

# ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا

## عەلی باپیر

**بەرگی**

**یەکەم و دووەم**



| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بەکوردی: | ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەتدا |
| نوسینی: | عەلی باپیر |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی ناوەوە: | جمعە صدیق کاکە |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ : | أمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز |
| تیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - ژمارەی سپاردن ( ٢٥٢٥ ) ساڵی (٢٠١٢ )پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٢١﴾ (الروم).

## پێشکەش بێ

خێرو پاداشتی ئەم کتێبە دەکەمە دیاریی و کەمێك توێشووی جیهانی بەرزەخ و قیامەت، بۆ :

١ -ڕووحی دایکی دڵسۆز و ماندوو نەناس و زۆر بەپەرۆشم.

٢ - ڕووحی هاوسەری وەفادارو خاوەن سۆزو مشوورخۆرم (خاتوون مەلاژن).

خوایە بەچاکترین شێوە پاداشتیان بدەیەوەو، پلەو پایەیان لە بەهەشتێ بەرز بکەیەوەو، خەم وپەژارەو ناسۆرەکانی ژیانی دنیایان لەبیر ببەیەوەو، ئەم بەرهەمەش بخەیە تای تەرازووی خێرو چاکەکانیانەوە.





## پێشەکی چاپی سێیەمی بەرگی یەکەم و
## چاپی یەکەمی بەرگی دووەم

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، ومن سيئات أعمالنا مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وحده لاشريك له وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾الأحزاب:٧٠-٧١)) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾النساء:١، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾آل عمران:١٠٢.

أما بعد.. فإنَّ أصدق الحديث كلام الله، وخيرا الهدي هَدْي محمد ﷺ وشرَّ الأمور مْحدثاتها وكل محدثة بدعة وكلّ بدعة ضلالة وكلّ ضلالة في النار..

خوێنەری بەرێز و خۆشەویست!

سوپاس و ستایشی شایستە بۆ خوای بەرز و مەزنی بێ وێنە، کە سەرەنجام بە ڕێنمایی و پشتگیریی و کارئاسانیی خۆی یارمەتیدام ئەم کتێبە بە هەردووک بەرگەکەی و، بە هەر نۆ(٩) بەشەکەیەوە، کە زیاتر لە دە(١٠) ساڵ لەمەوبەر نەخشەم بۆ کێشابوو، تەواو بکەم.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە لە پێشەکیی چاپی یەکەمی بەرگی یەکەم و ڕێخۆشکردنی گشتیی ئەم کتێبەدا، ئەوەی بە پێویستم زانیوە لەبارەی نێوەڕۆک و ئامانجی ئەم کتێبەوە ئاماژەم پێکردووە، لێرەدا بەس ئەوەندە دەڵێم، کە بابەتی (ئافرەت و خێزان) لە بنەڕەتدا زۆر گرنگ و هەستیارەو لەم ڕۆژگارەشدا ئەو

گرنگیی و هەستیارییە چەندقات بۆتەوەو هیوادارم ئەم بەرهەمەی بەندەش کەلێنێکی باش لەو بارە پڕ بکاتەوەو، بەرچاوی زۆر کەس ڕۆشن بکاتەوەو، گەلێك گرێکوێران بکاتەوەو، سەرەنجام بە هەموو لایەکمان بتوانین بەهۆی چاوبەخۆداگێڕانەوەمان لە بواری ئافرەت و خێزاندا، کۆمەڵگایەکەمان چاکتر و ڕاستتر و ساغتر بکەین. کە بێگومان سەرچاوەی هەموو چاکیی و ڕاستیی و ساغییەك، پابەندییە بە شەریعەتی خوای کاربەجێی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا.

شایانی باسیشە، کە بەرگی یەکەم هەر چوار بەشی لەخۆ گرتووە:

١ - دەروازەیەکی گشتی.

٢ - کەسایەتیو ڕێزو پایەی ئافرەت لە سایەی شەریعەتدا.

٣ - ڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتەکانی نەیارانی شەریعەت، لەبارەی ئافرەتەوە.

٤ - گرنگیی و چۆنیەتی بنیاتنانی خێزان.

بەرگی دووهەمیش پێنج بەشەکەی دی گرتۆتە خۆی، کە ئەمانەن:

١ - ئەرك و مافەکانی ژن و مێرد بەرانبەر بە یەکدی.

٢ - مافی منداڵان لەسەر باب و دایکیان و مافی باب و دایکیان لەسەریان.

٣ - چۆنیەتی لەیەکترازانی ژن و مێرد.

٤ - پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەرمەشقی هەرە بەرزمان لە ژیانی هاوسەرێتیی دا.

٥ - خاتوون مەلاژن... ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە.

**نووسەر**

١٦-١٧/ذو الحجة/١٤٣٣ کۆچی

١-٢/تشرینی یەکەمی/٢٠١٢ زایینی

هەولێر

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، وصلوات الله وسلامه وبركاته على محمد وآله أجمعين من الصحب والقرابة وأزواجه الطاهرات، والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.

**خوێنەری بەڕێز!**

بێگومان هەرخاوەن کارو پیشەو بەرهەمێك، سیفەت و تایبەتمەندییەکانی لە ئاوێنەی کارو بەرهەم و شوێنەوارەکەی دا دەردەکەون و دەدرەوشێنەوە، خوای پەروەردگاریش (تبارك وتعالى) کە خاوەنی ناوە هەرەچاکەکان و سیفەتە هەرە بەرزو پەسندەکانە،وەك فەرموویەتی :

﴿وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾﴾(الروم:٢٧)

وە تاکە سەرچاوەی هەرکام لەدروستکراو(الخلق) و فەرمان(الأمر)[1]ە، وەك فەرموویەتی:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ (الأعراف:٥٤).

(١) وشەی (الخلق) سەرجەم دروستکراوەکانی خوا دەگرێتەوە بەگەورە و گچکە و ماددیی ومەعنەویی وبەرهەست و نابەرهەستەوە، وشەی(الأمر) یش مەبەست پێی وەحی و کتێب و پەیامەکانی خوایە، کە زانایانی ئیسلام وشەی (التکوین) و(التشریع) یان بۆ بەکاردێنن.

شتێکی ئاسایی‌و چاوەڕوان کراوە کە هەم بوونەوەرو دروستکراوەکانی خواو، هەم کتێب‌و بەرنامەکەیشی بۆ هەر خاوەن عەقڵ‌و فیترەتێکی هۆشیارو ساغ، وەك ئاوێنەیەکی ساف‌و روون، سەرجەم ناوە هەرە چاك‌و سیفەتە هەرە بەرزەکانی خوا (سبحانه وتعالى) بدرەوشێننەوە، هەڵبەتە هەربۆیەش هەم شارەزایانی بوونەوەرو سروشت بەوپەڕی خۆبەکەمزانین (تواضع)ەوە سەری بەندایەتییان بۆ بەدیهێنەرو خاوەنی بوونەوەرو سروشت دانەواندوە، هەرچەندە لەئایین‌و بەرنامەی راست‌و نەگۆڕاوی خواش -کەئیسلامە- بێئاگا بووبن[1]، وە هەم زانایان‌و تێگەیشتوانی کتێب‌و شەریعەتی خواش بەوپەڕی هەست بەبچووکیی خۆکردن‌و خوا بەگەورەو بەرزگرتنەوە، سەری نەوازش‌و تەسلیمیان بۆ خوای بەرزو بێ وێنەو هاوتا شۆڕکردوەو، پابەندیی یان بەئایین‌و شەریعەتەکەیەوە کردوە. [2]

**بەڵێ خوێنەری سەنگین!**

وەك چۆن زاناو پسپۆڕانی بوارە جیاجیاکانی زانستە سروشتی یەکان، سەرجەمیان پاش لێکۆڵینەوەو قووڵ بوونەوەی زۆرو چڕوپڕ لەبارەی سروشت‌و

---

(١) بۆ وێنە: سەرنجی (الله يتجلى في عصر العلم)ی کۆمەڵە زانایەك و (العلم يدعو للأيمان) ی کریسی مۆریسۆن‌و (قصة الأيمان بين العلم والفلسفة والقرآن) ی نديم الجسر و (الاسلام يتحدى) ی وحيد الدين خان، بدە.

(٢) بۆ وێنە سەرنجی کتێبی: (مسلموا أهل الكتاب وأثرهم في الدفاع عن القضايا القرآنية) بدە، کەدوو بەرگی گەورەیەو بەدرێژایی باسی ژمارەیەك لەجوولەکەو دیانەکان دەکات کە لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەدا مسوڵمان بوو ون، نووسینی: د. محمد بن عبدالله السَّحيم. وە سەرنجی کتێبی: (حوارات مع مسلمين أوروبيين) ی د. عبدالله احمد قادری بدە کە باسی چل (٤٠) کەس لەو ئەوروپایی یانە دەکات کە لەئاستی بەرز بەرزدا مسوڵمان بوو ون.

بوونەوەرەوە، بێ‌سێ‌و دوو [(١)] دان بەو ڕاستی یەدا دەنێن، کە خوای کاربەجێ لەبارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە فەرموویەتی:

﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾﴾(الملك: ٣ – ٤)

واتە: لە دروستکراوی خوای خاوەن بەزەیی دا هیچ نارێکییەك نابینی، دەجا چاو بگێڕەوەو سەرنج بدە بزانە هیچ کەلێن‌و کونان دەبینی، پاشان جار لەدوای جار چاوبگێڕەو سەرنج بدە، بۆ دۆزینەوەی نارێکی و کەم‌وکوورییەك - بەڵام سەرەنجام- چاوت بە دەست بەتاڵیی‌و شەکەتیی دەگەڕێتەوە لات - هیچت دەستگیرنابێ -!﴾.

پێم بڵێ: بێجگە لەبەدیهێنەرو خاوەن‌و مشوورخۆری ئاسمانەکان‌و زەوی ، کێ هەیە بتوانێ ئاوا بەبێ منەتیی‌و ڕاشکاوانە خەڵکی هان بدات‌و بێ منەتیان بکات لەدیتنەوەی تەنها یەك نارێکی‌و ناتەواویی، هەرچەندە زۆریش بچووك بێت، [(٢)] لەسەرجەم ئاسمانەکان‌و زەویی دا؟!

ئایا شارەزاو پسپۆڕانی سروشت ناسیش هەر کەسە لەبواری پسپۆڕی(تخصص)ی خۆی دا پڕ بەدڵ‌و زاریان هەمان شایەدیی بێ‌عەیب‌و هەڵەیی‌و تێرو تەواویی یان بۆ دروستکراوەکانی خوا نەداوەو هەموویان نالێن: ئەم بوونەوەرەو دیاردە سروشتی یە سەرسوڕهێنەرەکانی چۆن دروست کراون، دەبوایە هەر وابن‌و هەر کەم‌و زیادیی یەك لەئەندازەو قەبارەو خێرایی‌و چی‌و چی یان دا کرابایە، وەزع تێك دەچوو؟!!

---

(١) دیارە بێجگە لەکەسانێك کەبەهەر هۆیەکەوە بووە کۆمەڵێك گرێ‌و گۆڵی دەروونییان بەرانبەر بەخواو ئاین بەگشتی بۆ پەیدا بووەو، ئەو گرێ‌و گۆڵانە بوونەتە پەرچ‌و لەمپەر لەبەردەم خواناسییاندا.

(٢) چونکە وشەی (مِنْ تفاوتٍ) ئەوە دەگەیەنێ.

بۆ وێنە:

زاناو پسپۆڕانی زانستە سروشتی یەکان دەڵێن: تێکڕای ئەم بوونەوەرو سروشتە بەجۆرێك هەڵخراوەو لەگەڵ ژیانو گوزەرانی ئینسان دا گونجێنراوە ، کە نەك هەمووی بگرە ئەگەر تەنها شتێك لەشتەکانیشی شێوەو چۆنیەتی یەکەی بگۆڕێ، ژیانو گوزەرانی ئینسان تێك دەچێ!

بۆ نموونە: ئەگەر خۆر لەجیاتی (١٥٠) ملیۆن کیلۆمەتر دوورتر، یان نزیکتر بوایە لەزەوی، یان ئەگەر قەبارەی خۆر لەجیاتی ملیۆنێكو (٣٠٠,٠٠٠) جار کە لەزەوی زلترە، گەورەتر یان گچکەتر بوایە، یان ئەگەر ڕێژەی گازەکان لەهەوای دەوری زەویدا، کە نایترۆجین (٧٨٪) و ئۆکسجین (٢١٪) و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن (٠,٠٣٪)یە، کەمتر یان زیاتر بوایە، یان ئەگەر ڕێژەی ئاوی سەرزەوی کەمتر یان زیاتر بوایە لەڕێژەی ئێستای، یان ئەگەر هێزی کێشندە (قوة جاذبیة)ی زەوی لەئەندازەی ئێستای پتر بوایە یان کەمتر[1]، یان ئەگەر فشاری هەوا لەئەندازەی ئێستای کەمتر یان زیاتر بوایە، یان.. یان.. هتد، ئەوە بەتەئکید نەك هەر حاڵو گوزەرانی ئینسان لەسەر زەوی تێك دەچوو، بەڵکو هەر لەسەرەتاوە دروست نەدەبوو! هەروەها پێکەوە گونجاویی‌و تەبایی دیتنی چاوو تیشكو ڕەنگەکانی خۆرو، بیستنی گوێ‌و شەپۆلەکانی هەواو، پێداویستییەکانی جەستەو ئەو بژێوو وزەو ڤیتامینانەی کە لەگۆشتی ئاژەڵو پەڕەورو دانەوێڵەو میوەو تەڕە کارو سەوزەدا هەن.. هەموو ئەمانەو دەیانو سەدان نموونەی دیکەیان، بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئەم بوون (وجود)ە ،ئەوپەڕی وردەکاریی‌و زانایی‌و یاسامەندیی لەتێکڕای‌و، یەك یەکی پێکهێنەرەکانیدا ڕەچاو کراوە!

---

(١) کە یەك کیلۆگرامە بۆ هەر سانتیمەتر دووجایەك.

**جا خوێنەری بەڕێز!**

وەك چۆن بەپێڵێنانی زاناو پسپۆڕانی سروشتناس، دروستكراوەكانی خوا (تبارك وتعالى) ئاوێنەی تێدا درەوشانەوەی سیفەتە هەرە بەرزو بێوێنەكانی خوان، وەك: زاناییو بەزەییو كاربەجێییو تواناییو پەنهانبینیو.. هتد، بەهەمان شێوەش زاناو پسپۆڕانی شەریعەتناسیش تێكڕا لەسەر ئەوە كۆكو یەكدەنگن، كەئایینو شەریعەتی خواش یەكجار تێرو تەواو و بێهەڵەو پەڵەیەو، هێندەی نووكی دەرزی كەموكووڕیی تێدا نیەو، هەرچی خوای دادگەرو كاربەجێ فەرموویەتیو ناردوویەتی، لەلووتكەی هەرە بەرزی ڕاستییو دادگەریی دایە:

وەك فەرموویەتی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾(الأنعام:١١٥)،وە فەرموویەتی:

﴿ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ ۚ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ﴾ (المائدة:٣).

وە هەروەك چۆن زاناو پسپۆڕانی سروشتناس، كە سیفەتە بەرزو بێوێنەكانی خوای پەروەردگاریان لەئاوێنەی دروستكراوەكانو دیاردە سروشتی یەكاندا بەڕوونی بینیوە، لەمیحرابی زانست (معرفة)دا بۆ خوا بەچۆك دا هاتوونو، دانیان پێداهێناوە كەئەو بوونەوەرو سروشتە بەجۆرێك سازكراوەو هەڵخراوە، كەهەلومەرجی ژیانو گوزەرانی ئینسان برەخسێنێو سەرجەم پێداویستییەكانی بۆ فەراهەم بێنن، زاناو شارەزایانی شەریعەتزانیش بەهەمان شێوەو بگرە چاكتریش سیفەتە بەرزو پەسەندو بێسنوورەكانی خوای بێوێنەو هاوەڵیان لەدوو تویێی ئایینو شەریعەتەكەیدا وەك ڕۆژی ڕوون بینیوەو، لەژێر سایەی شەریعەتدا سەری بەندایەتییان بۆ خوا خستۆتە سەرزەمینو، لەناخیانەوە دانیان پێداهێناوە، كە ئایینو شەریعەتی خوا بەجۆرێك دانراوەو نێرراوە، كەهەرچی خێرو خۆشییو

بەرژەوەندیی ئینسانە، بەعەقڵو رووحو جەستەو دەروونەوەو لەبواریی تاکییو خێزانییو کۆمەڵییو لەدنیاو دوارۆژا، تێیدا رەچاوکراونو، ئینسان بەنێررانی شەریعەت رێی سەرفرازییو عیززەتمەندییو بەختەوەریی راستەقینەو هەمەلایەنەی پێشان دراوە و، گەورەترین چاکەی لەلایەن خواوە لەگەڵ کراوەو، چاکترین نیعمەتی پێ بەخشراوە!

بەڵێ، زاناو پێشەوایانی ئیسلام کە لەناسینی شەریعەتی خواو پەی پێبردنی نهێنییەکانیدا پسپۆرن، لەسەر بناغەی ئیمان بەخواو پێغەمبەرو ﷺ ئایینو بەرنامەکەیو دڵنیابوون لەو راستییە، کەهەرچی خوا بیفەرمویو بۆ پێغەمبەرەکەی بنێرێ، لەوپەری راستییو دادگەرییدایە، پاش سەرنج دانو تیوەڕامان (إستقراء)ی تێکڕای شەریعەتی خوا ،گەیشتوونە ئەو قەناعەتەی کە لەبنچینە (قاعیدة) یەك دا ختوویانەتەروو کەدەڵێ:

(أينما وجِدَتِ المَصْلحة فثَمَّ شَرْعُ اللهِ) بەرژەوەندیی - ئینسانەکان - لەکوێ بێ بەرنامەی خوایش لەوێیە.

هەڵبەتە تەنها ئەوەش شتێکی ئاساییو گونجاوەو لەخوای کاربەجێو بە بەزەییو بەرزو مەزنو شەریعەتە تێرو تەواوو بێهەڵەو پەڵەکەی دەوەشێتەوە، چونکە خوای بێوێنە خۆی ئینسانی خوڵقاندووە، بەگوێرەی فیترەتو سروشتێکیش کەئینسانی لەسەر سروشتاندوە بەرنامەو شەریعەتی بۆ ناردوە، بۆیە پڕ بەپێستی ئینسان بوونی شەریعەتی خوا، شتێکی روونو بێچەندوچوونە، وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی:﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ الملك: ١٤

واتە: ئایا ئەو کەسەی کەئینسانی خوڵقاندوە، پێی زانا نیە لەحاڵێکدا کەپەنهان بینو شارەزایە؟!

هەروەها خوای کاربەجێ زۆر بەراشکاویی رایگەیاندوە کەشەریعەتی خواو





فیترەتی ئینسان دوو رووی حەقیقەتێکن‌و لەسەدا سەد پێکەڵپێك‌و وەك یەكن: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ الروم: ٣٠.

واتە: دەجا رووی خۆت بەپاكیی‌و چاكیی لەگەڵ ئایین دا راست بكە، ئەو سروشتەی كەخوا خەڵكی لەسەر سروشتاندوە[١]، بێگومان دروستكراوی خوا گۆڕانی بۆ نیە، تەنها ئەوەش بەرنامەی راست‌و تەواوە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن..

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

چ بڵێی (شەریعەتی خوا) چ بڵێی (سروشتی خەڵكی) هەردووكیان یەك شتن، چونكە هەردووكیان لەیەك سەرچاوەوە هاتوون‌و مۆری یەك كارخانەیان پێوەیە، سروشتی خەڵك (فطرة الناس)ی دروستكراو و كردەوەی خوایەو، بەرنامەی خوا (شریعة الله)ش فەرمان‌و فەرمایشتی خوایە، جا بێگومان خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاریش فەرمایشت‌و كردەوەی كۆك‌و تەبان‌و دژ بەیەك‌و جیانین‌و، فەرمانی بنیاتنەرانە (الأمر التكويني)ی خواو، فەرمانی بەرنامە دانەرانە (الأمر التشريعي)ی مەحاڵە هیچ جۆرە تێك گیران‌و ناكۆكییەكیان لەنێواندا هەبێ!

بەڵام بێگومان مەرج نیە هەركەس راست بۆوە، پەی بەو حەقیقەتەی شەریعەتی خوا ببات، وەك چۆن هەموو كەس سەر لەنهێنییەكانی بوونەوەرو سروشت دەرناكات! بۆیە هەمیشە خوای زاناو پەنهان بین، لێتێگەیشتن‌و پەی پێبردنی

---

(١) وەك دەبینین خوای زانا (دین) ی بە (فطرة) داناوەو تەفسیر كردوە، كەواتە (دین) ی خواو (فطرة) ی ئینسان یەك شتن‌و دوو رووی حەقیقەتێكن.

حیکمەتو نهێنییەکانی هەردووك کتێبی بینراوی بوونەوەر (کتاب الکون المنظور)و کتێبی خوێنراوی قورئان (کتاب القرآن المقرؤ) تایبەت دەکات بەزاناو شارەزایانو خاوەن عەقڵانەوە، ئەوانەی کە لەشتان ورد دەبنەوەو سەرکێڵانە بەلایاندا ڕەت نابن، وەك فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٠ ﴾ (آل عمران: ١٩٠)

وە فەرموویەتی: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩ ﴾(ص:٢٩).

وە فەرموویەتی : ﴿ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ٤٣ ﴾ (العنكبوت:٤٣).

بەڵێ تەنها ئەهلی عەقڵو زانست لەنیشانەکانی خوا (آیات الله) تێدەگەن کە لەسروشت(طبیعة) و بەرنامە(شریعة)ەکەی خۆیدا دایناون، بۆئەوەی ببنە نیشانەو بەڵگەی دەستیانو قووچکەی[1] سەر ڕێی بەرەو خواچوونیان، هەر بۆیەشە کەخوای دادگەر هەمیشە سەرزەنشتی کافرو لاڕێیەکان دەکات، کەنافامنو مۆری کەودەنییو کەڕییو کوێرییو بێئاگایی یان بەنێو چاوانەوە دەدات، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ

(١) قووچکە: (مَعلَمْ) کۆیەکەی (مَعالِمْ) ە، کە بریتین لەو نیشانانەی ئینسان بەهۆیانەوە بەڕێ دەزانێو ڕێگای لێتێك ناچێ.

ﭐلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ (الأعراف:١٧٩).

واتە: بێگومان کەسانێکی زۆرمان لەجنو ئینسان بۆ دۆزەخێ سازکردوون کەدڵ (عەقڵ) یان هەنە بەڵام پێیان حاڵی نابن، وە چاویان هەن، بەڵام پێیـان نـابینن، وە گوێیان هەن، بەڵام پێیان نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵ وان، بگرە گومڕاتریشـن، هـەر ئەوانەن بێئاگایان.

دیارە شتێکی ئاشکراشە کە نکوڵیکردنو ملەجیڕەی بێ بڕوایان، چ لەبەرانبـەر نیشانەکانی خوا لەبوونەوەرو سروشتدا، کەخوا بـەڵێنی داوە بـەردەوام ئـەو بەڵگـەو نیشانانە لەخودی ئینسانەکانو لەئاسۆیەکانی بوونەوەریش دا -بەهۆی گەشـەکردنو بەرەو پێش چوونی زانستەوە- بخاتەڕوو، وەك فەرموویەتی:

﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ ﴾ (فصلت:٥٣).

وە چ لەبەرانبـەر ئایەتـەکانی قورئـانی بـەڕێزدا، کـەڕۆژ بـۆ ڕۆژێ ڕووداوو گۆڕانکارییـەکانی ڕۆژگـارو، ئەزموونـە تـاڵو شـیرینەکانی مرۆڤایـەتیو، ڕاسـتییە بەرزو مەزنەکانیان زیاتر دەدرەوشێننەوە، بەڵێ ئەو نکـوڵییو دان پێدانەهێنانـەی بێ بڕوایان، هیچ زیانێك بەهەردووك جۆرە نیشانەکانی خوا (آيات الله) ناگەیـەنێ، وەك چۆن ڕۆژی پرشنگدارو مانگی درەوشاوە نەدیتنی بابای کوێر زیانیان لێنادات!

ئێستاش لەکۆتایی ئەم پێشەکییەداو لەبەر تیشکی ئەو ڕاستییانەدا کە ڕابردن، لەبارەی کتێبی (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەت دا) دەڵێم: خـوا پشـتیوان بـێ لەم کتێبەدا هەوڵ دەدەیـن هەڵوێسـتی شـەریعەتی خـوا لـەبارەی ئـافرەتو خێـزان (المرأة والأسرة) وە بەپوختییو ڕوونیی بخەینەڕوو:

یەکەم: بۆئەوەی کەسـانێك کەسـتایش بـۆ خـوا مسـوڵمانو دڵنیـاو مسـۆگەرن کەشـەریعەتو ئـاییني خـوا لـەبارەی ئـافرەتو خێزانیشـەوە، وەك هـەر مەسـەلەو

بابەتێکی دیکە، ڕاست ترین و چاکترین هەڵوێستی نواندووە، دادگەرترین چارەسەری بۆ کێشەو گرفتەکانیان داناوە، بەڵێ ئەو جۆرە کەسانە بەهۆی ئەم کتێبەوە ئەو قەناعەتو بڕوایەیان پتەوترو دامەزراوتر بێت، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗا﴾(المدثر:٣١)

وە ئەگەر هەتا ئێستا وردە ئیشکالێك یان تەمومژێکیشیان لەبەرچاو هەبووە، خوا یاربێ بڕەوێتەوە، یان ئەگەر لەڕووی پابەندیی و ڕەفتارو ئاکاریی خێزانیی و هاوسەرێتییەوە، کەموکووڕیی و کرچو کاڵییەکیشیان هەبووەو، بە بەرچاو ڕوونییەوە چارەسەری بکەنو نەیهێڵن، چونکە بێگومان هەر زانیارییەك نەگۆڕێ بۆ کردارو، هەر تێگەیشتنێك نەبێتە مایەی پێگەیشتن، خاوەنەکەی لەسەری قەرزدار دەبێتەوە.

دووەم: بۆ ئەوەی کەسانێکیش کەبەداخەوە هەتا ئێستا بەهۆی بەڕاست نەزانینو دان پێدانەهێنانو قبوول نەکردنی شەریعەتی خواوە، تەنانەت ئەگەر لەبوارێکو بگرە تاکە مەسەلەیەکیشدا بێت، نەچوونەتە نێوبازنەو جوغزی ئیمانو ئیسلامەوە، ئەگەر بەلاف لێدانی ڕووتیش ئیدیعای مسوڵمانەتیی بکەن، بەڵێ بۆئەوەی ئەوجۆرە کەسانەش بەهۆی خستنەڕووی هەڵوێستی ئایینو شەریعەتی خوا لەبارەی ئافرەتو خێزانەوە، زیاتر بیانووبڕ بکرێنو بەڵگەو بەهانەیەکی دیکەشیان لەبەڵگەو بیانووەکانی ڕوو لەخوا وەرگێڕانو، بەکەندەڵانی ڕێچکان دا هەڵدێرانو، لەزەلکاوی بێ دینییدا خنکانیان، لێ بستێنرێتەوە، لەخوای بەخشەریش داواکارم کەئەم کتێبە هەرکام لەو دوو ئامانجە سەرەکییەی کەئاماژەم پێکردوون بپێکێ.

پێویستە ئەو ڕاستییەش بگوترێ کەبەندە لەنووسینی ئەم کتێبەم دا تەنها پشت بەقورئانو سوننەتو چاك لێتێگەیشتنیان دەبەستمو، بۆ چاك لێتێگەیشتنیشیان

وێــڕای عــەقڵی خــۆم کــەمو زۆر لەئــەزموونو بەرهــەمو لێکدانــەوەی زانــاو پێشەوایانیشمان بەهرەمەند دەبمو، بێجگە لەبەڵگەی بەهێزتریش -بەپێی بۆچوونی خۆم- بەهیچ شتێکی دیکەوە پابەند نابم، لە لێحاڵی بوونی دەقەکانی قورئانو سوننەتدا،وە مەگەر چۆن دەنا هەر شتێکیش لەهەر کەسو هەر سەرچاوەیەکیش وەربگرم، حەتمەن ئاماژەی بۆ دەکەم، هەم وەك ئەمانەتدارییو وەفاو، هەم بۆ بەرچاوڕوونیی زیاتری خوێنەری بەڕێزیش.

مەمنوونی هەر خوشكو برایەکی دڵسۆزیش دەبم، کە لە هەر کەمو کوورییو هەڵەو پەڵەیەك -کە هیچ کەس لێیان خاڵی نابێ- ئاگادارم بکاتەوە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد انّ لا اله الا انت،

أستغفرك وأتوب اليك.

نووسەر

**ئەحمەدئاوا**

**١٥ محرم ١٤٢٣ك.**

**٢٩/٣/٢٠٠٢م.**

## ڕێ خۆشکردن

**خوێنەری بەڕێز و سەنگین!**

ئەم کتێبە (ئافرەت‌و خێزان لەسایەی شەریعەت دا) ئەسڵ‌و هەوێنەکەی وتارێکی بەندیە کە لەساڵی (١٩٩٩) و لەدەورەیەك دا دراوەو پاشان برایەکی[(١)] بەڕێز لەکاسێتەوە هێنابوویە سەر قاقەز، جا هەرچەندە من ئەو وتارو نامیلکەیەم لێرەدا بەجیا نەهێناوە، بەڵام وەك گوتم بۆتە بناغەو هەوێنی ئەم کتێبەی بەردەست تان.

وە ئەم کتێبە بێجگە لە (پێشەکی) لەم بەشانەی خوارەوە پێك دێ:

## بەشی یەکەم: دەروازەیەکی گشتی

ئەم بەشی یەکەمە لەسێزدە (١٣) کورتە باس پێکهاتوە، بەمەبەستی ئەوە کە خوێنەری بەڕێز، پێش چوونە نێو درێژەو وردەکاریی باس‌و بابەتەکانەوە، سەرەتا سەرنجێکی خێراو گشتگیر(شمولي) بداتە تێکڕای مەسەلەی ئافرەت‌و خێزان لەڕوانگەی شەریعەتەوە، شایانی باسە کە ئەم بەشی یەکەمە وەك ناومان لێناوە (دەروازە) دەروازەو بناغەی سەرجەم بەشەکانی دیکەیە.

---

(١) ئەو برایە کاك (ئارام ئەحمەد جاف)ە، خوا پاداشتی بداتەوەو، وتارەکەش بەناوونیشانی: (ئافرەت لەسێبەری ئیسلام دا) بوو.

## بەشی دووەم: ڕێزو حورمەتو پایەی ئافرەت لەسایەی شەریعەتدا.

لەم بەشەش دا لەچەند خاڵێكو لەبەر تیشكی چەند دەقێكی قورئانو سوننەتدا، ڕوونی دەكەینەوە كەئیسلام چ ڕێزو حورمەتێكی لەئافرەت ناوەو، چ پلەو پایەیەكی پێبەخشیوە، چ دایك بێ، چ هاوسەرو، چ كچو، چ خوشك.

## بەشی سێیەم: ڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتەكانی نەیارانی شەریعەت لەمەڕ ئافرەتەوە.

ئەم بەشی سێیەمەش تەرخان كراوە بۆ بەرپەرچدانەوەی چەندان تۆمەتی دوژمنانی ئیسلامو نەیارانی شەریعەتو، ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستیی یە كەسەرجەم ئەو مەسەلانەی ئەوان بەچەند تیرێكیان زانیون كەبیانگرنە شەریعەتی خوا! هەر كامێكیان ئەگەر وەك لەشەریعەت دا هاتوون بخرێنەڕوو، بەڵگەیەكی زۆر بەهێزی دیكەیە لەسەر ئەوە كەئیسلام چاكترین ڕێزو حورمەتی لەئافرەت گرتوەو، بەپێچەوانەی بۆچوونی ناحەزانییەوە، نەك هەر مافی پێشێل نەكردوەو بەسووك تەماشای نەكردوە، بەڵكو زۆر زۆریش خاتری گرتوە!

بەڵێ لەم بەشی سێیەمەدا هەركام لەم مەسەلانە توێژراونەوە:

١-بەشوودانی ئافرەت.

٢-مارەیی (المهر).

٣-سەرپەرشتیی پیاو بۆ ئافرەتو خێزان (قوامة الرجل على المرأة والأُسرة).



٤-چەند ژنیی (تعدد الزوجات).

٥-یاخی بوونی ژن (نشوز الزوجة) و چۆنیەتی چارەسەرکردنی.

٦-بەرگو پۆشاکی ئافرەت (لباس المرأة).

٧-میراتی ئافرەت (میراث المرأة).

٨-شایەدیی دانی ئافرەت (شهادة المرأة).

٩-تۆڵەی خوێنی ئافرەت (دیة المرأة).

١٠-تەڵاقدانی ئافرەت.

١١-بەهەڵە تێگەیشتن لەچەند دەقێك لەبارەی ئافرەتەوە.

١٢-چەند بەناو فەرموودەیەکی هەڵبەستراو دەربارەی ئافرەت.

شایانی باسیشە کەپاش توێژینەوەی ئەم مەسەلانە، روونمان کردۆتەوە کەهەر کام لەم مەسەلانە، نەك هەر تۆمەتێك نیە کەشەریعەتی پێتاوانبار بکرێ، بەوە کەرێزی لەئافرەت نەگرتوە وەك ناحەزانی کاڵفام گومانیان بردوە، بەڵکو یەك یەکی ئەو مەسەلانە بەڵگەیەکی بەهێزی کاریەجێ بوون و دادگەربوونی شەریعەتی خوایەو، سەلمێنەری ئەو راستیی یەشە،کە ئافرەت بەس لەسایەی شەریعەت دا، وەك پێویست رێزی لێدەگیرێو حورمەتو کەسایەتیی و تایبەتمەندیی یەکانی دەپارێزرێن!

## بەشی چوارەم: گرنگیی خێزانو چۆنیەتی بنیاتنانی لەشەریعەتدا

لەم بەشەش دا ئەم چەند مەسەلەیە توێژراونەوەو تیشکیان خراوەتە سەر:

١-گرنگیی خێزان (أهمیة الأسرة).

٢-پێناسەی هاوسەرێتی (تعریف الزّوَاج).

٣-گرنگیی و حوکمی هاوسەرێتی.

٤-خوازبێنی (الخِطْبة) و حوکمو ئەدەبو حیکمەتەکانی.
٥-پایەکانی مارەکردن (أركان عقد النكاح).
٦-سەرپەرشتی کردن (ولاية) ی بەشوودانی ئافرەت.
٧-شایەتیدان (الإشهاد) لەسەر بەشوودانو مارەبڕینی ئافرەت.
٨-هاو کوفێتی (الكفاءة) نێوان ژنو مێرد.

## بەشی پێنجەم: ئەرك و مافەکانی ژنو مێرد بەرانبەر بەیەکدی.

ئەم بەشەش تەرخان کراوە بۆ روونکردنەوەی پەیوەندیی و هەڵسوکەوتی شەرعییانەی ژنو مێرد لەگەڵ یەکدیداو ئەو هەقو مافانەی کەدەبێ هەرکامێکیان بۆ ئەوی دیکەدابینیان بکاتو، ئەو ئەدەبو رەوشتە بەرزو شەرعییانەی کەپێویستە لەژیانی ژنو مێردایەتییان دا رەچاویان بکەن، ئەمیش لەسێ تەوەرەدا دەخرێتەڕوو:

١-ماف وئەدەبە هاوبەشەکانی نێوانیان.
٢-مافەکانی ژن لەسەر مێردی.
٣-مافەکانی مێرد لە سەر ژنی.

## بەشی شەشەم: مافی منداڵان لەسەر بابو دایکیانو، مافی بابو دایکیان لەسەریان

لەم بەشەش دا لەدوو تەوەرەدا باسی ئەرکو مافەکانی نێوان بابو دایكو منداڵەکانیان دەکەین:

١-ئەرکی بابو دایك بەرانبەر بەمنداڵەکانیان.
٢-مافی بابو دایك لەسەر منداڵەکانیان.





## بەشی حەوتەم: چۆنیەتی لەیەك ترازانی ژنو مێرد

لەم بەشی حەوتەمەش دا سەرەتا لەسێ تەوەرەدا کە گەورەترین بەشی ئەم کتێبەیەو زۆرترین پانتایی گرتوە، لەچاو بەشەکانی دیکە،لە چوار تەوەرەدا باسی شێوەو چۆنیەتی لەیەك ترازانی ژنو مێرد دەکەین:

١-دەست لێبەردانی مێرد بۆ ژن (الطلاق)

٢-لەخۆدارنینی ژن بۆ مێرد (الخُلعْ)

٣-هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرێتیی (فَسْخُ الزَّواج) لەلایەن دادوەرەوە.

4-عیددەوئەومەسەلانەی پێیەوە پەیوەستن.

چونکە شەریعەتی پڕ لەحیکمەتو دادگەریی خوای کاربەجێ، هەرچەندە بارتەقای ئەوە کە کەیفی بەپێکەوە پەیوەست کردنێکی شەرعییانەی پیاوو ژن دێت، رقی لە لەیەك ترازانو دەست لەیەك بەردانیانە، بەڵام شەریعەت وەك لەبەرانبەر هەر مەسەلەیەکی دیکەش دا هەڵوێستو بڕیاری واقیع بینانەی هەیە، نەك عاتیفی یانە، لەمەسەلەی پەیوەندی نێوان ژنو مێردیش دا، بەهەمان شێوەو چەندان شێوازو میکانیزمی جۆراوجۆری دیاری کردوە، بۆ چارەسەری ئەو کێشەو گیروگرفتانەی کە لەنێوانیان دا پەیدا دەبن، بەڵام کاتێك هەموو رێیەکانی چارەسەر دەگەنە بن بەستو ژیانیان تەواو لێتاڵ دەبێ، شەریعەت بەناچاریی‌و وەك (أبغض الحلال) رێی داوە، کە بەیەکێك لەو سێ شێوازە، ئەو ژنو مێردە کۆتایی بەپەیوەندیی نێوانیان بهێنن، کە (طلاق) و (خُلْع) و (فَسْخ) ن، چونکە یان مێرد ژنەکەی ناوێ، ئەوە (طلاق)ی بۆ هەیە، یان ژن مێردەکەی لێ بۆتە بەلا، ئەویش (خُلْع)ی بۆ هەیە، وە یان یەکێکیان ئەوی دیکەی ناوێتو تەرەفی دیکە دەستی

لێبەرنادات، یان ڕەواو هەق نیە پێکەوە بمێننەوە، ئەوە (فَسْخ) گرفتەکەیان چارەسەر دەکات، کەلەلایەن قاضیو دادگای شەرعییەوە دەکرێ.
پاشان لەتەوەرەی چوارەمیشدا، لەحەوت خاڵان دا، باسی عیددەو ئەو مەسەلانەی پێیەوە پەیوەستن، دەکەین.

## بەشی هەشتەم: پێغەمبەری خواﷺ سەرمەشقی هەرەبەرزمان لەبواری هاوسەریتیی دا.

لەم بەشی هەشتەمەش دا لەبارەی لایەنێکی گرنگو هەستیاری ژیانی پێغەمبەری خواوەﷺ دەدوێین، کەبریتیە لەلایەنی هاوسەریتیی، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو ڕوویێکەوە تەواوترین ئینسانو چاکترین پێشەواو سەرمەشقە، جا یەکێك لەلایەنە هەرە گرنگو وردو ئاڵۆزو هەستیار (حساس) ەکانی ژیانی ئینسان، بریتیە لەلایەنی هاوسەریتیی (الناحیة الزَّوجیة) کە بێگومان هەبوونی سەرمەشق (أُسوة)ێکی بێ هەڵەو پەڵەی وەك پێغەمبەری خاتەمﷺ، چاکترین یاریدەدەرو ڕێپیشاندەری دەبێ لەو بوارەدا.
جا ئێمە لەچوار خاڵان دا ئەم بەشی هەشتەمەمان خستۆتەڕوو:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشقی هەمەلایەنەمانە.
٢- ژن هێنانی پێغەمبەری خوا ﷺ و حیکمەتەکانی.
٣- پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوشت جوانترینو وەفادارترین هاوسەرو، بەسۆزترین باب.
٤- خۆری کەسایەتیی هەرەبەرزی پێغەمبەری خوا ﷺ و فووی زاری داخ لەدڵە گوێز لەهەمبانەی خۆدا ژمێرەکان.

## بەشی نۆیەم: (خاتوون مەلا ژن) ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە.

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشەش کەبەشی کۆتایی کتێبی: (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەت دا)یە، تەرخانم کردوە بۆ نووسینو تۆمارکردنی ژمارەیەك لەرەوشتو خەسڵەتە جوانو دڵگیرەکانو ئاکارو هەڵوێستە رەندو پەسەندەکانی هاوسەری کۆچکردووم (روخسار ئیبراهیم ماماغا) کەمن هەر بەنازناوی (خاتوون مەلا ژن) ناوم دەهێنا، خوا بەلوتفو کەرەمی بێسنووری خۆی لێی خۆش بێتو، جێگاو ماوای بەهەشتی رازاوەو نەبڕاوە بێت.

شایانی باسیشە من هەر لەساڵی (١٩٩٦)ەوە کە کۆچی تێدا کرد، بەتەما بووم نامیلکەیەکی لەسەر بنووسم،، ئێستاش کەدەرفەت رەخساوە، پێم باشترە بیخەمە گەڵ ئەم کتێبەو، ئەم بەشی نۆیەمەی بۆ تەرخان بکەم، چونکە هەم ئەم کتێبەی پێ تێرو تەواوتر دەبێتو، هەم ئەوەش زیاتر شایستەی ئەو ئافرەتە هەڵکەوتوویە.

لەم کارەشم دا دوو ئامانجم لەبەرچاو گرتوون:

یەکەم: وەك وەفاداریی‌و ئەمەگ بۆ ئەو هاوسەرە دڵسۆزەم کەبەڕاستیی رۆژانی سەختو دژوارو، هەلومەرجی ناخۆشو پڕکەندو کۆسپو، ژیانو گوزەرانی نارەحەتو پڕ میحنەتی لەگەڵ بەرێ کردوومو، شێرە ژنانە لەژیانی پڕ هیجرەتو ئاوارەیی‌و کۆچو کۆچبارم دا بەبێ پرتەو بۆڵەو گلەیی‌و گازندە، دەستباری بۆ گرتوومو هاوکاریی‌و پشتیوانیی کردووم.

دووەم: وەك بەرچـاو ڕوونییـەك بـۆ دایکـانو خوشـکانی بـەڕێزمان، بـەڵکو هەڵوێستو هەڵسوکەوتو ئاکارە بەرزەکانی خاتوون مەلا ژن، ببنە مایـەی سوودو کەڵکو بەهرەو پەند لێوەرگرتنیان.

خوایـە لەچـاکەو بەخششـی خۆتـەوە ئـەم بەرهەمـە بگێـڕی بەمایـەی سـوودو بەهرەلێوەرگرتنی خوێنەرانی بەگشتی، بۆئەوەی ببێتە پارسـەنگێکی قـورس لـە تـا ترازووی خێرو چاکەکانی دایکی دڵسۆزمو، هاوسەری وەفادارم دا، ئامین.



## خوێنەری سەنگین!

خوا پشتیوان بێ لەم بەشی یەکەمەدا هەوڵ دەدەین لە دووتوێی سێزدە(١٣)کورتەباسی گرنگ دا بەگشتیی چاوێك بەبابەتی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا)بگێڕین، بۆئەوەی بەرلەوەی بچینە نێو درێژەو وردەکارییەکانی بابەتەکەوە، سەرنجێکی هەمەلایەنەی لێبدەین، بەمەبەستی بەرچاو ڕوونیی و ڕێخۆشکردن.

جا دیارە هەندێك لەو کورتە باسانە لێرەدا بە گوشراوەیی دەخرێنە ڕوو، یان هەر ئاماژەیان پێدەکرێ و، لە بەشەکانی داهاتوودا زیاتر دەتوێژرێنەوە، هەندێکیشیان تایبەتن بەم بەشەوەو قسەیان لەبارەوە ناکەینەوە.

شایانی گوتنیشە کە ئەم بەشی یەکەمە وەك ناومان لێناوە: (دەروازە)ی سەرجەم بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبەیە، ئەوبابەت و باسانەی کە تێیدا دەخرێنە ڕوو، دەروازەو بناغەی تێکڕای بابەت و مەسەلەکانی دیکەن.

## یەکەم: شەریعەتی خوای کاربەجێ و دادگەر لایەنگریی (إنحیاز)بەلای کەس دا ناکات لەسەر حیسابی یەکێکی دیکە

لە سۆنگەی ئەوەوە کە شەریعەتی ئیسلام بەرنامەی خوای پەروەردگارە بۆ تێکرای ئینسانەکان، بەنێرو مێ و ڕەش و سپی بە سەرجەم ڕەگەزو نەتەوە و تیرەو ڕەچەڵەکەکانیانەوە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾﴾ (التكوير/٢٧-٢٨).

وە بێگومان خوای پەروەردگاریش خاوەنی هەموو ناوێکی چاك و سیفەتێکی بەرزو پەسەندەو، لەهەرچی کەم و کووڕیی و ناتەواوییە پاك و بێ خەوشە، بەڵێ جا لەو سۆنگەیەوە شتێکی مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوە، کەلە شەریعەتی خوادا هیچ جۆرە داشکاندن و لایەنگریی (انحیاز)یەکی بۆ هیچ کەس و لایەنێك تێدا بێ، چونکە دالەنگاندن و لایەنگریی بەناهەق و لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە ستەم (ظلم)ەو خوای پەروەردگاریش (سبحانه وتعالی) لە (ظلم)و سەرجەم خەسڵەتە نزم و پەستەکانی دیکەش بەرییەو، خاوەنی ئەوپەڕی کاربەجێیی (حکمة)و دادگەریی (عدل)یە.

ئەو ڕاستییەش لە چەندان دەقی قورئانێدا زۆر بەڕوونی و ڕاشکاویی خراوەتە ڕوو، بۆ وێنە:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ (الحجرات:١٣).

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلۡعَبِيدِ ۝٤٦﴾ (فصلت:٤٦).

ئەمە بەگشتی و بەتایبەتیش لە پەیوەندی نێوان ئافرەت و پیاودا، خوای دادگەرو کاربەجێ هەمیشە پیاوو ئافرەتی وەك یەك باسکردوون و پلەو ئیمتیازی نەداوە بەهیچ کامیان بەسەر ئەوی دیکەدا، مەگەر پلەیەك کە ئیش و ئەرك و بەرپرسیاریّتی داخوازی دەکات، بۆ وێنە: خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿مَنۡ عَمِلَ صَـٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ۝٩٧﴾ (النحل:٩٧).وە فەرموویەتی:

﴿هُنَّ لِبَاسٞ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٞ لَّهُنَّ﴾(البقرة: ١٨٧).

واتە وەك چۆن بەرگ و پۆشاك خاوەنەکەی دادەپۆشێ و لەسەرماو گەرما دەیپارێزێ و جوانی دەکات، ژن و مێردیش هەرکامێکیان بۆ ئەوی دیکە بەهەمان شێوەیە بەبێ جیاوازیی. هەروەها فەرموویەتی:

﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞ﴾(البقرة:٢٢٨).

کەواتە ژنان چ ئەرکێکیان بەرانبەر بەمێردەکانیان لەسەر شانە، بارتەقای ئەوەش مافیان لەسەریان هەیە، ئەو پلەیەش کە پیاوان بەسەر ژنەکانیانەوە هەیانە، پلەو پایەی سەرپەرشتیاریی (درجة القوامة)یە، کەوەك دواتر روونی دەکەینەوە: ئەرك و بەرپرسیاریّتی و بارگرانییە، نەك ئیمتیازو خەڵاتکران و، (تكليف)ە، نەك (تشريف)!

ئنجا بێگومان ئەوە کە ناگونجێ و مەحاڵە شەریعەتی خوای دادگەر داشکاندن و لایەنگریی (پیاو) یان (ژن)ی تێدابێت، لەلای ئەهلی ئیمان شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە و راستەوخۆ پەیوەستە بە ئیمان و عەقیدەوە، کەسانێکیش کە خوانەناسن ولە هەمبانەی ئەو رێچکەو بیردۆزانەدا گوێز دەژمێرن، کە زادەو

هەڵقوڵاوی بیرو هۆشی ئینسانەکان و ئارەزوەکانیانن و بەلادا شکاندن و لایەنگریی زەقی: (رەگەزیی[١] نەتەوەیی[٢] و چینایەتی[٣] و جینسیی[٤] و ...هتد.) ەکانیان پێوە دیارەو، دێنن قیاسی شەریعەتی خوا لەسەر ئەو رێچکەو بیردۆزانە دەکەن، و لەسەربناغەی لەرزۆکی هەندێك تۆمەتی سەیرو سەمەرە، شەریعەتی تێرو تەواوی خوای کاربەجێ بەوە تاوانبار دەکەن کە گوایە لایەنگریی پیاوانی کردوە لەسەر حیسابی ئافرەتان!

بەڵێ ئەو جۆرە کەسانەش سەرەتا ئێمە ئامۆژگارییان دەکەین کە جاری بەرلەوەی لەسەر لق و پۆپەکانی شەریعەت (فروع الشريعة) کێشەو مشت و مڕ بکەن ،با بێن لەبارەی ئەسڵ و بناغەی ئیسلام و شەریعەتەوە هەڵوێستی خۆیان یەکلایی بکەنەوە، کە ئایا ئیعتیراف بەوە دەکەن کە ئیسلام بەرنامەی خوایە یان نا ؟! چونکە بەبێ ساغ کردنەوەی ئەو مەسەلەیە ناگەنە هیچ ئاکامێك، پاشان خوا پشتیوان بێ ئێمە لەبەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا یەك بەیەك بەرپەرچی ئەو گومان و تۆمەتانەیان دەدەینەوە، کە دەیانکەنە بیانوو پاساوی تاوانبارکردنی شەریعەت.

(١) وەك نازییەکان و فاشییەکان دەیانگوت و سەرجەم رەگەزپەرستەکان دەڵێن.
(٢) وەك ناسیۆنالیستەکان دەڵێن.
(٣) وەك دوو رێچکەی دژ بەیەکی لایەنگرانی چینی بۆرژواییەکان و پرۆلیتارەکان دەڵێن.
(٤) وەك هەردووك جۆرە جووڵانەوە دژ بەیەکەکانی ژنانی دژ بە پیاوان و پیاوانی دژ بەژنان، دەڵێن.

## دووەم : شـەریعەتی خـوا بـۆ بەختـەوەركردنی ئینسـانەكان هـاتوە، بۆیـە لەگـەڵ فیطـرەت و سروشتیشـیان دا پـڕ بـە پێستە

بەڵێ شەریعەتی خوا كە بۆ ئەوە هاتوە هیدایەتدەری ئینسـانەكان و رێكخـەری ژیان و گوزەرانیان بێت، بە جۆرێك كە لـە یـەك كـات دا هـەم خۆیـان بەختـەوەریی راستەقینەو هەمەلایەنەی جەستەیی و رووحیی و تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵیی لـە دنیاو دوارۆژدا وە دەست بێنن و، هەم بەهۆی چاك بەندایەتیی كردنیانـەوە بـۆ خـوا (تبـارك و تعالى)پاداشـت و رەزامەنـدیی ویـش مسـۆگەر بكـەن، بێگومـان شـەریعەتێكی وا لەگـەڵ سروشـت و خواسـت و ویسـتە رەوایـەكانی مـرۆڤ دا پـڕ بەپێستە، وەك خوای زانا فەرموویـەتی:﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ﴾(الروم: ٣٠)

**خوێنەری بەڕێز!**

سەرنج بدە چـۆن خـوای كاربـەجێ هـەموو ئـەو پێداویسـتییانەی كـە جەسـتەی ئینسان ئاتاجیانە لە ئاوو هـەواو پرۆتینـات و كاربۆهیـدرات و چـەوریی و خـوێ و ڤیتامینەكان و..هتد لە دەوروبەری دا بۆی رەخساندوون، وەك فەرموویەتی:

﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ (فصلت:٩–١٠).

دەجا وەك چۆن حیكمەت و رەحمەتی بێسنووری خوا لە دروستكراوەكانیدا، كە

بە فەرمانی دروستکەرانە(الأمر التكويني) هاتوونەدی، درەوشاونەوە، لە بەرنامەو یاساکانیشی دا کە بەفەرمانی یاسادانەرانە (الأمر التشريعي) نێرراون، بەهەمان شێوە درەوشاونەوە.

بۆیە- وەك لە پێشەکی ئەم کتێبەشدا خستمانە روو- هەرکەسێك لەسەر بناغەیەکی زانستیانەو بەچاوی عەقڵ و ویژدان سەرنجی ئەو یاساو ڕێڕوونییانە بدات، کە خوای دادگەر و بەخشەر لە بواری پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد دا ناردوونی، بێ سێ و دوو دانی پێدا دێنێ کە ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویانە، هەر ئەوە ڕاستەو، لەسەدا سەد بەرژەوەندیی ژن و مێردو خێزان و کۆمەڵگاش هەر لەوەدایەو، پێچەوانەی ئەوە کە شەریعەت دیاری کردوە، زیانی هەموو لایەکی تێدایە بەگشتی و بەتایبەتیش ئافرەت و خێزان، وەك مێژوو و ئەزموونی مرۆڤایەتی ئیسپاتی کردوەو، لە باسەکانی داهاتوودا تیشکی دەخەینە سەر.

بە چاکیشی دەزانم کە کۆتایی ئەم کورتە باسە بە چەند قسەکی یەکێك لەزاناو پسپۆڕانی شەریعەت بێنم، کە لەبارەی پەیوەست بوونی بەرژەوەندیی و خێرو خۆشیی دنیاو دوارۆژی ئینسانەکان بە شەریعەتەوە، کردوونی:

((فإن الشريعة مبناها وأساسها على الحِكَم ومصالح العباد في المعاش والمعاد، وهي عدل كلها، ورحمة كلها، ومصالح كلها، وحكمة كلها، فكل مسألة خرجت من العدل الى الجور وعن الرحمة الى ضدها، وعن المصلحة الى المفسدة، وعن الحكمة الى العبث ،فليست من الشريعة، وإن أدخلت فيها بالتأويل، فالشريعة عدل الله بين عباده، ورحمته بين خلقه، وظله في أرضه، وحكمته الدالة عليه، وعلى صدق رسوله (ﷺ) أتم دلالة وأصدقها، وهي نوره الذي به أبصر المبصرون، وهداه الذي به اهتدى المهتدون، وشفاءُه التام الذي به دواء كل عليل، وطريقه المستقيم الذي من استقام

عليه فقد استقام على سواء السبيل، فهي قرة العيون وحياة القلوب ولذة الأرواح، فهي بها الحياة والغذاء والدواء والنور والشفاء والعصمة، وكل خيرٍ في الوجود فإنما هو مستفاد منها وحاصل بها، وكل نقصٍ في الوجود فَسَبَبُهُ من إضاعتها..))(١).

واتە: بێگومان ریشەو بناغەی شەریعەت لەسەر حیکمەت دامەزراوەو بەرژەوەندییەکانی دنیاو دوارۆژی خەڵکی دابین دەکات، شەریعەت سەرلەبەری دادگەریی و رەحمەت و خێرو قازانج و حیکمەتە، جا هەر مەسەلەیەك لە دادەوە بۆ ستەم و، لە رەحمەتەوە بۆ پێچەوانەکەی و، لە بەرژەوەندییەوە بۆ زیان و، لە لێزانییەوە بۆ ناشێیی بچێ، ئەوە هەرچەندە بە پینەوپەرۆش بخزێنرێتە نێوی پەیوەندیی بە شەریعەتەوە نییە، چونکە شەریعەت دادگەریی خوایە لە نێو بەندەکانیداو بەزەیی خوایە لە نێو دروستکراوانیدا ، وە سێبەری خوایە لە سەرزەمین و، ئەو زانستو حیکمەتەیە کەبەتەواوترینو راست ترین شێوە دەلالەت لەسەر پەروەردگاریێتی خواو راستیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات.

وە شەریعەت ئەو رووناکییەیە کە بینایان پێی دەبینن‌و، ئەو رێنماییەیە کەرێپیشاندراوان رێی پێدەردەکەن‌و، ئەو چارەسەرەیە کە بەتەواویی دەرمانی هەر دەردێکەو، ئەو راستە شەقامەیە کەهەرکەسێك لەسەری راوەستاوبێ، بەرێی راست دا دەگاتە مەنزڵ.

بۆیە شەریعەت رووناکی چاوان‌و ژیانی دڵان‌و لەززەتی رووحانە، ژیان‌و خۆراك‌و دەرمان‌و رووناکی‌و چارەسەرو پارێزران هەر بەوییە، بێگومان هەر خێرو خۆشی یەك لەژیان دا هەبێ لەوەوە وەرگیراوەو، بەهۆی وییەوە پەیدا کراوە، بەپێچەوانەشەوە هەر کەم‌وکوورییەك لەدنیادا بەهۆی بەزایەدانی وی‌و کەمتەرخەمیی تێداکردنی وییەوەیە..

(١) بڕوانە (إعلام الموقعين عن رب العالمين) إبن قيم الجوزية، ج٣ص٥.

## سێیەم: مێینە بوونی ئافرەت‌و نێرینە بوونی پیاو ،دوو راستیی حاشا هەڵنەگرن، بەڵام بەڵگەو نیشانەی بەرزیی و نزمیی نین

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

ئەوە کە ئافرەت مێینە (أنثى) یەو پیاویش نێرینە (ذکر)یە دوو شتی واقیعی‌و بەرهەست‌و بەڵگەنەویستن، بەڵام بەداخەوە لەم رۆژگارەمان دا درۆو دەلەسەو چەواشەکاریی‌و لەشەریعەت دەرچوون‌و لەفیترەت هەڵگەڕانەوە ،بەجۆرێك پەرەی ستاندوە، کە گەلێك جار بەڵگە نەویستەکان (البدیهیات)یش نکوولیی‌و لام‌و جیمیی یان لەبەرانبەردا دەکرێ!!

ئەگەرنا ئەوە کە پیاو نێرەو ئافرەت مێیە، حەقیقەتێکە وەك رۆژی روون‌و رەنگ‌و دەنگ‌و دیمەن‌و دەروون‌و دەورو پەرێزو بەرهەمی هەردووکیان ئاشکراو دیارە، بەڵام ئەوانەی کەماف‌و کەرامەتی ئافرەت تەنها لەوەدا دەبینن کەلەحەقیقەتی مێینەتی(أنوثة) خۆی هەڵگەڕێتەوە، بۆئەوەی لەگەڵ پیاودا یەکسان بێت، بۆئەوەی یەکسانیی ژن‌وپیاو بسەلمێنن، خۆیان ناچار بینیوە کەخۆیان لەو حەقیقەتە روون‌و بێچەندو چوونانە گێل بکەن‌و نکوولیان لێبکەن، بێخەبەر لەوە کەڕاستییەکان بەخۆلێگێل کردن‌و سەرەخەریی لەبەرانبەردا کردن، ناگۆڕێن‌و بەری خۆر بەبێژنگ ناگیرێ!

بەڵام ئایا راستە ئافرەت بۆ وەدەست هێنانی کەسایەتیی‌و رێزو حورمەت یەکی لەسەر ئەوە کەوتوە، کەحەتمەن دەبێ لەهەموو شتێك دا لەگەڵ پیاودا یەکسان بێت؟!

**لەوەڵام دا دەڵێین:**

لەکاتێك دا کەرامەتو ڕێزو حورمەتی ئافرەت یەکی لەسەر یەکسان بوونی لەگەڵ پیاودا کەوتوە، کە نێرایەتی(ذکورة) پایەو ئیمتیاز بێتو، مێیایەتی(أنوثة)یش نزمیی و خواریی(رذیلة) بێت!

جا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە ئەوانەی شەریعەتی خوا بەوە تۆمەتبار دەکەن کەلایەنگریی نێرینەی کردوە لەسەر حیسابی مێینە، خۆیان بەزمانی حاڵو کردار پێشانی دەدەن کەنێر(ذكر) بوونیان پێ (فضیلة)وە مێ(أنثی) بوونیان پێ (رذیلة)یە! چونکە ئەدی ئەگەر وانیە، بۆچی وەك بابای بەڕووباردا چوو، دەست بۆ چڵە پووشانیش دەبەن، تاکو ئیسپاتی بکەن کەنێرومێ یەکسانن‌و، ئافرەت هیچی لەپیاو کەم نیە؟!!

جا ئەگەر هاتباو ئەو سەرلێشێواوانە گوێیان بۆ شەریعەت گرتبایە، بۆیان دەردەکەوت کە:

١- نێرینە بوون‌و مێینە بوون لەخودی خۆیان دا، نەچاکیی دەگەیەنن‌و نەخراپیی، بەڵكو لەو ڕووە یەکسانن، چونکە هەردووکیان هێندەی یەك پێویستن بۆ درێژەپێدانی وەچەی ئینسان لەسەر زەوی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ (الحجرات:١٣).

٢- بەڵام سەنگی مەحەکی چاکیی‌و خراپیی‌و گەورەیی‌و بچووکیی، بریتیە لەپارێزکاریی (تقوی) واتە پابەندیی چاکتر بە بەرنامەی خواوە: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾، کەبێگومان ئەو تەرازوو و سەنگی مەحەکەش ئەوپەڕی دادگەریی تێدایە، چونکە نێرو مێ تێیدا یەکسانن، و

هەرکامێکیان دەتوانێ تەقوای زیاتر بکاتە پیشە، بەپێچەوانەی نێرایەتییو مێیایەتییەوە، کە نەختەتاو ئازایەتیی لەهەبوونو نەبوونیان دا هەیەو، نەهیچ کەسیش دەتوانێ جینسو رەگەزی خۆی بگۆڕێ!

٣- لەهیچ دەقێکی قورئانو سوننەتیش دا خودی نێربوونو مێ بوون ،نەکراونە مایەی بەرزییو نزمییو، هەندێك دەقیش کەبەڕواڵەت ئەگەری واتاو چەمکێکی وا هەڵدەگرن، پاش لێوردبوونەوەو سەرنجی قووڵ دەردەکەوێ، کە ئەو ئەگەر(إحتمال)انە هەڵەو بێ بناغەن، وەك لەباسەکانی داهاتوودا روونی دەکەینەوە، خوا پشتیوان بێت.

جا هەرچەندە وەك پێشتر گوتمان لەیەك جیاواز بوونی ئافرەت و پیاو، شتێکی زۆر ئاشکراو روونەو ،پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە ناکات، بەڵام بۆ زیاتر بێقسەکردنی هەندێك کەس باچەند قسەیەك لەوبارەوە لەزانای ناودارو خاوەنی یاداشتی (نۆبڵ)ی ساڵی (١٩١٢) (ئەلکسیس کاریل)ەوە نەقلّ بکەین، دیارە ئێمە لەتەرجەمە عارەبییەکەیەوە لێی نەقڵ دەکەین، بەڵام بەمەبەستی کورت کردنەوە یەکسەر وەری دەگێڕینە سەر کوردی:

(ئەلکسیس کاریل) لەبارەی جیاوازیی قووڵو ریشەیی نێوان پیاوو ئافرەتەوە دەڵێ: ((رژێن(غُدّة)ە جینسییەکان بێجگە لەپاڵپێوەنانی ئینسان بۆ ئەنجام دانی کاری جینسیی، کە دەبێتە مایەی مانەوەی وەچەی مرۆڤ، چەند ئەرکێکی دیکەشیان هەن: هێزی چالاکییە جەستەییو عەقڵیو رووحییەکان زیاد دەکەن، هیچ کاتێك بابایەکی خەسێنراو نەبۆتە فەیلەسووفێکی گەورە یان زانایەکی پایە بەرز، یان تەنانەت تاوانبارێکی بێبڕەزاش! چونکە گونەکان-ی پیاو- و هێلکەدانەکان(مبایض)-ی ئافرەت- چەندان ئەرکی زۆر گرنگیان هەن.. ئەوانن (واتە گونی پیاوو هێلکەدانی ژن) کە خانە نێرینەییو مێینەییەکان بەرهەم دێنن،

لەهەمان كاتیش دا چەند ماددەیەكی دیاری كراو دەڕژێننە نێو خوێنەوە، كەسەرجەم خانەو شانەو ئەندامو پێكهێنەرەكانی جەستەمان، وەك مۆركردن بەتایبەتمەندییەكانی نێرینەیی و مێینەیی پابەند دەكەن)).

پاشان دەڵێ:

((بێگومان جیاوازییەكانی نێوان پیاوو ئافرەت لەشێوەی تایبەتی ئەندامەكانی زاوزێ، یان مندالّدانودوو گیانیی،یان شێوازی پەروەردەو فێركردن، پەیدا نەبوو ون، بەڵكو ئەو جیاوازییانە خوارِسكی[1] یەكەیان زۆر لەوە گرنگترە.. چونكە جیاوازییەكە لەخودی خانەو شانەكانەوە هەڵقولاوەو، لەو ماددە كیمیاییە دیاری كراوانەوە هاتوە، كە هەر كام لەگون[2](خصية) و هێلكەدان(مبيض) دەیان ڕژێننە نێو جەستەوە.

جا لەئەنجامی ئەوەدا كەئەوانەی بەرگرییان لەمێینەیی(أنوثة) كردوە ،لەو راستییە جەوهەرییانە بێئاگابوو ون، پێیان وا بووە كەدەبێ هەردووك ڕەگەزەكە (نێرو مێ) یەك جۆرە خوێندن بخوێنن، وە پێویستە یەك جۆرە هێزو وزەیان پێ بدرێ و، بەرپرسیارێتی وەك یەكیان پێ بسپێررێ!!

بەڵام لەراستیی دا ئافرەت زۆر لەپیاو جیاوازەو، هەر خانەیەك لەخانەكانی جەستەی مۆركی ڕەگەزەكەی (كە مێینەییە) پێوەیە.. هەروەها تێكرای ئەندامەكانیشی هەروان، لەسەرووشیانەوە كۆئەندامی مێشكی)).

---

(١) ئەو وشەی (طبيعية) ی بەكارهێناوە، بەڵام من كردمە (خوارِسك) نەك (خۆرِسك) كە لەكوردی دا لەبەرانبەر (طبيعي) دانراوە، چونكە (طبيعة) (فعيلة) ی بەمانا (مفعولة) یە، جا ئەو (مطبوعة) یە دەبێ (طابع) ێك تەبعی كردبێ، كەخوای بێ وێنەیە!

(٢) ئەو وشەی (گون) ی نەهێناوە، بەڵام سیاق پێویستی دەكات كەببێ.

پاشان دەڵێ:

((دەبێ بزانین کەیاسا کارئەندامییەکان(القوانين الفسيولوجية)یش وەك یاسا گەردوونییەکان کارشکێنییان لەگەڵ ناکرێو، ناگونجێ ئارەزووە ئینسانییەکان جێگایان بگرنەوە!

بۆیە ئێمە ناچارین کەوەك خۆیان هەن ئاوا قبووڵیان بکەین.. جالەسەر ئافرەتان پێویستە کە کەسایەتیی خۆیان بەگوێرەی سروشتی خۆیان گەشە پێبدەنو، هەوڵ نەدەن لاسایی نێرینەکان بکەنەوە، چونکە بەتەئکید رۆڵی ئەوان لەپێشخستنی ژیار (حضارة)دا، لەهی پیاوان بەرزترە، بۆیە نابێ دەستبەرداری ئەرکە سروشتییە دیاری کراوەکانی خۆیان بن)).

پاشان لەکۆتایی دا دەڵێ:

((بێگومان گرنگیی ئەرکی دووگیانیی و منداڵ بوون بۆ دایك، هەتا ئێستا وەك پێویست نەزانراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەو ئەرکە پێویستە بۆ کامڵ بوونی گەشەکردنی ئافرەت.

بۆیە زۆر کەودەنییە کەوا لەئافرەت بکەین نکووڵیی لەدایکایەتیی(الأمومة) بکات.

لەبەرئەوە پێویستە کچان هەمان فێرکردنو راهێنانو هیواو ئاوات لەدڵ دا واندنی عەقڵییو ماددیی کەبۆ کوڕان تەرخان کراوە، بۆ ئەوان (واتە کچان) دانەنرێ.. بەڵکو پێویستە پەروەردەکەران گرنگییەکی زۆر بەتایبەتمەندییە عەقڵییو ئەندامییەکانی نێرو مێ بدەن، هەروەها گرنگی بەئەرکە سروشتییەکانیان بدەن، چونکە لەنێوان دوو رەگەزەکەدا چەندان جیاوازیی وا هەن کەهەڵناوەشێنرێنەوە، بۆیە هیچ چارمان نیەو دەبێ لەبنیاتنانی جیهانێکی

شارستانیدا حیسابی ئەو جیاوازییانە بکەین‌و لەبەرچاویان بگرین)![1]

بەڵێ ئەمە ئامۆژگاریی‌و ڕێڕوونی ئەو زانا پسپۆڕە بووە، کە کاتی خۆی لەبەرانبەر لێکۆڵینەوە گرنگەکانی لەبواری پزیشکی گەریی(الطب)دا پاداشتی نۆبڵی پێدراوە، بەڵام بەداخەوە ڕۆژئاواییەکان نە بەقسەی ئەم‌و نە بەقسەی چەندان زاناو دانای دیکەی خۆیانیان نەکردو، هەر سوور بوون لەسەر دژایەتی کردنی فیترەت‌و لێهەڵگەڕانەوەی، هەتا ڕۆژیان بەم ڕۆژە گەیشت، کە لەسۆنگەی دوورخستنەوەی ئافرەت لەئەرکە سروشتییە بەرزەکانی خۆی‌و، پاشان لەیەك هەڵوەشانەوەی خێزانەوە، ئێستا گیرۆدەی گەندەڵیی‌و پۆخەڵیی‌و پووچەڵییەکی وا بوون، کە هەموو ئینسانێکی جوامێرو ویژدان‌و عەقڵ زیندوو، بێزی لێیان دەبێتەوەو، خۆیشیان هاوارو ناڵەیان لێبەرز بۆتەوەو نازانن چی بکەن!!

---

(١) بڕوانە: (الانسان ذلك المجهول - ئینسان ئەو نەناسراوەیە-) ص ٧٧ تا ٨٠، وەرگێڕانی (عادل شفیق) .

## چوارەم: واقیعی ڕابردوو و ئێستای مرۆڤایەتی بەڵگەو پشتگیری شەریعەتە لەو تێڕوانینەیدا کە بۆ ئافرەت هەیەتی

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! ئەوە کەشەریعەتی خوای کاربەجێ، ئەرکی سەرەکی ئافرەتی بەدایکایەتیی (أمومة) و کابانێتیی و بەخێوکردنو پەروەردەکردنی منداڵ، داناوە، هەم مێژووی کۆنو تازەی مرۆڤایەتیو، هەم واقیعی ئێستای کۆمەڵگاکانیش، شایەدو بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی و بەجێیی.

چونکە تۆ بێنە سەرنج بدە! نەك هەر لەنێو کۆمەڵگاکانی مسوڵمانان دا بەتایبەتیو دینداردا بەگشتی، بەڵکو لەنێو تێکڕای کۆمەڵگاکانی بەشەردا بەهەموو جۆرە بیروباوەڕەکانیانەوە، تەنانەت ئەوانەشیان کە بەهەموو توانایانەوە دەهۆڵی بانگەشەی یەکسانیی و وەك یەك بوونی (ژنو پیاو) دەکوتنو، لەمێژیشە ئافرەتیان لەماڵەکەی وەدەرناوەو، وازیان پێ لەئەرکی سروشتیی و فیکریی خۆی هێناوە، ئایا چەند ئافرەتی فەیلەسووفو سەرۆكو پادشاو فەرماندەو مێژوونووسو دۆزەرەوە(مكتشف) لەبەرانبەر پیاوان دا دەبینی؟! بێگومان لەهەندێك بواردا هیچو لەهەندێکیشیان دا زۆر دەگمەن، کەهەر ناگونجێ لەگەڵ پیاوان دا بخرێنە تەرازووەوە! تەنانەت لەوڵاتێکی وەك ئەمەریکاش دا کەئێستا بەحیساب مەشخەڵ هەڵگری مافی مرۆڤو دیموکراسیی و یەکسانی ژنو پیاوو .. هتد، نەك هەر لەمێژووی ئەمەریکادا، هیچ ژنێك نەبۆتە سەرۆك(رئيس)، بگرە هیچ ئافرەتێك بۆ ئەو پۆستە هەر کاندید(ترشيح)یش نەکراوە!

جا بێگومان ئەم دیاردەیە ئەگەر تەنها لەجیهانی ئیسلامییو لەنێو کۆمەڵگا مسوڵمان نشینەکان دا بووایە، دەکرا بەوە پاساو بدرێتەوەو تەفسیر بکرێ، کەئەوە فیتی ئاراستەو پەروەردەی ئاینییە، کەئافرەتان لەو بوارانەدا لەپیاوان بەجێماون! بەڵام لەحاڵێك دا کەخۆمان لەبەردەم حاڵەتێکی ئاوا گشتگیردا دەبینینەوە، ناچارینو عەقڵو مەنتیق ئەمرمان پێدەکەن کەئەوجۆرە تەفسیرو پاساودانە وەلا بنێینو، بەهەموو ڕاشکاوییەکەوە دانی پێدا بێنین کەهۆکاری پەیدا بوونی ئەو دیاردەو حاڵەتە مرۆییو جیهانییە، هەر دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی نێوان پێکهاتەی خودی سروشتو کەسایەتیی ژنو پیاو، کەخوای کاربەجێ سروشتو کەسایەتیی هەرکام لەژنو پیاوی بەجۆرێك هەڵخستوەو، لەهەرکامێکیان دا جۆرە تواناو ئامادەیی گەلێکی (إستعدادات) وای داناوە، کە ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەرشانی بتوانێ جێبەجێی بکات.

هەرچی پیاوانن زیاتر تواناو ئامادەیی کارو چالاکی ماددییو دەرەکییان پێبەخشراوە، لەعەقڵو ئازایەتی و جەستەی بەهێز، وەهەرچی ژنانن زیاتر تواناو ئامادەیی کار و چالاکی مەعنەوییو نێوماڵیان پێبەخشراوە، لەسۆزو بەزەییو پەرۆشو دەنگو جەستەی نەرم وناسك، هەڵبەتە کارو ئەرکی هەرکام لەپیاوو ئافرەتیش پێویستی بەو تواناو ئامادەییو خەسڵەتو تایبەتمەندییانە هەیە کەپێی دراون .کار و چالاکی دەرەوەی ماڵ، کەبریتیە لەروو بەڕووبوونەوە لەگەڵ سەرماو گەرماو ماندوێتیو کێشەو گرفتەکانی مەیدانی کارو کاسپیو ڕۆزی وەدەست هێنانو، مەیدانی سیاسەتو حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو، مەیدانی جەنگو ئاشووبو ئاشتیی.. بەڵێ ئەو ئەرکو چالاکییانە زیاتر پەکیان لەسەر ئەو تواناو وزەو ئامادەییو تایبەتمەندییانە کەوتوە کەبەپیاوان دراون، هەربۆیەش بەدرێژایی مێژوو و ئێستاش پیاوان ئەو بوارانەیان قەرەباڵغ کردوە لەهەموو

کۆمەڵگاکانی بەشەردا، بەڵام کارو چالاکیی و ئەرکی نێو ماڵ، کەبریتییە لە دایکایەتیی و بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ و کابانێتی کردن و هەڵسووڕاندنی کاروباری ماڵ.. بەڵێ ئەم ئەرك و چالاکییانە پێویستییان بەو توانا و ئامادەیی و تایبەتمەندییانە هەیە کە بەئافرەت دراون، هەربۆیەش بەدرێژایی مێژوو و ئێستاش مەگەر بەدەگمەن، دەنا هەر ئافرەتان کابان و ماڵداریکەر و بەخێوکەر و پەروەردەکەر بوون!

بەڵام لێرەدا نابێ لەچەند راستییەك بێئاگا بین:

**یەك:** خوای کاربەجێ و دادگەر و شەریعەتە بێ هەڵە و پەڵەکەیشی، لەهیچ دەقێك دا هەر ئاماژەشیان بەوە نەکردوە، کەژن و پیاو لەسۆنگەی ئەو جیاوازییەی کە لەخەسڵەت و تایبەتمەندییەکانیان دا هەیە و پاشان لەئەرك و چالاکییەکانیاندا هەیە، هیچ کامیان ئیمتیاز و پلەی بەسەر ئەوی دیکەیان دا هەیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ،خوای بەرز و مەزن بەراشکاویی فەرموویەتی کەهەرکام لەژن و پیاو پلە و پایە و ئیمتیازیان بەسەر یەکدی دا هەیە بەهۆی تایبەتمەندییە خوارسکەکانیانەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾ النساء-٣٤-، واتە: لەسۆنگەی[1] ئەوەوە کە خوا هەندێکیانی -لەژنان و پیاوان- بەسەر هەندێکیان دا هەڵبژاردوە ، واتە: هەرکام لەپیاوان و ژنان پلە و ئیمتیازیان بەسەر یەکدی دا هەیە، یانی هەم پیاوان لەهەندێك لایەن و تایبەتمەندیی یان دا بەسەر ئافرەتانیانەوە هەیەو، هەم ژنانیش لەهەندێك خەسڵەت و تایبەتمەندییان دا، پلەیان بەسەر پیاوانەوە هەیە! جا مادام وابێ دەبێ بڵێین:

نە ئەو ئەرك و چالاکییانەی پەیوەندییان بەتایبەتمەندییەکانی پیاوەتی

---

(١) رستەی پێشەوەی کەبریتیە لە (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ) ،باسی سەرپەرشتیاریی پیاوان دەکات بۆ خێزانەکانیان، لەباسەکانی داهاتوودا دەیتوێژینەوە.

(رجولة)یەوە هەیە ،بەژنان ئەنجام دەدرێن و، نە ئەو ئەرك و چالاكییانەش كە پەیوەستن بەتایبەتمەندییەكانی مێینەتی(أنوثة)یەوە، بەپیاوان جێبەجێ دەكرێن.

دوو: خوای كاربەجێ هەبوونی ئافرەتانی بەهەموو تایبەتمەندییەكانی مێینەتی(خصائص الأنوثة)یەوەو، هەبوونی پیاوانی بەهەموو تایبەتمەندییەكانی پیاوەتییەوە، بەپێویست زانیوە، بۆیە هەردووكیانی بەوجۆرەی كە هەن، دروست كردوون، بۆیە نەپیاوەتی پایەبەرزیی(فضیلة)یە بۆ پیاوانو، نەمێینەتیو ژنایەتییش پلە نزمیی(رذیلة)یە بۆ ئافرەتان، بەڵكو وەك پێشتریش گوتمان، پایە بەرزییو پایە نزمیی بەرهەمی پارێزكارییو خراپەكارین، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾ (الشمس: ٧-١٠).

دیارە هەربۆیەشە كەشەریعەتی خوا لەسەر هەركام لەپیاوانو ژنانی قەدەغە كردوە، كە لاسایی یەكدی بكەنەوەو خۆیان بەیەكدی بشوبهێنن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**لَيْسَ مِنَّا مَنْ تَشَبَّهَ بِالرِّجَالِ من النِّسَاءِ، وَلا مَنْ تَشَبَّهَ بِالنِّسَاءِ من الرِّجَالِ**)) رواه أبوداود بسند صحيح.

هەروەها لە (صحيح البخاري)دا هاتوە: ((**لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُتَشَبِّهِينَ من الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ من النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ**))رواه البخاري: ٥٨٨٥، واتە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی لەو پیاوانە كردوە كەلاسایی ئافرەتان دەكەنەوەو، لەو ئافرەتانەش كەلاسایی پیاوان دەكەنەوە.))

بەڵێ لەڕوانگەی شەریعەتەوە مێینەیی ئافرەتان كەموكوڕیی نیە، تاكو بە بانگەشەی یەكسانیی لەگەڵ پیاوان، یان بەلاسایی كردنەوەیان، ئەو كەموكوڕییە لابەرن و چارەی بكەن! بەڵكو كامڵ بوونی كەسایەتی ئافرەت(كمال شخصية المرأة) لەوەدایە كە بەبێ هەست بەنوقسانیی كردن بەهۆی ژنایەتییو دایكایەتییو

ماڵداریی‌و کابانەتییەوە، کەسایەتی خۆی کامڵ‌و تێرو تەواو بکات، نەك بەپاڵنەری خۆبەکەمزانین‌و خۆ بەناتەواو زانین بەهۆی مێینەتییەوە، بێهوودە خەریکی خۆیەکسان کردن لەگەڵ پیاو، یان سەرگەرمی لاسایی کردنەوەیان‌و دوورکەوتنەوە لەکەسایەتی فیطریی‌و سروشتیی خۆی بێتو، سەرەنجام گیرۆدەی کەسایەتی پلیشانەوە(ذوبان الشخصية) ببێتو (بوون بەپیاو)ی چنگ نەکەوێ‌و، (ئافرەتایەتی)یشی لەدەست بچێ‌و، ببێتە رەگەزێکی سێیەم[1](الجنس الثالث)، واتە: نە ژن‌و نەپیاوو مەخلووقێکی ناتەواو! (علي بن أبي طالب)یش خوا لێی رازی بێ جوانی گوتوە: (قيمة المرءِ مايحسِنُهُ) واتە: نرخی ئینسان لەشتێك دایە کەباش دەیزانێ‌و بۆی دەکرێ))!

سێ: وەك گوتراوە ریزپەڕ بنچینەی پێهەڵناوەشێتەوە(الشاذُ لاينقض القاعدة)، بۆیە هەبوونی چەند ئافرەتێکی مەیلەو پیاوانە لەهەندێك تایبەتمەندیی دا وەك: هێزی جەستە، ئازایەتی، بیرتیژیی.. وە هەبوونی هەندێك پیاوی نیزیك لەسروشتی ژنانەوە، وەك: زۆر عاتیفیی بوون، دەنگ‌و جەستە ناسکیی، نەك هەر نابێتە بەڵگە لەسەر هەڵەیی ئەو بنچینەیەی کە لەبارەی کەسایەتیی‌و سروشتی پیاوو ئافرەتەوە خستمانەڕوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە راستیی ئەو بنچینەیە زیاتر ئیسپات دەکات، بە بەڵگەی ئەوە کە خەڵکی بەوجۆرە ژنانە دەڵێن: فلانە ئافرەتە نێرانە هەڵکەوتوە، وە بەو جۆرە پیاوانەش دەڵێن: فلانە پیاوە سەرژنانەیە.

چوار: ئەوە کەپیاوان بەپێی هەڵکەوت‌و سروشتی نەفسیی‌و جەستەییان، ئەرك‌و

---

(١) ئێستا لەزۆرێك لەوڵاتانی پیشەسازیی‌و بەتایبەت لەئەورووپادا، ژمارەیەکی زۆر لەوجۆرە ئافرەتانە پەیدا بوو ون، کە بەرواڵەت ئافرەتن، بەڵام لەئەنجامی ئەرکوکاری قورسی کارخانەکان‌و شوێنەکانی دیکەدا گەلێك تایبەتمەندییەکانی ئافرەتایەتییان لەدەست داوە، بەتایبەت منداڵ بوون!!

کاریان زیاتر دەرەکییەو، هی ئافرەتانیش زیاتر لەجوغزی ماڵو خێزان دایە، ئەوە ناگەیەنێ، کە ئافرەت دەرەوەی ماڵو خێزانی لێقەدەغە کرابێت، یان پیاو بۆی نەبێ کە لەماڵێ هەندێك كاروچالاكی وەك هاوکاریی ماڵو خێزانی ئەنجام بدات!

بەڵكو تەنها ئەوەندەیە کە مەیدانی سەرەکییو سروشتیی کار و چالاكیو جموجۆڵی ئافرەت ماڵەوەیەو، هی پیاویش دەرەوەی ماڵە، وە وەك لەباسەکانی داهاتوودا دەیخەینەڕوو، شەریعەتی ئیسلام خاتری ئافرەتی گرتوەو چاودێریی کردوە، کە هەندێك كاروچالاكی کە لەسەر ئافرەتان فەرز نەکردوە، بۆ وێنە: جەنگو جیهادو، بژێو پەیداکردنو، جومعەکردنو.. هتد.، بەڵام هیچ کام لەو کارو چالاكییانەی لێقەدەغە نەکردوون، ئەگەر خۆی رەغبەتی بوو و بۆی لوا کەئەنجامیان بدات، ئاشکراشە کە لەنێوان: لێقەدەغەکردنو لەسەر فەرزنەکردن دا، جیاوازیی زۆر هەیە.

**پێنجەم: شەریعەت کار لەسەر پێکەوە پەیوەست کردنی ژن و پیاو دەکات، لەسەر بناغەی دادگەریی و رەچاوکردنی پێکهاتەی سروشتییان، نەك بەگژ یەکیان دا بکات و پێکەوەیان بەشەڕ بدات، وەك بیردۆزەو فەلسەفەکانی رۆژئاوایی دەیکەن**

فەلسەفەو بیردۆزەکانی رۆژئاوا کەبەگشتی درێژەپێدەری کەلەپوورو فیکرو فەرهەنگی میراتی ئیغریقیی و رۆمانیی و یۆنانیین، بیرۆکەی پێکەوە دژ بوون(تَضادّ) و ناکۆك بوونیان لەنێو هەناوی خۆیان دا هەڵگرتوە، جا ئەو دژایەتیی و ناکۆکییە نێوخۆییە، چ لەنێوان ئینسانو سروشت دا، وە چ لەنێوان دەوڵەمەندو نەداردا، کە کاکڵەی بیردۆزەی مارکسیزم پێك دێنێ، وە چ لەنێوان بەهێزو بێهێزدا، کەبیردۆزەکانی نێتشەی ئەڵمانیی و داروینی ئینگلیزییان لەسەر بنیات نراوە، وە چ لەنێوان نێرو مێدا!

بەڵام لەڕوانگەی ئایینو شەریعەتی خوای کاربەجێو دادگەرەوە، ئەوجۆرە بیرکردنەوەیە هەڵەیەو، خواو ئینسان نەك هەر دژی یەکدی نین، بەڵکو هەر ناگونجێ ئینسانی دروستکراو دژایەتیی و ناکۆکیی لەگەڵ خوای بەدیهێنەری دا هەبێتو، خواش(ﷻ) ئینسانی بۆ بەندایەتی(عبودیة) دروست کردوە: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦ مەبەستیش لەو بەندایەتی کردنەی

ئینسـان، بەختـەوەریی‌و سـەرفرازیی ئینسـانەو قوتاربوونیـەتی لەخزمـەتکاریی‌و نۆکەرایەتی کردن بۆ شـەیتان‌و تاغووتـەکان: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾﴾(يس/٦٠-٦٢).

وە ئینسان‌و سروشتیش نەك هەر دوژمنی یەکدی نین، تاکو ئینسان ناچاربێت بەچاوی ناحەزایەتی بۆ سروشت‌و بوونەوەر بڕوانێ‌و، هەوڵ بدات بەسەریدا زاڵ بێت، وەك ئەوجۆرە تەعبیرانە لەفەرهەنگی رۆژئاوادا هەن، بەڵکو وەك خوای پەروەردگار رایگەیاندوە، کە ئاسمانەکان‌و زەوی بۆ ئینسانەکان رام‌و مەیسەرو دەستەمۆ کراون‌و، هەرچی خێرو بێرو نازو نیعمەتی کەتێیان دایە، دیاریی‌و خەڵاتن‌و لەلایەن خوای بەخشندەو بەبەزەییەوە بۆی فەراهەم هێنراون: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾﴾ (ابراهيم/٣٢-٣٤).

هـەروەها دەوڵەمەنـدو هـەژاریش- مـادام لەسـەر بناغـەی سیسـتەمێکی چەوسێنەرانەوە پەیدا نـەبووبن-، وە دەسـتەڵاتدارو بـێ هێـزیش مـادام حاڵـەتێکی سروشـتییانەیان هـەبێ، لەڕوانگـەی شـەریعەتی خـواوە، نـەك هـەر دژایـەتیی‌و ناکۆکیی‌و دەست لەیەخەی یەکدی نانیـان شـتێکی پێویسـت‌و حـەتمیی نیە، بگرە

لەژێر سایەی حوکمی شەریعەت دا، حاڵەتی فیترییی و ئاساییان هەر ئەوەیە کە هەرکام لەدەوڵەمەندو بەهێز، هێزو دەوڵەمەندییەکەیان- کە چاکەو نیعمەتێکی خواییە پێیان بەخشراوەو، ئەمانەتێکە بەشێوەیەکی کاتیی لایان دانراوە - وێڕای بەهرەو سوود لێوەرگرتنی خۆیان، لەچوارچێوەیەك دا کە شەریعەت دیاریکردوەو، سەرناکێشێ بۆ ستەمو زۆر و چەوساندنەوە، لەخزمەتی خەڵكو کۆمەڵگا بەگشتییو بەتایبەت چینی نەدارو کەمدەست دا بەکاری بێنن!

هەروەها بەهەمان شێوە نێرو مێ، ژنو پیاویش لە ڕوانگەی شەریعەتی خواوە، نەك هەر پێکەوە دژو ناکۆك نین و، پێویست ناکات لەیەك تیژ بکرێن و بۆ شەڕی یەکدی هان بدرێن، بەڵکو نێرو مێ تەواوکەری یەکن و، ژنو پیاو بەبێ یەك نایان کرێو، ژنو مێرد بەرگو پۆشاکی یەکدیین و لەسەر بناغەی یەکدی خۆشویستنو ڕێز لەیەکدی گرتنو بەزەییو پەرۆش جوولان بۆ یەکدی، خێزانو ماڵ پێکەوە دەنێن!

باسەرنجی ئەم دەقانەی قورئانو سوننەت بدەین لەوبارەوە: ١- ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾(الروم: ٢١).

﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾(البقرة: ١٨٧).

((**إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ** [١] **الرِّجَالِ**)) رواه أحمد وابوداود والترمذي وهو صحيح.

---

(١) (شقائق) کۆی (شقیقة)یە کە لە (شقّ)ەوە هاتوەو (شق)یش بەمانای (لەتك) دێت! بەڵێ ژنو پیاو وەك دوو لەتکی سێوێکن!

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

شەریعەتی خوا ژنو پیاو بەدوژمنو ناحەزی یەكدی دانانێ، بەڵكو بەدوو لەتكی سێوێكو دوو شتی بۆیەك ئاتاجو دوو شەریكو هاوبەشی پێكهێنەری خێزانیان دادەنێو، دەیەوێ لەجیاتی پێكەوە بەشەڕدانو بەگژ یەكدا كردنیان، كەهەمیشە بەزیانی تەرەفی بێهێز تەواو دەبێ كەئافرەتە! بەڵێ لەجیاتی ئەوە لەلای یەكدییان خۆشەویست بكاتو، بەگوێرەی ئامادەییەكانیانو پێكهاتەی سروشتییان كاروباری ژیانو گوزەرانو خێزانو كۆمەڵگاشیان لەنێوان دا دابەش بكات، جا هەرچەندە شەریعەتی خوا پیاوو ئافرەت یەكسانو وەك یەك سەیر دەكات، لەڕووی (ئینسان بوون)ی هەردووكیانەوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَا﴾(الأعراف: ١٨٩)

واتە: خوا - ئەو زاتەیە كەلەیەك تاكە نەفس دروستی كردوون. وە هاوسەرەكەیشی هەر لەخۆی گێڕاوە، بۆئەوەی ئولفەتی پێوەبگرێ...

وە لەڕووی (بەندەی خوا بوون)ی هەركامێكیانەوە: ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧﴾(النحل: ٩٧)

واتە: هەركەسێك بڕوادار بێت لەنێر یان مێ، وە كردەوەی باش بكات، ئەوە بەژیانێكی پاكو چاك دەیژیەنین، وە بێگومان بەگوێرەی چاكترینی ئەوەی كەدەیان كرد، پاداشتیان دەدەینەوە.

بەڵێ پیاوو ژن لەڕووی ئینسانییەوەو، لەڕووی بەندایەتییەوە، وەك یەكو یەكسانن لەڕوانگەی شەریعەتەوە، بەڵام شەریعەتی خوای كاربەجێ یەك جۆرە

ئەرك‌و كاری بۆیان دیاری نەكردوە، بەڵكو هەركامێكیان جۆرە ئەرك‌و كارێكی بۆ دانـاوە، كـەپێی بكـرێ‌و لەگـەڵ پێكهاتـەی سروشـتی عـەقڵ‌و رووح‌و دەروون‌و جەسـتەیدا بگونجـێ، بەپێچـەوانەی بیروبۆچـوونی كـرچ‌و كـاڵ‌و سـەركێلانەی ئـەو رێچكەو بیردۆزانـەوە، كـەپێیان وایـە كاتێـك یەكسـانیی‌و وەك یـەك بـوونی پیـاوو ئافرەت دەچەسـپێ، كەحەتمـەن هـەردووكیان یـەك جـۆرە ئـەرك(وظیفـة) جێبـەجێ بكەن، كە بێگومان مەبەستیش لێرەدا هەرئەوەیە كەژن ئەرك‌و كاری پیـاو بكـات، چونكە ئەوە ئاشكرایە كەپیاوان ئەركی ژنانیان پێئەنجام نـادرێ، بەتایبـەت ئـەركی دایكایەتیی(أمومة) و بەخێوكردن(حضانة)ی منداڵ!!

ئیدی سەرەنجام -لەسۆنگەی ئەوجۆرە فەلسەفە پووچ‌و پێچەوانەی شەرع‌و عەقڵ و زانستەوە- هەموو لایەك زەرەر دەكەن:

١- ژن: چونكە:

أ- لەئەرك‌و چالاكی خوارسـك‌و ئاسـایی خـۆی بێبـەش دەكـرێ‌و، هەمیشـە هەست بەتینوێتی ئـەو غـەریزە بێبەشـەی (دایكایـەتیی‌و كابـانێتیی‌و.. هتد)ی دەكات..

ب- لەو بوارانەش دا كەتێیان دا - بۆ یەكسـان بـوون لەگـەڵ پیـاودا بـەپێی فەلسەفەی پووچی رۆژئاوا- لاسایی پیاو دەكاتەوە، ناچـارە پێچـەوانەی سروشتی خۆی بجووڵێتەوە، وەك پیاوی پێناكرێ‌و لێی بەجێ دەمێنێ.

٢-پیاو: كە:

أ- ژن لەمەیدانی سروشتیی ئـەرك‌و چـالاكی خـۆی دا سـەغڵەتی دەكـات و تەنگ پێهەڵچنەر (مُزاحِم)ی دەبێت.

ب- ماڵ‌و حاڵەكەی ساردو سِر دەبێـت‌و، كـەس نابێـت بـەدەوری دا بێـت‌و بچێ‌و خزمەتی بكات‌و بیحەسێنێتەوە.

**٣-منداڵ:** کە بەناچاریی دەبێ ببرێتە دایەنگا(دار الحضانة)، وەسەرنجام:

أ- هەم لەخۆراکی سروشتییو هەرە چاکی خۆی، کەشیری دایکە بێبەش (محروم) بێت.

ب- هەم لەباوەشی گەرمو پڕ سۆزو خۆشەویستی لەدەروونەوە هەڵقوڵاوی دایکیشی.

**٤-کۆمەڵگا:** کەبێگومان هەر پێکهاتەی ئەو جۆرە دایکو باوو منداڵە مەینەتبارو گرفتارو لانە لێتێکچوانەیە، کەباسمان کردنو سەرەنجام پەیدابوونی ژمارەیەکی زۆری نەخۆشییو گرێ وگۆڵی دەروونییو عەقڵییو کۆمەڵایەتیی، کە لەو هەلومەرجە نارێكو ناسروشتییەی خێزانە شیرازە پچراوو لێك هەڵوەشاوەکانیانەوە پەیدا دەبن!!

**کەواتە:**

ئێستا زانیمان بۆچی شەریعەتی خوا، هەمیشە جەختی لەسەرئەوە کردۆتەوە، کەژنو پیاو هەردووکیان هەڵقوڵاوی سەرچاوەیەکن، کەبریتیە لەیەك جۆرە دەروون (نفسٍ واحدة)! بۆئەوەی لەسەر بناغەی وەك یەك بوونو لەیەك چاوگەوە هاتن، هەم:

١- بەچاوی نامۆیی سەیری یەکدی نەکەنو بزانن کەئاشنان!

٢- دان بەبوونو رێزو حورمەتی وەك یەکی یەکدی دا بێننو، هیچ کامیان خۆی پێ لەوی دیکە بەرزترو چاکتر نەبێ!

٣- بەشێوەیەکی تەبایانەو لەسەر بناغەی پێکهاتەو تایبەتمەندییەکانی یەکدی و لەسەر بناغەی خەڵکی لە شوێنەکانی خۆیان دا دادەنێین (تُـنْـزِلُ النـاس منـازِلَـهُمْ ) و نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب، ئەرکو چالاکییەکان لەنێو خۆیان دا دابەش بکەنو (توزیع الادوار) بکەن!

**پاشان دەڵێین:**

ئەگەر یەکسان بوونی پیاوو ئافرەت یەکی لەسەرئەوە کەوتبێ، کەحەتمەن هەردووکیان یەك جۆرە چالاکییان هەبێ، نازانم بۆچی بانگەشەکەرانی یەکسانیی ژنو پیاو - بەچەمكو واتای نەفامێتیی- هەر جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کەدەبێ ژنیش کارو چالاکییەکانی پیاو ئەنجام بداتو، جارێك بیریان لەوە نەکردەوە کەپیاویش خۆی لەقەرەی ئەرکەکانی ئافرەت بدات؟! یان ئەوانە بەزمانی حاڵ بەئافرەتی دەسەلمێنن، کەناتەواو(ناقص)ە و بەوەش ئیسپاتی تەواویی(کمال)ی خۆی دەکات، کە تەقلیدی پیاو بکات؟!

**لەکۆتاییش دا دەڵێین:**

ئەگەر راست بێ بەبێ یەك جۆر کارو چالاکی ئەنجام دان، یەکسانیی(مساواة) نەیەتەدی، دەبوایە ئەندازیاران(مهندسین)یش خۆیان لەئەرکی پزیشکان(أطباء) هەڵقورتێننو بەپێچەوانەشەوە، هەروەها سەرجەم چینو توێژەکانی کۆمەڵگاش بەهەمان شێوە!!

بەڵام شەرع و عەقڵ و زانست دەڵێین:

نەخێر بەڵکو پێویستە هەرکەسە بەپێی پسپۆڕیی و تواناو شارەزاییەك کە هەیەتیو، لەبوارو مەیدانێك دا کەتوانای ئەسپ تاودان و پێشبڕکەی هەیە، ئەسپی خۆی تاو بداتو پێشبڕکە بکات، ئەگەرنا کاری خەڵکیش تێك دەداتو خۆیشی زەرەر دەکات!

## شەشەم : کاتێك وەك پێویست دەرکی حیکمەتی هەڵوێستی شەریعەت لەمەڕ ئافرەت و خێزان دەکرێ، کەوردبینانەو دووربینانە سەرنج بدرێ و، تەماشای سەرجەم شەریعەتیش بکرێ، نەك خودی مەسەلەی ئافرەت و خێزان بەتەنها

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

هۆکارێکی گەورەو گرنگی بەهەڵەداچوونی نەیاران و رەخنەگرانی شەریعەت لەبواری ئافرەت و خێزان دا، ئەوەیە کە لەجیاتی سەرنجدانی دووربینانەو وردبینانە لەو مەسەلە گرنگ و هەستیارەدا، بەکورت بینانەو سەرکێلانە تێی دەفکرن و، زۆر هاکەزایی بەلایدا رادەبورن!

بۆ وێنە:

ئەوجۆرە کەسانە پەیوەندیی قووڵ و ریشەداری نێوان ژن و پیاو، کەمەگەر پەیوەندیی نێوان دایك و رۆڵە، ئەگەرنا لەپەیوەندییەکانی نێوان دروستکراوەکانی خوادا هیچ پەیوەندییەك هێندە قووڵ و بەهێزو هەمەلایەنەو درێژخایەن نیە! بەڵێ ئەو پەیوەندییە سەرسوڕهێنەرەی نێوان ژن و پیاو، بەکوڵك و پێستەوە لەکردەوەی پێکەوە جووت بوون(العملية الجنسية)دا کورت هەڵدێنن!!

کەبێگومان ئەوجۆرە تێڕوانینە (ئاژەڵیی) و بگرە لە (ئاژەڵیی) نزمترەش، وێڕای زۆر سەرکێڵ بوونی، سووکایەتیو (إهانة)کردنێکی گەورەشە بەو پەیوەندییە

خوارِسکەی نێوان ئەو دوو ئینسانە نێرو مێیەو، ئەو دوو کچو کورە ڕێز لێگیراوەی ئادەمی خەلیفەی خوا لەسەرزەوی!﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾ (الاسراء:٧٠).

بەڵام وەك گوتراوە: (هەرکەسە لەهەمبانەی خۆیدا گوێزان[1] دەژمێرێ)، ئەدی وەفاداریی نێوان ژنو مێرد بۆ یەکدی، هەتا ڕاددەی خۆکردنە فیداکار، لەنێو سەرجەم ئەو کۆمەڵگایانەی بەشەردا کەفیترەتیان نەدۆڕاندوە، چۆن تەفسیر دەکرێ، ئەو هەموو بەسەرهاتانەی عیشقو خۆشەویستی نێوان کورو کچ، کەبەخۆشەویستی پاكو ڕووحیی(الحُبُّ العُذْرِيّ) ناسراوەو، لەنێو هەموو گەلو میللەتانی دنیادا چەندان حیکایەتی گەورەو گرنگیان لەسەر دروستکراوە، وەك: (مەمو زینو، خەجو سیامەندو، لاسو خەزاڵ، شیرینو فەرهاد، لەیلاو مەجنوون) چۆن چۆنی بەو پێناسە نزمو سادەیەی کەشایستەی پەیوەندیی زۆرێك لەژیاندارانیش نیە، تەفسیر دەکرێن؟!!

ئەوە لەبارەی سەرکێڵانە بوونی ئەوجۆرە تێڕوانینەوە.

لەبارەی کورت بینانە بوونیشیەوە، دەڵێین:

بەداخەوە ئەوجۆرە کەسانە لەسەر بناغەی تەنها بەماددیی زانینی ژیانو گوزەرانو، بەئاژەڵ دانانی ئینسان، زۆر کورت بینانە تەماشای پەیوەندیی نێوان پیاوو ئافرەتیان کردوەو، هیچ حیسابێکیان بۆ لایەنە ئەخلاقییو کۆمەڵایەتییو دوارۆژییەکانی نەکردوەو، تەنها ئەو تاوە(لحظة) ئێستاییەیان لەبەرچاو گرتوە،

---

(١) گوێزان کۆی (گوێز)ە، نەك (چەقۆ)، گوێزیش دەژمێرێن بۆیە بەپێی یاسای ڕێزمان لەکوردیدا بە (ان) دەکرێتە کۆ، وەك: (هێلکە) هێلکان،خزم،خزمان...

کەئافرەت‌و پیاو وەك جووتێك، نێرو مێیەك، بۆ ئارەزووشکاندنیان، تێیدا پێك دەگەن‌و.. ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ!!

ئاشکراشە کەئەو لایەنەی پەیوەندیی نێوان ژن‌و پیاو، لەچاو لایەنەکانی دیکەی ئەو پەیوەندییەو، ئەو ئەنجامانەی، کەپەیدا دەبن، زیاتر وەك پێشەکی(مقدمة) وایەو، روونیشە کەحیساب کردن بۆ پێشەکی‌و پشت گوێ خستنی ئەنجام(نتیجة)، شتێکی زۆر بێجێ‌و ناماقوڵەو، بەوجۆرە کورت بینییە تەماشاکردنی پەیوەندیی نێوان ژن‌و پیاو، نەك هەر لەئاستی بەرزی ئینساندا نیە، بەڵکو لەئاژەڵ‌و ژیاندارانیش ناوەشێتەوە، چونکە لەجیهانی ژیاندارانیشدا نێرو مێ ئەوەندە بەرانبەر بەیەکدی‌و پێکەوە جووت بوونیان هەست بەبەرپرسیارێتی دەکەن، کە پابەندیی(إلتزام)یان بەرانبەر بەئەنجام‌و بەرهەمی کردارە جیسنییەکەیان هەبێت کەبێچوەکانیان‌و، هەرکام لەنێرومێ خەم‌و مشووری بەخێوکردن‌و راهێنان‌و پەروازەکردنیان دەخۆن!

هۆکارێکی دیکەی گرنگی بەهەڵەداچوونی ئەو جۆرە کەسانەش ئەوەیە، کەلەجیاتی ئەوەی بێن سەرنجی سەرجەم شەریعەت بدەن، بۆئەوەی چاك لەشوێنی شیاو(مَحَل الإعراب)ی ئافرەت‌و خێزان حاڵی بن، هاتوون بەبێ حاڵی بوون‌و سەرنج دان لەلایەن و بوارە جۆراوجۆرەکانی شەریعەت، بەعەقیدەو عیبادەت‌و ئەخلاق‌و حوکم‌و سیاسەت‌و.. هتد، تەنها چاویان لەسەر خودی مەسەلەی ئافرەت‌و خێزان‌و وردە بابەتەکانی چڕ داگرتووەو، ئەو مەسەلەیان وەك ئاڵقەیەکی زنجیرێك لەباقی لایەن‌و مەسەلەکانی شەریعەت پچڕاندوە، پاشان کەسەرنجی ئەو مەسەلە لەسیاق‌و زنجیرەی خۆ دابڕێنراوەیان داوەو، وەك پێویست حیکمەت‌و مانایان تێدا بەدی نەکردوە، لەجیاتی چاو بەهەڵەی خۆدا گێڕانەوە، کەوتوونەتە گلەیی‌و گازندەو پرتەو بۆڵە بەرانبەر بەشەریعەت!

**جائێستا با ڕوونتر بدوێین:**

ئەوەی کە وەك پێویست ماناو حیکمەت بۆ خۆداپۆشینی ئافرەت(تَسَتُّر المرأة) و، پابەندبوونی هەرکام لەپیاوو ژن بەکۆمەڵێك ئەدەبو رەوشتی ئیسلامییەوە، پەیدا دەکات، کەبێگومان هەرکام لەو ئەدەبو رەوشتانە، جۆرێك لەپابەندکردنی ئافرەتو پیاوو، ئازادیی لێگرتنەوەیانی تێدایە، بەڵێ کاتێك ئەو شتانە حیکمەتو مانای تەواوی خۆیان بەدەستەوە دەدەن، کەئینسان لەمیانەی سەرجەم سیستەمی ئیسلامییەوە سەرنجیان بداتو، بزانێ کەئینسان لەڕوانگەی شەریعەتەوە بۆ بەندایەتیکردن بۆ خوا خولقێنراوەو، بەندایەتیی کردنەکەیشی لەپابەندییدا بۆ شەریعەتی خوا دەردەکەوێو، پاداشتی ئەو بەندایەتییەش لەدوارۆژدا دێتەوە ڕێی، وە بزانێ کەژیانی دنیا بۆ ئینسان تاقیگایەو شوێنی تێدا ڕابواردن نیەو، هەر خۆشیو لەززەتێك مایەی تووڕەیی خواو گلەیی پێغەمبەری خواﷺ و لەدەست دانی پاداشتو خێرو خۆشیی نەبڕاوەی دوارۆژ بێت، دەبێ خۆی لێ بپارێزێ، وە بزانێ کەهەرجۆرە لادانێك لەشەریعەتو ملکەچ بوون بۆ هەواو ئارەزووەکان، هەم لەدنیاو هەم لەدوارۆژدا باج(ضریبة)ی زل زلی ڕووحییو جەستەییو دنیاییو قیامەتیی هەن.

**بەکورتی:**

هەرکەسێك دەیەوێ وەك پێویست لەحیکمەتەکانی شەریعەت تێبگات، لەبواری ئافرەتو خێزاندا، با لەجیاتی سەرنج دانی سەرکێلانەو کورت بینانە، وردبینانەو دووربینانە سەرنج بداتە یاساو ئاراستەکانی شەریعەتو، لەجیاتی تەماشاکردنی جوزئییانەی شەریعەت، بەشێوەیەکی گشتیو هەمەلایەنانە لەهەموو شەریعەتەوە ڕابمێنێ، ئەوکاتە لەسەداسەد دڵنیا دەبێ، کەمەسەلەی ئافرەتو خێزان لەشەریعەتدا، پڕ بەپێستەو لەشوێنی شیاوی خۆی دایە.

**دەوترێت: گوتەی: (ئیسلام زوڵمی لەئافرەت كردوەو بەكەم سەیری كردوە) وێڕای هەڵەو درۆبوونی لەخودی خۆیدا، خاوەنەكەیشی لەبازنەی ئیسلام دەباتەدەرێ**

**بەڵێ خوێنەری سەنگین!**

تۆمەتباركردنی شەریعەتی ئیسلام بەوە كەستەمی لەئافرەت كردوەو بەكەمو سووك تەماشای كردووە، دوو بەڵای گەورەو جەرگبڕو ماڵوێرانكەر بەسەر خاوەنەكەی دێنێ:

یەك: ئەو قسەو دەعوایە لەخودی خۆیدا هەڵەو درۆیەو، وەك خوا پشتیوان بێ لەباسەكانی داهاتوودا روونی دەكەینەوە: سەرجەم ئەو شتانەی كەخاوەنانی ئەو دەعواو تۆمەتە وەك بەڵگەو شوبهە دەیان خەنەڕوو وەك: (قوامة) و (نشوز) و (طلاق) و (تعدد الزوجات)و (مهر) و (میراث) و (شهادة) و.. هتد، ئەگەر وەك شەریعەت دایناون سەرنج بدرێن، بەپێچەوانەوە لەجیاتی بەڵگەبوونیان لەسەر راستیی ئەو تۆمەتو دەعوایە، دەبنە بەڵگەی بەهێز لەسەر تێرو تەواویی‌و بێخەوشیی شەریعەتی خوای كاربەجێ.

دوو: قسەو ناماقووڵیی وا -یان وێنەی ئەوە- هەركاتێك لەبابایەكی مسوڵمان پشكووتەوە، ئەوە بێژەرەكەی بێ سێ‌و دوو لەبازنەی ئیسلام‌و ئیمان دەچێتە دەرێ، چونكە خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾ (الأنعام:١١٥)،

هەروەها فەرمویەتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾(المائدة: ٣).

وەك لەم ئایەتانەو هاوێنەکانیاندا دەبینرێ، خوای زاناو تواناو بیسەرو بینەرو کاربەجێو بەخشەرو دادگەر، بەڕاشکاویی‌و بێ پێچ‌و پەنا ڕایگەیاندوە کەفەرمایشتەکانی لەوپەڕی ڕاستیی‌و دادگەریی دان، وە ئایین‌و بەرنامەکەی کامڵ‌و تێرو تەواوە، هیچ کەموکووڕیی تێدا نیە، ئاشکراشە کەتەنها ئەوە لەفەرمایشت‌و ئایین‌و بەرنامەی خوا دەوەشێتەوە، خوایەك کە خاوەنی هەرچی سیفەتی بەرزو پەسەندەو، لەهەموو سیفەتێکی خراپ پاك‌و بەدوورە کەڕستەی: (سُبْحانَ اللهِ وبِحَمْدِه) هەردووکیان دەگەیەنێ.

جا بێگومان ئینسانیش بەبێ بەڕاست زانین(تصدیق)ی خوای بەرزو مەزن، لەهەرچییەکدا کەفەرموویەتی‌و ناردوویەتی، نابێتە مسوڵمان، بێگومانیش هەرکەسێك بەڕاستیی بڕوای بەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێ، ناگونجێ بەهیچ جۆرێك هیچ جۆرە گومان‌و دوو دڵییەکی لەدڵ هەبێ بەرانبەر بەهەرچییەك کەفەرموویانە، کەهەمووی ڕاست‌و بەجێیە، وەك خوای پەنهان بێن فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ﴾ (الحجرات: ١٥).

**کەواتە:**

کەسانێك کەخۆیان بەمسوڵمان دەزانن دەبێ وریا بن‌و دڵنیا بن کەبەهەر جۆرە قسەیەك کە بۆنی ئەوەی لێبێ دوو دڵ(متردد)ن بەرانبەر بەیەکێك لەیاساکانی شەریعەت، ئەوەیان هەر لەئەسڵ دا خواو پێغەمبەری خوایان نەناسیون‌و ئیمانیان نەهێناوە، یان ئەگەر پێشتریش ئیمانیان هەبووبێ، بەو هەڵوێستەیان لەدەستیان چووە!





کەسانێکیش کەمسوڵمان نین، ئەوە ئێمە بەرلەوەی لەسەر لق و پۆپەکانی شەریعەت لەگەڵیان تێك بگیرێین، پێویستە لەسەر بناغەو بنەماکانی دین و شەریعەت لەگەڵیان بدوێین ،کە بێگومان شوێنێکی دیکەیان پێویستە[1].

**هەشتەم: پاش دەرکەوتنی ئاکام و پەرێزی شوومی بێبەندو بارکردنی ئافرەت و، لەیەك هەڵوەشاندنەوەی خێزان، دەرفەتی مشتومڕی جیددیی لەوبارەوە نەماوە.**

هەر مەسەلەیەکی تیۆریی(نظري) بەرلەوەی بچێتە قالبی کردەوەوە، لەدنیای واقیع دا بەرجەستە ببێ و، شوێنەوارو بەرهەمی چاك یان خراپی دەربکەوێ، ڕێی تێدەچێ و دەگونجێ کەقسەو باس و مشتومڕی لەسەر بکرێ، بەڵام پاش ئەوەی لەبۆتەی کردەوەو تاقیکردنەوەدا ئەنجام و شوێنەواری ئاشکرا دەبێت، چ بەچاك چ بەخراپ، بەڵێ دوای ئەوە گفتوگۆو شەڕە قسە لەبارەوە کردنی، شتێکی ماقووڵ و مەنتیقیی نیەو، پێشینانیش لەوجۆرە حاڵەتانەدایە کەدەڵێن: (مانگ پێویستی بەئەنگوست(پەنجە) نیە ئیشارەی بۆ بکات).

جا مەسەلەی بەرهەڵداو بێبەندو بارکردنی ئافرەت بەناوی ئازادیی(حریة)یەوەو سەرەنجام لەیەك هەڵوەشاندنەوەی خێزان و، بێمراد بوونی ژن و، ژینتاڵ بوونی پیاوو،

---

(١) ئەوجۆرە کەسانە واباشە سەرنجی کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی) بەرگەکانی : (١تا٦)، و کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان، ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) بدەن.

هەڵوەداو سەرگەردان بوونی منداڵان لەکۆمەڵگا نەفامییەکان(المجتمعات الجاهلية)ی سەردەمدا بەگشتیی‌و بەتایبەت لەرۆژئاوادا، ئێستاکە بۆتە واقیعێکی روون‌و ئاشکراو لەوە ترازاوە دەرفەتی ئەوەی تێدا مابێت کەسێك تازە بەتازە بێت‌و، لەوبارەوە ملە جیرەی بێماناو شەڕە قسە(مجادلة)ی بێبناغە بکات‌و بیەوێ ئیسپاتی ئەوە بکات، کە کۆمەڵگا نەفامییەکان قازانجیان کردوە، کەبەهۆی لەفیترەت‌و سروشت هەڵگەڕانەوەیانەوە، خۆیانیان گیرۆدەی هەل‌ومەرجێك کردوە، کەنازانن چۆن چۆنی خۆیانی لێدەرباز بکەن!

ئێستاش با سەرنجێکی خێرا بدەینە ژیان‌و گوزەرانی ئەو میللەت‌و کۆمەڵگا نەفامییە لەخوایاخی‌و لەفیترەت هەڵگەڕاوانەی دنیا، داخۆ لەئاکامی دوورخستنەوەی ئافرەت لەجێگاو ڕێگاو ئەرك‌و کاری سروشتییانەی خۆی‌و، سەرەنجام لەیەك هەڵوەشاندنەوەی خێزان‌و وێران بوونی ماڵ دا، چییان لێهاتوەو سەریان بەچی گەیشتوە؟!

جائێمە لەدوو خاڵاندا باسی ئەو مەسەلەیە دەکەین:

١-سەرگوزشتەی ئافرەت لەماڵ‌و حاڵ بردنە دەرەوەی‌و هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

٢-شوێنەوارو ئاکامە شووم‌و نەگبەتەکانی هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

## ١- سەرگوزشتەی لەماڵ چوونە دەرەوەی ئافرەت‌و لەیەك هەڵوەشاندنەوەی خێزان:

(پاش سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسا (١٧٩٠ز) و دروستبوونی سەرەتایەك بۆ کۆتایی پێهێنانی چاخی دەرەبەگایەتی(عصر الإقطاع)، دەرگا بۆ جوتیارە نیمچە کۆیلەکان خرایە سەر پشت کەکۆت‌و زنجیری دەست‌و پێیان بپسێنن‌و، ئازادانە ڕووبکەنە شارەکان تاکو لەکارگەکان(مصانع)دا ئیش بکەن‌و ببنە کرێکار، جا

دیـاره لەسـەرەتاوە جوتیارەكـان هەسـتیان بەخۆشـیی و بەختەوەرییـەكی بێئەنـدازە دەكردو، پێیـان وابـوو زۆریـان قـازانج كـردوەو یـەكجاریی لەچەوسـێنرانەوەو سـتەم قوتاریان بووەو لەخەم ڕەخسیون! بـەڵام زۆری نـەبرد كەلـەو خـەوە خۆشـە بێـداریان بۆوەو حاڵی بوون كەخراپ حاڵی بوونە!

بـەڵێ جوتیارەكـانی دوێنـێو كرێكارەكـانی ئـەمڕۆ كەچـینی (پرۆلیتار)یـان پێكهێنـاوە، پـاش ماوەیـەك تێگەیشـتن كەلـەژێر سـایەی شـوومی سیسـتەمی نەفامیی(النظام الجاهلي)دا لەكۆلكی دەرەبەگایـەتی سڵەمیونەوەو بەسـەر بـەرازی سـەرمایەداریی(كاپیتالیزم)دا كـەوتوونو ئەگـەر لەسـەرێكەوە تـۆزە قازانجێكیـان كردوە، لەچەندان سەرەوە زیانیان لێكەوتوەو، خۆیانیان دووچاریی چەندان گرفـتو كێشـەی تـازە كـردوە، بەدەسـت چـینی بـۆرژوازی خوێنمـژو بێویژدانـە خـاوەن كارخانەكانەوە، كەلەسەر بناغـەی فەرهـەنگی (ژیـان تـەنها ماددەیـە) و (ئینسـان ئاژەڵەو هیچی دی)! سەریان هەڵدابوو.

بەهـەر حـاڵ باجـاریێ چـینی چارەڕەشـی پرۆلیتـاری دەسـتەویەخە لەگـەڵ سـەرمایەدارو بـۆرژوا بێویـژدانو پـارە پەرسـتە بـەحوكمی سیسـتمی لیبرالیـزم بەرهەڵداكراوو ئازاد، لێرە بـەجێ بهـێڵین، چونكە كێشمەكێشـی نێـوان (پرۆلیتـارو بۆرژوا) هەر لەمانگرتنو كارنەكردن(الإعتصـام والإضـراب عـن العمـل)ەوە بگـرە، هەتا خۆپێشاندانو ڕێپێوان(المظاهرة والمسيرة) و پێكهێنـانی نیقابـەو سـەندیكاو.. هتـد، بەمەبەسـتی فشـار خستنەسـەر سـەرمایەدارو بۆرژواكـانو زیـادكردنی كـرێ(أجـرة) و چـی و چـی، حیكایـەتێكی دوورو درێـژەو، ئێستاشـی لەگـەڵ بـێ بەسیناریۆی جۆراوجۆرەوە هـەر درێـژەی هەیـەو بەردەوامـە! دیـارە ئـەو حاڵەتـەش شتێكی ئاسایی‌و چاوەڕوان كراوە بۆ كۆمەڵگایەك كەشەریعەتی دادگەرانەی خوایان لـەنێودا نیـەو، بێجگـە لـەگومانو ئـارەزووی خۆیشـیان هـیچ مەرجیعییـەتێكی

دیکەیان نیە، کە لەکاتی تێکگیرانو کێشەو گرفتدا بگەڕێنەوە لای و، مسۆگەر لەکەش و هەواو هەلومەرجێکی ئاواشدا دەستەلاٌتدارانو پارەداران زیاتر قسەیان سوار دەبێتو، بەوجۆرەی کەلەخزمەتی بەرژەوەندییەکانیاندایە، سیستەمی حوکمو پێش ئەوەش فیکرو فەرهەنگی کۆمەلٌگا دادەڕێژن!

بەلٌێ بابزانین ئافرەتو خێزان لەو کێشمەکێشو گوریس پچڕکێنەیەدا چییان بەسەرهات!

پاش ئەوەی پیاوان ڕوویان لەشارو کارگەکان کرد بۆ بژێو پەیداکردن، چ ئەوەی خێزانی هەبوو، چ ئەوەی سەلٌت بوو، ژمارەیەکی زۆری ئافرەتان بەبێ سەرپەرشتو مشوورخۆر مانەوەو، ئەوانیش ناچاربوون تەگبیرێك لەژیانو گوزەرانی خۆیان بکەن، ئەمە لەلایەکەوە، کەبێگومان هەرگیز لەکۆمەلٌگای ئیسلامییدا -مەبەستمان کۆمەلٌگایەکە کەلەسەر دین پەروەردەکرابێو شەریعەتیش بەسەریدا حاکم بێت- حالٌەتی وا مەگەر بەدەگمەن دەنا ڕوونادات، چونکە ئیسلام هێندە ڕێزو کەرامەتی ئافرەت پاراستوە، کەچ هاوسەر بێت، چ کچ، چ دایك، چ خوشك، لەهەموو حالٌاندا لەسەر پیاوی فەرز کردوە، کەمشووری بخواتو بیژیەنێ، جا چ مێردی بێت، چ بابی، چ کوڕی، چ برای، یان هەر خزمێکی دیکەی، وە لەبەرانبەر خوای دادگەرو لەبەرانبەر شەریعەتدا بەرپرسیارەو ئەگەر بێتو بەخۆشیی بەئەرکی سەرشانی خۆی هەلٌنەستێ، بەزۆر لێی دەستێنرێ[1]! ئنجا ئەگەر هاتو هیچ کەسیشی نەبوو بیژیەنێ، ئەوە دەولٌەت لەبەرانبەریدا بەرپرسیارەو، هەقی لەسەر خەزێنەی دارایی گشتی(بیت المال العام) یە!

وە لەلایەکی دیکەشەوە: خاوەن کارخانە سەرمایەدارو بۆرژوایەکان، پاش ئەوەی لەئەنجامی تەماعو پارە پەرستییو چەوساندنەوەی کرێکارەکانیانەوە، گیرۆدەی

(١) وەك لەبەشی پێنجەم و شەشەم دا دەیخەینە ڕوو.

(مانگرتن) و (كارنەكردن) و (خۆپیشاندان) و چی و چی چینی كرێكار بوون، كەبێگومان ئائەوكاتە تەنها پیاوان بوون، هەڵسان دەستیان كرد بەبانگەشەو زەمینەسازییو بانگهێشت كردنی ئافرەتان بۆ لەماڵو حاڵ هاتنەدەرو كرێكاریی كردن، تاكو بیانكەنە ئەڵتەرناتیف (بدیل)ی پیاوانو لێیان بێمنەت بن!

ئیدی سەرتان نەئێشێنم ئافرەتی كلۆڵی رۆژئاوایی، سەرەنجام لەژێر فشارو كاریگەریی هەردووك هۆكاری (برسیەتیو ئاتاجیی) و (بانگەشەو پروپاگەندەو تەماع وەبەرنانو صابوون لەبنی پێدان) دا، وەك باڵندەی برسی بەتەڵەو داوەوە بوو و بۆی دەرچوو!

چونكە ئافرەتی داماوی رۆژئاوایی بەحیساب بۆ كاركردنو بژێو پەیدا كردن، رووی لەشارو كارگەو كارخانەكان كرد، بەڵام دوایی بەمەرەدی ئەو پیرەژنە چوو كە هەندێك شیرو ماستی لەدەفر (قاپ)ێكدا بەهەندێك گەنجی هەرزە فرۆشتبوو، بەڵام ئەوان نەك هەر پارەكەیان پێنەدەدا، بەڵكو گاڵتەو جەفەنگیشیان پێدەكرد، ئەویش هیچی بۆ نەمابۆوە پارانەوە نەبێو، لێكدا لێكدا دەیگوت: (كۆجیلەم بدەنەوە، حاشا لەدراو)[1]!

ئافرەتی رۆژئاوایی بێدەرەتانیش كەبەحیساب لەترسی برسیەتیو مردن رووی كردبووە شارو كار، تەماشای كرد دەوڵەمەندو خاوەن كارو كارخانەكان تەماعیان كردۆتە مێینایەتی(أنوثة)یەكەیو، بەبێ دەست بەردار بوونی شەرەفو كەرامەتی، بەبێ ئیشی دەگەرێنەوەو، سەرەنجامیش بەبێ نان سەردەنێنەوە، بۆیە مەگەر چۆن دەنا بەناچاریی خۆیان تەسلیمی ئەو چارەنووسە تاڵە كرد!

ئنجا سەرباری هەمموو خەمانیش، ئافرەتی بێپارەی، كەرامەت پارە پارەی بێچارەی رۆژئاوا، سەرمایەدارو بۆرژوا بێویژدانەكان، جگە لەنیوە كرێیان پێرەوا

---

(١) كۆجیلە: قاپێكی گچكەی دارە، شیرو ماستی تێدەكەن، (دراو) یش پارەیە.

نــەدیتن‌و، تــەنها نیــوەی کرێــی کرێکــاری پیاویــان دەدانــێ، هەرچــەندە هــەمان ئیش‌وکاری ئەوانیشیان پێدەکردن!

بۆیە سەرەنجام ئافرەتانی پرۆلیتارو ناچار لەژێر فشارو گوشاری ئەو هەل‌ومەرجە ناسروشتیی‌و زاڵمانەیەدا کەدووچاری بوو بوون، ناچار بوون کە داوای یەکسان کردنی کرێیەکانیان بکەن لەگەڵ کرێکارە پیاوەکاندا، وە بیرۆکەی یەکسانیی ژن‌و پیاو(فكـرة مسـاواة الرجـل والمـرأة) ئـا لـەئێرەوە چـەقەرەی دەرکـرد! واتـە: لەهەل‌ومەرجی چەوسێنرانەوەی ئافرەت‌و هەق‌و مـاف پێشـێل کرانیـدا، ئیـدی لـەو رۆژەوە ئافرەتانی رۆژئاوایی کلۆڵ هەر خەریکن‌و هەر خەریکن کـەدەعوای یەکسـان بوونیان لەگەڵ پیاواندا ئیسپات بکەن، بۆئەوەی ئەو ماف‌و ئیمتیازانـەی کـەپیاوان هەیانن، ئەوانیش وەدەستیان بخەن!

ئەمە زۆر بەکورتیی‌و گوشراویی سەرگوزشتەی لەماڵ چوونە دەرەوەی ئـافرەت‌و هەڵوەشێنرانەوەی خێزان بوو.[1]

ئنجا بابچینە سەر خاڵی دووەم:

## ٢- شوێنەوارو ئاکامە شووم‌و نەگبەتەکانی لەماڵ‌و حاڵ چوونە دەرەوەی ئافرەت‌و هەڵوەشێنرانەوەی خێزان:

**خوێنەری بەڕێز:**

لەڕاسـتیدا شـوێنەوارە شـوومەکانی مـاڵ بەجێهێشـتنی ژن‌و هەڵوەشـاندنەوەی خێزان لەکۆمەڵگاکانی رۆژئاوادا، هێندە زۆرو جۆراوجـۆرن، نـازانم لـەکوێوە دەست

(١) بۆ نووسینی ئەو باسە بەدەستکارییەوە سوودم لەکتێبی : (مذاهب فكرية معاصرة) ی محمد قطب، وەرگرتوە، بڕوانە: لاپەڕە ١١٩ تا ١٢٦.

پێبکەم!، بەڵام هەرچۆن بێ هەوڵ دەدەم زۆر بەگوشراویی لەچەند بڕگەیەکدا ئاماژە بەگرنگترینیان بکەم:

**یەك:** نەمانی ڕێزو خۆشەویستیی و وەفای ژن و مێرد بەرانبەر بەیەکدیی، زۆر بوونی تەڵاق و پەیوەندیی جینسیی بەدزیی(الخيانة الزوجية) لەلایەن ژن و مێردەوە، ڕوحم لەسەریەك ساردبوونیان و لەیەکدی بێزار بوونیان.

**بۆ وێنە:** [1]

لەشوێنێکی وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، تەنها تاکو کۆتایی ساڵەکانی پەنجایەکان، ڕێژەی تەڵاق گەیشتۆتە (٥٠٪)! واتە: لەهەر دوو ژن و مێرد یەکیان لەیەك ترازاوە! وەبەپێی سەرژمێرێکی مەرکەزیی (١/٣)ی منداڵانی ئەمەریکا بێبەشن لەیەکێك لەدایك یان باوکیان!

**دوو:** کولەمەرگی منداڵان و دەستەویەخە بوونیان لەگەڵ چەندان گرفت و کێشەو دیاردەی دڵتەزێندا، وەك ڕفێنران(إختطاف) و، دەستدرێژیی جینسیی لێکران و، کوژران و، هۆگربوون بە بەکارهێنانی مادە سڕکەرەکان(إستعمال المواد المخدرة)و، تووشبوونی نەخۆشییە ترسناکەکان، وەك (سیلان) و (إیدز) کە لەپەیوەندیی جینسیی ناشەرعیی و ناسروشتییەوە پەیدا دەبن.

**بۆ وێنە:** [2]

لەشوێنێکی وەك ئەمەریکا بەپێی سەرژمێرە ڕەسمییەکان هەر ساڵێك (١٠٪)ی منداڵان تەعدای شەرەفیان لێدەکرێ، بۆ نموونە: سەرۆکی شارەوانی شاری (ئامۆجوردو) لە ویلایەتی (نیومەکسیکۆ) لەدادگا، تۆمەتی دەستدرێژیی کردنە سەر شەش کچۆڵەی گچکەی لەسەر ئیسپات بووا!

---

(١) بڕوانە: (أمريكا: السقوط والحل)ی مختار خليل المسلاتي، ص ٢٥،

(٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٢.

وە لەشاری (بتسبرگ) سێزدە منداڵ کە فەحس کرابوون، حەوتیان دووچاری نەخۆشی (السَّیلان الجنسي) بوو بوون.[١]

وە ساڵانە لەئەمەریکا نیزیکەی ملیۆنێكو هەشت سەد هەزار منداڵ بزر دەبن، کە (٩٠٪)یان ئەوانەن کە لە ماڵەکانی خۆیان ڕادەکەنو پاشان دەرفێنرێن.[٢]

وە سەرژمێرە ڕەسمییەکان دەریان خستوە کە (٣/١)ی تاوانە زلە سەرەکییەکان لەلایەن هەرزەکارانێکەوە ئەنجام دەدرێن کەتەمەنیان لەبیست ساڵ کەمترە![٣]

وە حاڵەتی هۆگربوون(الإدمان) بەخواردنی ماددە سڕکەرەکانەوە، گەیشتۆتە ڕێژەی زیاتر لە (١٥٪)ی گەنجەکانی قوتابخانە ئامادەییەکان![٤]

وە ساڵانە زیاتر لەملیۆنێك کچی هەرزەکار بەبێ مێردو شووکردن منداڵیان دەبێ و (٨٠٪)شیان کچی قوتابخانە ئامادەییەکانن، مەبەستیشیان لەهێشتنەوەی کۆرپەکانیان ئەوەیە کە دەوڵەت هاوکارییان بکاتو، دەوڵەتیش ساڵانە زیاتر لەملیارێك دۆلار بۆ هاوکاری دایکانی هەرزەکار خەرج دەکات![٥]

سێ: کەمبوونەوەی حاڵەتی ژن هێنانو شووکردنو زۆربوونی دیاردەی ڕیزپەڕی جینسیی(الشذوذ الجنسي)، واتە: جووت بوونی نێر لەگەڵ نێرو مێ لەگەڵ مێ!

ئەمەش چەند زانیارییەك لەوبارەوە، وەك چەند وێنەیەك تەنها لەئەمەریکا:[٦]

دیاردەی ژن هێنان لەنەوەدەکاندا لەچاو حەفتایەکان (١٧٪) کەم بۆتەوە،

---

(١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٣.
(٢) هەمان سەرچاوە، ص ٣٥.
(٣) سەرچاوەی پێشوو، ص ٤١.
(٤) هەمان سەرچاوە، ص ٤١.
(٥) هەمان سەرچاوە ص ٤٦.
(٦) هەمان سەرچاوە، ص ٤٩ تا ٥١.

پەیوەندییە جینسییە ناشەرعییەکان سێ بەرانبەر زیادیان کردوە، گۆڤاری (نیوزویك)ی ئەمەریکی لەساڵی (١٩٧٧)دا بلاوی کردۆتەوە، کەئەوکاتە ژمارەی ڕیزپەڕە جنسییەکان(الشذوذ) دەوری بیست ملیۆن بووە!

هەموو لایەکیش ئاگادارن کە (بیل کلنتۆن) سەرۆك کۆماری پێشووی ئەمەریکا لەساڵی (١٩٩٢)دا لەکاتی هەڵبژاردنەکان لەشاری (کالیفۆرنیا) کۆنگرەیەکی بەستو بەئاشکرا بانگی نێربازەکانی کردو بەڵێنیدانێ کە لەبەرانبەر دەنگ پێدانیدا، ئەویش بەرگرییان لێبکاتو خزمەتیان پێ بکات!

**چوار:** پەرەستاندنی تاوان(الجريمة) و توندوتیژیی، کەوەك دەروونناسو کۆمەڵناسەکان گوتوویانە، هۆکاری سەرەکی بلاوبوونەوەو گەشەکردنی دیاردەی تاوانو توندوتیژیی لەیەك ترازانی ژنو مێردو هەڵوەشاندنەوەی خێزانو پەرتەوازە بوونی منداڵەکانیانەو، ئەو کەسانەش کەخەریکی تاوانو توندوتیژیی دەبن، وەك قەتڵو دزیی و تەعدای جینسیی، بەزۆری کەسانێکن کەلەباوەشی خێزانێکی ساغو لەژێر سەرپەرشتیی بابو دایکیاندا بەخێونەکراونو، لەسۆنگەی ئەوەوە دووچاری نەخۆشیی و گرێو گۆڵی دەروونیی و عەقڵیی بوونو، کینەو ڕقیان بەرانبەر بەسەرجەم کۆمەڵگا بۆ دروست بووەو، دەیانەوێ بە هەر شێوەیەك بێ ڕقی خۆیان بەو کۆمەڵگاو دەوروبەرە برێژن![1]

**پێنج:** سەربارەی هەموو شتێکیش تەشەنەکردنی چەندان نەخۆشیی ترسناكو قەڵاچۆکەر بەهۆی بلاوبوونەوەی پەیوەندییە جینسییە ناشەرعییەکانەوە، هەر لەزیناوە بگرە هەتا نێربازیی و، خۆلەیەك خشاندن(سحاق)ی ئافرەتانو، جووت بوون لەگەڵ ژیاندارانذا بەتایبەتی سەگ!

---

(١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠٢.

دیارە بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشییە کوشندەو پیسانەش کە(ئایدز) لەهەموویان تازەترو پیسترو کوشندەترە، خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەیان پێکردوە، کەبەرهەمو زادەی شوومی ئەو پەیوەندییە جیسنییە ناشەرعییانەیە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾(الاسراء:٣٢).

واتە: تـوخنی زینا مەکەون، چونکە گوناحێکی ناقۆڵایەو خراپترین ڕێبازو شێوازە!﴾.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ((**لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا، إِلاَّ فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ وَالأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلاَفِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا**)) رواه ابن ماجه في السنن برقم: ٤٠١٩، واتە: (داوێن پیسیی هەرکاتێك بەشێوەیەکی زەق لەنێو هەر کۆمەڵگایەکدا بڵاوبۆوە، بەجۆرێك کە نەیشارنەوە، ئەوە بەتەئکید نەخۆشیی‌و ئەو ئازارانەیان لەنێودا بڵاودەبنەوە، کە لەو پێشینانەیاندا کەڕابردوون نەبوو ون)!.

بەڵێ خوێنەری سەنگین! ئەمانە هەندێك لەشوێنەوارە شوومو نەگبەتەکانی ماڵ بەجێهێشتنی ئافرەت‌و لەیەك هەڵوەشێنرانەوەی خێزان بوون، کە بەتەئکید زۆری دیکەش هەن، بەڵام ئێمە وەك نموونەو مشتێك لەخەروارێك ئەمانەمان لێرەدا تۆمارکردن، جا ئایا کەسانێك ڕێزو حورمەتی عەقڵ‌و زانست‌و قەدری ئینسان‌و مرۆڤایەتی‌و بەرژەوەندییە باڵایەکانیان لەلا بێت، پاش دەرکەوتنی ئەو شوێنەوارە شوومو پەرێزە پیسانەی لەماڵ بردنە دەرەوەی ژن‌و کوێر کردنەوەی ماڵ‌و خێزان، دەگونجێ لەوبارەوە مشت‌ومڕو بگرەو بەردەو شەڕە قسە بکەن؟!

**تۆیەم : بەدرێـژایی مـێژووی ئیسـلام، مـادام شـەریعەت پیـادە كرابـێ، ئـافرەت بەگشـتی كێشـەیەكی وای نـەبووە كـە ناچـار بـێ كۆبوونـەوەو خۆپیشـاندانی لەپێناودا بكات، وەك هی ڕۆژئاوایی**

یەكێك لە جیاوازییە بنەڕەتییەكانی بەرنامەی خوای زانـاو شـارەزا بـە هـەموو شتێك‌و، ئەو ڕێچكەو بیردۆزانەی كە زادەو هەڵقوڵاوی ئاوەزو ئـەزموون‌و ئـارەزووی ئینسانەكانن، ئەوەیە كە ڕێچكەو بیردۆزەكان مەگەر چۆن دەنـا حەتـمەن لایـەنگریی چین‌و توێژێك‌و كۆمەڵێك دەكەن لەسەر حیسـابی خەڵكەكـەی دیكـە، پاشـان لـەژێر فشارو گوشاردا نەبێ هەق‌و مافە ڕەوایەكانی خەڵكەكە ناسەلمێنن، دیـارە هۆكـاری ئەو دیاردەیەش هەر ئەوەیە كـە هـەر كەسـە بەرژەوەنـدیی خـۆی‌و دەورو بەرەكـەی زیاتر دەبینێ‌و ڕەچاو دەكـات، وەك پێشـینان گوتوویانـە: ((سەرچـۆپی بـدە دەسـت گامێشێ بۆ لای (كـادێن)ێ دەیكێشـێ))، بـەڵام شـەریعەت‌و بەرنامـەی خـوا، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە تـەنها لـە زانیـاری‌و حیكمـەت‌و بـەزەیی بێسـنوری خـواوە سەرچـاوەی گرتـوەو، بەنـدەكان (عبـاد)یش بـۆ خـوای دادگـەر وەك یـەكن‌و، هـیچ كامیان‌و هیچ كۆمـەڵ‌و توێـژێكیان مەگـەر بـە پارێزكـاریی(تقـوی) ئەگـەرنا هـیچ ئیمتیازو پلـەیان بەسـەر بـاقی خەڵكەكـەدا نیـە، وە بێگومـان خـوای باڵادەسـت‌و بێنیـاز و مەبەسـت تەماحێكـی بە هیچ كامیان نیە، وەك فەرموویەتـی:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ۝١٥﴾
(فاطر:١٥)

بۆیە ئاین و شەریعەتی خوا، ئەو کەمو کوڕییە زلو گورچکبڕەی تێدا نیـە، کـە زۆر بە زەقی لە تێکڕای ڕێچکە مرۆڤکردەکاندا دەبینرێ، بۆ وێنە:

(کۆمۆنیزمو سۆسیالیزم) -کە بێگومـان مارکسیزمو لینینیزمو ماویزم چەند جۆرێکیانن- چونکە هەڵقولاوی چینی کەمدەستو نەدارن، بەلای چینی پڕۆلیتـاردا دایانشکاندوەو، نەفرینیان لە چینی پارەدارو بۆرژواز کـردوەو بڕیـاری بنبڕکردنییـان دەرکردوە.

بەلاّم (کاپیتالیزمو لیبرالیزم)[1] کە لەم ڕۆژگارەدا زیاتر لە ئەمەریکاو ئەوروپادا خۆی دەنوێنـێ[2]، بەپێچـەوانەوە، چـونکە چـینی پـارە زۆرو بـەزەبرو زۆر ڕەنگیـان ڕشتوە، تەنها بەرژەوەندیی تاکڕەوانەو ناشەرعییانەی ئەو چینە خاوەن گەنجینەیەیان ڕەچاو کردوەو، باقی خەڵکو جەماوەریان فەرامۆش کردوەو، بەصەدەقەو بـەلاّگێڕی ئەو چینەیان حیساب کردوە.

هـــەروەها هـــەر کـــام لـــە ڕێچـــکەو بیرۆکـــەی (ناســـیۆنالیزمو ئەگزیستانیسیالیزم)[3]یش، کـە یەکـەمیان نەتـەوە پەرستییەو، دوەمیشیان تـاك پەرسـتیی، بەهــەمان شـێوەو هەریەکـە بـە جۆرێـك دووچـاری دەردی (تـەنها خۆدیتن)و(غـەیر فت کردن) بوون.

ئنجـا بـا سـەرنج بـدەین داخـۆ شـەریعەتی ئیسلام چـۆن چـۆنیو لەسـەر چ بناغـەیەكو بە چ میکانیزمێك، توانیویەتیو دەتوانێ ڕێ لە دروسـتبوونی کێشـەی ئافرەتو تێکگیرانی ژنو پیاوو مشتو مڕی نێوانیان بگرێ:

**یەك:** هەرکام لە پیاوو ئافرەت وەك یەكو بێ کەمو زیاد ئینسانن‌و هیچ کامیان

---

(١) کاپیتالیزم: سەرمایەداریێتی (الرأسمالیة) .

(٢) بەلاّم ئێستا (٢٠١٢/١١/٢) زۆربەی جیهانی گرتۆتەوە بەجیهانی مسوڵمانانیشەوە!.

(٣) ئەگزیستانیسیالیزم: بوونایەتی (الوجودیة) .

ئیمتیازو زیادەیان بەسەر یەکدییەوە نیە،ئەوەندە هەیە پیاو (ئینسانی نێر)ەو ئافرەتیش (ئینسانی مێ)یەو، نێرایەتیی‌و مێیایەتیی(الذكورة والانوثة)یش هیچ دەورو کاریگەرییەکیان لە بەرزیی‌و نزمیی ئینساندا نیە، وەك خوای کاربەجێ لە چەندان ئایەتی قورئاندا ڕایگەیاندوە، بۆ وێنە:

﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ﴾(آل عمران: ١٩٥)

واتە: جا خاوەن‌و پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە، کە بێگومان من کردەوەی هیچ بکەرێکتان، چ نێر چ مێ، زایە ناکەم، هەندێکتان لەهەندێکتانن..

سەرنج بدە چۆن خوای دادگەر بەرستەی: (بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْض) بێدارمان دەکاتەوەو پەیوەندیی نێوان نێرو مێمان تێدەگەیەنێ، کەهەرکامێکیان حەوجێی ئەوی دیکەیەو، هیچیان بەبێ هیچیان نابن، کەواتە هیچ کامیان بیانوو پاساوی لاف‌و گەزاف لێدان‌و خۆهەڵکێشانی نیە بەسەر ئەوی دیکەیاندا!

دوو: هەرکام لەئافرەت‌و پیاو بەندەی خوای بەدیهێنەرن‌و، وەك یەك‌و بێ کەم‌و زیاد لەسەریان پێویست کراوە، کەخوا بپەرستن‌و بەندایەتیی بۆ بکەن، وە ئەو کەسەشیان لەلای خوا بەڕێزترو لەپێشترو چاکترە، کەبەندایەتیی‌و ملکەچیی بۆ خوای خۆی زیاترە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ (الحجرات: من الآية١٣).

کەواتە: وەك چۆن لەڕووی ئینسانەتییەوە هیچ کەس لەنێرو مێ، ڕێی فیزو کەشخەو لاف لێدانی بەسەر ئەوی دیکەدا نیە، لەڕووی بەندایەتیی(عبودیة)یشەوە هەرواو، ئەم ڕاستییەش لەچەندان دەقی قورئان‌و سوننەتدا دوویات کراوەتەوە.

سـێ: بێئـەوەی هـیچ کـام لـەپیاوو ئـافرەت داوای هـەق و مافـەکانیان بکـەن، شەریعەتی بـێهەڵەو پەڵەی خوای دادگەر، هەر لەبەراییەوە هەم ماف و هـەم ئـەرکی سەرشـانی هـەرکامێکیانی دیـاری کـردوەو، روونـی کردۆتـەوە کەهـەرکامێکیان هـەم هـەق و مـافی لەسـەر لایەکـەی دیکـە هەیـەو، هـەم لەبەرانبەریشیدا بەرپرسیارەو ئەرکی لەسەرشانە، جا ئەو ئـەرک و مافانـە[1]، هەنـدێکیان گشـتی و هاوبەشـن و هـەردووک لا تێیانـدا بەشـدارن، ئـەوانی دیکـەش تایبـەتن بەهەرکامێکیانـەوەو هـەر کەسـە بـەگوێرەی هەڵکـەوت و پێکهاتەی سروشت و فیترەتی، بەبێ ڕەچاوکردنی پلەو پایەو ئیمتیـازی هـیچ لایـەک بەسـەر ئـەوی دیکـەدا، جگـە لـەوەی بەرژەوەنـدیی بـاڵای خێـزان و کۆمـەڵگا، داخوازیی دەکات، خوا فەرموویەتی:

﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾﴾ (البقرة: ٢٢٨)

واتە: ئافرەتان بارتەقای ئەو ئەرکەی کە لەسەرشانیانە بەرانبـەر بـەمێردەکانیان مافیشیان هەیە، بەشێوەیەکی بەچاک زانراو، وەپیاوان پلەیەکیان بەسەریانەوە هەیە وەخوا زاڵ و کاربەجێیە.

دیارە مەبەست لەو پلە(درجة)یە ئەرکی سەرپەرشـتیی(قوامـة)ی مـاڵ و خێزانـە کەلەراسـتیدا - وەك دواتـر باسـی دەکـەین - سەرپەرشـتیی مـاڵ و خێـزان ئەرکە(وظیفة)ە، نەك ماف(حق) و، (تکلیف)ە، نەك (تشریف)!

دیارە ئێمە لەداهاتوودا - لەبەشی پێنجەم دا- بەوردیی باسی ئەرك و مافەکانی ژن و مێرد دەکەین کە لەسەریەکیان و بەرانبەر بەیەکیان هـەن و، ڕوونـی دەکەینـەوە کەئافرەتان بەرلەوەی - وەك ئافرەتانی ڕۆژئاوا- لەژێر تین و گوشاری ئاتـاجیی و بـێ

---

(١) لەبەشی پێنجەم دابەوردیی باسی ئەرك و مافەکانی ژن و مێرد بەرامبەر بەیەکدی دەکەین.

دەرەتانییـدا، داوای مافـەكانی خۆیـان بكـەن، خـوای دادگـەر تێكـڕای هـەق‌و مافەكانیانی بۆ دابین كـردوون، لەهـەموو بوارەكـانی: خواپەرسـتیی، فەرهـەنگیی، كۆمەڵایەتیی، ئابووریی، سیاسیی.. هتددا.

**چـوار:** شـەریعەت بـەهۆی ئـەو دوو جـۆرە سـزا دنیـاییی‌و دوارۆژیـی(العقوبـات الدنيوية والاخروية)یەوە كەدیاریی كردوون، بۆ هەركام لەژن‌و مێرد لـەكاتی لادان‌و ستەم‌و دەستدرێژیی یاندا بۆ سەر یەكدی، كەسزا دوارۆژییەكان زیـاتر گوشـاری مەعنـەوییان هەیـەو، سـزا دنیاییـەكانیش گوشـاری مـاددیی‌و بەرهەست، چونكە هەر لەدنیاداو لەلایەن حوكمڕانانەوە پیادە دەكرێن، بەڵێ بەهۆی ئەو دوو جۆرە سزایانەوە بەربەست(سـدّ) و ڕێگرێكـی زۆر مەحكـەم‌و مەترسـیدار لەبـەردەم هـەركام لـەژن‌و مێـرددا دادەنـێ، كەنـەوێرن سـتەم‌و دەسـتدرێژیی بكەنـە سـەر مافـەكانی یەكـدیو، كەمتەرخـەمیی لەئـەركی سەرشانیاندا بكەن بەرانبەر بەیەكدی.

شایانی باسیشە كەدەڵێین:

ئافرەت لەئیسلامدا كێشە(قضية)یەكی وای تووش نـەبووە بەدرێژایی مێـژووی حوكمڕانێتی شەریعەت، كەناچاریی كردبـێ سـكاڵای خـۆی بەرێتـەبـەر ئـەملاو لاو، خۆپێشـاندان‌و ڕێپێـوان‌و چـی و چـی لـەپێناودا بكـات، وەك ئـافرەتی دامـاوو لێقـەوماوی ڕۆژئـاوایی، كەبەمەبەسـتی نـەخنكان لـەڕووباری برسـیەتی‌و بـێ دەرەتانییدا، ڕووی لەپردی كاركردنی نێو كارخانەی شارەكان كردو، سەرەنجام خـۆی بەپەنـد بـرد، هەربۆیـەش پێشـینانمان گوتوویانـە: (ڕوویـار بتبـات چـاكترە لـەوەی كەبەپردی نامەرددا بپەڕیەوە)، چونكە لەپەڕینەوەی خۆتـدا ئەگـەری سـەلامەتیی‌و قوتـاربوون زیـاترە وەك لـە (لـەپرد كەوتنـەخوار) چـونكە مسـۆگەر بابـای نامـەرد پردەكەی بۆ لێپەڕینەوەی خەڵك نیە لـەڕووبار، بـەڵكو تەڵـەو داوێكـە لەسـەر ڕێـی

خەڵکی دایناوە! بەڵێ کەدەڵێین: ئافرەت لەژێر سایەی شەریعەت دا کێشەی نیەو نابێ، مەبەستمان ئەوە نیە کە ئافرەتانی مسوڵمان گیرۆدەی هیچ جۆرە گرفتو نارەحەتییەك نابن، چونکە ئەم ژیانو گوزەرانەی دنیا بۆ هیچ کەس لەگرفتو سەغڵەتیی خاڵی نابێت، بەڵام هەبوونی کێشەو قەیرانێکی گشتی وا کەسەرجەم ئافرەتان بگرێتەوە، وەك لەرۆژئاوا هەبوو و هەیە، شتێکەو، ڕووداني وردە کێشەو گرفتی شەخسیی‌و تایبەتیی‌و جوزئییش لەنێوان ژنو مێرددا، شتێکی دیکەیە، کە لەکورتە باسی دەیەم دا تیشکی دەخەینەسەر.

## دەیەم: شتێکی نارەوایە کەشەریعەت بەهەڵوێست و ڕەفتاری هەڵەو ناشەرعییانەی موسڵمانان تۆمەتبار بکرێ

تێرو تەواویی و کامڵ بوونی شەریعەت شتێکەو، بەبێ هەڵەو پەڵە زانینی موسڵمانانیش شتێکی دیکەی جیایەو، نابێ تێکەڵ بکرێن و بکرێنە (لازم و ملزوم)ی یەکدی!

بەڵێ ئیسلام ئایینی تێرو تەواوو بێ هەڵەو پەڵەی خوایە: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ (المائدة-٣)

بەڵام مەرج نیە موسڵمانان وابن، یان هەموویان وابن، چونکە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ**)) رواه **أحمد وأبوداود.** واتە: (تێکڕای ئادەمیزادەکان خەتاکارن و چاکترینی خەتاکارانیش تۆبەکارانن).

دیارە ئەوەی گوترا ڕاستییەکی ئاشکراو ڕوونە، بەڵام بەداخەوە هەمیشە کەسانێکی دڵڕەش و ناحەزی ئیسلام، ڕەفتارو مومارەسەی هەڵەو ناشەرعییانەی هەندێك لەموسڵمانانیان کردۆتە بەڵگەو بیانووی تۆمەتبارکردنی شەریعەت لەبواری ئافرەت و خێزاندا.

هەڵەو کرچ و کاڵییەکانی موسڵمانانیش لەبواری هەڵس وکەوت و ڕەفتار لەگەڵ ئافرەتدا، بەگشتی دووجۆرن:

**یەك:** کەسانێك کەلەژێر فشاری عادەتو نەریتەکانی نەفامییانەی کۆمەڵگاو دەوروبەریداو بەمەبەستی لەخۆ دوورخستنەوەی گلەیی‌و گازندەو ڕەخنەو پلاری خەڵکی، وە بەمەبەستی سەلماندنی عیززەتو پیاوەتیی(رجولة) خۆیان، ئاگایانە یان نائاگایانە بەجۆرێك لەگەڵ ئافرەتدا دەجوولێنەوە (چ ژن، چ کچ‌و خوشك، چ دایك) کە زۆر لەڕووحی ئیسلامەتییەوە دوورەو چەندان فەرسەخ لەخوار ئاستی بەرزی شەریعەتەوەیە!

بۆ وێنە:

١-دڵتەنگ بوون بەپەیدابوونی کچ‌و ناڕەزایی دەربڕین! بێخەبەر لەوە کە کچ بوون‌و کوڕبوونی کۆرپە، پاش قەدەری خوا، هۆکارە ماددییەکەی - وەك زانستی پزیشکیگەریی تازە ڕوونی کردۆتەوە- تۆو(مني)ی پیاوە، نەك ئاوی ئافرەت!

٢-ڕێزلێنەگرتنی کچ‌و خوشك‌و بەکەم سەیرکردنیان‌و بێبەش کردنیان لەمیرات، بە بەڵگەی ئەوە کەکچ‌و خوشك میرات بۆ پیاوی بێگانە دەبەن! کەبێگومان ئەو هەڵوێستو قسە پووچە بۆنی ڕەخنە لێگرتنی شەریعەتی لێ دێتو ئەوەش کوفرە!

٣-بەزۆرو تۆبزیی بەشوودانی ئافرەت! بێئاگا لەوە کەبەپێی ڕای جەماوەری زانایان‌و بەگوێرەی ڕای بەڵگەدارو زاڵ(راجح)، ئەوجۆرە مارەبڕینە هەر دانامەزرێ، وەك دواتر باسی دەکەین!

٤-بەناهەق لێدان‌و قسە پێگوتنی ژن‌و بیانوو پێگرتنی‌و ناڕەحەت کردنی! لەحاڵێکدا کەهەم خوای پەروەردگارو هەم پێغەمبەری سەروەریشمان ﷺ لەچەندان ئایەتو فەرمایشتدا فەرمانیان کردوە، بەچاك ڕەفتارکردن

لەگەڵ ژن داو، ڕێز لێگرتنیو دڵڕاگرتنیو چاوپۆشیی لێكردنی، وەك لەداهاتوودا دەیخەینەڕوو!

٥-پشتگوێ خستنی ئافرەت (چ كچو خوشك، چ هاوسەر، چ دایك) و پرسو ڕاوێژپێینەكردنی لەكاروباری ماڵو خێزاندا بەتایبەتیو كاروباری كۆمەڵگادا بەگشتیی، لەحاڵێكدا كەئەوە پێچەوانەی سوننەتو ڕێو شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەكانیەتی!

دوو: كەسانێك كەخۆیان بەمسوڵمانی باشو پابەند بەشەرعەوە دەزانن، بەڵام لەسەرێكەوە لەسۆنگەی سادەو سەركێڵ تێگەیشتنی دەقەكانی قورئانو سوننەتەوەو، لەسەرێكی دیكەشەوە بەهۆی كاردانەوە (رد فعل)یان بۆ دیاردەی بێ بەندو باركردنی ئافرەتو لەیەك هەڵوەشێنرانەوەی خێزان، دووچاری جۆرێك لە (هەستیاریی) بوو ون لەبارەی ئافرەتەوەو زیاد لەوەی كەشەریعەت پێویستی، بگرە پەسەندی كردوە، بۆ وریاییو دووربینیی(إحتیاط)كردنی ئافرەت لەڕووی بەرگو پۆشاكو جموجوڵو هەڵسوكەوتییەوە، لەسەر ژنو كچو خوشكو دایكو كەسوكاریان فەرزی دەكەنو، زیادەڕۆیی(مبالغة)ی زۆرو بێسەلیقەییو وشك تەبعییەكی وا دەكەنە پیشە، كەخواو پێغەمبەر ﷺ تووڕەو خزمو خەڵكیش بێزار دەكەن!.

بۆ وێنە:

١-بەعەورەت زانینی دەنگو ڕەنگو دیمەنی ئافرەتو، پابەندكردنی بەقسەكردن لەگەڵ میوان - ئەگەر خزمو دۆستی دینداریش بێت!- لەپشت پەردەوەو، پۆشینی پێچە(نقاب) وەك عادەتێكی هەمیشەیی، لەحاڵێكدا كەوەك دواتر دەیخەینەڕوو، زانایان لەسەر عەورەت نەبوونی دەنگی ئافرەت

یەکدەنگ(مُجْمِع)[١]نو، زۆربەی هەرەزۆریشیان ڕوو و دوو دەست(الوجه والیدین)ی ئافرەت بەعەورەت نازانن‌و، مادام مەترسیی گوناحباریی(خوف الفتنة)یش لەئارادا نەبێ، هیچ کام لەزانایان پێچەگرتنەوەی ئافرەتیان بەپێویست‌و زۆربەیان بەسونەتیشیان نەزانیوە![٢]

وە ئەگەر هاتباو ئەوەی ئێستا ئەوجۆرە مسوڵمانە خاوەن هەستیاریی (حساسیة)انە لەسەر ئافرەتی پێویست دەکەن، لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکانی‌و پێشینەی چاکماندا ئافرەتان پێیەوە پەیوەست(مقید) بوونایە، مەحاڵ بوو توانیبایان ئەو ڕۆڵە گرنگ‌و بەرچاوەی کەشان بەشانی پیاوان لەهەموو بوارو لایەنەکانی ژیان دا گێڕاویانە، بیگێڕن، بەتایبەت لەبواری جەنگ‌و جیهادو ڕۆژانی سەختی بەرەنگارییدا، وەك لەباسەکانی داهاتوودا باسی دەکەین‌و، نموونەی جۆراوجۆری بەشدارییکردنی کاریگەرانەی ئافرەت لەسەرجەم جموجۆڵ‌و چالاکییەکاندا، لەسیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکانییەوە نەقڵ دەکەین.

٢-بوار نەدان بەئافرەت بۆ فێربوونی زانستی شەرعیی‌و چوونە مزگەوت بۆ نوێژی جومعەو بەشدارییکردن لەچالاکییە کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی‌و جیهادییەکان دا، لەحاڵێکدا کەوەرگرتنی زانستی شەرعیی بۆ

---

(١) بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) ج٣ص٢٧٦تا ٢٨٤، بەڵام بەمەرجێك ئافرەت دەنگەکەی بەخەمزەو نازەوە دەرنەبڕێ‌و نەیلاوێنێتەوەو مێینایەتی تێدا نەخاتەڕوو، وەك خوای پەنهان بین لەبارەی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ﴿...ولا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مرض.﴾(الأحزاب: من الآية٣٢).

(٢) بڕوانە (المفصل) ج٣ص١٨٣تا ٢٠٩، الدكتور عبدالكريم زيدان، هەروەها بڕوانە: (جِلْباب المرأة المسلمة) للشيخ محمد ناصرالدين الألباني.

جێبەجێکردنی ئەرکە پێویستەکان(الأعمال الواجبة) چ فەرزی عەینی بن چ کیفائی، لەسەر هەر کام لەپیاوو ئافرەت فەرزە، چونکە: هەر شتێك فەرزێك یەکی لەسەری بکەوێ فەرزە (ما لا یتم الواجبُ الا بهِ فهو واجِبٌ)، پێغەمبەریش لەوبارەوە فەرموویەتی: ((**طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ**)) رواه ابن ماجه، وصححه الألباني في صحيح ابن ماجه: ٣٩١٣، واحمد وغيرهما.

ئاشکراشە کەخوای پەروەردگار لەچەند جێیەکی قورئانیێدا ئەرکی فەرمان بەچاکەکردنو رێگریی لەخراپەکردن (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)ی لەسەر تێکرای مسوڵمانان بەنێرو مێو وردو درشتەوە فەرز کردوە، بۆ وێنە:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾ (التوبة:٧١).

ئاشکراشە کەچەمكو واتای چاکە(المعروف) و خراپە(المنكر) زۆر فراوانەو هەرچی جینسی چاکەو خراپە دەیگرنەوە، چ لەرووی عەقیدەیی و فیکرییەوەو، چ لەرووی کۆمەڵایەتی و، چ سیاسیی و، چ ئابووریی و.. هتد.

٣- پشتگوێ خستنو کەمتەرخەمیی کردن لەجێبەجێکردنی مافەکانی ژندا، بەبیانووی دینداریی کردنو لەخواو دوارۆژ ترسانو، ژیانی دنیا بەکەمو سادەگرتن! بەڵێ ئەمیش عادەتو نەریتێکی نەزانانەو ناشەرعییانەی ژمارەیەك لەو پیاوانەیە کەژنو ماڵیان هەیەو، زۆر کەمتەرخەمن لەجێبەجێکردنی هەقو مافەکانیاندا، کەشەرع لەبواری ژنو مێردایەتیی و هەڵسوکەوتی ژنو مێرددا، لەسەر پیاوانی فەرز کردوون، شایانی باسیشە کەهەقو مافی ژن لەسەر مێردی لەرووی ماددیی و مەعنەوییەوە، چەندان دەقی قورئانو سوننەتی لەسەر هەن، بۆ وێنە:

أ- ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾ (النساء: ١٩).

واتە: وە بەشێوەیەکی باش لەگەڵیان (لەگەڵ ژنەکانتاندا) ڕەفتار بکەن، جا ئەگەر لەسەر هەندێك کەموکوڕییان - ڕقیشتان لێیان بوو (ئەوە هەر لەگەڵیان خۆشڕەفتاربن) چونکە زۆر نیزیکە لەحاڵێکدا کەڕقتان لەشتێکە، خوا خێرو قازانجی زۆری تێدا پەیدا بکات.

ب- ﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾(البقرة: من الآية٢٢٨)، کەپێشتریش هێنامان.

ج- ((..**ألاَ إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقًّا وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا..**))رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح. واتە: (ئاگاداربن کەئێوە هەقتان لەسەر ژنەکانتان هەیەو ئەوانیش هەقیان لەسەرتان هەیە).

د-((**عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: آخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ سَلْمَانَ وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَرَأَى أُمَّ الدَّرْدَاءِ مُتَبَذِّلَةً، فَقَالَ لَهَا: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: أَخُوكَ أَبُو الدَّرْدَاءِ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا.. فَجَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا فَقَالَ: كُلْ، قَالَ: فَإِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: مَا أَنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأْكُلَ، فَأَكَلَ.. فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يَقُومُ، فَقَالَ لَهُ: نَمْ، فَنَامَ، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ، فَقَالَ له: نَمْ، فَلَمَّا كَانَ آخِرُ اللَّيْلِ، قَالَ سَلْمَانُ: قُمْ الآنَ، فَصَلَّيَا جَمِيعًا، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ.. فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ صَدَقَ سَلْمَانُ**)) رواه البخاري.

واتە: (پێغەمبەر ﷺ سەلمان و ئەبودەرداى پێکەوە کردنە برا، جا سەلمان (سەلمانى فارسیى) سەردانى ئەبودەرداى کردو، دایکى دەرداى بەشێوەیەك بینى کەدەستى بەخۆیدا نەهێنا بوو! جا پێى گوت، ئەوە چیتە؟! ئەویش گوتى: ئەبودەرداى برات گوێ بەدنیا نادات! ئنجا ئەبودەرداء هاتەوە خواردنى بۆ ساز کردو پێى گوت: بخۆ، گوتى: من بەڕۆژووم، ئەویش گوتى: هەتا نەخۆى ناخۆم، ئیدى بەناچاریى خواردى، پاشان کەشەو داهات ئەبودەرداء هەڵسا بۆ شەونوێژان، ئەویش (واتە: سەلمان) پێى گوت: بخەوە، ئەویش خەوت، پاشان هەڵسا کەشەو نوێژان بکات، بەڵام دیسان پێى گوت: بخەوە، ئنجا لەکۆتایى شەوگاردا سەلمان گوتى: ئێستا هەڵسە! ئیدى پێکەوە نوێژیان کرد (واتە: شەونوێژ)، ئنجا سەلمان پێى گوت: بێگومان هەقى پەروەردگارت لەسەرە، وە بێگومان هەقى خۆتت لەسەرە، وەهەقى هاوسەرەکەتت لەسەرە، جا هەقى هەموو خاوەن هەقێك بدە، دوایى کە چوە لاى پێغەمبەرﷺ و ئەوەى بۆ باس کرد، پێغەمبەرشﷺ وەئەوەى کە ڕوویدا بوو (لەنێوان ئەوو سەلمان دا) بۆى گێڕایەوە، پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم فەرمووى: سەلمان ڕاستى کردوە.)

جا خوێنەرى بەڕێز!

بەپێویستى دەزانم چەند هەڵوەستەیەك لەبەرانبەر ئەم فەرمایشتە بەپێزەدا بکەم، چونکە مادام پێغەمبەرى خوا ﷺ پشتگیریى سەلمانى فارسى کردوەو فەرموویەتى: سەلمان ڕاستى کردوە، کەواتە هەرچى سەلمان کردوویەتى و گوتوویەتى- لەو بەسەرهاتەدا کە گێڕامانەوە- بەحوکمى بەڕاست دانان(تصدیق)ى پێغەمبەرى خواﷺ دەچێتە ڕیزى جۆرى سێیەمى سوننەتەوە، کەپێى دەگوترێ:

(السُّنَّة التقريرية):

**یەك:** لەم فەرموودەیەدا دەردەكەوێ كەسەلمان خوا لێی ڕازی بێ، چۆتە ماڵی ئەبودەرداء خوا لێی ڕازی بێ، بێئەوەی خۆی لەماڵێ بێت، بە بەڵگەی ئەوە كەپاش باس كردنی چاكو چۆنیو هەواڵپرسیی سەلمان لەگەڵ هاوسەری ئەبودەرداء دا، باسی هاتنەوەی ئەبودەرداء كراوە: (**فَجَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ...**)، كەواتە ئەو ئاڵۆزكردن(تعقيد) و حەساسیەتەی كەهەندێك كەس لەوبارەوە كردوویانەتە پیشەو، بەهیچ جۆرێك لەخێزانیان قبووڵ ناكەن - مادام خۆیان لەماڵ نەبن- پێشوازییو بەخێرهاتنی هیچ میوانێك بكەن، هەرچەندە دۆستو خزمو ناسیاوێكی دینداریش بێت! با بزانرێ كەئەو عادەتە هەرچەندە بەناوی دینداریەوە دەكرێ، بەڵام وا نیەو هەڵقوڵاوی میزاجو تەبعی خۆیانە!

دیارە ئەو فەرمایشتانەش كە لەڕیزی هەقو مافەكانی مێردا بەسەر ژنەكەیەوە باسی ئەوە دەكەن، كەنابێ ژن فەرموو لەكەسێك بكات كەمێردەكەی حەز لەچارەو هاتنە ماڵەوەی ناكات، بەڵگەیەكی دیكەی بەهێزن بۆ ئیسپاتی ئەوە كە گوتمان، كەیەكێك لەو فەرمایشتانە ئەمەیە: ((..**فَحَقُّكُمْ عليهِنَّ أنْ لا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ، ولا يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ**..))رواه الترمذي وقال: حسن صحيح.

واتە: مافی ئێوەیە لەسەر ژنەكانتان كە هەركەسێك ئێوە حەزی پێنەكەن، لەسەر شوێنی تایبەتی ئێوە داینەنیشێنن، وە هەركەسێك ئێوە حەز لەچارەی نەكەن، فەرمووی لێ نەكەن.

چونكە مادام بۆیان نەبێ فەرمووی هاتنەماڵ لەكەسانێك بكەن كەدەزانن مێردەكانیان حەز لەچارەیان ناكەن، دیارە بۆ كەسانی دیكەی كە وا نین

ئازادن كەفەرموویان لێ بكەن.

دوو: هەروەها لەچاكو چۆنی كردنو پرسیاری ئەوە چیتە؟ (**مَا شَأْنُكِ؟!**)ی سەلماندا، كەئاراستەی هاوسەری ئەبودەردائی كردوە، ئەوە دەفامرێتەوە كەئینسانی مسوڵمان بۆی هەیە چاكو چۆنیو هەواڵپرسیی لەگەڵ هاوسەری دۆستو برای مسوڵمانیدا بكاتو، ئەگەر هەستیشی بەوەزعو حاڵەتێكی نائاسایی كرد، پرسیاریشی لێبكاتو هەوڵی چارەسەركردنی كێشەو گرفتەكەیشی بدات، وەك سەلمانی فارسی كردوویەتی، كەواتە بائێمەی مسوڵمانیش لەهەموو شتێكداو بەكردەوەو ڕەفتار شوێن پێی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی خوا لێیان ڕازی بێت هەڵگرین، نەك هەر بەقسەو لاف لێدانو موزایەدە بەسەر خەڵكییەوە كردن باسی قورئانو سوننەتو ڕێبازی پێشینەی چاك (السَّلف الصالح)مان بكەینو بەكردەوەو ئاكاریش ئاسمانو ڕێسمانمان بەین بێت!

سێ: لەڕۆژوو پێشكاندنی سەلمان بەئەبودەرداء، پاشان ڕێ پێنەدانی بەشەو نوێژكردنیدا، هەتا كۆتایی شەوگار، ئەوە وەردەگیرێ كەدەبێ ئینسانی مسوڵمان ئامۆژگاریی خوشكو برایانی مسوڵمانی بكاتو، چی بەچاكو شەرعیی دەزانێ ئاگاداریان بكاتەوەو، هەڵەو ناشەرعییەكانیان بۆ ڕاست بكاتەوە.

چوار: لەڕستەی: (**وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا**)دا ئەو ڕاستییە دەبینرێ كەدینداریی‌و خواپەرستیی تەنها بریتی نیە لەڕۆژووگرتنو نوێژكردن! بەڵكو جێبەجێكردنی مافەكانی ژنو ماڵیش - بەتایبەت سەرجێیی‌و ژنو مێردایەتیی كردن كەسیاقی بەسەرهاتەكەی سەلمانو ئەبودەرداء دەلالەتی لەسەر دەكات - یەكێكە لەجۆرو شێوەكانی دینداریی‌و خواپەرستیی.

هەر بۆیەش (عبداللە بن عباس) – خوالێیان ڕازی بێ- لە بەر ڕۆشنایی ئایەتی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾ وە ئایەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ دا گوتوویەتی: ((**إني أُحِبُّ أنْ أتـزَيَّن للمرأةِ كما أُحِبُّ أن تتـزَيَّن لي**))رواە ابن جرير وابن ابي حاتم ،واتە:من حەز دەکەم خۆم بۆ ئافرەت برازێنمەوە ،وەك چۆن حەز دەکەم کەئەویش خۆیم بۆ برازێنێتەوە!)[1] [2].

ئەوەش کورتەیەك بوو لەو هەڵەو کرچو کاڵییو کەموکوڕییانەی کە ژمارەیەکی زۆر لەمسوڵمانان لەبواری هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتدا، گیرۆدەیان دەبنو ئیسلامو شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێو دادگەر لێیان بەرییەو، ڕەوا نیە لەسەری حیساب بکرێن، ئاخر چۆن ڕەوایە شەریعەت هەڵوێستو ڕەفتاری هەڵەو لادەرانەی کەسانێکی لەسەر حیساب بکرێن کەبەقسەیان نەکردووەو سەرپێچییان لەفەرمانەکانی کردووە؟!




(١) بڕوانە: المصباح المنيرفي تهذيب تفسيرابن كثير،ص١٦٦..
(٢) لەباسەکانی داهاتوودا بەوردی باسی چۆنیەتی هەڵسوکەوتو ئەدەبە کانی نێوان ژنو مێرد دەکەین.

**یازدەم : ئەگەر بە قورئان‌و سوننەتەوە پابەند بین‌و پەیڕەویی لە پێشینەی چاك(السلف الصالح)مان بكەین، دەبێ لە هەموو بوارەكانی ژیاندا ئافرەتان ڕۆڵی خۆیان بگێڕن**

شتێكی ئاشكرایە كە شەریعەت‌و بەرنامەی خوا لە قورئان‌و سوننەتدا كورت هەڵاتوەو، بێجگە لە ئایەتەكانی خواو دەقەكانی سوننەتی پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) قسەو كردەوەی هیچ كەسێكی دیكە بە بەشێك لە (دین)و (شەریعەت) دانانرێ‌و، ئەو پەڕەكەی تەفسیرو لێكدانەوەیەكی ڕاست‌و بەجێی شەریعەتە، هەزاران ڕەحمەتیش لە پێشەوایانمان كە لە چەندان قسەو هەڵوێستیاندا ئەو ڕاستییە مەزنەیان درەوشاندۆتەوە، ئەوەتا ئیمام)واتە: هەر كام لە زانایان لەبارەی دینەوە قسەیان لێ‌وەردەگیرێ‌و بەسەریشیاندا دەدرێتەوە، جگە لەخاوەنی ئەم گۆڕە، كە مەبەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووەو لەو كاتەدا لەتەنیشت گۆڕی موبارەكیەوە ڕاوەستاوە.

هەروەها ئیمام (شافیعی) هەر لەو بارەیەوە گوتوویەتی:[1]

كل العلوم سوى القرآن مَشْغَلَةٌ     وسوى الحديث والفقه في الدين

العِلمُ ما كان فيه‌قالَ، حَدَّثَنا     سوى ذلك وسواس الشياطين

دیسان شتێكی ڕوون‌و بێ چەندو چوونە كە هیچ كام لە وەچەكان(أجيال)ی

---

(١) لە كتێبی (زانایانی ئیسلام كێن‌و چۆنن؟!) دا ئەو شیعرە مانا كراوەو ئەو باسەش جوان ڕوون كراوەتەوە، بڕوانە: چاپی سێیەم: ٢٠١١ز.

ئوممەتی سەربەرزی پێغەمبەری پایەبەرزمان (ﷺ) هێندەی سێ وەچەو سەدەکانی سەرەتای ئیسلام ڕاستو قوولو تەواو لە قورئانو سوننەت تێنەگەیشتوونو پێیانەوە پابەند نەبوون، ئەمەش بەشایەدیی پێغەمبەری خوا (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((**خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ**))(متفق عليه) واتە: (باشترین خەڵکی خەڵکی ئەم سەدەیەی منن، ئنجا ئەوانەی لە دوایانەوە دێن، پاشان ئەوانەی لەدوایانەوە دێن.

**کەواتە:**

هاوەڵان (اصحاب)ی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و شوێن کەوتوانیان (تابعین)و شوێن کەوتوانی شوێن کەوتوان (تابعي التابعين)، بەشایەدیی دانی ڕاست ترین ئینسان، چاکترینی خەڵکین، بێگومانیش کەسانێك لەلای خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لە هەموو کەس چاکترن، کە لەهەموو کەس ڕاست تر لە قورئانو سوننەت تێگەیشتبنو، لە هەموو کەسیش باشتر پێیانەوە پابەند بن.

جا ئێستا با لەبارەی بوار پێدانی ئافرەت بۆ ڕۆڵ گێڕانیان لە هەموو لایەنەکانی دینو ژیندا، سەرنجی چەند دەقێکی قورئان، پاشان چەند دیمەنو ڕووداوێکی سیرەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی بدەین، داخۆ چی دەبینین!! داخۆ جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئاڕاستەکان (توجیهات)ی قورئانو هەڵوێستو ئاکارو ڕەفتارەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و هاوەڵە بەڕێزەکانیو، گەلێك هەڵوێستو ڕەفتارو بیرو بۆچوونی کرچو کاڵو ناشەرعییانەی ژمارەیەك لە خەڵکی مسوڵمانی ئەم ڕۆژگارەمان نابینین، کە بێگومان تەنها لە میزاجو تەبعی خوارو خێچی خۆیانەوە هەڵقوڵیونو، پەیوەندییان بە دینو شەریعەتەوە نیە، هەرچەندە بەداخەوە زۆربەیان (نازانن‌و ناشزانن کە نازانن)و گیرۆدەی نەزانینی ئاوێتە (الجهل المركب) بوون!

## یەكەم: چەند دەقێكی قورئان:

١- ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ (التوبة: ٧١)

واتە: وە پیاوانی برواداروو ئافرەتانی بروادار، هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن، فەرمان بەچاكە دەكەنو ڕێگریی لە خراپە دەكەن، و نوێژ بەرپا دەكەنو زەكات دەردەكەن، و فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن، ئائەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێتەوە، بێگومان خوا زاڵی كاربەجێیە.

وەك دەبینین خوای كاربەجێ پیاوو ئافرەتی بڕواداری بە دۆستو پشتیوانی یەكدی داناونو هەر كام لە ئەركەكانی: فەرمان بەچاكەو ڕێگریی لە خراپەو، نوێژ بەرپاكردنو، زەكاتدانو، فەرمانبەریی كردنی خواو پێغەمبەریﷺ، بە ئەركی سەرشانی هەردووك لایان داناوە، بەبێ جیاوازیی.

ئاشكراشە كە هەر كام لە وشەی (المعروف)و (المنكر) چونكە (أل)ی (تعریف)یان لەسەرە وەك شارەزایانی زمانی عارەبی گوتوویانە، جینسی چاكەو خراپە دەگرنەوە، جا چ پەیوەندییان بە لایەنی ئیمانو عەقیدەوە هەبێ، چ بە لایەنی عیبادەت، چ ڕەوشتو ئاكار، چ ئابووریی‌و بازرگانی، چ كۆمەڵایەتی، چ حوكمو سیاسەت، وە چ جیهادو جەنگو بەرەنگاریی.

دیسان نوێژو زەكاتیش دوو پایەو كۆڵەكەی گەورەو گرنگی ئیسلامنو یەكیان هەقی خوایەو ئەوی دیكەشیان هی خەڵكیو، یەكیان ڕووحییەو

یەکیان ماددیی.

هەروەها فەرمانبەریی کردنی خواوپێغەمبەریش، کە وەك توێژەرەوەکانی قورئان دەڵێن: (ذكر العام بعد الخاص)ە، هەرچی هەڵس و کەوتی ئینسانە، بە تاك و کۆمەڵەوە دەیگرێتەوە.

**مادام وابێ:**

پیاوو ئافرەت وەك یەك و بەبێ جیاوازیی و کەم و زیاد، لە بەرانبەر شەریعەتدا بەرپرسیارن، بێجگە لەچەند شتێکی تایبەت کە سروشتی هەر کام لە پیاوو ئافرەت داخوازیی دەکات، کە تێیاندا جیاواز بن و تایبەت بن بەیەکێکیانەوە، وەك: دایکایەتیی و بەخێوکردنی منداڵ و کابانێتی، بۆ ئافرەت، وە بژێو پەیداکردن و کەسابەت و، سەرپەرشتی کردنی ماڵ و خێزان و، جەنگ و جیهاد، بۆ پیاو.

٢- ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ ﴾ (الأحزاب: ٣٥)

واتە: بێگومان پیاوانی مسوڵمان و ئافرەتانی مسوڵمان، وە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، وە پیاوانی ملکەچ بۆ خواو ئافرەتانی ملکەچ، و پیاوانی ڕاست و ئافرەتانی ڕاست، و پیاوانی خۆ ڕاگرو ئافرەتانی خۆ ڕاگر، و پیاوانی لەخواترس و ئافرەتانی لە خوا ترس، و پیاوانی ماڵبەخشەر لە پێناوی

خواداو ئافرەتانی ماڵبەخشەر، و پیاوانی ڕۆژووگرو ئافرەتانی ڕۆژووگر، و پیاوانی داوێن پارێزو ئافرەتانی داوێن پارێز، پیاوانی زۆر خوا لەیادو ئافرەتانی زۆر خوا یادکەر، خوا لێبوردنو پاداشتێکی گەورەی بۆ ئامادە کردوون.

لەم ئایەتەشدا دەبینین کە خوای دادگەر ئافرەتانی لەگەڵ پیاواندا لە دە(١٠) خەسڵەتی گەورەو بنەڕەتی ئیسلامدا پێکەوە بەراورد کردوونو، پاشان موژدەو بەڵێنی لێبوردنو پاداشتی گەورەی خۆی پێداون. شایانی باسیشە ئەو دە خەسڵەتو کردەوەیەش سەرجەم بوارەکانی عەقیدەو عیبادەتو ئەخلاقو تەزکیەیان گرتۆتەوە، تاکولە لای هەموو کەس ڕوونو ئاشکرا بێت کە ئافرەتو پیاو لە جێبەجێ کردنی سەرجەم ئەرکە شەرعییەکاندا یەکسانن.

٣- تێکڕای زانایانی (اصول الفقه) لەسەر ئەوە کۆکن کە هەر جارێك خوای زاناو توانا بە صیغەی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ مسوڵمانان بدوێنێ، ئەوە هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ پێکەوە وەك یەك دەگرێتەوە، مەگەر بەبەڵگەو نیشانە(قرینة)یەك تایبەت کرابێت بەیەکێکیانەوە. [1]

## دووەم: چەند دیمەنو ڕووداوێك لە سیرەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزیدا:

وەك پێشتر گوتمان هیچ کەس هێندەی پێشینەی چاکمان- کە مەبەستمان پێی خەڵکی سێ سەدە چاکەکان(أهل القرون الثلاثة الخيرة)ە- باش لە قورئانو سوننەت

---

(١) بۆ وێنە بڕوانە: (الإحكام في أصول الأحكام) لابن حزم الاندلسي، ج٣ ص ٣٣٧.

حاڵی نەبووەو پێیانەوە پابەند نەبووە، جا با چەند هەڵوێستو ڕەفتارێکی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی بۆ دەرخستنی دەورو ڕۆڵی ئافرەت لەو کۆمەڵگا ئیسلامییە نموونەییەدا، بە وێنە بێنینەوە:

## ١- لە ڕووی سیاسییەوە:

أ- (الواقدي وابن عساکر)لە (عبدالله بن الزبير)ەوە خوالێیان ڕازی بێ هێناویانە کە لە ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا (أم حکیم بنت الحارث بن هشام) ژنی (عکرمة بن ابي جهل) مسوڵمان بوو، پاشان (أم حکیم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (عکرمة) لە ترسی ئەوە کە بیکوژی، ڕایکردوە بۆ یەمەن، جا پەنای بدە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: با دڵنیا بێ (هو آمن).

ئنجا (أم حکیم) لەگەڵ غولامێکی ڕۆمی خۆیدا بەدوایدا چوو، وە لە کەنارێك لەکەنارەکانی (تهامة) فریای کەوت، پێی گوت: ئامۆزام! لەلای خزم دۆست ترین کەسو چاکەکارترین کەسو باشترین کەسەوە هاتوومە لاتو، خۆت مەفەوتێنە، ئیدی (عکرمة) بۆی وەستا هەتا پێی گەیشتو گوتی: من ئەمانم لە پێغەمبەری خوا بۆ وەرگرتووی، ئەویش گوتی: ئەوەتکردوە؟! گوتی: بەڵێ خۆم قسەم لەگەڵ کردوەو ئەمانی پێداوی، ئەوجا لەگەڵی گەڕایەوە.[١]

ب- هەروەها (بخاريو مسلم) هەر لەو بارەوە گێڕاویانەتەوە کە (أُم هانيء بنت ابي طالب) خوا لێی ڕازی بێت لە ئازاد کردنی مەککەدا، دوو کەس لە

(١) بڕوانە (نحو صحوة أسلامية في مستوى العصر) فتحي يكن، ص٣١٢، ٣١٣.

خزمەکانی خۆی پەنا دابوو، کەچی (علي) برای خوا لێی رازی بێ، دەیویست بیانکوژێ، جا (ام هانيء) چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، ئەویش پشتگیریی کرد و فەرمووی: ((**قد أجرنا من أجرتِ يا أمَّ هانيء**) واتە: هەر کەسێك تۆ پەنات دابێ ئەی (ام هانيء)ئەوە ئێمەش پەناماندا)).

ج- هەروەها بەیعەت پێکردنی ئافرەتان بە پێغەمبەری خوا ﷺکە لە سوورەتی (الممتحنة)دا باسکراوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٢﴾ (الممتحنة:١٢).

وە (بيهقي) گێڕاویەتەوە کە خەڵکی لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا، هاتوونە لای پێغەمبەر ﷺ گەورەو گچکە، پیاوو ئافرەت و بەیعەتیان پێی کردوە.[١]

د- وە هەڵوێستی (عبدالرحمن بن عوف) لەبارەی پێشنیار کردنی خەلیفەی سێیەمەوە کە دەڵێ: راوێژم بە هەموو کەس کرد تەنانەت ئافرەتانی پشت پەردە(ذوات الخدور)[٢]یش! بەڵێ ئەم دەق و قسانە، ئەوە دەگەیەنن کە ئافرەتان نەك هەر مافیانە، بەڵکو ئەرکی سەرشانیانە کە لە بواری سیاسیدا رۆڵی خۆیان بگێڕن.

---

(١) بڕوانە: (البداية والنهاية) لابن كثير، ج٣ ص ١٦٣.
(٢) بڕوانە: (المفصَّل فى احكام المرأة والبيت المسلم) ج٤ ص٣٢٤.

## ٢-لە ڕووی بەرەنگاریی‌و جەنگ‌و جیهادەوە:

أ- (الحاكم) لە (عبدالله بن جعفر)ەوە خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوەو گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای (یاسر)و (عمّار)و (أم عمّار)دا ڕەتبوو کە لە پێناوی خوای بەرزدا ئەشکەنجە دەدران، ئەویش فەرمووی: ((**صَبْراً یاآل یاسر، صبراً یاآل یاسر، فأنَّ موعِدکم الجَنّةُ**)).[١]

واتە: ئەی بنەماڵەی یاسر. خۆڕاگربن، ئەی بنەماڵەی یاسر خۆڕاگربن، لەبەهەشت پێك دەگەینەوە.

وە (أحمد) لە (مجاهد)ەوە هێناویەتی کە گوتوویەتی: یەکەمین شەهید لە ئیسلامدا (سُمیَّة)ی دایکی عەممار بوو، کە ئەبوو جەهل ڕمبێکی لە نێوگەڵی دا تا مرد.[٢]

ب- (طبراني)لە (أم سُلَیم)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەرﷺ چەند ئافرەتێکی ئەنصاریی لەگەڵی دەچوونە غەزایە کە ئاویان بە نەخۆشان دەداو تیماری بریندارانیان دەکرد.

ج- (بخاري) لە (ثعلبة بن أبي مالك) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ پۆشاکی لە نێو ئافرەتانی مەدینەدا بەشکرد، پاشان پۆشاکێکی زۆر باش مایەوەو هەندێك لەوانەی کە لەدەوری بوون گوتیان: ئەی گەورەی بڕواداران! ئا ئەمەیان بدە بەکچی پێغەمبەری خوا ﷺ کە هاوسەرتە، مەبەستیان (أم کلثوم بنت علي بن أبي طالب)بوو، عومەریش خوا لێی ڕازیبێ گوتی: (أم سُلَیْط) شایستەترە، (أم سُلَیْط) لەو

---

(١) بڕوانە: (الاصابة في تمییز الصحابة) ج٣ ص ٦٤٧.

(٢) بڕوانە: (البدایة والنهایة) ج٣ ص٥٩.





ئافرەتانەیە کە کاتی خۆی بەیعەتی بە پێغەمبەری خوا دابوو، عومەر گوتی: چونکە ئەو ئافرەتە لە جەنگی ئوحوددا کوندەی[1] ئاوی بۆ دەدوورین.

د- (أبو داود) لە (حشرج بن زياد) لە نەنکی- دایکی بابی یە وە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی، کە ئەوان (واتە ئافرەتان) لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ بۆ خەیبەر چوون، وە تێیدا هاتوە کە پێغەمبەرﷺ لەو بارەوە لێی پرسین، ئەوانیش گوتیان: هاتووین تاکو تەشی بڕێسین و کەلوپەلی جەنگی پێ سازبکەین، و برینداران دەرمان بکەین، و تیرانتان وێ بدەین، وە شۆرباتان بۆ ساز بکەین.

هـ- (طبراني)لە (مهاجر)ەوە هێناویەتی کە (أسماء بنت يزيد بن السَّكن) ئامۆزای (معاذ بن جبل) خوا لێیان ڕازیبێ، لە جەنگی یەرمووك دا نۆ کەس لە ڕۆمەکانی بە دینگەی ڕەشماڵێ کوشتبوون.

و- هەروەها (بخاري)لە (**الرُّبَيِّع بِنْت مُعَوِّذ**)ە گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: ((**كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللّٰهِﷺ، نَسْقِي وَنُدَاوِي الْجَرْحَى وَنَرُدُّ الْقَتْلَى إِلَى الْمَدِينَةِ**))

واتە: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ دەچووینە غەزایە، ئاوماندەدا بە برینداران و تیمارمان دەکردن، وە جەنازەی کوژراوەکانیشمان دەهێنایەوە بۆ مەدینە.

## ٣- لەڕووی چالاکییە جۆراو جۆرەکانەوە:

أ- (بخاري) لە (سهل بن سعد)ەوە خوالێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: ئافرەتێکمان هەبوو لە کێڵگەیەکیدا سڵقی دەچاند، جا کە ڕۆژی جومعە دەهات بنکی سڵقی لە مەنجەڵێك دەکرد، پاشان چەند مستە جۆیەکی

---

(١) کوندە، مەشکە، جەوەندە.

هاڕڕاوی تێدەکردو، بنکە سلّقە کە لە جیاتی بەرە شێو بوو، (سەهل) دەڵێ: جا ئێمە ڕۆژانی جومعە پاش نوێژ کردن سەلامان لێی دەکرد و ئەویش ئەو چێشتە (سووپی جۆ)ی بۆ دادەنایین، حەزمان دەکرد ڕۆژی جومعە زوو بێت لەبەر خاتری چێشتەکەی!

ب- هەروەها (بخاري) لە عائیشەوە خوالێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوەکە پێغەمبەری خواﷺ لە مزگەوتەکەی خۆی دا بەپێوە وەستاوەو عائیشەی هاوسەری بۆ تەماشاکردنی یاری و وەرزشی حەبەشەیی یەکان لە پشتییەوە وەستاوەو، ڕوومەتی بەڕوومەتی پێغەمبەرەوە ﷺ نووساندوەو، پێغەمبەریش هانی حەبەشییەکانی داوەو فەرموویەتی: ((**دونكم يابني أرفدة**)).

ج- دیسان هەر (بخاري) لە عائیشەوە خوالێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان کە تازە عائیشەی هێناوە پێشبڕکە(مسابقة)ی ڕاکردنی لەگەڵ کردوەو عائیشە پێشی کەوتۆتەوە، پاشان جارێکی دیکە کە ئەوجار عائیشە تۆزێك کەوتۆتە تەمەنەوەو گۆشتی گرتوە، پێشبڕکەی لەگەڵ کردوەو، ئەو جارەیان پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی کەوتۆتەوەو فەرموویەتی: ((**هذه بتلك**)) ئەم جارەیان بەجارەکەی دیکە!

**تێبینی:** دیارە لە فەرموودەکەدا هاتوە کە پێغەمبەرﷺ لە شوێنێکی چۆڵ و پاش ئەوەی سوپایەکەی ئیزنداوە، کە تێپەڕن ئەوجار پێشبڕکەکەی کردوە.

د- (البزار)لە (إبن ابی أوفی)وە خوالێی ڕازیبێ، کە هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کردوە گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: جەنازەکەی هەڵگرن و پێشتان خۆش بێ کە هەڵی دەگرن، چونکە -ئەو ئافرەتە- خۆی و غولامەکانی بەشەوێ بەردیان بۆ ئەو مزگەوتە دەکێشا کە لە سەر پارێزکاریی بنیات

نراوە(الَمَسْجِدُ الذي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى).

هـ- (إبن عبدالبر) لە (عائشة)وە خوالێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە، کە گوتوویەتی: ((**نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ لَمْ يَكُنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَسْأَلْنَ عَنْ الدِّينِ وَيَتَفَقَّهْنَ فِيهِ**)) واتە: باشترین ئافرەتان ئافرەتانی ئەنصاریی بوون، کە شەرم کردن نەدەبووە ڕێگریان کە لەبارەی ئاینەوە پرسیاربکەن و تێیدا شارەزا بن.[1]

و- لە(صحيح البخاري)[2]دا هاتوە کە پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی پێکهاتنی ناسراو بە (صلح الحديبية)دا پاش ئیمزا کردنی ڕێککەوتننامەکە، فەرمانی کرد کە هاوەڵان (أصحاب) خوا لێیان ڕازیبێ ئیحرامەکانیان بشکێنن، چونکە ئەو ساڵە بەپێی سوڵحەکە دەبوایە بگەڕێنەوە و نەچنە مەکەوە، بەڵام هاوەڵان زۆر لەسەر دڵیان قورس بوو و هەرچەندە سێ جار پێی فەرموون، فەرمانەکەیان جێبەجێ نەکرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵتەنگ بوو و چووە چادرەکەی خۆیەوەو، سکاڵای خۆی لای (أم سلمة)ی هاوسەری کردو فەرمووی: ((**يا أم سلمة ما شأن الناس؟!**)) ئەی دایکی سەلەمە! ئەوە ئەو خەڵکە بۆ وادەکەن ؟!)) ئەویش پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا: خۆت دەبینی زۆر نارەحەتن (بەجۆری ڕێککەوتننامەکەو بەگەڕانەوەشیان و نەچوونیان بۆ شاری مەککە)، جا تۆ هیچ کامیان مەدوێنە و قوربانییەکەت سەربڕەو سەرتاشیش بانگ بکە سەرت بتاشە، جا هەرکات تۆ وات کرد خەڵکەکەش بەناچاریی وادەکەن! ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرێ و

---

(١) بڕوانە: (الجامع فی بیان فضل العلم وأهله) ج١ ص٨٨.

(٢) هەروەها بڕوانە: (تفسير القرآن العظيم) ج٤ ص١٩١، وە بڕوانە: (سيرة رسول الله ﷺ الرحيق المختوم) صفي الرحمن المباركفوري، ص ٣٩٠.

قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد، هەتا قوربانییەکەی خۆی سەربڕی پاشان دانیشت و سەری تاشی، ئیدی خەڵکەکەش هەڵسان دەستیان کرد بە سەربڕینی قوربانییەکان و سەری خۆتاشینیان.

**کەواتە:** پێغەمبەری خواﷺ پرس و ڕاوێژی بە (أم سلمة)ی هاوسەری کردوە، بۆ چۆنیەتی دەرباز بوون لەو کێشەو گرفتە زلە کە هاتبووە پێشی و، لە پێشنیاری ئەو هاوسەرە بەرێزو دانایەشی خوالێی ڕازیبێ، بەهرەمەند بووە بۆ چارەسەری ئەو گیرو گرفتە!

ی- (أبو حاتم)لە (ابو عجفاء السلمي)یەوە هێناویەتی[1] کە ڕۆژێکیان (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازیبێ، لەسەر مینبەر وتاری داو نەهی کرد لەداوا کردنو وەرگرتنی مارەیی زۆر، کەچی ئافرەتێك ڕەخنەی لێگرتو گوتی: هەقێك کە خوا پێمان دەدات بۆچی تۆ لێمان قەدەغە دەکەی، ئەدی خوا نەی فەرموە: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾﴾ (النساء: ٢٠)

واتە: ئەگەر ویستتان دەست لە هاوسەرێك هەڵگرنو هاوسەرێکی دیکە بگرن، وە(قِنطار)[2]یك مارەییتان دابووە یەکێکیان، هیچی لێ وەر مەگرنەوە؟!

(١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القران) للقرطبي، ج٥ ص٩٩، و (أحمد و ترمذي) گێڕاویانەتەوەو بە (صحيح) یان داناوە.

(٢) (قنطار) چەند پێناسەیەکیان هەن، یەکێکیان (پڕی پێستێك زێڕ)ە، بەڵام ئەگەر بگوترێ ئەندازەیەکی زۆر، باشترە.

(عمر) یش لە بەرانبەر ڕەخنەو گلەیی ئەو ئافرەتەدا گوتی (اصابت إمـرأة و أخطأ عمر) واتە: ئافرەتێك پێکای‌و عومەر هەڵەی کرد!) وە لـە بڕیارەکـەی پەشێمان بۆوە.

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز:**

ئەوەی لەو چەند لاپەڕەیەداو زۆر بە گوشراویی خرایـە ڕوو، لەبـەر تیشـکی دوو ئایەتی بـەپێزی قورئـانی بـەڕێزو چـەند هەڵوێسـتو ڕەفتـارێکی هـاوەڵانی بـەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەر ﷺ دا کە بێگومان نموونەی هـەرە پرشـنگداری مسـوڵمانەتیی‌و پێشینەی چاکمانن، ئائەوەیە هەڵوێستی شەریعەتی خوای کار بـەجێ بەرامبـەر بـە ئافرەت‌و دەوربینینی لە سەرجەم لایەنەکانی ژیان‌و گوزەرانی میللەت‌و کۆمـەڵگای مسوڵماندا.

ئاشکراشە- وەك پێشتر گوتمان- کە ئیسلام تـەنها قورئـان‌و سـوننەتەو شـێوەی مسـوڵمانەتیی‌و دینـداریی کردنـی پێشـینەی چاك(السَّـلف الصـالح) یشـمان کـە بێگومان هاوەڵانمان لە ڕیزی پێشەوەیانن- سەنگی مەحەك‌و تەرازوو و پێـوەری لـە ئیسلام تێگەیشتن‌و بە شەریعەتەوە پابەند بوونن‌و، پێویستە هـەر کەسـێکی دیکـە جا خۆی بە هەر چییەك بزانـێ‌و، هـەر پایـەو مـەقامێکی هـەبێ، لەبـەر ڕۆشـنایی قورئان‌و سوننەت‌و ڕێبازو ڕێ‌و شوێنی پێشـینەی چـاکماندا، چـاو بـە تێگەیشـتنی خۆی‌و شێوەی مسـوڵمانەتییەکەیدا بگێڕێتـەوە، نـەك بـە بیـانووی دینـداریی و لـە خواترسـانەوە تـەبعو میزاجـی تایبـەتی خـۆی، یـان عـورف‌و نـەریتی کۆمـەڵگاو میللەتێك بکاتە تەرازوو و پێوەری تێگەیشتنی لە قورئان‌و سوننەت!

هەروەها مسوڵمانەتیی‌و دینداریی ڕاستەقینە، تەنها ئەوەیە کـە مـرۆڤ هەرچـی زیاترو چاکتر هەوڵی لـێ تێگەیشتن‌و پێوە پابەند بوونی ڕێبـازی پێشـینەی چـاکمان بدات، نەك یەکێك بیـەوێ لـە ئیسـلام ئیسـلامتر و لـە شـەریعەت بـەولاوەترو لـە

پێشینەی چاکمان پابەندتر بێت!! چونکە بێگومان هەر جۆرە لادان(انحراف)ێك لـە قورئانو سوننەتو شەریعەتی خوا، هەر لادانو تاوانە، جا چ بەباری کورت هێنانو بەزایەدان(تفریط)دا بێت، وە چ بەباری تێپەڕاندن(إفراط)دا بێت، و بێگومان نیازو مەبەستی پاكو چاك قەرەبوو(تعویض)ی نەپێکان(عدم إصابة) ناکاتەوە، بەڵکو مەرجی بۆ خوا بوون(الإخلاص لله) چەندە پێویستە، بەپێی شەرعی خوا بوون(اتّباع شرع الله)یش، هێندە پێویستە.

وە بەڕاستی من بە ئەزموونی تایبەتی خۆم بۆم ڕوون بۆتەوە کە ملکەچ کردنی میزاجو تەبع بۆ تەرازووی شەرعو، واز لـێهێنانی ئارەزوو (هَوی)و شوێن کەوتنی ڕێنمایی (هُدی)، کارێکی سووكو ئاسان نیەو لەگەڵ خۆخەریك بوون (مجاهدة النفس)و خۆ پاكو چاك(تزكية النفس) کردنێکی باشی دەوێت!!

## دوازدەم : شەریعەت لەسەر بناغەی ئینسان بوون بۆ ئافرەت دەڕوانێ، بەڵام ڕۆژئاوا لەسەر بناغەی مێینە( أنثى ) بوون!

ئەگەر سەرنجی سەرجەم دەقەکانی قورئانو سوننەت بدەین لەبارەی تێڕوانینیانەوە بۆ ئافرەت، ئەو ڕاستییە دەبینین کەشەریعەتی خوا لەسەر بناغەی (ئینسان) بوون هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتدا دەکات، وە ئەو ڕاستییە لەهەموو ئەو دەقانەدا دەدرەوشێتەوە کە لەبوارە جیاجیاکاندا سەبارەت بەئافرەت هاتوون، باسەرنج بدەین، بزانین چۆن؟!

## ١-لەڕووی ئەسڵی دروستبوونی ئافرەت و پیاوەوە، کەیەك چاوگیان هەیە:

خوای پەروەردگار لەزۆر جێیاندا ئەو ڕاستییەی خستۆتەڕوو کەئافرەت و پیاو لەیەك جۆرە نەفس دروست بوو ون، بۆ وێنە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ﴾(النساء:من الآية ١).

## ٢- لەڕووی بەندەی خوا بوونی ئافرەت و پیاوەوە وەك یەك:

ئەمیش لەگەلێك شوێندا ڕاگەیەنراوە، بۆ وێنە:

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ ﴾ (النحل: من الآية٩٧).

## ٣- لەڕووی قبووڵ کرانی کردەوەی چاکی پیاو و ئافرەتەوە، وەك یەك و بێ جیاوازیی:

ئەمیش لەگەلێك شوێناندا خراوەتە ڕوو، بۆ وێنە:﴿ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُواْ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ

﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥﴾[1](آل عمران:١٩٥).

## ٤- لەو ڕووەوە کە ئافرەتیش وەك پیاو بۆی هەیە خاوەن کەسابەت‌و ماڵ‌و سامانی خۆی بێت:

وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا﴾ (النساء: من الآية٣٢).

## ٥- لەو ڕووەوە کە ئافرەتیش وەك پیاو مافی هەڵبژاردنی هەیە لەدیاری کردنی هاوسەردا:

لەوبارەشەوە دەقی قورئان‌و سوننەت زۆرن، بۆ وێنە:

* ﴿هُنَّ لِبَاسٞ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٞ لَّهُنَّ﴾(البقرة: من الآية١٨٧)، جا بێگومان وەك چۆن هیچ کەس مافی ئەوەی نیە بەزۆر جۆرو ڕەنگێك کاڵاو پۆشاك بەسەر ژن‌و پیاودا بسەپێنێ، حەوجار حەوجاروباشتر، کەس مافی تۆبزیی کردن‌و سەپاندنی هاوسەری نیە بەسەر هیچ کامیاندا، وەك لەداهاتوودا بەدرێژیی باسی دەکەین.

---

(١) لەم ئایەتە بەپێزەوە دەفامرێتەوە کەنێرو مێی مسوڵمان پێویستە لە: هیجرەت‌و ئاوارەیی‌و ئازارو ئەشکەنجە دیتن‌و جەنگ‌و کوشتارو فیداکاریی دا، بەشداربن.

* پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((**لا تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ**)) متفق عليه.واتە: بێوەژن بەبێ ڕاوێژ پێکرانی مارە نـاکرێ، وەکـچ بەبێ مۆڵەت لێوەرگیران مارەناکرێ،گوتیان: ئەی پێغە مبەری خوا، چاچـۆن مۆڵەتی لێوەرگیرێ؟ فەرمووی: ئەوەیە،کە بێدەنگ بێ.

## ٦- لەو ڕووەوە کە وەك چۆن مافی وازلێهێنانی ژن بەپیاو دراوە، مافی دەستبەرداربوونی مێردیش بەژن دراوە:

بەڵێ وەك چۆن شەریعەت لەڕووی چەندان حیکمەتـەوە مـافی (طـلاق)ی بـەپیاو داوە کەدوایی ڕوونی دەکەینەوە، بەهەمان شێوەش مافی لەخۆدارنین (خلع)ی بـەژن داوە، لەحاڵێکدا کەلەمێردەکەی جاڕزو بێزار دەبێـت بەهـەر هۆیەکـەوە بێـت، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾(البقـرة: مـن الآية٢٢٩).

واتە: ئەگەر زانیتان ئەو ژنو مێردە سنوورەکانی خوایان بۆ بـەرپا نـاکرێن ئـەوە گوناحیان ناگاتێ کەژنەکە خۆی بکڕێتەوە.

(واتە: ئەو مارەییەی کەپیاوەکەی داویـەتێ، یـان هـەر ئەندازەیـەك کەلەسـەری پێکدێن، بیدات بەمێردەکەیو لەئەستۆی خۆی دای برنێ).

## ٧- لەڕووی ویلایەت هەبوونی ئافرەتان بەسەر پیاواندا، وەك چۆن پیاوانیش ویلایەتیان بەسەریانەوە هەیە:

خـوای بـەرزو مـەزن فەرموویـەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾ (التوبة: من الآية٧١).

دیارە کە (ولایة)و (موالاة)ی نێوان پیاوانو ئافرەتانی بڕوادار چەمكو واتایەکی فراوانی هەیـەو، تێکـڕای لایەنـەکانی ژیـانو گـوزەران بەعەقیـدەییو فەرهـەنگیو ئـەخلاقییو کۆمەڵایـەتیو ئـابووریو سیاسـیو جـەنگو ئاشـتییو قـەزاییو.. هتـدەوە، دەگرێتـەوە ،کەواتـە: ئافرەتـان نـەك هـەر مافیـان هەیـە کەمشـووری کۆمەڵگاو میللەتەکەیان بخۆن، بەڵکو ئەو خەمخۆرییو خۆ بـە بەرپرسیار زانینـە، ئەرکی سەرشانیانەو بەکەمتەرخەمیی تێداکردنی گوناحبار دەبن!

دیـارە دەتـوانین چـەندان دەقـی دیکـەش لـەبوارو لایەنـەکانی دیکـەش دا، بـۆ ئیسپاتی ئەو ڕاستییە[1] بەبەڵگە بێنینەوە، بەڵام بەو ئەندازەیە وازدێنین.

بەڵام وەك پێشتر گوتمـان فەلسـەفەو بیردۆزەکـانی ڕۆژئـاوا بەگشـتی، هەرچـەندە لافی زل زل لێدەدەن، لـەبواری تێڕوانینیانـدا بـۆ ئـافرەت، بـەڵام بـەکردەوەو واقیـع لەسەر بناغەی مێینە(أنثى) بوون لەگەڵ ئافرەتـدا ڕەفتـارو هەڵسوکـەوت دەکـەن، بەڵگەش بۆ ئیسپاتی ئەو ڕاستییە زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە تەنها ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین:

---

(١) واتە: ئەو ڕاستییە کەئیسلام لەسەر بناغەی ئینسان بوونی ئافرەت ڕەفتارو مامەڵەی لەگەڵدا کردوە.

**یەكەم:** پێشتر باسمان كرد كەكاتی خۆی سەرەتای سەرهەڵدانی جوولانەوەی مافی ئافرەت‌و یەكسانكردنی لەگەڵ پیاودا، لەوەوە بوو كەهەرچەندە ئافرەتان هەمان ئیش‌وكاری پیاوانیان لەكارگەو كارخانەكان(المعامل والمصانع)دا دەكرد، بەڵام ئەوروپاییەكان! تەنها نیوەی كرێی پیاوانیان دەدانێ!! هەڵبەتە ئەو نیوە هەق پێدانەش لەسەر بنەمای بەكەم سەیركردنی ئافرەت‌و بەهۆی مێینە بوونیەوە و بەنیوە ئینسان دانانی، بنیات نراوە، ئەگەر نا مادام هەركام لەژن‌و پیاو یەك جۆرە كار(شغل) بكەن، بۆچی دەبێ ئافرەتەكە نەك هەر نیوە، بگرە درەمێك كەمتر وەربگرێ؟! هەڵبەتە ئەو ستەم لێكردن‌و نیوە هەق پێدانە، پاشینە هزرییی(الخلفیة الفكریة)یەكەی هەر ئەوەیە كەگوتمان.

ئەگەرنا بۆچی رۆژێك لەرۆژان لەكۆمەڵگای ئیسلامیدا ئافرەتان گرفت‌و كێشەیەكی لەوجۆرەیان نەبووە؟! لەسۆنگەی ئەوەوە كەلەئیسلامدا لە بنەڕەتدا ئەو زەمینەو بناغە فیكرییەی كەئافرەت بەهۆی مێینەبوونیەوە لەپیاو كەمترە، تێیدا نەڕەخساوە، چونكە خوای دادگەر بەڕاشكاوی فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾ (النساء:٣٢).

واتە: ئەو شتانە (ئەی ژنان‌و پیاوان!) كەخوا هەندێكتانی پێ بەسەر هەندێكتاندا بەرزكردۆتەوە، بەخۆزگە مەخوازن، پیاوان لەبەرهەمی كەسابەتیاندا پشكیان هەیەو ژنانیش لەبەری ڕەنجیاندا پشكیان هەیە، (لەجیاتی خۆزگە بەشتی یەكدی خواستن) لەبەخششی خوا بخوازن، بێگومان خوا بەهەموو شتێك زانایە.

**لەم ئایەتە بەهێزو پیرۆزەی قورئانی بەرێزدا، ئەم پێنج ڕاستییە گرنگە دەفامرێنەوە:**

أ- شتێکی حەرامو خراپە کەئافرەتانو پیاوان بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانە (خصائص)ە، وە کە خوا بەهەرکامێکیانی بەخشیوە، ئێرەیی (حسد) بەیەکدی ببەن: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ .

ب- وەك چۆن پیاوان لەهەندێك تایبەتمەندییاندا، بۆ وێنە: بیرو هۆشو هێزی جەستە، زیادییان بەسەر ئافرەتانەوە هەیە، ئافرەتانیش لەهەندێك تایبەتمەندییاندا، بۆ وێنە: سۆزو پەرۆشو نەرمونیاسێکی جەستەو دەنگ، ئیمتیازو پلەیان بەسەر پیاواندا هەیە: : ﴿مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾

ج- پیاوانو ئافرەتان وەك یەكو بێجیاوازیی، لەكردو كۆشو ڕەنجی خۆیان بەهرەمەند دەبنو لەبەر نێرو مێیی فەرقیان پێ ناكرێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا ۖ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ﴾(النساء: ٣٢).

د- هەر كام لەپیاوانو ئافرەتان ئەگەر دەیانەوێ پێشبڕكە بكەن، با بەهۆی داواكردنی بەشی زیاترو چاكتر لەبەخششو چاكەی خواوە - كە بەهۆی ئیمانو كردەوەی چاكەوە دەستگیر دەبێ - ئەو پێشبڕكەیە بكەن، نەك بەهۆی دژایەتییكردنی یەكدیو یەكدی شكاندن، یان لاساییكردنەوەی یەكدیو خۆ پلیشاندنەوەوە: ﴿وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ﴾(النساء: ٣٢)

هـ- بێگومان خوای كاربەجێو زانا كەبەهەموو شتێك زاناو شارەزایە، لەبەر چەندان حیكمەتو بەرژەوەندیی گەورە گەورە بەوجۆرەی كەئێستا هەیە، تایبەتمەندییەكانی لەنێوان ئافرەتو پیاودا دابەش كردوون، بۆیە پێویستە

هەموو لایەك لەسەداسەد متمانەیان بەڕاستیی و بەجێیی و حیكمەتی ئەو مەسەلەیە هەبێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمًا﴾ (النساء: ٣٢).

**دووەم:** زۆر بەزەقی دیارە كەكاتی خۆی و ئێستاش لەو كۆمەڵگایانەدا كەئافرەتان لەماڵ و حاڵیان وەدەرێ نراون و، ملیان پێلەبەر جۆرەها ئیش و كار یان ڕاست تر بڵێین: سۆخرەو بێگار نراوە، وەنەبێ بەپاڵنەری زۆرو زەوەندی ئیش و كارەكان و قەیرانی پیاوان (أزمة الرجال)ەوە بووبێ، بەڵكو بۆ ڕاوكردنی ئافرەت و بەسێنایی چنگ لێگیربوونی بووە، ئەگەرنا ئەوساو ئێستاش لەو وڵاتانەدا قەیرانی بێ ئیش و كاریی(أزمة البطالة)ی پیاوان هەبووەو هەیە!.

بەڵێ ڕۆژئاوایی بە ژیان تەنها بەماددە دانەرو، ئینسان بەئاژەڵ سەیركەرەكان، تەنانەت ئەوەش كە لافی پێ بەسەر ئافرەتاندا لێدەدەن، كە گوایە لەگەڵ پیاواندا یەكسانیان كردوون و مافی زەوت كراویان بۆ وەرگرتوون، ئەدی ئەوە نیە شان بەشانی پیاوان كۆڵیان خستۆتە سەر پشتیان! بەڵێ ئا ئەوەش كەبەحیساب پلەو ئیمتیازێكە ئافرەتان وەدەستیان هێناوە، ئەویش هەر باج(ضریبة)ێكی دیكەی قورسەو بەئافرەت دراوە، تەڵەو داوێكە و ئافرەتی پێوەكراوە!

پێشتریش باسمان كرد كە چۆن ئافرەتی كلۆڵی ئەورووپایی، هەتا لەژێر سایەی ڕژێمە سیكۆلاریستەكانی ڕۆژئاوادا بەسەد كولەمەرگی دەستی لەئیشێك گیربوو - یەنیوە قیمەت- یان گیرنەبوو، لەمێژ بوو مێینایەتی و كەرامەتی خۆی دۆڕاندبوو، یان لێزەوت كرابوو!

**سێیەم:** بەڵگەیەكی دیكەی سەلمێنەری ئەوە كە ڕۆژئاوا لەسەر بناغەی مێینە بوون لەگەڵ ئافرەتدا ڕەفتار دەكات، ئەوەیە كە ئافرەت بەهەموو شێوەیەك

کراوەتە وەسیلەی ڕەواج پێدانو ساغ کردنەوەی کەلوپەلو شمەکی بازرگانیی کە هەر لەقاپو مەنجەڵەوە بگرە، هەتا تازەترین بەرهەمی تەکنۆلۆجیای سەردەم، مەگەر چۆن دەنا بۆ ڕمێنو ڕەواج پێدانی ساغ کردنەوەی وێنەی ئافرەتانی بەسەرەوە هەیەو لەوێنەکانیشدا هەوڵ دراوە ئەو ئەندامانەی کەزیاتر مێینەتی(أنوثة) ئافرەتیان تێدا دەردەکەوێ، بەرجەستەو نمایش بکرێن!

**چوارم:** بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە ئەوروپاییەکان و وابەستەو دابەستەکانیان هەر تا ئەوکاتە بەدەوری ئافرەتاندا دێنو دەچنو ڕێزیان دەگرن و خاتریان دەگرن! هەتا گەنجو جوانن و چالاکی جیسنییان هەیەو دەتوانن، ئەگەرنا دوایی کە مێینایەتی(أنوثة) و ڕەونەقیان نامێنێ، لەبرەوو ڕەواج دەکەونو، هەر بێوەژن و پیرەژنە ئازا بێت لە خانەی پیران(دار العجزة)دا جێگاو ڕێگایەك بۆ خۆی دابین بکات! بەپێچەوانەی کۆمەڵگای ئیسلامییەوە، کە پیاو و ئافرەت کاتێك دەکەونە تەمەنەوەو دەبنە (دایە گەورەو بابە گەورە) سەد هێندەی پێشوو حورمەتو ڕێزیان زیاد دەکاتو قەدریان دەگیرێ، بەڵام نەك لەخانەی پیراندا بەڵکو لەماڵی خۆیانو کوڕو کچو نەوەکانیاندا!

**کورتەی قسان:**

شەریعەتی خوای دادگەر، تێڕوانینی بۆ ئافرەتو مامەڵە لەگەڵ داکردنی بۆی، لەسەر بناغەی (ئینسان) بوونیەتی، هەرچەندە لەئەرك‌و کارو چالاکی بۆ دیاری کردنیدا، ڕەچاوی سروشتو هەڵکەوتەی جەستەیی و دەروونییو تایبەتمەندییەکانی ئافرەتی کردوەو، لەبەر سەرنج دانو جەخت کردن لەسەر ئینسان بوونی مێینە(أنثى) بوونی، تایبەتمەندییەکانی فەرامۆش نەکردوە.



بەڵام فەلسەفەو بیردۆزەکانی ڕۆژئاوا، هەرچەندە لافی زۆریان بەناوی مافی مرۆڤەوە بۆ ئافرەت لێداوە، بەڵام بەکردەوەو لەواقیعدا تێڕوانین و مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەتدا، تەنها لەسەر بناغەی مێینەبوونیەتیی، بەپاڵنەرو هاندەری پێوە ڕابواردن و کەڵك و لەززەت لێوەرگرتنیەتی، هەرچەندە ئەو ڕابواردن(تمتّع)ە، لەسەر حیسابی شەرەف و کەرامەتیی، ئەو سوودو کەڵك لێوەرگرتنەش لەسەر حیسابی مرۆڤایەتیی و کەسایەتیی و ئایندەو چارەنووسی خۆی و کۆمەڵگایەکەیشی بێت.[1]

هەڵبەتە ئەو دوو تێڕوانین و مامەڵە زۆر لەیەك جیاوازەش، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکردوە، زادەو هەڵقوڵاوی دووجۆرە بیروبڕوای لەیەك جیان، کەبیروبڕوای ئیسلامیی و بیروبڕوای نەفامێتیی(الجاهلية)ن، پێشینانیش گوتوویانە: (گۆزە چی تێدا بێ، هەرئەوەی لێدەڕژێ).

(١) بەڕاستی هەر جارێك لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن یان لەجادەو شەقامەکانی شارەکان (وەك سلێمانی و هەولێر) دا چاوم لەو ئافرەتە بەستەزمان و داماوانە هەڵدەنگوێ، کەبەرگو پۆشاکی سەیرو سەمەرەی بێگانەیان پۆشیوە، بێجگە لەبەرجەستەوتمایان کردنی مێینایەتی (انوثة) ی ئەو ئافرەتانە، هیچ حیکمەت و فەلسەفەیەکی دیکەیان تێدا بەدی ناکرێ، زۆر بەزەییم بەرۆشم بۆیان دەجوولێ کە ئەو کڵۆڵانە ئاوا بەدەست مۆدیل و مۆدیل کاریی ڕۆژئاواییە ڕەوشت ڕووخاوەکانەوە گیرۆدە بوون، وەك چەرخ و فەلەك هەرجارە بەجۆرێك دەیان خولێننەوە!!

## سێزدەم

**بۆ تێگەیشتن لەو گۆڕانکارییە گەورەیەی کەئیسلام بەسەر وەزعی ئافرەتیدا هێناوەو ئەو هەموو حورمەتو ڕێزەی کە لێی ناوە، پێویستە لەحاڵو باری ئافرەت پێش هاتنی ئیسلام ئاگادار بین**

هەرچەندە ئێستاشی لەگەڵ بێ، هیچ ڕێچکەو بەرنامەیەکی مرۆڤکرد، نەك هەر نەگەیشتۆتە ئاستی بەرزی ئیسلام لەتێڕوانین و هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئافرەتدا، بەڵکو هیچ کامیان هەر تۆزی ڕێگایشی ناشکێنن‌و، بگرە زۆر لەو شتانەش کە ڕێچکەکان بەرپرزگرتن لەئافرەت‌و داکۆکیکردن لەسەر مافی ئافرەتی دادەنێن، بەپێچەوانەوە جۆرێکە لەسووکایەتی پێکردنی‌و سوودی خراپ لێوەرگرتن(استغلال)ی، بەلاّم دیسان هەتا چاو بەمێژوودا نەگێڕینەوەو نەزانین کە بەر لەهەڵهاتنی خۆری ئیسلام و شەریعەت، ئافرەت لەچ شەوەزەنگێکی ئەنگوستەچاودا بووە، ناتوانین وەك پێویست هەست بەو ماوە(مسافة) دوورە بکەین، کەئیسلام و شەریعەت ئافرەتی لێوە گواستۆتەوە و، ئەو ئاستە بەرزە بەدی ناکەین کەئافرەتی بۆ بەرز کراوەتەوە.

جا ئێستا با ئاوڕێك لەمێژووی دووری بەر لەهاتنی ئیسلام بدەینەوە، داخۆ

ئافرەت لەچ ئاستێکدا بووەو شەریعەتی خوا گەیاندیە کوێ؟[1]

## یەك: هیندستان:

هیندستان لـەو سـەرو حـەدەدا بـەپێی بەرنامـەی (مـانۆ) بـەڕێوە دەچـوو، لـەو بەرنامەیەدا ئافرەت هیچ هەق و مافێکی جیاو سەربەخۆ لەهی باب و مێردو کـوڕی نـەبوو، بۆیـە هـەرکاتێك ئافرەتێـك بـاب و مێـردو کـوڕی نەبوایـە، دەبـوو لـەڕووی ڕەچەڵەك (نسب)ەوە خۆی بەڕەچەڵەکی پیاوێك لـەخزمانی مێردەکەیـەوە پەیوەسـت بکات، خراپتر لەوەش ئەوەبوو کە ئافرەت پاش مردنی مێردەکەی بۆی نەبوو بمێنـێ و، دەبوایـە لەیـەك ئاگردانـدا پێکـەوە -مێـرد بـەمردوویی و ژن بەزینـدوویی- بسووتێنرێن و دابرکێن و ببنە قەرەبروود! ئەو نەریتە پەستە هەتا سەدەی حەڤدەیـەم هەر مابوو!

## دوو: بابل:

لەو بەرنامەیەدا کە (حامۆڕابی) بۆ بابلییەکانی دانابوو، ئافرەت لەریزی ماڵات (ئاژەڵ) حیساب دەکرا!

## سێ: یۆنان:

ئافرەت لەلای یۆنانییەکان - کە چەندان فەیلەسووفی نـاوداری وەك سـوقرات و

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لەکتێبـی (المرأة في القرآن) ی (عباس محمـودالـعقاد) وەرگرتوە، کەلەبەرگی (٤) ی زنجیرەی (موسوعة عباس محمود العقاد الاسلامية) دایە، بڕوانە: ص ٤٤٢تا ٤٤٨.

ئەفلاتوون و ئەرەستۆیان لەنێودا هەڵکەوتوون- لەڕووی مافەوە هیچ ئازادیی‌و پلەو پایەیەکی نەبوو و، دەبوایە لەژوورێکدا نیشتەجێ بن، کەهیچ پەنجەرەی نەبن، یان پەنجەرەی زۆر کەم بن و دەرگاکانیش پاسەوانیان هەبێ.

کۆڕو مەجلیسی فەیلەسووفەکان بەهیچ جۆرێك ڕەگەزی ئافرەتیان تێدا نەبوو، وەئەرەستۆ ڕەخنەی هەبوو لەخەڵکی (ئەسپارتە) کەزیاد لەپێویست ماف بەئافرەتەکانیان دەدەن و لەمیرات بەشیان دەدەن!

## چوار: ڕۆمان:

بۆچوونی ڕۆمانە کۆنەکانیش لەبارەی ئافرەتەوە، وەك هی هیندەکان بوو، کەبۆی نیە بوون‌و کەسایەتی سەربەخۆ(مستقل)ی خۆی هەبێت، درووشمێك کە لەسەرەتای شارستانێتییەکەیانەوە لەوبارەوە بەرزیان کردبۆوە ئەمەبوو: (کۆت‌و زنجیری ئافرەت ناکرێتەوەو نیری سەرشانی لاناچێ)!!

## پێنج: میصر:

میصر تەنها شارستانێتییەکە کە تارادەیەك ڕێزی لە ئافرەت گرتوەو چەند مافێکی نیزیك لە مافەکانی پیاوی بۆ دابین کردوون، چونکە بۆی هەبووە ملکی خۆی هەبێ‌و میرات بگرێ‌و، ئەگەر مێردیش لەماڵەوە نەبوو سەرپەرشتی خێزان بکات.

بەڵام پاش ڕووخانی دەوڵەتی ڕۆمانی جۆرە بیرو باوەڕێکی زاهیدانەی دژ بە ڕابواردن بڵاو ، سەرەنجام میصریش وەك باقی ولاتانی ئەو ڕۆژگارە ئەو فەلسەفەو بیرو بۆچوونانەی تێدا بڵاو بوونەوە، کە یەکیان ئەوە بوو کە دەیگوت: (ئافرەت پیسە) وە (پێویستە خۆی لێ دوور بگیرێ مەگەر لەکاتی ناچارییدا).

لە پاشماوەكانی ئەو جۆرە بیرو بۆچوونانە ئەوە بوو كە هەتا سەدەی پێنجەمی زایینی زۆرێك لە لاهوتییە نەصرانییەكان زۆر بە جیددیی لەوەیان دەكۆڵییەوە كە ئایا سروشت(جِبِلّة)ی ئافرەت چ جۆرێكە؟! وە لە كۆبوونەوەی (ماكۆن)دا پرسیاریان كرد كە ئایا ئافرەت تەنها جەستەیە؟ یاخود وێڕای جەستە ڕووحیشی هەیە؟! سەرەنجام گەیشتنە ئەو قەناعەتە كە بێجگە لە (مریم)سەلامی خوای لێبێ، هیچ ئافرەتێك خاوەنی ڕووحێكی قوتاربوو نیە!

هەروەها میصرییەكان لە ئەنجامی ستەمو چەوساندنەوەی ڕۆمانەكاندا بەرانبەر بە ژیانی دنیا، دووچاری ڕەشبینیی بوو بوون، زۆرێك لە ڕاهیبەكان قەناعەتیان وابوو كە هەتا لە دنیاو داوەكانی شەیتان – كە یەكەمیان ئافرەتە– نزیكتر بن، لە خوا دوورتر دەبن، بۆیە بڕیاریان دابوو كە بە هیچ جۆرێك توخنیان نەكەون!

## شەش: نیوە دوورگەی عارەبی:

وەزعی ئافرەت لە نێو گەلی عارەبدا گەیشتبووە پلەیەكی هەرە نزم كە لەوە نزمترو خراپتر بە زەحمەت چنگ دەكەوێ! چونكە لە نێو گەلی عارەبدا هەر خودی ئافرەتو پەیدا بوونی كچ بە گرفتو كێشە دادەنراو، بە شوورەیی و نەنگ(عیب)ێك لەقەڵەم دەدرا كە دەبولابرایەو بەهەر نرخێك بووە خۆی لێ دەرباز بكرێ، جا پێم وایە بەسەرنج دانی دوو ئایەت لە سوورەتی (النحل)كە باسی هەڵوێسی زۆرێك لە عارەبەكان دەكەن بەرانبەر بە ئافرەت، پێویستیمان بە قسەی دیكە نامێنێ لەوبارەوە:

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٥٩﴾ (النحل:٥٩–٥٨).

واتە: لەکاتێکدا یەکێکیان موژدەی پەیدا بوونی مێینەی پێدەدرێ، دەم‌و چاوی ڕەش هەڵدەگەڕێ‌و دڵی پڕ دەبێ لە تووڕەیی. خۆی لە کۆمەڵەکەی دەشارێتەوە لەتاو ئەو هەواڵە خراپەی کە موژدەی دراوەتێ! (دۆش داماوەو نازانێ) ئایا بەشەرمەزارییەوە بیهێڵێتەوە، یان بیخاتە بن گڵ؟! بزانن ئەوە خراپترین شتە کە بڕیاریان داوە.

کەواتە: هەڵوێستی عارەبەکانی سەردەمی نەفامیی لەکاتی پەیدابوونی کچدا بریتیبوو لە:

أ- دەموچاو گرژو مۆنو ڕەش و تەڵخ هەڵگەڕان ﴿ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا﴾ (الزخرف: ١٧)

ب- دڵ‌و دەروون پڕبوون لە داخ‌و خەفەت‌و پەژارە﴿ وَهُوَ كَظِيمٌ ﴾ (الزخرف: ١٧).

ج- خۆ شاردنەوەو حەشاردان لە خەڵکی لەبەر خراپی ئەو هەواڵەی کە پێی دراوە: ﴿ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ﴾(النحل: ٥٩)

د- گیر خواردن لە نێوان دوو ئەگەر (احتمال)ی خراپدا کە سێیەمیان نیە:

یەکیان: بەخەجاڵەتیی‌و شەرمەزارییەوە بیهێڵێتەوەو نەیکوژێ:﴿ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ ﴾ (النحل: ٥٩)؟

دووەمیان: یان ژێر گڵی بخات‌و زیندە بەچاڵی بکات:﴿ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِ ﴾(النحل: ٥٩ ؟!)

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

ئەوەی ڕابرد چەند ئاماژەیەكی زۆر كورت بوون سەبارەت بـەحاڵو بـاڵو وەزعـی ئافرەت بەر لە هاتنی ئیسلام، لەنێو سەرجەم گەلانی جیهانی ئەو كاتـەو دەوڵـەتو ژیارەكاندا، جا بێگومان ئەگەر ئـەوەی لـە قورئـانو سـوننەتدا لـەبارەی ئافرەتـەوە هاتوە، كە وەك كچو خوشكو دایكو هاوسەر، چۆن هەڵسو كەوتو ڕەفتاری لەگەڵ بكرێ، بەراورد بكرێ لەگەڵ ئەوەی كە ئەوساكە لە نێو پێشـكەوتووترین دەوڵـەتو ژیارەكانـدا بـاو بـووە، جیاوازییـەكی گـەورەی هێنـدەی ئاسمـانو زەمـین دەبیـنین، عارەبیش گوتوویانە: (وبِضدها تَتبيَّنُ الأشْياءُ).

لێرەشدا كۆتایی بەم كورتە باسە دێنینو، بە كۆتایی پێهێنانی ئەم كورتـە باسـە سێزدەهەمینەش، كۆتایی بەم بەشی یەكەمە (دەروازەیەكی گشتی) دێنینو دەچـینە سەر بەشی دووەمی ئەم كتێبە.



**خوێنەری خۆشەویست!**

خوا یاربێ لەم بەشی دووەمەداو لەچەند خاڵێك دا باسی (کەسایەتیو ڕێزو حورمەتو پایەی ئافرەت لە سایەی شەریعەتدا) دەکەین بەم شێوەیەی خوارێ:.

١-ئافرەتو پیاو وەك یەك ئینسانن، بێ جیاوازیی.

٢-ئافرەتو پیاو وەك یەك بەندەی خوان، بێ جیاوازیی.

٣-ئافرەت ڕێی هیچ جۆرە چالاکییەکی لێ نەگیراوە، ئەو پەرەکەی خاتری گیراوەو، هەندێك ئەرکی لەسەر پێویست نەکراوە.

٤-ئەرکی سەرەکی ئافرەت ئەوەیە کە سروشتی خۆیو بەرژەوەندیی کۆمەڵ داخوازیی دەکەنو، بەخۆیشی نەبێ جێبەجێ ناکرێ.

٥-شەریعەت ئافرەتی تایبەت کردوە بە هەندێك حوکمەوە، کە بەرژەوەندیی ئافرەتیان تێدا ڕەچاو کراوە، نەك بە پێچەوانەوە.

٦-ئافرەت لە هەموو حاڵێکدا شەریعەت خاتری گرتوەو پاراستوویەتی: چ کچ بێ، چ خوشك، چ دایك بێ، چ هاوسەر.

٧-نامسوڵمانانیش جارویار دان بەحەقیقەتدا دەنێن.

## ١) ئافرەتو پیاو وەك یەك ئینسانن، بێ جیاوازیی:

خوای پەروەردگارو بێ هاوتا (جل جلاله) لەچەندان ئایەتی قورئانێدا ئەو ڕاستیییەی زۆر بە ڕوونی ڕاگەیاندوە، کە پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، بۆ وێنە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ (النساء: ١)

واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن کە لەیەك نەفس دروستیکردوون، وە هەر لە خۆی هاوسەرەکەیشی خوڵقاندوە، وە بەهۆی وانەوە پیاوان و ئافرەتانی زۆری -لەسەر زەوی- بڵاوکردنەوە، وە پارێز لەو خوایە بکەن کە لەنێو خۆتاندا شتی پێ لەیەکدی دەخوازن، وەپارێز لە خزمایەتیی بکەن- کەبیپچڕن- بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە.

وەك دەبینن خوای زاناو کاربەجێ لەم ئایەتە بەپێزەدا، دوو ڕاستی گەورەی کە ئێمە لێرەدا جێی مەبەستمانن، خستوونە ڕوو:

**یەك:** ئافرەتیش لەهەمان جۆرە نەفس کە پیاوی لێ دروستکراوە، خوڵقێنراوە: ﴿**وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا**﴾ کە بێگومان مەبەست پێیان ئادەمو حەوایە، سەلامی خوایان لێ بێت.

**دوو:** ئەو پیاوو ئافرەتە زۆرانە کە بوونەتە وەچە و لێیانو کەوتوونەتەوە، لەهەردووکیان وە پاش کەوتوون: ﴿وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ﴾ (النساء: ١)

**مادام وابێ:** ئافرەتو پیاو هەم لە خودی خۆیاندا وەك دوو ئینسانی نێرومێ، یەکسانو هیچ جیاوازییان نیە، وەهەم لە ڕووی پەیدابوونی وەچە

(ذرية)کەشیانەوە، وەك یەك بەشدارو کاریگەرن.

**کەواتە:** بەڵێ ڕاستە لەڕوانگەی شەریعەتەوە ئافرەت و پیاو لەئەسڵی ئینسان بوونیاندا یەکسانن و جیاوازییان نیە، ئینسانیش وەك ئینسان و بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەگەز(جنس)ەکەی، دروستکراوێکی ناوازەو، ڕێزلێ گیراوو، ئەمانەت پێ سپێرراوو، بەخەلیفەی خوا دانراوو، لەلایەن فریشتانەوە کڕنووش بۆبراوە، وەك خوا فەرموویەتی:

ا- ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ (التين:٤).

ب- ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾﴾ (الاسراء:٧٠).

ج- ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ ۖ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾﴾ (الأحزاب:٧٢).

د- ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾(البقرة: من الآية٣٠).

ه- ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿٣٤﴾﴾ (البقرة:٣٤).

ئاشکرایە کە ئافرەتیش بە حوکمی ئینسان بوونی، لە تێکرای ئەو پلەوپایەو ئیمتیازانەدا کە بۆ ئینسان دانراون، بەشدارەو هیچ کەس و لایەنێکیش ئەو پلەو پایانەی پێ نەبەخشیون، تاکو منەتی بەسەردا بکات، وە بۆ خۆیشی وەدەستی نەهێناون، تاکو لافیان پێوە لێبدات! بەڵکو تەنها لەلایەن خوای پەروەردگاریەوە پێی دراون، بۆیە پێویستە لەو ڕووەوە تەنها شوکرانەو ستایشی وی بکات و ئەرکی بەندایەتیی بەرانبەر جێبەجێ بکات.

## ٢) ئافرەت و پیاو وەك یەك بەندەی خوان، بێ جیاوازیی:

ئەم ڕاستییەش دیسان لەچەندان ئایەتی کتێبی خوادا (تبارك وتعالى) ڕاگەیەنراوە، بۆ وێنە: خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ (النساء:١٢٤)

واتە: هەر کەسێك کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات لەنێرومێ وەبڕواداریش بێ، ئەوە بێگومان ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو هێندەی درزی پشتی نێوکە خورماش ستەمیان لێ ناکرێ.

زانایانی ئیسلام سەرجەمیان، چ توێژەرەوان (مفسرین) چ فەرمایشت ناسان (محدِّثین) چ پسپۆڕانی بواری (فقه)و (أصول الفقه) لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە سەرجەم دواندن(خطاب)ەکانی قورئانو سوننەت، جا چ بە (يا أيها الناس) یان بە (ياأيها الذين آمنوا) یان بە ( يابني آدم ) یان بە (يا أيها الانسان) دەست پێ بکەن، ئەوە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ وەك یەك تێیاندا بەشدارن، مەگەر بەڵگەو نیشانە(قرينة)یەکی ئاشکراو بێ پێچو پەنا، تایبەتیان بکات بەیەکێك لە دوو ڕەگەزەکەوەو، ئەوی دیکەیان هەڵباوێرێو جیای بکاتەوە.[1]

(١) بڕوانە: (الإحكام في أصول الأحكام) للآمدي ج١ ص١٩٩، وە بڕوانە: (الوجيز في أصول الفقه) للدكتور عبدالكريم زيدان، ص٨٧، کە لەسەر بنچینەی ئەم فەرموودەیە: (رُفِعَ القلمُ عن ثلاثة، عن الصّبى حتى يبلغ، وعن النائم حتى يستيقظ، وعن المجنون حتى يفيق) رواه أحمد وأبوداود والحاكم، واتە: قەڵەمی گوناهـ نووسران لەسەر سێ جۆرە هەڵگیراوە: لەسەر منداڵ، تاکو باڵغ دەبێ، وەلەسەر نووستوو تاکو وەخەبەردێ، وەلەسەر شێت هەتا دێتەوە

هەر بۆیەش جارێکیان (أم سلمة)ی هاوسەری پێغەمبەری خواﷺ گوێی لێبوو کە پێغەمبەرﷺ لە ناوەختێکدا فەرمووی: (یاأیها الناس)، ئیدی (أم سلمة)ش بەخێرایی بەرەو مزگەوت چوو، کاتێك لەو بارەوە کەنیزەکەکەی پرسیاری لێ کردو گوتی[1]: ((**إنما دعا الرِّجال ولمْ يَدعُ النِّساءَ**) واتە: تەنها پیاوانی بانگ کردووەو بانگی ئافرەتانی نەکردووە؟)) لەوەڵامدا گوتی: ((**إنِّي من النَّاس**) منیش هەر لە خەڵکم!.

کەواتە: هەرچی فەرمانو پێشگیریی(الأوامر والنواهي)و ئاراستەکان(التوجیهات)ی قورئانو سوننەتن، ئەوە تاك تاکی مسوڵمانانی نێرو مێ دەگرنەوەو، هەموویان لەبەرامبەر شەریعەتی خوادا، هەم بۆ پیادە کردنیو هەم بەڕێوەبردنیو هەم پارێزگاریی لێکردنی، بەرپرسیارنو، ئەم ئایەتەش کە ئەرکە سەرەکییەکانی پیاوانو ئافرەتانی بڕواداری خستوونەتە ڕوو، هەر ئەوە دەگەیەنێ کە باسمان کرد:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ (التوبة:٧١).

چونکە مادام هەر کام لە پیاوانو ئافرەتان دۆستو پشتو پەناو مشوور خۆری یەکدی بن، بۆ چەسپاندنی هەرچی چاکەیەو ڕیشەکێش کردنی هەچی خراپەیە، دیارە شەریعەتیش بۆ چەسپاندنی چاکەکانو لابردنو نەهێشتنی خراپەکان هاتوە،

---

سەرعەقڵو هۆش، هەموو ئینسانێکی بالغو عاقڵ بە ئەرك پێ سپێرراو (مکلف) دادەنێن، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەگەز (جنس) ەکەی.

(١) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج١ص٦٠٩٩.

بۆیە پیاوانو ئافرەتان لەبەرامبەر شەریعەتو ئۆممەتدا بەرپرسیارنو، بەو جۆرە ئافرەت نەك هەر مافی ئەوەی هەیە لە هەموو بوارو مەیدانەکانی بەندایەتییو مسوڵمانەتییدا بجوڵێ، بەڵکو ئەرکو پێویستییەکی سەر شانیشییەتیو بەکەمتەرخەمیی تێدا کردنی گوناحبار دەبێت.

## ٣) ئافرەت ڕێی هیچ جۆرە کارو چالاکییەکی لێ نەگیراوە، ئەوپەڕەکەی خاتری گیراوەو هەندێك ئەرکی لەسەر پێویست نەکراون:

خوای پەروەردگار دەربارەی موتڵەقی کارو چالاکیو جمو جوڵ ڕەوا بوون بۆ پیاوو ئافرەتی مسوڵمان، بەمەرجێك چاك(صالح) بێت، واتە لە سنووری شەرعدا بێت، فەرموویەتی:

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ (النحل:٩٧).

بەڵێ نێرو مێی خاوەن ئیمان، ئەنجامدانی هەر جۆرە کارو جمو جوڵێکی چاكو پەسەندیان بۆ ڕەوایەو، دەبێتە مایەی ژیانو گوزەرانی بەختەوەرانەی دنیاو وەرگرتنەوەی چاکترین پاداشتی دوارۆژ.

ئەم ڕاستییەش لەچەندان ئایەتی دیکەی قورئانیشدا خراوەتە ڕوو، جا لەسەر بناغەی ئەم حەقیقەتەو ئەو حەقیقەتەی کە لەخاڵی دوەمدا خستمانەڕوو، کە سەرجەم دواندن(خطاب)ەکانی قورئانو سوننەت ڕوویان لە هەردووك ڕەگەزی نێرومێیە بەبێ جیاوازیی، مەگەر بەڵگەیەکی ڕوون هەبێ لەسەر تایبەت کردنی ئاڕاستەو ئەمرو نەهییەك بەیەکێك لە دوو ڕەگەزەکەوە، بەڵێ لەسەربناغەی ئەو

دوو ڕاستییە، دەتوانین بە ڕاشکاویی بڵێین کە ئافرەت لە ڕوانگەی شەریعەتەوە هیچ بوارو مەیدانێکی چالاکی و کارو جمو جوڵی لێ پاوان و قەدەغە نەکراوە، بەڵام بەسێ مەرجان:

**یەك:** خودی ئەو کارو چالاکییە چاك (صالح) بێ، واتە شەرعیی بێت.

دوو: ئافرەت لەکاتی ئەنجامدانی کارو چالاکییەکەدا تووشی ناشەرعیی نەبێت و ئەدەبەکانی شەرع لەبەرگو پۆشاك و هەڵس و کەوت و هەل و مەرجی کارەکەیدا ڕەچاو بکات.

سێ: کارو چالاکییەکەی لەسەر حیسابی ئەرکی سەرەکی و سروشتی خۆی نەبێت، کەلە جوغزی ماڵ و خێزاندا ئەنجامی دەدات و، کارێك ناکات زیانی لە سوودی پتر بێت، بۆ خۆی و خێزانی و کۆمەڵگایەکەی.

با ئێستاش لەچەندان مەیدان و بواری گرنگ و سەرەکیدا سەرنج بدەین داخۆ شەریعەت چۆن بواری بە ئافرەت داوە، کە جمو جۆڵ بکات و چالاکی ئەنجام بدات:

## ١-لەبواری زانستدا:

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە ئینسان بەبێ زانیاری و شارەزایی و بەرچاوڕوونی ناتوانێ کردەوەی چاك (العمل الصالح) ئەنجام بدات، بۆیە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: (العلم مُقَدّم على العمل) زانیاری پێش کردەوە دەخرێ، کەواتە تەنها ئەوە کە شەریعەت ئافرەتیشی وەك پیاو بەبەرپرسیار داناوە لەبەرانبەر دین و ژیندا ((كُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه..))متفق عليه، بەسە بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە ئافرەت نەك هەر ئازادە لە فێربوون و وەرگرتنی زانستدا، بەڵکو لەسەریشی فەرزە کە ئەو زانیارییانە فێر بێت، کە یەکێك لە ئەرکە عەینی(الواجبات العينية)یەکان یان ئەرکە کیفائی(الواجبات الكفائية)یەکان یەکیان لەسەریان کەوتوە، بەپێی

بنچینەی: (ما لا يتم الواجب إلاّ بهِ فهو واجبٌ)، کەواتە: پێویستمان بەهیچ بەڵگەیەکی جیاو سەربەخۆ ناکات بۆ ئیسپاتی ئەوە ،کە ئافرەتانیش وەك پیاوان بۆیان هەیەو، بگرە لەسەریان فەرزە کە فێری زانستە شەرعییەکانو، هەموو ئەو جۆرە زانیارانە ببن کە دینو ژینی مسوڵمانان پێویستییان پێیانە.

پێشتریش خستمانە ڕوو کە سەرجەم ئەمرو نەهیو ئاراستەکانی قورئانو سوننەت، ئافرەتو پیاو دەگرنەوە، مەگەر بەڵگەیەکی ڕوون تایبەت کرابێ بەیەکێکیانەوە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ((**طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ**)) **رواه أحمد وابن ماجه وصححه الألباني في صحيح ابن ماجه برقم : ٣٩١٣.**
واتە: (بەدواداگەڕانی زانیاری لەسەر هەموو مسوڵمانێك فەرزە).

(عائشە)ش خوا لێی ڕازی بێ لە وەسفی ئافرەتانی مەدینەدا گوتوویەتی: ((**نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ، لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ**))رواه البخاري.

واتە: ئافرەتانی پشتیوانان، باشترین ئافرەتن، شەرم ڕێی لێ نەگرتن کە لەدین دا شارەزابن.

**کەواتە:**

هەرچی کە بەناوی ئیسلامەوە گوتراوە کە گوایە حەز ناکات ئافرەت فێری زانست ببێو شارەزا بێ، ئەوە بێگومان درۆیە، وەك دوایی لەبەشەکانی دیکەدا باسی دەکەین.

بەپەسەندیشی دەزانم لەو بارەیەوە ئەم چەند دێڕە شیعرە لە (أحمد شوقی)یەوە کە نازناوی (أمیر الشعراء)ی پێ دراوەو لەئەصڵیشدا کورد بووە، بخوازمەوە:

| | |
|---|---|
| ١- أُمَّ المـــؤمنين إليـــك نشــكو | مُصـيبتنا بِجَهـلِ المؤمنـات |
| ٢- فتلـك مصـيبة يـا أُمِّ فينـا | تَكـادُ نغـصٌ بالمـاءِ الفـرات |
| ٣- نـرى جهـلَ الفتـاة لهـا عفافـاً | كـأن الجهـل حِصْـنٌ للفتـاة |
| ٤- ونُلـزِمُهن قَعْـرَ البيـت قهـراً | ونَحسـبُهنّ فيـه مـن الهنـات |
| ٥- لـئن وَأدوا البنـاتِ فقـد قَبَرْنـا | جميـع نسـاءنا قبـل الممـات |
| ٦- لقـد كـذبوا علـى الاسـلام كـذِباً | تـزولُ الشَّـم منـه مُزلَـزلات |
| ٧- ألَـيسَ العلـمُ في الإسـلام فرضـاً | علـى أبنائِـه وعلـى البنـاتِ؟! |
| ٨- وكانَـتْ أُمُّنـا في العلـم بَحـراً | يُحِـلُّ لِسـائليها المُشْـكِلات |
| ٩- وعَلَّمَهـا النبـيِّ أجَـلّ عِلْـم | فكانـت مِـنْ أجُـلِّ العالِمـات |
| ١٠- فمـاذا اليـوم ضُـرَّ لـو اْلتَفَتْنـا | الى أسـلافِنا بعـض ألتفـات |

واتە:

١- هۆ دایکی بڕواداران- مەبەستی خاتوون عائیشەیە خوا لێی ڕازی بێ- سکاڵای خۆمان دێنینە لای تۆ لەچەنگ بەڵایەك کە بریتییە لە نەزانیی ئافرەتانی بڕوادار.

٢- دایەگیان! لە سۆنگەی ئەو بەڵایەوەکە لەنێوماندایە، هێندە گرفتارین ئاوی زوڵاڵیشمان لە داخان بۆ قووت ناچێ!

٣- پێمان وایە نەزانینی کچ دەبێتە مایەی داوێن پاکیی، وەك بڵێی نەزانین قەڵاو پەرژین بێ بۆ کچ!!

٤- وە بەتۆبزیی کچەکانمان لەماڵێ دەبەستینەوەو پێشمان وایە لەحاڵو وەزعێکی ئاسوودەو چاکدان.

٥- ئەگەر کاتی خۆی عارەبە نەفامەکان تەنها کچەکانیان زیندە بەچاڵ دەکرد، ئەوە ئێمە ئێستا تێکرای ئافرەتانمان بەر لەمردن دەخەینە گۆڕەوە!

٦- بەڕاستی درۆیەکی هێندە زلیان بەناوی ئیسلامەوە کردوە- کە دەڵێن ئیسلام ڕازی نیە ئافرەت بخوێنێ- کە چیا سەرکەشەکان لەداخان لەبن دێن‌و دەڕووخێن!

٧- ئەدی زانیاری فێربوون لە ئیسلامدا لەسەر کوڕان‌و کچان فەرز نەکراوە؟!

٨- هەروەها دایکمان (عائیشە) لەزانستدا دەریایەك بوو کە گرفت‌و کێشەی پرسیارکەرانی چارەسەر دەکرد.

٩- پێغەمبەر ﷺ گەورەترین زانیاری فێرکردبوو، بۆیە لەباڵاترین زانایانی ئافرەت بوو.

١٠- ئایا ئەمڕۆش چ زیانێك دەکەین ئەگەر هەر تۆزێك- لەبارەی زانست فێری ئافرەت کردنەوە- ئاوڕمان لە پێشینانمان دابایەوە؟!!

هەزار ڕەحمەت لە ئەحمەد شەوقی شاعیر بێت، بەڕاستی تانووتی باشی لەو کەسانە گرتوەو گلەیی بەجێی لێیان کردوە، کە لەڕووی نەزانییەوە بەناوی دین‌و شەرعەوە ڕێگریی لە ئافرەت(کچ، خوشك، ژن) دەکەن کەفێری زانستی ببێت، دیارە ئێستاش مسوڵمانان پێویستیان بەئامۆژگاریی‌و بەرچاو ڕوونیی هەیە، لەبواری هەڵ‌و مەرج‌و دەرفەت ڕەخساندن بۆ ئافرەتان کە فێری زانست بن.[1]

## ٢-لە بواری عیبادەتدا:

شتێکی ڕوونە کە چوار دروشمە سەرەکییەکانی عیبادەت (نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، حەج) وەك یەك لەسەر هەردووك ڕەگەزی نێرومێ پێویست کراون، لەگەڵ هەندێك

(١)( الوجيز في أصول الفقه) ص٣٠٨، ٣٠٩.(٢) وەلە (صحيح البخاري) دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکی لەهەفتەدا بۆ ئافرەتان تەرخان کردوە کە زانستی شەرعییان فێر بکات- بڕوانە: (صحيح البخاري ج١، ص٢٣٦) .

خاتر گرتن و بار سووکیی بۆ ئافرەت لە بواری نوێژو ڕۆژوودا، لە حاڵەتە نائاساییەکانی وەك کەوتنە عادەت(حیض)و زەیستانیی(النِّفاس)دا، وە بەمەرج گرتنی هەبوونی مێرد یان خزمێکی مەحرەم لەکاتی چوونە سەفەری حەج و عومرەدا.

هەر بۆیەش لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ - هەروەها چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیدا - ئافرەتان نەك تەنها بەشداریی نوێژی جومعە، بگرە بەشداریی نوێژە فەرزەکان و تەنانەت خەوتنان و بەیانیشیان لە مزگەوتەکانی مەدینەدا دەکرد.

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ بیست بووە، کە هەندێك لە پیاوان ژنەکانیان یان خوشك و کچەکانیان ئیزن نادەن، ئاگاداری کردوونەوە کە ئەو ڕەفتارە نەکەن و فەرموویەتی: ((**إِذَا اسْتَأْذَنَكُمْ نِسَاؤُكُمْ بِاللَّيْلِ إِلَى الْمَسْجِدِ فَأْذَنُوا لَهُنَّ**))متفق عليه عن عبدالله بن عمر. واتە: (هەرکات ئافرەتانتان بەشەوێ بۆ چوونە مزگەوت داوای مۆڵەتیان لێکردن، مۆڵەتیان بدەن.)[1]

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەپیاوان کردووە کە لە ڕۆژانی دوو جەژنەکاندا، تێکرای ئافرەتان لەگەڵ خۆیان ببەنە نوێژگە(مُصلَّى)، تەنانەت ئەوانەشیان کە لە حەیزدان، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ:

((**عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: أنَّ رَسُولَ الله ﷺ أَمَرَ يَوْمَ الْعِيدِ أنْ تُخْرَجَ الْبِكْرُ مِنْ خِدْرِهَا، حَتَّى تَخْرُجَ الْحُيَّضُ، فَيَكُنَّ خَلْفَ النَّاسِ فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ وَيَدْعُونَ بِدُعَائِهِمْ يَرْجُونَ بَرَكَةَ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَطُهْرَهُ**)) رواه البخاري. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە کە ڕۆژی جەژن کچی پشت پەردە بڕێتە دەرێ، تەنانەت حەیزدارەکانیش بچنە دەرێ و لەپشت خەڵکییەوە بن و لەگەڵ

---

(١) ئەسڵ لەشوێنی نوێژکردنی جەژنەکان دەشت و سارایە ئەگەر سەرماو قوڕو قاڵ نەبێ و بگونجێ، بۆیە ئافرەتانی بێ‌نوێژ (حائض) یش دەتوانن بەشدار بن، ئەگەر نا حەرامە ئافرەتی حەیزدار بچێتە مزگەوتێ.

ئەواندا (الله أكبر) بکەن‌و لەگەڵیان بپارێنەوەو ئومێدەواری بەرەکەت‌و پاکیی ئەو ڕۆژە دەبن.

واش پێدەچێ ئەو چوونە دەرو بەشداریی کردنەی ئافرەتان فەرز بێت، چونکە فەرمان (أمر) بۆ فەرز بوونە مادام نیشانەیەکی ڕێگر(قرینة مانعة) نەبێ، کە لێرەدا نیەو، سەربارەش ئەو فەرموودەیەی کە (بخاري) لە (حفصة)ی دایکی بڕواداڕانەوە دەیگێڕێتەوە، هەر ئەوە دەگەیەنێ، کە کورتەکەی ئەوەیە: خوشکی حەفصە پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کردوە کە ئایا ئەگەر یەکێك لە ئافرەتان لەبەر نەبوونی پۆشاکی تەواو، نەچێتە دەرێ بۆ نوێژی جەژن هیچی لەسەرە؟! ئەویش فەرموویەتی: با لە پۆشاکی هاوەڵێکی وەربگرێ‌و هەر بەشداریی بکات!.

جاری وا بووە کە ئافرەتان منداڵی گچکەو کۆرپەشیان لەگەڵ خۆیاندا بردۆتە مزگەوتێ بۆ نوێژەکانی شەوو ڕۆژ، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ، کە پێغەمبەری پێشەوامانﷺ فەرموویەتی: ((**أني لأقومُ الى الصَّلاةِ وأنا أُريدُ أنْ أُطوِّلَ فيها، فأسْمَعُ بُكاءَ الصبيِّ فأتجوَّزُ في صلاتي كراهيةَ أن أشُقَّ على أُمِّه**))رواه البخاري وأحمد وأصحاب السنن عن أبي قتادة الأنصاري عن أبيه. واتە: (من جاری وایە هەڵدەستم بۆ نوێژێ‌و دەمەوێت درێژەی پێبدەم، بەڵام گریانی منداڵان دەبیستم‌و نوێژەکەم کورت دەکەمەوە، حەز ناکەم دایکی نارەحەت بێت)!

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

لەڕۆژگاری پێغەمبەری خواو خەلیفە ڕاشیدەکانیدا ئاوا بوارو دەرفەت بۆ ئافرەتان ڕەخسێنراوە، کە بەشداری بەجێهێنانی دروشمەکانی خواپەرستیی بکەن لەگەڵ پیاوان دا، کەواتە با بزانرێ ،کە دوور خستنەوەی ئافرەتان لە مزگەوت‌و لەبۆنە ئیسلامییەکان، نیشانەی بەجێماویی(تخلف)ی مسوڵمانانە لە دینەکەیان، جا ئەو دوورخستنەوەو بوارو ڕێپێنەدانە، بەهەر بیانوو پاساوێکەوە بێت، چونکە

بەتەئکید خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو کەس زاناو شارەزا ترن و لەهەموو کەسیش سوورترو بەتەنگەوە ترن، بۆ پاراستنی ئابڕوو وکەرامەتی ئافرەتان، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ لأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي**؟!))رواه البخاري ومسلم.

کەواتە:

باهەموو لایەکمان هەوڵ بدەین کە لەهەموو ڕوویەکەوە کۆمەڵگایەکەمان بگێڕینەوە ژێر سایەی شەریعەتی خواو، بیگەیەنینەوە ئاستی بەرزی قورئان و سوننەت و خواو پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنیان فەرمووە، وا ڕەفتار بکەین، نەك تەبع و میزاجی خۆمان یان نەریت و باوی خەڵکی چۆن دەخوازێ!

## ٣-لەبواری کارو کەسابەتدا:

وەك دواتر باسی دەکەین شەریعەتی خوا هیچ کاتێ ڕێی نەداوە کە ئافرەتان ناچاری ئیش و کاری دەرەوەو ڕۆزیی و بژێو پەیداکردن بن، چ بۆخۆی و چ بۆ منداڵەکانی، بەڵام ئەگەر هاتو بەهەر هۆیەکەوە بوو ئافرەت ویستی لەماڵ بچێتە دەرێ و کارو کەسابەتێك بکات، ئەوە مادام ئافرەتەکە ئەو سێ مەرجانەی ڕەچاوکردبن کە لەسەرەتای ئەم خاڵی سێیەمەوە باسمان کردن، شەریعەت ڕێی لێ ناگرێ و ئازادە لە مومارەسەی هەر جۆرە کارو کاسبییەك دا بۆ وەدەس هێنانی ماڵ و سامانی حەڵاڵ.

هەڵبەتە لەتێکڕای چاخ و سەردەمەکانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیشدا ئافرەتان شان بەشانی پیاوان لە هەموو مەیدانەکانی ئیش و کارو کاسبیدا، وەك: بازرگانی و کڕین و فرۆشتن، زیندوو کردنەوەی زەوی بەیار(إحياءُ المَوات)و کشتوکاڵ کردن و، پیشە دەستییەکان (المهن اليدوية)و..هتد، دەوری خۆی بینیوەو، سەرجەم

زاناو پێشەوایان لەسەر ئەوە یەك دەنگ(مُجْمِع)ن، كە ئافرەت بۆی هەیە هەموو ئەو (عَقْد)و مامەڵەو سەودایانە بكات، كە پیاو دەیان كات بەبێ جیاوازیی، خوای دادگەریش (تبارك وتعالى) فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَۚ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾ (النساء:٣٢)، كە لە بەشی یەكەمدا مانامان كردوە.

ئنجا با سەرنجی ئەم چەند دەقە بەهێزوپیزەی سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزیش ﷺ بدەین كە لەبارەی كارو كاسبی ئافرەتانی مسوڵمانی ڕۆژگاری زێڕینی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەدوێن:

١- (بخاري)لە (سهل بن سعد)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە كە ئافرەتێك (بُرْدَة)[1] یەكی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێناو گوتی: ((**يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَسَجْتُ هَذِهِ بِيَدِي أَكْسُوكَهَا) واتە**: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمەم بەدەستی خۆم چنیوە، كە بیكەمە پۆشاكی تۆ، دەڵێ: پێغەمبەریش چونكە ئاتاجی بوو، لێی وەرگرت...

٢-هەروەها (بخاري) لە (جابر بن عبدالله)وە خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە كە ئافرەتێكی ئەنصاریی گوتی: ((**يَا رَسُولَ اللَّهِ ألاَ أَجْعَلُ لَكَ شَيْئًا تَقْعُدُ عليه؟ فَإِنَّ لِي غُلَامًا نَجَّارًا؟**)

[1] البردة: كساء مخطط يلتحف به، المعجم الوسيط، ص٤٨. واتە: بوردە پۆشاكێكی خەتخەتە لەخۆوە دەپێچرێ

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا شتێکت بۆ دروست نەکەم کە لەسەری دابنیشی- لەنێوان دوو وتارەکەی جومعەدا- چونکە من غولامێکی دارتاشم هەیە؟!))، پێغەمبەریش فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ با، جا دوانگە (منبر)ێکی بۆ دروستکرد...

٣- (إبن ماجە وإبن سعد) گێڕاویانەتەوە کە (زینب) هاوسەری (عبدالله بن مسعود) خوا لێیان ڕازی بێ ئافرەتێکی دەست ڕەنگین (صَنَّاع اليدين) بووەو چوەتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من ژنێکی خاوەن صنعەتم و لێیشی دەفرۆشم، نەخۆم و نەمێردەکەم و نە کوڕەکەم هیچمان نیە، جا ئایا ئەگەر مەسرەفیان بکێشم چۆنە؟! ئەویش فەرموویەتی: ((**لَكِ فِي ذَلِكَ أَجْرَ مَا أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ**) واتە: هەتا مەسرەفیان بکێشی پاداشتت لەسەر ئەوە هەیە.

٤- (إبن هشام)و (إبن سيد الناس) هەواڵی ئەو ئافرەتەیان گێڕاوەتەوە کە بە کەلوپەلی فرۆشتنەوە هاتبووە شاری مەدینەو لەبازاڕی (بنی قینقاع) فرۆشتبووی، پاشان لەلای زێڕنگەر(صائغ)ێك دانیشتبوو کە شتێکی لێ بکڕێ و، یەکێك لەجوولەکەکانیش دامێنی کراسەکەی لەپشتی گرێدابوو کە هەڵسابوو عەورەتی دەرکەوتبوو و هاواری کردبوو و...هتد. کە سەرەنجام ئەو ڕووداوە بوو بەمایەی دەرکران و ئاوارەبوونی تیرەی (بني قينقاع).

**کەواتە:**

هاوەڵە ئافرەتەکانی پێغەمبەر(صحابيات النبي) ﷺ بەبێ هەستکردن بەهیچ جۆرە سەغڵەتی(حرج)یەك، سەرگەرمی جۆرەها ئیش و کارو پیشە بوون و پێغەمبەری خواش ﷺ نەك هەر لێی قەدەغە نەکردوون، بەڵکو بەڕەزامەندیی دەربڕین و وەرگرتنی دیارییەکانیان هانیشی داون.

## ٤- لەبواری جەنگو جیهاد دا:

هەرچەندە لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەم مەسەلەیەمان کردو چەند نموونەیەکیشمان لەو بارەوە هێناوەتەوە، بەڵام لێرەشدا دیسان چەند نموونەیەك دێنینەوە:

١- (مسلم) لە (أُم عطية)وە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: ((**غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ فَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ وَأُدَاوِي الْجَرْحَى وَأَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى**) واتە: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت غەزام کردوون، لەلای بارگەو بنەکانیان (واتە پشتی بەرەی جەنگ) دەمامەوە، جا خواردنم بۆیان ساز دەکردو، بریندارەکانم تیمار دەکردو، خزمەتی نەخۆشەکانم دەکرد)).

٢- هەروەها (إبن الحجر العسقلاني) لە (فتح الباري)[1]دا هێناویەتی کە ئافرەتێك بەناوی (رفيدة الأسلمية)کە زۆر لەتیمارکردنی بریندارانـدا کارامە بوو، لە جەنگی (خَنْدق)دا چادرێکی هەڵدابوو کە هەر بەناوی خۆیەوە ناسرابوو، جا لەو چادرەدا پێشوازیی لە بریندااران دەکرد، خەمی دەخواردنو تیماری دەکردن، کاتێك (سعد بن معاذ) خوا لێی ڕازی بێ پێکرا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەچادرەکەی وی دای بنێن تاکو لەنزیکەوە سەردانی بکەم.

٣- پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێی گێڕانەوەی هەر کام لەخاوەنی کتێبی[2] (حياة الصحابة) وە خاوەنی کتێبی[3] (الإصابة في تمييز الصحابة) دەربارەی

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج٨، ص٤١٩.
(٢) بڕوانە: ج١، ص٥٨٠، .
(٣) بڕوانە: ج٤، ص٤٧٩.

(نسيبة بنت كعب) خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی: ((**مَا الْتَفَتُّ يَوْمَ أُحُدٍ يَمِيناً وَلاَ شِمَالاً إِلاَّ وَأَرَاهَا تُقَاتِلُ دُونِي**)) واتە: ڕۆژی جەنگی ئوحد تا ئاوڕم بەلای ڕاستو چەپدا دەدایەوە، دەم بینی دەجەنگیو بەرگریيم لێدەکات!.

٤-هەروەها (إبن سعد وإبن إسحاق)[1] گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی جەنگی (حونەین) ئاوڕی دایەوەو (أم سليم بنت ملحان)ی بینی کە (أبو طلحة)ی مێردی لەگەڵ خۆی هێنابووی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد، (أم سليم) گوتی: بەڵێ دایكو بابم بەقوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا مۆڵەتم دەدەیت کە ئەوانەی پشتت لێ هەڵدەکەنو ڕادەکەن (لەمسوڵمانان) بکوژم، وەك چۆن تۆ ئەوانە دەکوژی کەلە دژت دەجەنگێن؟!

جا (أم سليم)خەنجەرێکی پێبوو، (أبو طلحة)ش پێی گوت: ئەو خەنجەرە چییە پێت ئەی دایکی سولەیم؟! ئەویش گوتی: خەنجەرێکە هەڵم گرتوە، تاکو ئەگەر یەکێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لێم نزیك بۆوە ورگی بدڕم.

٥-(بخاري)گێڕاویەتەوە کە لە (جەنگی ئوحود دا) (عائشة) و (أُم سُلَيم)-خوا لێیان ڕازی بێ- کوندە ئاویان لەسەر پشتیان هەڵدەگرتو، پاشان دەیان برد دەیان کردە زاری خەڵکەکەوەو دووبارە دەچوون پڕیان دەکردەوەو، دەهاتن دەیان کردە زاری خەڵکەکەوە!

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

ئەمەش هەڵوێستو ڕەفتاری ئافرەتانی مسوڵمان لەڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺو لەبواری جەنگو جیهادو فیداکاریی و بەرگرییدا.

---

(١) هەروەها (مسلم) یش بەکورتی هێناویەتی لەژێر ناونیشانی: (كتاب الجهاد، باب غزو النساء مع الرجال) دا.

## ٥-لە بواری کۆمەڵایەتییدا:

ئەوەی کە لەدەقەکانی قورئانو سوننەت دەفامرێتەوە، ئەوەیە کە ئافرەتانیش وەك پیاوان بۆیان هەیە لەسەرجەم جموجۆڵو چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشداریی بکەن، بەڵام بەو سێ مەرجەی کە لەسەرەتای ئەم خاڵەوە باسمان کردوون، ئەمەش چەند وێنەیەك لە بەشداریی کردنی ئافرەتان لە بۆنەو چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا، لەرۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺدا:

١- (بخاري‌و مسلم) گێڕاویانەتەوە کە کاتێك (أبو أسيد السّاعدي) ژنی گواستەوە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ دەعوەتکرد، جا بێجگە لەژنەکەی (أم أسيد) هیچ کەس خواردنی بۆ ساز نەکردنو بۆ دانەدەنان، پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە نان خواردن بۆوە، (أم أسيد) کە پێشتر هەندێك خورمای لە قاپێکدا کردبوونە خۆشاو، بەدەستی خۆی وەك شتێکی تایبەت بۆ پێغەمبەری هێنا کە بیخواتەوە.

شایانی باسە کە (بخاري) ئەم فەرمایشتەی لەژێر ناونیشانی (باب)ێکدا هێناوە، بەناوی: (قيام المرأة على الرِّجال في العرس وخِدمتهم بالنَّفْسِ) واتە: (هەڵسانی ئافرەت لەکاتی زەماوەندا بە خزمەتکردنی پیاوان بەدەستی خۆی).

جا بێگومان ئەگەر ئەو جۆرە ڕەفتارە بۆ ئافرەتی بووك (عروس) دروست بێ، دیارە چاکتر بۆ هی دیکە دروستە، چونکە بووك زیاتر شەرم دەکات! بەڵام بێگومان ئەو جۆرە ڕەفتارەی ئافرەت جگە لە ڕەچاو کردنی ئەدەبە شەرعییەکانی کە بۆ ئافرەت بە مەرج گیراون، لەجلوبەرگ و، جوانی خۆ دەرنەخستن ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ (النور: ٣١) و، بە لەنجەولار

نەڕۆیشتن ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾(النور: ٣١) و، دەنگی خۆ نەرمو ناسك نەكردنەوە ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ﴾ (الأحزاب: ٣٢)، بەڵێ بێجگە لە ڕەچاوكردنی ئەو ئادابانەی دەبێ كۆڕو مەجلیسەكەیش كە خزمەتیان دەكات، تایبەتی و دۆستو ناسیاو بن، نەك خەڵكێكی گشتی.

٢-(مسلم) لە (أنس بن مالك)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەری خواﷺ دراوسێیەكی فارسیان هەبوو و شۆربای خۆشی ساز دەكرد، جا ڕۆژێكیان خواردنی بۆ پێغەمبەری خواﷺ سازكردو پاشان هات بانگی كرد، پێغەمبەریشﷺ ئاماژەی بۆ عائیشە كردو فەرمووی: ئەمیش بێت؟ كابرا گوتی: نەء، پێغەمبەری خوا فەرمووی: كەواتە نایەم، دووبارە دەعوەتی كردەوەو پێغەمبەری خواش فەرمووی: ئەمیش بێت؟ گوتی نەء، پێغەمبەریش فەرمووی: دەمنیش نایەم، پاشان بۆ جاری سێیەم گەڕایەوەو بانگی كردەوە پێغەمبەری خواش فەرمووی: ئەمیش بێت؟! گوتی: بەڵێ، ئیدی هەڵسان پێكەوە چوون هەتا هاتنەماڵەكەیان.

لەم فەرموودەیەشەوە دەفامرێتەوە كە شتێكی زۆر ئاساییە كە ژن لەگەڵ مێردی خۆی، یان هەر ئافرەتێك لەگەڵ مەحرەمی خۆیدا بچێتە دەعوەتی خەڵكی.[1]

٣-هەروەها (بخاري) لە (عائشة)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە كە ڕۆژێكیان ئافرەتێكی بۆ پیاوێكی ئەنصاریی بردوە، جا پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموە: ((**يَا عَائِشَةُ مَا كَانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ؟! فَإِنَّ الأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمْ**

---

(١) بێگومان ڕەچاوكردنی سنوورو ئەدەبەكانی شەرع لەهەموو حاڵاندا هەر پێویستە.

**اللَّهْوُ**؟! : واتە: ئەی عائیشە! ئەوە گۆرانیو دەفتان پێ نەبوو؟! چونکە ئەنصارییەکان کەیفیان پێی دێ.
وەك (ابن حجر العسقلاني)ی لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی: [(١)] ئەو ئافرەتەی کە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ بەبووکی بردوویەتی بۆ مێردەکەی، کچێکی هەتیو بووە کە خۆی بەخێوی کردوە، وە لە ڕیوایەتی (شریك)دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**فَهَلْ بَعَثْتُمْ مَعَهَا جَارِيَةً تَضْرِبُ بِالدُّفِّ وتُغَنِّي؟!**)) واتە: بۆچی کچێکتان لەگەڵ نەناردوە کە دەف لێبدات‌و گۆرانی بڵێت؟!)) عائیشەش دەڵێ: ئێمەش گوتمان: جا چیمان گوتبایە؟! فەرمووی: گوتباتان[(٢)]:

**أتَيْنَـــــاكُمْ أتَيْنَـــــاكُمْ     فَحَيَّانَـــــا وحَيَّـــــاكُمْ**
**ولَـــولا الـــذَهَبُ الأحمـــر     ماحلَّـــت بـــواديكم**
**ولَـــولا الحِنْطَـــةُ السَّـــمْراء     ماسمنَـــتْ عَـــذاريكم**

بەڵێ، هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەرﷺ عائیشە، خوا لێی ڕازی بێ بەزاراوی کوردایەتی بە (بەربووکی) لەگەڵ بووکێك چووەو پێغەمبەری خواش ﷺ چونکە وەك عادەتی ئەنصارییەکان، دەفو گۆرانی بێژیان لەگەڵ نەبووە، گلەیی لێیان کردوە، پاشان چەند وشەیەکیشی فێر کردوون کە دەبوایە لەگۆرانیەکەیاندا گوتبایانن!

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج٩، ص٢٢٥، ٢٢٦.
(٢) واتە: هاتینە لاتان هاتینە لاتان، سلاومان لێبێو سلاوتان لێبێ، وەئەگەر زێڕی سوور نەبوایە، ئەم بووکە نەدەبووە میوانی دۆڵو شیوی ئێوە، وە ئەگەر گەنمی بۆر نەبوایە کچەکانتان قەڵەو نەدەبوون.

٤- (بخاري و مسلم)لە (عائشة)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە کە گوتوویەتی: ((**دَخَلَ عَلَيَّ أَبُو بَكْرٍ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِي الأَنْصَارِ، تُغَنِّيَانِ مِمَّا تَقَاوَلَتْهُ الأَنْصَارُ يَوْمَ بُعَاثٍ. قَالَتْ: وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ تُدَفِّفَانِ وَتَضْرِبَانِ أي بالدف، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَبِمَزَامِيرِ الشَّيْطَانِ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟! وَذَلِكَ يَوْمُ عِيدٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا وَهَذَا عِيدُنَا**)) واتە: ئەبوو بەکر لێم وەژوور کەوت و دوو کچم لەلا بوون لە کچە ئەنصارییەکان، کە بەو وشانەی کاتی خۆی ئەنصارییەکان لە ڕۆژی جەنگی (بعاث)دا بەیەکدییان گوتبوون، گۆرانیان دەگوت... دەڵێ.. بەڵام گۆرانی بێژیی کارامە نەبوون، دەفیان دەکوتا، جا ئەبوبەکر گوتی: ئایا دەبێ دەنگی شەیطان لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت؟! وە ئەوە لە ڕۆژی جەژندا بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر! هەموو کۆمەڵێك جەژنیان هەیەو ئەمڕۆش جەژنی ئێمەیە.

لەم فەرمایشتەوە وەردەگیرێ کە لەبۆنەو ڕۆژانی شادیی و خۆشییدا ڕێگاو دەرفەتی زیاتر بە ئافرەت دراوە- لەشەریعەتدا- کە بەشداریی بکەن و دەوری خۆشیان ببینن.

٥-(مسلم) لە (صحيح)ەکەی خۆیدا بەسەرهاتێکی گێڕاوەتەوە کە ئەمە کورتەکەیەتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ میوانێکی دێ و وا دیارە خۆیان خواردنێکی ئەوتۆیان نەبووە، بۆیە بەهاوەڵەکانی دەفەرموێ: ((**مَنْ يُضِيفُ هَذَا اللَّيْلَةَ رَحِمَهُ اللَّهُ**؟!)) کێ ئەمشەو ئەم پیاوە بەمیوانی دەباتەوە، خوا بەزەیی پیێدا بێتەوە؟!، دیارە پیاوێکی ئەنصاریی دەیباتەوەو بەژنەکەی دەڵێ: هیچمان هەیە؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر، بێجگە لە بژێوی منداڵەکان هیچمان نیە،

ئەویش پێی دەڵێ: هەرچۆن بووە بەشتێك بیان خافڵێنەو، هەر كات میوانەكەمان هاتە ژووری، چرایەكە بكوژێنەوەو وای پیشان بدە كە ئێمەش لەگەڵی دەخۆین...

لەم فەرمایشتەش دەفامرێتەوە كە ئافرەت بەمەبەستی خزمەتی ماڵ‌و میوان بۆی هەیە لەگەڵ مێردو میوانەكانی لە ژوورێك بێت‌و لەنزیكیانەوە دابنیشێت، دیارە لەگەڵ ڕەچاوكردنی ئەدەب‌و ڕەوشتە بەرزە شەرعییەكاندا.

٦-(ترمذي) لە (بُريدة)وە گێڕاویەتەوە كە جارێكیان پێغەمبەر ﷺ دەچوو بەرەو یەكێك لە غەزایەكان، پاشان لەكاتی گەڕانەوەیدا كەنیزەكێكی ڕەش(جارية سوداء) هاتە خزمەتی‌و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من لەخۆمم گرتبوو، ئەگەر خوا بەسەلامەتی گێڕاتیەوە، لەبەردەمتدا دەف لێبدەم‌و گۆرانی بڵێم، پێغەمبەری خوا‌ش ﷺ فەرمووی: ((**إنْ كُنْتِ نَذَرْتِ فَاضْرِبِي وإلاَّ فَلا**) واتە: ئەگەر لەخۆتت گرتوە دەف بكوتە،ئەگەرنا لێی بگەڕێ، ئیدی دەستی كرد بەدەف لێدان، هەتا ئەبوبەكریش هاتە ژوور هەر بەردەوام بوو، عەلیش هاتە ژوور هەر بەردەوام بوو، عوسمانیش هاتە ژوور هەروا، پاشان عومەر وەژوور كەوت، ئیدی دەفەكەی خستە ژێر خۆی‌و لەسەری دانیشت.

**كەواتە :**

با ئەو كەسانەی كە هەمیشە خەریكی ئەوەن كە بەهەر تەئویل‌و پینەو پەڕۆیەك بووە، هەرچی زیاتر جوغزو بازنەی (موباح) تەسك بكەنەوەو هەرچی زیاتر ڕێژەی شتی حەڵاڵ كەم بكەنەوەو هی حەرام زیاد بكەن، بابزانن كە وەك چۆن پێچەوانەی ئەو ڕەفتارە-كە فراوان كردنی بازنەی موباحە لەسەر حیسابی شەرع‌و سنوورەكانی- هەڵەو تاوانە، ئەوەی ئەوانیش هەر وایەو، ئەدەبی تەواو لە خزمەت

خوای کاربەجێ‌و پێغەمبەرە کۆتاییەکەیداﷺ، ئەوەیە کە ئینسان بەهیچ جۆرێك پێشیان نەکەوێتەوە، بەهیچ باری تێپەڕاندان‌و بەزایەدان(الإفراط والتفریط)دا، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾(الحشر: من الآیة٧).
واتە: وەهەرچی پێغەمبەر پێیداون لێی وەربگرن‌و، ئەوەی لێتان قەدەغە دەکات وازی لیّ بێنن.

## ٦-لە بواری حوکم‌و سیاسەتدا:

خوا پشتیوان بێ لە پێنج بڕگەدا باسی چۆنیەتی هەڵس‌و کەوتی ئافرەت دەکەین لە بواری حوکم‌و سیاسەتدا:

### یەك: کارو چالاکی سیاسی بەشێوەیەکی گشتی:

وەك پێشتر باسمان کرد، تێکڕای دەقەکانی قورئان‌و سوننەت بەگشتی ڕوویان لە هەردووك ڕەگەزی نێرومێیە، بێگومان کارو چالاکی سیاسییش هەر یەکێکە لەو جموجوڵانەی کە سەرجەم مسوڵمانان، نەك هەر مافیان هەیە، بگرە ئەرکی سەر شانیانە کە پێیان هەڵسن، چونکە (سیاسەت)لەسادەترین‌و چاکترین پێناسەیدا بریتییە لە: (إدارة شؤون الناس وإصْلاحُها) واتە: بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵك‌و چاککردنی.

ئەمەو سەربارەش ئایەتی وەك: ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ (التوبة: من الآیة٧١). وە فەرموودەی وەك: ((**الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ**

**وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ**))رواه مسلم عن تميم بن أوس الداري. بەڵێ، ئەو جۆرە ئایەتو فەرمایشتانە، کە یان بە ڕاشکاویی یان بەگشتی باسی ئافرەتیشیان تێدا کراوە، دەقن لەسەر ئەوە کە ئافرەت لەبەرانبەر کارو چالاکی سیاسەتو حوکمڕانیشدا، وەك باقی لایەنو بوارەکانی دیکەی دینو ژین، بەرپرسیارەو ئەرکی لەسەرشانە، چونکە وەك پێشتریش باسمان کردوە، چەمكو واتای (المعروف)و (المنکر) هێندە فراوانو گشتگیرە، هیچ جۆرە جموجوڵو چالاکییەك ناهێڵن، کە نەیگرنە نێوخۆیانەوە، پەیوەندیی بەهەر بوارو لایەنێکەوە هەبێ، دیسان وشەی (النَّصيحة)ش- کە بەمانای دڵسۆزییو پەرۆشو مشورخواردن دێ، نەك ئامۆژگاریی (موعظة)-. بەڵێ ئەمیش چەمكو واتایەکی هێندە فراوانە کە هیچ نیازو وتەو کردەوەیەکی باشو پەسەند نامێنێ کە نەیگرێتەوە!

خوێنەری بەڕێز!

ئێستا کە زانیمان شەریعەت، ئافرەتیش وەك پیاو لەبەرانبەر حوکمو سیاسەتدا بەگشتی بە بەرپرسیار دەزانێ، با چەند مەسەلەیەکی گرنگی حوکمو سیاسەتیش جیاجیا بتوێژینەوە، تاکو بەرچاومان لەو بارەوە ڕۆشنتر بێت.

### دوو: مەسەلەی ڕاوێژ(الشورى):

خوای کاربەجێ لە دوو ئایەتی قورئانیدا باسی پێویست بوونی ڕاوێژ(ضرورة الشورى)ی لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا کردوە، کە لەیەکێکیاندا وەك یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی خەڵكو میللەتو، لەوی دیکەشیاندا وەك ئەرکێکی سەرشانی گەورەو پێشەوای مسوڵمانانی خستۆتە ڕوو، بەم جۆرە:

أ- ﴿ وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (٣٨) ﴾ (الشورى:٣٨).

واتـە: ئـەو كەسـانەى كـە وەڵامـى پـەروەردگاريان داوەتـەوە، وە نوێـژيان بەرپاكردوە، وكاروبارىان بە ڕاوێژە لـە نێوانيانـداو، لـەوەى كـە پێمـان داون، دەبەخشن.

وەك دەبينين خـواى بـەرزو مـەزن (ڕاوێژپێكـەوە كـردن)ى مسـوڵمانانى وەك سيماو نيشانەيەكى سـەرەكى يـان بـاس كـردوەو خستووشـيەتە نێـوان نوێـژ بەرپاكردن (إقامة الصلاة)و ماڵبەخشـين (إنفـاق المال)ەوە، كـە دوو دروشمـى هەرە گەورەى تاك و كۆمەڵگاى مسوڵمانن!

تـاكو مسـوڵمانانيش بـزانن كـە ڕاوێـژ وەك نوێـژو زەكـات، فـەرزو پايـەى مسوڵمانەتى و دينداريى يانە.

ب- ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾(آل عمران:١٥٩)

واتە: جا- ئەى موحەممەد!-تۆ بەهۆى بەزەيى خواوە بۆيـان- بـۆ هـاوەڵان- نەرم بووى، وە ئەگەر هاتباو قسە زبرو دڵرەق بوايـەى، لـەدەورت دەپـرژان، بۆيە لێيان ببوورەو داواى لێخۆشبوونيان بۆ- لـەخوا- بكـەو، لـە كاروبـاردا ڕاوێژيان پێبكە، بەڵام هەر كاتێك- پـاش ڕاوێـژ- بڕيارتـدا، پشـت بـە خـوا ببەستەو ئەنجامى بدە، بێگومان خوا پشت پێبەستووياني خۆش دەوێت.

**كەواتە:**

ڕاوێـژ (شـورى) هـەم خەسـڵەت و سـيمايەكى گرنگـى مسـوڵمانانەو وەك نوێـژو زەكات لەسەريان فەرزە، هەم ئەركێكى سەر شـانى بـەرپرس و كاربەدەسـتەكانيانەو بـەهيچ شـێوەيەك نابـێ كەمتەرخـەميى تێدا بكـەن، پێويسـتە بـۆ بـەڕێوەبردنى كاروبارى دين و ژينى كۆمـەڵگا ڕاوێـژ بەمسـوڵمانان بكـەن بەگشـتى، بـەنێرومێ و

وردو درشتیانەوە، چونکە ڕاناو (ضمیر)ی سەر (وشاوِرهُمْ) گشتگیرەو تێکڕای مسوڵمانان دەگرێتەوەو هیچ کامیان هەڵناوێررێن[١]، هەروەها وشەی (الأمر)یش وەك زانایانو توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: هەر کاروبارێکی گرنگو ئەمیەتداری دینو ژینی مسوڵمانان دەگرێتەوە.[٢]

جا شایانی باسە کە هەم پێغەمبەری خوا ﷺو هەم چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیشی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی خوا لێیان ڕازی بێ، بەکردەوە بەو جۆرە ڕەفتاریان کردوە کە خوا فەرمانی پێکردوە، هەمیشە ڕاوێژیان بە وردو درشتو نێرومێی مسوڵمانان کردوە، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو بارەوە، واتە لەبارەی ڕاوێژکردنی پێغەمبەری خوا ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکانی بەئافرەتان:

١- پێشتریش باسمان کرد-لەکورتە باسی(١١)ی بەشی یەکەم لە خاڵی (٣) برگەی (هـ)دا-کە (بخاري) هێناویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ لەساڵی شەشەمی کۆچیدا پاش مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی (صلح الحديبية) دووچاری گرفتو کێشەیەك بوو، بەلاّم بەڕاوێژو ڕێ ڕوونی دایکی بڕواداران (أم سَلَمة) خوا لێی ڕازی بێ، ئەو کێشەیەی بەئاسانی چارەسەرکرد.

جا هەرچەندە هەندێك لە زانایان[٣] ڕایان وایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) لەزمانی عارەبیدا بنچینە(قاعدة)یەك هەیە لەکاتی باسکرانی کۆمەڵێکی تێکەڵ لەنێر و مێدا کاری پێدەکەنو پێی دەگوترێ (قاعدة تغليب المذكر على المؤنث) واتە: ئەو کاتە تەنها ڕاناوی نێرینەبەکار دێنو گشت کۆمەڵەکە بەنێرو مێوە دەگرێتەوە، جا لەهەموو ئەو شوێنانەدا کە ڕووی دواندن (خطاب) گشتییەو سەرجەم پیاوانو ئافرەتان دەگرێتەوە، وەك: (ياأيها الذين امنوا) یان (أقيموا الصلاة) ئەوە قاعیدەی ناوبراو کاری پێکراوە.

(٢) بڕوانە: (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) ی الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، ص١٥٤.

(٣) بۆ وێنە: (الحسن البصري) وەك (الشافعي) لەکتێبی: (الأمّ) دا لێی گێڕاوەتەوە.

هەر بەمەبەستی فێرکردنی خەڵكو چاولێکردنی لەو هەڵوێستەیدا ئەو کارەی کردوە! ئنجا من هەرچەندە ئەو ڕایەم پێ پەسەند نیە، بەڵام خۆ هەرچۆن بێو بەهەر مەبەستێك کرابێ، ئاکارو ڕەفتارە بەرزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئوممەتەکەی هەر سەر مەشقو ڕێڕوونیی و ڕێبازن!

٢-(ابن الجوزي) لە (يوسف بن ماجشون)ەوە هێناویەتی کە گوتوویەتی: ((**قال لي ابن شهاب ولأخ لي وابن عم لي ونحن صبية: لاتستحقروا أنفسكم لحداثة أسنانكم، فأن عمر بن الخطاب رضي الله عنه كان إذا أعياه الأمر المُعْضِلُ دعا الأحداثَ فاستشارهُمْ لِحدَّةِ عُقولِهِم، وكان يُشاوِرُ النِّساءَ**:))

واتە: (ابن الشهاب الزهري) بەمنو برایەکمو ئامۆزایەکمی گوت کە ئێمە منداڵبووین: لەبەر کەمتەمەنیی خۆتانتان پێ کەم نەبێ، چونکە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، هەر کاتێ گرفتێکی قورسی هاتبایە پێش، بانگی تازە پێگەیشتوانی دەکرد، چونکە بیرو هۆشیان تیژو سافە، ڕاوێژی پێدەکردن، هەروەها ڕاوێژی بەئافرەتان دەکرد.[1]

ئاشکرایە کە عومەر خوا لێی ڕازی بێ خەلیفەیەکی سەرڕاست(راشد)ەو ئەگەر بە پێویستی نەزانیایە بە حوکمی ئایەتەکانی ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى:الآية٣٨) و﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ (آل عمران:الآية١٥٩)، ڕەنگە تەنها بە ڕاوێژ پێکردنی پیاوان وازی هێنابایەو، گەنجانی تازە ساڵو ئافرەتانی بەشدار نەکردبایە، بەڵام دیارە زانیویەتی کە هەردووك ڕاناوی (هم)ی سەر (أمرهم)و (شاورهم) وێڕای پیاوان، ئافرەتانو تازە ساڵانیش دەگرێتەوە، وەك لە پێشەوە باسمانکرد.

(١) بڕوانە: (سيرة عمر بن الخطاب لإبن الجوزي ص١٠١.

ئەمەش دوو نموونە لە بارەی ڕاوێژکردنی عومەرەوە بە ئافرەتان بۆ دەرکردنی بڕیارەکانی:

ا- ڕاوێژکردنی بە (حَفْصة)ی کچی‌و دایکی بڕواداران، لەبارەی ماوە(مُـدَّة)ی گونجاوی مانـەوەی پیـاوانی جـەنگاوەرو موجاهیـدو دووریـیـان لـە مـاڵ‌و خێزانیان‌و، ئایا ئافرەتان بەگشتی چەندە خۆڕاگر دەبن‌و، بەچەندە تووشی سەغڵەتیی نابن بەهۆی تامەزرۆییان بـۆ مێردەکانیـان؟ (حَفْصـة)ش خـوا لێی ڕازی بێ، ماوەی چوار مانگی بۆ دیاری کردو، عومـەریش خـوالێی ڕازی بێ کردی بەبڕیار.[1]

ب-هەروەها لەمەسەلەی دیاریکردنی مووچەدا بۆ ئەو منالانـەی کـە لەشـیر براونەوە[2]، کاتێك عومەر خـوا لێـی ڕازی بـێ لـەڕێی ئافرەتانـەوە پێـی گەیشتەوەو حاڵییانکرد کە هەندێك لە ئافرەتان کۆرپەکانیان پێش تـەواو کردنی مـاوەی شـیرخواردن، کـە دوو سـاڵە، لەشـیر دەبڕنـەوە، تـا وەبـەر بڕیارەکەی خەلیفـە بکـەون کـە دەڵـێ: هـەر منـداڵێك لەشـیر بوویێتـەوە مووچەی دەدرێتێ، وە سەرئەنجام ئەو کۆرپانە دووچاری زیان دەبن، بـەڵێ پاش ئاگـادار بـوونی لـەو مەسـەلەیە، یەکسـەر بڕیارەکـەی گۆڕی‌و وای لێکرد کە سەرجەم منداڵانی گچـکە بەشـیرەخۆرو لەشـیربڕاوەوە، بڕیـاری مووچە وەرگرتن بیانگرێتەوە!

٣- هەروەها (عثمان بن عفان) خەلیفەی سێیەم خوا لێـی ڕازی بـێ، بەهـەمان شێوە ڕاوێژی بەئافرەتان کردوە، بەتایبەتی بە (أم سَلَمة) دایکی بـڕواداران[3]

---

(١) سەرچاوەی پێشوو
(٢) هەمان سەرچاوە.
(٣) بڕوانە: (المرأة والسياسة في صدر الأسلام) د.أحمد الكُبَيسي، ص٤٨.

خوا لێی ڕازی بێ، هەڵبەتە (أبوبكر)و (علي) یش بەهەمان شێوە ڕاوێژیان بە ئافرەتان کردووەو لە عەقڵو ئەزموونەکانیان بەهرەمەند بوون، خوا لەهەموو لایەکیان ڕازی بێت و ڕازیشیان بکات.

٤- وە (إبن حجر العسقلانی)[١] لە (أبي بردة عن أبيه) دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: ((**مَا أشكلَ عَلَينَا أمرٌ فَسَألْنَا فيهِ عائشةَ إلاّ وَجدْنا عِندَها عِلماً عَنه**))واتە: هیچ مەسەلەیەکمان لێ نەئاڵقاوەو لەبارەیەوە پرسیارمان لە عائیشە کردبێ، مەگەر زانیاریمان لێ چنگ کەوتوە دەربارەی.

هەروەها (ابن حجر)[٢] لە (عطاء بن أبي رباح)ەوە هێناویەتی کە گوتوویەتی: ((**كانت عائشة أفقه الناس وأعلم الناس، وأحسن الناس مشورة في العامّة**)) واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ تێگەیشتووترینی خەڵکی و زاناترینیان بوو، وە لەهەموو کەس ڕاوێژی و بۆچوونی لەبارەی کاروباری کۆمەڵگاوە باشتر بووە.

٥- پێشتریش باسمان کردوە کە (عبدالرحمن بن عوف) خوا لێی ڕازی بێ، بۆ پێشنیار کردنی خەلیفەی سێیەم داخۆ (عثمان) بێ یان (علي)؟ پرس و ڕاوێژی بەهەموو لایەك کردوە، تەنانەت کچانی پشت پەردەش(ذوات الخدُور)[٣]، وەك (ابن تیمیة) هێناویەتی.[٤]

ئەوە سەبارەت بە هەڵوێستی پێغەمبەرﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکانی و هاوەڵانی بەرانبەر بەمەسەلەی ڕاوێژ پێکردنی ئافرەتان، کەواتە پێچەوانەی ئەوە کە ڕابورد

(١) بڕوانە: (الاصابة في تَمييز الصَّحَابة) لابن حجر العسقلاني، ج٤، ص٣٩٢.

(٢) هەمان بەرگو لاپەرەی سەرچاوەی پێشوو.

(٣) بۆیە ئەو وەسفە بۆ کچان بەکارهێنراوە چونکە (کچ) لە (ژن) زیاتر شەرم دەکات و خۆی لەچاوی پیاوان حەشار دەدات وەك فیترەت، بەمەرجێك میزاج و سروشتی تێك نەدرابێ.

(٤) بڕوانە: (المفصل) ی (د.عبدالکریم زیدان) ج٤، ص٣٣٤.

کە بریتییە لە حیساب نەکردن بۆ ئافرەتانو پشت گوێخستنیانو ڕاوێژ پێنەکردنیان، بیروبۆچوونو هەڵوێستێکی نەفامانەو ناشەرعییەو هیچ پەیوەندیی بەشەریعەتی خواوە نیە، هەر شتێکیش بەناوی فەرموودە (حدیث)ەوە لەوبارەوە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕرابێتەوە، بەتەئکید هەڵبەستراوەو ئەصڵی نیە، بۆ وێنە:

(شاوروهُنَّ وخالِفوهُنَّ...) کەڵەسەر زمانان باوە، زانایانی پسپۆڕی بواری فەرمایشت ناسیی گوتوویانە: ئەسڵی نیە![1]

ئنجا با سەرنجی هەڵوێستی شەرعزانان (فقهاء)یش بدەین، داخۆ لەو بارەوە چۆنە:

جەماوەرو زۆربەی زۆری شەرعزانان ڕایان وایە کە ڕاوێژکردن(الشورى)و فەتوا(الفَتْوى)یەك حوکمیان هەیە و، هەر کەسێك بۆی هەبێ فەتوا بدات، بۆیشی هەیە ڕاوێژی پێ بکرێو، بیرو بۆچوونی خۆی بۆ حوکمڕانان هەر لە خەلیفەو قازییەوە، هەتا گچکەترین کاربەدەست پێشکەش بکات، هیچ کام لە شەرعزانان نێرینەیی(ذكورة)یان بۆ بابای فەتوادەر(مفتي) بە مەرج نەگرتوە.

(الماوردي) لەو بارەوە گوتوویەتی: ((إنَّ كل مَنْ صَحَّ لَهُ أن يُفْتي في الشرع، جاز أَنْ يُشاوِرَهُ القاضي في الأحكام فَتُعْتَبَرُ فيه شروط المفتي ولاتعتبر فيه شروط القاضي فيجوز أن يشاور المرأة، إِذْ يجوز أن تَسْتَفْتي وأَنْ تُفْتي) واتە: بێگومان هەرکەسێك لەشەرعدا بۆی هەبێ فەتوا بدات، بۆیشی هەیە کە قازی لە حوکمە

(١) بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الألباس عمّا اشتهر من الأحاديث على أَلْسِنَةِ الناس) وە بڕوانە: (المقاصد الحسنة في بيان كثير من الأحاديث المشتهرة على الألسِنة) ص٢٤٨، للسّخاوي.

شەرعییەکاندا ڕاوێژی پێبکات، چونکە مەرجەکانی فەتوادەری تێدا ڕەچاودەکرێن، نەك هی قازی، بۆیە قازی بۆی هەیە کە ڕاوێژ بەئافرەتان بکات، چونکە ئافرەت بۆی هەیە داوای فەتوابکاتو فەتواش بدات. [1]

وە (الخطیب الشربینی) [2] و (الباجوري)[3]یش هەمان شتیان گوتوە.

بەڵام زانایانی حەنەفی مەزهەب نەك هەر فەتوادانو ڕاوێژ پێکردن، بەڵکو بۆ ئافرەت بە دروست(جائز)ی دەزانن کە لەهەر بوارێکدا بۆی هەبێ تێیدا ببێتە شایەت بۆیشی هەیە پلەی دادوەری(منصب القضاء) یشی پێبدرێ، (الکاساني) لەو بارەوە گوتوویەتی[4]: ((وأما الذكورة فَلَيْسَتْ من شروط جواز التقليد في الجملة، لأنّ المرأة من أهل الشهادات في الجملة إلاّ أنها لاتقضي في الحدود والقصاص لأن لاشهادة لها في ذلك، وأهلية القضاء تدور مع الشهادة) واتە: بەڵام نێرینەیی بەمەرج نەگیراوە بۆ دروست (جائز) بوونی وەرگرتنی پلەی قاضیەتی، چونکە ئافرەت بەگشتی بۆی هەیەو شایستەیی شایەدی دانی هەیە، ئەوەندە هەیە لە سنوورە شەرعییەکانو تۆڵە وەرگرتنەوە(قصاص)دا دادوەری ناکات، چونکە بۆی نیە لەو بوارانەدا شایەدیی بدات، وە شایستەیی دادوەرییش لەگەڵ شایەتیداندا یە.

بەڵام لەلای (طبري)[5] و (ابن حَزْم)[6] ئافرەت بۆی هەیە بە موتڵەقیی ببێتە قاضیو لەهەر کێشەیەکدا دادوەریی بکات، تەنانەت لە سزا شەرعییەکانیشدا.

---

(١) بڕوانە: (أدب القاضي) ص٢٦٤.

(٢) بڕوانە: (مغني المحتاج) ج٤، ص٣٩١.

(٣) بڕوانە: (حاشية الباجوري على ابن قاسم الغزّي) .

(٤) بڕوانە: (بدائع الصنائع) للكاساني، ج٧، ص٣.

(٥) بڕوانە: (المفصّل في أحكام المرأة والبيت المسلم) د. عبدالكريم زيدان، ج٣، ص٤٢٧.

(٦) بڕوانە هەمان بەرگو سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

**کەواتە:**

ئێستا کەزانیمان قورئانو سوننەت چییان فەرمووەو، پێغەمبەری خوا ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکانیو هاوەڵەکانیشی خوالێیان ڕازی بێ چۆنیان هەڵسوکەوت کردوە لەبواری پرسو ڕاوێژ پێکردنی ئافرەتاندا، زۆر چاك دڵنیا دەبین کە ئەو زاناو نووسەرە هاوچەرخانەمان کە گوتوویانەو دەڵێن: ئافرەت لە کۆڕی ڕاوێژ (مجلس الشوری)ی دەوڵەتی ئیسلامیدا هیچ پایەو شوێنێکی نیە! بەهەڵەدا چوونو هیچ بەڵگەیەکی شەرعییو عەقڵییشیان بەدەستەوە نیە، بەڵکو ڕاکەیان پێچەوانەی قورئانو سوونەتو هەڵوێستی کردەیی پێغەمبەری خواو جێنشینە سەر ڕاستەکانیشیەتی.[1]

---

(١) پێمواێە یەکەمین کەس لەزانایانی هاوچەرخ کە ئەو ڕایەی دەربڕیوە، پێشەوای ناودار (أبو الاعلی المودودي) یە ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کتێبی: (نظرية الإسلام و هديه في السياسة والقانون والدستور) لەژێر سەرباسی (المرأة ومناصب الدولة في نظام الأسلام) دا، ص٣١٦تا ٣٢٥. جا ئەوەندەی سەرنجی بەڵگەکانی (أبو الأعلى) م دا هیچیان هێزو پێزی ئەوەیان نەبوو کە لەبەرانبەر ئەو هەموو بەڵگانەدا خۆڕابگرن کە پێشتر هێنامانەوە، چونکە:

١-ئایەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾(النساء: من الآية٣٤) پەیوەندیی بەماڵو خێزانەوە هەیە کە ئایا کێ سەرپەرشتی بکاتو بێگومان پیاویش لەو ڕووەوە شایستە ترە، وەك دوایی بەدرێژیی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

٢-وە فەرموودەی: ((لَنْ يُفلح قومٌ ولَّوْا أمرهُم إمرأةً))رواه البخاري، پەیوەندیی بە سەرۆکایەتیو شەخسی یەکەمی دەوڵەتەوە هەیە، وەك دوایی باسی دەکەینو مەسەلەی ڕاوێژیش لەو بابەتە زۆر جیاوازە.

٣-وە ئایەتی: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى...﴾(الأحزاب: الآية٣٣) ش وەك لە داهاتوودا دەیتوێژینەوە، ئەگەر تایبەتیش نەبێ بەهاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خواشەوە، خوا لێیان ڕازی بێ، ئەو پەڕەکەی باسی شوێنی ئاسایيو کاری

سەرەکی ئافرەت دەکاتەو، هیچ دژایەتی و تێك گیران لەگەڵ مەسەلەی ڕاویژ پێکردنی ئافرەتدا نیە، چونکە هەر خودی قەدەغەکرانی جوانی خۆدەرخستن (التبرج)، بەڵگەیە لەسەر چوونە دەرەوەی ئافرەت لەکاتی پێویستیدا، ئەگەرنا خۆ لەماڵێ لێی قەدەغە نیە کە بۆ مێردو مەحرەمەکانی جوانی خۆی دەربخات: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِن﴾(النور: الآية ٣١) .

٤-وە ئەوە کە گوتوویەتی: (.. والحقيقة أن المجالس التي تُدعى بمثل هذا الاسم في عصرنا هذا لَيْسَتْ وظيفتها مجرد التشريع وسَن القوانين بل هي بالفعل تُسَيِّر دفَّة السِّياسة في الدولة، فهي التي تؤلِّف الوزارات وتحلُّها، وتضعُ خطة الأدارة...) ص٣١٧، ٣١٨.

واتە: لە ڕاستیدا ئەو کۆڕ (مجلس) انەی کە لەم سەردەمەدا بەو ناوەوە- ناوی: ئەنجوومەنی یاسا دانان (المجلس التشريعي) - ناوزەد دەکرێن، ئەرکەکەیان بەس یاسادانان نیە، بەڵکو بەکردەوە دۆلابی سیاسەتی دەوڵەت دەچەرخێنن، چونکە ئەو ئەنجوومەنانەن کە وەزارەتەکان پێك دێنن و هەڵیان دەوەشێننەوە، وە نەخشەی بەڕێوەچوون دادەنێن..

**بەڵێ لەوەڵامی ئەم قسانەشدا دەڵێین:**

١-لەڕاستیدا ئەرکی ئەنجوومەنی یاسادانان(المجلس التشريعي) لەم ڕۆژگارەدا دوو شتی سەرەکییە، کە هەردووکیان نەك هەر (ماف) بگرە ئەرکی ئافرەتی مسوڵمانن لە نێو کۆمەڵگاو دەوڵەتە شەرعییەکەیدا:

ا-یاسادانان کە بە زاراوەی کاتی خۆی، فەتوادان(إفتاء) ە ئەمیش وەك پێشتر باسمان کرد، تەنها زانایی و شایستەیی تێدا ڕەچاو کراوە، هیچ مەرجی دیکەی وەك نێرایەتی (ذكورة) تێدا بەمەرج نەگیراوە.

ب-لێپرسینەوەو چاودێریی (المحاسبة والمراقبة) ی کار بەدەستانو داموو دەزگاکان ،کە لە شەریعەت لانەدەن، ئەمیش بێگومان- وەك پێشتر باسکرا- ئەرکی سەر شانی هەر مسوڵمانێکەو فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە (الامر بالمعروف والنهي عن المنكر) یش جگە لەوە شتێکی دیکە نیە!

٢-مەرج نیە واقیعی ئەنجوومەنەکانی یاسادانانی ئەم ڕۆژگارە ،تاکە نموونەو شێوەی پێکهێنانی ئەنجوومەنی شوورا بن، بەڵکو لە دەوڵەتێکی ئیسلامی بەو جۆرە دەگۆڕێن و

پێك دەهێنرێن كە لەگەڵ یاساو ئاراستەكانی شەریعەتدا پڕ بە پێست بن.

٣-ئەگەر گریمان وەك (أبو الأعلی) گوتوویەتی، ئەو ئەنجوومەنانەی ئەم ڕۆژگارە دەستەڵاتی باڵای دەوڵەتیش بن و ڕاست بێت (قِوامة) یان بەسەر كۆمەڵگاشدا هەبێ، ئەوە دیسان ئەو؛ ناگەیەنێ ئافرەت باڵا دەست (قوام) بووە بەسەر كۆمەڵگادا، چونكە ئەوەی كە سیفەتی باڵادەستی (قِوامة) یەكەی بۆ هاتۆتە دی، كۆی سەرجەم ئەنجوومەنەكەیە نەك تاك تاكی ئەندامەكانی، كە هەندێكیان ئافرەتن، ئینجا وەك پێشتریش باسمان كرد هەركام لە پیاوو ئافرەت ئەركی مشوورخۆریی و سەرپەرشتی كۆمەڵگایان لەسەر شانە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾(التوبة: من الآية٧١)، كە دەگونجێ ناوبنرێ: (الولاية المتبادلة) .

٤- پاشان دەڵێین: وەك (أبو الاعلی) گوتوویەتی: كە نابێ ئافرەت هیچ جۆرێك لە جۆرەكانی سەرپەرشتیاریی (الولایة) ی پێ بسپێرێ، چونكە دژایەتی هەیە لەگەڵ ئایەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾(النساء: الآية٣٤) وپێغەمبەریش فەرموویەتی: ((لـن يفلـح قـومٌ ولّـوا أمـرَهُمْ أمـرأةً))، ئەوە وا نیە، چونكە: زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە دروستە ئافرەت ببێتە چاودێر(ناظر) بەسەر(وقف)ەوە، وە سەرپەرشتیاریی(وصایة) ماڵ و سامانی هەتیوان بكات!

وە (أبو داود) گێڕاویەتەوە كە عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ بۆخۆی سەرپەرشتی كاروباری زەكاتەكەی دەكرد، پاشان عایدی (حفصة) ی كرد كە هەتا دەمرێ سەرپەرشتی بكات، ئینجا لەدوای وی خزم و نزیكانی تێگەیشتووی.

٥- هەروەها ئەوە كە (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ پاش جەنگی حوشتر (الجَمَل) لەوە ژیوان بۆتەوە كە لەماڵ چۆتە دەرێ وە گلەیی لە (عبدالله بن عمر)-خوا لێیان ڕازی بێ- كردوە كە بۆچی نەهی لێنەكردو؛ كە دەربچێ؟! ئەم مەسەلەش بەهیچ جۆرێك ناكرێتە بەڵگەی ئیسپاتی ئەو مەبەستە كە دەیەوێ ئیسپاتی بكات، چونكە:

أ- پەشیمان بوونەوەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، لەسەر ئەسڵی لەماڵ چوونە دەرەوەكەی نیە، بەڵكو لەسەر ئەوەیە كە ئەو جەنگو هەرایە قەوماوەو ئەویش ئەگەر لەماڵ نەچووبایەدەر گیرۆدەی نەدەبوو، ئەگەرنا سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە ئافرەتان بۆ كاری پێویست بۆیان هەیەو بگرە جاری وایە فەرز دەبێ

کە لەماڵ بچنە دەرێ.

ب-لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو دەقانەی قورئان‌و سوننەت‌و هەڵسوکەوت‌و هەڵوێستی پێغەمبەری خواﷺ‌و خەلیفە ڕاشیدەکانیدا، هیچ یەکمان لەسەر ئەوە نەکەوتوە کە لەماڵ چوونە دەرەوەی عائیشە (دایکی بڕواداران) بکەینە بەڵگە تاکو بەرەخنە لێگرتنی مەبەستەکەی ئێمە زیانی پێ بگات!

**بەکورتی:**

هۆی ژیوان بوونەوەکەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، لەوە کە ئەو سەفەرەی کردوە کە تێیدا تووشی جەنگی (جَمَل) بوەوە، لەسەر ئەسڵی سەفەرەکەی نەبووە، بەڵکو لەسەر ئەوە بووە، کە ئەو ئامانجەی سەفەرەکەی لە پێناودا کردوە، نەك هەر نەهاتۆتە دی، بگرە پێچەوانەی ئەوەش ڕوویداوە!

٦-وە (أبو الاعلى) لە کتێبی (الحجاب) دا بەڵگەیەکی دیکەش دەهێنێتەوە لەسەر ئەوە کە نابێ‌و دروست نیە کە ئافرەتی مسوڵمان ببێتە ئەندامی ئەنجوومەنی شورا، کە لەوانی پێشووی بەهێزتر نیە، چونکە دەڵێ: بەبەشداری کردنی ئافرەت لە ئەنجوومەنی شورادا، گیرۆدەی تێکەڵیی (إختلاط) لەگەڵ پیاوان دەبێ‌و، وەك پێویست ناتوانێ پابەند بێ بەپۆشاك‌و حەشمەتێك کە لە شەریعەتدا بۆ ئافرەتان دانراوە!

**لە وەڵامی ئەو بەڵگەیەشدا دەڵێین:**

١-وەك پێشتریش گوتمان ئافرەتی مسوڵمان لەسەری پێویستە سەرجەم ئەدەبە شەرعییەکان ڕەچاو بکات، لەکاتی چوونەدەرو هەر چالاکی‌و هەڵسوکەوتێکیدا.

٢-تێکڕای زانایان لەبەر پێویستی (ضرورة) تێکەڵیی (إختلاط) یان بەڕەوا زانیوە، وەك (نووي) لە (شرح صحيح مسلم) ج٩، ص١٠٩دا گوتوویەتی: (... ويُستثنى من هذا كلّ مواضع الضرورة..) .

٣-هەروەها ئاشکرایە لەکاتی جێبەجێکردنی (مناسك الحج) و شایەتیی دان‌و خزمەتی ماڵ‌و میوان‌و کڕین‌و فرۆشتن‌و چارەسەری نەخۆش‌و دادگایی کردن‌و چالاکییە جیهادییەکان‌و ... هتددا، دروستەو جاری واش هەیە فەرزە کە ئافرەت نزیك پیاوان بکەوێتەوەو تێکەڵیان ببێ، چونکە وانەبێ ئەو کارانەی بۆ ئەنجام نادرێن‌و، بێگومان هەر شتێکیش فەرزێك یەکی لەسەری کەوت فەرز دەبێ.

## سێ: مەسەلەی بەڵێنو پەیمان (البيعة):

مەسەلەی بەشدارییکردنی ئافرەتان لە هەڵبژاردنو بەیعەت پێدانی پێشەواو گەورەی مسوڵمانانندا، پێم شکنایەت هیچ مشتو مڕێکی لەسەر بێت، لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونیی باسی ئەو مەسەلەیەی کردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾ (الممتحنة:١٢)

واتە: ئەی پێغەمبەر! هەر کات ئافرەتانی بڕوادارت هاتنە لا، بەیعەتت پێدەدەن کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خوا، وە دزی نەکەن، وە زینا نەکەن، وە

---

**کەواتە:**

مەترسی تێکەڵ بوون(إختلاط) بەهیچ جۆرێك ناگونجێ بکرێتە بەڵگەی ئەندام نەبوونی ئافرەت لە ئەنجوومەنی شوڕادا، چونکە ئەگەر وابێ دەبێ گەلێك کارو چالاکی دیکەش لە ئافرەت قەدەغە بکەین، کە بەبێ جۆرێك لە تێکەڵیی بۆیان ناکرێنو زەقترینیشیان حەجو عومرەن! هەرچەندە دەشگونجێ بەهۆی دیاری کردنی جێگاو ڕێگایەکی تایبەتەوە بۆ ئافرەتان تا ڕادەیەکی زۆر دووربینیی (إحتیاط) لە تێکەڵیی ئافرەتانو پیاواندا بکرێ.

**تێبینی:**

بۆ نووسینی ئەم پەراوێزە تا ڕادەیەك سوودم لە کتێبی: (قضايا فقهية معاصرة) ی (د. محمد سعيد رمضان البوطي) وەرگرتوە، باسی (المرأة والشورى في الشريعة الاسلامية) ص١٦٧-١٧٨.

منداڵەکانیان نەکوژن، وە بوختانێك کە لە نێوان دەست و لاقیاندا هەڵی دەبەستن، سازی نەکەن- واتە منداڵی غەیری مێردیان و خۆیان نەکەنە هی خۆیان-، وە لەچاکەدا سەرپێچیت لێنەکەن، جا تۆش پەیمانیان لێوەربگرەو داوای لێبوردنیان بۆ لەخوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەیی.

هەروەها مەسەلەی پەیمان و بەڵێنی ئافرەتان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەرجەم کتێبەکانی سوننەت و سیرەدا هاتوە، بۆ وێنە:

(بخاري ومسلم)لە (عائشة)وە خوا لێی رازی بێ گێڕاویانەتەوە، کە گوتوویەتی:

((**كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُبَايِعُ النِّسَاءَ بِالْكَلَامِ**)): واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەقسە پەیمانی لە ئافرەتان وەردەگرت ، (واتە بەبێ تۆقەکردن).

## چوار: وەزارەت و دەزگاکانی دیکەی دەوڵەت:

ئاشکرایە کە لەبواری مامەڵەکان(المعاملات)دا ئەسڵ ڕەوا بوون(الإباحة)ە، هەتا بەڵگە پەیدا دەبێت لەسەر ناڕەوایی و قەدەغە بوون، ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد، ئافرەتیش وەك پیاو دوێنراو(مخاطب)ی سەرجەم ئەمر و نەهی و ئاراستەکانی شەریعەتە بەگشتی، مەگەر بەبەڵگەیەکی ڕوون لە شتێکدا جیاکرابێتەوەو هەڵاوێرابێ، دەنا بێجگە لەسەرۆکایەتی و پێشەوایەتی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی، هیچ پایە (مَنْصب)یەکی دیکەی کاروباری سیاسی دەقێکی شەرعی ڕاست و ڕاشکاو (صحیح و صریح)ی لەسەر نیە کە لەئافرەت قەدەغە کرابێ، بەڵام وەك پێشتریش باسمانکرد، چەندان دەقی قورئان و سوننەت ئەوە دەگەیەنن کە پیاوو ئافرەت لە بەڕێوەبردنی دین و هەڵسوڕاندنی ژیندا، وەك یەك بەرپرسیارن و پێویستە هەردووك ڕەگەزەکە مشوورخۆرو سەرپەرشتیار بن:

﴿بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾(الأنفال: ٧٢).

بەڵام بێگومان نابێ لێرەدا لە دوو ڕاستی بێ ئاگابین:

**یەکەم:** جەنگو جیهاد کە لەئەسڵدا لەسەر ئافرەت پێویست نەکراوە، مەگەر لەحاڵەتی نائاساییدا کە پێی دەگوترێت هەڵسانی گشتی(النفير العام)، ناگونجێ ئافرەت تێیدا بکرێتە بەرپرسو فەرماندە، چونکە تێییدا سەرکەوتوو نابێ، بەبەڵگەی ئەوەی خوای کاربەجێ لەسەری پێویست نەکردوە، واقیعیش شایەدی وەحییە!

**دووەم:** نابێ ئافرەت وەزارەتێك یان بەرپرسیێتی ئۆرگانو کارێکی پێ بسپێرری کە لەگەڵ فیترەتو کەسایەتییدا ناگونجێو، پێویستە چ کاروبارێك لە سروشتو شایستەییەوە نزیکترە ئەوەی پێبسپێرری، بەپێی بنچینەی: (نُنْـزِلُ الناسَ منازِلَهم) واتە: خەڵکی لە شوێنی خۆیاندا دادەنێین.

ئەوانەش کە ئایەتی﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾(النساء: الآية٣٤)و فەرموودەی: ((**لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أمْرَهُمْ امْرَأةً**)) بە بەڵگەی دروست نەبوون(عدم جواز)ی بەرپرسیێتی ئافرەت بۆ هەر جۆرە ئۆرگانێك کە پیاوانی تێدا بن، دێننەوە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکردوە، لەوەڵامیان دەڵێین:

ا- ئایەتەکە باسی خێزانو ماڵ دەکاتو، دەفەرموێ لەبەر چەند هۆکارێك پێویستە پیاوان سەرپەرشتیاری ئافرەتانو ماڵو خێزان بنو، بۆمان نیە هەر لەخۆوە ئایەتەکە بکەینە بەڵگەی ئیسپاتی مەسەلەیەکی دیکەی جیا کە هیچ پەیوەندییان پێکەوە نیە.

ب- فەرموودەکەش- هەرچەندە مشتو مڕێکی لەسەر هەیە- باسی سەرۆکایەتی دەوڵەت دەکات، کە گەلێك ئافرەت بکەنە سەرۆکیان سەرفراز نابن، چونکە کاتێك پێغەمبەری خواﷺ ئەو فەرمایشتەی فەرموو، کە

هەواڵی بۆهات: گەلی فارس پاش مردنی (شیرویە)ی پادشایان (بوران)ی کچیان کردۆتە پادشا، بۆیە هەندێك لەزانایان دەڵێن: ناگونجێ ئەم فەرموودەیە بکرێتە بەڵگەی: دروست نەبوون(عدم جواز)ی پادشایەتی و سەرۆکایەتی بۆ ئافرەت لە ئیسلامدا، چونکە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە وشەی: (**لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ**) هەر گەلێك نیە، بەڵکو مەبەست گەلێکی تایبەتە کە سیاقی فەرموودەکە دەلالەتی لەسەر دەکات، واتە: گەلی فارس! ئنجا بێگومان ئەوە کە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ وەك (ابن حزم) [1] هێناویەتی، ئافرەتێکی بەناوی: (الشفاء) کردۆتە بەرپرس و پشکنەر(مفَتِّشة)ی بازاڕ، کە بێگومان بازاڕ(السوق)یش بەزۆری پیاوان کاریان تێدا کردوە، بەڵێ ئا ئەوە بەڵگەیەکی بەهێزی دیکەیە بۆ ئیسپاتی ئەو ڕایە کە لەبارەی کارو بەرپرسێتی گونجاوو شایستە پێسپێرانی ئافرەتانەوە، خستمانە ڕوو.

## پێنج: مەسەلەی سەرۆکایەتی و پێشەوایەتی ئافرەت:

هەر چەندە لە کتێبی خوادا دەق(نص)ێکی ڕوون و ڕاشکاو مشتو مڕ هەڵنەگر نیە لەسەر قەدەغەو نادروست(عدم جواز) بوونی پلەوپایەی سەرۆکایەتی بۆ ئافرەتان لەکۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا، بەڵام هیچ زاناو پێشەوایەکی ناودارو (مُعتَبَر)ی ئیسلامم پێ شك نایەت، کە گوتبێتی: دروستە ئافرەت پلەی سەرپەرشتیاریێتی گشتی(مقام الولاية العامة)ی پێبدرێ.

(١) بروانە: (المحلّى شرحُ المُجلّى) ج٩، ص٤٢٩، هەروەها بروانە: (المفصَّل في أحكام المرأة والبيت المسلم) ج٣، ص٤٢٧.

جا هەندێك لەزانایان ئایەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ (النساء: من الآية٣٤). بەبەڵگە دێننەوەو دەڵێن: ئەگەر بۆ سەرپەرشتیاری خێزانێکی چەند کەسی پێویست بێ پیاوان سەرۆكو باڵادەست بن، ئەوە بۆ سەرپەرشتیو بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو دەوڵەتێکی چەند هەزار کەسی، چاکتر پیاوان پێویستن.

بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام ئەم فەرموودەیە بەبەڵگە دێننەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی[1]:

((**عَنْ أبِي بَكْرَةَ﷛ قَالَ: لَمَّا بَلَغَ النَّبِيُّ ﷺ أنَّ فَارِساً مَلَّكُوا إبنَةَ كِسْرَى، قَالَ: لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أمْرَهُمْ امْرَأةً**))رواه البخاري. واتە: (کاتێك هەواڵ بە پێغەمبەرﷺ گەیشت کە فارسەکان کچی کیسرایان کردۆتە پادشایان، فەرمووی: گەلێك کاروباری خۆیان بە ئافرەتێك سپاردبێ، سەرکەوتوو نابن.)

بەڵام من پێم وایە- دوای ئەوەی زانیمان بەڵگە هێنانەوە بەم فەرموودەیە لە مشتو مڕ خاڵی نیە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد-، ئەم دوو بەڵگەیە لەوانەی ڕابردوو بەهێزترن:

١- سەرۆکایەتییو سەرپەرشتیاریی دەوڵەتو کۆمەڵگای ئیسلامیی تەنها سەرۆکایەتییەکی دنیایی(رئاسة دنيوية)ی ڕووت نیە، بەڵکو وێڕای ئەوەو لەپێش ئەوەشدا پێشەوایەتییەکی دینیی(إمامة دينية)یشە، کە بەتەئکید ئافرەت تواناو بۆ لوانو شایستەیی ڕاپەڕاندنی هەموو ئەو ئەرك و کارە گەورەو گرنگانەی نیە، چونکە هەندێکیانی هەر لەسەر پێویست نەکراون، وەك: جەنگو جیهاد، جومعە، نوێژی جەماعەت[2]، وە هەندێکیشیانی هەر بۆ ناگونجێن وەك: فەرماندەێتی سوپا(قيادة الجيش)، پێش نوێژییو

---

(١) بڕوانە: (صحيح البخاري) ج٧، ص٧٣٢، رقم الحديث: ٤٤٢٥.

(٢) چونکە زۆر لە زانایان نوێژی بەکۆمەڵ بەفەرزی عەین یان کیفایە دەزانن.

وتاردانی جومعەو بۆنەکانی وەك: جەژنەکانو مانگو خۆر گیرانو نوێژی باران بارین، جەماعەتی پێنج فەرزەکان، ئنجا سەربارەش حاڵەتەکانی بێ نوێژیی(حیض)و دووگیانیی(حمل)و زەیسانی(نفاس)یش لەوێ بوەستن، کە گۆڕانێکی زۆر بەسەر عەقڵو دەروونو جەستەی دا دێنن!

٢-ئەگەر سەرنجی واقیعی کۆنو تازەو ئێستای مرۆڤایەتی بدەین، بە سەرجەم میللەتو کۆمەڵگاکانیەوە، چ بێدین، چ دیندار، چ پێشکەوتوو، چ دواکەوتوو، چ گچکەو کەم، چ گەورەو قەرەباڵغ دەبینین ،کە مەگەر بە دەگمەن ئەگەرنا هەر پیاوان سەرۆكو پاشاو گەورەی وڵاتانو کۆمەڵگاو میللەتان بوونو هەن.

**کەواتە:**

دیارە کە شایستەتر بوونی پیاوانو لێهاتووتر بوونیان بۆ سەرۆکایەتی، حەقیقەتی ژیانو گوزەرانی ئینسانو بەرژەوەندیی باڵای مرۆڤایەتی داخوازی دەکات، هەر بۆیەش شەریعەتیش وا بڕیاری داوە، چونکە وەك زانایان گوتوویانە: (أيْنَما وُجِدتِ المَصلحة فثم شرع الله).

شایانی باسیشە کە بەپێی ئەوە ،کە ڕابورد پێویستە پایەی (والي) بوونیش کە لە جێی پارێزگار(محافظ)بوونی ئەم ڕۆژگارەیە، بۆ ئافرەت ڕەوا نەبێ، چونکە (والي)یش لە چوار چێوەی شارو کاری خۆیدا، سەرجەم ئەرکەکانی خەلیفەو سەرۆکی گشتی هەن.

**خوێنەری بەڕێز!**

ئێستاش دوای ئەوەی لە هەموو بوارو مەیدانەکانی: زانستو عیبادەتو کارو کەسابەتو جەنگو جیهادو کۆمەڵایەتیو حوکمو سیاسەتدا، سەرنجی کارو چالاکیو جموجۆڵی ئافرەتاندا، زۆر بە ڕوونیی ڕاستێتیی(صدق) ئەو قسەیەمان بۆ

دەرکەوت، کە کردوومانە بەسەر باس‌و ناوونیشانی ئەم خاڵی سێیەمە: (ئافرەت ڕێی هیچ جۆرە کارو چالاکییەکی لێنەگیراوە)، بەڵام بەر لەوەی کۆتایی بەم خاڵی سێیەمە بێنین، بە پەسەندی دەزانم بەخێرایی تیشکێکیش بخەینە سەر مەسەلەی خاترگیرانی ئافرەت‌و لەسەر پێویست نەکرانی چەند ئەرکێك:

## یەك: ئافرەت نە مەسرەف کێشان(نفقة)ی خۆی نە هی منداڵی لەسەر نیە:

بەڵێ ئەمە یەکێکە لە جۆرەکانی خاترگیران‌و (مراعاة)کرانی ئافرەت لە شەریعەتدا، کە هیچ کاتێك شەرع ناچاری ناکات ڕۆزی‌و بژێوی خۆی‌و منداڵەکانی پەیدا بکات، بەڵکو ئەوە ئەرکی مێردیەتی ئەگەر شووی کردبێت، ئەگەر نا هی باب، یان براو مام‌و هتدیەتی‌و، ئەگەر کەس نەبوو، ئەرکی دەوڵەتە.

خوای کاربەجێ لەو بارەوە کە مەسرەف‌و نەفەقەی ژن‌و منداڵ لەسەر پیاوە، فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾(البقرة: الآية٢٣٣)

واتە: وە لەسەر خاوەنی منداڵەکەیە بەشێوەیەکی بەچاك زانراو، بژێوو پۆشاکی ئافرەتان دابین بکات.

وە فەرموویەتی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ﴾ (الطلاق: الآية٦).

واتە: هاوسەرەکانتان لەو جێگاو ڕێگایەدا نیشتەجێ بکەن، کە بۆتان دەگونجێ‌و خۆشتانی تێدان.

تەنانەت ئەگەر هاتو بابای مێرد ڕژد و چرووك بوو و وەك پێویست پێداویستییەکانی ژن‌و منداڵەکانی دابین نەدەکرد، ئەوە ژنەکە ئەگەر هیچ چارەی نەما، بۆی هەیە بەبێ ئاگاداریی مێردەکەی، پێداویستییەکانی خۆی لەماڵ‌و

سامانی مێردەکەی دابین بکات، چونکە (بخاري‌و مسلم) لە (عائشة)وە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە کە (هند)ی خێزانی (أبوسفیان) هاتۆتە لای پێغەمبەری خواﷺو سکاڵای ئەوەی لەلا کردوە کە مێردەکەی چرووکەو هێندەی ناداتێ کە کیفایەتی خۆی‌و منداڵەکانی بکات، پێغەمبەریشﷺ پێی فەرموە: ((**خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ**)) واتە: هێندەی کە بەشێوەیەکی بەچاك زانراو بەشی خۆت‌و منداڵەکانت دەکات، لەماڵ‌و سامانەکەی بەکاربێنە.

## دوو: ئافرەت لە حاڵەتی ئاساییدا جەنگ‌و جیهادی لەسەر پێویست نەکراوە:

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لە شێوەکانی خاتر گرتن‌و بەتەنگەوە بوونی شەریعەت بۆ ئافرەت کە مەگەر مسوڵمانان بکەونە حاڵەتی نائاسایی بەرگریی‌و هەڵسانی گشتی (النفیر العام)، ئەگەرنا لەسەری پێویست نەکردوە، کە وەك پیاو بچێتە سەنگەرو بەرەی جەنگەوە.

(بخاري) لە (عائشة)وە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: ((**اسْتَأْذَنْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْجِهَادِ، فَقَالَ: جِهَادُكُنَّ الْحَجُّ**)).

واتە: داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەرﷺ کرد بۆ جیهادکردن، فەرمووی: جیهادی ئێوە -ی ئافرەتان- حەج کردنە)). (ابن حجر العسقلاني)[1] لە (ابن بطّال)ەوە لە شەرحی ئەم فەرمایشتەدا هێناویەتی: (دلّ الحدیث علی أن الجهاد غیرُ واجبٍ علی النساء) واتە: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە جەنگ لەسەر ئافرەتان پێویست نیە.

---

(١) بڕوانە: (فتح الباری شرح صحیح البخاری) ج٦ ص٧٥، ٧٦.

## سێ: ئافرەت نوێژی جومعەی لەسەر پێویست نیە:

ئەمەش شێوەیەکی دیکەی خاترگرتنو بەپەرۆشەوەبوونی شەریعەتە بۆ ئافرەتان، کە نوێژی جومعەی لەسەر فەرز نەکردوون وەك پیاوان، ئەمەش یەکدەنگیی (إجماع)ی زانایانی لەسەرە[1]، پێغەمبەریشﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: ((**الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلاَّ أَرْبَعَةً: عَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَوْ امْرَأَةٌ أَوْ صَبِيٌّ أَوْ مَرِيضٌ**))رواه أبوداود. وقال النووي: إسناده صحيح على شرط الشيخين وقال ابن حجر: صَحَّحَهُ غير واحد. واتە: (نوێژی جومعە بەکۆمەڵ لەسەر هەموو مسوڵمانێك هەقێکی پێویستە، بێجگە لەچوار جۆرە کەس: کۆیلەیەکی خاوەندار، یان ئافرەت، یان منداڵ، یان نەخۆش).

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

ئەم سێ شتە: کاسبیی کردنو بژێو پەیداکردن، جەنگو جیهاد، جومعەکردن، سێجۆرە کردەوەن کە لەسەر ئافرەت پێویست نەکراونو تایبەتن بە پیاوانەوە، لەبەرئەوە کە خوای زاناو کار بەجێ زانیویەتی ئەو جۆرە کارانە وەك پێویست بە ئافرەت جێبەجێ ناکرێنو، بەهۆیانەوە دووچاری سەغڵەتییو نارەحەتیی دەبێت! جا ئایا پێویست نەکرانی ئەو جۆرە کارانە لەسەر ئافرەت، هیچ خاوەن عەقڵو ویژدانێك هەیە بتوانێ بڵێ: ڕێزو حورمەت نەگرتنو بەکەم سەیر کردنی ئافرەتیان تێدایە، یان بەپێچەوانەوە خاترگرتنو بەتەنگەوە بوون؟!

شایانی باسیشە کە پێویست نەکرانی ئەو کارانە لەسەر ئافرەت، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەگەر هاتو پێیان هەڵساو خۆبەخش(متطوع)انە جێبەجێی کردن، بۆی وەبەر ناکەونو خێرو پاداشتی نابێ! با ،هەر کاتێك ئەنجامی دان، بۆی حیساب دەکرێنو

(١) بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) ج٣، ص٤٢٤.

پاداشتی لەسەریان هەیە، بەڵام ئەوەندە هەیە لەسەر نەکردنو چواندنیان وەك پیاو لێپرسینەوەو سزای نیە!

ئێستا ڕوون بۆوە ئافرەت لە شەریعەتی خوادا وەك پیاو خاوەنی کەسایەتی تایبەتی خۆیەتیو، ڕێی هیچ جۆرە کارو چالاکییەکیشی لێنەگیراوەو، ئەویەری لەبەر خاتر گیران هەندێك ئەرکو کاری لەسەر پێویست نەکراون!

کەواتە:

با هەم نامسوڵمانانێکی ناحاڵی کە ئەم مەسەلەیەیان کردۆتە دەستەچیلەی تۆمەتبارکردنی شەریعەت سەبارەت بە ئافرەت، بۆخۆیان تێبگەنو بێدەنگ بنو، هەم مسوڵمانانێکیش کە بەهەر هۆیەکەوە بووە، بەهەر جۆرە دەرکەوتنو کارو چالاکییەکی ئافرەتان- هەرچەندە ئەدەبو ڕەوشتە شەرعییەکانیشی تێدا ڕەچاوکرابن- قەڵسو لاڵووتو بێزارن، بێنەوە سەرخۆ و بزانن کە بۆچوونو هەڵوێستەکەیان، هیچ پەیوەندیی بەشەریعەتەوە نیەو هەڵقوڵاوی میزاجو تەبیعەتی خۆیانە! هەڵبەتە هەمیشەش پێویستە تەبع لەگەڵ شەرع بگونجێو بۆی ملکەچ بکرێ، نەك شەرع بەپێی میزاجو تەبع ملی پێ بابدرێ، چونکە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عليه أمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ**)) رواه مسلم عن عائشة رضي الله عنها. واتە: (هەر کەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوە بەسەریدا دەدرێتەوە).

لێرەشدا کۆتایی بەخاڵی سێیەم[1] لەبەشی دووەم دێنینو دەچینە سەر خاڵی چوارەم.

---

(١) دیارە خاڵی سێیەم زۆری توێژینەوە لەسەرکرا، هۆیەکەشی ئەوەیە کە مەسەلەی جموجۆڵو کارو چالاکی ئافرەت پشکی هەرە گەورەی ئەو مشتو مڕەی پێ براوە، کە لەبارەی ئافرەتو خێزانەوە هەیە، جا چ لەنێوان ئەهلی ئیسلام خۆیاندا، کە زۆر جار دووچاری

## ٤) ئەركی سەرەكی ئافـرەت ئـەوەیـە كە سـروشتی خۆی‌و بـەرژەوەندیـی كۆمەڵگا داخـوازیـی دەكـەن‌و بـەخـۆشی نـەبـێ جێـبەجـێ نـاكـرێ:

پاش ئەوەی لە پێشوودا بۆمان روون بۆوە كە شەریعەتی دادگەرانـەی خـوا رێـی هیچ جۆرە كارو چـالاكییەكی چـاك‌و پەسـەند لـە ئـافرەت نـاگرێ، تـەنها هەنـدێك ئەرك‌و كار كە لەسەر پیـاوان پێویسـت كـراون لەسـەر وی پێویسـت نـەكراون، وەك خاتر گیرانو موراعـات كردنـە! بەپەسـەندی دەزانم،كـە ئـەم جـارە باسـی ئـەركیی سەرەكی‌و سروشتیی ئافرەت بكەین، لە روانگەی شەریعەتەوە، ئەو ئەركـە گـەورەو گرنگەی ،كە هەم سروشت‌و فیترەتـی مێیانـە(أنثویـة)ی خـۆی‌و هـەم بەرژەوەنـدیی باڵای كۆمـەڵگا داخوازیی دەكەن.

جا خوێنەری بەڕێز!

ئەگەر لە یادت بێت ئێمە لەكورتە باسی دووەمی بەشی یەكـەمی ئـەم كتێبـەو لەژێر سەرباسی: (شەریعەتی خوا بـۆ بەختـەوەر كردنـی ئینسـانەكان هـاتوە، بۆیـە لەگەڵ فیترەت‌و سروشتیاندا پڕ بەپێستە)دا روونمان كردەوە، كە لەسـۆنگەی ئـەوەوە شەریعەتی خواو فیترەتی خەڵكی هەردووكیان فـۆڕمی یـەك بەدیهێنـەرو خاوەنیـان پێوەیـەو، شـەریعەت فەرمایشـتی خـواو فـیترەتـیش كردەوەیـەتی، وە لەسـۆنگەی ئەوەوە، كە سـیفەتەكانی هـەر خـاوەن پیشـەو كارێـك لەبەرهـەم‌و شـوێنەوارەكەیدا دەردەكەون‌و دەدرەوشێنەوەو، بێگومـان خوای بێوێنـەش (سـبحانه وبحمـده) خـاوەنی

---

تێپەڕاندن‌و بەزایەدان (الإفراط والتفریط) بوون ، وە چ لە نێوان ئەهلی ئیسلام‌و نەیارو ناحەزانیاندا، كە بەحیساب لەڕووی ئافرەت‌و خێزانەوە رەخنەو گلەییان لەشەریعەت هەیە!





هەموو ناوێکی هەرچاکو سیفەتێکی هەرە بەرزو پەسەندەو، لەهەموو لەکەو کەمو کوڕییەك پاكو بەدوورە.. بەڵێ لەسۆنگەی ئەو ڕاستییە مەزنانەوە شتێکی روونو بێ چەندو چوونو چاوەڕوانکراوە، کە هەرچی لەشەریعەتی خوای بەرزو مەزندا هاتوە، لەهەموو ڕوویەکەوەو لەسەدا سەد، ڕاستو تەواوو لەگەڵ سروشتی ساغی ئینسانو بەرژەوەندییە ڕەواو ڕاستەقینەکانی عەقڵو ڕوحو جەستەو تاكو خێزانو کۆمەڵگا، لەدنیاو دوارۆژدا پڕ بەپێستو گونجاو بێت.

جا یەکێك لەو شتانەی شەریعەتی خوای دادگەر دیاریکردوە، بریتییە لە ئەرکی: کابانییو دایکایەتییو بەخێوکردنی منداڵ، بۆ ئافرەت وەك ئەرکێکی سروشتییو سەرەکیی، وەك چۆن ئەرکی: کارو کاسبیی ڕۆزیی پەیداکردنو سەرپەرشتی ماڵو خێزانو ڕوو بەڕووبوونەوە لەگەڵ سەرماو گەرماو مەترسییەکانو گرفتارییەکانی مەیدانە جۆراو جۆرەکانی ژیانو گوزەرانیشی، وەك ئەرکێکی سەرەکی بۆ پیاو دیاری کراوە.

جا ئێمە - خوا پشتیوان بێت - سەرەتا لەبەر تیشکی چەند دەقێکی قورئانی بەرێزی خواو سوننەتی بەپێزی پێغەمبەری پێشەواماندا، باسی ئەو ئەرکە سەرەکییو سروشتییەی ئافرەت دەکەین- هی پیاویش بۆ باسەکانی داهاتوو هەڵدەگرین- پاشان باسی حیکمەتەکانی دیاریکردنی ئەو ئەرکە بۆ ئافرەت دەکەین، بەڵام پێویستە بزانرێ کە ئێمە لێرەدا نامانەوێ باسی ئەركو مافەکانی ژنو مێرد بکەین بەرانبەر بە یەکدی، چونکە ئەو باسە شوێنێکی دیکەی بۆ تەرخانکراوە[1]، ئێمە لێرەدا تەنها باسی ئەو ئەرکە سروشتییەی ئافرەت دەکەین کە شەریعەت وەك ئەرکێکی سەرەکییو بنەڕەتیی بۆی دیاری کردوەو لەسەری پێویست کردوە:

---

(١) کەبەشی پێنجەمی ئەم کتێبەیە.

١- خـوای خـاوەنی بارەگـای مـەزن لەسـیاقی باسـی ئەركـە سـەرەكیی‌و سروشتییەكانی مێردو ژن دا فەرموویەتی:

﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ ۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ﴾ (النساء: الآية٣٤).

واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ژنانەوە بـەهۆی زێـدەیی پێدانی خـوا بـۆ هەندێكیان بەسەر هەندێكیاندا، وە لەسـۆنگەی ئـەوەوە كـە پیـاوان لـەماڵی خۆیانیان خەرج كردوە، جا ئافرەتانی چاك‌و شایستە ئەوانەیانن كە ملكەچن (بۆ مێردەكانیان لـە سـنووری شـەرعدا)، پـارێزەرن (بـۆ نامووسـی خۆیـان‌و ماڵی مێردیان) لەحاڵەتی دیارنەبوونیاندا، بەهۆی ئـەوەوە كـە خـوا (مـاف‌و بەرژەوەندییەكانی) ئەوانی پاراستوە..

دیـارە ئێمـە لـەداهاتوودا باسـی مەسـەلەی سەرپەرشـتیاری(قوامـة) پیـاو دەكەین بۆ ماڵ‌و خێزانی‌و ئێستا لێی دەگەرێین، بەڵام هەڵوەستەیەكی كورت دەكەین لەبەرانبەر هـەردووك وشـەی: (قانتـات)‌و (حافظـات للغیـب)دا كـە خوای بەرزو مەزن كردوونی بە پێناسەی ژنانی چاك (الصالحات)!

مادام ئەركی پیاو و لەنێو خێزاندا بریتـی بـێ لـە سەرپەرشـتیاری و مشـور خـواردن و بەسـەر ڕاگەیشـتن، دیـارە كاتێـك پیـاو لـەو ئەركـەی خۆیـدا سەركەوتوو دەبێت كە:

یەكـەم- كاتێـك لەماڵـە، ژنەكـەی ڕێـزو حورمـەتی بگـرێ‌و- لەسـنووری

شەرعدا- لەقسەی دەرنەچێ: (قانتات)[1]، بۆ ئەوەی ماڵەکەی شوێنی ئیسراحەت تێداکردنو تێدا پشوودانو سرەوتن بێت، نەك جێگای مشتو مڕو هەراو گوریس پچڕکێنەی نێوان خۆیو ژنەکەی! ڕەحمەتیش لەو شاعیرەی کە گوتوویەتی:

تەنیایم خاسەن جە یانەی وەجەنگ

پای پەتیم خاسەن جە پێلاوی تەنگ

دوو- وە کاتێك کە لەدەرەوەی ماڵە، ئابڕوو و کەرامەتیو ماڵو سامانی بپارێزێ (حافظات للغَيْب) بۆ ئەوەی بە دڵێکی ئارامو ئاسوودەوە و بەمتمانەو دڵنیاییەوە بەرەو کارو کاسبیو ڕۆزیی پەیداکردنو مەیدانەکانی دیکەی ژیانو گوزەران بچێ! نەك خوانەکردە وێڕای ماندوویەتیو شەکەتی جەستەیو سەرقاڵییەکانی ژیانو گوزەران، دڵو دەروونیشی هەر لە دڵەڕاوکێ و داخورپاندا بێت، سەبارەت بە چارەنووسی ماڵو خێزانیو کەرامەتو سامانی.

شایانی باسیشە کە وشەی (حافظات للغيب) لێی دەفامرێتەوە کە ئەوە دەبێ ئافرەت بێت کە لەکاتی ئامادە نەبوون(غیاب)ی پیاودا ببێتە پارێزەری کەرامەتو ماڵو سامانی خۆیو مێردەکەی، واتە: دەبێت ئافرەت لەماڵەوە بێتو لەوێدا ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، وەك چۆن پیاو لەدەرەوەیەو لەوێ دەوری خۆی دەبینێ.

---

(١) وشەی (قنوت) یانی ملکەچیی، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾(البقرة: الآية٢٣٨)، جا چ ملکەچیی بۆ خوا چ بۆ غەیری خوا لەبەر خوا، وەك خوای پەروەردگار بە هاوسەرەکانی پێغەمبەری فەرمووە: ﴿وَمَنْ يَقْنُتْ مِنْكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحاً...﴾(الأحزاب: الآية٣١) .

٢-هەروەها خوای کاربەجێ(جلّ وعلا) فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾(البقرة: الآية٢٣٣)
واتە: وە با دایکەکان ماوەی دوو ساڵی تەواو شیر بدەن بە منداڵەکانیان، بۆ کەسانێك کە بیانەوێ ماوەی شیرە خۆرەیی- منداڵ کە دوو ساڵە- تەواو بکەن.

**کەواتە:** شیر پێدانو بەخێوکردنی منداڵیش ئەرکێکی دیکەی سەرەکی ئافرەتەو لەسەری فەرزە کە جێبەجێی بکات، تەنانەت ئەگەر لە مێردەکەیشی جیا بووبێتەوە! مەگەر مێردەکەی ڕازی نەبێتو خۆیشی ئامادەیی نەبێ شیری پێبدات، واتە بەڕاوێژی هەردووکیان دایەن(مُرْضع)ێکی بۆ پەیدا بکەن، ئەو کاتە گوناحبار نابێ، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ وَإِنۡ أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ ﴾ (البقرة:من الآية٢٣٣).

بەڵام ئەگەر دایکەکە حەزی دەکرد و داوای دەکرد شیر بدات بەکۆرپەکەیو بەخێوی بکاتو مێردەکەیشی-کەتەڵاقی داوە- ڕازی نەبوو، ئەوە ژنەکە خاوەن هەقە بەمەرجێك مێردی نەکردبێتەوە، وەك (أبوداود) گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەرﷺ ئافرەتێك هاتەلای پێی گوت: ((**يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً وَحِجْرِي لَهُ حِوَاءً وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي وَأَرَادَ أَنْ يَنْتَزِعَهُ مِنِّي**)) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم کوڕەم لە زگی خۆمدا هەڵم گرتوە، وە بەمەمکی خۆم تێرم کردوە، وە لەباوەشی خۆمدا حەواندوومەتەوە، ئێستاش بابی تەڵاقی داومو دەیەوێ لێم

بسێنێتەوە! ئەویش فەرمووی: ((**أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي**)) واتە: تۆ زیاتر هەقت پێیەوە هەیە مادام شوونەکەیەوە.

٣- پێغەمبەری پێشەواو نووری چاویشمانﷺ لەبارەی ئەرك و کاری بنەڕەتی ئافرەتەوە گەلێك فەرمایشتی هەن، بۆ وێنە:

((**خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ نِسَاءُ قُرَيْشٍ أَحْنَاهُ عَلَى وَلَدٍ فِي صِغَرِهِ وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ**))رواه مسلم. واتە: (چاکترین ئافرەتانێك کە سواری حوشتر بوون ئافرەتە قورەیشییەکانن، کە لەگەڵ منداڵی گچکەیاندا زۆر بەسۆزو بەپەرۆشن، وە سەبارەت بەماڵ و سامانی مێردیشیان زۆر مشورخۆرو بەتەنگەوەن).

هەروەها فەرموویەتی: ((..**وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا..**))متفق عليه. واتە: ((.. وە ئافرەتیش لەماڵی مێردەکەیدا چاودێرەو بەرپرسیارە لەبەرانبەر ژێردەستەکانیدا..

هەروەها (بخاري و مسلم)گێڕاویانەتەوە کە (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خواﷺ خوا لێی ڕازی بێ، چووە خزمەت بابی و سکاڵای حاڵی خۆی لەلا کرد کە بەهۆی دەستاڕ(رحا)ەوە دەستی بلۆقی کردوەو داوای لێکرد کە کارەکەر (خادِمة)یێکی بۆ پەیدا بکات! پێغەمبەریش بە (فاطمة)و (علي) مێردیشی-خوالێیان ڕازی بێ- فەرموو: شتێکتان پێبڵێم کە بۆتان باشتر بێت لەوەی داواتان کردوە؟ هەر کات چوونە سەر جێگای خەوتن، سی و سێجار (سبحان الله)و سی وسێجار (الحمد لله)و سی وچوار جار (الله أكبر) بکەن، ئەوە چاکترە بۆتان لە خزمەتچی.

دیسان (بخاري و مسلم) لە (أسماء بنت أبي بكر) خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە کە گوتوویەتی: ((**تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ وَمَا لَهُ فِي الأَرْضِ مِنْ مَالٍ**

**وَلاَ مَمْلُوكٍ وَلاَ شَيْءٍ غَيْرَ نَاضِحٍ وَغَيْرَ فَرَسِهِ، فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ وَأَسْتَقِي الْمَاءَ وَأَخْرِزُ غَرْبَهُ وَأَعْجِنُ وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ..**)) واتـە: زوبـەیر منـی هێنا لەحاڵێکدا کـە لەسـەر زەوی هـیچ شـتێکی نـەبوو نەسـامان نەکۆیلـە، بێجگە لەحوشترێك‌و بێجگە لە ئەسپەکەی، جا من هەم ئەسـپەکەیم ئالیـك دەداو، هـەم ئـاوم هەڵـدەهێنجاو، هـەم دۆڵچـەی ئـاو هەڵهێنجانیشـم بـۆ دەچنی‌و، هەم هەویریشم دەشێلا، بەڵام چاکم نان کردن نەدەزانی..

جا خوێنەری بەڕێز!

بەسەرنجدانی سەرجەم ئەو ئایەتانەی قورئـان‌و ئـەو فەرمایشـتانەی پێغەمبـەری خـواﷺ زۆر بـەڕوونی دەزانـرێ کـە لەڕوانگـەی شـەریعەتەوە، ئـەرکی بنـەڕەتی‌و سروشـتی ئـافرەت بریتییـە لـە کابانـداریی‌و هەڵسـوڕاندنی کاربـاری مـاڵ‌و خێـزان بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی منداڵ‌و، سازدانی جێگاو ڕێگایەك کە هەم خۆی‌و هەم مێردی‌و هەم منداڵەکانی تێیدا بسرەون‌و بەختەوەر بن.

ئێسـتاش نـۆرەی ئـەوە هـاتوە کـە سـەرنجێکی وردو قـووڵی واقیـع بینانـە لـەو هەڵوێسـتەی شـەریعەت بـدەین کـە جێگـای ڕەخنـەو گلـەیی نـەیارو ناحـەزە سەرکێڵەکانیەتی، داخۆ حیکمەتەکانی چین‌و شەریعەت بۆچی ئەو بڕیارەی داوە؟ وە ئایا ڕاستە کە دیاری کردنی ئەوە بـۆ ئـافرەت بەڵگـەی بەکـەم تەماشـاکردنیەتی؟! باسەرنج بدەین!

**یەك:** جارێ بەر لەهـەر شـتێك دەمـەوێ ئـەو ڕاسـتییە دووپـات بکەمـەوە کـە پێشتریش چەندان جار گوتوومانە، ئەویش ئەوەیە کە کابانی ماڵ(ربَّة البيت) بوونی ئـافرەت، وەك ئـەرکێکی سـەرەکیی‌و سروشـتییەتی، نـەك وەك تاکـە ئـەرك‌و تـەنها کـارو چـالاکی! چونکە وەك لـە خـاڵی سـێیەمی ئـەم بەشـی دووەمـەدا بەدرێـژیی خسـتمانە ڕوو، ئـافرەتیش وەك پیـاو بـێ کـەم‌و زیـاد

دوێنـراو(مخاطَـبْ)ی ئایەتـەکانی قورئانـەو، لەبەرانبـەر ئـایینو شـەریعەتی خواشدا بەرپرسیارە.

**دوو:** بـــەڵام وەك چـــۆن پیـــاو لەچوارچـــێوەی کاروبـــاری خێزانـــدا سەرپەرشتیار(قوّام)ەو ئەرکی بژێو پەیداکردنو کردوکۆشی دەرەوەیماڵەوەی بەئەستۆوەیە، ئەگەر نـا ئـەرك و بەرپرسـیارێتی دیکەشـی زۆر لەسـەر شـانن بەرانبەر بەکۆمەڵو دەوروبەری، وەك: فەرمان بەچـاکەو ڕێگـرتن لـە خراپـەو جـەنگو جیهـادو بـەرەنگاریی و بەشـداریی تێـداکردنی سـەرجەم ئەرکـە کیفائیییەکان، ئافرەتیش بەهەمان شێوە، جگە لەو ئەرکانـەی کـە وەك خـاتر گیران لەسەری پێویست نەکراون، مەگەر خۆی خۆبەخش(متطـوع)انـە پێیـان هەڵسێ.

**سـێ:** بێگومـان ڕوانگـەی لێـوە سـەرنجدانی شـەریعەت بـۆ بـوونو ژیـانو ئینسان(الوجود والحیـاة والانسـان) زۆر لـەهی ڕێچـکەو بـیردۆزە مرۆڤکـردە ڕۆژهـــەڵاتی و ڕۆژئـــاوایی یـــەکان-کـــە ســـەرجەم بەسیســـتەمە نەفامییەکان(الأنظمة الجاهلیة) دادەنرێن- جیـاوازە، سیسـتەمو ڕێچـکەکانی نەفامێتی، هەرچەندە زۆر جاران بـەدرۆ بانگەشـەی ڕێزگرتنـی مـرۆڤو مـاف بۆدابینکردنی دەکەن، بەڵام لەڕاستیی و واقیعدا ئینسـان لـەکۆتایی لیسـتەوە دانراوەو، پاش هەموو شتێك نۆرەی دێتو حیسابی بۆ دەکـرێو، هەمیشـەو دایـم یەکـەمێتی(أولویـة) لـەو ڕێچـکەو بـیردۆزە نەفامییانـەدا بـەماددەو بەرهەمی ماددیی و بەرژەوەنـدیی مـاددیی دەدرێ، لەسـۆنگەی ئـەوەوە کـە لەبناغەی ئایدۆلۆژیی ئەو ڕێچکانەدا، یەك تۆز حیسـاب بـۆ ڕووحو دواڕۆژو لەپێش هەموو شتێکیشدا خوای بەدیهێنەرو پـەروەردگار نـەکراوەو، تـەنها و تەنها ژیانی دنیاو جەستەو ماددە لەبەرچاوگیراونو ئیعتیباریان بۆ دانـراوە!

وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَـٰتِنَا غَـٰفِلُونَ ﴿٧﴾﴾ (الروم:٧).

بەڵام ئایینو شەریعەتی خوای کاربەجێ، کە لەلایەن ئەو زاتەوە نێرراوە کە بوونو ژیانو ئینسانی رەخساندوون، بەجۆرێکی دیکەو لەڕوانگەیەکی دیکەی زۆر جیاوازەوە تەماشای ئەو مەسەلانە دەکات:

١- جاری بەر لەهەر شتێك ئیسلام ئەم (كَوْن)ە بەبەشێکی گچکە لەو بوون (وجود)ە دەزانێ، کە خوا خوڵقاندوویەتیو، بێجگە لەخۆی تا ئێستا هیچ کەس نازانێ سنوورو ئەوپەڕی چەندەو کوێیە؟ وە بوونیش هەمووی بە موڵكو دروستکراوی خوای بێ وێنەو تاك دەزانێو، خوا بەتاکە خاوەن (مالـك)و هەڵسوڕێنەری کاروبار بوون دەزانێ، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ **(الأعراف:٥٤)**.

٢- پاشان شەریعەتی خوای بەرزو مەزن ژیانی دنیا بەیەکێك لە قۆناغەکانی ژیانی ئینسان دادەنێ، کە قۆناغی تاقیکرانەوە(مرحلة الإبتلاء)یە، وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾**(الملك: الآية٢)**. هەروەها

فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ (**الكهف:٧**). پاشان دوای ئەم قۆناغە کورتەی تاقیکرانەوە قۆناغەکانی بەرزەخو قیامەتو نیشتەجێبوون لە بەهەشتو دۆزەخیشدا دێنو، ئەنجام (نتيجة)و بەرهەمی ئەم ژیانە دنیاییەیان تێدا بەرجەستەو نمایان دەبێ، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ (**ق:١٩-٢٢**)

٣- ئینسانیش لە ڕوانگەی شەریعەتەوە بەپێچەوانەی بۆچوونی نەفامێتییەوە، بەس بریتی نیە لە کەلەشو جەستەیەکی پێکهاتوو لەچەند چەنگە خۆڵێك! بەڵكو ئینسان بەرلەوەی جەستەیەکی پێکهاتوو لەخۆڵو خاك بێت، ڕووحێکی خوایی پاکە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ (**السجدة: ٩، ٨، ٧**).

دیارە هەر لەسۆنگەی ئەو ڕووحەشەوە کە لەلایەن خواوە وەك فوویەك بەبەرجەستەی ئینساندا کراوەو، ئێستاش لەگەڵ بێگیان(روح) هەر مەتەڵو نهێنییەکی حەل نەکراوو نەزانراوە:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ (**الاسراء:٨٥**).

بەڵێ لەسۆنگەی ئەو ڕووحە خواییەوە، ئینسان شایستەیی خەلیفایەتی خوا:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ (**البقرة: الآية٣٠**).

وە سەجدە بۆ بران لەلایەن فریشتانەوەی، وەدەست هێناوە: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (**الحجر:٢٨، ٢٩، ٣٠**).

**چوار:** جا مادام ئینسان لەلای خواو لە شەریعەتی خوادا خاوەنی پایەو مەقامێکی هێندە بەرزو ناوازە بێت، لەگەڵ دادگەریی‌و حیکمەتی خواو شەریعەتەکەیدا ناگونجێ، کە بخرێتە کۆتایی لیستی گرنگیی‌و ئەمیەت پێدانەکان(نهاية قائمة الإهتمامات)ییەوە!

بۆیە ئایین‌و شەریعەتی خوا، ئاگالێبوون‌و بەخێوکردن‌و لەباوەش گرتن‌و پەروەردەکردنی کۆرپەو ساوای ئینسانی کردۆتە ئەرك‌و کارێکی بنەڕەتیی‌و پێویستی ژن، تاکو لەحاڵێکدا کە پیاو(رَجُلْ) لەدەرەوەی ماڵ بەعەقڵ‌و هۆشی وردەکارانەو عەزم‌و ئیرادەی خۆڕاگرانەو جەستەو ئەندامە زبرو بەهێزەکانییەوە، سەرگەرمی کێشمەکێش‌و گرفتارییەکانی مەیدانی کاسبی‌و بژێو پەیداکردن‌و گۆڕەپانی بیناسازیی‌و شمەك دروستکردن‌و، شەڕگەی

جەنگ و جیهادو بەرگریی لەوڵات و میللەتکردن دەبێت، ژن(مرأة)یش بەبەزەیی و سۆزو پەرۆشی بەجۆشی و، جەستەی نەرم و نیانی و، دەنگ و سەدای بەئاوازو خۆشی، لەماڵێ سەرقاڵی کابانیی کردن و ماڵ و حاڵ ڕێکخستن و، کۆرپە بەخێوکردن و، منداڵ پەروەردەکردن و، جێگاو ڕێگای تێدا پشوودان و سرەوتن ئامادەکردن بێت، وە بەتەئکیدیش هەر بەرنامەو ڕێبازێك بەجدیی و بەقەناعەتی ڕاستەقینەوە ڕێزو حورمەتی ئینسانی لەلا بێت، نابێ ئەوەندەی پێ لەبەخێوکردن و پەروەردەکردن و پێگەیاندنی وەچە(جیل)ی ئینسان خەسارو زیاد بێت، کە وەك ئەرکێکی سەرەکیی و سروشتیی بۆ ئافرەتی تەرخان بکات، بۆ ئەوەی وا نەیەتە بەرچاو کە ڕێزو قەدرو پایەی ماددەیی، بەرژەوەندیی ماددە لەتاتەرازوویدا لە هی ئینسان قورسترە!

**پێنج:** ئنجا بێگومان دەست بەردار بوونی ئافرەت بۆ ئەو ئەرکە بنەڕەتیی و سروشتییەی خۆی، دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی حەتمیی کۆمەڵێك کێشەو گرفتی دەروونیی و ئەخلاقیی و کۆمەڵایەتی، لەسەر شانی خێزان و کۆمەڵگا کە پێشتر لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێیان کردوە، ئێستاش لە واقیعی کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا زۆر بەڕوونیی و بەرجەستەیی دەبینرێن و، وردە وردەش خەریکن لەکۆمەڵگا لاساکەرەوەکانیاندا سەرهەڵدەدەن.

وە لە ڕاستیدا ئەو مەسەلەیەی لەماڵ چوونە دەرەوەی ئافرەت و وازهێنانی لەئەرکی سەرەکیی و سروشتیی خۆی، هەر ئەو پەندە کوردییەی بەسەردا دەچەسپێ کە دەڵێ: (قازانجی سەری مایەی خوارد!) یان وەك دەڵێن: (بۆ دەستەسرێك قەیسەرییەك دەسووتێنێ!) چونکە بەڵێ ڕەنگە ئەو ئافرەتانەی بۆ کارو کاسبیی و پارە پەیداکردن، ماڵ و حاڵی بەجێدەهێڵن، خۆیان وەك تاك

سوودێکی ماددیی بکەن‌و پارە پەیدابکەن، بەڵام لەبەرانبەردا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکردوە، هەم خۆیان‌و هەم مێردیان‌و هەم کۆرپەو منداڵەکانیان‌و سەرەنجام کۆمەڵگاکەشیان، زەرەری زل زل دەکەن، کە بەهیچ کلوجێك بۆیان قەرەبوو(تعويض) نابنەوە!

هەر کەسێکیش بەچاوی عەقڵ‌و دڵ بڕوانێتە واقیعی شپرزەو شێواوی لەیەك ترازاو و لەبەر یەك هەڵوەشاوی کۆمەڵگا ڕۆژئاوایی‌و ڕۆژهەڵاتییە نەفامییەکانی ئەم ڕۆژگارە، لە سەدا سەد (١٠٠٪) ئەوەی گوتمان دەسەلمێنێ‌و ڕاستێتی(مِصداق) ئەم ئایەتە قورئانییە بە (عين اليقين) دەبینێ، کە دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ **(الروم:٤١)**.

**شەش:** ئنجا سەرەڕای هەموو شتێکیش دیارە یاسا(سنة)یەکی خواییە لە ژیانی ژیانداراندا بەگشتی‌و ئینساندا بەتایبەت، کە خوای کاربەجێ هەر شتێکی خوڵقاندوە سروشتی ئەو شتەی وا هەڵخستوە، کە تام‌و چێژ(لَذّة) لەجێبەجێکردنی ئەو ئەرکە سروشتیی‌و خوارسك(فطري)یە وەربگرێ، کە خوا بۆی دیاری کردوە، وەك خوای کاربەجێ لەسەر زمانی (موسى)عليه السلام و لەوەڵامی پرسیاری فیرعەوندا کە لێی پرسیوە:﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾ (طه:٤٩) ؟! واتە: جا پەروەردگارتان کێیە ئەی مووسا؟!، فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ (طه:٥٠) پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بەهەموو شتێك بەخشیوە پاشان ڕێڕوونی کردوە کە چۆن بەڕێوەبچێ‌و چی بکات..

بەڵێ مێروولە لەززەت لە ئیش‌و کاری کۆکردنەوەی دانەوێڵەو گواستنەوەو چی‌و

چیلێکردنی وەردەگرێ، هەروەها هەنگ لەززەت لەکاری نەپساوەی ڕۆژو شەوی خۆی لە مژینی شیلەی گوڵان و دروستکردنی هەنگوین و چی‌وچی کردن وەردەگرێ! وە بەپێچەوانەوە هەرکام لە دروستکراوەکانی خوا لەکاتی ڕێ لێبەستران و بێبەش(محروم)کران لەئەنجامدانی ئەرك و کارە خوا ڕسکەکانیاندا، هەست بەسەغڵەتیی و گرفتاریی و ئێش و ژان دەکەن، سەرەنجامیش بەرەو پووکانەوەو هەرەس و فەوتان دەچن! هەر بۆیەش لەسەرەتای ئەزموون(تجربة)ی کۆکردنەوەی ژیانداران لە باغی ژیانلەبەران(حديقة الحيوانات)دا، پسپۆڕەکانی ئەو کارە تەماشایان کرد ئەو شێرو پڵنگ و ورچ و چی‌وچییانە پاش ماوەیەك ژیانی نێو قەفەزو تەلبەند تووشی کۆمەڵێك نەخۆشی و جۆرێك لە بێزاریی و جاڕزبوون دەچن و سەرەنجام لەڕو لاوازو سەر کزۆڵە دەبن و...هتد.، بۆیە لەوەوە دەرس و پەندیان وەرگرت و ئەوجا هەر ژیاندارێکیان هێنابایە ئەو شوێنانە هەوڵیان دەدا ژینگە(بِيْئَة)یەکی وای بۆ ساز بکەن، وەك ئەوەی کە خۆی ژیانی تێدا بردۆتە سەر، بۆئەوەی بەهۆی ئەنجامدانی ئەرك و چالاکییە سروشتییەکانیەوە، وەك حاڵەتی ئاسایی و خوارسکی خۆی بمێنێتەوەو، بەهۆی ڕێی ئەرك و چالاکی سروشتیی لێگیرانەوە، نەچەوسێتەوەو نەپووکێتەوە!

جا دیارە ئەو سوننەتەی خوای پەروەردگار گشتگیرە (شامِلْ)ەو بگرە لەجیهانی ئینساندا کاراترو بەرچاوتریشە! بەڵێ هەر کام لە پیاوو ئافرەتیش وێڕای یەکسان بوونیان لەئەسڵی ئینسان بوون و بەندەی خوابووندا، هەرکامێکیان بەپێی حیکمەتی بێسنووری خوای کاربەجێ- بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی یەکدی تەواوکەریی (رابطة تكاملية)یان لەنێواندا هەبێت و، نوسخەی فۆتۆکۆپی(مُسْتَنْسَخْ)ی یەکدی نەبن- کۆمەڵێك تایبەتمەندی(خصائص)ی پێ بەخشراوە، کە جێبەجێکردنی ئەرکە بنەڕەتی و سروشتییەکەی داخوازییان دەکات و یەکی لەسەریان کەوتوە.

ئافرەت چونکە مێ(أنثى)یە حەز بەهەبوونی مێرد(زَوْج) دەکاتو، چونکە دوایی دووگیان(حامِلْ) دەبێ، هەستو نەستی دایکایەتی(أُمومـة)ی هەیەو، حەز بەهەبوونی کۆرپەو منداڵو بەخێوکردنیو لەباوەشگرتنی و ڕاژاندنو لایەلایە بۆ کردنیو .. هتدی دەکات.

وە پاش دوورکەوتنەوەی ئافرەتی ڕۆژئاوایی لە ماڵو حاڵ، مل لەبەر کارو کاسبی نانیو لەیەك هەڵوەشانەوەی خێزان، زانایانی کۆمەڵناسو دەروونناس، پاش چەندان لێکۆڵینەوەو تیۆەڕامانی مەیدانیی، وە پاش هاوار لێبەرز بوونەوەی ئافرەتانی بێبەشکراو لەجێبەجێکردنی ئەرکی سروشتییو خوارِسکیان، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئافرەت بەبێ دەورديتنی سروشتییانەی خۆی، هەست بەبەختەوەریی ڕاستەقینە ناکاتو هەمیشە وەك کەسێکی شتی بەنرخ لێبزر بوو، وێڵو عەوداڵو سەراسیمەو سەرگەردانو دڵ بەئێشو ژانە![1]

## ٥) شەریعەت ئافرەتی تایبەتکردوە بەهەندێك حوکمەوە، کەبەرژەوەندیی ئافرەتیان تێدا ڕەچاو کراوە، نەك بەپێچەوانەوە:

شەریعەتی دادگەرانەو واقیع بینانەی خوای کاربەجێ (تبارك وتعالى) پاش ڕاگەیاندنی یەکسان بوونو وەك یەکبوونی ئافرەتو پیاو لەڕووی ئینسانییو بەندایەتییو بەرپرسیاریێتی (مَسْؤلية) لەبەرانبەر ئاینو شەریعەتی خوداو وەك

(١) بڕوانە: (المرأة المسلمة في مواجهة التحدّيات) صالح خليل حمودي، فصل: (هروب المرأةِ الغربية من العمل الى البيت) ص٤٦- ٤٨.

یەکبوون، لەوەرگرتنەوەی سزاو پاداشتی دنیاو دوارۆژدا[1]، بەڵێ پاش ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییانە لەبارەی پیاوو ئافرەتەوە، شەریعەت هەڵساوە بە تایبەتکردنی هەرکام لە پیاوو ئافرەت بەچەند حوکمێکی دیاریکراو، کە لەسەر بناغەی پێکهاتەی سروشتی هەر کامێکیان بنیاتنراون، جا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە شەریعەت بەڕواڵەت لای ئافرەتی گرتووە بەلایدا دایشکاندوە لەسەر حیسابی پیاو، چونکە بەتەئکید ئەرك و کارە تایبەتەکانی پیاو لە جوغزی خێزان و کۆمەڵگاشدا، زیاتر و قورستریشن! کەچی لەجیاتی ئەوەی پیاوان سکاڵای وەزعی خۆیان و بارگرانییان بکەن! ئێستا ئافرەتان قاڵەو زاڵەیان لێبەرز بۆتەوەو، بەحیساب خۆیان بەبەشخوراوو داماو دەزانن!!

جا هەڵبەتە هەر کەسێك هەر بەئەلیف و بێی عەقیدەی ئیسلامیی ئاشنا بێت و چ بڕ لە شەریعەت حاڵی بوو بێت- وەك پێشتریش باسمانکردوە- دەزانێ کە هەر جۆرە ڕەخنەو نارەزایییەك لەیەکێك لەیاساو حوکمە بەئاشکرا زانراوەکانی ئیسلام، مایەی کافر بوون و لە بازنەی ئیسلام دەرچوونە، بەدڵنیاییشەوە دەڵێم:

ئەو جۆرە هەڵوێستانەی بەناو بەرگرییکەران لەمافەکانی ئافرەت(المدافعین عن حقوق المرأة) لە ژنان و پیاوانی ژنانیی! وێڕای کوفرو لەدین دەرچوون، لاساییکردنەوەو تووتی بوون(الببَّغائية)یشیان بۆ ئەهلی کوفری ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتیش، دەگەیەنێ!

چونکە وەك لەبەشی یەکەمدا خستمانە ڕوو، داواکاری(مطالبة) ئافرەتی

---

(١) لە تەورات و ئینجیلی جوولەکەو دیانەکانی ئێستادا کە بەدەقی قورئان گۆڕدراون و دەستکاری کراون، (لە درەختی قەدەغەکراوی بەهەشت خواردن) پاڵدراوەتە لای (حەووا) کە گوایە دوای حەووا ئادەمیشی فریوداوە! بەڵام لەقورئانیدا پاڵدراوەتە لای هەردووکیان، وەك یەك: ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا﴾(طـه: من الآية١٢١) .

ڕۆژئاوایی بۆ یەکسانیی(المساواة) لەگەڵ پیاودا لەو هەلو مەرجو واقیعەی ئەوساکەی ئەورووپاو ڕۆژئاوادا تا ڕاددەیەك شتێکی ئاسایی ماقووڵ بووەو داواکارییەکی ناچارییانەش بووە!

بەڵام بێگومان بانگەشەو داواکاریی یەکسان بوونی[1] پیاوو ئافرەت لەنێو ئەهلی ئیسلامدا، شتێکی زۆر سەیرو بێجێیە، چونکە:

١- لەژێر سایەی شەریعەتدا ڕۆژێك لەڕۆژان هیچ کەس نەیگوتوە کە ئافرەت هەر لەبەر ئەوەی ئافرەتە، ئەگەر هێندەی پیاویش کارو بەرهەمی هەبێ، دەبێ هەر نیو هێندەی وی کرێ(أُجرة) وەربگرێ! وەك لەسەرەتای دەست بەئیش کردنی ئافرەتی ڕۆژئاوایی لەکارگەو کارخانەکاندا باوبووە! وەك لەبەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێکردوە.

٢-وە هیچ کاتێك جوامێریی (شهامة)ی ئەهلی ئیسلام ڕێی بەپیاوان نەداوە کە ئافرەتانیان ناچار بکەن، کە لەبرسانو لەبەر بێدەرەتانییان پەنا بەرنە بەر ئیشو کاری دەرەوەی ماڵو ئارەق ڕشتنو بژێو پەیداکردن، بەڵکو وەك دوایی- لەخاڵی شەشەمی ئەم بەشەدا- ڕوونی دەکەینەوە، لەژێر سایەی شەریعەتدا هەمیشە ئافرەت کەسایەتییو کەرامەتی پارێزراوە، چ کچ بێ چ خوشك، چ هاوسەر چ دایك!

٣-وە پیاوو ئافرەت دوو ئینسانی لە ئەسڵدا یەکسانو، لەشێوەی پێکهاتنو سروشتدا جیاوازن، بێگومانیش وەك یەك تەماشاکردنی دوو شتی جیاوازو، یەك جۆرە ئەرکو کاری یەکسان سپاردن بەدوو کەسی جیاواز، ستەمو

---

(١) واتە یەکسان بوون لە ئەرکو کارو چالاکییەکاندا، کە بەپێی داخوازی فیترەتیان پێویستە جیاواز بن، مادام لەپێکهاتەی نەفسییو جەستەییاندا جیاوازیی هەیە.



خراپەیەو پێچەوانەی دادگەرییە، وەك چۆن بەدوو چاو تەماشاكردنی دوو شتی یەكسانیش هەر ستەمو تاوانە.

ئێستاش با سەرنجێكی خێرا لەهەندێك لەو یاساو حوكمانە بدەین، كە ئافرەتیان لێ بوێرراوە، یان تایبەت كراون بە ئافرەتەوە، تاكو بە پێچەوانەی بانگەشەو بۆچوونی نەیارانی شەریعەتەوە، كە پێیان وایە ئەو شتانە بەڵگەو نیشانەی بەكەمو سووك دانانی شەریعەتن بۆ ئافرەت! ڕوون بێتەوە، كە بەهێزترین بەڵگەی دادگەریی شەریعەتی خواو پەرۆشی بۆئافرەت ،تاكو باری شانی سووك بێت‌و لەزیان‌و خراپە دوورو پارێزراوبێت!

## یەكەم: چەند شتێك كە لەسەر پیاو پێویستن، بەڵام ئافرەت چاوپۆشیی لێكراوە:

### ١-جەنگ‌و جیهاد:

پێشتر ڕوونمانكردەوە كە ئافرەت مەگەر هەڵسانی گشتی(النفير العام) بێت‌و پیاوان بەتەنها نەتوانن ئەركی جەنگ‌و بەرەنگاری ئەنجام بدەن، ئەگەر نا جەنگ كردنی لەسەر پێویست نەكراوە، جا ئایا ئەوە سووكایەتیی‌و بەكەم سەیركردنی ئافرەتە، یان خاترگرتن‌و ڕێز لێگرتنی؟ ئایا هەموو كەس نازانێ كە ئافرەتان بەگشتی حەز لەچارەی شەڕو جەنگ‌و ئاڵۆزیی ناكەن‌و، سۆزی بەتین‌و هەست‌و نەستی ناسك‌و جەستەی نەرم‌و گچكەیان، ئەوەی پێناكرێ كە بەپیاوان دەكرێ؟!

پاشان ئایا ڕەوایە ئافرەت وێڕای ئەركی دایكایەتیی‌و بارگرانییەكان (مُضاعفات)ی وەك: حەیزو دووگیانیی‌و زەیسانیی‌و شیر پێدان‌و.. هتد، ئەرك‌و باری قورس‌و گران‌و لەگەڵ سروشت‌و جەستەدا نەگونجاویشی بخرێتە سەرشان؟! واتە:

کۆڵی خۆی- کە هیچ کات پیاو ناتوانێ لەگەڵی هەڵبگرێ- هەر بەکۆڵەوە بێتو بەشێك لەئەرك‌و کاری پیاویشی بکاتە سەربار؟! ئایا ئەو بارگرانکردنەی ئافرەت بەچ عەقڵ‌و ویژدانێك ڕێزگرتن‌و حورمەت پاراستنی ئافرەتی تێدایە؟!

## ٢-بژێو پەیداکردن:

یەکی دیکە لەو ئەرکانەی کە لەسەر پیاو پێویستن‌و ئافرەتیان لێ عەفوو کراوە لەشەریعەتدا، بریتییە لە کارو کاسبی‌و بژێو پەیداکردن، وەك پێشتریش باسمان کردوە، ئەمەیش ئێمە وەك پەیڕەوانی شەریعەت نەك هەر هیچ بەسووك دانان(إهانة)ی بۆ ئافرەت تێدا نابینین، بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕێزو قەدر گرتنێکی گەورەی ئافرەتی تێدایە، دیارە پێشتریش باسمانکرد کە ئیسلام ڕێی لە ئافرەت نەگرتوەو لێی قەدەغە نەکردوە کە کارو کەسابەت بکات، بەڵام خۆژیاندن‌و خەڵك ژیاندنی نەخستۆتە ئەستۆ، تاکو ناچار بێت کار بکات!

ئنجا بەڕاستی نازانم ئەوە چ ڕێزو حورمەت‌و ماف پێدانێکە دیمەنی ئافرەتانێك کە لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان‌و لەگەراج‌و فرۆکەخانەو هوتێلەکاندا حەمباڵیی دەکەن‌و خواخوایانە ڕێبوارێك تەکلیفیان لێبکات جانتایەکی بۆ هەڵگرن‌و کۆڵێکی بۆ بەکۆڵدا بدەن؟!

ئایا ئەو حاڵە باشترە کە ئافرەتانی کلۆڵی کۆمەڵگا نەفامییەکان گیرۆدەی بوونە یان ئەوەی ئیسلام دەی فەرموێ، ئافرەتان ناچاری کارو کاسبی نەکرێن‌و پێویستە خانم و خاتوونانەو ڕێزلێگیراوانە لەماڵەوە سەرگەرمی ئەرك‌و کاری سەرەکی‌و فیترییانەی خۆیان بن؟ وە ئایا کەسایەتیی‌و ڕێزو حورمەتی ئافرەت لەکام حاڵەتەیاندا پارێزراوە؟!

### ٣-نوێژی جومعە:

نوێژی جومعەش لەسەر ئافرەتان فەرز نەکراوە هەرچەندە بۆیشیان هەیە بیکەن و بۆیشیان بەردەکەوێ، بەڵام لەسەریان پێویست نەکراوە، بۆ ئەوەی- جگە لەحاڵەتەکانی بێنوێژیی و زەیستانیی- هەر کاتێك بەهۆی ئەنجامدانی ئەرکی سەرەکیانەوە لەسەریان گران و زەحمەت بوو، بتوانن نەیکەن! بێگومان ئەمەش بێجگە لەخاترگرتن و کار بۆ سێناکردن، هیچ تەفسیرێکی دیکە هەڵناگرێ، مەگەر کابرا دڵ و دەروونی نەساغ بێت و لەبیانوو بگەڕێ!

## دوەم: چەند شتێك كە لە ئافرەت قەدەغەكراون:

### ١-سەفەری دوور بەبێ مەحرەم:

یەکێك لەو شتانەی کە بۆ پیاو ڕەوا(مُباح)یەو لە ئافرەت قەدەغەکراوە، بریتییە لە سەفەرکردن بۆ ماوە(مسافة)ی دوو شەوو ڕۆژێك، یان کەمتریش بەتەنها، واتە: کە مێردی یان خزمێکی مەحرەمی- وەك باب و براو کوڕ- لەگەڵی نەبێت، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**لاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ مَسِيرَةَ يَوْمَيْنِ لَيسَ مَعَهَا زَوْجُهَا أَوْ ذُو مَحْرَمٍ**))رواه البخاري. واتە: (هیچ ئافرەتێك نابێ بەبێ مێرد یان خزمێکی مەحرەمی سەفەرێکی ماوە دوو ڕۆژیی بکات.)

هەروەها بۆ بەموتڵەقی حەرام بوونی بەسەفەر چوونی ئافرەت بەبێ مەحرەم فەرموویەتی: ((**لاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ...**))رواه البخاري.

ئەم مەسەلەیەش بێگومان حیکمەتەکەی پاراستنی ئافرەتە، کە لەڕووی جەستەیی و مەعنەوییەوە، دووچاری گرفت و کێشەیەك ببێ، ئەوانەش کە سەفسەتە دەکەن و دەڵێن: باشە بۆ کاتی خۆی هۆیەکانی سەفەرو هاتوچۆ

سادەبوون‌و سەفەر زەحمەت‌و پڕ مەترسیی بووە بەهەر حاڵ، بەلاّم ئێستا هیچ پاساو(مبَّرر)ێك بۆ ئەو حوكمە نیە، یان وێڕای بێ‌ئیمانیی لەواقیع‌و دنیاش بێ‌هەواڵن، یان هەر زۆرزان‌و شەیتانن‌و دەیانەوێ نێچیری ئاسان زۆر بن! ئەگەر نا وەك كوردەواریی خۆمان گوتوویانە: (ماڵی خۆت توند بگرەو سەگی دراوسێت بە دز مەگرە). هەروەها گوتوویانە: (ئەگەر دز دز بێ، تاریكە شەو زۆرن!).

## ٢-تەنها نەبوونی ئافرەت لەگەڵ پیاوانێكی بێگانەدا:

ئەمیش واتە: (عدم خلوة المرأة مع رجالٍ أجانب)[١] یەكی دیكەیە لەو شتانەی كە لە ئافرەت قەدەغە كراون، بەپێچەوانەی پیاوەوە.

بەلاّم دەبێت لێرەدا ورد بین:

بێگومان بەتەنهاو لە شوێنێكی چۆڵ پێكەوە بوونی پیاوو ئافرەتێكی بێگانە، وەك یەك بۆ هەردووكیان قەدەغەیەو لێیان حەرام كراوە، وەك پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ**) رواه مسلم.

واتە: با هیچ پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێك‌و لە جێیەكی چۆڵ بەتەنها نەبێ، مەگەر مەحرەمێكی لەگەڵبێ)).

كە (النَّووي) لەو بارەیەوە یەكدەنگیی(إجماع)ی زانایانی هێناوە.[٢]

ئەمما ئەوەی كە بۆ پیاو ڕەوایەو لە ئافرەت قەدەغەیە، بریتیە لەوەی كە پیاوێك بۆی هەیە بەتەنهاو لەجێیەكی چۆڵ لەگەڵ كۆمەڵە ئافرەتێك بێت، بەلاّم ئافرەت بۆی نیە بەتەنهاو لە جێیەكی چۆڵ لەگەڵ كۆمەڵێك پیاو بێت، وەك (ابن الحجر

(١) (أجنبـي) لەزاراوەی شەرع زاناندا هەر پیاوێكە كە بەو ئافرەتە بشێ، هەرچەندە ئێستاش نەبێ‌و لە داهاتوودا پێی بشێ، وەك برای مێردی ژن.
(٢) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٩، ص١٠٩.

العسقلاني) هێناویەتی.[(١)]

حیکمەتی ئەم حوکمە شەرعییەش دیسان هەر پاریزگاریی لێکردنی ئافرەتە چونکە:

**یەکەم:** ئافرەت لە ڕووی جەستەییەوە بێهێزترە لە پیاوو بەرگریی بۆ لەخۆی ناکرێ.

**دووەم:** پیاو داواکەر(طالِبْ)ە، بەڵام ئافرەت داواکراو(مَطْلوب)ەو مەگەر بەدەگمەن دەنا ئافرەتان با کۆمەڵیش بن، سروشتی تایبەتی ئافرەتانەیان ناهێڵێ پرکێشیی پیاو بکەن! بەپێچەوانەی پیاوانەوە.

## ٣-جوانیی خۆ دەرخستن و داپۆشینی هەموو جەستە جگە لە دەست و دەموچاو:[(٢)]

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو حوکمانەی کە تایبەتن بە ئافرەتەوەو لە حاڵێکدا کە خوای کاربەجێ بەئافرەتانی فەرموە: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾(النور: من **الآية٣١**)، واتە: با جوانیی خۆیان دەرنەخەن،مەگەر ئەوەی، کە بەشێوەی عادەتی دەردەکەوێ.

بەڵام پیاوان بە هیچ کام لەو حوکمانەوە پابەند نەکراون و لەسەریان پێویست نەکراوە کە سەرتاپای جەستەیان جگە لە دەست و دەم و چاویان داپۆشن و، بێجگە لە هاوسەرانیان هیچ کەس جوانییان نەبینێ! جا حیکمەتی ئەوەش دیسان بەس

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج٦، ص٧٥، ٧٦.
(٢) ئەمە ڕای جەماوەری زانایانەو لە باسەکانی داهاتوودا بە درێژی باسی بەڵگەکانیان دەکەین.

ڕەچاوکردنی پاراستنی کەسایەتیی‌و کەرامەتی ئافرەتە، کە وەك شتێکی هەرزان‌و بێکڕیار هەمیشە وەك گۆشتی سەرچەپەڕێ خۆی نەخاتە گۆڕێ‌و، خۆی بێ نموود و کەم بایەخ(مُبْتَذَلْ) نەکات!

بەڵام دیارە وێڕای ئەوەش، خۆ داپۆشین(تَسَتُّر)و بەحەیاو حەشمەت بوونی ئافرەت، هەم بۆ پیاوو هەم بۆ تێکڕای کۆمەڵگاش، پڕە لە حیکمەت‌و سوودو کەڵك، چونکە شەریعەتی حەکیمانەو دووربینانەی خوای پەروەردگار، دەیەوێ لەکاتێکدا کە ئافرەت لە مەیدان‌و بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیان‌و گوزەراندا ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ، جۆرە بەرگو پۆشاکێکی لەبەردا بێت‌و بەجۆرێك هەڵسوکەوت بکات، کە زیاتر ئینسان بوونی تێدا بەرجەستەبێت، نەك مێینە بوون![1]

**کەواتە:**

بەڵێ سەرجەم ئەو حوکم‌و یاسایانە کە تایبەتکراون بەئافرەتەوە، ئەگەر بابەتییانەو بەویژدانەوە سەرنج بدرێن، زۆر بە ڕوونیی دەزانرێ ،کە حیکمەتی بەرز بەرزیان گرتوونە خۆو، بەگشتی بەرژەوەندیی پاراستن‌و کارئاسانیی‌و کەسایەتیی بەرزڕاگرتنی ئافرەت‌و بوار ڕەخساندن بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە سروشتیی‌و بنەڕەتییەکە(أداء الوظيفة الفطرية والأساسية)یەتی!

(١) دکتۆر (محمد سعید رمضان البوطي) لەکتێبی (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرّباني) ص١٥٧، ئەم ڕووداوەی گێڕاوەتەوە: شاعیرەیەکی ناسراوی عارەب لە ئێوارە کۆڕێکدا (قصیدة)یەکی خوێندەوە لە حاڵێکدا کە خۆی زۆر ڕازاندبۆوەو لەکاتی شیعر خوێندنەوەکەیشیدا قژ (شَعْر) ە درێژەکەی کە دەهاتە سەر چاوی بەلەنجەو لارێکی مانا بەخشەوە پرچەکەی هەڵدەدایەوەو هەروەها بەردەوام... جا کاتێك شیعرەکەی تەواو بوو، ئەهلی هۆڵەکە چەپڵەیەکی گەرمیان بۆ لێداو، یەکێك لە بەشداربوان بە هاوەڵەکەی تەنیشتی گوت: شیعرەکەی چۆن بوو؟! ئەویش گوتی: شەعر(قژ)ێکی هەیە، عەقڵ دەڕفێنێ!

## ٦) شەریعەت لەهەموو حاڵێکدا ئافرەتی پاراستوەو خاتری گرتوە، چ کچ بێ ،چ هاوسەربێ، چ دایك:

ئەگەر سەرنجی دەقەکانی شەرعو ڕێڕوونیی و ئاراستەکانی بدەین، دەبینین کە لەهەموو قۆناغەکانی تەمەندا داکۆکیی لەسەر پارێزگاریی لێکردنی کەسایەتیی ئافرەت و پاراستنی مافەکانی کراوە، جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئافرەت بەزۆری سێ حاڵەتی هەن و، یان کچەو بابی هەیە، وە یان ژنەو مێردی هەیە، وە یان دایك و نەنکەو، کوڕو کچ و نەوەی هەن، با سەرنج بدەین داخۆ لە هەرسێك حاڵەتەکەیدا، شەریعەت چۆن چۆنی ڕێزو حورمەتی لێگرتوەو هەوڵی پاراستنی کەسایەتیی و مافەکانی داوە:

### ١-کچ:

لەکاتێکدا بەر لەهاتنی ئیسلام کە عارەبەکان زۆر جاران (کچ)یان زیندە بەچاڵ دەکردو بەلەدایك بوونی کچ هێندە دڵگران دەبوون، کە ڕوویان تەڵخ و ڕەش هەڵدەگەڕا، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ ﴾ (النحل:٥٨)، بەڵێ ئا لەو هەلومەرج و واقیعەدا، خوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەروەرمانﷺ بەهۆی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە لە وەحییەوە هەڵقوڵاوەکانەوە، ئەو جۆرە تێڕوانین(نظرة)ە بەکەم دانەر(مُهین)ە نەفامییەیان لە ڕیشەوە گۆڕی و سەدو هەشتا (١٨٠) پلە وەریان چەرخاندو کیژ(بنت)یان بەرز نرخاند کە وەك خەڵات و بەخشش و نیعمەتێکی گەورەی خوایی دابنرێ و، لەجیاتی زیندەبەچاڵکردن، وەك چاو بپارێزرێ!

با سەرنجی ئەم چەند دەقەی قورئانو سوننەت بدەین:

١-﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾ (الشورى:٥٠، ٤٩).

واتە: خوا خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، هەرچی بیەوێ دروستی دەکات، هەر کەسێك خوا بیەوێ، مێینەی پێ خەڵات دەکات، وە هەر کەسێکیش کە بیەوێ، نێرینەی پێ دەبەخشێ، یان بە جووتە نێرینانو مێینانیان پێدەدات، هەر کەسێکیش کە بیەوێ، نەزۆکی دەکات، بێگومان ئەو زاناو توانایە.

وەك دەبینین خوای پەروەردگار وشەی (یَهَبُ) کە لە زمانی کوردیدا مانای خەڵاتو بەخشیش دەگەیەنێ، بۆ پێدانی منداڵ بەکار دێنێ، ئنجا (کچ)یشی پێش کوڕ خستوە!

٢- پێغەمبەریشﷺ فەرموویەتی: ((**مَنْ كَانَتْ لَهُ أُنْثَى فَلَمْ يَئِدْهَا وَلَمْ يُهِنْهَا وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ الذُّكُورَ عليها، أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ**))رواه مسلم. واتە: (هەر کەسێك مێینەیەکی هەبێو زیندە بەگۆڕی نەکاتو، بەسووك تەماشای نەکات، وە منداڵە نێرینەکانی بەسەردا پەسەند نەکات، خوا دەیخاتە بەهەشتێ).

٣- هەروەها فەرموویەتی: ((**مَنْ ابْتُلِيَ مِنْ هَذِهِ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنْ النَّارِ**))متفق عليه. واتە: (هەر کەسێك بەهەندێك لەو کچانە تاقیبکرێتەوە- وپێی ببەخشرێن-، ئەویش لەگەڵیان چاکەکار بێت، بۆی دەبنە پەردەو پەرژینی ئاگر-ی دۆزەخ-).

٤- دیسان فەرموویەتی: ((**مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ وَضَمَّ أَصَابِعَهُ**))رواه مسلم. واتە: (هەر کەسێك دوو کیژان

هەتا باڵغ دەبن بەخێویکات، ڕۆژی قیامەتێ منو ئەوە وەك ئەم دوو پەنجەیە لەیەك نزیك دەبین، [1] وە پەنجەکانی پێکەوە نووساندن).

## ٢-هاوسەر:

هەرچەندە-خوا یاربێ- ئێمە لە بەشێکی تەرخانو سەربەخۆدا باسی مافەکانی ژنو مێرد بەسەر یەکدییەوە دەکەینو لێرە ئەو بابەتە ناتوێژینەوە، بەڵام هەر بە کورتی چەند ئاماژەیەکی پێ دەکەین:

١- ژنو مێردایەتیی لەسەر بنەمای ڕێزو بەزەیی و خۆشەویستی دوو سەرە (مُتبادل) بنیاتنراوە، وەك خوای خاوەنی بوون(ﷻ) فەرموویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾(الروم:الآية٢١).

٢-وە ئافرەت بە بوونی بەڵێنی هاوسەریێتی(عقدة النكاح) خاوەنی هەقێکی گەورەیە لەسەر مێردەکەی و، ئەگەر پێیەوە پابەند نەبێ، سزاو جەزرەبەی دونیاو قیامەتی بۆ مسۆگەرە:

﴿ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ ﴾ (النساء:الآية٢١)

واتە: وە ژنەکانتان پەیمانێکی گەورەو پتەویان لێتان وەرگرتوە.

٣- وە ژنومێرد لە شەریعەتدا بەجلو بەرگو پۆشاك شوبهێنراون بۆ یەکدی، کە بێگومان ئەو پێچواندن(تشبیە)ە زۆر شت دەگەیەنێ، لە یەك نزیکیی

---

(١) لە فەرموودەی دیکەدا هاتووە کە ئەو دوو پەنجەیە پەنجەی شایەتمانو پەنجە درێژە بوون.

زۆرو، بۆ یەك ئاتاج بوونو یەكسانییو .. هتد. ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾(البقرة: من الآية١٨٧).

٤- وە ژنو مێرد ئەركو كاریان لەبەرانبەر یەكدی دا، وەك یەكە:﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾(البقرة: الآية٢٢٨)، دیارە مەبەست لەو پلە(درجة)ی پیاوانیش پایەی سەرپەرشتیاری(قِوامَة)یە، كە لە ڕاستیدا ئەركو (تكليف)ە، نەك ئیمتیازو (تَشريف)!

٥-وە پیاوان زۆر جەختو داكۆكییان لەسەر كراوە، كە دەبێ هەتا دەتوانن لەگەڵ ژنەكانیاندا چاكو خۆشڕەفتار بنو لەگەڵیان لێبوردەو خۆڕاگرو چاوپۆشیكەر بن: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (النساء:الآية١٩).

واتە: وە بەچاكە لەگەڵ ژنەكانتان ڕەفتار بكەن، جا ئەگەر لەسەر هەندێك كەمو كوورپی ڕقیشتان لێیان بۆوە، هەر لەگەڵیان باش ڕەفتار بن، چونكە زۆر نزیكە ڕقتان لە شتێك بێت كەچی خوا خێرو قازانجێكی زۆری تێدا بڕەخسێنێ.

٦- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ كەمتەرخەمیی(تقصير) كردنی مێرد، لە دابینكردنی ژیانو گوزەرانی ژنو منداڵدا، كە ئەركێكە شەریعەت خستوویەتیە ئەستۆی، بە گوناحێكی زل دادەنێ: ((**كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ**)) رواه ابوداود، واتە: ئینسان ئەوەندەی گوناح بەسە، كە كەسێك ژیانو گوزەرانی بەوی سپێردراوە، زایەی بكات!))

## ٣-دایك:

لە بارەی ڕێز لێگرتن و ئاگالێبوون و چاودێریی دایکەوە[1]، ئایەتی قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەری خواﷺ یەکجار زۆرن، بۆ وێنە:

١- خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾(الاحقاف:الآية١٥).

واتە: وەئینسانمان بەچاکەکردن لەگەڵ دایك و بابی ڕاسپاردوە، دایکی بەناڕەحەتیی - لە زگیدا- هەڵی گرتوەو، بەناڕەحەتییش دایناوە، هەروەها سی (٣٠) دانە مانگ ماوەی ئاوس بوونی و لەشیر برینەوەی بووە.

٢- ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خواشﷺ گەورەیی و قورسی هەقی دایك لەسەر ڕۆڵەکانیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

(بخاري)[2] گێراویەتەوە کە ڕۆژێکیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و لێی پرسی: کێ لەهەموو کەس زیاتر هەقی چاکە لەگەڵ کردنی لەسەرمە؟!

ئەویش فەرمووی: دایکت.

گوتی: ئەدی دوای ئەو؟

فەرمووی: دایکت!

گوتی: ئەدی دوای ئەو؟

فەرمووی: دایکت!

---

(١) لە بەشی شەشەمدا -لەبەرگی دووەم دا- باسی مافەکانی باب و دایك و ڕۆڵەکانیمان بەرانبەر بەیەکدی، کردووە.

(٢) بڕوانە: (فتح الباري) ج١٢، ص٤.

گوتی: ئەدی دوای وی؟!

فەرمووی: بابت.

٣- هەروەها (الطبراني) گێراویەتەوە کە ڕۆژێکیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ وە لەبارەی چوونە جەنگو جیهادەوە پرسیاری لێکرد، ئەویش پێی فەرموو: ئایا دایکت زیندووە؟! گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ((**إِلْزَمْ رِجْلَها فَثَمَّ الجنَّة**)) واتە: لاقی دایکت بگرەو خزمەتی بکە، چونکە بەهەشت لەوێیە!

٤-هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**الجنَّةُ تَحْتَ أقدامِ الأمَّهاتِ**)) رواه النّسائی ، واتە: بەهەشت لەژێر پێیەکانی دایکاندایە[1]..

٥- ئنجا ئەوەندە بەسە بۆ خستنەڕووی هەقی دایكو باب لە شەریعەتدا، کە ئازاردانو سەرپێچیی لێکردنیانو دڵ ئێشاندنیان، ئەگەر بە گچکەترینو سادەترین شێوەش بێت، پاش هاوبەش بۆخوادانان(الاشراك باللە) بە گەورەترین تاوان دانراوە!

وەك پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟! ... الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ**)) **رواه البخاري** ،واتە: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە گەورەترینی گوناحە زلەکان؟! .. هاوبەش بۆ خوا دانان، وە نارەحەتکردنی دایكو باب.).

٦- وە مافی دایكو باب لەسەر منداڵەکانیان هێندە جەختی لەسەر کراوە کە تەنانەت لە حاڵەتی کافرێتیو بێدینیشیاندا هەر پێویستە مافەکانیان دابین بکرێنو بەشێوەیەکی باش مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ، ئەوەندە هەیە لەشتی

ناشەرعیبیدا بەقسەیان ناکرێ:﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾ (لقمان: من الآية١٥).

**ئنجا لەکۆتایی ئەم خاڵەشدا، خستنە ڕووی ئەم سێ مەسەلەیە بەپێویست دەزانم:**

**یەك:** هیچ کاتێك ئافرەت دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانو گوزەرانی خۆی لەئەستۆدا نیە، بەڵکو هەتا کچە لەسەر بابی پێویستەو، کە شوی کرد لەسەر مێردیو، کە مێردیشی مرد، یان هەر نەیکردبوو، ئەوە لەسەر بابی، یان برای- یان- یان- .. هتد.، یەتی، مەگەر خۆی هەیبێو نەیەوێ.

دوو: هەر کاتێك ئەو ئافرەتە هیچ خزمێکی وای نەبوو کە لە ڕووی شەرعییەوە دابینکردنی ژیانو گوزەرانی لەسەر پێویست بێت، ئەوە ئەرکی ناوبراو دەچێتە ئەستۆی دەوڵەتو خەزێنەی دارایی(بیت المال)یەکەیەوە، وە ئەوە کۆدەنگ(إجماع)ی زانایانی لەسەرەو[1] بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیە: ((**مَنْ خَلَّفَ مالاً أو حقاً فَلِوَرَثَتِه، وَمَنْ خَلَّفَ كَلاًّ أو دَيْناً فَكَلُّهُ إليَّ وَدَيْنُهُ عَلَيَّ**)) **متفق عليه عن أبي هريرة**. واتە: (هەرکەسێك ماڵێك یان هەقێکی پاش خۆی بەجێهێشت، ئەوە با بۆ میراتگرانی بێت، بەڵام هەر کەسێك پەککەوتەیەك یان قەرزێکی بەجێهێشت، ئەوە پەککەوتەکەی[2] با بۆ لای

---

(١) بڕوانە: (القوانين الفقهية لابن جزي) ص١٦٨، وە (مغني المحتاج) ج٣، ص٤٤٨ وە (المغني لابن قدامة) ج٣، ص١٦٨، کە (قضايا فقهية معاصرة) ی البوطي، ص١٥٧ ئاماژەی پێیانکردوە.

(٢) وشەی (كَلّ) لە زمانی عارەبیدا بەمانای (هەتیو) و (بێوەژن) و (پەککەوتە) دێ، جا من (پەککەوتە) م بەکارهێنا، چونکە دووەکەی دیش دەگرێتەوە.

من بێت (واتە من گوزەرانی دابین دەكەم)وە قەرزەكەش با بكەوێتە سەر من).

جا دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ گەورەو پێشەوای مسوڵمانان لە جێگای دادەنیشێ، كەواتە: ئەو ئەركانە دەچنە ئەستۆی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییەوە.

سێ: زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام گوتوویانە: مەبەست لە رستەی: ﴿..وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗا...﴾، دیارە بەهەمان شێوەش ﴿..وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ..﴾ ئەوەیە كە پێویستە هەموو ئەو شتانەی كە بۆ ژیانو گوزەران پێویستن، دابین بكرێن.[1]

**بەڵێ خوێنەری سەنگین!**

وەك بینیمان شەریعەتی خوای دادگەر (تبارك وتعالى) لە هەموو حاڵاندا رێزو حورمەتو كەسایەتیی ئافرەتی پاراستووەو لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەكانی تەمەنیدا، نەیهێشتوە، كە بێ موراد بێتو بێ دەرەتانو پەككەوتوو بێت!

جا ئەگەر بێتو حاڵی ئافرەتی مسوڵمان لەژێر سایەی شەریعەتدا بەراورد بكەین لەگەڵ حاڵو باڵی تفتو تاڵو شپرزی ئافرەتی رۆژئاوایی لە هەموو قۆناغەكانی تەمەنیدا، ئەوە بێگومان جیاوازییەكی هێندەی دووری ئاسمانو زەوی دەبینین.

لە رۆژئاوا(غَرْب) كچ هەر باڵغ بوو، ئەوە بەپێی یاساكان(قوانین)ی وڵاتانی بەناو پێشكەوتوو و لەڕاستیدا دواكەوتوودا[2]، مەسرەفكێشانی لەسەر دایكو بابی

---

(١) بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٨، ص١٦٨، وە (قضايا فقهية معاصرة) ص١٥٧.

(٢) چونكە پێشكەوتنی ڕاستەقینە ئەوەیە كە رێزو حورمەتو كەسایەتیی ئینسان تێیدا جێگیر بێ، ئەگەرنا بەرەو پێش چوونی ماددیی لەسەر حیسابی جەوهەری مرۆڤو بەهابەرزەكانیو پلێشانەوەی، هیچ نیە.

نامێنێو، دەبێ بۆخۆی بکەوێتە مشووری نان پەیداکردن! ئیدی چۆن بۆی پەیدا دەکرێ گرنگ نیەو، دەبێ هەر پەیدای بکات، بۆ ئەوەی لەبرسان نەمرێ!

هەروەها ژنی ڕۆژئاوایی چونکە کار دەکات، لە ڕووی یاسایی(قانوني)یەوە نان‌و نەفەقەی لەسەر خۆیەتیو جاری وا هەیە مێردەکەی بەزۆر پارەشی لێدەستێنێ!

بەڵام ژینتاڵییو بەدحاڵیی گەورەو بێڕەزا، ئەوەیە کە بێوەژن‌و پیرەژن‌و پەککەوتەکان تێیدا دەژین، کە سەرەنجامیان پەککەوتەخانەکان(دار العَجَزة)یەو جاری وا هەیە بە دە(١٠) ساڵیش جارێك کوڕو کچەکانیان سەردانیان ناکەن، نەوەکانیشیان هەر باس مەکە!

## ٧) جاروبار بێبڕوایان‌و نەیارانی شەریعەتیش دانیان بەڕاستیدا هێناوە:

**خوێنەری بەڕێز!**

خوا یاربێ لەم خاڵی حەوتەمو کۆتایی بەشی دووەم دا، چەند قسەو دان پێداهێنانێکی ژمارەیەك لەنووسەرو ناودارانی بێبڕوای ڕۆژئاوایی دەخەینە ڕوو، تاکو بەپێی یاسای (مِنْ فَمِكَ أُدِينُكَ)، ئەو دان پێداهێنانە(إعترافات)ەش بەڵگەیەکی دیکەی ڕاستی قسەکانمان بن نەك بۆ مسوڵمانان کە یەکیان لەسەر شایەدیی دانی ئەو جۆرە کەسانە نەکەوتوە، بەڵکو بۆ زیاتر بێدەنگ کردنی کەسانێك کە ڕەنگە دەیان بەڵگەی زانستییان لەلا، هێندەی قسەو دان پێداهێنانی بابایەکی ڕۆژئاوایی بەهێزو کاریگەر نەبێ!

جا بێگومان ئەو زاناو ناودارە بیانییانەی کە دانیان بەو ڕاستیانەدا هێناوە، زۆر زۆرن‌و ئێمە تەنها وەك چەند نموونەیەك هەندێکیان لێ باس دەکەین.

## ڕای هەندێك لەو زاناو ناودارە بیانییانەی کە دانیان بە ڕاستێتیی مافی ئافرەت لەئیسلامدا هێناوە

### یەك: گوستاف لوبۆن:

لەو بارەوە گوتوویەتی: [١]

(کە ئیسلام هات، مافەکانی ئافرەتی چەسپاندو شیرازەی مافو ئەرکەکانی خێزانی دامەزراند، وە ئیسلام حاڵی ئافرەتی زۆر چاك کردو یەکەمین[٢] ئایینە کە ئاوا پایەی ئافرەتی بەرز کردەوە، وە ئەوەی ئافرەتان لەسایەی شارستانێتی ئیسلامدا[٣] پێی گەیشتوون، خوشکە ئەوروپاییەکانیان تازە بەتازە چنگیان کەوتوە.

وە ئیسلام گەلێك کۆتو بەند کە لەسەردەمی نەفامێتیدا باوبوون، ئافرەتی لێ ئازاد کرد کە لە میراتدا بەشدار بێت، وە لە ڕووی ئابوورییەوە ئەوەی هەیەتی تێیدا سەربەخۆ بێتو مێردی هیچ دەسەڵاتی بەسەردا نەبێت. هەروەها لەڕووی کاروباری کەسێتی(الأحوال الشخصية)یەوە چاکسازیی زۆری کرد، چونکە هەم تەڵاقو هەم چەند ژنیی[٤] (تعدد الزوجات) دوای ئەوەی پاشا گەردانیی زۆریان

---

(١) بڕوانە: گۆڤاری (حضارة الاسلام) العدد الثاني، السنة التاسعة، ص٢٧، کە ئەویش لە کتێبی: (الاسلام وحضارة الغرب) ص ١٠٦، وەریگرتوە.

(٢) ئەمە ڕاست نیەو شەریعەتەکانی خوا پێش گۆڕانو دەستکاریی کرانیان، هەموویان وەك یەك ڕێزیان لەئافرەت گرتوە.

(٣) ئەو نووسیویەتی (حضارة العرب)، بەڵام مەبەستی (ئیسلام) ە بۆیە وام لێکرد.

(٤) لەبارەی مەسەلەی (چەند ژنیی)یەوە نامیکەیەکی سەربەخۆمان نووسیوە، بەناوو نیشانی (سروشت و پایەکانی خێزانو مەسەلەی چەند ژنی لەتەرازووی شەرعو عەقڵ دا).

تێدابوو، ڕێکی خستن و مەرج و بەندی بۆ دانان.

ئنجا هەرچەند ئیسلام فەرمانی کردوە بەخۆداپۆشینی ئافرەت و ڕێگای لە بەتەنهاو لەجێی چۆڵ و لەگەڵ پیاودا بوونی گرتوە، بەڵام ڕێی چوونە دەرەوە بۆ کۆڕەکانی زانست و مزگەوتەکان و کاروچالاکییە پەسەندەکانی لێنەگرتوە).

### دوو: هیملتۆن:

ئەمیش کە یەکێك بووە لە ناودارانی ئینگلیز لە بارەی ڕێزو حورمەت لێگیرانی ئافرەت و پارێزگاریی لێکردنی لەسایەی شەریعەتدا، گوتوویەتی. [١]

(بێگومان یاساکانی ئیسلام زۆر ڕاشکاون لە زۆر گرنگیی و ئەمیەت پێدانی ئافرەت و، پاراستنی لە هەر شتێك کە ببێتە مایەی ئازاردانی و ڕووشاندنی حورمەتی و کەسایەتیی، وە وەك هەندێك لە نووسەران گومان دەبەن، ئیسلام بەهۆی پێویست کردنی خۆداپۆشین لەسەر ئافرەت، تەنگی پێهەڵنەچنیوە بەڵام ئەوەندە هەیە داخوازییەکانی جوامێریی و غیرەت[٢] (غَیْرَة)ی ڕەچاوکردوون.)

### سێ: ڤۆلتێر:

ئەمیش هەر لەو بارەوە گوتوویەتی: [٣]

(ئێمە لەوە بێئاگاین کە قورئان بەو جۆرەی کە سروشت[٤] ئیمتیازی بەپیاو داوە، ئیمتیازەکەی بۆ دادەنێ، بەڵام قورئان لەوەدا لە تەورات جیایە کە ناچێ

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٧، ٢٨.

(٢) مەبەست لە (غَیْرَة) لێرەدا (بەتەنگەو نامووسەوە بوون)ە، نەك ئازایەتیی.

(٣) سەرچاوەی پێشوو ص٢٧.

(٤) ڕۆژئاواییەکان وشەی سروشت (طبیعة) لە جیاتی خوا (سبحانه وتعالى) بەکاردێنن.

بێهێزیی (ضعف)ی ئافرەت بە زاراوەی گوناحو تۆڵەو سزایەكی خوایی دابنێ، وەك لە تەوراتدا لە سیفری (التكوین)و (إصحاح)ی سێیەمو ئایەتی ژمارە (١٦)دا هاتوە!).

### چوار: ئۆگست كۆنت: [١]

ئەمیش كە بەدامەزرێنەری زانیاری كۆمەڵناسیی (سۆسیۆلۆجیا) ئەورووپایی دادەنرێ، لە كتێبی: (سیستەمی سیاسیی)دا گوتوویەتی:

(ئەگەر بێتو رۆژێك لە رۆژان ئافرەت ئەو یەكسانییە مادییەیان وەدەست بخەن، كە ئێستا كەسانێك پێیان وایە بەرگرییان لێدەكەن، كە بۆیان داوادەكەن، بێئەوەی خۆیان رازی بن! ئەوە بێگومان لە حاڵێكی ئەوتۆدا ئەو پشتیوانە كۆمەڵایەتییەیان كە هەیانە تێك دەچێو نامێنێ، بە ئەندازەی ئەوە كە ئەوان حاڵەتی ئەدەبییان[٢] تێك دەچێ، لەهەمان كاتیشدا سەرچاوە ئەسڵییەكانی خۆشەویستی دووسەرەی نێوان ئەوانو پیاوان لێڵ دەبن!).

### پێنج: جان جاك رۆسۆ:

ئەمیش كە بە بابی رۆحیی شۆڕشی فەرنسایی (١٧٩٠) دادەنرێ، لە كتێبی: (ئەمیل)دا هەڵوێستو بۆچوونی خۆی لەبارەی ئافرەت لەم چەند شتەدا خستۆتە

---

(١) بڕوانە: (دائرة المعارف) لفريد وجْدي، ج٨، ص٦٠٤.

(٢) مەبەست لە حاڵەتی ئەدەبی حاڵەتی ئەخلاقییە، كە بێگومان هەر پیاوێك ئەگەر هەر تۆزێك جوامێریی هەبێ، هەر كە زانی ژنەكەی بێبەندو بارە، لەبەر چاوی دەبێزرێ، دیارە ئەگەر مسوڵمانیش بێ ،قبووڵكردنی بێناموسیی بە گوناحێكی یەكجار زل دەزانێو بۆی قوت ناچێ!



ڕوو: [١]

* پێویستە ئافرەت لەڕێی سەرگەرم بوون بەئەرکی سروشتیی خۆیەوە، خزمەت بەگەل و کۆمەڵگا بکات، کە بریتیە لە گرنگیدان بە مێردو منداڵەکانی.
* وە دەبێ ئافرەت لەجیاتی لاساکردنەوەی پیاوو خۆ پێشوبهاندنی، هەوڵ بدات مێینایەتی(أنوثة)ی خۆی تۆخ بکاتەوەو لەدەستی نەدات.
* وە پێویستە ئافرەت بەهیچ ڕەنگێك ماڵ و حاڵ بەجێ نەهێڵێ و بەبیانووی کاسبی و ئیشکردنەوە هەڵوەدای ئەملاو لا نەبێت.
* وە دەبێ وریاو هۆشیار بێت و پیاوانی چڵێس و نیاز خراپ و نزم و پەست فێڵی لێنەکەن و بەناوی مافەکانی ئافرەت و یەکسانکردنی لەگەڵ پیاودا، نەیخەنە تەڵەو داوی خۆیانەوە.

## شەش: بەرتراند ڕاسل:

فەیلەسووفی ناوداری ئینگلیز کە سەرجەم ئەوروپا شانازیی پێوە دەکات، ئەویش لەوبارەوە گوتوویەتی: [٢]

(خێزان واتە خێزانی ڕۆژئاوایی، لە سۆنگەی بەکارهێنانی ئافرەتەوە لە کاروبارە گشتییەکاندا، لەبار یەك هەڵوەشاوە، وە بەئەزموون دەرکەوتوە کە هەر کاتێك ئافرەت لە ڕووی ئابوورییەوە ئازادو بێ منەت بوو[٣]، ئەوە لە داب و نەریتە

---

(١) بڕوانە: بەشی (پەروەردەی ئافرەت) لاپەڕە: ٢٣٤، وە بڕوانە: (هذە مشكلاتهم) د. محمد سعید رمضان البوطي، ص٩، ٩٣.
(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٩٣.
(٣) لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوون، ئەگەر نا ئافرەت لە ئیسلامدا لەڕووی ئابووریی و چی و چییەوە ئازادە و ئیمانەکەیشی ناهێڵێ بەو دەردانە بچێ!

باوەکانی کۆمەڵگا هەڵدەگەڕێتەوە، وە ڕازی نابێ کە بۆ تەنها پیاوێك بێتو لەگەڵی پاكو وەفادار بێت!).

## حەوت: میشیل فوج:

ئنجا با کۆتایی ئەو دان پێداهێنانەش بەچەند قسەیەکی داچڵەکێنەرانەی یەکێك لەو ئافرەتە کلۆڵانەی ڕۆژئاوا بێنین، کە لەتاو ئازارو ئێشو ژانی خۆیان نازانن ڕوو لە کێو لە کوێ بکەن!

ئەویش (میشیل فوج) ئافرەتی سەماکەر(راقصة)ی فەرەنسییەو لە چاوپێکەوتنو دیدارێکی گۆڤاری (الاسبوع العربي)[1]دا کە بەبۆنەی سەردانی بۆ شاری (بەیروت) سازکراوە، باسی ئێشو ژانو بێدەرەتانی خۆیو خوشکە ڕۆژئاواییەکانی کردوەو گوتوویەتی:

((پاش ئەوەی بابمو خێزان(أسرة)ەکەم دەستبەردارم بوون، ناچار بووم ئیشێك بدۆزمەوە تاوەکو ژیانو گوزەرانی خۆم دابین بکەم!... بابم یەکێك بوو لە گەورەپیاوانی پیشەسازیی زۆر دەوڵەمەند لە (پاریس)، جا بەبەڵگەی ئەوە کە ئەویش خۆی لەتەمەنی شازدە ساڵییدا چۆتە نێو گۆڕەپانی ژیانو گوزەرانەوە، ڕازی نەبوو بم ژیەنێو مەسرەفم بکێشێ! چونکە دەبێ منداڵەکانیشی خۆیان کار بکەنو بژێوی پەیدا بکەنو بەسەر ملی یەوە نەبنە بار!))

وە دەیگوت: ((بابم لەگەڵ دایکیشم زۆر دڵ ڕەق بوو و بە زبریی لەگەڵی دەجولایەوە، چونکە جاروبار هاوکارییەکی کەمی منی دەکرد!))

---

(١) گۆڤارێکی لوبنانییە، بڕوانە ژمارە (٢٤٧)، وە بڕوانە: (المرأة المسلمة في مواجهة التحدّيات) ص٥٧، ٥٨، صالح خليل حمودي.

وە دەیگوت: ((دایکم چاکەتێکی (فیزون)ی لەبەردایە کە نرخەکەی بیست هەزار (٢٠٠٠٠)لیرە زیاترە، من یان دەبێ بەئارەقەی نێو چاوان پارەو نانێك پەیدا بکەم، یان بە...؟! بۆیە سەرەنجام خۆمم لە مەلهاکانی شەودا دیتەوە کە لەو شوێنانەدا بەهۆی پیشەی سەماکردنەوە بژێوم چنگ بکەوێ!))

پاشان (میشیل)لە درێژەی گێڕانەوەی بەسەرهاتە پڕ کارەساتەکەی خۆیدا گوتی:

((ئا ئەمەیە ژیانی خێزانیی لە پاریس... سۆزو بەزەیی و پەرۆش لە دڵی باب و دایکاندا چۆڕە بڕ بووە!.. هێندە خۆپەرست(أناني)ن هەر عانەیەك کە دەیدەنە منداڵەکانیان وەك پارچە گۆشتێك بێ و لە جەستەیان ببڕێ! ئێمە لە پاریس هیچ نرخێك بۆ خێزان(عائلة) دانانێین، باب و دایك لە یەکدی نامۆ(غریب)ن و هەر کامیان بەتەنهاو بۆخۆی دەژیەت! بۆیە زۆربەی هەرە زۆری کچان لەماڵ و خێزانەکانیان بێزارن و، هەندێکیان دەبنە سکرتێرەو هەندێکیان مامۆستا(مُدرِّسة)و، هەندێکیان فرۆشیار لەلای بازرگانەکان، وە هەشیانە کە هەڵدەخلیسکێن و بە لەشفرۆشیی خۆیان دەژیەنن، ئەویش نالێم ژیانێکی خۆش گوزەرانانە، بەڵکو بژێوی سادەو هاکەزایی و هەرزان!

وە کچ بە چەندین ئەزموونی تاڵدا تێپەڕ دەبێ و لە میانەیاندا ناڕەحەتیی زۆر و مەینەتی جۆراوجۆر دەچێژێ! ئائەوەیە ڕاستی ژیان و گوزەرانی ئافرەت لە پاریس.))

**بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!**

ئەمانەش چەند دان پێداهێنانێکی کەسانێکی (بیانیی)بوون، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، پێیان لەو ڕاستییە ناوە کە ئافرەت و خێزان تەنها

لەکاتێکدا کەسایەتیی‌و حورمەت‌و ماف‌و بەرژەوەندیەکانیان پارێزراو دەبن، کە لە ژێر سایەی شەریعەتی دادگەرانەو وردبینانەو دووربینانەی خوای پەروەردگاردا بن.

بەکۆتایی پێهێنانی ئەم خاڵی حەوتەمەش، کۆتایی بەبەشی دووەمی ئەم کتێبە دێنین، دەچینە سەر باس‌و خواسی بەشی سێیەم.



**خوێنەری بەڕێز!**

خوا پشتیوان بێ لەم بەشی سێیەمەدا وەك پێشتریش گفتمان داوە، هەوڵ دەدەین گرنگترینی ئەو شتانەی کە دوژمن و ناحەزانی و سەرکێڵ و فامکاڵی شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای دادگەر، ویستوویانەو دەیانەوێت کە وەك چەند تۆمەتێك ئاراستەی شەریعەتیان بکەن، بە مەبەستی شێواندن و گەچڵاندنی سیماو ڕوخساری گەش و جوانی، لە بواری ئافرەت و خێزاندا، بەرپەرچ بدەینەوەو بپووچێنینەوە.

جا ئێمە سەرجەم ئەو تۆمەت(شبهة)انە لە دوازدە خاڵاندا دەتوێژینەوەو دەپووچێنینەوە، کە پێشتریش لە (ڕێ خۆشکردن)دا ئاماژەمان پێکردوون:

## ١-مەسەلەی بەشوودانی ئافرەت:

گەلێك جاران ناحەزانی ئافرەت بێئەوەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە بکەن لەبارەی مەسەلەیەکەوە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە نێو مسوڵمانانەدا بۆتە باو، وە بەبێ ئەوەی لە هەردووك سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەریعەت ڕابمێنن، کە قورئان و سوننەتن، هەر لە ڕەش ڕا و لە پشت پەردەی نەزانین(وراء حجاب الجهل)ەوە دەست دەکەن بە تۆمەتبارکردن(إتهام)ی شەریعەت، بە شتانێك کە شەریعەت لێیان دوورو بەرییە!

جا یەکێك لەو مەسەلانە مەسەلەی بەشوودانی ئافرەتەو، ئەو نەیارو ناحەزە بێئاگاو نەزانانە، بەهۆی هەندێك ڕەفتارو مومارەسەی هەڵەو ناشەرعییانەی هەندێك لە مسوڵمانانەوە، بێ سێ و دوو ئەو مەسەلەیان کردۆتە دەستە چیلەی هەڵایسانی شەڕێکی گەورە دژی شەریعەت!

جا با سەرنج بدەین داخۆ بڕیاری شەریعەت لەمەسەلەی بەشوودانی ئافرەتدا چییەو چۆنە؟!

**خوێنەری بەڕێز!**

ئەگەر لە یادت مابێ لە پێشەکی ئەم کتێبەدا گفتم داوە کە لە توێژینەوەو باسکردنی سەرجەم بابەتو مەسەلەکانی ئەم کتێبەدا بێجگە لە دەقەکانی قورئانو سوننەتو بیروڕای بەڵگەدار ترو بەهێزتر، خۆم بە هیچ شتێکی دیکەوە نەبەستمەوە، جا با لەسەرەتاوە سەرنجی دەقەکانی قورئانو سوننەتو بەڵگە عەقڵییە بەهێزەکان بدەین، داخۆ لەو بارەوە چی دەفەرموون؟ پاشانیش ئاوڕێك لە ڕاجیایی(إختلاف)ی زانایان دەدەینەوە:

**یەك:** لەبەشی دووەمدا خستمانە ڕوو لەبەر تیشکی چەندان ئایەتو فەرمایشتدا، کە نێرو مێ لەڕووی ئینسان بوونو بەرپرسیار (مكلَّف) بوون لە بەرانبەر ئایینو شەریعەتدا، وەك یەكو یەكسانن‌و، هەرشتێك ڕوو لە هەر کامێکیان بکات لە ئەرکو ماف، ڕوو لە ئەوی دیکەشیان دەکات بەبێ جیاوازیی.

**کەواتە:**

وەك چۆن پیاو بۆی هەیە بەئیرادەی خۆی هاوسەر بگرێو کێی پێ باشە هەڵبژێرێ، ئافرەتیش هەمان مافی هەیە، کە مێردی خۆی بە ئیرادەو ئارەزووی خۆی دیاری بکات، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٨). هەروەها خوای دادگەرو کار بەجێ ژنو مێردی بە پۆشاکی یەکدی داناون: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾(البقرة:من

الآية١٨٧)، ئاشكراشە ئینسان چ پیاو چ ژن، ئازادە لە هەڵبژاردنی جۆرو شێوەی بەرگو پۆشاكی خۆی داو، هیچ كەس بۆی نیە لەسەری فەرز بكات!! ئنجا ئەگەر نەگونجێ بەرگو پۆشاك لەسەر ئینسان فەرز بكرێ، چۆن دەكرێو دەگونجێ هاوسەر(زوج) لەسەر ئینسان فەرز بكرێت؟ مەگەر خوای پەروەردگار لە بواری پەیوەندیی نێوان ژنو مێردا نەیفەرموە ،كە مایەی ئارامیو ئۆخژنی یەكدینو خۆشەویستیو بەزەیی دوو سەرە(المحبة والرحمة المتبادلة) یان لە نێواندا هەیە: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ (الروم:٢١)؟! جا ئایا ئەگەر ژنو مێردێك بەزۆر لەیەك بەسترابن، دەبێ چ ئۆخژنێكیان بەیەكدی بێتو چۆن چۆنی خۆشەویستییان لەنێواندا دروست بێ؟!

دوو: وە ئەوە كە پیاو بۆ خۆی بۆی هەیە ژن بهێنێو پێویستی بەسەرپەرشتیكار(ولي الأمر) نیە، بەڵام لەلای زۆربەی جەماوەری زانایان هەبوونی سەرپەرشتیار بۆ شووكردنی ئافرەت بە مەرج گیراوە، چەند حیكمەتێكی تێدا هەن كە لە داهاتوودا باسیان دەكەینو، سەرجەمیش لەبەرژەوەندیی ئافرەتدانو، ئافرەتیش ،كە بە فیطرەت حەز دەكات داواكراو(مطلوب)و ئارەزووكراو(مرغوب فيها) بێت، شتێكی بێجێ و ناماقووڵەو بۆ ئافرەتیش جۆرێكە لە بێنموودیی(إبتذال)، كە خۆی خۆی لە پیاوێك مارە بكات، بەبێ ئاگاداریيو چاودێریی سەرپەرشتیكاری![1]

(١) دیارە خۆ مارەكردنی ئافرەت، لەگەڵ خۆ پێشنیار كردن (عرض النفس) جیایەو، خۆ پێشنیاركردنی ئافرەت بۆ پیاوی چاكو شایستە دروستەو، هیچی لەسەر نیەو (بخاري)

بەڵام بێگومان بەمەرج گیرانی ئاگاداریی‌و ڕەزامەندیی سەرپەرشتیکاری، ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەت ئازادی لێ زەوت بکرێ لە شووکردنیدا، وەك تۆزێکی دیکە باسی دەکەین.

سێ: دەقی سوننەت‌و فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە کە دەبێ ئافرەت بە ئازادیی‌و ڕەغبەتی خۆی شوو بکات‌و، هیچ کەس تۆبزیی لێ نەکات- زۆرن، بۆ وێنە:

(بخاري) لە ژێر ناوونیشانی[1]: (بَاب لاَ يُنْكِحُ الأَبُ وَغَيْرُهُ الْبِكْرَ وَالثَّيِّبَ إِلاَّ بِرِضَاهَا)دا ئەم فەرمایشتانەی هێناون:

١- ((**لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟! قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ**))عن ابي هريرة رضي الله عنه.
واتە: (بێوەژن هەتا ڕاوێژی پێ نەکرێ‌و فەرمانی لێ وەرنەگیرێ مارە ناکرێ، وەکچ هەتا مۆڵەتی لێوەرنەگیرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! جا چۆن کچ مۆڵەت دەدات؟! فەرمووی: بێ دەنگییەکەی مۆڵەت دانیەتی).

٢- ((**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي؟ قَالَ: رِضَاهَا صَمْتُهَا**)) واتە: عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بێگومان کچ شەرمێ دەکات، فەرمووی: بێدەنگ بوونی نیشانەی ڕازی بوونیەتی.

---

لەژێر ناوونیشانی: (باب عرضُ المرأة نفسها على الرجل الصالح) دا دوو فەرموودەی هێناون، بڕوانە: (فتح الباري) ج١٠، ص٢١٨، ٢١٩.

(١) واتە: دەرگای نە باب و نە هیچ کەس، کچو بێوەژن بەرەزامەندیی خۆیان نەبێ، بەشوو نادەن، بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) لابن حجر العسقلاني، ج١٠، ص٢٤٠تا ٢٤٧.

٣- ((**عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الأنْصَارِيَّةِ أنَّ أبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِﷺ، فَرَدَّ نِكَاحَهَا**)) واتە: خەنسائی کچی خیذام گێڕاویەتەوە، کە بێوەژن بووەو بابی بە مێردی داوەو، ئەویش ئەو شووکردنەی پێناخۆش بووەو، هاتۆتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مارەبڕینەکەی هەڵوەشاندۆتەوە.

٤- وە (ابن حجر) گوتوویەتی: بەسەرهاتی (خنساء بنت خِدام) لەڕێیەکی دیکەشەوە هاتوە کە (الدّار قطني والطبراني) لە (ابو هريرة)وە هێناویانە بەم جۆرە: ((**أنَّ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ زَوَّجَهَا أبوها وَهْيَ كارِهَةٌ، فَأَتَتْ النَّبِيَّﷺ فَرَدَّ نِكَاحَها**)) وە باسی ئەوەی تێدا نەکردوە کە ئایا کچ بووە یان بێوەژن.[1]

٥-وە (ابن الأثير)[2] ئەم فەرموودەیەی لەو بارەوە هێناوە: ((**لَيْسَ لِلْوَلِيِّ مَعَ الثَّيِّبِ أمْرٌ، وَالْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ فَصَمْتُهَا إقْرَارُهَا**))رواه مسلم ومالك وأبوداود والترمذي والنسائي عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما. واتە: (سەرپەرشتیار بۆی نیە هیچ دەورێکی هەبێ لەبەشوودانی بێوەژندا، وە کچی بێ بابیش ڕاوێژی پێ دەکرێ و بێ دەنگییەکەشی نیشانەی دان پێدا هێنانیەتی).

٦-هەروەها (مسلم) ئەم فەرموودەیەشی هێناوە: ((**الأيِّمُ أحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِي نَفْسِهَا وَإذْنُهَا صُمَاتُهَا**))عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما. واتە: (بێوەژن خۆی زیاتر لەسەرپەرشتیارەکەی مافی هەڵبژاردنی مێردی هەیە، کچیش مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ و

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج١٠، ص٢٤٦.

(٢) بڕوانە: (جامع الأصول) لأبن الأثير، ج١١، ص٤٦٠.

ڕاوێــژی لــەبارەی خۆیــەوە پــێ دەکــرێ، نیشــانەی مۆڵەتدانیشــی بێدەنگییەتی).

٧- هەروەها (إبن حجر)[1] ئـەم فەرمووددەیەشـی هـەر لـەو بـارەوە هێنـاوە: ((**عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ جَارِيَةً بِكْرًا أَتَتْ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا**))رواه النسائي وابن ماجه. واتە: (ئافرەتێکی کـچ هاتە لای پێغەمبـەرو بـۆی بـاس کـرد کـە بـابی بەشـووی داوەو ئـەویش ناڕازییە! پێغەمبەریش ﷺ سەرپشکی کـرد). واتـە ئـازادی کـرد لـەوەدا کەبەبڕیاری بابی ڕازی بێ‌و نیکاحەکەی دابمەزرێ، یان ڕازی نەبێ‌و هەڵی بوەشێنێتەوە.

**جا خوێنەری بەڕێز!**

وەك بینیمـان سـەرجەم دەقـەکانی سـوننەت بەڕاشـکاوی ئـەوە دەگەیـەنن، کەئافرەت چ کچ بێ چ بێوەژن، دروست نیـە بـەبێ ڕەزامەنـدیی خـۆی مـارە بـبڕێ، ئەوەنـدە هەیـە بێـوەژن مـافی زیـاتری هەیـە لەچۆنیەتی دەربڕینـی هەڵوێستیدا داخۆ ڕازییە، یان نا؟ لە کـچ، هـەر بۆیـەش بـۆ بێـوەژن وشـەی (تُسْـتأمَرُ) واتـە: ڕاوێـژی پێـدەکرێ، بـەکارهاتوە، بـەڵام بـۆ کـچ وشـەی: (تُسْتَأذَنُ) واتە: مۆڵەتی لێوەردەگیرێ، ئنجـا حیکمـەتی ئـەو جیاوازییـەش، وەك (ابن تيمية) گوتوویەتی، [2] هەر ئەوەیە کە کچ لەبەر ئەوەی ئەزموونی ژن‌و مێردایــەتی نیــە، زیــاتر شــەرم‌و شــکۆی هەیــەو بــۆ دەربڕینــی ڕەزامەندییەکەی قسەکردن(کلام)ی بەمەرج نەگیراوە، بەبێدەنگ بوون وازی لێهێنـراوە، بـەڵام چـونکە بێـوەژن ئـەو پێشـگیر(مـانِعْ)ەی نیـە قسـەکردن‌و

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري)، ج١٠، ص٢٤٦.

(٢) بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٣٢ ص ٢١.

دەربڕینی ڕاشکاوانەی خۆی بەمەرج گیراوەو، بۆی هەیە خۆی ئەمر [١] بەسەرپەرشتیارەکەی بکات بەشووی بدات! ئەگەر نا لەئەسڵی ڕازی بوونەکەدا، وە لەوەدا کەنابێ بەزۆر بەشوویدرێن، هیچ جیاوازییەکیان نیەو وەك یەکن. [٢]

**چوار:** جا هەرچەندە ئەو ئایەتو فەرمایشتانە بەس(کافي)ن، بەڵام زانایانی ئیسلام چەند بەڵگەیەکی دیکەشیان هێناونەوە، کەئێمەش ئاماژەیەکیان پێدەکەین: [٣]

١- یەکێکیان ئەوەیە کە باب بۆی نیە بەبێ ڕێگادانو مۆڵەتی کچەکەی، مادام عاقڵو شارەزا بێت- هەڵسو کەوت(تصرف) لەماڵو سامانەکەیدا بکات، دەجا بێگومان دامێن(بُضعْ)ەکەی زۆر لەماڵو سامانی بەلاوە گرنگترە! کەواتە: حەوجار حەوجار بۆی نیە بەبێ ئیزنو ڕەزامەندیی خۆی هیچ بڕیارێکی لەوبارەوە بۆ بدات.

٢- یەکی دیکەشیان ئەوەیە کەئاشکرایە گچکەیێتی(الصِّغَر) بەدەقی قورئانو بەکۆدەنگیی زانایانیش، هۆی نەهێشتن (حَجْر) خستنەسەر منداڵە، بەڵام پێچەوانەی بنەماکانی ئیسلام(أصول الأسلام)ە، کە کچێنیی(بکارة) بکرێتە مایەی (حَجْر) خستنەسەر ئافرەتو، بەو هۆیە ئازادی شووکردنی لێزەوت بکرێ، چونکە لەهیچ حاڵەتێك لەو حاڵەتانەدا، کە زانایان لەسەریان ڕێککەوتوون، کە یاسای (حَجْر)یان

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

(٣) بڕوانە: (مجموع الفتاوی) ج٣٢ ص ٢٠ تا ٢٣، وە بڕوانە: (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) د. عمر سليمان الأشقر، ص ١٤٢ تا ١٤٧، (المبحث الرابع: حكم إجبار الولي المرأة البالغة العاقلة على الزواج) .

تێدا بەکار بێنن، کچێنیی نەکراوەتە هۆکار.

٣- یەکی دیکەشیان — لەو بەڵگانە — ئەوەیە کەبەشوودانی کچ، لەحاڵێك دا کەپێی ناخۆشەو نارازییە، پێچەوانەی بنەمایەکانی ئاینو بنچینەکانی عەقڵیشە، چونکە خوا ڕێی بەسەرپەرشتیار(ولي)ی ئافرەت (واتە باب یان باپیر یان برا..) نەداوە کە لەکڕینو فرۆشتنو ئیجارەو چیو چیدا تۆبزی لێ بکات، هەروەها بۆی نیە بەزۆر جۆرێك خواردنو خواردنەوەی پێبخوات یان بەزۆر جۆرە بەرگو پۆشاکێکی لەبەر بکات[1] کەخۆی ئارەزووی لێی نیە! دەجا چۆن ڕێی دەدات کەتۆبزیی لێ بکات بۆ ژنو مێردایەتیو جووت بوون، لەگەڵ کەسێکدا کەچارەی ناویو پێی قایل نیە؟!!

٤- یەکی دیکەشیان ئەوەیە زانایان لەسەرئەوە ڕێککەوتوون کەسەرجەم ئەو مامەڵەوگرێبەست (عَقْد)انەی بەزۆر(بالإكراه) دەکرێن، بەتاڵن، وەك: کڕین، فرۆشتن، سەلەم، ئیجارە.. هتد، دەجا بێگومان مارەکردن(نکاح)یش یەکێکە لە (عَقْد)ە هەرە گەورەو، گرنگەکانو تۆبزیی تێداکردنی پێچەوانەی ئەو بنچینە گشتی(القاعدة العامة)یە کە زاناو پسپۆڕانی شەریعەت لەسەری یەکدەنگ بوون.[2]

٥- یەکی دیکەش لەو بەڵگانە ئەوەیە ،کە هەر کاتێك ژنو مێرد کێشەو ناکۆکییان کەوتە نێوان، شەریعەت دوو ڕێی داناون بۆ قوتاربوونو دەرباز بوونی ژن لەمێردێك کەپێی ڕازی نیە:

---

(١) مەبەست لێرەدا جۆرو ڕەنگی پۆشاکە، نەك شەرعیی بوونی، کەپێویستە هەر شەرعیی بێت.

(٢) بڕوانە: (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) ص ١٤٦.

**یەکەم:** کە لەلایەن هەر کام لەژن و مێردەوە حەکەمێك دیاری بکرێ و ئەو دوو حەکەمە هەر شتێکیان بەچاك زانی لەبارەی چارەنووسی ئەو خێزان و ژن و مێردەوە، بڕیاری لەسەر دەدەن و بڕیارەکەشیان بۆ هەردووکیان پابەندکەر(مُلْزِمْ)ە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ ﴾ (النساء:من الآية٣٥).

**دووەم:** کەئافرەتەکە مێردەکەی لەیەخەی خۆی دابڕنێ، کە لەشەرع دا پێی دەگوترێ: (الخُلْعْ)، وە هەرکات مێرد ڕازی نەبوو، ژنەکە بۆی هەیە سکاڵای خۆی بەرێتە لای دادوەر(قاضـي) و ئەویش کێشەکەی بۆ چارەسەر دەکات.

**جا دەڵێین:**

ئەگەر ژنی خاوەن مێرد، مادام بەمێردەکەی ڕازی نەبێ و لەگەڵ یەك نەگونجێن، شەریعەت ڕێی دابێ خۆی لە چەنگ قوتار بکات، دیارە حەوجار حەوجار ڕێگاشی دەدات کە هەر لەسەرەتاوە خۆی بەداوییەوە گرفتار نەکات! چونکە بێگومان پارێز لەچارەسەر چاکترو کەم مەسرەف ترەو سەربارەش: (دِرْهَمُ وقايةٍ خيرٌ من قِنطار عِلاجٍ)، چونکە هەمیشە چارەسەر دەکەوێتە پاش باج دان و زیان لێکەوتن.

### * هەموو بێدەنگییەك جێی ئیعتبار نیە

پێویستە ئەوەش بزانرێ کەتەنها کاتێك بێدەنگ بوونی کیژ دەکرێتە بەڵگەو نیشانەی ڕازی بوونی، کە بێدەنگییەکەی هەڵقوڵاوی ئیرادەی ئازادی خۆی بێت و هیچ ترس و هەڕەشەو فشارێکی لەسەر نەبێ، ئەگەرنا بێدەنگیی لەترسان و بێدەنگیی پاش لێدران و ئازاردران هیچ ئیعتبارێکی شەرعیی نیە! چونکە کچەکە

لەو حاڵەتەدا زۆر لێکراو(مُکْرَهْ)ەو حاڵەتی ناوبراویش یەکێکە لەو حاڵەتانەی کەهیچ حوکمێکی شەرعیی لەسەر بنیات نانرێ: ((**رفع اللهُ عن أُمَّتي الخطأ والنّسْيانَ وماأُستُكرِهوا عليه**)) رواه ابن ماجه وابن أبي عاصم، وصححه ابن حبان وأخرجه الطبراني والدارقطني والحاكم بلفظ: (تجاوز) بَدَلَ (رفع)، واتە: خوا هەڵەو لەبیرچوونو ئەوەی بەزۆر پێیان کرابێ لەسەر ئۆممەتی لابردوە.[1]

ئێستاش کەزانیمان ئەو مەسەلەیە حوکمی چۆنە لەدەقەکانی قورئانو سوننەت دا، با سەرنجێکی ڕاجیایی زانایانیش بدەین، هەرچەندە پاش فەرمایشتی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کەس بوارو دەرفەتی قسەو ڕادەربڕینی نامێنێ، مەگەر لەبەر ڕۆشنایی فەرمایشتی بەرزو پیرۆزی ئەوان دا:

١- جاریٚ تێکڕای زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەئافرەتی بێوەژن(ثیب) نەبابیو نەهیچ کەس لەسەرپەرشتیارانی بۆیان نیە، بەبێ ڕەزامەندیی خۆی بەشووی بدەن، تەنها (الحسن البصري) ڕایەکی ڕیزپەڕ(شاذ)ی هەیە کەبابی بۆی هەیە، بەڵام خاوەنی (المغني)[2] لە (ابن إسحاق)ەوە هێناویەتی کە گوتوویەتی: ((لا أعلم أحداً قال في البنتِ بقول الحسن وهو قولٌ شاذٌ خالَفَ فيه أهل العلم والسنة..)، هەروەها (ابن تيمية)ش هەمان قسەی کردوە لەوبارەوە.[3]

٢- بۆ کچۆڵەی گچکە، واتە کەباڵغ نەبووبێ، ئەوە بەپێچەوانەوە تێکڕای زانایان یەکدەنگن، کە باب بۆی هەیە، مادام پیاوەکە هاوکوف (كُفؤ) بێت،

---

(١) بڕوانە: (كشف الخَفا ومزيلُ الالباس عما اشتهر من الاحاديث على أَلْسِنَةِ الناس) للعَجْلوني ج١ص٥٢٢.
(٢) بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٧ص٣٨٥.
(٣) بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٣٢ ص٢٣.

مارەی ببڕێ، هەرچەندە نارازیش بێت، خاوەنی: (المغني)[1] لە (إبن المُنذر)ەوە هێناویەتی کەگوتوویەتی: (أجْمَعَ كلّ مَنْ نَحْفَظُ عنه مِنْ أهْل العِلْمِ أنَّ نِكاحَ الأب إبنتَهُ البِكْرَ الصغيرة جائزٌ إذا زوجَها مِنْ كُفْؤٍ) واتە: تێکرای ئەوانەی، کە لەئەهلی زانست قسەیانمان پێگەیشتوە، لەسەرئەوە یەکدەنگن، کەباب بۆی هەیە کچی گچکەی خۆی لەپیاوی شایستەو هاوکوف مارە ببڕێ)[2].

٣-بەڵام ئەوەی زۆربەی مشتومڕی زانایانی لەسەرە بریتییە لەکچی باڵغ(البنت الكبيرة) کە ئایا سەرپەرشتیار(ولي) بۆی هەیە بەبێ ڕەزامەندیی خۆی بەشووی بدات یان نا؟

بەشێکیان کە (مالك و شافعي و إسحاق و ابن أبي ليلى) و (احمد) لەیەکێك لەدوو قسەکەی دا، سەرقافڵەیانن، ڕایان وایە کەباب بۆی هەیە کچی باڵغی خۆی بێئەوەی ڕای لێبێ‌و ڕازی بێ، بەشووی بدات![3] بەشێکیشیان کەزۆربەی هەرە زۆری زانایانن‌و (الأوزاعي والثوري و أبو عبيد و أبو ثور و أصحاب الرأي و ابن المنذر[4] و داود[5] الظاهري و ابن حزم[6] الاندلسي و الصنعاني[7] و ابن تيمية[8]

---

(١) بڕوانە: (المغني) ج٧ص٣٧٩.

(٢) بەڵام ئەویش کە باڵغ بوو بۆی هەیە داوای هەڵوەشاندنەوەی بکات مادام ڕازی نەبێ، وەك لەبەشی حەوتەم- بەرگی دووەم داهێناومانە.

(٣) بڕوانە: (المغني لأبن قدامة) ج٧ص ٣٨٠.

(٤) هەمان سەرچاوە بەرگو لاپەڕە، وە بڕوانە: (المجموع) للنووي، ج١٧ص ٣٢٨.

(٥) بڕوانە: (المجموع) ج١٧ص٣٢٩.

(٦) بڕوانە: (المحلي شرح المجلى) ج١١ص٢٠، مسألە: ١٨٢٦.

(٧) بڕوانە: (سُبُل السّلام) ج٣ص١٦٢.

(٨) بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٣٢ص٢٣.

والشوكاني[١])یان لەنێودانو، ڕای هەرکام لە مەزەبی (الزيدية[٢]) و مەزەبی (الجعفرية[٣])یەو (بخاري[٤])یش هەڵی بژاردوە، دەڵێن: باوو غەیری ویش هیچ کەس بۆی نیە بەتۆبزیی کچی باڵغ مارەببڕێو، هەرکاتێکیش بەزۆر بەشوویدا، مەگەر کچەکە دوایی خۆی بەئازادیی خۆی قەناعەت بکات، ئەگەرنا مارەکردنە کەی دانامەزرێو بەهەڵوەشاوە(مفسوخ) دادەنرێ.[٥]

دیارە هەر ئەم ڕایەی دووەمیش ڕاستە و، چونکە پێشتریش بەڵگەکانیم هێناونەوە لێرەدا دووبارەیان ناکەمەوە.

**کەواتە:**

پاش ئەم برە توێژینەوەیە، ڕوون بۆوە کەئەو تۆمەتەی بەناهەق پاڵ دراوەتە لای شەریعەت کەگوایە ئازادیی شووکردنو هاوسەرگرتنی لەئافرەت زەوت کردوەو، ڕێگای داوە کەبەزۆر مارە ببڕێ! ڕاست نیەو هەرچەندە هەندێك لە زانایانیش ڕایەکی وایان هەیە، بەڵام وەك پێشتریش گوتمان، مادام دەقەکانی قورئانو سوننەتو، حوکمی عەقڵو فیترەتیش ئەو ڕایە ڕەد دەکەنەوە، پێویستە بەهەڵە دابنرێو بەبۆچوون(إجتهاد)ێك دابنرێ کەنەپێکاوەو، ئاشکراشە کە بیروبۆچوونی زانایان بەتایبەت پاش دەرکەوتنی هەڵەییو ناتەواوییەکەی، دروست نیە لەسەر شەریعەت حیساب بکرێ، بەتایبەتیش کە ئەو ڕایە پێچەوانەی چەندان دەقی ڕوونو ڕاشکاوی قورئانو سوننەتە، کەپێشتر هێنامانەوە.

---

(١) بڕوانە: (نيل الأوطار) للشوكاني، ج٦ص١٢٣.
(٢) بڕوانە:(الروض النضير شرح مجموع الفقه الكبير) ج٤ص٢٢٨،٢٢٦، وە:(المفصل)ج٦ ص٤٤٧.
(٣) (شرائع الاسلام) ج٢ص٢٧٦، ٢٧٧، وە : (المفصل) ج٦ص ٤٤٧، ٤٤٨.
(٤) بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج١٠ ص ٢٤٤، (باب: إذا زوج الرجل ابْنَتَهُ وهي كارِهَة فنِكاحُهُ مَرْدودٌ) .
(٥) بڕوانە: (المفصل) ج٦ص ٤٥١، وە سەرجەم ئەو سەرچاوانەی کەپێشتر ئاماژەیان بۆ کراوە.

## ٢-مەسەلەی مارەیی (المهر):

مەسەلەی مارەیی(المَهْر، الصَّداق)یش یەکی دیکەیە لەو شتانەی کەژمارەیەك لەناحەزانی شەریعەت پێیان وایە، بەلگەیەکی زۆر بەهێزیانە بۆ سەلماندنی ئەوە کەئیسلام بەچاوی سووك بۆ ئافرەت دەڕوانێ، چونکە پێیان وایە مارەیی بریتییە لەنرخ و بەها (قیمة)یەك ،کە ئافرەتی پێ دەفرۆشرێ، جا چ کەم بێ چ زۆر!!

بەلاَم بێگومان بەسەرنج دانی دەقەکانی شەریعەت ڕوون دەبێتەوە، کە ئەو ئەنجامگیریی (إستنتاج)یە ،جگە لەوەهمو خەیاڵێکی پووچ و بەتاڵ چی دیکە نیەو، بەپێچەوانەوە مارەیی دیاریی و خەلاَتێکی پێویستە کەلەلایەن مێردەوە بەژن دەدرێ و، نیشانەو بەلگەی داخواز(طالِبْ) بوون و ئارەزوومەند(راغِبْ) بوونی کابرایە بۆ ئافرەتەکە،وە بێجگە لەئافرەتەکە، هیچ کەسێکی دیکە کەم و زۆر هەق و پەیوەندیی بەمارەیی یەوە نیە.

پێشتریش ڕوونمان کردۆتەوە کەوەك چۆن لە مەسەلەی ژن و مێردایەتییدا، فیترەتی پیاو وایە کەحەز دەکات دەست پێشخەر(مُبادِرْ) و داواکار(مُطالِبْ) بێت، بەپێچەوانەوە، ئافرەت حەز دەکات داخوازکراو(مطلوب) و ویستراو(مراد) بێت، واتە: پیاو دەیەوێ (عاشق) بێت و ئافرەت پێی خۆشە (مَعْشوق) بێت، ئەمەش چونکە هەلْقولاَوی سروشت و کەسایەتیی هەردووکیانە (مصداق)ەکەی لەو هەموو حیکایەت و بەسەرهاتانەی خۆشەویستی نێوان پیاوو ئافرەتدا دەبینین، کەهەمیشە پیاوان عاشق و ئافرەتان مەعشووق بوون، لەشیعری شاعیرانیشدا هەمیشە پیاو پەپوولەو ئافرەتیش مۆم و چرا بوونە!

لەڕاستیدا هەر کاتێك ئافرەت هەست بکات کەهیچ کەس نیە خۆشی بوێ و بۆی

شەیداو عەودالْ بێت، هەست بەجۆرێك لەكەموكوورِیی‌و نائومێدیی دەكات[1]، بەپێچەوانەی پیاوەوە كە مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا ئەوجۆرە هەست‌و نەست‌و چاوەڕوانی(تَوَقُّعْ)یەی نیە!

ئێستاش با لەبەر تیشكی چەند ئایەت‌و فەرمایشتێكدا مەسەلەی مارەیی لەشەریعەتدا چۆنە ئاوا بیخەمەڕوو، چونكە وەك پێشتریش ئاماژەم بۆ كردوە زۆربەی ئەو مەسەلانەی كەنەیارو ناحەزانی شەریعەت وەك تیری تۆمەتێك ئاڕاستەی ئیسلامیان كردوون، بەهۆی ئەوەوە گیرۆدەی ئەو هەڵوێستەیان بوونە، كەڕەفتارو هەڵس‌وكەوتی هەڵەو ناتەواوی مسوڵمانانیان لەسەر شەریعەت حیساب كردوەو، لەجیاتی ئەوەی لەئاوێنەی ڕوون‌و بێگەردی قورئان‌و سوننەتدا سەرنجی ئەو مەسەلانە بدەن، ئنجا حوكم‌و بڕیاری خۆیانیان لەبارەوە بدەن، هەڵساون لەئاوێنەی شكاوو بەگەردو غوبار داپۆشراوی ئەو ڕەفتارو مومارەسە هەڵەو ناشەرعییانەدا لێیان ڕوانیون‌و، پاشانیش كەدیمەنێكی دزێوو نابەرچاویان هاتۆتە بەر نیگا خەتای شەریعەتیان گرتوە!

---

(١) پێشتریش باسمانكرد كەشتێكی شەرعییە ئافرەتی مسوڵمان لەسنووری شەرع‌و ئەدەبەكانیدا خۆی بۆ پیاو پێشنیار بكات، بەڵام پێویستە ئەو پیاوە پیاوێكی چاك‌و شایستەو نەجیب بێت، (بخاري) یش لەژێر ناونیشانی: (باب عرض المرأة نفسها على الرجل الصالح) دا دوو فەرموودەی هێناون، كەئەمە یەكیانە:
(عن أنس قال: جاءَ تْ إمرأةٌ الى رسول الله ﷺ تعرِض عليه نَفْسَها، قالَتْ: يا رسول الله ألَك بي حاجة؟ فقالت بِنْتُ أنس: ماأقَلَّ حياءها وا أسَوأتاهُ! قال (أنَسٌ) هي خيرٌ مِنكِ، رَغِبَتْ في النبي ﷺ فَعَرضَتْ عليه نَفْسَها.) فتح الباري ج١٠ص٢١٨.
واتە: ژنێك هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ خۆی بۆ پێشنیار كرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! پێویستیت پێم هەیە؟ كچەكەی ئەنەسیش گوتی: چەند كەم شەرم بووە، ئەی عەیب‌و شوورەیی بۆ خۆم! ئەنەسیش گوتی: ئەو لەتۆ باشتر بوو، ئارەزووی پێغەمبەر كردو خۆی پێشكەش كرد.

ئنجا با سەرەتا چەند ئایەتو فەرمایشتێك کەباسی مارەیی ئافرەت دەکەن بخەینەڕوو، پاشان لەبەر تیشکی ئەو ئایەتو فەرمایشتانەداو، لەچەند بڕگەیەکی کورتدا باسی: پێناسەو حوکمو حیکمەتو چۆنیەتیو چەندێتیو جۆرەکانی مارەیی، دەکەین:

١-خوای پەروەردگار فەرمووییەتی: ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗ ﴾ (النساء:الآية٤)

واتە: وە بەدڵخۆشییەوە مارەیی یەکان بدەنە ئافرەتان.

٢- هەروەها فەرموویەتی:﴿ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗ ﴾(النساء:الآية٢٤)

واتە: جا لەپای ئەو لەززەتەی کە لەژنەکانتانی دەبینن، پێویستە کرێیەکانیان بدەنێ﴾.

٣- وە فەرموویەتی: ﴿ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم ﴾(النساء: من الآية٢٤)

واتە: وە بێجگە لەوانە کەرابردن (لەئافرەتانی نەشیاو) ئەوانی دیکەتان بۆ حەڵاڵن، کە بەماڵو سامانتان هەوڵی هێنانیان بدەن..

٤- وە فەرموویەتی﴿ وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ﴾(النساء: الآية٢٥).

واتە: وە هەر کامێکتان لەڕووی دارایی یەوە بۆی نەلوا کەئافرەتانی پاك ڕاگیراوی بڕوادار بهێنێ، ئەوەبا لەو کچە بڕوادارانەتان بێنێ کە کەنیزەکن و

بەدەستی ڕاست تانەوەن.

٥- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا ﴾(النساء: من الآية٢٠).

واتە: ئەگەر ویستتان ژنێك (تەلاق بدەن) بەژنێكی دیكە بیگۆڕن، وە قینتارێك[1] مارەییتان بەیەكێكیان دابوو، ئەوە نابێ هیچی لێوەربگرنەوە.

٦- وە فەرموویەتی: ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٦)

واتە: ئەگەر ئافرەتتان تەلاقدان بەرلەوەی دەستیان بگەیەننێ، یان مارەییان بۆ دابنێن گوناحتان ناگاتێ، بەڵام دیارییان بدەنێ، هەبوو بەئەندازەی خۆیو نەداریش لەقەدەر خۆی.

٧- پێغەمبەری خواش ﷺ بەپیاوێكی فەرمووە:[2] ((**تَزَوَّجْ وَلَوْ بِخَاتَمٍ مِنْ حَدِيدٍ**)) رواه البخاري عن سهل بن سعدﷺ. واتە: (ژنێ بێنە، ئەگەر بە (مارەیی) ئەنگوستیلەیەكی ئاسنیش بێت).

٨- هەروەها (بخاري) بەسەرهاتی ئەو ئافرەتەی گێڕاوەتەوە كە هاتۆتە

---

(١) وشەی (قنطار) چەند مانایەكی هەن، یەكیان كە لە (ابو سعيد الخدري) گێڕدراوەتەوە ئەوەیە كەقنطار پڕی پێستی گایەك زێڕە (ملء مَسْك ثَوْرٍ ذَهَباً)، (مجاهد) یش گوتوویەتی: برتییە لە (٧٠٠٠٠) مسقاڵ زێڕ، بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٦ص٦٨١.
(٢) بڕوانە: (فتح الباري) ج١٠، ص٢٧١.

کۆڕ(مجلس)ێـك، کـە پێغەمبـەری خـوای ﷺ تێـدا بـووەو، خـۆی پێشـکەش پێغەمبـەر کـردوەو، ئـەویش بێـدەنگ بـووەو دوای جـاری سـێیەم پیاوێـك هەڵساوەو گوتوویەتی: ((**يَا رَسُولَ اللّٰهِ أنكِحْنِيهَا**)) واتە: ئـەی پێغەمبـەری خوا! لێمی مارە بکە)) ئەویش پێی فەرموە: ((**هَل عِنْدَكَ مِنْ شَيءٍ**)) واتە: ئایا هیچ شتێکت هەیە؟ ئەویش گوتوویـەتی: نـەء، ئـەویش پێـی فـەرموە: ((**اذْهَبْ فَاطْلُبْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ**)) واتە: بڕۆ ئەگـەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت پەیدای بکە! ئنجا کـابرا چـوەو هاتۆتـەوەو گوتوویـەتی: هـیچ شـتێکم چـنگ نەکـەوت، تەنانـەت ئەنگوسـتیلەیەکی ئاسـنیش! ئـەویش فـەرمووی: ((**هَـلْ مَعَـكَ مِـنْ الْقُـرآنِ شَـيءٌ**؟!)) واتـە: ئایـا هـیچ شـتێکت لەقورئان لەبەرە؟! گوتی: سوورەتی فـلانو سـوورەتی فـلانم لەبـەرە، ئـەویش پێی فەرموو: ((**إِذْهَبْ فَقَدْ أنْكَحْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِـنْ الْقُرآنِ**)) واتـە: دەبـڕۆ ئەوە لەسەر ئەو قورئانەی کەلەبەرتە لێم مارەبڕی)). واتە: ئەو سـوورەتانەی لەبەرتن فێری بکە.[1]

٩- هـەروەها (الترمـذي) گێڕاویەتـەوە[2] کـە ئافرەتێـك لـەتیرەی (بـني فـزارة) لەسەر جووتە نـەعلێك مـارەبڕابوو، پێغەمبـەری خـواش ﷺ پێـی فـەرموو: ((**أرَضِيتِ مِنْ نَفْسِكِ وَمَالِكِ بِنَعْلَيْنِ؟!**)) واتە: ئایا بۆ نەفسو ماڵی خـۆت بەجووتە نەعلێك قایل بووی؟ئەویش گوتوویەتی: بەڵێ، وەپێغەمبەریش ﷺ ڕێی داوە.

جا ئێستا لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم دەقانـەی قورئـانو سـوننەتدا بـابزانین: مـارەیی چییەو، حیکمەتی چییەو، حوکمی چۆنەو، چۆنیەتیو ئەندازەو، جۆرەکانی چین؟!

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج١٠، ص٢٥٧.
(٢) بڕوانە: (المفصل) ج٧ص٦٣.

## یەك: پێناسەی مارەیی:

زانایان بەچەند جۆرێك پێناسەی مارەیی یان کردوە کەوەك یەك، یان زۆر لەیەك نیزیکن‌و، ئەمەیان کۆکەرەوە(جامِعْ) ترینیانە:

((مارەیی (مَهْر) ئەو برە ماڵەیە کە بۆ ژن لەسەر مێردی پێویست دەبێ، جا چ لەکاتی مارەکردن(عقد)یدا ئەندازەکەی دیاریی بکرێ، چ نەکرێ)).

شایانی باسیشە کە لە قورئانێدا ئەم ناوانە بۆ مارەیی ئافرەت بەکارهێنراون:

أ-(صَدُقات) کەکۆی (صَدُقة)یەو، کۆی (صَداق)یش (أصْدُقة)یە، بۆیەش مارەیی بەو ناوە ناونراوە، تاکو ئەوە بگەیەنێ کەبابای بەخشەر(باذِلْ)ی، بەڕاستیی ئارەزوومەندی ئەو ژن خواستنەیە.

ب- (نِحلة) کەبەمانای دیاری (هدیة) و بەخشین (هِبة) دێ، ئەوەندە هەیە مارەیی دیاریی‌و خەڵاتێکی پێویستە.

ج- (فریضة) کەبەمانای شتی پێویستکراو دێت.

د-(أجُور) کەکۆی (أجْر)ەو ئەویش بەمانای کرێ‌و پاداشت دێ.

هـ – (طَوْل) کە مەبەست پێی ماڵ‌و سامان‌و دەست ڕۆیشتوویی یە.

## دوو: حوکمی مارەیی:

زانایان لەسەر پێویست بوونی مارەیی بۆ ئافرەت یەکدەنگن، چونکە سەرجەم دەقەکان هەر ئەوە دەگەیەنن‌و (ابن عبدالبَّر) لەوبارەوە گوتوویەتی: (اأجمَع علماءُ المسلمين أنَّهُ لايجوز لَهُ وَطْءٌ في نِكاحٍ بغير صداقٍ مُسَمىً دَيْناً أو نَقْداً) واتە: زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن ،کە دروست نیە پیاو بەناوی نیکاحەوە بچێتە لای ژنەکەی هەتا مارەیی بۆ بڕیار نەدرێ، جا چ قەرز بێت چ حازر.)[1]

---

(١) بڕوانە: (أحكام الزَّواج في ضوء الكتاب والسنة) د. عمر سليمان الأشقر، ص٢٥٥.

## سێ: حیكمەتی مارەیی:

حیكمەتی پێویست بوونی مارەیی(مَهر)یش بۆ ئافرەت، تەنها ڕوونكردنەوەی ئەو حەقیقەتەیە كە ئەو مارەكردن(عقد)ە، شتێكی گەورەیەو بەڵێنێكی گرنگە، ئەگەر نا مارەیی وەك نرخ بۆ فرۆشراو(كالثَّمن للمَبیع)و وەك كرێ بۆ كرێ گرتە(كالأجر للمأجور) نیە، چونكە ئەگەر وا بوایە دەبوو حەتمەن چۆنیەتیی و ئەندازەكەی پێش مارەبڕینەكە خراپانایە، وە دەبوایە نیكاح بەبێ ناوبردنی مارەیی دانەمەزرابایە![1] كە بێگومان وانیە و ناونەهێنانی مارەیی لەكاتی مارەبڕیندا زیانی نیە، بەڵام دوایی مارەیی هاوویێنە(مَهْر المِثْل) لەسەر پیاوەكە فەرز دەبێت.[2] هەر بۆیەش زانایان ناوبردنو دیاریكردنی مارەیی(مَهْر)یان لەكاتی مارەكردندا تەنها بەسوننەت داناوە.[3]

## چوار: چ شتێك بە مارەیی دەشێ؟!

هەرچەندە زانایان لەبارەی دیاریكردنی (تحدید)ی ماهیەتی مارەییەوە تا ڕاددەیەك یەكدەنگن و دەڵێن: (كلُّ ماكان مالاً جاز أن یكون صداقاً)[4] واتە: هەر

---

(١) بڕوانە: (المفصل) ج٧، ص٥٢، كە لە: (الهدایة وفتح القدیر والعنایة) ج٢، ص٤٣٢، ٤٣٥، وەری گرتوە

(٢) بەڵگەشی قسەی (ابن مسعود) ە: (لَها مِثْلُ صَداقِ نِسائها لاوكْسَ ولا شَطَطَ..) كە دوایی (معقل بن سنان الأشجعي) شایەتیی بۆ (أبن مسعود) دا كە پێغەمبەریشﷺ بەهەمان شێوە لەبارەی (بَرْوَعْ بنتِ واشق)ەوە حوكمی كردوە، وەك (أبوداود و ترمذي) گێڕاویانەتەوە، بڕوانە. (المفصل) ج٧، ص١١٤.

(٣) بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٦، ص٦٨٠، وە: (نهایة المحتاج) للرَّملي، ج٦، ص٣٢٨.

(٤) بڕوانە: (أحكام الزواج في ضوء القرآن والسنة) ص٢٥٧، وە بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٦، ص٦٨٢

شتێك ماڵو سامان بێت دەگونجێ بكرێتە مارەیی، بەڵام لەو بارەوە، كە ئایا سوودو كەڵك(منفعة) وەك: نیشتەجێكردنی لە خانوودا، یان دەرس پێگوتن، یان ئیش بۆ كردن... هتد، دەگونجێ بكرێتە مارەیی؟ ڕاجیاییان هەیەو زۆربەی زانایان[1] كە شافیعییەكانو حەنبەلییەكانو ظاهیرییەكانو زەیدییەكانو جەعفەرییەكانیان لەنێودان، دەڵێن: بەڵێو، هەندێكیشیان دەڵێن: نەخێر، بەڵام بێگومان ڕای زۆربەیان ڕاستەو ئایەتو فەرموودەكانیش بەڵگەن.

## پێنج: ئەندازەی مارەیی:

لەو بارەشەوە هەرچەندە دەقەكانی قورئانو سوننەت ڕێی مشتو مڕو ڕاجیاییان نەهێشتۆتەوە، كە هەر ئەندازەیەك بگونجێ پێی بگوترێ ماڵو ژنو مێرد لەسەری پێك بێن دروستە بكرێتە مارەیی، تەنانەت ئەگەر جووتە پێڵاوێك یان چەنگە خواردنێكیش بێت![2] بەڵام دیسان هەندێك لە زانایان لەوەشدا مشتو مڕێكیان دروستكردووەو گوتوویانە: بەڵێ بۆ لای زۆری مارەیی هیچ بواری ڕاجیایی تێدا نیەو هەرچەندە زۆر بێت هەر دروستە، بەڵام بۆ لای كەمییەكەی پێویستە سنوور(حَدّ)ێك دابنرێ! كەچی دواییش لەسەر ئەو سنوورو ئەندازەیە پێك نەهاتوون، وە لە ڕاستییدا وەك چۆن بۆ لای زۆری مارەیی هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نیە ، بۆ لای كەمییەكەیشی هەروایە، وەك پێشتر لەدەقەكانی قورئانو سوننەتدا دەركەوت.[3]

(١) بڕوانە: (المفصَّل) ج٧، ص٥٤.

(٢) چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لَوْ أنَّ رَجلاً أعطى امرأةً صِداقاً مِلأَ يديه طعاماً كانتْ له حلالاً) رواه أحمد وأبوداود، بڕوانە: (المفصل) ج٧، ص٦٣.

(٣) بڕوانە: (المفصّل في أحكام المرأة والأسرة) د.عبدالكريم زيدان، ج٧، ص٦٢، هەروەها بڕوانە: (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) ص٢٦٠، (ابن حجر) یش لەو بارەوە گوتوویەتی:(وقد وردت أحاديث في أقلِّ الصَّداق، لايثبت فيها شيء) فتح الباري ج٩،ص٢١٦.

## شەش: جۆرەکانی مارەیی:

مارەیی چەند جۆرێکی هەیە، بەم شێوەیەی خوارێ:

١و ٢: مارەیی ناوبراو (المَهْرُ المُسمَّى) و، مارەیی هاوویْنە (مَهْر المِثْل)، یەکەمیان بریتییە لەوەی کە لەکاتی مارەکردن(عَقْد)ەکەدا باس کرابێ‌و بڕیاری لەسەر درابێ، کەبێگومان سوننەت وایەو دووربینیی(إحتیاط)یش بۆ دروست نەبوونی کێشە لەداهاتوودا هەر لەوەدایە، وەك خاوەنی (کفایة الأخیار) گوتوویەتی: (المُستحبُّ أن لایُعْقَدَ عَقْدُ النكاح الا بصَداقٍ إقتداءً برسول الله ﷺ فإنه لَمْ يَعْقِدْ إلا بِمُسمىً، ولأنَّهُ أدْفَعُ للخُصومةِ).[1]

مارەیی هاوویْنەش ئەوەیە کەلەدەمی مارەکردندا باسی نەکرابێت‌و دوایی بەپێی مارەیی(مَهْر) هاوویْنەکانی ئەو ژنە لەخزمە نیزیکەکانی، بۆی دیاریدەکرێت، بەڵگەی ئەو جۆرە مارەییەش وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ‌کردوە، ئەو قسەیەی (عبدالله بن مسعود)ە خوا لێی ڕازی بێ، کەپرسیاری لەبارەی ژنێکەوە لێکرا، کە مێردەکەی بەر لەوەی بچێتە لای، مردوەو لەکاتی مارەبڕینیشدا مارەیی بۆ دیاریی نەکراوە؟ ئەویش بەبۆچوونی خۆی (إجتهاد)ی کرد گوتی: (لَها مِثْلُ صَداقِ نسائها لاوكْسَ ولا شَطَطَ...) واتە: هاو وێنەی مارەیی ئافرەتە خزمەکانی بۆ هەیە، نەکەمترو نەزیاتر..)، ئنجا (مَعْقِل بن سنان الأشجعي)یش خوا لێی ڕازی بێ هەڵساو شایەدیی بۆ داو گوتی: پێغەمبەری خواش ﷺ بەهەمان شێوەی بڕیاری تۆ بڕیاری بۆ (بَرْوَع بنت واشق) داوە.[2]

(١) بڕوانە: (كفاية الأخيار) ی (أبوبكر بن محمد الحسيني) ج٢ص١١١.

(٢) ئەو فەرموودەیە (أبوداود و الترمذي) و غەیری ئەوانیش گێڕاویانەتەوە.

٣و٤: مارەیی پێشخراو(المهْر المُعجَّل) و، مارەیی دواخراو(المَهْـر المؤجَّـلْ)، دیـارە مەبەست لەیەکەمیان ئەوەیە، کە پـێش گوێزرانـەوەی ژن لەلایـەن مێـردەوە تەسـلیمی دەکـرێ‌و، دووەمیشـیان ئـەوجۆرە مارەییەیـە ،کـەدوا دەخـرێ‌و، بەشێوەی قەرز لەلای مێرد دەبێ.

جا هەم دواخسـتن‌و پێشخسـتنی مارەییەکـە هـەمووی‌و، هـەم پێشخسـتنی بەشێکی‌و دواخستنی بەشێکی دیکەی، دروستن، بەڵام پەسـەندو چاك وایـە کەپێش بخرێ، چونکە وەك (ابـن تیمیـة) گوتوویـەتی: (وكـانوا (أيِ السَّـلف) يُعَجِّلون الصَّداق كُلَّه قَبْلَ الدُّخول، لَـمْ يَكونـوا يُـؤخِّرونَ مِنـه شَـيئاً..) واتـە: پێشینەکانمان عـادەتیـان وابـوو مارەییـیـان بەتـەواویی پـێش چـوونە لای ژن، دەداو هیچیان لـێ دوا نەدەخست..[1]

٥: جۆرە مـارەییەکی دیکە ئەوەیە کەژن تەنها نیوەی مارەییەکەی دەدرێتـێ‌و ئەمـەش هـەموو زانایـان لەسـەری یەکـدەنگن، ئـەویش بریتییـە لـەوەی کەمێردەکەی ئەو ئافرەتەی لێی مارەکراوە، پـێش گواسـتنەوەی‌و چـوونەلای تەڵاقی بدات، وەك خوای بـەرز فەرموویـەتی: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ﴾(البقرة: من الآية٢٣٧).

بەڵێ ئەمانەش جۆرەکانی مارەیین، ئەمجار دوو مەسـەلە مـاون پێویسـتە سـەرو ئاماژەیان پێبکەین:

(١) بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٣٢ ص١٢٢، ١٢٣.



**یەکەم:** لەدوو حاڵاندا ژن تەواوی مارەییەکەی بۆ پێویست دەبێ:

أ- هەر کاتێك مێردەکەی چووە لای و گواستیەوە، وە ئەمە زانایان لەسەری یەکدەنگن، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾﴾ (النساء:٢٠-٢١).

بەڵام زانایان لەوبارەوە کەئایا خەڵوە(خلوة)ی پیاویش لەگەڵ ژنەکەی بێئەوەی بچێتە لای، هەمان حوکمی چوونەلای هەیە، لەپێویست بوونی تەواویی مارەییدا یان نا؟! ڕاجیایی(إختلاف)یان هەیەو، هەرچی حەنەفییەکان و حەنبەلییەکانن دەڵێن: بەڵێ، بەڵام (مالك) و (شافعي) لەقسەی تازەیداو (داود) دەڵێن نەخێر.[1]

بەڵام بێگومان ڕای یەکەم ڕاستەو، هەم ڕستەی: ﴿وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ﴾ (النساء: ٢١)

واتە: لەحاڵێکدا کەهەندێکتان لەشوێنی چۆڵ لەگەڵ هەندێکتان بوو ون.

بەڵگەیە لەسەری و هەم یەکدەنگیی(إجماع)ی هاوەڵانیش،[2] سەرباری ئەوەش ئەو ڕایە ڕای جەماوەری زانایانە، چونکە وێڕای حەنەفییەکان و حەنبەلییەکان، هەرکام لە (أوزاعي) و (إسحاق) و (زیدیة)ش هەمان

---

(١) بڕوانە: (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) ص ٢٦٤.

(٢) بڕوانە: (أحكام الزواج..) ص٢٦٤.

ڕایان هەیە[١] و (ابن تیمیة)ش هەر ئەو ڕایەی هەیە.[٢]

ب- هەر کاتێك بەر لە چوونەلای(قبل الدخول) یەکێك لەژنو مێردەکە مرد، جا هەرچەندە لەمەشدا زانایان مشتومڕو ڕاجیاییان هەیەو (مالك) و (شافعی)یش لەقسەیەکیدا گوتوویانە: هیچی ناکەوێ، بەڵام لەڕاستیدا ئەم مەسەلەیە هیچ مشتومڕ هەڵناگرێ، چونکە ئەو فەرموودەیەی کەپێشتریش هێنامانەوە: کەپیاوێك مردوەو ژنێکی لەپاش بەجێماوە کەمارەیی بۆ دیاری نەکردوەو نەچۆتە لایشیو (ابن مسعود)یش گوتوویەتی: (لَها مثل صَداق نسائِها..).. پاشان (معقل بن سنان الأشجعي)یش شایەتیی داوە ،کە پێغەمبەریش ﷺ لەبارەی (بَرْوع بنت واشق) هەمان بڕیاریداوە... بەڵێ ئەم فەرموودەیە قسە بۆ هیچکەس ناهێڵێتەوەو ئەو زاناو پێشەوایانەش کە ڕایەکی پێچەوانەی فەرمایشتەکەیان هەبووە، بەتەئکید ئەو فەرموودەیەیان لەڕێی ڕاست(طریق صحیح)ەوە پێنەگەیشتوە، هەر بۆیەش لە (شافعي)یەوە گێڕراوەتەوە کەگوتوویەتی: (ان کان یثبت (أي حدیث بَروَعْ) فلا حُجة في قول أحدٍ دون النبيﷺ).[٣] واتە: ئەگەر(لە ڕووی سەنەدەوە فەرموودەکەی بەڕوەع) چەسپاوبێ ئەوە لە گەڵ فەرمایشتی پێغەمبەردا صلی الله علیه و سلم هیچکەس قسەی بەڵگە نیە.هەروەها (ترمذي) گوتوویەتی: (وروي عن الشافعي أنه رجع بمصر بَعْدُ عن هذا القول، وقال

(١) بڕوانە: (المفصل...) ج٧ص٩١.
(٢) بڕوانە: (مجموع الفتاوی) ج٣٢ص١٢٤.
(٣) بڕوانە: (الحاوي) للماوردي ج١٢ص١٠٦، وە: (أحکام الزواج..) ص٢٦٦.

بحديث بروع بنت واشق)، [١] هەروەها (نووي)یش لەوەڵامی (الماوردي)دا کەئەو فەرموودەیەی بەبێ هێز (ضعيف) داناوە، گوتوویەتی: (.. الراجح ترجيح الوجوب والحديث صحيح رواه أبوداود والترمذي وغيرهم وقال الترمذي حديث حسن صحيح). [٢]

دیارە هەرکام لەحەنەفییەکان و حەنبەلییەکانیش هەمان ڕایان لەوبارەوە هەیە، [٣] هەرچەندە لەکاتی هەبوونی بەڵگەی بەهێزدا یەکمان لەسەر قەرەباڵغیی و جەماوەری زانایان نەکەوتوە.

دووەم: هەرکاتێك بەر لەچوونەلا(قبل الدخول) ئافرەتەکە داوای جیابوونەوەی کرد، یان هۆکارێکی ڕەخساند کە دەبووە هۆی جیابوونەوە، وەك هەڵگەڕانەوە(الإرتداد)، ئەوە هیچ شتێکی لەمارەییەکەی ناکەوێ. [٤]

**جا خوێنەری بەڕێز!**

لەو بڕە توێژینەوەیەوە کەڕابرد، ڕوون بۆوە کەبەپێچەوانەی حاڵی بوونی کەسانێك کەهەمیشە لەپشت پەردەی ڕەشەوە بۆ شەریعەت و حوکمەکانی دەڕوانن، مەسەلەی مارەیی بۆ ئافرەت پڕە لەحیکمەت و بەرژەوەندیی زۆری بۆ ئافرەت تێدا هەن، سەرباری ئەوەش پشتیوان(سند) و دەستەبەرکەر(ضامِنْ)ێکی زۆر باشیشە بۆ بەردەوام بوونی ماڵ و خێزان، جا نازانم ناحەزانی ئیسلام و شەریعەتی بێهەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێ، ئەو تێڕوانین و بۆچوونە هەڵەیەی خۆیانیان لەکوێوە هێناوەو لەچی هەڵهێنجاوە، کەگوایە مارەیی ئافرەت بەکەم سەیرکردن و سووکایەتیی

---

(١) بڕوانە (سنن الترمذي) ج٣ص٤٥١، وە: (أحكام الزواج) ص ٢٦٦.

(٢) بڕوانە: (روضة الطالبين) ج٨ص٢٨٢، وە: (أحكام الزواج) ص٢٦٦.

(٣) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو. ص٢٦٥.

(٤) بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٧ص٥٦٤ و ٥٨٤، وە: (المفصل) ج٧ص١١٢.،لەبەشی حەوتەمولە تەوەرەی سێیەم دابە درێژیی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

پێ کردنیەتی؟!

ئایا ئەو جۆرە کەسانە دەیانەوێ شەریعەتیش ئافرەتانی مسولمانی بەدەردی ئافرەتە کلۆڵو ژێنتاڵەکانی ڕۆژئاوای نەفامیی بردبایە، کە گەلێك جاران بەپارەیەکی زۆر ئەوجار مێردیان چنگ دەکەوێ! با لەوبارەوە ئەم قوڵە نەزیلەیەتان بۆ بگێڕمەوە کەنووسەرێکی ئیسلامیی لەکتێبێکیدا هێناویەتیو دەڵێ[1]:

(خزمێکم هەیە کە لە ئەمەریکا نیشتەجێیەو ئافرەتێکی ئەمەریکیی ئەو خزمەمی بەئەندازەیەك پارە خواستبوو، کە ئەگەر لەکۆمەڵگای ئێمەدا بوایە - بەپێی دینەکەمان- دەبوایە خزمەکەمان وەك مارەیی بەوی بەخشیبایە! جا لەسەردانێکیدا بۆ وڵات و شارەکەی خۆی (دیمەشق)، کەچەند ڕۆژێکیان پێچوو لەگەڵ خۆیدا ژنەکەیشی هێنابوو. وە کاتێك ژنە ئەمەریکاییەکەی بەو عادەتەی لای ئێمەی زانی کە دەبێ پیاو مەمنوونیی بۆ ژن دەربڕێو مارەیی پێبدات، بەچپەوە داوای لەمێردەکەی کرد، کە با هیچ کەس لەخزمو کەس‌وکاری بەو جۆرە ژنو مێردایەتی دروستکردنەی ئەوان نەزانێ، بۆئەوەی لەکۆمەڵگایەکدا کە- بەپێی قسەی- خۆی ئافرەتی هێندە تێدا بەڕێزو حورمەتە، هەست بەسووکایەتیو کەمیی نەکات!)

ئنجا بەپێشکەشکردنی ئەم سێ ئامۆژگارییەش کۆتایی بەم مەسەلەیە دێنین:

١-هەرچەندە وەك پێشتر باسمان کرد، شەریعەت نەبەلای زۆریی(كَثْرَة)داو نە بە لای کەمیی(قِلَّة)دا، سنووری بۆ مارەیی دانەناوەو، بێگومان ئەمەش حیکمەتی زۆری تێدا هەن، کەیەکیان ئەوەیە مسولمانان بەگوێرەی هەلومەرجی ژیانو گوزەرانیان، وەبەپێی حاڵو باڵی ماددیی بابای زاوا،

---

(١) بڕوانە: (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني) د. محمد سعيد رمضان البوطي ص١٣٩.

بوارێکی فراوانیان هەبێ بۆ هەڵسوکەوت تێداکردنی ئەو مەسەلەیە، بەڵام پێویستە بزانرێ کەشەریعەت بەگشتی حەز لەئاسانکاریی دەکات لەوبارەوەو فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ زۆرن لەو بوارەدا، بۆ وێنە[1]:

أ- ((**إنَّ أعظم النكاح بَرَكَةً أيْسَرُهُنَّ صَدَاقاً**)) رواه البيهقي وأحمد عن عائشة رضي الله عنها. واتە: (ژن هێنانێك مارەیی ئاسانتر بێت بەرەکەتی گەورەترە).

ب-((**مِنْ يُمْنِ المرأة أنْ تتيسَّرَ خِطْبتُها، وأنْ يتيسَّر صَدَاقُها**))رواه البيهقي عن عائشة رضي الله عنها. واتە: (لەفەڕو بەرەکەتی ئافرەت، ئاسانیی خوازبێنیی‌و ئاسانیی مارەیی یەکەیەتی).

ج- وە (أبو العَجْفاء) دەگێڕێتەوە کە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: ((**ألا لاتُغْالُوا صَدَاقة النساء...**)) رواه الترمذي و البيهقي. واتە: (ئاگادار بن لەمارەیی ژناندا زیادەڕۆیی مەکەن).

٢- بەڵام بۆیەش شەریعەت ڕێی داوە کەژنان مارەیی زۆر وەربگرن، چونکە بێگومان پیاوانیش هەموویان لەیەك ئاستی ئیمانیی‌و ئەخلاقیی‌و جوامێرییدا نین‌و، جێی خۆیەتی کەئافرەتی مسوڵمان لەکاتی دڵنیاو مسۆگەر نەبوونییدا، لەکەسایەتیی ئەو پیاوەی کەداخوازیی دەکات، لەبواری ئەندازەی مارەییدا دووربینی(إحْتياط)ی خۆی بکات، وەك چۆن جێی خۆیەتی کە لەکاتی قەناعەت هاتنی‌و دڵنیابوونی لەکەسایەتیی دیندارانەو ڕەوشت بەرزانەو جوامێرانەی ئەو پیاوەی کە دەیەوێ بیخوازێ، مەسەلەی نەداریی کابراو پێ‌هەڵنەسووڕانی مەصرەف‌و مارەیی زۆرو قورس

---

(١) بۆ ئەو فەرموودانەو هی دیکەش لەوبارەوە بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة السلامية) ج٧ص٦٤، ٦٥.

لەبەردەم خۆیدا نەکاتە کۆسپو لەمپەر! وەك پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ**...)) رواه الترمذي وهو صحيح. واتە: هەرکات کەسێك کە لەئایین و ڕەوشتی رازین داخوازیی ئافرەتی لێکردن ئافرەتی پێبدەن.

٣-گومانی تێدا نیە کەمارەیی تەنهاو تەنها موڵكو مافی ئافرەت خۆیەتیو بێجگە لەخۆی هیچ کەس بۆی نیە بەهیچ جۆرێك هەڵسوکەوت (تصرف)ی تێدا بکات، نەمێرد، نەباب، نەبرا، نەدایك.. هتد، خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ﴿٤﴾ ﴾ النساء

واتە: وە وەك دیارییەك مارەییەکان بدەنە ئافرەتان، جا ئەگەر خۆیان بەدڵخۆشییەوە شتێکیان لێی بەخشی بەئێوە، ئەوە بیخۆن بەدڵنیاییەوەو نۆشی گیانتان بێ.

## ٣-مەسەلەی سەرپەرشتیی پیاو (قِوامَةُ الرَّجُلِ) بۆ ئافرەت و خێزان:

یەکی دیکە لەو مەسەلانەی کەناحەزانی ئیسلام کردوویانە بەمایەی ڕەخنەگرتنو تانووت دانیان لەشەریعەت، ئەوەیە کەشەریعەت پیاوی بەسەرپەرشتیارو مشوورخۆریماڵو خێزان داناوەو نابێ ژن لەقسەو فەرمانی دەربچێ !

جائێمە سەرەتا ئەو ئایەتە قورئانییەی، کە باسی ئەو مەسەلەیەی کردوە، تەفسیر دەکەینو، پاشانماناو مەبەستی (قِوامَة) دەخەینەڕوو، دوایی باسی

حیکمەت‌و پاساوو بەجێبوونی ئەو مەسەلەیە دەکەین، تاکو ئەو تۆمەتەش وەك هاوەڵە پێشووەکانی بپووچێتەوەو، ئاشکرا بێت، کە بەپێچەوانەی گومانی ناحەزانی شەریعەتەوە، ئەم مەسەلەیەش وەك هەر مەسەلەو حوکم‌و بڕیارێکی دیکەی شەریعەت، تۆمەتێك نیە ئاڕاستەی ئایینی خوا بکرێ، بەڵکو بەڵگەیەکی دیکەیە لەبەڵگە ڕوون‌و پتەوەکانی ئیسپاتی خوایی بوونی شەریعەت‌و دادگەر بوونی حوکم‌و بڕیارەکانی.

**بڕگەی یەك:** خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾(النساء: من الآية٣٤).

واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ژنانەوە ،لەسۆنگەی ئەوەوە کەخوا هەندێکیانی بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە، وە بە هۆی ئەوەوە کە (پیاوان) لە ماڵی خۆیانیان (بۆ ژنان) بەخشیوە.

**جا ئێستا با سەرنج بدەین:**

خوای کاربەجێ بە ڕوونیی‌و ڕاشکاویی ڕایگەیاندوە کە پیاوان سەرپەرشتیارو کار هەڵسووڕێنی ژنانن:﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾(النساء: من الآية٣٤) پاشان دوو هۆکاری خستوونە ڕوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی چاوەڕوان کراو: بۆچی پیاو بەسەر ژندا حوکمڕان‌و قسە ڕۆیشتوویە لە شەریعەتدا؟!

**یەکەمیان:**﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ ﴾(النساء: من الآية٣٤) لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای کار بەجێ هەر لە ئەسڵدا جیاوازیی خستۆتە نێوان پێکهاتەی سروشتی پیاوو ئافرەتەوەو، چەند پلەو

ئیمتیازێکی بەهەرکامێکیان داوە بەسەر ئەوی دیکەدا، واتە هەر کامێکیان هەندێك خەسڵەتو تایبەتمەندیی هەن، کە لەوی دیکەیاندا نین، وەك لە باسەکانی ڕابردوودا باسمان کردوە، پیاو خاوەنی جەستەیەکی زبرو بەهێزو ئیرادەیەکی قایمو دەنگێکی گڕو سیمایەکی بەسامو هەیبەتو هۆشو گۆشێکی وردو تیژە، ئافرەتیش خاوەنی لەشو لارێکی نەرمو ناسكو سۆزو پەرۆشێکی بەجۆشو خرۆشو دەنگێکی بەنازو سیمایەکی دڵبزوێنو سەرنج ڕاکێشە!
جا ئەو خەسڵەتو تایبەتمەندییانەی پیاو وایان لێکردوە، کە لە ئافرەت شیاوترو گونجاو تر بێت بۆسەرپەرشتیاریو کارو بار هەڵسووڕاندنو حوکمڕانیی لە ماڵو خێزاندا.

**کەواتە:**

ڕستەی: ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾(النساء: من الآية٣٤)! بەپێچەوانەی تێگەیشتنی هەندێك کەسەوە ماناکەی ئەوە نیە کە پیاوان بە موتڵەقییو لە هەموو شتێکدا بەسەر ژناندا ئیمتیازو پلەیان هەیەو هەڵبژێرراون! چونکە ئەگەر خوای کار بەجێ ئەوەی مەبەست بوایە دەیفەرموو: (بما فضل الله الرجال على النساء)! بەڵکو وەك گوتمان ئەو ڕستە بە برستە قورئانییە، دەیەوێ تێمان بگەیەنێ ،کە هۆو حیکمەتی سپێررانی ئەرکی (قوامة) بەپیاو ئەوەیە کە پیاوان هەندێك تایبەتمەندییان لەلایەن خواوە پێدراون، کە بەهۆیانەوە دەتوانن ئەرکی سەرپەرشتیاریی لەنێو ژنو ماڵدا جێبەجێ بکەن، وەك چۆن ئافرەتانیش بەهەمان شێوە هەندێك تایبەتمەندیی جەستەییو دەروونییان پێ بەخشراون لە لایەن خوای بەخشەرەوە، کە بەهۆیانەوە بتوانن ئەرکی

گرنگ‌و هەستیاری کابانێتی‌و دایکایەتی لەنێو ماڵ‌و مێرددا ئەنجام بدەن.

بەڵگەشمان بۆ ڕاستێتی ئەو جۆرە تەفسیرو لێکدانەوەیەی ئەو ڕستە پیرۆزەی قورئان، جگە لە ڕواڵەت(ظاهر)ی تەعبیرەکە، ئەوەیە کە وەك لە باسەکانی ڕابردوودا گوتوومانە: سەرجەم دەقەکانی قورئان‌و سوننەت داکۆکیی لەسەر وەك یەك بوون‌و یەکسان بوونی ئافرەت‌و پیاو دەکەن، لەڕووی ئینسان بوون‌و، بەندەی خوا بوون‌و، لەبەرانبەر شەریعەت‌و ئاراستەو ئەمرو نەهییەکانیدا بەرپرسیار بوونەوە، کە هەر ئەم ئایەتە بەتەنها لەو بارەوە بەسە، کە دەفەرمووێ: ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ﴾(آل عمران: من الآية١٩٥).

دیارە ئەو ئایەتە بەپێزە قورئانییەش کە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ﴾(البقرة: من الآية٢٢٨)، هەر بەڵگەیەکی دیکەی ئیسپاتی ڕاستیی قسەکەمانە، چونکە خوای دادگەر بە ڕوون‌و ڕاشکاویی فەرموویەتی: کە ژنان بە ئەندازەی ئەو ئەرکەی کە بەرانبەر بە پیاوان لەسەر شانیانە، مافیشیان لەسەریان هەیە بێ کەم‌و زیاد، پاشان کە فەرموویەتی: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ﴾واتە: پیاوان پلەیەکیان بەسەر ژنانەوە هەیە، ئەوە هەمان پلەی سەرپەرشتیارێتی(درجة القوامة)یە ،کە خەریکی توێژینەوەینی‌و، وەك گوتمان: لەسروشت‌و پێکهاتەو تایبەتمەندییەکانی پیاوەوە سەرچاوەی گرتوە، کە واقیعێکە ڕوون‌و بەرچاوەو هیچ عاقڵێك ناتوانێت نکووڵیی

لـێ بکات، سەربارەش پلەی ناوبراو ئەرکو بارگرانیی و (تکلیف)ە، نـەك مـافو خەنیی کردنو (تشريف)!!

دووەمیان: ﴿وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ە بـە هـۆی ئـەوەوە- پیـاوان ئەرکی کارو بار هەڵسووڕاندنو مشورخواردنی ژنو ماڵیان پێ سـپێراوە- کـە مـاڵو سـامانی خۆیـان بـۆ ژنو منـداڵان خـەرج دەکـەن، چـونکە لەشەریعەتی خوادا وەك پێشتر باسمان کردوە، پیاو وێڕای مارەیی (المهر)و پـارەو خـەرجی ژن گواسـتنەوە، نـانو نەفەقـەی ژنو منـداڵو سـەرجەم پێداویستییەکانی ماڵو حاڵیشـی بـە ئەسـتۆوەیەو، مـاقوڵیش نیـە پیـاو ڕەنـجو زەحمـەتی بـژیو پەیـداکردن بەتـەنها بکێشـێ، کەچـی بـۆی نـەبێ سەرپەرشتی ماڵو خێزانو کارو بارەکانیان بکات!

بەڵێ عـەقڵو مـەنتیقیش دەڵێن: (الغُنمُ بالغُرْمِ)، پێشینانیش گوتوویانـە: (ئەوەی دەیکات دەزانێ، ئەوەی دەخوات چووزانێ!) بەڵێ جێی خۆیـەتی بـاب کـە ئـەرکی بـژیو پەیـداکردنی بەئەسـتۆوەیە، مـافی چـۆنیەتی خەرجکردنو بەڕێوەبردنی ماڵو خێزانو لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشتیشـی هەبێ، هەرچەندە وەك پێشتریش گوتمان: ئەوە ئەرکو تەکلیفـە و، مـافو تەشریف نیە!

**برگەی دوو**: ئێستاش کە هەتا ڕاددەیـەك تەفسیری ئایەتەکـەمان[1] زانـی، بـا بچینـە سەر برگەی دووەمو بزانین سەرپەرشتیاری پیاو (قِوامَةَ الرَّجل) بۆ ژنو ماڵ مانای چییە؟!

جارێ وشەی: (قوّام) وەك ئاشکرایە لەسەر کێش (وزن)ی (فَعّال)ەو، ئەمیش

(١) بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتریش دەتوانی سەرنجی: (جامع البيان) الطبري، ج٤، ص٨٢ تا ٨٤، وە: (الجامع لأحكام القران) للقرطبی ج٣، ص١٤٣٠، ١٤٣١، بدەی.



بۆ زۆر داکۆکیی کردن(المبالغة)ە لەسەر شتێك، کەواتە: وشەی (قوام) کە لە (قائم)ەوە هاتوە، یانی زۆر سەرپەرشتیارو مشوور خۆر.[١]

ئنجا مەبەستیش لە سەرپەرشتیاری پیاو بەسەر ئافرەتەوە (قوامة الرجل علـى المـراة) وەك لـە خـودی وشـەکەو سـیاقی ئایەتەکـەوە دیـارەو توێژەرەوان(مفسِّرین)ی قورئانیش ڕوونیان کردۆتەوە بریتییە لە:

(هەڵسانی پیاو بە سەرپەرشتیی‌و چاودێریی کردنی ئافرەت‌و مشـوورخواردن لەدابین کردنی پێویستییەکانی‌و ئاگادار کردنی‌و پاراسـتنی‌و ئـەدەب دادان‌و ڕاستکردنەوەی لەکاتی هەڵەو لاداندا).[٢]

**کەواتە:**

سەرپەرشتیاریی پیاو بۆ ئـافرەت‌و خێـزان، کـت‌و مـت وەك سـەرۆکایەتیی‌و حـوکمڕانێتی کاربەدەسـت(ولـيّ الأمـر)ە بـۆ میللـەت‌و ڕەعیەتەکـەی، کـە پێویستە لەسەر بناغەی دادگەریی‌و دڵسۆزیی‌و پەرۆش‌و ڕاوێژپێکردن بێـت، نەك بەشێوەی خۆ سەپاندن‌و کوێخایەتی‌و دیکتاتۆریی!

بەتایبەتیش کە خوای کاربەجێ ڕایگەیاندوە کە پەیوەندیی نێوان ژن‌و مێـرد پێویستە لەسەر بناغەی ئۆخژن‌و ئـارامیی بەیەکـدی هـاتن‌و خۆشەویسـتی‌و بـەزەیی‌و سـۆزو پـەرۆش بـێ بۆیەکـدی ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى

---

(١) بڕوانە: (مفـاتيح الغيـب) للامـام فخرالـدين الـرازي، ج١٠، ص٨٨، وە: (الجامع لأحكـام القران) للقرطبی، ج٣، ص١٤٣٠.

(٢) بڕوانە: (أحكام القرآن) للجصاص، ج٢، ص١٨٨، وە: (أحكام القـرآن) لابـن العربـي، ج٢، ص٤١٦. وە: (تفسـير الكشـاف) للزمخشري، ج١، ص٥٠٥، وە: (تفسـير ابـن كـثير) ج١، ص٤٩١.

ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ (الروم:٢١).

ئنجا با بچینه سەر برگەی سێیەمو، بزانین حیکمەتو پاساوی ئەو مەسەلەیە چییە؟!

**برگەی سێ:** جارێ شتێکی بێ چەندو چوونه کە هیچ کارو پرۆژەیەکو، هیچ کارو چالاکییەك ،بەبێ چاودێرو سەرپەرشتیکار بەڕێوە ناچێو ئەنجام نادرێ، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**إِذَا خَرَجَ ثَلَاثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ**)) رواه احمد و ابوداود. واتە: هەر کاتێك سێ کەس بەسەفەر چوون، بایەکیان بکەنە ئەمیریان.

جا وەك چۆن وڵات بەبێ پادشاو حوکمڕان بەڕێوە ناچێ، ماڵو خێزانیش کە دەوڵەتۆکەیەکی گچکەیە، پێویستی بە چاوساغو حوکمڕانو مشوورخۆرێك هەیە!

جا بە سەرنج لێدانو تێوەڕامانی هەر کام لە ژنو مێردو تایبەتمەندییەکانیان، وەك ڕۆژی ڕوون ئاشکرا دەبێ، کە لە ژنو پیاو دووەمیان شیاوترو لێهاتووترە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرپەرشتیاری ماڵو خێزان، وە لە ڕاستیدا سروشتی ژن وا هەڵکەوتوە، کە تەنها کاتێك هەست بەدڵنیاییو بەختیاریی دەکات، کە خۆیو منداڵەکانی لەسایەو پەنای مێردێکی بەمشوورو خەمخۆردا ببینێتەوەو، هەر کاتێك هەست بکات کە بەڕێوەبردنی ماڵو خێزان ئەرکێکە و چۆتە ئەستۆیە وە، خۆی بەبێ پەناو بێ کەسو بێ دەرەتان دەبینێ!

وە لەڕاستیدا هەر ماڵو خێزانێك پیاو وەك پێویست دەوری سروشتی خۆی تێدا نەبینێو، ئەرکی شەرعیی خۆی لەسەرپەرشتیی کردنو چاودێریی‌و بەسەرڕاگەیشتن تێدا ئەنجام نەدات، کەمو زۆر شیرازەی دەپچڕێو سەنتەری

تێك دەچێ‌و، هەم دایك هەست بەچارەڕەشیی دەكات‌و، هەم منداڵەكانیش كەم‌و زۆرگیرۆدەی هەڵەو پەڵەو هەڵوەدایی دەبن، ئەمەش واقیعێكەو بە چاوان دەبینرێ‌و، پێویست بەبەڵگە لەسەر هێنرانەوە ناكات! كۆمەڵگا نەفامییەكان (المجتمعات الجاهلية)ی ڕۆژئاواش كە هەر كام لە دایك‌و باب دەستبەرداری ئەركە فیترییەكانی خۆیان بوو ون، بەڕوونترین شێوە ئەو واقیعەیان تێدا بەرجەستەو نمایان بووە!

## ٤- مەسەلەی چەند ژنیی (تعدّد الزّوجات):

یەكی دیكە لەو تۆمەتانەی كە ناحەزانی ئیسلام ئاراستەی شەریعەتی دەكەن، ئەوەیە كە ڕێی داوە پیاو لە ژنێك زیاتر بێنێ هەتا چوار ژن، وە دەڵێن: ئەوە یەكێكە لە بەڵگەكانی بەسووك سەیركردنی شەریعەت بۆ ئافرەت‌و بەكەمترو نزمتر دانانی لە پیاو!

جا ئێمە سەرەتا لەبەر تیشكی دەقەكانی قورئان‌و سوننەتدا باسی مەسەلەی چەند ژنیی (تعدّد الزّوجات) دەكەین، پاشانیش پاساوو حیكمەتەكانی دەخەینە ڕوو، تاكو تەمی ئەم تۆمەتەش بەتیشكی خۆری حەقیقەت وەك پێشووەكانی بڕەوێنینەوە:

## بڕگەی یەك: چەند ژنیی لە شەریعەتدا:

خوای دادگەرو كار بەجێ فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾﴾(النساء:٣)

واتە: وە ئەگەر مەترسییتان هەبوو کە لە بەهاوسەرگرتنی کچانی هەتیودا دادگەریی نەکەن، ئەوە دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار لە ئافرەتانێك کە پێتان دەشێن، بێنن، بەڵام ئەگەر بیمی ئەوەتان بوو دادگەریی نەکەن (لەنێوانیان)دا، ئەوە با هەر یەکێك بێت، یان ئەو کەنیزەکانەی کە خۆتان خاوەنیانن، ئەوە نزیکترە لە دووچار نەبوونتان بە ستەم کردنەوە.

هەروەها خوای باڵادەست هەر لەو بوارەدا دەربارەی قورسیی و زەحمەتیی ڕەچاوکردنی دادگەرییەوە لەنێوان چەند ژنێکدا، فەرموویەتی:

﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ وَإِن تُصْلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ١٢٩ ﴾(النساء:١٢٩).

واتە: وە بێگومان هەرچەندە سوور بن هەر ناتوانن کە لە نێوان ژناندا دادگەریی بکەن، بەڵام یەکجارییش لامەدەن (بەلای یەکیاندا کە زیاترتان خۆش گەرەکە) بەجۆرێك کە ژنەکەی دیکەتان وەك هەڵواسراو(ژنی بێ مێرد) بەجێ بهێڵن، وە ئەگەر بێتو چاکخوازیی و پارێزگاریی بکەن، ئەوە بێگومان خوا لێبوردەو بەخشندەیە.

شایانی باسیشە کە توێژەرەوانی قورئان[1] و شەرعزانان(فقهاء)یش گوتوویانە: مەبەست لە دادگەریی(عدل) لە ئایەتی ژمارە (٣)ی (النساء)دا، یەکسانییکردنی ژنەکانە لە مەسرەفکێشان و بەرگ و پۆشاك و جێگاو ڕێگاو شەو لە لامانەوە(النفقة

(١) بڕوانە: (التفسير الكبير) للرازي، ج٩، ص١٧٦، ١٧٧، وە: (تفسيرأبن كثير) ج١، ص ٤٥١، وە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج٣، ص١٦.

والكِسوة والسّكنَى والمَبيْت)دا، کە بێگومان ئەم جۆرە هەڵس و کەوتە هەر کەس بیەوێت دەتوانێ بیکات، بۆیە ئینسان پێی موکەللەف(مُكلَّف) کراوە، دیارە کەسێکیش لەخۆی ڕانەبینێ بەو جۆرە لەگەڵ ژنەکانیدا ڕەفتار بکات، بۆی نیە لەژنێك زیاتر بێنێ، وەك لە دەقی ئایەتەکەدا هاتوە.

دیسان توێژەرەوانی قورئان و[1] شەرعزانان لەسەر ئەوە کۆکن کە وشەی دادگەریی (عدل) لە ئایەتی ژمارە (١٢٩)ی (النساء)دا کە خوای پەنهان بین فەرموویەتی: هەرچەندە زۆریش مەبەستتان بێت هەر بۆتان نایەتە دی﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ﴾، بەڵێ مەبەست لەو جۆرە دادگەرییە لە ئیمکاندا نەبووەو بەهیچ کەس نەکراوە، ئەوە نیە کە لە ئایەتی ژمارە (٣)ی هەمان سوورەتدا فەرمانی پێ کراوە! چونکە بێگومان خوای کار بەجێ فەرمان بە شتێك ناکات کە ئینسان توانای جێبەجێکردنی نەبێت! وەك فەرموویەتی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾(البقرة: من الآية٢٨٦). واتە: خوا بێجگە لەوەی کە لەتوانادایە لە هیچ کەس داوا ناکات.

دیسان ناگونجێ و مەحاڵە کە فەرمایشتی خوای پەروەردگارو زانا ناکۆکیی و دژایەتیی (إختلاف وتضادّ)ی تێدا هەبێ، وەك فەرموویەتی﴿ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾(النساء: من الآية٨٢) واتە: ئەگەر قورئان لەلایەن غەیری خواوە بوایە، ناکۆکیی زۆریان تێدا دەبینی.

---

(١) بڕوانە: (جامع البيان) للطبري، ج٤، ص٤٢٤، وە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج٣، ص١٥٩١.

**کەواتە:**

وەك گوتمان: ئەو دادگەرییەی کە لە ئایەتی ژمارە (٣)دا فەرمانی پێکراوە، جیایە لەوە کە لە ئایەتی ژمارە (١٢٩)دا بە نەگونجاو (غیر ممكن) دانراوە، دادگەریی فەرمان پێکراو لە پۆشاكو مەسرەفو شەو لە لامانەوەدایەو، دادگەرییە نەگونجاوو لە توانا بەدەرەکەش لە خۆشویستنو سەرجێیی(الحب والجماع)دایە، وەك توێژەرەوان گوتوویانەو، بۆ وێنە: (الطبري) لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾دا نووسیویەتی: (لن تطيقوا أيها الرجال أن تُسَوّوا بين نسائكم وأزواجكم في حُبِهِنّ بقلوبكم حتى تعدلوا بينهن في ذلك).[1]

هەروەها (القرطبي)یش نووسیویەتی: (أخبر تعالى بنفي الإستطاعة في العدل بين النساء و ذلك في مَيْل الطَّبْع بالمحبّة والجماع والحظّ من القلب..).[2]

ئنجا شەرعزانان لەبەر ڕۆشنایی دەقە شەرعییەکاندا گوتوویانە، بۆ چەند ژنیی دوو شت بەمەرج گیراون:

یەکەم: دادگەریی کە ڕوونمان کردەوە مەبەستی پێی چییەو ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریشﷺ بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەو دوو جۆرە ماناکردنە جیاوازەی کە بۆ وشەی (عدل) خستمانە ڕوو: ((**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْسِمُ بَيْنَ نِسَائِهِ فَيَعْدِلُ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ**)) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ مافەکانی هاوسەریتی لەنێوان هاوسەرەکانیدا بەش کردوە بەدادگەرانە، پاشان دەیفەرموو: ئەی خوایە! ئەمە

(١) بڕوانە: (جامع البيان) لأبي جعفر الطبري، ج٤، ص٤٢٢.

(٢) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) لأبي عبدالله القرطبي، ج٣، ص١٥٩١.

دابەشکردنی منە بۆ شتێك کە پێم دەکرێ، بەڵام لۆمەم مەکە بۆ شتێك کە تۆ پێت دەکرێ‌و من پێم ناکرێ.)) رواه أبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه وأحمد والبيهقي والدارمي.[1]

چونکە ئاشکرایە ئەوەی ،کە ئینسان لە دادگەریی کردن لەنێوان چەند ژنێکدا پێی دەکرێ، مەسرەفکێشان‌و شەو لەلامانەوەیەو[2]، ئەوەش کە تەنها بە دەست خوای باڵا دەست‌و بێ وێنەیە، مەیل‌و ئارەزووی دڵ‌و دەروونە!

دووەم: توانای مەسرەف کێشان، دیارە ئەمیش نەك تەنها هی چەند ژنێك، بەڵکو مەرجی ژنهێنانی یەکەمیشە، چونکە مادام مەسرەفکێشانی ژن‌و ماڵ‌و منداڵ لەسەر مێرد فەرز بێت، دیارە بە کەمتەرخەمیی تێدا کردنی گوناح بار دەبێت.

هەر بۆیەش خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾(النور: من الآية٣٣)

واتە: وە ئەوانەی کە مەسرەفی ژنهێنانیان نییە، با خۆیان داوێن پاك ڕابگرن تاکو خوا لە بەخششی خۆیەوە بێ نیازیان دەکات..

وە لە (شافعي)یشەوە گێڕدراوەتەوە ،کە وشەی (ألاّ تعولوا)ی بە (ألاّ تميلوا) لێك نەداوەتەوە، بەڵکو بە: (ألاّ يكثر عيالكم) تاکو منداڵ‌و خێزانتان زۆر نەبێ، تەفسیری کردوە.[3]

---

(١) بڕوانە: پەراوێزی (جامع البيان) ج٤، ص٤٢٤.
(٢) ئەمیش وەك لەبەشی پێنجەمدا باسی دەکەین بەموتڵەقیی نییەو بواری قسە کردنی تێدایە.
(٣) بڕوانە: (الجامع لأحكام القران) للقرطبي، ج٨، ص١٣٢٨، ١٣٢٩.

**کەواتە:**

مەرجەکانی چەند ژنیی (تعدُّد الزَّوجات) تەنها ئەم دوانەن: دادگەریی لەنێواندا کردنیان، وە توانادار بوون بۆ مەسرەفکێشانیان، وە بێجگە لەم دوو مەرجە نەقورئانو سوننەتو نە بەرهەمو کەلەپووری شەرعزانانیش بەدرێژایی مێژووی ئیسلام ، باسی هیچ مەرجێکی دیکەیان نەکردوە، [1] بۆیە هەر کەسێك بەناوی دینو شەریعەتەوە مەرجو بەندێکی دیکە بخاتە سەر ئەو مەسەلەیە، ئەوە بێگومان ڕاو بۆچوونێکی شەخسییو هەڵەی خۆیەتیو دەیەوێ حوکمێکی شەرعی بگۆڕێو حەلاڵێکی خوای کار بەجێ لەبەندەکانی قەدەغە بکات!!

بەر لەوەی ئەو بڕگەی یەکەمەش بەجێ بهێڵین، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ بەڵگەی ئەوە بکەم کە بۆچی وشەی (عَدْل) لە ئایەتی ژمارە (٣)ی (النساء)دا مانای دادگەریی لە مەسرەفکێشانو.. هتد.دا دەگرێتەوەو، لە ئایەتی ژمارە (١٢٩)شدا، خۆشەویستنو هەستو نەستی دەروونیی، دەگرێتەوە؟!

بێگومان یەکێك لە هەرە هۆکارە گرنگەکانی دیاری کردنی مانای وشەو تەعبیرەکان لەسەرجەم زمانەکانی دنیادا، بریتیە لە بابەت(موضوع)و سیاقی قسەکان، جا ئەگەر سەرنج بدەین زۆر بەڕوونیی دەبینین کە بابەتو سیاقی تێدا هاتنی وشەی (عدل)ی ئایەتی ژمارە (٣) زۆر بەزەقیی مەسەلەیماڵو سامانو شتی مادديی تێدایە﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ (النساء: الاية ٢، ٣).

---

(١) بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) د. عبدالكريم زيدان، ج٦، ص٢٩٣، ٢٩٤.

**کەواتە: جێبەجێکردنی دادگەریی لەم سیاقەدا مەبەست پێی شتی ماددییە.**

بەڵام جێبەجێکردنی وشەی (عدل) لە ئایەتی ژمارە (١٢٩)دا مەبەست پێی شتی مەعنەویی‌و دەروونییە، چونکە سیاقەکە هەمووی لەو بارەوەیە: ﴿ وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ﴾ (النساء: الآية ١٢٨، ١٢٩).

**کەواتە:**

جێی خۆیەتی کە وشەی (أن تعدلوا)ش لە بابەت‌و سیاقەکەی جیاو ڕیزپەڕ(شاذ) نەبێت‌و، ماناو چەمکێکی هەبێت کە لەگەڵ ئەو کەش‌و هەوایەدا سازو گونجاو بێت![1]

ئێستاش با بچینە سەر برگەی دووەم و بزانین پاساوو حیکمەتەکانی چەند ژنیی چین؟!

## برگەی دووەم: حیکمەتی چەند ژنیی:

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کەمەسەلەی چەند ژنیی هەم لەسەر دڵی ئافرەت زۆر قورسەو، هەم چەند گرفت‌و کێشەیەکیشی لێ پەیدا دەبن، بەڵام شەریعەتی

---

(١) ڕەنگە ئەم جۆرە سەرنجدان و هەڵهێنجانە لە تەفسیرەکانیشدا هاتبێ، بەڵام من بەرچاوم نەکەوتوە بە تایبەت بۆ ئەم مەسەلەیە.

وردبینو دووربینی خوای کاربەجێ، بەپێی تەرازوویەکی زۆر واقیع بینانە هەمیشە سەنگو سووکی لەنێوان بەرژەوەندییەکانو زیانەکان(المصالح والمفاسد)دا دەکاتو، هیچ کاتێك ڕێنادات لەبەر سەرهەڵدانی چەند وردە گرفتو کێشەیەك، کۆمەڵێك بەرژەوەندیی گەورەو پێویست لەدەست بدات، یان لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکی شەخسییو تایبەتدا، کۆمەڵێك زەرەرو زیانی زل زل بکات!

هەربۆیەش زاناو پسپۆڕانی شەرعزان، لەچوارچێوەی زانیاریی (أصول الفقه)داو لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی وەك: ﴿وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ (البقرة: من الآية٢١٩) وە ((**لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ**)) [1] **رواه أحمد وعبدالرزاق وابن ماجه والطبراني عن ابن عباس ورواه مالك والشافعي عنه عن يحي المازني مرسلا، وأخرجه ابن أبي شيبة والدارقطني**[2]، دا چەند بنچینە (قاعدة)یەکی شەرعییان دارِشتوون، وەك:

(دفع أعظم المفسدتين وجلب أعظم المصلحتين)، (دفع المضار مقدمٌ على جَلْبِ المنافِعِ)، (إحتمالُ أخف الضررينِ وتَفْويتُ أدْنى المَنْفَعَتينِ).. هتد.

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کەڕابرد، دەتوانین زۆر بەڕاشکاویی بڵێین:

زەرەرو زیانەکانی چەند ژنیی هەرچەندو هەرچۆنێ بن، زۆر کەمترو لاوەکیترن لەقازانجو بەرژەوەندییەکانیو، سوودو کەڵکە تایبەتییەکانی یەك ژنیی هەرچۆن بێ، زۆر کەمترو گچکەترن لەزەرەرو زیانەکانی ڕێگرتن لەچەند ژنیی، جا باسەرنج بدەینو بزانین چۆنو بۆچی؟

---

(١) واتە: دەستپێشخەریی زیان بەخەڵك دانو لەبەرانبەر زیان دا، زیان لێدان دروست نییە.

(٢) بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الألباس عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس- للعجلوني، ج٢ ص٤٩١)

## پاساوو حیکمەتەکانی چەند ژنیی:(١)

١- جاری وا هەیە کابرا ژنێکی هەیەو نەزۆك(عقیم)ەو زۆریش حەزی لەمنداڵەو بێگومان بێجگە لەهێنانی ژنێکی دیکە، هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکەی لەبەردەمدا نیە!

٢- جاری وا هەیە کەژن گیرۆدەی حاڵەتێکی نەخۆشی وا دەبێ کەتوانای پەیوەندیی جینسییو ژنو مێردایەتیی نابێو، کابرا یان دەبێ ژنی دیکە بهێنێ، یان بەخۆ کپکردنەوە گرفتار بێت، یان ئەگەر ئیمانو تەقوای مەحکەم نەبێ، دووچاری داوێن پیسیی ببێ.

٣- جاری وایە کابرا ئارەزووی جینسیی لەوە زیاترە کە بە ژنێك دابمرکێو قەناعەت بکات، بەتایبەتیش کە ژن حاڵەتەکانی حەیزو زەیسانی هەن!

٤- جاری وا هەیە کە کابرا ئافرەتێکی خزمی بێسەرپەرشتی هەیەو، بێگومان ئافرەتیش تەنها بەنانو نەفەقە مەداری ساز نابێو، پێویستی بەسێبەری ماڵو مێردیش هەیە!

٥- جاری وا هەیە کەئافرەتێکی گەنج مێردی شەهید بووە یان مردوە، ڕەنگە گەنجێکی بێژنو ماڵ ئارەزوومەندی نەبێ، بەڵام باباپەکی خێزاندار بەمەمنوونییەوە بیخوازێو لەبێوەژن کۆشییو تەنهایی قوتاری بێت.

٦- لەهەندێك کاتو شوێناندا بەتایبەت بەهۆی جەنگو کوشتارەوە، هاوسەنگیی نێوان ژمارەی پیاوانو ئافرەتان تێکدەچێو، ئافرەتان ڕێژەیان

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لە (المفصل) ی د. عبدالکریم زیدان، وەرگرتوە، بڕوانە: ج٦ص٢٩٠، ٢٩١.

زۆر زیاتر دەبێ لەپیاوانو، بێجگە لەچەند ژنیی هیچ ڕێگا چارەیەکی دیکە کەشایستەی کۆمەڵگایەکی پاکو پیاو و ئافرەتانێکی شەریف بێت، لەبەردەمدا نیە!

٧- جاری وا هەیە چەند بەرژەوەندییەکی گەورەی کۆمەڵایەتی بەمەسەلەی لەژنێك زیاتر هێنان، دێنەدی، وەك: پتەوکردنی نێوان دوو بنەماڵە، یان دوو عەشیرەت، یان پەیداکردنو پتەوکردنی پەیوەندی نێوان سەرۆكو سەرکردەو بەشێك لەرەعیەتو کۆمەڵەکەی، یان.. هتد.

٨-بێگومان لەچەند ژنییدا وەچەی زۆر(النَّسْل الكثير) هەیە، کە هەم بۆ کاتی جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەی میللەتو ئوممەتو، هەم بۆ زۆربوونی دەستی ئیشکەر(اليَدُ العاملة) بەتایبەت بۆ کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکان(المجتمعات الزراعية) پێویستە!.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

ئەمانەن پاساوو حیکمەتەکانی چەند ژنیی(تعدد الزَّوجات) لەشەریعەتدا، کەپێم وایە هەرکەسێك عەقڵو ویژدانی هەبێتو بەشێوەیەکی بابەتییانەی واقیع بینانە سەرنجیان بدات، قەناعەت دەکات بەلەجێی خۆدابوونی ئەو مەسەلەیەش، وەك هەر مەسەلەو بڕیارێکی دیکەی شەریعەتی تێروتەواوی خوا (تبارك وتعالى).

بەڵام با ئەمجار سەرنجبدەین داخۆ نەیارو ناحەزانی شەریعەت، چ ڕێگاچارەیەکی جێگرەوە(بَديل)یان هەیە بۆ چاککردنی ئەو حاڵەتو دیاردانە، کە لەو هەشت خاڵەدا ئاماژەمان پێیان کرد؟!

لەڕاستیدا ناحەزانی شەریعەت، نەك هەر هیچ چارەسەرێکی ئەو حاڵەتو دیاردانەیان پێ نیە، بەڵکو شتێکیان کردوە کەقورەکەی خەست تر کردۆتەوە(زادَ

الطين بَلّة)! چونکە ئەوان هەڵساون بە بەرهەڵداکردنە نێویەکدی نێر و مێ، بەبێ هیچ حیساب کردنێك بۆ ئاینو ئەخلاقو ئایندەی کۆمەڵگا.[١]

ئێستاش بەپەسەندی دەزانم بۆ خستنەڕووی واقیعی نزمو پەستی ئەو کۆمەڵگایانەی کەلەبواری جینسیی و پەیوەندییە جینسییەکاندا، لەڕووناکیو ڕێڕوونی شەریعەت بێبەشن، چەند قسەیەکی بەپێز لەنووسەرێکی ناوداری ئیسلامیی ئەم ڕۆژگارە بخوازمەوەو یەکسەر لەعارەبییەوە وەریان بگێڕمە سەر کوردی:

(شێخ محمد الغزالي) خوا لێی خۆش بێ، لەوبارەوە نووسیویەتی:

{... بەڵام ئیسلام ژن هێنانی ئاسان کردوەو کردووشیەتی بەیەکێك لەو تاعەتانەی کەئینسان پێیان لەخوا نیزیك دەبێتەوە، وەکاتێکیش لەڕووی ئەخلاقییەوە لەئینسان ڕاببینێ چەند ژنیی بۆ ڕەوا دەکات، ئەگەرنا لێی قەدەغە دەکات.

جا سەیر ئەوەیە کەجیهانی ڕۆژئاوا چرەدووکەڵێکی زۆری لەبارەی یاساکانی

---

(١) پەیمانگای (کینزی) بۆ لێکۆڵینەوە جینسییەکان، لێکۆڵینەوەو سەرژمێرو ڕاپرسییەکی لەڕووی جینسیو ئەخلاقییەوە لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا کردو، یەکێك لەپرسیارەکان کەئاڕاستەی ژمارەیەکی زۆری کچانی کرد، ئەمە بوو: ئایا هەرکاتێك کەزانیت هاوەڵەکەت پەیوەندیی جینسی لەگەڵ ئافرەتێکی دیکەدا هەیە، کاردانەوەت چی دەبێ؟! ئەنجامی ئەو ڕاپرسییەش بەم جۆرە بوو: (٦%) بەباشتریان زانی کە ئەو پەیوەندییەی خۆیان بپچڕن، وە (١٠%) ڕایان وابوو پەیوەندییەکەیان هەر بمێنێ، بەڵام ئەو پیاوە بەهاوڕێ(صدیق) نازانن، وە (٣٣,٤%) گوتیان هاوڕێیەتییمان هەر درێژە پێ دەدەین، بەڵام ئەو حاڵەمان پێ ناخۆشە!، وە (٥١%) یش گوتیان: ئەو حاڵەتە زۆر ئاساییەو وەك پێشوو هەر هاوڕێ دەمێنینەوە!! بڕوانە: (مجلة الكفاح العربي) ژمارە: ٧٧٦ی ١٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٣ز، وە بڕوانە: (المرأة بين طغيان النظام الغربي..) ص١٢٥.

ئیسلام‌و ڕێڕوونییەکانیەوە بلاوکردۆتەوەو، لەهەموو لاوە دەستی کردوە بەزمان درێژیی!

سەرسوڕهێنەرتریش لەوە ئەوەیە، کەئەو جیهانی ڕۆژئاوایە، پەیوەندییە جینسییەکانی خۆی لەسەر پاشاگەردانییەکی سامناك بنیات ناوە! چونکە ئەو منداڵانەی کەبەزۆڵیی پەیدا دەبن، زۆر بەبێڕەزایی لەزیادبووندان‌و لەهەندێك وڵاتاندا ڕێژەیان لەهی منداڵانی ئاسایی نزیك بۆتەوە!

بۆ فرە ژنیی(تعدد)یش ئەوە گوازەگوازی پیاو لەنێو کۆمەڵە ئافرەتێکدا شتێکی ئاساییە.. ژنی (کەنەدیی) سەرۆکی ئەمەریکای پێشووتر، باسی کردوە کە مێردەکەی دووسەد، سێ سەد هاوڕێ(صدیقة)ی هەبووە!

ئنجا تەنانەت خەڵکی ئاساییش چ جای پادشایەکان، لەجیهانی ڕۆژئاوادا دەتوانن چنگ بگەیەننە سەدان نامووس!

جا بەڕاستی جێی سەرسوڕمان ئەوەیە، کەپیاو بتوانێ لەنێو یەك حەشاماتی زۆری دەستگیرانان(العشیقات)دا بخولێتەوە، بێئەوەی هیچ سەغڵەتییەك ڕووی تێبکات، کەچی لەگەڵ لەشیرازەیەکی مەحکەمی ڕەوشت‌و خوودا، چەند دانە ژنێکی هەبوون، بخرێتە قەفەزی تۆمەتباریی(قفص الإتهام)یەوە!!

یەکێك لەسەرۆکە ناودارەکانی ڕۆژئاواو سیاسەتمەدارە زلەکان، پیاوێکە کەلەبواری داوێن پیسییدا ناوبانگی هەبووە، جا هەرچەندە باس‌و خواسی پیسی‌و زیناکردنی وی زۆر ئاشکرایە ،کەچی هیچ لەپایەی بەرزی دانەلەنگاندوە!}

(أنیس منصور)[1] یش نووسیویەتی دەڵێ:

{شتێکی سەیر نەبوو کە لە فەرەنسادا لەبارەی پڵنگی سیاسەتی فەرەنسایی (جورج کلمنصو)یەوە، کتێبێك دەربچێ کە لەنێوان ساڵەکانی (١٨٤١-١٩٢٩ز)دا

---

(١) بڕوانە: ڕۆژنامەی (الأهرام) ڕۆژی ١٩٧٩/٩/١٣.

ژیاوە، چونکە پیاوێك بووە، چۆتە نێو گەلێك مەیدانی سیاسی ترسناکەوەو توانیویەتی کۆمەڵگا کۆنترۆڵ بکات وە (گوایە)[1] توانیویەتی لەیەك کاتدا لەگەڵ بیست کەسدا دەربارەی بیست بابەت قسە بکات!

بەڵام هیچ کەس پێی وا نەبووە ،کە ئەو کابرایە هەشت سەد (٨٠٠) دۆست(عشيقة)ی هەبووەو چل کوڕی زۆڵی لێیان بووە!}

ئەدی دەبێ ئەو گورگە چەندی نازۆڵی[2] لێبووبن!

(أنيس منصور) دەڵێ: (بەڵام کاتێك ئەو گورگە لەنیوە شەوێدا زانی کە ژنە ئەمەریکاییەکەی خۆی دۆڕاندوە، بەو نیوەشەوە هەڵساو بەبەرگی نوستنەوە دەریکردە سەر جادە!)

ئێمەش ئەوەمان پێ سەیرە کە بۆچی ئەو کابرایە ئەوەی بۆ خۆی بە ڕەوای زانیوە لە خەڵکی دیکەی قەدەغە کردوە؟!

جا ئەو ڕۆژنامەوانە (أنيس منصور) دەڵێ: (... (کلمنصو) وەك هەموو گورگە ئینسانەکان، لەهەموو کەس زیاتر بەسووکی سەیری ئافرەتی کردوە، وەهیچ کەس لەو قسەی خراپتری بەئافرەت نەگوتوە، چ کاتێك کەخەریکی ڕابواردن بووەو، چ کاتێکیش کە لەسەر جێگای مردن بووە!

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا یاریدەدەری وەزیری بەرگریی فەرەنسایی کتێبێکی لەبارەوە نووسیوە، سەرکردەکانی دنیای ڕۆژئاواش لەپیاوە هەرە بەرزەکانیانی دەزانن! بۆچی؟ چونکە زینای کردوەو ژنی نەهێناوە![3].

---

(١) ئەو وشەی (گوایە) خۆم زیادم کرد چونکە دڵنیا بووم کەدرۆو موبالەغەیە!

(٢) زۆڵ (غير شرعي) یەو مەبەستیشم لە (نازۆڵ) ئەوەیە کە (شرعي) بێت، بەڵام پێم حەیف بوو وشەی (شرعي) بۆ ئەوجۆرە منداڵە حەرامزادانە بەکاربێنم.

(٣) پێشتر گوتوویەتی ژنێکی ئەمەریکایی هەبووە، بەڵام ڕەنگە مەبەستی لێرەدا ئەوەبێ کەژنی ڕەسمیی لەیەکێك زیاتر نەهێناوە!.

بەڵێ، لەڕوانگەی ڕۆژئاواییەکانەوە زینا ئاساییە، بەڵام چەند ژنیی کەموکوورییەکە خاوەنەکەی- هەرچەندە بلیمەتیش بێت- بێ خێرو سەرەو ژێر دەکات! ئا ئەوەیە ئەو نەریتە پیسەی کە خاچپەرستێتی(الصَّليبية) دەیەوێ لەنێو ئێمەدا ڕەواجی پێبدات‌و ، لەشوێنی خۆیشی چەسپاندوویەتی‌و بارەکەڵای بۆ کێشاوە!

پێغەمبەری ئیسلام مانای هاوسەرێتی هێندە بەرزو پیرۆز کردوە کە شایستەی باسکردنە، هاوسەرێتی(زواج) لەئیسلام دا بریتی نیە لەدەست بەسەرداگرتنی پیاوێکی بەهێز بۆ مێینەیەکی بێ هێز! بەڵکو بەڵێن(عَقْد)ێکی ئازادانەیە کەبەناوی خواو مۆڵەت‌و زەمانەتیی وی دەستی پێکراوە و تەواو کراوە، وە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەحەجیماڵئاوایی(حجة الوداع)دا وتاری بۆ خەڵکی دا فەرمووی:

((**اتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ**)) واتە: لەبارەی ژنانەوە پارێز لەخوا بکەن! چونکە ئێوە وەك سپاردەیەکی خوایی وەرتان گرتوون‌و، بەوشەی خوا دامێنیانتان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردوە)).![1]

ئەمەش کورتەیەك بوو لەبارەی پووچاندنەوەی تۆمەتی چوارەمەوە، کەناحەزانی نەزانی شەریعەت بەهۆی مەسەلەی چەند ژنییەوە ئاراستەی ئیسلامیان کردوەو، وەك ڕوون بۆوە چەند ژنیی (تعدد الزوجات) یەکێکی دیکەیە لەبەڵگەکانی ڕاست‌و دروستیی شەریعەتی خواو، باشترین چارەسەریشە بۆ کۆمەڵێك گرفت‌و کێشە کە لەکۆمەڵگادا بۆ پیاوان‌و ئافرەتان دروست دەبن، ئەوانەش کەبڕوایان بەشەریعەتی خوا نیەو بەحیساب سیستەمی چەند ژنییان پێ هەڵەیە، دووچاری دەردی چەند

(١) بڕوانە: (فن الذكر والدعاء عند خاتم الانبياء) الشيخ محمد الغزالي، ص ٤٩، ٥٠، ٥١.

دۆستیی(تعدد الخلیلات) بوون و سەرەنجام ئافرەتە کلۆڵە بەدۆست گیراوەکان، بێجگە لەپێوە ڕابوێرانی جەستەیی - بۆ ماوەیەکی کەم- هیچ ماف و ئیمتیازێکی ماددیی و مەعنەوییان چنگ ناکەوێ و سەربارەش زۆر زۆر قورس لەسەر کەرامەت و کەسایەتیی خۆیان و چارەنووسیی منداڵە زۆڵەکانیان، کە نازانن باوکیان کێیە؟! وە سەرجەم کۆمەڵگاکەشیان دەکەوێ!

جا ئایا چەند ژنیی(تعدد الزوجات) شەریعەتی خوا بۆ ئافرەت باشترە، هەروەها بۆ وەچەکەی و کۆمەڵگایەکەیش، یان چەند دۆستیی(تعدد الخلیلات)ی ڕۆژئاوا ؟!!(١).

ئێستاش نۆرەی تۆمەتی پێنجەمە:

## ٥ -یاخی بوونی ژن (نشوز الزَّوجة) و چۆنیەتی چارەسەرکردنی:

ئەمیش مەسەلەیەکی دیکەیە لەو مەسەلانەی، کە ناحەزانی شەریعەت کردوویانە بەمایەی ڕەخنەگرتنیان لەئیسلام و، بەگومانی خۆیان بەڵگەی سەلماندنی بەسووك ڕوانینی شەریعەتە بۆ ئافرەت!

جا ئێمە سەرەتا لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی قورئان و سوننەت دا، ئەو مەسەلەیە لەشەریعەت دا چۆنە دەخەینەڕوو، پاشانیش بەدەم ڕوونکردنەوەی

---

(١) بڕوانە: (سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەند ژنیی لەبەر ڕۆشنایی شەرع و عەقل دا)، زنجیرەی بابەتە هەنووکەیی یەکان ئالقەی (١٢)،کە لەوێدا لێکۆڵینەوەی خەست و خۆڵم لە بارەوە کردوە،

حیکمەتەکەیەوە، قسەو قسەلۆکی ناحەزان لەوبارەوە دەپووچێنینەوە:

## بڕگەی یەك: چۆنیەتی ئەو مەسەلەیە لەشەریعەت دا:

وەك لەخاڵی سێیەمی ئەم بەشەدا باسمان کرد، شەریعەتی خوا (ﷻ) لەبەر چەند حیکمەتێك ئەرکی سەرپەرشتیاری(قِوامَـة)ی خێزانی خستۆتە ئەستۆی پیاوەوەو، دیارە بابای سەرپەرشتیاریش بۆ هەر کارو کۆمەڵێك دەبێ مافی چاودێریی و لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی هەبێ، ئەگەرنا بێگومان هیچ کەس بەدەست بەستراویی ئەرکی سەرپەرشتیاریی و بەرپرسیاریی بۆ ئەنجام نادرێ، جا لەسەر ئەم بناغەیە کەهیچ خاوەن عەقڵ و ویژدانێکی ساغ ناتوانێ نکووڵیی لێبکات، شەریعەت مافی ئەدەب دادان(حَق التأدیب) و لێپرسینەوەو سزادانی ئافرەت و خێزانی بەپیاو داوە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴿٣٤﴾ ﴾ (النساء: من الآية٣٤).

واتە: وە ئەو ژنانەی کەمەترسیی یاخی بوونیانتان هەیە، ئەوە ئامۆژگارییان بکەن، وە لەسەر جێیی دا دوورییان لێبگرن، وەلێیان بدەن، جائەگەر بەقسەیان کردن ئەوە بیانوویان پێمەگرن، چونکە بێگومان خوا بەرزو گەورەیە.

جا ئێستا با بەوردیی سەرنجی ئەم ئایەتە بەهێزو پیرۆزەی قورئان بدەین و، سەرەتا یەك یەکی وشە پێویستەکانی دەتوێژینەوەو، پاشان سەرنجێکی گشتی لەهەمووی دەدەین و، ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەریش ﷺ کە پێیەوە پەیوەندیدارن دەیان هێنینەوە:

١-(وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ) وە ئەو ژنانەی دەترسن لەیاخیبوونو سەرپێچییان، هەندێك لەزاناو توێژەرەوانیش گوتوویانە: مەبەست لە (تخافون) زانینو دڵنیابوونە لەیاخی بوونەکە، بەڵام بۆیە بەوشەی (تخافون) تەعبیری لێداوە، چونکە: مەترسیی هەبوون لەشتێك لەگەڵ زانینیدا لەیەك نیزیکن، وەك چۆن وشەی(ظن)یش لەقورئانیدا لەجێی (علم) و (یقین) بەکارهاتوە، بۆ وێنە:

﴿ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ (البقرة:٤٥-٤٦).

(أبو جعفر الطبري)[1]یش هەردووك ڕایەکەی هێناون، بێئەوەی وەك عادەتی خۆی یەکیان لێهەڵبژێرێ، منیش وای بۆ دەچم کەحیکمەتی ئەوجۆرە تەعبیرە ئەوەبێ کەهەردووك حاڵەتەکانی: مەترسیی هەبوون لەسەرپێچیکردنو یاخی بوونی ژنو، گەیشتنە قەناعەتو دڵناییش بگرێتەوە، چونکە لەهەندێك حاڵاندا تەنها بەهەست کردن بەپێشەکییەکانی یاخی بوون(نشوز) و مەترسیی لێهەبوونی، پێویستە یان لانی کەم دروستە کە مێرد لێپرسینەوەی خۆی لەگەڵ ژندا دەست پێبکات، بەرلەوەی کار لەکار بترازێ[2]! لەهەندێك حاڵانیشدا پێویستە هەڵوێستی یاخی بوونەکە تەواو ئاشکرا بێت، چونکە هەرچەندە تەواویش ئاشکرا بێت، زیانێکی وای نابێ، کە چارەسەر نەکرێو قەرەبوو نەکرێتەوە.

---

(١) بڕوانە: (جامع البيان) ج٤ص٨٧، ٨٨.

(٢) وەك ئەوەی کابرا هەست بکات کەژنەکەی چاوی تەماع دەبڕێتە پیاوێکی دیکە!

٢-(نُشُوزَهُنَّ) یاخی بوونیان، سەرپێچییکردنیان، (راغب الأصفهاني)[1] پاش ئەوەی ڕوونی کردۆتەوە، کە وشەی (نشُوز) لە (نَشَزْ)ەوە هاتوە کەبریتییە لە: تەپۆلکەو شوێنی بەرز(المُرْتَفِعُ من الأرض)، گوتوویەتی: ((ونشوزُ المرأةِ:بغضُها لِزَوجِها ورَفْعُ نَفْسِها عَنْ طاعته، وعَيْنِها عَنْهُ الى غَيْرِهِ)) واته: یاخی بوونی ژن بریتییە لە: ڕقوکینەی بەرانبەر بەمێردەکەی، وە خۆیە بەرزکردن لەبەقسەکردنی، وە چاوی خۆ بەرزکردنەوەو گواستنەوە بۆ غەیری مێردی.

کەمن پێم وایە ئەم پێناسەیەی (راغب) بۆ (نشوز) - خوا پاداشتی بداتەوە -، کۆکەرەوە(جامِعْ)ترین پێناسەیە، چونکە:

**ئافرەت، مەگەر چۆن، دەنا بە سێ پاڵنەران لەمێردەکەی یاخی دەبێتو لەقسەو فەرمانی دەردەچێ:**

أ- یان هەر ڕقی لەمێردەکەیەتیو کەیفی پێی نایەت!

ب- یان خۆی لەبەرانبەریدا بەزل دەگرێو سەرکەشیی دەکات!

ج-یان دڵی بەکەسێکی دیکەوەیەو چاوی لەدوایەتی!

جا هەرچەندە- وەك دواتر باسی دەکەین- هەر کاتێك ژن بەهۆکارێکی شەرعیی، یان ناشەرعییەوە دڵی لەسەر مێردەکەی هەڵقەناو ویستی لێی جیا بێتەوە، شەرع ڕێیداوە کە بەهۆی (خُلْع)ەوە خۆی قوتار بکات[2]، بەڵام بێگومان هەتا وا بخاتەڕوو کەژنو هاوسەری ئەو کابرایەیە، پێویستە سنوورو ئەدەبە شەرعییەکانی ژنومێردایەتی لەگەڵ بپارێزێ.

---

(١) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٨٠٦

(٢) لەبەشی حەوتەم و لەتەوەرەی دووەم دا بەدرێژیی باسی خولعمان کردوە.

٣-﴿فَعِظُوهُنَّ﴾ ئامۆژگارییان بکەن، (وَعْظ)یش وەك (راغب) گوتوویەتی:[١] بریتییە لە سەرزەنشت کردنێکی تێکەڵ بەترساندن(زَجْرٌ مُقْتَرِنٌ بالتَّخويف)، وە (راغب) لە (الخليل)ەوە نەقڵی کردوە کە لە پێناسەی (وعْظ)دا گوتوویەتی: بریتییە لەبیرخستنەوەی چاکە بەجۆرێك کەدڵ نەرم بکات(التذكير بالخَيْر فيما يَرِقُّ لَهُ القَلْبُ).[٢]

٤-﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ وە لەجێگای خەوتنیان دووریی یان لێبکەن، دیارە وشەی (هَجْر) وەك (راغب) گوتوویەتی[٣]: بریتییە لەدوورکەوتنەوەی ئینسان لەغەیری خۆی(مفارقَةُ الأنسانِ غَيْرَهُ)، وشەی (مَضاجع)یش کۆی (مَضْجَعْ)ە، کە بریتییە لەشوێنی خەوتنو پاڵکەوتن، وە مەبەست لەرستەی: ﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ وەك (راغِبْ) گوتوویەتی: کینایەیە بۆ سەرجێیی نەکردنیان(كِنايَةً عن عدم قربِهِنَّ).[٤]

٥-﴿وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ﴾ وە لێیان بدەن، شایانی باسە کەسەرجەم توێژەرەوانی قورئان لێرەدا، واتە: لەباسی لێدانی مێرد بۆ ژنەکەی دا.. چەندان فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ یان هێناون کەئەو لێدان(ضَرْب)ە بەمەرجی (غَيْرَ مُبَرِّح)ەوە دەبەستنەوە، بۆ وێنە: ((...**لا تَهْجُرُوا النِساءَ إلاّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ**))رواه مسلم عن جابر بن عبدالله ﷺ.[٥]

---

(١) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٨٧٦
(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەرەی پێشوو.
(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٨٣٣.
(٤) هەمان سەرچاوەو لاپەرە.
(٥) بڕوانە: (جامع البيان) للطبري" ج٤ص٩٧.

دیارە مەبەست لەوشەی (غَیْـر مُـبرح)یـش ئەوەیـە کەئێـسقانی نەشـکێنێ‌و گۆشتی بریندار نەکات‌و زۆر پێی ناڕەحەت نەبێ.[(١)]

٦-﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ﴾ جا ئەگەر فەرمانبەرییان کردن‌و وازیان لـەیاخی بـوون هێنـا، جـا هەرچـەندە توێـژەرەوان لەتەفسـیری ئـەم ڕسـتەیەدا قسـەیان زۆر کردوون، بەڵام پێم وایە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان(إمـام مفسـري القـرآن) لەهەموویان چاکتر ئەو ڕستەیەی تەفسیر کردوە، کە گوتوویەتی[(٢)]: ((...فإن راجَعْن طاعتكم عند ذلك وفـئنَ الى الواجـب علـيهنَّ..)) واتـە: جـا ئەگـەر گەڕانەوە بۆ فەرمانبەریی کردنتان پاش ئەوە، وە گەڕانەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان...

٧-﴿فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾ ئـەوە لێیـان لـەبیانوو مـەبن، وەك (الطَّـبري)ی گوتوویـەتی[(٣)] : (اذا أطاعَتْـك فـلا تَبغـيَنَّ عليهـا العِلَـل)) واتـە: ئەگـەر بەقسەی کردی (لەجێبەجێ کردنی ئەو شتانەدا کەشـەرع لەسـەری پێویـست کردوون بەرانبەر بەمێردی)[(٤)] ئەوە لێـی بـەدوای بەهانـەدا مەگـەڕێ‌و بـەبێ بەڵگەی شەرعی تێی هەڵمەپێچە.

ئنجا با چەند دەقێکی سوننەتیش بۆ بەرچاوڕوونی زیـاتر لـەبارەی تەفسـیری ئەو ئایەتەو شێوازەکانی سزادانی ئـافرەتی یـاخی‌و سەرکەشـەوە بێنینـەوە، پاشـان بەگشـتی سـەرنجی مانـاو مەبەسـتی ئایەتەکـەو مەسـەلەی سزادانی

---

(١) بڕوانـە: (جـامع البيـان) ج٤ص٩٦، ٩٧، وە: (الجـامع لأحكـام القـرآن) للقرطـبـي، ج٣ص١٤٣٣.

(٢) (جامع البيان) ج٤ص٩٨،، وە (الجامع لأحكام القرآن) ج٣ص١٤٣٣.

(٣) (جامع البيان) ج٤ص٩٨، ٩٩، وە (الجامع لأحكام القرآن) ج٣ص١٤٣٣، ١٤٣٤.

(٤) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم زیادم کردوە، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست.

ئافرەتی یاخی(ناشز) دەدەین:

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**لاَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمْ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ!**))رواه البخاري. واتە: (با یەكێكتان وەك كۆیلە بەقەمچی لەژنەكەی نەدات، پاشان شەوێ لەگەڵی جووت بێت!).
* وە (مالك) لەپێغەمبەری خواوە ﷺ هێناویەتی كە كاتێك مۆڵەتی لێوەرگیراوە كەلەژنان بدرێ، لەكاتی یاخیبوونیان دا، فەرموویەتی: ((**إضْرِبُوا ولَنْ يَضْرِبَ خيارُكُمْ**) واتە: لێیان بدەن–لەقۆناغی سێیەمی سزادانیان دا– بەڵام چاكەكانتان لە ژنیان نادەن.))
* هەروەها (ابوداود) لە (إياس بن عبدالله) گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لاَ تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللَّهِ**) واتە: لەبەندە مێینەكانی خوا مەدەن، جا دوایی (عمر بن الخطاب)-خوا لێی ڕازی بێ- هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ژنان لەمێردەكانیان یاخیو بێ منەت بوونە!، ئەوجار مۆڵەتی فەرموو كەلێیان بدرێ، جا ژنانێكی زۆر هاتنە ماڵی پێغەمبەری خواو لای هاوسەرەكانی كەسكاڵایان لەچنگ مێردەكانیان دەكرد، ئەویش فەرمووی: ((**لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ**)) واتە: ئەوجۆرە كەسانەتان چاك نین.[1]

**جا ئێستا با لەچەند خاڵێكدا سەرنجێكی گشتی لەم ئایەتە بدەین:**

**یەكەم:** زانایانی ئیسلام لە سەر ئەوە یەك دەنگن كە هەر پیاوێك لە خۆڕا و بەبێ بەڵگەی شەرعیی لە ژنەكەی هەڵپێچێ و شەری پێبفرۆشێ، ئەوە گوناهبارەو، ئەگەر كابرا هەر چاك نەبوو و نەهاتەوە ژێر باری شەرع، ژنەكە

(١) بڕوانە: (المفصل فی أحكام المرأه والبيت المسلم) ج٧ص٣١٦، ٣١٧.

بـۆی هەیـە لـە لای قـازی شـكاتی لـێبكاتو بۆیشـی هەیـە داوای لـە خۆداڕنین(خلـع)ی مێردەكـەی بكـات، هـەر بۆیـەش هەرسـێك قۆنـاغی سزادانەكەی تایبەت كردوون بە: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ﴾(النساء: ٣٤).
كەواتە: تەنیا لەكاتێكیدا مێرد بۆی ڕەوایە ئەوسێ قۆناغەی لێپرسینەوە لەگەڵ ژنەكەی دا ئەنجام بدات، كەژنەكەی كەمتەرخەمی لەو ئەركانەدا بكات،كە لەسەری فەرزن.

دووەم: هەروەها زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەش یەكدەنگن كەتەنها كاتێك ژنی سەرپێچیكەر (عاصیة) نازناوی یاخی(ناشز) وەردەگرێ، كە لە سنووری شەرعداو لەو شتانەدا، كە شەریعەت وەك ئەركێكی پێویست خستوونیە گەردنی ژنەوە،لەبەرانبەر مێردیدا لاریی هەبێت[1]، ئەگەر نا ئەگەر بێتو پیاوەكە داواكارییەكی ناشەرعیی لە ژنەكەی هەبێ، بۆ وێنە: بیەوێ لە كاتی (حیض)دا یان لە پشتەوە(دبر)ی لەگەڵی جووت بێ، ئەوە نەك هەر ئەو هەڵوێستەی بەیاخیبوون(نشوز) دانانرێ، بگرە ئەو هەڵوێستەی فەرزیشەو، ئەگەر مێردەكەی دەست لەو ڕەفتارە ناشەرعییانەی هەڵنەگرێ، پێویستە لەلای قازی شكات بكات و داوای لێ جیابوونەوەیشی بكات، چونكە فەرمانبەریی ژن نەك هەر بۆ مێردەكەی، بەڵكو تەنانەت بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ بەسنووری شەرعو چاكەوە بەندە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَـٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ

(١) بڕوانە : (الفقه الاسلامي وأدلته) د. وهبة الزحيلي، ج ٩ ص ٦٨٥٤، وە : (المفصَّل) ج ٧ ص٣١٠



بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٍ ﴾(الممتحنة:١٢)

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إنما الطاعة في المعروف)) رواه البخاري. واتە: بێگومان فەرمانبەریی کردن تەنها لە چاکەدایە.)

**سێیەم:** زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بەبێ عوزرو هۆی شەرعیی، ملنەدانی ئافرەت بۆ سەرجێیی(مباضعة)ی پیاو، ئافرەت دەکاتە شایستەی سزادران بە هەرسێك قۆناغو شێوازەکانییەوە، [1] فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەیەوە زۆرن، بۆ وێنە: ((**إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ فَبَاتَ غَضْبَانَ عليها، لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ**))متفق عليه. واتە: (هەرکاتێك پیاو ژنەکەی خۆی بانگ کردە سەرجێگاکەی و ملی نەدا، ئەویش لێی تووڕە بوو، ئەوە هەتا دەبێتە ڕۆژ، فریشتەکان نەفرینی لێدەکەن).

بەڵام لەو بارەوە ،کە ئایا بۆ غەیری ئەوەش مێرد مافی لێپرسینەوەی ژنەکەی هەیە، تاکو دەگاتە شێوازی کۆتایی کە لێدان(ضرب)یەتی؟! زانایان ڕاجیاییان لەو بارەوە هەیە، بەڵام وا پێدەچێ بەم سێ بەڵگەیەی خوارێ، هیچ کەس گومانی لەوەدا نەمێنێ کە مێرد لەسەر هەر شتێکی دیکەش کە لەسەر ژن پێویست بێت، جا چ حەقی خوایی بێت وەك: نوێژو زەکاتو ڕۆژوو...هتد.، وە خۆ دوورگرتن لە قەدەغە کراوەکان وەك: درۆو غەیبەتو بوختان و ...هتد، وە چ هەقی ماڵو مێرد بێت وەك: لەماڵ نەچوونەدەر بە بێ مۆڵەتی مێردو، فەرموونەکردن بۆ کەسانێك کە مێردەکەی حەز لە

(١) بڕوانە : (الجامع لاحكام القران) للقرطبي، ج ٣ ص ١٤٣٣.

چارەیان نەکاتو ،خزمەتی ماڵ[1] و مێرد، وێنەی: جلو بەرگ شۆردن و نان و چێشت سازکردنو...هتد، بەڵێ ئەگەر بەقسەی خۆش نەهاتە ژێر باری شەرع، وردە وردە سزایەکەی توند بکات، ئەو سێ بەڵگەیەش ئەمانەن:

١- خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ (التحریم: ٦)، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! خۆتانو خێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن كە سووتەمەنییەكەی خەڵكو بەردە....

کەواتە ئینسان وەك چۆن خۆ لە ئاگری دۆزەخ پاراستنی لەسەر فەرزە، هاوسەرو خێزان لێ پاراستنیشی هەر لەسەر فەرزەو، ئاشکراشە کە ئینسان چ پیاو بێ چ ژن، بەجێبەجێ کردنی ئەرکە شەرعییەکان، جا چ پەیوەست بن بەخواوەو مافی خوا (حق الله) بن، چ مافی خەڵك (حق الناس)بنو پەیوەست بن بەخەڵکەوە، وە چ بە باری ئیجابییدابن، کە ئەنجامدانی فەرزو سوننەتەکانە، وەچ بە باری سەلبییدابن، کە خۆ دوورگرتنە لە قەدەغەکراوو ناپەسەندەکان، بەڵێ ئینسان بەجێبەجێکردنی ئەرکە شەرعییەکان، لە ئاگری دۆزەخو تۆڵەی خوا دەپارێزرێ، کەوابێ ئەرکی سەرشانی مێردە - بەحوکمی ئەرکی سەرپەرشتیاریی ژن و خێزان پێسپێرران- کە وریای ماڵو خێزانی بێتو نەهێڵێ دووچاری ناشەرعییەکبن، کە سزایەکەی تووڕەیی خواو ئاگری دۆزەخە.

---

(١) هەر چەندە زانایان لەوبارەوە ڕاجیایان هەیە، بەڵام وەك لەباسەکانی داهاتوودا دەیخەینە ڕوو، ڕای ڕاست و هەق ئەوەیە، کە ئافرەتیش خزمەتی ماڵ و مێردی لەسەر فەرزە، وەك لەبەشی پێنجەم دا باسمان کردوە.

٢- بەقیاس لەسەر ئەوە کە پیاو بۆی هەیە لەسەر ملنەدانی ژن- بەبێ هۆو پاساوی شەرعیی- بۆ سەرجێیی(المباضعة) لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات هەتا دەگاتە ڕاددەی لێدان، بەڵێ بەقیاس لەسەر ئەوە، گوتراوە: پیاو بۆی هەیە لەسەر هەر کارو ئەرکێکی دیکەی شەرعییش، لێپرسینەوە لەگەڵ ژنەکەیدا بکات، هەتا دەگاتە ڕاددەی سزاو جەزرەبەی جەستەیی.[1]

٣- هەڵبەتە وشەی یاخی بوون(نشوز)یش موتڵەقی سەرپێچیی و یاخی بوونو پشت پەل بوون دەگەیەنێ و، بەبێ بەڵگەیەکی شەرعیی ڕوون دروست نییە چەمك و واتا فراوانو گشتگیر و گشتییەکەی تەسك بکرێتەوەو، تایبەت بکرێ بەهەندێك شتەوە، وەك زانایانی (أصول الفقه) باسیان کردوە.[2]

شایانی باسیشە کە ژنی یاخیبوو(ناشز) تێکرای زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتون کە-مەگەر دووگیان(حامل) بێ-، دەنا مافی مەسرەف کێشرانی بەسەر مێردەکەیەوە نامێنێ، وەك (ابن المنذر) گوتوویەتی: (اتفق أهل العلم على وجوب نفقات الزوجات على أزواجهن إذا كان جميعاً بالغين الا الناشز منهن الممتنعة)،[3] چونکە ماقووڵ نییە کەسێك مافی شەرعییت بفەوتێنێ و، تۆش لەسەرت فەرز بێ کە خزمەتی بکەی.!

**چوارەم:** هەروەها زاناو توێژەروان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە ئەو سێ جۆرو قۆناغانەی لێپرسینەوەی مێرد بۆ ژنی سەرکەش و یاخی و لەشێرازەی شەرع

---

(١) بڕوانە (الجامع لاحكام القرآن) ج٣ ص١٤٣٣.

(٢) بڕوانە : (الوجيز في أصول الفقه) د. عبدالكريم زيدان، ص٣١٧، ٣١٨ .

(٣) بڕوانە : (الجامع لاحكام القران) ج٣ ١٤٣٣.

چووەدەر، دەبێ بەڕیز(ترتیب)ێك بن، كە خوا فەرموویەتی پلەپلەیی(تدرج) لە جێبەجێ كردنیاندا ڕەچاو بكرێت.

ئنجا ئەگەر سەرنجی ئەو سێ جۆرە سزادانەش بدەین، دەبینین حیكمەتی زۆر گەورەیان تێدایە، چونكە، یەكەمیان، كە ئامۆژگاریی(وعظ)یە، لە تایبەتمەندیی ترین‌و بەرزترین پێكهێنەری ئینسانەوە كە ئاوەز(عقل)ە، دەست پێدەكات، ئاخر قسەی خێرو ئامۆژگاریی یەكسەر پەیوەندیی بە عەقڵ‌و بیرو هۆشەوە هەیەو، ئینسانیش بەر لە هەر شتێكی دیكە بەعەقڵ و هۆش لە ئاژەڵ جیادەبێتەوە، كەواتە: قۆناغی یەكەمی لێپرسینەوە كردن لەگەڵ ژنێكدا كەیاخی و پشتپەل بووە، بریتییە لە دواندنی تایبەتمەندیی ترین و بەرزترین پێكهێنەری!

ئنجا ئەگەر ئەو ژنە سەركەشە هەرچەندە پیاوەكەی بەقسەی خۆش‌و ئامۆژگاریی‌و سەرزەنشت‌و بیرخستنەوەو...هتد.، لەگەڵی خەریك بوو كە لە كەلی شەیتان بێتە خوارێ‌و، بێتەوە ژێر سایەو قەڵەمڕەوی شەرع‌و واز لە لادان‌و سەرەخەریی بێنێ، بێسوود بوو، شەریعەتی خوای كاربەجێ دیاری كردوە كە پیاوەكە لە شێوازی چارەسەرەكەی پلەیەك بێتە خوارێ‌و ئەمجارە - كە ژنەكەی زمانی عەقڵ‌و مەنتیقی فەرامۆشكرد- بەزمانی ڕەگەز(جنس) بیدوێنێ و تێی بگەیەنێ كەمادام ئەو گوێ بە پیاوەتیی(رجولة)ی پیاوەكەی نادات، ئەویش لە مێینەتیی(أنوثة) ژنەكەی بێمنەتە، بێگومان ئەم شێوازەی دووەمیش لە نەفسییەتی ژندا زۆر كاریگەرە، چونكە ژن دەزانێ كە بەهێزترین چەكی لەبەرانبەر پیاودا بریتییە لە ئاتاجیی پیاو بۆی، وە داواكراو(مطلوب) بوونی وی بۆی، جا كە بۆی دەركەوت پیاوەكەی هێندەی ئێش پێگەیشتوە، ئەولایەنەی تێدا فەرامۆشكردوە! ئەوە چاوێكی جیددیی

بە هەڵوێستی خۆیدا دەگێڕێتەوە، مەگەر یەکجار یاخی و لەخۆباییو سەرکێش بێ، ئەگەر نا دێتەوە سەر ڕێ و واز لە ڕەفتارە ناشەرعییەکانی دێنێ.!

وە لە کۆتاییدا ئەگەر دیسان ژنەکە هەر لەسەر قسەو هەڵوێستی خۆی مکوڕ بوو، واتە: نەبەمەنتیقی عەقڵو هۆش ئیقناع بوو، وەنە بە مەنتیقی جینس حاڵی بوو، و زەنگی تایبەتمەندیی ترین پێکهێنەری ئافرەتایەتیش بێداری نەکردەوە! ئەوجار بەناچاریی شێوازی سێیەم خۆی فەرز دەکات، کە لێدانێکی سووکی وایە نەئێسك شکانو نە پێست ڕووشانی تێدایەو، زیاتر ئازار پێگەیاندنێکی نەفسییە لە ڕێی جەستەوە، نەك ئازاردانی خودی جەستەکە، دیارە ئەم شێوازو قۆناغی سێیەمەی لێپرسینەوەش-لەکاتی خۆیدا وەك شەرع دیاریکردوە- زۆر بەجێیەو نزمترین پلەی سزادانیشە بۆ بەرزترین شێوەی یاخیبوون و نزمترین ئاستی ئینسان!

کوردانیش گوتوویانە: (ئەسپی ڕەسەن پێویستی بە ئاوزەنگ ناکات)، دیارە هی نارەسەنیش دەبێ...!

**کەواتە:**

بابای مێرد، هەرچەندە ژنەکەشی لێییاخی و پشتپەل بوو بێت، بۆی نیە چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿وَٱضۡرِبُوهُنَّ﴾(النساء: ٣٤)، هەر لەگەڵ ژنەکەی سەرپێچییەکی کرد، بێ سێ و دوو هەڵکوتێتە سەریو کوتەککاریی بکاتو، پاشانیش پێی وابێ، کە بە گوێرەی شەرعی خوا ڕەفتاریکردوە!!

چونکە وەك شارەزایانی زمان گوتوویانە: هەرچەندە پیتی (و) بۆ خستنەوە سەریەك(عطف)و کۆکردنەوە(جمع) بەکاردێت، بەڵام بە پێی سیاق مانای دەگۆڕێ و

لێرەدا ڕیز(ترتیب)یش دەگەیەنێ[١]

ئنجا با سەرنج بدەین داخۆ زانایانی ئیسلامیش لەوبارەوە چییان گوتوە؟

(القرطبي) لەوبارەوە نووسیویەتی[٢]: (أمر الله ان يبدأ النساء بالموعظة اولاً، ثم بالهجران، فإن لم ينجحا فالضرب، فإنه هو الذي يُصْلِحُها له ويَحْمِلُها على توفية حقه...) واتە: خوا فەرمانی کردوە، کە (بۆ ئەدەب دادانی) ژنان- ی یاخی- سەرەتا بە ئامۆژگاریی لە گەڵیاندا دەستپێبکرێ، دوایی بەخۆ لێ دوور گرتن، ئنجا ئەگەر ئەو دوانە سوودیان نەبوو، بەلێدان، چونکە دیارە لێدان ژنەکەی بۆ چاك دەکات ،وە واداری دەکات کە مافەکەی بۆجێبەجێ بکات.

هەروەها (الإمام الرازي) هەر لەو بارەوە گوتوویەتی[٣]: (... الذي يدل على نص الآية أنه تعالى آبتدأ بالوعظ، ثم ترقّى منه الى الهجران في المضاجع ـ ثم ترقى منه الى الضرب، وذلك تنبيه — يجري مجرى التصريح في أنه مهما حصل الغرض بالطريق الأخف وجب الإكتفاء به ،ولم يجز الإقدام على الطريق الأشق).

کە بە کورتیی ئەمیش دەڵێ: ئایاتەکە ڕیزو پلەپلەیی دەگەیەنێ و، ئەوە دەگەیەنێ کە هەتا بە شێوازێکی سووك و ئاسانتر ئامانجەکە بهێنرێتە دی، دروست نیە پەنا ببرێتە بەر شێوازێکی قورستر.

دیسان شەرعزانان(فقهاء)یش هەروایان گوتوەو ئەوەیان دووپات کردۆتەوە کە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە.[٤]

---

(١) بڕوانە : (الفقه الاسلامي وأدلة) د. الزحيلي، ج٩ص٦٨٥٦.

(٢) بڕوانە : (الجامع لاحكام القرأن) ج٣ص١٤٢٣.

(٣) بڕوانە : (مفاتيح الغيب) الإمام فخرالدين الرازي، ج١٠ص٩٠.

(٤) بڕوانە : (المغني) لابن قدامة، ص٤٦، وە : (بدائع الصنائع) للكاساني، ج٢ص٣٣٤ وە : (الفقه لاسلامي وأدلته) ج٩ص٦٨٥٤، وە : (المفصل) ج٧ص٣١٠ تا ٣١٩.

ئێستاش کە بۆمان دەرکەوت ئەم مەسەلەیە لە شەریعەتدا چۆن چۆنییە، با بچینە سەر برگەی دووەمی ئەم خاڵی پێنجەمە، بزانین ئەو تۆمەت(شبهة)ی کەناحەزانی شەریعەت بە تیرێکی کاریگەری تێگەیشتبوون ،چی لێ ماوەتەوە.؟!

## برگەی دوو: حیکمەتی ئەو مەسەلەیە:

وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، حیکمەتی ماف پێدرانی پیاو بە لێپرسینەوەو سزادانی ژن لە کاتی یاخی بوونیدا- بەمانای شەرعیی و ڕاستەقینەی یاخی بوون- لەسەر بناغەی ئەرکی سەرپەرشتیاری ژنو ماڵو خێزان بە پیاو سپاردن، شتێکی سروشتیی و ڕەوایە و غەیری ئەوە نائاسایی و ناماقووڵو بێ جێیە، چونکە ماقووڵ نیە پیاو لەسەر لادانو کەمتەرخەمیی و بێسەرەو بەرەیی و کەموکوورییەکانی ژنو منداڵەکانی بەرپرسیار بێتو، لە دنیاو دوارۆژدا موستەهەقی سزاو تۆڵەی خەڵكو خوا بێت، کەچی ڕێی پێنەدرێ ئەو وەسیلەو هۆکارانە بەکار بێنێ کە پێویستی پێیان هەیەو، بگرە یەکی لەسەریان کەوتوە، بۆ پەروەردەکردنو ئەدەب دادان(تأدیب)و ڕاستکردنەوەی ئەو ژنو خێزانەی کە لە بەرانبەریاندا بەرپرسیارە!!

**ئنجا پێویستە لەم شتانەش بێئاگا نەبین:**

١- لێدانی ژنان لە قۆناغی سێیەمی لێپرسینەوەشدا ئەویەرەکەی ڕەوا(مُباح)یەو، پێم شك نایەت هیچ زانایەك نەك بە فەرز، بە سوننەتیشی دانابێ، دیارە بە سەرنج لێدانی دەقەکانی سوننەتیش کە پێشتر ئاماژەمان پێکردن، هەر ئەوە دەفامرێتەوە.

ئەم فەرموودەیەش کە (ابن ماجة) لە (عائشة)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هێناویەتی بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر پەسەند نەبوونی لێدانی ژنان هەرچەندە ڕەواش بێت: ((**مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَادِمًا لَهُ وَلَا امْرَأَةً وَلَا**

**ضَرَبَ بِيَدِهِ شَيْئًا**)).

هەروەها خاوەنی: (عون المعبود شرح سنن ابي داود) لەو بارەوە پاش هێنانی ئەو فەرمایشتانەی کە لێیان دەفامرێتەوە لێدانی ژن ڕەوایە، نووسیویەتی: (وفيه من الفقه ان ضرب النساء في منع حقوق النكاح مباح على ان يكون ضرباً غير مبرِّح، ... ثم لما بالغوا في الضرب أخبرَ ﷺ ان الضربَ وان كان مباحاً على شكاسة أخلاقهن، فالتحمّل والصبر على سوء أخلاقهن وترك الضرب أفضَل وأجملُ).[1]، کەکورتەکەی ئەوەیە: هەر چەندە لێدانی ژنان لەکاتی ناچاریی دا ڕەواو ڕێ پێدراوە، بەڵام تەحەمولکردنی پیاوان و سینگ فراوانییانو پەنانەبردنیان بۆ لێدان، باشترو پەسەندترە.

٢- ئنجا دەبێ بزانرێ کە وەك چۆن ژنان دووچاری دەردی سەرکەشیی و یاخیبوون دەبن، بە هەمان شێوە پیاوانیش جاری واهەیە دووچاری ئەو دەردە دەبن، وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾(النساء/١٢٨)

واتە: وە هەر کات ژنێك مەترسیی یاخیبوونو پشت هەڵکردنی لە مێردەکەی هەبوو، ئەوە گوناحیان ناگاتێ کە لە نێوان خۆیاندا پێك بێنو، بێگومان هەر صولحو پێکهاتنیش چاکترە.

**کەواتە:**

با هیچ کەس وا نەزانێ کە شەریعەتی خوا، یاخیبوون(نشوز)ی تەنها بە باڵای ژنان بڕیوەو، تەنها ڕێڕوونیی پیاوانیشی کردوە بۆ چارەسەری

(١) بڕوانە: (عون المعبود ...) ج٦ ص ١٨٤، ١٨٥.

واقیعیبیانەی حاڵەتی یاخی بوونی ژنان! بەڵکو لە شەریعەتدا باسی حاڵەتی (نشوز)ی پیاوانیش کراوەو ڕێی چارسەری واقیعیبیانەو حەکیمانەش پێشانی ژنان دراوە!

ئەوەندە هەیە شەریعەتی خوای کاربەجێ، دوو ڕێگاو شێوازی جیاوازی بۆ هەر کام لە پیاوانو ژنان دیاری کردوون بۆ چارسەری حاڵەتی ناوبراو، کە هەر کام لەو دوو ڕێبازو شێوازە، لەگەڵ سروشتو کەسایەتیی پیاوانو ژنان دا، پڕ بەپێستن!

٣- کەسانێکیش کە ڕەخنە لە شەریعەت دەگرن کە بۆچی ئەو مافەی بەپیاو داوە؟ لێیان دەپرسین: ئایا ئێوە بەدیلتان چییە؟! ئایا واز لە ژن بهێنرێ یاخی بێتو پیاوی کلۆڵیش لە بەرامبەریدا دەستەپاچە بێت؟! وە ئایا هەرگیز پیاو چ مسوڵمان چ کافر، لە بەرانبەر سەرکێشیی و یاخیبوونی ژنەکەیدا دەستەوسان بووە؟! ئەدی ئەو هەموو ئافرەتە کوژراوو لێدراوو سەروگوێلاك شکێنراوانەی ڕۆژئاوا چین، کە لەلایەن مێرد یان دۆستەکانیانەوە، شەوکوژو شەوکوت دەکرێن؟ کە بەپێی ئامارە ڕەسمییەکان ساڵانەو مانگانە لە زیاد بووندان!!!![1]

---

(١) بەهانگای: (مامانیی و نەخۆشییەکانی ژنان) لە گۆڤارێکی تایبەت بە خۆی داو لە ژمارەی مانگی (ینایر)ی ساڵی (١٩٩٣)دا وتارێکی دوورودرێژی لە بارەی کێشەو گرفتارییەکانی ژنانی ئەمەریکایی بە دەست مێردەکانیانو دۆستەکانیانەوە نووسیوەو، لە وتارەکەدا هاتووە کە: لە هەر (١٢) چرکەدا ژنێك دەستدرێژیی دەکرێتەسەر، وە لە هەر (١٢) چرکەدا ژنێك لەلایەن مێردەکەی یان دۆستەکەیەوە هەتا ڕادەی کوژرانو تێك شکێنران کوتەککاریی دەکرێو ...هتد!
بڕوانە: (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني) ص ٣٢ تا ٣٤.
نووسینی: د. محمد سعيد رمضان البوطي.

ئنجا ئایا ئەگەر گریمان پیاوەکەش بە هەر هۆیەکەوە بوو وازی لە ژنەکەی هێنا، کە لەسەر یاخیبوونی خۆی بەردەوام بێت، ئایا ئەو گرفتو کێشەیەی کە بەهۆی سەرکێشیی و یاخیبوونی ژنەکەوە پەیدا بووە، بەخۆلێ کەرکردنی پیاوەکەی چارەسەر دەبێ، یان بە دەردی عارەب گوتوویانە: قوڕەکە خەستتر دەبێ(زاد الطين بلَّةً)؟!

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز!**

لەبەردەم دیاردەو حاڵەتی یاخی بوونی ژندا، تەنها سێ ئەگەر(إحتمال)مان لە پێشەو ناچارین یەکیان هەڵبژێرین:

١- کە بە پیاوەکە بڵێین: بۆت نیە هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەك لەگەڵ ژنەکەتدا بکەی، کە بەشێوەیەکی تیۆریی و ڕەسمیی ڕۆژئاوا ئەم ئەگەرەی هەڵبژاردوە، هەر چەندە واقیع زۆر پێچەوانەو دوورە!

٢- کە بە پیاوەکە بڵێین: هەر کاتێك ژنەکەت بەپێی تەرازووی شەریعەت لای دا، بەو سێ شێوازە ریزکراو(مرتب)ەی کە دیاریکراون، پلەپلە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکە.

٣-کە بە پیاوەکە بڵێین: کەیفی خۆتەو چۆن عەقڵت بڕی ئاوا کێشەو گرفتەکەت چارەسەربکەو، هیچ جۆرە سنوورو پێوەرێکی بۆ دیاری نەکەین.

ئاشکراشە کە کامیان ڕاستو بەجێیەو، لە بەرژەوەندیی هەر کام لە پیاوو ژنو خێزانیش دایەو، لەگەڵ فیترەتیشیاندا گونجاوو پڕ بە پێستە.

**لە کۆتاییشدا دەڵێم:**

ئەو کەسانەی کە بەناوی یەکسانیی ژنو پیاوەوە، ئەوە ڕەواج پێدەدەن کە ڕێدرانی پیاو بە سزادانی ژن- بەو جۆرە کە شەریعەت دیاری کردوە- ستەمێکەو

نابێ ژنان قبوولّی بکەن! وێڕای خۆ کافر کردنیان، ئەگەر پێشتریش بە شتی دیکە کافر نەبووبن، یان هەر لە ئەسڵدا کافر نەبووبن، ئافرەتانیش تووشی شەڕێکی دۆڕاو دەکەن، چونکە پیاوان بە حوکمی فیترەت دەستبەرداری ئەو هەق و عادەتەی خۆیان هەر نابن، وەك لە پێشکەوتووترین وڵاتانی دنیادا-بە حیسابی ئەو جۆرە کەسانە- کە جیهانی ئەورووپاو ڕۆژئاوایە دەستبەرداری نەبوونە!

ئیدی سەرەنجام:

لەلایەکەوە ژن وای لێ حاڵی کراوە کە کەتو مت لە هەموو شتێك دا وەك پیاوەو، پێویستە لە هەموو شتێکیش دا وەك وی ڕەفتار بکات، ئەگەر بیەوێ یەکسانیی خۆی لەگەڵ پیاودا ئیسپات بکات، بۆیە پیاو مافی سزادان و لێپرسینەوەی ئەوی نیەو، پێویستە لە بەرانبەر مستێدا دریشەی بۆ ڕابگرێ چونکە: (لا يَفُلُّ الحديدَ الا الحديد... ئاسن هەر بە ئاسن دەپاچێتەوە)!

وە لەلایەکی دیکەشەوە وەك گوتمان: پیاو بەحوکمی فیترەت و عادەتی پیاوانەی خۆی لەسەر مافی خۆی (کەلێپرسینەوەی ژنە) سوورە! دیارە شەریعەتیش لە ئارادا نیە تاکو شێرازەو سنوورەکان دیاری بکات!

بۆیە لە ئاکامدا پیاو لە ژنەکەی دەدات و ژنیش دەست دەکاتەوەو بەرگری لە خۆی دەکات بە گوێرەی فەرهەنگی ڕۆژئاوایی! ئەنجامی پێکدادانی ژن و پیاویش وەك ڕۆژی ڕوون دیارەو پێویست بە شەرح ناکات!

بەڵێ ئەمەش بە حیساب یەکی دیکە بوو لەو تۆمەت و تیرانەی، کە ناحەزانی شەریعەت لە شەریعەتیان گرتبوو، بەڵام دەرکەوت کە ئەو تۆمەت و تیرەشیان وەك هاوەڵە پێشووەکانی، بۆ خۆیان گەڕایەوە و کوردەواریشمان ڕاستیان گوتوە: (تفی بەرەو سەرێ بۆ خاوەنی دەگەڕێتەوە!).

## ٦- بەرگو پۆشاکی ئافرەت (لباس المرأة):

یەکێ دیکەش لەو مەسەلانەی کەبەخەیاڵی خاوو گومانی بێ بنەوانی ناحەزانی شەریعەت، تۆمەتێکەو ئاڕاستەی ئیسلام دەکرێو پێی خەتابار دەکرێ، ئەوەیە کە ئیسلام ئافرەتی پابەند کردوە بەجۆرە بەرگو پۆشاکێکەوە، کە تارادەیەکی زۆر ئازادیی لێ زەوت دەکات و، ڕێی جموجۆڵو چالاکی لێدەگرێ!

جا ئێمە وەك عادەتی خۆمان لەپووچاندنەوەی سەرجەم ئەو تۆمەتانەدا، سەرەتا هەڵوێستی ڕاستو ڕوونی شەریعەت لەبارەی چۆنیەتی بەرگو پۆشاکی ئافرەتو خۆداپۆشینیەوە دەخەینەڕوو، پاشانیش حیکمەتی ئەو مەسەلەیە ڕووندەکەینەوە، تاوەکو بەشێوەیەکی جوانو ئاسان، تەمی ئەو تۆمەتەش بڕەوێتەوەو، حیکمەتو دانایيو کارامەیی زیاتری شەریعەتیش ئاشکرا بێت:

### بڕگەی یەکەم: چۆنیەتی پۆشاکی ئافرەتو سنووری عەورەتی لەشەریعەتدا:

**خوێنەری بەڕێز!**

لەسۆنگەی ئەوەوە کەبەزۆری ڕەخنە و گلەییو گازندەی ناحەزانی شەریعەت لەم مەسەلەیەداو، لەزۆربەی هەرەزۆری مەسەلەکانی دیکەشدا، بەهۆی خراپ تێگەیشتنیانو بێئاگاییان لەشتەکانە لەئەسڵو خودی شەریعەتدا، وەبەهۆی بیستنو دیتنی بیروبۆچوونو ڕەفتارو هەڵسوکەوتی هەڵەو ناشەرعییانەی هەندێك لەمسوڵمانانەوەیە، بۆیە بەپێویستی دەزانم کە هەمیشە مەسەلەو بابەتەکان لەخودی شەریعەتدا چۆنن، ئاوا بیانخەمەڕوو بەر لەوەی بچینە سەر پووچاندنەوەی قسەو تۆمەتەکانی ئەوان، چونکە پێم وایە هەر بەخستنەڕووی مەسەلەکان وەك

خۆیان، زۆر لەو هەڵوێستە هەڵەو دوژمنکارییانەی کەلەسەر تێگەیشتن و بۆچوونی هەڵە بنیاتنراون، وەك دیواری بناغە ڕووخاو لەخۆوە هەرەس دێنن!

جا ئێستا با سەرنج بدەین، داخۆ شەریعەتی بەرجەستە لەقورئانو سوننەتدا، چ جۆرە بەرگو پۆشاکێکی بۆ ئافرەت دیاریکردوە؟ وە ئایا ڕاستە ئەوجۆرە بەرگو پۆشاکە ئازادیی جموجۆڵو چالاکییە شەرعییەکان لەئافرەت زەوت دەکات؟ یان بەپێچەوانەوە کەسایەتییو ڕێزو قەدری پێی زیاد دەکاتو، بوارو زەمینەی سەربەرزانەو بێمنەتانەی چاکتری بۆ دەڕەخسێنێو، شوورەو پەرژینێکی قایمو مەحکەمی ئەدەبو ویقاری وای بەدەوردا دەکێشێ، کەڕێی چاو تێبڕینو تەماع لەهەر دڵنەخۆشێکی ئارەزووباز بگرێو، وای لێبکات کەلەکاتی چوونە دەرەوە و دەرکەوتنیو ئەنجامدانی چالاکییە شەرعییە جۆراوجۆرەکانیدا ـ کە لەبەشی دووەمدا ئاماژەمان پێیان کرد ـ، مێینایەتی (أنوثة) و کێشندەیی (جاذبیة)یەکەی داپۆشرێو مرۆڤایەتی (إنسانیة)یەکەی بەرجەستە بێت، چونکە شەریعەتی کاربەجێی خوا، حەز دەکات کەئافرەت دەرخستنی جوانییو مێینایەتییەکەی، تەنها لەچوارچێوەی ماڵەکەی و بۆ حەڵاڵی خۆی بێت، نەك بەهۆی خۆنواندنییەوە بۆ هەموو کەس خۆی بێ نموود(مُبْتَذَلْ) و بێقەدر بکات!

خوای زاناو پەنهان بین (جل جلاله) فەرموویەتی:﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ

إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِيٓ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِيٓ أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُواْ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ (النور:٣٠-٣١).

واتـە: (ئـەی موحەممـەد ﷺ !) بـەبڕواداران بڵـێ :کـە لـە (ڕوانینـی) چـاوانیان بگرنەوەو داوێنیان بپارێزن، ئا ئەوە چاکترو پاکترە بۆیان، بێگومـان خـوا شـارەزایە بەوەی کە دەیکەن. وە بەئافرەتانی بڕوادار بێژە با لە (ڕوانینی) چاوانیان بگرنـەوە، وە داوێنیـان بپـارێزن، وە بـا جـوانیی خۆیـان ـ جگـە لـەوەی کەدەردەکـەوێ ـ وە دەرنەخەن، وە با بەسەرپۆشەکانیان یەخەو بەرۆکیان داپۆشن، وە با جـوانیی خۆیـان دەرنەخەن مـەگەر بۆ مێردەکانیان، یان باوکانیان، یـان باوکـانی مێردەکانیـان، یـان کوڕەکانیان، یان کوڕانی مێردەکانیان، یان براکانیان، یـان کـوڕانی براکانیـان، یـان کوڕانی خوشکەکانیان، یان ئافرەتانیان، یان کەنیزەکو کۆیلەکانیان، یان پیاوانێکی بەردەست کەتەماعیان لەژناندا نیە، یان منـداڵانێك کەعـەقڵیان بەعـەورەتی ژنـان ناشـکێ، وە بـا (ئافرەتـان) لاقـی خۆیـان بەزەویـدا نـەکوتن، بۆئـەوەی خشـڵێك کەپـەنهانیان کـردوە پێـی بزانـرێ! وە تێکڕاتـان بگەڕێنـەوە لای خـوا، ئـەی بڕوادارینە ابەڵکو سەرفراز بن.

هەروەها خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ﴾ (الأحزاب:٥٩)

واتـــە: پێغەمبـــەر! بەژنـــەکانتو کچـــەکانتو ئافرەتـــانی بـــڕواداران بڵـــێ،

کەچارشێوەکانیان لەخۆیانەوە بپێچن، ئا ئەوە چاكترە بۆئەوەی بناسرێن (کەخاوەن حەیاو حورمەتن) و (بەهۆی تەماع تێکرانەوە) ئازار نەدرێن، وە خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

جا ئێستا با لەبەر ڕۆشنایی ئەو دوو ئایەتەی سوورەتی (النور) و ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأحزاب)دا سەرنجبدەین، داخۆ کتێبی خوا بەرگو پۆشاکی ئافرەت چۆن چۆنی دیاریدەکات؟! پاشانیش سەرنجی دەقەکانی سوننەتیش دەدەین کە بێگومان هەمیشە ئایەتەکانی خواو فەرمایشتو کردەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە کۆكو تەبانو، هەرگیز هیچ جۆرە ناکۆکییەكو جیاوازییەکیان لەنێواندا نیە، چونکە بەتەئکید هیچ کەس وەك پێغەمبەری خواﷺ لەکتێبو کەلامی خوا چاك حاڵی نەبووەو نابێو، دیارە هیچ کەسێکیش هێندەی وی - دایكو باوم فیدای بن - بەشەریعەتی خواوە پابەند نەبووەو خوا چی فەرموە، ئەویش وایکردوەو مووبەموو جێبەجێی کردوە، وەك ئاشناترینو نزیکترین کەسی (عائشة)ی دایکی ئیمانداران لەوەڵامی پرسیارێك لەبارەی هەڵسوکەوت و ڕەوشتییەوە، گوتوویەتی: ((**كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنُ**))رواه مسلم.

بەر لەهەر شتێك پێویستە ئەوە بزانین کە ئەو بەرگو پۆشاکەی شەرع لەسەر ئافرەتی پێویست کردوە خۆی پێداپۆشێ، بەرگو پۆشاکێکە کە عەورەت(عَوْرَة)[1]ی بشارێتەوە، بۆیە ئەگەر بمانەوێ جۆرو چۆنیەتی پۆشاکی ئافرەت بزانین، پێویستە سنووری عەورەتی ئافرەت بزانین، جا لەوبارەوە زانایانی

(١) وشەی (عورة) وەك (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: کینایەیە بۆ پاشو پێش (سوأة) ی ئینسانو لەئەسڵیشدا لە (العار) ەوە هاتوە، چونکە بەدەرکەوتنی، ئینسان عەیبدار دەبێ، هەروەها بەمانای کەلێنو بۆشاییو ناتەواویش دێ، بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٥٩٥.

ئیسلام دوو ڕای سەرەکییان هەن، کە هەردووکیشیان بەپلەی یەکەم ڕستەی:

﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ بە بەڵگە دێننەوە!![1]

جاری زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام لەتوێژەرەوانی قورئانو فەرمایشتناسانو شەرعزانان، ڕایان وایە کەعەورەتی ئافرەت بریتییە لەتێکڕای جەستەی، بێجگە لەدەموچاوی‌و هەردووک دەستەکانی تا مەچەکی (الوجه واليدين الى الرسغ).

هەندێکیشیان ڕایان وایە کەجەستەی ئافرەت هەمووی عەورەتەو هیچی لێهەڵناوێرێ! بەڵام بێگومان ڕای زۆربەو جەماوەری زانایان کەدەڵێن: ڕووی ئافرەتو هەردووک دەستی تامەچەکی عەورەت نین، ڕاستە، بەڵام باپەلە نەکەینو سەرەتا گوێ بۆ زاناو توێژەرەوانی قورئان بگرین داخۆ ڕستەی: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾یان چۆن تەفسیر کردوە؟!

(ابو جعفر الطبري) گوتوویەتی:[2]

{(وقوله: **وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ**) يقول تعالى ذكره: ولايظهرن للناس الذين لَيْسوا لَهُنَّ بِمَحْرَمٍ زينتهن، وهما زينتان: إحداهما: ماخَفي، وذلك كالخلخال والسوارين والقرطين والقلائد، والاخرى: **مَا ظَهَرَ مِنْهَا**..}.

واتە: خوای بەرز دەفەرموێ: وە باجوانیی خۆیان بۆ خەڵکێك کەمەحرەمیان نین دەرنەخەن، ئەویش دووجۆرە جوانییە، یەکیان: ئەوەیە کەپەنهانە، وەك خرخاڵو بازنو گوارەو گەردن بەند، وەئەوی دیکەشیان ئاشکرایە...

(١) بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) ج٣ص١٨٣-١٨٤.
(٢) بڕوانە: (جامع البيان) ج١٠ص١٥٦تا ١٥٩.

پاشان پێشەوای توێژەرەوان(إمام المفسرين) لەبارەی ڕستەی (مَا ظَهَرَ مِنْهَا)وە گوتوویەتی: (وذلك مختلف في المَعنيِّ منه بهذه الآية، فكان بعضهم يقول: زينة الثياب الظاهرة..) واتە: جا لەوبارەوە کەئایا لەم ئایەتەدا مەبەست پێی چییە؟ ڕاجیایی هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست جوانیی جلوبەرگی ئاشکرایە..

ئنجا پاش ئەوەی (ابن جرير) بەهەشت نۆ ڕیوایەت ئەو ڕایە لە (عبدالله بن مسعود)ەوە خوا لێی ڕازی بێ دێنێ، دێتە سەر ڕای دووەمو دەڵێ:

(وقال آخرون: الظاهر من الزينة التي أبيح لها أن تبديه: الكحل والخاتم والسواران والوجه...) واتە: وە هەندێکیش گوتوویانە: جوانیی ئاشکرا کە (ئافرەت) بۆی هەیە دەریبخات: کلو ئەنگوستیلەو بازنو دەموچاوە..

دیارە (ابن جرير) وەك عادەتی خۆی لەچەند ڕێیەکیشەوە ڕای ناوبراو لەهەرکام لە: (عبدالله بن عباس) و (سعيد بن جبير) و (قتادة) و (مسور بن مخرمة) و (مجاهد) ەوە دێنێ، ئەوجار ڕای سێیەمیش لەهەرکام لە (یونس) و (حسن)ەوە دێنێ کەگوتوویانە: مەبەست لە (ماظهر منها) دەمو چاوو بەرگو پۆشاکە(الوجه والثياب).

پاشان (إبن جرير) گوتوویەتی: (وأولى الأقوال في ذلك بالصواب، قول من قال: عني بذلك الوجه والكفان، يدخل في ذلك اذا كان كذلك: الكحل والخاتم والسوار والخضاب..).

واتە: وە نیزیکترین قسە کەلەوبارەوە لەڕاستییەوە، قسەی ئەوانەیە کەگوتوویانە: مەبەست لێرەدا ڕوو و هەردووك دەستەکانن، جا هەر کام لە کلو ئەنگوستیلەو بازنو خەنەش دەچنە نێو ئەوەوە (مەبەستی ئەوەیە کەئەگەر گوتمان مەبەست لە (**مَا ظَهَرَ مِنْهَا**) ڕوو و دەستەکانن، ئەو شتانەش دەگرێتەوە کەبۆ جوانکردنو ڕازاندنەوەی ئەو ئەندامانە بەکاردێن).

شایانی باسیشە ئەم ڕایەی (ابن جریر) مەگەر چۆن، دەنا سەرجەم توێژەرەوانی قورئانیش پەسەندیان کردوە، کە دەتوانم ناوی ئەمانەیان بهێنم کەبەرهەمەکانیانم لەبەردەستە: الزمخشري[١] و ابن كثير[٢] وفخرالدين الرازي[٣] وابن العربي[٤] والقرطبي[٥] والجصاص[٦] والشوكاني[٧] والقاسمي[٨] والآلوسي[٩] وسيد قطب[١٠] وسعيد حوى[١١] والطباطبائي[١٢] وناصر مكارم شيرازى[١٣] والشيخ حسين محمد مخلوف[١٤] والشيخ خالد عبدالرحمن العك.[١٥]

ئنجا باسەرنجێکی دەقەکانی سوننەتیش بدەین لەبەر ڕۆشنایی قسەی زانایانی فەرمودەناس دا، پاشان دەچینە سەر ئەنجامگیریی کۆتایی لەوبارەوە:[١٦]

---

(١) (الكشاف) ج٣ص٢٣٠، ٢٣١.
(٢) مختصر تفسير ابن كثير، ج٢ص٦١٥، محمد علي الصابوني.
(٣) (التفسير الكبير) ج٢٣ ص٢٠٥، ٢٠٦.
(٤) (أحكام القرآن) ج٣ص٣٨١، ٣٨٢.
(٥) (الجامع لأحكام القرآن) ج٦ص٣٥٥٤.
(٦) (أحكام القرآن) ج٣ص٣١٥.
(٧) (فتح القدير) ج٤ص٢٩.
(٨) (تفسير القاسمي المسمى: محاسن التأويل) ج٧ص١٩٥.
(٩) (روح المعانى) ج١٨ ص ١٤٠.
(١٠) (في ظلال القرآن) ج٦ص٩٥.
(١١) (ألأساس في التفسير) ج٧ص٣٧٥٩.
(١٢) (تفسير الميزان) ج١٥ ص ١١٠، ١١١.
(١٣) (تفسير نمونه) ج١٤ ص ٤٣٩، ٤٤٠.
(١٤) (صفوة البيان لمعاني القرآن) ص ٤٥١
(١٥) (صفوة البيان لمعاني القرآن) ص ٣٥٣.
(١٦) بۆ سەرجەم ئەم دەقانەی سوننەتو زۆری دیکەش بڕوانە: (جِلْبابُ المرأة المسلمة في الكتاب والسنة) ی، الشيخ محمد ناصرالدين الألباني) خوا لێی خۆش بێت، وە: (المفصل ج٣ص١٩١ تا ١٩٣.

١-(أبوداود) لە (عائشة) وە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە (أسماء بنت أبي بكر الصديق) خوا لێیان ڕازی بێ هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەحاڵێك دا کەپۆشاکێکی تەنکی لەبەردابوو، جا پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێوەرگێڕاو فەرمووی: ((**يَا أَسْمَاءُ إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتْ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلاَّ هَذَا وَهَذَا وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ**)) واتە: ئەی ئەسماء! ئافرەت کەبالغ بوو، بۆی ناشێ کەبێجگە لەئەمەو ئەمە دەربخات، وە ئاماژەی بۆ ڕووی‌و هەردووك لەپە دەستی خۆی کرد)).

٢- ((**عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ يَوْمَ الْعِيدِ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ ثُمَّ قَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى بِلَالٍ فَأَمَرَ بِتَقْوَى اللَّهِ وَحَثَّ عَلَى طَاعَتِهِ وَوَعَظَ النَّاسَ وَذَكَّرَهُمْ ثُمَّ مَضَى حَتَّى أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ فَقَالَ تَصَدَّقْنَ فَإِنَّ أَكْثَرَكُنَّ حَطَبُ جَهَنَّمَ، فَقَامَتْ امْرَأَةٌ مِنْ سِطَةِ النِّسَاءِ سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ فَقَالَتْ لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ؟ لِأَنَّكُنَّ تُكْثِرْنَ الشَّكَاةَ وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ..**))رواه مسلم والنسائي والدارمي وابن خزيمة والبيهقي وأحمد.

واتە: (لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لەڕۆژی جەژن دا نوێژم کرد، سەرەتا بەر لەوتار نوێژی کرد بێبانگ‌و قامەت، پاشان هەڵساو سەنگی خۆی دایە سەر بیلال، جا فەرمانی بەپارێزکاریی لەخوا کرد، وە هانیدا بۆ فەرمانبەریی کردنی، وە ئامۆژگاریی خەڵکی کردو بیری خستنەوە. پاشان ڕۆیی هەتا هاتە لای ئافرەتان، ئامۆژگاریی کردن‌و بیری خستنەوە، پاشان فەرمووی: خێرو چاکە بکەن، چونکە زۆربەتان سووتەمەنی دۆزەخن! جا ئافرەتێکی ڕوومەت ڕەش هەڵگەڕاو لەنێوەڕاستیانەوە قسەی کردو گوتی: جا بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟! ئەویش فەرمووی: چونکە زۆر گلەیی‌و

پرتەو بۆڵە دەكەن، بەرانبەر بەمێردیش سپڵەن..)

جا دیارە كە (جابر) وەسفی ڕوومەتی ئافرەتەكەی كردوە، دەموچاوی دیار بووە، ئەگەر نا نەیدەزانی ڕەنگی چۆنە؟!

٣- ((**عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ الى رَسُولَ اللَّهِﷺ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ لأَهَبَ لَكَ نَفْسِي.. فَصَمَتَ فَلَقَدْ رَأَيْتُهَا قَائِمَةً مَلِيًّا أَوْ قَالَ هَوِيْنًا، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِﷺ فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتْ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْصِدْ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ...**)) رواه البخاري ومسلم والنسائي وأحمد والبيهقي والحميدي والروياني وأبويعلى وغيرهم.

واتە: (ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ كەلەمزگەوتێ بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم خۆمت پێشكەش بكەم! ئەویش بێدەنگ بوو، جا من بینیم ئافرەتەكە زۆر ڕاوەستا، یان گوتی: بەكاوە خۆ ڕاوەستا، ئنجا پێغەمبەری خواش ﷺ تەماشای كردو باش سەرنجی داو چاوی پێداگێڕا، دوایی سەری خۆی نەوی كرد، جا كاتێك ئافرەتەكە زانی هیچی لەبارەوە دەرنەبڕی، دانیشت).

ئەم فەرمایشتەش زۆر بەڕوونیی، ڕاستیی ئەو ڕایە ئیسپات دەكات كەدەڵێ دەموچاوی ئافرەت عەوڕەت نیە، ئەگەر نا پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای چی كردوەو چۆن سەرنجی وردی داوەتێ؟!

٤- ((عَنْ عَائِشَةَ رضيَ اللهُ عَنها قَالَتْ: كُنَّ نِسَاءُ الْمُؤْمِنَاتِ يَشْهَدْنَ مَعَ النَّبِيِّﷺ صَلَاةَ الْفَجْرِ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، ثُمَّ يَنْقَلِبْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ حِينَ يَقْضِينَ الصَّلَاةَ لَا يُعْرَفْنَ مِنْ الْغَلَسِ)) متفق عليه وفي رواية: ((**وَمَا يَعْرِفُ**

**بَعْضُنَا وجُوهُ بَعْضٍ))** رواه أبو يعلى بسند صحيح.

واتە: (ئافرەتانی بڕوادار لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی بەیانی یان دەکرد، چارشێوەکانیان لەخۆیانەوە دەپێچا، پاشان کە نوێژیان تەواو دەکرد، دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان لەبەر تاریکی بولێڵی بەیان، نەدەناسران).

ئەمیش بەڵگەیەکی دیکەیە، چونکە مادام ئافرەتان بەهۆی تاریکی بوولێڵەوە نەناسراون، دیارە ئەگەر تاریك نەبوایە دەناسرانو، ئەمەش کاتێك دەبێ کە ئافرەت دەموچاوی دیارو بەدەرەوە بێت!

٥- هەروەها (بخاري ومسلم أبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه ومالك وأحمد والبيهقي وابن حزم) لە (عبدالله بن عباس) یان گێڕاوەتەوە، کە ڕۆژی قوربانی سەربڕین، پێغەمبەری خواﷺ (الفضل بن عباس) لەپشت خۆیەوە سواری وڵاخ کردوە، وە (الفضل) جوانو بەرچاو بووە، جا پێغەمبەرﷺ بۆ خەڵکی وەستا بوو فەتوای بۆ دەدان، وە ئافرەتێکی جوانو بەرچاوی (خَثعَمی)ی هات داوای فەتوای لەپێغەمبەری خواﷺ دەکرد، . ئیدی (الفَضل) دەستی کرد بەسەرنج دانیو جوانی یەکەی سەرسامی کردبوو، جا کاتێك پێغەمبەرﷺ ئاوڕی دایەوەو زانی (الفَضل) تەماشای دەکات، بەدەستی خۆی چەناگەی گرت و ڕووی لەسەرنج لێدانی وەرچەرخاند...

دیارە ئەم فەرموودەیەش بەهەمان شێوە، بەڵگەی ڕاستیی ئەو ڕایەیە کە گوتمان، ئنجا مادام ئەو بەسەرهاتە وەك (ابن حجر العسقلاني) ساغی کردۆتەوە پاش وردە بەرد هاویشتنی جەمرەی عەقەبە(رمي جمرة العقبة) بووە، کەواتە پاش ئیحرام شکاندنی یەکەم (التحلل الأصغر) بووە، کە ئافرەتو پیاو بێجگە لەجیماع، شتێکیان بۆ حەڵاڵ دەبێ، بۆیە ناگونجێ بگوترێ: ئەو ئافرەتە چونکە لەئیحرام دا بووەو، ئافرەتی (مُحْرِمَة)یش بۆی

نیە دەستو دەموچاوی داپۆشێ، بۆیە ڕووی دیار بووە! هەرچەندە ئەگەر گریمان پێش (رمي جمرة العقبة)یش بووبێ، دیسان ئەوە هەر نابێتە بەڵگەی ئەوە کە هۆی ڕووی خۆ دانەپۆشینی ئافرەتەکە ئیحرام هەبوونی بوە، چونکە ئافرەتان ئەگەر (مُحْرِمة)یش بن، هەر بۆیان هەیە ڕووی خۆیان لەبەرانبەر پیاوان داپۆشن، ئەوەندە هەیە لەسەریان پێویست نیە، بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن، بۆ وێنە:

((**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا قَالَتْ: كَانَ الرُّكْبَانُ يَمُرُّونَ بِنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللهِﷺ مُحْرِمَاتٌ، فَإِذَا حَاذَوْا بِنَا سَدَلَتْ إِحْدَانَا جِلْبَابَهَا مِنْ رَأْسِهَا عَلَى وَجْهِهَا، فَإِذَا جَاوَزُونَا كَشَفْنَاهُ**))رواه أحمد وأبوداود والبيهقي وسنده حسن.

واتە: (لەکاتێك دا کەئێمەی ئافرەتان لەخزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ بووین لەحاڵەتی ئیحرام دا، جا کاتێك سوارەکان بەلامان دا ڕەت بوونایە، یەکێکمان چارشێوەکەی لەسەر سەریەوە شۆڕدەکردەوە سەر ڕووی، وە کە تێدەپەڕین لامان دەبردەوە).

٦- هەروەها (احمد) لە (سُبيعة بنت الحارث)ەوە گێڕاویەتەوە کە ژنی (سعد بن خولة) بووەو لەحەجی ماڵئاوایی دا کۆچی دوایی کردوەو (بَدْري)یش بووە، جا بەر لەوەی چوار مانگو دە شەو لەوەفاتی تێپەڕن، سکەکەی داناوەو (أبو السَّنابِلُ بن بَعْكك) پاش ئەوەی (ئەو ئافرەتە) لەزەیسانی هەڵساوەتەوە پێی گەیشتوە، لەحاڵێك دا کەچاوی ڕشتوونو خەنەی لەدەستان داوەو خۆی ساز کردوە، جاپێی گوتوە: خۆت ماندوو مەکە، یان قسەیەکی ئەوتۆ، ڕەنگە بەتەمای مێرد کردنەوە بیت؟! دەبێ چوار مانگو دەشەو بەسەر وەفاتی مێردەکەت دا بڕۆن (ئەوجار بۆت هەیە)! دەڵێ: منیش چوومە لای

پێغەمبەرﷺ ئەوەم بۆ گێڕایەوە کە (أبو السنابل بن بعكك) گوتی، فەرمووی: لەو کاتەوە کە کۆرپەکەت داناوە، حەڵاڵ بووی (بۆ شووکردنەوە).

دەلالەتی ئەم دەقەش لەسەر ئەو مەبەستەی کەگوتمان زۆر ئاشکراو ڕوونە، چونکە (أبو السنابل) دیارە خۆڕازاندنەوەی (سبيعة)ی بینیوە بۆیە وای پێ گوتوە!

٧-دیسان (بخاري ومسلم وأحمد) لە (عطاء بن أبي رباح)ەوە گێڕاویانەتەوە کەگوتوویەتی: (ابن عباس) پێی گوتم، ئافرەتێکی بەهەشتاوییت پێشان بدەم؟! گوتم: بەڵێ، گوتی: ئەم ئافرەتە ڕەشەیە، ئەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: من فێ(صرع) دەمگرێو خۆم دەردەخەم، جا بۆم لەخوا بپاڕێوە، ئەویش فەرمووی: ((**إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ**)) واتە: ئەگەر حەز دەکەی ئارام بگرەو بەهەشتت مسۆگەر دەبێ، ئەگەر دەشتەوێ لەخوا داوا دەکەم کەچاکت بکاتەوە؟ ئەویش گوتی: خۆڕا دەگرم، بەڵام گوتی: من خۆم دەردەخەم (لەکاتی فێ لێهاتن دا) جا بۆم لەخوا بپاڕێوە کەخۆم دەرنەخەم، ئەویش بۆی پاڕایەوە.

ئەمیش دیسان بەڵگەیەکی ڕوونو بێچەندو چوونە، چونکە دیارە ئافرەتەکە دەموچاوی— بەلای کەمەوە — دیار بووە، ئەگەر نا چۆن زانرا کە ئەو ئافرەتە ڕەشەو بە (هذه المرأة السوداء) وەسف کراوە!.

**خوێنەری بەڕێز!**

ئێستاش دوای ئەوەی لەبەر تیشکی قورئانو سوننەتدا- بەپێی تێگەیشتنو ڕاوبۆچوونی زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوانی قورئانو فەرمایشت ناسان - بۆمان ڕوونبۆوە کە سنووری عەورەتی ئافرەت کوێیەو چۆنە! با بۆ زیاترو چاکتر دڵنیابوون

لەڕاستو دروستی ڕای جەماوەری زانایان،[1] سەرنجێکی قسەو بەڵگەی لایەنگرانی ئەو ڕایەش بدەین کە دەڵێ: جەستەی ئافرەت هەمووی عەورەتە، تەنانەت نینۆکی پەنجەکانی پێیەکانیشی: [2]

١- بەڵگەی یەکەمیان ئەوەیە کە هەر ڕستەی: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾(النور: من الآية٣١) واتە: وەبا جوانییەکەیان جگەلەوەی دەردەکەوێ، دەرنەخەن.

بەجۆرێك تەفسیر دەکەن کە ببێتە بەڵگە بۆ ڕایەکەیانو دەڵێن: ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ مەبەست پێی ڕواڵەتو دەرەوەی بەرگو پۆشاکەو، بەو پێیە ئافرەت جگە لە بەرگو پۆشاکی دەرەوەو ڕواڵەتیی خۆی، بۆی نیە هیچ جوانییەکی دیکەی خۆی دەربخات!

بەڵام بێگومان ئەو ڕایە لە تەفسیرو لێکدانەوەی ئەو ڕستە قورئانییەدا هەڵەیە، چونکە:

أ- ئایەتەکە ئاوا دەستپێدەکات:﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ (النور: من الآية٣١) وەك دەبینین، خوای کاربەجێ بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی ﷺ فەرمووە، کە

---

(١) بەڵکو (النووی) هەر بە موتڵەقی عەورەتنەبوونی ڕوو و دوودەستەکانی ڕاگەیاندوە، بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٦ص٣٨١٢، (باب ندب من أراد نكاح إمرأة الى أان ينظر الى وجهها وكفيها قبل خِطبَتها) .

(٢) بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) ج٣ص ١٨٤.

بەئافرەتانی بڕوادار ڕابگەیەنێ سێ شتان بکەن:

لــە تەماشــاکردن‌و ڕوانینــی چــاوەکانیان بگرنــەوە:﴿ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ ﴾، وە داوێنیــان بپــارێزن (لــە دەرخســتن‌و خراپــەکاریی): ﴿وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾، وە جوانیی خۆیان نەخەنە ڕوو:﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ وەك دەبینین هەرسێك کردەوەکان، ئینسـان تێیانـدا ئـازادەو (إختیاري) بن، واتە: توانای کردن‌و نـەکردنیانی هەیـە، بـەڵام بێگومـان وەدەرکـەوتن (ظهـور) ی بـەرگ و پۆشـاکی دەرەوەی ئـافرەت، شـتێکی ناچـاریی و (إجبـاري) یـە، چـونکە ئـافرەت بیـەوێ‌و نەیـەوێ، هـەر دەردەکـەوێ‌و دەبینـرێ، کەواتــە: ناگونجــێ مەبەســت لــە جــوانیی دەرخراو(الزينة الظاهرة) بەرگ‌و پۆشاك بێت، چونکە دەرکەوتنی پۆشـاك بە دەست ئینسان نیەو هەر دەبینرێ، مەگەر هەر نەچێتە دەرێ!

ب- وشەی (زينة) هەرچەندە جل‌و بـەرگیش دەگرێتـەوە، وەك لـە ئایـەتی: ﴿يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴾ (الأعـراف: مـن الآيــة٣١) هاتوە، بەڵام وشەی (زينتهن) لەو ئایەتەی سووڕەتی (النـور)دا چـونکە- وەك باسمانکرد- دەرخستن و دەرنەخستنی کراوە بەشـتێکی ئیختیـاریی، ناگونجێ مـەبەستی بـەرگ‌و پۆشـاك بێـت، کـەوەك گوتمـان ئـافرەت هـیچ ئیختیاریێکی لە دەرکەوتنیدا نیە.

ئنجا ئەگەر بێت‌و بەوردیی سەرنجی ئایەتەکە بـدەین، دڵنیـا دەبـین ،کـە بەهیچ جۆرێك نالوێ مەبەست لەوشەی (زينة) جل‌و بەرگ بێت، چـونکە ئەگەر گریمان بشگونجێ هـەردووك وشـەی: : ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا

﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾(النور: من الآية٣١) و بەرگو پۆشاك بێت، خۆ بە تەئكید ناگونجێ كە بڵێین: مەبەست لە وشەی: ﴿لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾جلو بەرگە! چونكە بێگومان ئەوە خشڵ(حلي)ە، كە بەهۆی پێ بەزەویدا كوتانو خرینگەو زرینگەوە پەی پێ دەبردرێ، نەك جلوبەرگ!! دیارە وشەیەكیش كە لەسیاقی ئایەتێكدا چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە، دەبێ هەر یەك واتای هەبێو هەرجارە واتایەكی بۆ دانەنرێ.

ج- پێشتریش خستمانەڕوو كە زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوانی قورئان وشەی ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾یان بە كلو خەنەو ئەنگوستیلەو بازن، یان بە دەمو چاوو دوو دەست تا مەچەك، تەفسیر دەكەن.

٢- بەڵگەیەكی دیكەشیان ئایەتی ژمارە (٥٩)ی (الأحزاب)ە، كە پێشتر هێنامانو بەئانقەست قسە لەبارەكردنییەوەمان بۆ ئێرە هەڵگرت، جا لایەنگرانی ڕای بە عەورەتدانانی دەمو چاوو دەستی ئافرەت، ڕستەی: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ئاوا تەفسیر دەكەن: (با ئافرەتان) چارشێوەكانیان بەسەر دەمو چاویاندا بدەن، ئائەوە چاكترە بۆ ئەوەی بناسرێنو ئازار نەدرێن.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو مانایە بۆ ڕستەی: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ۚ﴾ هەڵەیە، چونكە: وشەی: (**يُدْنِينَ**) وەك (راغب الاصفهاني) گوتوویەتی[1]:

---

(١) مفردات ألفاظ (القرآن) ج٣١٩، ٣١٨، واتە: (الدنو) نزیكیی خودیی یان حوكمییە.. وە دەگوترێ، دووشتەكەم لە یەك نزیكخستنەوە، وەیەكیانم لەوی دیكە وەنزیك خست، خوای بەرز فەرموویەتی: با چارشێوەكانیان لەخۆیان نزیك بخەنەوە.

{الدنوّ: القرب بالذات أو بالحكم.. ويقال: دانيت بين الأمرين وأدنيت احدهما من الآخر، قال تعالى: ﴿يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾} کەواتە ڕستەی: ﴿يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾ واتە: با چارشێو(عەبا)ەکانیان لە خۆیانەوە بپێچن، ئیدی کەم و زۆر مانای دەم و چاو داپۆشین ناگرێتەوە!

ئنجا ئەوەندە بەسە کە (إبن عباس) خوا لێیان ڕازیبێت، بەهەمان شێوە ئەو ڕستەیەی مانا کردوەو گوتوویەتی: (تُدْنِي الجِلبَابَ إلى وَجهِهَا وَلاَ تَضرِبُ بِهِ) واتە: چارشێوەکەی لە دەمو چاوی نزیک دەخاتەوە، بەلاَم پێی داناپۆشێ).[1]

کەواتە:

بە هیچ جۆرێك ئایەتی﴿يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾ ئەو جۆرە تەفسیرو لێکدانەوەیە هەڵناگرێ، کە هەندێك لە زانایان هێناویانە، بۆ وێنە یەکێکیان لەو بارەوە گووتویەتی:[2]، ﴿يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾، (أي: يُغَطِّين بها وجوهَهنَّ وصدورهن) واتە:... یانی دەمو چاوو سینەیانی پێداده‌پۆشن!

هەڵبەتە هەرکەسێکیش بابەتییانەو بێلایەنانە تەماشای ئایەتەکەو ئەو

---

(١) بڕوانە: (جلباب المرأة المسلمة في الكتاب والسنة) للشيخ ناصر الدين الالباني، ص٦، ١٤، تێبینی: هەرچەندە (الشيخ ناصرالدين) لە لاپەڕە (٦)دا گفتیداوە، کە ئەو قسەیە دوایی (تخريج) کراوە، بەلاَم من نەمبینی!

(٢) بڕوانە: (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) للشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، ص ٦٧٢.

جۆرە تەفسیرەش بکات، دەزانێ کە زۆر لەیەك دوورن و هیچ پەیوەندییان پێکەوە نیە! پاشان دەڵێین:

خوای کاربەجێ لە ئایەتی ژمارە (٣١)ی (النور)دا کە ویستوویەتی ئافرەتانی مسوڵمان ئاگادار بکاتەوە، کە بەسەرپۆش و لەچکەکانیان، یەخەو بەرۆکیان داپۆشن، فەرموویەتی: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ[1] عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ وەبا بەسەرپۆشەکانیان یەخەو بەرۆکەکانیان[2] داپۆشن. دەجا بێگومان خوای قسەلەجێ ئەگەر ویستبای فەرمانیش بکات بە داپۆشینی دەموچاو، ئەوە تەعبیرێکی بە هەمان شێوەی بەکار دەهێنا، کە بەراشکاویی ئەو مەبەستە بگەیەنێ، نەك بە تەئویلێکی دووریش هەر نەیگرێتەوە!

٣- بەڵگەیەکی دیکەشیان ئەوەیە کە چەند فەرمایشتێك دێننەوە کە ئەوپەڕەکەی سوننەتو پەسەندبوونی پێچەگرتنەوە(انتقاب)ی ئافرەتانیان لێدەفامرێتەوە- وەك تۆزێکی دیکە ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین- بەڵام شتێکی روونە کە لە نێوان فەرزنەبوونی داپۆشینی دەموچاوو دەستەکان(عدم وجوب ستر الوجه واليدين) و سوننەتو پەسەندبوونی داپۆشینیان(استحباب

---

(١) وشەی (خِمار) کە کۆیەکەی (خُمُر)ە، (راغب الأصفهاني) لە بارەیەوە گوتویەتی: (أصل الخمر ستر الشيء و يقال لما يستر به: خمار. لكن الخمار صار في التعارف إسماً لما تغطي به المراة رأسها وجمعه: خمر..) (مفردات ألفاظ القرآن) ص٢٩٩، ٢٩٨، لە زمانی کوردیشدا وشەی (لەچك) و (سەرپۆش) و لە فارسیشدا وشەی (روسري) بۆ بەکار دێت.

(٢) وشەی (جيب) یش کە کۆیەکەی (جيوب) ە لە ئەسڵدا بەمانای (قطع) دێ، وەك (راغب) گوتوویەتی، (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٢١٠، لە کوردیشدا (یەخە) و (بەرۆك) ی پێدەگوترێ، دیارە بە داپۆشینیشی بە زیادەی لەچكو سەرپۆش گەردنو ملو بەشێك لە سینگی ئافرەت دادەپۆشرێ، هەروەها ئەو خشڵانەش کە پێیانەوەن وەك: گوارەو ملوانکەو گەردن بەند..

سترهما)دا، هیچ دژایەتی و ناکۆکییەك نیە، تاکو ئیسپاتی لایەکیان بەڵگەی لاچوونی لایەکەی دیکەیان بێت! بەڵێ چەند دەقێکی سوننەت هەن، کە بەڕوونیی‌و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن ،کە شتێکی سوننەت‌و پەسەندە (بەلآم فەرز نیە) کە ئافرەتان لەکاتی بینینی پیاواندا دووربینی(احتیاط)بکەن و ڕووی خۆیان داپۆشن، بۆ وێنە:

أ- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**لاَ تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ وَلاَ تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ**))رواه البخاري والنسائي واحمد البيهقي عن ابن عمر مرفوعا.

واتە: (ئافرەتی خاوەن ئیحرام، نەپێچە دەگرێتەوەو، نە دەستکێشیش لە دەستدەکات).

دیارە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ڕەوابوون‌و شەرعیبوونی داپۆشینی ڕوو و دوو دەست لەلایەن ئافرەتەوە، ئەگەرنا پێویستی نەدەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ بفەرموێ: با ئافرەتانی خاوەن ئیحرام دەست‌و ڕوویان دانەپۆشن.

ب- ((**عَنْ أسمَاء بِنْت أبِي بَكر قَالَتْ: كُنَّا نُغَطِّي وُجُوهَنَا مِنَ الرِّجَال**...))رواه الحاكم وقال حديث صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي وقال الشيخ ناصر الدين الالباني: إنما هو على شرط مسلم فقط.

واتە: (ئەسمائی کچی ئەبوبەکر خوا لێیان ڕازیبێت گوتوویەتی: ئێمە عادەتمان وابوو لە ئاست پیاواندا ڕووی خۆمانمان دادەپۆشی).

ج- ((**عَنْ عَبْدِ الْخَبِيرِ بْنِ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ**

قَالَ: جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُقَالُ لَهَا أُمُّ خَلَّادٍ وَهِيَ مُنْتَقِبَةٌ تَسْأَلُ عَنْ ابْنِهَا وَهُوَ مَقْتُولٌ، فَقَالَ لَهَا بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ: جِئْتِ تَسْأَلِينَ عَنْ ابْنِكِ وَأَنْتِ مُنْتَقِبَةٌ، فَقَالَتْ إِنْ أُرْزَأْ ابْنِي فَلَنْ أُرْزَأْ حَيَائِي...))رواه ابو داود[1]

واتە: (ژنێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پێی دەگوترا (أم خلاد)و پێچەی گرتبۆوە ،لە كوڕێكی دەگەڕا، كە كوژرابوو، جا یەكێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: هاتووی لە كوڕەكەت دەپرسی و نیقابیشت كردوە؟! ئەویش گوتی: ئەگەر كوڕەكەشم لە دەستدابێ شەرمو شكۆم لە دەست نادەم).

دیارە ئەم دەقەش هەم ڕەوا(مباح) بوونی داپۆشینی دەمو چاو و ،هەم فەڕز نەبوونیشی، هەردووكیان دەگەیەنێ و، هەر كەسێك تۆزێك سەرنج بدات، هەردووك دەلالەتەكان دیارن.

كەواتە: وەك پێشتر گوتمان، هەرچەندە ئەم دەقانەو هاووێنەكانیان دروست(جائز) بوون، یان ئەوپەڕی پەسەند(مستحب)بوونی داپۆشینی ڕوو و دەستەكانی ئافرەت دەگەیەنن، بەڵام بێگومان- بە لەبەرچاوگرتنی دەقەكانی دیكەی قورئانو سوننەت- بەهیچ شێوەیەك فەڕزبوون ناگەیەنن، بۆیە ناشێ بكرێنە بەڵگەی ئیسپاتی ئەو ڕایەی كە دەڵێ: دەمو چاو و دوو دەستی ئافرەت عەورەتن!

٤- بەڵگەیەكی دیكەشیان ئەوەیە، كە دەڵێن: مادام بۆ بابای ژنخواز(خاطِبْ)

(١) بەڵام شێخ ناصرالدین الالباني تێبینی لەسەر (سند)ی ئەو فەرموودەیە هەیە، بڕوانە (جلباب المرأة المسلمة) ص١١٢

مۆڵەت هەبێ کە تەماشای دەمو چاو و دەستی ئافرەت بکات، کەواتە غەیری (خاطِبْ) بۆی نیە تەماشای دەم و چاو و دەستی ئافرەت بکات‌و، ئەمەش عەورەتبوونی ئەو ئەندامانە دەگەیەنێ!

بەڵام لەڕاستیدا ئەم مەسەلەیەش بەبەڵگە ناشێ، چونکە:

بەڵێ ڕاستە بابای ژنخواز بۆی هەیە و بگرە سوننەت و پەسەندیشە، کە تەماشای ئەو ئافرەتە بکات کە نیازی خواستنی هەیە و، لەوبارەوە دەقی سوننەت زۆرن، بۆ وێنە: ((**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟! قَالَ لاَ، قَالَ: فَاذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا..**)) رواه مسلم والنسائي.[1]

بەڵام بێگومان مۆڵەتدران بۆ تەماشاکردنی ئافرەتێك، کە کابرا نیازی خواستن‌و هێنانی هەیە شتێکە و، عەورەتبوونی ڕوو و دەستی ئافرەت شتێکی دیکەیە، چونکە کە گوتمان دەم و چاو و دەستی ئافرەت عەورەت نین، مانای ئەوە نیە، کە تەماشاکردنی پیاوان بۆیان ڕەوا بێت- وەك دواتریش باسی دەکەین- تاکو وابزانرێ کە مۆڵەتدرانەکەی (خاطب) بەڵگەی عەورەتبوونی دەم و چاو و دەستەکانە!

ئنجا دەڵێین: هەر خودی ئەو فەرموودانەش کەفەرمانیان کردوە، یان مۆڵەتیانداوە، بابای ژنخواز تەماشای ئافرەتە جێی نیازەکەی بکات، بەڵگەن لەسەر عەورەت نەبوونی دەم و چاو و دەستی ئافرەت، ئەگەر نا کابرا تەماشای کوێی بکات‌و چۆن چۆنی تەماشای بکات؟! بەتایبەتیش کە

(١) (شرح صحيح مسلم) للنووي، ج٦ص٣٨١١.

لەهەندێك دەقاندا هاتوە كە بێئەوەی ئافرەتەكە ئاگادار بێت، هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ تەماشایان كردوە، بۆ وێنە: (جابر بن عبدالله) دەڵێت: ((**فَخَطَبْتُ جَارِيَةً فَكُنْتُ أَتَخَبَّأُ لَهَا حَتَّى رَأَيْتُ مِنْهَا مَا دَعَانِي إِلَى نِكَاحِهَا وَتَزَوُّجِهَا فَتَزَوَّجْتُهَا**))رواه أبوداود. واتە: (كچێكم خواست، جا- بەر لە داواكردنی- خۆمم بۆ مەڵاسدەدا[1] تاكو ئەوەندەم لێ بینی كە ببێتە هاندەرم بۆ مارەكردنو هێنانیو مارەمكرد).

هەروەها (ابن الحجر العسقلاني)یش گوتوویەتی: (قال الجمهور: يجوز أن ينظر إليها اذا أراد ذلك بغير إذنها)) واتە:جەماوەری زانایان گوتوویانە: دروستە بەبێ مۆڵەتی ئافرەتەكە، ئەگەر ویستی تەماشای بكات، بۆی بڕوانێ.)[2]

(النووي)یش گوتویەتی: (انما يباح له النظر الى وجهها وكفيها فقط لأنها ليست بعورة.. وهذا مذهبنا ومذهب الأكثرين..)) واتە: وە تەنها بۆی هەیە تەماشای ڕوویو لەپە دەستەكانی بكات، چونكە عەورەت نین، وە ئەوە ڕای ئێمە (شافیعییەكان) و ڕای زۆربەیە.)[3]

٥- بەڵگەیەكی دیكەشیان ئەوەیە ،كە دەڵێن: بێگومان حیكمەتی عەورەتبوونی جەستەی ئافرەت، بێجگە لەدەستو دەموچاوی، ئەوەیە كەسەرنجی پیاوان ڕادەكێشێ، دەجا ئاشكرایە، كە جوانیی ئافرەت بەزۆری لەدەموچاوی دایەو، مادام وابێ پێویستە ئەویش هەر عەورەت بێت!

(١) دیارە لەرێگاو بانان خۆی لێگرتوە تاكو ببینێت، كەواتە دەبێت دەموچاوی دیار بووبێت.
(٢) (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج١٠، باب النظر الى المرأة قبل التزويج، ص٢٢٨.
(٣) (شرح صحيح مسلم) ج٦ص٣٨١٢.

ئێمە لەوەڵامی ئەم قسەیەیاندا دەڵێین:

ڕاستە کە دەموچاویش لەمەسەلەی سەرنجڕاکێشانی پیاواندا وەك ئەندامەکانی دیکەی بەعەوڕەت دانراو وایە، بەڵام پێویستە بزانرێ کەحیکمەت و هۆی هەڵاوێرانی دەموچاوو دەستەکانی لەحوکمی بەعەوڕەتدانرانی جەستەی ئافرەت، ئەوەیە کە ئافرەت ئەگەر لەسەری فەرز بێت ڕوو(وجە)ی و دوو دەستەکانی داپۆشێ، تووشی سەغڵەتییەکی زۆر دەبێت و، ڕێی گەلێك ئەرك و چالاکی دین و ژینی لێدەبەسترێ، کەواتە: حیکمەتی بەعەوڕەتدانەنرانەکەی سەغڵەت نەکرانی ئافرەتە، نەك سەرنجڕانەکێشانی ئەو ئەندامانە!

ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە دەڵێین: بێگومان ئەو قسەیە لەسەر قیاس بنیاتنراوەو زانایانی (أصول الفقه)یش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە تەنها کاتێك پەنابردنە بەر (قیاس) بۆ هەڵهێنجانی حوکمێکی شەرعیی دروستە، کەلەو بارەوە دەق(نص)ێکی شەرعیی لە بەردەست نەبێ، ئەگەر نا وەك بنچینەیەکی ئیسلامییە کە (لا إجتهاد في مقابل النص)،[1] ئنجا وەك پێشتریش ڕوونمانکردەوە کەچەندان دەقی شەرعیی ڕوون و ڕاشکاو لەسەر عەوڕەتنەبوونی دەموچاو و دوو دەستی ئافرەت هەن، بۆیە دروست نیە لەسەر بناغەی قیاس، قسە لەو مەسەلەیە بکرێ!

(١) بڕوانە: (الرسالة) للأمام الشافعي، لاپەڕە ٢٠٦، بڕگەی: ١٣٢٦، وە بڕوانە: (الوجيز في أصول الفقه) للدكتور عبدالكريم زيدان، لاپەڕە ١٩٩، کەگوتوویەتی: (ومن المقرر عند الاصوليين: لا إجتهاد في معرض النص)، وە بڕوانە: (أصول الفقه المهمة) عبدالرحمن ناصر السعدي، لاپەڕە ٩٩.

٦- بەڵگەیەکی دیکەشیان ئەوەیە کەئەو فەرمایشتانەی عەورەتنەبوونی دەستو ڕووی ئافرەت دەگەیەنن بەر لەفەرزبوونی چارشێو(جلباب)[1] بوون!
بەڵام لەڕاستیدا ئەم قسەیە هیچ هێزو پێزێکی نیە، چونکە:

أ- ئەسڵ لەحوکمە شەرعییەکاندا ئەوەیە کەهەر لەجێی خۆیان دەبنو هیچ کەس بۆی نیە باسی لاچوون(نَسْخ)یان بکات، مەگەر بەبەڵگەیەکی

---

(١) (راغب) لەپێناسەی (جلابیب) دا دەڵێت: (القُمُص والخُمُر) واتە: کراسەکانو سەرپۆشەکان، بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) لاپەڕە ١٩٩، بەڵام چاکترین پێناسە ئەوەی (ابن العربي) یە کەگوتوویەتی: (إختلف الناس في الجلباب على ألفاظ متقاربة، عمادها: انه الثوب الذي يستر به البدن) بڕوانە: (أحكام القرآن) بەرگی -٣- لاپەڕە (٦٢٥)، واتە: خەڵکی لەبارەی (جلباب) ەوە ڕاجیاییان هەیە، بەڵام بەچەند وشەو تەعبیرێکی لەیەك نیزیك، کەکاکڵەکەیان ئەوەیە کە: (جلباب) بریتییە لەو پۆشاکەی کەهەموو جەستەی پێدەپۆشێت. ئینجا (الشوكاني) یش لە (فتح القدير) ەکەی خۆیدا، ج٤ص٣٦٩، لەوبارەوە گوتوویەتی: (والجلابيب جمع جلباب، وهو ثوب يستر جميع البدن)، کەماناکەی ڕوونەو وشەی (الملحفة) ش وەك خاوەنی (المعجم الوسيط) ص٨١٨، پێناسەی کردوە، سێ مانای هەن: أ- (مايلتحف به) هەرشتێکە کەلەخۆوە بیپێچرێت، ب- (اللباس فوق سائر اللباس) بەرگی سەرەوەی جلوبەرگ، ج- (غطاء من القطن المضرب يتدثر به النائم) پۆشاکێکە کەلۆکەی پەڕەکراو دروستدەکرێ بابای خەوتوو بەخۆیدا دەدات، کەبەکوردی (لێفە) و(لحێف) ی پێدەڵێن، وشەی (القناع) یش وەك سەرچاوەی پێشوو مانایکردوە، ص ٧٦٣، (القناع ماتغطي به المرأة رأسها) ئەو شتەیە کەئافرەت سەری پێدادەپۆشێت، کەبەکوردیی (سەرپۆش) و (لەچك) ی ناوە.
(القاسمي) یش لە (محاسن التأويل) ج٨ص٣٠٨دا، لە (الزمخشري) یەوە نەقڵ دەکات کەگوتوویەتی: (الجلباب ثوب واسع أوسع من الخمار ودون الرداء..)، دیارە بەزاراوەی ئێستاش ئێمە هەم (چارشێو) هەم (عەبا) وەهەم هەر پۆشاکێکی دیکە سەرتاپا گرەوە، بە (جلباب) دەزانین.

ڕوونو بێ چەندو چوونی وا، کە هیچ جۆرە مشتومڕێك هەڵنەگرێ، دەجا بێگومان، نەك هەر بەڵگەیەکی وا، بەڵکو نیمچە بەڵگەیەکیش نیە، کە بگونجێ بە لابەر(ناسخ)ی ئەو دەقانە دابنرێ، بەتایبەت ئایەتەکان، ئنجا سەربارەی ئەوەی کە ئایەتەکانی (حجاب) و (جلباب) کە لەسورەتی (الأحزاب)دان، وەك (بخاري) لە (المسور بن مخرمة)ەوە هێناویەتی، لەساڵی سێ، یان پێنجی کۆچیو لەکاتی گوێزانەوەی (زینب بنت جحش)دا خوا لێی ڕازیبێ، هاتوونەتە خوارێ، بەلام وەك پێشتر باسمانکرد ئەو فەرمایشتانەی کەئێمە بەبەڵگەمان هێنانەوە، هەموویان، یان لانی کەم هەندێکیان، بەتەئکید پاش ئەو مێژووە گوتراون، بەتایبەت ئەوەی بەسەرهاتی (الخثعمية)ی تێدایە، هەروەها ئەم فەرموودەیەش: ((**أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ النِّسَاءَ أَنْ يَخْرُجْنَ لِصَلَاةِ العِيدِ، قَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: إِحْدَانَا لا يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا**)) متفق عليه. واتە: (کاتێك پێغەمبەرﷺ فەرمانیکرد کە ئافرەتان بۆ نوێژی جەژن بچنە دەرێ، (أم عطية) بەپێغەمبەریﷺ گوت: ئەدی ئەگەر یەکێکمان (جلباب)ی نەبوو؟! ئەویش فەرمووی: باخوشکەکەی لەچارشێوەکەی خۆی بەشی بداتو تێیەوە بپێچێ).

{لەم فەرموودەیەوە نیشانەیەکی گرنگی (جلباب)مان بۆ دەردەکەوێت، ئەویش ئەوەیە کە هەم گەورەو فراوانەو، هەم دەشگونجێ هەر بەخۆدا بدرێتو لەبەر نەکرێ، ئەگەرنا ناگونجێت بۆ دوو کەسان بەکار بێت!}

کەواتە: دەرکەوت کە چوونی ئافرەتان بە (جلباب)ەوە بۆ نوێژی جەژن

پاش فەرزبوونی (حجاب)[1] و (جلباب) بووە!

ب- ئنجا- وەك لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا خستوومانەتەڕوو- بێگومان ئافرەتی مسوڵمان بەگشتیو بەتایبەتی (صحابیات) خوا لێیان ڕازیبێ، هەمیشە شانبەشانی پیاوان لە هەموو بوارو مەیدانەکاندا، سەرگەرمی کارو چالاکی بوونو پێچەدارو بێپێچە(منتقبة وغير منتقبة)شیان هەر لەنێودا بووەو، هیچ کاتێکیش دەموچاو بەدەرەوە بوونی ئافرەت نەکراوەتە کێشەو گرفت، کەواتە ئەوە کە (دەموچاوی ئافرەت عەورەت نیە) شتێکی زانراو و سەلمێنراو بووە لەنێو مسوڵماناندا، وەك چۆن پێچە گرتنەوەش هەبووە، هەربۆیەش (إبن المفلح) کە یەکێکە لەزانا بەرجەستەکانی مەزەبی حەنبەلیی، لەوەڵامی پرسیاری ((هل يَسُوغُ الإنكار على النساء الأجانب كشف وجوههن في الطريق؟! واتە: ئایا دەگونجێتو دروستە ئەرکی قەدەغەکردنی ناشەرعیی(انكار المنكر) لەگەڵ ئافرەتانی بێگانەدا ئەنجامبدرێت، کەلەڕێگاو باناندا ڕوویان

(١) هەرچەندە لەبارەی ئایەتی (حجاب) ەوە ڕاجیایی هەیە، بەڵام (ابن حجر العسقلاني) لە (قاضي عياض) ەوە نەقڵی کردوە کەتایبەتە بەهاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، بڕوانە (فتح الباري) بەرگی (٩) لاپەڕە ٤٨٧، کە گوتوویەتی: (فرض، الحجاب مما اختصصن به فهو فرض عليهن بلا خلاف في الوجه والكفين..)، دیارە بەڵگەش لەسەر ئەوە زۆرن کەپەردە گرتنەوەو لەپشت پەردەوە قسە لەگەڵکردن، تایبەتە بەئافرەتانی پێغەمبەرەوە ﷺ و خوا لێیان ڕازیبێت، بەڵام حەیفێ گەلێك کەس، هەتا ئێستاش نازانن، کە (حجاب) و (جلباب) دوو مەسەلەی لەیەك جیان، دیارە کەدەشڵێین، لەپشت پەردەوە (من وراء حجاب) قسەکردن تایبەتە بەهاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت، مەبەستمان ئەوە نیە کە بۆ ئافرەتانی دیکەش دروست، یان پەسەند نیە! نەء، بەڵام وەك دایکانی بڕواداران، لەسەریان فەرز نیە.

دەردەخەن؟!دا دەڵێ: وەڵامی ئەو پرسیارە لەسەر ئەوە وەستاوە، کە ئایا ئافرەت لەسەری پێویستە ڕووی داپۆشێت، یان پێویستە چاوی لێبگیرێتەوە؟! پاشان ئەو ڕایە هەڵدەبژێرێ، کە ئافرەت ڕووی خۆداپۆشینی لەسەر فەرز نیە.[1]

لەکۆتایی پووچاندنەوەی بەناو بەڵگەکانی لایەنگرانی ئەو ڕایەدا ،کە پێی وایە ڕوو دەستەکانی ئافرەت عەورەتن‌و لەسەری فەرزە ،کە دایانپۆشێت، بەپەسەندی دەزانم کە بەڵگەیەکی دیکەش بخەمەڕوو لەسەر ڕاستیی ڕای جەماوەری زانایان‌و هەڵەیی ڕای ئەو کەسانەی کەدەموچاو[2] و دەستی ئافرەت بەعەورەت دەزانن:

---

(١) بڕوانە: (الآداب الشرعية) بەرگی (١) لاپەڕە ٣٥٩.

(٢) دیارە حوکم‌و یاساکانی شەریعەت مادام لەلایەن خوای کاربەجێوەن، هەموویان لەسەر بناغەی زانست‌و حیکمەت بنیاتنراون، جا هەرچەندە ئینسانی مسوڵمان بۆ ئیمان پێهێنان‌و لێدڵنیابوونیان کەڕاست و دروستن‌و بەرژەوەندی‌و سوودی ئینسان دابین دەکەن لەدنیاو دوارۆژدا پەکی لەسەر دەرکەوتن‌و پەی پێبردنی حیکمەتەکانی حوکم‌و یاساکانی خوای دادگەرو کاربەجێ نەکەوتوەو، وشەی بەرزی (أشهد أن لا اله الا الله وأشهد ان محمد رسول الله) هەموو گرێکوێرەیەکی بۆ چارەسەر کردوە، بەڵام لەولاشەوە هیچ بەرگرو پەرچ(مانع) ێك لەبەردەمیدا نیە ،کە هەتا دەتوانێت وردبێتەوەو سەرنج بدات‌و لێکۆڵێتەوە تاکو حیکمەتی حوکمەکانی خوای بەرزو مەزن دەرك بکات‌و بزانێت ،چونکە هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی زانیاری زیاتر پیشەی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوایە ﷺ، سەرنج بدە چۆن (ابراهیم) کە (خليل الله) یە لەخوا دەپاڕێتەوە کەچۆنیەتی مردوو زیندوو بوونەوەی پیشان بدات: (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى) (البقرة: من الآية٢٦٠)، ئنجا کاتێکیش پەروەردگاری زاناو پەنهان بینی پێی دەفەرموێت: ئایا ئیمانت نەهێناوە بەزیندووبوونەوەی مردووان؟! (قال: أو لم تؤمن؟!) ئیبراهیم عليه الصلاة والسلام هاندەری ڕاستەقینەی خۆی بۆ ئەو داوایەی دەخاتەڕوو و دەفەرموێت: با ئیمانم هێناوە، بەڵام بۆئەوە دڵم ئارام بگرێت-بەهۆی زانیاری زیاترەوە-: (قال: بلى ولكن لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي..) .

ئەویش ئەوەیە کە: مادام خوای کاربەجێ بەهەرکام لەپیاوانو ئافرەتانی فەرموە کە لەسەیرکردنو ڕوانینی خۆیان بەرانبەر بەیەکدی، بگرنەوە: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ .. وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾ (النور: ٣٠-٣١)، کەواتە: وەك چۆن پیاوان دەموچاویان دیارەو عەورەت نیە، بۆیە بەئافرەتان وتراوە، کە لەسەرنجو تەماشەکردنیان[1] بۆ پیاوان بگرنەوە ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾، ئەگەر نا، ئەگەر هاتباو دەموچاوی پیاوان عەورەت بوایە،دیارە پێیان دەگوترا کەدایپۆشن، لەجیاتی ئەوەی، کە بەئافرەتان بگوترێت: لەتەماشاکردنتان بگرنەوە،[2] جا بەهەمان شێوەش بۆیە بەپیاوان گوتراوە لەسەرنجی چاوەکانتان بۆ ئافرەتان بگرنەوە: ﴿.. وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾، چونکە دیارە ئافرەتان لەسەریان پێویست نیە کەدەموچاویان

---

جا بۆ حیکمەتی عەورەت نەبوونی دەستو دەموچاوی ئافرەتیش وەك زانایان گوتوویانە، دەتوانین بلێین: حیکمەتەکەی ئەوەیە کەئافرەت بۆ کڕینو فرۆشتنو جۆرەها هەلسوکەوتی دینداریی‌و دنیاداریی، هەم پێویستی بەبەدەرەوەبوونی دەستەکانی هەیە بۆ گرتنو وەرگرتنو.. هتد، وەهەم پێویستی بەبەدەرەوە بوونی دەموچاوی هەیە، بۆ دیتنو قسەکردنو ڕۆیشتنو.. هتد، بەلام مەگەر لەحالەتی نائاسایی دا، دەنا پێویستی بەدەرخستنی ئەندامەکانی دیکەی نیەو لەحالەتی ناچاریی‌و نائاساییشدا بنچینەی: (الضرورات تبيح المحظورات) دێتە گۆڕێ.

(١) (ابن العربي) گوتوویەتی: (.. وكما لايحل للرجل أن ينظر الى المرأة فكذلك لايحل للمرأة أن تنظر الى الرجل، فأن علاقته بها كعلاقتها به وقصده منها كقصدها منه..) (أحكام القرآن) ج٣ص٣٨٠.

(٢) (راغب) گوتوویەتی: (الغض: النقصان من الطرف والصوت..) مفردات ألفاظ القرآن ص ٦٠٧، ٦٠٨. واتە: (غض) بەلێکەم کردنەوەو لێگرتنەوەی ڕوانینو دەنگ دەگوترێت.



داپۆشن، چونکە عەورەت نیە!

ئەمەش چەند فەرموودەیەك لەو بارەوە کەدەبێت پیاوان چاوی خۆیان بگرنەوە لەسەرنجدانی ئافرەتان:

أ- ((**عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّـهِﷺ عَنْ نَظْرَةِ الفُجَاءَةِ؟ فَـأَمَرَنِي أَنْ أَصْـرِفَ بَصَـرِي**)) رواه مسلم وأبوداود والترمذي وأحمد والحاكم والبيهقي.

واتە: (لەبارەی سەرنجی کتوپڕەوە پرسیارم لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرد؟ ئەویش ﷺ فەرمانی پێکردم کەچاوم لابدەم)..

ب- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بە (علي بن أبي طالب) خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: ((**يَا عَلِيُّ لاَ تُتْبِعْ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ فَإِنَّ لَكَ الأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ**))رواه أبوداود والترمذي والحاكم والصحة على شرط مسلم و وافقه الذهبي، ورواه أحمد والبيهقي.

واتە: (ئەی عەلی! جار لەدوای جار سەرنج مەدە (ئافرەتان)، چونکە هی یەکەمجارت بۆ دەپۆشرێت، بەڵام هی دووەم نا).

پێموایە حیکمەتی ئەوەش کەپێغەمبەری خوا ﷺ هێندەی داکۆکی لەپیاوان کردوە کە لەسەرنجدانی ئافرەتان خۆبپارێزن، هێندە بەئافرەتانی نەفەرمووە هەر ئەوەیە کە، وەك پێشتریش باسمانکردوە: سروشتی ئافرەت وایە کەزیاتر حەز دەکات داواکراو(مطلوب) بێت، نەك داواکار(طالب) و، مەعشووق بێت نەك عاشق!

هەر بۆیەش لەهیچ شوێنو ڕۆژگارێکدا نەبیستراوە- مەگەر بەدەگمەن- کە ئافرەتان لەڕووی جینسییەوە پیاوان سەغڵەت بکەنو (تَحَرُّش) یان پێبکەن، بەپێچەوانەی پیاوانەوە، کەهەمیشە- مەگەر دینو ڕەوشت دامەزراو، یان

زۆر جوامێرو پیاوبووبن- ئەو دیاردەو حاڵەتەیان لەبارەی ئافرەتانەوە لێبینراوە، وەك ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَ ﴾ (الأحزاب: من الآية: ٥٩) ئاماژەی پێدەكات.

ئێستاش كە بۆمان روون بۆوە، ئەو عەورەتەی كە لەسەر ئافرەت فەرزە لەلای پیاوانی بێگانە(أجنبي)[1] دایپۆشێت، چییەو كوێیە، كاتی ئەوە هاتوە بەكورتی نیشانەو سیفەتەكانی ئەو پۆشاكەش بخەینەروو، كە بۆ ئافرەت دەشێت عەورەتی خۆی پێداپۆشێت:

بەسەرنجدانی دەقەكانی قورئانو سوننەت بۆمان دەردەكەوێت كەپۆشاكی ئافرەتی مسوڵمان پێویستە ئەم حەوت(٧) مەرج و سیفەتانەی تێدابن:[2]

**یەك:** هەموو سەرتاپای جەستە دایپۆشێت، بێجگە لەدەموچاوو هەردووك دەستی تامەچەكەكانی.

(١) پیاوی (أجنبي) لەزاراوەی شەرعدا هەر پیاوێكە كەئێستا یان لەداهاتوودا پاش نەمانی پەرچ (مانع) ێكی كاتیی ئەو ئافرەتەی پێببشێت. بڕوانە: (المفصل..) ج٣ص١٨٢، ١٨٣.

(٢) بڕوانە: (جلباب المرأة المسلمة) ی شێخ ناصرالدين الالبانى، ص ٣٧، بەڵام ئەو هەشت مەرجی هێناون كەیەكیان (بۆنخۆش نەبوون)ەو منیش لامبرد، چونكە بۆنخۆشبوونی ئافرەت لەكاتی چوونە دەرەوەدا تایبەت نیە بەبەرگو پۆشاكیەوەو بەگشتی لێی قەدەغەیە، وەك لەچەندان فەرموودەدا هاتوە، بۆ وێنە: (أيما امرأة استعطرت فمرت على قوم ليجدوا ريحها فهي زانية..) رواه النسائي وابن خزيمة وابن حبان في صحيحيها ورواه الحاكم وصححه ورواه أبوداود والترمذي وحسنه الالباني، واتە: هەر ئافرەتێك خۆی بۆنخۆش بكاتو بەلای كۆمەڵێكدا رەتبێت تاكو بۆنی بكەن، ئەوە زیناكەرە (مەبەست زینای گچكەیە، نەك هی گەورە) .

بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج٢ص ٦١٣، (الكبيرة التاسعة والسبعون بعد المائتين): (خروج المرأة من بيتها متعطرة متزينة ولو بأذن زوجها) .

**دوو**: نابێت پۆشاکەکە لەخودی خۆیدا زریق‌و بریق‌و ڕازاوەو سەرنجڕاکێش بێت.

**سێ**: نابێت هێندە تەنك بێت، کە پێستی تێدا دیاربێت.

**چوار**: نابێت تەسك و تروسك بێت و وەسفی ئەندامەکانی بکات‌و شێوەو قەبارەیان دیار بخات.

**پێنج**: نابێت وەك هی پیاوان بچێت، چ جای هەر هی ئەوان بێت!

**شەش**: نابێت وەك هی ئافرەتانی کافر بچێت، واتە: پۆشاکێك کە مانایەکی ئایینی دەبەخشێ کە تایبەتمەندیی کۆمەڵێکی نامسوڵمانە.

**حەوت**: نابێت پۆشاکێکی وابێت ،کە شۆرەتی پێدەربکات، جا چ بەباری چاکیی‌و گران قیمەتییدا بێت، چ بەباری خراپیی‌و هەرزان قیمەتییدا، مەگەر لەبەر ناچاریی‌و نەداریی بێت.

جا ئێستا با بەکورتیی سەرنجی هەرکام لەو حەوت مەرج‌و نیشانانە بدەین، داخۆ بەڵگەیان چییە ؟!

**یەك**: جارێ یەکەمیان، کە (دەبێت هەموو جەستەی جگە لەوەی کەلێی هەڵاوێرراوە بگرێتەوە) ئەوە لەڕابردوودا بەدرێژی باسمانکردو پێویست بەدووبارە کردنەوە ناکات.

**دوو**: ئەمیش کە (نابێت پۆشاکەکە لەخودی خۆیدا زریق‌و بریق و ڕازاوە بێت) بەڵگەکەی هەر خودی ئایەتی: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ەیە، چونکە ئافرەت لەسەری پێویستە کەجوانیی‌و ڕازاوەیی(الجمال والزينة)ی خۆی-جگە لەوەی هەڵاوێرراوە- بشارێتەوەو دەرینەخات، دیارە بەرگ و پۆشاکی ڕازاوەو بەزرق و بریقیش، جۆرێکە لەجوانیی‌و سەرنجڕادەکێشێت، بۆیە پێویستە دەرنەخرێت‌و بشارێتەوە، بەڵام پێویستە بزانرێت کەمەرج نیە چارشێو و

عەبا یان هەر بەرگێکی سەرتاپای ئافرەت، حەتمەن یان ڕەش یان سپی بێت، بەڵکو ڕەنگەکانی دیکەش هەر دروستن، بەڵام بەو مەرجەی کەگوترا، بەڵگەی دروست(جائز) بوونی ڕەنگەکانیش ئەوەیە، کە وەك (ابن أبي شيبة) هێناویەتی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ و ئافرەتە هاوەڵە(صحابية)کان خوا لێیان ڕازی بێت، لەڕەنگی سوورو (عَصْفَر) پۆشاکیان پۆشیوەو ڕەنگیانکردوە.[1]

بەڵام ئێستا (٢٠١٢/١١/٥) دەڵێم: لەڕاستی دا ئەمجۆرە بەڵگە هێنانەوەیە ئەوپەڕی بایی ئەوە دەکات بگوترێ: بەرگو پۆشاکی زۆر زریقو بریق ناپەسند (مكروه)ە، ئەگەرنا، بایی ئەوە ناکات بگوترێ: ئەو جۆرە پۆشاکە قەدەغەیە.

**سێ**: مەرجی سێیەمیش کەبریتییە لە تەنك(شفاف) نەبوونیو پێستو موو تێدا دەرنەکەوتنی) بەڵگەی زۆرن، یەکیان ئەم فەرمایشتەیە[2]: ((**صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا، قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ** ...)) رواه مسلم وغيره، جا (ابن حجر الهيتمي) لەمانای ((**نِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ**)) واتە: ئافرەتانێکی پۆشتەی ڕووت دا، گوتوویەتی: (والمراد كاسيات صورةً عاريات معنىً، بأن تلبس ثوباً رقيقاً يصف لون أبدانهن)) واتە: مەبەست ئەوەیە کە بەڕواڵەت پۆشتەنو لەڕاستیدا ڕووتن، وەك ئەوەی بەرگێکی تەنك بپۆشێت ،کە ڕەنگی

---

(١) بڕوانە: (المصنف) لابن أبي شيبة، ج٨ص٣٧١، ٣٧٢، (عَصْفَر)یش جۆرە گوڵێکە ڕەنگی سووری لێ دروست دەکرێت.

(٢) بڕوانە: (الزواجر عن إقتراف الكبائر) لابن حجر الهيتمي، ج١ص٣٠١، الكبيرة الثامنة بعد المائة :(لبس المرأة ثوبا رقيقاً يصف بشرتها) .

جەستەیان دەربخات.)

دیارە (ابن حجر)ئەم ڕەفتارەی ئافرەتانی لەكتێبە كەی خۆیدا لە ریزی گوناهە زلەكان(الكبائر) ژماردوە.

**چوار**: مەرجی چوارەمیش كەبریتییە لە (تەسكو تروسكو تەنگ(ضيق) نەبوونی بەجۆرێك كە وەسفی ئەندامەكانی بكات و شێوە و قەبارەیان دەربخات) بەڵگەی جگە لەعەقڵو[1] فیترەت، ئەم فەرمایشتەشە: ((**عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: كَسَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قُبْطِيَّةً كَثِيفَةً مِمَّا أَهْدَاهَا لَهُ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ فَكَسَوْتُهَا امْرَأَتِي، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِﷺ: مَا لَكَ لَمْ تَلْبَسْ الْقُبْطِيَّةَ؟ قُلْتُ: كَسَوْتُهَا امْرَأَتِي، فَقَالَ: مُرْهَا فَلْتَجْعَلْ تَحْتَهَا غِلَالَةً، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ تَصِفَ حَجْمَ عِظَامِهَا**)) اخرجه الضياء المقدسي في (الاحاديث المختارة) وأحمد والبيهقي بسند حسن وله شاهد من حديث دحيه نفسه أخرجه أبوداود والبيهقي والحاكم وصححه.

وەك دەبینین (أسامة) خوا لێی ڕازی بێ، قوماشێكی جۆری (قبطية)ی بەدیاریی لەپێغەمبەری خواوە ﷺ پێگەیشتوەو كردوویەتە پۆشاكی ژنەكەی، ئنجا پێغەمبەری خوا پێی فەرمووە ،كە ژێركراسێكی لەبنەوە لەبەر بكات، نەبادا شێوەی ئەندامەكانی دەربخات.

جا هەرچەندە وەك دەردەكەوێت، ئەستوور(كثيف)یش بووە، بەڵام وا دیارە جۆرە قوماشێكی نەرم و بەبەدەنەوە چەسپاو بووە.

**پێنج**: مەرجی پێنجەمیشی ئەوەیە كە (نەهی پیاوانە، نە وەك هی ئەوانیش بچێ) ئەمیش بەڵگەی زۆرن، بۆ وێنە: ((**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِﷺ الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ**))أخرجه

---

(١) چونكە حیكمەتی جلوبەرگ داپۆشین (ستر)ە، دیاربوونی جەستەش پێچەوانەی ئەوەیە.

أبوداود وابن ماجة والحاكم وأحمد وصححه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي وقال الالباني: وهو كما قالا وصححه ابن حبان والشوكاني.

واته: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی لەپیاوێك كردوه، كە بەرگی ژنانە دەپۆشێت‌و، ژنێكیش كە پۆشاكی پیاوانە دەپۆشێت).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**لَيْسَ مِنَّا مَنْ تَشَبَّهَ بِالرِّجَالِ من النِّسَاءِ وَلَا مَنْ تَشَبَّهَ بِالنِّسَاءِ من الرِّجَالِ**))اخرجه أحمد عن عبدالله بن عمر وبن العاص ورواه الطبراني باختصار وأخرجه أبو نعيم في الحلية وقال: الألباني: يستشهد بمثله.

واته: (هەركەسێك لەژنان خۆی بەپیاوان بچوێنێت لەئێمە نیە، هەروەها هەركەسێك لەپیاوان خۆی بەژنان بچوێنێت).

هەروەها (ابن عباس) خوا لێیان رازی بێت گوتوویەتی: ((**لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُتَشَبِّهِينَ من الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ من النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ**)) رواه البخاري وأبوداود وأحمد.

**شەش:** مەرجی شەشەمیش ئەوەیە كە (نابێت لە هی ئافرەتانی كافر بچێت) بەڵگەكەی ئەوەیە كەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ لەچەندان دەقی قورئان‌و سوننەتدا ئاگاداریان كردووینەوە كە نابێت لاسایی ئەهلی كوفر بكەینەوەو، شوێن ئارەزوەكانیان بكەوین و چاویان لێبكەین، بۆ وێنە:

أ- ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية: ١٨پاشان (واتە پاش ئەهلی كیتاب) تۆمان خستە سەر ڕێبازێك لەئایینی خۆمان، جاشوێنی بكەوەو نەكەویە دوای ئارەزوەكانی ئەوانە كە نازانن.﴾



ب- ((**عَنْ عَبْدَ اللَّه بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِﷺ عَلَيَّ ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ مِنْ ثِيَابِ الْكُفَّارِ فَلا تَلْبَسْهَا**))أخرجه مسلم والنسائي والحاكم وأحمد.

واتە: (پێغەمبەری خواﷺ دوو پارچە پۆشاکی بە (عصفر) ڕەنگ کراوی لەبەردا بینیم، فەرمووی: ئەمە لەپۆشاکی کافرانە مەیپۆشە).

ج- ((**عَنْ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِﷺ: مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ**))رواه أحمد وأبوداود وصححه الحافظ العراقي وقال ابن حجر: سنده حسن وصححه ابن حبان وقال ابن تيمية: هذا اسناد جيد في كتابه: (اقتضاء الصراط المستقيم).

واتە: (هەرکەسێك چاو لەکۆمەڵێك بکات و خۆی وەك وان لێبکات، ئەوە لەوانە).

ئێستاش (٢٠١٢/١١/٥) دەڵێم: پۆشینی پۆشاکی لەهی کافران چوو، تەنیا کاتێك حەرامە، کە مانایەکی دینیی و تایبەتەندییەکی کافرانی تێدا بێ، خۆ بەکافران چواندنیش لەجلوبەرگ و هەر شتێکی دیکەدا، ئەگەر لەتایبەتمەندیی دینییان نەبێ، حەرام نییەو ڕەوایە، وەك لەکتێبی (بۆنەو جەژنەکان لەتەرازووی شەریعەت دا) ڕوونمان کردۆتەوە.

**حەوت**: مەرجی حەوتەم و کۆتاییش ئەوەیە، کە (نابێت پۆشاکێك بێت شۆرەتی پێ دەربکات) بەڵگەی ئەم مەرجەش، بێجگە لەو دەقە گشتییانەی، کە فیزو کەشخەو خۆزانان و خۆ بەزلگرتن قەدەغە دەکەن، ئەم فەرمایشتەیە: ((**مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ فِي الدُّنْيَا أَلْبَسَهُ اللَّهُ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ أَلْهَبَ فِيهِ نَارًا**)) أخرجه أبوداود وابن ماجه ورواه أحمد والنسائي في السنن الكبرى وأخرجه البيهقي.

واتە: (هەرکەسێك لەدنیادا پۆشاکێکی ناو دەرکردو بپۆشێت، خوا لەڕۆژی دواییدا پۆشاکی زەبوونیی لەبەر دەکات، پاشان ئاگری بەردەداتێ).

جا دیارە پۆشاکی شۆرەتدارو بەناوبانگ، چ لەبەر زۆر چاکیی‌و گرانقیمەتیی بێت، چ لەبەر هەرزانقیمەتیی‌و سادەیی، یان لەبەر سەیریی‌و دەگمەنیی بێت، مادام بەمەبەستی ناوو شۆرەت دەرکردن بێت، هەر یەك حوکمی هەیە.

ئێستاش بەرلەوەی ئەم بڕگەی یەکەمە بەجێبهێڵین- هەرچەندە زۆر درێژ بۆوە- و بچینە سەر بڕگەی دووەمی ئەم باسە، بەپێویستی دەزانم سەرو ئاماژەی کورت بەچەند مەسەلەیەکی دیکەش بکەم، کە هەر پەیوەستن بەعەورەت‌و پۆشاکی ئافرەتانەوە: [1]

**یەکەم**: زۆر لەزانایان کەڕایان وایە، ڕوو و دوو دەستی ئافرەت عەورەت نین و لەسەری پێویست نیە دایانپۆشێت، دوایی لەلایەن خۆیانەوە مەرجێکیان داناوە، کەبۆتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی قسەکەیان! ئەویش کە گوتوویانە: بەمەرجێك لەسەر ئافرەت پێویست نابێت، کە دەمو چاوو دەستەکانی داپۆشێت، کەمەترسیی گوناح(خوف الفتنة)ی نەبێت بەهۆی تەماشاکرانییەوە.

بەڵام لەڕاستیدا ئەو قسەیە وێڕای ئەوەی، کە هیچ بەڵگەیەکی لەپشت نیە، قسەیەکی سەیریشە! چونکە خۆ بێگومان ئەو خوایەی، کە ڕێیداوە ئافرەتان دەمو چاوو دەستیان دیار بێت، هەر زانیویەتی، کە پیاوان سەیری ئافرەتان

---

(١) بۆ نووسینی ئەم وردە مەسەلانە سوودم لە(جلباب المرأة المسلمة) وەرگرتوە، دیارە بەگشتیش بۆ نووسینی ئەم باسەو وەرگرتنی فەرمایشتەکانو (تخريج) یان سوودم لێی وەرگرتوە، خوا پاداشتی (شێخ ناصرالدين) بداتەوەو لێی خۆش بێت.

دەکەن و پێیان سەرسام(مُعجَب) دەبن، هەر بۆیەش بەر لەوەی باسی ئەوە بکات، کەئافرەت چاوپۆشیی لێکراوە، لەنەشاردنەوەی جوانییەك، کە بەعادەت هەر دەردەکەوێت (**إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا**)، فەرمانی کردوە کەپیاوان بەئارەزووەوە تەماشایان نەکەن:﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾!

هەڵبەتە ئەو قسەیە زۆر ڕاستو ڕێکە، کەدەڵێت: هەر کاتێك پیاو مەترسیی گوناح(خوف الفتنة)ی بوو، حەرامە تەماشای ئافرەت بکات، وەك هەندێك لەزانایان گوتوویانەو[1] بەڵگەشی ئایەتەکەیە: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾! (النور: من الآية٣٠)، هەر بۆیەش هەم وشەی (غَضّ)ی بەکارهێناوە، کە بەمانای لێگرتنەوەو لێکەمکردنەوە دێت و، هەم (مِنْ) یشی خستۆتە سەر (أبصار)، کە بێگومان (مِنْ) لێرەدا بۆ (تبعیض)ە، کەواتە: هەموو ڕوانینێکی پیاوان بۆ ئافرەتان، هەروەها هی ئەوانیش بۆیان، حەرام نیە، بەڵکو ئەگەر بەئارەزووەوە بێت حەرامە، هەرچەندە بێگومان، هەر خۆپاراستن سەلامەت ترو چاکترە.

**دووەم**: کە دەگوترێت دەستو دەموچاوی ئافرەت عەورەت نین، دەبێت بزانرێت، کە ئەگەر هاتو ئافرەت، دەم وچاوی خۆی بەو شێوەیە فیترەتیو سادەیەی، کە توێژەروان باسیان کردوە(کل و خەنەو ئەنگوستیله وبازن) زیاتر ڕازاندنەوەو زیادەڕۆیی تێدا کرد، وەك لەم ڕۆژگارەدا باوە، ئافرەتان شتی سەیرو سەمەرە لەدەستو دەموچاویان دەکەن، ئەوە ئەگەر گریمان

(١) بڕوانە: (الفقه على المذاهب الأربعة) کەخاوەنی : (جلباب المرأة المسلمة) ئاماژەی پێکردوە، بڕوانە: ص ١٦.

ڕازاندنەوەو دەستکاریی خۆکردنەکە، لەئەسڵیشدا حەرام نەبێت، وەك برۆ باریککردن (النَّمص) و ددان تەنك کردن (الوشر) و خاڵ کوتان (الوَشم)، کە بە دەقی فەرمایشت لەعنەت لەو کەسانە کراوە، کە دەیانکەن و لەوانەش کە بۆیان دەکرێت! وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ..**))متفق عليه.[1]

بەڵێ ئەگەر خۆڕازاندنەوەو دەستکاریی خۆکردنەکە لەم جۆرانەش نەبێت، کەهەر لەئەسڵدا حەرامن، ئەوە مادام زیادەڕۆیی و (تكلف)ی تێدا کردبێت، هەر دەبێتە مایەی حەرام بوونی دەرخستنیان - واتە دەرخستنی دەمو چاوو دەستێك کەزیادەڕۆیی لەڕازاندنەوەیاندا کراوە-، بە بەڵگەی ئەوەی، کە ئایەتەکە کاتێك باسی جوانیی خۆدەرنەخستنی ئافرەتان دەکات، تەنها ئەو جۆرە جوانیی و ڕازاندنەوەیە هەڵدەوێرێ و جیادەکاتەوە، کەبەشێوەیەکی ئاساییەو بەبێ ویستن و (تكلُّف) دەردەکەوێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾.

بەڵام ئەگەر هات و بەئانقەست و بەشێوەیەکی نائاسایی بوو، ئەوە بێگومان حوکمەکەی جیایە، چونکە ئەوکاتە وشەی (ظَهَرَ) کە لەئایەتەکەدا هاتوە، نایگرێتەوەو وشەی (أظهَرَ) دەیگرێتەوە، دیارە دەرکەوتن (ظهور) و دەرخستن (إظهار) یش، زۆر لەیەك جیاوازن.

---

(١) بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج٢ص٢٧٢، کە (ابن حجر الهيثمي) هەرسێکیانی لەڕیزی گوناحە زلەکان حیساب کردوون، واتە: برۆ کردنو ددان تەنك کردنو خاڵکوتان.



**سێیەم:** هەرچەندە هەندێك لەزانایان ڕایان وایە، کە پێ(قَدَمْ)ی ئافرەتانیش وەك دەستەکانیان عەورەت نیە، بەڵام ڕایەکەیان هەڵەیە، چونکە:

أ- خـــوا فەرموویـــەتی: ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾(النور:من الآية٣١)

کەواتە: دیارە دەرخستنی پێیەکانیان حەرامە، چونکە بێگومـان ئـافرەت بۆیە پێ بەزەویدا دەکوتێت، تـاکو خڕخاڵـەکانی پێـی خرینگـەیان بێـت و پێیان بزانرێت، دەجا ئاشکرایە، ئەگەر هاتبـاو پێـی خۆدەرخسـتنیان بـۆ ڕەوا بوایــە، بــۆ ئاگادارکردنــەوەی پیــاوان لەخشــڵ و خڕخاڵــەکانیان، پێویستییان بەوە نەبوو، کە پێ بەزەویدا بکوتن و یەکسەر وەك بازنەکانی دەستیان دەریان دەخستن!

(ابن حزم الأندلسي)یش لەو بارەوە و دوای هێنانی ئەو ڕستە قورئانییـە، گوتوویەتی:[1] (هـذا نـص علـى أن الـرّجلَين والسـاقين ممـا يخفـى ولا يحـل إبداؤه).

ب- هەروەها (ترمذي) گێڕاویەتەوە کـە کاتێـك (أم سلمة) خـوا لێـی ڕازی بێت گوێی لە پێغەمبەرﷺ بوو فـەرمووی: ((**مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ لَمْ يَنْظُرْ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**)) واتـە: هەرکەسـێك بـەفیز پۆشـاکەکەی بەدوای خۆیدا ڕابکێشێت، خـوا لـەڕۆژی قیامەتـدا تەماشـای ناکـات)، لێی پرسی: ((**فَكَيْفَ تَصْنَعُ النِّسَاءُ بِذُيُولِهِنَّ؟!**)) واتە: ئەدی ئافرەتـان چـی لـەدامێنی کراسـەکانیان بکـەن؟!))، ئـەویش لەوەڵامـدا فـەرمووی:

(١) بڕوانە: (المحلّى شرح المجلّى) ج٣ص١٢٩.

((**تُرْخِينَهُ شِبْرًا**)) واتە: با بستێك درێژتری بكەن) ، گوتی: ((**إِذًا تَنْكَشِفَ أَقْدَامُهُنَّ**)) واتە: كەواتە پێیەكانیان دەردەكەون! ئەویش فەرمووی: ((**تُرْخِينَهُ ذِرَاعًا وَلاَ تَزِدْنَ عليه**)) واتە: دەبا باسكێك دامێنەكەیان بەربدەنەوە، بەڵام زیاتری نەكەن). [1]

**چوارەم:** زۆر لەزانایان، ئەگەر نەڵێم زۆربەی هەرە زۆریان، لەمەسەلەی بەرگ‌و پۆشاك‌و سنووری عەورەتدا، جیاوازییان خستۆتە نێوان ئافرەتی ئازاد(الحُرَّة) و كەنیزەك(الأمة)ەوەو، هەندێكیان گوتوویانە: عەورەتی كەنیزەك وەك هی پیاوەو، نێوان ناوك وئەژنۆ(مابين السرة والركبة) یەتی!!

بەڵام بەڕاستیی ئەو ڕایە هیچ بەڵگەیەكی وای لەسەر نیە و، (ابن حزم الأندلسي) یش لەو بارەوە جوانی گوتوە كەدەڵێت: [2] (وأما الفرق بين الحرة والأمة، فدين الله واحد والخِلقة والطبيعة واحدة، كل ذلك في الحرائر والإماء سواء، حتى يأتي نص في الفرق بينهما في شيء فيوقف عنده.. وما اختلف اثنان من أهل الأسلام في أن تحريم الزنا بالحرة كتحريمه بالأمة ،وأن الحد على الزاني بالحرة كالحد على الزاني بالأَمة، وأن التعرض الحُرَّة في التحريم كتعرّض الأمة ولا فرق، ولهذا وشبهه وجب أن لا يقبل قول أحد بعد رسول اللهﷺ إلاّ بأن يسنده اليهعليه السلام).

واتە: بەڵام جیاوازیی خستنە نێوان ئافرەتی ئازادو كەنیزەكەوە (ڕاست نیە)، چونكە ئایینی خوا یەكەو هەردووكیشیان یەك جۆرە سروشتیان هەیە، بۆیە پێویستە ئازادو كەنیزەك یەكسان بن لەو شتانەدا، هەتا دەقێك دێت‌و

(١) بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة) ج٤ص٤٧٨، رقم الحديث: ١٨٦٤، كەگوتوویەتی: أخرجه الدارمي والبيهقي واحمد.. وأخرجه وأبوداود والنسائي وابن ماجه واحمد.

(٢) بڕوانە: (المحلى شرح المجلى) ج٣ص١٣٠، ١٣١.

لەشتێکدا جیاوازییان دەخاتە نێوانەوە، ئیدی لەسەر ئەوە دەوەستێنرێت.. وەهیچ کام لە ئەهلی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕاجیابییان نەبووە، کە زیناکردن لەگەڵ ئافرەتی ئازاد ،وەك زینا لەگەڵ کەنیزەك حەرامە، وسزای زیناکەر لەگەڵ ئافرەتی ئازاد، وەك هی زیناکەر لەگەڵ کەنیزەکە، وە پرکێشیی کردن بۆ کەنیزەکیش، وەك پرکێشیی کردنی ئازاد حەرامە، جا بۆیە لەبەر ئەوەو وێنەی ئەم قسانە، پێویستە پاش پێغەمبەری خواﷺ هیچ کەسێك قسەی لێوەرنەگیرێت (وەك دین) مەگەر پاڵی داتە لای ئەوﷺ.

**پێنجەم:** ئەوە کە عەورەتی ئافرەت کە لەسەری پێویستە دایپۆشێت، تێکڕای جەستەیەتی، بێجگە لەدەمو چاو و هەردوو دەستی، تا مەچەکی، وەك چۆن ڕای زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوانی قورئانو فەرمایشتناسان(مفسري القرآن والمحدّثين)ە، ڕای زۆربەی هەرەزۆری شەرعزانان و پێشەوای مەزهەبە فیقهییەکان(الفقهاء وأئمة المذاهب الفقهية)یشە، وەك (ابن رشد)[1] گوتوویەتی، کە (أبو حنيفة)و (مالك)و (الشافعي)و (احمد) لەقسەیەکیدا لەنێویاندان وەك (النووي)[2] هێناویەتی: هەروەها (الطحاوي)[3] گوتوویەتی: هەرکام لە (محمد بن الحسن)و (أبو يوسف)یش، هەمان ڕایان هەیە، دیارە (إبن حزم الأندلسي)[4]یش هەمان ڕای پەسەند کردوە، گەلێك

(١) (بداية المجتهد ونهاية المقتصد) ج١ص٨٩.

(٢) (المجموع شرح المذهب) ج١٧ص٢٩٠، وە (شرح صحيح مسلم) ج٦ص ٣٨١٢.

(٣) (شرح المعاني) ج٢ص٩، لە (جلباب المرأة المسلمة) ص ٨٩، وەرگیراوە.

(٤) (المحلي شرح المجلى) ج٣ص١٢٦، مسألة: ٣٤٩ (والعورة المفترض سترها على الناظر وفي الصلاة من الرجل: الذكر وحلقة الدبر فقط، وليس الفخذ منه عورة، وهي من المرأة: جميع جسمها حاشا الوجه والكفين فقط) .

لەزاناو شارەزایانی هاوچەرخیش هەمان ڕایان هەیە، بۆ وێنە: (الشيخ محمدناصرالدين الالباني)[١] فەرموودەناسی ناوداری هاوچەرخ، وە (د. عبدالكريم زيدان)[٢] وە (سيد سابق)[٣] وە (د. وهبة الزحيلي)[٤] وە (د. محمد سعيد رمضان البوطي)[٥] وە غەیری ئەوانیش زۆرن، هەرچەندە ئێمە بۆ ئیسپاتی حوکمە شەرعییەکان، پاش هەبوونی بەڵگەی شەرعیی، پەکمان لەسەر هیچی دیکە نەکەوتوە، بەڵام ئەگەر بێتو وێڕای بەڵگەی بەهێز زۆرینەی، یان زۆربەی هەرە زۆری زاناو پێشەوایانیش پشتگیریی ڕایەك بکەن، هێزو پێزێکی مەعنەویی زیاتر پەیدا دەکات، هەربۆیەش یەکدەنگیی زانایانی ئیسلام ( إجماع علماء الإسلام ) بەلای زۆربەی هەرەزۆری زانایانەوە، یەکێکە لەبەڵگە شەرعییەکان، کە شەرعزانان بۆ هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان پشتیان پێدەبەستن.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کەبچینە سەر بڕگەی دووەمی ئەم خاڵی شەشەمەی بەشی سێیەم:

(١) کەکتێبی (جلباب المرأة المسلمة) چاکترین بەرهەمیەتی لەوبارەوە.
(٢) (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) ج٣ص١٩٠، ١٩١.
(٣) (فقه السنة) ج١ص١٤٠.
(٤) (الفقه الاسلامي وأدلته) ج٩ص٦٥٠١، کە گوتوویەتی: (والعورة: هي ماعدا الوجه والكفين) .
(٥) (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني) ص١٦٥.

## بڕگەی دووەم: حیکمەتی دیاریکردنی ئەو بەرگ و پۆشاکە

خوێنەری بەڕێز!

توێژینــەوەی ئــەم مەســـەلەیە لەبڕگــەی یەکەمــداو لەڕوانگــەی دەقــەکانی شەریعەتەوە، زۆری خایاندو پانتاییەکی زۆریداگرت، بۆیـە هەوڵـدەدەم ئـەم بڕگەیـە بەکورتیی و پوختیی بخەمەڕوو.

ئنجــا وەك پێشــتریش ئامــاژەم پێکــرد، مــن پێموایــە بەخســتنەڕووی ڕاســتییەکان(حقائق)ی شــەریعەت وەك خۆیــانو، پاککردنــەوەو لەبێــژینگ دانیــان لەهەموو ئەو ژەنگ و ژار و لیتەولاڵی وەهمو خەیاڵو بیروبۆچوونی هەڵەو عــورفو بــاوی ناتــەواوو کــرچو کــاڵی مســوڵمانان، کەبەدرێــژایی مێــژوو لێیــان ئــاڵاوە، تاڕاددەیەکی زۆر ڕێ تەختو هەموار دەبێت بۆ:

١- ڕاســـتکردنەوەی ڕەفتــارو هەڵســـوکەوتی بــەناو شـــەرعییانەی دوور لەشــەرعییانەی زۆرێــك لەمســـوڵمانان، کەکەرەســـتەیەکی بانگەشـــەو پڕوپاگەندەی خراپو چەواشەکاریی ناحەزانەی خستۆتە بەردەست نـەیارانی شەریعەتو، ئەوپەندە کوردییەیان بەسەردا چەسپیوە، کـە دەڵێـت: (بوکمان گەلێك جوان بوو! بالووکەشـی لـە لێـوێ هـات!) ئـەوانیش کـەخۆیان هـەر لەبنەڕەتدا ناحاڵیی و نەشارەزابوون بەشەریعەت، دیتنـی ئـەو هەڵسـوکەوتو ڕەفتــارە هەڵــەو ناشــەرعییانەش، هێنــدەی دیکــە بەچــاڵی نــەزانینی ئاوێتە(الجهل المركب)دا بردوونیە خوار!

٢- بۆ بەرچاو ڕوونکردنەوەو ئیقناع کردن، یان لانی کـەم، بەهانـە بەدەسـتەوە نەهێشتنی نەیارانی شەریعەت .

بۆیە من پێموایە لەمیانەی خستنەڕووی هەڵوێستی ڕاستو ڕەوانـی شـەریعەتدا لــەبارەی بــەرگو پۆشــاکی ئافرەتــەوە، تاڕاددەیــەکی زۆر ئامــانجی ئــەم بڕگــەی

دووەمەش هاتۆتەدی، بۆیە هەر بەکورتی دەڵێم:

مەگەر چۆن، دەنا خوای کاربەجێ لەپاڵ خستنەرووی حوکمە شەرعییەکاندا، حیکمەتەکەیشیانی خستۆتەڕوو، ئەوەتا خوای پەروەردگار لەئایەتی ژمارە (٥٩)ی سوورەتی (الأحزاب)دا پاش فەرمانکردنی بەپێغەمبەری خوا ﷺ کە بەهاوسەرەکانیو کچەکانی و ئافرەتانی مسوڵمانان بفەرموێت، کە چارشێوەکانیان لەخۆیانەوە بپێچن، یەکسەر حیکمەتی ئەو خۆداپۆشینەشی خستۆتەڕوو و فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾واتە: ئەو خۆداپۆشینەی ئافرەتان نیزیکترە بۆئەوەی بناسرێنو ئازار نەدرێن!.

**کەواتە:**

حیکمەتی ئەو جۆرە بەرگو پۆشاکەی کە شەریعەت بۆ ئافرەتانی دیاریکردوە، ئەوەیە کە لەسۆنگەی پۆشینی ئەوجۆرە بەرگو پۆشاکەوە، کەسایەتی خاوەن حەیاو ڕێزدارانەیان بناسرێت و، هیچ نەفس نزمو چڵێسێکی پیس چاویان تێنەبڕێ و تەماعیان تێنەکاتو، بەهۆی ئەو چاوتێبڕینو تەماع تێکردنەوە، دووچاری ئازارو چەرمەسەرییو گرفتاریی نەبن!

کەوابێت بەرگو پۆشاکی شەرعییانە، نەك هەر بەکەم سەیرکردنو بێڕێزیی تێدا نیە بۆ ئافرەت، بەڵکو هەر لەئەسڵدا لەبەر پاراستنی ڕێزو حورمەتیو بەرز ڕاگرتنی کەسایەتییەتیو، بۆ لێدوورخستنەوەی ئازارو نارەحەتیی جەستەیی و نەفسییە!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

لەسۆنگەی ئەوەوە کەخوای زاناو کاربەجێ و شارەزا بەسروشتی ئینسانەکان، دەزانێت کەئافرەت سروشتی وا دەخوازێت کە هەمیشە ویستراو(مراد) و خواستراو(مطلوب) بێت، تاکو لێرەوە بێهێزییە جەستەییو دەروونییەکەی بۆ

قەرەبوو بێتەوەو، لەگەڵ کەم تواناییدا-لەچاو پیاو- بتوانێت پیاو بەلای خۆیدا ڕاکێشێت و پەلکێش بکات و، دەزانێت کە پیاو بەپێچەوانەوە، هەمیشە سروشتێکی ویستەر (مريد)انەو داواکارانەی هەیە، بۆیە ئەگەر بێت و ئافرەت لەکاتی چوونە دەرەوەیدا بەرگو پۆشاکەکەی وانەبێت کەبەشێکی زۆری مێینایەتی(أنوثة)یيەکەی و هێزە کێشندەیی(قوة جاذبية)کەی بشارێتەوەو پەنهان بکات، ئەوە جارێ هەر ئافرەت بەلای کەمەوە لەدوولاوە زەرەر دەکات:

**یەکەم:** کەلەجیاتی ئەوەی وەك ئینسانێکی بەڕێزو سەنگینو خاوەن حەیاو حورمەت تەماشا بکرێتو، کەسایەتیی بەرز بنرخێنرێت، بەپێچەوانەوە بەدەستی خۆی کەسایەتیی و ڕێزو حورمەتی خۆی دەڕووشێنێتو بگرە دەڕووخێنێت، چونکە بەهۆی ڕانواندنی جوانییەکەی و خستنەڕووی مێینایەتییەکەی، بەهۆی نەپۆشینی بەرگو پۆشاکی شەرعییەوە، بەزمانی حاڵ لەجیاتی ئەوەی وەسفی ئینسانەتیی خۆی بکات، وەسفی مێینایەتی خۆی دەکاتو، سەرنجی نێرینەکانی بەلادا ڕادەکێشێتو پەلکێشیان دەکات، وەبەزمانی حاڵ بەدەورووبەرو کۆمەڵگا بەگشتیو پیاوان بەتایبەتی دەڵێت : کە من بەرلەوەی ئینسان بم، مێینە(أُنْثى)م!! چونکە ڕواڵەتو پۆشاکەکەی بەرلەوەی ئینسان بوونی تێدا بەدی بکرێت، مێینەبوونی لێدەخوێندرێتەوە! بەتایبەت ئافرەتانێك کەبەرگو پۆشاکی نەفامییانەی ئەم ڕۆژگارە لەبەر دەکەن، کەهێندە مێینایەتی(أنوثة) ئەو ئافرەتانەی بەرجەستە دەکات، من بەشەخسی خۆم پێم سەیرە کەئەو کلۆڵە لاساکەرەوەو دواکەوتوانەی مۆدیلەکانی ڕۆژئاوا، چۆن ڕوویان دێت بەڕێگادا بڕۆن! یان نازانم چۆن کەسوکاریان شەرم نایانگرێت و خەجاڵەت نابن، کەئەو ژنو کچو خوشكو دایکانەیان، ئاوا بەبێ شەرمیی و هێندە بەنزمیی دەبینن؟!!

**دووەم:** کە هەر زادەو بەرهەمی یەکەمەو، لەئەنجامی وەك گۆشتی سەرچەپەڕێ خۆخستنەگۆڕێداو، دەرخستنی سەرجەم جوانییو ڕازاوەییەکان بەئاشکراو پەنهانەوە، ئەوجۆرە ئافرەتانە حاڵەتی داواکراویێتی(المطلوبیة) لەدەستدەدەن، چونکە کابرا کەئەو ئافرەتەی وەك گۆشتی سەرچەپەڕێ بینیو، بگرە جاری وا هەیە هەتا ڕاددەیەك لێشی دەتامێنێت! دیارە هیچ هاندەرێکی ئامێنێ کەوای لێبکات هەوڵی بۆ بدات، مەگەر تەنها بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵی بگوزەرێنێتو کات بەسەر ببات!

لێرەدا بەچاکی دەزانم ئەم بەسەرهاتە کەیەکێك لەنووسەرە ئیسلامییەکان خۆی بینیویەتی هەر لەزمانو قەڵەمی خۆیەوە بەپوخت کراوەیی بۆتان بگێڕمەوە، تاکو حیکمەتەکانی شەریعەتی خواو بەزەییو پەرۆشی بۆ ئافرەت چاکتر دەرکەوێت، کەفەرمانی پێکردوە بەڕەچاوکردنو پەیڕەویی لێکردنی کۆمەڵێك ئەدەبو ڕەوشت، کەیەکیان بەرگو پۆشاکی شەرعییە:

ئەو نووسەرە دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

{چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژێکیان کچێك هاتە نووسینگەکەمەوە، لەکۆلێجی شەریعەت، کە هەستم کرد لەچکێکی ساختەی کردوەو هەندێك لەقژی پێداپۆشیوە، ئیدی مۆڵەتی لێم وەرگرت، کە دابنیشێتو بەسەرهاتی تاڵی خۆیم بۆ بگێڕێتەوە، بەهیوای ئەوە کەڕێڕوونیی بکەم یان هاوکارییەکی بکەم بۆ چارەسەری گرفتەکەی.

کورتەی بەسەرهاتەکەی ئەوەبوو ،کەکچێك بووە لەماڵێکدا پێگەیشتوە ،کە هیچ ڕێزێکی ئاینیان لەلا نەبووەو، بەهیچ شتێکییەوە پابەند نەبوو ون! لەقوتابخانەو پاشان زانکۆ خوێندوویەتیو شارەزا بووە، بێئەوەی هیچ کەسێك چاودێریی بکاتو لێی بپرسێتەوە و، گوتی: لەقۆناغی ئامادەییەوە کوڕان دەورەیان دەدامو وایان پێشاندەدا کەپێم سەرسام(مُعجَب)ن! وە هانیان دەدام کە زیاترو زیاتر

لەڕووی پۆشاك و ڕەفتارمەوە ئازاد بم! منیش تەسلیمی ئەو وەزعە بوومو دڵم وەك هوتێل و میوانخانەی لێهاتبوو! یەك لەدوای یەك گەنجەکان دەهاتنە نێوی!

هەتا لەقۆناغی زانکۆدا زیاتر بەو حاڵەتەدا ڕۆچوومو بەردەوامیش فشارم لەسەربوو کەزیاتر بەرەو ئازادیی (بەرهەڵدایی) بچم! ئیدی لەو ماوەیەدا یەکێك لەگەنجەکان بەتەواوی دڵی داگیرکردمو، ئەویش وای پیشاندەدا کەبەڕاستیی و لەقووڵایی دڵییەوە منی خۆش دەوێت! منیش پێشنیارم بۆ کرد لەکەسوکارم بمخوازێت، ئەویش وای پیشاندا کەڕازییەو بەتەئکیدەوە گوتی: کە منیش هەر بەو ئومێدەوە تۆم خۆشویستوەو، بەم زوانەش لێت دێمە پێشوو دەتخوازم! ئیدی لەوکاتەوە پەیوەندیمان بەهێزتر بوو، هەتا سەرەنجام لەیەکێك لەدیدارو ژوانەکانماندا توانی کەکچێنیم نەهێڵێت! دیارە منیش متمانەی تەواوم بە گفت و بەڵێنەکانی هەبوو!

ئیدی پاشانیش چەند جارێکی دیکە ئامانجی خۆی لێم هێنایەدی، منیش هەر پەیتاپەیتا پرۆژەی زەواجەکەمانم بیردەخستەوەو، ئەویش بەقسەی لووس و درۆو فێڵ دەیخافڵاندم!

هەتا لەیەکێك لەدیدارەکانماندا زۆر بەداکۆکییکردنەوە پێم گوت کەگفتی خوازبێنییکردن(خطبة)ەکەی بێنێتەدی! ئەویش بەشێوەیەکی بەسووك دانەرانە تەماشای کردمو گوتی: هەرکات بڕیاری ژن هێنانم دا بەدوای کچێکی شەریف و بەئابڕوودا دەگەڕێم، کە خۆی نەکردبێتە پەشتەماڵی دەستی خەڵکی!!

ئیدی کە ئەو قسەیەم بیست وەك چریکە و هاوارێکی توند لە خەوێکی دوور و درێژ ڕایچڵەکاندمو، هەستمکرد کە لەنێو ئاپۆڕاییەکی خەڵکی دام کە گاڵتەم پێدەکەنو پێم ڕادەبوێرنو هەڵم دەخەڵەتێننن! وە خۆمم زۆر بێکەس و غەریب هاتە بەرچاو لەم دنیایەدا، چونکە کەسوکارەکەم وێڵیانکردبووم کە بەکەیفی خۆم بژیم و

بچم، بەڵام دەشمزانی کە ئەگەر مەسەلەکەیان بۆ باس بکەم بەشێوەیەکی خراپ لەنێوم دەبەن!

ئنجا لەگەرمەی نارەحەتییداو بە ئاهونالەیەکەوە گوتی: ئێستاکە بۆم دەرکەوتوە کە ئەگەر هاتباو ئەدەبەکانی ئیسلامم رەچاوکردبان‌و، ئامۆژگارییو ئاراستەکانیم لەگوێگرتبان، بەو مەرەدە نەدەچووم‌و، ئاوا گرفتاری تەڵەو داوای هیچ فێڵبازێك نەدەبووم‌و، کەرامەت‌و کەسایەتییم پارێزراو دەبوو!

جا بەراستیی ئێستا نازانم چی بکەم؟!!

منیش پێم گوت: جا باشە (دادە) پێویستی دەکرد کەخۆت بخەیتە نێو ئەم ئەزموونە تاڵەوە و فەرمانەکانی خوا تاقیبکەیەوە، بۆ ئەوەی سەرەنجام بگەیتە دڵنیایی؟

ئایا ئەوەت نەدەزانی -کەپێویستە هەموو عاقڵێك بیزانێت- کە ئەم ئایینەی خوا بەگشتی کۆمەڵێك رێڕوونییو ئامۆژگاریی خوای خاوەن ئەوپەری بەزەییەوە، بەندەکانی خۆی پێدواندوون، تاکو بەرەچاوکردنیان‌و پابەندیی پێوەکردنیان بەختەوەربن‌و، لەهەموو خراپەو زیانێك پێی پارێزراوو چەپاڵە دراوبن؟!

ئەویش پێی گوتم:

من لەمرۆوە بەڵێن‌و پەیمان بەخوا دەدەم-بەپەشێمانییەوە- کە ملکەچی فەرمانەکانیو پابەندی یاسایەکانی بم‌و، جارێکی دیکە ئاوڕ لەفێڵ‌و پیلانی شەیتان نەدەمەوەو تەسلیمی هەواو ئارەزووەکان نابم!

منیش پێم گوت: بەین بەین سەردانم بکەو دڵنیاش بە کەخوای بەبەزەیی دەرووی خێرت لێدەکاتەوە!

جا لەلوتفو کەرەمە سەرسوڕهێنەرەکانی خوا (جلّ وعلَی) ئەوەبوو کەپاش تێپەڕبوونی سێ چوار رۆژێك بەسەر ئەو دیدارو قسەو باسەدا، گەنجێکی مسوڵمان



سەردانی كردم‌و سكاڵای حاڵ‌و وەزعی خۆی لەلامكرد كەپێویستی بەئافرەتێكی دیندارو گونجاو هەیە بۆ ژن هێنان‌و ماڵ پێكەوەنان!

منیش پێم گوت: ڕات چییە بەرانبەر بەئافرەتێك كەهەم لەدیمەن‌و شێوەی ڕازی بی‌و هەم دین‌و ڕەوشتیشت بەدڵ بێت؟!

ئەویش گوتی: زۆرباشە، كێیە؟!

ئیدی منیش بەسەرهاتەكەیم بۆ گێڕایەوەو، بۆم لەبنی كوولەكەداو حاڵ‌و باڵیم خستەبەرچاوی‌و، بۆیشم باسكرد، كەمنیش متمانەم بەتۆیەو گەڕانەوەكەی هەیە!

دیارە ئەویش دڵی بۆ مەسەلەكە گوشاد بوو، وە ڕێكخستنی‌و سازكردنیشی هەر بەخۆم سپارد، منیش لەدەرفەتێكدا دیدارێكم بۆ سازاندن‌و بەیەكم گەیاندن‌و بەیەكدی ئاشنابوون‌و قسەوباسیان پێكەوە كردو، پەیمانیان پێكەوە بەست‌و، سەرەنجام كوڕەكە وەك عادەت و باوی مسوڵمانان لە كەسوكاری خوازبێنی كردو، خوا لەژیان‌و گوزەرانێكی هاوسەرێتی سەركەوتوانەو بەختەوەرانەدا پێكەوەی كۆكردنەوە.

بەڵێ ئەو كچە كلۆڵەی كەدەستی بەئاگری چلێسانی فیلزانەوە چزابوو و، لەكونی بێبەندو باریی بەناو پێشكەوتن(التقدم)ەوە پێیەوە درابوو، لەژێر سایەو لەباوەشی گەرم‌و پڕ سۆزی شەریعەتی خوادا قوتاری بوو و حەوایەوەو حەسایەوە، منیش ئەو ئایەتەی خوای بەرزو مەزنم هاتە زەینەوە كەفەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾(الأنفال: من الآية٢٤)

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە هەركاتێك خواو پێغەمبەر[1] بۆ شتێك

---

(١) بروانە: (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني) د.محمد سعيد رمضان البوطي، ص١٦٨-١٧١.

بانگیان کردن، کە زیندووتان دەکاتەوە بەدەنگیانەوە بچن.

کەواتە: بەڵێ ڕاستە، حیکمەتی ئەوجۆرە بەرگو پۆشاکەی کەشەریعەت بۆ ئافرەتی دیاریکردوە، بەپلەی یەکەم بریتییە لەپاراستنی کەسایەتییو ڕێزو حورمەتی ئافرەتو، وەك ئەو سیاجو پەرژینەی کەبەدەروی باخدا دروستدەکرێت بۆ پارێزگاریی لێکردنی.

دیارە ناشڵێین: شەریعەت پارێزگاریی لێکردنی ئافرەتی تەنها بەجلوبەرگەکەی سپاردوە! وەك زۆرێك لەناحەزانی شەریعەت گومان دەبەنو، جاروباریش هەندێك ڕەفتارو ئاکاری هەڵەو ناشەرعیی ئافرەتانێکی پۆشتە دەکەنە بەڵگەی ئەوە کەئەها! بەرگو پۆشاك نابێتە هۆی پەیدابوونی ئەدەبو ڕەوشتی بەرز لەئافرەتدا!!

بەڵکو بێگومان چ بۆ ئافرەتو چ بۆ پیاویش، ئیسلام پێش ڕواڵەتو دیکۆریان، هەوڵی چاککردنو جوانکردنی جەوهەرو نێوەڕۆکیاندەدات، بەهۆی تێگەیاندنو پێگەیاندنیانەوە لەسەر بناغەی ئیمانو عیبادەتو تەزکیەو پەروەردەیەکی ڕاستو دروست، وەلەڕاستیدا ئیسلام بەرگو پۆشاکی بەبەشێكو ئاڵقەیەك لەزنجیرەی ئەو ئاڕاستەو ئەدەبانە داناوە، کەپێویستە ئافرەتیان لەسەر پەروەردە بکرێتو، بەرگو پۆشاك تەواوکەری ئەو ئەدەبانەیە نەك بەدیلیان!

بەڵام هیچ خاوەن عەقڵو ویژدانێکیش، ناتوانێت نکوڵیی لەو ڕاستییە بکات کە بەرگو پۆشاکی شەرعییانە کەسایەتییو ویقارو حورمەتێکی زۆر بۆ ئافرەت پەیدا دەکات، بەپێچەوانەی بەرگو پۆشاکی بێبەندو بارانەو، خۆڕازاندنەوەی نەفامانە (التبرج الجاهلي)کە لایەنی ئینسانبوون لەئافرەتدا پەنهانو، مێینە بوونی تێدا بەرجەستەونمایان دەکاتو، خەڵکی ڕەوشت نزمو چڵێسیشی لێهاندەدات![1]

---

(١) دکتۆر محمد سعيد رمضان البوطي لەکتێبی: (المرأة ..) ص ١٥٦، دا ئەم قوڵە حیکایەتە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێکیان لە (الجزائر) لەیەکێك لەو کۆڕە فیکرییانەدا کەساڵانە

لێرەشدا کۆتایی بەم مەسەلەیە دێنین‌و دەچینە سەر خستنەڕووی مەسەلەیەکی دیکە، تاکو بەپێچەوانەی خەیاڵ‌و بانگەشەی بەتاڵی ناحەزانەوە، هەرچی زیاتر دادگەریی‌و تێروتەواویی شەریعەت ئاشکراتر بێت.

## ٧-مەسەلەی میراتی ئافرەت:[1]

میراتی ئافرەتی(میراث المرأة)یش یەکی دیکەیە لەو شتانەی، کە نەیارانی شەریعەت بەحیسابی خۆیان، کردوویانە بەبەڵگەی بەکەم سەیرکردنی ئیسلام بۆ ئافرەت‌و ڕێزو حورمەت لێنەگرتنی!

جا ئێمە وەك عادەتی خۆمان سەرەتا تیشکێك دەخەینە سەر مەسەلەی میراتی ئافرەت‌و، هۆی بەهەڵەداچوون‌و ڕێلێبزربوونی ناحەزانی شەریعەت‌و، پاشان حیکمەتی شەریعەت لەچۆنیەتی‌و ئەندازەی دیاریکردنی بەشەکانی میراتدا دەخرێنەڕوو:

---

دەگیرێن‌و منیش بەشدار بووم، کچێکی (!!) ئەڵمانی کە وتەی بۆ دانرابوو لەسەرەی خۆیدا هاتە سەر (منصة) و وەك عادەتی هەر ئافرەتێکی ڕۆژئاوایی زۆر خۆی ڕازاندبۆوە، سەربارەش هەڵسوکەوتەکانیشی هێندەی دیکە مێینایەتییەکەی بەرجەستەتر کردبوو!
سەرەنجام پاش پێشکەشکردنی وتەکەی، سوێند بەخوا هیچ جۆرە کارلێك(تفاعل)ێکی زانیارییم لەنێوان قسەکانی‌و خەڵکی هۆڵەکەدا نەبینی، تاکە شوێنەوارێك کە وتەکەی لەنێو ئەهلی کۆڕەکەدا بەجێهێشت ،ئەوەبوو کە هەندێکیان کارت(بطاقة)ێکی یەکدی ناسینیان لەژوورەکەی‌و لەهوتێلەکەدا بۆ دانابوو، دەعوەتیان کردبوو بۆ شەوێکی خۆش پێکەوە بردنە سەر!!

(١) بۆ نووسینی ئەم مەسەلەیە سوودم لەکتێبی: (المرأة..) ی د. محمد سعید رمضان البوطي، ص١٠٦تا ١١٣، وەرگرتوە، وێڕای ئەو سەراچاوانەی دیکە کەئاماژەم پێیان کردوە.

## بڕگەی یەکەم: میراتی ئافرەت لەشەریعەتدا:

هەڵبەتە بابەتی میرات، بابەتێکی تاڕاددەیەك وردو ئاڵۆزە و پێویستی بەپسپۆڕیی‌و شارەزایی تایبەت دەکات، بۆیە ئێمە لێرەدا نامانەوێت بچینە نێو وردەکارییەکانی میرات‌و چۆنیەتی دابەشکردنییەوە، بەڵام بایی ئەوەندەی ، کە ئەو تۆمەتە بێبناغەیە لەشەریعەتی بێهەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێ بڕەوێنینەوە، لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێکدا، چەند وێنەیەك دێنینەوە، پاشان لەبڕگەی دووەمدا حیکمەتەکانیان دەخەینەڕوو:

جارێ بەر لەهەر شتێك دەڵێین:

وەك چۆن بەگشتی پەندی: (الناسُ أعداءُ ماجَهِلُوا) بەسەر نەیارانی شەریعەتی خوادا دەچەسپێت، لەم مەسەلەیەش دا هەروایە، بابزانین چۆن؟!

هۆی بەهەڵەداچوونی ئەوجۆرە کەسانە لەمەسەلەی میراتی ئافرەتدا، ئەوەیە کەکاتێکك بیستوویانە ڕستەیەك لەکتێبی بەڕێزی خوای بەرزو مەزندا هەیە، لەبارەی میراتی ئافرەتەوە، کەفەرموویەتی: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ﴾(النساء: من الآية١١)، واتە: خوا لەبارەی منداڵەکانتانەوە ئامۆژگارییتان دەکات: بۆ نێرینە و هێندەی بەشی دوو مێینە هەیە..

بەڵێ ،کە ئەو ڕستە قورئانییەیان بیستوە، چونکە هەر لەبنەڕەتەوە دڵنەخۆش‌و لەبیانوو بوونە! یەکسەر بێ‌سێ‌و دوو ئەو ڕستەیەیان لەلا بۆتە بنچینەیەکی گشتی(قاعدة عامة) لەبارەی میراتی ئافرەتەوە! بێئەوەی سەرنجی دەقەکانی دیکەی قورئانیش بدەن، کە لەوبارەوە- واتە لەبارەی میراتی ئافرەتەوە- هاتوون‌و پاشان لەگەڵ دەقی ناوبراودا بەراورد(مقارنة)یان بکەن ،بۆئەوەی لەچەمك‌و واتای ڕاستەقینەو حیکمەتی ئەو دەقە پیرۆزە حاڵی بن!

جا بێگومان ئەو عادەتە شتێکی زۆر هەڵەیەو خاوەنەکەی دووچاری چۆرتی جۆراوجۆر دەکات‌و، هەق وایە ئینسان لەبارەی هەر مەسەلەیەکەوە ویستی قسە بکات‌و بڕیار بدات، سەرەتا سەرنجێکی گشتی‌و سەرتاسەری لەخۆی‌و سەرجەم مەسەلەو بابەتە پەیوەندیدارەکانی بدات‌و، چاك چاك پێی ئاشناو لێی شارەزا بێت، ئەوجار ڕێ بەخۆی بدات کەلەبارەیەوە بدوێت یان بڕیار بدات! هەربۆیەش خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ (الاسراء:٣٦)

واتە: شتێك کەزانیارییت لەبارەیەوە نیە شوێنی مەکەوە، چونکە بیستن‌و دیتن‌و عەقڵ، هەموو ئەوانە لێیان دەپرسرێتەوە.

جا ئێستا با بۆ وێنە لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی قورئاندا، چەند حاڵەت‌و شێوەیەکی میراتگرتنی ئافرەت بخەینەڕوو:

١- ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾(النساء: من الآية١١)

واتە: خوا لەبارەی منداڵەکانتانەوە ئامۆژگارییتان دەکات، بۆ نێرینە هێندەی بەشی دوو مێینە هەیە.

ئەمجۆرە دابەشکردنەی میرات لەحاڵێکدایە، کە بابای مردوو، تەنها کوڕو کچان لەپاش خۆی وەك میراتگر بەجێبهێڵێت، جالەو حاڵەتەدا، کوڕ دوو هێندەی کچ میرات دەگرێ‌و، دواییش حیکمەتەکەی ڕووندەکەینەوە لەبڕگەی دووەمدا، کەواتە: ئەم یاسایە تایبەتە بەوحاڵەتە دیاریکراوەو یاسایەکی گشتی میراتگرتنی ئافرەت نیە.

٢- ﴿ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ ﴾(النساء:

من الآية١١) واتە: ئەگەر مردوەکە منداڵی لەپاش بەجێما بوون، ئەوە باب و دایکی هەرکامێکیان، شەشیەك (٦/١)ی پێدەبڕێت لەوەی کەبەجێی هێشتوە لەماڵو سامان.

وەك دەبینین لەم حاڵەتەدا ،کە مردووەکە، هەم بابو دایکیو هەم منداڵەکانیشی میراتی لێدەگرن، هەرکام لەبابو دایکی، یەکی شەش یەك دەگرن، بەبێ ڕەچاوکردنی مێینایەتیو نێرینایەتیو، باسی یاسای ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾یش لەگۆڕێدا نیە!

٣- ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ﴾(النساء: من الآية١٢)

واتە: ئەگەر پیاوێك، یان ئافرەتێك کە نەبابی[1] هەیەو نەمنداڵ، میراتی لێگیراو برایەك، یان خوشکێکی هەبوو، ئەوە هەرکامێکیان شەشیەکی هەیە..﴾.

کەواتە لەم حاڵەتەشدا خوشك و[2] برا، وەك یەك میرات دەگرنو یاسای: (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە هەیە) لەئارادا نیە!

٤- ﴿فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾(النساء: من الآية١٢)

---

(١) (كلالـة) لەسەر ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان-ئەگەر نەڵێین سەرجەمیان- برتیە لەکەسێك، کە بمرێتو بابو منداڵی لەپاش نەبن، بڕوانە: (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) عبدالرحمن بن ناصر السعدي، ص ١٦٨، وە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٧١٩، ٧٢٠.

(٢) مەبەست خوشكو برای دایکییە، بڕوانە: (فقه السنة) ج٣ص٤٧٥.

واتە: ئەگەر هاتو ئەو براو خوشکانە (کە میرات لەبابایەکی بێ باب و منداڵ دەگرن) لەدوان زیاتر بوون، ئەوە لەسێیەکدا هاوبەشدەبن..

کەواتە لێرەشدا ژمارەیەك خوشكو برا، هەم خوشکەکان دوانو بەرەو ژوورو، هەم برایەکانیش دوانو بەرەو سەر، میراتیانگرت، ئەوە هەم خوشکەکان سێ یەك (٣/١)ی میراتەکە لەنێوان خۆیاندا بەشدەکەنو، برایەکانیش سێیەکی دابەشدەکەن، واتە: دیسان نێرو مێ بەیەکسانییو وەك یەك میرات دەگرن، نەك بەشێوەی دوو بەیەك!

٥- ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾(النساء: من الآية١١)

واتە: ئەگەر دوو ئافرەتو زیاتر بوون، ئەوە دوو سێیەك (٣/٢)ی ئەوەی بەجێی هێشتوە بەمیراتدەگرن.

جا با بەوێنەیەك ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە:

ئەگەر پیاوێك مرد و ژنێكو دوو کچو برایەکی لەپاش بەجێمان، میراتەکەی ئاوا دابەشدەکرێت:

ژنەکەی هەشتیەك (٨/١) دەگرێتو، دوو کچەکانی[1] دوو سێیەك (٣/٢)و، مامەکەشیان کە برای مردووەکەیە، ئەوەی لێیان دەمێنێتەوە دەیگرێت کە (٢٤/٥)، مادام وابێت لەم حاڵەتەدا هەر کام لە کچەکان بە تەنها لەمامیان زیاتریان بەردەکەوێت، چونکە هەرکامێکیان سێیەك (٢٤/٨) دەگرێت، واتە: هەرکامێکیان نیزیکەی دووقاتی مامیان دەگرن!

جا هەرچەندە ئایەتەکە فەرموویەتی: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ﴾ کە

(١) جگە لە فەرموودەکەی (الترمذي) ئەم مەسەلەیە یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء) یشی لەسەرە، بڕوانە (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنّان) ص١٦٦.

بەڕواڵەت وا دەگەیەنێت تەنها كاتێك كچان(بنات) دوو سێیەك دەگرن، كە لەدوان زیاترین، بەڵام، هی دوانیش هەم ئایەتەكەش دەیگرێتەوەو، هەم (ترمذي)یش لەفەرموودەیەكی ڕاست(صحیح)دا هێناویەتی كەكاتێك (سعد بن الربیع) لەجەنگی (ئوحود)دا كوژرا، خوا لێی ڕازی بێت، تەنها دوو كچیشی لەپاش بوون وێڕای ژنەكەی‌و، مامی كچەكانیش ماڵ‌و سامانەكەی (سعد بن الربیع)ی برای بردە لای خۆی، ژنەكەی (سعد) چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ و پێی ڕاگەیاند، كەمامەكەیان ماڵ‌و سامانەكەی (سعد)ی بردۆتە لای خۆی‌و هیچی بۆ بەجێنەهێشتوون‌و، بەبێ ماڵ‌و سامانیش شوویان بۆ ناكرێت! پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ﴿**يَقْضِي اللّهُ فِي ذَلِكَ**)) واتە: خوا لەوبارەوە حوكم دەردەكات، جا لەوكاتەدا ئەو ئایەتەی میرات هاتە خواری‌و، پێغەمبەری خواش ﷺ بەدوای مامەكەیانی ناردو پێی فەرمود: ((**أَعْطِ ابْنَتَيْ سَعْدٍ الثُّلُثَيْنِ وَأَعْطِ أُمَّهُمَا الثُّمُنَ وَمَا بَقِيَ فَهُوَ لَكَ**)) واتە: دوو سێیەكی بدە بەدوو كچەكەی سەعدو، هەشتیەكیش بدە بەدایكیان‌و، ئەوەی مایەوەش هی تۆیە.

٦- ﴿وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ﴾(النساء: من الآية١١)

واتە: وە ئەگەر كچە میراتگرەكە هەر یەكێك بوو، ئەوە نیوەی هی ئەوە..﴾ بۆ وێنە: ئەگەر ژنێك مردو، كچێك‌و مێردەكەی لەپاشبوون، ئەوە كچەكەی نیوەی ١/٢ میراتەكە دەگرێت‌و، باپیشی كەمێردی ژنە كۆچكردووەكەیە چواریەك (١/٤) دەگرێت، چونكە خوا فەرموویەتی:﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ﴾(النساء: من الآية١٢)

واتە: وەنیوەی میراتی ژنەکانتان هی ئێوەیە- ئەی پیاوینە:- مادام ژنەکانتان منداڵیان لەپاش نەبێت، بەڵام ئەگەر منداڵیان لەپاشبوو، ئەوە چواریەکتان هەیە لەوەی کەبەجێیانهێشتوە.

کەواتە: لێرەشدا مێینە، کە کچێکە،دووقاتی نێرینە-کە باببەتی- میرات دەگرێت! واتە مەسەلەی: (نێر دوو هێندەی مێ دەگرێت) لێرەشدا لەئارادا نیە، بەڵکو ڕاست بەپێچەوانەوەیەو، مێینە دوو هێندەی نێرینەی گرتوە!

ئێستاش کە هەتا ڕاددەیەك تیشکمان خستە سەر چۆنیەتی میراتگرتنی ئافرەتو ڕوونبۆوە کە ئەوەی نەیارانی نەزان و بێئاگای شەریعەت پێیانوا بووە، بنچینەیەکی گشتی میراتگرتنی ئافرەتە: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾وا نیەو ئەوان بەهەڵە حاڵیبوونە، بابچینە سەر برگەی دووەمو بزانین حیکمەتی ئەوجۆرە دابەشکردنەی میرات لەشەریعەتدا چییە؟!

## برگەی دووەم: حیکمەتی ئەو جۆرە دابەشکردنەی میرات:

هەرکەسێك بەوردی سەرنجی بابەتی میرات(الميراث) بەگشتی بدات، دەگاتە ئەو ئەنجامە کە جیاوازیی نێوان بەش و پشکەکانی میرات لەنێوان میراتگرانی پیرو گەنجو ئەسڵو لق(الأصل والفرع) و نێرو مێدا، بەهیچ جۆرێك نێرایەتیی و مێیایەتیی(الذكورة والأنوثة) کاریگەریی لەسەری نیە، بەڵکو جیاوازییەکان دەگەڕێنەوە بۆ سێ تەرازوو پێوەری زۆر دادگەرانەو وردبینانەو دووربینانە:[1]

---

(١) بڕوانە: (الاسلام هو الحل، لماذا؟ وكيف؟) د. محمد عمارة.؟ فصل: (التحرير الاسلامي للمرأة) کە کتێبی: (ميراث المرأة وقضايا المساواة)ی د. صلاح الدين سلطان، ص ٤، لێی وەرگرتوە، هەروەها: (مجلة الايمان) العدد -٩-، ص ١٩٥.

**یەك**: پلەو ئەندازەی نیزیکیی(درجة ومقدار القرابة)ی نێوان بابای مردوو وبابای میراتگر، جا چ نێر بن چ مێ، واتە هەتا بابای میراتگر (الوارث) لەمیرات لێگیراو (المورِّث)ەوە نیزیکتر بێت ،زیاتریش میراتی لێدەگرێ، بەپێچەوانەشەوە.

**دوو**: ڕێژەو ئەندازەی ئاتاجیی‌و پێویستیی هەبوون بەماڵ، بەهۆی ئەو بەرپرسیارێتییە دارایە(المسؤولیة المالیة)وە، کە بابای میراتگر شەریعەت خستوویەتە ئەستۆیەوە، ئاشکراشە کەرهەکەسێك زیاتر خەرج بکات موستەهەقی هاوکاریی زیاترەو وەك گوتراوە: دەستکەوت بار تەقای زیانە (الغُنْمُ بالغُرْمِ).

**سێ**: ڕێژەی ڕووتێکردن‌و پشت تێکردنی تەمەن‌و ژیانی بابای میراتگر، هەر بۆیەش دەبینین هەمیشە وەچەی ساواو ڕوو لەژیان، بەبێ‌جیاوازیی نێوان ڕەگەز(جنس)یان، لەچینی-بەڕواڵەت- ڕوو لەپیریی‌و مردن، پشك‌و بەشی زیاتری میراتدەگرن، وەك لەوێنەی میراتگرتنی کچ‌و بابدا زۆر بەزەقی دەبینرێت.

ئێستاش با لەبەر تیشکی ئەم سێ تەرازوو و پێوەرەدا، سەرنجێکی ئەو چەند وێنەیە لەمیراتگرتنی ئافرەت بدەین، کەبەنموونە هێنامانەوە:

١- جارێ وێنەی یەکەمیان: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ﴾ حیکمەتی دابەشکردنی میرات لێرەداو بەم شێوەیە ئەوەیە، کەبابێك یان دایکێك مردووەو هیچ کەسی میراتگریشی لەپاش نیە، بێجگە لەکوڕو کچەکانی، جا شەریعەت لێرەدا دوو بەشی بۆ کوڕ داناوەو بەشێك بۆ کچ، چونکە:

دیارە کەبەپێی شەریعەت - وەك پێشتریش باسمانکردوە- ئافرەت هیچ کاتێك نەك هەر خەرجیو مەسرەفکێشانی خەڵك، بەڵکو هی خۆیشی لەئەستۆدا نیە!

بەڵام کوڕەکە وا نیە، چونکە:

یان ژنی نەهێناوەو ماڵی پێکەوە نەناوەو، پێویستی بەماڵو سامانە بۆ ژن هێنانو ماڵ پێکەوە نان - بەپێچەوانەی کچەکەوە، کە بەپێی شەرع لەسەری پێویست نیە دینارێك خەرج بکات!

وەیان ماڵو خێزانی هەیەو ژیانو گوزەرانیانی بەئەستۆوەیە، وەجاری وا هەیە بابو دایك یان خزمی دیکەی هەژاریشی بەئەستۆوەن، کەبەپێی شەرع هیچ کاتێك ئەو جۆرە بەرپرسیارێتییە داراییانە ڕوو لەکچەکە ناکەن!

بگرە هەر کچەکە خۆیشی ئەگەر شووی بۆ نەکرا، یان کردیو مردو کەسی دیکەی نیزیکتریشی لەبرایەکەی نەبوو، ئەویش هەر دەگەڕێتەوە سەرشانی وی!

٢- بەڵام لەوێنەی دووەمدا کەبابو دایك میرات لە (کوڕ) یان (کچ) یان دەگرن، ئەوە لەسۆنگەی ئەوەوە کەبابو دایکەکە، کاتی خۆی، مادام بابەکە توانای دابینکردنی ژیانو گوزەرانی نەبوویێت، وەك یەك لەدارایی و مەسرەفی کوڕەکەیان بەهرەمەند بوونە، ئێستاش جێی خۆیەتی ،کە لە بەهرە لێوەرگرتنی میراتەکەیشیدا یەکسانبن!

٣- هەروەها لەوێنەی سێیەمیشدا بەهەمان شێوە لەسۆنگەی ئەوەوە کەخوشك یان برایەکە[1] بابیان نەماوەو هەرخۆیشیانن کەمیراتی یەکدی دەگرن، دادگەریی وا دەخوازێت کەتێیدا یەکسانبن، چونکە بێگومان خوشكو برای

(١) وەك پێشتر گوتمان خوشكو برایەکان، لێرەدا خوشكو برای دایکیین.

دایکیی هیچ کاتێك مەسرەفو خەرجی کێشانی یەکدییان لەحاڵەتی ژیاندا ناکەوێتە ئەستۆ، بۆیە بەپێی یاسای (الغُنمُ بالغُرمِ) جێی خۆیەتی وەك یەك‌و بەیەکسانییش میرات لەیەکدی بگرن!

٤- ئەمیش بەهەمان شێوە وەك هی سێیەم، ئەوەندە هەیە لێرەدا میراتگرەکە تەنها خوشکێك یان برایەك نیە، بەڵکو کۆمەڵێك خوشك، یان کۆمەڵێك بران، یان کۆمەڵێك خوشك‌و بران!

٥- ئەمیشیان حیکمەتەکەی ئەوەیە کەکچەکان (جا دووان بن یان زیاتر) لەچاو دایك‌و مامیان، کەم تەمەن ترن، جا چ مێردیان کردبێت چ نەیانکردبێت‌و، بێگومانیش شەریعەت لەڕووی ژیان‌و گوزەران دابینکردنەوە، زیاتر بەتەنگ وەچەی تازەوەیە، کەلەو سەرەتای تەمەنیانەوە دەستیان لەدەستمایەیەك گیر بێت‌و، بناغەی ژیان‌و گوزەرانێکی پێبنیات بنێن! سەربارەش کچ چاوەڕوانییەکی زۆری لەبابی هەیەو لەهەموو کەسیش لێی نیزیکترە!

٦- ئەمیش وەك وێنەی پێشوویەو (کچ) لەچاو بابی زیاتر ڕووی لەژیان‌و گوزەران‌و (مان)ەو، ئەوەندەی کچیش لەدایکییەوە نیزیکەو چاوەڕوانی لێی هەیە، هیچ کەسی دیکە بەوشێوەیە نیە، بۆیە لەو حاڵەتەدا کەبەوێنە هێنراوەتەوە، کچ پشکی شێر (حِصَّةُ الأَسَد) لەمیراتی دایکی دەبات، دوو بارتەقای بابی!

ئنجا شایانی باسیشە کەیەکێك لەنووسەرە ئیسلامییەکان پاش لێکۆڵینەوەو تێوەڕامان(إستقراء)ێکی وردو پشوو درێژانە، لەبابەتی میرات بەگشتی‌و، لەبارەی مەسەلەی میراتی ئافرەتەوە بەتایبەت، گەیشتۆتە ئەم ئەنجامەی خوارێ کەمن بەکورتیی‌و، گوشراویی دەیهێنم‌و، ئەو لەچەندان خشتەی ژمێرەیی(جَداول



ریاضیة)دا خستوویەتەڕوو: [(١)]

أ- تەنها لەچوار (٤) حاڵەتاندا ئافرەت نیوەی پیاو میراتی بەردەکەوێت، لەسەرجەم مەسەلەکانی میراتدا.

ب- چەندان حاڵەتی چەند بەرانبەری ئەوە ئافرەت هێندەی پیاو میرات وەردەگرێت.

ج- لە دە (١٠) حاڵەت یان زیاتریشدا ئافرەت لەپیاو زیاتر میرات وەردەگرێت.

د- چەند حاڵەتێکیش هەن کەئافرەت میراتیان تێدا دەگرێت، بەڵام پیاوانی هاوتای (وەك خوشكو برا، نەنكو باپیر) میرات ناگرن.

کەواتە:

ئێستا پاش ئەم برە توێژینەوەیە، دەرکەوت کەئەم تۆمەتی حەوتەمەش وەك هاوەڵە پێشووەکانی پووچو بۆشەو، ڕوونیش بۆ وە کەئەم شەریعەتە تێرو تەواوو بێ هەڵەو پەڵەیەی خوای کاربەجێو دادگەر، لەهەر لایەنێکییەوە تۆمەتی ئاراستە بکرێت، بەهۆی ڕوونکردنەوەی ئەو لایەنەیەوە کاملیی‌و بێخەوشییەکەی زیاترو زیاتر ئیسپات دەبێت، وەك چۆن (بخوور) هەتا زیاتر بسووتێنرێت، بۆنی خۆشی چاکتر دەرواو بڵاو دەبێتەوە!

(ئیمام شافیعیی)یش ڕەحمەتی خوای لێبێت جوانی گوتوە:

یخاطبنی السفیه بکل قبح — فأکره أن أکون له مجیباً
یزید سفاهة فأزید حلماَ — کعود زاده الإحراق طیباً

واتە: بابای نەفام بەقسەی ناشیرین دەمدوێنێ، منیش حەز ناکەم وەڵامی بدەمەوە، ئەو لەنەفامی زیاد دەکاتو منیش لەهێدیی‌و مەندیی، وەك بخوورێك،

(١) بڕوانە: (میرات المرأة وقضیة المساواة) د. صلاح الدین سلطان، ص ١٩، وە: (مجلة الایمان) العدد-٩-، ص ١٩٥.

کە سووتاندن هەربۆنی خۆش زیاد دەکات.

## ٨- مەسەلەی شایەدییدانی ئافرەت

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو مەسەلانەی کەنەیارانی شەریعەتی خوا (ﷻ) لە دەریای تۆمەتەکانی خۆیانیان هەڵهێنجاوە، بەرانبەر بەئایینو بەرنامەی خوا، کەگوایە ڕێزی لەئافرەتان نەگرتوەو بەکەم سەیری کردوون!

دیارە ئەو گومانو بۆچوونەشیان لەم ڕستە بەپێزەی قورئانەوە هەڵگۆزتوە، کەفەرموویەتی:

﴿ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴾(البقرة: من الآية٢٨٢)

واتە: وە (بۆ نووسینی قەرز) دوو شایەد لەپیاوانتان داوا بکەن، جا ئەگەر هەردووکیان پیاو نەبوون، باپیاوێکو دوو ئافرەت بن، لەو کەسانەی کەبۆ شایەدیی پێتان پەسەندن (بۆیەش دوو ئافرەت بن) تاکو ئەگەر یەکیان لەبیری چۆوە، یەکێکیان بیری ئەوی دیکەیان بخاتەوە.

شایانی باسیشە کەڕستەی باسکراو، یەکێکە لەبڕگەکانی درێژترین ئایەتی قورئان کەبەئایەتی قەرز (آیة الدَّین) ناسراوەو، دەربارەی نووسینو تۆمارکردنو شایەد لەسەر گرتنی قەرز پێدانو سەرجەم ئەو سەوداو مامەڵەو بازرگانیانەوەیە کە لەسەر قەرز بنیاتدەنرێنو، زۆرێک لەوردەکارییەکانی ئەو بابەتەی گرتوونەخۆ، تەنانەت هەندێک لەزاناو توێژەرەوانی قورئان ئەو حوکمو یاسایانەی کەلەو تاکە

ئایەتەی قورئان‌و ئایەتی دوایەوە هەڵدەهێنجرێن، ژمارەیانی لەپەنجا (٥٠) تێپەڕاندوە![1]

دیارە هاتنە خوارەوەی درێژترین ئایەتی قورئانیش لەبارەی بابەتێکی گرنگی دارایی‌و ئابوورییەوە، ئەندازەی گرنگیی‌و بایەخ پێدانی شەریعەت بەو لایەنە گەورەو گرنگەی ژیان‌و گوزەران دەردەخات !

جا ئێستا با سەرنج بدەین کە ئایا گومان‌و بۆچوونی نەیارو ناحەزانی شەریعەت تا چ رادەیەك لەجێی خۆیدایە، یان هەر شتێکی پووچ‌و بۆشەو وەك پووش‌و پەڵاشی دەم بایە؟!

بۆ ئاسان خستنەڕووی ئەم مەسەلەیەش لەچەند بەندێك دا ڕوونی دەکەینەوە:

**یەك:** وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، فەرمانکردنی شەریعەت بەتۆمارکردنی قەرزو شایەد لەسەرگرتنی، بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەمیەت‌و بایەخدانی شەریعەت بەلایەنی ئابووریی‌و خەمخۆریی‌و بەتەنگەوەبوونیشی بۆ پاراستنی ماڵ‌و دارایی مسوڵمانان‌و بەفیڕۆنەچوونی‌و، پاراستنی کۆمەڵگای ئیسلامیی لەدروستبوونی کێشەو گرفت‌و دەمەقاڵێ‌و تێك گیران، لەسەر دواخستنی درانەوەی قەرز، یان نکوولیی لێکردنی‌و... هتد.

(ابن العربي) لەو بارەوە گوتوویەتی:[2] (قال علماؤنا رحمة الله عليهم: لما أمر الله بالتوثيق بالشهادة على الحقوق كان ذلك دليلاً على المحافظة في

---

(١) بڕوانە: (أحكام القرآن) لابن العربي، ج١ص٣٢٧ تا ٣٤٧، کەیەنجاو دوو (٥٢) حوکمی شەرعی لێیان وەرگرتوە، وەبڕوانە: (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) ی (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) ص ١١٨ و ١١٩، کە (٥٠) حوکمی تەنها لەئایەتی (الدَّين) هەڵهێنجاوە. بۆتوێژینەوەی ئەو ئایەتەش،بڕوانە تەفسیرەکەی لە بەرگی یەکەمی (تەفسیری قورئانی بەرزوبەرێز ) دا.

(٢) (أحكام القرآن) ج١ص٣٤٧، المسألة: الثانية والخمسون.

مراعاة المال وحفظه، ويعتضد بحديث النبي ﷺ ((**كَانَ يَنْهَى عَنْ قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ وَإِضَاعَةِ الْمَالِ**)) متفق عليه عن المغيرة بن شعبة.

واتە: زانایانمان خوا لێیان خۆش بێ گوتوویانە: مادام خوا فەرمانیکردوە بەتۆمارکردنی شایەدییدان لەسەر مافەکان، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەدەبێ وریایی بکرێ لەچاودێریی کردنی ماڵو سامان پاراستندا، وە ئەم مەسەلەیەش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ پشتگیریی دەکات: (پێغەمبەر ﷺ) گوتراو گوتیو، زۆر پرسیارکردنو، ماڵ بەزایەدانی، قەدەغە کردوە.

**دوو:** لەبارەی حوکمی شایەدیی دانیشەوە، زانایان زۆر قسەو باسیانکردوەو هەندێکیان[1] بەسوننەت (ندب) و، هەندێکیشیان[2] بەفەرزی عەینو، هەندێکیشیان[3] بەفەرزی کیفایەیان داناوە، بەڵام واپێدەچێ فەرزی کیفایە بوونی لەهەموویان بەهێزتر بێت، بەتایبەت لەکاتێکدا کەبەهۆی شایەد نەگرتنو شایەدیی نەدانەوە، هەقی خاوەن هەقێك بفەوتێ، یان کێشەو ناکۆکییەك پەیدا ببێ! وە ڕستەی : ﴿وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَـٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:من الآية٢٨٣). چاکترین بەڵگەی ئەو ڕایەیە.

هەندێك لەزانایانیش ڕایان وایە کەشایەدییدانو شایەدگرتن بۆ قەرزو قۆڵو مامەڵە، لەئەسڵدا سوننەتە، بەڵام ئەگەر هاتو پاراستنی هەقێكو

(١) الجامع لاحكام القرآن للقرطبي، ج٢ص١٠١٥.

(٢) ئەوە ڕای شافیعی یە ڕەحمەتی خودای لێبێت، بڕوانە (أحكام القرآن) لابن العربي، ج١ص٣٣٨.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە، وە ئەوە ڕای (ابن العربي) یە.

زایەنەبوونی یەکی لەسەری کەوت فەرز دەبێت![1]

**سێ**: زانایانی ئیسلام لەبارەی شایەدییدانەوە، جگە لەو حاڵەتانەی کەشایەتەکانی قورئان بەڕوونیی باسیانکردوون، وەك: پێویست بوونی چوار شایەد بۆ ئیسپاتی زینا[2] و دوو شایەد بۆقەرزو کڕینو فرۆشتن[3] و، دوو شایەد بۆ تەڵاقدانو گێڕانەوەی ژن[4]..، ڕاجیایی زۆریان هەیەو لەراستیدا ئەو مەسەلەیە بواری زۆری تێدایە بۆ (اجتهاد)ی زانایان، وەك (ابن قیم الجوزیة) زۆر بەدرێژیی باسیکردوە.[5]

**چوار**: لەبارەی شایەدییدانی ئافرەتانیشەوە، مشتومڕو ڕاجیایی زۆر کەوتۆتە نێوان زانایانەوە، لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەسەر بناغەی (إجتهاد)ی خۆیان لەوبارەوە دواونو، بێگومانیش (إجتهاد)ی زانایان گەلێك هۆکار کاریگەرییان لەسەری دەبێ، هەر لەشێوازی بیرکردنەوەو تێگەیشتنی زانایانەوە بگرە، هەتا عورفو باوو دابو نەریتی کۆمەڵگایەکانو ئاستی فەرهەنگییانو، ڕاددەی بوار پێدانی ئافرەتان بۆ ئەنجامدانی ئەرکو چالاکییە شەرعییەکانو... هتد.

---

(١) (تيسير الكريم المنان..) ص١١٨، ١١٩، بەڵام پێویستە بزانیّ شایەدگرتنو شایەدییدان لەیەك جیانو زۆربەی هەرەزۆری زانایان شایەدگرتن هەر بەسوننەت دەزانن.

(٢) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ (النور: من الآية٤)

(٣) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ ... وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ ...﴾ (البقرة: من الآية٢٨٢)، وە فەرموویەتی: ﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ (البقرة: من الآية٢٨٢) .

(٤) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية٢) .

(٥) بڕوانە: (الطرق الحكمية في السياسة االشرعية) ص١٠٨ تا ١٩٥.

جا ئێستا بائاماژە بەهەندێك لەڕاجیایی زانایانو بیروبۆچوونەکانیان بکەین لەبارەی مەسەلەی شایەدییدانی ئافرەتانەوە، کەئایا لەکوێو کوێو شایەدییان لێوەردەگیرێ و، لەکوێو کوێش لێیان وەرناگیرێ؟!

(ابن قيم الجوزية) لەوبارەوە گوتوویەتی: [(١)]

(شایەدییدان(شهادة)ی ئافرەتان دوو جۆرە: جۆرێکیان شایەدیی ئافرەتانی جیا لەپیاوان تێدا وەردەگیرێ، وە جۆرێکیشیان لەگەڵ پیاوان نەبێ شایەدییان تێیدا وەرناگیرێ.

جا لەوبارەوە زانایانی پێشین ڕاجیاییان هەیە:

(ابن أبي شيبة) لە (مكحول)ەوە گێڕاویەتەوە کەگوتوویەتی: شایەدیی ژنان تەنها لەمەسەلەی قەرز(الدَّين)دا دروستە!

بەڵام لە هەرکام لە (الشعبي) و (الزهري) و (عبدالله بن عمر)ەوە هاتوە، کەگوتوویانە: شایەدیی ئافرەتان باهەر خۆیشیان بن، لەسەرجەم ئەو بابەتانەدا وەردەگیرێ، کە هەر خۆیان لێیان ئاگادارن، واتە ئەو مەسەلانەی، کە پەیوەندییان بەعەورەتی ئافرەتانو دووگیانیی بوونو حەیزو شیرپێدانو منداڵ بەخێوکردنو ... هتدەوە هەیە.

کەچی هەرکام لە (علي بن أبي طالب) و (عطاء) و (عمر بن عبدالعزيز) ڕایان وایە کەلەهیچ بوارێکدا شایەدییدانی تەنهای ئافرەتان، ئیعتیباری پێناکرێ!

وە (سعيد بن المسيب) و (عبدالله بن عتبة)ش ڕایان وایە کەئافرەتان تەنها لەو مەسەلانەدا شایەدییان لێوەردەگیرێ، کەبێجگە لەخۆیان هیچ کەس تێیاندا پسپۆڕو لێیان ئاگادار نیە.

وە (الزهرى) گوتوویەتی: (مضت السنة من رسول الله ﷺ والخليفتين بعده انه

---

(١) (الطرق الحكمية فى السياسة الشرعية) ص١٣٤ تا ١٤٨.

لاتجوز شهادة النساء في الحدود والنكاح والطلاق) واته: ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو خەلیفەکەی دوای وی وا گوزەراوە کەشایەدییدانی ئافرەتان، لەسزا شەرعییەکان(الحدود) و ژن مارەبڕینو تەڵاقدا دروست نیە.

بەڵام لەولاشەوە لەڕێی ڕاستەوە هاتوە کە (شريح القاضي) شایەدیی لەپیاوێكو دوو ئافرەت وەرگرتوە، لەمەسەلەی ئازادکردنی کۆیلەیەکدا.

هەروەها لەڕێی ڕاستەوە هاتوە کە (الشعبي) شایەدیی پیاوێكو دوو ژنی وەرگرتوە لەتەڵاقدانو برنیداربوونی بەهەڵە(جِراح الخطأ)دا.

وە لە (جابر بن زيد)ەوە هاتوە بەڕێیەکی ڕاست (صحيح)دا کەشایەدیی پیاوێكو دوو ئافرەتی لەهەر کام لەتەڵاق و نیکاحدا وەرگرتوە.

بگرە (إياس بن معاوية) شایەدیی دوو ئافرەتی لەمەسەلەی تەڵاقدا وەرگرتوە، وەك لەڕێی ڕاستەوە هاتوە!

وە لە ڕێی ڕاستەوە هاتوە، کە (شريح) شایەدیی چوار ئافرەتی بۆ ئیسپاتی مارەیی ژنێك لەسەر مێردەکەی وەرگرتوە.

وە لە (طاوس)ەوە هاتوە کەگوتوویەتی: شایەدیدانی ئافرەتان وێڕای پیاوان بێجگە لەئیسپاتی زینا، لەهەموو شتێکی دیکەدا دروستە، ئەویش لەبەرئەوەی کەبۆیان نیە تەماشای ئەو کردەوە بەدە بکەن!

هەروەها (ابو عبيد) گێڕاویەتەوە ،کە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێت لەسەر بناغەی شایەدییدانی چوار ئافرەتان کەشایەد بوون لەسەرئەوە کەبابایەکی سەرخۆش(سکران) ژنەکەی تەڵاقداوە، لەیەکدی جیاکردنەوە!

وە (سفيان بن عيينة) هێناویەتی کە (علي بن أبي طالب) خوا لێی ڕازی بێت لەسەر بناغەی شایەدیدانی چوار ئافرەت خوێن(دية)ی منداڵێکی خستە سەر ژنێك

کەوەسەری کەوتبوو، کوشتبووی!

دیسان لە (عطاء بن أبي رباح)ەوە هاتوە کەگوتوویەتی: ئەگەر بێتو هەشت ئافرەت شایەدییم لەلابدەن لەسەر ژنێك کەزینای کردوە، بەردبارانی دەکەم!

هەروەها هەر لە (عطاء)ەوە هاتوە کەگوتوویەتی: شایەدیی ئافرەتان مادام لەگەڵ پیاوان بن، لەهەموو شتێك دا دروستە..

وە (سفیان الثوری) گوتوویەتی: شایەدییدانی دوو ئافرەتان لەگەڵ پیاوێك دا لەتۆڵە(قصاص)و تەڵاقو نیکاحو هەموو شتێکدا بێجگە لەسزا شەرعییەکان دروستە، وە دروستە بەتەنها شایەدیی بدەن لەسەر ئەو مەسەلانەی کەتەنها خۆیان لێیان ئاگادارن.

وە (أبو حنیفة) گوتوویەتی: شایەدیی پیاوێكو دوو ئافرەت لەسەرجەم حوکمەکاندا وەردەگیرێ، بێجگە لەتۆڵەو سزایەکان(القصاص والحدود).

وە (مالك) گوتوویەتی: شایەدیی ئافرەتان نە بەتەنهاو نەلەگەڵ پیاویش دا لەتۆڵەو سزا(حد) و، تەڵاقو نیکاحو، گێڕانەوە ژێر نیکاح(رجعة) و، ئازادکردن (عتق) و، ئیسپاتی ڕەچەڵەك (نَسَب) و (ولاء)[1] و (إحصان)[2] دا وەرناگیرێ، بەڵام لەمەسەلەکانی ماڵو دارایییدا لەگەڵ پیاودا وەردەگیرێ، وەلەمەسەلەکانی تایبەت بەژناندا، بەتەنهاش شایەدییان لێوەردەگیرێ..

ئنجا لەو مەسەلانەدا کەشایەدیی ئافرەتانیان بەتەنهایی تێدا وەردەگیرێ،

---

(١) ولاء: یانی سەرپێبوون، کەلێرەدا مەبەست ئەوەیە، بابایەکی کۆیلە کێ ئازادی کردوەو سەر بە کێیەو (مَولَی)ی کێیە؟

(٢) إحصان: بەچەند مانایەك دێت، یەکیان پاکداوێنییەو یەکی دیکەیان هاوسەرداربوونە، کە هەردووکیان بۆ ئێرە گونجاون.

دیسان زانایان لەژمارەی پێویست(نصاب)یاندا ڕاجیاییان هەیە:

(الشعبي) و (النخعي)یەکی لەقسەیەکیانداو، هەرکام (قتادة) و (عطاء) و (ابن شبرمة) و (الشافعي) و (داود الظاهري) گوتوویانە: لەچوار ئافرەتان کەمتر دروست نیە شایەد بن، بەڵام (داود) مەسەلەی شیرپێدان(الرضاع)ی هەڵاواردوەو گوتوویەتی: ئافرەتێکیش دروستە.

(عثمان البتي)یش گوتوویەتی: هەر مەسەلەیەك ئافرەتان بەتەنها تێیدا شایەد بن، نابێ لەسێ کەس کەمتربن.

هەندێکیشیان، کە (الزهري)یان لەنێودایە گوتوویانە: هەر مەسەلەیەك دروست بێ ئافرەتان بەتەنهایی شایەدیی تێدا بدەن، دوان بەسن، جگە لە چریکە(إستهلال)ی کۆرپەی تازە لەدایکبوو، ئەوە قسەی مامان(قابلة) بەتەنهاش بێ، وەردەگیرێ.

بەڵام (الحكم بن عيينة) و (ابن أبي ليلى)و (مالك) و (أبو عبيد) گوتوویانە: لەهەموو مەسەلەکاندا دەبێ دوو ئافرەت هەر شایەد بن.

بەڵام ژمارەیەکی زۆر لەزانایان لەمەسەلەی زیرەی کۆرپە(إستهلال الجنين)دا گوتوویانە: یەك ئافرەت شایەدیی بەسە، کە (ابوبكر) و (عمر) و (علي) و (الزهري)، وە (النخعي) و (الشعبي)یە، کە لەقسەیەکیان دا، وە (الحسن البصري)و (شريح) و (أبي الزناد)و (يحيى الانصاري) و (ربيعة)و (حماد بن أبي سليمان)یان لەنێودان، خوا لێیان ڕازی بێ.

وە (الثوري) گوتوویەتی: لە کەموکوڕییەکانی ژنانو ئەو شتانەدا کەبەس خۆیان لێیان ئاگادار دەبن، شایەدیی یەك ئافرەتیش دروستە، وە ئەم ڕایە هی (أبو حنيفة) و هاوەڵەکانیشیەتی، وە لەڕێی ڕاست (صحيح)ەوە لە (ابن عباس)ەوە هاتوەو

لەهەرکام لە (عثمان) و (علی)و (ابن عمر) و (الحسن البصري) و (الزهري)یشەوە گێڕراوەتەوە.

وە لە هەرکام لە (ربیعة) و (یحی ابن سعید) و (ابي الزناد) و (النخعي) و (شریح) و (طاوس)و (الشعبي) و (الحکم) ڕایان وایە، کە بۆ ئیسپاتی شیرپێدان، شایەدیی یەك ئافرەت بەسە، وە (عثمان بن عفان) خوا لێی ڕازی بێ، بەشایەدییدانی ئافرەتێك، ژنو مێردەکانیانی لەیەك جیاکردۆتەوە، وە (الزهري) گوتوویەتی: خەڵك هەر لەسەر ئەو ڕایەن، (الشعبي)یش ئەو ڕایەی لەتێکڕای قاضیەکانەوە نەقڵکردوە.

بەڵام (ابن حزم الأندلسي) گوتوویەتی: لە (عمر) و (علي) و (المغیرة بن شعبة) و (ابن عباس)ەوە گێڕاومانەتەوە، کە بە شایەدییدانی ئافرەتێك لەمەسەلەی شیرپێداندا ژنو مێردیان لەیەك جیاواز نەکردوونەوە، هەروەها ئەوە قسەی (ابو عبید)یشە، وە گوتوویەتی (واتە ئیبنو حەزم): لە (عمر)ەوە گێڕاومانەتەوە کەگوتوویەتی: (لو فتحنا هذا الباب لم تشأ إمرأة أن تفرق بین رجل وامرأته الا فعلت) واتە: ئەگەر ئەم دەرگایە بکەینەوە هەر ئافرەتێك بیەوێ ژنو مێردێك لەیەك بترازێنێ، دەیکات! (واتە شایەدیی دەدات کە ئەو ژنو مێردە خوشكو برای شیریی یەکدین).

بەڵام (أوزاعی) گوتوویەتی: پێش مارەکردن(النکاح) شایەدیی ئافرەتێك لەو بارەوە وەردەگرمو ڕێنادەم مارە بکرێ، بەڵام پاش مارەکردن بەوجۆرە شایەدییە لەیەکیان جیا ناکەمەوە.

(ابن حزم الأندلسي)یش لەبارەی ژمارەی شایەدیی ئافرەتەوە گوتوویەتی:

دروست نیە کەبۆ ئیسپاتی سزای زینا، کەمتر لەچوار پیاوی دادگەر (عـدل)[1] شایەدیی بدەن، یان لەجێی هەر پیاوێك دوو ئافرەت، واتە: سێ پیاوو دوو ئافرەت، یان دوو پیاوو چوار ئافرەت، یان پیاوێك‌و شەش ئافرەت، یان هەشت ئافرەت.

هەروەها بەم شێوەیە لەسەرجەم هەقەکاندا، لەسزا شەرعییەکان‌و زینـاو ئـەوەی تۆڵـە (قصـاص)ی تێدایـەو نیکـاح‌و تـەلاق‌و مـاڵ‌و سـامانەکان.. لەسـەرجەم ئـەو شتانەدا، یان دەبێ دوو پیاوی مسوڵمانی دادگەر شایەدیی بدەن، یان پیاوێـك‌و دوو ئافرەتی بەوجۆرە، یان چوار ئافرەتی بەوجۆرە.

وە لەهەموو ئەم مەسەلانەدا، بێجگە لەسزایەکان(الحدود) یەك پیـاوی بـەوجۆرە وێڕای سوێندی داواکەر(يمين الطالب)[2]، یان دوو ئافرەتی بەوجۆرە، وێڕای سـوێندی داواکەر، هەر مەسەلەیەکیان پێ‌ئیسپات دەبێ، بەڵام تەنها لەمەسـەلەی شـیرپێدان (الرضاع)دا، یەك ئافرەتی دادگەر(عدلة) یان یەك پیـاوی دادگـەر (عـدل) بەشـایەد وەردەگیرێن).

---

(١) (القرطبـي) لەپێناسـەی دادگـەریی (عدالـة) دا گوتوویـەتی: (العدالـة هـي الإعتـدال في الأحوال الدينيـة، وذلـك يـتم بـأن يكـون مجتنبـا للكبـائر محافظـا علـى مرؤتـه وعلـى تـرك الصغائر: ظاهر الأمانة غير مغفل) (الجامع لأحكام القرآن) ج٢ص١٠٢٠، واتە: دادگـەریی بریتیە لەڕێکوپێك بوون لەکاروباری دینداریدا، ئەویش بەخۆ دوورگرتن لەگوناهە زلەکان‌و پارێزگارییکردن لەجوامێریی خۆو، نەکردنی گوناحە گچکەکان، مەیسـەر دەبـێ، هـەروەها دەبێ ئەو بابایە پاکیی‌و چاکیی لـێ‌ببینرێ‌و ساویلکەش نەبێ.

(٢) ئەم مەسەلەیە چەندان فەرموودەی (صحيح) ی لەسەرن بۆ وێنە: (عن ابن عباس عن النبـي ﷺ أنه قضى باليمين مع الشاهد) رواه مسلم والترمذي وابن ماجه، وابوداود وبلفظ قريب فيه، وەئەمە ڕای (مالك و شافعي و احمد وإسحاق و أبو عبيد وأبو ثورو داود) یشە، بڕوانە (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبـي، ج٢ص١٠١٧، ١٠١٨.

**جا خوێنەری بەڕێز!**

هەرچەندە ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەی (ڕاجیایی زانایان لەبارەی شایەدیی دانی ئافرەتانەوە) زۆری خایاند، بەڵام مەبەستم بوو، بۆئەوەی بزانرێ کەئەو مەسەلەیە لەبنەڕەتەوە-جگە لەوەی کەقورئان دیاری کردوە- مەسەلەیەکی ئیجتیهادییو مشتومڕو ڕاجیایی هەڵگرە، هەرچەندە بەداخەوە زۆر لەکتێبو سەرچاوە فیقهییو مەزهەبییەکان، بەجۆرێکی دیکە مەسەلەکەیان خستۆتەڕوو!

ئنجا با لە کۆتاییشدا ئاماژەیەك بەحیکمەتی ئەوە بکەین، داخۆ بۆچی لەهەموو ئەو مەسەلانەدا کەتایبەت نین بەئافرەتانەوە بۆ شایەدییدان، هەمیشە پیاوێك لەگەڵ دوو ئافرەت دا خراوەتە تەرازووەوە؟!

**لەوەڵام دا دەڵێین:**

**یەکەم:** وەك چەندان جار دووپاتمان کردۆتەوە،(دین) تەنها ئەوەیە کەخواو پێغەمبەری خواﷺ بەڕوون و ڕاشکاویی بە (دین)یان داناوە، کەئەویش لەقورئانو سوننەت دا بەرجەستەیە، بۆیە هیچ پەکمان لەسەر ئەوە نەکەوتوە کە پاساو بۆ ئەو ڕاو بۆچوونانەی زاناو پێشەوایان-خوا لێیان خۆش بێ- بێنینەوە کەلەبارەی شایەدیی دانی ئافرەتەوە گوتوویانەو، بەتەئکیدیش هەندێکیان بەزایەدان(تفریط)ێکی زۆریان تێدایە بۆ مافی ئافرەت لەشایەدیی دان دا.

**دووەم:** واشی بۆ دەچم کەڕایەکەی (إبن حزم) کەهەمیشە زۆر بەسەختیی چاو لەسەر دەقەکانی قورئانو سوننەت چڕ دادەگرێو، هیچ جۆرە مەسەلەیەکی لەئافرەت پاوان نەکردوە کەشایەدیی تێدا بدات، چونکە هیچ دەقێك لەو بارەوە نیە، لەهەموو ڕایەکانی دیکە لەڕووح و ئاڕاستەی گشتی(الإتجاه العام)ی ئیسلامەوە نزیکترە.

**سێیەم:** وەك لەپێشووش دا ئاماژەمان بۆ کرد، مەگەر چۆن، دەنا خوای کاربەجێ هەر لەپاڵ ڕاگەیاندنی یاسا شەرعییەکان دا، حیکمەتەکانیشیان دەخاتەڕوو، جا لەم مەسەلەیەش دا هەروایەو خوای پەروەدگار بۆئەوەی لەشیکردنەوە(تحليل) ی ئەم حوکمە شەرعییەدا، کەلەبواری پارەو سامانو مامەڵەو بازرگانیی دا، شایەدیی دوو ئافرەت بارتەقا(مقابل)ی شایەدیی یەك پیاوە، هیچ کەس دووچاری لێکدانەوەی هەڵەو ناتەواو نەبێ و، ئەنجامگیرییەکی لێنەکات کەهەڵەو نەگونجاوە، هەر یەکسەر لەمیانەی خستنەڕووی حوکمە شەرعی یەکەدا ، حیکمەتەکەیشی خستۆتەڕوو:

﴿ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ ﴾(البقرة: من الآية٢٨٢).

بەڵێ، هۆو حیکمەتی دانانی دوو ئافرەت لەتەرازووی یەك پیاودا بۆشایەدییدان لەبواری ماڵو سامانو مامەڵەو بازرگانی دا، ئەوەیە کە: ئەگەر یەکێك لەدوو ئافرەتەکە شتێك لەوردەکارییەکانی ئەو حیسابو کیتابەی بواری ئابووریی و مامەڵەو بازرگانیی لەبیرچووە، ئەوی دیکەیان بیری بخاتەوەو، بەوجۆرە ئەو دوو ئافرەتە دەستبارگرو بیرخەرەوەی یەکدی بن لەو بوارەدا.

**کەواتە:**

نهێنی مەسەلەکە- مەگەر لەپشت پەردەی ڕەشەوە یان بەچاوی تەماویی یەوە سەرنجی بدرێ- هەر ئەوەیە کەشەریعەت دووربینیی کردوە لەوەدا کەشایەدیی یەکە بەرێكوپێکیی بەڕێوەبچێ و، کەلێنو بۆشایی تێنەکەوێ و

ماڵو سامانی مسوڵمانان بەبەلاش زایەنەبێو، دەروازەی کێشمەکێشمو ناکۆکییان لێنەکرێتەوە، نەك بەکەم سەیری ئافرەت کرابێ و چی و چی!!
بەڵێ، ئەو خوایەی (ﷻ) کەئەو حوکمەی داناوە، هەر خۆیشی روونی کردۆتەوە کەبۆچیو لەبەرچی داینـاوە، ئیدی چ پێویست دەکاتو چۆن ماقووڵە، کە بێین گوێ بۆ خاوەنی یاسایەکە نەگرین، کە مەبەستی پێی چی یە؟! وە بێ سێو دوو لەسەر بناغەی گومانو غەرەز مەزەنتەکاریی و (تکهّنات) بکەوینە سەر شیکردنەوە(تحلیل) و هۆ هێنانەوە(تعلیل)ی جۆراوجۆر!!
ئنجا ئەوەش کەئافرەتان لەبواری ماڵو سامانو دارایی ژماردنو کۆنترۆڵ(ضبط) کردنی وردەکارییەکانیدا، هێندەی پیاوان کارامەو شارەزا نینو سەر ڕاست نین، شتێکی روونو بەرچاوە، بێگومان لەکاتی یاسادانان(التشريع)یش دا حاڵەتی گشتی ڕەچاو دەکرێ، ئەگەر نا ئافرەتی زۆر کارامەو پسپۆڕیش لەو بوارەدا هەنو دەبنو، پیاوی زۆر کۆڵەوارو دەستەپاچەش بەهەمان شێوە.
بەڵگەش لەسەر ئەوە کەمێینایەتیی(أُنوثة)ی ئافرەت، کەمو زۆر دەوری لەو یاساو حوکمەدا نیە زۆرن، بۆ وێنە:
أ- یاسادانەر(المشرع) تبارك وتعالى، کە خۆی بێگومان لەهەموو کەس بەیاسایەکانی شارەزاترە، هیچ ئاماژەیەکی دوورونزیکی بەوە نەکردوە، بەڵکو بەڕوونیی نوختەی خستۆتە سەر پیت، کەبەمەبەستی باش کۆنترۆڵکردنی حیسابو کیتابەو هیچی دیکە.
ب- ئەگەر لەبەر مێ(أُنثى) بوونی ئافرەت بوایە، دەبوو لەهەموو حاڵەتەکانی شایەدییدان دا ئەو یاسایە هەر لەگۆڕێدا بوایە، بەڵام پێشتر

باسمان کرد کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەو بوارو مەسەلانەدا کەئافرەتان تێیاندا ئاگادارن، شایەدیی ئەوان، نەك هەر لەهی پیاوان بەهێزترو بەهەند گیراو (معتبر) ترە، بگرە بێجگە لەوان، شایەدیی کەسی دیکە، هەر وەرناگیرێ‌و ئیعتیباری نیە!

**چوارەم:** ئنجا بێگومان خوای کاربەجێ شەریعەتی خۆی ناردوە، کەلەنێو کۆمەڵگایەکی لەسەر ئیسلام پەروەردەکراو و، پابەند بەڕێوونیی‌و ئاڕاستەکانییەوە پیادە بکرێ، کۆمەڵگایەکی ئیسلامییش هەرکام لەپیاوان‌و ئافرەتان ئەرکە سروشتیی یەکانی خۆیان – بەپلەی یەکەم– ئەنجام دەدەن‌و خۆیان لەکاروباری یەکدی هەڵناقورتێنن‌و، لاسایی یەکدی ناکەنەوە، ئیرەیی(حَسَد) بەیەکدی نابەن، وەك کۆمەڵگا نەخۆش‌و دەردەدارو نەفامیی یەکانی ڕۆژئاوا، ئنجا دیارە ئافرەتانێکیش کەئەرکی سروشتی دایکایەتیی‌و ژنایەتیی‌و کابانێتیی(الأمومة والزوجية وربة البيت) لەچوارچێوەی خێزانێکی مسوڵماندا جێبەجێ دەکەن:

یەك: زۆر نایانپەرژێتە سەر کاروباری مامەڵەو بازرگانیی‌و وردەکارییەکانی، چونکە ئەرك‌و کارە تایبەتییەکانیان، زۆربەی تواناو وزە فیکریی‌و ڕووحیی‌و جەستەییەکانیان بەکاردێنن!

دوو: چونکە شەریعەت ئەرکی ژیان‌و گوزەران‌و دابینکردنی پێداویستییەکانی لەکۆڵکردوتەوەو، ناچار نیە کە بۆ بژێو پەیداکردن، دەست بکات بەڕاکە ڕاك‌و مل بەملە لەگەڵ پیاوان، بۆیە شتێکی ئاساییە کەنەتوانێ لەمەیدانێکدا کە شارەزای نیەو کاروچالاکی تێدا ئەنجام نەداوە، پێشبڕکە(مسابقة) لەگەڵ پیاودا بکات، وەك چۆن پیاویش لەمەیدانی پسپۆڕیی‌و شارەزایی خۆیدا، پێشبڕکەی بۆ لەگەڵ ناکرێ‌و

تۆزی ڕێگاشی ناشکێنیٚ!

هەرچەندە لەکۆمەڵگا نەفامییەکان(المجتمعات الجاهلية)یش دا، کە ئافرەت چارناچار وازی پیٚ لەئەرکی سروشتیی خۆی هێنراوەو، بەگژ بژێو پەیداکردنو خۆژیاندن دا کراوەو، دەروازەکانی هەموو جۆرەکانی کەسابەتی لەبەردەمدا ئاوەڵا کراوە، وەك ئاشکراو ڕوونە، دیسان هەر نەیتوانیوە نەك هەر بگاتە پیاو، بگرە هەر لێشی نیزیك بێتەوە، چونکە بەناچاریی خزێنراوەتە مەیدانێکەوە، کە فیترەتی لەگەڵ ناسازەو خراوەتە گۆمێکەوە کەناتوانیٚ مەلەی تێدا بکات، مەگەر لەترسی مەرگو خنکان پەلەکوتەو پەلەقاژەیەك بکات!

پێم وایە ئەم برە توێژینەوەیەش بەسە، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتی هەشتەمەو، نۆرەی ڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتی نۆیەمینە[1]!

## ٩- مەسەلەی تۆڵەی خوێنی ئافرەت (دية المرأة):

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو مەسەلانەی کەناحەزو نەیارانی شەریعەت، کردوویانە بەمایەی تۆمەتی بەکەم دانرانی ئافرەت لەئیسلامدا، کەئەمیش وەك ئەوانی پێشوو زیاتر لەسۆنگەی نەزانییو بێئاگاییان و قووڵنەبوونەوەیانەوە لەقورئانو سوننەتدا سەریهەڵداوە.

جا بێگومان بۆ خستنەڕووی ئەو تۆمەتەو بەرپەرچدانەوەیشی، پێویستە چەند بڕگەیەك بنووسین:

---

([1]) بۆ تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتی (اللَّين) سەرنجی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)بەرگی یەکەم، تەفسیری سورەتی(الفاتحة) و(البقرة)، بدە.

**بڕگەی یەك:** زانـاو پێشـەوایانی ئیسـلام لەسـەر ئـەوە ڕێككـەوتوون كەنێرینەیی(الذكورة) مەرج نیە بۆ تۆڵەو كوشتنەوە(القصـاص) نەلـەكوژەرو نەلەكوژراودا، واتە: هەم پیاوێك كەئافرەتێكی بەئانقەست(عَمْداً) كوشـتبێ، دەكوژرێتەوەو، هەم ئافرەتیش تۆڵـەی پیـاوی لێدەسـتێنرێتەوە، وەك گوتمـان ئەمە ڕای تێكڕای زانایانـە وەك : (النخعـي والشعبـي والزهـري وعمـر بـن عبدالعزيز ومالك وإسحاق والشافعي والحنفية والحنابلة و... الخ)، هەنـدێك لەزانایانیش ڕایان وایە، كەپیاو لەسـەر ئـافرەت دەكوژرێتـەوە، بـەڵام دەبـێ دوایی نیوەی خوێنە (دية) كەی بدرێ بەخوێنگرەكان (أولياء)ی.

بەڵام (الجعفرية) و (الزيدية) دەڵێن: ئەگەر پیاوێكی ئـازاد ئـافرەتێكی ئـازاد بكوژێ، پێی دەكوژرێتەوە، بەڵام دەبێ نیوەی خوێن (ديـة)ەكـەی كـە لـەهی ئافرەتەكە زیادە، بگێڕرێتـەوە بـۆ خوێنگرەكـانی، بـەڵام ئەگـەر ئـافرەتێكی ئازاد پیاوێكی ئازادی كوشـت، پێـی دەكوژرێتـەوە، ئەوەنـدە هەیـە زیـادەی خوێن (ديـة)ەكەی لەخوێنگرانی ئافرەتەكـە وەرناگیرێتـەوەو نایگێڕێتـەوە بـۆ كەسوكاری پیاوە كوژراوەكە.[1]

بەڵام بێگومـان ڕای زۆربـەو جـەماوەری زانایـان ڕاسـتە ،كـەدەڵێن: لـەڕووی تۆڵە(قصـاص)ەوە نێرومـێ وەك یـەكن‌و، هـیچ جیاوازییـەكیان نیـە، بۆیـە دروست نیە مادام ئافرەتە بكوژە(قاتلـة)كـە تۆڵـەی لێوەردەگیرێتـەوە، هـیچ شتێكی دیكەی زیاد (مەبەسـت نیـوەی خـوێن(نصـف الديـة)ە) وەربگـیرێ، چونكە چەندان دەقی ڕوونو بێ‌چەندو چوون لەسەر ئەوە هـەن، كەشـەریعەت

(١) بڕوانە (المفصل فى أحكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية) للدكتور عبدالكريم زيدان ج٥ ص ٣٤٦، ٣٤٧، وە ئاماژەشی بەهەموو سەرچاوەكان كردوە.

لەڕووی تۆڵە(قصاص)ەوە نەفسی ئەهلی ئیسلامی[1] بەنێرو مێ و وردو درشتەوە وەك یەك داناوە، بۆ وێنە:

أ- خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ﴾(البقرة: من الآية١٧٨).

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! لەبارەی کوژراوانەوە تۆڵە (کوشتنەوە)تان لەسەر فەرزکراوە.

وەك دەبینین خوای دادگەرو کاربەجێ بەگشتی فەرموویەتی: کە کوشتنەوە(قصاص) لەسەر مسوڵمانان پێویست کراوە لەبەرانبەر کوژرانی هەرکامێکیاندا، وە هیچ جۆرە هەڵاواردن(إستثناء)ێکی تێدا نیە. کەواتە: هەر مسوڵمانێك مسوڵمانێکی دیکە-جا چ نێر بێ چ مێ و، چ درشت بێ چ ورد- بکوژێ لەسەر مسوڵمانان فەرزە کەبابای کوژەر بکوژنەوە، دیارە مادام کوشتن(قتل)ەکە لەجۆری ئانقەست(عمد) بێت و، خاوەنەکەیشی بەخوێن(دیة) ڕازی نەبێ و عەفوویشی نەکات!

بەڵام زانایان لەوبارەوە کەئایا مسوڵمانی کۆیلە(رقیق)ش هەمان حوکمی

(١) لەنێوان جەماوەری زانایان و (أبوحنیفة) و ژمارەیەك لەزانایان دا مشتومڕێکی زۆر لەو بارەوە هەیە ،کەئایا بابای کافری (ذمي)، مسوڵمانی لەسەر دەکوژرێتەوە یان نا؟!
هەرچی زۆربەو جەماوەرن دەڵێن: تەنها مسوڵمانان خوێنیان بەرانبەر (متکافيء)ە و مسوڵمان بەنامسوڵمان ناکوژرێتەوە و خوێن(دیة) دەدرێ، بەڵام (أبوحنیفة و سفیان الثوري) ڕایان وایە کەپێی دەکوژرێتەوە.
بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (فتح القدیر) للشوکاني، ج١ص٢٣١، وە بڕوانە: (أحکام القرآن) لابن العربي، ج١ص٩٠ تا ٩٣، وە : (المفصل) ج٥ص٣٤٥، ٣٦٠ وە بڕوانە: (الأساس في التفسیر)سعید حوی، ج١ص٤٠٠.

هەیەو لەگەڵ هی ئازاد(حر)دا یەکسانە یان نا؟! ڕاجیاییان[1] هەیەو، زۆربەیان دەڵێن: نەخێر کۆیلە حوکمەکەی جیایەو ئازاد لەسەر کۆیلە ناکوژرێتەوەو، هەندێکیشیان کە (أبوحنیفة) و هاوەڵەکانیو (سفیان الثوري و ابن أبي لیلی و داودی الظاهري)یان لەنێودانو (القرطبي) گوتوویەتی: لە (علي بن أبي طالب) و (ابن مسعود)یش خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە، کە (سعید بن المسیب) و (ابراهیم النخعي) و (قتادة) و (الحکم بن عتیبة) هەمان ڕایان هەیە، دەڵێن: ئازادو کۆیلە لەوبارەوە یەکسانن، منیش پێموایە ڕای ئەو (هەندێك)ە لەهی ئەو (زۆربە)یە ڕاستترو بەهێزترەو، لەبڕگەی سێیەمیشدا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەو مەسەلەیە.

ب- هەروەها خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ﴾(المائدة: من الآیة٤٥) واتە: و لەتەوڕاتدا لەسەریانمان پێویست کردوە کەنەفس بەنەفسە. (واتە: نەفس بەنەفس دەکوژرێتەوە).

ج- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ((**فَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يُفْدَى وَإِمَّا أَنْ يُقْتَلَ**))متفق علیه، رواه الترمذي والنسائي والبیهقي والدارقطني وغیرهم.[2]

واتە: (هەرکەسێك کەسێکی لێکوژرا، ئەوە لەنێوان دوو شتاندا سەرپشکە: یان خوێن بدرێ لەبری کوژراوەکەی، یان بابای کوژەر بکوژرێتەوە).

(١) بڕوانە: (فتح القدیر) للشوکاني، ج١ص٢٣١.
(٢) أحکام القران لابن العربي، ج١ص٩٨.

د- هەروەها فەرمووویەتی: ((**الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ**..))رواه أبوداود واحمد وابن ماجه والبيهقي عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده وإسناده حسن.[١]

واتە: (مسوڵمانان خوێنیان یەکسانە).

جا دیارە ئەم ئایەتو فەرموودانە لەیەك كاتدا سێ شتیان لێوەردەگیرێن:

١- نێرو مێ لەمەسەلەی تۆڵە (قصاص)دا وەك یەكن، كەپێشتریش باسمانكردو گوتمان زانایان لەسەری یەكدەنگن.[٢]

٢- دروست نیە زیاد لەتۆڵە (قصاص) هیچی دیكە وەربگیرێ، بەتایبەت فەرموودەی ((..**إِمَّا أَنْ يُفْدَى وَإِمَّا أَنْ يُقْتَلَ**)) دەق(نص)ە لەو بارەوەو بواری هیچ قسەو ڕای دیكە نادات.

٣- ئەهلی ئیمان، ئازادو كۆیلەیان لەمەسەلەی تۆڵەدا وەك یەكن، چونكە ئایەتو فەرموودەكان بەگشتی باسی مسوڵمانانیان كردوە بێجیاوازیی.

**بڕگەی دوو:** وەك چۆن زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كەپیاو بەئافرەت دەكوژرێتەوە، لەسەر ئەوەش یەكدەنگن، كەخوێنی (دیة) ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە!

وەزانایان تێكڕا (ابن علية) و (الأصم) یان بەڕێزپەڕ (شاذ) داناون، كە گوتوویانە: خوێنی ئافرەتیش وەك هی پیاو وایە![٣]

بناغەی ئەو یەكدەنگییەی زانایانیش لەسەر ئەوە كەخوێنی ئافرەت نیوەی

(١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.
(٢) (أحكام القرآن) لأبن العربي، ج١ص٩٢.
(٣) (المغني) ابن قدامة، ج٩ص ٥٣١، ٥٣٢.

خوێنی پیاوە، ئەم دەقانەی سوننەتن:

أ- ((**عَنْ مَعاذ بِن جَبَل ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ دِيَةُ الْمَرأةِ عَلَى النِّصفِ مِنْ دِيَةِ الرَّجُل.**))أخرجه البيهقي.[1] واتە: (خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە).

ب- هەروەها لەو (كتاب)ەدا کەپێغەمبەری خوا ﷺ بۆ (عمر و بن حزم) ی ناردوە، هاتوە: ((**دِيَةُ الْمَرأةِ عَلَى النِصفِ مِنْ دِيَةُ الرَّجُل**)).[2]

ج- هەروەها[3] (الشافعي) لە (ابن شهاب) و (مكحول) و (عطاء)ی گێڕاوەتەوە کەگوتوویانە: بەگشتی لەخەڵکیمان زانیوە کەخوێن(دية)ی مسوڵمانی ئازاد لەڕۆژگاری پێغەمبەرداﷺ سەد (١٠٠) حوشتر بووە، جا (عمر) ئەو خوێنەی بۆ خەڵکی شارەکان بەهەزار(١٠٠٠) دینار، یان دوازدە هەزار(١٢٠٠٠) درەم قەبڵاند، خوێنی ئافرەتی ئازادیش لەخەڵکی شارەکان بەپێنج سەد(٥٠٠) دینار، یان شەش هەزار(٦٠٠٠) درەم قەبڵاند.[4]

جا (الشيرازي) خاوەنی کتێبی (المهذب) گوتوویەتی[5]: ئەمە ڕای (علي) و (عثمان) و (ابن عمر) و (زيد بن ثابت)ە خوا لێیان ڕازی بێ، نەشزانراوە هیچ کەس ڕای پێچەوانەی هەبێ، بۆیە بەیەکدەنگیی(إجماع) دانراوە.

---

(١) (المجموع) للنووي، ج٢٠ص١٩٧.
(٢) (المغني) ج٩ص٥٣٢.
(٣) (المجموع) ج٢٠ص١٩٧.
(٤) مەبەست لەدینار، دیناری زێڕە کە مسقاڵێك بووە، کەواتە: (١٠٠) حوشتر، ئەوکاتە بە (١٠٠٠) مسقاڵ مەزەنندە کراوە، (درەم) یش زیو بووە.
(٥) (المجموع شرح المهذب) للنووي، ج٢٠ ص١٩٨.

**بڕگەی سێ**: بەپەسەندم زانی بەرلەوەی بچینە سەر بڕگەی چوارەمو کۆتاییی، حیکمەتی نیوەبوونی خوێنی ئافرەت لەگەڵ پیاودا بخەینەڕوو، لەم بڕگەیەدا سەرنجی بیروڕاو بەڵگەکانی ئەو کەسانە بدەین، کەدەڵێن:

دروست نیە نە ئازاد بە کۆیلەو، نە پیاویش بە ئافرەت بکوژرێتەوە!

جا ئەوەندەی سەرنجی قسەو بیروڕای ئەو کەسانەم دا، وام هاتە بەرچاو، کە لەو جۆرە تەفسیرە کە بۆ ئایەتی ژمارە (١٧٨)ی سووڕەتی (البقرة)ی دەکەن، بەولاوە، بەڵگەی دیکەیان نیە!

ئایەتەکەش بەتەواویی ئەمەیە:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٨﴾ ﴾ (البقرة:١٧٨)

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! لەبارەی کوژراوانەوە، تۆڵەتان لەسەر پێویست کراوە (کە بۆ بابای کوژراو لەبکوژەکەی تۆڵە بکەنەوە)[1] ئازاد بەئازادو، کۆیلە بەکۆیلەو، مێینە بەمێینە، جا هەر کەسێك لەبرایەکەیەوە شتێك چاوپۆشیی لێکرا (واتە لەکوشتنەوە عەفووکرا بۆ خوێن) ئەوە پێویستە (بابای خاوەن هەق) بەشێوازێکی باش داوای وەرگرتنی هەقەکەی بکات، هەم ئەو (بابای چاوپۆشیی لێکراو)یش بەلەباریی هەقەکەی تەسلیم بکات (لەبەرانبەر چاکەداو لەجیاتی چاکە تووشی سەرئێشەی نەکات!)، ئەوەش (کەچاوپۆشیی لەتۆڵە بکرێ) سووککردنو بەزەیی نواندنێکە

(١) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوەو ئایەتەکە ناڕاستەوخۆ دەیگەیەنێ، نەك ڕاستەوخۆ، بەمەبەستی زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست زیادم کردوە.

لەپەروەردگارتانەوە، هەرکەسێك دوای ئەوە (کەخوێنی وەرگرتوە، یان کەبابای بکوژی لەکوشتنەوە عەفوو کردوە)[1] دەستدرێژیی بکات، ئەوە بێگومان ئازارێکی بەئێشی بۆ دانراوە.

جا ئەو جۆرە کەسانە[2] دەڵێن:

مادام خوا (ﷻ) پاش باسکردنی پێویست بوونی تۆڵە، فەرموویەتی: ئازاد بەئازادو کۆیلە بەکۆیلەو، مێینە بەمێینە، کەواتە: ئازاد بەکۆیلەو، نێرینە بەمێینە، دروست نیە!

بەڵام لەڕاستیی دا بۆچوونەکەیان هەڵەیەو، ئایەتەکە بەهیچ جۆرێك ئەوە ناگەیەنێ، چونکە:

**یەکەم:** بەڵێ ئایەتەکە فەرموویەتی: ئازاد بەئازادو، کۆیلە بەکۆیلەو، مێینە بەمێینە! بەڵام خۆ نەیفەرموە: ئازاد بەکۆیلە نابێ‌و، نێرینە بەمێینە نابێ! کەواتە چۆن دەبێ لەخۆمانەوە شتێك بەدەمی ئایەتەکەوە بڵێین کەنەیفەرمووە؟!.

**دووەم:** وەك پێشتر باسمان کردوە، چەندان دەق لەوبارەوە هەن کەمەسەلەی تۆڵە(قصاص) هەموو ئەهلی ئیسلام دەگرێتەوە، بەبێ جیاوازیی لەنێوان نێرو مێ‌و کۆیلەو ئازادیان دا.

**سێیەم:** ئنجا وەك (ابن کثیر)یش گوتوویەتی:[3] ئەو فەرموودانەی کە لەوبارەوە هاتوون کەپێچەوانەی چەمك‌و واتای گشتی ئەو ئایەت‌و

---

(١) یان مەبەست دەستدرێژیی کردنی بابای کوژەرە، بەکوشتنی نەفسێکی دیکە، یان بەوەخواردنی دانی خوێنەکە، یان هەرنەدانی!

(٢) (الحسن البصري وعطاء) یان لەنێودان، بڕوانە: (الأساس في تفسیر) ج١ص٤٠٠.

(٣) (مختصر تفسیر ابن کثیر) ج١ص٥٣٧، الشیخ محمد علی الصابوني.

فەرموودانەن، کەدەڵێن: تۆڵە تێکڕای مسوڵمانان دەگرێتەوەو کەسی لێ‌هەڵنەوێرراوە، ڕاست(صحیح) نین‌و هێزو پێزی ئەوەیان نیە کەبەرانبەر بەو ئایەت‌و فەرموودانە بوەستن!

**چوارەم:** ئەوەش کە لەبارەی ئایەتی:﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ﴾ (المائدة:من الآية٤٥)وە وتراوە: ئەوە بەرنامەی پێش ئێمە(شرع من قبلنا)یە!! زۆربەی زانایان گوتوویانە: (ان شرع من قبلنا شرع لنا اذا حُكِيَ مُقَرّراً ولم ينسخ).[1] واتە: بەرنامەی خەڵکی پێش ئێمە، بەرنامەی ئێمەشە مادام بەجۆرێك کەدان پێداهێنانی پێوەدیاربێ بۆمان بگێڕرێتەوەو، نەسخ نەکرابێتەوە.

**پێنجەم:** لەبارەی حیکمەت‌و هۆی ئەو جۆرە تەعبیرەشەوە ﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ﴾ (البقرة: من الآية١٧٨) توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە:

هۆیەکەی ئەوە بووە ،کە پێش هاتنی ئیسلام، دوو هۆزی عارەب پێکەوە شەڕیان بوو، کوژراوو بریندداریان لەنێوان دا بوون، جا یەکێك لەدوو هۆزەکان ژمارەو توانایان زیاتر بوو، بۆیە سوێندیان خواردبوو کەڕازی نابن تاکو بەهەر کۆیلەیەکیان ئازاد(حر)ێك و بەهەر ئافرەتێکیان پیاوێك نەکوژنەوە! وەك (ابن أبي حاتم) لە (سعيد بن جبير)ەوە گێڕاویەتەوە، [2]

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص ٥٣٦، بەڵام (د. عمر سليمان الاشقر) لەوبارەوە ڕایەکی دیکەی هەیە، بڕوانە: (نظرات في أصول الفقه) ص ٤٦٥.

(٢) (مختصر تفسير ابن كثير) ج١ص١٦٠، وە بڕوانە: (فتح القدير) للشوكاني، ج١ص٢٣٢، ٢٣٣.

ئیـدی خـوای دادگـەریش فـەرمووی: ﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾ (البقرة: من الآية١٧٨) واتە: نابـێ سـتەم لەیەكـدی بكـەن و خۆتان بەسەر یەكدی دا هەڵكێشن..

(عبدالله بن عباس)یش خوا لێیان ڕازی بێ هۆیەكی دیكەی گێڕاوەتەوەو گوتوویەتی: [1] عارەبەكان لەسەردەمی نـەفامێتی(الجاهلیـة)دا عادەتیـان وابوو، پیاویان لەسەر كوشتنی ئافرەت نەدەكوشتەوە، بەڵكو ئافرەتێكیان لـەبری پیـاوە بكوژەكـە دەكوشـتەوە، بـەڵام ئافرەتیـان لەسـەر ئـافرەت و پیاویان لەسەر پیاو دەكوشتەوە، جا خـوای دادگـەر ئایـەتی: ﴿ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾ی ناردەخوارێ.

جا بەپێی قسەی (ابن كـثیر) وا دەردەكـەوێ كـە (ابـن عبـاس) ئایـەتی: ﴿ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾ی بەلابەری(ناسـخ) ئایـەتی﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ﴾ دانابێ، بەڵام بێگومان ئەو ڕایە بێهێزەو چاكتر وایـە وەك (سـید قطـب) گوتوویـەتی: بڵێین: [2] هـیچ مەسـەلەی نەسـخ لـەگۆڕێدا نیـە، چـونكە شوێن و بابەتی ئایەتەكەی (المائدة) و ئەوەی (البقرة) جیـاوازن و، هەرچـی ئایەتەكـەی ژمـارە (٤٥)ی (المائـدة)یـە، بابـەت و بوارەكـەی بریتیـە لەدەستدرێژیی تاكیی(الإعتداء الفردي)، جـا چ بـۆ سـەر تاكێـك بـێ، چ بۆسەر زیاتر كە دیاریكراو بن، وە چ لەلایـەن تاكێكـەوە بـێ، چ لەلایـەن زیاتر لەیەكێك و دوان، مادام دیاریكراو بـن، ئـەوە دیـارە كـە دادگـەریی

(١) هەمان سەرچاوە: (مختصرتفسیر ابن كثیر) ج١ص١٦٩، (فتح القدیر) ج١ص٢٣٣.
(٢) بڕوانە: (في ظلال القرآن) ج١ص١٦٥، ط ٢٥: دار الشروق.

ئەوەیە، هەر کەسە کە کەسێکی کوشتوە بکوژرێتەوە.[(١)]

بەڵام ئایەتی ژمارە (١٧٨)ی (البقرة) بوارو بابەتەکەی بریتیە لەشەڕو هەراو دەستدرێژییکردنە سەریەکدی دوو تیرەو هۆز، یان دوو کۆمەڵ، کەخەڵکێك لەیەکدی دەکوژن، دیارە بۆ چەسپاندنی دادگەریی لەنێوانیانداو جێبەجێکردنی یاسای تۆڵە(حکم القصاص) چار هەر ئەوەیە کە چەند ئازادو کۆیلەو ئافرەتیان لەیەکدی کوشتوە، هەموویان پێکەوە سەرژمێر بکرێنو لەبری هەر ئازادێك یەکێكو، لەجێی هەر کۆیلەیەك کۆیلەیەكو، لەجیاتی هەر مێینەیەکیش مێینەیەك، بکوژرێتەوە، یان خوێن بدرێ، ئەگەر لێبوردن لەئارادا نەبێ.[(٢)]

**بڕگەی چوار:** ئێستاش پاش بەرچاو ڕوون بوونەوەمان لەبارەی حوکمی تۆڵە(قصاص)وە بەگشتیو تۆڵەی خوێنی ئافرەت بەتایبەت، دەتوانین

---

(١) زانایان لەوبارەوە کە ئایا دروستە کۆمەڵ (جماعة) یێك لەبری کەسێك کەبەهەموویان کوشتوویانە بکوژرێنەوە، یان نا؟! ڕاجیایی یان هەیە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان کەپێشەوای هەر چوار مەزهەبەکانیان لەنێودان، وەك خاوەنی (الأساس في التفسير) ج١ص٤٠٠، هێناویەتیو بگرە خاوەنی (المغني) ج٩ص٣٦٦، ٣٦٧، گوتوویەتی: ئەو ڕایە هی: (عمرو علي و ابن عباس والمغيرة بن شعبة وسعيد بن المسيب والحسن البصري‌و أبو سلمة و عطاء وقتادة و مالك والثوري والأوزاعي والشافعي وأسحاق وأبوثور وأصحاب الرأي) یە! هەروەها گوتوویەتی: وە (إجماع الصحابة) یشی لەسەرەو گوتوویەتی: (روى سعيد بن المسيب أن عمر بن الخطاب قتل سبعة من أهل صنعاء قتلوا رجلاً وقال: لوتمالأ عليه أهل صنعاء لقتلتهم جميعاً) .

(٢) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ أُصِيبَ بِقَتْلٍ أَوْ خَبْلٍ فَإِنَّهُ يَخْتَارُ إِحْدَى ثَلَاثٍ إِمَّا أَنْ يَقْتَصَّ وَإِمَّا أَنْ يَعْفُوَ وَإِمَّا أَنْ يَأْخُذَ الدِّيَةَ، فَإِنْ أَرَادَ الرَّابِعَةَ فَخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ..) . رواه أبوداود وابن ماجة والدارمي والدارقطني وأحمد وابن أبي شيبة وابن أبي حاتم عن أبي شريح الخزاعي، بڕوانە: (فتح القدير) للشوكاني، ج١ص٢٣٣.

بەئاسانیی لەبارەی حیکمەت‌و هۆی ئەوجۆرە حوکمەوە، نوختە لەسەر پیت دابنێین‌و بڵێین:

مادام لەکاتی جێبەجێکردنی حوکمی تۆڵەستاندنەوە (القصاص)دا، نەك تەنها پیاوێك، بەڵکو چەندان پیاو، کە لەکوشتنی ئافرەتێك دا بەشداربوونە، پێویستە بکوژرێنەوە، کەواتە بەهیچ جۆرێك ناگونجێ‌و ڕێی تێناچێ، کەبگوترێ: نیوە خوێن (نصف الدیة) بوونی ئافرەت لەچاو هی پیاودا، پەیوەندیی بەبەکەم دانانی ئافرەتەوە هەیە، چونکە ئەگەر وابوایە، دەبوایە لەحاڵەتی تۆڵەستاندنەوەش دا ئەم بەکەم دانانە هەر ببوایە!

**کەواتە:**

دیارە حیکمەت‌و هۆی ئەو مەسەلەیە شتێکی دیکەیە، ئەویش ئەوەیە کەخوێن (دیة) کە جێدار (بدیل)ی کوشتنەوەیە، لەجۆری کوشتنی بەئانقەست (نوع القتل العمد)[1]دا، لەڕاستیی دا قەرەبووکەرەوە (مُعَوَّض)ی بابای کوژراوە بۆ ماڵ‌و خێزان‌و کەس‌وکارەکەی، ئاشکراشە کەپێویستە بژاردنەوەو قەرەبووکردنەوە، لەبواری شتی ماددییدا، بەئەندازەو لەقەدەر شتە بۆ قەرەبووکراوە (معوَّض عنه)ەکەو ئەو کەلێن‌و بۆشاییی یە بێت، کەبەجێی هێشتوە!

شتێکی ڕوونیشە کە کەلێن‌و بۆشاییی یەکیش کە ئافرەتێك بەجێی دەهێڵێ، لەڕووی داراییی‌و گوزەرانەوە، کەبێگومان بژێو پەیداکردن‌و ڕۆزی دابینکردنی

---

(١) پێناسەی کوشتنی بەئانقەست ئاوا کراوە: (القتل العمد فعل یترتب علیه زهوق روح انسان بقصد من الفاعل بغیر وجه حق) (المفصل..) ج٥ص٣٢٨، واتە: کوشتنی ئانقەست کردەوەیەکە بەهۆیەوە گیانی ئینسانێك دەردەچێ لەلایەن بکەرێکەوە بەمەبەستەوەو بەناهەق.

بەئەستۆوە نیە، زۆر کەمترە لەو کەلەبەرو نوقسانییەی کەبەهۆی لەدەست دانی پیاوێکەوە لەخێزانێك دا پەیدا دەبێ، کەشەریعەت بژێو پەیداکردن و گوزەران دابینکردنی خۆیشی و خەڵکێکیشی خستۆتە ئەستۆ، بۆیە ئەوپەڕی دادگەریی یە، کە خێزانێك کەدەویستری کەلێنی پیاوێکیان بەماڵ و سامان و لە ڕووە[1] ماددییەکەیەوە بۆ قەرەبوو(تعویض) بکرێتەوە، دوو هێندەی خێزانێکی دیکەیان بدرێتێ، کەدەویستری کەلێنی لەدەست دانی ئافرەتێکیان بۆ قەرەبوو بکرێتەوە!

## ١٠- مەسەلەی تەڵاق:

خوێنەری بەڕێز!

مەسەلەی تەڵاقیش یەکی دیکەیە لەو مەسەلانەی کە نەیارانی شەریعەت کردوویانەتە بناغەی هەڵبەستراني تۆمەتی ڕێز لێنەگیرانی ئافرەت و، بە کەم تەماشاکرانی لە ئیسلامدا و دەڵێن:

چ ڕەوای هەقە ژنێك کە ڕەنگە خاوەنی کۆشێك منداڵ بێت و ئەرکی زۆری بەو ماڵ و حاڵەیەوە کێشا بێت، کە تێیدا نیشتەجێیە، چارەنووسی ببەسترێتەوە بە چەند وشەیەکی سەرزارەکیی کە لە زاری مێردەکەی دەردەچن؟!!

جا هەرچەندە ئێمە -خوا پشتیوان بێت- بەشی حەوتەمی ئەم کتێبە (چۆنیەتی لەیەکترازانی ژن و مێرد)مان بۆ توێژینەوەی مەسەلەی تەڵاق تەرخان کردوە، کە گەورەترین بەشی ئەم کتێبەیەو زۆرترین پانتایی داگرتووە،بۆیە لێرەدا ناچینە نێو

(١) بۆیە گوتوومانە لە ڕووە ماددیی یەکەیەوە، چونکە لە ڕووی مەعنەویی و جەوهەریی ئینسانەوە، مرۆڤ قیمەتی تەواو نابێ و لەو ڕووە جەوهەرییەشەوە نێر و مێ یەکسانن، هەر بۆیەش تۆڵە و کوشتنەوە، کە پەیوەندیی بەو لایەنەوە هەیە، نێر و مێ تێیدا وەك یەکن!



وردەکارییەکانی ئەو مەسەلەیەوە، بەڵام بایی دەرخستنی بەهەڵەداچوونی ناحەزانی شەریعەت لەبارەی تەڵاقەوەو، خستنەڕووی حیکمەتی-بەپلەی یەکەم- بەدەستی پیاوبوونی تەڵاق، لەچەند بڕگەیەگ دا شتێکی لەبارەوە باس دەکەین.

## بڕگەی یەك: پێناسەی تەڵاق:

زانایانی ئیسلام بەچەند شێوەیەك پێناسەی تەڵاق (طلاق)یان کردوە، کە لەنێوەڕۆکدا دەبنەوە بە یەك، یەکێك[1] لە لێکۆڵەرەوانی ئیسلام پاش هێنانو خستنە ڕووی پێناسەی هەر چوار مەزهەبە فیقهییەکان (الحنفية والمالكية والشافعية والحنبلية)و، پاش ئەوەی ڕوونی کردۆتەوە کە وشەی (طلاق) لە زمانی عارەبییدا بەمانای ئازادبوونو بەرهەڵدابوون، دێ وەك گوتوویەتی: (يقال: طَلَقَ طلاقاً: تحرَّر من قيده، و طَلَقَت المرأةَ من زوجها طلاقاً، أي: تحلَّلت من قيد الزواج و خرجت من عصمته، وأطْلَق الشيء أي، حلَّهُ وحرَّره وأطْلَقَ الأسيرَ، أي: حرَّره، وأطْلَقَ له العَنان، أي: أرسله وتركه...)[2]

بەم جۆرە پێناسەی (طلاق)ی لە زاراوەی شەرعدا کردوە کە منیش زۆرم پێ بەجێیە:

(الطلاق، إنهاء عقد الزواج الصحيح في الحال أو في المآل بالصيغة الدالة عليه)

واتە: تەڵاق: کۆتایی پێهێنانی پەیمانی ژنو مێردایەتییەکی ڕاستو دروستە ئێستاکە، یان لە داهاتوودا بە تەعبیرێك، کە بیگەیەنێت).

---

(١) کە بەڕێز (د.عبدالكريم زيدان) ە،خوا پاداشتی بداتەوە، بڕوانە: (المفصل..) ج٧، ص٣٤٧.

(٢) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص٥٢٣، و بڕوانە: (لسان العرب لابن منظور) ج٨، ص١٨٧ تا ١٩١.

کەواتە:

بەکورتیی زاراوەی تەلاق لە شەرعدا بریتییە لە: ئازادبوونو لەیەکترازانی ژنو مێرد لەو پەیمانو بەڵێنەی کە پێکەوە گرێیان داوەو، ژنو مێردایەتیی خۆیانیان لەسەر بنیات ناوە.

## بڕگەی دوو: ڕەوابوون(مشروعية)ی تەلاق:

بەڵگە لەسەر ڕەوابوونی تەلاق زۆرنو، دەیان دەقی قورئانو سوننەتی لەسەرنو کۆڕا(إجماع)ی زانایانیشی لەسەرە، [1] بۆ وێنە خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾(البقرة: الآية٢٢٩)
واتە: تەلاقدانێك -کە گێڕانەوە(رجعة)ی لەگەڵ بگونجێت- دوو کەڕەتە، پاشان یان دەبێت هێشتنەوەی (مێرد بۆ ژنەکەی) بەشێوەیەکی باش بێت، یان بەرهەڵداکردنێکی چاکە کارانە بێت..

هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾(الطلاق: من الآية١)، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێك ئافرەتانتان تەلاق دا، لەکاتی بەپیرەوەچوونی عیددەیاندا تەلاقیان بدەن[2]. (واتە: کاتێك کە دوای حەیز کەوتوونەتە پاکییەوە، لە پاکییەکەشیاندا نەچوونەتە لایان).

(١) بڕوانە: (المفصل..) ج٧، ص٣٤٧، و: (المغني) لأبن قدامة، ج٧، ص٩٦.
(٢) بڕوانە: (تيسير الكريم المنان في تفسير كلام الرحمن) ص٨٦٩، و بڕوانە: (صفوة البيان لمعاني القرآن- للشيخ حسنين محمد مخلوف)ص٧٢٩.

دیـاره لـه سـوننەتی پێغەمبـەری خواشـدا ﷺ دەق لـەو بـارەوە زۆرن بـۆ وێنـە: (البخاري) گێڕاویەتەوە کە (عبدالله بن عمر)-خوا لێیان ڕازی بێت- ژنەکەی خۆی لە کاتێکدا کە لە حەیزدا بووە تەلاق داوە، (عمـر)یش-خـوا لێـی ڕازی بێـت- لـەو بارەوە پرسـیاری لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـردوە، ئـەویش فەرمووییـەتی: ((**مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ**)) واته: پێی بڵێ، با بگەڕێتـەوە لای، پاشـان بیهێڵێتـەوە تـا پـاك دەبێتـەوە، دوایـی دەکەوێتە حەیزەوە و پاشان پـاك دەبێتـەوە، ئنجـا ئـەو کاتـە ئەگـەر ویسـتی، بـا بیهێڵێتەوە، وەئەگەر ویستی با بەر لەوەی بچێتە لای بەرهەڵدای بکات، ئـەوە ئـەو عیددەیەیە کە خوا فەرمانی کردوە، کە ئافرەتانی لەسەرو حەددا تەڵاق بدرێن)).

## برگەی سێ: حوکمی تەڵاق:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە تـەڵاقیش وەك زۆر لـە هەڵس‌وکەوتەکان(التصرفات) پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسـەردا دەچەسـپێن، کـە بریتین لە: ڕەوابـوونو، ناپەسـەندبوونو، قەدەغـەبوونو، پەسـەند بـوونو، پێویسـت بوون(الإباحة والكراهة والحرمة والاستحباب والوجوب)، کە دیاره ئـەم پێـنج جـۆره حوکمەش بەگوێرەی هەڵوێستو ڕەفتاری ژن لەگەڵ مێردەکەیدا دەگۆڕێن، بۆ وێنـە: ژنێك کە ئەرکـە شـەرعییەکانی سـەر شـانی بەرانبـەر بـە مـاڵو مێـردی جێبـەجێ دەکاتو، عـەیبو هەڵەیەکی وای نیە کە پاساوی واز لێهێنانی بێت، ئەوە بێگومان تەڵاقدانی ئەگەر قەدەغـەش نەبێت، بەلای کەمەوە ناپەسـەندە، بەڵام بە پێچـەوانەوە ژنێك کە لە مێردەکەی بۆتـە (ژان)و تـەواو تـەنگی پێهەڵچـنیوەو پشـووی پێسـوار

کردوەو، زۆریش هەوڵی لەگەڵ داوەو بۆی چارەسەر نەکراوە، ئەوە بێگومان وازلێهێنانی ژنی ئاوا، بەلای کەمەوە موباحەو، جاری واش هەیە دەبێتە فەرز، یان لانی کەم سوننەتیش.!

وە لەو بارەوە کە ئایا تەلاق لەئەسڵدا ڕەوا(مباح)یە، یان قەدەغە(محظور)، زانایان ڕاجیاییان[1] هەیەو، هەندێکیان بەڕەواو، زۆربەی هەرە زۆریشیان لە ئەسڵدا بە حەرامی دەزانن‌و دەڵێن: مەگەر ناچاریی بێت، دەنا دروست نیە، دیارە بە سەرنجدانی ئایەتەکانی قورئان‌و فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ زۆر بە ڕوونیی دەزانرێت کە ڕای زۆربەی شەرعزانان(الفقهاء) ڕاست‌و بەجێیە، بۆ وێنە:

١-خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ (النحل:٧٢)

واتە: خوا لە خۆتان هاوسەری بۆ ڕەخساندوون‌و لە هاوسەرەکانتان کوڕان‌و نەوە گەلی بۆ گێڕاون، وە لە ڕۆزییە پاك‌و چاکەکان بژێوی پێداون، جا ئایا بڕوا بە باتیڵ دێنن‌و ناسپاسیی بەرانبەر بە چاکەکانی خوا دەکەن؟!

وەك دەبینین خوای کار بەجێ هاوسەری لەڕیزی چاکەو نیعمەتەکانی خۆیدا داناوەو، دیارە هیچ کەسیش بۆی نیە، بەبێ بەڵگەو پاساوی شەرعیی ،دەست بەرداری چاکەی خوا بێت، چونکە بە سپڵەو ناسپاس(کفور) دادەنرێت!

٢- هەروەها خوای کاربەجێ لە ئایەتی (٣٤)ی (النساء)دا پاش ئەوەی باسی

---

(١) بڕوانە: (المفصل..) ج٧، ص٣٥١، ٣٥٢.

چۆنیەتی لێپرسینەوەو سزادانی ئافرەتی یاخیو سەرکەشی لەلایەن مێردەکەیەوە کردوە، فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴾(النساء:من الآية٣٤)

واتە: جا ئەگەر هاتو بەقسەیان کردن، ئەوە لێیان بۆ بەهانە مەگەڕێن، چونکە بێگومان خوا بەرزی گەورەیە.

کەواتە: بەدەقی قورئان بیانوو پێگرتنی بەناهەقو ئازاردانی ئافرەت قەدەغەیەو، ئاشکراشە کە تەڵاقدانی ئافرەت- بەناهەق- گەورەترین جۆرە ئازاردانو نارەحەتکردنە!

٣- هەروەها خوای پەروەردگار باسی کردوە، کە ئەوە شەیطانو جادووگەرەکان(السحرة)ن کە هەوڵی لەیەکترازاندنی ژنو مێرد دەدەن، وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ .... فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ ﴾ (البقرة:من الآية١٠٢)

٤- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ((**أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللَّهِ الطَّلَاقُ**)) رواه أبوداود. واتە: (ناپەسەندترین حەڵاڵ لای خوا تەڵاقدانە).

کەواتە: تەڵاق لە ئەسڵدا شتێکی باشو پەسەند نیەو، لانی کەم ناپەسەند(مكروه)ە، ئەگەر حەرامیش نەبێت، بەڵام لەکاتی ناچاریدا حوکمەکەی دەگۆڕێت.

## بڕگەی چوار: جۆرەکانی تەڵاق:

تەڵاق لەچەند ڕوویێکەوەو بەچەند ئیعتیبارێك، بۆ چەند جۆرێك دابەش دەکرێت، جائەوەی ئێمە لێرەدا زیاتر مەبەستمانە، دوو جۆرە دابەش کردنە:

**١- لەڕووی بەگوێرەی سوننەت بوون یان بیدعەت بوونییەوە، دابەش دەبێت بۆ:**

**یەکەم:** تەڵاقدانی سوننەتیی(الطلاق السُّنّي) کەبریتیە لەوەی مێرد یەك تەڵاقی ژنەکەی بدات لەپاکیی(طهر)یەکدا، کە نەچووبێتە لای، پاشان وازی لێبهێنێت ،تاکو عیددەی بەسەر دەچێت، جائەم تەڵاقە(طلقة) ئەگەر تەڵاقی یەکەم، یان دووەم بێت، بەتەڵاقدانی گێڕانەوە (رجعي) دەناسرێتو، ئەگەر مێردەکە ژنەکەی بەر لە بەسەرچوونی (عدة)ەکەی نەگێڕایەوە لای خۆی، ئەوە ژنەکە بەتەڵاقدراو(مطلقة) دادەنرێتو، لەمێردەکەی جیادەبێتەوە، بەڵام بەجیابوونەوەی گچکە(البينونة الصغرى)، چونکە مێردەکەی بۆی هەیە بەمارەیی‌و مارەکردنێکی تازە(مهر وعقد جديد) بیهێنێتەوە لای خۆی، وەك جیابوونەوەی گەورە(البينونة الكبرى) نیە، کە هەتا ژنەکە مێردێکی دیکەی شەرعیی نەکاتەوەو، پێکەوە جووت نەبن، پاشان کابرای دووەم بەبێ بەمەرج گیرانی پێش وەخت، لێی جیانەبێتەوە، بۆ مێردی پێشووی حەڵاڵ نابێتەوە!

زانایان تێکرا لەسەر کەوتنی ئەم جۆرە تەڵاقە یەکدەنگن.[١]

**دووەم:** تەڵاقدانی بیدعەتیی(الطلاق البدعي)، کەبریتییە لەوەی کابرای

---

(١) (المفصل..) ج٧ص٤م، ٤١٥، هەروەها بڕوانە: (المغني) لابن قدامة ج٨ص٢٣٥ تا ٢٣٧.

تەلاقدەر(مُطلِّقْ) لەتەلاقدانەکەیدا، ڕەچاوی سنوورو ئەدەبەکانی شەرع نەکات، جا ئەمیش دوو جۆرە:[١]

أ-جۆری یەکەمیان پەیوەندیی بەکاتی تەلاقدانەکەو حاڵەتی ژنەکەوە هەیە، کە بریتییە لەوەی لەکاتی لەحەیز(حیض)دا بوون دا بێت، یان لەکاتی پاکیی(طهر)یەك کەتێیدا جووت بوون(جماع) ئەنجام درابێت.

ب- جۆری دووەمیشیان پەیوەندیی بەژمارەی تەلاقەکانەوە(عدد الطلقات) هەیە، وەك ئەوەی کەکابرا لەیەك کاتدا سێ تەلاقی بدات!

شایانی باسیشە، کە زانایان لەسەر کەوتنو نەکەوتنی تەلاقی بیدعەتیی، پاش ئەوەی لەسەر حەرام(محظور) بوونی یەکدەنگ بوونە- ڕاجیایی (إختلاف) و مشتومڕێکی زۆریان هەیە،[٢] کە-خوا یار بێت- هەموو ئەم باسو خواسانە بۆ بەشی حەوتەمی ئەم کتێبە هەڵدەگرین[٣].

**٢- لەڕووی یەکجارەکی بوونو یەکجارەکی نەبوونیشەوە، دابەشدەبێت بۆ:**[٤]

**یەکەم:** تەلاقی جیابوونەوەو دابڕان(الطلاق البائن)، کەئەمیش وەك پێشتر باسمانکرد، دوو جۆرە: جیابوونەوەی گچکە(البینونة الصغری) و جیابوونەوەی گەورە(البینونة الکبری).

**دووەم:** تەلاقی گێڕانەوە(الطلاق الرجعي)، کەبریتییە لەوجۆرە تەلاقەی

---

(١) بڕوانە: (المفصل...) ج٧ص٤١٥.

(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

(٣) ئێستاش. (٥/١١/٢٠١٢) دەڵێم: سوپاس بۆ خوا بەتێروتەسەلیی لەبەشی حەوتەم لەتەوەرەی یەکەمی دا، باسی تەلاقدانو سەرجەم بابەتو مەسەلە پەیوەندارەکانیمان کردوە.

(٤) بڕوانە: (المغني) لابن قدامة، ج٨ ص ٢٧٢.

کابرای تەڵاقدەر دەرفەتی هێنانەوەو گێڕانەوەی ژنەکەی لەبەردەمدا ماوەو، یەکجاریی لێی دانەبڕاوە.

## بڕگەی پێنج: حیکمەتی تەڵاق:

بەڕەوادانانی تەڵاق لەکاتی ناچارییدا، یەکی دیکەیە لەبەڵگەکانی واقیع بینیی‌و دانایی شەریعەتی خوای کاربەجێ، چونکە بێگومان بناغەی ژیانی هاوسەرێتی(حیاة الزوجیة) لەئیسلامدا بریتیە لە یەکدی خۆشویستن‌و بەزەیی‌و پەرۆش بۆ یەکدی هەبوون‌و ئۆخژن‌و سوکنایی بەیەکدی هاتن: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾ (الروم: من الآیة٢١)

جا هەرکاتێك پەیوەندیی نێوان ژن‌و مێرد بوو بەپێچەوانەی ئەوە، کە خوا فەرمانی پێکردوەو، پاش چەندان شێوازی چارەسەریش[١] گرفتەکەیان هەرچاك نەبوو، ئەوە مانای وایە پاساو (مـبرر)ی مانەوەی ئەو ژن‌و مێردایەتییە نەماوە، لەسۆنگەی ئەوەوە کەئامانج‌و مەبەستە شەرعییەکان(الأهداف والمقاصد الشرعیة) کەژیانی هاوسەرێتیان بۆ بنیاتنراوە، ناهێنێتەدی، بگرە بەبەراوەژوەوە، پێچەوانەو دژی ئەوان، کە بریتیە لە: ناکۆکیی‌و یەکدی ئازاردان‌و بوغزو کینەو بێزێزیی‌و...هتد. سەری هەڵداوە!

سەرنج بدە (ابن قدامة) چەند جوانی گوتوە[٢]: (.. ربما فسدت الحال بین الزوجین

(١) کەلەئایەتەکانی ژمارە ٣٤و ٣٥ی (النساء) دا خراونەتەڕوو.
(٢) بڕوانە: (المغني) لابن قدامة، ج٨ص٢٣٣، ٢٣٤.

فيصير بقاء النكاح مفسدة محضة وضرراً محضاً بإلزام الزوج النفقة والسكنى وحبس المرأة مع سؤ العشرة والخصومة الدائمة من غير فائدة. فاقتضى ذلك شَرْعَ مايُزِيلُ النكاح لتزول المفسدة الحاصلة منه).

واته: جاری وا هەیە حاڵو باڵی ژنو مێردان واتێکدەچێ، کەپێکەوە مانەوەیان بەس دەبێتە زەرەرو زیانی ڕووت، بەوە کەمێردەکە ناچار بکرێ مەسرەفو جێگاو ڕێگا بۆ ژنەکەی دابین بکاتو، ژنەکەش لەماڵێکدا بهێڵرێتەوە، لەحاڵێکدا بەخراپیی ڕەفتاریی لەگەڵ دەکرێو کێشمەکێشی بەردەوامی بێسوودیش لەوێ بوەستێ! جا ئەو حاڵو وەزعە داخوازیی ئەوەی کردوە، کە بڕیارێك هەبێ بۆ نەهێشتنی پەیوەندیی هاوسەرێتی، تاکو ئەو زەرەرو زیانەی کەلێیەوە پەیدابوونە، لابچن!

هەروەها (الكاساني)یش هەمان شتی لەوبارەوە گوتوەو[1] بێگومان ئەو مەسەلەیەش شتێکی زۆر ڕوونو بەرچاوەو، کەسانێکیش کە بەناوی مافی ژنانو بەرگریی لێکردنیانەوە، ڕەخنە لە ڕەوابوونو ڕێپێدانی تەلاق-لەکاتی ناچارییدا- دەگرن، زۆر بەهەڵەدا چوونە، چونکە بەتەئکید هیچ ڕێزو حورمەتو مافێکی ئافرەت بەوە دابین ناکرێو لەوەدا نیە، کە ژنێکی کلۆڵ-جا چ خەتای بێ چ نەبێ- وەك تەوقو کۆتو زنجیرو کۆڵێکی قورس بەملی مێردەکەیەوەو، لەسەر پشتی بمێنێتەوەو، وەك شتێکی بێزراوو نەویستراو(مرفوض) خۆی بێتە بەرچاو، کەبێگومان هەر تەنها ئەوجۆرە هەستو نەستە، کە لەو هەلومەرجەدا بۆ ژن دروست دەبێ، بەگەورەترین ئازارو ئەشکەنجەی دەزانێ!

---

(١) بڕوانە: (بدائع الصنائع) للكاساني ج٣ص١١٢.

## بڕگەی شەش: لەیەك جیابوونەوەی ژنو مێرد تەنها لەڕێی تەڵاقەوە نیەو تەڵاقیش مەرج نیە هەر بەدەستی پیاو بێت:

دیارە ئێمە –خوا پشتیوان بێ– لەبەشی حەوتەمدا باسی ئەم بابەتە دەكەین، بەڵام لێرەشدا بەپەسەندم زانی ئاماژەیەكی پێبكەم، چونكە زۆر كەس كەشارەزای شەریعەت نین وا دەزانن، تاكە ڕێگەی لەیەكترازانی ژنو مێرد تەڵاقەو، تەڵاقیش تەنها بەدەست پیاوە!

كەبێگومان وا نیەو لەیەكترازانی ژنو مێرد، سێ ڕێی سەرەكیی و سێ شێوازی بنەڕەتی هەن:

**یەكەم:** تەڵاق(الطلاق) كە بەزۆریی لەلایەن پیاوەوە دەبێ.

**دووەم:** خولع(الخلع) كە لەلایەن ژنەوە دەبێو، بەمانای لەملی خۆ داڕنینە!

**سێیەم:** فەسخ(الفسخ) كە لەلایەن قاضیەوە دەبێو، بەمانای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی هاوسەرێتیی(حل عقدة الزواج)یەو، چەندان هۆكاری جیاجیای هەن.

ئەوە لەبارەی ڕێبازو شێوازەكانی لەیەكدی ترازانی ژنو مێردەوە بەگشتی، لەبارەی تەڵاقیشەوە، كەمەرج نیە تەنها بەدەست پیاو بێ، دەڵێین: [1]

هەرچەندە تەڵاق لەئەسڵدا بەدەست پیاوەو لەبڕگەی حەوتەمیشدا باسی حیكمەتەكەی دەكەین، بەڵام تەڵاقدان سێ حاڵەتی هەنو، بەسێ شێواز ئەنجامدەدرێ، كەلەدوانیاندا ئیرادەی ئافرەت ڕۆڵی تێدا دەگێڕێ:

---

(١) بڕوانە: (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني) د. محمد سعيد رمضان البوطي، ص١٣٧، ١٣٨.

أ- کە مێرد ژنەکەی تەڵاق بدات، کە ئەمە حاڵەتی ئاساییە بۆ تەڵاقدان.

ب- کە بەهەردووکیان پێکەوە ئەو بڕیارە بدەن، بەویستی هاوبەشی ژن و مێرد ئەو لەیەکدی ترازانە تەواوبێ.

ج- کە ژن لە ڕۆژی مارەکردنی(عقد النکاح)یەوە، تەڵاق بەدەست بوونی خۆی بەمەرج بگرێ لەخودی بەڵێنی هاوسەرێتییەکەی دا.[1]

کەواتە: نەتەڵاقیش تەنها ڕێبازی لەیەك جیابوونەوەی ژن و مێردەو، نەتەڵاقیش تەنها بەدەست پیاوە، وەك بێئاگایان و نەشارەزایان گومان دەبەن!

## برگەی حەوت: حیکمەتی بەدەست پیاوبوونی تەڵاق:[2]

دەتوانین حیکمەتی بەدەستی پیاو بوونی تەڵاق، لەم چەند وردە خاڵەدا بخەینەڕوو:

١- وەك لەخاڵی سێیەمی ئەم بەشەدا باسمانکرد، پێویستە پیاو سەرپەرشتی ژن و خێزان بکات، جابێگومان کێش سەرپەرشتیار بێ لەهەڵسووڕاندن و بەڕێوەبردنی کارێك، جێی خۆیەتی بڕیاری ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەیشی بەدەست بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((**الطَّلَاقُ لِمَنْ أَخَذَ بِالسَّاقِ**))رواه ابن ماجە، واتە: تەڵاقدان مافی ئەو کەسەیە، کە لینگی (ژنی) بەدەستە!

٢- بێگومان تەڵاق کۆمەڵێك ئەرك و بەرپرسیارێتیی دەخاتە ئەستۆی پیاوەوە، وەك: مارەیی دواخراو(المهر المؤجّل) و، مەسرەفی کاتی عیددەو، کرێی شیرپێدان(الرضاعة) و، بەخێوکردن(الحضانة)... دیارە ئەمەش وا لەپیاو

(١) بڕوانە: (المفصل...) ج٧ص٣٦٠.

(٢) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لە (المفصل...) ج٧ص٣٤٨، ٣٤٩، وەرگرتوە.

دەکات کە بەرلەوەی مل لەتەلاقدان بنێ، بیر لەو مەسەلانە بکاتەوە، وێڕای ئەو ئەرک‌و زەحمەتانەی کە بە بنیاتنانی خێزانەکەیەوە کێشاونی، ڕەنگە گەلێك جار بیرکردنەوەی لەو مەسەلانە، بڕیاری تەلاقدانەکەی پێدوابخاتو، دوایش خوای دەرووکەرەوە دەرووی خێریان لێبکاتەوەو، گرفتەکەیان چارەسەر ببێت.

٣- وەك لەباسەکانی ڕابردوودا خستوومانەتەڕوو، هەست‌و سۆزو بەزەیی لەئافرەتدا بەهێزترە، وەك چۆن بیرو هۆشی پیاویش بەگشتی لەهی ئافرەت زیاترە، حیکمەتی ئەوجۆرە دابەشکردنەی هۆش‌و سۆز(العقل والعاطفة)یش لەنێوان پیاوو ئافرەتدا، ئەوەیە کەئەرکی سروشتیی پیاو زیاتر پەکی لەسەر عەقڵ‌و بیرو هۆش کەوتوە، لەحاڵێکدا کەئەرك‌و کاری ئافرەت-واتە ئەرك‌و کاری سروشتیی و بنەڕەتیی- زیاتر پێویستی بەسۆزو بەزەیی‌و پەرۆش هەیە، ئنجا ئاشکراشە کەبڕیارێکی هەستیارو مەترسیداری وەك تەلاق، جێی خۆیەتی بەدەست کەسێکەوە بێ کەعەقڵ‌و هۆش، پتر کاریگەریی لەسەری هەیە، نەك عاتیفەو سۆز!

٤- دیارە وەك لەبڕگەی شەشەمیشدا خستمانەڕوو، نەتەلاق تەنها ڕێی دەربازبوونی ژن‌و مێردە لەژیانێکی هاوسەرێتیی پڕ گرفت‌و ناسۆرو، نەتەلاقیش هەموو شێوازەکانی هەر بەدەست پیاوە!

پێموایە بەم بڕە توێژینەوەیەش ڕوون بووەوە کەمەسەلەی تەلاقیش وەك پێشووەکانی، نەك هەر مایەی تۆمەتبارکرانی شەریعەتی دادگەرانەو واقیع بینانەی خوای زاناو تواناو کاربەجێ نیە، بەڵکو بەڵگەیەکی دیکەی تێرو تەواویی ئەو بەرنامە خواییەیە.

## ١١. بەهەڵە تێگەیشتن لە چەند دەقێك لەبارەی ئافرەتەوە:

خوێنەری سەنگین!

لە دە (١٠) خاڵی ڕابردوودا تـەمی تۆمـەتی دە (١٠)مەسـەلەمان ڕەوانـدەوە-والحمد لله المتعال-، خوا یاربێ لەم خاڵی یازدەهەمەشدا تیشك دەخەینە سەر چـەند دەقێكی قورئانو سـوننەت كەناحـەزانی شـەریعەت وەك عـادەتی خۆیـان، بەهەڵـە لێیان حاڵیبوونەو، لەسۆنگەی ئەوەوە گیرۆدەی سەرلێشوانی زیاتر بوونە، دیارە ئەو مەسـەلانەش كەلەباسـەكانی ڕابـردوودا توێژیومانـەوە، بـەخێرایی بەسـەریاندا تێپەڕدەبینو ئاماژە بەو شوێنانە دەكەین، كەئەو مەسەلانەیان تێدا خراونەڕوو:

**یەك:** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾

یەكێك لەو دەقانەی كەئەوجۆرە كەسانە بەهەڵە لێیان تێگەیشتوونو، پاشان كردوویانن بە بەڵگەی ئیسـپاتی ئـەوە كەئیسـلام ئـافرەتی بەكـەمتر لـەپیاو داناوە، ئەوەیە كەخوای كاربەجێ هەمیشە لە قورئانیدا بەشێواز و صیغەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ ئاراستەكانی خۆی بە مسوڵمانان فەرمووە!! بەڵام وەك پێشتر باسمانكرد، ئـەو لێتێگەیشـتنو ئەنجامگیریی(اسـتنتاج)یەی ئەوان هەڵەیە، چـونكە ئـەوجۆرە شـێوازو صـیغەیە لـەزمانی عارەبیـدا-كـە زمـانی قورئانـە- نێـرو مـێ وەك یـەك دەگرێتـەوە[1]و، هۆیەكەیشـی تـەنها ئەوەیە كەوەك بنچـینە(قاعـدة)یـەكی زمـانی عـارەبی[2] هەمیشـە لـەكاتی

(١) وەك لەبەشی دووەمدا لەزاناو پسپۆڕانی (أصول الفقه) وە نەقڵمانكردوە، بۆ وێنە: بڕوانە: (الوجيز في أصول الفقه) د. عبدالكريم زيدان، ص ٣٠٨، ٣٠٩، فقرة رقم: ٢٨٠٠: (دخول الإناث في خطاب الذكور) .

(٢) كەپێی دەگوترێ: (قاعدة التغليب) .

پێکەوە کۆبوونەوەی کۆمەڵێك نێرو مێ دا، بەبێ مەبەستی بەرزکردنەوەو نزمکردنەوە، نێرینەکان زاڵدەکرێنو بەبەکارهێنانی ناوو سیفەتو ڕاناوی نێرینە(المذكر) بانگی هەموویان دەکرێو دەدوێنرێن!

کەواتە:

بەهیچ جۆرێك مەسەلەی بەرزکردنەوەو نزمکردنەوە لەگۆڕێدا نیەو هۆکاری ئەوجۆرە دەربڕینە، شتێکی زمانەوانییو هونەریی ڕووتەو هیچی دیکە!

**دوو:** ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ البقرة:٢٢٨.

ئەم ڕستە قورئانییەش هەندێك دڵنەخۆشی کەم هۆش، لێیان بۆتە گرفتێکی گەورە، کەئەوەتا قورئان بەڕاشکاویی پلەو پایەی زیادی بەپیاوان داوە بەسەر ئافرەتانداو فەرموویەتی: پیاوان پلەیەکیان بەسەریانەوە هەیە! بەڵام لەبەرئەوەی لەخاڵی سێیەمی ئەم بەشەدا ئەو مەسەلەیەمان ڕوونکردۆتەوە لێرەدا دووبارەی ناکەینەوەو خوێنەر حەواڵەی ئەوێ دەکەین.

**سێ:** ﴿كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾﴾ (الدخان:٥٤)

ئەم دەقەش کەهاو وێنەیشی زۆرن، یەکی دیکەیە لەو دەقانەی کەبۆ هەندێك کەس بۆتە جێگای ئیشکالو پرسیار.

بۆچی لەچەندان شوێنی قورئانێدا موژدەی ئەوە بەپیاواندراوە کە هاوسەری سپیو جوانو چاوگەشو گەورەو ڕازاوەیان دەدرێنێ، بەڵام بۆ تەنها جارێکیش موژدەیەکی وا بەئافرەتان نەدراوە، ئایا ئەوانیش حەز لەمێردی قۆزو جوانو بەرچاو ناکەن؟!

**وەڵامی ئەم ئیشکالو پرسیارەش بەدوو شتان دەدەینەوە:**

١- خوای پەنهان بێن لەبارەی نازو نیعمەتەکانی بەهەشتەوە فەرموویەتی:

﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ

﴿مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾﴾ (الزخرف:٧٠-٧١)

واتە: بچنە بەهەشتەوە خۆتان‌و هاوسەرانتان شادمان دەکرێن. قاپی زێڕینی پڕ لەخۆراك‌و پەرداخ گەلی پڕ لەخواردنەوەی جۆراوجۆریان بەسەرەوە دەگێڕێ، هەرچی نەفسەکان بیخوازن‌و چاوەکان لەززەتی لێبکەن تێیدایە، ئێوە تێیدا هەر ماو دەبن.

کەواتە: مادام خوای بەرزو مەزن بەپیاوانی بەهەشتی‌و هاوسەرەکانیان دەفەرموێ: هەرچی نەفس ئیشتیای بکات‌و چاو حەز لەدیتنی بکات لەبەهەشتێدا هەیە، دیارە بێگومان هەموو کەس مورادو مەبەستی لەبەهەشتێدا دێتە دی!

٢- وەك پێشتریش باسمانکردوە، فیطرەتی پیاو لەڕووی مەیلی جینسییەوە، زیاتر حاڵەتی داواکار(طالب) و، فیطرەتی ئافرەتیش حاڵەتی داواکراو(مطلوب)ی هەیە، هەر بۆیەش مەگەر بەدەگمەن، دەنا لەنێو پەخشان‌و شیعرو هونەری سەرجەم گەلانی دنیادا بەرهەمێکی ئافرەت نابینی کە بە پیاوی هەڵگوتبێ، ئەوە هەر پیاوە کەبۆتە شەیداو عاشق‌و پەپوولەی دەوری چراو مانگی ڕووی یارو خۆشەویستەکەی!

دەجا بێگومان پاداشتی خوای کاربەجێش لەبەهەشت دا، هەر بەگوێرەی فیطرەتی ئینسانەکان دانراوەو باسکراوە، ئنجا تۆ سەرنج بدە ئەوەی کە (باب) بەکوڕەکەی دەیڵێ: (ڕاوەستە دوایی جوانترین کچت بۆ دەخوازم!) ئایا ئەگەر هەمان قسەش بەکچەکەی بڵێ چەند سەیرو نەگونجاو دێتە بەرچاو!

دیسان بەدرێژایی مێژووی ئینسان لەسەر زەوی، مەگەر بەدەگمەن دەنا

هەر پیاوان بوونە کەچوونەتە داخوازیی ئافرەتانو لەکەسو کاریان داوایانکردوون.

تەنانەت لەنێو ژیاندارانیشدا هەر نێرینە بەدوای مێینەدا عەودالّەو لێی دەخەفتێ!

**چوار:** ((**الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا وَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ**)) رواه البخاري ومسلم. واتە: (ئافرەت وەك پەراسوو وایە، ئەگەر ڕاستی بکەیەوە دەیشکێنی،وە ئەگەر لێی بەهرەمەندبی، لێی بەهرەمەند دەبی لەحالّێکدا کەلاریی تێدایە).

ئەم فەرموودەیەش[1] گەلێك کەس لێیان بۆتە جێی پرسیارو ئیشکال، کە

---

(١) هەندێك لەزانایان ئەو فەرموودەیە کەبەم شێوەیەش هاتوە: (وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ..) متفق علیه، وە ئایەتی: ﴿ خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾(النساء: من الآية١) دەکەنە بەلّگەی ئەوە کەئافرەتی یەکەم (حەووا) لەپەراسووی ئادەم دروستبووە!، بەلاّم لەڕاستیدا نە ئایەتەکەو نەفەرموودەکەش ئەوە ناگەیەنن، چونکە:

أ-هەرچی ئایەتەکەیە باسی (نەفس) دەکات ،کە شتێکی مەعنەوییەو دابەش (تجزية) نابێ، کەواتە: مەبەست جۆرو جینسی ئەو نەفسەیە، وەك چۆن لەشوێنی دیکەش فەرموویەتی: ﴿خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا﴾(الروم: من الآية٢١)، دیارە ئەگەر ئایەتەکەی: (النساء) جیابوونەوەی حەووا لەئادەم بگەیەنێ، دەبێ ئەم ئایەتەش جیابوونەوەی سەرجەم ژنەکان لەمێردەکانیان بگەیەنێ!!

ب- فەرموودەکەش تەنها مەبەست پێی وێکچواندن (تشبيه) ە هیچی دیکە، هەربۆیەش (النووي) پاش ئامـاژەکردنی بەچەند شوێنەوار (أثـر) ێـك لـەوبارەوە کەحەووا لەپەراسووی چەپی ئادەم دروست بووە، گوتوویەتی: (وفيه دليل لما يقوله الفقهاء او بعضهم ان حوّاء خلقت من ضلع آدم) (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٦ص٣٩٧٧، دەجا بێگومان ئەگەر ئەو فەرموودە (صحيح) انە بەلّگەی ئەو ڕایە بوونایە (النووي) بە بەلّگەی دەهێنانەوەو ئاماژەی بۆ ئەو شوێنەوار (أثر)ە، نەدەکرد! ئێستاش (٢٠١٢/١١/٥) دەلّێم مەسەلەی دروستبوونی حەووا لەپەراسووی ئادەم، هیچ

ئایا بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتی بە پەراسوو چواندوە؟! ئایا ئەوە جۆرێك لە بە کەمو سووك تەماشاکردنی ئافرەت نیە، کە وەك پەراسووی خوارو خێچ دابنرێ؟!

بەڵام لەڕاستیدا وا نیەو ئەگەر بەوردیی سەرنجی بدرێ، هیچ جۆرە زەمێکی تێدا نیەو وەسفێکی واقیعبینانەی ئافرەتەو هیچی دیکە، چونکە:

١- (بخاري) ئەم فەرموودەیەی لەژێر ناوونیشانی، (باب المداراة مع النساء)[1]دا هێناوە، کەواتە: مەبەستی پێغەمبەرﷺ لەم فەرمایشتەی ئەوە بووە، کەپیاوان لەهەڵسوکەوتیان لەگەڵ ژنەکانیان دا، وریا بنو لەگەڵیان پشوو درێژو لێبوردەو سینە فراوانبن.

هەروەها (مسلم)یش لەژێر ناوونیشانی: (باب الوصیة بالنساء)[2]دا هێناوییەتی، کەهەمان مەبەست دەگەیەنێ.

٢- مەبەست لەپێچواندنی ئافرەتیش بەپەراسووی خوار، ئەوەیە کەئافرەت بەپێچەوانەی پیاوەوە سۆزو بەزەیی لەعەقڵو هۆشی زیاترو بەهێزترەو، لەئەنجامی ئەوەدا گەلێك جار هەڵسوکەوتەکانی بەپێودانگی عەقڵو مەنتیقی پیاو ناڕاستو لارەو، پێویستە پیاو لەگەڵی چاوپۆشو لێبوردەو سینگفراوان بێت.

ئنجا وەك چۆن پەراسووەکان بەهۆی لاریی و چەماوەییانەوە بوونەتە

---

پەیوەندیی بەئیسلامەوە نییەو لەپەیمانی کۆن وەرگیراوە، کە ئەمە دەقی تەوراتە لەوبارەوە: (فأوقع الرب الأله آم في نوم عميق ثم تناول ضلعا من اضلاعه وسدَّ مكانها باللّحم وعمل من هذه الضّلع أمرأةً احضرها الى آدم) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح، ٢، خلق المرأة، ص١١.

(١) بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج١٠ص٤٣١.

(٢) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٦ص٣٩٧٥.

شایستەی ئـەوە کەقەفـەزی سـینگ(قفـص الصـدر) پێکبهێـنن، کـەدڵو جەرگو هەناوی ئینسان کەگرنگترینو هەستیارترین ئەنـدامن، لـەباوەش بگرێو بیانپارێزێ، بەهەمان شێوە ئافرەتیش لەسۆنگەی ئەو زێدە سـۆزو بەزەییو پەرۆشـەیەوە، بۆتـە شـیاوی ئـەوە کەببێتـە دایـكو بەخێوکـەری کۆرپـەو پێگەیەنـەرو پەروەردەکـەری وەچـەیەکی تـازە(الجیـل الجدیـد) کەبێگومـان گەورەترینو بایەخدارترین سـەرمایەی کۆمـەڵگایە.

کەواتــە: وەك چــۆن لاریــی(إعوجــاج)ی پەراســووەکان، هــیچ جــۆرە کەموکوورییەك ناگەیەنێ، چونکە ئەو ئەرکەی کەپێیان سپێرراوە بەهۆی ئەو لارییەوە بۆیـان جێبەجێدەکرێ، بەهـەمان شـێوەش بـەهێزیی سـۆزو بەزەیی لەئافرەتدا، نابێتە مایەی عـەیبو کـەموکوڕیی، چـونکە ئـەویش ئەگەر وا نەبووایە ئەرکە سروشتییەکانی خۆی بۆ ئەنجام نەدەدران!

پێنج: ((**مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الْحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ**))متفق علیه عن أبي سعید الخدري.

واتە: (هیچ عـەقڵ و دین ناتەواوێکم نەدیوە، کە هێندەی ئێوە بەکار بێت بۆ زاڵبوون بەسەر بیر و هۆشی پیاوی وریادا)!

ئەم فەرمـوودەیەش وا لەقەڵەم دراوە کە سووکایەتیی و بەکەم دانـان(تحقیر)ی بـۆ ئافرەتـان تێدایـە، بـەڵام بـە سـەرنج دانـی کۆتـایی فەرمایشـتەکە ئـەو مـەتەڵەش حەل دەبێ! چونکە پێغەمبەری خـوا ﷺ هـەر خـۆی مـەبەسـتەکەی خۆی ڕوون کردۆتەوە، با سەرنجی تەواوکەری فەرمایشتەکە بدەین:

((**قَالَتْ إِمرأَةٌ مِنْهُنَّ: وَمَا نُقْصَانُ عَقْلِنَا وَدِينِنَا؟! قَـالَ ﷺ: أَلَيْسَ شَهَادَةُ إِمْرَأَتَيْنِ بِشَهَادَةِ رَجُلٍ وَاحِدٍ؟! فَذَلِكَ نُقْصَانُ العَقْلِ، وَأَلَيْسَـتِ المَـرأَةُ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ ؟! فَذَلِكَ نُقْصَانُ الـدِينِ**)) واتـە: ئافرەتێکیـان

گوتی: جا ناتەواویی عەقڵ و دینمان چی یە؟! ئەویشﷺ فەرمووی: ئایا شایەدییدانی دوو ئافرەت وەك پیاوێك نیە؟! دەجا ئەوە ناتەواویی عەقڵ دەگەیەنێ، ئایا ئافرەت کە کەوتە حەیزەوە، واز لە نوێژ و ڕۆژوو ناهێنێ؟! ئا ئەوەش ناتەواویی دینداریيانە!.

وەك دەبینین پێغەمبەری خواﷺ بۆ خۆی فەرمایشتەکەی خۆی تەفسیر کردوە، تاکو ڕێ لە تەفسیری هەڵەو سوودی خراپ وەرگرتن (سوء الإستفادة)ی ناحەزان و دڵڕەشان، یان ناحاڵی بووان بگرێ و ڕوونی کردۆتەوە، کە مەبەست لە ناتەواویی عەقڵ و هۆشی ئافرەت، هەر ئەو ڕاستی یە سەلمێنراو و بینراوەیە، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردو، گوتمان ئافرەت سۆز و بەزەیی و پەرۆشی لە عەقڵ و بیر و هۆشی بەهێزترە.

هەروەها ڕوونیشی کردۆتەوە، کە مەبەستیشی لە ناتەواویی دینداریی ئافرەتان ناتەواویی و کەم و کووڕیی یانە لە پابەندیی شەریعەتەوەو، چواندنی هەندێك لە ئەرکە شەرعییەکانە، لە حاڵەتە حەیز و زەیستانی دا.

واش پێدەچێ کە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خواﷺ زیاتر لە حاڵەتێکی قسەی خۆش(مُلاطفة) و ئەوانەدا بووبێ، چونکە بێگومان ئافرەتان لەسەر هیچ کام لە بێهێزیی هۆش و، کەمبوونەوەی پابەندیی بەهۆی حەیزەوە، گلەییان لێ ناکرێ، کەواتە مەبەستی پێغەمبەری خواﷺ لێرەدا زیاتر مەدح و ستایشی ئافرەتان و پێداهەڵگوتنیانە، کە ئەوەتا لەگەڵ ئەوەشدا کە لەچاو پیاوان لەو دوو ڕووەوە ناتەواون و کەم و کووڕییتان هەیە، کەچی دەتوانن بەسەر پیاوی زۆر وریا و چاپووك دا زاڵ بن!

شەش: ((**لَوْ كُنْتُ آمِرًا بَشَرًا يَسْجُدُ لِبَشَرٍ لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا لِعِظَمِ حَقِّهِ عَلَيهَا**))رواه أحمد والنسائي والترمذي بسند صحيح عن أنس

بن مالك.

واتە: (ئەگەر فەرمانم بەهیچ ئینسانێك كردبایە كە كڕنووش بۆ ئینسانێكی دیكە ببات، فەرمانم بە ئافرەت دەكرد كە سەجدە بۆ مێردەكەی ببات، لەبەر گەورەیی هەقی مێردەكەی لەسەری).

دیارە شوێنی ئیشكال و پرسیاریش ئەوەیە، كە چۆن پێغەمبەری خواﷺ ئەگەر هەر بە (لَوْ)یش بێت باسی ئەوە دەكات! ئایا ئەوە لێی نافامرێتەوە، كە ئافرەت وەك كۆیلە و بەردەست و خزمەتكارێك بۆ پیاو تەماشا دەكرێ؟!

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین:

أ- جیاوازیی نێوان ئەگەری بوونی شتێك لەگەڵ بوونی دا زۆر زۆرە، جاری وا هەیە جیاوازییان هێندەی دووری نێوان ئاسمان و زەوی، بگرە بوون و نەبوون(الوجود والعدم)ە، چونكە خوای پەروەردگار لە قورئانیدا ئەگەر(لَوْ)ی بۆ شتی مەحاڵیش بەكارهێناوە، وەك فەرمویەتی: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾الأنبياء/٢٢. واتە: ئەگەر ئاسمانەكان و زەوی جگە لەخوا، پەرستراوانی دیكەیان تێدابان، تێك دەچوون.

ب- تەنها مەبەستی پێغەمبەری خواﷺ لێرەدا ئاگاداركردنەوەی ژنانە، لە گەورەیی هەق و مافی مێردەكانیان لەسەریان و هیچی دیكە، وەك چۆن لە چەندان فەرموودەش دا باسی هەق و مافی ژنانی كردوە بەسەر مێردەكانیانەوە، بۆ وێنە:

١) ((**خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي**))رواه ابن ماجه والحاكم.

واتە:(چاكترینتان باشترینتانە بۆ ماڵ و خێزانی و، منیش لە هەمووتان بۆ خێزانم چاكترم).

٢) ((أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا وَأَقْرَبُهُمْ مِنِّي مَجَالِسَ أَلْطَفُهُمْ بِأَهْلِهِ))رواه الترمذي والحاكم على شرط الشيخين.

واتە: (ئیمان کامڵترینتان و نشینگە نزیکترینتان(لەڕۆژی قیامەتدا) لە منەوە، نەرم و نیا نترینیانە لەگەڵ خێزانی دا).

کەواتە:

مەبەست لەو فەرموودەیەش-وەك ئەم سێیانەی کە ئێستا هێنامانەوە-تەنها بیرهێنانەوە و ئاگادارکردنەوەی ئافرەتانە لە مافەکانی مێردەکانیان، پێغەمبەری خواﷺ هەمیشە هەرکام لە ژنان و پیاوانی لە ئەرك و مافەکانی یەکدی ئاگادارکردۆتەوە، بە هەرشێوازێك کە بە کاریگەرتری زانیبێ لەسەر نەفسیەتی هەرکام لە دوو ڕەگەزەکە.

لێرەشدا کۆتایی بەم خاڵی یازدەیەمە دێنین و دەچینە سەر خاڵی دوازدەیەم و کۆتایی.

## ١٢- چەند بەناو فەرموودەیەکی هەڵبەستراو لەبارەی ئافرەتەوە:

بالەم خاڵی دوازدەیەم و کۆتایی یەشدا ئاماژەیەکی کورت بە چەند دەقێك بکەین کە بەناو فەرموودە(حدیث)ن، بەڵام لە ڕاستیدا وانین، هەرچەندە ڕەنگە بەسەر زاری گەلێك کەسەوە بن و لە زۆر کتێبانیش دا نووسرابن!

دیارە لە سۆنگەی بە فەرموودەزانینی ئەو دەقانەشەوە، هەم ژمارەیەك لە مسوڵمانان دووچاری هەندێك بۆچوون و هەڵسوکەوتی هەڵە و کرچ و کاڵ لەبارەی ئافرەتەوە بوونە، هەم ناحەزانی شەریعەتیش بیانوویەکی دیکەی تۆمەتبارکردنی ئایین و شەریعەتی خوای بەرز و مەزنیان کەوتۆتە دەست!

جا با سەرنج بدەین:
١) ((شاوروهُنَّ وخالِفُوهُنَّ)) واتە: ڕاوێژ بە ژنان بکەن و بەقسەشیان مەکەن!
٢) ((طاعة النساء ندامةٌ)) واتە: بەقسەکردنی ژنان پەشیمانیی لەدوایە!
٣) ((خالفوا النساء، فإنَّ في خلافهن البركة)) واتە: پێچەوانەی ڕای ژنان بجوولێنەوە، چونکە لە بەقسەنەکردنیان دا پیت و پێز هەیە!

ئەم سێ دەقە کە بەناوی فەرموودەی پێغەمبەرەوەﷺ لە هەندێك کتێبان دا هاتوون، هیچ کامیان لەڕووی زنجیرەی ڕاوییەکانیان(سند)ەوە فەرموودە نین، [1] نێوەڕۆکیشیان پێچەوانەی ئاڕاستەکانی قورئان و سوننەت و هەڵوێستی کردەیی پێغەمبەری خوایەﷺ، کە ڕاوێژی بە هاوسەرەکانی کردوە و بەقسەیشی کردوون، وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ لەکاتی صوڵحی حودەیبییەدا ڕاوێژی بە (أم سلمة)ی هاوسەری کرد و بەقسەیشی کرد.

هەروەها ئەو دەقانە پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقیشن، چونکە وەك گوتراوە: ((**الحِكْمَةُ ضَالَّةُ المُؤْمِنِ**) واتە: (زانیاری بەسوود بزربووی بڕوادارە) [2]، جا ئەو کەسەی کە ڕاوبۆچوونێکی باش و بەسوودی هەیە، چ نێر بێ چ مێ، پێویستە لێی وەربگیرێ، وەك لە (عبدالله بن عمر)-خوا لێیان ڕازی بێ- گێڕراوەتەوە، کە گوتوویەتی: ((**خُذِ الحِكْمَةَ وَلاَ يَضُرُّكَ مِنْ أيِّ وِعَاءٍ خَرَجَتْ**)). واتە: حیکمەت وەربگرەو زیانی نیە لە چ هەگبەیەکەوە

(١) بڕوانە (كشف الخفا ومزيل الالباس..) ج٢ ص٤، ٥، کە گوتویەتی: هیچ کامیان فەرموودە نین، یان لە هەندێك لە هاوەڵانەوە گێڕراونەتەوە بە سەنەدێکی بێهێز.
(٢) ئەمیش هەر قسە و حیکمەتێکی جوانە و مانایەکەی ڕاستە، ئەگەرنا فەرموودە بوونی ئیسپات نەبووە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو: ج١ ص٤٣٥، ٤٣٦.

دەرچووە.

٤) ((فُضِّلَتِ المرأة عَلَى الرّجُل بِتِسعَةٍ وَتِسعِينَ جُزءاً مِنَ اللَّذَّةِ)) واتە: ئافرەت نەوەدو نۆ هێندەی پیاو چێژی زیاتر (لە جووتبوون) وەردەگرێ!))

ئەمیش وێڕای پێچەوانەی عەقڵ و واقیع بوونی، پسپۆڕانی بواری فەرموودەناسییش بە هەڵبەستراویان داناوە.[1]

٥) ((مَثَلُ المَرأةِ الصَّالِحَةُ كَمَثَلِ الغُرابِ الأعْصَمِ بَينَ مَائَةِ غُرابٍ)) واتە: وێنەی ئافرەتی چاك لەنێو ئافرەتاندا، وەك قەلە بەڵەکەیەکی دەندووك و پێ سوورە لەنێو سەد قەلە بەڵەکەدا.

ئەمیش شارەزایانی فەرموودەناس بەبێهێز(ضعیف)[2]یان داناوە، وێڕای ئەوەش پێچەوانەی عەقڵ و واقیعیشە.

جا بێگومان دەقی دیکەی لەم جۆرە زۆرن، بەڵام شتێکی ئاشکرایە، کە هەردەقێك بە ناوی پێغەمبەری خواوەﷺ هاتبێ، هەتا لە تاقیکردنەوە و مەحەکی زانا و پسپۆڕانی فەرمایشتناس دەرنەچێ، دروست نیە کە لەسەر ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامﷺ حیساب بکرێت.

خوێنەری بەڕێز!

لێرەدا کۆتایی بەم خاڵی دوازدەیەمە دێنین، بەکۆتایی هاتنی ئەم خاڵەش دەگەینە کۆتایی ئەم بەشی سێیەمەی، کە تەرخانمان کردبوو بۆ ڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتەکانی نەیارانی شەریعەت، وە پێم وایە لە سەداسەد ئامانجەکانی ئەم

(١) بڕوانە: (شرح المناوي على الجامع الصغير) ج٥ ص٤٤٠، وە (ميزان الإعتدال) للذهبي، ج٢ ص١٧، و (المرأة...) للدكتور البوطي، ص٢٠٩.

(٢) بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الألباس..) للعجلوني، ج٢ ص٤٠٦.

بەشەشمان پێکاون و تـەم و مـژی تۆمەتـەکانمان زۆر بـاش بەتیشـکی خـۆری بەڵگـە شەرعیی و عـەقڵییەکان ڕامالیوەو، ئێمە و ناحەزانی شەریعەتی بێ هەڵـە و پەڵـەی خوا بووینەتە (مصداق)ی ئەم ئایەتە بەرز و پیرۆزە:

﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾.(الاسـراء:٨١)

واتە: بڵێ: هەق هات و ناهەق پووچایەوە، بێگومان باتیل پووچەڵ و بۆشە.

**خوێنەری بەڕێزو سەنگین!**

لەم بەشی چوارەمەدا، خوا پشتیوان بێ، ئەم هەشت خاڵە دەتوێژینەوە:

١-گرنگیی بنیاتنانی خێزان (أهمية تكوين الأسرة).

٢-پێناسەی هاوسەرێتیی (تعريف الزواج).

٣-حوكمی هاوسەرێتیی (حكم الزواج).

٤-خوازبێنی (الخطبة) و حوكمو ئەدەبو حیكمەتەكانی.

٥-پایەكانی مارەكردن (أركان النكاح).

٦=سەرپەرشتیی كردن (ولاية)ی بەشوودانی ئافرەت.

٧-شایەتییدان (الإشهاد) لەسەر بەشوودانو مارەبڕینی ئافرەت.

٨-هاكوفێتیی (الكفاءة)ی نێوان ژنو مێرد.

دیارە بەپێی تواناش هەوڵ دەدەین كەئەم باسو بابەتانە بەكورتییو پوختیی بتوێژینەوەو، هەر مەسەلەیەكیشمان پێشتر توێژیبێتەوە، لێرەدا دووبارەی ناكەینەوەو تەنها ئاماژەیەكی پێدەكەین.

## ١-گرنگیی بنیاتنانی خێزان (أهمية تكوين الأسرة):

جووتیەتیی (الزوجیة) ، بنچینەیەکی گشتی یە لەتێکڕای دروستکراوەکانی خوادا[١] هەر لەگەردیلەو[٢] ئەمیباوە[٣] بگرە، هەتا هەموو جۆرەکانی ڕووەك و زیندەوەرو ژیانلەبەران، بەبێ هەڵاواردن (بدون إستثناء)، خوای بەدیهێنەریش لەچەند شوێنێکی قورئان دا ئاماژەی بەو ڕاستی یە کردوە، بۆ وێنە: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ (يس:٣٦)

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ (الذريات:٤٩)

ئنجا شتێکی ڕوونو ئاشکرایە کەجووتبوون(التزاوج) ی نێرو مێ لەجیهانی ڕووەك و ژیانلەبەرانو مرۆڤیش دا، تاکە ڕێی زۆربوونو بەردەوامبوونی وەچە(نسل)یانە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ﴾(النساء: من الآية١).

واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن کەلەیەك تاکە نەفس دروستی کردوون، وە هاوسەرەکەیشی هەر لەخۆی دروست کردوە، لەو دوانەش

---

(١) دیارە بێجگە لەدروستکراوە ناماددییەکانی وەك فریشتەکان.

(٢) گەردیلە: ذرة.

(٣) ئەمیبا: ژیانداریێکی یەك خانەیی یە.

پیاوان‌و ژنانی زۆری بڵاوکردوونەتەوە.

جا شەریعەتی دانای خـوای کاربـەجێ‌و زانـاش، فـەرمانی بەمسـوڵمانان کـردوە کەخێزان پێکەوە بنێن‌و پیاوانی زگورتیی ژندارو ئافرەتانی بـێ‌مێردیش هاوسـەردار بکەن، وەك خوا فەرموویەتی:﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ [1] مِنكُمْ ﴾ (النور: من الآية٣٢).

دەشتوانین لـەم چـەند برگـەیـەدا ئامـاژە بـەگرنگیی‌و بایـەخی بنیاتنـانی خێـزان بکەین:

**یـەك**: بێگومـان هەرکام لەپیاوو ئافرەت بەپێی ئەو سروشـتەی کـەخوا لەسـەری خوڵقاندوون، غەریزەی جینسیی‌و مەیل‌و ئـارەزووی بەرانبـەریان هەیـە، جـا خـوای پـەروەردگار رێ‌و رەسمـی خێـزان پێکـەوەنانی لەشـەریعەت دا دیـاری کردوە، تاکو ئینسان لەو رێیەوەو بەشێوەیەك کەشایستەی ئـادەمیزاد بێـت ئەو غەریزەیەی خۆی تێر بکات.

**دوو**: هەرکام لەپیاوو ژن خوای کاربەجێ وا سروشتیانی هەڵخستوە، کەبـەهۆی یەکدییـەوە هەسـت بـەئارامیی‌و ئۆخـژن‌و ئاسـوودەیی دەکـەن، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا ﴾ (الروم: من الآية٢١)

**سـێ**: بەهۆی بنیاتنانی خێزانەوە – وەك شەریعەت دایـنـاوە – هـەرکام لـەژن‌و مێرد تایبـەت دەبـن بەیەکدییـەوەو بەرهەڵدایيـەك کەلـەنێو ئـاژەڵ دا هەیـە دروست نابێ، وەچە (نسل)ی خەڵکیش تێکەڵ‌و پێکەڵ نابێ!!

**چـوار**: لەسێبەرو باوەشی خێزانێکی شەرعییدا منداڵانێکی حەڵاڵ‌و پاك پەیـدا

---

(١) الأيامى: جمع أيم، بريتى يە لەئافرەتى بێ‌مێرد يان پياوى بێ ژن، بروانە: (مفردات ألفاظ القران) للراغب، ص١٠٠.

دەبـن‌و، لەباوەشـی بـاب‌و دایکێکـی شـەرعیی‌و ناسـراوو دیـاردا پـەروەردە دەبـن‌و پێـدەگرن! دیـارە کۆرپـە گـەلێکیش ،کـە بەشـیری حـەڵاڵ‌و لەکۆشـی دایکێکـی بەحـەیاو شـەرم دا فرچـك دەدرێـن‌و بـەخێودەکرێن‌و، منـداڵانێك کەبەدڵنیاییی یەوە دەزانن کوڕو کچی کێن‌و بـەکێ‌وکێ بڵـێن: بابـەو دایـە، لەگەڵ کۆرپـە گەل‌و منداڵانێك کەبەزۆڵیی پەیـدا دەبـن‌و ... هتـد، هێنـدەی ئاسمان‌و ڕێسمان لەیەك جیان!

**پێنج**: هەروەها لەسۆنگەی بنیاتنانی خێزانەوە، ئوممەت لەگەشـەو زیـاکردن دا دەبێت‌و وەچە لـەدوای وەچـە وەك شـەپۆلە یـەك لـەدوای یەکـەکانی دەریـا، سەرزەمینی ئیسلام ئاوەدان و قەرەباڵغ دەکەن! هەربۆیەش پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویەتی:

((**تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ إِنِّي مُكَاثِرٌ الأَنْبِيَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**))رواه احمد عـن أنس وصححه ابن حبان.

واتە (ژنی وا بێنن مێردی خۆی خۆشبوێ‌و منداڵی زۆر بێن، چونکە لـەڕۆژی قیامەتێ لەگەڵ پێغەمبەران دا پێشبڕکە دەکەم لەزۆریی ئوممەتم دا).

**شەش**: لەڕاستی دا هەرکام لەئافرەت‌و پیـاو بـەبێ پێکـەوەنانی خێـزان، هـیچ کامیـان وەك پێویسـت کامـڵ نـابن‌و، نـەپیاو پیـاوەتیی(رجولـة) نـەئافرەت ژنایـەتیی(أنوثـة) کامـڵ دەبێـت، بەتایبـەت پـاش زاووزێ کردنیـان‌و، پەیدابوونی منداڵ‌و بوونیان بەباب‌و دایك، پـەی بەگـەلێك لایـەنی پـەنهانی ژیان‌و گوزەران دەبەن.

**حـەوت**: هـەروەها خێزانـی شـەرعیی(الأسـرة الشـرعية) خشـتی یەکـەمی دروسـتبوونی کۆمەڵگایـەکی سـاغ‌و سـەلیم‌و تۆکمەیـەو، پـێش بنیاتنـانی کۆمـەڵێك خێـزان‌و بنەماڵـەی سـاغ‌و سـەلیم،کۆمەڵگایەکی سـاغ و تـەواو

لەخەیاڵ پڵاو بەولاوە چی دیکە نیە!

**هەشت**: بەهۆی بنیاتنـانی خێزانـە شـەرعییەکانەوە، چـەندان بنەماڵـەو تـیرەو عەشیرەت پێکەوەگرێ دەدرێنو دەهۆنرێنەوە، هەربۆیـەش خـوای کاربـەجێ، وەك چۆن باسی خزمایەتی پشت(نسب)ی کردوە، باسی هی بەرێشی کـردوەو فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ ﴾ (الفرقان:٥٤).

واتـە: وە (خـوا) ئـەو کەسـەیە کەلـەئاوێ ئینسـانی وەدیهێنـاوە، پاشـان وەچەکەی لەرێی پشتێو بەرێوە بڵاوکردۆتەوە، وە پەروەردگارت بەتوانایە.

**نــــۆ**: هەروەها ژن هێنانو شووکردنو پێکەوەنانی خێزان، گەورەترین نازو نیعمەتی ماددییو جەستەیی بەهەشت، کەلایەنی جینسی یەو ژیانی هاوسەرێتیی پڕ کەیفو شادییو بێ دەردەسەرییە، بیر ئینسان دەهێنێتەوە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾ (آل عمران:١٤-١٥)

واتە: خۆشویستنی ئارەزووەکان بۆ خـەڵکی ڕازێنراوەتـەوە، لەژنانو...هتـد، بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەچاکتر لەوە؟! بۆ ئەوانەی پارێز لەپەروەردگاریان دەکەن، باغاتێ هەن کە ڕووباریان بـەژێردا دەڕۆن بەهەمیشـەیی تێیـان دان،

وە هاوسەرانێکی پاکیزە، وە ڕەزامەندیی یەك لەخواوە، وەخوا بینەری بەندەکا نیەتی[1].

دیارە دەگونجێ گرنگیی و بایەخی بنیاتنانی خێزان، زۆر زیاتری لەسەر بنووسرێ، بەڵام ئەم بڕگانەی نووسیمانن، خاڵە سەرەکیی و هێڵە گشتی یەکانیی و هیچی دیکە.

## ٢- پێناسەی هاوسەرێتیی (تعريف الزواج):

لەقورئانێدا - هەروەها لەسوننەتیشدا - دوو وشە بۆ هاوسەرێتیی و ژن و مێردایەتیی بەکارهێنراون، کەبریتین لە (زواج) و (نكاح)، جا با سەرەتا سەرنجێکی چەمك و واتای ئەو دوو وشەیە لەئەسڵی زمان دا بدەین و، پاشانیش پێناسەی هاوسەرێتیی بکەین لەڕوانگەی شەرعەوە:

یەکەم: (راغب الأصفهاني) لەبارەی وشەی (زواج)ەوە گوتوویەتی:[2] (يقال لكل واحد من القرينين من الذكر والأنثى في الحيوانات المتزاوجة: زوج، ولكل قرينين منها وفي غيرها زوج، كالخف والنعل، ولكل مايقترن بآخر مماثلاً له أو مضاداً، زوج..)

کەواتە: وشەی (زوج) یانی جووت، جا چ نێرو مێ بن، چ هاوکوف و وەك یەك بن وەك جووتە نەعل، وەچ دژو پێچەوانە بن وەك: بەرزو نزم، تاریك و ڕووناك، ساردو گەرم..

---

(١) بۆ زۆربەی بڕگەکانی ئەم خاڵە سوودم لە: (المفصل...) ج٦ص١١، ١٢، وە (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) د. عمر سليمان الأشقر، ص١٧ تا ١٩ وەرگرتوە، وێڕای دەستکاریی خۆم.

(٢) (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٣٨٤، ٣٨٥.

هەروەها شارەزایانی زمان گوتوویانە: [(١)] کەبەهەرکام لەژن و مێرد دەگوترێ (زوج) هەندێك جاریش بەژن دەگوترێ (زوجة) کەکۆیەکەی (زوجات)ە، بەڵام وشەی (زوج)، کەکۆیەکەی (أزواج)ە ڕەوانترە، هەر بۆیەش لەقورئانیدا بۆ ژن هەر وشەی (زوج) بەکارهاتوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ﴾ (البقرة: من الآية٣٥).

بەڵام بێگومان بەکارهێنانی وشەی (زوجة)ش بۆ ئافرەت لەزمانی عارەبییدا، هیچ ئیشکالێکی نیە، چونکە لەشیعری سەردەمی نەفامییدا هاتوە، بۆ وێنە: [(٢)]

فبكا بناتي شجوهن و زوجتي والأقربون ثم الي تصدعوا

دووەم: لەبارەی وشەی (نكاح)یشەوە (راغب الاصفهانی) گوتوویەتی: [(٣)] (أصل النكاح للعقد ثم استعير للجماع، ومحال أن يكون في الأصل للجماع ثم استعير للعقد، لأن أسماء الجماع كلها كنايات لاستقباحهم ذكره، كاستقباح تعاطيه ومحال أن يستعير من لا يقصد فحشاً اسم ما يستفظعونه لما يستحسنونه..)

واتە: وشەی (نكاح) [(٤)] لەئەسڵدا بۆ مارەکردن بووەو دوایی بۆ جووتبوون خوازراوەتەوە، وەمەحاڵە کە لەئەسڵدا بۆ جیماع بووبێ و پاشان بۆ مارەکردن خوازرابێتەوە، چونکە سەرجەم ناوەکانی جووتبوون کینایەن، لەسۆنگەی ئەوەوە کەوەك چۆن بەناشیرینیان زانیوە بەئاشکرا جیماع بکەن، بەناقۆڵاشیان زانیوە کەباسی بکەن، ئنجا مەحاڵیشە کەسێك کەحەز ناکات تەعبیرو وشەی ناجۆر

---

(١) (المصباح المنير) للفيومي، ص ٢٨٥، وە (لسان العرب) ج٢ص٦١.

(٢) (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٣٨٥.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، ص ٨٢٣.

(٤) هەندێك: لەزانایانیش گوتوویانە: (النكاح: لغة هو الضم والجمع.. ومنه تناكحت الأشجار اذا تمايلت وانضمّ بعضها الى بعض) بڕوانە: (المجموع) ج١٧ ص ٢٧٦.

بەکاربێنێ، وشەیەك کەخەڵکی بەناقۆڵای دەزانن، بۆ مەبەستێکی بخوازێتەوە کە بەپەسەندی دەزانن (کە مارەکردنە)!

جا هەرچەندە زانایان لەبارەی ماناو مەبەستی ئەسڵی وشەی (نکاح)ەوە ڕاجیایی(اختلاف)یان هەیە و، هەندێکیان دەڵێن: لەئەسڵدا بۆ جووتبوونەو پاشان بۆ مارەکردن(عقد) خوازراوەتەوە، هەندێکیشیان پێیان وایە کەلەئەسڵدا هەم جووتبوون(جماع) و هەم مارەکردنیش دەگرێتەوە، بەڵام بەڕاستی قسەکەی (راغب) زۆر ڕاستو بەهێزەو، هەق هەرئەوەیە، کە وشەی ناوبراو لەئەسڵدا بۆ مارەکردنەو، پاشان بۆ سەرجێی(جماع)یش خوازراوەتەوەو بەکارهێنراوەو ، بەڵگەکەی (راغب)یش ئەگەر بەوردیی سەرنج بدرێ، دەرفەتی قسان بۆ هیچ ڕایەکی دیکە ناهێڵێتەوە!

دیارە بەسەرنجدانی سەرجەم ئەو ئایەتانەش کەوشەی ناوبراویان تێدا بەکارهێنراوە، ئەو مەبەستەی گوترا، یەکجار ڕوون بێ چەندو چوون دەبێ، بۆ وێنە: ﴿وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ﴾ (النور: من الآية٣٢)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَا﴾(الأحزاب: من الآية٤٩).

﴿فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ﴾ (النساء: من الآية٢٥)

شایەنی باسیشە کەبێجگە لە (راغب الأصفهاني) کەبەڕاستی زەبر دەست ترینو چاکترین توێژەرەوەو شیکەرەوەی ماناو مەبەستی وشەکانی قورئانە، زۆر لەزانایانی دیکەش وەك (الزمخشري)[1] و (الأزهري) و (الجوهري)و (ابن سیده)[2] هەمان ڕایان

(١) بڕوانە: (المجموع) للنووي، ج١٧ (کتاب النکاح) ص ٢٧٦، ٢٧٧.
(٢) وەك (إبن منظور) خاوەنی (السان العرب) ج٣ص٧١٤،هێناویەتی.



هەیە.

**هەرچەندە هەندێك لەزانایان گوتوویانە:**

وشەی (نکاح) لەتێکرای ئایەتەکانی قورئانێدا هەر بەمانای مارەکردن (عقد)ە، بێجگــە لــە ئایــەتی: ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ ﴾ (البقرة:٢٣٠)، بەڵام (الشربيني) جوان وەڵامی ئەوەی داوەتەوە کەگوتوویەتی:[1] مەبەست لەوشەی ناوبراو لەوێشدا هەر مارەکردنەو بەهۆی فەرموودەی: ((**حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ**))وە، کە (بخاري مسلم) گێراویانەتەوە، دەزانین کەسەرجێی(وطء) مەرجە بۆ حەڵاڵبوونەوەی ژنی تەڵاقدراوی شووکەرەوە، بۆ مێردی پێشووی.

لەزاراوی شەرعزانانیش وشەی (زواجو نكاح) بەچەند شێوەیەك پێناسە کراون کەلەنێوەڕۆکدا هەریەکن[2]، ئەم پێناسەیەش لەهەموویان کۆکەرەوەترو ڕێکترە:[3] (الزواج عقد يفيد شرعاً حِلُّ استمتاع كل من الزوجين بالآخر على الوجه المشروع). واتە: هاوسەرێتیی پەیمانێکە کەلەڕووی شەرعییەوە لەززەت لێوەرگرتنی هەرکام لەژنو مێرد لەیەکدی بەشێوەیەکی ڕەوا، حەڵاڵ دەکات.

دیارە وشەی (نکاح)یش هەر هەمان واتاو مەبەستی وشەی (زواج)ی هەیەو، وەك دوو وشەی هاو واتا (مترادف) وان لەزاراوی شەرعدا، هەرچەندە لەڕووی زمانەوانییەوە مانایان تاڕادەیەك جیاوازە.

---

(١) (مغني المحتاج شرح المنهاج) ج٣ص١٢٣.

(٢) بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٦ص ١٠١، وە: (الدر المختار) ج٣ص٤٣، وە: (نهاية المحتاج للرمكي ج٦ص١٧٣، وە: (عقد الزواج وآثاره) محمد أبوزهرة، ص ٣٧، وە (شرح الأزهار) ج٢ص١٩٦.

(٣) بڕوانە: (المفصل...) ج٦ص١١.

## ٣-حوكمی هاوسەرێتیی (حكم الزواج):

زاناو پێشەوایانی ئەهلی ئیسلام پاش ئەوەی لەسەر ئەوە یەكدەنگ بوونە كە هاوسەرگرتن بۆ پیاوو ژن ،لەئەسڵدا شتێكی دروست (جائز) و ڕەوا (مباح)یە، [١] لەسەر ئەوە كەئایا تەنها موباحە یان سوننەتە یان فەرزِ؟ ڕاجیاییان هەیەو، هەیانە بۆ وێنە: (ابن حزم الظاهري)[٢] و (داود الظاهري)[٣] ڕای وایە كەبۆ پیاوان مادام توانای جەستەیی و دارایییان هەبێ، فەرزە، هەندێكیشیان[٤] هەر بەپەسەند (مستحب)ی دەزانن، هەیشیانە[٥] كەڕای وایە مادام كابرا لەخۆی نەترسێ تووشی گوناحو زینا ببێ، چاكتر وایە واز لەژنهێنان بهێنێو، سەرگەرمی تاعەت یان زانست بێت!

بەڵام بەسەرنجدانی ئایەتەكانی قورئانو فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا، دەردەكەوێ كەڕای بەپەسندو سوننەت زانینی هاوسەرگرتن بۆ هەركام لەپیاوانو ئافرەتان، لەهەموو ڕایەكانی دیكە ڕاستترو چاكترە، بگرە هەرئەوە ڕاستو بەجێیەو زۆربەی جەماوەری زانایانیش لەسەری كۆكن[٦]، بەڵام بێگومان ئەوە لەحاڵەتی ئاساییدا، ئەگەرنا لەحاڵەتە نائاسییەكاندا، حوكمی هاوسەرگرتن دەگۆڕێو، ئەمیش وەك گەلێك مەسەلەی دیكە پێنج حوكمە شەرعییەكانی بەسەردا

---

(١) بڕوانە: (المجموع) للنووي، ج١٧ص ٢٧٨، وە: (المغني) لابن قدامة، ج٧ص٣٣٤، وە: (المفصل...) ج٦ص١٤.

(٢) بڕوانە: (المحلّى) ج١١ص٥. مسألة: ١٨١٩.

(٣) بڕوانە: (المجوع) ج١٧ص٢٨٥.

(٤) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

(٥) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٢٨٦.

(٦) بڕوانە: (المفصل...) ج٦ص٣١.

دەچەسپێن، واتە کەلەئەسڵدا پەسەندو سوننەت (مستحب ومندوب)ە، جاری واش هەیە فەرز دەبێت، بۆ وێنە: ئەگەر ئەو کەسە (پیاو بێ یان ئافرەت) دڵنیابێ یان گومانی زاڵ (الظن الراجح)ی وابێ، کەبەبێ هاوسەرگرتن گیرۆدەی گوناح دەبێ، چونکە فەرزە ئینسان گوناح نەکات‌وهەر شتێك فەرزێکیش پەکی لەسەری بکەوێ، فەرزە (مالایتم الواجب الا به فهو واجب).[1]

جاری واش هەیە کە بۆی بە ناپەسەند(مکروه) دادەنرێ، بۆ وێنە: ئەگەر گومانی وابوو کەهەق‌و مافەکانی جەستەیی‌و ماددیی[2] ژنەکەی یان مێردەکەی بۆ جێبەجێ ناکرێن![3]

ئەگەر دڵنیاش بوو کەهاوسەرەکەی ڕەنجەڕۆو دەسخەڕۆ دەکات‌و، ناتوانێ مافەکانی ژن‌و مێردایەتیی لەگەڵ ئەنجام بدات، ئەوە لێی حەرام دەبێت.[4]

لەهەندێك حاڵەتانیشدا بەمویاح دادەنرێ، وەك ئەوەی کابرا ژنێکی هەبێ‌و بەبێ عوزرێکی شەرعیی، کەبۆی بکاتە فەرز یان سوننەت، بەبێ پەرچ (مانع)ێکی واش کەلێی حەرام یان ناپەسەند بکات، بیەوێ ژنی دیکە بێنێ، چونکە ئاشکرایە کەڕەوا (مباح) هەر شتێکە کەهیچ کام لەچوار حوکمە شەرعییەکان: (الوجوب والندب والحرمة والكراهة) پێیەوە پەیوەست نەبن.[5]

---

(١) بڕوانە: (الوجيز في أصول الفقه) د. عبدالكريم زيدان، ص ٢٩٩، ٣٠٠.

(٢) مەبەستم لە (جەستەیی) لایەنی (جینسییە) و، (ماددیی) یش بۆ پیاو لەبەرانبەر ئافرەتدا مەسرەف کێشان‌و لایەنی دارایی یەو، بۆ ژنیش لەبەرانبەر پیاودا، ئەو کارو خزمەتانەن کەشەریعەت لەسەری پێویست دەکات، کەلەبەشی پێنجەمدا باسیان دەکەین.

(٣) دیارە وەك لەپەراوێزی دوای ئەمدا باسی دەکەین، ئەگەر دڵنیابێ لەجێبەجێنەکردنیان، هاوسەرگرتنەکەی حەرام دەبێ، مەگەر تەرەفی بەرانبەر ئاگادارو ڕازی بێت!

(٤) بەپێی بنچینەی (لاضرر ولاضرار) بڕوانە: (كشف الخفا..) ج٢ص٤٩١.

(٥) بڕوانە: (الوجيز...) ص٤٧، (المطلب الخاص: المباح)، کەگوتوویەتی: (المباح: هو ماخيَّر الشارعُ المكلَّفَ بين فعله وتركه ،سولامدح ولاذم على الفعل والترك) .

ئێستاش باسەرنجی ژمارەیەك لەئایەتەكانی قورئانو فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا بدەین:

أ- ﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ﴾(النساء: من الآية٣)

ب- (﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ﴾ النور: من الآية٣٢)

ج- ((**يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ من اسْتَطَاعَ مِنْكُم الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعليه بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ**)).متفق عليه

واتە: (ئەی كۆمەڵی گەنجەكان هەركامێكتان توانای ژنهێنانی هەبوو، باژن بێنێ، چونكە ئەوە بۆ لێگرتنەوەی چاوی‌و پاراستنی داوێنی چاكترە، كەسێكیش نەیتوانی بارۆژوو بگرێ، چونكە-وەك خەساندن- ئارەزووی ناهێڵێ).

جا هەرچەندە فەرمایشتەكە ڕووی لەكورانە، بەڵام وەك پێشتریش چەند جارێك باسمان كردوە، لەهەموو دواندنەكان(خطابات)ی شەرعدا، مەگەر بەبەڵگەو نیشانەی ڕوون تایبەت كرابن بەرەگەزێكیانەوە، ئەگەر نا هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ وەك یەك بەشدارن.

د- ((**الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِهَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ**..))رواه مسلم والنسائي عن عبدالله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما.

واتە: (ژیانی دنیا ڕابواردنێكی زوو تێپەڕو كاتییە، چاكترین نیعمەتیش تێیدا-بۆ پیاو- ژنێكی چاكە).

دیارە بەهەمان شێوەش چاكترین نیعمەتی دنیاش بۆ ژن، مێردی باشە، چونكە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ (البقرة: من الآية١٨٧)

ە- ((أَمَا إِنِّي أَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي))متفق عليه. واتە: (ئاگاداربن! بێگومان من لەهەموانتان لەخوا ترسترو پارێزکارترم، بەلاَم بەڕۆژوو دەبم (مەبەست ڕۆژووی سوننەتە) و بەڕۆژووش نابم، شەونوێژیش دەکەمو دەشخەوم، ژنانیش دێنم، جاهەرکەسێك لەڕێبازی من لابدات، ئەوە لەمن نیە).

## ٤- خوازبێنیی (الخِطبة) و حوکمو ئەدەبو حیکمەتەکانی: [(١)]

وشەی (خِطبة) وەك شارەزایانی زمانو شەرعزانان (الفقهاء)یش گوتوویانە: بریتیە لە: (طلب الرجل امرأة للزواج)[(٢)] یان (إلتماس نكاح المرأة)[(٣)] یان (إلتماس الخاطب النكاح من جهة المخطوبة)[(٤)] کە بەکوردی (خوازبێنی) پێدەگوترێ، عارەب دەڵێن: (خطب الرجل فلانة خِطْباً وخِطْبةً، أي طلبها للزواج، فهو خاطِب والخِطْبُ الذي يخطب المرأة وهي المخطوبة).[(٥)]

کەواتە: (خِطبة) یانی داواکردنو خواستنی ئافرەت لەسەرپەرشتیارو کەسوکاری.

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لە (المفصل..) ج٦ص ٥٨ تا ٧٣ وە (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) ص ٥٠ تا ٧٨، وەرگرتوە.
(٢) (المفصل..) ج٦ص٥٨.
(٣) سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگو لاپەڕە.
(٤) (مغني المحتاج) للشربيني، ج٣ص١٢٨.
(٥) (المفصل..) ج٦ص٥٨.

حوكمی خوازبێنیی(خِطبة)یش زانایان هەندێكیان گوتوویانە: [1] تەنها ڕەوا(مباح)یە، بەڵام هەندێكی دیكەیان بەشتێكی پەسەندو سوننەتیشیان داناوەو، واش پێدەچێ ڕای پەسەندو سوننەت بوونی ڕاستو تەواو بێ، چونكە بەسەرنجدانی حیكمەتی خوازبێنیی هەر ئەوە دێتە بەرچاو.

حیكمەتی خوازبێنیی كردنیش زۆر ئاشكرایە، چونكە:

١- هەل و دەرفەتێكی باشە بۆ ئافرەتەكەو كەسوكاریشی كەلەوماوەیەی خوازبێنیی‌و پێش مارەكردن دا، زۆرباش لەكەسایەتیی‌و پەرێزو دین‌و ڕەوشتی بابای خوازبێنیكەر(خاطِب) بكۆڵنەوەو پاشان لەبەر ڕۆشنایی‌و شارەزایی دا هەنگاوەكانی دیكەیان بنێن.

٢- هەروەها كردنی خوازبێنیی بەپێشەكی‌و ڕێخۆشكردنی مارەكردن، هەم گرنگیی‌و بایەخی ئەو مەسەلەیە دەگەیەنێ‌و، هەم كەسوكاری ئافرەتەكەش دەتوانن بیروڕای خۆیانی لەبارەوە دەربڕن‌و، بەڕاو ڕەزامەندیی هەموو لایەك پێك بێت.

٣- دیسان بابای خوازبێنیكەریش دەرفەتێكی باشی بۆ دەڕەخسێ كەلەمیانەی خواستن‌و داواكردنەكەدا، زیاترو چاكتر بەرچاوی لەبارەی ئەو ئافرەتەوە ڕۆشن بێتەوە، كەبەتەمایە بیكاتە هاوسەری ژیانی.

ئێستاش كەبەكورتیی پێناسەو حوكم‌و حیكمەتەكانی خوازبێنییمان زانین، بالەچەند كورتە بڕگەیەكیش دا تیشك بخەینە سەر هەندێك لەئەدەبەكانیشی:

---

(١) بڕوانە: (المفصل...) ج٦ص٥٨.

## یەك: بەرلەداخوازیی ، پشكنین و هەڵبژاردن:

یەكـەمین و گـرنگترین ئـەدەبی خـوازبێنیی ئەوەیـە كەلەسـەر بناغـەی ناسـین و ئاشنایی و شارەزایی بێـت و، كـابرا پێویسـتە بەرلـەوەی عـەزمی لەسـەر خواسـتنی ئافرەتێك جەزم بكات، جوان جـوان لێكۆڵینـەوەی شـەرعیبیانەو مـاقووڵی لـەبارەوە بكات[1]، پاشان كەتێیدا گەیشتە قەناعـەت ئـەوجار لێـی بچـێتە پـێش، هـەروەها ئـافرەتیش و كەسوكاریشـی پێویسـتە پـاش هاتنەپێشـی كـابرا ، هـەتا چـاك چـاك شارەزای نەبن و نەیناسن، (بەڵێ)یان (نەء)ی بۆ نەڵێن.

ئەنجا با لەبەر ڕۆشنایی چەند فەرمایشتێكی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ ژمارەیـەك لەو بنەما گرنگانە كەپێویستە هاوسەریان لەسەر هەڵبژێرێ، بخەینەڕوو:

أ- ((**تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ**))متفق عليـه. واتە: (ئافرەت لەبەر چـوار شـتان دەهێنرێـت: بـۆ سامانەكەی، بۆ خانەدانییەكەی، بۆ جوانییەكەی، بـۆ دینداریيەكـەی، دەجـا هەوڵی دیندارەكە بدە، دەستت بەخۆڵ بێت) (واتە: یـاخوا نـەدار بـی ئەگـەر وانەكەی).

ب- ((**عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: تَزَوَّجْتُ، فَقَـالَ لِـي رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: مَـا تَزَوَّجْـتَ؟ فَقُلْتُ: تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا، فَقَالَ: فَهَلَّا جَارِيَةً تُلَاعِبُهَـا وَتُلَاعِبُـكَ**))رواه البخـاري ومسلم.

---

(١) پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ وَانْكِحُوا الْأَكْفَاءَ وَأَنْكِحُوا إِلَيْهِمْ) رواه ابن ماجە، واتە: ئافرەتانی باش بۆ كۆرپەكانتان هەڵبژێرن و، هاوسەرانی هاوكووف بهێنن و، ژنیش بەخەڵكی هاوكووف بدەن.

وەك دەبینین پێغەمبەر ﷺ هانی (جابر)ی داوە كە دەبوایە كچێكی هێنابایە، چونكە مەبەست لە وشەی(جارية) وەك لەڕیوایەتی دیكەی ئەم فەرموودەیەدا هاتوە، كچ (بكر)ە.

ج- ((**تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُم الْأُمَمَ**))رواه أبوداود. واتە: (ئافرەتی مێرد دۆستی زاووزێكەر بێنن، چونكە من شانازیی بەزۆریتانەوە دەكەم بەسەر ئۆممەتانی دیكەدا).

دیارە ئافرەتی كچ بەهۆی ئافرەتانی خزمییەوە، لەلایەنی زاووزێی شارەزا دەبین، بەهۆی پشكنینو لێكۆڵینەوەو پرسیاركردنیشەوە، لەڕەوشتو خووی مێرد دۆستیی حاڵی دەبین.

كەواتە: سەرجەم حەوت بنەمامان لەم فەرمایشتە پیرۆزانەدا دەستگیردەبن، لەبواری هەڵبژاردنی ئافرەتی باشەوە:

١-سامانداریی (لمالها).
٢-خانەدانیی (لحسبها).
٣-جوانیی (لجمالها).
٤-دینداریی (لدینها).
٥-كچایەتیی (بكراً).[1]
٦-مێرد دۆستیی (الودود).
٧-زاووزێكردن (الولود).

بەڵام ئەوەی كە لەهەموویان گرنگترەو پێویستە زیاتر جێی سەرنج بێت، بریتیە

(١) دیارە لەچەند حاڵەتێكیشدا بێوەژن چاكترە، وەك ئەوەی كە بێوەژنەكە خزم بێتو بێ سەرپەرشت بێت، یان لەكچەكە بەدین تر بێت، یان پیاوەكە منداڵی وردی هەبن.. هتد، بڕوانە: (المفصل..) ج٦ص٤٨، ٤٩.

لەدینداریی و مسوڵمانەتیی و ڕوولەخوایی.

گرنگترین بنەمای شەرعییش بۆ هەڵبژاردنی ئافرەت بۆ هاوسەریی بریتین لە:

١-دینداریی.

٢-ڕەوشت بەرزیی.

چـونکە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((**إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ**))رواه الترمـذي وهو صحيح.

دیارە ئەمـەش ئەوە ناگەیەنێ کەئافرەتیش بۆی نەبێ، ئەو خەسڵەتو مـەرجانەی کەپیاو تێیدا ڕەچاویان دەکـات، وەك سـامانداریی و جـوانیی و خانـەدانیی و.. هتـد ئـەویش ڕەچـاویان بکـات! بـا ،بـۆی هەیـە، بـەڵام دینـداریی و ڕەوشــت جـوانیی، لەسەرووی هەموو شـتێکەوەن، لـەژیانی ژن و مێردایـەتیی،دا، بۆیـە پێویسـتە بـەر لەهەر شتێکی دیکە لەبەرچاویان بگرێ.

## دوو: یەکدی دیتن و پێك ئاشنابوون:

یەکی دیکە لەئەدەبەکانی خوازبێنیی، ئەوەیە کەئەو ئـافرەت و پیـاوەی نیازیـان هەیە ببنـە هاوسـەری یەکـدی، بەیەکـدی ئاشـنابن و یەکـدی ببیـنن، لەوبارەشـەوە فەرمـوودە زۆرن، بۆ وێنە:

((**عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ أَنَّهُ خَطَبَ امْرَأَةً فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: انْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا**))رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

واتە: (تەماشای بکە، چونکە ئەوە چاکترە بۆ بەردەوامبوونی خۆشەویستیتان).

هەروەها (أبوداود)یش فەرموودەیەکی بەهەمان مەبەستی لە (جابر بن عبدالله) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاوەتەوە.

(بخاري)یش لە (سهل بن سعد)ەوە گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئەو ئافرەتەکەی، کە خۆی پێشکەشی کردو گوتی: ((**يَا رَسُولَ اللَّهِ! جِئْتُ لأَهَبَ لَكَ نَفْسِي**))، تەماشای کردو لێی وردبۆوە ((**فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ**)).

زانایانی ئیسلامیش لەسەر سوننەت بوون یان لانی کەم ڕەوابوونی ئەو تەماشاکردنە، یەکدەنگن و (ابن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: [1] (لانعلم بين أهل العلم خلافاً في إباحة النظر الى المرأة لمن أراد نكاحها).

بەڵام زانایان لەسەر ئەوەش کۆکن، کەئەو یەکدی دیتنە، مەرجی دروستبوون(شرط الصحة)ی نیکاح نیە، (إبن تيمية) لەوبارەوە گوتوویەتی: [2] (يصح النكاح وان لم يرها..) واتە: ئەگەر پیاوەکە نەیشیبینێ، نیکاحەکە هەر دروستەو دادەمەزرێ.

هەروەها زۆربەی هەرەزۆری زانایان دەڵێن: [3] تەنها بۆی هەیە تەماشای ڕووی و هەردووك دەست (الوجه واليدين)ی بکات، هەر ئەم ڕایەش ڕاستو بەجێیە، [4] هەروەها مۆڵەت لێوەرگرتنی ئافرەتەکەو ڕازی بوونیو ئاگاداربوونی، بەمەرج نەگیراوە بۆ ئەو تەماشاکردنو تێوەڕامانە، (ابن حجر العسقلاني) لەوبارەوە گوتوویەتی[5]: (قال الجمهور: يجوز أن ينظر إليها إذا أراد ذلك بغير إذنها).

ئنجا هەندێك لەزانایان کەئەوەیان بەمەرج گرتوە: دەبێ بابای سەرنجدەر دڵنیابێ

---

(١) (المغنى) ج٧ص٤٥٣.

(٢) (مجموع الفتاوى) ج٢٩ص٣٥٥.

(٣) (المغنى) إبن قدامه، ج٧ص٤٥٣، (مغنى المحتاج) للشربينى، ج٣ص١٢٨.

(٤) بەڵام (احمد) لەقسەیەکی داو (أهل الظاهر) یش ڕایان وایە کەبۆی هەیە تەماشای سەرتاپای جەستەی بکات! بڕوانە (فتح البارى) ج٩ص١٨٢، وە: (المغنى) ج٧ص٤٥٣.

(٥) (فتح الباري) ج٩ص١٨٢.

لەئارەزوو نەجوولانی! لەڕاستیی دا هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیەو، شتێکی نەگونجاو (غیر ممکن)یشە، چونکە ئینسان بەدیتنی دیمەنەکان کارتێکراو(متـأثر) دەبێو، شەریعەتیش زانیویەتی کەوایەو هیچ مەرجیشی نەخستۆتە سەر تەماشەکردنەکەو موتڵەقە.[1]

هەروەها زانایان لەسەرئەوەش یەکدەنگن کەبابای سەرنجدەر بۆی هەیە تەماشاکردنو سەرنجدانەکەی دووبارەو چەند بارە بکاتەوە، چونکە ڕەنگە بەجارێكو دوان ئامانجو مەبەستەکەی نەیەتەدی.[2]

هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش ڕێککەوتوون [3] کەئافرەتیش هەمان مافی پیاوی هەیە بۆ تەماشاکردنو سەرنجدانی ئەو پیاوەی کەبەتەمایە ببێتە هاوسەری، ئەوەندە هەیە بۆیە فەرموودەکان تەنها باسی تەماشاکردنی پیاوان بۆ ئافرەتان دەکەن چونکە: ١- پیاوان بەزۆریی بەدەرەوەنو دەبینرێن. ٢- وەك پێشتریش باسمان کردوە بەفیطرەت پیاو داواکارو ئارەزوومەند(طالب و راغب)ەو ئافرەت داواکراوو ئارەزوو بۆ کراو(مطلوب و مرغوب فيها)! (عمر بن الخطاب)یش خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: [4] ((لا تزوجوا بناتكم من الرجل الدميم فأنَّه يُعْجُبهُنَّ منهم مايعجبهم منهن)) واتە: کچەکانتان مەکەنە هاوسەری پیاوی نابووت، چونکە ئافرەتانیش وەك پیاوان دیمەنو ڕواڵەتیانیان بەلاوە گرنگە.

ئنجا زانایان بەموتڵەقیی باسی دروستبوون (جواز)ی تەماشاکردنی ئافرەتیان کردوە بۆ پیاوو وەك هی پیاو بۆ ئافرەت- کە دەم و چاو و دەستەکانی- سنووریان

---

(١) (كفاية الأخيار) ج٢ص٨٥، وە: (مجموع الفتاوى) لابن تيمية، ج٢١ ص٢٥.
(٢) (مغني المحتاج) ج٣ص١٢٨، وە (المغني) لابن قدامة، ج٧ص٤٥٣.
(٣) (المفصل..) ج٦ص٦٩، ٧٠.
(٤) (المفصل..) ج٦ص٧٠.

بۆ دیاری نەکراوە، بەڵام وا پێدەچێت ئەویش تەنها تەماشاکردنی ئەو ئەندازەو ئەندامانەی بۆ دروست بێت کەبەعادەت دەردەکەون، وەك دەمو چاوو گەردنو قۆڵو باسكو تووكەسەر![1]

## سێ: بەتەنهاو لەشوێنی پێکەوەبوون(الخلوة)ی پیاوو ئافرەت، حەرامە:

کەواتە: پێویستە یەکدی دیتنەکەی خوازبێنیکەر(خاطب) و داخوازیکراو(مخطوبة) بەتەنهاو لەشوێنی چۆڵو جێی گومان نەبێت، بەڵکو یان دەبێ لەجێیەکی قەرەڵەباڵغ، یان بەئامادەیی مەحرەمێکی ئافرەتەکە بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی خەڵوە پێکەوە نەکردنی ئافرەتو پیاوی نامەحرەمەوە، فەرموویەتی:

((**لا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ كَانَ الشَّيْطَانُ ثَالِثَهُمَا**)) رواه الترمذي وصححه.

واتە:(هەرکاتێك پیاوێك خەڵوە لەگەڵ ئافرەتێکدا بکات، ئەوە مسۆگەر شەیتان سێیەمیانە).

دیارە ئەوەش کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، ئێستا پەرێزو بەرهەمی شوومی لەنێو وڵاتە ڕۆژئاواییو ڕۆژهەڵاتییەکانو دەوڵەتۆکە کلكو دابەستەکانیان لەجیهانی ئیسلامیدا، زۆر بەڕوونیی دەبینرێ!

**کەواتە:**

پێش مارەکردن هەرچەندە کچو کوڕ- بۆ وێنە لەکوردەوارییدا - بەدەستگیرانو دۆستو لەیەك نیزیك ناودەبرێنو دادەنرێنو، گەلێك جاران بەحوکمی عادەتو

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەرە.

نەریتیی نەفامانەی کۆمەڵگا، ڕەچاوی ئەوە ناکەن ،کە جارێ ئەو پیاو و ئافرەتە لەڕووی شەرعییەوە هەر بەیەك بێگانەن و خەڵوەو جیژوانو چیو چی پێکەوە دەکەن! بەڵام پێویستە بزانرێ کەعورفو عادەت مادام پێچەوانەی شەرع بوو، هیچ ئیعتیبارێکی بۆ دانانرێ!

## چوار: نابێ ئافرەتەکە لەو پیاوە حەرام بێ، یان خوازبێنیی کراو بێت:

ئەدەبێکی دیکەی فەرزی خوازبێنی، ئەوەیە کەنابێ ئەو ئافرەتە:

١-حەرام بێت جا چ بەشێوەی یەکجارەکیی (على التأبيد) وەك: خوشكو کچو برازاو خوارزاو.. هتدی نەسەبیی یان شیریی، چ بەشێوەی کاتیی (بصورة مؤقتة) وەك، خوشکی خێزانو پوور و پلك(عمة وخالة)ی خێزانو، ئافرەتی بەمێرد.

٢- لەعیددەدا بێت، جا زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەئافرەتی عیددەدار (المرأة المعتدة) بەهیچ جۆرێك دروست نیە بەڕاشکاویی(بصراحة) داخوازیی بکرێ، جا عیددەکەی هەرجۆرێك بێت، بەڵام بۆ ئافرەتێك کە لەعیددەی وەفاتی مێردەکەی دابێ، یان[1] لەعیددەی دوای تەڵاقی سێیەمیدا دابێ، ئەوە بۆ یەکەمیان، سەرجەم زانایانو ،بۆ دووەمیشیان بەشێکیان دەڵێن[2]: بەڕاشکاویی نا، بەڵام بە لەبەر ڕاهاویشتن(بالتعريض)

---

(١) چونکە خوا فەرموویەتی: (وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ) (البقرة: من الآية٢٣٥) .

(٢) ئەمە ڕای (حنابلة) یە، بڕوانە: (المغني) لابن قدامة، ج٦ص٦٠٨.

دروستە پێی بگوترێ! بەڵام هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن[(١)] کە ژنێك لەعیددەی تەڵاقی گێڕادرانەوە(الطلاق الرجعي) دا بێت، دروست نیە بەهیچ جۆرێك داخوازیی بکرێ، لەبارەی ژنێکیشەوە کەبەشێوەی جیابوونەوەی بچووك (البينونة الصغرى) لەمێردەکەی جیابووبێتەوە، زانایان رایان جیاوازە، کە ئایا دروستە لەکاتی عیددەیدا بەپەنهانیی بەگوێیدا بدرێ یان نا؟! حەنبەلییەکانو شافیعییەکان بەدروستو حەنەفییەکانیش بەحەرامی دەزانن.[(٢)]

٣- خوازبێنیی کراو(مخطوبة) بێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی قەدەغە کردوە، وەك (بخاري) لە (ابن عمر) خوا لێیان رازی بێ گێڕاوەتەوە: ((**نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَبِيعَ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَلَا يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ**)) واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کەهەندێکتان سەودا بەسەر سەودای هەندێکتاندا بکەن، وە نابێ پیاو خوازبێنی بەسەر خوازبێنی برایەکەیەوە بکات، تاکو پێش ئەوە خوازبێنیکەرەکە واز دێنێ، یان خوازبێنیکەرەکە مۆڵەتی دەدات.))

دیارە ئەم قەدەغەکردن(نهي)ەش بەلای جەماوەری زانایانەوە، بگرە (النووي) یەکدەنگیی لەسەر نەقڵ کردوە، بۆ بەحەرام دانان (التحريم)ە.[(٣)]

---

(١) بڕوانە: (المغني) ج٦ص٦٠٩، وە (مغني المحتاج) ج٣ص١٣٦، وە (بدائع الصنائع) ج٣ص٢٠٤.

(٢) بڕوانە: (المفصل..) ج٦ص٦٥.

تێبینی: لەکۆتایی بەشی حەوتەم دا باسێکی تێرو تەسەلمان لەبارەی عیددەوە کردوە.

(٣) بڕوانە: (فتح الباري) ج٩ص١٩٩.

## پێنج: وتاری خوازبێنیی (خطبة الخطبة):

ئـەدەبێکی دیکـەی خـوازبێنی یـان مـارەکردنی ئـافرەت، ئەوەیـە کـەبابای خوازبێـنیکەر (خـاطب)یـان سـەرپەرشتیار، یـان وەکیلەکەی، وتارێك بـکاتە رێ خۆشکەرو پێشـەکی ئەوکارە خێرە، ئەگەر بەم وشـانە دەسـت پێبکـات، کەبـەوتاری پێویستی (خُطبة الحاجة) ناسراوە، زۆرباشە:

((إنَّ الْحَمْدَ للَّه نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللَّه مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا، ومن سيئات أعمالنا مَنْ يَهْدِهِ اللَّـهُ فَـلاَ مُضِـلَّ لَـهُ وَمَـنْ يُضْـلِلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وحـده لاشـريك لـه وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾الأحـــــزاب:٧٠-٧١)) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾النســـــــاء:١، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾آل عمران:١٠٢.

أما بعد.. فإنَّ أصدق الحديث كلام الله، وخيرا الهدي هَـدْي محمـد ﷺ وشـرَّ الأمور مُحدثاتها وكل محدثة بدعة وكلّ بدعة ضلالة وكلّ ضلالة في النـار)) رواه أبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه عن ابن مسعود رضي الله عنه.

ئنجا پـاش ئەمـە بەتـەعبیرێکی جـوانو شایسـتە داواکـاریيو داخوازییەکـەی دەخاتەڕوو، بۆ وێنە بلێ:

ئێمە هاتووینە خزمەتتانو حەز بەتێکەڵیی‌و نزیکییتان دەکەینو، بۆ ئەو مەبەستەش مەمنوون دەبین ئەگەر فلانکەس (ناوی داخوازیی بۆ کراوەکە دەبات) بەکورو بچووکی خۆتان قبووڵ بکەنو فلانکەسمان (ناوی ئافرەتەکە دەبات) پێشکەش بکەن!

جا هەرچەندە (داود الظاهري)[1] ڕای وایە کە ئەو جۆرە وتارەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەقڵمان کرد، پێویستە کە لەکاتی داخوازیی یان مارەکردن(عقد)دا بدرێ، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان هەرجۆرە وتارێکی دیکە مادام (الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله و والوصية بالتقوى لله)ی تێدا بێ، هەر بەدروستو لەئەسڵیشدا بەپەسەند(مستحب)ی دەزانن نەك بەفەرز.

گومانیشی تێدا نیە کە هەر ڕای جەماوەری زانایان ڕاستو دروستە.

ئنجا لەکۆتایی ئەم باسەشدا پێویستە تیشکێکی خێرا بخەینە سەر چەند وردە بابەتێك:

١- بابای داخوازییکەر(خاطب) هەم دروستە خۆی ڕاستەوخۆ خوازبێنییەکە بکات، هەم دروستە یەکێك بکاتە وەکیلی خۆی، چونکە لە (صحيح البخاري)دا هاتوە لە (عبدالله بن عمر)ەوە خوا لێیان ڕازی بێ، ((**أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَ حَفْصَةَ فَأَنْكَحَهَا عُمَرُ إِيَّاهُ**)) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی داخوازکرد ، عومەریش لێی مارەکرد، خوا لێیان ڕازی بێ.

هەروەها لە (سنن النسائي)دا لە (أم سلمة)ەوە هاتوە: ((..**فَبَعَثَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَخْطُبُهَا عليه**..)) واتە: جا پێغەمبەری خوا

---

(١) (بداية المجتهد) لإبن رشد، ج٢ص٣، وە: (المغني) ج٧ص٤٣٣.

ﷺ عومەری کوڕی خەتتابی ناردە لای کەبۆی داخواز بکات.))

٢- هەرکاتێك ئینسـان لەبارەی داخوازییکەر(خاطب)ەوە ڕاوێـژی پێکرا، پێویستە بابای ڕاوێژپێکراو، کابرای پرسیار لەبارەوە کراو، وەك گۆشتی سەر چەپەری بخاتە گۆڕێو، بەگوێرەی پێویست کەموکووڕیی یەکانی بلێ، [١] چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێك (فاطمة بنت قیس) ڕاوێژی لەبارەی (معاوية بن أبي سفيان) و (أبوجهم)ەوە، کە داخوازییان کردبوو، پێکرد، فەرمووی:

((**أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلَا يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ، وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لَا مَالَ لَهُ**))رواه أبوداود.

واتە: (هەرچی (أبوجهم)ە گۆچانەکەی لەملی نایەنێتە خوارێ (واتە زۆر لەژنان دەدات)، هەرچی (معاوية)شە ڕووتەڵەو هیچماڵو سامانی نیە)!

٣- خوازبێنییش مارەبڕین(عقد) نیەو تەنها گفت(وعد)ێکە، بەڕای زۆربەی زانایانیش بەڵێندان بەمارەکردنیش پابەندکەر(مُلْـزِم ) نیە[٢]، بەڵام هەندێك لەزانایان ئەو گفت بردنە سەرە بەفەرز دەزانن، واش پێدەچێ ڕای بەسوننەت(مندوب) زانینی جێبەجێکردنی ئەو گفتو بەڵێنە لەهەموو ڕایەکانی دیکە ڕاستر و بەجێتر بێت، چونکە هەرچەندە لەئەسڵدا بەڵێن بردنە سەر(إنجاز الوعد) فەرزە: ﴿وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾ (الاسراء: من الآية٣٤)، بەڵام بۆیە پێموایە لەم مەسەلەیەدا کابرا گوناهبار نابێ، چونکە بێگومان دیارە عوزرێکی هەیە، بۆیە ژیوان بۆتەوە!

---

(١) دیارە باسکردنی کەموکوڕی کەسێك لەو حاڵەتەدا یەکێکە لەو حاڵەتانەی کەبەغەیبەت دانانرێ. بڕوانە: (المجموع) للنووي، ج١٧ ص٣٦٦، ٣٦٧.

(٢) (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) ص ٦٨.

هەڵبەتە ئەگەر بەبێ بەڵگەو پاساویش ژیوان بێتەوە، دیارە بەهۆی بەڵێن شکاندنەوە گوناهبارە.[١]

٤- زانایان لەبارەی ئەو دیاریی‌و خەڵاتانەوە، کەبابای خوازبێنیکەر پێشکەشی ئافرەتە داخوازیکراوەکەیان دەکات، ڕاجیاییان هەیە کەئایا لەحاڵەتی سەرنەگرتنی داخوازییەکەدا دروستە داوایان بکاتەوە یان نا؟!.

جارێ ئەگەر ئەو دیاریی‌و خەڵاتانە لەسەر حیسابی مارەیی(المهر) بن، ئەوە زانایان تێکڕا[٢] ڕایان وایە کەپێویستە ئافرەتەکە بۆی بگێڕێتەوە، مەگەر خۆی چاوپۆشیی لێبکات.

بەڵام ئەگەر لەسەر حیسابو بەناوی مارەییەوە نەبووبێ‌و، تەنها دیاریی‌و بەخشش (الهدیة والهبة) بووبێ، ئەوە هەرچەندە هەندێك[٣] لەزانایان ڕایان وایە کەکابرا هەر بۆی هەیە داوایان بکاتەوە، بەڵام ڕایەکەیان هەڵەو بێهێزو پێزە، چونکە پێچەوانەی چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ وێنە: ((**الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ**))رواه البخاري. واتە: (ئەو کەسە کەلەبەخششێکی خۆی پەشیمان دەبێتەوەو وەریدەگرێتەوە، وەك سەگە کەڕشانەوەکەی خۆی دەخواتەوە)!

شایانی باسیشە کە (ابن قدامة) گوتویەتی: [٤](الهبة والصدقة والهدیة والعطیة معانیها متقاربة وكلها تمليك في الحياة بغير عوض..) واتە:

---

(١) (فتح الباري) ج٥ص٢٩٠.
(٢) (حاشية ابن عابدين) ج٣ص١٥٣.
(٣) یەکێك لەو زانایانە (ابن تيمية) یە، (مجموع الفتاوى) ج٣٢ص١٠.
(٤) (المغني) ج٦ص٢٤٦.

بەخشش‌و خێرو دیاریی و خەلاّت، مانایان لەیەك نیزیكەو هەموویان بـریتین لە: بەخاوەن كردنێكی بێ بەرانبەر لەحاڵەتی ژیاندا.

پاشان (ابن قدامة) بەجۆرە پێناسەی خەلاّت‌و بەخشش دەكـات: [1] (الهبـة: أن يدفع إنسان الى آخر شيئاً للتقرب اليه والمحبة له) واتـە: بەخشـش ئەوەیـە كە كەسێك شتێك بەیەكی دیكە بدات بۆ خـۆ لێنیزیـك خسـتنەوەی‌و لەبـەر خۆشویستنی.

٥ - سوننەتە پاش خوازبێنییكردن‌و مارەبڕینەكە، دوعـای خێـر بـۆ هـەردووك هاوسـەرەكە بكـرێ‌و پیرۆزباییـان لـێبكرێ، چـونكە پێغەمبـەری خـوا ﷺ عـادەتی وا بووە وەك لەم فەرمایشتەدا دەردەكەوێ:

((**كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَفَّأَ الإِنْسَانَ إِذَا تَزَوَّجَ قَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي الْخَيْرِ**))رواه أحمد والترمذي وأبوداود وابن ماجه والدارمي والبيهقي والحاكم وصححه ووافقه الذهبي.[2]

واتە: (پێغەمبەر ﷺ كاتێك یـەكێك ژنـی هێنابایـەو پیرۆزبـایی لێكردبایـە، دەیفەرموو: خوا پیت‌و پێزت بخاتێ‌و، پیت‌و پێزت بەسـەردا بڕێژێ‌و، لەسەر خێرو چاكەش كـۆتان بكاتەوە).

لێرەشدا كۆتایی بەم خاڵی چوارەمە دێنین‌و دەچینە سەر خاڵی پێنجەم:

(١) (المغني) ج٦ص٢٤٦.
(٢) بڕوانە: (المجموع) للنووي، ج١٧ص٣٦٧.

## ٥- پایەکانی مارەبڕین و مەرجەکانی ( أركان عقد النكاح وشروطه):[١]

**خوێنەری سەنگین!**

شتێکی ئاشکرایە کەسەرجەم گرێبەست (عقد)ەکان کە گرێبەستی هاوسەرێتیی(عقد الزواج)یش یەکێکیانە، لەسەر بناغەی ویستو قەناعەتو ڕەزامەندیی هەردووك لایەنی گرێدەر(الطرفين العاقدين) بەبابەتی گرێبەست(موضوع العقد)ەکە، بنیات دەنرێن، جا لەسۆنگەی ئەوەوە کەئەو ویستو ڕەزامەندییە، شتی شێرراوەو پەنهانن‌و، ئینسانەکان پەییان پێنابەن، بۆیە پێویست بووە کەلەهەرکام لەدوو لایەنەکەی گرێبەستەکەوە، چەند وشەو تەعبیرێك ببیسترێن، کەبەڵگەو نیشانەی ئەو ویستو قەناعەتە ئیجابییەیان بن، کەلەبارەی ئەو مەسەلەیەوە هەیانە.

جا ئەگەر هاتو گرێبەستەکە شتێکی ئاساییو سادە بوو، وەك کڕین‌و فرۆشتنی نان‌و گۆشتو کەلوپەلی دیکەی لەوجۆرە، ئەوە کارەکە تەنها بەوەیەکدیدان‌و لەیەکدی وەرگرتن (التعاطي) ئەنجامدەدرێ‌و، پێویست ناکات هەردووك لای کڕیارو فرۆشیار، ئەو وشەو تەعبیرانە بڵێن کەقەناعەتو ڕازیبوونیان بگەیەنن، بەڵام ئەو گرێبەستانەی کەبابەتەکانیان شتی گرنگو گەورەن، وەك:

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لەم کتێبانەی وەرگرتوە:
(الفقه الإسلامي وأدلته) د. وهبه الزحيلي ج٨ (الفصل الثاني: تكوين الزواج) ص ٦٥٣،
وە (المفصل) ج٦ (الفصل الثالث: (أركان عقد الزواج وشروطه ومستحباته) ص٧٩.
وە : (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة)، (الفصل الثالث: أركان عقد النكاح وشروطه وأنواعه) ص ٧٩.

مارەبڕینو، ڕێککەوتننامەو، کڕینو فرۆشتنی شتی گرانبەها، وەك زەوی و زارو خانوو و بەرەو زێڕو.. هتد، ئەوە تەنها بەوەیەکدیدان (التعاطي) پێك نایەتو، پێویستە دەربڕینێك یان نووسینێك لەئارادا هەبێ، کەڕازیبوونی هەردووك لای تێدا دەربکەوێو، ئەو مەرجانەش کەپێویستن، ڕەچاو بکرێن.

جائێستا پاش ئەم پێشەکیو ڕوونکردنەوەیە، باسەرنجێکی کورت بدەینە هەرکام لەپایەکانی مارەکردنو مەرجەکانیشی:

## یەك: پایەکانی گرێبەستی مارەکردن:

تێکڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن کە هەرکام لە:

أ-پێویستکردن (الإيجاب)

ب-قبوولکردن (القبول)

دوو پایەی گەورەو گرنگی مارەبڕینو، بەبێ هەرکام لەم دوانە گرێبەستی هاوسەرێتیی (عقد الزواج) دانامەزرێ.

جا هەرچی حەنەفییەکانو حەنبەلییەکانن دەڵێن[1]: پایەکانی مارەکردن تەنها ئەم دوانەن، بەڵام جەماوەری زانایان دەڵێن:[2] پایەکانی مارەکردن چوارن، کە ئەمانەن.

١-پێویستکردنو قبوولکردن (الإيجاب والقبول)

٢-ژن (الزوجة)

٣-مێرد (الزوج)

٤- سەرپەرشتیار (الولي).

---

(١) بڕوانە: (المفصل..) ج٦ص٨٠.

(٢) بڕوانە: (الفقه الإسلامي وأدلته) ج٩ص ٦٥٢١.

پێموایە بە وردبوونەوەش دەردەکەوێ کەڕای جەماوەری زانایانیش لەگەڵی هی حەنەفیی‌و حەنبەلییەکاندا هەردەبێتەوە بەیەك، چونکە، بێگومان بوونی (الإيجاب والقبول)، هەبوونی ژن‌و مێردیش پێویست دەکات، ژنیش کەبەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان ناگونجێ بۆ خۆی خۆی مارەببڕێ، هەبوونی سەرپەرشتیار (ولي) پێویست دەکات!

مەبەستیش [1] لە وشەی (الإيجاب) ،کە لەئەسڵی زماندا واتە لەسەرخۆ پێویستکردن، ئەوەیە کەسەرپەرشتیاری ئافرەتەکە بەبابای خوازبێنیکار بڵێ: ئەوە فلانە ئافرەتەم لەتۆ مارەبڕی(زوجتك فلانة)، مەبەستیش لەوشەی (القبول) ئەوەیە کە بابای ژنخواز، یەکسەر لەوەڵامی بابای سەرپەرشتیاردا بڵێ: ئەوە هاوسەریتی فلانە ئافرەتەم بۆ خۆم قبووڵکرد(قَبِلتُ نِكاحَ فلانة لي).

شایانی باسیشە[2] کەمەرج نیە (إيجاب) بەس لەلایەن سەرپەرشتیاری ئافرەتەوە بێ، (قبول)یش تەنها لەلایەن خوازبێنیکار(خاطب)ەوە بێ، بەڵکو دەگونجێ بەپێچەوانەوە بێت‌و بابای خوازبێنیکار بەسەرپەرشتیارەکە بڵێ: (تزوجتُ ابنتك فلانة)، ئەویش لەوەڵامیدا بڵێ: (قَبِلتُ تزوَّجها إياك)، گرنگ ئەوەیە قسەی هەرکامێکیان پێش بکەوێ بە (إيجاب) و ئەوی دیکەش بە (قبول) دادەنرێ.

ئنجا سەرجەم زانایان[3] لەسەر ئەوەش ڕێککەوتوون، کەمادام (الإيجاب والقبول)ەکە، لەگرێبەستی مارەکردنەکەدا، بەهەرکام لەوشەکانی (التزويج) و (النكاح)بن، ئەوە مارەکردن (نكاح، زواج)ەکە دادەمەزرێ، چونکە هەرکام لەو دوو وشەیە لەقورئانی بەڕێزدا هاتوون، بۆ وێنە:

(١) بڕوانە: (أحكام الزواج..) ص ٧٩، ٨٠.
(٢) (المفصل..) ج٦ص٨١.
(٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.



﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ ﴾ (الأحزاب:٣٧).

﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ ﴾ (النساء:٢٢).

بەڵام ئایا بەوشەی دیکەش مارەکردن دادەمەزرێ یان نا؟! ئەوە زانایان ڕاجیاییان لەبارەیەوە هەیەو دوایی ئاماژەی پێدەکەین.

## دوو: مەرجەکانی گرێبەستی مارەکردن:

گرێبەستی هاوسەرێتیی (عقد الزواج) چوار جۆرە مەرجی هەن: [1]

١-مەرجەکانی دامەزران (شروط الإنعقاد).

٢-مەرجەکانی دروست بوون (شروط الصحة).

٣-مەرجەکانی جێبەجێبوون (شروط النفاذ).

٤-مەرجەکانی بەردەوامبوونو هەڵنەوەشانەوە (شروط اللزوم).

جا ئێستا بەکورتیی پێناسەی هەرکام لەو چوار جۆرە مەرجانەو، پاشان سەرژمێرێکیان دەکەینو، ئاماژەش بەهەڵوێستی زانایان دەکەین لەبارەیانەوە:

١- مەرجەکانی دامەزران (شروط الإنعقاد) ئەوانەن، کە پێویستە لەپایەکانو

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، لاپەڕە (٩٧)، وە (الفقه الإسلامي وأدلته) ج٩ص٦٥٣.

بناغــەی گرێبەســتەکەدا هــەبن‌و، نــەبوونی هــەرکامێکیان دەبێتــە مایــەی دانەمەزرانی.

٢-مەرجــەکانی دروســتبوون (شــروط الصــحة) ئەوانــەن کــەبۆ پەیــدابوونی شوێنەواری شەرعیی لەگرێبەستەکەدا پێویستن‌و، بەنەبوونیان یـان نـەبوونی هــەرکامێکیان ، (عقد)ەکــە لــەلای جــەماوەری زانایــان بــە (باطــل)و، لای حەنەفییەکانیش بە (فاسد)دادەنرێ، کە زۆر لەیەکەوە نزیکن‌و جیاوازییــەکی کردەییان نیە.

٣-مەرجەکانی جێبەجێبوون (شروط النفاذ) ئەوانەن کەپەیدابوونی شـوێنەواری کردەیی (عقد)ەکــە، پــەکی لەســەریان کــەوتوەو، هــەرکامێکیان نەیەتــەدی، بەڕای زۆربەی زانایان بەوەستێنراو (موقوف) دادەنرێ.

٤-مەرجەکانی بــەردەوامبوون‌و هەڵنەوەشــانەوە (شــروط اللــزوم)یــش، ئەوانــەن کەبەنەمانی یــان نەهاتنــەدی هــەرکامێکیان (عقد)ەکــە بەناپێویســت (غــیر لازم) دادەنرێ‌و، یــەکێك لەلایەنــە گرێــدەرەکانی یــان غــەیری وان، دەتوانــێ هەڵیبوەشێنێتەوە.

دیارە بەسەرژمێرکردن‌و خستنەڕووی مەرجـەکانیش، پێناسـەکانیان زیـاتر ڕوون دەبنەوە.

## ١-مەرجەکانی دامەزرانی مارەکردن (شروط انعقاد النکاح):

ئەم جۆرە مەرجانە بەشێوەیەکی گشتی سـێ بەشـن، بـەڕای زۆربـەی هـەرەزۆری زانایان: [1]

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٦٥٣٤ تا ٦٥٣٩، وە : (أحکام الزواج) ص ٨١.

## یەکەم: مەرجەکانی هەردوو گرێدەر (شروط العاقدين):

١- لێهـاتوویی ڕەفتـارکردن (أهليـة التصـرف)، کەبـەلای زۆربـەی زانایانـەوە کەمالیکییەکانو شافیعییەکانو حەنبەلییـەکانیان لـەنێودان، عاقـڵ بـوونو بـاڵغ بـوونو ئـازادبوون، مـەرجی پەیـدابوونی (أهليـة)ن، بۆیـە مەگـەر سەرپەرشتیار (ولي) ،کە ئەویش ئەگەر باب (أب) بێت ،هەموویان لەسـەری کۆکن، ئافرەت لەمنداڵی گچکە مـارە بـبڕێ، ئەگـەرنا دروسـت نیـە خـۆی بەوکارە هەڵسێ. بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن: منداڵی فامیدە(الصبـيّ المُمَيِّـز) بۆی هەیە ئافرەت لەخۆی مارە بکات، هەرچـەندە بـاڵغیش نـەبووبێ، بـەڵام بێگومان ڕای زۆربە بەهێزترە.

٢- بیستنی قسەی یەکدی، واتـە: دەبـێ هـەردووک گرێدەر(عاقد)ەکـە، قسـەو دەنگی یەکدی ببیستن لەکاتی مارەکردنەکـەدا، هەرچـەندە نامـەش لـەکاتی ناچاریی‌و دووره دەستییدا، زۆربەی هەرەزۆری زانایـان بەچـەند مەرجێکـەوە بەدروست (جائز)یان زانیوە.

## دووەم: مەرجەکانی ئافرەتی مارەکراو:

١- دەبێ ئافرەتەکە مێینەیەکی تەواو بێت، کەواتە مـارەیی پیـاوی نێرەمـووك (الخنثى) نایەت‌و دانامەزرێ!

٢- نابـێ لـەوجۆرە ئافرەتانـە بـێ کەبەشـێوەیەکی کـاتیی(مؤقّـت) یـان هەمیشـەیی(مؤبّـد) لـەو پیـاوە حـەرامن، بەشـێوەی کـاتیی وەك: ئـافرەتی شـوودارو، ئـافرەتی خـاوەن عیـددەو ئـافرەتی کـافری غـەیری کیتـابی،

وەبەشێوەی هەمیشەیی وەك: دایكو خوشكو كچ ،چ نەسەبیی و چ شیریی‌و.. هتد.

## سێیەم: مەرجەكانی داڕشتنی گرێدان(صیغە العقد)ەكە، واتە: (الإیجاب والقبول):

ئەمانیش چوارن‌و زانایانیش لەسەریان یەكدەنگن:

١- یەكبوونی مەجلیس(اتحاد مجلس)ی گرێدەرانی مارەبڕینەكە، واتە پێویستە (إیجاب)و (قبول)ەكە لەیەك كات‌و یەك شوێندا بگوترێن.

٢- یەككەوتن(توافق)ی (ایجاب) و (قبول)ەكە لەبارەی ئەو ئافرەتەوە كەمارە دەكرێ‌و، ئەو پیاوەی كەلێی مارە دەبڕێ، لەبارەی ئەندازەی مارەیی(المهر)یەوە، كەواتە ئەگەر كابرای سەرپەرشتیار گوتی: ئەوە خەدیجەم لەتۆ مارەبڕی‌و ئەویش گوتی: ئەوە مارەبڕینی ئامینەم قبوولْ كرد، یان سەرپەرشتیار بلێ: لەسەر دەمسقالْ زێڕو ئەویش بلێ: لەسەر حەوت مسقالْ زێڕ، ئەوە دانامەزرێ!

٣- بابای پێویستكەر (مُوجِب) نابێ بەرلەوەی بابای قبوولْكەر قبوولْو ڕەزامەندیی خۆی ڕابگەیەنێ، قسەكەی خۆی بگێڕێتەوەو پەشێمان ببێتەوە، واتە ئەگەر هاتوو پێش ئەوەی تەرەفی بەرانبەر قبوولْو ڕەزامەندیی خۆی ڕابگەیەنێ، بابای پێویستكەر قسەكەی خۆی كێشایەوە، ئەوە دانامەزرێ، چونكە (إیجاب)و (قبول)ەكە، یەكیان نەگرتوەو پێكەوە پەیوەست نەبوونە.

٤- پێویستە مارەبڕینەكە هەنووكەیی‌و ئێستایی(تنجیزیاً وحالیاً) بێ، نەك ببەسترێتەوە بەداهاتووەوە، یان بەمەرجێكەوە كەجارێ پەیدا نەبووە، بۆ وێنە: بابای مارە بڕ(عاقد) بلێ: فلانە كچەمت دەكەمە هاوسەر، ئەگەر

کاکم ڕازی بێ، یان ئەگەر ڕۆژهەڵات.

جـا وەك لەســەرەتاوە گــوتم : زانایــانی ئیســلام لەســەر ئــەو چــوار مەرجانــە یەکدەنگن، بەڵام لەبارەی چەند شتێکی دیکەوە ڕایان جیاوازە، بۆ وێنە: [١]

**یەکەم:** لەو بارەیەوە کە ئایا وشەکان (إنكاح)و (تـزويج) بەمـەرج گـیراون یـان نا؟

ڕایان جیاوازەو هەرچی شافیعییەکانو حەنبەلییەکانن دەڵێن: بەو دوو وشەیە نەبێ مارەکردن دانامەزرێ، بەڵام زۆربـەی زانایـان دەڵـێن: مـەرج نیـە، جـا هەرچەندە ئەوانیش کەئـەو دوو وشـەیەیان بەمـەرج نـەزانیون، ڕایـان جـۆراو جـۆرە، بـەڵام وابێدەچـێ ڕاسـتترین ڕا ئـەوەی حەنەفییـەکان بێـت کـەدەڵێن: هەروشەیەك پێدان(تمليك) بگەیەنێ، دروستە بـۆ مـارەکردن بـەکاربهێنرێت، وەك: (البيع، والهبة، الصدقة، التملّك)، ئەمـە ڕای زەیدییەکانیشـە و (ابـن تيمية)ش هەڵیبژاردوەو گوتوویەتی: (وينعقد النكاح بما عـدَّه النـاسُ نكاحـاً بأي لغة ولفظ كان، ومثله كلُّ عقْدٍ)[٢] واتە: مارەکردن بەهەر زمانێكو هەر وشەیەك کەخەڵکی بـەمارە بریینـی تێبگـەن دادەمـەزرێ، هـەروەها هـەموو گرێبەستەکانی دیکەش هەروان.

بەڵگەشیان ئەوەیە کەهەم لەقورئانێدا وشەی (هبة) بۆ ئەو مەبەسـتە بـەکار هاتـوە: ﴿وَٱمۡرَأَةً مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ﴾(الأحزاب: من الآيـة٥٠) واتـە: وەهەم پێغەمبـەریش ﷺ وشـەی (تمليـك)ی بـەکارهێناوە، وەك فەرمویـەتی: ((**مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ**)) رواه البخاري.

(١) (المفصل..) ج٦ص٨١ تا ٨٧.
(٢) (الإختيارات الفقهية من فتاوى شيخ الاسلام ابن تيمية) ص١١٩.

**دووەم:** لەو بارەوە، کە ئایا مەرجە صیغە (الإیجاب والقبول)ەکە بەزمانی عارەبی بن، یان بەهەر زمانێك بن هەر دروستە؟! دیسان زانایان ڕاجیاییان هەیەو، هەندێکیان ڕایان وایە کەهەرکەسێك بتوانێت بەعارەبی بڵێت بەغەیری عارەبی(أعجمی) دروست نیە، زۆربەشیان کە (أبو حنیفة) و شافعییەکان لەقسەی ڕاستتر(اصح)یاندا لەنێوانیاندا هەنو، لەهەر کام لە (أحمد)و (مالك)یشەوە گێڕدراوەتەوەو (شیخ الإسلام ابن تیمیة)ش پشتگیریی کردوە، دەڵێن: بەعارەبی گوتنی بەمەرج نەگیراوەو، بەهەر زمانێك بێ هەر دروستە.[1]

دیارە هەر ئەم ڕایەش ڕاستو ماقووڵە، چونکە بناغە لەهەڵسوکەوتەکان دا ڕەواییو دەستکراوەییەو، ئامانجیش تێیان دا هێنانەدی بەرژەوەندییەکانەو هیچ دەقێکی شەریعەتیش نیە کەپابەندمان بکات، بەوشەو تەعبیرێکی دیاریکراوەوە.

**سێیەم:** لەو بارەوە کەئایا پێویستە ئەو کەسەی وشەی (إیجاب)ی ئاڕاستە دەکرێ بۆ وێنە: (زوجتك ابنتی زینب)، ئەویش لەوەڵامدا وشەی (تزوج) یان (نکاح) دووبارە بکاتەوە؟ یان تەنها ئەوەندە بەسە کەبڵێ: قبووڵم کرد (قَبِلْتُ)؟ دیسان ڕاجیایی هەیەو، شافعییەکان دەڵێن: بەڵێ پێویستە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: پێویست ناکاتو بێگومان هەر قسەی زۆربەش ڕاستو بەڵگە دارە.[2]

---

(١) (المفصل..) ج٦ص٨٥ تا ٨٦.

(٢) بڕوانە (المفصل..) ج١ ص١٠٤، وە (الفقه الإسلامی وأدلته) ج٢ ص٦٥٥٢.

## ٢-: مەرجەکانی دروست بوونی (شروط الصحة)ی ماره برِین:

بۆ دروست بوونی گرێبەستی هاوسەرێتییش، سەرجەم یان لانی کەم زۆربەی زانایان ئەم شتانەیان بەمەرج گرتوە:

١- دەبێ گرێبەستی(عقد)ەکە هەمیشەیی(مؤبَّد) بێت، نەك کاتیی(مؤقت)، ئەمەش تێکڕای زانایانی ئیسلام کەبە (أهل السنة والجماعة) ناسراون، لەسەری یەکدەنگن، بەڵام شیعەی ئیمامیی (الشیعة الإمامیة) (نیکاحی کاتی) کەبەهاوسەرێتیی ڕابواردن(زواج المتعة) ناسراوە، بەدروست دەزانن و، هەندێ شتیش بەبەڵگە دێننەوە کە بەڵمی تەواویش نین و، زاناو پێشەوایانی ئەهلی سوننەت لێیانیان هەڵوەشاندوونەوە[1]، لەتەفسیری ئایەتی (٢٤)ی

---

(١) شیعەکان بەحسابی خۆیان کۆمەڵێك بەڵگەیان بۆ ئیسپاتی دەعواکەیان هێناوەتەوە کە ئەم سێیانەیان لەهەموویان دیارترن:

ا-ڕستەی: ﴿فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾(النساء: من الآیة٢٤) کەلەجیاتی (تزوجتم) وشەی (استمتعتم) بەکارهاتوە.

ب: ڕستەی ﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ (النساء: من الآیة٢٤) .

ج: (بخاري ومسلم) لە (ابن مسعود) گێڕاویانەتەوە کەلەجەنگەکان (غزوات) دا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕێی (نکاح المتعه) ی داون.

بەڵام لەڕاستیدا ئەم شتانە هیچیان بەڵگەنین، چونکە:

ا/ وشەی (استمتعتم) مەبەست پێی (نکاح) و (زواج)ە، بەو شێوەیەی کە زانراوو ناسراوە، سەرەتاو کۆتایی ئایەتەکەش هەرئەوە دەگەیەنێ.

ب- وشەی (أجورهن) کەلەجیاتی (مهورهن) بەکارهاتوە، تەنها لێرە نیە و لەچەند شوێنێکی دیکەی قورئانیشدا هەروایە و هیچ پەیوەندییشیان بە (النکاح المؤقت) ەوە نیە، بۆ وێنە: ﴿فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ (النساء: من

(النساء)دا لەبەرگی سێیەمی: تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێزدا بەدرێژیی بەرپەرچی قسەی شیعەکان لەو بارەوە داوەتەوە.

٢- بەڕای هەرە زۆری زانایان، نابێ هیچ کام لەگرێدەر (عاقد)ەکان لەحاڵەتی ئیحرامی حەج و عومرەدا (مُحْرِم) بن، کەچی حەنەفییەکان دەڵێن: لەئیحرامدا بوون پەرچ (مانع) نیە بۆ مارە بڕین، بەڵام بێگومان قسەی زۆربەی زانایان ڕاستترو بەڵگەدار ترە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**لاَ يَـنْكِحُ الْمُحْـرِمُ وَلاَ يُـنْكِحُ وَلاَ يَخْطُـبُ**))رواه مسلم، واتە: (بابای ئیحرامدار نە مارەدەبڕێ لە غەیری خۆیو نە بۆ خۆی مارە دەکاتو، نە خوازبێنییش دەکات).

جا ئەو شتانەی کە حەنەفییەکان بەبەڵگەیان دێننەوە، ئەو هێزو پێزەیان نیە، (الشوكاني)یش پاش توێژینەوەی زۆر لەو بارەیەوە گوتوویەتی: (والحق أنه يحرم أن يتزوج المحرم أو يزوج غيره كما ذهب اليه الجمهور).[1]

٣- نابێ تۆبزیی کردن (إكراه) بۆ هیچ کام لەدوو گرێدەر (عاقدی النكاح)ەکە، لەئارادا هەبێت، هەموو زانایانیش لەسەر ئەم مەرجە ڕێککەوتوون بێجگە لە حەنەفییەکان، بەڵام بێگومان ڕای زۆربەی زانایان ڕاستەو لەو بارەشەوە بەڵگە زۆرن، یەکیان ئەو فەرمایشتەیە: ((**إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ**

---

الآيـــة٢٥) ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ﴾ (الأحـزاب: مـن الآية٥٠).

ج- مۆڵەت درانیش بەنیکاحی کاتیی، ڕاستە بووە، بەڵام لەبەر ناچاریی و پێویستیی بووەو، پاشان هەتا قیامەت پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە و لەو بارەشەوە فەرموودە زۆرن، بۆ وێنە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الِاسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ ذَلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ رواه مسلم واحمد عن سبرة بن معبد الجهني.

(١) بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٥ص١٥.



**وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عليه**))رواه ابن ماجه والبيهقي وغيرهما عن ابن عباس وهو حديث حسن.

هەروەها لەخاڵی یەکەمی بەشی سێیەم (بەشـوودانی ئـافرەت)دا، بەدرێـژیی باسـی ئـەوەمان کـردوە، کەبـەبێ ئـیرادەی ئـازادو ڕازی بـوون، مـارە کـردن دانامەزرێ.

٤- پێویستە ئەو ئافرەتو پیاوە کە لەیەکدی مارەدەکرێن، دیارو دیاریکراو بـن هیچ جۆرە تەمو مژێکیان بەسـەرەوە نـەبێ، ئـەم مەرجـەش شـتێکی ڕوونو بەڵگەنەویسـتەو، پێموانیـە هـیچ زانایـەك مشـتو مـڕ لـەبارەی پێویسـت بوونییەوە بکات، چونکە سەودای نەدیتـەو شـتی نـەزانراو (مجهـول) دروسـت نیە.

٥- ئامادە بوونی سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە (حضور ولي المرأة)، ئەمیش لەلای زۆربـەی جـەماوەری زانایـان مـەرجێکی دیکـەی دروسـت بـوونی (صـحة)ی مارەکردنە، بەڵام حەنەفییەکان ئەوە بەمەرج نـازانن، جالەبـەر ئـەوەی ئێمـە خاڵی شەشەمان تەرخان کردوە بۆ توێژینەوەی ئەو مەسەلەیە، هەڵی دەگرین بۆ ئەوێو، بێگومان وەك دواتـریش ڕوونـی دەکەینـەوە ڕای زۆربـەی زانایـان ڕاستترەو بەڵگەدار ترە.

٦- شـایەتیبیدانی بـەلای کەمـەوە دووشـایەد، ئـەمیش ڕای زۆربـەی زانایـانی لەسـەرە، کەیـەکی دیکەیـە لەمەرجـەکانی دروسـت بـوونی نیکـاح، بـەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کەلەخاڵی حەوتەم دا دەیتوێژینەوە بۆ ئەوێی هەڵدەگرین.

ئنجا شایانی باسە کەهەندێك مەرجی دیکەش هەن، کەتەنها بەشێك لەزانایان بەمەرجیان گرتوون، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان بەپێویستیان نازانن، بۆ وێنە:

ا- مالیکییەکان ڕایان وایە کە هەرکاتێك پیاوو ئافرەتەکە بڕیاریاندا کەنابێ مارەیی (المهر) لەگرێبەستی هاوسەرێتیی (عقد الزواج)ەکەدا هەبێ، ئەوە ئەو نیکاحە مادام پێش چوونەلا(قبل الدخول) بێت، نادروستەو بەهەڵوەشاوە (مفسوخ) دادەنرێ، بەڵام ئەگەر هاتو پاش چوونەلا بوو، ئەوە گرێبەستەکە دەچەسپێو، ژنەکەش وێنەی مارەیی(مهر مثل)ی دەکەوێ، بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە مارەکردن بێ مارەیی، یان کە نەبوونی مارەیی(عدم المهر)ی تێدا بەمەرج گیرابێ، هەر دامەزراو و دروستە، چونکە مارەیی نە پایەی مارەکردنە[١] و نە مەرجیشە[٢]، بەڵکو تەنها پێویستییەکە لەپێویستییەکانیو کەموکوڕیی (خلل) تێدا بوونی کارناکاتە سەر خودی گرێبەستەکە. دیارە ئەگەر مارەیی(المهر)یش مەرج بوایە بۆ دروستبوونی مارەکردنەکە، دەبوایە لەکاتی گرێبەستی(عقد)ەکەدا باسبکرایە، کەئاشکرایە باسکردنی لەوکاتەدا پێویست نیە، هەر بۆیەش ئەو جۆرە مارەکردنەی کەتێیدا باسی مارەیی ناکرێ، کە بە (نکاح التفویض) ناسراوە، بەیەکدەنگیی زانایانو دروستە.

ب- هەروەها هەندێك لەزانایان کە مالیکییەکانیان لەنێودان، ڕایان وایە کەئەگەر ژنو مێردەکە، هەردووکیان یان یەکیان نەخۆشییەکی ترسناك (مرض مخوف)[٣]ی هەبێ، ئەوە دیسان ئەو مارە کردنە دروست نیە، بەڵام

---

(١) پایە (رکن) ی شتێك ئەوەیە کەبناغەو پێکهێنەری ئەو شتە بێتو، بەبێ وی نەبێتو، لەنێو خودی شتەکەشدا بێت، وەك خوێندنی سورەتی فاتیحە بۆ نوێژ.

(٢) مەرج (شرط) ی شتێك ئەوەیە کە لەدەرەوەی شتەکە بێتو بوونیشی پێویست بێ بۆ پەیدابوونی ئەو شتە، وەك: هاتنی کاتی نوێژ بۆ بەرپاکردنی نوێژەکە.

(٣) بریتییە لەو جۆرە نەخۆشییە کەبەعادەت ئینسان لێی قوتار نابێت.

وەك (ابـن حـزم الأندلسـي) گوتوویـەتی: مالیکییـەکان هـیچ بەڵگەیـەکی ئەوتۆیان لەو بارەوە بەدەستەوە نیە.

## ٣-مەرجەکانی جێبەجێبوون (شروط النفاذ):

وەك پێشـتر خسـتمانە ڕوو، مەرجـەکانی جێبـەجێبوون، ئەوانـەن کەپێویسـتە لەگرێبەستی مارەکردندا بێنەدی، بـۆ ئـەوەی مارەکردنەکـە پـاش دامـەزرانی بێتـە دی، نەك ڕابگیرێ‌و بوەستێنرێ.

ئەمانیش لەلای تێکرا، یان زۆربەی، یان بەشێك لە زانایان، ئەمانەن:

١- دەبێ هەرکام لەدوو گرێدەر (عـاقد)ەکـە، خـاوەنی لێهـاتوویی ڕەفتـارکردنی تەواو (صاحب کامل اهلية التصرف) بن، کەئەمیش بە: عـاقڵیی‌و بـاڵغیی‌و ئازادیی(العقل والبلـوغ والحريـة) دێتـە دی، جاهـەر کـات پیـاوو ئافرەتەکـە کەلەیەکـدی مـارە دەکـرێن، بـەو جـۆرە بـوون، ئـەوە گرێبەسـتەکە دروسـتە جێبەجێ بکرێ، بەڵام ئەگەر یەکیان یان هەردووکیان وانەبوون، ئەوە لە سەر ڕێدان(اجازة)ی سەرپەرشتیار پەکی کەوتوەو، ئەگەر مۆڵەت(إذن)ی دا باشە، ئەگـەرنا دەبـێ بوەسـتێنرێ، دیـارە ئەمـەش ڕای حەنەفییەکانـە، بـەڵام ڕای زۆربە ئەوەیە- وەك پێشتریش گوتمان-کـە ڕەفتارەکـان(تصـرفات)ی منـداڵ‌و کۆیلە، هەر لەئەصڵدا ناتەواوو دانەمەزراون.

هەروەها زۆربەی زانایان ڕایان وایە، کەئافرەتیش بۆی نیە بۆ خۆی خۆی مارە بکات، بەپێچەوانەی حەنەفییەکانەوە، کـەدواتر تیشـك دەخەینـە سـەر ئـەم مەسەلەیە.

٢- نـابێ بابـای ڕاسـپێردراو(وکیل) پێچـەوانەی ڕای ڕاسـپێرەر(موكّـل)ەکـەی

بجووڵێتــەوە، هــەرکاتێك کردیــە وەکیــل بــۆ گرێبەســتی هاوســەرێتیی، جــا هــەرکاتێك پێچــەوانە جوولایــەوە ســەودایەکە ڕادەگــیرێ، تــاکو بابــای وەکیلگر(موکِّل) ڕێ دەدات.

پێموایە ئەم مەرجەش سەرجەم زانایان تێیدا کۆکن.

٣- لەبارەی سەر ڕاست (رشید)بوونی بابای مێرد (زوج) یشەوە، مالیکییــەکان بەمەرجیان داناوە بۆ جێبەجێبوونی (النفاذ)، بەلام حەنەفییەکان بەمەرجیان نەگرتوە.

٤- هەروەها ئەوە کەنابێ مارەبڕ (عاقد)ەکە سەرپەرشتیارێکی دووربێ لەکاتی هەبوونی سەرپەرشتیارێکی نیزیك (مع وجود ولـي أقـرب)دا، حەنەفییــەکان بەمەرجی جێبەجێبوونو مالیکییەکانیش ئەگەر سەرپەرشتیارە نیزیکەکـە بـاب بێـت، ئـەوەیان بەمــەرجی دامــەزران دانــاوە، بــەلام شـافیعییەکانو حەنبەلییەکان ئەو مەرجەیان بەمەرجی دروستبوون (شرط الصحة) دانـاوە، مەگەر پەرچێك لەبەردەم سەرپەشـتیارە نیزیکەکـەدا هـەبێ، وەك: شـێتیی، گچکەیی، ڕێگریی لەهاوسەرگرتن (العضل).

٥- نابێ بابای مارەبڕ(عاقد) خۆتێهەڵقورتێنەر(فضولي) بێت، کەمەبەست لـە (فضولي) کەسێکە کە لەکاتی گرێبەستەکەدا، مافی سەرپەرشتیاری نـەبێ، جائەم مەرجەش لەلای حەنەفییەکانو مالیکییەکان مەرجی جێبەجێبوونـە، بــەلام شــافیعییەکانو حەنبەلییــەکان ڕەفتــار (تصــرف)ی بابــای خۆتێهەڵقورتێنـەر، هـەم لـەبواری مـارەکردنو هـەم مامەڵـەو سـەوداش دا، بەبەتاڵ دەزانن.

## ٤-مەرجەکانی بەردەوامبوون و هەڵنەوەشانەوە (شروط اللزوم):

واتە: ئەو مەرجانەی کەگرێبەستەکە والێدەکەن کەهیچ کام لـەدوو (عـاقد)ەکـەو غەیری وانیش نەتوانێ هەڵیبوەشێنێتەوە:

١-دەبێ ئـەو پیـاوەی ئافرەتەکـەی لـێ مـارەکراوە، هـاوکوف (کـفء)ی بـێ، ئەگـەرنا هـەم ئافرەتەکـەو هـەم سەرپەرشـتیارەکان (الأولیـاء) مـافی ڕەخنەلێگرتنیو هەڵوەشاندنەوەییان هەیـە، دواتـریش بەتایبـەت باسـی ئـەم مەسەلەیە دەکەین.

٢-دەبێ بابای مێـرد هـیچ کـام لەنەخۆشـییەکانی بێچـووکیی(الجَبّ) و چـووك شـلیی(العِنَّـة)ی نـەبێ[1]، ئەگـەرنا ئافرەتەکـە هـەقی خۆیـەتی داوای هەڵوەشاندنەوە(الفسخ)ی نیکاحەکەی بکات.

هەروەها ئەگەر ژنەکەش نەخۆشییەکانی ڕێگری سـەرجێیی (أمـراض موانـع الجماع)ی هەبن، بەهەمان شێوە پیاوەکەش هـەمان مـافی هەڵوەشـاندنەوەی هەیە.

دیسـان نەخۆشـییەکانی شـێتیی (الجنـون) و گـولیی (الجـذام) و بەڵـەکیی (البَرَص)یش لەهەرکامێکیان دا هەبن بەهەمان شێوە.

٣-حەنەفییەکانیش هەندێك مەرجی دیکەیان هەن کەتایبەتن بەخۆیانەوە.[2]

ئەمانە بەکورتیی پایەو مەرجەکانی هاوسەرێتیی (الزواج) بوون.

---

(١) لەبەشی حەوتەم دا بەدرێژیی باسی ئەم مەسەلەیەو، بەوردیی پێناسەی نەخۆشییەکانی ژنو پیاو کراوە.

(٢) بڕوانە: (الفقه الإسلامي وأدلته) ج٩ص٦٥٧٧ و ٦٥٧٩، وە بڕوانە: (المفصل...) ج٦ص١٢٧، ١٢٨.

بەڵام لەکۆتایی ئەم خاڵی پێنجەمەدا مەسەلەیەك هەیە پێویستە ئاماژەیەکی پێبکەین: ئەو چوار جۆرە مەرجانەی کە ڕابردن هەموویان هەبوونیان لەئەسڵی مارەکردنەکەدا پێویستە، جا چ بۆ دامەزرانیی‌و، چ بۆ دروستبوونیی‌و، چ بۆ جێبەجێبوونیی‌و، چ بۆ بەردەوامبوونیی‌و سەرگرتنی، بەڵام هەندێك مەرجی دیکە هەن، کە لەم چوار جۆرە جیانو، دەگونجێ هەرکام لەژن‌و مێرد لەسەر یەکدی بەمەرجیان بگرن.

**ئەو مەرجانەش بەگشتی سێ جۆرن:**

١- ئەو مەرجانەی کەلەگەڵ ئامانجەکانی هاوسەرێتیی دا گونجاون‌و خاوەن شەرع خۆی فەرمانی پێکردوون، وەك ئەوەی ژن مەسرەف کێشرانی لەسەر مێردەکەی بەمەرج بگرێ، یان پیاو منداڵ بەخێوکردن لەسەر ژن بەمەرج بگرێ!

جا ئەم جۆرە مەرجانەی زانایان لەسەر جێبەجێکردنیان یەکدەنگن، وەك (ابن حجر) لە (الخطّابي)یەوە نەقڵی کردوە.[1]

٢- ئەو مەرجانەی کەپێچەوانەو دژی ئامانجەکانی مارەکردنن‌و، پێچەوانەی بڕیارەکانی شەریعەتن، وەك ئەوەی کەژنەکە لەسەر مێردەکەی بکاتە مەرج کەبەقسەی نەکات، یان دادگەریی لەنێوان خۆی‌و هەوێ(ضرة)یەکەی دا نەکات! ئەم جۆرە مەرجانەش وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی:[2] (..فهذه الشروط باطلة باتفاق المسلمين في جميع العقود) واتە: ئەم مەرجانە بەیەکدەنگیی مسوڵمانان لەهەموو گرێبەستییەکان دا پووچ و ناهەقن.

---

(١) (فتح الباري) ج٩ص٢١٨.
(٢) (مجموع الفتاوى) ج٣١ص٢٨.



هەروەها زانایان لەوبارەوە ئەم بنچینە شەرعییەیان داناوە: (ما ثبت بالشرع مقدّمٌ على ماثبت بالشرط).[١]

٣- ئەو مەرجانەی کەپێچەوانەو دژی ئامانجەکانی هاوسەرێتیی و بڕیارەکانی شەریعەت نین، وەك ئەوەی کەژنەکە لەسەر مێردی بکاتە مەرج کەلەشارەکەیان بارنەکەن، یان ژنی بەسەر نەهێنێ، یان لەسەر ئەو کارەی بەردەوام بێت کەشەرع ڕێی داوە بیکات، جا زانایان لەبارەی ئەم جۆرە مەرجانەوە ڕاجیاییان هەیەو، هەرچی زۆربەو جەماوەرن دەڵێن: ئەوجۆرە مەرجانە دروست نین، جاهەیانە هەر ئەسڵی مارەکردنەکەش کەئەم مەرجانەی تێدا بەمەرج گیراون بەدانەمەزراو (غیر منعقد) دادەنێ و، هەشیانە نیکاحەکە بەدامەزراوو مەرجەکانی بەناشەرعیی دادەنێ و، پێوە پابەندبوونیشیان بەپێویست نازانێ.[٢]

بەڵام ژمارەیەك لەزانایان کەحەنبەلییەکانو (شریح وعمر بن عبدالعزیز وجابر بن زید وطاوس والأوزاعي وإسحاق)یان لەنێودانو (ابن تیمیة)ش هەڵیبژاردوە، دەڵێن:[٣] بەمەرج گرتنی ئەو جۆرە مەرجانەش شەرعییەو پێوە پابەندبوونیشیان پێویستە، منیش وای تێدەگەم ئەم ڕایەی دووەم ڕاستتر بێت، چونکە چەندان فەرموودە هەن کەفەرمان بەبەجێهێنانی مەرجان (الوفاء بالشروط) دەکەن، بەتایبەت مەرجێك کە لەنیکاح دا بەمەرج گیرابێ، بۆ وێنە: ((**أَحَقُّ مَا أَوْفَيْتُمْ مِن الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الفُرُوجَ**)) رواه البخاري عن عقبة بن عامر الجهني. واتە:

(١) (الأشباه والنظائر) للسیوطي ص ١٤٩.
(٢) (أحكام الزواج..) ص ١٨٥، ١٨٦.
(٣) سەرچاوەی پێشوو، ص ١٨٥، ١٩١.

(بێگومان شایستەترین ئەو مەرجانەی کەپێویستە وەفایان پێبکەن، ئەو مەرجانەن کەداوێنەکانتان بۆ خۆتان پێ حەڵاڵ کردوون).

## ٦- سەرپەرشتیکردنی بەشوودانی ئافرەت:

شەرعزانان وشەی (ولایة)یان ـ کەئێمە بەکوردی (سەرپەرشتیاریی)مان بۆ داناوە ـ بەچەند جۆرێك پێناسە کردوە، کەڕەنگە ئەمە باشترینیان بێت:
(الولایة هي قدرة الشخص شرعاً على إنشاء التصرف الصحیح النافذ على نفسه أو ماله، أو على نفس الغیر وماله) واتە: سەرپەرشتیاریی بریتییە لەدەسەڵاتی کەسێك لەڕووی شەرعییەوە، لەسەر ڕەفتاری ڕاستو جێبەجێبوو بەسەرخۆی یان ماڵو سامانیدا، یان بەسەر نەفسو ماڵو سامانی غەیری خۆیدا.
جائێستا با لەچەند بڕگەیەکدا باسی ئەم مەسەلەیە بکەین ـ واتە مەسەلەی سەرپەرشتیکردنی بەشوودانی ئافرەت:-

### یەك: حیکمەتی هەبوونی سەرپەرشتیارێکی پیاو (وليّ رجل) بۆ بەشوودانی ئافرەت:

ئەوە کەشەریعەت بڕیاریداوە، پێویستە پیاوان سەرپەرشتی بەشوودانی ئافرەتان بکەن، مەبەست بەکەم تەماشاکردنی ئافرەتان نیە، بەڵکو ئەم حیکمەتانەی تێدا هەن کەسەرجەم بەبەرژەوەندیی ئافرەت تەواو دەبن:
١- پاراستنی کەسایەتیی ئافرەت لەوە ،کەوا بێتە بەرچاو کەم شەرمەو زۆر ئارەزووی پیاوان دەکات، چونکە بێگومان ئافرەت بەفیترەت ڕقی لەوەیە کەبەوجۆرە سەیر بکرێ.

٢- بێگومان پیاوان چاکتر یەکدی یەکتردەناسن‌و بۆ کەسایەتی ناسینی بابای خوازبێنیکەر (خاطب)، ئەگەر ئافرەت وێڵ بکرێ، مەگەر چۆن دەنا تووشی فریودران‌و پەشێمانیی دەبێ.

٣ـ شەریعەت جەختی لەسەر ئاشکراکردن(اعلان)ی نیکاح کردوە و، ئەو ئامانجەش بە ئامادەبوونی بابای سەرپەرشتیار، پاشان شاهیدەکان‌و دەعوەت، باش دێتە دی.

٤-بێگومان پێکەوە پەیوەستبوونی ژن‌و مێرد، مەسەلەیەك نیە تەنها پەیوەندیی بەخۆیانەوە هەبێ، بەڵکو چەند خێزان‌و بنەماڵەیەك تێیدا بەشدارن‌و، تۆڕێکی فراوانی پەیوەندیی جۆراوجۆر بەوهۆیە دروست دەبێت‌و، جێی خۆشیەتی ئەو خەڵکە کەم‌وزۆر ئاگایان لەو مەسەلەیە هەبێ، چونکە بێگومان دوایی ئەو ئافرەتە هەر گرفت‌و کێشەیەکی هەبێ، خزم‌و نیزیکەکانی کەمو زۆر بەهۆیەوە دووچاری گرفتاریی و سەرئێشە دەبن.

## دوو: خەسڵەتەکانی بابای سەرپەرشتیار: [١]

زۆربەی هەرەزۆری زانایانی ئیسلام، لەسەر ئەوە رێککەوتوون کەپێویستە بابای سەرپەرشتیار مسوڵمان‌و نێرینەو عاقڵ‌و بالغ بێت، بۆ وێنە: (ابن رشد) گوتوویەتی: (إتفقوا على أن من شرط الولاية: الإسلام والبلوغ والذكورة). [٢]

هەروەها زۆربەیان لەسەر ئازادیی (الحرية) بابای سەرپەرشتیاریش رێککەوتوون، وەك (ابن قدامة) گوتوویەتی. [١]

---

(١) بۆ نووسینی ئەم خاڵەش سوودم لە: (أحكام الزواج..) ص ١١٧ تا ١٦٢، (المفصل..) ج٦ ص٣٣٩ تا ٤١٢،: (الفقه الإسلامي) ج٩ص ٦٥٧٢ تا ٦٥٧٤، وەرگرتوە.

(٢) (بداية المجتهد) ج٢ص١٢.

بـەڵام بـۆ دادگـەریی (العدالـة) ئـەوە ڕای زیاتریـان لەسـەر ئەوەیـە کـە لەسەرپەرشـتیاردا بەمـەرج نـەگیراوە، وەك (الکاسـاني) هێناویـەتی[٢]، بـەڵام هەندێکیان کەشافیعی یان لەنێودا هەیە، ڕایـان وایـە کەدادگـەر (عـادل) بـوونیش مەرجە بۆ بابای سەرپەرشتیار، بەڵام وەك زۆربـە گوتوویانـە، ئایـەتی، ﴿وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ﴾ (النور: من الآیة٣٢)، یەکدەنگیی ئۆممەت لەسەر ئەوە کەهەمیشە پیـاوان بەگشـتی کـچ‌و خوشـك‌و خزمـەکانیان بەشـووداوەو، مـارەبڕیوە، بـەبێ لێکۆڵینـەوە لـەپارێزکاریی‌و خراپـەکارییان (مەبەسـت پارێزکـاریی‌و خراپـەکاریی پیاوانە)، وە هەبوونی بەزەیی‌و پـەرۆش‌و بەتەنگـەوە بـوونی بەرژەوەنـدیی ئافرەتـان لەتێکڕای پیـاواندا، هـەموو ئەمانـە بەڵگـەن لەسـەر بەمـەرج نـەگیرانی دادگـەریی لەبابای سەرپەرشتیاردا.[٣]

هەروەها زۆربەی زانایان، دیتن (بصر) و گۆیایی (نطق) یشیان بەمەرج نەزانیوەو سەرپەرشتیاریی بابای کوێرو لاڵیشیان بەڕەوا داناوە.[٤]

### سێ: سنووری دەسەڵاتی بابای سەرپەرشتیار:

زانایـانی ئیسـلام پاشـئەوەی لەسـەر پێویسـتبوونی هـەبوونی سەرپەرشـتیارو ڕێگادانی بەهاوسەردارکردن (تزویج)ی کچ‌و کـوڕی گچـکە، یەکـدەنگ بوونـە، وەك هەرکام لە: (ابن المنذر وابن قدامة وابن حجر العسقلاني) ئەو یەکدەنگییەیان نـەقڵ

---

(١) (المغني) ج٧ص ٣٥٦.
(٢) (بدائع الصنائع) ج٢ص ٢٣٩.
(٣) (بدائع الصنائع) ج٢ص٢٣٩.
(٤) (المغني) ج٧ص٣٥٧.

کردوه، [١] وە پاشئەوەی لەبارەی پەسەندو چاکبوونی هەبوونی سەرپەرشتیارو ڕازی بوونی بۆ بەشوودانی ئافرەتی باڵغ، چ کچ بێ چ بێوەژن، ڕێککەوتوون، وە لەبارەی پێویست نەبوونی سەرپەرشتیارەوە بۆ ژنهێنانی کوڕی باڵغ دیسان یەکدەنگ بوونە، لەبارەی ئەوەوە کەئایا هەبوونی سەرپەرشتیارو بوونی، مەرجە بۆ مێردکردنی ئافرەتی باڵغ ـ چ کچ چ بێوەژن -؟! ڕاجیاییان هەیەو هەرچی زۆربەیانن ـ وەك لەبەشی سێیەم لەخاڵی یەکەمیدا خستمانەڕوو ـ دەڵێن: بەڵێ هەبوون و ئامادەبوونی سەرپەرشتیار بۆ شووکردنی ئافرەت و هاوسەرگرتنی مەرج و پێویستە، بەڵام (أبو حنيفة) تەنها بەپەسەندی دادەنێ و بەمەرجی نازانێ.[٢]

دیارە مەسەلەی بەمەرج گرتنی هەبوونی سەرپەرشتیاریش بۆ مارەکردنی ئافرەت، لەگەڵ مەسەلەی تۆبزیی کردن(اجبار)ی سەرپەرشتیار یان نەکردنی، بۆ مارەبڕینی ئافرەت، دوو مەسەلەی لەیەك جیان، هەرچەندە زۆر کەسیش لێی تێکەڵ دەبن!

چونکە لەحاڵێکدا کەزۆربەی هەرەزۆری زانایان هەبوونی سەرپەرشتیار بۆ مارەکردنی ئافرەتی باڵغ - هی گچکەش چاکتر - بەمەرج دەگرن، دیسان زۆربەی هەرەزۆریشیان تۆبزیی لێنەکرانی ئافرەت و ئازادبوونی بۆ هەڵبژاردنی هاوسەریش هەر بەپێویست دەزانن و بەمەرج دەگرن، بۆ دروستبوونی مارەکردن (صحة النكاح) و بگرە بۆ ئەسڵی دامەزران (انعقاد)یش! وەك لەخاڵی یەکەمی بەشی سێیەمدا بەتێرو تەسەلی خستوومانەتەڕوو.

جا زانایان بەڵگەیان لەسەر ڕەوابوونی مارەبڕین و لێمارەکردنی کچان و کوڕانی

---

(١) (فتح الباري) ج٩ص١٩٠.

(٢) (المغنى) ج٧ص٣٣٧، (المحلى) لإبن حزم، ج٩ص٤٥١، (السيل الجرار) للشوكاني ج٢ص٢٥٩.

بچووك، چەند شتێکە، بۆ وێنە:

أ- ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ ﴾(الطلاق: من الآية٤)، وەك دەبینین خوای زانا عیددەی ئافرەتانێك كەجاری نەكەوتوونە حەیزەوە، وەك هی ئەوانەی كەلەحەیز چوونەتەوەو نائومێد بوونە، بەسێ مانگ داناوە، دەجا دیارە تەلاقیش تەنها پاش مارەكران دەبێ، كەواتە: دیارە دروستە كچی گچكە مارە بكرێ، پێش باڵغ بوونو كەوتنە حەیزیشەوە!

شایانی باسیشە كە (بخاري) لەژێر ئەم ئایەتەدا كەهێنامانەوە، ناونیشانێكی بەم جۆرە هێناوە: (باب إنكاح الرجل ولده الصغار).[1]

ب-هەروەها (بخاري) هەر لەوبارەوە ئەو فەرمایشتەی هێناوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ عائیشەی-خوا لێی ڕازی بێ- بە شەش ساڵی مارەكردوەو، بەنۆ ساڵییش بۆی گوازراوەتەوە.[2]

بەڵام كاتێك مارەكردنو لێمارەكردنی كچ و كوڕی نەباڵغ دروستە، كەئەم مەرجانە بێنەدی:

١- دەبێ سەرپەرشتیارەكە باب(أب) بێت، نەك سەرپەرشتیارەكانی دیكە، ئەمە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، كە (مالك وشافعي و أحمد وأبوعبیده والثوري وابن أبي لیلی)یان لەنێودان، بەڵام شافیعی باپیر(جد)یشی وەك باب داناوە.[3]

---

(١) (صحيح البخاري) ج٩ص١٨٩.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

(٣) (المغني) ج٩ص٤٠٢.

٢- دەبێ ئەو هاوسەرەی بۆی هەڵدەبـژێرێ، هـاوکوفی بێـتو عـەیبـدار نـەبێ، چونکە ئەگەر چاكو هاوکوف نەبێ، هیچ بەرژەوەندییەکی منداڵەکـەی تێـدا نیە، کەواتە دروست نیە.[1]

هەروەها زۆربەی هەرەزۆری زانایان، کە سەرپەرشتیار(ولی)یان بەمـەرج گرتـوە، بۆ بەشوودانو مارەکردنی ئافرەتی بالّغ، چەند بەلّگەیەکیان هێناوەتەوە، بۆ وێنە:

١-﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾ (النسـاء: مـن الآيــة٣٤)، هەرچـەندە لەبەلّگەبوونی ئەم ئایەتەدا لەسەر ئەو مەبەستە، جێگای مشـتومڕ هەیـە، بەلاّم مادام بەشوودانی ئافرەتیش هەر مەسەلەیەکی خێزانییەو، ئایەتەکەش هەر لەوبارەیەوە، تارادەیەکی زۆر مەودای مشتومڕ کەم دەکاتەوە.

٢-﴿ وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ ﴾ (النـــور: مــــن الآيـــة٣٢)، ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴾ (البقرة: من الآية٢٢١)، چـۆنیەتی بەلّگـەبوونی ئـەم ئایەتانـەش ئەوەیـە وەك (ابـن تیمیـة) گوتوویـەتی:[2] کـە خـوای پەروەردگار لەبارەی مارەبڕین(إنكاح)ەوە، ڕووی دواندن(خطاب) و فـەرمانو نەهێشـتن(الأمـر والنهـي)ی کردۆتـە پیـاوانو، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ کەئافرەتان لەوبارەوە هیچیان بەدەست نیە.

٣-﴿ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ ﴾ (النساء:من الآية٢٥)، وەك دەبیـنین خـوای کاربەجێ بۆ مارەکردنی کەنیزەك ڕێدان(إذن)ی کەسوکاری بەمەرج گرتوە.

٤- ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

(٢) (مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية) ج٣٢ ص ١٠٣.

تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾(البقرة: من الآية٢٣٢)، توێژەرەوانی قورئانیش بەتایبەت ئەوانەیان کەڕاوبۆچوونی زانایانی پێشین (علماء السلف) لەتەفسیرەکانیان دا دێنن وەك:
(الطبري[١] و ابن كثير[٢]و الشوكاني [٣] ) سەرجەمیان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەم ئایەتە ڕووی دواندنی لەو سەرپەرشتیارانەیە، کەپاش بەشوودانی ئافرەتانی ژێر چاودێریی یانو، تەلاقدرانیان لەلایەن مێردەکانیانەوە، لەحاڵێکدا ،کە ژنو مێردەکە بۆ یەکدی ژیوان بوونەتەوەو بەیەکدی ڕازی بوونەتەوە، ویستوویانە ڕێ لەو ئافرەتانە بگرن کەبگەڕێنەوە لای مێردەکانیان، جا مادام سەرپەرشتیاران (أولیاء) ئامۆژگاریی بکرێن، کەڕێی شووکردنەوە لەو ئافرەتانەی ژێر چاودێرییان نەگرن، دیارە بەشوودانو مارەبڕینیان مافی ئەوانەو، ئامۆژگارییان کراوە کەئەو مافە بەخراپ بەکارنەهێنن!
(البخاري)یش گێڕاویەتەوە[٤] کە هۆی دابەزین(سبب النزول)ی ئەم ئایەتە ئەوە بووە، کە (معقل بن يسار) خوا لێی ڕازی بێ خوشکێکی خۆیداوە بەپیاوێكو، ئەویش تەلاقێك، یان دوانی داوەو، پاشان بۆ یەکدی ژیوان بوونەتەوەو، داوای کردوە کەبیدەنەوە، بەڵام (معقل) ڕازی نەبوەو پێی گوتوە: (يَا لُكَعُ أَكْرَمْتُكَ بِهَا وَزَوَّجْتُكَهَا فَطَلَّقْتَهَا وَاللّٰهِ لا تَرْجِعُ إِلَيْكَ أَبَدًا).. ئنجا خوای بەبەزەیی ئەم ئایەتەی ناردەخوارێو، ئەویش کەفارەتی

---

(١) (جامع البيان) ج٢ص٦٥٨، ٦٥٩.
(٢) (مختصر تفسير ابن كثير) ج١ص٢١٧، ٢١٨.
(٣) (فتح القدير) ج١ص٣١٨.
(٤) (جامع البيان) ج٢ص٦٥٩، وە (فتح القدير) ج١ص٣١٨.

سوێندەکەی داوەو ناردوویەتیەوە لای.(١)

هەروەها زۆربەو جەماوەری زانایان چەند فەرمایشتێکیش بەبەڵگە دێننەوە، بۆ وێنە:

١- ((**لا نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ**)) واتە: بەبێ سەرپەرشتیار مارەکردن نابێ. رواه أبوداود والترمذي وابن ماجه وأحمد وصححه الألباني عن أبي موسى.

٢- ((**أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيِّهَا فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ فَإِنْ دَخَلَ بِهَا فَلَهَا الْمَهْرُ بِمَا اسْتَحَلَّ مِنْ فَرْجِهَا، فَإِنْ اشْتَجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَهُ**))رواه ابوداود وابن ماجه عن عائشة رضي الله عنها وصححه الألباني. واتە: (هەر ئافرەتێك بەبێ رێدانی سەرپەرشتیارەکەی مێردی کرد، ئەوە مارەکردنەکەی بەتاڵە، مارەکردنەکەی بەتاڵە، مارەکردنەکەی بەتاڵە، جا ئەگەر چوو بووە لای، ئەوە مارەیی دەکەوێ بەهۆی ئەوەوە، کە داوێنی بۆ خۆی حەڵاڵکردوە، وە هەر کاتێك کۆمەڵێك سەرپەرشتیار لەسەر بەشوودانی ئافرەتێك بوو بەدەمەقاڵێیان، ئەوە حوکمڕان، سەرپەرشتیاری هەر ئافرەتێکە کەسەرپەرشتیاری نەبێ).

شایانی باسیشە ئەوانەش، کە ڕایان وایە ئافرەتی باڵغ، شووکردنی لەسەر ئامادەبوونی سەرپەرشتیار پەکی نەکەوتوە، چەند شتێکیان بەبەڵگە هێناوەتەوە، کە لەڕاستیدا بەهیچ شێوەیەك هێزو پێزی ئەوەیان نیە، کە لەبەرانبەر بەڵگەکانی زۆربەو جەماوەری زانایان دا بوەستن، هەروەها بەڵگەکانی ئەوانەش، کە ڕایان وایە

(١) بەڵام وەك گوتراوە: (ان خصوص السبب لایمنع شمول المعنی) بۆیە حوکمو واتایەکەی گشتییە، وەلەبەرگی یەکەمی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)دا بەدرێژیی قسە لەسەر ئەم مەسەلەیەکراوە

دروست نیە کورو کچی بچووك لەلایەن سەرپەرشتیاریانەوە هاوسەدار(تزویج) بکرێن، بەهەمان شێوەن، بۆیە ئاماژەپێکردنی ئەوانیشم بەپێویست نەزانی.

## چوار: مافەکانی سەرپەرشتیارو ئەرکەکانی سەرشانی:

بابای سەرپەرشتیاری ئافرەت (ولي المرأة) بەحوکمی سەرپەرشتیارێتییەکەی، هەقی خۆیەتی کەزۆرباش چاوبگێڕێو وردبێتەوەو دووربینیی بکات، لەهەڵبژاردنو دیاریکردنی پیاوێکی شایستەو هاوکوف دا، بۆ ئەو ئافرەتەی، کە لەژێر چاودێرییدایەو لێی بەرپرسیارە، هەم لەبەر بەرژەوەندیی ئافرەتەکە خۆیو، هەم لەبەر بەرژەوەندییو سومعەو کەرامەتی بنەماڵەو خزمەکانیشی، چونکە وەك پێشتریش گوتمان: مەسەلەی هاوسەرگرتن (زواج) شتێك نیە تایبەت بێت بەپیاوو ئافرەتەکەوە، بەڵکو بنەماڵەو خزمەکانیشیان کەمو زۆر دەگرێتەوە.[1]

پێویستیش بەدووبارەکردنەوە ناکات، کەئەو سەرپەرشتیارێتییە شتێکی زۆرەملێیو تۆبزکاریی(قسري وجبري) نیەو، تەنها دووربینییەکە بۆ گیرۆدەنەبوونی هەڵەو عەیبەیەك، کە وێڕای ئافرەتەکە خزمو کەسوکاریشی باج(ضریبە)ەکەی دەدەن.

هەروەها بابای سەرپەرشتیار، لەچەند ڕوویەکیشەوە بەرانبەر بەئافرەتە سەرپەرشتییکراو(المرأة المولیة)ەکەی بەرپرسیارە، کەئەمانە گرنگترینیانن:

١- دەبێ ئەو ئافرەتە بەپیاوی خاوەن دینو ڕەوشت نەبێت نەدات، چونکە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ...**)) رواه الترمذي.

(١) (المفصل..) ج٦ص٣٥٢، ٣٥٣.

٢- دەگونجێت ئینسان ئافرەتی ژێر چاودێریی خـۆی پێشـنیار بکـات بـۆ پیـاوی دیندارو نەجیبو تێرابینراو، چونکە لە (صحيح البخاري)دا هاتوە کە (عمـر بن الخطاب) حەفصەی کچی، خوا لێیـان ڕازی بێـت، بەرلـەوەی پێغەمبـەری خوا ﷺ بیخوازێت، بۆ هەر کام لە (أبوبکر) و (عثمان) خوا لێیـان ڕازی بـێ پێشنیار کردوە.

٣- هەروەها پێویستە وێڕای دینداریی‌و ڕەوشت بەرزیی، قـەدو قیافـەو دیمـەنی جوانیش لەو پیاوەدا کەئافرەتەکەی پێدەدات، ڕەچـاو بکـات، (ابـن الجـوزي) لەوبارەوە گوتوویەتی: [1] (واستحب لمن أراد تزويج بنتـه أن ينظـر لهـا شـاباً مستحسـن الصـورة، لأن المـرأة تحـب مايحـب الرجـل) واتـە: بـۆ کەسـێك کەکچەکەی بەشوو دەدات، وا باشە کەچاوی بۆ لەگەنجێکی دیمەن ڕێكوپێـك بگێڕێـت، چـونکە ئـەوەی پیـاو حـەزی لێـدەکات، ئـافرەتیش هـەر حـەزی لێدەکات.

٤- هەروەها وا باشە بابای سەرپەرشـتیار ڕەچـاوی ئەنـدازەی تەمـەن‌و سـاڵیش بکات، هەرچەندە لەڕووی شەرعییەوە دروسـتیش بێـت، بـەڵام گـەلێك جـار جیـاوازیی زۆری تەمـەن، گیروگرفتـی زۆری بەدواوەیـە، (ابـن الجـوزي) لەوبارەشەوە گوتوویەتی:[2] (وإياك أن تزوج البنت بشيخ أو شخصٍ مكروه، فربما حملها ذلك على ما لا ينبغي..)، واتە: وریابەو نەچی کچ بدەیە پیرێك، یان کەسێکی وا ،کە خۆشی نـەوێت، چـونکە زۆرجـاران ئـەوە وای لێـدەکات تووشی هەڵوێست‌و ڕەفتاری ناشایست ببێت.

٥- دیسان پێویستە دەستوبرد بکات لە بەمێرد دانیدا، مـادام کـاتی هاتبـێ‌و

---

(١) (أحكام النساء) لابن الجوزي، ص ٣٠٥.

(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە..

خۆیشی ئامادەبێت، (الترمذي) گێڕاویەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە ئامۆژگاریی (علي بن أبي طالب)ی خوا لێی ڕازی بێت، کردوەو فەرموویەتی: ((**يَا عَلِيُّ، ثَلاثٌ لا تُؤَخِّرْهَا" الصَّلاةُ إِذَا آنَتْ، وَالْجَنَازَةُ إِذَا حَضَرَتْ، وَالأَيِّمُ إِذَا وَجَدْتَ لَهَا كُفْئًا**)) واتە: ئەی عەلی سێ شتان دوا مەخە: نوێژ کە کاتی هات، جەنازە کە ئامادە بوو، وە ئافرەت هەرکات پیاوی شایستەیت دۆزیەوە.[1]

٦- هەروەها لەسەر بابای سەرپەرشتیار پێویستە کەبەهیچ جۆرێك ڕێگریی نەکات لەشووکردنی ئەو ئافرەتەی کەسەرپەرشتی بەشوودانی دەکات، مەگەر بەبەڵگەی شەرعییەوە، کەشەرعزانان بەو ڕێگرییە(العضل) دەڵێن و، ئەمیش بەچەند جۆرێك پێناسە کراوە، کەڕەنگە ئەمە چاکترینیان بێت: (العضل: هو امتناع الولي من تزويج موليته من الكفؤ حيث يجب عليه هذا التزويج)[2]، واتە: (العضل) بریتیە لە ڕێنەدانی سەرپەرشتیار بە بەشوودانی ئەو ئافرەتەی لەبەردەستیەتی، بە کەسێکی شیاو، لەکاتێکدا کە لەسەریشی پێویست بووە بەمێردی بدات..

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێت کەزانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەلەکاتێکدا بابای سەرپەرشتیار لەسەر نەهێشتن (عضل)ەکەی خۆی سوور بوو، ئەوە سەرپەشتیارێتییەکەی لێدەستێنرێتەوەو لەوەوە دەگوازرێتەوە، جا هەندێك لەزانایان دەڵێن: لەو حاڵەتەدا مافی سەرپەرشتیارێتییەکە، یەکسەر دەچێتە دەستی حوکمڕان (الحاكم)ەوە، بەڵام هەندێکی دیکەیان دەڵێن: دەگوازرێتەوە بۆ

---

(١) ابن الأثیر گوتوویەتی: (الأیم) پیاوی بێژن و ئافرەتی بێمێردە، جابوویێتیو مردبێت ،یان هەر نەیکردبێت، (النهاية في غريب الحديث والأثر) ج١ص٨٥.
(٢) (المفصل...) ج٦ص٣٦١.

سەرپەرشتیارێکی دوورتر (ولـي أبعـد)، بەڵام وەك (ابن تيمية) گوتوویەتی:[1] زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کەئەگەر هاتو سەرجەم سەرپەرشتیارەکان لەسەر نەهێشتن (عضل) کۆبوون، ئەوە بێ‌سێو دوو مافی سەرپەرشتیارێتی (حق الولايە) لەهەموویان دەستێنرێتەوەو دەدرێتە دەست حوکمڕان.

مەبەست لەحوکمڕان (حاکم)یش یان (سلطان) تەنها خەلیفەو پێشەوای مسوڵمانان نیە، بەڵکو سەرپەرشتیاری دەڤەرەکان (ولاة المناطق) و جێگرەکان (النواب)و قازییەکانیشن.[2]

## ٧-شایەتییدان لەسەر بەشوودانی ئافرەت:

خوێنەری بەڕێز!

پێشتر لەخاڵی پێنجەم دا (پایەکانی مارەبڕین‌و مەرجەکانی) باسمان کرد، کەیەکێك لەمەرجەکانی دروستبوونی مارەکردن (صحة النكاح) بریتییە لەشایەدییدان‌و، لەوێ تەنها ئاماژەمان پێکردو بۆ ئێرەمان هەڵگرت، جا ئەوە لێرە لەچەند برگەیەکی کورتدا دەیخەینەڕوو:

**یەك:** جارێ تێکرای زانایانی ئیسلام وەك (إبن تيميه) گوتوویەتی: لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کەهەر مارەکردن (نکاح)ێك دوو پیاو یان زیاتر شایەتییان لەسەردابێت‌و ئاشکراش کرابێت، ئەوە ڕاست‌و دروستەو هیچ ئیشکالێکی تێدا نیە: (اذا اجتمع الإشهادُ والإعلان فهذا الذي لانزاع في صحته).[3]

---

(١) (مجموع الفتاوى) ج٣٢ ص ١٤٨.
(٢) (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) ص ١٤٩.
(٣) (مجموع الفتاوى) ج٣٢ص١٥٨.

**دوو:** هەروەها كۆڕای زانایان لەسەرئەوەش دامەزراوە، كەهەر مارەكردنێك هیچ كام لەشایەتییدانو جاڕدان (اعلان)ی تێدا نەبن، ئەوە بەتاڵەو بەزینا حیساب دەكرێت، وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی: (نكاح السر الذي يتواصون بكتمانه ولا يُشْهدون عليه أحداً، باطلٌ عند عامة العلماء وهو من جنس السفاح).[1]

**سێ:** بەڵام زانایانی ئیسلام لەدوو مەسەلاندا كەوتوونە ڕاجیاییەوە، واتە لەدوو جۆرە مارەكردن(نكاح)اندا:

١- مارەكردنێك كەشایەد شایەدییان لەسەرداوە، بەڵام ئەوانەی پێی هەڵساون ئاشكرایان نەكردوەو، جاڕیان لەسەری نەداوەو، هەوڵیانداوە بیشارنەوە!.

٢-مارەكردنێك كەئاشكرا كراوە، بەڵام هیچ شایەدێك لەكاتی گرێبەست(عقد)ەكەیدا ئامادە نەبووە!

**چوار:** زۆربەو جەماوەری زانایان كە (أبو حنيفة وشافعي وأحمد)یان لەنێودانو (ابن قدامة) گوتوویەتی:[2] لە (عمر وعلي و ابن عباس وسعيد بن المسيب وجابر بن زيد والحسن البصري و النخعي وقتادة والثوري والأوزاعي)یش گێڕڕاوەتەوە، دەڵێن: هەبوونی بەلای كەمەوە دوو شایەدی پیاو مەرجە بۆ دامەزرانو دروستبوونی مارەكردن، بەڵام (مالك) شایەدگرتن بەمەرجی دامەزرانو دروستبوونی نیكاح نازانێتو، پێی وایە بەس جاڕدان (إعلان) مەرجە، (ابن عبدالبر) لەوبارەوە گوتوویەتی:[3] (ليس الشهود في النكاح

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ١٣٠.

(٢) (المغني) ج٩ص٣٤٧.

(٣) (الإستذكار) ج١٦ ص ٢١٤، لە: (أحكام الزواج) ص ١٦٤.

عند مالك من فرائض عقد النكاح، ويجوز عقده بغير شهود، وإنما الفرض الإعلان والظهور لحفظ الأنساب..).

جا شایانی باسە کە (ابن تیمیة)ش ڕای (مالك)ی پەسەندکردوەو سەرخستوەو گوتووشیەتی: قسەیەکی (أحمد)یشە، خوا پاداشتی هەموو زاناو پێشەوایانی ئیسلام بداتەوە.

واش پێدەچێت ڕای زۆربەو جەماوەری زانایان ڕاستترو بەهێزتر بێت، چونکە چەند دەقێکی سوننەتیان بەدەستەوە هەن، کەپسپۆڕو شارەزایان بەڕاست(صحیح)یان داناونو، بێگومان پاش قسەو بڕیاری پێغەمبەریش ﷺ هیچ کەس بواری قسەکردنی نامێنێتو، ناشلێین (مالك) و هاوڕایانیشی پێچەوانەی سوننەت قسەیان کردوە، بەڵکو وا دیارە ئەو دەقانەیان پێنەگەیشتوون، یان بەناڕاست(غیر صحیح)یان تێگەیشتوون!.

ئەمەش ژمارەیەك لەو دەقانەیە:

١- ((**لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْنِ**))[1] رواه ابن حبان في صحيحه والدارقطني والبيهقي وصححه الألباني عن عائشة رضي الله عنها مرفوعاً، ورواه أبوهريرة وجابر بن عبدالله وأبو موسى الأشعري عن الحسن البصري مرسلا. واتە: (مارەکردن بەدووشایەدان نەبێ دروست نیە).

٢- ((**لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِشَاهِدَيْ عَدلٍ وَوَلِيٍّ مُرْشِدٍ**))سنده صحيح عن ابن عباس موقوفاً عليه كما قال الشيخ ناصرالدين الألباني.[2]

٣- ((**لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ**)) رواه الترمذي عن عباس موقوفاً وصححه عنه.

---

(١) (إراوء الغليل) ج٦ص٢٥٨.

(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٢٣٥.

٤- ((**لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدلٍ، فَإِنْ تَشَاجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَهُ**))رواه البيهقي عن عائشة رضي الله عنها مرفوعا الى النبيﷺ.

٥- (مالك) گێڕاویەتەوە[1] کەمەسەلەیەکی مارەکردن هێنراوەتە لای (عمر) خوا لێی ڕازی بێ، کەتەنها پیاوێك و ئافرەتێك شایەدی بوون، ئەویش گوتوویەتی: (هذا نكاح السر ولا أجيزه ولو كنت تقدمت فيه لرجمت) واتە: ئەوە هاوسەرگرتنی پەنهانە و مۆڵەتی پێنادەم‌و، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە، کە پێشینەم تێیدا نیە، ئەنجامدەرانیم بەردباران دەکرد.

هەڵبەتە لەم ڕۆژگارەی ئێستاشماندا حیکمەتی ئەو ڕایەی جەماوەری زانایان زۆرچاك ئاشکرا بووە، هەربۆیەش ئێستاکە هیچ کەس بەبێ شایەدگرتن ژن مارە ناکات.

ئنجا بێگومان ڕای هەرە ڕاست‌و پەسەندو بێ‌گرێ‌و گۆڵیش هەرئەوەیە کە ئینسان کارێك بکات لەڕاجیایی زانایان بچێتە دەرێ-هەتا بۆی بگونجێ- لێرەشدا بەوە لە ڕاجیایی زانایان دەچێتە دەرێ، کەبۆ هاوسەرگرتن (زواج) هەم شایەدان بگرێ‌و، هەم جاڕیشی بۆ بدات، کەبێگومان هەم شایەدگرتنەکەش جۆرێك لەجاڕدانی تێدایەو، هەم جاڕدان‌و ئاشکراکردنەکەش کۆمەڵێك شایەدان لەسەر مەسەلەکە پەیدا دەکات، هەربۆیەش شەریعەت فەرمانی بەهەردووکیان کردوە، جاپێشتر باسی ئەو دەقانەمان کرد کەباسی شایەدگرتن(إشهاد) دەکەن‌و، ئەمەش چەند دەقێکە لەسەر ڕاگەیاندن‌و جاڕدان بۆ نیکاح:

---

(١) (شرح الزرقاني على موطأ الأمام مالك) ج٣ص١٤٤، ١٤٥، لە: (المفصل..) ج٦ص١٠٨.

١- ((**أَعْلِنُوا هَذَا النِّكَاحَ وَاجْعَلُوهُ فِي الْمَسَاجِدِ وَاضْرِبُوا عليه بِالدُّفُوفِ**)) رواه الترمذي عن عائشة رضي الله عنها. واتە: (ئەم مارەکردنە ئاشکرا بکەن‌و، با لەمزگەوتان بێت‌و دەفانیشی لەگەڵ لێبدەن).

٢-((**فَصْلُ مَا بَيْنَ الْحَرَامِ وَالْحَلَالِ الدُّفُّ وَالصَّوْتُ**))رواه الترمذي عن محمد بن حاطب الجمحي. واتە: (جیاوازیی نێوان حەرام‌و حەڵاڵ ـ ی پەیوەندیی جینسیی ـ بریتیە لەدەفە لێدان‌و دەنگ لێهێنان)!

**پێنج**: لەبارەی شاهیدەکانیشەوە، زانایان لەهەندێك شتدا ڕێککەوتوون‌و، لەهەندێك مەسەلانیشدا ڕاجیاییان هەیە:

١- جارێ هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کەپێویستە بەلای کەمەوە دوو پیاو بن، [١] چونکە ئەسڵ لەبوونی شایەددا پیاوانن- لەوجۆرە مەسەلانەدا کەزیاتر پیاوان پێیان هەڵدەستن -: ﴿وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡ﴾(البقرة: من الآية٢٨٢).

٢- هەروەها پێم شك نایەت هیچ زانایەك بەپەسەندی نەزانیبێ، کەئەگەر بگونجێ ژمارەی شایەدەکان لەدوان زیاتر بێ، چونکە ئیعلانکردنی نیکاح ئامانجێکی شەرعییەو بەژمارەی زیاتری شایەدەکانیش ئەو ئامانجە چاکتر دێتەدی.[٢]

٣- بەلام لەو بارەوە کە ئایا مەرجە هەردووك شایەدەکان نێرینە بن؟ زانایان ڕاجیایی یان هەیەو، هەرچی (النخعي والأوزاعي والحنابلة والشافعية)ن دەڵێن، مەرجە شایەدەکان پیاو بن، بەڵگەشیان ئەوەیە کە (الزهري)[٣]

(١) (المفصل..) ج٦ص١١٦.
(٢) (مغني المحتاج) للشربيني، ج٣ص١٤٤.
(٣) (المغني) لأبن قدامة، ج٦ص٤٥٢، ٤٥٣.

گوتوویەتی: (مضت السنة عن رسول الله ﷺ أن شهادة النساء لا تجوز في الحدود ولا في النكاح ولافي الطلاق)، بەڵام (الحنفية والزيدية والظاهرية)[1] دەڵێن: پیاوێكو دوو ئافرەتیش هەر دەبن، بگرە (الظاهرية) دەڵێن: چوار ئافرەتیش هەر دەگونجێن، پێشتریش لەبەشی سێیەمو خاڵی (٨)ی (شایەدییدانی ئافرەت)دا خستمانەڕوو، كە ئەو مەسەلەیە هیچ دەقێكی پابەندكەر(نص مُلزِم)ی لەبارەوە نەهاتوەو، بواری تێدا فراوانە بۆ كۆشش (إجتهاد) و قسەو باسو مشتومڕی زانایانو، واش پێدەچێ ڕای دووەم چاكترو گونجاوتر بێت بەتایبەت هی (ظاهیری)یەكان، چونكە لەدەقەكانی سوننەتەوە دیارە كە ئامانجو حیكمەتی شایەدگرتن ئاشكرابوونو زانراو بوونە، بێگومان ئەو ئامانجو حیكمەتەش، وەك چۆن بەشایەدییدانی دوو پیاو دێتە دی، بەهەمان شێوەش بەشایەدییدانی پیاوێكو دووژن یان چوار ژنیش هەر دێتەدی!.

٤- هەروەها لەبارەی تایبەتمەندییەكانی شایەدەكانیشەوە، دیسان زانایان ڕاجیایی زۆریان هەیە لەبارەی هەندێكیانەوەو، لەسەر هەندێكیشیان یەكدەنگن.

جارێ بۆ سیفەتەكانی: (عاقڵ بوونو باڵغ بوونو مسوڵمان بوون) پێم وانیە كەسێكی وا هەبێ لەزانایانی ئیسلام كەبۆ شایەدەكان بەمەرجی نەگرتبن.

بەڵام لەبارەی نێرینەیی(الذكورة) كەپێشتریش ئاماژەمان پێدا، ڕاجیاییان هەیەو پێموایە (ظاهیری)یەكانیش لەوبارەوە لەهەموویان باشتر پێكاویانە.

---

(١) (المفصل..) ج٦ص١١٧.

هـەروەها لـەبارەی دادگـەریی(عدالـة)یشـەوە، زانایـان تـا ئەندازەیـەك ڕاجیاییان هەیـە، چـونكە هەرچـی حەنەفییـەكانن ،دادگـەر(عادل) بـوون بەمـەرج نـازانن‌و دەڵـێن: وەك چـۆن دروسـتە بابـای لارێ(فاسـق) ژنـی لێمـارەبكرێ، دروستیشـە بەشـایەدیش بگـیرێ، بـەڵام شـافیعییەكان‌و حەنبەلییەكان دادگەربوونی دوو شـایەدەكە بەپێویسـت دەزانـن، ئەوەنـدە هەیە دەڵێن: مەبەست دادگەریی ڕواڵەتیی(العدالـة الظـاهرة)یـەو، بابـای حاڵ‌و باڵ پۆشراو(الشخص المستور الحال) بەشایەد دەشێ، بەوپێیە قسـەو ڕای شـافیعیی و حەنبەلییـەكان جیاوازییـەكی ئـەوتۆی لەگـەڵ هـی حەنەفییـەكان نامێنـێ، بەتایبـەتیش كـەدەزانین ئـەو زانایانـەش كەدادگەرییان بەمەرج گرتوە، گوتوویانە: كەلەكاتی ناچاریی‌و تـێككگیران دا، بابای لارێ(فاسق)یش بەشایەد دەشێ.[1]

هەروەها زانایان لەبارەی ئـازادیی(الحریـة) شایەدەكانیشـەوە، مشـتومڕو ڕاجیاییان هەیـەو، هەرچـی حەنەفییـەكان‌و شـافیعییەكانن، پێیـان وایـە بابای كۆیلە(عبد) بەكەڵكی شـایەدییدان نایـەت! بـەڵام حەنبەلییـەكان‌و (ظاهیری)یەكان، ڕایان وایـە كەشـایەدیی كۆیلـەش وەك هـی ئـازاد(الحر) دروستەو، لەڕاسـتیدا ڕای دووەمـیش ڕاسـتە، چـونكە هـیچ بەڵگەیـەكی شایانی باس لەسەر قبووڵ نەكردنی شایەدیی كۆیلە نیە.[2]

بـەڵام تێكـڕای زانایـان لەسـەر ئـەوە كـۆكن، كەپێویسـتە هـەركام لەشـایەدەكان بـەڕوونیی گوێبیسـتی قسـەی دوو گرێـدەرەكان(كلام العاقدین) بـبن‌و، چـاكیش لێیـان تێبگـەن بـۆ پێویسـتكردن (الإیجـاب) و

(١) (المفصل..) ج٦ص١١٨ تا ١٢٠، وە (مجموع الفتاوى) لإبن تیمیة، ج٣٢ ص٣٨.
(٢) (المفصل..) ج٦ص١٢٢.

پەسەندگرتن(القبول) گوتنەکەیان، هەر بۆیەش پێم شك نایەت هیچ زانایەك شایەدییدانی بابای کەڕ(أصم) یان بابای لاڵ(أخرس)ی بەڕەواو دروست زانیبێ، چونکە کەڕ نازانێ چی گوتراوە، لاڵیش ناتوانێ هیچ قسەیەك بگێڕێتەوەو نەقڵ بکات![1]

## ٨- هاوکوفێتیی نێوان ژن و مێرد:

خوێنەری سەنگین!

پێشتر باسمان کرد کەئامادەبوونی سەرپەرشتیار(حضور الولي) بەلای زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلامەوە، مەرجی دروستبوونی مارەکردن(شرط صحة النكاح)ە، هەروەها خستمانەڕوو-بەتایبەت لەخاڵی یەکەمی بەشی سێیەمدا- کەسەرپەرشتیار بۆی نیە زۆرو تۆبزیی لەئافرەت بکات بۆ هاوسەرگرتن(الزواج).

**جالێرەدا بۆ شووکردنی ئافرەت و دیاریکردنی مێردی، سێ حاڵەت هەن:**

١- کە هەم ئافرەتەکەو هەم سەرپەرشتیارەکەیشی ڕێکدەکەون لەسەر دیاریکردنی هاوسەر(زوج)، دیارە لەم حاڵەتەدا ئیشەکە زۆر سێناو سروشتیانە پێکدێ و، هیچ گرفت و کێشەی تێدا نابێ.

٢- کە ئافرەتەکە بەکابرای دیاریکراو ڕازییەو، ئەویش بابایەکی شایستەو هاوکووفە، بەڵام سەرپەرشتیارەکەی بەبێ بەڵگەو پاساوی شەرعیی ڕێگری دەبێ، ئەم حاڵەتەش وەك پێشتر باسمان کرد بە (عضل) دادەنرێ و، سەرەنجام دەستەڵاتی شەرعیی بەرجەستە لەحوکمڕان و کاربەدەستەکانی و (قاضی)یەکاندا، چارەسەری دەکات و بەقازانجی ئافرەتەکە مەسەلەکە

(١) (المغني..) ج٩ص٣٥٠.

هەڵدەبڕێ.

٣ـ کە ئافرەتەکە بەبێ ڕەزامەنـدیی و ڕاڵێبـوونی سەرپەرشـتیارەکەی، دەیـەوێ ملی کابرایەکی نەگونجاوو ناشایستە بگرێ، لـەم حاڵەتـەش بـەڕای زۆربـەی هەرەزۆری زانایان بابای سەرپەرشتیار هـەقی خۆیـەتی نـەهێڵێ ئـەو سـەودا هەڵەیە سەربگرێ.

بۆیە پێویستە مەسەلەی هاوکوفێتیی بتوێژینەوە، تـاکو بـزانین و کـەنگێ و لـەچ حاڵەتێکدا سەرپەرشتیار بۆی هەیە، ڕێی شووکردن لەئافرەت بگرێ؟!.

## یەك: هاوکوفێتیی (الكفاءة) یانی چی؟!

(الکفـاءة) لەئەسـڵی زمـانی عارەبیـدا [١] بـەمانای (المماثلـة والمسـاواة) دێ و (الکفـؤ) یـانی (الـنظیر والمسـاوي) جـا بەوپێیـە دەگونجـێ بڵـێین: وشـەی (کفـاءة) لەکوردیدا بەمانای (هاوتا)و (هاو وێنە) و (هاوشان)و (هاوکوف) و (شایستە) دێ.

لەزاراوی شەرعیش دا[٢] بریتیە لە: (مسـاواة الرجـل للمـرأة في أمـور مخصوصـة كالدين والنسب والحرية وغيرها) واتە: هاوتایی پیاو بـۆ ئـافرەت لەچـەند شـتێکی تایبەتدا، وەك دینداریی و ڕەچەڵەك و ئازادیی و غەیری ئەوانەش.

شـایانی باسیشـە کەمەسـەلەی هـاوکوفیی و هاوتـایی لـەبواری هاوسـەرێتی (الـزواج)دا بـەڕای سـەرجەم زانایـانی ئیسـلام[٣] ، تـەنها لەپیاودایـە بەنسـبەت ئافرەتەوە، واتە: تەنها ڕەچاوی ئەوە دەکرێ کەپیاوەکە هاوتاو هاوشـانی ئافرەتەکـە

---

(١) (المعجم الوسيط) ص ٧٩١.

(٢) (المفصل..) ج٦ص٣٢٥.

(٣) (أحكام الزواج في ضوء الكتاب والسنة) ص١٩٧، و (بدائع الصنائع) للكاساني، ج٢ص٣٢٠.

بێتو، هاوتاو هاوکوف بوونی ژنەکە بۆ مێردەکەی گرنگ نیە.

## دوو: هەڵوێستی زانایان لەوبارەیەوە:

زانایان بەگشتی لەبارەی بەمەرج گرتن و نەگرتنی هاوتایی (کفاءة)یەو بۆ بەشوودانی ئافرەت، سێ ڕایان هەن:

١- دەڵێن: بێجگە لەهاوتایی و هاوشانیی لەڕووی دینداریی و پارێزکارییەوە، هیچ جۆرە هاوکوفییەکی دیکە نەمەرجەو نەڕەچاوکردنیشی پێویست و بگرە پەسەندیشە.[1]

٢- دەڵێن: هاوکوف بوونی پیاو بۆ ئافرەت، مەرجی دروستبوونی مارەکردنەو بەبێ ئەوە نیکاحەکە دروست(صحیح) نابێ![2]

٣- دەڵێن: هاوکوفێتی (الكفاءة) مەرجی بەردەوامبوون و هەڵنەوەشێنرانەوەو مەرجی بەردەوامبوون (شرط لزوم)ی مارەکردنەو، هەرکاتێك هەرکام لەئافرەتەکەو سەرپەرشتیارەکانیشی ڕازیبوون کە ئەوە ڕەچاو نەکرێ و گوێی پێنەدرێ، ئەوە مارەکردنەکە ڕاست و دروستە و هیچ ئیشکالی نیە، شایانی باسیشە کە هەرکام لەحەنەفییەکان و مالیکیەکان و شافیعییەکان و زۆربەی حەنبەلییەکانیش لایەنگرانی ئەم ڕایەی سێیەمن.[3]

ئاشکراشە کەڕای یەکەم و دووەم ڕاست پێچەوانەی یەکدین، چونکە هەرچی ڕای یەکەمە کە هاوکوفیی بەمەرجی دروستبوونی نیکاح دادەنێ، پێی وایە کەهاوکوفیی هەقێکی خواییەو بەڕەچاونەکرانی مارەکردن دروست (صحیح) نیە!

---

(١) ئەوە ڕای (مالك و ابن حزم و والشوكاني وصديق حسن خان)ە، (الروضة الندية) ج٢ص٩.
(٢) ئەمە ڕای (سفيان الثوري) و قسەیەکی (أحمد)ە، (المغني) ج٧ص٣٧٢.
(٣) (أحكام الزواج..) ص ١٩٩.

بەڵام ڕای دووەم پێی وایە کەهاوکوفیی نەك هەر هەقێکی خوایی(حق الله) نیە، بگرە مافی خەڵکی(حق الناس)یش نیەو، دروست نیە ڕەچاو بکرێ و هیچ ئیعتیبارێکی شەرعیی بۆ دابنرێ!

ڕای سێیەمیش کەوتۆتە نێوان تێپەڕاندن(إفراط)ی ڕای دووەم و بەزایەدان(تفریط)ی ڕای یەکەمەوە، هاوکوفێتیی بەهەقی خوا دانانێ، تاکو مارەکردن بەبێ وی سەر نەگرێ، بەڵام ناشڵێ هیچ ئیعتیارێکی نیە، بەڵکو دەڵێ هاوشانبوونی پیاو بۆ ئافرەت مەرجێکە کەلەژێر ڕکێفی هەرکام لەئافرەتەکەو سەرپەرشتیارەکانیدایەو، ئەگەر ڕەچاویان کرد، هەرکامێکیان-واتە هەم ئافرەتەکەو هەم سەرپەرشتیارەکانیش- دەتوانن لەکاتی نەبوونیدا(في حالة عدمه) ڕەخنە لەهاوسەرێتییەکە بگرن و، ئەگەر لەو مەرجە نەهاتنە خوارێ، نیکاحەکە هەڵبوەشێننەوەو، ئەگەر لێشی هاتنەخوارێ، جێبەجێی بکەن.

جا ئێستا باسەرنجی بەڵگەکانی هەرکام لەو سێ ڕایە بدەین، بەڵام لەپێشدا بەباشی دەزانم کەسەرنج بدەین داخۆ ئەو خەسڵەتانە چین، کەبۆ هاوکوف بوون پێویستە ڕەچاو بکرێن؟!.

## سێ: ئەو خەسڵەتانەی هاوتابوون (کفؤ) یان تێدا ڕەچاو دەکرێ:

زانایانی ئیسلام لەوبارەوە ڕاجیایی و مشتومڕی زۆریان لەنێواندا بووەو هەیە، بەم جۆرەی خوارێ:

### ١-لەڕووی دینداریییەوە:

زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەپیاوی کافر بەهیچ جۆرێك هاوکوفی ئافرەتی مسوڵمان نیەو، دەقەکانی قورئانیش لەوبارەوە زۆر ڕوون و ڕاشکاون، بۆ

وێنە:

﴿ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴾ (الممتحنة: من الآية١٠).

﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴾(البقرة: من الآية٢٢١).

بەڵام پێویستە بزانرێ کەمەبەست لەوشەی (دین) لەزاراوەی شەرعزاناندا کەلەوبارەوە بەکاری دێنن دینداریی(التدین) و پارێزکارییە، کەپێچەوانەی لاریی و لارێ بوون(الفسوق)ە، جا بەم واتاو چەمکەش، زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەسەر بەمەرج گرتنی (دین) یەکدەنگن و گەلێك بەڵگەشیان بەدەستەوە هەن، بۆ وێنە:

أ- ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ﴾ (النور: ٣).

ب- ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ ﴾ (السجدة:١٨).

ج- ((**إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ**))رواه الترمذي عن أبي هريرةﷺ.

(الصاوي)ش جوانی گوتوە: (فمخالطة الفاسق ممنوعة وهَجره واجب شرعاً، فكيف النكاح)[1] واتە: تێکەڵیی بابای گوناحکار قەدەغەیەو، بەپێی شەرع قسە لەگەڵ نەکردنی پێویستە، چ جای ژن و ژنخوازیی!

(١) (حاشية الصاوي على الشرح الصغير) ج٢ص٤٠١.



### ٢- لەڕووی ڕەچەڵەکو وەجاخەوە:

مەبەست لەوشەی (الحَسَب) خۆهەڵکێشانە بەنەسەبو ڕەچەڵەکو باب‌و باپیرانەوە، کە لەوشەی (الحساب)ەوە وەرگیراوە، چونکە پێویستییان بەژماردنی چاکەو شانازییەکانیان بووە!

جا وەك (ابن الحجر) گوتوویەتی:[1] جەماوەرو زۆربەی زانایان ڕایان وایە کەخەسڵەتی ڕەچەڵەك (نسب) پێویستە لەمەسەلەی هاوکوفێتیی (الکفاءة)دا ڕەچاو بکرێ، بەڵام (مالك) ڕای وایە کەخەسڵەتی ناوبراو لەهاوکوفێتییدا ئیعتیباری پێناکرێ.[2]

### ٣-لەڕووی ماڵ و سامانەوە:

زۆربەی زانایان کە مالیکییەکانو شافیعییەکانو حەنەفییەکانو هەندێك لەحەنبەلییەکان[3] و جەعفەرییەکانیشیان[4] لەنێودان، ڕایان وایە کەماڵو سامان بۆ بۆ هاکوفێتیی جێی ئیعتیبار نیە، ئەوەندە هەیە هەندێکیان، وەك حەنەفییەکانو حەنبەلییەکان، ئەوەیان بەمەرج گرتوە، کە دەبێ کابرا هێندەی سامان هەبێ، کە مارەیی (المهر)و مەسرەف کێشانی خێزانی پێ جێبەجێ بکرێ.[5]

---

(١) (فتح الباري) ج٩ص١٣٥.
(٢) (بداية المجتهد) ج٢ص١٦.
(٣) (أحكام الزواج..) ص ٢٣٠، ٢٣١.
(٤) (الأحكام الجعفرية في الأحوال الشخصية) عبدالكريم رضا الحلي، ص١٦، ١٧.
(٥) (أحكام الزواج..) ص ٢٣١.

**٤- لەڕووی ئازادییەوە:**

زۆربەی [١] زانایان ئازادیی بابای هاوسەرگر(متزوج)یش، بەمەرجی هاوکوفێتیی دەزانن، مادام ئافرەتەکە ئازاد بێت، بەڵام حەنبەلییەکان دەڵێن: ئازادیی یەکێك نیە لەخەسڵەتو مەرجە پێویستەکانی هاوکوفێتیی. [٢]

**٥- لەڕووی پیشەو کاروبارەوە:**

ئەمیش شافیعییەکانو بەشێك لەحەنبەلییەکان، بەخەسڵەتێکی پێویستی هاتنەدی هاوکوفێتیی نێوان پیاوو ژنی دەزانن، بەڵام (أبو حنیفة) و مالیکی یەکانو ڕای زاڵتر(الرأي الراجح)ی حەنبەلییەکان، ئەوەیە کەکارو پیشە بەمەرج نەگیراوە بۆ ئیسپاتی هاوکوفێتیی. [٣]

**٦- لەڕووی ساغو سەلامەتیی جەستەوە:**

ئەمیش زۆربەی زانایان بەیەکێك لەمەرجەکانی هاوکوفێتییان داناوە، لەگەڵ چەند وردە جیاوازییەکدا لەچۆنیەتی بەمەرج گرتنەکەیانو جۆری عەیبو ناتەواوییەکانی جەستەییدا، گرنگ ئەوەیە کەهەرکام لەمالیکییەکانو حەنەفییەکانو شافیعییەکانو حەنبەلییەکان، لەو بارەوە (مبدئیاً) یەك ڕایان هەیە، [٤] بەڵام (ظاهیری)یەکان ڕایان پێچەوانەیە. [١]

---

(١) (بدائع الصنائع) ج٢ص٣١٩، (بداية المجتهد) ج١ص١٧، (روضة الطالبين) ج٧ص٨٠.
(٢) (المقنع) ج٣ص٣٠، لە (أحكام الزواج) ص٢٣٢.
(٣) (المبسوط للسرخسي) ج٥ص٢٥.
(٤) (مغني المحتاج) ج٣ص١٦٥، (بداية المجتهد) ج٢ص١٢. (القوانين الفقهية) ص ١٣٢، لابن جزي.

لەكۆتایی ئەم بڕگەیەشدا، خستنەڕووی ڕاستییەك بەپێویست دەزانم:
بێجگە لەخەسڵەتی دینداریی(خصلة التدين) هیچ كام لەو پێنج خەسڵەتەی دیكە كەكەمو زۆر زانایانی ئیسلام بەمەرجی هاوكوفێتیان داناون، بەڵگەی شەرعییان لەسەر نیەو زاناو پێشەوایانمان شوێنی بۆ گەڕانەوە (مَرجِع) و جێی پشت پێبەستنیان بۆ مەرج گرتنیان تەنها عورفو باوو دابو نەریتی كۆمەڵگاكان بووە، هەر بۆیەش بەرزیی و نزمیی زۆر لەبیروبۆچوونیاندا هەیە لەبارەیانەوەو، بەتەئكیدیش هەندێك لەو پێوەرانە لەڕۆژگارو هەلومەرجی ئێستای كۆمەڵگاكەماندا هیچ باویان نەماوەو، پێوەرو خەسڵەتو مەرجی دیكە جێگایانیان گرتوونەوە، كەگرنگترینیان ڕادەی خوێندەواریی و بڕوانامە(شهادة)یە!

## چوار: بەڵگەكانی بەمەرج گرتنی هاوكوفێتیی یان بەمەرج نەگرتنی:

أ- ئەوانەی گوتوویانە: بێجگە لەمسوڵمانەتیی هیچ جۆرە هاوكوفێتییەكی دیكە مەرج نیە، ئەوانە چەند دەقێكیان بەبەڵگە هێناوەتەوە، بۆ وێنە: [٢]

١-﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ (الحجرات:١٣).

٢- ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ﴾ (الحجرات: من الآية١٠)

---

(١) (المحلى) ج١٠ص٥٨.

(٢) بڕوانە: (زاد المعاد في هدي خير العباد) لابن القيم، ج٤ص٢٢ (فصل: في حكمه ﷺ في الكفاءة في النكاح) .

٣- ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ﴾(آل عمران: من الآية١٩٥).

٤- ((**إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ وَ آبَاكُمْ وَاحِدٌ، فَلَا فَضْلَ لِعَرَبِي عَلَى أَعْجَمِي إِلاَّ بِالتَّقْوَى**)) رواه الطبراني والبزار بلفظ قريب منه.

٥- ((**إِنَّ آلَ أَبِي فُلَانٍ لَيْسُوا لِي بِأَوْلِيَاءَ، إِنَّمَا وَلِيِّيَ اللَّهُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ**))متفق عليه.

ب- ئەوانەی گوتوویانە: هاوکوفێتیی مەرجی دروستبوونی نیکاحە:

ئەوانەش دوو جۆرە دەقیان بەبەڵگە هێناوەتەوە، جۆرێکیان لەرووی سەنەدەوە ڕاست (صحیح)ن، بەڵام بەبەڵگەی ئەو مەسەلەیە ناشێن، بۆ وێنە: [(١)]

((**إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَعِيلَ وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ**))رواه مسلم عن وائلة بن الأسقع.

جۆرێکیشیان بەڕواڵەت فەرموودەن، بەڵام یان بێ‌هێز(ضعيف)یان هەڵبەستراو(موضوع)ن، بۆ وێنە:

١- (ألا لا تزوج النساءَ إلاّ الأولياء، ولا يزوجن الا من الأكفاء) کەزانایان بەبێ هێزو بگرە بەهەڵبەستراویان داناوە.[(٢)]

---

(١) (ابن تيمية) لەوبارەوە گوتوویەتی: {پێغەمبەر ﷺ عارەبەکانی تایبەت نەکردوون بەهیچ حوکمێکی شەرعییەوە، چونکە بانگەوازەکەی بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی بووە، وەهەمیشە پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمەکانی پەیوەست کردوون بەسیفەتە کاریگەرەکانەوە لەڕەزامەندیی‌و تووڕەیی خوادا، بۆ وێنە فەرموویەتی: (يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ..) رواه مسلم. (مجموع الفتاوى) ج١٩ص٢٦، ٣١.

(٢) بڕوانە: (كشف الخفا..) للعجلوني، ج١ص٤٤٢، وە: (الفوائد المجموعة في الأحاديث الموضوعة) للشوكاني، ص١٢٤، وە : (إرواء الغليل) للألباني، ج٦ص٢٦٤.

٢- (العرب أكفاء بعضهم لبعض قبيلة لقبيلة وحي لحيّ..) کەزانایان پسپۆڕو شارەزا ئەمیشیان بەبێ بنچینەو هەڵبەستراو داناوە.[١]

ج- ئەوانەی گوتوویانە: هاوکوفێتیی مەرجی دروستبوونی نیکاح (شرط صحة النكاح) نیە، بەڵام هەقو مافێکی ڕەوای هەرکام لە ئافرەتەکەو سەرپەرشتیارەکانیشیەتیو، ئەگەر خۆیان لێی دابەزن، نیکاحەکە هیچ ئیشکالی نابێ،[٢] ئەگەرنا دەتوانن پەرچی تێبخەنو هەڵیبوەشێننەوە، ئەمانیش چەند بەڵگەیەك دێننەوە، بۆ وێنە:

١- ﴿فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٢) واتە: جا ڕێگرییان مەکەن کەخۆیان لەمێردەکانیان مارە بکەن، مادام بەشێوەیەکی بەچاك زانراو لەنێو خۆیاندا پێکهاتبن.

جا (ابن تيمية) گوتوویەتی: (.. يدل على أن المرأة ولو رضيت بغير المعروف، لكان للأولياء العضل، والمعروف تزويج الكفؤ..).[٣]

واتە: .. ئەوە دەگەیەنێ کەئەگەر هاتو ئافرەتەکە بەجۆرێك ڕازیبوو کەبەباش نەزانراوە، ئەوە سەرپەرشتیارەکان بۆیان هەیە ڕێگریی بکەن.. ئنجا بەباش زانراویش بریتیە لەبەشوودانی بۆ هاوکوف.

٢- ئنجا ئەگەر لەڕووی عەقڵو ئەزموونو واقیعیشەوە، سەرنج بدەین ڕەچاوکردنی هاوکوفێتییو هاوشانیی لەژنو مێردایەتییدا، هەر

---

(١) بڕوانە: (نصب الراية) ج٣ص١٩٧، وە (فتح الباري) ج٩ص١٣٣.

(٢) (الشربيني) گوتوویەتی: (الكفاءة معتبرة دفعاً للعار وليست شرطاً في صحة النكاح بل هي حق للمرأة والولي فلهما إسقاطها) (مغني المحتاج) ج٣ص١٦٤.

(٣) (مجموع الفتاوى) ج٣٤ص٨٤.

پێویستو بەجێیە، چونکە بێگومان بناغەی خێزان (أساس الأسرة) یەکدی خۆشویستنو ڕێزو حورمەت لەیەکدی گرتنی نێوان ژنو مێردەو هەرکاتێکیش ئافرەت هەست بکات کەمێردەکەی لەخوار خۆیەوەیەتی، ڕەنگە لەجیاتی بەقسەکردنیو خۆ بەکەمگرتن، فیزو کەشخەی بەسەردا بکات، یان ئافرەتەکە هەست بەنائاسودەیی دەروونو دڵەڕاوکەو پەشێمانیی بکات، هەروەها خزمو نیزیکەکانیشی بەتەئکید بەو خزمایەتیو تێکەڵییە ناچوون یەكو نارێکە، خۆشحاڵ و ڕازی نابن!

لەکۆتاییشدا دەڵێم:

شەریعەتی وردبینو دووربینی خوای کاربەجێ لەم مەسەلەیەشدا، وەك هەر حوکمو مەسەلەیەکی دیکەش ئەوپەڕی لێزانیی، حیکمەتی بەکارهێناوە، کەهاوکوفێتی لەڕووی دینداریییەوە[1]، بەڕوونیی بەمەرج گرتوە، بەڵام جۆرەکانی دیکەی هاوکوفێتیی، نە وایە کەئینسان بتوانێ یەکجاریی ئیهمالیان بکاتو، نە واشە کە ئینسان پابەند بکەن! بۆئەوەی مسوڵمانان لەلایەکەوە هەتا دەتوانن خۆیان بەرز بکەنەوە بۆ ئاستی بەرزی نموونەییانەی ئیسلامو، لەلایەکی دیکەشەوە، مەوداشیان هەبێ تارادەیەك واقیعو هەلو مەرجە جیاجیاکان لەبەرچاو بگرن!

لێرەش دا کۆتایی بە بەشی چوارەم دێنینو دەچینە سەر بەشی پێنجەم لە بەرگی دووەم.

---

(١) مەبەستم لەڕووی بەڵگە شەرعی یەکانەوەیە.

# بەشی پێنجەم

## ئەرك و مافەكانی ژن و مێرد بەرانبەر بە یەكدی

١. ئەرک و ماف و ئەدەبە هاوبەشەکانی ژن و مێرد.

٢. مافەکانی ژن لەسەر مێرد.

٣. مافەکانی مێرد لەسەر ژن.

خوێنەری سەنگین !

خوای بەرزو مەزن پشتیوان بێ لەم بەشی پێنجەمەدا، هەوڵدەدەین لە سێ تەوەری سەرەکیدا، باسی ئەرك و ماف و ئەدەبەکانی نێوان ژن و مێرد بکەین، کە هەر تەوەرەی حەوت خاڵ دەگرێتە خۆی و، سەرەنجام تێکڕای ئەرك و ماف و ئەدەبەکانی نێوان ژن و مێرد لە بیست و یەك (٢١) خاڵدا دەخەینە ڕوو:

## تەوەری یەکەم: ئەرك و ماف و ئەدەبە هاوبەشەکانی نێوان ژن و مێرد

پاش سەرنجدانی دەقەکانی شەریعەت و تەماشاکردنی چەند سەرچاوەیەکی پەیوەندیداری بەرهەمی زانایان، گەیشتمە ئەو قەناعەتە، کە گرینگترین ئەرك و ماف و ئەدەبە هاوبەشەکانی نێوان ژن و مێرد، ئەم حەوتەی خوارەوەن:

١ـ خۆشەویستی و بەزەیی و ڕێزی دوو سەرە.
٢ـ ڕەوایی پێکەوە جوتبوون و چێژ لە یەکدی وەرگرتن.
٣ـ خۆ بۆ یەکدی ڕازاندنەوەو جوان کردن.
٤ـ وەچە خستنەوە (الإنجاب).
٥ـ چەسپاندنی ڕەچەڵەکی منداڵ بۆ لای ژن و مێرد.
٦ـ قەدەغە بوونی هاوسەرگیریی لە نێوان هەر کامێکیان و، خزمە زۆر نێزیکەکانی ئەوی دیکەیاندا.
٧ـ میرات لە یەکدی گرتن.

ئیستاش بەرێز پێیاندا دەچینە خوارو، شەرح و پێناسەیەکی کورتی هەر کامێکیان دەکەین:

## ١ـ خۆشەویستی و بەزەیی و ڕێزی دووسەرە:

خوای کاربەجێ، ژن و مێردی بەوشەی جووت (زوج) ناوبردوە، چونکە ژن و مێرد دوانەو جووتێکن، یەکدی تەواو دەکەن و بەبێ یەك نایانکرێ، وەك خوا عزوجل دەربارەی هەردووکیان ـ ژن و مێرد ـ فەرموویەتی:

١ـ ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ﴾ البقرە ـ ٢٣٠ـ، کە لێرەدا وشەی(زوج) بۆ مێرد بەکارهاتوە.

٢ـ ﴿وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ **البقرة** ـ٣٥ـ لێرەشدا وشەی(زوج) بۆ ژن ـ کە دایکمان حەووایە(سەلامی خوای لەسەر بێ) بەکار هاتوە.

هەروەها خوای پەنهان زان، ژن و مێردی بۆ یەکدی بە بەرگ و پۆشاك چواندوون، وەك فەرموویەتی: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ البقرە ـ ١٨٧ـ دیارە بەرگ و پۆشاکیش نزیکترین و تایبەتی ترین شتی مرۆڤەو، پاش خواردن و خواردنەوە لە هەموو شتێك بۆی ئاتا جترەو وێرای عەیب و عار داپۆشینی، لە سەرماو گەرماو مێش و مەگەزو جروجانەوەر دەیپارێزێ و جوانی دەکات و ..هتد، بۆیەش خوا عزوجل هەر کام لە ژن و مێردی بۆ یەکدی، وەك بەرگ و پۆشاك داناون.

ئنجا بناغەی پەیوەندیی و پێکەوە پەیوەستبوونی ژن و مێرد لە ڕوانگەی شەریعەتی خوای کاربەجێوە بریتیە لە :

یەکدی خۆشەویستن و بەزەیی بەیەکداهاتنەوەو بۆ یەکدی بە پەرۆش بون و ڕێز لەیەکدی گرتن.

وەك خوای بێ هاوتا فەرموویەتی:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ **الروم-٢١**. واتا: وە لە نیشانەو بەڵگەکانی پەروەردگارییێتی خوا، ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەرانێکی بۆ دروست کردوون، تاکو بەهۆیانەوە ئارام بن و ئۆخژنتان بۆبێ، وە خۆشەویستی و بەزەیی و سۆزی خستۆتە نێوانتانەوە، بێگومان لەوەدا نیشانەو بەڵگە هەن بۆ کەسانێك بیربکەنەوە.

بەڵێ، پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد لە ئیسلامدا، بەرلەوەی پێك گەییشتنی جەستەکان و تێرکردنی غەریزەکان بێ، پێك گەییشتنی دڵەکان و تێنوێتی شکاندنی ڕووحەکانە! هەروەها بەرلەوەی باسی ئەرك و ماف و چەندی من و چەندی تۆبێ، باسی ڕێزو خۆشەویستی و بەزەیی و پەرۆشیی و دڵسۆزیی و غەمخۆرییە.

## ٢ــ ڕەوایی پێکەوە جووتبوون و چێژلەیەکدی وەرگرتن:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە ئەرك و مافە هاوبەشەکانی نێوان ژن و مێردو، هەر کام لە ژن و مێرد مافیان لەسەر یەکدی هەیە، کە بە پێی تواناو بۆ لەوان لە ڕووی غەریزەی جینسییەوە هاوکاری یەکدی بن و یەکدی تێربکەن، وە لە ڕاستیدا هەر کام لەوشەی جووت(زوج) و پۆشاك(لباس) ئەو واتایە دەگەیەنن، بەلام وێڕای ئەوەش بەڵگەزۆرن، بۆ نموونە :

١ــ ﴿ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرە ــ٢٢٢ــ واتە: جا هەر کات ژنەکانتان خۆیان شۆرد(لە خوێنی حەیز)، ئەوە بەو جۆرە کە خوا فەرمانی پێکردوون، بچنە لایان (لەگەڵیان جووتبن).

٢ـ ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾ البقره ـ١٨٧ـ واتە: لە شەوی ڕۆژووگرتن تاندا، چوونە لای ژنەکانتان بۆ حەڵاڵ کراوە[1].

٣ـ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ البقرة ـ ٢٢٨ـ واتە: وە بۆ ژنان هەیە هەمان ماف هەیە کە لەلایەن مێردیانەوە لەسەریانە، بە شێوەیەکی پەسند.

کە دیارە ئەم تەعبیرە﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ﴾ واتاو چەمکەکەی گشتگیرەو بە پێی ئەم ڕستە قورئانییە، هیچ حەق و مافێکی پیاو لەسەر ژن نیە، مەگەر لە بەرانبەریدا ژنیش حەق و مافێکی لەسەر پیاو هەیە، جا جاری وا هەیە هەق و مافەکان وەك یەکن، وەك تێرکردنی جینسیی، وەجاری وایە لە یەك جیان، وەك مافی بژێو پەیداکردن بۆ ئافرەت و خێزان لەسەر مێردو، مافی منداڵ بەخێو کردنی ژن بۆ پیاو.

هەڵبەتە ڕەوا بوونی پێکەوە جوتبوونی ژن و مێردو چێژ لە یەکدی وەرگرتنیشیان، پێویستە دوو مەرجی تێدا ڕەچاو بکرێن:

یەکەم: هیچ کامیان بۆی نیە بە ئانقەست ئەوەی دیکە سەغڵەت بکات، چ بە باری ڕێ لێگرتن و لێگرتنەوە ، چ بە باری زێدەڕۆیی و تێپەڕاندندا.

دووەم: هیچ کامیان بۆی نیە ـ کە لێرەدا مەبەست زیاتر مێردە ـ شتێکی ناشەرعی لە هاوسەرەکەی داوا بکات.

وشەی (المعروف)یش کە لە ڕستەی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾

دایە هەردوك مەرجەکەی لێوەردەگیرێن، چونکە نە یەکدی سەغڵەت کردن و نە

(١) وشەی (رفث) هەرچەندە بە قسەی ناشیرین دەگوترێ، قسەی جینسی، بەڵام وشەیەکی کۆکەرەوەشە بۆ هەرچی کە پیاو لە ژنەکەی دەیەوێ: (كلمة جامعة لما يريد الرجل من المرأة في سبيل الإستمتاع بها..) المعجم الوسيط ص ٣٥٨).

شتی ناشەرعیی لە یەکدی داواکردن، هیچ کامیان پەسندو بە چاك زانراو نین و، مافەکانیش بە شێوازی پەسندو بە باش زانراو(معروف) داوا دەکرێن و، جێ بەجێ دەکرێن.

لە باسەکانی داهاتووشدا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیە.

## ٣ـ خۆ بۆ یەکدی جوان کردن و ڕازاندنەوە:

وەك پێشتریش گوتمان ڕستەی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ﴾ مانایەکەی فراوان و گشتگیرەو سەرجەم مافەکانی ژن و مێردان لەسەر یەکدی دەگرێتەوە، هەر بۆیەش لە (عبدالله ابن عباس) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە کە گوتویەتی:(إنی أُحِبُّ أن أتَزَيَّنَ للمرأة كما أُحِبُّ أن تَتَزَيَّنَ المرأة ،لأن الله تعالى يقول: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ﴾ رواه ابن أبي حاتم.[(1)].

واتە : من حەز دەکەم کە خۆم بۆ ژنەکەم جوان بکەم، وەك چۆن حەز دەکەم ژن خۆیم بۆ بڕازێنێتەوە، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ:((وە ژنان شێوەی هەمان مافی پیاوان کە لەسەریانە، مافیان هەیە لەسەریان بە شێوەیەکی پەسند)).

شایانی باسیشە، کە جوانیی و خاوێنیی و بۆنخۆشیی، هەر کامێکیان لە خودی خۆیاندا، خەسڵەتێکی پەسندو پێویستن لە مرۆڤی موسوڵماندا بە گشتی و لە هەموو حاڵاندا، بەڵام بە تایبەتی لە ژیانی هاوسەریی(الحياة الزوجية)دا پەسند ترو پێویست ترن، ئێستاش با سەرنجی چەند دەقێکی سوننەت بدەین لەو بارەیەوە:

١ـ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:(إنَّ الله جميلٌ يحبُّ الجمال) رواه مسلم:٩١ .

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص١٦٦.

واتە: بێگومان خوا جوانەو جوانیی خۆشدەوێ.

٢ـ هەروەها فەرموویەتی:(( الطهور شَطْرُ الإيمان..) رواه مسلم: ٢٢٣.

واتە پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە..

٣ـوە فەرموویەتی: **(عن عائشة رضي الله عنها قالت: كنت أُطيِّب النبيَّ**(صلى الله عليه وسلم) **بأطيب ما يجد، حتى أجد وبيص الطيب في رأسه ولحيته)** رواه البخاري: ٥٩٢٣.

واتە: من پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بە خۆشترین بۆن، كە هەیبوو بۆن خۆش دەكرد، هەتا بریقەی بۆنەكەیم لە سەری و ڕیشیدا دەبینی.

٤ـ ڕۆژێكیان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵەكانی فەرموو: **(إنكم قادمون على إخوانكم فأصلحوا رحالكم وأصلحوا لباسكم حتىّ تكونوا كأنكم شامة في النّاس، فإن الله لا يحب الفحش والتفحّش)** رواه ابو داود: ٤٠٨٩.

واتە : ئێوە دەچنە لای برایەكانتان، دەجا كورتانی ولآخەكانتان چاك بكەن و، بەرگ و پۆشاكتان چاك بكەن، هەتا لە نێو خەڵكدا وەك خاڵ دیاربن، چونكە خوا، چڵكنیی و نارێكیی خۆش ناوێ.

٥ـ ئنجا بۆ ڕاستكردنەوەی ئەو بیرو بۆچوونە لارەی ،كە پێی وایە گوێ بە جەستە نەدان و پشت گوێ خستنی هەق و مافی ژن و منداڵ، مایەی پارێزكاریی و لە خوا نزیك بوونەوەیە، با سەرنجی ئەم دەقە بدەین:

(دخلت امرأة عثمان بن مظعون على نساء النبيِّ (صلى الله عليه وسلم) فرأينها سيئة الهيئة فَقُلْنَ لها: ما لكِ؟ ما في قريش رجل أغنى من بعلك! قالت : ما لنا منه من شيء، أما نهاره فصائم، وأما ليله فقائم، فدخل

النبي(صلى الله عليه وسلم) فذكرت ذلك له، فلقيه النبيُّ فقال له: يا عثمان أما لك فيَّ أسوة؟ قال: وما ذاك يا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فداك أبي وأمي: فقال: أما أنت فتقوم الليل وتصوم النهار وإنَّ لأهلك عليك حقاً، وان لجسدك عليك حقا، فصلِّ ونَمْ. وَ صُمْ وأفْطِرْ، فأتتهم المرأة بعد ذلك عطرة كأنها عروس، فقلن: مه؟ قالت: أصابنا ما أصاب الناس) رواه الطبراني ورجاله ثقات كما قال الهيثمي في (مجمع الزوائد).

واته: ژنی عوسمانی كوڕی مەزعون چووە لای هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوانیش بە پۆشاك و حاڵێكی خراپەوە بینیان و پێیان گوت: ئەوە بۆچی وای ؟ خۆ هیچ پیاوێك لە هۆزی قورەیش هێندەی مێردی تۆ دەوڵەمەند نیە! گوتی : ئێمە لەوەوە هیچ سوودێك نابینین(واتە: نایەتە لام) هەرچی ڕۆژگاریەتی هەر بە ڕۆژووە،وە هەرچی شەوگاریشیەتی هەر خەریكی نوێژە، جا كاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتەوە ماڵ بۆیان گێڕایەوە، ئنجا پێغەمبەر توشی بوو و پێی فەرموو: ئەی عوسمان! ئایا چاو لە من ناكەی؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باب و دایكم فیدات بن، مەبەستت چیە؟ فەرمووی: چونكە تۆ هەموو شەوێ شەو نوێژ دەكەی و هەمو ڕۆژانیش بەڕۆژووی، لە حاڵێكدا، كە خێزانت مافی لەسەرتەو جەستەت مافی لەسەرتە، بۆیە شەو نوێژیش بكەو بشخەوە، وە ڕۆژووی سونەتیش بگرەو، ڕۆژی واش هەیە مەیگرە!

دوای ئەوە ئەو ژنە چۆوە لایان، بۆن خۆش(و ڕازاوە) دەتگوت بووكە، پێیان گوت ئەوە چییە؟ گوتی ئەو خێرو خۆشییەی خەڵك تێیدابووە، گەییشتە منیش!

٦ـ هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەم جۆرە مەدح و ستاییشی

ژنانی باشی کردوە:(**خير النساء الّتي تَسُرُّه إذا نظر..**) **رواه أحمد و أبو داود و النسائي والحاكم عن أبي هريرة بإسناد صحيح.**
واتە : باشترینی ژنان ئەو ژنەیە، کە مێردی تەماشای کرد، پێی دڵخۆش بێ.. دیارە ژن و مێردیش کاتێك بە بینینی یەکدی دڵخۆش دەبن، کە جوان و پاك و خاوێن و بۆن خۆش و، پێش ئەوەش ڕووگەش و زمان شیرین بن!

## ٤ـ وەچە خستنەوە (الإنجاب):

منداڵ و ڕۆڵە هەبوون، داخوازییەکی **فیطریی** و خواڕسکی مرۆڤە، چ پیاو چ ژن.
وە خوای کاربەجێ و توانا، پەیدا بوونی ڕۆڵەو نەوەی بە یەکێك لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی لە ژیانی بەشەردا داناوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ﴾ النحل-٧٢. واتە: وە خوا لەخۆتان هاوسەری بۆ ڕەخساندوون و لە هاوسەرانیشتان کوڕان و نەوەکان، وە لە ڕۆزییە خۆش و بە تامەکان بژێوی داون، جا ئایا ئەو (کافر)انە بڕوا بە بەتاڵ دێنن و سپڵەیی بەرانبەر بە چاکەی خوا دەکەن!
شایانی باسیشە هەبوونی منداڵ و وەچە، مافێکی ڕەوای هەر کام لە ژن و مێردە، بۆیە هیچ کامیان بەبێ ڕاو ڕەزامەندیی ئەوی دیکە، لەو حاڵانەشدا کە دروستە پێشگیری(منع) پەیدا بوونی منداڵ بکرێ، دروست نیە یەکلایەنە بڕیاربدات. دیارە لە بارەی ئەوەوە کە لەم ڕۆژگارەدا پێی دەگوترێ: سنووردارکردنی وەچە (تحديد النسل)، دەقێکی شەریعەتی ڕوونمان لەبەردەست نیە، بەڵام شەرع



زانان باسی مەسەلەیەکی دیکەی وێنەی ئەوەیان کردوە، کە بریتیە لە(العزل) ئەویش ئەوەیە، کە پیاو نەهێڵێ تۆوەکەی بچێتە شوێنی ئاسایی خۆیەوەو لە دەرەوە بیرێژێ، تاکو منداڵ پەیدا نەبێ.

هەڵبەتە زانایان لە بارەی (العزل) یشەوە ڕاجیاییان هەبووە، بەلام وا پێدەچێ ڕای زۆرینە ڕاست بێ ،کە بەدروست(جائز)ی دەزانن و، بەڵگەش بە زۆر دەقان لە سوننەت دێننەوە، بۆ نموونە:

١- (عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما: كنا نعزل على عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم و القرآن ينزل) رواه مسلم، ١٤٤٠ والترمذي: ١١٣٧.

واتە : ئێمە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) عەزلمان دەکردو قورئانیش دادەبەزی. مەبەستیش لەوە کە دەڵێ: قورئانیش دادەبەزی، یانی : بەلام خوا قەدەغەی نەکرد، کەواتە: ئەو کارە ڕەوایە.

٢- (**عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما: كنا نعزل على عهد رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فبلغه ذلك، فلم يَنْهَنا**) رواه البخاري:٥٢٠٨. ومسلم:١٤٤٠.

واتە : لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) عەزلمان دەکرد، هەرچەندە هەواڵیشی پێگەیشت، بەلام ڕێگریی لێنەکردین.

## ٥- چەسپاندنی ڕەچەڵەکی منداڵ بۆلای ژن و مێرد (اثبات النسب):

ئەمیش ئەرك و مافێکی دیکەی هاوبەشی نێوان ژن و مێردە، کە ئەو منداڵانەی لە کاتی ژیانی هاوسەرییاندا پەیدا دەبن، بە هی هەردووکیان دادەنرێن و، هیچ کامیان لەوی دیکە کەمتر یان زیاتر بەشی پێیانەوە نیە.

ئاشکرایە کە ئیسپاتی ڕەچەڵەکی منداڵ بۆ لای دایکی جێی مشتو مڕنیە، چونکە شتێکی ڕوونە، بەڵام چەسپاندنی ئەو ڕەچەڵەکە بۆ لای پیاوەکە پێویستی بە بەڵگەیەو، ئەمیش لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئەسڵ گومانی باش بردن(حسن الظن)و کارکردنە بە ڕواڵەت(**العمل بالظاهر**) بە پێی بنچینە: (**نحن نحكم بالظاهر والله يتولى السرائر**) ئێمە حوکم بەڕواڵەت دەکەین و نهێنییەکان حەواڵەی خوا دەکەین، بەڵێ، لەبەر ئەوە هیچ کەسێك بۆی نیە بەبێ بەڵگەی جێی دڵنیایی(دليل يقيني)،

هەر لە خۆوە نکوڵیی ڕەچەڵەکی منداڵێك یان زیاتر، لە خۆی یان لە غەیری خۆی بکات، ئەگەرنا مادام بەڵگەی ئیسپاتکەری پێ نەبێ، لە حاڵەتی یەکەم دا خۆی دووچاری(ملاعنة) و سەرەنجام جیابوونەوە لە هاوسەرە تۆمەتبار کراوەکەی دەکات و، لە حاڵەتی دووەمیشدا سزای تۆمەتی داوێن پیسیی(**عقوبة القذف**)ی بەسەردا دەچەسپێنێ.

وەك خوای زاناو توانا لە بارەی کەسێکەوە، کە تۆمەتی داوێن پیسی پاڵ دەداتە لای هاوسەری ، فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾ النور-٧-

وە لەبارەی سزادانی کەسانێکەوە کە بەبێ هەبوونی چوار شایەد، ئافرەتانێك کە بە پاك ناسراون، تۆمەتباری زینا دەکەن، کە پێویستە یەکی (٨٠) قەمچییان لێبدرێ فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾النور-٤-.

ئنجا لەسەر بناغەی ئەوە کە ڕابرد، شەریعەتی ئیسلام بڕیاری داوە کە هەر منداڵێك لە ماڵی پیاوێك و لەسەر جێگاکەی لە دایك ببێ، پاڵ دەدرێتە لای و بە ڕۆڵەی وی دادەنرێ، وەك لەو بارەوە خوای پەنهانزان فەرمویەتی: ﴿..وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ۝٤ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ...﴾ الاحزاب -٤، ٥-

واتە: وە خوا بە کوڕو کراوەکانتانی نە گێڕاوە بە کوڕانی ئێوە، ئەوە هەر قسەیەکی زارتانە، وە خوا هەق دەفەرموێ و بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنمایی دەکات، بە ناوی باببیانەوە بانگیان بکەن ئەوە لەلای خوا دادگەرانەترە.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی:(**الوَلَدُ للفِراشِ وللعاهِرالحَجَرُ**) رواه البخاري: ٢٢١٨، ومسلم:١٤٥٧.

واتە: منداڵ هی خاوەن جێگای خەوتنەو داوێن پیسیش بەردی پێ دەبڕێ.

یانی منداڵ لەسەر جێگاو لە ماڵی کێ لە دایك بووبێ ڕەچەڵەك(نسب)ی دەچێتە سەر ئەو کەسەو بابای زیناکەریش هیچی پێ نابڕێ.

کۆتایی ئەم مەسەلەیەش بەم دەقەی سوننەت دێنین، کە بەڵگەیەکی زۆر بەهێزە بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە هیچ کەس بۆی نیە بە گومان و دڵپیسیی، لە هاوسەری و ڕەچەڵەکی ڕۆڵەکانی بکەوێتە دوو دڵیەوە. چونکە بێگومان شتی جێی دڵنیایی، بە گومان و دوو دڵی هەڵناوەشێتەوە:(الیقین لا یزول بالشك)، وەك زانایان لەسەری پێکهاتون.

**(عن أبي هريرة رضى الله عنه ان رجلاً أتى النبيَّ صلى الله عليه وسلم فقال يا رسول الله!ولدلي غلام أسود! فقال صلى الله عليه وسلم: هل لك من إبل؟ قال:**

نعم، قال: ما ألوانها؟ قال حُمُر، قال هل فيها من أورق؟ قال: ان فيها لَوَرقاً، قال: فأنّى أتاها ذلك؟ قالَ لعلّهُ نَزَعَهُ عِرْق. قال: فلعلّ ابنك نَزَعَهُ عِرْق) البخاري: ٥٣٠٥، ومسلم: ١٥٠٠ .

واته: پیاوێك هاته لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گووتی: ئەی پێغەمبەری خوا! کوڕێکی ڕەشم بۆ لە دایك بووە! ئەویش فەرمووی : ئایا حوشترت هەن؟ گوتی : بەڵێ . فەرموی: ڕەنگیان چۆنە؟ گووتی سوورن، فەرموی : ئایا هی بۆر(خۆڵەمێشی)یان تێدایە؟ گووتی: هی بۆریان تێدایە، فەرموی: ئایا ئەو ڕەنگەیان لە کوێوە بۆ هاتوە؟ گووتی: ڕەنگە دەمارێك ڕایکێشابێ، فەرمووی: دە جا کوڕەکەشت ڕەنگە دەمارێك ئەو ڕەنگەی بۆ ڕاکێشابێ.

## ٦ـ قەدەغە بوونی هاوسەرگیریی لە نێوان هەر کام لە ژن و مێرد و خزمە زۆر نزیکەکانی ئەوی دیکەیاندا.

لە سۆنگەی ئەوەوە کە گرێبەستی هاوسەرگیری هەردوك خێزان و بنەماڵەی ژن و پیاو پێکەوە دەبەستێ و، وەك یەك خێزان و بنەماڵەیان لێ دێ، بۆیە شەریعەتی خوای کاربەجێ لە نێوان هەرکام لە مێردو ژن و خزمە زۆر نزیکەکانی هەر کامێکیاندا، هاوسەرگیریی قەدەغە کردوە.

بۆیە یەکی دیکە لە ئەرك و مافە هاوبەشەکانی ژن و مێرد ئەوەیە کە:

١ــ مێرد لێی قەدەغەیە، کە هاوسەرگیریی لەگەڵ بنەچەکانی(أصول)ی هاوسەرەکەیدا وەك : دایك و نەنك و...هتد، یان لقەکان (فروع) یدا،کچ و کچەزاو ..هتد، بکات.

٢ـ ژن لێی قەدەغەیە، کە هاوسەرگیریی لەگەڵ بنەچەکانی هاوسەرەکەی دا

بکات ،وەك: باب و مام و باپیرو..هتد. وە لەگەڵ لقەکانی دا ـ وەك: کوڕو کوڕەزاو...هتد.

وەك خوای کاربەجێ لەم ئایەتەدا باسی هەندێکیان کردوە:

﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ النساء ـ٢٣ـ.

واتە: (هاوسەرگیریی) لەگەڵ دایکانتان و کچانتان و خوشکانتان و پلکانتان و[1] پوورانتان و کچانی براو کچانی خوشك و ئەو دایکانەتان، کە شیریان پێتان داوەو خوشکانی شیریتان و دایکانی ژنەکانتان و کچانی پەروەردەکراوی باوەشتان[2]. لەو ژنانەتان، کە چونەتە لایان، بەڵام ئەگەر نەچوینە لایان، گوناهتان ناگات، وە ژنانی کوڕانێکتان، کە لە پشتتانن، وەکە دوو خوشك پێکەوە کۆبکەنەوەو جگە لەوەی ڕابردوو، لێتان قەدەغە کراوە بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

---

(١) وشەی (پلك)م بۆ خوشکی باب و، وشەی (پورم)یشم بۆ خوشکی دایك بەکارهێناوە هەرچەندە لە زمانی کوردی دا هەردووکیان بۆ هەردووك لایان بەکاردێن.

(٢) واتە: لە ژێر سەرپەرشیاریی و چاودێریی ئێوەدا.

## ٧ـ میرات لەیەکدی گرتن:

یەکی دیکە لە ئەرك و مافە هاوبەشەکانی نێوان ژن و مێرد، بریتیە لە میرات لە یەکدی گرتن، کە هەر کامێکیان پاش مەرگی ئەوی دیکە میراتی لێ دەگرێ، ئەگەر پێش گواستنەو(قبل الدخول) یش بێ، وەك خوای دادگەر لە بارەی میرات لەیەکدی گرتنی ژن و مێردەوە فەرموویەتی:

﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ النساء-١٢-

واتە: وە بۆ ئێوە نیوەی میراتی ژنەکانتان هەیە، ئەگەر منداڵیان نەبێ، بەلاّم ئەگەر منداڵیان هەبوو، ئەوە چواریەکی میراتیانتان هەیە، پاش وەسیەتێك کە دەیکەن، یان قەرزێك کە دەدرێتەوە بە خاوە ن قەرز، وە ئەوان چواریەکی میراتی ئێوەیان هەیە، ئەگەر منداڵتان نەبن، بەلاّم ئەگەر منداڵتان هەبوون، هەشتیەکی میراتتان دەگرن، پاش جێ بەجێ کردنی وەسیەتێك کە دەیکەن و درانەوەی قەرزێك کە لەسەرتان بووە..

بەڵێ ئەمە ئەرك و مافە هاوبەشەکانی ژن و مێردن و، دەشتوانین هەندێك شتی دیکەش لەو بارەوە باس بکەین وەکو بەخێوکردنی منداڵ و پەروەردەکردنیان، وەشێوەی پەسندو جوان پێکەوە مامەڵە کردن و، پاراستنی عەیب و عارو نهێنیەکانی یەکدی..، بەلاّم پێم وابوو باشتر وایە ئەمانەو هاو وێنەکانیان لە

تەوەرەی دووەم و سێیەمدا، کە تەرخانمان کردوون، بۆ خستنە رووی مافەکانی ژن لەسەر مێردو مافەکانی مێرد لەسەر ژن باس بکەین.

## تەوەرەی دووەم: مافەکانی ژن لەسەر مێرد

دەتوانین مافەکانی ژن لەسەر مێرد، لەم حەوت خاڵەی خوارەوەدا بخەینە روو:

١ـ پێدانی مارەیی(المهر).

٢ـ دابین کردنی بژێوو بەرگ و پۆشاك(النفقه)ی.

٣ـ دابین کردنی جێگاو رێگا(السکنی)ی.

٤ـ بەشێوەیەکی پەسندو جوان مامەڵە لەگەڵ کردنی(حسن المعاشرة).

٥ـ لەگەڵ جوتبوونی، بە گوێرەی پێویستی وی و بە پێی توانای مێرد.

٦ـ پاراستن و بەرگریی لێکردنی.

٧ـ دادگەری لەگەڵ کردنی لە کاتی چەند ژنییدا.

ئێستاش یەك لەدوای یەك بە توێژینەوەیاندا دەچینە خوار:

### ١ـ پێدانی مارەیی(المهر):

مارەیی(مـهـر ــ صِدَ ا ق) کە لە قورئانـدا وشـەکانی: (**صدقة و نحلة و فريضة و أجر و طَوْل**)ی بۆ بەکارهاتوون، یەکەمین و سەرەتاییترین مافی ژنە لەسەر مێردی و هەقێکی ئەوە لەگەردنی دایە، بەلاّم لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە لەبەشی سێیەمدا(رەواندنەوەی تەمی تۆمەتەکانی شەریعەت لەبارەی ئافرەتەوە) لە خاڵی دووەمدا(مەسەلەی مارەیی ـ المهر) باسی مارەیی ئافرەتمان کردوەو روونمان کردۆتەوە، کە :

مارەیی چییەو، حوکمی چۆنەو، حیکمەتی چییەو، چ شتێك بە مارەیی دەشێ و، ئەندازەی مارەیی چەندەو، جۆرەکانی مارەیی چین؟!

بۆیە لێرەدا بە پێویستی نازانین ئەوەی لەوێ گوتراوە دووبارەی بکەینەوەو، خوێنەری بەرێز حەواڵەی ئەوێ دەکەینەوە.

## ٢ـ دابین کردنی بژێوو بەرگ و پۆشاك (نفقە)ی:

مافێکی دیکەی ژن لەسەر مێردی لە شەریعەتی واقیع بین و وردبین و دوربینی خوای کاربەجێ دا، بریتیە لەوە کە پێداویستیەکانی ژیان و گوزەرانی بۆ دابین بکات لە: خواردن و خواردنەوەو بەرگ و پۆشاك و دەرمان و چارەسەرو جێگای حەوانەوەو نیشتەجێ بوون.

دیارە ئێمە لە خاڵی سێیەمدا بە تایبەتی باسی جێگاو رێگا(سُکْنى)دەکەین و، لێرەدا بە گشتی باسی مەسرەف کێشان(نفقە) دەکەین و دەڵێین :

بەڵگە لەسەر پێویست بوونی بژێوو مەسرەفی ژن لەسەر مێردو دابین کردنی پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانی زۆرن، بۆ نموونە:

١ـ ﴿..وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ﴾البقرەـ٢٣٣ـ.

واتە: وە بژێوو پۆشاکی ئەو دایکانە بە شێوەیەکی پەسند، لەسەر ئەو باوکانەیە، کە منداڵەکان هی ئەوانن..

٢ـ(فاتقوا الله في النساء فإنكم أخذتموهن بأمان الله واستحللتم فروجهن بكلمة الله ولكم عليهن ألاّ يوطِئْنَ فُرُشكم أحداً تكرهونه، ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف) رواه مسلم:١٢١٨.

واتە: دە جا لەبارەی ژنانەوە پارێز لەخوا بکەن، چونکە ئێوە وەك سپاردەی

خوا وەرتان گرتوون(لە کەس وکاریان)،وە بە وشەی خوا داوێنیانتان بۆ خۆتان حەلاڵ کردوە، وە مافی ئێوەیە لەسەریان کە فەرمووی کەسێك نەکەن بۆ ماڵەوەو دانیشتن لەسەر جێگاتان، کە حەز لە چارەی ناکەن، ئنجا ئەگەر ئەوەیان کرد واتە: سەرپێچییان کرد(وە بە ئامۆژگاریی و جێگا لێ جیا کردنەوەش چاك نەبوون) ئەوە بە لێدانێکی سووك لێیان بدەن. وە مافی ئەوانیشە لەسەرتان کە بە شێوەیەکی پەسند بژێوو پۆشاکیان بۆ دابین بکەن.

٣ـ (عن عائشة رضي الله عنها ان هند بنت عتبة قالت: يا رسول الله إن أبا سفيان رجل شحيح وليس يُعْطيني ما يكفيني وولدي الا ما أخذت منه وهو لا يعلم! فقال: خذي ما يكفيكِ وولدكِ بالمعروف) رواه البخاري : ٥٠٤٩.

واتە: هیندی کچی عوتبە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەبو سوفیان پیاوێکی رژدە، هێندەم ناداتێ ،کە بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، مەگەر بە شێوەیەك، کە ئاگای لێ نیە لە سامانەکەی هەڵبگرم ! فەرمووی: ئەوەندەی کە بە شێوەیەکی پەسندو باو، بەشی خۆت و منداڵەکەت دەکات هەڵبگرە.

سەبارەت بە ئەندازەی ئەو بژێوو مەسرەفکێشانەش، زانایان زۆر شتیان گوتوە، بەلاّم بێگومان ئەوە هەتا رادەیەکی زۆر، پەیوەستە بە عورف و عادەت و شێوەی ژیان و گوزەران و رادەی هەبوون و توانایی پیاوەوە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴾ الطلاق ـ٧ـ واتە: با هەر خاوەن سامانێك لە سامانەکەی خەرج بکات (بۆ خێزانی) هەر کەسێکیش بژێوی

لێ تەنگ کرایەوە، با لەوەی کە خوا پێیداوە ببەخشێ، خوا جگە لەوەی پێیداوە لە هیچ کەس داوا ناکات، بێگومان خوا پاش سەغڵەتیی، ئاسانیی پەیدا دەکات.

شایانی باسیشە وەك لە بەشی حەوتەم(لەیەکترازانی ژن و مێرد)دا باسی دەکەین بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان، یەکێك لە بەڵگەو پاساوەکانی داواکردنی ژن بۆ جیابوونەوەی لە مێردی، بریتیە لە ئامادە نەبوونی مێرد، یان کەمتەرخەمیی کردنی ، لە مەسرەفکێشانی ژن و خێزانی دا.

کەواتە مەسرەفکێشان و دابین کردنی پێداویستیەکانی ژن و منداڵەکانی لەلایەن مێردەوە مافێکی گەورەو گرینگەو، بەزایەدانی مایەی هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری نێوان ژن و مێردە.

جا هەرچەندە هەندێك لە زانایان ڕایان وایە، کە لەسەر مەسرەف نەکێشان، ژن بۆی نیە داوای جیابوونەوە بکات، بەڵام من پێم وایە هەر ڕای جەماوەری زانایان لەو بارەوە ڕاستەو، ئەم فەرمودەیەش وێڕای ئایەت و فەرموودەکانی دیکە، بەڵگەیەکی پتەوو یەکلایی کەرەوەیە لەو بارەوە:

(عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: **تقول المرأة: إمّا أن تُطْعِمَني وإمّا أن تُطلِّقني..**) رواه البخاري:٥٣٥٥، (باب وجوب النفقة على الاهل والعيال). واتە: ژن دەڵێ (واتە بە مێردی دەڵێ): یان بژێویم بدە، یان تە لاقم بدە.. بەڵام لێرەدا دەبێ ئاگاداری دوو ڕاستی بین:

یەك : هەرچەندە بۆ ژن دروست و ڕەوایە کە بەهۆی مەسرەف نەکێشرانەوە لەلایەن مێردەوە، داوای جیا بونەوە بکات، بەڵام بێگومان دان بە خۆداگرتنی و خۆڕاگرییەکەی مادام بۆی بلوێ، باشترە وەك ئافرەتە هاوەڵەکان(صحابيات)،کە خۆڕاگرو بە قەناعەت بوون ،لەسەر هەژاریی و نەداریی مێردەکانیان، بەڵام بێگومان لەسەری پێویست نیە.

دوو: پیاوێك كەلەبەر هەژاریی و نەبوونیی، مەسرەفی ژن و خێزانی ناكێشێ، حوكمی جیاوازە لە پیاوێك كە ڕژدو چرووكە، هەرچەندە لە هەردووك حالاًتیشدا ژنەكەی هەر بۆی هەیە داوای جیا بوونەوە بكات، بەلاًم لە حاڵەتی یەكەم دا پیاوەكە گوناهبار نیەو، بۆ ژنەكەشی خۆڕاگریی باشترە، وە لە حاڵەتی دووەمدا پیاوەكە گوناهبارەو، ژنەكەشی خۆ دەربازكردنی چاكترە، مادام هیچ چارەی نەبێ، وەك هیندی ژنی ئەبو سوفیان، كە بەبێ ئاگاداری مێردە چرووك و چەنگ قووچاوەكەی ،مەسرەفی خۆی و منداڵەكانی لە ماڵ و سامانەكەی وەلابنێ!

بە نیسبەت دابینكردنی دەرمان و چارسەریش، بۆ ژن ،هەرچەندە هەر كام لە حەنبەلییەكان[1] و حەنەفییەكان[2] و شافیعییەكان[3]، لەسەر مێردی بە پێویست نازانن، بەلاًم بێگومان نەیانپێكاوە، چونكە:

١ــ جاری وایە چارەسەر لە خواردن و خواردنەوەش پێویستتر دەبێ و كەمتەرخەمیی تێداكردنی، دەبێتە مایەی مەرگ و فەوتان.

٢ــ فەرمانی خوا بە مامەڵە كردنی باشی پیاوان لەگەڵ ژنەكانیان: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ بە پشتگوێ خستنی مێرد بۆ ژنە نەخۆشەكەی، نەك هەر نایەتەدی، بەڵكو پێچەوانە دەبێتەوەو، دەبێتە ڕەفتاری خراپی مێرد لەگەڵ ژنەكەی.

٣ــ هەروەها خەم نەخواردنی مێرد لە هاوسەرە نەخۆشەكەی، پێچەوانەی

(١)المغنی لابن قدامه، ج٧ ص ٥٦٨ .
(٢) الفتاوى الهندیه، ج١ ص ٥٤٩.
(٣) مغني المحتاج، ج٣ ص ٤٣١.

پێناسەی خوایە بۆ بناغەی ژیانی هاوسەریی و پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد:
﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ..﴾الروم–٢١، بۆیە ڕای ڕاست ئەوەیە، کە دەرمان و چارەسەریش، بەشێکە لە نەفەقەی پێویستی ژن لەسەر مێرد.

## ٣ـ دابین کردنی جێگاو ڕێگا(سكنى)ی:

ئەمیش مافێکی دیکەی گرنگ و گەورەی ژنە بەسەر مێردیەوە، جا هەرچەندە وشەی مەسرەفکێشان(نفقة) ئەمیش دەگرێتەوە، بەلاّم لەبەر گرنگیی، بە جیاش باسمان کردو قورئانیش بە تایبەت باسی کردوە، وەك خوای عزوجل فەرموویەتی:
﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ﴾ الطلاق ـ٦ـ .

واتە: ژنەکانتان بە پێی تواناتان لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆتاندا نیشتەجێ بکەن، شایانی باسیشە ئەم ئایەتە لەبارەی مەسرەفکێشان و نیشتەجێکردنی ژنی تەلاّقدراو(**مطلقة**)ەوە دەدوێ، بەلاّم بێگومان بە (**قیاس الأوْلى**) ئەگەر نەفەقەو حاواندنەوەی ژنی تەلاّقدراو لە ماوەی عیددەی دا پێویست بێ، هی ژنی ئاسایی پێویست ترە، وەك (إبن قدامة الحنبلي) گوتوویەتی: (**فإذا أوجبت السكن للمطلّقة فللّتي في صُلْبِ النكاح أولى**)[1].

واتە: ئنجا ئەگەر دابین کردنی شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ ژنی تەلاّق دراو پێویست بکات (واتە: ئەگەر ئەو ئایەتە پێویستی بکات) ئەوە بۆ ژنێك کە هەر لە ژێر نیکاح دایە، پێویستترە.

---

(١) المغني لإبن قدامة، ج٧ ص٥٦٩.

## ٤. بە شێوەیەکی پەسندو جوان مامەڵە لەگەڵ کردنی(حسن المعاشرة):

ئەمیش مافێکی دیکەی ژنە لەسەر مێردی وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿..وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾ النساء ـ١٩ـ واتە: وە بە شێوەیەکی پەسند و باش مامەڵە لەگەڵ ژنەکانتان بکەن، وە ئەگەر لەبەر خەسڵەتێکیان ڕقتان لێیان بۆوە، نیزیکە کە جاری وایە شتێکتان خۆش نەوێ، کەچی خوا خێرو بەرژەوەندییەکی زۆری تێدا دا بنێ.

ئێستاش با لە چەند بڕگەیەکدا باسی هەر کام لە: پێناسەی خۆش ڕەفتاری پیاو لەگەڵ ژنداو، گرنگییەکەی و، حوکمەکەی و، هۆکارەکانی، بکەین:

### ١ـ پێناسەی : خۆش ڕەفتاریی مێرد لەگەڵ ژنەکەی دا:

توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان لەبارەی چەمك و واتای(**المعاشرة بالمعروف**) ەوە کردوەو پوختەو گوشراوی ڕای زۆربەیان[1] لەو بارەوە ئەوەیە ،کە لەم چەند دێڕەدا دەیخەینە ڕوو: خۆش ڕەفتاریی مێرد لەگەڵ ژنیدان ئەوەیە کە لەگەڵیدا ڕووگەش و زمان شیرین و قسە خۆش و بەڕێزو حورمەت بێ و، خۆشەویستی و

---

(١) بڕوانە : ١ـ الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج٥ ص ٩٧ / ٢ـ (تفسير القرآن العظيم) لإبن كثير، ج١ ص٤٦٦ / ٣ـ (الكشاف للزمخشري)، ج١ ص٤٩٠/ ٤ ـ (مفاتيح الغيب) للرازي، ج١ ص ١٢/ ٥ ـ (أحكام القرآن) للجصاص، ج٢ ص ١٠٩/ ٦ـ (تفسير المنار) للشيخ محمد رشيد رضا، ج٤ ص ٤٥٦/ ٧ـ (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) لعبد الرحمن بن ناصر السعدي، ص١٧٢/ ٨ ـ (أحكام القرآن) لإبن العربي، ج١ ص ٤٦٨.

سۆزو بەزەیی لەگەڵ بنوێنێ و، هیچ قسەو ڕەفتارێکی لێ نەپشکوێتەوە ،کە پێچەوانەی شەرع و عورف و جوامێریی بێ ، لە ڕووی مەسرەفکێشانەوە لە قەدەر حاڵ و گوزەرانی لەگەڵ خۆی و منداڵەکانی دا دەست کراوەو سەخیی بێ و، بە شێوەیەك لەگەڵی دا هەڵس و کەوت بکات، کە هەست بە بەختەوەریی و خۆشنوودیی بکات و شادمان بێ.

## ٢ـ گرنگیی خۆش ڕەفتاریی پیاو لەگەڵ ژنەکەی دا :

سەرەڕای ئەوە کە خوا سبحانە وتعالی فەرمانی بە پیاوان کردوە کە دەبێ لەگەڵ ژنەکانیان دا خۆش ڕەفتاربن ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ کە دیارە خوای کاربەجێ فەرمان بە شتی گرنگ و پێویست نەبێ ناکات، بەڵێ، سەرەڕای فەرمانی خوای بەرزو مەزن، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) هەر فەرمانی پێکردوەو خۆش ڕەفتاریی پیاویشی لەگەڵ هاوسەری دا کردوە بە سەنگی مەحەك و پێوەری ئیمان کاملی و چاکیی لەلای خوا، وەك فەرموویەتی

١ـ (**أستوصوا بالنساء خيراً ..**) رواه البخاري: ٥١٨٦ و مسلم: ١٤٦٨.

واتە وەسیەتی من لەبارەی چاکە کردن لەگەڵ ژنان دا وەربگرن[1].

٢ـ (**اكمل المؤمنين ايمانا أحسنهم خُلُقًا وخيارکم خيارکم لنساءهم**) رواه الترمذي:١١٦٢ وقال : حديث حسن صحيح.

واتە : ئیمان تەواوترینی ئیمانداران، ڕەوشت چاکتریتانە، وەباشترینتان، باشترینتانن بۆ ژنەکانتان.

---

(١) الإستيصاء: قبول الوصية، أو المعنى: أوصيكم بهن خيراً فاقبلوا وصيتي فيهن بروانە: تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي) ح ٤ ص ٣٢٦.

٣-(**خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ وأنا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي**) رواه ابن ماجه.

واته: چاکترینتان، باشترینتانه بۆ خێزانی و، منیش باشترینتانم بۆ خێزانم.

ئنجا شایانی باسیشه، کە خوای کاربەجێ پاش ئەوەی فەرموویەتی ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ یەکسەر فەرموویەتی: ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ ئاماژەیە بەوە، کە پیاوان نابێ کەم و کوڕی و هەڵەو پەڵەی ژنەکانیان بکەنە بیانووو پاساوی بوغزو غەرەزو ڕەفتاری ناڕێکیان لەگەڵیاندا، بەڵکو پێویستە هەردەم لایەنە خێرو چاکەکانی ژنەکانیان هەر لەبەرچاوبێ و، تەنیا هەڵەو کەم و کوڕییەکانیان نەبینن، وەك پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە فەرمویەتی:

٤- (**لا يَفْرِكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً ،إِنْ كَرِهَ مِنْها خُلُقاً رَضِيَ مِنْها آخَرَ**) **رواه مسلم: ١٤٦٩**

واته: هیچ پیاوێکی ئیماندار، ژنێکی ئیماندار نەبوغزێنێ، ئەگەر ڕقی لە خەسڵەتێکیشی بێتەوە، خەسڵەتێکی دیکەی هەیە کە خۆشی بوێ!

## ٣ـ حوكمی خۆش ڕەفتاریی پیاو لەگەڵ هاوسەری دا:

بە پێی ڕواڵەتی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ کە فەرمانەو فەرمانیش بۆ پێویست بوونە(**الأمر للوجوب**)، وە بەپێی فارماییشتەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە چاکڕەفتاریی پیاویان لەگەڵ ژندا، کردۆتە مایەی تەواویی ئیمان و ڕەوشت بەرزی و چاکێتیی لەلای خوا، دیارە خۆش ڕەفتاری پیاو لەگەڵ هاوسەری دا، فەرزەو لەسەر چواندنی و کەمتەرخەمیی تێدا کردنی، گوناهبار دەبێ.

## ٤ـ هۆکارەکانی وەدەست هێنانی خەسڵەتی خۆش ڕەفتاری مێرد لەگەڵ ژن دا[1].

چەند شتێك دەبنە هاندەری پیاو بۆ خۆش ڕەفتاری لەگەڵ ژن دا لەوانە :

### یەك : شارەزابوون لە سروشتی ژن :

ئەویش ئەوەیە کە ئافرەت بەهۆی ئەوەوە کە سۆزو بەزەییەکی زێدەی هەیە چونکە سروشتەکەی - کە دایکایەتییە - دەیخوازێ، لەچاو پیاو جۆرێك لەلاریی (اعوجاج)ی تێدایەو دەبێ پیاو تەحەمولی بکات، وەك فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی پێدەکات:

**(المرأة كالضلع، إنْ أقَمْتَها كَسَرْتَها، وان استمتعت بها، استمتعت بها وفيها عوج)** رواه البخاري: ٥١٨٤ و مسلم: ١٤٦٨.

واتە: ژن وەك پەراسوویە، ئەگەر ڕاستی بکەیەوە دەیشکێنی، وە ئەگەر لەگەڵی بگوزەرێنی، دەبێ بەلاریی لەگەڵی بگوزەرێنی.

وە لەڕیوایەتێکی(مسلم)دا هاتوە: **(وكسرها طلاقها)** :١٤٦٨، واتە: وە شکاندنیشی تەلاق دانیەتی.

دیارە پێشتریش ڕوونمان کردۆتەوە کە بۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ژن بە پەراسوو دەچوێنێ و لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

---

(١) بڕوانە: (المفصل فی احكام المرأة والبيت المسلم..) .. عبدالكريم زيدان، ج٧ ص ٢٢٧ـ ٢٣٢.

**دوو: بینینی لایەنە چاکەکانی و، ئومێدەواربوون بە بەرەکەتی خوا :**

وەك فەرموودەی:(**لا يفرك مؤمن مؤمنة ان كره منها خُلقاً رَضي منها آخر**) رواه مسلم : ١٤٦٩، دەلالەت لەسەر یەکەمیان و رستەی قورئانی: ﴿فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾ النساء ـ١٩ـ، دەلالەت لەسەر دووەمیان دەکات، کە پێشتر مانامان کردن.

**سێ: لە بیربوونی ئەو راستییە کە پیاو مشورخۆرو بەڕێوەبەری ژن و خێزانە:**

وەك خوا عزوجل فەرموویەتی : ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ..﴾ النساء ـ٣٤ـ کە دیارە پێشتر بەدرێژایی باسی مەسەلەی سەرپەرشتیاریێتی پیاومان کرد بۆ ژن و خێزان و، لێرە دوبارەی ناکەینەوە.

ئاشکراشە لەبەرچاو گرتنی ئەو راستییە شەرعییە، پاڵ بە پیاوەوە دەنێ، کە لێبوردەیی و سینگ فراوانیی و چاکەکاریی لەگەڵ ژن و خێزانی دا بکاتە پیشە!

شایانی باسیشە کە بەشێك لە زانایان لە باسی نەفەقەو مەسرەفکێشانی ژن دا لەلایەن مێردەوە، باسی گرتنی خزمەتکار(خادمه)و دابین کردنی پارەو مەسرەفی بۆنی خۆش و کەل و پەلی جوانیی (**الطيب وأدوات الزينة**)شیان کردوە، بەلاّم مـن بۆیە لەوێ باسم نەکرد، چونکە قەناعەتم وایە ئەو دوو شتەش دەکەونە جوغزی مامەڵەی باش و خۆش رەفتاریی پیاو لەگەڵ ژنی دا، پیاوێك بیەوێ بە چاکیی ئایەتی﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾ جێ بەجێ بکات، لە کاتێکدا کە هاوسەری

کاروباری ماڵ و خێزانی بۆ هەڵنەسووڕێ، ئەگەر لەبەر نەخۆشیی بێ، پێویستە، ئەگەرنا وا پەسندە مادام لە توانای دا هەبێ هاوکارێکی بۆ پەیدابکات.

هەروەها مەسەلەی کەل و پەلی جوانی و بۆنی خۆشیش بە هەمان شێوە شتێکی پە سندو باشە، مێرد هاوکاری ژنەکەی بکات و پارەی دابین کردنیانی پێبدات.

هەڵبەتە زانایان، چ لە بارەی دابین کردنی هاوکارو خزمەتکارو، چ لەبارەی دابین کردنی کەل و پەل و پێداویستیەکانی جوانیی و خۆ ڕازاندنەوەی ژنەوە، ڕاجیاییان هەیە[1] هۆی ڕا جیاییەکەش، هەم نەبوونی دەقێکی ڕوون و بێ چەندوچوونی شەریعەتە لەو بارەوەو، هەم جیاوازیی عادەت و باوی کۆمەڵگاکان و میللەتانە، بەڵام پێم وایە ئەوەی من هەڵم بژاردوە لە پێکانی ڕاستیی و ئامانجەکانی شەریعەت و چەمك و واتای ئایەت و فەرموودەکانەوە، نزیکترەو زانیاری تەواویش بەس لەلای خوایە عزوجل.

ئنجا لە کۆتاییدا باسی خۆش ڕەفتاریی مێرد لەگەڵ ژنەکەی دا دەڵێم:

دیسان لە خۆش ڕەفتاریی و جوامێریی پیاو لەگەڵ هاوسەری دا ئەوەیە،کە تەنانەت دوای مردنیشی بۆی وەفاداربێت و یادی بکات و ڕێزی دەستە خوشکەکانی بگرێ، جا دیارە ئێمە لەبەشی هەشتەم دا،کە باسی چۆنیەتی کەسایەتیی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکەین لە بواری ژیانی هاوسەرێتیی دا، باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین، بەڵام لێرەش ئەم دەقەی سوننەت بە نموونە دێنینەوە:

**(عن عائشة رضي الله عنها قالت: جاءت عجوز الى النبي** صلى الله عليه وسلم **فقال: كيف أنتم؟ كيف حالكم وكيف كنتم بعدنا؟ قالت: بخير بأبي وأمي أنت يا رسول الله. فلما خرجت قلت: يا رسول الله تُقْبِلُ على هذه العجوز هذا**

---

(١) لەو بارەوە سەرنجی : (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) بدە، ج٧ ص ١٨١ـ١٨٨

**الاقبال؟ فقال: يا عائشة! إنها كانت تأتينا زمان خديجة، و إنَّ حُسْنَ العهد من الإيمان)** أخرجة الحاكم والبيهقي.

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پیرەژنێك هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی: ئێوە چۆنن؟ حاڵتان چۆنە؟ وە دوای ئێمە چۆن بوون؟ ئەویش گوتی ئەی پێغەمبەری! خوا باب و دایکم فیدات بن، باشین، جا کاتێك چووە دەرێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بەم جۆرە گەرم و گوڕییە پێشوازیی لەم پیرەژنە دەکەی و دەیدوێنی؟!

فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەم ژنە لە ڕۆژگاری خەدیجەدا هاموشۆی دەکردین و، وەفادارییش لە ئیمانەوەیە.

## ٥ـ لەگەڵ جووتبوونی بە گوێرەی پێویستیی وی و بەپێی بۆ لوانی مێرد:

مافێکی دیکەی ژن لەسەر مێرد، ئەوەیە کە بچێتە لای و لەگەڵی جووت ببێ، بەڵگەی ئەوەش کە پیاو لەسەری پێویستە لەگەڵ هاوسەری دا جووت ببێ زۆرن:

١ـ ئامانجی هاوسەرگیریی بە پلەی یەکەم بریتییە لە تێرکردنی غەریزەی جینسیی هەرکام لە ژن و مێرد، کە دیارە ئەوەش بەبێ سەرجێیکردن(جماع) نایەتەدی، فەرمایشتی خواش، کە فەرموویەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾البقرە-١٨٧. کە پێشتر ماناامان کرد، ئاماژەیە بۆ ئەوە.

٢ـ فەرموودەی خوا عزوجل: ﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ﴾ النساء-

١٢٩، واتە: وە هەرچەندە لەسەریشی سووربن ناتوانن بە تەواویی لە نێوان ژناندا دادگەریی بکەن، دەجا بە یەکجاریی بەلای یەکێکیاندا لامەدەن و ئەوی دیکە وەك هەڵواسراو بەجێ بهێڵن.. واتە : وەك هەڵواسراو لە نێوان مێرد هەبوون و مێرد نەبوون دا ، کە دیارە ژنی بێ مێرد، هاوسەرێکی نیە لەگەڵی جووت ببێ.

٣- (**عن عبدالله بن عمرو بن العاص قال : قال لي رسول الله** صلى الله عليه وسلم: **يا عبدالله ألم أُخبَرْ أنك تصوم النهار وتقوم الليل؟ فقلت : بَلَى يا رسول الله، قال: فلا تفعل صُمْ وأفْطِرْ، وقُمْ ونَمْ، فإنَّ لجسدك عليك حقاً، وان لعينك عليك حقاً، وان لزوجك عليك حقاً، وان لِزَوْرِكَ عليك حقاً..**)

رواه البخاري : ١٩٧٥

واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله **عليه وسلم**) پێی فەرمووم: ئەرێ ڕاستە هەواڵم پێدراوە کە هەموو ڕۆژێ بەڕۆژووی و شەوگار هەر شەو نوێژ دەکەی؟ گوتم: با ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەجا وامەکە، ڕۆژو بگرەو مەشگرە ـ واتە: ڕۆژوی سوننەت ـ وە(شەوێ) بشخەوەو شەو نوێژیش بکە، چونکە: جەستەت مافی لەسەرتە، وە چاوەکانت مافیان لەسەرتە، وە هاوسەرت مافی لەسەرتە، وە میوانت مافی لەسەرتە..

ئنجا ئاشکرایە ئەو مافەی ژن کە لەگەڵ ڕۆژووگرتنی مێرددا تێک دەگیرێ، بریتیە لە جووتبوون (جماع)، ئەگەرنا مافەکانی دیکە لەگەڵ ڕۆژووگرتندا دژ ناوەستن و ڕۆژو گرتن ڕێیان لێناگرێ..

دیارە لەبارەی ماوەو ئەندازەی جووتبوونی پێویستی پیاویشەوە، لەگەڵ ژنەکەیدا، زانایان ڕا جیایی زۆریان هەیە، لە نێوان شەش مانگ هەتا چوار ڕۆژداو،

زۆر شتیشیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، کە پێم وایە ئیقناعکەر نین و، پێم وایە ڕای ڕاست هەر ئەوەیە کە لە ناوونیشانی ئەم مەسەلەیەدا هێناومانە(لەگەڵ جووتبوونی بە گوێرەی پێویستیی وی و بە پێی بۆ لوانی مێرد)، چونکە مادام تێرکردنی غەریزەی جینسیی یەکدی لەلایەن ژن و مێردەوە، مافی هەر کامێکیان بێ بەسەر ئەوەی دیکەوە، کەواتە: دەبێ بە پێی پێویست و کیفایەت بێ، مادام لایەنی بەرانبەر بتوانێ و بۆی بلوێ، وەك چۆن مافەکانی دیکەش هەروان: خواردن و خواردنەوەو بەرگ و پۆشاك و جێگای حەوانەوەو..هتد[١].

شایانی باسە کە شەریعەتی خوای کاربەجێ تێرکردنی پیاوی بۆ هاوسەرەکەی لە ڕووی جینسییەوە، بە طاعەت و کارێکی پاداشتدار داناوە، وەك لەم فەرمایشتەدا دەبینرێ:

**(..وفي بُضْعِ أحدكم صدقة: قالوا يا رسول الله أيأتي أحدنا شهوته ويكون له فيها أجر؟ قال: أرأيتم لو وضعها في حرام أكان عليه وِزرٌ؟ فكذلك اذا وضعها في الحلال كان له أجرٌ)** رواه مسلم: ١٠٠٦.

واتە: وە لەی جووتبونی یەکێکتان (لەگەڵ هاوسەری)دا پاداشت هەیە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا یەکێکمان ئارەزوی خۆی جێ بەجێ بکات چۆن پاداشتی هەیە؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر ئارەزووەکەی لە حەرام دا جێ بەجێ بکات گوناهی ناتگات ؟ بە هەمان شێوە ئەگەر لە حەلاڵدا دایبنێ پاداشتی هەیە.

---

(١) دوایی لە کتێبی: (المسائل الفقهية من اختيارات شيخ الإسلام ابن تيمية)ش دا، هەمان شتم بینی، کە دەڵێ: (ويجب على الزوج وطء امرأته بقدر كفايتها، مالم ينهك بدنه أو يشغله عن معيشته)، واتە: وە لەسەر مێردپێویستە بە ئەندازەی پێویستیی ژنەکەی لە گەڵیدا جووت ببێ،مادام زیان بە جەستەی نە گەیەنێ و، لەکاروبارو بژێو پەیداکردن ڕێگریی لێ نەکات.

## ٦ـ پاراستن و بەرگریی لێکردنی:

پیاو بە حوكمی ئەوەی كە مشوورخۆرو سەرپەرشتیاری ژن و خێزانەكەیەتی ئەركی سەر شانیەتی و مافی ژن و خێزانیەتی لەسەری، كە بەرگرییان لێ بكات و بیانپارێزێ، ئەگەرنا هیچ مانایەك بۆ سەرپەرشیتارێتی پیاو بۆ ژن و منداڵەكانی نامێنێتەوە، وەك خوای كاربەجێ لەبارەی سەرپەرشتیاربوون و مشورخۆریی پیاوانەوە بۆ ژنەكانیان، فەرموویەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ..﴾ النساء ـ٣٤ـ .

ئنجاوێڕای ئەوەش كە گوترا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەرگریی كردن و پارێزگاریی كردنی پیاوی بۆ ماڵ و خێزانی بە جیهاد داناوەو، كوژرانیشی لەو پێناوەدا بە شەهیدیی لەقەڵەم داوە:

**(من قُتِلَ دون ماله فهو شهيد، ومن قتل دون دمه فهو شهيد، ومن قتل دون دينه فهو شهيد، ومن قتل دون أهلهِ فهو شهيد)** رواه أبو داود: ٤٧٧٢ ورواه الترمذي: ١٤٢١، وقال حديث حسن صحيح.

واتە: هەر كەسێك لە كاتی بەرگریی كردن لەماڵ و سامانی دا بكوژرێ ئەوە شەهیدە، وەهەر كەسێك لەسەر خوێنی بكوژرێ، شەهیدە، وەهەر كەسێك لەسەر ئایینی بكوژرێ، شەهیدە، وە هەر كەسێك لەسەر خێزانی بكوژرێ، شەهیدە.

## ٧ـ دادگەریی لەگەڵ كردنی لەكاتی چەند ژنیی دا:

ئەمیش مافێكی دیكەی ژنە لەسەر مێردی، كە هەر كاتێك زیاتر لە هاوسەرێكی هەبوو، لە نێوانیاندا دادگەربێ.

چونكە وەك پێشتریش لە بەشی سێیەم، لەمەسەلەی چەند ژنییدابامان كرد، مەرجی ڕەوا بوون پێیدانی چەند ژنیی، بریتیە لە دادگەر بوون(عدل) پاش

هەبوونی توانای مادی بۆ مەسرەف کێشان، وەك خوای کاربەجێ: فەرموویەتی ﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ النساء -٣-

شایانی باسە ئێمە لە کاتی توێژینەوەی مەسەلەی چەند ژنیی(تعدد الزوجات) لەبەشی سێیەم دا، تا ڕادەیەك باسی چەمك و واتای دادگەریی بە مەرج گێراومان کردوە، بۆ ڕەوابوونی چەند ژنیی، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوەو خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ و حەواڵەی نامیلکەی:(سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەند ژنیی) کە ئالقەی(١٢) زنجیرە بابەتە هەنووکەییەکان)ە دەکەین.

بەڵام بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە مەسەلەیەکی گرنگ بکەم، کە لەبەرگی سێیەمی (تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز)داو لەکاتی توژینەوەی ئایەتەکانی: (١٢٨و١٢٩)ی (النساء)دا، بەدرێژیی لە بارەیەوە دواوین، ئەویش ئەوەیە کە:

هەرچەندە لە حاڵەتی ئاسایی و بۆ لوان دا، دادگەربوونی پیاو لەنێوان چەند ژنێکدا، بەوە دێتەدی، کە لە چوارشتان دا یەکسانییان لە نێواندا ڕابگرێ، کە بریتین لە:

١- مەسرەفکێشان (النَّفَقَة).

٢- بەرگ و پۆشاك (الكِسوَة).

٣- جێگاو ڕێگا (السَّكَنْ).

٤- شەو لەلا مانەوە (المَبِيتْ).

وە زانایان لەو بارەوە یەك قسەن [1].

---

(١) بروانە : (التفسير الكبير) للرازي، ج٩ ص ١٧٦، ١٧٧ و (تفسير القرآن العظيم) لابن كثير ج١ ص ٤٥١، و (الجامع لاحكام القرآن) للقرطبي ج٣ ص ١٦

بەڵام لە کاتێکدا بە هەر هۆیەکەوە، پیاو لەگەڵ هاوسەرەکانی دا دەکەوێتە بارودۆخێکی نائاسایی یەوە یەکێك یان زیاتر لە هاوسەرەکانیشی ڕازی دەبن، ئەوە پیاو بواری ئەوەی هەیە، کە خۆی پابەند نەکات بە دادگەریی و یەکسانییەوە، لەو چوارشتەدا بە تایبەتی لە مەسەلەی شەو لەلا مانەوەدا، بەڵگەشمان ئەم ئایەتە بە پێزەیە:

﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ الْأَنفُسُ الشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾النساء ـ ١٢٨ـ

واتە: وە ئەگەر ژنێك مەترسیی یاخی بوون، یان پشتگوێ خستنی لە مێردەکەی هەبوو، ئەوە گوناهیان ناگا، کە لە بەینی خۆیان دا پێك بێن، وە پێکهاتنیش باشترە، وە نەفسەکان ڕژدییان تێدا ئامادەیە، وە ئەگەر چاکە بکەن و پارێز بکەن، ئەوە بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە.

(ابن کثیر) لە تەفسیرەکەی خۆیداو لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی:

(يقول تعالى مُخبِراً و مُشرِّعاً عن حال الزوجين، تارة في حال نفور الرجل عن المرأة وتارة في حال اتفاقه معها، وتارة في حال فراقه لها، فالحالة الأولى، ما اذا خافت المرأة من زوجها أن يَنفِرَ عنها أو يُعرِض عنها، فلها أن تُسْقِطَ عنه حقها أو بعضه، من نفقة أو كسوة أو مبيت أو غير ذلك من حقوقها عليه، وله أن يقبل ذلك منها، فلا حرج عليها في بذلها وذلك له، ولا عليه في قبوله منها)[1].

واتە: خوای بەرز دەفەرموێ، وەك هەواڵدان و یاسادانان بۆ حاڵی ژن و مێرد،

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ٣٢٨.

جارێك لە كاتی بێزاریی مێرد لە ژن و، جارێك لـە حاڵـەتی تـەبایی و پێكهاتنیـان داو، جارێك لە حاڵەتی دووریی گرتنی دا لێی، جا لە حاڵەتی یەكـەم دا هـەر كـات ژن ترسا، كە مێردەكەی لێی بێزاربێ، یان پشتگوێی بخات، ئەوە ژنەكە بـۆی هەیـە كە هەموو مافەكەی، یان بەشێكی لەسەر مێردەكەی لابـەرێ : مەسـرەف كێشـان، یان بەرگ و پۆشاك، یان شەو لەلامانەوە، یان غەیری ئەوانـەش لـەو مافانـەی كـە لەسـەر مێردەكـەی هـەنی، وە مێردەكـەش بـۆی هەیـە ئـەوەی لێ وەربگـرێ و نـە ژنەكەی بە پێدانی ئەو مافـەی گونـاهی دەگـاتێ و نـە مێردەكەشـی بـە وەرگرتنـی گوناهبار دەبێ.

هەروەها (ابن كثير) لـەبارەی هـۆی هاتنـە خـواری ئایـەتی(١٢٨)ی (النسـاء) نوسیوویەتی:

(**روى ابو داود الطيالسي عن ابن عباس قال: خَشِيَتْ سودةُ أن يُطلِّقَها رسولُ الله** صلى الله عليه وسلم **فقالت: يا رسول الله ! لا تُطَلِّقْني واجْعَلْ يومي لعائشة، ففعل. ونزلت هذه الآية: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًا..﴾ قال ابن عباس: فما اصطلحا عليه من شيء فهو جائز. رواه الترمذي وقال: حسن غريب**) [(١)].

واتە: سەودە (خودا لێـی ڕازی بـێ) ترسـا ،كـە پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) تەڵاقی بدات، بۆیە گوتی: ئەی پێغەمبەری خـوا! تـەڵاقم مـەدە و ڕۆژەكـەی من بۆ عـائیشە دابنێ، ئەویش وایكرد، وە لەو بارەوە ئەم ئایەتە هاتە خـوارێ : وە ئەگەر ژنێك مەترسـیی یـاخی بـوون یـان ڕوو لێـوەرگێڕانی لـە مێردەكـەی هـەبوو، گوناهیان ناگا كە لە نێوان خۆیاندا پێك بێن و صوڵح بكەن ..

---

(١)هەمان سەرچاوەو لاپەڕە .

هەروەها بوخاری هەر لەو بارەوە هێناویەتی:

(عن عائشه رضي‌الله عنها: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾ قالت: الرجل تكون عنه المرأة، ليس بمستكثر منها، يريد أن يفارقها، فتقول: أجعلك من شأني في حلٍّ، فنزلت هذه الآية في ذلك)[1].

واتە: عائیشە خوا لیێی ڕازی بێ گوتویەتی: ئەم ئایەتە: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾ لە بارەی پیاوێکەوە هاتۆتە خوار کە ژنێکی لەلادەبێ زۆر کەیفی پێنایەت و دەیەوێ لێی جیابێتەوە، ژنەکەش دەڵێ: لە بارەی مافەکانی خۆمەوە ئازادت دەکەم(بەڵام وازم لێ مەهێنە!).

لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەش دا دەڵێم:

بێگومان شەریعەتی تێرو تەواوی خوای کاربەجێ لەم مەسەلەیەشدا وەك سەرجەم حوکم و بڕیارەکانی دیکەی واقیع بینی خۆی خستۆتە ڕوو و کارێکی کردوە، کە بەرژەوەندی هەر کام لە ژن و مێرد دابین بکات و هیچ کامیان سەغڵەت و نارەحەت نەکات، ئەویش دەبێ، لە پێناوی ئەوەدا، کە ژیانی هاوسەرییان تێك نەچێ و لەیەك نەترازێن.

کەواتە : ئەوە کە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە بارەی دادگەریی پیاو لە نێوان ژنەکانی دا فەرموویەتی: (**من كانت لـه امرأتـان يَميـلُ لاحداهما على الأخرى جاء يوم القيامة يَجُرُّ أحدَ شِقَّيْه ساقطاً أو مائلاً**) رواه النسائي و أبو داود وأبو ماجه وصححه الالباني في صحيح ابن ماجه: ١٦٠٣

واتە: هەر کەسێك دوو ژنی هەبن و لەسەر حیسابی ئەوی دیکەیان، بەلای یەکێکیان دا بشکێنێ ڕۆژی قیامەتێ دێ لە حاڵەتێکدا،کە لا تەنیشتێکی

---

(١) صحيح البخاري: ٤٦٠١

داکەوتوە، ڕایدەکێشێ.

بەڵێ ئەم فەرموودەیەو پێش ئەمیش چەمکی وشەی(عدل) کە لە ئایەتی(٣)ی (النساء)دا هاتوە، مەبەست پێیان حاڵەتی ئاسایی ژن و مێردە، بەلاّم لە حاڵەتی نائاسیی دا، هەر چۆنێکی خۆیان پێك بێن، مادام ژنەکەی ڕازی بێ، دروستە لەگەڵ مێردەکەی لە مافەکانیدا سەنگ و سوکییەك بکات، جا چ هاوسەری تەنیای مێردەکەی بێ، چ هی دووەم و سێیەم و چوارەم بێت.

لێرەش دا کۆتایی بە تەوەرەی دووەمی ئەم بەشە دێنین و دەچینە سەر تەوەرەی سێیەم و کۆتایی.

## تەوەری سێیەم: مافەکانی مێرد لەسەر ژن

دەتوانین مافەکانی مێرد لەسەر ژنەکەی دابەش بکەین بۆ حەوت مافی سەرەکی، کە لەم حەوت خاڵەدا دەیانخەینە ڕوو:

١ـ فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی.
٢ـ خۆش ڕەفتاریی لەگەڵ مێردیدا.
٣ـ تەبایی و لەگەڵ گونجانی لە ڕووی جووتبوونەوە بەپێی توانا.
٤ـ خزمەت کردنی ماڵ و مێردی.
٥ـ بەخێو کردن و پەروەردە کردنی منداڵ.
٦ـ پارێزگاریی لێکردنی سومعە و ماڵ و سامانی مێردی.
٧ـ ماڵ بەجێ نەهێشتن بەبێ مۆڵەتی مێردی و، فەرموو نەکردنی لە کەسێك کە مێردی حەز لە چارەی ناکات.

ئێستاش تیشك دەخەینە سەر یەك یەکی ئەم حەوت مافەی مێرد لەسەر ژن:

## ١ـ فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی:

یەکەمین مافی مێرد لەسەر ژنی و یەکەمین و گرنگترین ئەرکی سەرشانی ژن بەرانبەر بە مێردی ئەوەیە، کە بە پێی توانای و لە سنووری شەرع و بە پەسند زانراودا بە قسەی بکات و گوێڕایەڵی بێ، دیارە بەڵگەش لەسەر ئەوە کە شەریعەت فەرمانبەریی و گوێڕایەلیی ژنی بۆ مێردی پێویست کردوە ،زۆرن، بۆ وێنە:

**یەك:** خوای کاربەجێ لە بارەی چۆنیەتی بەڕێوەچونی ماڵ و خێزانەوە فەرمویەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ..﴾ النساء-٣٤. واتە: پیاوان بەسەر ژنانەوە سەرپەرشتیارو مشورخۆرن..

شایانی باسیشە ئێمە لە (بەشی سێیەم)دا باسی مەسەلەی سەرپەرشتی پیاو(قوامە الرجل)مان کردوە بۆ ژن و خێزان بۆیە لێرەدا ناگەڕێینەوە سەری و ئەوەندە دەڵێین کە: مادام پیاو مشوورخۆرو بەرپرس و سەرپەرشتیاری ژن و خێزان بێ، بێگومان مافی ئەوەشی هەیە، کە لەو چوارچێوەیەدا بە قسەی بکرێ و فەرمانبەریی بکرێ، چونکە هیچ دامەزراوەیەك بەبێ بەڕێوەبەر(مدیر)و سەرپەرشتیار بەڕێوەناچێ و هیچ بەڕێوەبەرو بەرپرسێکیش بەبێ ڕێز لێگیران و گوێڕایەڵیی بۆ کران، ئەرکی خۆی بۆ جێ بەجێ ناکرێ.

**دوو:** خوای دادگەر لەبارەی چۆنیەتی چارەسەری یاخیبوونی ژنی لەلایەن مێردەوە، فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾ النساء-٣٤. واتە: وە ئەو ژنانەی مەترسی یاخیبونیانتان هەیە، ئامۆژگارییان بکەن، وە لەگەڵیان لەسەر جێگا مەخەون، وە (ئەگەر هەر

نەهاتنەوە سەر ڕێ)، لێیان بدەن. بەڵام ئەگەر فەرمانبەرییان کردن، بیانوویان پێ مەگرن، بێگومان خوا بەرزو گەورەیە.

دیارە ئێمە پێشتر لە (بەشی سێیەم)دا باسی (مەسەلەی یاخیبونی ژن و چۆنیەتی سزادانی)مان کردوەو لەوێ بە درێژیی لەبارەی تەفسیرو واتای ئەم ئایەتەوە دواوین و، لێرە دووبارەی ناکەینەوەو هەر بە کورتی دەڵێین:

مادام پیاو مافی لێپرسینەوەو ڕاست کردنەوەی ژنی هەبێ، لە کاتی لارێی و لاساریی دا، شتێکی ئاشکرایە کە لەسەر ژن پێویست بێ بەقسەی مێردی بکات و بۆی گوێڕایەڵ بێ، ئنجا کە خوا فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾ کەواتە: کاتێك مێرد قسەی بەسەر ژنەکەیەوە نامێنێ، کە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی بۆ بکات و هەر کات ژن بە قسەی مێردی کرد، ئەو کاتە مێرد بۆی نیە لەسەر حاڵەتی پێشوی لێپرسینەوەو سزادان بەردەوام بێ .

**سێ**: خوای کاربەجێ لە پێناسەی ژنانی باشدا فەرمویەتی: ﴿فَٱلصَّـٰلِحَـٰتُ قَـٰنِتَـٰتٌ﴾ واتە: ئافرەتانی چاك، ملکەچانن.

دیارە وشەی(قَـٰنِتَـٰتٌ)یش، کە کۆی (قانت)ە، هەم دەگونجێ مەبەست پێی ملکەچیی فەرمانبەریی ژن بێ بۆ خوای پەروەردگار و هەم بۆ مێردیشی ، هەرچەندە لێرەدا وا پێدەچێ مەبەست پێی ملکەچ بوونی بێ بۆ مێردی، چونکە سیاق و دەلالەتی لەسەر دەکات و، خوای کاربەجێ لەم ئایەتەدا پێناسەی هەر کام لە ئەرکی سەرشانی پیاو ژن دەکات لە چوارچێوەی ماڵ و خێزاندا.

بەڵام لێرەدا ڕاستییەك هەیە نابێ لێی بێ ئاگابین، ئەویش ئەوەیە كە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی ژن بۆ مێردی تەنیا لە سنووری شەرع و شتی پەسندو چاك دایە، وەك خوای كاربەجێ دەربارەی ئافرەتانێك كە بەیعەتیان بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دا فەرموویەتی: ﴿..وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ﴾ الممتحنه-١٢، واتە: وە لە چاكو پەسندا سەرپێچییت لێنەكەن..

هەروەها پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:(**انماالطاعة في المعروف**) رواه البخاري:٧١٤٥ و مسلم ١٨٤٠. واتە: بێگومان گوێڕایەڵیی تەنیا لە چاكەدایە.

كەواتە: هەر كات پیاوێك داوایەكی ناشەرعی لە ژنەكەی كرد ،یان فەرمانێكی ناشەرعی پێكردن، ئەوە نەك هەر فەرمانبەریی و بە قسە كردنی لەسەر پێویست نیە، بگرە لێشی قەدەغەیەو لەسەریشی گوناهبارو سزادراو دەبێ.

هەڵبەتە پێشتریش باسی ئەوەمان كردوە، كە بەرپرس و بەڕێوەبەر بوونی پیاو بۆژن و خێزان، بە مانای تاكڕەویی و خۆفەرزكردن و ڕاوێژنەكردن نیەو، بناغە لە بەڕێوەبردنی خێزان دا، تەبایی و ڕاوێژو هاوكاریی پێكەوە كردنی ژن و مێردە، وەك خوای كاربەجێ بە گشتی فەرموویەتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ (**الشوری ٣٨**) واتە: وە كاروباریان بە ڕاوێژە، هەروەها بە تایبەتی دەربارەی شیردانی دایكی تەلاقدراو بە منداڵەكەی، وە لەكاتی لە شیر برینەوەی دیسان باسی ڕاوێژ پێكەوە كردنی ژن و مێردی لەیەك جیابوەوەی كردوەو فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ..﴾ الطلاق ـــ٦ـــ واتە: جا ئەگەر شیریان بۆتان بە منداڵەكەتاندا، كرێیەكەیان بدەنێ وە لە نێوان خۆتان بە شێوەیەكی پەسند ڕاوێژبكەن..

هـــەروەها فەرموویـــەتی: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾ البقرە-٢٣٣. واتە: جا ئەگەر (دایك و باب) ویستیان لە شیری ببڕنەوە بە ڕەزامەندی ڕاوێژی نێوانیان، ئەوە گوناهیان لەسەرنیە..

ئاشكراشە ئەگەر ڕاوێژو لێك تێگەیشتنی ژن و مێردێكی لەیەك ترازاو، بۆ شیرپێدان و لە شیر بڕینەوەی منداڵ پێویست بێ، بۆ ژن و مێردێكی پێكەوە ژیاو پێویست ترە!

## ٢ـ خۆش ڕەفتاریی لەگەڵ مێردیدا:

بە پێی فەرمایشتی خوا: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ..﴾ البقرەـ٢٢٨ـ وەك چۆن پیاو لەسەری پێویستەو مافی ژنەكەیەتی كە بە شێوەیەكی باش و پەسند ڕەفتارو مامەڵەی لەگەڵ بكات، بە هەمان شێوەش مافی پیاوەو ئەركی سەرشانی ژنە كە مامەڵەو هەڵس و كەوتی لەگەڵ مێردەكەی دا باش و پەسند بێت.

كە دەتوانین بە كورتیی ئاوا پێناسەی خۆش ڕەفتاریی ژن لەگەڵ مێردەكەیدا بكەین:

هەموو ئەو ئەركانەی، كە شەریعەت خستوونیە سەر شانی ژن،كە بەرانبەر بە مێردەكەی ئەنجامیان بدات، لە گوێڕایەڵیی و ڕێز لێگرتن و ..هتد، وە بزانێ ـ لە سنووری شەرع دا ـ مێردەكەی بە چی دڵخۆش دەبێ وابكات و وابلێ.

پێشم وایە گرنگترین شت كە دەبێ ژن خۆی لێ بپارێزێ، لە هەڵس و كەوتی لەگەڵ مێردی دا، بریتیە لە خۆ دوورگرتن لە ڕووگرژیی و پرتەو بۆڵەو قسەی زبرو ناخۆش.

## ٣ـ تەبایی و لەگەڵ گونجانی لە ڕووی جووتبوونەوە، بە پێی توانا:

مافێکی دیکەی پیاو لەسەر ژنەکەی ئەوەیە، کە مەسەلەی جینسیی لەسەر نەکاتە کارتی فشارو لەو بارەوە لەگەڵی تەباو گونجاوبێ و، بە پێی تواناو بۆ لوانی بەدەم داواکاریەوە بچێ، چونکە وەك پێشتریش گوتمان، ئامانجی سەرەکی هاوسەرگیریی بریتیە لە تێرکردنی غەریزەی جینسی هەردووك لا، وەك ڕستەی:(**هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ**) دەیگەیەنێ.

لەو بارەشەوە فەرمووده زۆرن، بۆ نموونە:

**(اذا دعا رجل امرأته الى فراشه فأبت أن تجيء لعنتها الملائكة حتى تُصبح)** رواه البخاري: ٥٣٢٣٧ و مسلم: ١٤٣٦ و اللفظ للبخاري.

واتە: هەر کات پیاو بانگی ژنەکەی کرد بۆ سەر جێگاکەی و نەهات، هەتا بەیانی دەکاتەوە فریشتەکان نەفرینی لێدەکەن.

بەڵام لێرەدا نابێ لە دوو مەسەلان بێئاگابین:

یەك: پیاو بۆی نیە بە ناهەق ژنەکەی سەغڵەت بکات و بیانووی پێ بگرێ، یان زیاد لە توانای خۆی لێی داوابکات، یان لە کاتی نەساغیی و خەمباریی دا.. یان، .. یان. هتد، ئەگەر نا ستەم و ناهەقیی دەکات و گوناهباریشە، چونکە: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾البقرە-٢٨٦، واتە: خوا جگە لە توانای لە هیچ کەس داوا ناکات.

دوو: پیاو بۆی نیە لە کاتی حەیزدا یان لە شوێنی غەیری ئاسایی یەوە داوای جووتبوون لە هاوسەری بکات، چونکە خوای پەنهانزان لە بارەی کاتی کەوتنە حەیزی ژنەوە، فەرموویەتی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ

﴿فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرە-٢٢٢، واتە: وە لەبارەی حەیزەوە لێت دەپرسن: بڵێ: ئەوە ئازارە بۆیە لە کاتی حەیزدا لە ژنان کەنار بگرن و توخنیان مەکەون(وەك جووتبوون) هەتا پاك دەبنەوە، جا هەر کات خۆیان شۆرد لەو شوێنەوە، کە خوا فەرمانی پێکردوون بچنە لایان (لەگەڵیان جووتبن) بێگومان خوا پەشیمان بوەوان و خۆ پاککەرەوانی خۆش دەوێن.

هەروەها فەرماییشتی خوا، کە فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ﴾ ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە جگە لەو شوێنەی، کە خوا فەرمانی پێکردوە پیاو بچێتە لای ژنەکەی، کە شوێنی منداڵ لێوە پەیدابوون و لێوە لە دایك بوونە، واتە: داوێن (فرج) دروست نیە لە شوێنی دیکەوە ـ کە مەبەست کۆمە ـ لەگەڵی جووت ببێ.هەروەها کە لە ئایەتی دواتردا فەرموویەتی: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ﴾ البقرە-٢٢٣، واتە: ژنەکانتان کێڵگەتانن، (واتە: شوێنی تۆوی کۆرپە تێدا وەشاندنتانن)، دە جا هەرکات (یان هەر چۆنێکی، یان لەهەر لایەکەوە) ویستتان بچنە لای کێڵگەکانتان، بچن.

هەمان مەبەست دەگەیەنێ .

ئنجا وێڕای ئەم ڕستە قورئانیە موبارەکانە، چەند فەرماییشتێکی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە گێڕراونەوە کە زانایان مشت و مڕیان لەسەریان هەیەو پێم وایە دوای ئایەتەکانیش، یەکمان لەسەریان نەکەوتوە بۆ نمونە:

أ- (ولا تأتوا النساء في أعجازهن) رواه الترمذي.

واتە: وە لە کۆمیانەوە مەچنە لای ژنان.

ب- (لا ينظر الله لرجل جامع امرأته في دُبُرِها) رواه ابن ماجه.

واتە: خوا تەماشای پیاوێك ناكات، كە لە كۆمیەوە لەگەڵ ژنەكەی جووت دەبێ.

## ٤- خزمەت كردنی ماڵ و مێردی:

مافێكی دیكەی مێرد لەسەر ژنی، بریتیە لەوە كە بەپێی تواناو برستی خزمەتی ماڵ و مێردی خۆی بكات، شایانی باسە لەبارەی پێویست بوون و پێویست نەبوونی خزمەتی ژن بۆ ماڵ و مێردی، زانایان ڕاجیایی زۆریان هەیەو، زۆربەیان ڕایان وایە، كە ژن لەسەری پێویست نیە خزمەتی ماڵ و مێردی بكات و، هەندێكیشیان خزمەت كردنی ژن بۆ ماڵ و مێردی، بە ئەركی سەرشانی ژن و مافی مێرد دەزانن.

جا لەبەر ئەوەی من ڕای دووەمی(هەندێك لە زانایان)م پێ پەسندترە بە باشی دەزانم، سەرەتا سەرنجێكی قسەو بیرو ڕای زۆربە(جمهور) بدەین و، دوایش هۆی هەڵبژاردنی ڕای دووەم بخەینە ڕوو:

### أ- ڕای زۆربەی زانایان:

#### ١ـ حەنەفییەكان:

(الكاساني) لەو بارەوە گوتوویەتی: (ولو جاء الزوج بطعام يحتاج الى الطبخ والخبز، فأبت المرأة الطبخ والخبز لا تُجْبَرُ على ذلك، و يُؤْمَرُ الزوج أن يأتي لها بطعام مهيأ)[1]، واتە: وە ئەگەر مێرد خواردنێكی هێنا، كە حەوجێی لێنان و

(١)بدائع الصنائع، ج٤ ص ٢٤.



کردنە نان بوو، ژنەکەی ناچار ناکرێ ئەوە بکات، بەڵکو مێرد لەسەری پێویستە کە خواردنی ئامادە کراوی بۆ بێنێ.. بەلاّم لە (الفتاوى الهندية)دا هاتوە (قالوا: ان **هذه الأعمال ــ أعمال البيت وخدمته واجبة عليها ديانة وان كان لا يُجْبِرُها عليها القاضي)**[1].

واتە: گوتوویانە: ئەم کارانە - ئیش و کاری ماڵ و خزمەتی مێرد ـ وەك دینداریی لەسەر ژن پێویستن، هەرچەندە قازیش ناچاری ناکات بیانکات.

## ٢ـ مالیکییەکان:

(الدردير) لە (الشرح الكبير)دا گوتوویەتی: (**ويجب عليه اخدام أهله بأن يكون الزوج ذا سعة، وهي ذات قدر ليس شأنها الخدمة... والا بأن لم تكن أهلا للإخدام أوكانت أهلاً و الزوج فقير فعليها الخدمة الباطنية و لوغنية ذات قدرٍ من عجن و كنس وفرش وطبخ له لا لضيوفه..**)[2].

واتە : وە پیاو لەسەری پێویستە خزمەتکار بۆ ژنەکەی بگرێ، مادام مێرد هەبووبێ و ژنەکەش خاوەن پێگەیەکی وابێ نەگونجێ خزمەت بکات، بەلاّم ئەگەر ژنەکە شایستەی خزمەتکار بۆ گیران نەبوو، یان شایستەش بوو، بەلاّم مێردەکە هەژار بو، ئەوە لەسەری پێویستە، ئەگەر دەوڵەمەندیش و پارەداریش بێ کە خزمەتی نێوەوە و شارراوەی نێ‌و ماڵ بکات، لە هەویر شێلان و گەسك دان و ڕایەخ ڕاخستن و چێشت لێنان بۆ مێردی، نەك بۆ میوانەکانی..

---

(١) الفتاوى الهنديه، ج١ ص ٥٤٨

(٢) الشرح الكبير، ج٢ ص ٥١٠ ــ ٥١١

### ٣ــ شافیعییەكان:

(أبو اسحاق الشیرازی) لە (المهذب)دا گوتوویەتی:(ولا یجب علیهاخدمته في الخبز والطحن والطبخ والغسل وغیرها من الخدم، لان المعقود علیه من جهتها هو الإستمتاع فلا یلزمها ما سواه)[1].

واتە: وە خزمەتكردنی وی (مێردی) لەسەر پێویست نیە، لە نان كردن و هاڕین و لێنان و شۆردن و خزمەتەكانی دیكە، چونكە ئەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەكەی لەسەر بنیات نراوە، بە نیسبەت ژنەكەوە، تەنیا جووتبوونەو جگە لەوەی لەسەر پێویست نیە.

### ٤ـ حەنبەلییەكان:

(ابن قدامة) لە (المغني) دا گوتویەتی:(ولیس علی المرأة خدمة زوجها من العجن والخبز والطبخ وأشباهه ككنس الدار وملأ الماء من البئر، نص علیه أحمد، ولأن المعقود علیها من جهتها هو الإستمتاع بها، فلا یلزمها غیره كسقي دوابه وحصد زَرْعِه)[2].

واتە: وە خزمەتی مێرد لەسەر ژن پێویست نیە لە هەویر شێلان و نانكردن و چێشت لێنان و شێوەیان، وەك ماڵ گەسكدان و ئاو هەڵهێنجان لە بیر، دەقی قسەی ئەحمەدی لەسەرە، چونكە گرێبەستی هاوسەرگیریی بە نیسبەت ژنەوە، مەبەست پێی جووتبوونەو، جگە لەوەی لەسەر نیە، وەك ئاودانی ئاژەڵەكانی و درەوی دانەوێڵەكەی.

(١) المهذب وشرحه تكملة المجموع ،ج١٥ ص ٥٨١
(٢) المغني ج٧ ص٢١.

## ٥ـ ظاهیرییەکان:

(ابن حزم) لە (المحلّى) دا گوتوویەتی: (وليس على الزوج ان ينفق على خادم لزوجته ولو أنه ابن خليفة وهي بنت خليفة، انما عليه أن يقوم لها بمن يأتيها بالطعام والماء مهيأً ممكناً غدوة وعيشةً، وبمن يكفيها جميع العمل من الكنس والفرش) [1].

واتە: وە لەسەر مێرد پێویست نیە، کە خزمەتکار بۆ ژنەکەی بگرێ، هەرچەندە هەردوکیان کوڕوکچی خەلیفەش بن، بەڵکو لەسەری فەرزە، کە کەسێکی بۆ دابین بکات، بەیانیان و ئێواران خواردن و ئاوی ئامادەکراو بۆ خواردنی بۆ بێبێنێ، وە کەسێك هەبێ، کە هەموو ئیشەکانی ماڵی بۆ بکات لەگەسك لێدان و ڕایەخ ڕاخستن..

هەڵبەتە ئەو قسەیەی (ابن حزم)یش سەیرۆکەیە! چونکە هەر عەینی قسەی ئەوانی دیکە دەکات و، ئەو کەسەی ئەو کارانە بۆ ژن دەکات، هەر لە حوکمی خزمەتکار(خادم)دایە!

## ب- ڕای دووەم:

کە ژمارەیەك لە زانایان پەسندیان کردووە،لە نێویاندا هەرکام (ابو بكر بن شيبه)و (ابو اسحاق الجوزجاني)و(ابن تيمية) [2] هەن، وە منیش پێم پەسندە، بەڵام بە تێبینی یەکەوە، دەڵێ: خزمەتی ماڵ و مێرد بە گوێرەی توانا ئەرکی سەرشانی ژنە بەرانبەر بە مێرد، دەگونجێ بەم بەڵگانە پشتگیریی بکرێ:

---

(١) المحلّى ج ١٠ ص ٩٠ .

(٢) بڕوانە: (المفصل..) ج٧ ص ٣٠٤ .

١ـ ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ..﴾ البقره-٢٢٨، ئەم ڕستە قورئانییە لێی وەردەگیرێ، کە هەر مافێکی ژن، مافێکی مێردی لەبەرانبەردا هەیەو، هەر ئەرکێکی مێرد، ئەرکێکی ژنی لەبەرانبەردا هەیە.

کەواتە: ئەگەر مافی ژنە لەسەر پیاو کاری دەرەوەی ماڵ بکات و، بژێوی خۆی و ژن و منداڵی دابین بکات، مافی مێردیشە لەسەر ژن کە ئیش و کاری ماڵەوە بکات و، خزمەتی خۆی و مێردو منداڵەکانی بکات، بە واتایەکی دیکە: ئەگەر ئەرکی مێردە لە دەرەوەی ماڵ بژێو پەیدا بکات، ئەرکی ژنیشە کە لە ماڵەوە، خزمەتی خۆی و مێردە ماندووەکەی و منداڵەکانی بکات.

٢ـ (**عن علي ابن ابى طالب أن فاطمة رضي الله عنها أتت النبي** صلى الله عليه وسلم **تسأله خادماً، فقال: ألا أخبرك ماهو خير لك منه؟ تُسَبِّحين الله عند منامك ثلاثاً وثلاثين، وتحمدين ثلاثاً وثلاثين، وتكبرين الله أربعاً وثلاثين..**) رواه البخاري:٥٣٦١، ٥٣٦٢

واتە: فاتیمە خوا لێی ڕازی بێ ،چووە لای پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) داوای خزمەتکارێکی لێکرد، ئەویش فەرمووی: شتێکت پێ بڵێم لەوە بۆت باشتربێ؟ لەکاتی خەوتندا سی و سێ (سبحان الله)و سی و سێ(الحمدلله)و سی و چوار(الله اکبر) بکە. وەك دەبینین پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) بە عەلی مێردی فاتیمەی نە فەرموو، کە دەبێ خزمەتکارێکی بۆ بگری، هەروەها خۆیشی بۆی دابین نەکرد، هەروەها نەشیفەرموو خزمەتی ماڵ و مێردت لەسەر پێویست نیە!

٣ـ(**عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما قال: هلك أبي وترك سبع بنات أو تسع بنات، فتزوجت امرأة ثيباً، فقال لي رسول الله** صلى الله عليه وسلم

**تزوجت يا جابر؟ فقلت : نعم فقال بكراً أم ثيباً؟ قلت:بل ثيباً . قال: فهلا جارية تلاعبها وتلاعبك، وتضاحكها وتضاحكك! قال: فقلت له: ان عبدالله هلك وترك بنات، وإني كرهتُ أن أجيئهن، فتزوجت امرأةً تقوم عليهنَّ وتُصلِحهن، فقال بارك الله لك، أو: خيراً)** رواه البخاري:٥٣٦٧

واتە: جابیری کوڕی عەبدوللاّ خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: باوم مردو حەوت یان نۆ کچی بەجێهێشت،منیش بێوەژنێکم هێن، پێغەمبەریش صلی اللە علیەوسلم پێمی فەرموو: ئەی جابیر هاوسەرت پەیدا کردوە؟ گوتم بەڵێ، فەرمووی: کچە یان بێوەژن؟ گوتم : بەڵکو بێوەژنە، فەرمووی: دەبوایە کچ بوایە یاریی و گەمەتان پێکەوە کردبایەو پێکەوە پێکەنیبانایە، دەڵێ پێم گوت: عەبدوللاّ مردوەو کچی لەپاش جێماون، منیش حەزم نەکرد یەکێکی وەکو خۆیان بێنمە لا، بۆیە ژنێکم هێنا، کە سەرپەرشتییان بکات، فەرمووی: خوا بەرەکەتدارت بکات، یان خێردارت بکات.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پشتگیریی ڕایەکەی جابیری کردوە، کە بێوەژنێك بۆی باشتربووە، کە خزمەتی خوشکەکانی بکات، لە کچێك کە هاوتەمەنی خوشکەکانی بێ و خزمەتیانی پێ نەکرێ!

٤ـ (عن أسماء بنت أبي بكر رضي الله عنهما قالت: تزوجني الزبير وما له في الارض من مال ولا مملوك ولا شيء، غير ناضح وغير فرسه، فكنت أُعَلِّفُ فَرَسه وأسْقي الماء وأخْرِزُ غَرْبَهُ وأعجِنُ..) رواه البخاري:٥٢٢٤

واتە: ئەسمائی کچی ئەبوو بەکر خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: زوبەیر بە هاوسەری گرتم و لەسەر زەوی هیچ سامانێك و کۆیلەیەك و هیچ شتێکی نەبو، جگە لە ئاژەڵێکی[1] ئاوکێش، وە جگە لەئەسپەکەی، جا من ئالیکم

(١) الناضح: الدابة يُسْتَقى عليها، المعجم الوسيط ص.٩٢٨

دەدا بە ئەسپەکەی و ئاوم دەکێشاو دۆڵچەکەیم [١] دەدووری و هەویریشم دەشێلا..

وەك دەبینین ئەسمائی کچی ئەبو بەکری صیدیق، نەك ئیش و کاری نێو ماڵ بەڵکو هی دەرەوەشی کردوە!

ئەوی بەڕوونیش لەم دەقانە دەفامرێتەوە ئەوەیە، کە ئیش و کارو خزمەتی ژن بۆ ماڵ و مێردی، لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) شتێکی ئاسایی و سەلمێنراوو چاوەڕوانکراو بووە، شایانی باسیشە کە (بخاري) فەرموودەی ژمارە(٥٣١)ی لە ژێر ناوونیشانی(**باب عمل المرأة في بيت زوجها**)دا هێناوە واتە: کاری ژن لەماڵی مێردی دا، هەروەها فەرموودەی ژمارە(٥٣٦٧)ی لە ژێر ناوونیشانی:(**باب عون المرأة زوجها في ولده**) دا هێناوە، واتە: یاریدەدانی ژن بۆ مێردی بۆ بەخێوکردنی منداڵەکانی.

ئێستاش کاتی خستنە رووی ئەو ڕایەیە، کە پێم ڕاست و پەسندە، وێڕای تێبینییەکەم:

وەك دەردەکەوێ هیچ ئایەت و فەرمایشتێکی روون و ڕاشکاو نیە کە مەسەلەی ئیش و کاری ژن و خزمەت کردنی ماڵ و مێردی بەلایەك دابخات، کە لەسەری پێویستە یان نا؟!

هەڵبەتە هۆکاری ڕاجیایی زانایانیش لەو بارەوە هەر ئەوەیە بەلام لە سۆنگەی ئەوەوە کە چ لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، چ دوای ئەویش هەتا ئەم ڕۆژگارە، عورف و باوی موسوڵمانان هەروا هاتوە، کە ژنان ئەرك و کاری ماڵەوە ڕاپەڕێنن و خزمەتی ماڵ و مێردیان بکەن بەبێ بەرانبەر، ئاشکراشە کە

(١) دۆڵچە: ئەوەیە کە ئاوی پێ لەبیر هەڵدەکێشن .

عورف و عادەت و باوی موسوڵمانان، مادام لەگەڵ دەقێکی شەریعەت دا تێك نەگیرێ ، یەکێکە لە بنەماکانی هەڵێنجانی یاساکانی شەریعەت. هەروەها گرێبەستەکانیش، کە یەکیان گرێبەستی هاوسەرگیریی (عقد الزواج)ە دادەبەزێنرێتە سەر عورف و باوی خەڵك، بۆیە: دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین: ئەو رایە ڕاست و بەهێزترە، کە دەڵێ : خزمەتی ماڵ و مێرد ئەرکی ژنەو مافی مێردە لەسەری، وەك (**القرطبي**) لەبارەی خزمەتی ژن بۆ ماڵ و مێردی و، ڕاپەراندنی کاروباری ماڵ گوتویەتی: (**وهذا أمر دائرٌ على العرف الذي هو أصل من أصول الشريعة فإن نساء الأعراب وسُكّانَ البوادي يخدمن أزواجهن حتى في استعذاب الماء و سياسة الدواب**) [(١)].

واتە: وە ئەمە بەپێی باوی خەڵك دەگۆڕێ، ئەو عورفەی کە یەکێکە لە بنچینەکانی شەریعەت، وە ژنانی لادێ و دانیشتوانی دەشت و بیابان خزمەتی مێردەکانیان دەکەن، تەنانەت لە هێنانی ئاوی شیرین و سەرپەرشتی ولاخەکانیشدا.

(ابن القيم)یش گوتویەتی:(**ان العقود المطلقة ومنها عقد الزواج، انما تنزل على العرف السائدبين الناس، والعرف بين الناس أن الزوجة تقوم بخدمة الزوج كماتقوم بشؤون البيت الداخلية**) [(٢)].

واتە: گرێبەستەکان لە گرێبەستی هاوسەرگیریی یەکێکیانە، بەپێی عادەت وباوی خەڵك جێ بەجێ دەکرێن، عادەتی نێو خەڵکیش ئەوەیە، کە ژن خزمەتی مێردی دەکات و، ئیش و کاری نێوماڵ بەڕێوە دەبات.

---

(١) الجامع لاحكام القرآن ،ج١٠ ص ١٤٥.
(٢) زاد المعاد في هدى خير العباد ج٤ ص٣٢.

تێبینیەکەشم ئەوەیەکە: نابێ لەبیریشمان بچێ، کە ئەو حوکمانەی پەیوەستن بەعورف و باوی خەڵکەوە، هەر کات عورف و باوەکە گۆڕا، حوکمەکەش دەگۆڕێ، بۆیە مەرج نیە لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا، کە لەو بارەوە عورف و عادەتیان جیایە، ئەم مەسەلەیە هەمان حوکمی هەبێ، دیارە ئەمەش مەسەلەیەکی وردەو زانایانی لێکۆڵەرەوەو وردبین لەسەری ڕێککەوتوون، بۆ نموونە(القرافی) لە کتێبی:(**الإحكام فى تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصُرّفات القاضي والامام**)دا لەو بارەوە گوتوویەتی:

(**ان إجراء الأحكام التى مدركها العوائد مع تغيُّر تلك العوائد، خلاف الإجماع وجهالة في الدين، بل كلّ ما هو فى الشريعة يَتْبَعُ العوائد، يتغير الحكم فيه عند تغير العادة الى ما تقتضيه العادة المتجدّدَه، وليس هذا تجديداً للإجتهاد من المقلّدين حتى يشترط فيه اهلية الإجتهاد، بل هذه قاعدة اجتهد فيها العلماء وأجمعوا عليها، فنحن نتبعهم فيها من غير استئناف اجتهاد**)[1].

واتە: بێگومان وەك خۆیان چەسپاندنی ئەو حوکمانەی کە پەیوەستن بە عورف و باوەکانەوە، هەرچەندە عورف و باوەکانیش گۆڕابن، پێچەوانەی یەکدەنگییەو نەزانینە لە ئایین دا، بەڵکو هەرچی لەشەریعەت دا پەیوەستە بە عورف و عادەتەوە، لە کاتی گۆڕانی عورف و عادەتەکەدا حوکمەکەی دەگۆڕێ، بۆ حاڵەتێك کە عادەتە تازەکە دەیخوازێ، وە ئەمەش ئیجتیهادی تازە نیە لە لاساییکەرەوانەوە تاکو شایستەیی ئیجتیهادی تێدا بە مەرج بگیرێ، بەڵکو ئەوە بنچینەیەکە زانایان کۆششیان تێدا کردوەو لەسەری ڕێککەوتوون ئێمەش لەوەدا شوێنیان دەکەوین بەبێ ئیجتیهادکردنی تازە.

---

(١) الإحكام فى تميز الفتاوى عن الأحكام وتصرفات القاضي والإمام، ص ٢١٨، ٢١٩ .

## ٥ـ بەخێو کردن و پەروەردەکردنی منداڵ :

هەرچەندە چ بەخێوکردنی و چ پەروەردەکردن و بار هێنانی منداڵ، ئەرکی سەرشانی هاوبەشی هەرکام لە ژن و مێردەو، لە ڕاستی دا منداڵ سپاردەیەکی گەورەو گرنگی خوایی یە، لە ئەستۆی دایك و بابی دا، بەلآم بەخێوکردن و پەروەردەکرنی منداڵ بە پلەی یەکەم ئەرکی سەرشانی ژنەو، ئەو ئەرکە گرنگ و گەورە یە، وەك بەدایك جێ بەجێ دەکرێ، بە هیچ کەس وا جێ بەجێ ناکرێ.

شایانی باسیشە زانایان لەو بارەوە، کە ئایا ژن تا چ ڕاددەیەك بەخێو کردن و پەروەردە کردنی منداڵی لەسەر پێویستە، وەك مافێکی هەر کام لە مێردو منداڵەکە لەسەری؟! زۆر قسەو باسیان کردوە، بەلآم ئەوەی من لەلام ساغ بۆتەوە ئەوەیە، کە ژن وەك ئەرکێکی شەرعیی سەرشانی و، وەك مافێکی ڕەوای هەرکام لە مێردو منداڵ بە پێی تواناو بۆ لوانی، هەرکام لە بەخێوکردن و پەروەردە کردنی منداڵی لەسەر پێویستە، بەلآم بێگومان پاش هاوکاریی مێردو دابین کردنی پێداویستییەکانی خۆی و منداڵەکەی یان منداڵەکانی، بە بەڵگەی:

١ـ بێگومان ژن و مێرد هۆکاری پەیدابوون و هاتنە دنیاوەی منداڵن و، بەچکەی مرۆڤیش لە بەچکەی هەر ژیانداریێکی دیکە زیاتر شایستەی خزمەت و هاوکاریی و مشوورلێخورانەو، بەبێ ئەوە زوو لەبەین دەچێ، ئنجا دیارە دایکیش لە هەموو کەس چاکترو شاییستە ترە، بۆ بەخێوکردن و خزمەت و پاشان پەروەردەکردنی منداڵەکەی ، وە لە ڕاستی دا هیچ کەسێك لە ژنان و پیاوان، کەلێنی دایك بۆ منداڵەکەی پڕناکاتەوە، بۆیە ژن لەسەری پێویستە منداڵی خۆی بەخێوو پەروەردە بکات،وە ئەگەر بەهۆی کەمتەرخەمیی ئەوەوە، هەر گیروگرفتێك و ناتەواویەك بەسەر منداڵەکەی بێ، گوناهبارو بەرپرسیارە.

٢ـ خوای کاربەجێ دەربارەی ئەرکی سەرەکی هەرکام لە ژن و مێرد، لە بواری بەخێوکردنی منداڵ دا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ..﴾البقرة ـ٢٣٣ـ واتە: وە داییکان بۆ هەر کەسێك کە ویستی ماوەی شیرپێدان تەواوبکات ، دوو ساڵی تەواو شیر بە منداڵەکانیان دەدەن (وەبەخێویان دەکەن) وە بەشێوەیەکی پەسند بژێوو بەرگ و پۆشاکی دایکەکان لەسەر بابی منداڵەکەیە، هیچ کەسێك لە توانای خۆی بەدەر لەسەری پێویست ناکرێ.. کەواتە: شیرپێدانی منداڵ و بەخێوکردنی، ئەرکێکی خوارسك و شەرعیی دایکە، هەر بۆیەش لە ئایەتەکەدا بە شێوەی هەواڵدان( إخبار) هاتوە ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ ﴾ کە ئەمە یانی: تەنیا شیرپێدانی دایك بە رۆڵەکەی و بەخێوکردنی حاڵەتێکی سروشتیی و ئاساییە!

٣ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:(**كلكم راعٍ وكلكم مسئول عن رعيته، والإمام راعٍ ومسئول عن رعيته، والرجل راعٍ في أهله ومسئول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسئول عن رعيتها**..) وفي رواية ـ **والمرأة راعية على بيت زوجها وولده**..) رواه البخاري: ٨٩٣، ومسلم:١٨٢٩.

واتە: هەر کامێکتان چاودێرەو بەرپرسیارە بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەی، وە پێشەوا چاودێرە بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەی بەرپرسیارە، وە پیاو لە نێو خێزانی دا چاودێرەو بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەی و بەرپرسیارە، وە ژن چاودێرە لە ماڵی مێردی و بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەی بەرپرسیارە.. وە لە

ڕیوایەتێك دا هاتوە: وە ژن چاودێرە بەسەر ماڵی مێردی و منداڵی دا..

کەواتە: ژن بەرانبەر بە ماڵ و مێردی و خێزان و منداڵەکانی، بەرپرسیارەو ئەرکی چاودێرێتیی پێ سپێردراوە.

٤ـ زانایانی ئیسلام زۆر بە درێژیی باسی بەخێوکردنی منداڵیان کردوە، لە ژێر ناوونیشانی:(الحضانة)دا کە بەمجۆرە پێناسەیان کردوە [١]:

**(الحضانة هي حفظ الولد في بيته وذهابه ومجيئه والقيام بمصالحه، أي: في طعامه ولباسه وتنظيف جسمه وموضعه)** [٢].

واتە: (**حضانة**) بریتیە لە پاراستنی منداڵ لە ماڵەکەیداو لە چوون و هاتنی داو هێنانەدی بەرژەوەندییەکانیەتی، یانی: لە خواردنی و پۆشاکی و پاککردنەوەی جەستەی و شوێنی.

جازانایان لەو بارەوە لەسەر سێ بنەمای گرنگ ڕێککەووتون:

یەك: بناغە لە یاساکانی بەخێوکردنی منداڵ(**حضانة**)دا هێنانەدی بەرژەوەندی بەخێوکراو (**محضون**)ە .

دیارە لەسەر ئەم بنەمایەش، شەرعزانان بۆ کەسێك کە بەئەرکی بەخێوکردنی منداڵ هەڵدەستێ، عەقڵ و ئەمانەت و سەر ڕاستیی(رشد)و توانایی لەسەر چاودێری کردن و پەروەردەکردنی بەخێوکراو(**محضون**)یان بە مەرج گرتوە.

هەروەها گوتوویانە: سەنگی مەحەك لەو بارە وە بریتیە لە هێنانەدی

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە سودم لە(أحكام الحضانة مع تطبيقات في الواقع الاوروبي)وەرگرتوە نووسینی: شيخ سالم الشيخي، المجلة العلمية، العددان:٨، ٩، ص٢٨٧، ٢ ٣٢.

(٢) الشرح الكبير للدردير، ج٢ ص ٥١٢.

بەرژەوەندی منداڵ و، هەر شتێك ببێتە مایەی زیان پێگەیاندنی منداڵەکە، ئەوە پێچەوانەی ئامانجەکانی شەریعەتە.

دوو: بناغە لە بەخێوکردنی منداڵ دا ئەوەیە کە مافی ژنە:

(الخطيب الشربيني) لە بارەی حیکمەتی لە پێشتر بوونی ژنانەوە، بۆ بەخێوکردنی منداڵ گوتوویەتی: (**والحضانة نوع ولاية وسلطنة ولكن الاناث أليق لها لأنهن أشفق، واهدى الى التربية، وأصبر على القيام بها، وأشد ملازمة للأطفال**) [1].

واتە: وە بەخێوکردنی منداڵ جۆرێکە لە سەرپەرشتیاریی و حوکمڕانیی، بەڵام مێینەکان بۆ ئەوە شایستەترن، چونکە بە سۆزترن و لێزانترن بۆ پەروەردە، وە لەسەری خۆڕاگرترن و، زیاتر ئاگایان لە منداڵان دەبێ.

سێ: بناغە لە بەخێوکردنی منداڵ ئەوەیە کە مافی دایکە، مادام مێردی نەکردبێتەوە:

بەڵگەی ئەم بنەمایەش وێڕای دەلالەتی عەقڵ و فیطرەت، ئەم فەرموودەیەیە:

(**عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: أن امرأة قالت: يا رسول الله ان إبني هذا كان بطني له وعاء،وثديي له سِقاء، وحجري له حِواءً، وان اباه طلقني واراد ان ينتزعه مني، فقال لها رسول الله** صلى الله عليه وسلم **:أنت أحق به مالم تنكحي**) رواه أحمد و ابو داود:٢٢٧٢، والحاكم وصححه و وافقه الذهبي.

واتە: ژنێك گووتی : ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم کوڕەم لە زگمدا هەڵم گرتبوو، وە بە مەمکم شیرم داوەتێ، وە لە کۆشم دا دامناوە، ئێستاش بابی

---

(١) مغني المحتاج، ج٣ ص٤٥٢ .

تەلاقی داوم و دەیەوێ لێشم بسەنێتەوە! پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: تۆ پێی شایستەتری بە مەرجێك شوو نەکەیەوە.

کەواتە: بەم چوار بەڵگەیە دەرکەوت ،کە مافێکی دیکەی پیاوە لەسەر ژنەکەی، کە بەپێی توانا منداڵەکانی بەخێوبکات و پەروەردەیان بکات.

گومانیشی تێدانیە، کە دایك یەکەمین قوتابخانەی پەروەردە بوونی منداڵەو، هەزار ڕەحمەت لە ئەحمەد شەوقی شاعیر، کە گوتوویەتی:

والأُم مدرسةٌ إن أعدَدْتَها    أعدَدْتَ شَعْباً طَيِّبَ الأعراق

واتە: وە دایك قوتابخانەیەو، ئەگەر ئامادەو پەروەردەی بکەی، میللەتێکی نەجیب زادەت پەروەردەو ئامادەکردوە.

## ٦ـ پارێزگاریی لێکردنی سومعەو ماڵ و سامانی مێردی:

مافێکی دیکەی مێرد بەسەر ژنەوە، ئەوەیە کە پارێزەری ناوو شۆرەت و ئابڕوو کەرامەتی پاشان ماڵ و سامانەکەیشی بێ.

چونکە خوای کاربەجێ لە پێناسەی ژنانی چاك دا فەرموویەتی:

﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ﴾النساء -٣٤-.

واتە: جا ژنانی چاك و بۆ خوا صوڵحاو گوێڕایەڵن(بۆ مێردەکانیان) وە لە کاتی لە ماڵ نەبوونی مێرددا پارێزەرن (بۆ سومعەو ئابڕووی و ماڵ و سامانی) وەك چۆن خوا ئەوان و مافەکانیانی پاراستووە.. فەرماییشتێکی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) چەمك و واتای ئەم ڕستە قورئانیە مویارەکە ڕوون دەکاتەوە، کە دەفەرمووێ :

**(خَيرُ النساءِ امرأةٌ اذا نَظَرْتَ اليها سَرَّتْكَ، واذا أمَرْتَها أطاعَتْكَ، واذا غِبتَ عَنها حَفِظَتْكَ في نَفسِها وَمالِكَ، ثُمَّ قرأ رسول الله** صلى الله عليه وسلم **هذه الآيةَ:**

(﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾) **الى آخرها**. رواه الطبري عن أبي هريرة، وأخرجه أبو داود الطيالسي[1].

واتە: چاكترینی ژنان ئەو ژنەیە، كە هەركات تەماشات كرد دڵخۆشت بكات، وە هەركات فەرمانت پێكرد بە قسەت بكات، وەهەركات بەجێت هێشت و لەماڵ نەبووی، بتپارێزێ لە نەفسی خۆی و ماڵو سامانت دا، پاشان پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەم ئایەتەی هەتا كۆتایی خوێندەوە: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾.

كەواتە: مەبەست لە پارێزەر بوونی ژنان، پارێزەر بوونیانە بۆ سومعەو كەرامەتی مێردەكانیان و، ئەو ماڵ و سامانەیان، كە بەرەنجی شانیان پەیدای دەكەن.

شایانی باسیشە سەرجەم توێژەرەوانی قورئان ئەگەر نەڵێین هەموویان، ئەو ڕستە قورئانییەیان هەر بەو شێوەیە تەفسیر كردوە. [2].

ئاشكراشە،كە پارێزگاری كردنی ژن لە سومعە و كەسایەتی مێردی، بەوە دەبێ كە هەموو كاتێك و بە تایبەتی كە مێردی دیارنیەو لەماڵ نیە، ئاگای لە خۆی بێ و خۆی دووربگرێ لە هەر قسەو تەعبیرو هەڵس و كەوتێك، كە مایەی نەنگیی بێ بۆ خۆی و مێردی، بە تایبەتیش لەو ڕۆژگارەدا، كە ئامرازەكانی پەیوەندی و

---

(١) بڕوانە: جامع البيان فى تأويل القرآن، للطبري: ٩٢٢٢، ج٥ ص٧١، وە بڕوانە: مسند أبو داود الطيالسي: ٢٣٢٥.

(٢) بڕوانە: جامع البيان للطبري، ج٥ ص ٧٠، وە المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص٢٩٠ و : احكام القرآن للجصاص، ج٢ ص١٨٨، وە أحكام القرآن، لابن العربي، ج١ ص٥٣١ . و: تيسير الكريم الرحمن، لعبدالرحمن بن ناصر السعدي، ص١٧٧.

ڕاگەیاندن گوناهو هەڵەو لادانیان زۆر ئاسان کردوە، هەروەها عەیب و عار دەرخستنی خەڵك و ئابڕوو چوونیان لە کاتێکدا وریانابن و تووشی هەڵەو پەڵە دەبن.

هەروەها پارێزگاریی لەماڵ و سامانی مێردی بەوە دەبێ، کە خۆی بپارێزێ لە زێدەڕۆیی و دەست بلاوی و کڕینی شمەك و کەل و پەلی زیادو نا پێویست و ..هتد.

## ٧ـ ماڵ بەجێ نەهێشتن بەبێ مۆڵەتی مێردی و، فەرموو نەکردنی لە کەسێك، کە مێردی حەز بەچارەی ناکات:

مافێکی دیکەی مێرد لەسەر ژن ئەوەیە، کە ژن بە بێ مۆڵەت و ئاگاداریی مێردەکەی، ماڵ و حاڵ بەجێ نەهێڵێ، مەگەر حاڵەتێکی ناچاریی وا بێتە پێش ،کە شەریعەت لەسەری پێویست بکات بچێتە دەر. هەروەها مۆڵەتی کەسێك نەدا بێتە ماڵیان کە مێردەکەی حەز بەچارەی ناکات و، نایەوێ ببینێ، یان نایەوێ بێتە ماڵیان.

شایانی باسیشە کاتێك سەرنجی کتێبە فیقهییەکان دەدەین و، تەماشای قسەو فەتوای زانایان دەکەین لەو بارەوە، تێپەڕاندن و زێدەڕۆییەکی زۆر دەبینین و سەخت گیرییەکی بێ‌ڕەزامان لەلایەن، یان هەندێکیانەوە دێتە بەرچاو، چ بۆ مەسەلەی لەماڵ دەرنەچونی ژن و ،چ بۆ ڕێ پێ نەدانی هاتنی کەسانێك بۆ ماڵیان ،کە مێردەکەی حەز ناکات، جا چ هەقی بێ یان ناهەق!!

دیارە منیش بە ئانقەست وشەی(ماڵ بەجێ نەهێشتن)م بەکارهێناوە لە جیاتی وشەی(لەماڵ دەرنەچوون) کە دیارە((ماڵ بەجێ هێشتن) لەماڵ دەرچوونێکی تایبەتەو سەفەرێکی چەند ڕۆژەی دووریش بێ دەیگرێتەوە، بەلام لەماڵ

دەرنەچوون(الخروج) زیاتر بۆ چوونە دەری ئاسایی و کاروباری ڕۆژانەیە. ئنجا زانایان چەند ئایەتێکیان بەبەڵگەی ڕەوانەبوونی چوونەدەری ژن لەماڵ بەبێ مۆڵەتی مێرد، هێناوەتەوە، کە پێم وایە بەڵگە پێ هێنانەوەیان بۆ ئەو مەسەلەیە ڕاست نیە، وەك:

١ـ ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ﴾ الاحزاب ـ٣٣ـ واتە: وە لە ماڵەکانتان دابنیشن، کە دیارە ڕووی دواندن(خطاب) لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم)، وە ئەگەر گریمان ژنانی ئوممەتیش بگرێتەوە دەڵێین: ئایەتەکە فەرمان بە دانیشتن لەماڵدا دەکات، نەك بە دەرنەچوون لەماڵ!

٢ـ ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ..﴾ الطلاق ـ ٦ ـ ئەمیش دیسان تەنیا فەرمانە بە نیشتەجێکردنی ژنان لە شوێنی حەوانەوەی خۆیاندا، بەڵام باسی نەچونە دەریان ناکات!

٣ـ ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ ﴾ الطلاق ـ١ـ ئەمیش باسی ئەوە دەکات، کە پیاوانێك کە ژنەکانیان تەڵاقداوە، بۆیان نیە لەماوەی عیدەیاندا لە ماڵەکانیان دەریان بکەن و، ئەوانیش بۆیان نیە دەربچن، وە هیچ پەیوەندیی بە مەسەلەی لەماڵ دەرچوون و دەرنەچوونەوە نیە ![1]

بەڵام من پێم وایە بەڵگەی ڕەوا نەبوونی ماڵ ، بەجێ نەهێشتنی ژن، بەبێ مۆڵەتی مێرد، چەند شتێکە:

یەك : مادام پیاو سەرپەرشیتارو بەڕێوەبەرو بەرپرسی ماڵ و خێزانە، ماقووڵ نیە بەبێ پرس و مۆڵەتی وی، ژن ماڵ بەجێ بهێڵێ و مێرد سەراسیمە ببێ و نەزانێ بۆ کوێ چووە و ڕووی لە کوێ کردوە؟!

---

(١) بڕوانە: (المفصل..) ج٧ ص٢٨٨، کە ئەو ئایەتانەی لەو بارەوە بەبەڵگە هێناونەوە!

ئایا لە حاڵێكی وادا چ مانایەك بۆ جێ بەجێ كردنی:(الرِّجال قوَّامُون علی النساء..) دەمێنێتەوە؟!

دووەم : مادام ژن لەسەری پێویستە فەرمانبەرو گوێڕایەڵی مێردی بێ: (فالصالحات قانتات) ناگونجێ بە مۆڵەت و ئاگاداری وی، بەملاولادا بڕوات.

سێ : پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (اذا استأذنت أحدكم امرأته الی المسجد فلا یمنعها) رواه البخاری:٥٢٣٨ و مسلم: ٤٤٢، واتە: هەر كات ژنی یەكێكتان مۆڵەتی لێخواست بۆ چوونە مزگەوت، با ڕێی لێنەگرێ.

هەروەها چەند فەرموودەیەكی دیكەش لەو بارەوە هەن بۆ نموونە:

أ- (**أئذنوا للنساء بالليل الی المساجد**) رواه مسلم:٤٤٢.

ب - (**لاتمنعوا النساء من الخروج الی المساجد بالليل**) رواه مسلم:٤٤٢.

ج - (**لاتمنعوا النساء حُظوظَهُنَّ من المساجد اذا استأذنوكم**) رواه مسلم: ٤٤٢.

شایانی باسیشە ئەم فەرمایشتانە لە دوو سەرەوە بەڵگەن لەسەر ئەوە، كە ژن لەسەری پێویستە بۆ لەماڵ دەرچوون مۆڵەت لە مێردی وەربگرێ:

یەكەم: دەفەرموێ:(اذا استأذنت)، (اذا استأذنوكم)،كەواتە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن بۆی نیە دەربچێ.

دووەم: كە دەفەرموێ:(فلا یمنعها)، (لاتمنعوا) كەواتە: لە غەیری حاڵەتی مۆڵەت وەرگرتن دا، پیاو بۆی هەیە ڕێی لێبگرێ.

هەڵبەتە ئەو فەرمایشتانەش ئەوە دەگەیەنن، كە نەك تەنیا(ماڵ بەجێهێشتن) بەڵكو لەماڵ دەرچوونی ئاساییش، پێویستی بە مۆڵەتی مێرد دەكات، بەلاَم من بۆیە ئەو وشەیەم بەكارهێنا، چونكە وەك پێشتریش گوتم، زۆربەی زانایان زێدەڕۆییان لە ڕێ لێگرتنی چوونەدەری ژن لەماڵ دا كردوە و، جۆرە

لێكدانەوەیەكیان بۆ هەندێك لە فەرموودەكان كردوە، كە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مەبەستی نەبووە، بۆ وێنە:

أ ـ لە زانایان هەیە گوتوویەتی: مێرد بۆی هەیە رێگریی لە ژنەكەی بكات، كە بچێ سەردانی باب و دایكی نەخۆشی بكات، بگرە تەنانەت بچێتە سەر جەنازەشیان!![1].

ب ـ وە هەیانە گوتوویەتی: مێرد بۆی هەیە ژنەكەی لە چوونە مزگەوت قەدەغە بكات![2].

ج ـ هەیانە گوتویەتی: ژن بۆی نیە بەبێ ڕەزامەندیی مێردی بچێ بۆ فێربوونی زانست![3].

بەڵام من پێم وایە ئەو قسەو فەتوایانە هەڵەن و، لەگەڵ دەقەكانی قورئان و سوننەت دا تێك دەگیرێن، چونكە:

١ـ رێگری مێرد لە ژنی، كە سەردانی باب و دایكی نەخۆشیی بكات ،یان بچێتە سەر جەنازەیان، پێچەوانەی ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ەو مایەی پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتییە لەگەڵ نزیكترین كەسی مرۆڤ دا، كە باب و دایكینی، كە خوای كاربەجێ پاش پەرستنی خۆی فەرمانی كردوە،كە چاكە لەگەڵ واندا بكرێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَـٰنًا﴾الاسراء ـ٢٣ـ دیارە لەسەرپێچیی خواش دا فەرمانبەریی هیچ

---

(١) بروانە: (المفصل ..) ج٧ ص ٢٩٠، كە لە : (كشاف القناع)، ج٣ ص ١١٧، وەریگرتوە.

(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەرە، كە لە:(المجموع شرح المهذب) ج١٥ ص٥٦٧، وەریگرتوە.

(٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢٩٣، كەلە:(فتح القدير شرح الهداية) ج٣ ص٣٣٦، وەریگرتوە.

کەس ناکرێ: (**لا طاعة في معصية الله، إنما الطاعة في المعروف**) رواه مسلم: ١٨٤٠.

٢ــ هــەروەها ڕێگریــی کردنــی مێــرد لــە ژنەکــەی کــە بچــێتە مزگــەوت، ڕەفتارکردنیەتی بە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەرە وە (صلى الله عليه وسلم): (**لا تمنعوا إماء الله مساجد الله**) رواه مسلم:٤٤٢.

٣ ـ هەروەها ڕێگریی کردنی مێرد لە هاوسەری، کە بچێت فێری زانیـاری بـێ، ڕێگریی کردنیەتی لەوە کە ژنەکەی فەرزێك جێ بـەجێ بکـات:(**طلب العلم فريضة على كل مسلم**).رواه ابن ماجه.

کەواتە : نابێ پیاوان زێدەڕۆیی بکەن لـە مەسـەلەی لـەماڵ نەچـونە دەری ژنـان بـەبێ مۆڵـەتی وان، وە هـەرکات ژن داوای لـە مێـردی کـرد، کـە بـۆ ئەنجامـدانی ئەرکێکی شەرعی فەرزبێ، یان سونەت، یان موباح، بچێتە دەرێ، لەسـەری فـەرزە ڕێی بدات و بەرێ نەدانی بـەبێ بەڵگـەی ڕوون، گوناهبـارەو ژنەکەشـی بـۆی هەیـە بەقسـەی نـەکات، بەتایبـەت ئەگـەر ئەرکەکـە فـەرز، یـان سـونەت بـوو، یـان پێویسـتییەکی ژیـانی ڕۆژانـە بـوو، کـە بـەبێ ئەنجامـدانی دووچاری سـەغڵەتی و نارەحەتی دەبـوو چـونکە خـوا فەرموویـەتی: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ الحج ـ٧٨ـ، واتە: وە لە ئایین دا سەغڵەتیی نەخستۆتە سەرتان، کەواتە: هـەر کـەس بەناوی ئیسلامەوە خەڵکی سـەغڵەت کـرد، ئـەوە لـە ئیسـلام لایـداوەو لـە لادان و سەرپێچییش دا بەقسەی کەس ناکرێ (**لاطاعة في معصية الله**).

ئەوەی هەمووی بە نسبەت ڕەوانەبوونی لەماڵ چوونەدەری ژن و ماڵ بەجێهێشـتن بەبێ مۆڵەتی مێرد. بە نسبەت ڕەوا نەبوونی فـەرموو کردنیشـی لـە کەسـێك، کـە مێردەکەی حەز ناکات بێتە ماڵیان دەڵێین:

یەك : بە حوكمی ئەوە كە پیاو بەرێوەبەرو سەرپەرشتیاری ماڵ و خێزانیەتی، مافی ڕەوای خۆیەتی كە ژنەكەی فەرمووی كەسێك نەكات و، مۆڵەتی هاتنە ماڵی كەسێك نەدات، كە مێردەكەی حەز ناكات ببینێ و بێتە ژوور، چونكە ئاوا نەبێ مانایەك بۆ بەرپرسیارییێتی و مشوورخۆرێتییەكەی نامێنێتەوە، بەرپرسی هەر دامەزراوەیەك مافی ئەوەی هەیە بەبێ ڕەزامەندی وی خەڵك نەیەتە ژوور دامەزراوەكە.

دوو: مادام ژن لەسەری پێویست بێ بە قسەی مێردی بكات لە سنووری شەرع دا، ناگونجێ مۆڵەت بەكەسانێك بدات بێنە ماڵەكەیانەوە، كە دەزانێ مێردەكەی حەز لەچارەیان ناكات، ئەگەرنا گوێڕایەڵ بوون و فەرمانبەر بوونی ژن بۆ مێرد نایەتەدی.

سێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی مافی ژن و مێرد لەسەر یەكدی فەرموویەتی : (.. **ألا إن لكم على نسائكم حقاً ولنسائكم عليكم حقاً، فحقكم عليهن أن لا يوطئن فُرُشَكم مَنْ تكرهون، ولا يأذنَّ في بيوتكم لِمَنْ تكرهون، ألا وحَقُّهن عليكم أن تُحْسنوا اليهن في كسوتهن وطعامهن**))
رواه الترمذي : ١١٦٣ وقال :حسن صحيح.

واتە: ئاگاداربن ! بێگومان ئێوە مافتان لەسەر ژنەكانتان هەیەو ژنەكانیشتان مافیان لەسەرتان هەیە، مافی ئێوە لەسەریان ئەوەیە، كە فەرموی كەسێك نەكەن بۆ دانیشتن لەسەر جێگاتان، كە خۆشتان ناوێ، وە مۆڵەی هاتننە ماڵ بە كەسێك نەدەن، كە حەز لەچارەی ناكەن، وە ئاگاداربن مافی ئەوانیشە لەسەرتان، كە بەباشی بەرگ و پۆشاك و خواردنیان بۆ دابین بكەن.

هەروەها هەر لەو بارەیەوە فەرموویەتی : (**لايحل لامرأة أن تصوم وزوجها**

**شاهد الاّ بأذنه ولا تأذنَ في بيته الاّ بإذنه**) رواه البخاري: ٥١٩٥، و مسلم: ١٠٢٦ ، اللفظ للبخاري .

واته : ڕەوا نیە بۆ ژن کە لە کاتێك دا مێردی لەماڵە بە ڕۆژوویێ (واتە: ڕۆژووی سوننەت) بەبێ مۆڵەتی وی، وە مۆڵەتی هاتنە ماڵ نادات، مەگەر بە مۆڵەتی وی.

حیکمەتی ڕۆژوو نەگرتنی ژنیش، کە مەبەست ڕۆژووی سوننەتە بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی مادام لە ماڵەوەبێ ئەوەیە ڕێی جووتبوونی لێ نەگیرێ بەهۆی ڕۆژووەکەیەوە.

شایانی باسیشە زانایان زۆر لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە قسەو باسیان کردوە، کە ئایا مێرد تا چ ڕاددەیەك مافی ڕێ لێگرتنی خزم و نزیکەکانی ژنەکەی خۆی هەیە کە بێنە ماڵەکەیان، کە هێندێکیان لەمەش دا زێدەڕۆیی و سەختگیریی زۆریان کردوە و هەیانبووە گوتوویەتی: (**وله ان يمنع والديها وولدها من غيره وأهلها من الدخول عليها، لأن المنزل ملكه، فله حق المنع من دخول ملكه..**) [(١)].

واتە: وە (پیاو) بۆی هەیە کە ڕێگریی لە هاتنە ماڵی باب و دایکی ژنەکەی و منداڵەکانی کە لە مێردێکی دیکەینی و کەس و کاری بکات، چونکە ماڵەکە موڵکی خۆیەتی وبۆی هەیە ڕێگریی(هەرکەسێك) بکات لە هاتنە نێو موڵکییەوە.!

بەڵام من پێم وایە کە ڕای ڕاست و هاوسەنگ لەو بارەوە ئەوەیە کە:

مادام ژنیش لە ماڵ و حاڵی خۆی و مێردەکەی دا بەرپرسیارو چاودێرو سەرپەرشتیارە، بناغە ئەوەیە، کە بۆی هەیە ڕێ بە هاتنە ماڵەوەی هەموو کەس

---

(١) (المفصل..) ج٧ ص ٢٩٩، کە لە : (الهداية..) ج٣ ص ٣٣٥، وەریگرتوە.

بدات، جگە لە کەسانێك، کە مێردەکەی بۆی دیاری کردوون، یان خۆی دەزانێ، کە حەز لە چارەو دیداریان ناکات، ئەوە بە گشتی بۆ خەڵك، بەڵام بۆ خزم و نزیکانی ئەوە چاکتر بۆی هەیە، کە فەرموویان لێ بکات و ڕێزیان لێ بگرێ، مەگەر مێردەکەی بەڵگەیەکی ئیقناعکەری بەدەستەوەبێ، کە فلاَن کەس - جا چ پیاو بێ چ ئافرەت - ڕۆڵی خراپ دەگێڕێ و گرفت و ئاژاوەیان لە نێوان دا دروست دەکات.

کەواتە : ئەسڵ ئەوەیە، کە ژن بۆی هەیە فەرمووی هەر کەسێك بکات، بەتایبەت خزم و دۆست و ناسیاو، وە مۆڵەت وەرگرتنی ژن لە مێردی بۆ ڕێپێدانی هەندێك کەس، حاڵەتێکی هەڵاوێرراو(مستثنى)ە و لە کاتێك دایە کە دڵنیانیە مێردەکەی پێیخۆشە یان پێیناخۆشە ئەو کەسە بێتە ماڵیان.

لێرەش دا کۆتایی بەم تەوەرەی سێیەم دێنین و، کۆتاییش بە کۆی تەوەرەو باسەکانی بەشی پێنجەم دێنین و دەچینە سەر بەشی شەشەم:

# بەشی شەشەم

## مافی منداڵان لەسەر باب و دایکیان و مافی باب و دایکیان لەسەریان

١- ئەرکی باب و دایک بەرانبەر بە منداڵەکانیان .

٢- مافی باب و دایک لەسەر ڕۆڵەکانیان .

**خوێنەری بەڕێز !**

خوا هاوکارمان بێت لەم بەرگەدا[1] لە دوو تەوەردا هەوڵ دەدەین، سەرەتا لەتەوەری یەکەم لەسێ خاڵاندا، ئەرکی سەرشانی باب و دایك بەرانبەر بە منداڵەکانیان بخەینە ڕوو، هەر لەپێش پەیدابوونی منداڵەکانیانەوە تا کۆتایی تەمەنی خۆیان، یان باب و دایکیان .

پاشان لەتەوەری دووەمیش دا، دیسان لە سێ خاڵاندا، مافی دایك و باب لەسەر منداڵەکانیان دەخەینەڕوو .

## تەوەری یەکەم : ئەرکی باب و دایك بەرانبەر بە منداڵەکانیان:

ئەم تەوەرە لەسێ خاڵی سەرەکییدا دەتوێژینەوە، کە ئەوە ناونیشانەکانیانە:

یەکەم: فێرکردن و پەروەردەکردن و ڕاهێنان .

دووەم: بەخێوکردن و مەسرەف کێشان.

سێیەم: هەڵس و کەوت و مامەڵەی ڕاست و دروست.

## یەکەم : فێرکردن و پەروەردەکردن و ڕاهێنان:

لە ڕووی گرنگییەوە یەکەمین ئەرکی باب و دایك بەرانبەر بە منداڵەکانیان بریتیە لە هەوڵدان و تێکۆشانیان بۆ فێرکردن و پەروەردە کردن و ڕاهێنانیان .

---

(١) بۆ نووسینی ئەم بەشە تا ڕادەیەك سوودم لە (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) بەرگی (١٠) وەرگرتوە، چاپی چوارەم، ١٤٣٣-٢٠١٢.

مەبەستیشمان لە فێرکردن (تعلیم) ئەوەیە، کە باب و دایك هەر بە گچکەیی کار لەسەر منداڵەکانیان بکەن لەڕووی زانیار کردن و بەرچاو ڕوونکردنەوە و شارەزاکردنیان، لەهەردووك بواری دینداریی و دنیاداریی دا، بەشێوەیەك کە هەر لەسەرەتاوە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی و، خواپەرست ڕەوشت و ئاکاری پەسندیان فێر بکەن.

وەمەبەستیشمان لە پەروەردەکردن و ڕاهێنان ئەوەیە کە باب و دایك هەوڵبدەن منداڵەکانیان پاش بەرچاو ڕوونبوونەوەو شارەزایی فیکریی، بەکردەوەش ئەوەی کە فێری بوون جێ بەجێ بکەن و پێیەوە پابەندبن و لەسەری ڕابێن.

ئێستاش لە چوار بڕگەی سەرەکیی دا باسی فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵ دەکەین، لەلایەن باب و دایکیەوە:

## ١) فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵان، گەورەترین ئەرکی باب و دایکانە:

با سەرنجی چەند دەقێکی قورئان و سوننەت بدەین لەو بارەوە کە فێرکردن و پەروەردە و ڕاهێنانی منداڵان، گرنگترین ئەرکی سەرشانی باب و دایکیانەو بەکەمتەرخەمیی تێداکردنی گوناهبارو سزابار دەبن.

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾ التحريم: ٦، واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان و خێزانتان لەئاگرێك بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە.

دیارە خۆو خێزان (ژن و منداڵ) لە ئاگر پاراستنیش بەوەدەبێ، کە لەوشتانە دووربن کە مایەی چوونە نێو ئاگری دۆزەخن، کە لە دوو شتی سەرەکیی دا کۆدەبنەوە:

أ- چواندنی فەرزەکان.

ب- مشکاندنی قەدەغەکان.

لەهەردووك بواری سەرەکی ئیمان و عەقیدە و پابەندیی کردەیی (الإلتزام العملي)دا:

٢- ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَالْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾ طه: ١٣٢ . واتە: وە فەرمان بەخێزان (ژن و منداڵ) ت بکە بە نوێژ کردن و لەسەریشی خۆڕاگربە، ئێمە بژێوت لێ داواناکەین، خۆمان بژێوت دەدەینێ، وە سەرەنجام بۆ پارێزکردنە.

کەواتە لەسەر مرۆڤ (چ پیاو چ ژن) پێویستە کە فەرمان بە خێزانی بکات خوا بپەرستێت، کە بێگومان نوێژ کردن گەورەترین جۆریەتی.

٣- (ألا كلكم راعٍ وكلكم مسؤول عن رعيته، الإمام راعٍ ومسؤول عن رعيته، والرجلُ راعٍ في أهلهِ ومسؤول عن رعيتـه، والمـرأة راعيـة في بيـت زوجهـا ومسؤولة عن رَعيَّتها..) رواه البخاري: ٨٩٣. ومسلم:١٨٢٩.

واتە: ئاگاداربن! هەر کامێکتان چاودێرەو بەرانبەر بە مشوور لێخوراوانی بەرپرسیارە، پێشەوا(سەرۆك) چاودێرەو بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەی بەرپرسیارە، وە پیاو چاودێری ماڵ و خێزانیەتی و بەرانبەر بە مشورلێخوراوانی بەرپرسیارە، وە ژن لەماڵی مێردی دا چاودێرە و بەرانبەر بە ماڵ و خێزانی بەرپرسیارە.

٤- (كل مولود يولد على الفطرة، فأبواه يُهَوِّدانه أو يُنَصِّرانه أو يُمَجِّسانه، كمثل البهيمة تنتج بهيمة، هل ترى فيها من جدعاء؟) رواه البخاري :١٣٥٩، ومسلم:٢٦٥٨.

واتە : هەموو منداڵێك لەسەرفیطرەت لەدایك دەبێ، پاشان باب و دایكی دەیكەنە جوولەكە، یان دەیكەنە نەصرانی، یان دەیكەنە مەجووسیی، وەك ئاژەڵ كە بەچكەی دەبێ، ئایا هیچ لووت و گوێ بڕاوی تێدا دەبینی؟!

لەم دوو فەرمودەیەشەوە دەردەكەوێ، كە ئەوە باب و دایكن بە پلەی یەكەم، كە دەبێ وریای منداڵەكانیان بن و، چاودێرییان بكەن و مشووریان لێبخۆن، تاكو دووچاری خلیسكان و لادان نەبن.

٥- (إن الله سائل كلَّ راعٍ عما استَرْعاه، أحَفِظَ ذلك أم ضيَّع، حتّى يُسأل الرجل عن أهل بيته) رواه البخاري :٣٤٥٥، ومسلم:١٨٤٢٠.

واتە : بێگومان خوا لە هەموو چاودێرو بەرپرسێك دەپرسێتەوە لەوەی، كە پێی سپاردوە، كە ئایا پاراستوویەتی، یان زایەی كردووە، تەنانەت لە پیاو دەپرسێتەوە لەبارەی ماڵ و خێزانییەوە.

٦- (كفى بالمرء إثماً أن يُضَيِّعَ مَنْ يقوت) أخرجه أبو داود: ١٦٩٢ والحاكم (٤١٥/١) وصححه، واتە: مرۆڤ ئەوەندە گوناهی بەسە (بۆ سزادرانی) كە ئەوانەی بژێویان لەسەریەتی زایەیان بكات.

٧- (ما نَحَل والدٌ ولداً أفضل من أدَبٍ حَسَنٍ) رواه البخاري في التأريخ وأحمد في المسند والبيهقي في السنن.

واتە: هیچ باوب و دایكێك منداڵی خۆی بەچاكتر لە ئەدەب و ڕەوشتی باش خەلآت نەكردوە.

واتە: باب و دایكێك، كە ڕۆڵەكانیان باش فێر دەكەن و پەروەردە دەكەن، ئەوە باشترین دیاریی و خەلآتیان پێشكەش كردوون.



ئێستاکە لەبەر تیشکی ئەو ئایەت و فەرمایشتانەدا بۆمان ڕوونبۆوە، کە فێرکردن و پەروەردەو ڕاهێنانی منداڵان، گەورەترین و گرنگترین ئەرکی سەرشانی باب و دایکیانە با سەرنج بدەین، کە ئایا دەبێ باب و دایك چۆن و لەکوێوە دەست بکەن بە فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان؟

## ٢) باب و دایك چۆن و لەکوێوە دەست بە فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بکەن؟!

لەسۆنگەی ئەوەوە، کە مرۆڤ بەر لەوەی کردارو هەڵس و کەوت بێ، عەقڵ و دڵ و بیرکردنەوەو هەست و سۆزە، پێویستە فێرکردن و پەروەردەو ڕاهێنانی باب و دایك بۆ منداڵ، هەنگاوی یەکەمی بریتی بێ لە : خۆناسین و خواناسین و دەوروبەر ناسین و، پاشان ئیمان و عەقیدەو، دواتر خواپەرستن و بەندایەتیی کردن بۆ خوا، ئنجا ڕاهێنان و بارهێنان لەسەر خوو ڕەوشتی بەرزو ئاکاری پەسندو...هتد.

بەڵام لێرەدا بەباشی دەزانم، بەر لەوەی لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەت و فەرموودەیەك دا باسی دەستپێك و چۆنیەتی فێرکردن و پەروەردەکردنی دایك و باب بۆ ڕۆڵەکانیان بخەینە ڕوو، هەنگاوێکی دیکە بگەڕێینەوە بەرەو دوا، چونکە لەڕاستیدا مشوور خواردنی باب و دایك لە ڕۆڵەکانیان لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە بەردی بناغەی بنیاتنانی خێزانی تێدا دادەنرێ، با بزانین چۆن؟!

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەچەند فەرمایشتێکی دا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە هەرکام لە پیاوو ئافرەت دووربینیی و ووردبینیی بکەن لە هەڵبژاردنی هاوسەریاندا، بەتایبەت پیاو کە ئەو دەستپێشخەری بنیاتنانی خێزانە، ئەمەش چەند فەرموودەیەك، وەك نموونە لەو بارەوە:

١- (**تَخَيَّروا لِنُطَفِكُم، فإنَّ العِرقَ دسَّاسٌ**) رواه ابن ماجه : ١٩٦٨ عن عائشة، والحاكم والبيهقي، والدار قطني، واتە: بۆ وەچەی خۆتان، ئافرەتی باش دیاریی بکەن، چونکە سیفەتەکان بە پەنهانیی دەگوازرێنەوە.

واتە: خەسڵەتەکانی هاوسەرتان و باب و دایك و خزمانی دەگوازرێنەوە بۆ وەچەکەتان، بۆیە ئافرەت و بنەماڵەو کەسانی باش هەڵبژێرن بۆ خزمایەتیی.

٢- (**تَخَيَّروا لنطفكم فانكحوا الأكفاء وأنكحوا إليهم**) رواه ابن ماجة عن عائشة (٦٣٣/١) والحاكم (١٦٣/٢) وصححه.

واتە: بۆ وەچەتان گوڵبژێر بکەن، وە ئافرەت بدەن بە کەسانی شایستەو هاوسەرگیریيشیان لەگەڵ بکەن.

٣- (**تُنْكَحُ المرأةُ لأربعٍ: لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها، فاظفر بذات الدِّينِ تَرِبَتْ يَداكَ**) رواه مسلم عن أبي هريرة : ٢٥٦٤، وابن ماجه : ٤١٤٣.

واتە: ئافرەت لەبەر چوارشتان بەهاوسەر دەگیرێ: بۆماڵ و سامانی و، بۆ وەجاخ و ڕەچەڵەکی و بۆ جوانیی و بۆ دینداریی، دەجا بۆ دیندارەکە بخەفتێ، ئەگەرنا هەژار بکەوی!

٤- (**إذا جاءكم من تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فأنكحوه، إلاّ تفعلوا تكن فِتْنَةٌ في الأرض وَفَسَادٌ عَرِيضٌ**) رواه الترمذي :١٠٨٤ وقال: حسن صحيح.

واتە : هەرکات کەسێك لە دینداریی و ڕەوشتی ڕازین و، هات و داوای ئافرەتی لێکردن ،پێی بدەن، ئەگەرنا ئاشووب و خراپەیەکی فراوان لە زەمیندا بلاّو دەبێتەوە .

کەواتە: هەرکام لە پیاوو ژن پێویستە، هەر لەوکاتەوە کە چاودەگێڕن بۆ

هاوسەرو دەیانەوێ خێزان بنیات بنێن، مشووری فێرکردن و پەروەردە کردنی ڕۆڵەکانیان بخۆن ئەویش بەوەی کە باب هەوڵی پەیدا کردنی دایکێکی باش و، دایکیش هەوڵی دیاریکردنی بابێکی چاك بۆ منداڵەکانیان بدەن!

هەروەها پێویستە دایك و باب هەر لەسەرەتای ژیانی هاوسەرگیریی و لەکاتی پێکەوە جووتبونیانەوە، لەبیری فێرکردن و پەروەردەکردنی مندماڵەکانیان دابن وە بەناوی خواهێنان و خۆ بەخوا پاراستن لە شەیتانەوە بچنە لای یەکدی، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(**لو أنَّ أحدكم إذا أتى أهلهُ قال: بسم الله اللهم جَنِّبْنا الشيطان وَجَنِّبِ الشيطانَ ما رَزَقْتَنا ، فَقُضِيَ بينهما ولَدٌ لم يضرُّه**) رواه البخاري :٦٣٨٨ و مسلم :١٤٣٤.

واتە: ئەگەر بێت و یەکێکتان کە لەگەڵ هاوسەری دا جووت دەبێ بڵێ : بەناوی خوا، ئەی خوایە شەیتانمان لێ دوور بخەیەوە و شەیتان لەوە دوور بخەوە کە پێمان دەدەی، وە منداڵیان بۆ بڕیار بدەی (شەیتان) زیانی پێناگەیەنێ.

ئێستاش با لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەت و فەرموودەیەکدا، چۆنیەتی و شێوازی دەستپێکی فێرکردن و پەروەردەکردنی باب و دایك بۆ ڕۆڵەکانیان ڕوون بکەینەوە:

١) خوای کاربەجێ لە میانەی خستنە ڕووی ئامۆژگاریی کردنی (لقمان) دا خوا لێی ڕازی بێ بۆ جگەرگۆشەکەی خۆی هێڵە گشتی یەکانی فێرکردن و پەروەردەکردنی ڕاست و دروستی ڕۆڵەکانمان فێر دەکات، کە دەفەرموێ :

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ

يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾لقمان:١٢–١٩.

واتە: بێگومان ئێمە حیکمەتمان بە لوقمان دابوو (وەپێمان ڕاگەیاندبوو) کە سوپاسی خوابکە، وەهەر کەسێك سوپاسی بکات، ئەوە قازانجی سوپاسەکە بۆ خۆیەتی و هەر کەسێکیش سپڵەیی بکات، ئەوە بێگومان خوا دەوڵەمەندو ستایشکراوە.

وە (یادبکەوە) کاتێك لوقمان بە ئامۆژگاریی کردنەوە بە کوڕەکەی خۆی گوت، ئەی ڕۆڵەکەم ! هاوبەش بۆخوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش دانان ستەمێکی مەزنە، وە لەبارەی باوب و دایکیەوە، ئامۆژگاریی مرۆڤمان کرد، کە دایکی لەکاتی دووگیان بوونیدا بەناڕەحەتیی و بێ هێزیی،



لـەدوای بێهێزیـی لـە سـکیدا هـەڵیگرتوە،(پێ دووگیـانبوون و) لـە شـیر بڕینەوەی لە ماوەی دوو ساڵی ڕەبەقدا، پێمان ڕاگەیاند، کە سوپاسـی مـن و هی دایك و بابت بکە، گەڕانەوەش بەس بۆلای منە .

وە ئەگەر هەوڵیان لەگەڵدای، کە شتێك بکەیە هاوبەشم، کە زانیارییت پێی نیە (واتە بـوونی نیـە) ئـەوە بـە قسـەیان مەکـە، بـەلاَم لـە ژیـانی دونیـادا بەباشـیی ڕەفتاریـان لەگەڵـدا بکـەو لەخزمـەتیان دابـە، وە شـوێن ڕێبـازی کەسێك بکەوە، کە بۆلای من گەڕاوەتەوە، پاشان گەڕانـەوەتان بـەس بـۆلای منە، جا هەواڵتان پێدەدەم بەوەی کە دەتانکرد.

ئەی ڕۆڵەکەم ! ئەگەر کردەوە (چاك یـان خـراپ) هێنـدەی قورسـایی دەنکـە خەرتەلەیەك بێت، لەنێو بەردێك دا، یان لە ئاسمانەکان یان لـە زەویـدا بـێ، خـوا (لـەڕۆژی دوایـی دا) هـەر دەیهێنێ. بەڕاسـتی خـوا پـەنهان بینـی شارەزایە.

ئەی ڕۆڵەکەم! نوێژ بەرپا بکەو، فەرمان بەهەرچی پەسەندە بکـەو، ڕێگریـی لەهەرچی ناپەسەندە بکە، وە لەبەرانبەر ئەوەدا کە تووشت دێت خۆڕاگریـە، بەڕاستی ئەوە لەو کارانەیە کە عەزیمەتیان دەوێ.

وە ڕووت لەخەڵك وەرمەچەرخێنە، وە بەفیز بەزەویدا مـەڕۆ، بێگومـان خـوا هەرکەسێکی خۆ پێ زۆری شانازییکەری خۆشناوێ.

وە لەڕۆیشتنندا میـانجیی بـە و، لـە دەنگـت بگـرەوە، مسـۆگەر ناخۆشـترین دەنگ و سەدا، دەنگ و سەدای کەرانە.

جا ئێستا با سەرنجێکی خێرا لەم هەشت ئایەتە بدەین، کـە وەك پێشـتر گوتمـان هێڵە گشتی یەکانی فێرکردن و پەروەردەکردنی ئیسلامییانەمان گرتوونە خۆیان :

**یەك:** سەرەتا خوای بەرزو بێ هاوتا پاش ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستیە کە حیکمەتی بە لوقمان بەخشیوە، دەیخاتە ڕوو کە فەرمانی بە لوقمان کردوە سوپاسگوزاریی بۆخوا بکات و، ڕوونیشی دەکاتەوە، کە بەهرەمەند لە سوپاسگوزاری خودی مرۆڤی سوپاسگوزار خۆیەتی، ئەگەرنا خوا بێ نیازەو شایستەی هەموو ستایشێکە.

**دوو:** ئنجا باسی ئامۆژگاریی کردنی لوقمان بۆ کوڕەکەی دەکات، چونکە سوپاسکردنی خوا عز وجل لەسەر چاکەکانی بەوە دەبێ، کە چاکەو نیعمەتەکانی لەڕەزامەندی خوادا بەکاربێن، ئنجا مادام لوقمانیش، خوا حیکمەتی پێداوە، پێویستە فێری ئەوانی دی بکات و، نێزیکترین کەسیش و شایستە ترین کەسیش کوڕە جگەر گۆشەکەی خۆیەتی.

**سێ:** یەکەمین شتیش کە لوقمان ئامۆژگاری جگەر گۆشەکەی خۆی پێ دەکات و، دەیکاتە سەر ڕشتەی قسە حەکیمانەو ئامۆژگارییە دڵسۆزانەکانی، ئەوەیە کە هاوبەشی بۆخوا پەیدا نەکات لەهیچ کام لە : بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریەتیی و خاوەنداریەتیی و پەرستراویەتیی و ناوو سیفاتەکانی و...هتد، وە ڕاشیدەگەیەنێ، کە شیرك ستەمێکی مەزن و بێڕەزایە.

کەواتە:

لوقمانی حەکیم لە ئیمان و عەقیدەوە دەست بە فێرکردن و پەروەردەکردنی کوڕەکەی دەکات، ئەویش لە خوا بەیەك گرتن (توحید) ەوە کە بێگومان هەناوو سوڕگەی ئیمانە، ئنجا هۆکاری ئەوەش،کە لوقمان بە کوڕەکەی نالێ : ئیمان بێنە! یان تەنیا خوا بپەرستە ! ئەوەیە کە کوڕەکەی ئیماندارو خوا بەیەکگر (مؤمن و مُوَحِّد) بووە و پێویستی

نەکردوە، ئەوەی پێ بڵێ، بەڵام ئامۆژگاریی کردوە، کە لە شیرك وریای خۆی بێ!

**چوار**: پاشان خوای کار بەجێ وەسیەتی خۆی بەرێز لێگرتن و چاکە لەگەڵ کردنی باب و دایك لەگەڵ ئامۆژگارییەکانی لوقمان دا تێکهەڵکێش دەکات و، دەیخاتە روو کەلەسەر مرۆڤی مسوڵمان پێویستە سوپاسگوزارو وەفادار بێ، هەم بۆ خوای بەرزو بێ هاوتا عز وجل، هەم بۆ باب و دایکیشی، بەڵام ئاگاداریشی دەکاتەوە کە نابێ لە شیرك و گوناهو خراپەدا، فەرمانبەریی باب و دایك بکات، هەرچەندە نابێ کوفرو شیرکی باب و دایکیشی بکاتە بیانوو و پاساوی چاکە لەگەڵدا نەکردنیان!

**پێنج**: ئنجا جارێکی دیکە دێتەوە سەر ئامۆژگارییەکانی لوقمان بۆ کورەکەی، کە ئەمجارە بۆی باسی ئەوە دەکات، کە هیچ شتێك لە چاکەو خراپە، هەرچەندە زۆریش بچووك بێ، لەخوای پەنهان بین و شارەزا ون نابێ، بۆیە دەبێ مرۆڤ وریاو بێدار بێ و، چاکەو خراپە، ئەگەر گچکەو کەمیش بن بەکەمیان نەگرێ .

**شەش** : ئنجا لوقمان دێتە سەر باسی تاعەت بۆ خوا ئەنجامدان، کە نوێژ بەرپاکردن گەورەترین و گرنگترین جۆریەتی و، بە کورەکەی دەڵێ : رۆڵەکەم نوێژ بەرپا بکە، کەوا پێ دەچێ ئەمە لەکاتی سەرەتای دەستپێکردنی نوێژەکانی دا بووبێ، یان بۆ جەخت لەسەرکردنەوە بووبێ.

**حەوت**: پاشان لوقمانی حەکیم ئامۆژگاریی کورە جگەرگۆشەکەی دەکات، کە فەرمان بە هەرچی پەسەندە لە قسەو کردەوە بکات و، رێگریی لەهەرچی ناپەسەندە لە قسەو کردەوە بکات،

**هەشت** : ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە سەردەکێشێ بۆ تێکگیران و سەرهەڵدانی گرفت و کێشە ، بۆیە ئەو جار ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات، کە پشوو درێژ بە حەوسەڵەو خۆڕاگر بێ .

**نۆ**: ئنجا لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات لە بواری هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵکداو، پێی دەڵێ، کە ڕوو گرژو مۆن و مرچ و ڕوو وەرچەرخێن و مل بادەر نەبێ، وە بەفیزو خۆبادان و دەمار زلییەوە بەڕێدا نەڕوات و شانازیی بەسەر خەڵکدا نەکات .

**دە**: وە لەکۆتاییی دا لوقمانی حەکیم ئامۆژگاریی جگەر گۆشەکەی خۆی دەکات، کەخۆی لەبەزایەدان و تێپەڕاندن (تفريط وافراط) بپارێزێ و میانجی و میانە بێت چ لە ڕۆیشتنی چ لە قسە کردن و دەنگ هەڵهێنانی دت.

کەواتە:

نەخشەو بەرنامەی لوقمانی حەکیم بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندن یان شارەزاکردن و کاراکردن، یان فێرکردن و پەروەردەکردنی کوڕەکەی بەمجۆرە بووە:

١- ئیمان و خوا بەیەکگرتن.

٢- چاکە لەگەڵ باوك و دایك کردن و، لە ناشەرعیی دا گوێڕایەڵیی نەکردنیان .

٣- ئەنجامدانی تاعەت و چاکەو خۆپاراستن لە خراپە بە گشتی.

٤- نوێژ بەرپا کردن بەتایبەت.

٥- فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە .

٦- خۆڕاگری و دامەزراویی لە بەرانبەر بەڵاو گرفتارییەکان دا.

٧- بەشێوەیەکی جوان پەسەند ڕەفتار لەگەڵ خەڵکیدا کردن و، خۆپاراستن لە فیزو دەمارو شانازیی کردن بەسەریان دا.

٨- خۆپاراستن لە بەزایەدان و تێپەڕاندن و گرتنی خەتی نێوەڕاست و میانجیی بوون.

٢) عن عبدالله بن عباس رضي الله عنه قال: كنت خلف النبي صلى الله عليه وسلم يوماً، فقال: يا غلام! إني أُعَلِّمُك كلماتٍ: إحفظِ اللهَ يَحفَظْك، إحفظ الله، تجده تجاهك، إذا سألت فاسأل الله، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيءٍ لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، وإن اجتمعوا على أن يضروك بشيء، لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك، رُفِعَتِ الأقلام وجُفّت الصُّحُف). رواه الترمذي وقال: حسن صحيح ورواه أحمد.

واتە : عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ : ڕۆژێکیان (بە سواری وڵاخ) لە پشت پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بووم، فەرمووی: ئەی ڕۆڵە ! من چەند شتێکت فێردەکەم: خوا بپارێزە دەتپارێزێ، خوا بپارێزە بەرە و ڕووت دەبینی، ئەگەر داوات کرد، بەس داوا لە خوا بکە، وە ئەگەر داوای یارمەتییت کرد، تەنیا داوای یارمەتیی لەخوا بکە، وەبزانە ئەگەر خەڵك هەموو خڕ ببنەوە، کە سودێکت پێ بگەیەنن، تەنیا سوودێکت پێ دەگەیەنن، کە خوا بۆی نووسیبوی، وەئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە، کە زیانێکت لێبدەن، تەنیا زیانێکت پێ دەگەیەنن، کە خوا لەسەری نووسیبوی، قەڵەم هەڵگیروان و پەڕەکان وشك بوونەوە .

وەك لەم وەسیەت و ئامۆژگارییە گەورەو گرنگەی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دا دەبینین، کە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسی ئامۆزای پێ

ئامۆژگاریی دەکات، کە دیارە ئەو کاتە مێرد منداڵ بووە، پێغەمبەری خوا جەخت لەسەر ئیمان و عەقیدەو خوا بەیەکگرتن و، هەموو شتێك لەخوا زانین و خوا سبحانه وتعالی بە هەمە کار زانین، دەکاتەوە، کە لەڕاستی دا ئەوە کاکڵەو بناغەی ئیمان و عەقیدەیەو، ئیمان و عەقیدەش، بەردی بناغەو یەکەمین هەنگاوی بنیاتنانی کەسایەتیی منداڵی مسوڵمان و تێگەیاندن و پێگەیاندنیەتی.

٣) (مُروا أولادَكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين، واضربوهم عليها وهم أبناء عشر وفرّقوا بينهم في المضاجع) رواه أبو داود:٤٩٥، باسناد حسن كما قال النووي في رياض الصالحين.

واتە: بە منداڵەکانتان بڵێن نوێژ بکەن کە بوونە حەوت ساڵان، وە کە بوونە دە ساڵان لەسەر نوێژ نەکردن لێیان بدەن، وە شوێنی خەوتنیشیان لەیەك جیابکەنەوە.

لەم فەرمایشتەش دا پێغەمبەر خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێنمایی باب و دایکە مسوڵمانەکان دەکات، کە لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە ئامۆژگاریی کوڕو کچەکانیان بکەن بە نوێژ کردن و فێری تاعەت و خوا پەرستیی یان بکەن.

جا هەرچەندە لە فەرموودەکەدا تەنیا باسی نوێژکراوە، بەلاّم بێگومان ڕۆژوو گرتن و یادی خواو دوعاو قورئان خوێندنیش، هەر هەمان حوکمیان هەیە .

شایانی باسیشە مەبەست لە لێدانی منداڵ لەسەر نوێژ نەکردن لە تەمەنی (دە)ساڵیی دا، لەبەر ئەوەنیە کە لەو تەمەنەدا تاعەت لەسەر مرۆڤ فەرز دەبێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە ئەو منداڵە بزانێ باب و دایکی بە

جدییانە، کە داوای نوێژکردنی لێدەکەن، هەروەها مەبەست لە لێدانیش ئەوەنیە جەستەی بریندار و ڕەش و شین ببێتەوە، بەڵکو مەبەست زللەیەکی سووکە و ئامانجیش لێی هەر ئەوەیە، کە بزانێ شتەکە جیددییەو پشتگوێ خستنی ناکرێ .

## ٣) باشترین شێوازی فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵان:

دەتوانین لەبارەی باشترین شێوازی فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵانەوە، زۆر شت بڵێین، بەڵام ئێمە لەشەش بڕگان دا بە کورتیی باسی گرنگترین هۆکارەکان و باشترین شێوازی فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵان دەکەین :

### ١- سەرمەشقییەکی باش:

گەورەترین و گرنگترین هۆکاری پەروەردەو فێرکردن بۆ منداڵ و تەمەنەکانی دیکەش، بریتیە لەوە کە بابای فێرکەرو پەروەردەکەر، کە لێرەدا باب و دایکن — خۆیان بە کردەوە و ئاکار، هەرچی کە دەیانەوێ فێری منداڵەکانیانی بکەن و لەسەری پەروەردەیان بکەن، لەخۆیان دا بەرجەستەی بکەن و پیشانیان بدەن .
واتە: باب و دایك ئەگەر دەیانەوێ منداڵەکانیان خاوەنی ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ و و ڕاست بن، با خۆیان وابن، هەروەها ئەگەر دەیانەوێ خواپەرست و ڕەوشت بەرزو زمان پاك و کردار چاك و دادگەرو بە بەزەیی و بەڕێز و ....هتد بن، با هەوڵ بدەن خۆیان لەخۆیان دا وابن، چونکە بێگومان زمانی کردارو ڕەفتار لە هەموو زمانێك گۆیاترو ڕەوان ترە و باشتر بەرانبەر حاڵی دەکات، لێرەشدا قسەیەکی (عمر بن عتبە) دێنینەوە کە بە مامۆستای منداڵەکانی گوتوە:

(ليكُن أول إصلاحك لولدي إصلاحك لنفسك، فإن عيونهم معقودة بعينك، فالحسن عندهم ما صنعت، والقبيح عندهم ما تركت، علِّمْهُمْ كتابَ الله ولا تُكْرِهْهُم فيَملّوهُ، ولا تَتْرُكهم منه فيهجروه، وروِّهم من الحديث أشْرَفه، ومِنَ الشّعرِ أعَفَّهُ، ولا تنقلهم من علمٍ الى علم حتى يُحْكِموهُ)[1] .

واته ! با هەنگاوی یەکەمی چاککردنی منداڵەکانم، چاککردنی خۆت بێ، چونکە ئەوان چاویان لەچاوی تۆ بڕیوە، چاکە لەلای وان ئەوەیە، کە تۆ دەیکەی و، خراپە ئەوەیە کە تۆ نایکەی، کتێبی خوایان فێر بکە، بەلاّم زۆریان لێ مەکە، با لێی بێزار نەبن، وە وازیشی لێ مەهێنە، با پشتی تێ نەکەن، وە کام فەرمایشت بەرزترە، بۆیان بگێڕەوە، وە کام شیعر پاکترە، بۆیان بخوێنەوە، وە لە زانیارییەك بەرەو یەکی دیکە مەیانگوازەوە، هەتا تەواو فێری نەبن .

## ٢- گێڕانەوەی بەسەرهات و چیرۆك :

ئەمەش هۆکارێکی زۆر کاریگەری فێرکردن و پەروەردەو ڕاهێنانە، هەر بۆیەش خوای کار بەجێ، زۆرترین پانتایی قورئانی بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێشوان و دەرس و پەندی چیرۆك و سەرگوزشتەکانیان تەرخان کردوە، وەك لەسەرەتای سووڕەتی (یوسف) دا، کە بۆ بەسەرهاتی پڕ ماجەراو پڕ دەرس و پەندی (یوسف) و برایەکانی تەرخان کراوە، فەرموویەتی: ﴿ الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ ﴾ يوسف: ١ – ٣

---

(١) العقد الفريد، ج٢، ص٤٣٦.

بەڵام زۆر گرنگە کە هەر بەسەرهات و چیرۆکێك دەگێڕیتەوە، دەرس و عیبرەتەکانی لێ دەربهێنرێن و بخرێنە ڕوو.

## ٣-ستایش کردن لەسەر چاکەو، سەرزەنشت کردن لەسەر خراپە :

بێگومان سزاو پاداشت، دوو هۆکاری گرنگ و پێویستن لەهەر بەرنامەیەکی فێرکردن و پەروەردەکردندا، چونکە عادەتی بەشەر وایە، مەدح و ستایشی حەز لێیە و، ڕقی لە زەم و سەرزەنشتە .

بۆیە پێویستە باب و دایك لەلایەکەوە مەدح و ستایش و هاندان بەکاربێنن، لەکاتێکدا کە منداڵەکەیان چاکەیەکی لێ دەبینن دەپشکوێتەوە، هەروەها لۆمەو سەرزەنشت و پرینگاندنەوە شیان هەبێ لەبەرانبەر خراپەو کەمتەرخەمیی دا .

بەڵام نابێ لە هیچ کامیاندا زێدەر ڕۆیی بکرێ.

## ٤- ڕێ پیشاندان و ئاراستە کردن :

ئەویش هۆکارێکی کاریگەری بواری فێرکردن و پەروەردەکردنە بە گشتی و ، باب و دایك پێویستە ئاگایان لە کوڕو کچەکانیان بێ و، هەمیشە لەکاتی پێویستدا ڕێنماییان بکەن و، لەخێرو شەڕ ئاگاداریان بکەنەوە، ئەمەش چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە :

أ- (**عن أنس قال: قال لي رسول الله** صلى الله عليه وسلم : **يا بُنيَّ إذا دخلت على أهلك فسلِّمْ تكون بركة عليك وعلى أهل بيتك**) رواه الترمذي : ٢٦٩٨ وقال : حديث حسن صحيح.

واتە: ڕۆڵە گیان ! ئەگەر چوویەوە لای ماڵ و خێزانت سەلام بکە، دەبێتە مایەی پیرۆز بەرەکەت لەسەر خۆت و ماڵ و خێزانت.

ب- (**عن عمر بن أبي سلمة ربيب رسول الله** صلى الله عليه وسلم **قال: كنت غلاماً في حِجْرِ رسول الله، وكانت يدي تطيش في الصَّحفة، فقال لي رسول الله** صلى الله عليه وسلم : **يا غلام سَمِّ الله تعالى وكُلْ بيمينك وكُلْ مِمَّا يليك**)

رواه البخاري : ٥٣٧٦ ومسلم:٢٠٢٢.

واتە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە دەڵێ : مێرد منداڵێك بووم لە ماڵی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، لەکاتی خواردندا دەستم لە قاپی خواردنەکەدا دەگێڕا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم : ڕۆڵە گیان ! ناوی خوا بێنەو بەدەستی ڕاستت بخۆو، لەپێش خۆتەوە بخۆ .

## ٥- توندیی نواندن و تووڕە بوون لەکاتی پێویست دا :

وەك لەو فەرموودەیە دەردەکەوێ کە پێشتر هێنامان و، باسی لێدانی منداڵ دەکات لەسەر نوێژ نەکردن لە تەمەنی (دە) ساڵان بەرەو ژوور: (**وأضربوهم عليهاوهم أبناءُ عشرٍ**).

ئاشکرایە بەکارهێنانی توندی و فشار، بە ئەندازەی پێویست و لەکاتی خۆیدا لەبواری فێرکردن و پەروەردەدا، هیچ خاوەن عەقڵ و ئەزموونێك نکوڵیی لێناکات.

## ٦- لەخوا پاڕانەوەی باب و دایك بۆ چاك بوونی ڕۆڵەکانیان :

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی گرنگ و کاریگەرە بەدەست باب و دایکەوە بۆ فێرکردن و پەروەردەو ڕاهێنانی ڕۆڵەکانیان، بەبەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەرانی هەڵبژاردە و پایە بەرزی خوا عز وجل وعليهم الصلاة والسلام و بەندە چاکەکانی خوا بۆ هیدایەت و چاکی ڕۆڵەکانیان لە خوای بەخشندە پاڕاونەوە، بۆ نموونە :

أ- ﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾البقرة:١٢٧—١٢٨

ب- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان: ٧٤.

جـ- قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ الأحقاف: ١٥.

هەڵبەتە پاڕانەوەی باب و دایك بۆ ڕۆڵەكانیان، لە سۆنگەی ئەوەوە، كە زۆر دڵسۆزانەو لە ناخەوە بەكوڵ و دڵە، ئەگەری گیرابوونی زیاترە، بۆیە پێویستە باب و دایكە دڵسۆزو بە پەرۆشەكان، بۆ ڕۆڵەكانیان وەك هۆكارێكی زۆر گرنگ و كاریگەر، وێڕای هۆكارەكانی دیكە، لە پاڕانەوەودوعا لە قاپی خوادا بەهرەمەند بن بۆ صاڵح بوون و تێگەیشتن و پێگەیشتنی چاكتری كوڕو كچەكانیان .

## ٤) بوارەكانی فێركردن و پەروەردەكردنی منداڵ[1] :

لەڕاستیدا لە ڕوانگەی شەریعەتی تێرو تەواوی خوای كاربەجێ وە، پێویستە فێركردن و پەروەردەی منداڵ هەموو بوارەكان بگرێتەوەو گشتگیرو هاوسەنگ بێت،

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە بەدەستكاری‌ییەوە سوودم لە : (التربیة الإیمانیة والنفسیة للأولاد) ی (الشیخ یوسف خطار محمد) وەرگرتوە، بڕوانە : الفصل السادس، بناء شخصیة الطفل المسلم، ص١٧٥—٣٥٢.

ئەو بوارو کایە سەرەکییانەش، کە پێویستە خێزانێکی مسوڵمان و باب و دایکێکی ئیماندار منداڵەکانیان تێیاندا تێبگەیەنن و پێبگەیەنن – بەڕای من – ئەمانەن:

## ١- بواری ئیمان و عەقیدە:

کە پێشتریش باسمان کردو لەڕاستیدا ئیمان و عەقیدە لە کەسایەتی مرۆڤدا، ڕۆڵی بناغە لە خانوودا دەگێڕێ، وەك لە بەرگی یەکەمی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) دا خستومانەتە ڕوو، ئنجا خوا بەیەکگرتن (توحید) یش لە ئیماندا دەوری سورگەو چەق (مدارو مرکز) دەبینێ، بۆیەش خوا عز وجل بە پێغەمبەری خاتەمی فەرمووە : ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد: ١٩.

## ٢- بواری خواپەرستیی (العبادة):

ئەویش کە بەرهەم و زادەی ڕاستەوخۆی ئیمانەو پاش ئیمان و عەقیدە، خواپەرستیی گرنگترین بواری تێدا فێربوون و پەروەردە بوونی منداڵەو، خوای زانا حیکمەت و ئامانجی دروستکرانی جن و مرۆڤی بەپەرستن و بەندایەتیی بۆ خواکردن داناوە : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦.

دیارە هەرکام لە موفرەدەکانی خواپەرستیی (عبادة) یش وەك: نوێژو ڕۆژوو و زیکرو دوعاو حەج و عومرەو ماڵبەخشین و ....هتد، گرنگیی و کاریگەریی تایبەتی خۆی هەیە و هیچیان کەلێنی هیچیان ناگرن.

### ٣- بواری ڕەوشت و ئاکار :

ئەویش ئەنجام و بەرهەمی ئیمان و عیبادەتە و پەیوەندیی ڕاستەوانە (**ارتباط طردي**) ی لەنێوانیان دا هەیە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت و خووی بەرزو پەسندی کردووە بەسەنگی مەحەکی ئیمان وەك فەرموویەتی: (**أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خُلُقاً**) رواه الترمذي : ١١٦٢، وقال : حسن صحيح. واتە: ئیمان تەواوترینی ئیمانداران،ڕەوشت جوانترینییانن.

### ٤- بواری هەست و سۆز (العاطفة):

ئەمیش بوارو لایەنێکی گرنگی پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵەو، پێویستە باب و دایك، هەم خۆشەویستی و سۆزو پەرۆشیان بۆ منداڵەکانیان بخەنەڕوو، وەهەم ئەوانیش فێربکەن، کە خواو پێغەمبەرو قورئان و ئیسلام و مسوڵمانانیان خۆشبوێ و، ڕقیان لە شەیتان و کوفرو ستەم و خراپەو تاوان بێ، شایەنی باسیشە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبەر خوا خۆشویستن و لەبەر خوا بوغزاندن و، لەبەر خوا بەخشین و لەبەر خوا نەبەخشینی، بەهۆکاری تەواو بوونی ئیمان داناوە، وەك فەرموویەتی : (**مَنْ أحبَ لله، وأبغَضَ لله، وأعطى لله، ومَنَعَ لله، فقد استكمل الإيمان**).رواه ابوداودوغيره.

## ٥) بواری دەروونیی (المجال النفسي):

دەگونجێ لەبارەی تێگەیاندن و پێگەیاندنی منداڵ لە ڕووی دەروونییەوە، گەلێك شت باسبکرێن، چونکە لایەنی دەروونیی مرۆڤ،لە لایەنی عەقلیی و جەستەیی زۆر

فراوانترو هەستیار تریشە، بەڵام من بە ئاماژەکردن بەچەند شتێکی گرنگی ئەو بوارە هەستیارە، واز دێنم:

١- ڕاهێنانی لەسەر ڕاستبێژیی (صدق) خۆدوورگرتن لە درۆ کردن .

٢- ڕاهێنانی لەسەر باوەڕو متمانە بەخۆبوون.

٣- ڕاهێنانی لەسەر خەسڵەتە بەرزەکانی وەك : بەخشندەیی، خۆڕاگریی ، خۆبە کەمگریی، ئازایەتیی، لێبوردن، داوای لێبوردن کردن لەسەر هەڵە، ڕێز لەخەڵك گرتن، بەزەیی نواندن.

٤- فێرکردنی کە چۆن گیرو گرفتەکانی چارەسەر بکات و، پشت بەخۆی ببەستێ.

٥- دەستخۆشیی و ئافەرین لێکردنی و تەقدیرکردنی، لەکاتی کردنی کاری باشەو سەرکەوتندا.

٦- لەسەر هەڵەو کەم و کوڕیی زۆر، سەرزەنشتی نەکرێ و بەهیچ جۆرێك گاڵتەی پێ نەکرێ.

٧- وەلاّمی پرسیارەکانی بدرێتەوە و فێربکرێ وتووێژی ئازادانە بکات و، لەسەر گوتنی هەق و ڕاستیی مەدح و ستایش بکرێ.

٨- لەخۆشویستن و لاواندنەوەی دا زێدەڕۆیی نەکرێ و ڕانەهێنرێ، هەرچی داوای کرد بۆی جێ بەجێ بکرێ.

٩- بەئارامیی و ڕێزەوە، گوێی بۆ بگیرێ و قسە و پێشنیارەکانی لێوەربگیرێن و، ئەگەر نەگونجاو بوون بۆی ڕوون بکرێتەوە، کە بۆچی ناگونجێن.

١٠- کاربکرێ لەسەر تێدا لابردنی حاڵەتی شەرمکردن و زۆر ترسان و، هەر خەسڵەتێکی دیکەی خراپ.

## ٦) بواری فیكریی:

ئەمیش بوارێكی گرنگ و هەستیاری تێگەیاندن و پێگەیاندنی منداڵە و، پێویستە باب و دایك بە شێنەیی و پلە پلەیی كاری جیددیی لە رووی فیكریی یەوە لەسەر منداڵەكانیان بكەن، كە من پێم وایە بوونناسیی [1] و دونیا بینیی، یەكەمین هەنگاوی پەروەردەی فیكریی یە، چونكە بوونناسیی، بناغەی ئیمان و عەقیدەشەو هەركەسێ وەڵامی روونی پرسیارەكانی :

ئەم بوونە چییە ؟!

كێ خاوەنیەتی؟

بۆچی دروستی كردوە؟

دەبێ چۆن بژین؟

بۆكوێ دەچین؟

پێ نەبێ، ناتوانێ ئیمان و عەقیدەیەكی راست و دروستی هەبێ.

پاشان پێویستە هەوڵبدرێ منداڵ بە زانیاری راست مێشكی رۆشن بكرێتەوە و لەسەر پرسیار كردن و موتالاو لێكۆڵینەوە هانبدرێ.

## ٧) بواری جەستەیی و تەندروستیی :

بوارێكی دیكەی گرنگ، كە پێویستە منداڵی تێدا پەروەردە بكرێ و پێبگەیەندرێ، بریتیە لە بواری جەستەیی و تەندروستیی.

بەسەرنجدانی چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆمان روون دەبێتەوە، كە پێویستە چۆن چۆنی منداڵ لەو بوارەدا پەروەردە بكرێ :

---

(١) ئۆنتۆلۆژی –Antolog

أ- (عن عبدالله بن عمرو بن العاص رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم يا عبد الله أَلَمْ أُخْبَرْ أنك تصوم النهار وتقوم الليل؟ قلت بلى يا رسول الله، قال: فلا تفعل، صُمْ وأفْطِرْ وقُمْ ونَمْ، فإن لجسدك عليك حقا وإن لعينيك عليك حقاً، وإن لزوجك عليك حقاً) رواه البخاري : ٥١٩٩، ومسلم : ١١٥٩.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ئەی عەبدوڵلا! ئەرێ وایە هەواڵم پێدراوە، کە ڕۆژانە هەر بەڕۆژووی و شەوانە هەر شەو نوێژ دەکەی ؟ گوتم : با، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی : دەجا وامەکە، بەڵکو بەڕۆژوو ببەو پێش مەبە، شەونوێژ بکەو بشخەوە، چونکە حەقی جەستەت لەسەرەو هەقی چاوەکانت لەسەرەو، هەقی هاوسەریشت لەسەرە.

ب- (المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف، وفي كُلٍّ خَيرٌ، إِحْرِصْ على ما ينفعك، واستعن بالله ولا تعجز) رواه مسلم : ٢٦٤٤.

واتە: بڕواداری بەهێز لەهی بێهێز چاکترەو لەلای خوا خۆشەویستترە و هەردووك لاشیان خێریان تێدایە، سووربە لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێ، وە پەنابەرە بەر خواو دەستە پاچە مەبە.

جـ- (علّموا أولادكم السباحة والرمي، والمرأة الغزل) رواه البيهقي في الشعب عن ابن عمر مرفوعاً الى النبي صلى الله عليه وسلم.

واتە: کوڕەکانتان فێری مەلەوانیی و تیرەندازیی و، ئافرەتیش فێری ڕستن و چنین بکەن.

د- (كل شيء ليس من ذكر الله فهو لغو أو لهو أو سهو، إلاّ أربع خِصالٍ: مشي الرجل بين الغرضين، وتأديبه فرسه، وملاعبته أهلَه، وتعليم

السباحة) أخرجه الطبراني في الكبير:١٧٨٥، والبزار:١٧٠٤، والحاكم في المستدرك (٢/٩٥).

واتە: هەر شتێك لە یادی خوا نەبێ، ئەوەپووچ، یان خافڵان، یان بێئاگاییە، جگە لە چوار کردەوە:

هاتن و چوونی پیاو لەنێوان دوو نیشانەکاندا، وە مەشقکردنی بە ئەسپەکەی، وە یاریی و گەمە کردنی لەگەڵ خێزانی، وە فێرکردنی مەلەوانیی .

شایانی باسە کە گرنگیدان بە پێگەیاندنی منداڵ و بەهێزکردنی لە رووی جەستەییەوەو، مشوورخواردن لە تەندروستیی و ساغلەمیی، زۆر شت دەگرێتەوە، وەك: خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵ و پاك پێدانی، پاراستنی لە شتی حەرام و پیس و زیان بەخش هەر لە جگەرەوە بگرە، هەتا کۆتایی شتە پیس و زیانبەخشەکان، دەرفەت پێدان و هەلومەرج بۆ رەخساندن بۆ یاریی و وەرزش، پاراستن و دوورخستنەوەی لە عادەت و نەریتی خراپ و زیان بەخش ...

پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە خوا پەرستیەکانی وەك : نوێژو رۆژوو و زیکرو پاڕانەوەو حەج و عومرە ... وێڕای خواپەرستیی بوونیان، کاریگەرییەکی زۆریشیان لەسەر ساغ و بەهێزو گورج و گۆڵ ڕاگرتنی جەستە هەیە، بەمەرجێك بەوشێوەیە کە لە سوننەت دا هاتوە، جێ بەجێ بکرێت[١]

ئێستاش دەچینە سەر خاڵی دووەمی ئەم تەوەرەیە:

---

(١) بڕوانە کتێبی : (الصلاة والرياضة والبدن) ی (عدنان الطرشة) کە بە وردیی باسی کاریگەریی نوێژی کردوە لەسەر جەستەو کۆئەندامەکانی.

## دووەم: بەخێو کردن و مەسرەف کێشان:

دووەمین ئەرکی سەرشانی باب و دایك بەرانبەر بە ڕۆڵەکانیان بریتیە لە بەخێوکردن و مەسرەف کێشان.

جا ئێمە لەپێنج برگەدا بابەتی بەخێوکردن و مەسرەف کێشانی باب و دایك بۆ ڕۆڵەکانیان،دەتوێژینەوە :

**١- بەڵگەکانی پێویستبوونی بەخێوکردن و مەسرەفکێشانی باب و دایك بۆ منداڵەکانیان :**

خوێنەری بەڕێز !

عەقڵ و فیترەتی ساغ و سەلیم، حوکم دەکەن کە مادام باب و دایك هۆکاری هاتنەدی منداڵەکانیانن و، ئەوانیش پەکیان لەسەر بەخێوکەرو مەسرەفکێش کەوتوە و باب و دایکیشیان لەپێشترین و شایستە ترین کەسن لەو بارەوە و، بەکەمتەرخەمیی کردنی ئەوان، زۆر زۆر نێزیکە لەبەین بچن، کەواتە: لەسەریان پێویستە مشووری ژیاندن و بەخێوکردن و مەسرەف کێشانیان بخۆن.

هەڵبەتە وێڕای ئەم حوکمەی عەقڵ و فیترەت، ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت و یەکدەنگیی (اجماع) ی زانایانیش بەڵگەن بەم شێوەیەی خوارێ:

**أ- بەڵگەی قورئان:**

* ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ

أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة: ٢٣٣

واتە : وە دایکان بۆ ماوەی دوو ساڵی ڕەبەق شیر بە منداڵەکانیان دەدەن، بۆ هەر کەسێك، کە ویستی ماوەی شیر پێدان تەواو بکات، وە بژێوو پۆشاکی دایکەکانیش بەشێوەیەکی پەسند لەسەر بابی منداڵەکەیە..

* ﴿ وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴾ الطلاق: ٦

واتە: وە ئەگەر ژنە تەڵاق دراوە کانتان خاوەن کۆرپەلە بوون، ئەوا هەتا کۆرپەکانیان دادەنێن، مەسرەفیان بکێشن، جا ئەگەر شیریان بۆتان دا (بەکۆرپەکانتان) کرێیەکانیان بدەنێ....

دیارە زۆربەی زانایان ڕایان وایە،کە مەبەست لە ژنانی شیردەر (**مرضعات**) لەهەردووك ئایەتەکەدا، ژنانی تەڵاق دراون، کە وەك دەبینین خوای کار بەجێ لە ئایەتی یەکەم دا بەرگ و پۆشاك و مەسرەف و، لەهی دووەمیش دا کرێی شیرپێدانی ئەو دایکانەی خستۆتە ئەستۆی بابی منداڵەکەوە .

**ب- بەڵگەی سوننەت:**

**(عن عائشة رضي الله عنها قالت : قالت هند أمرأة أبي سفيان للنبي صلى الله عليه وسلم : إنَّ أبا سفيان رجلٌ شحيح وليس يُعْطيني ما يكفيني وولدي الا ما أخذت منه وهو لا يعلم، قال: خذي ما يكفيك وولدك بالمعروف) رواه البخاري : ٥٣٦٤، ومسلم:١٧١٤.**

واتە : هیندی ژنی ئەبی سوفیان بە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) گوت: ئەبو سوفیان پیاوێکی چرووکەو هێندەم ناداتێ کە بەشی (مەسرەفی) خۆم و منداڵەکانم بکات، مەگەر خۆم لە پارەکەی هەڵبگرم، بەبێ ئاگاداری خۆی ! فەرمووی : ئەوەندە هەڵبگرە، کە بەشێوەیەکی باوو پەسند، بەشی خۆت و منداڵەکانت بکات.

**جـ- بەڵگەی یەکدەنگیی زانایان :**

(قال ابن المنذر: أجمع كل من نحفظ عنه من أهل العلم على أنَّ على المرء نفقة أولاده الأطفال الذين لا مال لهم).[1]

واتە: (ابن المنذر) گوتوویەتی : هەموو ئەوانەی لە خاوەنانی زانیاری کە زانیاریمان لێیان وەرگرتوە، یەکدەنگن کە پیاو مەسرەف کێشانی منداڵە گچکە بێ ماڵ و سامانەکانی خۆی لەسەرە.

دوای ئەم چوار بەڵگە ڕوونەش دەرفەتی مشتومڕ نامێنێ لەوەدا کە بەخێو کردن و مەسرەف کێشانی منداڵ و ڕۆڵە، ئەرکی سەرشانی باب و دایکە، بەتایبەت باب.

**٢- ئەو منداڵانە کێ و کێن کە مەسرەف کێشانیان لەسەر باب و دایکیان پێویستە؟!**

بەگشتی لەوبارەوە دوو ڕا هەن : ڕایەکیان کە هی مالیکییەکانە دەڵێ : تەنیا منداڵانی ڕاستەوخۆ (الاولاد المباشرون) ژیان و مەسرەفیان لەسەر بابیانە، بۆ نموونە : (إبن الجزّي المالكي) گوتوویەتی: (أولاد الصلب تجب نفقتهم على آبائهم.... ولا يجب أن ينفق الجد على ابن ابنه).[2]

(١) (المفصل في احكام المرأة والبيت المسلم) ج١٠، ص١٥٨.
(٢) (قوانين الأحكام الشرعية) ص٢٤٦.

واتە: منداڵانی ڕاستەوخۆ بژێویان لەسەر باپیانە .... وە لەسەر باپیر نیە، کە مەسرەفی کوڕی کوڕی بکێشێ.

وە ڕایەکەی دیکەیان، کە هی زۆربەی زانایانە لە حەنەفییەکان و شافعییەکان و حەنبەلییەکان و ظاهیرییەکان و جەعفەرییەکان دەڵێ: ئەوانەی مەسرەف کێشانیان لەسەر باب و دایك پێویستە، بریتین لە منداڵانی ڕاستەوخۆیان (کوڕو کچەکانیان) وە لقەکانیشیان لە نێرو مێ، واتە: نەوەکانیان و ...هتد، بۆ نموونە:

لە کتێبی: (العدة شرح العمدة) دا هاتوە: (**وعلى الانسان نفقة والديه وإن عَلَوَا وأولاده وإن سَفَلوا**). [1]

واتە: وەلەسەر مرۆڤ مەسرەف کێشانی باب و دایکی و سەروویان و منداڵەکانی و خوارویان، پێویستە.

هەڵبەتە ڕای دووەمیش ڕاستترو بەهێزترە، چونکە وشەی (ولد، أولاد) وێڕای کوڕو کچ، نەوەکان (حفدة) یش دەگرێتەوە، بەبەڵگەی ئەوە کە خوا تبارك وتعالى هەموو بەشەری بە ڕۆڵەی ئادەم ناوبردوە، هەرچەندە زۆریش لێی دوورکەوتوونەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأعراف: ٢٧

واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم شەیتان فریوتان نەدات!

---

(١) العمدة شرح العمدة، ص١١٥.

**٣- مەرجەکانی ئەو منداڵانەی مەسرەف کێشانیان لەسەر باب و دایك پێویستە :**

زانایـان و پسـپۆرانی شـەریعەت لـەو بـارەوە قسـەو باسـی زۆریـان کـردوەو پوختەکەی ئەوەیە:

ئەو منداڵانەی بـەخێوکردن و مەسـرەف کێشـانیان لەسـەر بـاب و دایکیـان پێویستە، دەبێ دوو مەرجیان تێدابن :

یەکەم : هەژار بن .

دووەم: توانای کاسبیی و بژێوی خۆ دابین کردنیان نەبێ.

ئنجا نەبوونی توانای کاسبیی و بـژێوی خـۆ دابـین کـردنیش، بـەڕای تێکڕایان زۆربەی زانایان بەیەکێك لەسێ شتان دێتە دی :

١- گچکەیی ( الـصِّغَـر).

٢- بـێ توانـایی عـەقڵیی، یـان جەسـتەیی (العجـز العقلـي أوالجَسَدي).

٣- مێیینەیی (الأنوثة).

دیارە سنووری گچکەیی (صغر) یش، بریتیە لە نابالّغ بوون (عـدم البلـوغ)، واتە : منداڵ لەکاتی لەدایك بوونەوە هەتا بالّغ بوون، بەگچکە دادەنرێ .

وە بێ توانایی عەقڵیی و جەستەییش، ئەوەیـە کـە شـێت و حـوڵ بـێ، یـان ئیفلیج یان کوێر ... یان ...هتد بێ.

بـەڵام مێینـەیی (الأنوثـة) لـە خـودی خۆیـداو، لـەلای زۆربـەی زانایـان هۆکارێکەی سـەرەکییە بـۆ پێویسـت بـوونی مەسـرەف کێشـانی هەرچـەندە گچکەو بێ تواناش نەبێ[1] بەڵام زۆر لـە زانایـان دەڵـێن : هـەرکات مێینـە

(١) (المفصل....) ج١، ص١٦٠-١٦٢.

(أنثى) كارو كاسبيى كردو هەبوو بوو، مەسرەف كێشانى لەسەر خۆى دەبێ مەگەر بەشى نەكات، ئەو كاتە چەندى لەبەر برا، لەماڵ و سامانى بابى بۆى تەواو دەكرێ[1] وە زانايان لەو بارەشەوە راى جيايان هەيە كە ئايە مێينە مەسرەف كيشانى لەسەر بابى هەر پێويستە هەر چەندە باڵغيش بووبێ هەتا شوو دەكات يان نا؟!

پێشم وايە راى ئەوانە بەهێزترو راستترە، كە دەڵێن : هەتا مێرد دەكات مەسرەف كێشانى لەلايەن بابيەوە فەرزە [2]

هەروەها زانايان لە دوو مەسەلەى ديكەشدا راى جيايان هەيە :[3]

**يەك:** باڵغێك كە تواناى ئيش و كارى هەيە، بەلأم كارى چنگ ناكەوێ، ئايا مەسرەف كێشانى لەسەر بابى فەرزە، يان نا، كە پێم وايە راى راستتر ئەوەيە كە ئەميش نەفەقەو مەسرەفكێشانى لەسەر بابى هەر فەرزە .

**دوو:** باڵغێك كە سەرگەرمى خوێندن و وەدەست هێنانى زانستە، ئايا بژێوى و مەسرەفى لەسەر خۆيەتى، يان هەر لەسەر بابيەتى ؟! كە بۆ ئەمەش من راى ئەوانەم پێ راست و بەهێزە كە دەڵێت: بژێوو مەسرەفى هەر لەسەر بابيەتى، چونكە وانەبێ زانست پەيداناكرێ و [4]، لەيەك كاتدا خوێندن و كاسبيى كردنيش بەهەموو كەس ناكرێ. [5]

---

(١) (المفصل....)ج١، ص١٦٨.

(٢) هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص١٧١-١٧٢.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص١٦٥-١٦٦.

(٤) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٦٦.

(٥) سوپاس بۆ **خوا** لە قۆناغى نێوەندييەوە، خوێندن و كاسبييم پێكەوە گرێدابوون،وەك لە سەرگوزشتەى ژيانم وبيرەوەرييەكانم دا،باسم كردوە.

**٤- جیاوازیی ئایین نایێتە مەرجی پێویست بوونی مەسرەف کێشانی منداڵ لەسەر باب و دایك :**

ئەمیش هەرچەندە تا ڕاددەیەك ڕا جیایی زانایانی تێدایە، بەلاّم ڕای ڕاست و بەهێز، کە هی زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، ئەوەیە کە جیاوازیی ئایین نابێتە پەرچ و ڕێگری پێویست بوونی بژێوو مەسرەفی منداڵ لەسەر باب و دایکی [1]، چونکە دەقەکانی شەریعەت بە گشتی بەبێ هەلاّواردن (استثناء) باسی فەرزبوونی دابین کردنی بژێوی منداڵانیان لەسەر باب و دایکیان کردووەو، بەبێ بەڵگەی ڕوون و بەبێ چەندو چوونیش بۆمان نیە چەمك و واتای دەقە گشتیەکان تایبەت بکەین.

**٥- ماوەی مەسرەف کێشانی منداڵان لەسەر باب و دایکیان:**

ئەمیش هەرچەندە پێشتریش ئاماژەی گشتیی پێکرا مەسەلەیەکە زانایان مشت و مڕی زۆریان لەبارەیەوە کردوە و، چەند حاڵەتێکی جیا جیاشی هەن، کە حوکمەکەیان دەگۆڕێ .

**حاڵەتی یەکەم : منداڵی ساماندار:**

مەسرەف کێشانی لەسەر باب و دایکی نامێنێ، مەگەر هەر خۆیان پێی ببەخشن[2]، چونکە مەرجی یەکەمی پێویست بوونی مەسرەف کێشانی هەژاریی (فقر)ە، وەك پێشتر باسمان کرد.

**حاڵەتی دووەم: نێرینەی هەژاری دەستەپاچەی کاسبی پێ نەکراو:**

ئەمەیان هەر پێویستە باب و دایکی مەسرەفی بکێشن، چونکە هەردووك مەرجەکەی تێدان کە بۆ مەسرەفکێشانی منداڵان بەمەرج

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٦٦-١٦٨.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص١٦٩.

گیراون [(١)]،کە هەژاریی‌وکاسبیی پێنەکرانن.

**حاڵەتی سێیەم : نێرینەی باڵغی توانادار لەسەر کاسبیی:**

ئەمیش ڕای بەهێزترو ڕاستتر، بگرە بەهێزو ڕاست هی زۆربەیە کە دەڵێن: مەسرەف و بژێوی لەسەر خۆیەتی، نەك لەسەر باب و دایکی [(٢)]، مەگەر سەرگەرمی خوێندن بێ، بەلاَم من پێم وایە تەنیا خوێندنێك ئەو حوکمەی هەیە، کە یان فەرزی عەین بێ، یان فەرزی کیفایە، واتە: زانستێك بێ کە ئەنجامدانی ئەرکێکی تایبەتی بابای خوێنەر پەکی لەسەری کەوتبێ، یان ئەرکێکی گشتیی پەکی لەسەری کەوتبێ، بەلاَم ئەگەر کارو کاسبی چنگ نەکەوت حوکمەکەی دەگۆڕێ، وەك پێشتر باسمان کرد.

**حاڵەتی چوارەم: مێینەی باڵغی توانادار لەسەر کاسبیی :**

ئەمیش هەرچەندە بەشێك لە زانایان دەڵێن : حوکمی وەك هی نێرینەیە و مادام توانای پەیدا کردنی بژێوی خۆی هەبێ، لەسەر باب و دایکی فەرز نیە، بەلاَم ئەو ڕایە کە دەڵێ : مێینە هەتا مێرد دەکات لەسەر باب و دایکی فەرزە مەسرەفی بکێشن ڕاست و بەهێزە، چونکە ناسکیی و هەستیاریی ئافرەت و جوامێری (شهامة) باب و دایکی مسوڵمان ،ڕێگا نادەن کچ ناچاری بژێو پەیداکردن و کاسبیی بکرێ [(٣)]

بەلاَم بێگومان ئەوە لە حاڵەتێکدایە کە کچەکە هەبوونە بێ کاسبیەکی نەبێ، ئەگەر نا ئەو کاتە حوکمەکەی دەگۆڕێ، مەگەر باب و دایکی

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٦٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص١٦٩.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص١٧١- ١٧٢.

وەك بەخشین (تبُّرع) هاوكاریی بكەن[١]

**٦- دابینكەری بژێوی منداڵان (المنفق علی الاولاد):**

زانایان لەو بارەوە كە ئایا كێ و كێ مەسرەفكێشانی منداڵیان لەسەر پێویستە و ڕیزبەندیی (ترتیب) یان چۆنە؟! ڕای جیایان هەیە، منیش لێرەدا بەپێویستی نازانم بچمە نێو ئەو وردەكارییانەوە كە شوێنی خۆیان سەرچاوە شەرعیەكان (المصادر الفقهیة)ن[٢]، بۆیە بە كورت كردنەوە و پوختكردنەوە و گوشینی زۆرەوە دەڵێم :

١- تێكڕای زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، كە بژێوو مەسرەفی منداڵ لەسەر بابیەتی، مادام هەبووبێ.

٢- پاشان زۆربەی هەرە زۆریان ڕایان وایە، كە ئەگەر باب هەژار بوو، بژێوو مەسرەفی منداڵ ئەركی باپیر(جَــدّ)ە، واتە: بابی باب (أبو الأب)، چونكە وەك پێشتریش گوتمان، وشەی (والد) بابی بابیش دەگرێتەوە، وەك چۆن باب دەگرێتەوە .

٣- ئنجا ئەگەر هیچ كام لە باب و باپیر نەبوون، یان نەبوو و هەژار بوون، ئەوە بەڕای زۆربەی زانایان ئەو ئەركە دەچێتە ئەستۆی دایك یان نەنكەوە، مادام هەبوو و دەست ڕۆیشتوو بێ.

٤- ئنجا ئەگەر ئەو منداڵە- یان ئەو كۆمەڵەمنداڵە –باب و باپیرو نەدایك و نەنكێكی وای نەبوو، بتوانێ بەخێوی بكات و مەسرەفی بكێشێ، ئەوە بەڕای زۆرێك لە زانایان، ئەو ئەركە دەچێتە ئەستۆی خزمە نیزیكەكانیەوە.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٧٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص١٧٣-١٨٢.

٥- وە لەکۆتایی دا ئەگەر خزمی نزیکی نەبوون، یان هەبوون بەڵام دەست ڕۆیشتوو نەبوون لە ڕووی داراییەوە، ئەوە ئەرکی ناوبراو دەچێتە ئەستۆی دەوڵەت و خەزێنەی گشتییەوە، بەبەڵگەی گەلێك دەقی شەریعەت، بەتایبەت ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) :

(والذي نفس محمد بيده إنْ على الأرض من مؤمن إلا أنا أولى الناس به، فأيكم ما ترك دَيْناً أو ضياعاً فأنا مولاه، وأيكم ما ترك مالاً فإلى العَصَبَةِ مَنْ كان) رواه مسلم :١٦١٩، ورواه البخاري بلفظ قريب منه : ٢٢٩٨.

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، هیچ بڕوادارێك لەسەر زەوی نییە مەگەر من نزیکترین کەسی، جا هەر یەکێکتان قەرزێك یان منداڵی وردی بەجێهێشت ـ ئەوە من سەرپەرشتیارمی، وە هەر کامێکتان سامانێکی بەجێهێشت، ئەوە بۆ میراتگرانیەتی هەرکەسێك بن.

ئێستاش نۆرەی خاڵی سێ یەم و کۆتایی ئەم تەوەرەی یەکەمە :

## سێ یەم : هەڵس و کەوت و مامەڵەی ڕاست و دروست :

سێیەمین ئەرکی سەرشانی باب و دایك بەرانبەر بە منداڵەکانیان، بریتیە لەوە کە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و لێزانانە هەڵس و کەوت و مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، جا هەرچەندە ئەم خاڵە لەگەڵ خاڵی یەکەمدا لێکچوونیان هەیەو، تا ڕاددەیەك تێکهەڵکێشن، بەڵام جیاوازییشیان هەیەو، هەرچی ئەم خاڵی سێیەمەیە، جوغزو مەودایەکەی فراوانترو گشتگیرترە .

هەڵبەتە دەشگونجێ بڕگەی زۆرو زەوەند لەژێر ناوونیشانی ئەم خاڵەدا بنووسین، بەڵام بەشەش بڕگەی سەرەکی وازی لێ دێنین:

## ١- ئەنجامدانی حەوت کار بۆ منداڵ، لە هەفتەی یەکەمی لەدایك بوونییەوە:

سەرەتای دەستپێکی هەڵس و کەوت و مامەڵەی دروستی دایك و باب لەگەڵ رۆڵەکانیاندا، ئەوەیە کە هەر کات منداڵ لەدایك بوو، هەر لەهەفتەی یەکەمی پاش لەدایك بوونیدا، حەوت کاری لەگەڵ ئەنجام بدەن، کە ئەمانەن:

### یەك: بانگ و قامەت بەگوێی ڕاست و چەپی دا بدەن:

بۆ ئەوەی کە یەکەمین وشەیەك کە دەچێتە نێو گوێ و مێشکی، ناوی خوا بێ، لەوبارەشەوە ئەم دەقەی سوننەت هەیە : (**عن أبي رافع رضي الله عنه قال : رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم أَذَّنَ في أُذنِ الحسن بن علي حين ولدتهُ فاطمة**) رواه الترمذي :١٥١٤، ـ وأبو داود:٥١٠٥، وأحمد، هەروەها لە فەرموودەیەکدا، کە (البيهقي) و (ابن السني) هێناویانە هاتوە، کە بانگ بە گوێی ڕاست و قامەت بەگوێی چەپ دا بدرێ[1].

### دوو: زارو مەلاشوو شیرین کردن (التحنيك):

ئەمیش واباشە ڕاستەوخۆ پاش لەدایك بوون ئەنجام بدرێ و، لەو بارەشەوە فەرمایشت و دەقی سوننەت زۆرن، بۆ نموونە :

---

(١) بڕوانە : (شعب الإيمان) للبيهقي : ٨٦١٩، و(سنن ابن السني)، ص٤٤٣.

(عن أبي موسى رضي الله عنه قال : ولد لي غلام فَأَتَيْتُ بـه النبيَّ صلى الله عليه وسلم فسَمَّاهُ ابراهيم، وحَنَكَهُ ودعا لـهُ بالبركة) رواه البخاري :٥٤٦٧، ومسلم :٢١٤٥.

دیارە زارو مەلاشوو شیرینکردنی منداڵ، واباشە بەخورمابێ، بەلاّم ئەگەر نەبوو، بەهەنگوین و وێنەی ویش هەردەبێ .

**سێ : مەڕە منداڵە بۆ کردنی (العقیقة):**

**چوار : ناونانی .**

**پێنج: سەرتاشرانی.**

وەك لەبارەی هەرسێکیانەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی :

(كل غلام رهينٌ بعقيقته تُذبَحُ عنه يوم سابعه، ويُسَمَّى، ويُحْلَقُ رأسُهُ) رواه أبو داود : ٢٨٣٧، والترمذي: ١٥٢٢.

واتە : هەر منداڵێك بارمتەی مەڕە منداڵەکەیەتی، ڕۆژی حەوتەم بۆی سەردەبڕێ و، ناو دەنرێ و قژیشی دەتاشرێ.

مەڕە منداڵ: دیارە لەبارەی مەڕە منداڵەشەوە ڕاجیایی (اختلاف) هەیە، بەلاّم وا پێدەچێ ڕای زۆربە ڕاست بێ، کە دەڵێن : سوننەتە و دەشگونجێ بۆ هەر کام لە کورو کچ، مەڕێك یان بزنێك بێ، وە دەشگونجێ بۆ کوڕ دوان و، بۆ کچ یەکێك بێ، وەك لەم دەقەوە دەردەکەوێ:

أ- (من ولد له مولود فأحب أن يُنْسِك عن الغلام شاتان وعن الجارية شاة، فليفعل) رواه ابو داود :٢٨٤٢ والترمذي : ١٥١٣، والبيهقي في السنن الكبرى (٩/٣٠٠)

واتە: هەر کەسێك منداڵێکی بۆ لەدایك بوو و حەزی کرد بۆ کوڕ دوو مەڕ و بۆ کچ مەڕێك سەرببڕێ، بابیکات.

ب- (عن علي بن ابي طالب رضي الله عنه قال: عَقَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم عن الحسن بشاةٍ..) رواه الترمذي والحاكم.

واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەڕێکی بۆ عەقیقەی حەسەن سەربڕی...

جـ- (عن مالك أن النبي صلى الله عليه وسلم عَقَّ عن الحسن والحسين كبشاً كبشاً) رواه أبو داود ٢٨٤١، واتە : پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ هەر کام لە حەسەن و حوسەین سەرو بەرانی بۆ کردنە مەڕە منداڵە .

ناونان : بەنیسبەت ناونانی منداڵیشەوە دەگونجێ لەکاتی لەدایك بوونیەوە ناوبنرێ و، دەشگونجێ بۆ ڕۆژی حەوتەم دوابخرێ، لە فەرمایشتەکاندا هەردووك کاتەکە هاتوون، کەواتە ئەوە کە دەگوترێ : سوننەتە حەوتووی بچێ ئەوجا ناوبنرێ، وانیە، چونکە لەچەندان دەقی سوننەت دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاش لەدایك بوون ناوی لە منداڵ ناوە، وەك (بخاري و مسلم) لەهەر کام لە (أبو موسى الأشعري) و (أنس بن مالك)ەوە گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەر پاش مەلاَشوو شیرینکردن (تحنيك) یەکسەر ناوی لە کوڕەکەی (أبو موسى) ناوە (إبراهيم) و ناویشی لە کوڕەکەی (أنس بن مالك) ناوە (عبدالله) [1].

هەڵبەتە پەسندەو بگرە پێویستیشە، باب و دایك ناوی باش و خۆش لە منداڵەکانیان بنێن وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (إنكم

(١) بڕوانە : صحيح البخاري : ٥٤٦٧، وە : صحيح مسلم: ٢١٤٥، وە صحيح البخاري :٥٤٧٠، وە صحيح مسلم : ٢١٤٤.

تدعون يوم القيامة بأسمائكم وأسماء آبائكم، فأحسنوا أسماءكم) رواه أبو داود : ٤٩٤٨.

واتە: بێگومان ڕۆژی هەڵسانەوە بەناوی خۆتان و باب و باپیرانتانەوە بانگ دەکرێن، بۆیە ناوی چاك لەخۆتان و منداڵەکانتان بنێن.

سەرتاشین : بەنیسبەت تاشینی سەری منداڵیشەوە، کە ڕای بەهێزو ڕاستتر بەلای منەوە ئەوەیە، کە کوڕو کچ تێیدا یەکسانن، سوننەتە لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی دابێ، وە واباشە کە مووە تاشراوەکە بە زیو (فضة) بکێشرێ و زیوەکە بکرێتە خێر وەك لەم دەقانە دەردەکەوێ :

أ- (عن علي رضي الله عنه قال : عَقَّ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم عن الحسن بشاة وقال: يا فاطمة إحلقي رأسَهُ وتَصَدَّقي بِزِنَةِ شَعْره فضةً..) رواه الترمذي : ١٥١٥.

ب- عن مالك عن جعفر بن محمد عن أبيه قال : وَزَنَت فاطمةُ رضي الله عنها بنتُ رسول الله صلى الله عليه وسلم شَعْرَ حَسَنٍ وحُسَينٍ و زينب و أم كلثوم، فتصدقَتْ بِزِنَةِ ذلك فِضَةً) رواه مالك في الموطأ(٢/٥٠١).

## شەش : شیر پێدانی (الإرضاع):

هەرچەندە شیر پێدانی منداڵ لەلایەن دایکییەوە، هەر لەدوای لەدایك بوونی دەست پێدەکات، بەڵام ئێمە لێرەدا باسمان کرد چونکە وەك کارەکانی دیکە نیە یەکجار بکرێ و ببڕێتەوە، بەڵکو هەتا تەمەنی دووساڵیی منداڵ، بەردەوام دەبێ، وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی:

﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ ﴾ البقرة: ٢٣٣

هەڵبەتە هیچ خواردنێك تەنانەت شیری ئاژەڵ یان ژنێکی دیکەش، کەلێنی شیری دایك بۆ منداڵەکەی پڕ ناکاتەوە ، چونکە وێڕای خۆراك و خواردنەوە (الطعام والشراب) بۆی، جۆرێکە لە دەرمان (د و ا ء ) یش و، مایەی پارێزرانی منداڵە لەچەند دەردو نەخۆشییەك، ئنجا وێڕای هەموو ئەوانە کاریگەری دەروونیشی هەیە لەسەر منداڵ و بۆ دروستبوونی کەسایەتییەکی تەندروست .

**حەوت : خەتەنەکردن (الختان):**

خەتەنەکردنیش یەکێکە لەو کارانەی کەلەسەر باب و دایك پێویستە هەر لەسەرەتای تەمەنەوە لەگەڵ منداڵەکانیان دا ئەنجامیان بدەن، وە خەتەنەکردن یەکێکە لەخەسڵەتەکانی فیطرەت و سروشتی ساغ، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(الفطرة خمسٌ: الختان، والإستحداد، ونتفُ الإبط، وتقليم الأظافر، وقصُ الشارب) رواه البخاري : ٥٨٨٩، ومسلم: ٢٥٧.

واتە: پێنج شت لە فیطرەت و سروشتی ساغن : خەتەنەکردن و، مووی بەر لابردن و، موی بن هەنگڵ هەڵکەندن و نینۆك کردن و، سمێڵ کورتکردنەوە.

لەبارەی کاتی خەتەنەکردنیشەوە دەقێکمان بەدەستەوە نیە کاتێکی تایبەتی دیاری کردبێ، بەلاَم دەبێ پێش باڵغ بوون بێ، جا چ یەکسەر پاش لەدایك بوون، چ پاش هەفتەیەك، چ دواتر .

شایانی باسیشە، کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر پێویست بوونی خەتەنەکردنی نێرینە، یەکدەنگن و هەندێکیش دەڵێن سوننەتە، بەلاَم بۆ مێینەن بەشێکیان بە سوننەت و بەشێکیان بە ڕێز لێگرتن (مَكْرَمة) ی

دادەنێن و، منیش پێم وایە خەتەنەکردنی کچان وسوننەت بوونی، بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە و، زیاتر وا پێدەچێ لە بازنەی عادەت و باوی کۆمەڵگاکان دابێ و، هەرکات بەبەڵگەش سەلمێنرا، کە زیانی هەیە بۆ مێینە ،وەك لەم رۆژگارەدا دەڵێن، ئەوە هیچ رێگرییەك نییە لەبەردەم مسوڵمانان دا، کە لەرێ لەو عادەتە بگرن و بنبڕی بکەن، چونکە هیچ دەقێکی شەریعەت نیە، کە مسوڵمانان پابەند بکات بەخەتەنەکردنی مێینەوە وەك (الشیخ سید سابق) لەو بارەوە گوتوویەتی:

**(الختان لا يجب على الأنثى وتركهُ لا يوجِبُ الاثم، ولم يأت في كتاب الله ولا سنة رسوله عليه الصلاة والسلام ما يثبت انه أمرٌ لازم، وكل ماجاء عن رسول الله في ذلك الامر ضعيفٌ لم يصح منه شيء، ولا يصح الإعتماد عليه ويقول (ابن المنذر) : (ليس في ختان الاناث خبرٌ يُرجعُ اليه ولا سنة تُتبع) أما حديث الرسول لأم عطية الانصارية : ((اخفضي ولا تنهكي) فهو حديث ضعيف : وكذلك حديث : (الختان سنة للرجال ومكرمة لنساء)) ضعيف أيضاً..)** [1].

واتە: خەتەنە کردن لەسەر مێینان پێویست نیەو نەکردنی گوناه نیە، وە لەکتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا (صلى الله عليه وسلم) هیچ شتێك نیە کە بیسەلمێنێ شتێکی پێویستە، وە هەرچی لەو بارەوە لە پێغەمبەرەوە گێڕراوەتەوە، بێهێزەو هیچی (سەنەدەکەی) ڕاست نیە و پشتی پێ نابەسترێ، وە (ابن المنذر) گوتوویەتی : لەبارەی خەتەنەی مێینانەوە هیچ هەواڵێکی وانیە کە بۆلای بگەڕێینەوە، وە هیچ سوننەتێك نیە کە مرۆڤ

---

(١) بڕوانە : (نحو القضاء على عادة ختان الإناث) د. جمال ابو السرور و د. أحمد رجا عبدالحميد رجب، ص٨.

شوێنی بکەوێ، وەهەرچی ئەو قسەیە، کە گوایە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە (أم عطية) ی ئەنصاریی فەرمووە : (بیڕە بەلاّم زۆرنا) ئەوە سەنەدەکەی بێهێزە، هەروەها گوتوویەتی : ((خەتەنە سوننەتە بۆ پیاوان و ڕێزە بۆ ژنان) دیسان سەنەدەکەی بێهێزە.

هەروەها (د.يوسف القرضاوي) یش لەو بارەوە هەمان ڕای هەیە، وەك گوتوویەتی : (أما ختان الإناث فإنَّ كلَّ ما استدل به على الوجوب أو السنية لا يدخل فيه النساء، ولا يوجد دليل صحيح من الاحاديث يدل على الوجوب أو السنية بالنسبة لهن، على أن الذي أراه و أرجِّحُهُ ان ختان الإناث للبنات ليس بواجب ولا سنة وقد يكون أمراً مباحاً والمباحات يمكن أن تمنع إذا ترتب على استعمالها ضررٌ، بناءً على قاعدة لا ضرر ولا ضرار) [1].

کورتەی مانای قسەکەی ئەوەیە، کە خەتەنەکردنی کچان نە فەرزەو نە سوننەت و، دەگونجێ ڕەوا (مباح) بێ، کە ڕەواش هەرکات زیانی لێکەوتەوە ڕێی لێ دەگیرێ .

لێرەشدا کۆتایی بەبڕگەی یەکەمی هەڵس وکەوتی ڕاست ودروستی باب ودایك لەگەڵ ڕۆکانیاندا دێنین ودەچینە سەر بڕگەی دووەم:

## ٢- خۆشویستن و بەزەیی پێداهاتنەوەیان :

هەڵبەتە خۆشەویستنی و بەزەیی و سۆزی باب و دایك بۆ منداڵ، شتێکی خوارِسکە، بۆیەش من پێم وایە خۆشویستن و بەزەیی و سۆز نواندنی باب و

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٨، ٩، کە لە سایتی إسلام اون لاین : ٢٠٠٤/٤/٢٨م ، وەر یگرتوون.



دایك بۆ منداڵ و جگەرگۆشەكانیان، بناغەی هەڵس و كەوتی ڕاست و دروستیانە لەگەڵیاندا.

ئەمەش چەند فەرموودەیەك لەبارەی گرنگیی خۆشەویستیی و بەزەیی و سۆزی باب و دایك و غەیری ئەوانیش بەرانبەر منداڵ :

أ- (عن أبي قتادة قال : خرج علينا النبي صلى الله عليه وسلم وأمامَة بنت أبي العاص على عاتقه فصلّى، فاذا ركع وَضَعَها وإذا رفعَ رَفَعَها) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتە دەر بۆلامان و، ئومامەی كچی ئەبیلعاص (كە نەوەی بووە) لەسەر شانی بوو، جا نوێژی كرد، كاتێك دەچووە ركوع دایدەنا، كە بەرز دەبۆوە هەڵی دەگرتەوە .

ب- (عن ابي هريرة قال: قَبَّلَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم الحسن بن علي وعنده الأقرع بن حابس التميمي جالساً، فقال الأقرع : إن لي عشرة من الولد ما قَبَّلْتُ منهم أحداً، فنظر اليه رسولُ الله صلى الله عليه وسلم ثم قال: من لا يَرحَم لا يُرحَمْ) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەكاتێكدا كە ئەقرەعی كوڕی حابیسی تەمیمی لەلای دانیشتبوو، حەسەنی كوڕی عەلی ماچ كرد، ئەقرەعیش گوتی : دە منداڵم هەن، هیچ كامیانم ماچ نەكردوە ! پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) تەماشای كردو فەرمووی: ئەوەی بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ .

جـ- (عن أُسامة بن زيد رضي الله عنه قال: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم ياخذني فَيُقعدني على فخذه ويُقعِّدُ الحسن بن علي على فخذه الآخر، ثم يضمهما ثم يقول: (اللهم فإني أرْحَمُهما) رواه البخاري.

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیگرتم و لەسەر ڕانی خۆی دایدەنام، وە حەسەنی کوڕی عەلیشی لەسەر ڕانەکەی دیکەی دادەنا، پاشان بەخۆیەوە دەیگوشین و دەیفەرموو، ئەی خودایە بەزەییت پێیان دابێ، چونکە من بەزەییم پێیاندا دێ.

## ٣- قسەی خۆش و گاڵتە لەگەڵ کردنیان:

دیارە منداڵ بە سروشت حەزی لە یاریی و گاڵتەو پێکەنین و قسەی خۆشەو، دەبێ ئەو لایەنە فەرامۆش نەکەن، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەتە لەو بارەوە :

أ- (عن البراء قال رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم واضعاً الحسن بن علي على عاتقه وهو يقول : اللهم إني أُحِبُّهُ فأَحِبَّهُ) رواه مسلم .

واتە: پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) بینی، حەسەنی کوڕی عەلی لەسەر شانی دانابوو و دەیفەرموو : ئەی خوایە! من خۆشم دەوێ، تۆش خۆشت بوێ.

ب- (عن جابر بن سَمُرةَ قال: صلَّيتُ مع رسول الله صلى الله عليه وسلم صلاة الأولى ثم خرج الى أهله وخرجتُ معهُ فاستقبلَهُ وِلْدانٌ، فجعل يَمسَحُ خدي أحدهم واحداً واحداً، وأما أنا فَمَسَحَ خَدَّيَّ) رواه مسلم .

واتە: جابری کوڕی سەمورە دەڵێ : نوێژی یەکەمم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) کرد، پاشان چووە دەرێ بۆلای ماڵ و خێزانی و، منیش لەگەڵی چوومە دەرێ، ئیدی چەند منداڵێك هاتنە پێشی، ئەویش یەك یەك دەستی بەڕوومەتی هەموویان داهێنا، وەدەستی بەهەردوو ڕوومەتی منیش داهێنا.



جـ- عن أنس رضي الله عنه قال : كان رسول الله صلى الله عليه وسلم أحسن الناس خُلقاً وكان لي أخ يُقالُ لهُ: أبو عُمَيْر وهو فطيم — كان اذا جاءنا قال : يا ابا عُمَيرُ ما فَعَلَ النُّغَيْرُ؟، لِنُغرٍ كان يلعب به) رواه البخاري : ٦٢٠٣، ومسلم : ٢١٥٠.

واتە: ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەهەموو كەس رەوشت جوانتر بوو، وەمن برایەکم هەبوو ئەبو عومەیری پێ دەگوترا — کە تازە لەشیر برابۆوە — جا کاتێك دەهاتە لامان دەیفەرموو : ئەی ئەبو عومەیر نوغەیر چی لێهات؟ مەبەستی چۆلەکەیەك بوو یاری پێدەکرد.

## ٤- چاوپۆشیی کردن لە هەڵەو پەڵەیان و بەنەرمیی مامەڵە لەگەڵ کردنیان:

بێگومان منداڵ وەك چۆن لە رووی جەستەوە ساواو پێنەگەیشتوویە، لە رووی عەقڵ و هۆشیشەوە هەروایەو کرچ و کاڵە، بۆیە نابێ ئەوەی لێ چاوەڕوان بکرێ کە لە بابایەکی باڵغ و کامڵ چاوەڕوان دەکرێ، کەواتە : دەبێ لەکاتی هەڵەکردنەکانی دا چاوپۆشیی و لێبوردن هەبێ، وەك لەم دەقەی سوننەت دا دەردەکەوێ:

(عن أم خالد بنت سعيد قالت : أتَيتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم مع أبي وعليَّ قميصٌ أصفر، قال رسول الله صلى الله عليه وسلم سنة سنة (وهي بالحبشية : حَسَنَة) قالت : فذهبتُ ألْعَبُ بخاتم النبوة فزَبَرَني أبي، قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : دَعْها...) رواه البخاري.

واتە: ئوممو خالید کچی سەعید دەڵێ : لەگەڵ بابم دا چوومە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کراسێکی زەردم لەبەردابوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله

**علیه وسلم)** فەرمووی : سەنە سەنە ،(کە بەحەبەشی واتە جوانە جوانـە) دەڵـێ : منیش چووم یاریم بە مۆری پێغەمبەرایەتی کرد، (کە هێندەی هێلکـە کـەوێك بووە لەنێو هەردووك شانی پێغەمبەردا) بابیشم تێی خوڕیم و لـێم تـووڕە بـوو، پێغەمبەری خواش (**صلی الله علیه وسلم**) فەرمووی: لێی گەڕێ.

## ٥- جیاوازیی نەکردن لە نێوان کوڕو کچدا و، وەك یەك تەماشاکردنیان :

بەدڵنیاییـەوە هەڵبـژاردنی نێرینـە بەسـەر مێینـەدا، نـەریتێکی نەفامیـە و پێچەوانەی دەقەکانی شەریعەتە، وەك خوای کاربـەجێ لـەبارەی ئـەو عادەتـەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان (المشركين بالله) ەوە، دەفەرموێ :

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ النحل: ٥٨ — ٥٩ .

واتە: وەهەرکات یەکێکیان موژدەی مێینـەی پێـدرا، ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێ و زۆر پەست دەبێ، خۆی لە خەڵکەکە دەشارێتەوە بەهۆی ئەو موژدە خراپەوە کە پێیدراوە (نازانێ) ئایا، بە ڕیسوایی یەوە بیهێڵێیتەوە، یـان بیخاتـە ژێـر گـڵ ؟ بزانن کە ئەوە خراپترین بڕیاریانە.

پێغەمبەری خواش (**صلی الله علیه وسلم**) لەبارەی جیاوازیی نەکردنی باب و دایـك لە نێوان کوڕو کچەکانیان دا فەرموویەتی : (**مَنْ كانت له أُنثى فلَم يَئِدْها، ولَمْ يُهِنها ولَمْ يُؤثِر ولدهُ عليها، أدخَلَهُ اللهُ الجَنةَ**) رواه ابو داود.

واتە : هەر کەس مێینەیەکی هەبێ، زیندە بەچاڵی نەکات و، بەکەم سەیری نەکات و، کوڕەکانی بەسەردا هەڵنەبژێرێ، خوا دەیخاتە بەهەشتێ .

## ٦- دادگەریی کردن لەنێوانیان دا، لەهەموو ڕوویەکەوە:

پێویستە باب و دایك لەنێوان منداڵەکانیان دا دادگەریی بەرپا بکەن و بەلای هیچ کامیاندا دانەشکێنن، دیارە لەو بارەوە وێڕای ئایەتە موبارەکەکانی قورئان، فەرموودەی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) زۆرن، ئەمەش چەند نموونەیەك لە ئایەتەکانی قورئان :

١- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ ﴾ النحل: ٩٠ واتە: بێگومان خوا فەرمان بە دادگەریی دەکات.

٢- ﴿ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُ ﴾ الشورى: ١٥، واتە : وەفەرمانم پێکراوە دادگەرییتان لەنێوان دا بکەم .

٣- ﴿ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ ﴾ المائدة: ٨، واتە : دادگەربن ئەوە لەپارێزکاریی نزیکترە .

ئەمەش چەند نموونەیەك لە سوننەت :

٤- (إعدلوا بين أبنائكم، إعدلوا بين أبنائكم) رواه أحمد وأبو داود والنسائي، واتە: لەنێوان ڕۆڵەکانتان دا دادگەریی بکەن، لەنێوان ڕۆڵەکانتاندا دادگەریی بکەن.

٥- (عن النعمان بن بشير أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَى اللهُ عليه وَسَلَمَ، فَقَالَ : إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلامًا كَانَ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَى اللهُ عليه

وسلم : أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَ هَذَا ؟، قَالَ : لا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : فَأَرْجِعْهُ) رواه البخاري و مسلم .

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر دەڵێ : بابی هێنایە لای پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گوتی : من غولامێکم خەڵاتی ئەم کوڕەم کردوە، فەرمووی : ئایا بەهەمان شێوەت خەڵاتی ڕۆڵەکانی دیکەت کردوە؟ گوتی : نا، فەرمووی : دەبیگێڕەوە، واتە: مادام دیارییت نەداوە بەوانی دیکە، هی ئەمیش وەربگرەوە .

٦- (سَوُّوا بَيْنَ أَوْلادِكُمْ فِي الْعَطِيَّةِ ، فَلَوْ كُنْتُ مُؤْثِراً لآثَرْتُ النِّسَاءَ على الرِّجال) رواه سعيد في سننه[1].

واتە: ڕۆڵەکانتان لە دیاریی پێداندا یەکسان بکەن، وەگەر من کەسم هەڵبژاردبوایە (لە زیاتر پێدان دا) ئافرەتانم بەسەر پیاوان دا هەڵدەبژارد.

هەڵبەتە لەتێکڕای ئەو ئایەت و فەرمودانەش بەڕوونیی دەفامرێتەوە، کە لەسەر باب و دایك پێویستە لەنێوان کوڕو کچەکانیان دا دادگەر بن و فەرق و جیاییان پێ نەکەن، هیچ گومانیشی تێدانیە، کە فەرق و جیایی کردن لە نێوان منداڵاندا دەبێتە مایەی پەیدابوونی بوغزو کینەو ئیرەیی، چ لەنێو خۆیانداو ،چ لەنێوان ئەوان و باب و دایکیان دا، و وێڕای گوناهباریی، باب و دایکیان عەیبداریی دنیاش دێننە سەر خۆیان .

لێرەش کۆتایی بەم تەوەرەی یەکەم دێنین و دەچینە سەر تەوەری دووەم.

(١) (المفصل.....) ج١، ص١٤٩.

## تەوەرەی دووەم : مافی باب و دایك لەسەر ڕۆڵەكانیان

ئەم تەوەرەیەش لەسێ خاڵاندا دەتوێژینەوە، كە ئەمە ناونیشانەكانیانە :

یەكەم: چاكەكردن لەگەڵ باب و دایك (برُّ الوالدين).

دووەم: فەرمانبەریی كردن بۆ باب و دایك (إطاعة الوالدين).

سێیەم: مەسرەفكێشانی باب و دایك (الإنفاق على الوالدين).

## یەكەم : چاكەكردن لەگەڵ باب و دایك (برُّ الوالدين):

خوا پشتیوان بێ ئێمە لە حەفت بڕگەدا باسی چاكەكردن لەگەڵ بـاب و دایـك دا دەكەین :

### ١- پێناسەی چاكەكردن لەگەڵ باب و دایك:

لـە قورئـانێ دا بـۆ چـاكەكردن لەگـەڵ بـاب و دایـك دا، وشـەی (إحسـان) بەكارهاتووە وەك خوای بـەرزو مـەزن فەرمویـەتی : ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الإسـراء: ٢٣، وە لـە سوننەتدا وشەی (برّ) بەكارهاتوە (برّالوالدين) ،جا ئایـا مەبەسـت لـە چـاكەكاریی، یان چاكەكردن لەگەڵ دایك و باب دا چییە ؟!

(ابـن الأثـير) گوتوویـەتی : (البِـرُّ بالكسـر : الإحسـان، ومنـه الحـديث في بـر الوالدين وهو في حقهما وحق الأقربين من الأهل : ضدُّ العقوق وهو الإساءة اليهم

والتضييع لحقهم) [١].

واتە : وشەی (بر) یان چاکەکردن، کە لەو بارەوە فەرموودەی : (چاکەکردن لەگەڵ باب و دایك) داهاتوە، کە ئەویش بۆ باب و دایك و خزمان، پێچەوانەی (عقوق) ە، ئەویش خراپە لەگەڵ کردنیان و ماف زایە کردنیانە.

(إبن منظور) یش گوتویەتی : (والبر ضد العقوق، والمَبَرَّةُ مثله، وبَرِرْت أبـرُّه برّا، وقد برَّ والده يَبَرُّه، وقال ابن الأعرابي: البرُ : فعل كل خير من أي ضرب كان، والبِرُّ: الإكرام) [٢].

واتە : (برّ)(بۆ) دژی (عقوق) ە، وە (ابن الاعرابی) گوتوویەتی : (برّ) کردنی هەرچاکەیەکە بەهەر شێوەیەك بێ، وە (برّ) ڕێزگرتنە.

(النووي) یش لەوبارەوە گووتویەتی : (قال العلماء : البرّ يكون بمعنى الصلة وبمعنى اللطف والمبرة وحسن الصحبة والعشرة وبمعنى الطاعة) [٣].، واتە : زانایان گوتوویانە : (برّ) بەمانای هاوکارییکردن و بەمانای میهرەبانیی و چاکەکاریی و هاوەڵێتی و ڕەفتاری باش و بە مانای فەرمانبەریی دێ.

کەواتە:

مەبەست لەچاکەکردن لەگەڵ دایك و باب، ئەوەیە کە بەهەموو شێوەیەك سوودیان پێ بگەیەنرێ و، بەهیچ جۆرێك خراپەیان لەگەڵ نەکرێ و ئازار نەدرێن، بەرێزو حورمەت و خۆشەویستی یەوە بدوێنرێن و، مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ و گوێڕایەڵیی و فەرمانبەرییان بۆ بکرێ، مەگەر لە ناشەرعیی و سەرپێچیی دا .

کۆتایی ئەم بڕگەیەش بەم دەقە دێنین کە تێگەیشتنی یەکێك لە هاوەڵانی بەڕێز

---

(١) النهاية في غريب الحديث والأثر، ج١، ص١١٦.
(٢) لسان العرب، ج٥، ص١١٨.
(٣) (الفصل.....) ج١، ص١٤٩.

و دڵسۆزی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم مان، لەبارەی چەمك و واتای چاکەکردن و ڕێزلێگرتنی ڕۆڵەوە بۆ باب و دایکی، بۆ ڕوون دەکاتەوە:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه أَنَّهُ أَبْصَرَ رَجُلَيْنِ، فَقَالَ لأَحَدِهِمَا : مَا هَذَا مِنْكَ ؟ فَقَالَ : أَبِي، فَقَالَ : لا تُسَمِّهِ بِاسْمِهِ، وَلا تَمْشِ أَمَامَهُ، وَلا تَجْلِسْ قَبْلَهُ) رواه البخاري في الأدب المفرد.

واتە: لەئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕراوەتەوە کە دوو پیاوی بینیون بە یەکێکیانی گوتووە : ئەمە کێیە ؟ گووتویەتی : بابمە، گوتوویەتی : بەناوی خۆی ناوی مەهێنە و لەپێشیەوە مەڕۆ، لەپێشی دامەنیشە (واتە : هەتا ئەو دانەنیشێ دامەنیشە).

## ٢- حوکم و پێگەی چاکەکردن لەگەڵ باب و دایك دا:

بەسەرنج دانی چەند ئایەت و فەرموودەیەك ،حوکم و پێگەی چاکەکردن لەگەڵ باب و دایك دا، لە ڕوانگەی شەریعەتەوەمان، بۆ ڕوون دەبێتەوە :

١- ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الإسراء: ٢٣ — ٢٤.

واتە : وە پەروەردگارت فەرمانی داوە، کە جگە لەئەو نەپەرستن، وە چاکە لەگەڵ باب و دایك دا بکەن، هەرکات یەکێك یان هەردووکیان لەلات کەوتنە تەمەنەوە، پێیان مەڵێ ئۆف، وە تێیان مەخوڕە و قسەیەکی بەڕێزو حورمەتەوەیان لەگەڵ بکە، وە لە ڕووی بەزەیی یەوە باڵیان بۆ شۆڕ بکەو

بلّێ : پەروەردگارم! بەزەییت پێیان دابێ، وەك چۆن بەگچکەیی منیان بەخێو کردوە .

٢- ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ لقمان: ١٤ – ١٥ .

واتە: وە ئامۆژگاریی مرۆڤمان کردوە بەرانبەر بە دایك و بابی، دایکی بێهێزیی دوای بێهێزیی (لە سکیدا) هەڵیگرتوە، وە پاش دووساڵ (شیرپێدان) لەشیری بڕیوەتەوە، ڕامان سپارد، کە سوپاسی من و باب و دایکت بکە، گەڕانەوە هەر بۆلای منە.

وە ئەگەر هەوڵیان لەگەڵ دای کە هاوبەشێکم بۆ دابنێی کە نایزانی بە قسەیان مەکە، بەلاّم لەژیانی دنیادا هەر بە چاکە لەگەڵیان مەدار بکە، وە شوێن ڕێبازی ئەوان بکەوە، کە بۆلای من گەڕاونەوە، پاشان گێڕانەوەتان بۆلای منە، جا هەواڵتان پێدەدەم بەوەی دەتانکرد.

٣- (عن عبدالله بن مسعود قال : سَأَلْتُ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم : أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّه عَزَّ وَجَلَّ ؟ قَالَ : " الصَّلاةُ عَلَى وَقْتِهَا "، قُلْتُ : ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ : " بِرُّ الْوَالِدَيْنِ "، قُلْتُ : ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ : " الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّه) رواه البخاري : ٥٢٧، ومسلم : ٨٥.

واتە : لە پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) پرسی، چ کردەوەیەك لەلای خوا خۆشەویستترە ؟ فەرمووی : نوێژ لەکاتی خۆیدا، گوتم : دوای ئەوە چی؟

فەرمووی : چاکە لەگەڵ باب و دایك دا، گوتم : دوای ئەوە چی؟ فەرمووی : جەنگ و تێکۆشان لەرێی خوادا.

٤- (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: رَغِمَ أَنْفُ ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُ ثُمَّ رَغِمَ أَنْف، قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهُ، قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ أَبَوَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا فَلَمْ يَدْخُلْ الْجَنَّةَ) رواه مسلم : ٢٥٥.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : زەبوون بێ، پاشان زەبوون بێ، پاشان زەبوون بێ، گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: کەسێك باب و دایکی، یەکیان، یان هەردووکیان، پیردەبن، کەچی(بەهۆی خزمەتکردنیانەوە) ناچێتە بەهەشتێ.

لەبەر رۆشنایی ئەم ئایەتە موبارەك و فەرمووده بەپێزانەش دا زۆر بە روونی بۆمان دەردەکەوێ، کە چاکەکردن و رێزلێگرتنی باب و دایك فەرزێکی گەورەیە، چونکە خوای کاربەجێ لەچەند ئایەتێکی قورئاندا پاش پەرستنی خۆی باسی چاکەکردن لەگەڵ باب و دایکی کردوە، هەروەها پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) پاش نوێژ کردن، بە گەورەترین کردەوەی داناوەو پێش جەنگ و جیهادیشی خستووە.

## ٣- دایك لەچاکە لەگەڵکران دا، پێش باب دەخرێ :

أ - بەڵگەی ئەمەش ئایەتەکانی قورئانن کە خوای کاربەجێ بەتایبەت باسی زەحمەت و ئەرك و ئازاری دایکی کردووە : ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ ﴾ لقمان: ١٤، ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَـٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ

ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ ﴾ الأحقاف: ١٥.

ب- فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) : (عن أبي هريرة رضي اللّه عنه قال: جَاءَ رَجُلٌ إلى رسول اللّه صلى الله عليه وسلم فقال : يا رسول اللّه مَنْ أحَقُّ النَّاسِ بِحُسنِ صَحَابَتي ؟ قال : « أُمُّك » قال : ثُمَّ مَنْ ؟ قال: « أُمُّكَ » قال : ثُمَّ مَنْ ؟ قال: « أُمُّكَ » قال : ثُمَّ مَنْ ؟ قال : « أَبُوكَ ») رواه البخاري : ٥٩٧، ومسلم: ٢٥٤٨.

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا !کێ شایستە ترە بە چاك هاوەڵێتیی کردنم، فەرمووی : دایکت، گوتی: پاشان کێ ؟! فەرمووی : دایکت، گوتی : پاشان کێ؟ فەرمووی : دایکت، گوتی : پاشان کێ؟ فەرمووی : بابت .

## ٤- باب و دایك کافریش بن، چاکە لەگەڵ کردنیان هەر فەرزە :

بەڵگەی ئەمەش :

أ- دەقی ئایەتی قورئانە، کە خوا فەرموویەتی : ﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ ﴾ العنكبوت: ٨.

ب- فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) : (عن أسماء بنت أبي بكر، قَالَتْ : قَدِمَتْ أُمِّي وَهِيَ مُشْرِكَةٌ، فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللَّه، فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّه، إنَّ أُمِّي قَدِمَتْ وَهِيَ رَاغِبَةٌ، أفَأَصِلُ أُمِّيَ ؟ قَالَ : نَعَمْ، صِلِي أُمَّك) رواه البخاري ٢٦٢٠، ومسلم : ١٠٠٣.

واتە: ئەسماء (کچی ئەبو بەکری صدیق خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ : دایکم، کە هاوبەش دانەر بوو هات، منیش پرسم بە پێغەمبەر (صلى الله

علیه وسلم) کرد گوتم: دایکم هاتوەو حەز لە نزیکییمان دەکات، ئایا بەخێری بهێنم و دیاریی بدەمێ ؟ فەرمووی : بەڵێ بەخێری بهێنەو دیاری بدەیە.

هەڵبەتە ئاشکراشە کە نابێ ئەو چاکە لەگەڵ کردن و ڕیزلێگرتنە، سەربکێشێ بۆ لادان لە شەریعەت و، زیان گەیاندن بە ئیسلام و مسوڵمانان ،وەك دواتر باسی دەکەین .

## ٥- چاکەکردن لەگەڵ باب و دایك دان پێش فەرزی کیفایە دەخرێ :

دیارە هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە چاکەکردن لەگەڵ باب و دایك دا فەرزی عەینە، لەسەر کورو کچەکانیان و، دیارە فەرزی عەینیش لەپێش فەرزی گشتییەوەیە .

بەڵگەی ئەمەش وێڕای دەلالەتی عەقڵ و فیترەت، چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) بۆ نموونە :

(عن عبدالله بن عمرو بن العاص قال: جاء رجل إلى النبي صلى الله عليه وسلم فاستأذنه في الجهاد، فقال أحيٌّ والداك؟ قال: نعم، قال: ففيهما فجاهِدْ ) رواه البخاري : ٣٠٠٤، ومسلم : ٢٥٤٩.

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، داوای مۆڵەتی لێکرد بۆ جیهاد کردن، فەرمووی : باب و دایکت ماون ؟ گوتی : بەڵێ، فەرمووی: دەجا لەخزمەتکردنی وان دا تێبکۆشە.

دیارە هەرکات جەنگ و جیهادو هەر فەرزێکی کیفایەی دیکە بوو، بە فەرزی عەین، ئەوکاتە حوکمەکەی دەگۆڕێ، بەلام وادیارە ئەو جەنگ و جیهادەی ئەو کابرایە داوای مۆڵەتی بۆ کردوە لەجۆری فەرزی کیفایە بووە، نەك فەرزی عەین .

## ٦- سەرپێچیی کردنی باب و دایك و دڵ ئازاردانیان بە ناهەق حەرامەو گوناهی گەورەیە :

مادام گوێڕایەڵیی و چاکەکاریی و ڕێزلێگرتن لەگەڵ باب و دایك دا، فەرز بێ، دیارە پێچەوانەکەیان حەرام و گوناهە، کە بە وشەی (عقوق) تەعبیری لێدەکرێ و ئەمیش لە (عَقَّ يَعِقُّ، عقوقا) وە هاتوە یانی : (قطع) بڕی.

شایانی باسیشە وشەی (عقوق الوالدين) ڕاست پێچەوانەو دژی (بِرّ الوالدين)ەو هەر قسەو ڕەفتارێك دەگرێتەوە کە مایەی دڵ ئازاردانی باب و دایك بێ، هەروەها هەر کەمتەرخەمییەکیش بەرانبەریان دەگرێتەوە .

ئەمەش فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە کە ئازاردانی باب و دایك بەناهەق یەکێکە لە سێ گوناهە زلترەکان:(عَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم: (أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ ثَلاثًا: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَكَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ، فَقَالَ: أَلا وَقَوْلُ الزُّورِ وشهادة الزُّورِ، أَلا وَقَوْلُ الزُّورِ وشهادة الزُّورِ، قَالَ فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْتُ: لايَسْكُتُ) رواه البخاري : ٢٦٥٤، ومسلم: ٨٧.

واتە: ئایاهەواڵتان بدەمێ گەورەترین گوناهەکان کامانەن ؟ گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، سێ جاران فەرمووی : هاوبەش بۆ خوادانان و، ئازاردانی باب و دایك، لەوحاڵەدا پاڵیدابۆوە دانیشت و فەرمووی : ئاگاداربن وە قسەی درۆو شایەدیی دانی بەدرۆ، ئاگاداربن! وە قسەی درۆو شایەدیی دانی بەدرۆ، ئیدی هەر دووبارەی دەکردەوە هەتا لەدڵی خۆم دا گوتم، بێ دەنگ نابێ (هەر دووبارەی دەکاتەوە).

## ٧- بوونە هۆکاری قسە پێگوتران و ئازاردانیان لەلایەن خەڵکیشەوە هەر دەچێتە بازنەی ئازاردانیانەوە:

بەڵێ، بە ناڕاستەوخۆ ئازاردانی دایك و بابیش هەر ئازاردانە، وەك عەقڵی سەلیم دەیزانێ و، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەقە لەسەری :

(إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ: يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ فَيَسُبُّ أُمَّهُ) رواه البخاري : ٥٩٧٣.

واتە: لەگەورەترینی گوناهە زلەکانە کە پیاو نەفرین لە باب و دایکی بکات، گوترا : ئەی پێغەمبەری خوا! جا چۆن پیاونەفرین لە باب و دایکی خۆی دەکات؟ فەرمووی: پیاوەکە جنێو بە بابی کابرایەك دەدات، ئەویش جنێو بەبابی وی دەدات، وە جنێو بە دایکی دەدات، ئەویش جنێو بە دایکی دەدات.

کەواتە:

مرۆڤی مسوڵمان دەبێ زۆر وریابێ و بەهیچ شێوەیەك کارێك نەکات و قسەیەك نەڵێ کە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ ببێتە مایەی ئازاردانی باب و دایکی، چونکە وەك باسمان کردو ڕوونبۆوە، ئازاردانی باب و دایك، یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، بگرە یەکێکە لەسێ گوناهە هەرە زلەکان .

## دووەم : فەرمانبەریی کردن بۆ باب و دایك (إطاعة الوالدين):

فەرمانبەریی کردن و گوێڕایەڵیی کردن بۆ باب و دایك دووەمین ئەرکی گرنگ و سەرەکیی سەرشانی منداڵە، چ کوڕ بێ، کچ، وە چ گەورە بێ، چ گچکە .

جا ئێمە لەسێ بڕگەی کورتدا باسی فەرمانبەریی کردنی منداڵ بۆ باب و دایکی دەکەین :

## ١- فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی بۆ باب و دایك، بەشێکە لە چاکە لەگەڵدا کردنیان :

دیارە ئەمەش شتێکی ڕوونە، چونکە کەسێك بەقسەی کەسێك نەکات و بۆی گوێڕایەڵ نەبێ، ناتوانێ لافی ئەوە لێبدات، کە لەگەڵیدا چاکە کارە، بەڵام وێڕای ئەوە بەسەرهاتی (جُرَیْج) یش کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە (رجلاً عابداً) پێناسەی کردوە و بەسەرهاتێکی درێژی هەیە[1]،بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بەبێ بە قسەکردن و فەرمانبەریی مرۆڤ بۆ باب و دایکی، چاکە لەگەڵ کردنیان نایەتەدی، چونکە وەك لەبەسەرهاتەکەدا هاتوە، دوای ئەوەی (جُریج) سێ ڕۆژان لەسەر یەك دایکی لەکاتی نوێژی سونەتدا بانگی کردوە و، ئەویش نوێژەکەی نەبڕیوە و وەڵامی نەداوەتەوە، دایکی دوعای لێکردووە و دوعاکەشی وەرگیراوە و بەهۆی ئەوەوە جورەیج تووشی دەردەسەریی و ناڕەحەتییەکی زۆر بووە، لەوەشەوە زانایان گوتوویانە : گوێڕایەڵیی بۆ باب و دایك، کە فەرزە، لە خواپەرستیی سوننەت لە پێشترە و، هەرکات تێکگیران، دەبێ فەرمانبەریی باب و دایك پێش بخرێ[2].

---

(١) بڕوانە (صحیح مسلم) فەرموودەکانی ژمارە : ٦٤٥٥ و ٦٤٥٦، کە بەسەرهاتەکەیان بە درێژیی هێناوە.

(٢) (بڕوانە : (شرح صحیح مسلم) للنووی، ج١٦، ص١٠٥-١٠٦.

## ٢- سنووری فەرمانبەریی بۆ باب و دایك، بازنەی پەسندكراو (معروف)ە:

ئەمیش یەكێكە لە ڕاستییە ئاشكراو سەلمێنراوەكانی ئیسلام، چونكە خوای كاربەجێ تەنانەت بۆ پێغەمبەری خۆی موحەممەدیش (صلى الله عليه وسلم) لەباسی بەیعەتكردنی ئافرەتانی ئیمانداردا فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ الممتحنة: ١٢، كە لێرەدا مەبەستمان ڕستەی: (وَلَا يَعْصِينَكَ) ە، واتە : وە لەشتی پەسند دا سەرپێچییت لێنەكەن.

هەڵبەتە ئاشكراشە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێجگە لە شتی چاك و پەسند فەرمان بە هیچی دیكە ناكات، بەلآم ئەوە بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییە مەزنەیە، كە هیچكەس بە ڕەهایی فەرمانبەریی بۆ ناكرێ، جگە لە خوای بەرزو مەزن تبارك وتعالى .

ئنجا بەنیسبەت باب و دایكیش بەتایبەت، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾ لقمان: ١٥،كە پێشتر هێنامان و مانامان كرد.

كەواتە:

لەسەر مرۆڤ پێویستە ئەوپەڕی ڕێزو حورمەتی بەرانبەر بە باب و دایكی هەبێ و بەپێی توانا لە خزمەتیان دابێ و، چاكەیان لەگەڵ بكات، ئەگەر كافریش بن،

بەلاَم بێگومان لەخراپەو گوناهدا فەرمانبەریی کردن بۆ هیچکەس ڕەوانیە.

## ٣- فەرمانبەریی کردن پێویست بۆ باب و دایك، لە سنووری فەرزو سوننەت و موباح دایە:

مادام لەسەرپێچیی و ناشەرعیی دا، گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی بۆ باب و دایك و بۆ هیچ کەسی دیکەش درووست (جائز) نەبێ، کە دیارە سەرپێچیی و ناشەرعییش هەرکام لەقەدەغەو ناپەسند (حرام ومکروه) دەگرێتەوە،، کەواتە: لە پێنج حوکمە شەرعییەکان، سێیان دەمێننەوە کە : پێویست و پەسند و ڕەوا (واجب و مندوب و مباح) ن، مانای وایە، هەرکات باب ،یان دایك فەرمانیان بە کوڕو کچەکانی خۆیان کرد، لەسەریان پێویستە بەپێی بۆ لوان جێ بەجێ ی بکەن، مادام فەرمانەکە شتێکی فەرز، یان سوننەت، یان ڕەوا (مُباح) بێ، بەلاَم بێگومان لەتوانا بەدەر لەسەر مرۆڤ پێویست نابێ و، باب و دایکیش بۆیان نیە ئەو مەسەلەیە بەهەڵە بەکاربێنن و، کوڕو کچەکانیان بەداواو تەکلیفی قورس و سەغڵەتکەر نارەحەت بکەن، چونکە خوای میهرەبان لە توانا بەدەر لەسەر هیچکەس فەرز ناکات، وەك فەرموویەتی : ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ البقرة: ٢٨٦.

## سێیەم: مەسرەف کێشانی باب و دایك (النّفقة على الوالدين):

مافێکی دیکەی گرنگی باب و دایك لەسەر ڕۆڵەکانیان، ئەوەیە کە لەکاتێك دا، دەکەونە تەمەنەوە و پێویستیان، دەبێ کوڕو کچەکانیان بەڕێزو حورمەتەوە بیانژیەنن و مەسرەفیان بکێشن، جا ئێمە لەشەش برگەدا ئەم بابەتە دەتوێژینەوە:

## ١- بەڵگەی پێویست بوونی مەسرەف کێشانی باب و دایك لەلایەن ڕۆڵەکانیانەوە :

وێـڕای عـەقڵ و فیترەتـی سـاغ ،کـە پێویسـتی دەکـەن، کـوڕو کچـە دەسـت ڕۆیشـتووەکانی هـیچ بـاب و دایکێـك لـە بـاب و دایکیانـەوە ڕانـەمێنن، کـە بـە هـەژاریی و نـەداریی و کولـە مـەرگیی سـاڵانی کۆتـایی تەمـەنیان بـەڕێ بکـەن، بەحوکمی هەرکام لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپیزو یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء) یش ئەوە ئەرکێکە لە ئەستۆیان دا:

### یەك: بەڵگەی قورئان:

دەتوانین زۆر ئایەت لەو بارەوە بەبەڵگە بێنینەوە، بۆ نموونە:

أ- ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾ الإسراء: ٢٣.
کـە بێگومـان مەسـرەف کێشـانی بـاب و دایـك، لـەکاتی پێویسـتیان دا، بەشێکە لە چاکە لەگەڵ کردنیان.

ب- ﴿ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾ لقمان: ١٥ .
ئاشکراشە کە دابین کردنـی پێداویسـتییەکانی ژیـان و گـوزەرانێکی بـەڕێزو حورمەتەوە، پەسەندترین پەسندە، وە لەڕاستیدا کەسـێك هاوکـاریی بـاب و دایکی ئاتاجی نەکات، فەرمانی خوای جێ بەجێ نەکردوە، کە بەشێوەیەکی پەسندو چاك مامەڵە لەگەڵ باب و دایکی دا بکات!

جـ- ﴿ فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا ﴾ الإسراء: ٢٣
شتێکی ڕوونیشە، ئەگەر گوتنی وشەی ئۆف (أف)، کـە بێزاریـی و تـوڕەیی

دەگەیەنیٚ، [1] بەرانبەر بە دایك و باب قەدەغە بیٚ، چونكە ئازار گەیاندنە، ئەوە مەسرەف نەكێشانی باب و دایك قەدەغەترە، چونكە بێگومان ئازارەكەی زۆر زیاترە لە گوتنی وشەی ناوبراو!

## دوو: بەڵگەی سوننەت:

هەروەها دەتوانین گەلێك دەقی سوننەتیش لەوبارەوە بەبەڵگە بێنینەوە ،بۆ نموونە:

أ- (الْكَبَائِرُ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَقَتْلُ النَّفْسِ وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ) رواه البخاري : ٦٦٧٥، واتە : گوناهە گەورەكان ئەمانەن : هاوبەش بۆ خوادانان و، ئازاردانی باب و دایك و، كوشتنی كەسێك بەناهەق و، سوێندی بەدرۆ (كە خاوەنەكەی نوقمی گوناه دەكات).

ب- (لا يدخل الجنة قاطع) رواه البخاري :٥٩٨٤، ومسلم : ٢٥٥٦، واتە: پچڕێنەری پەیوەندیی خزمایەتیی ناچێتە بەهەشت .

هیچ گومانیشی تێدانیە كە مەسرەف نەكێشانی باب و دایك لەلایەن ڕۆڵەكانیانەوە گەورەترین ئازاردانە، هەروەها خراپترین جۆری پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی (قطع صلة الرحم)ە، چونكە ئاشكرایە كە باب و دایك نزیكترین كەسی مرۆڤن و لەهەموو نیزیكانیش مافدارترن .

## سیٚ: بەڵگەی یەكدەنگی زانایان:

(إبن المنذر) گوتوویەتی (أجمع أهل العلم على أن نفقة الوالدين الفقيرين

---

(١) أف : كلمة تضجُّر وتكرُّه، المعجم الوسيط، ص٢١.

الذين لا كسب لهما ولا مال، واجبة في مال الولد) [(١)] .

واتە: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە دابین کردنی بژێوی باب و دایکێکی هەژار، کە نە کاسبییەکیان هەیە (پێی بژین) نە ماڵ و سامان، لە ماڵ و سامانی رۆڵەکانیان دا پێویستە .

## ٢- مەبەست لە باب و دایك، کە لەسەر رۆڵەکانیان فەرزە بژێویان دابین بکەن، باب و دایکی راستەوخۆ و باپیرو نەنکیشە :

هەرچەندە زانایان لەوبارەیەوە سووکە را جیاییەکیان هەیە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایان، کە حەنەفییەکان و شافعییەکان و حەنبەلییەکان و ظاهیرییەکان و جەعفەرییەکان و، ئیدی دیکەشیان لەنێودان دەڵێن:

مەبەست لەدایك و باب (الوالدين)، باب و دایکی راستەوخۆو نیزیك و، باب و دایکە ناراستەوخۆو دوورەکانیشن، واتە: نەنك و باپیرەکان(الجدات والاجداد) هەتا سەرەوە، چ نەنك و باپیر لەلایەنی بابەوە، وەك دایکی باب و بابی باب، یان لە لایەنی دایکەوە وەك : دایکی دایك و بابی دایك[(٢)].

بەڵگەی ئەم رایەش ئەوەیە کە ناوی (والد) لە زمانی عەرەبی دا وێرای باب و دایك، باپیرو نەنکیش دەگرێتەوە، هەروەها وشەی (أب) بۆ باپیر (جدّ) یش بەکاردێ ،وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ الحج: ٧٨، کە دیارە باپیرە گەورەی دووریشیان بووە، کەچی بە (أب) ناوی بردوە .

---

(١) (المفصل ----) ج١٠، ص١٨٣.

(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٨٥-١٨٦.

وە من دەڵێم :

بەڵکو دەگونجێ بگوترێ، نەنك و باپیری ئاتاج و هەژار، لە باب و دایك لەپێشتریشن بۆ دابین کردنی بژێو، چونکە بێگومان لەوان بەتەمەنترو بێ تاقەت ترن و، بۆ هاوکاریی و ئاگالێبوونیش لە پێشترن !

## ٣- مەرجی بژێو بۆدابین کردنی باب و دایك، لەلایەن رۆڵەکانیانەوە :

زانایان لەو بارەوە دوو ڕایان هەن:

ڕایەکیان دەڵێ : تەنیا مەرجی ئەو بژێو دابین کردنە، بریتیە لە هەژاریی باب و دایك، وە ڕایەکەی دیکەیان دەڵێ : وێڕای هەژاریی (فقر)، دەبێ توانای کەسابەتکردنیشیان نەبێ، ئەوجار بژێویان لەسەر ڕۆڵەکانیان پێویست دەبێ .

جا دیارە ڕای یەکەم کە هی زۆربەی زانایانە[1]،ڕاست و بێ گرێیە، چونکە کوڕێك یان کچێکی هەبوو وە دەستڕۆیشتوو، کە باب و دایکە بەتەمەن و هەژارەکانیان ناچار دەکەن — مادام بتوانن- کارو کاسبیی بکەن، تاکو بژێوی خۆیان دابین بکەن، ئەوە نەك هەر لە وشەی (أُف) ئازاردەرترینیان بەرانبەر بە باب و دایکیان بەکارهێناوە، بگرە هەر زۆریان ئازارداون و بێڕێزیی و سووکایەتییان بەرانبەر کردوون، لەحاڵەتێك دا، کە نەك هەر خراپەنەکردن (إساءة) بەرانبەر بە باب و دایك، بگرە چاکە کردن (إحسان) یش لەسەر کوڕو کچەکانیان ئەرکێکی گەورەی شەرعییە ! وەك پێشتر لەوبارەوە چەندان ئایەت و فەرموودەمان هێناونەوە، لێرەشدا بەم ڕستە قورئانیە وازدێنین: ﴿ قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ ﴾ الأنعام: ١٥١،

---

(١) (المفصل ......) ج١٠، ص١٨٦-١٨٩.

واتە: بلێ وەرن ئەوەی پەروەردگارتان لەسەری قەدەغە کردوون بۆتان بخوێنمەوە، کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی وەلەگەڵ باب و دایك دا چاکە بکەن.

هەڵبەتە لێرەدا وا چاوەڕوان دەکرا گوترابا: وە خراپە لەگەڵ باب و دایکتان مەکەن، چونکە ئەو تەعبیرە لەگەڵ: (هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی خوا) ڕێك دەکەوێ، بەڵام بۆیە تەعبیرەکە گۆڕاوە، چونکە خراپە نەکردن لەگەڵ باب و دایك بەتەنیا هیچ نیەو، پێویستە چاکەیان لەگەڵ بکرێ، ئەگەرنا خەڵکی دیکەش هەر خراپەی لەگەڵ ناکرێ!

## ٤- ئەوانەی بژێوی باب و دایکیان لەسەرە، کوڕان و کچان و نەوەکانیشن:

هەرچەندە لەوبارەشەوە تا ڕاددەیەك لەنێو زانایان دا مشتومڕ هەیەو هەندێکیان دەڵێن: تەنیا کوڕان و کچانی ڕاستەوخۆ ئەو ئەرکەیان دەکەوێتە ئەستۆ، بەڵام زۆربەیان کە حەنەفییەکان و شەفعییەکان و حەنبەلییەکان و ظاهیرییەکان و جەعفەرییەکان و هی دیکەشیان لەنێودان، دەڵێن: لە ئەستۆی کوڕان و کچان و لقەکانیشیان (واتە: نەوەکان) دایەو، هەموو لایەکیان لەو بارەوە بەرپرسیارن و بەکەمتەرخەمیی تێداکردن، گوناهبارو سزابارن[1].

بەڵگەی ئەم ڕایەش وەك پێشتریش گوترا:

ئەوەیە کە وشەی (والِدَین)، باب و دایك و باپیرو نەنکیش دەگرێتەوە، هەروەها وشەی (أب) بۆ باپیرو سەرووتریش بەکارهاتوە، وەك خوا عز وجل فەرموویەتی: ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ﴾ الحج: ٧٨، کەواتە: کوڕو کچ، وەکو

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٩٠.

چۆن بژێوو نەفەقەی باب و دایکیان لەسەرە، هی باپیرو نەنکیشیان لەسەرە، چونکە نەنك و باپیریش، هەر باب و دایکیانن، با پلەیەك لێشیان دوور کەوتبنەوە [(١)].

## ٥- بەمەرجێك رۆڵە (وَلَد) بژێوی باب و دایکی لەسەر پێویست دەبێ، کە هەبوو بێ:

دیارە هیچ کەس شتێکی لەسەر پێویست نابێ، کە لەتوانایدا نەبێ و پێی نەکرێ، وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا ﴾ البقرة: ٢٨٦ وە فەرموویەتی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ﴾ الطلاق: ٧، بۆیە تێکرای زانایان لەسەر ئەوە رێککەوتون کە تەنیا کوران و کچان و نەوان (أبناء و بنات و أحفاد) یێك بژێوو نەفەقەی باب و دایك و باپیرو نەنکانیان لەسەر پێویست دەبێ، کە هەبوو و دەست رۆیشتوو بن .

ئنجا زانایان لەبارەی پێوەری هەبوویەتی و دەسترۆیشتوویی یەوە مشتومڕیان هەیە[(٢)]، بەڵام پێم وایە رای راست ئەوەیە کە هەر کەسێك زیادەی لە بژێوی مەسرەفی خۆی و هاوسەری و منداڵەکانی هەبێ، بەهەبوو (مُيْسُور) دادەنرێ، دەشتوانین ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە بەبەڵگە بێنینەوە کە دەفەرموێ: (ابْدَأْ بِنَفْسِكَ، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ فَهَكَذَا وَهَكَذَا) رواه مسلم :٩٩٧، والنسائي : ٤٦٦٦.

---

(١) (المفصل -----) ج١٠، ص١٩٠.
(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٩٠-١٩٣.

واتە: (لەماڵ خەرجکردندا) بەخۆت دەست پێبکە، جا ئەگەر شتێك زیاد بوو بابۆ خێزانت بێ، وەئەگەر شتێك لە خێزانت زیاد بوو، بابۆ خزمانت بێ، وەئەگەر شتێك لە خزمانیشت زیاد بوو، ئەوە بەملاولادا بیبەخشە.

## ٦- مسوڵمانێتیی لە باب و دایکێدا کە بژێویان لەسەر ڕۆڵەکانیان فەرزە، بەمەرج نەگیراوە:

ئەمیش زانایان لەسەری یەکدەنگن، چونکە دەقی قورئانی لەسەرە : ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ ﴾ لقمان: ١٥، کە پێشتر هێنامان و ماناشمان کرد.

هەڵبەتە بێجگە لەو ڕستە قورئانییە، هەموو ئەو ئایەتانەش کە بەگشتی فەرمان بە مرۆڤان دەکەن،کە لەگەڵ باب و دایکیان دا چاك بن، بەڵگەن لەسەر ئەوە کە باب و دایك ئەگەر مسوڵمانیش نەبن، چاکە لەگەڵ کردن و گوێڕایەڵیی بۆ کردن و خزمەتکردن و بژێو دابین کردنیان، هەر پێویستە، چونکە کە خوا عز وجل فەرموویەتی:﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ ﴾ العنكبوت: ٨.وە فەرموویەتی : ﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ لقمان: ١٤ . وە فەرموویەتی : ﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ ﴾ الأحقاف: ١٥، وەك دەبینین لەهەرسێك شوێنەکەدا خوای کاربەجێ، وەصیەت و ئامۆژگارییەکەی خۆی ئاڕاستەی مرۆڤ (إنسان) کردوە، وەك مرۆڤ، وە باسی باب و دایکیشی کردوە بە گشتی و، لەهەردووك سورەتی

(العنكبوت) و (لقمان) یش دا، مەبەست لێیان باب و دایکی کافرو هاوبەش دانەرە!

ئنجا لەکۆتایی لێکۆڵینەوەمان دا لەبارەی بابەتی : (مافی باب و دایك لەسەر رۆڵەکانیان) ەوە دەڵێین:

**یەك:** لەچاکەکردن و رێزلێگرتنی باب و دایکە کە، مرۆڤ چاکە لەگەڵ هاوەڵەکانیان دا بکات و رێزیان بگرێ، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی :

(إِنَّ أَبَرَّ الْبِرِّ صِلَةُ الْوَلَدِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ) رواه مسلم : ٢٥٢٥ والترمذي : ١٩٠٣، وأبو داود : ٥١٤٣.

واتە: چاکترین چاکەکاریی ، هاوکاریی و چاکەکردنی مرۆڤە لەگەڵ خۆشەویستانی بابیدا، جا دیارە ئەوە چ لە حاڵی لە ژیان دا بوونی بابی — یان دایکی — و چ دوای مردنیشیان وەك لە ریوایەتێکی دیکەدا هاتوە : (إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةَ الرَّجُلِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ بَعْدَ أَنْ يُوَلِّي) رواه مسلم :٢٥٥٢، چونکە رستەی (بَعْدَ أَنْ يُوَلِّي) یانی پاش مردنی.

**دوو:** هەروەها لە چاکە لەگەڵ کردنیانە کە دوای مەرگیشیان ئاگامان لێیان بێ، وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەردەکەوێ:

(عَن مالك بن ربيعة الساعدي قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ: هَلْ بَقِيَ مِنْ بِرِّ أَبَوَيَّ شَيءٌ أَبَرُّهُمَا بَعْدَ مَوْتِهِمَا؟ فَقَالَ نَعَمْ: «الصَّلاَةُ عليهِما وَالاسْتِغْفَارُ لَهُمَا، وَإِنْفَاذُ عَهْدِهِمَا مِنْ بَعْدِهِمَا وَصِلَةُ الرَّحِمِ الَّتِي لاَ تُوصَلُ إِلاَّ بِهِمَا، وَإِكْرَامُ صَدِيقِهِمَا) رواه ابو داود.

واتە : لەکاتێکدا کە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووین

پیاوێك لە بەنی سەلەمە هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا پاش مردنی باب و دایکم هیچ چاکەیەك ماوە کە وەك چاکەکاریی لەگەڵیان بکەم ؟ فەرمووی: بەڵێ، دوعا بۆ کردنیان و داوای لێبوردن بۆ کردنیان، وەجێ بەجێ کردنی بەڵێنەکانیان دوای خۆیان، وە چاکەکردن لەگەڵ ئەو خزمانەی، کە پێیانەوە پەیوەستن، وە ڕێز گرتن لە هاوەڵەکانیان .

بەڵێ پێویستە چاکە لەگەڵ باب و دایك پاش مردنیشیان هەر بەردەوام بێ، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەند شێوەیەکی ئەو چاکەکارییەی ڕوونکردۆتەوە، کۆتایی ئەم مەسەلەیەش بەم فەرموودەیە دێنین :

**(إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلا مِنْ ثَلاثٍ : صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ)رواه مسلم :١٦٣١، والترمذي :١٣٧٦، والنسائي: ٣٦٥٣**، واتە: مرۆڤ کە مرد، کردەوەکەی لێدەبڕێ (واتە: پاداشتی کردەوەکانی) مەگەر لە سێ ڕێیانەوە، چاکەیەکی بەردەوام، یان زانیاریەك سوودی لێ وەربگیرێ، یان ڕۆڵەیەکی چاك کە بۆی بپاڕێتەوە .

دیارە مەبەست لە چاکەی بەردەوام (**صَدَقة جارية**) ئەو شتانەن کە بەردەوام دەبن وەك مزگەوت، قوتابخانە، نەخۆشخانە، ڕێگاوبان، پرد، زەوی زارو خانووی وەقف کراو...هتد.

لێرەشدا کۆتایی بەبەشی شەشەم دێنین ودەگوازینەوە بۆ بەشی حەوتەم،کە زۆرترین پانتایی ئەم کتێبەی داگرتوە.

# بەشی حەوتەم

## چۆنیەتی لەیەکترازانی ژن و مێرد

تەوەری یەکەم : دەستبەردانی مێرد لە ژنەکەی (الطّلاق).

تەوەری دووەم : لەخۆدارِمانینی ژن بۆ مێردەکەی (الخُلعْ).

تەوەری سێیەم: هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی (الفَسْخ).



**خوێنەری سەنگین !**

لــەم بەشــی حەوتەمــەدا باســی چــۆنیەتی لەیــەکترازانی ژن و مێــردو هەڵوەشــاندنەوەی گرێبەســتی نێوانیــان دەکــەین ،کەلەســەر بناغــەی وی پرۆســەی هاوسەرگیریی لەنێوانیان دا بنیات نرابوو.

ئنجا وەك لە (رێ خۆشکردن) ی ئەم کتێبەدا باسمان کردبوو، لەیەکترازانی ژن و مێردو هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی نێوانیان، بە گشتی سێ حاڵەت هەن، چونکە:

١- یان مێرد لە ژنەکەی بێزار دەبێ و دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ژیانی لەگەڵ ژنەکەیدا بەشێوەیەکی رێك و پێك بۆ نابرێتەسەر، ئەوە شەریعەت (طلاق) ی داناوە، واتە:

دەستلێبەردان و وازلێهێنانی پیاو بۆ ژن .

٢- یان ژن لەمێردەکەی بێزار دەبێ و چی دیکە ناتوانێ لەگەڵی مەدار بکات، شەریعەت (خُلْع) ی بۆ داناوە، واتە: لەخۆدارنینی ژن بۆ مێرد.

٣-یان هاوسەرگیرییەکەیان لە بناغەوە هەڵوەشاوەتەوەو شەرعیەتی نەماوە، یاخود لایەکیان دەیەوێ هەڵیبوەشێنێتەوەو لایەکی دیکە رازی نیە، ئەوە دادوەر (قاضي) هەڵدەستێ بە هەڵوەشاندنەوەی (فَسْخ) ی گرێبەستی نێوانیان و، پابەند (مُلْزَم) کردنی ئەو لایەنەی چاوی لە ستەمە و، ئامادەنیە بەخۆشیی بێتە ژێرباری شەرع.

بۆیە ئێمە لەسێ تەوەردا باسی چۆنیەتی لەیەك ترازانی ژن و مێرد[(١)] دەکەین و هەر تەوەرە بۆ یەکێك لەو سێ حاڵەتە تەرخان دەکەین :

---

(١) بۆ نووسینی ئەم بەشە بەهەر سێك تەوەرەکەیەوە بە پلەی یەکەم سوودم لە کتێبی (المفصل..) وەرگرتوە، بڕوانە بەرگەکانی : ٧، ٨، ٩، هەروەها سوودم لەچەند

## تەوەری یەکەم : دەستبەردانی مێرد لە ژنەکەی (الطّلاق)

هەڵبەتە بابەتی تەڵاق، بابەتێکی فراوانەو لق و پۆپی زۆرن و زانایانیش مشت و مڕو ڕاجیایی زۆریان تێدا هەیە و، ئێمەش نامانەوێ بچینە نێو هەموو وردەکاریەکانیەوە، کە شوێنی تەرخانکراوی ئەوە، سەرچاوە فیقهییەکانە، بۆیە ئەوەی دەمانەوێ لەبارەی تەڵاقەوە باسی بکەین، لەپێنج خاڵی سەرەکیی دا کورت و پوختی دەکەینەوە:

١- پێناسەی تەڵاق.

٢- حوکمی تەڵاق.

٣- حیکمەتی بەدەستی پیاوبوونی تەڵاق.

٤- پایەکانی تەڵاق.

٥- جۆرەکانی تەڵاق.

ئێستاش بەڕێز بەم پێنج خاڵەدا دەچینە خوار:

بەڵام سەرەتا دەڵێین خوێنەری بەڕێز! ئەگەر لەیادت بێ ئێمە لەخاڵی (١٠) ی بەشی سێیەم دا کورتە توێژینەوەیەکمان لەبارەی تەڵاقەوە کردو، تیشکمان خستە سەر پێناسەو حوکمی ڕەوا بوونی و جۆرەکانی و حیکمەتەکەی و هۆکاری بەدەست پیاوبوونی و، پوچەڵکردنەوەی ئەو تۆمەتانەی، کە لەم سەردەمەدا ئاڕاستەی

---

سەرچاوەیەکی دیکەش وەرگرتوە، وەك (الطلاق وأحكامه) للشيخ حسن حلاوة، الأمين العام للمجلس الاوروبي للإفتاء والبحوث، وە: (الخلع وأحكامه الشرعية..) للشيخ فيصل مولوي، المجلة العلمية للمجلس الأوروبي للإفتاء والبحوث، العددان الثامن والتاسع، وة (فقه الأسرة المسلمة ونوازلها في الغرب) للشيخ عبدالرحمن البرزنجي، وە: (احكام الزواج والطلاق في الفقه الاسلامي المقارن) للدكتور مصطفى إبراهيم الزلمي، وە: (الطلاق في الشرائع والقوانين والأعراف خلال أربعة ألاف سنة) د: مصطفى ابراهيم الزلمي.

شەریعەتی خوا دەکرێن، بۆیە جۆرێك لە دووبارە بوونەوە لەنێوان باسەکانی ئێرەو ئەوێ دا هەیەو، هەندێك شت کەلەوێ باس کراوە، لێرە بە ئاماژەیەکی کورت وازی لێ دێنین و، بێگومان هەندێك بابەتیش کە لەوێ باس نەکراون، لێرە بەپێی بۆ لوان بەتێرو تەسەلیی دەیانتوێژینەوە.

## ١- پێناسەی تەلاق:

دیارەووشەی (طلاق) وشەیەکی عەرەبییەو بەمانای بەرهەلّداکردن و ئازادکردن دێ، وەك (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (أصل الطلاق التخلية من الوثاق، يقال، أطلَقْتُه من عقاله و طَلَقتُهُ وهو طالق و طلْق: بلا قيد، ومنه استعير طلَّقْتُ المرأة نحو: خلَّيتُها فهي طالق، اي مُخلاة من حبالَة النكاح....) [1]

ئەوە بە نیسبەت وشەی تەلاق لە ڕووی زمانەوانییەوە، لەڕووی شەریعەتیشەوە زاناو شەرعزانان، بەچەند وشەیەك پێناسەیان کردوە، کە لەنێوەڕۆکدا یەکن و ڕەنگە ئەم پێناسەیە باشترینیان بێ:

(الطلاق شرعاً، إنهاء عقد الزواج الصحيح في الحال أو في المآل بالصيغة الدالة عليه) [2].

واتە : تەلاق لەشەرع دا، کۆتایی پێهێنانی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکی ڕاستە، ئێستا، یان لە داهاتوودا، بەدەربڕینێك، کە بیگەیەنێ.

هەروەها دەشتوانین ئاوا پێناسەی تەلاق بکەین :

(رَفعُ قيد النكاح في الحال أو في المآل بِلَفظٍ مخصوص) [3]

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٢٣.
(٢) (المفصل....) ج٧، ص٣٤٧.
(٣) الأحوال الشخصية، لمحمد أبي زهرة، ص٢٧٩.

واتە: هەڵگرتنی بەندی نیکاحە یەکسەر یان لە ئایندەدا بە بێژەیەکی تایبەت .
کەواتە :
تەڵاق بریتیە لەیەکترازانی ژن و مێرد و لەیەك جیابونەوەیان بە بەکارهێنرانی وشەو تەعبیرێکەوە لەلایەن مێردەوە، کە ئە مەبەستە بە ئاشکرا و بە ڕوونیی بگەیەنێ .

## ٢- حوکمی تەڵاق:

تەڵاق دان لەبنەڕەتدا شتێکی ڕەوایە، بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و ئیجماع :

### أ- قورئان :

١- ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ البقـــرة: ٢٢٩،
واتە : تەڵاقدان دووکەڕەتە (واتە: تەڵاقدانێك کە بواری پێکهاتنەوەی ژن و مێردی تێدابێ) ئنجا یان گرتنە خۆیەکی پەسەند، یان دەست لێبەردانێکی چاك...

٢- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ الطلاق: ١، واتە: ئەی پێغەمبەر ! هەرکات ژنانتان تەڵاقدان بەر لەکەوتنە عیددە تەڵاقیان بدەن (واتە: لەحاڵەتێکدا کە پاك بوونەوە لەو پاکییەدا نەچووبنە لایان).

### ب- سوننەت:

١- عن عمر بن الخطاب رضي الله عنهُ أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) طلَّقَ حَفْصة ثم راجَعها) أخرجه أبو داود والحاكم وَصَحّحَهُ ووافَقهُ الذهبي.
واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەفسەی تەڵاق دا، پاشان گێڕایەوە لای خۆی .

٢- (أبغضُ الحلال الى الله الطّلاق) اخرجهُ أبو داود : ٢١٧٨، وابن ماجة : ٢٠١٨، والحاكم في المستدرك (١٩٦/٢) وصَححَهُ ووافقهُ الذهبي.
واتە: بوغزێنراوترین حەلاڵ لەلای خوا تەلاٌقە.

## ج- ئیجماع :

زانایان لەسەر ڕەوایی تەلاٌقدان یەکدەنگن، وەك خاوەنی (المغني) هێناویەتی.[١]
منیش پێم وایە ئەو ڕایە ڕاست و پەسەندە، کە دەڵێ :
هەرچەندە تەلاٌق دان لە بنەڕەتدا ڕەواو درووستە، بەڵام لەڕاستیدا پێنج حوکمە شەرعییەکان (الأحكام الشرعية الخمسة) ی بەسەردا دەچەسپن، بەم شێوەیەی خوارێ:

### ١- پێویست (واجب) :

هەرکات ژن و مێرد کەوتنە ناکۆکییەوە و دوو دادوەرەکان (حَكَمَيْن) لەیەکترازانیان بڕیاردا، هەروەها پاش تێپەڕبوونی چوار مانگ بەسەر سوێند خواردن (إيلاء) ی بابای سوێند خۆر (مُولي) دا، وەك دوایی باسی دەکەین .

### ٢- پەسند (مندوب):

ئەمیش لەکاتێکدایە کە ژن بەرانبەر بە ئەرکە شەرعییەکانی کەمتەرخەم بێ و مێردەکەیشی نەتوانێ چارەسەری کەمتەرخەمی بکات .

### ٣- قەدەغە (حرام):

ئەمیش لەکاتێکدایە، کە پیاوەکە قەناعەتی وابێ ئەگەر ژنەکەی تەلاٌقی بدات ستەمی لێ دەکات، وە هیچ بەڵگەو پاساوێکی بەدەستەوە نەبێ بۆدەست

---

(١) (المغني) لأبن قدامة الحنبلي، ج٧، ص٩٦، وة : (المفصل....) ج٧، ص٣٤٧.

لێبەردانی، یان لەکاتی حەیزدا تەلاقی بدات، یان لەپاکییەکدا، کە چووبێتەلای (في طُهْرٍ جامعها فيه)، هەرچەندە بۆتەلاقدانەکەی بەڵگەو پاساویشی هەبێ، هەروەها لەکاتێکدا، کە بابای مێرد قەناعەتی وابێ پاش تەلاقدانی ژنەکەی، ژنی دیکەی بۆ نایەتەوە و تووشی زیناو خراپە دەبێ .

### ٤- ناپەسەند (مكروه):

ئەمیش لەکاتێکدایە کە پیاو هەندێك تێبینی لەسەر ژنەکەی هەبن کە بگونجێ بە خۆڕاگریی و حیکمەت چارەسەریان بکات، یان بە تۆزێك تەحەمول و پشوو درێژیی و، تەمەنی لەگەڵ بگوزەرێنێ .

### ٥- ڕەوا (مباح):

ئەمیش لەحاڵەتێکدایە کە مێرد پێویستی بە دەرباز بوون بێ لە ژنەکەی بەهۆی نارێکی ڕەفتارو هەڵس و کەوتیەوە، زەرەرمەند بوونی بەدەستیەوە .

## ٣- حیکمەتی بەدەستی پیاو بوونی تەلاق:

لەکاتێکدا مێرد لەگەڵ ژنەکەیدا دەگاتە بن دەست و پاش بەکارهێنانی سەرجەم هەنگاوو شێوازەکانی ڕاست کردنەوەو هێنانە سەر ڕێ، ژنەکەی لێی یاخی دەبێ، سێ ئەگەری لەبەردەم دا دەبن:

یەك: پێکەوە مانەوە بەناچاریی، وێڕای هەبوونی بوغزو کینەو ناکۆکیی، کە دیارە لەو حاڵەتەدا ژیانی ژن و مێردو منداڵەکانیشیان، بگرە خزمە نزیکەکانیشیان دەبێتە نیمچە دۆزەخێك .

دوو: هێشتنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی و لەیەك دوورکەوتنەوەی جەستەیی،

کە لەم حاڵەتەشدا، ژنەکە زەرەرمەندی گەورە دەبێ و، بەزاراوەی قورئان دەبێتە هەڵواسراو ﴿ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ ﴾ النساء: ١٢٩ .

سێ: هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی نێوانیان و ئازادو سەربەست بوونیان لەو واقیعە تاڵ و دژوارەی کە تێیدا دەژین، وەك خوا فەرمویەتی : ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ﴾ النساء: ١٣٠، واتە: وەئەگەر لەیەك بترازێن خوا هەر کامێکیان لە بەخششی خۆی ئەبەخشێ خۆی (لەوی دیکە) بێ نیاز دەکات...

ئاشکراشە کە هەموو عاقڵێکی خاوەن ویژدان دڵنیایە کە تەنیا ڕێی سێیەم، ڕێیەکی شایستەو گونجاوەو، دوو ڕێیەکەی دیکە بەکەڵك نایەن و، بە زیان و خراپەی ژن و مێردو منداڵەکانیشیان تەواو دەبن .

ئنجا لەبارەی حیکمەت و هۆکاری بەدەست پیاو بوونی تەڵاقیشەوە، هەرچەندە پێشتریش شتێکمان لەبارەیەوە باس کردوە دەڵێین :

بەلای کەمەوە سێ هۆکار هەن، کە پێویستی دەکەن تەلاق بەدەست پیاو بێ نەك ژن:

یەکەم : پیاو مشوورخۆرە و بەرپرسی ژن و خێزانە : ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾ النساء: ٣٤، هەروەها پیاو دەستپێشخەری هاوسەرگیریی و بنیاتنانی خێزانە، بۆیە شتێکی مەنتقییە، کە هەر خۆیشی مافی هەڵوەشاندنەوەی هەبێ .

دووەم: تەلاق کە بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی و دەرەنجامی زۆری لێدەکەونەوە، بڕیارێکی پڕمەترسییەو نابێت بەدەست کەسێکەوەبێ، کە عاتیفەو سۆز بەسەریدا زاڵ بێ، دیارە پیاوانیش بەگشتی

لە ژنان زیاترو چاکتر هەست و سۆزی خۆیان پێ کۆنترۆڵ دەکرێ.

سێیەم: تەڵاق دان دەبێتە مایەی پێویست بوونی چەند بەرپرسیارییەتێکی دارایی، وەك مارەیی دواخراو (المَهْر المُؤجَّل) و، کرێی شیر پێدان و بەخێو کردن (**أجرة الرضاعة والحضانة**) وە بژێوی کاتی عیددە، ئەمەش وا لە مێرد دەکات کە پەلە نەکات لە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییدا .

ئنجا بێگومان تەڵاق بەدەستی مێرد بوون مانای وانیە، کە ژن هیچ مافێکی نیە، بەڵکو ئەویش بۆی هەیە :

یەك : کە لەکاتی گرێبەستی هاوسەرگیریی (عقد النکاح) دا بەمەرجی بگرێ کە تەڵاقی بەدەست خۆی بێ، وەك لە مەزەبی حەنەفی دا هاتوە[1] .

دوو: کە مێردەکەی سەرپشکی بکات هەرکات ویستی جیابێتەوە، ئەوە زۆربەی زانایان بەرەوایان زانیوە [2]، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وسلم**) هاوسەرەکانی سەرپشك کرد، پاش دابەزینی ئایەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب: ٢٨ .

سێ: کە مێردەکەی بیکاتە وەکیل بۆ خۆتەڵاقدانی و جیابوونەوەی [3] .

چوار: ئنجا سەرباری هەموو ئەوانە، ژن مافی لەخۆدارنین (خُلْعْ) مێردیشی هەیە، وەك لە تەوەرەی دووەم دا بە درێژیی باسی دەکەین .

---

(١) حاشية ابن عابدين، رد المحتار على الدرِّ المختار، ج٢، ص٤٨٥.

(٢) (المهذب)للشيرازي، ج٣، ص٨.

(٣) الأحوال الشخصية، للشيخ محمد أبي زهرة، ص٣٢٣.

## ٤- پایەکانی تەلاق:

هەرچەندە لەبارەی پایەکانی تەلاقدانەوە، لەنێو زانایانەوە مشت و مڕو ڕا جیایی هەیە، بۆ وێنە: حەنەفییەکان دەڵێن: تەلاقدان بەس یەك پایەی هەیە کە بریتییە لە بێژە (لفظ) ەیەك کە بەکاردەهێنرێ بۆ لێکترازانی ژن و مێرد، وەك(الکاسانی) گوتوویەتی : (**فركن الطلاق هو اللفظ الذي جعل دلالة على معنى الطلاق...**) [(١)] .

بەڵام شافعییەکان دەڵێن: تەلاقدان پێنج پایەی هەن، وەك (الشربيني )گوتوویەتی: (**وأركانه خمسة : مُطلِّق و صيغة و مَحَلٌّ و ولاية وقَصْدٌ**) [(٢)] .

بەڵام ئەوەی زۆربەیان لەسەری ڕێك کەوتوون، ئەوەیە کە تەلاقدان سێ پایەی سەرەکیی هەن، کە بریتین لە :

١- تەلاقدەر: (**المطلّق**) کە مەبەست مێردە.

٢- تەلاقدراو (**مُطَلَّقة**) کە مەبەست ژنە.

٣- ڕێژگە (**الصيغة**) کە مەبەست ئەو بێژەو ئاماژەیە کە بۆتەلاقدان بەکاردێ[(٣)] .

وە من ڕای ئەو زانایانەم پێ ڕاستترە کە گوتوویانە : تەلاقدان پایەیەکی دیکەی

---

(١) بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، ج٣، ص١٥٧.

(٢) مغني المحتاج، ج٤، ص٤٥٥.

(٣) بۆ وێنە، بڕوانە، (المفصل...) ج٧، ص٣٤٥، وە : أحكام الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي، د. مصطفى الزلمي، ص١٥٠، وە : فقه الأسرة المسلمة ونوازلها في الغرب، الشيخ عبدالرحمن البرزنجي، ص٢٨٦، وە: الطلاق وأحكامه، للشيخ حسن حلاوة، ص١٤٨-١٧١، المجلة العلمية : العددان الثامن والتاسع.

چوارەمیشی هەیە :

٤- شایەدلەسەر گرتن (الإشهاد)، واتە : دوو کەسی دادگەر شایەد بن لەسەر تەڵاقدانەکە.

جا ئێستا با هەرکام لەم چوار پایە بتوێژینەوە :

## ١- تەڵاقدەر (المطلِّق) :

دیارە مەبەست لە تەڵاقدەر ئەو پیاوەیە کە لەنێوان ئەوو هاوسەرەکەیدا گرێبەستێکی هاوسەرگیریی ڕاست (عقد زواج صحیح) هەیەو، شایستەیی ئەوەی هەیە کە هاوسەرەکەی تەڵاق بدات و دەسبەرداری ببێ .

شایانی باسیشە کە زانایان لەبارەی مەرجەکانی بابای تەڵاقدەر (مُطَلِّـق) ەوە ڕاجیایی و مشت و مڕی زۆریان هەیە، بەڵام پاش سەرنجدانی قسەو بەڵگە هێنانەوەکانیان، گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە ڕای پەسەندو ڕاست و پشت ئەستوور بە بەڵگەی بەهێز، ئەوەیە کە بابای تەڵاقدەر، دەبێ چوار مەرجی سەرەکیی تێدابێنەدی، ئەگەرنا شایستەیی تەڵاقدانی نابێ، کە بریتین لە :

١- باڵغ بوون (بالغ).

٢- عاقڵ بوون (عاقل).

٣- سەربەست بوون (مختار).

٤- ئامانجداربوون (قاصد).

وە بەبێ هیچ لەم مەرجانە، مێرد شایستەیی تەڵاقدانی هاوسەرەکەی لەدەست دەدات، کەواتە:

کەسێك شایستەیی تەڵاقدانی هاوسەرەکەی هەیە کە :

١- باڵغ بێ و منداڵ نەبێ و مێرد منداڵیش نەبێ .

٢- وە عاقڵ و بەهۆش بێ و، شێت و گێل و سەرخۆش و بێهۆش و لەتووڕەییان ئاگا لەخۆ بڕاو نەبێ.

٣- وە ئازادو سەربەست بێ و زۆرلێکراو (مُكْرَه) و ئیرادە زەوتکراو نەبێ .

٤- وە ئامانجدار بێ و، بەهەڵە دا چوو و گاڵتەکەر نەبێ .

ئنجا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەڵێین :

یەك: بەمەرج گیرانی باڵغ بوون بۆ بابای تەڵاقدەر، ئەوە دەگەیەنێ کە منداڵ و مێرد منداڵی نابالغ، شایستەی تەڵاقدانی نیە و تەڵاقیشی ناکەوێ، کە دیارە ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە لە حەنەفییەکان و مالکییەکان و شافعییەکان، بەڵگەشیان ئەوەیە، کە باڵغ بوون سنووری لەسەر پێویست بوونی ئەرکە شەرعیەکانە، وەك پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:(رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنِ المَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ أَوْ يُفِيقَ) رواه البخاري معلقاً وأبو داود : ٤٤٠٣، والألباني في صحيح الجامع :٣٥١٢، واتە: قەڵەم (ی گوناە نووسین) لەسەر سێ جۆرە کەسان لابراوە : لەسەر خەوتوو تا بێدار دەبێتەوە، وەلەسەر منداڵ هەتا باڵغ دەبێ، وە لەسەر شێت هەتا دێتەوە هۆش .

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (الطَّلَاقُ لِمَنْ أَخَذَ بِالسَّاقِ) رواه ابن ماجه : وحسنه الألباني في صحيح الجامع : ٣٩٥٨، واتە : تەڵاق بەدەست ئەو کەسەیە کە لاقی هاوسەرەکەی دەگرێ، کە مەبەست پێی جیماع کردنە .(کەواتە: هەتا توانای جیماع کردنی نەبێ، شایستەیی تەڵاقدانی نیە).ز

دوو: بەمەرج گیرانی عاقڵ بوون بۆ تەڵاقدەر، ئەوە دەگەیەنێ، کە هەرکام لەشێت و بێ هۆش و سەرخۆش و ئاگا لەخۆ بڕاو، بەهۆی تووڕەیی زۆرەوە،

هەروەها عەقڵ و هۆش لە لانەماو بەهۆی پیریی، یان نەخۆشییەوە، هیچ کام لەمانە تەڵاقیان ناکەوێ، کە دیارە ئەمەش بەگشتی ڕای زۆربەی زانایانی لەسەرەو، دەگونجێ ئەم بەڵگانەش بۆ ئیسپاتی ڕاستی ئەم ڕایە بهێنرێتەوە :

١- (رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنِ المَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ أَوْ يُفِيقَ) کە پێشتریش هێنامان .

٢- (لا طلاق في إغلاقٍ) رواه ابو داود : ٢١٩٣، وابن ماجه : ٢٠٤٦، والحاكم : ٢٨٠٢، وقال صحيح على شرط مسلم، وحَسَّنَهُ الألباني في صحيح الجامع : ٧٥٢٥.

زۆرێك لە زانایانیش وشەی (إغلاق) یان بە تووڕەیی (غَضَبْ) لێکداوەتەوە، وەك: ( علي بن ابي طالب و ابن عباس و احمد و ابو داود و الكرخي و الطحاوي و ابن تيمية و ابن القيم) [1] ،بەڵام بێگومان مەبەست لە تووڕەیی، تووڕەییەکی توندی وایە، کە خاوەنەکەی ئاگای لەخۆی نەمابێ و عەقڵ و هۆشی داخرابێ.

٣- (قالَ عثمان رضي الله عنهُ لَيْسَ لمجنونٍ ولا لسكران طلاق) رواه البخاري [2] .واتە: شێت و سەرخۆش تەڵاقیان بۆنیە .

٤- (قال ابن عباس رضي الله عنهما : طلاق السّكران والمُسْتَكرَه لَيْسَ بجائزٍ) رواه البخاري[3] . واتە : تەڵاقی سەرخۆش و زۆرلێکراو ناکەوێ .

---

(١) إعلام الموقعين عن رب العالمين، لابن القيم، ج٣، ص٥٢، وە: (المسائل الفقهية من إختيارات شيخ الإسلام ابن تيمية) ٢١٨-٢٠.

(٢) صحيح البخارى، ص٩٩٠، باب الطلاق في الإغلاق والمكره والسكران والمجنون ...

(٣) هەمان سەرچاوە، ص٩٩٠-٩٩١.

٥- ابن المنذر لەبارەی قسەکەی (عثمان) ەوە گوتوویەتی : (ولا نَعلَمُ أحَداً مِن الصحابة خالَفَهُ)[١]، واتە: نەمانزانیوە هیچ کام لە هاوەڵان رایان پێچەوانەی بووبێ.

٦- (ابن قدامة) گووتویەتی: (أجمع أهل العلم على أنَّ الزائل العقل بغير سُكْرٍ أوما في معناه لا يقع طلاقهُ، وسواءٌ زال عَقْلُه لجنون أو إغماءٍ أو نومٍ أو شرب دواءٍ أو أكره على شرب الخَمْر)[٢] .

واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە بابای عەقڵ و هۆش لاچوو بەهۆی جگە لەسەر خۆشی و هاوونێنەی تەلاقی ناکەوێ، جا یەکسانە بەهۆی شێتی، یان بێهۆشی، یان خەوتن، یان دەرمان خواردنەوە، یان ناچارکردن لەسەر خواردنەوەی مەی بێ.

سێ: بەمەرج گیرانی ئازاد بوون و سەربەست بوون بۆ تەلاقدەر، ئەوە دەگەیەنێ کە بابای زۆرلێکراو ناچارکراو (مُكْرَه وَمُضطَرّ) تەلاقی ناکەوێ، چونکە ئازادو سەربەست نیەو ئیرادەی زەوت کراوەو، بابای ئیرادە زەوت کراویش تەکلیفی لەسەر نیە، چونکە توانای نیە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی : ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ ﴾ البقرة:٢٨٦ ، هەروەها پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە کە بابای ناچارکراو تەکلیفی لەسەر نییە و گوناهبار نابێ فەرموویەتی : (رفع عَن أُمَّتي الخَطَأ وَالنِّسيان وما استكرهوا عليه) رواه الطبراني في الكبير عن ثوبان بإسناد حسن وصححه الألباني في صحيح الجامع الصَغير: ٣٥١٥، واتە: ئوممەتم سێ شتیان لەسەر لابراون : هەڵەو، لەبیرچوون و، ئەوەی

---

(١) المغني، ج١، ص٣٤٧.

(٢) المغني، ج١، ص٣٤٥، والمهذب للشيرازي، ج٢، ص٢.

لەسەری ناچاربکرێن.

شایانی باسیشە هەندێك لە زانایان، وتەی (إغلاق) یان بەناچارکردن (إکْراه) لێکداوەتەوە، چونکە بابای ناچارکراو، قفل دەکرێ و ئیرادەی نامینێ، منیش پێم وایە وشەی (إغلاق) هەرکام لە تووڕەیی زۆرو ناچارکرانیش دەگرێتەوە .

چوار: بەمەرج گیرانی ئامانجدار (قاصد) بوانی بابای تەلاقدەر لە بەزار داهاتنی، یان نووسینی وشەی تەلاق و هاو وێنەکانی، یان ئاماژە پێکردنی دا، ئەوە دەگەیەنێ، کە هیچ کام لە قسەی هەڵە (خطأ) و گاڵتەکردن(هَزْل) تەلاقیان پێناکەوێ، چونکە تەلاقدەر مەبەستی نیە هاوسەرەکەی تەلاق بدات .

ئنجا هەرچی هەڵەیە، ئەوە زۆربەی زانایان ڕایان وایە، کە تەلاقی پێناکەوێ، چونکە مرۆڤ بەهەڵە وشەیەکی بەزار دابێ، بێئەوەی بیری لێ کردبێتەوە و مەبەستی بێ، ماقووڵ نیە ژنەکەی تەلاقی بکەوێ، ئەم ئایەتەش بەڵگەی یەکلایی کەرەوەیە لەو بارەوە :

﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥، واتە : وەلەوەدا کە بەهەڵە دەیڵێن گوناهتان ناگات، بەڵکو بەوە کە مەبەستی دڵتانە، وە دەیڵێن گوناهتان دەگات، وە خودا لێبوردەی بەزەییە.

هەروەها فەرموودەی :(رُفِعَ عَنْ أُمتي الخَطَأُ والنِّسيانُ وما استكرهوا عليه) کە پێشتریش هێنامان .

بەڵام بەنیسبەت قسەی گاڵتەو گەمە (الهُزء والمزاح) ەوە، زانایان زۆربەیان ڕایان وایە کە تەلاقی پێدەکەوێ وە ئەم دەقەش بەبەڵگە دێننەوە : (ثلاث

جِدُّهن جِدٌّ وهَزْلُهنَّ جِدٌّ: النكاح والطلاق والرجعة) رواه أبو داود والترمذي والحاكم وصححه وحسنه الألباني في صحيح الجامع: ٣٠٢٧.

واته: سێ شت ڕاستییان جیدییەو، گاڵتەشیان هەر جیدییە: مارەکردن و، تەڵاقدان و، گێڕانەوە (ی ژن).

بەڵام من وای بۆ دەچم، کە ڕایەکەی دیکە، کە هی ژمارەیەك لە زانایانە بەهێزترە، بەم بەڵگانە :

١- کردەوەکان بەپێی نیازو مەبەستن و، بابای گاڵتەکەریش مەبەستی نیە ژنەکەی تەڵاق بدات، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (إنما الأعمال بالنيات وانما لكل امريء ما نوى ...) رواه البخاري : ١، ومسلم : ١٩٠٧.

٢- خوا عز وجل لەبارەی پیاوانی تەڵاقدەری ژنەکانیانەوە، فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٢٧ واتە: وەئەگەر دڵیان لەسەر تەڵاقدان ساغ کردەوە، ئەوە خوا بیسەری زانایە.
ئاشکراشە ،کە بابای گاڵتەکەر، نیازی تەڵاقدانی ژنەکەی هەرنیە، چ جای دڵی لەسەر ساغ بکاتەوە !

٣- بەنیسبەت دەقەکەشەوە، فەرموودە ناسان تانەیان لەسەنەدی دەقەکەی داوە، بۆ وێنە : (الترمذي) گوتوویەتی: (في إسناده عبدالرحمن بن ازوك بن حبيب وهو مختلف فيه ومنكر الحديث) [1] ،واتە: لەنێو ڕاوییەکانی (عبدالرحمن بن أزوك بن حبيب) هەیە کە شارەزایان لەبارەیەوە ڕاجیان و فەرموودەی نامۆی گێڕاونەوە.

(١) أحكام الزواج و الطلاق ...ص١٥٤، کە لە عمدة القاري، ج١، ص٥٤٠، وە : الدرر البهية، ج٢، ص٦٩، وەریگرتوە.

## ٢- تەڵاقدراو (المُطَلَّقة):

ئەو ئافرەتەی کە تەڵاقدەدرێ لەلایەن مێردەکەیەوە، چەند شتێکی تێدا بەمەرج گیراون، کە بەبێ ئەو مەرجانە ناگونجێ تەڵاق بدرێ، یاخود تەڵاقی ناکەوێ:

١- دەبێ لەسەر بناغەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکی ڕاست (عقد زواج صحیح) بووبێتە هاوسەری مێردەکەی، ئەگەرنا ئافرەتی بێگانەو ئافرەتێك کە بەگرێبەستێکی نادرووست (عقد فاسد) بەهاوسەر دانرابێ، نابێتە شوێنی تەڵاق، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (**لا نذر لإبن آدم فيما لا يملك، ولا عتق له فيما لا يملك، ولا طلاق لة فيما لا يملك**) **رواه ابو داود والترمذي وقال: حديث حسن صحيح** .

واتە: بنیادەم بۆی نیە شتێك بکاتە نەزر کە نییەتی، وە ئازادکردنی کەسێکی بۆنییە کە خاوەنی نیە، وە بۆی نیە ئافرەتێك تەڵاق بدات کە هاوسەری نیە.

٢- دەبێ پێش گواستنەوەی (قبل الدخول بها) تەڵاقی نەدابێ، چونکە ئەگەر ئەو کاتە تەڵاقی دابێ، لێی جیابۆتەوەو هیچ تەڵاقی نەماون.

٣- دەبێ لە عیددەی تەڵاق و جیابوونەوەی گەورەدا نەبێ (**أن لا تكون في عدة طلاق بائن بَينونة كبرى**)، بەڵام ئەگەر لە عیددەی تەڵاقدانێك دابێ کە دەرفەتی گێڕانەوەی مابێ، کە پێی دەگوترێ : (**طَلاق رَجعي**) ئەوە زۆربەی زانایان دەڵێن : لەو حاڵەتەدا تەڵاقی دەکەوێ، بەڵام (**إبن تيمية**) وەژمارەیەك لە زانایان دەڵێن : لەو حاڵەتدا ئافرەت تەڵاقی دیکەی ناکەوێ و بەسەرنجدانی ڕواڵەتی ئایەتی ژمارە (٢) ی (**الطلاق**) یش، کە (**إبن تيمية**) بەبەڵگەی هێناوەتەوە، دەردەکەوێ، کە ڕایەکەی (إبن تيمية)

ڕاستترەو بەرژەوەندیی پاراستنی خێزان لە هەڵوەشانیش دێنێتە دی، ئەوەش سەرەتای ئایەتەکەیە، کە پەیوەستە بە مەسەلەی ناوبراوەوە: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ﴾ الطلاق: ٢، واتە: ئنجا هەرکات (ژنانی تەلاقدراو) نیزیك کەوتنەوە لە کۆتایی عیددەیان، ئەوە یان بەشێوەیەکی پەسند بیانگێڕنەوە لای خۆتان، یان بەشێوەیەکی پەسند لێیان جیاببنەوە.

(إبن تيمية) پاش هێنانی ئەم ڕستە قورئانییە، گوتوویەتی: (**فَخَيَّرَهُ بين الرَّجْعَةَ وبين أنْ يَدَعها تَنقضي العِدَّةُ فَيُسَرِّحَها بأحسان، فاذا طلَّقها ثانية قبل انقضاءِ العدة، لم يُمْسك بمعروف ولم يُسَرِّحْ بأحسان**) [(١)] .

واتە: خوا سەرپشکی کردوە لەنێوان گێڕانەوەداو لەنێوان ئەوەدا، کە وازی لێبێنێ، هەتا عیددەکەی تەواو دەبێ و بەشێوەیەکی جوان دەستبەرداری بێ، ئنجا کاتێك بۆ جاری دووەم و پێش تەواو بوونی عیددەکەی تەلاقی دەدا، ئەوە مانای وایە، نە بەشێوەیەکی باش هێشتوویەتەوەو، نەبەشێوەیەکی باش وازیشی لێ هێناوە .

٤- دەبێ لە عیددەی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی (**عِدة فسخ الزواج**) دانەبێ، جا بەهەر هۆکارێك هەڵوەشابێتەوە وەك ناهاوکوفیی (**عدم الكفاءة**) وە کەمتر بوونی مارەیی لە هاووێنەی خۆی (**مهر المثل**) وە هەڵگەڕانەوەی یەکێکیان لە ئیسلام....

٥- دەبێ لەکاتی حەیزدا نەبێ و لەپاکییەکیشدا نەبێ، کە چوویبێتەلای (**أن لا**

---

(١) مجموع الفتاوي، ج٣، ص٨٠، وە : المسائل الفقهية من اختيارات شيخ الاسلام ابن تيمية، ص١٧-١٨.

**تكون في حيض أو في طُهْرٍ جامعها فيه)** ئەوە لەسەر ڕای ئەوانەی کە دەڵێن، تەلاقی بیدعەتتی ناکەوێ، کە دواتر بە درێژیی لەبارەیەوە دەدوێین.

## ٣- ڕێژگە (الصّيغة):

پایەی سێ یەمی تەلاقدان بریتیە لەو بێژەو وشانە، کە بەکاردەهێنرێن بۆ دەربڕینی بڕیاری دەستبەرداری بوونی مێرد بۆ ژن، یان ئەو ئاماژانەی کە شوێنیان دەگرنەوە، بۆ کەسێك کە توانای دوان و نووسینی نیە .

شایانی باسیشە، کە زانایان لەبارەی ئەو بێژەو وشەو ئاماژانەوە کە بۆ تەلاقدان بەکاردەهێنرێن، ڕاجیاییان هەیەو، هەیانە جگە لەوشەی **(طلاق)** پێی وایە بەهیچ بێژەو وشەیەکی دیکە تەلاق دان ئەنجام نادرێ[1] ،کەچی هەندێکی دیکەیان ڕایان وایە، کە مێرد مادام نیەتی وابێ، دەگونجێ وشەو ڕستەیەك بەکاربێنێ، کە هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بەتەلاقەوە نەبێ، بۆ وێنە: کە بە هاوسەرەکەی بڵێ : ئاوم بدەیە[2] . هەروەها هەندێکیان ڕایان وایە کە هەرکەسێك لە پیاوانی هاوسەردار لە دڵی خۆیدا ژنەکەی خۆی تەلاق دا، ئەوە تەلاقی دەکەوێ، هەرچەندە بەزاریش گۆ**(تَلَفُّظ)** ی پێ نەکردبێ[3] .

هیچ گومانیش لەوەدانیە، کە ئەم ڕاو بۆچوونانە، هەڵبەزو دابەزو تێپەڕاندن و بەزایە دانیان تێدایەو، پێم وایە ڕای ڕاست و میانە لەو بارەیەوە ئەوەیە، کە بگوترێ:

---

(١) ئەمە ڕای جەعفەرییەکانە، بڕوانە : (الخلاف في الفقه) للطوسي، ج٢، ص٢٣١..

(٢) ئەمەش ڕای مالیکیی و شافیعییەکانە، بڕوانە،، المنتقى شرح الموطأ) ج٤، ص١٦، وە : (المهذب) للشيرازي، ج٢، ص٨٢.

(٣) بڕوانە : (أحكام الزواج و الطلاق في الفقه الاسلامي) د. مصطفى الزلمي، ص١٦٨.

ئەوەی تەلاقی پێ دەکەوێ و، پرۆسەی تەلاقدانی مێرد بۆ ژنی پێ ئەنجام دەدرێ، بریتیە لەهەر دەربڕینێك بەم قسەو نووسین، کە بەگوێرەی باو (عرف) ی نێو خەڵك بە ڕوون و ڕاشکاویی ئەوە بگەیەنێ، کە ئەو پیاوە بڕیاری پچڕاندنی پەیوەندی ژیانی هاوسەریی لەگەڵ ژنەکەیداوە و بڕاندویەتیەوە .

دیارە کەسێکیش توانای قسەکردن و نووسینی نەبێ، ئاماژەو (إشارة) یەکی ڕوون و ڕاشکاو جێگای دوان و نووسینی بۆ دەگرێتەوە .

شایانی باسیشە کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان، ئەگەر نەڵێین هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە وشەی (طلاق) و سەرجەم ئەو وشانەی لێی دەتاشرێن بۆ وێنە : **(أنت طالق)** و **(قد طلقتك)** و **(الطلاق له لازم)** و **(أنت مُطلَّقة)** ... بە وشەو دەربڕینی ڕاشکاو (صريح) دادەنرێن لە تەلاقداندا، بەلام وشەکانی دیکەی وەك : (فراق) و (سَراح) و (إلحقي بأهلك) و (أمرك بيدك) بە کنارە **(كناية)** دادەنرێن.

ئنجا (شافعي)، وە (مالك) لە ڕیوایەتێکی دا ڕایان وایە، کە وشە ڕاشکاوەکانی تەلاقدان سێن : **(الطلاق)** و **(الفراق)** و (السراح)، کە هەرسێکیشیان لە قورئان دا هاتوون [1] .

١- ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ ﴾ البقرة: ٢٢٩

٢- ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ ﴾ النساء: ١٣٠,

٣- ﴿ فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴾ الأحزاب: ٢٨.

وە ظاهيرييەکان ڕایان وایە، کە بێجگە لە وشەکانی : **(طلاق)** و (فراق) و (سراح) هیچ وشەیەکی دیکە تەلاقی پێ ناکەوێ [2] .

---

(١) (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج٣، ص٨٩.

(٢) بداية المجتهد ونهاية المقتصد، لإبن رشد، ج٢، ص٧٠..

## جیاوازی نێوان (صریح) و (کنایة)

ڕاشکاو (صریح) ئەوەیە، کە پێویستی بە نیەت ناکات، چونکە مانایەکەی ڕوونەو هەرکات بێژە (لفظ) ەکە گوترا، تەلاقەکە دەکەوێ و، ئەگەر بابای تەلاقدەر دوایی دەعوای ئەوەش بکات کە مەبەستی تەلاقدان نەبووە، لێی ناسەلمێنرێ و تەلاقەکەی بە کەوتوو دادەنرێ، (الخطابي) گوتوویەتی : ئەوە یەکدەنگیی (إجماع) ی زانایانی لەسەرە[1] ، بەلاّم کنارە (کنایة) بە نیەتەوە نەبێ تەلاقی پێ ناکەوێ، بۆیە ئەگەر بابای قسەکەر بە کینایە دەعوای کرد، کە نیەتی تەلاقی نەبووە لە ڕووی دادگاییەوە لێی دەسەلمێنرێ و تەلاقی ناخرێ، دیارە هۆکاری ئەمەش ئەوەیە، کە کینایە زیاتر لە مانایەکی هەیە و، نیەتەکە مانایەکان دیاریی دەکات[2] .

شایانی باسیشە کە زانایان هەرکام لەم وشەو تەعبیرانەیان بە کینایە داناون : (أنتِ بائن) تۆ جیابووەوەی (أمرك بيدك) کاری خۆت بەدەست خۆتە، (إلحقي بأهلك) بچۆوە لای کەس و کارت، (أنتِ عليَّ حرام) تۆ لە من قەدەغەی، (أنتِ بريَّة) تۆ لەمن دووری ...[3] .

کەواتە :

١- تەلاقدان بۆ کەسێك توانای قسەکردنی هەبێ، دەگونجێ بە وشەی ڕاشکاو (صریح)، یان کنارە (کنایة) بێ، مادام نیەتی هەبێ.

٢- هەروەها دەگونجێ بەنووسین بێ، بەلاّم دەبێ نووسین (کتابة) ەکە ڕوون و

---

(١) مغني المحتاج، ج٤، ص٤٥٦.

(٢) المهذب للشيرازي، ج٣، ص١٠.

(٣) الجامع لأحكام القرآن، للقرطبي، ج٣، ص٨٨.

ڕاشکاو بێ و، ناوی ژنەکەی تێدا بێنێ .

٣- وە بۆ بابای لاڵ (أخرس) تەلاقدان بە ئاماژە (إشارة) دەبێ، بەمەرجێك ئاماژەکە فامکراو (مفهوم) و ڕۆشن بێ .

٤- هەروەها تەلاقدان بەناردنی نوێنەرو ئاگادارکردنەوەی ژنە ئامادەنەبووەکەو ئیمزاکردنی لەجیاتی تەلاقدەر (مُطَلِّق) دەبێ[1].

## ٤- شایەد گرتن (الإشهاد):

وەك پێشتر لەبەشی چوارەمدا باسمان کردوە بەشوودانی ئافرەت (نكاح المرأة) بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان ، بەبێ شایەدی دووشایەد پێك نایەت و درووست نابێت، وە زانایان چەند دەقێکی سوننەت بۆ ئەو بەڵگە دێننەوە بۆ نموونە :

١- (لا نِكاح الاّ بِولّي وشاهِدَين) رواه ابن حبان والدار قطني والبيهقي وصححه الألباني .

٢- (لا نكاح الاّ بشاهدي عَدْلٍ ووليّ مُرشدٍ) سنده صحيح عن ابن عباس موقوفاً عليه، كما قال الشيخ ناصر الدين الألباني.

بەلاَم لەوبارەوە کە ئایە بۆ تەلاقدانی ژنیش، شایەدیی دان بەمەرج گیراوە، یان نا؟ زۆربەی زانایان پێیان وایە ، کە تەلاق بەبێ شایەدیش دەکەوێ و ، تەلاقدانی مێرد بۆ ژنەکەی، یەکی لەسەر شایەدی دانی دوو شایەد نەکەوتووە و تەلاقدان مافی مێردە .

هەندێکیشیان کە (علي وعمران بن الحصين) خوا لێیان ڕازی بێ لە هاوەڵاَن و (محمد الباقر وجعفر الصادق و عطاء وابن جريج وابن سيرين) لە شوێنکەوتوان (تابعين) و ظاهيرييەکانیان لەنێودان ڕایان وایە کە وەك چۆن شایەد گرتن بۆ مارە

(١) فقه الأسرة المسلمة، ص٢٩٨-٢٩٩..

کـردن پێویسـتە، بەهـەمان شـێوە بـۆ تەڵاقـدانیش پێویسـتە [١] .منـیش پـاش سـەرنجدانی مەسـەلەکەو تێوەرامـانی بەڵگـەکانی هـەردووك لا، گەیشـتمە ئـەو قەناعەتە، کە ڕای دووەم ڕاستترو بەڵگە دارترە، بەم بەڵگانەی خوارێ:

**بەڵگــەی یەکــەم** : ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ﴾ الطلاق: ٢، واتە: ئنجا هەر کـات ژنـانی یەك جار، یان دووجار تەڵاقدراو گەیشتنە (نیزیك) کاتی دیاریکراویان (واتە بەسەرچوونی ماوەی عیددە) ئەوە یان بە شێوەیەکی پەسند دەستیان پێوە بگرن و بیانهێڵنەوە، یـان بەشـێوەیەکی پەسند دەسـتیان لێبـەردەن، وە دوو شایەدی خاوەن دادگـەریش لـەخۆتان بەشـایەد بگـرن، وە بـۆ خـوا شـایەدیی بدەن، ئا ئەوەتان ئامۆژگاریی هەرکەسێکی بڕوادار بە خـواو ڕۆژیـی دوایـی، پێدەکرێ..

**(إبن حزم الظاهري)** لەبارەی چۆنیەتی دەلالەتی ئەم ئایەتـەوە بـۆ پێویسـت بوونی شایەد گرتن لەسـەر تەڵاقـدان گوتوویـەتی: **(قـرَن الله عـز وجـل بـين المراجعة والطلاق والإشهاد فلايجوز إفراد بعض : ذلك عن بعض، وكـان كل مَنْ طَلّق ولم يُشهِدْ ذوي عَدْلٍ، أو يُراجِعْ ولم يُشهِدْ ذوي عَدْلٍ، متعدياً لحدود الله تعالى، وقال (صلى الله عليه وسلم): (مـن عَمِـل عَمَـلاً لـيس عليـه أمرنا فَهوَ رَدٌ)** [٢] . واتە: خوای زاڵ و شکۆدار هەرکام لە گێڕانـەوەی مێـرد بۆ ژنی تەڵاقدراو و تەڵاق و شایەد گرتنـی پێکـەوە هێنـاون، بۆیـە نـاگونجێ

---

(١) المجلة العلمية للمجلس الأوروبي للإفتاء والبحوث، العددان الثامن والتاسع، ص١٦٦..
(٢) المحلىّ لإبن حزم، ج١٠.

هەنـدێکیان لـە هەنـدێکیان دابـڕین، بۆیـە هەرکەسـێك تـەلاٌق بـدات و دوو کەسی خاوەن دادگەریی بەشایەد نەگریّ، یـان هەرکەسـێك ژنـی تەلاٌقـدراوی بگێڕێتـەوەو دوو شـایەدی خـاوەن دادگـەریی نـەگریّ، ئـەوە بەزێنـەری سنوورەکانی خوای بەرزە، وە پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویـەتی : هەرکەس کارێـك بکـات فـەرمانی ئێمـەی لەسـەر نـەبیّ، ئـەوە کارەکـەی ڕەتکراوەیە .

کەواتە: تەلاٌقدانێك شایەدی لەسەر نەگیرابن، درووست نیـەو ئـەو تەلاٌقـەش ناکەویّ .

ئنجا هەڵبەتە زانایانی شەرعزانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کـە لـە زاراوەی شەرعدا فرمان (أمر) بۆ پێویستبوون (وجوب) ە، بەبیّ بەڵگەیەکی ڕوونـی ناچارکەر بۆمان نیە بڵێین مەبەسـت پێـی پەسـەند (منـدوب) بوونـە، وە لـە ئایەتەکەشدا هـەرکام لـە تەلاٌقـدان و گێڕانـەوە (الطـلاق والرجعـة) لـەبواری شایەد لەسەر گیران دا، پێکەوە باس کراون .

بگرە نەك هەرئەوەندە، بەڵکو خوای کاربـەجیّ سـەرەڕای ئـەوەی کـە پێشـیّ بەشێوەی فەرمان فەرموویـەتی : ﴿ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴾ دواییـش بـەدوو شـێوەی دیکـە جـەختی لەسـەر پێویسـت بـوونی ئـەو شـایەد گرتنـە کردۆتەوە :

أ- کە فەرموویەتی : ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَـٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ﴾ وەبۆ خوا شایەدیی بدەن.

ب- کـە فەرموویـەتی: ﴿ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ ﴾ئـا ئـەوەتان ئامۆژگـاریی کەسـێکی پـیّ دەکـریّ، کـە ئیمـانی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە .

جا نازانم چۆن دەگونجێ مەسەلەیەك خوای کاربەجێ ئاوا بەجەخت لەسەر کردنەوە فەرمانی پێ بکات و ڕای بگەیەنێ، کە ئەوە ئامۆژگاری خوایە بۆ هەر بڕواداریێك بە خواو ڕۆژی دوایی چۆن دەگونجێ هەر لەخۆوە بڵێین، ئەوە هەر شتێکی پەسەندەو فەرزنیە ؟!

**بەڵگەی دووەم:** (عن عمران بن الحصين رضي الله عنهُ أنهَّ سُئِلَ عن الرجل يُطَلِّق المرأة ثم يَقَعْ بها ولم يُشْهِدْ على طلاقها ولا على رَجْعَتِها ؟ فقال : طَلَّقت لغير سنة ورجَعْتَ لغير سنةٍ، أَشْهِدْ على طلاقها وعلى رَجْعَتِها ولا تَعُدْ) رواه أبو داود وابن ماجه والبيهقي .

واته : پرسیار لە عیمرانی کوڕی حوصەین کرا لە بارەی پیاوێکەوە، کە ژنەکەی تەڵاق دەدا، پاشان بێ ئەوەی شایەد لەسەر تەڵاقدانی وە گێڕانەوەی بگرێ، لەگەڵی جووت دەبێ ؟ ئەویش بە کابرای گوت : بەپێچەوانەی سوننەت تەڵاقت داوەو بەپێچەوانەی سوننەتیشەوە گێڕاوتەتەوە، شایەد لەسەر تەڵاقدانی و لەسەر گێڕانەوەی بگرەو، جارێکی دیکەش کاری وامەکە.

**بەڵگەی سێیەم:** (إبن كثير) گوتوویەتی:

(قال ابن جُريج : كان عطاء يقول: ﴿وَأَشْهِدُوا۟ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ قال: لايجوز في نكاح ولا طلاق ولا رجاع الا شاهدا عَدْلٍ، كما قال الله عز وجل الاّ أن يكون من عُذْرٍ) [1] . واتە: ئیبن و جورەیج گوتوویەتی : عطاء دەیگوت : ((وە دووکەسی خاوەن دادگەریی بەشایەد بگرن)) دەیگووت: لەمارەکردن و تەڵاقدان و گێڕانەوەدا درووست نییە، مەگەر دوو شایەدی

---

(١) بڕوانە : (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص١٤١٤، ١٤١٥.





دادگەر هەبن، وەك خوای زاڵ و پایەبەرز فەرموویەتی، ئەگەر رێگرێك هەبێ.

هەروەها(**السيوطي**) لە (**الدرُّ المنثور**) ەکەی خۆیدا هێناویەتی :

(عن عبدالرزاق وعبدالله بن حميد عن عطاء قال: (**النكاح بالشهود والطلاق بالشهود، والرجعة بالشهود**) [1] .

واتە : مارەکردن بە شایەدانەوەیە و، تەلاقدان بە شایەدانەوەیەو، گێڕانەوە بە شایەدانەوەیە .

شایانی باسە ژمارەیەك لە زانایانی هاوچەرخیش ئەم رایەیان هەیە بۆ نموونە : (**أحمد شاكر**) و (**أبو زهرة**) و (**محمد الغزالي**).

کەواتە:

پایەی چوارەمی پرۆسەی تەلاقدان بریتییە لە شایەد لەسەرگرتن (**الإشهاد**)، ئاشکراشە کە ئەم پایەیە رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە کەمکردنەوەی رێژەی تەلاقدا، بەتایبەت تەلاقدانی هەڵچوانەو عاتفییانە کە پەشێمانیی زۆری لەدوا دەبێ .

لێرەشدا کۆتایی بە خاڵی چوارەم دێنین و
دەچینە سەر توێژینەوەی بابەتی جۆرەکانی
تەلاقدان ، لە خاڵی پێنجەمدا،کەزۆرترین
پانتایی ئەم تەوەرەی داگرتوە.

---

(١) بڕوانە : (الدر المنثور...) ج، وە (المجلة العلمية ..) العدوان الثامن والتاسع، ص١٦٨.

## ٥- جۆرەکانی تەڵاقدان (أنواع الطلاق) :

**خوێنەری بەڕێز !**

تەڵاقدان بەگشتی نۆ جۆری هەیە کە ئەمانەن:

١- لە ڕووی سیفەتیەوە :

أ- تەڵاقدانی سونნەتیی

ب- تەڵاقدانی بیدعەتیی .

٢- لە ڕووی صیغەکەیەوە:

أ- تەڵاقدانی ڕاشکاو.

ب- تەڵاقدانی کینایە .

٣- لەڕووی شوێنەواریەوە :

أ- تەڵاقدانی گێڕراوە (رجعي)

ب- تەڵاقدانی جیابووەوە (بائن).

٤- لەڕووی کاتی پەیدابوونی شوێنەواریەوە :

أ- تەڵاقدانی دەستبەجێ (مُنجَّز)

ب- تەڵاقدانی هەڵواسراو (معلّق).

٥- سوێند خواردن بە تەڵاق (الحلف بالطلاق).

ئێستاش بەپێی دەرفەت بۆلـوان تیشـك دەخەینـە سـەر هـەر کـام لـەو نۆجـۆرە تەڵاقدانانە، لەژێر ناونیشانی پێنج سەرباس دا:

## ١- تەلاَق دان لەڕووی سیفەتیەوە :

تەلاَق دان لە ڕووی سیفەتی و بەپێی شەرع بوون و بەپێی شەرع نەبوونەوە، دووجۆرە:

یەکەم: تەلاَقدانی سوننەتیی (الطلاق السُنّي).

دووەم: تەلاَقدانی بیدعەتیی (الطلاق البدعي).

ئاشکراشە کە مەبەست لە تەلاَقدانی سوننەتیی ئەوەیە، کە بەگوێرەی شەریعەتی خواو ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێ و، مەبەستیش لە هی بیدعەتی ئەوەیە، کە بەگوێرەی شەریعەت و ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەبێ.

## پێناسەی تەلاَقدانی سوننەتیی :

بریتیە لەوەی کە مێرد یەك دانە تەلاَقی ژنەکەی خۆی بدات، لە پاکییەکدا، کە نەچووبێتەلای (في طُهْرٍ لَمْ يجامعها فيه) پاشان ڕاوەستێ، هەتا عیددەی بەسەر دەچێ، ئەوکاتە ژنەکەی بەو دانە تەلاَقە لێی جیادەبێتەوە، بەجیابوونەوەی گچکە (بَينونة صغرى)، بەمەرجێك یەکەمین یان دووەمین تەلاَق بێت، نەك سێیەمین .

دیارە تێکڕای زانایان لەسەر کەوتنی ئەم جۆرە تەلاَقە یەکدەنگن، وەلەسەر ئەوەش کە ئەم جۆرە تەلاَقدانە، تاکە تەلاَقدانی ڕەواو شەرعییە، یەکدەنگن[1] .

(١) (المفصل...) ج٧، ص٤١٤-٤١٥، وە : (المجلة العلمية...) العددان الثامن والتاسع، ص١٧٢-١٧٣.

## پێناسەی تەلاقدانی بیدعەتیی :

بریتیە لەوەی کە مێرد تەلاقێك، یان زیاتر بدات لە پاکییەکدا، کە چووبێتەلای (في طُهْرٍ جامعها فيه)، یان لەکاتی حەیزو زەیستانیی دا .

دیارە تێکڕای، یان زۆربەی هەرە زۆری زانایانیش لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون، کە ئەم جۆرە تەلاقدانە حەرامەو خاوەنەکەی گوناهبارە ، بەلاَم لەبارەی کەوتن و نەکەوتنی تەلاقەکەیەوە، ڕاجیایی و مشت و مڕی زۆر لەنێوان زانایاندا هەیە[1] .

کەواتە:

تەلاقدانی سوننەتیی و ڕەواو بێ گرێ و گۆڵ ئەوەیە کە :

أ- مێرد یەك تەلاقی ژنەکەی بدات، نەك زیاتر، ئەوە لەڕووی ژمارەی تەلاقەوە.

ب- مێرد لەکاتی پاکییەکدا ژنەکەی تەلاق بدات کەلەگەڵی جووت نەبووبێ، هەروەها لە حەیزدا نەبێ و زەیستان (نفساء) نەبێ.

بەڵگەش لەسەر ئەوە، کە ئەمجۆرە تەلاقدانە، تاکە تەلاقدانی ڕەواو بەگوێرەی سوننەتە، زۆرن، بۆنموونە :

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ﴾ الطلاق: ١، واتە: ئەی پێغەمبەر ! هەرکات ژنانتان تەلاقدان، باوابێ کە یەکسەر پاش تەلاقدان بچنە عیددەیانەوە، وە عیددە بژمێرن، وە پارێز لە خوای پەروەردگارتان بکەن ...

ئنجا وەك پێشتریش باسمان کردوە، ئەو جۆرە تەلاقدانە، تەنیا کاتێك

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.



دەبــێ، کــە ژنەکــە لــە حــەیزدا نــەبێ، هــەروەها زەیســـتان نــەبێ، وە لەپاکیەکیشدا نەبێ، کە مێردەکەی چوویێتە لای، بەڵکو لەپاکییەکدا بــێ، کە مێردەکەی لەگەڵی جووت نەبووبێ .

٢- عن ابن عمر رضي الله عنهما قال : طلَّقتُ امرأتـي وهـي حـائض، فـذكر ذلك عمر للنبي صلى الله عليه وسلم فتغيَّظ رسـول الله صلى الله عليه وسلم ثـم قـال : مُـرهُ فَلْيُراجِعْهـا حتـى تحـيض حيضـةً أُخـرى مُسْـتَقبلَةً سـوى حيضتها التي طلَّقها فيها، فأن بدا لَـهُ أن يُطلقهـا، فَلْيُطَلِّقهـا طـاهِراً مـن حَيْضَتِها قَبل أن يمُسَّها فذلك الطلاق للعِدة كما أمرَ الله) رواه البخاري : ٥٣٣٣، ومسلم : ١٤٧١، واللفظ له.

واتە: عەبدوڵلای کـوڕی عومـەر خـوا لێیـان ڕازی بـێ دەڵـێ : ژنەکـەم کـە لەحەیزدابوو تەڵاقم دا، عومەریش ئەوەی بۆ پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) باسـکرد، پێغەمبــەری خــواش (صــلى الله عليــه وسـلم) تــووڕە بــوو، پاشــان فەرمووی : پێی بڵێ، با بگەڕێتەوە لای، هەتا دەکەوێتە حـەیزێکی دیکـەی داهاتووی جیاواز لەوەی، کە تێیـدا تـەڵاقی داوە، ئنجـا ئەگـەر ڕای وابـوو تەڵاقی بدا بـا پـاش پاکبوونـەوەی لـە حەیزەکـەی و بـەر لـەوەی بچـێتە لای تـەڵاقی بـدات، ئـەوە ئـەو تەڵاقدانـەی پـێش عیددەیـە وەك خـوا فـەرمانی کردوە.

٣- (عن ابن عباس في قوله تعالى ﴿ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ قال: لا يُطلِّقها وهي حائضٌ، ولا في طُهر قد جامعها فيه، ولكن يتركها حتى اذا حاضت وطهرت طلَّقها تطليقةً)[١] .

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص١٤١٣.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەباس لەبارەی فەرموودەی خوای بەرز ((ئنجا پێش کاتی عیددەیان تەڵاقیان بدەن)) گوتوویەتی: لەکاتێکدا کە لەحەیزدایە تەڵاقی نادات، هەروەها لە پاکیەکدا کە چۆتە لای، بەڵکو لێی دەگەڕێ هەتا دەکەوێتە حەیزەوەو پاك دەبێتەوە، جا ئەو کاتە یەك تەڵاقی دەدات.

وە بەپێچەوانەشەوە، تەڵاقدانی ناشەرعیی و پێچەوانەی سوننەت ئەوەیە، کە مێرد ژنەکەی لەکاتی حەیزدا، یان لەکاتی پاکییەکدا، کە لەگەڵی جووت بووە تەڵاق بدات، یان زیاتر لە تەڵاقێکی بدات، هەرچەندە لەکاتی حەیز و لەکاتی پاکیەکی جیماع تێداکراویش نەبێ .

شایانی باسیشە کە هەندێك لە زانایان، کە شافعییەکانیان لەنێودان، ڕایان وایە کە دوو یان سێ تەڵاقدانی مێرد بۆ ژنەکەی، لە پاکییەکدا کە نەچووبێتەلای، ناشەرعیی و بیدعەتیی نیە[1] ، بەلآم بێگومان ڕای زۆرینەی زانایان ڕاست و تەواوە وەك دواتر باسی دەکەین .

بەنسبەت حاڵەتی زەیستانیی (نفاس) یشەوە، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە لەڕووی حەرام بوونی ژن تێدا تەڵاق دانەوە، کت و مت وەك حەیز وایە (ابن حزم الظاهري) لەو بارەوە گوتوویەتی :

**(وطلاق النفساء كالطلاق في الحيض، وبرهان ذلك أنه ليس الاّ حيض أو طهر، وقد ذكرنا عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أنهُ نهى عن الطلاق في الحيض وأمر بالطلاق في طهر لم يُجامِعْها فيه أو حاملاً، ولا خلاف في أنَّ**

---

(١) الطلاق وأحكامه، الشيخ حسين حلاوة، المجلة العلمية، العددان الثامن والتاسع، ص١٧٤.

دَمَ النفاس ليس طُهراً ولا هو حَمْلٌ فلم يبق الا الحيض، فهو حيض بل لا خلاف في أنَّ له حكم الحيض من ترك الصلاة والصوم والوطء)[(١)] .

واتە: وە تەلاّقدانی زەیستان وەك تەلاّقدانی كاتی حەیزە، بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە، كە تەنیا دوو حاڵەت هەن: كەوتنە حەیز، یان پاكیی، ئنجا لە پێغەمبەری خواشەوە (صلی الله علیه وسلم) باسمان كرد كە ڕێگریی لە تەلاّقدان لەكاتی حەیزدا كردوە، وە فەرمانی كردووە بە تەلاّقدان لەكاتی پاكییەكدا، كە جیماعی لەگەڵ نەكردبێ، یان دووگیان بێ، هیچ مشت و مڕیش لەوبارەوە نییە، كە خوێنی زەیستانیی پاكیی نییەو دووگیان بوونیش نیە، كەواتە بەس حەیز مایەوەو حەیزە، بگرە كێشەش لەوەدا نیە كە زەیستانیی حوكمی حەیزی هەیە، لەنوێژ نەكردن و ڕۆژوو نەگرتن و سەرجێی نەكردن دا.

## حیكمەتی حەرامبوونی تەلاّقدانی بیدعەتیی

### أ- تەلاّقدان لەكاتی حەیزدا:

دوو حیكمەتی تێدان، كە شەریعەت لەو كاتە تەلاّقی قەدەغە كردوە :

یەك: تاكو عیددەی ژنی تەلاّقدراو درێژ نەبێتەوەو تووشی زیان نەبێ .

دوو: تاكو دڵنیایی پەیدابێ كە پاڵنەری تەلاّقدانەكە، پێویستییەكی پیاوەكەیە، نەك هەڵچوونێكی كاتیی، چونكە ئاشكرایە مێرد لەكاتی حەیزدا مەیلی بەلای ژنەكەیدا نیەو جیماع لەگەڵ كرانی قەدەغەیە، بۆیە كاتی تەلاّقدانەكەی، كراوە بەكاتی پاكبوونەوەی و پێش جیماع لەگەڵ كردنی.!

(١) المحلىٌ لابن حزم، ج١٠، ص١٧٦.

## ب- تەڵاقدان لەکاتی پاکییەکدا کە چوونەلای :

ئەمیش دوو حیکمەتی تێدان :

یەك: تاکو دڵنیایی هەبێ لەوە، کە ژنەکە دووگیان (حامل) نیە.

دوو: مێرد لەکاتی پاکییدا ژنەکەی تەڵاق نادات، مەگەر زۆر بێزارو ناچار بێ .

## جـ- خستنی زیاتر لە تەڵاقێك :

حیکمەتی ئەمیش ئاشکرایە و بریتیە لە هەبوونی هەل و دەرفەت لەبەردەم ژن و مێرد کە لەپاش فەشەلێکی کاتیی و ئەزموونێکی تاڵ، بتوانن سەرلەنوێ ژیانی هاوسەریان دەست پێ بکەنەوە، بەڵام ئەگەر هەرسێك تەڵاقەکە پێکەوە بخرێن، هیچ دەرفەتی گەڕانەوە و پەشێمانیی نامێنێ .

### * حوکمی تەڵاقدانی سوننەتیی *

سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەو جۆرە تەڵاقدانە تەڵاقی ژنی پێدەکەوێ، مادام ئەو مەرجانەی تێدا هاتبنە دی، کە لەهەرکام لە مێردو ژن و صیغەی تەڵاقدانەکەدا بەمەرج گیراون [1]، کە پێشتریش قسەمان لەبارەیانەوە کرد.

### * حوکمی تەڵاقدانی بیدعەتیی *

تێکڕای زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە تەڵاقدانی بیدعەتیی حەرامەو خاوەنەکەی گوناهبارە، چونکە کارێکی کردوە، کە پێچەوانەی حوکم و ڕێنمایی شەریعەتە، بەڵگەش لەسەر قەدەغە بوونی ئەو جۆرە تەڵاقدانە، ئەو بەڵگانەن کە

---

(١) الطلاق وأحكامه، الشيخ حسين حلاوة، ص١٧٣.

پێشتر خستمانە ڕوو، بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە تاکە جۆری تەلاقدانی ڕەوا و شەرعیی بەگوێرەی سوننەت ئەوەیە، کە :

- مێرد یەك دانە تەلاقی ژنەکەی بدات نەك زیاتر .
- لەکاتی حەیزدا نەبێ و زەیستان نەبێ.
- لەکاتی پاکییەکدا نەبێ، کە چوویێتە لای .

کەواتە: بەپێی هەمان ئەو بەڵگانە، هەر تەلاقدانێك پێچەوانەی ئەو جۆرە تەلاقدانە بێ، کە تاکە شێوازی ڕاست و شەرعیی ژن تەلاقدانە، قەدەغەو ناشەرعییە، هەروەها ئەم مەسەلەیە یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء) شی لەسەرە[1] .

بەڵام لەو بارەوە، کە ئایا تەلاقدانی نا شەرعیی و بیدعەتیی جێ بەجێ دەبێ و تەلاقی پێ دەکەوێ، یان نا؟ مشت و مڕو ڕا جیایی زۆر لەنێوان زانایان دا هەیە، بەڵام بەر لەوەی بێینە سەر خستنە ڕووی ڕاجیایی زانایان لەو بارەوە، ئاماژە بە مەسەلەیەکی دیکە دەکەین، ئەویش ئەوەیە، کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان، یان هەموویان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون، کە:

یەك: سێ جۆرە ئافرەت لەو حوکمە گشتی یە، هەڵاوێراون ،کە حەرام بێ لەکاتی حەیزدا تەلاق بدرێن، کە ئەمانەن:

أ- ئافرەتی نەگوازراوە (غیر مدخول بها) ئەویش هۆیەکەی ئەوەیە، کە عیددەی لەسەر نیە، چونکە حیکمەتی عیددە زانینی هەبوون و نەبوونی کۆرپە (حَمْل)یە، خوا عز وجل لەبارەی پێویست نەبوونی عیددە لەسەر ئافرەتی نەگوازراوە، فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ

---

(١) المغني لأبن قدامة الحنبلي، ج١٠، ص٣٢٤، وة : شرح صحيح مسلم، للنووي، ج٩، ص٦٤..

ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٤٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٤٩ .

ب- ئافرەتێك كە ئیلائی لێكراوە و مێردەكەی بەر لە تێپەڕبوونی چوار مانگ نەگەڕاوەتەوە لای، وە دادوەر پێی تەڵاقداوە، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٢٦﴾ ﴾ البقرة: ٢٢٦ .

جـ- وە ئافرەتێك كە مێردەكەی لەخۆی دادەڕنێ (المرأة المخالعة).

حیكمەتی ئەو سێ حاڵەتەش ئاشكرایە:

هەرچی ئافرەتی نەگوازراوەیە، چونكە عیددەی لەسەر نیە لە حەیزدابێ یان لەپاكییدا بێ، هیچ لەمەسەلەكە ناگۆڕێ .

وە ئافرەتی ئـیـلاء لێكراو و ئافرەتی مێرد لەخۆدارنیش، چونكە چ لەحەیزدابن چ لەپاكییدا، تووشی زیان نابن، چونكە دەیانەوێ لەداوی مێردەكانیان دەربازبن[1] .

دوو: هەروەها سێ جۆرە ئافرەتیش لەو حوكمە هەڵاوێراون، كە حەرام بێ لە پاكییەكدا كە جیماعیان لەگەڵ كراوە تەڵاق بدرێن، كە بریتین لە :

أ- ژنی دووگیان(حامل) مادام سكەكەی ئاشكرابێ و دیاربێ .

ب- ئافرەتی گچكەی نابالغ كە ناكەوێتە حەیزەوە ، منیش دەڵێم : بەڵام بێگومان هاوسەرگیرییش[2] لەگەڵ كچی نابالغدا دروست نیە ! بەڵام

(١) (المفصل...) ج٧، ص٤١٧-٤١٩.

(٢) هاوسەرگیریی مەبەستم پێی گوێزرانەوەیەتی، نەك مارە كردنی، كە بێگومان دروستە، وەك پێشتر باسمان كردوە.

بەهەر حاڵ ،ئەگەر هاوسەرگیریی لەگەڵ کراو تەڵاق درا، ئەوە حوکمەکەیەتی .

جـ- ئافرەتی بەتەمەنی لەحەیز چۆوە، کە لەزارەوەی شەرعدا ناثومێد بوو (الآيسة) ی پێدەڵێن[1] .

**• حوکمی تەڵاقدانی بیدعەتیی لە ڕووی کەوتن و نەکەوتنی تەڵاقەوە•**

لەسۆنگەی ئەوەوە کە تەڵاقدانی بیدعەتیی (الطلاق البِدْعي) بەگشتی دوو جۆرە:

**جۆری یەکەم** : کە مێرد ژنەکەی خۆی لەکاتی حەیز، یان پاکییەکدا، کە جیماعی تێدا کردوە تەڵاق بدات .

**جۆری دووەم**: کە مێرد ژنەکەی خۆی لە پاکییەکدا کە جیماعی تێدا نەکردوە بەدوو، یان سێ تەڵاق، تەڵاق بدات.

بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە، ئێمەش لە دوو برگەدا باسی ڕا جیایی زانایان دەکەین لەبارەی کەوتن و نەکەوتنی تەڵاقێکەوە، کە بەشێوەی تەڵاقدانی بیدعەتیی دەدرێ .

سەرەتاش دەڵێم : ئەم مەسەلەیە لە کۆن و تازەدا مشت و مڕی زۆری لەبارەوە کراوەو دەکرێ، منیش بەپێویستی نازانم بچمە نێو سەرجەم وردەکارییەکانی ئەم مەسەلەیە، بەڵام پاش ئاماژە کردن بەبەڵگەی زانایان هەر ڕایەکیان هەبێ، ئەو ڕایەی کە پێم ڕاستترەو بەرژەوەندیی خێزان و کۆمەڵگای زیاتر تێدا بەدی دەکەم دەخەمە ڕوو و، بەڵگەکانیش لەقەدەر حاڵ باس دەکەم :

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٤٣٥.

## بڕگەی یەکەم : حوکمی کەوتن و نەکەوتنی تەڵاق لەکاتی حەیز، یان پاکییەکی جیماع تێدا کراودا:

لەوبارەوە زانایان بەگشتی بوونە دوو بەشەوە :

زۆربەی شەرعزانان کە حەنەفییەکان و مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و زەیدییەکانیان لەنێودان، دەڵێن : لەهەردووک حاڵەتدا تەڵاق دەکەوێ هەرچەندە بابای تەڵاقدەر، بەو جۆرە تەڵاقدانە گوناهباریشە (إبن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (فإن طلَّقها للبدعة وهو أن يُطلّقها حائضاً أو في طهرٍ أصابها فيه، أثِمَ ووَقَعَ طَلاقَهُ في قول عامة أهل العلم) [1] .

واتە: جا ئەگەر بەشێوەی بیدعەت تەڵاقی دا، کە بریتیە لەوەی لە حەیزدابێ و تەڵاقی بدات ،یان لە پاکییەکدا بێ، کە چوویێتەلای، ئەوە گوناهبار دەبێ و تەڵاقەکەشی دەکەوێ بەڕای زانایان بە گشتی.

هەندێکیش لە زانایان، کە وێڕای (الباقر) و (الصادق) و (الناصر) و (طاوس) و (سعيد بن المسيَّب) و (إبن علية) و ظاهرییەکان و جەعفەرییەکان و هەرکام لە (إبن تيمية) و (إبن القيم) و (الصنعاني) و (الشوكاني) و (محمد بن الوزير اليماني) یشیان لەنێودان [2]،ڕایان وایە کە ئەو جۆرە تەڵاقدانە، تەڵاقی پێ ناکەوێ .

### * بەڵگەکانی زۆربەی زانایان*

جا هەرچی زۆربەن چەند شتێك بەبەڵگە دێننەوە، کە ئەمانە بەهێزترینیانن:

---

(١) (المغني...) ج٧، ص٩٩، وە (المفصل...) ج٧، ص٤٢١.

(٢) (المفصل...) ج٧، ص٤٢١–٤٢٢، وە: (الطلاق وأحكامه..) المجلة العلمية، ص١٧٨.

١- دەڵێن خوای کار بەجێ، کاتێ باسی تەڵاقی کردووە، باسی ژنانی تەڵاقدراوی کردوە بەگشتی و، بەبێ جیاوازیی لەنێوان تەڵاقدراو لەکاتی حەیزداو تەڵاقدراو لەکاتی پاکیی جیماع تێداکراوو پاکیی جیماع تێدا نەکراودا باسی کردوە، وەك فەرموویەتی :

﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ ﴾ البقرة: ٢٣٠.

﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ ﴾ البقرة: ٢٢٨.

کەواتە هەموو جۆرە تەڵاقدانەکان، چ سوننەتیی بن، چ بیدعەتیی لەکەوتنی تەڵاقەکان دا، هەر یەك حوکمیان هەیە .

٢- دەڵێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کردوە، کە ژنەکەی بگێڕێتەوە، جا ئەگەر تەڵاقی نەکەوتبایە، پێویستی بە گێڕانەوەی نەدەکرد، وەك لەهەندێك ریوایەتی فەرموودەکەی (إبن عمر) دا هاتوە، کە تەڵاقێکی لەسەر حیساب کراوە[1] .

٣- دەڵێن ئەوە کە تەڵاقدان لەکاتی حەیزداو لەکاتی پاکییەکی جیماع تێداکراودا حەرامە، رێ لەوە ناگرێ، کە بابای تەڵاقدەر دەرەنجامەکەی تەحەمول بکات، بەبەڵگەی ئەوەی، کە (ظهار) هەرچەندە لە قورئاندا بە ﴿ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ ﴾ المجادلة:٢ وەسف کراوە، بەڵام ژنیشی پێ لە پیاوەکەی حەرام دەبێ، هەتا کەفارەت دەدات .

٤- دەڵێن تەڵاقدان لەخوا نزیك بوونەوە (قُربة) نیە، تاکو ئیعتیبار بەوە بکرێ، داخۆ بەگوێرەی سوننەتە؟ تاکو بکەوێ، یان نا؟ تاکو نەکەوێ،

(١) صحيح مسلم : ١٤٧١، (قلت لإبن عمر أفاحتسبتَ بتلك التطليقة ؟ قال: فَمَهْ).

بەڵكو لەكاتی بیدعەت بوونیدا وەك سزادانی خاوەنەكەی، كەوتنی لەپێشترە، لەكاتی بەپێی سوننەت بوونی دا.

## * بەڵگەكانی كەمینە *

ئەمانیش چەند شتێكیان بەبەڵگە هێناوەتەوە، كە ڕەنگە ئەمانە بەهێزترینیان بن:

١- دەڵێن خوا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ الطلاق: ١، بەلاّم ژن تەلاّقدان لەكاتی حەیزو لەكاتی پاكییەكی جیماع تێدا كراودا، تەلاّقدان نیە بەو شێوەیەی، كە خوا فەرمانی پێكردوە، كە بەر لەدەست پێكردنی عیددە بێ، ئنجا وەك زانایانی (أصول الفقه) گوتوویانە: (إنَ الأمر بالشيء نهيٌ عَن ضِدّه) فەرمان كردن بە شتێك، قەدەغەكردنی پێچەوانەكەیەتی .

٢- دەڵێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (مَن عَمِلَ عَمَلاً ليس عليه أمرنا فهو ردٌّ) رواه مسلم عن عائشة رضي الله عنها، واتە : هەر كەسێك كارێك بكات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەوە ڕەدكراوەیە .
دیارە ئەو جۆرە تەلاّقدانەش فەرمانی خواو پێغەمبەرەكەی لەسەر نیە،بۆیە ئیعتیباری پێ ناكرێ و بەهیچ دانانرێ.

٣- دەڵێن : خوا عز وجل فەرموویەتی:﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ البقرة: ٢٢٩، ئنجا بێگومان تەلاّقدانی ژن لە حەیزدا، یان لەپاكییەكدا، كە جیماعی تێدا كراوە، نەك چاك

دەستبەردار بوونی ژن نیە، بگرە خراپە لەگەڵ کردنیەتی، چونکە عیددەکەی درێژ دەبێتەوە .

٤- دەڵێن : (أبو داود و أحمد و النسائي) ئەم فەرموودەیان هێناوە : (إنَّ عبدالله بن عمر طلّق أمرأته وهي حائض : قال عبدالله بن عمر فردّها — أي رسول الله صلى الله عليه وسلم — عَلَيَّ ولم يرها شيئاً، وقال: اذا طَهُرتْ فَلْيُطلّقْ أو يُمْسكْ)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر کە ژنەکەی کە لە حەیزدا بوو تەلاّق دا، عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە لام و ئەو تەلاقەی بەهیچ دانەنا و فەرمووی : هەرکات پاك بۆوە با تەلاقی بدات یان بیهێڵێتەوە . دیارە ئەو دەقەش لەگەڵ قسەکەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر کە لە (صحيح مسلم) دا هاتوە : (وَحَسَبْتُ لَهَا التَّطْلِيقَةَ الَّتِي طَلَّقْتُهَا) رواه مسلم : ١٤٧١، تێك دەگیرێ .

٥- دەڵێن : مادام خوا تەلاّقدانی لەکاتی حەیزو لەکاتی پاکییەکی جیماع تێداکرادا قەدەغەکردوە، دیارە پێی ناخۆشە، کەواتە: خستنی ئەو تەلاّقە پێچەوانەی ئەو ئامانجە شەرعییەیە، هەروەها خستنی ئەو جۆرە تەلاّقە، پێچەوانەی ڕێ لێگرتنی شەرعە، وە ئەگەر بڵێین ئەو تەلاّقە کەوتوە، هیچ مانایەك بۆ ڕێ لێگرتنی شەرع نامێنێتەوە .

٦- دەڵێن: کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە عەبدوڵلای کوڕی عومەر کردوە هاوسەرەکەی بگێڕێتەوە، مەبەست لە گێڕانەوە (رجعة) گێڕانەوەی زمانەوانییە، نەك هی شەرعیی، کە وەك زاراوەیەك دوای ڕۆژگا ری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) داهێنراوە، مانا زمانەوانیەکەشی ئەوەیە کە عەبدوڵلاّ و ژنەکەی بگەڕێنەوە سەر حاڵەتی

پێشوویان، بەر لە تەلاقدانە بیدعەتییەکەی، ئەمەش وەلامی ئەو قسەیانە کە دەڵێ : ئەگەر تەلاقی نەکەوتبایە پێویستی بە گێڕانەوە نەدەکرد[1] .

٧- دەڵێن مەسەلەی **(ظهار)** لەتەلاق جیایە و نابێ قیاس بکرێنە سەر یەکدیی، چونکە **(ظهار)** گوناهێکەو خاوەنەکەی لەسەری سزادەدرێ، بەلام تەلاقدان مادام پاساوی خۆی هەبێ، لەبنەڕەتدا ڕەوایە بەمەرجێك بەشێوازی دیاریکراوی شەرعیی بێ، بەلام **(ظهار)** لەبنەڕەتدا قەدەغەیە!

ئاشکراشە کە ئەو مەسەلەیە بۆیە ڕاجیایی و مشت و مڕی زانایانی تێکەوتووە، چونکە دەقەکانی شەریعەت بەڕوونیی یەکلاییان نەکردۆتەوە، بەلام من ڕای دووەمم پێ باشترە، چونکە بەرژەوەندیی پاراستنی خێزان و لێك هەڵنەوەشانەوەی تێدایە و، دیارە بنچینەیەکی شەرعیشە کە: (اليقين لا يزول بالشك) هەر شتێك لە بوونی دڵنیابین، بە کەوتنە گومان هەڵناوەشێتەوە، مادام گرێ بەستی هاوسەرگیریش بە دڵنایی دامەزرابێ، ناگونجێ بەگومان هەڵبوەشێتەوەو هیچ بەڵگەیەکی دڵنیاکەریش لەسەر ئەوە نیە، کە ئەو جۆرە تەلاقە دەکەوێ، ئەوانەش کە باسی یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء) یان کردوە لەو بارەوە[2].

وا دیارە ئاگاداری ڕای ئەو هەموو زانا بەرجەستەو ناودارانە نەبوون، ئەگەرنا قسەی وایان نەدەکرد، وەك (إبن قيم الجوزية) باسی کردوە[3] .

---

(١) بڕوانە (المفصل...) ج٧، ص٤٢٤-٤٢٥.

(٢) بۆ وێنە (النووي) بڕوانە : (شرح صحيح مسلم) ج١٠، ص٦٠.

(٣) (زاد المعاد...) ج٥، ص٢٣٤.

**بڕگەی دووەم : حوکمی کەوتن و نەکەوتنی زیاتر لە تەڵاقێك لە پاکییەکی جیماع تێدا نەکراودا :**

لەم مەسەلەیەشدا زاناو شەرع زانان، ڕا جیایی و مشت و مڕی زۆریان بووەو هەیە و، بەگشتی چوار ڕایان لەو بارەوە هەن :

ڕای یەکەم : کە هی زۆربەی زۆری زانایانە و لەنێویشیاندا (أبو هریرە و ابن مسعود و ابن عمرو) وە غەیری وانیش لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ و، ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی شوێنکەوتوان و هەرکام لە: (أبو حنیفة و مالك و شافعي و أحمد) خوا لێیان خۆش بێ، هەن، دەڵێ : بابای تەڵاقدەر چەند تەڵاقی ژنەکەی بدات، یەك یان دوو یان سێ، هەرچەندە بە خستنی زیاتر لە تەڵاقێکی ژنەکەی گوناهبارە، بەڵام تەڵاقەکانی هەردەکەون .

ڕای دووەم : کە هی هەندێك لە موعتەزیلەو شیعەکانە، دەڵێ : بەو جۆرە تەڵاقدانە هیچ تەڵاقێك ناکەوێ .

ڕای سێیەم: کەهی کۆمەڵێك لە هاوەڵانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە خوا لێیان ڕازی بێ، هەروەها ڕای (إسحاق بن راهویه)یە، دەڵێ : بەو جۆرە تەڵاقدانە ژنی گوازراوە چەند تەڵاقی درابن دەکەون، بەڵام هی نەگوازراوە (غیر مدخول بها) تەنیا یەك تەڵاقی دەکەوێ .

ڕای چوارەم: کە هی (إبن عباس) و (طاوس) و (عکرمة) و (ابن اسحاق) لە شوێنکەوتوان (داود الظاهري) و (محمد بن علی بن الحسین) و (جعفر بن محمد) و ژمارەیەك لە پەیڕەوانی (أبو حنیفه) و (مالك) و (أحمد بن حنبل)ە، دەڵێ، ئەوجۆرە تەڵاقدانە حەرامە، بەڵام یەك

دانەیان هەر دەکەوێ[1] .

هەڵبەتە هەرکام لە لایەنگرانی ئەو چوار رایە، بەڵگەیان لەسەر ڕاستیی ڕایەکەی خۆیان هێناوەتەوە ون ئێمەش بە کورتیی و گوشراویی ئاماژە بەگرنگترین و بەهێزترین بەڵگەکانی هەر چوار ڕایەکە دەکەین و، پاشان ئەو ڕایەی کە پێمان پەسەندترو ڕاستترە دیاری دەکەین .

**ڕای یەکەم** : کە دەڵێ : بابای تەلاقدەر چەند تەلاقی ژنەکەی بدات هەموویان دەکەون، زۆر بەڵگان دێننەوە، کە بەڕای من ئەمانە گرنگترینیانن :

یەك: خوا فەرموویەتی : ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ ﴾ البقرة: ٢٣٠، ئەم تەلاقەش هەر سێکیان پێکەوە دەگرێتەوە، نەك بەجیا جیا.

دوو: (بخاري) لە (صحيح) ەکەیدا هێناویەتی، کە (عويمر العَجْلاني) لە خزمەت پێغەمبەردا لەگەڵ ژنەکەی، کە تۆمەتباری کردبوو بە زینا (ملاعنة) ی کرد، ئنجا پاش تەواوبونیان، یەکسەر عوەیمر گوتی: (كَذَبْتُ عليها يا رَسُولَ اللّه ! إنّ أمْسكْها، فطَلّقَها ثَلاثاً، قَبْلَ أنْ يَأمرهُ رَسُولُ اللّهِ صلى الله عليه وسلم)، شوێنی بەڵگە هێنانەوەش ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا، نکوولّیی لە خستنی سێ تەلاقەکەی بەجارێك نەکرد .

سێ: مەسەلەی تەلاقدانی (فاطمة بنت قيس) کە مێردەکەی سێ

(١) بڕوانە: (المفصل...) ج٨، ص٦٣-٦٤، وە: (الطلاق وأحكامه) للشيخ حسين حلاوة، المجلة العلمية، العددان : الثامن والتاسع، ص١٨٠-١٨٣.

بەسێ تەلاقی دابوو، جا کاتێك چەند کەسێك لە هاوەڵان کە یەکیان (خالد بن الولید) بوو چوونە لای پێغەمبەرو هەواڵیان دایە کە (إبن جعفر المخزومي) (**فاطمة**)ی هاوسەری سێ بەسێ تەلاق داوە و پرسیان: ئایا بژێوی لەسەر پیاوەکەی ماوە ؟ فەرمووی : (**ليس لها نفقة وعليها العدّة**) واتە: مافی نەفەقەی نیەو عیددەی لەسەرە، شوێنی بەڵگەش ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نکوولیی لە خستنی سێ تەلاق بەیەکجار نەکردوە، ئەم ڕووداوەش (**إبن حزم الأندلسي**) بە سەنەدی خۆی هێناویەتی[1] .

چوار: (أبوداود) لە (سنن) ی خۆیدا هێناویەتی کە (رُکانة بن عبد یزید) ژنەکەی خۆی یەکجاریی تەلاقداوە و، هەواڵی پێغەمبەری داوەو گوتوویەتی : بەخوا تەنیا مەبەستم یەك تەلاق بوو، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (**والله ما أردتَ الاّ واحدة؟**) ئایا سوێند بەخوا تەنیا مەبەستت یەك بوو ؟ ئەویش گوتوویەتی: (**والله ما أردتُ الاّ واحدة**) پێغەمبەری خواش گێڕاویەتەوە لای و، دووەم تەلاقی لە ڕۆژگاری عومەری کوڕی خەتاب و، سێیەمیشی لەسەردەمی عوسمان دا دا.

دیارە سوێند درانی ڕوکانەش، کە ئایا تەنیا مەبەستی یەك دانە تەلاق بووە، یان زیاتر؟ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەگەر مەبەستی زیاتر بوایە دەکەوتن .

---

(١) (المحلیّ...) ج١٠، ص١٧١.

پێنج: شتێکی ئاشکرایە کە لەڕۆژگاری عومەردا خوا لێی ڕازی بێ تەلاق دانی سێ بەسێ ی بەسێ حیساب کردووە و تێکڕاشای هاوەڵانیش هاوڕای بوونە، کەواتە تەلاقی سێ بەسێ دەکەوێ .

شەش : لە (صحیح البخاری) و (صحیح مسلم) دا لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ هاتوە، کە پیاوێك ژنەکەی خۆی سێ تەلاق داوە... بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەیپرسیوە، کە ئایا سێ تەلاقەکەی پێکەوە داون، یان جیا جیا؟ کە دیارە ئەگەر حوکمەیان جیاواز بوایە دەیپرسی .

حەوت : مادام خوا عز وجل سێ تەلاقی بۆ مێرد بەرانبەر بە ژنەکەی دیاریکردوون و، خستنیشیان بۆخۆی گێڕاوەتەوە، بۆی هەیە پێکەوە بیانخات، یان بە جیا جیا .

**ڕای دووەم:** کە دەڵێ : بەو جۆرە تەلاقدانە هیچ تەلاق ناکەون، بەهێزترین بەڵگەیان ئەوەیە کە:

ئەو جۆرە تەلاقدانە حەرام و بیدعەتە، حەرام و بیدعەتیش نابێ هیچ شوێنەوارێکیان بێتە سەری، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (**مَنْ أحدث في أمرنا هذا ماليس منه فهو رَدٌّ**) متفق علیه، وە فەرموویەتی : (**من عَمِلَ عَمَلاً ليس عليه أمرنا فهو ردٌّ**) رواه مسلم، کەواتە: شتی داهێنراوو کاری ناڕەوا، ڕەتکراوەو پوچن و ئیعتیباریان پێ ناکرێ .

**ڕای سێیەم:** ئەوڕایەش کە دەڵێ: تەلاقی سێ بەسێ، ئەگەر هی ژنێك بێ کە گوازرابێتەوە هەرسێکیان دەکەون، بەڵام ئەگەر هی نەگوازراوە بێ، بەس یەکیان دەکەوێ، بەهێزترین بەڵگەیان دووشتن:



یەك: ئەوە کە (أبو داود) لە (طاووس) ەوە هێناویەتی، کە (إبن عباس) بە (أبو الصَّهباء) ی گوتوە: لە ڕۆژگاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکرو سەرەتای ڕۆژگاری عومەردا خوا لێیان ڕازی بێ، پیاوێك ئەگەر هاوسەری خۆی کە نەگوازرابێتەوە سێ تەلاقی دابوایە، تەنیا یەك تەلاقی دەکەوت، بەلاّم ئەگەر گوازراوە (مدخولٌ بها) بوایە، هەرسێکی دەکەوتن[1] .

دوو: بۆیە ئافرەتی نەگوازراوە تەنیا تەلاقێکی دەکەوێ، باسی تەلاقیش بدرێ، چونکە عیددەی لەسەر نیەو بە یەکیان لە مێردەکەی جیا دەبێتەوە و دووەکەی دیکە زیادن.

## * کورتە هەڵسەنگاندنێکی بەڵگەکانی ئەم سێ ڕایە *

ئێستاش بەر لەوەی بەڵگەکانی ڕای چوارەم کە ئێمە پێمان ڕاستترو باشترە، بخەینە ڕوو، بەباشی دەزانم ئەگەر زۆریش بە کورتیی بێ، بەڵگەکانی سێ ڕای پێشوو هەڵسەنگێنین:

**هەڵسەنگاندنی بەڵگەکانی ڕای یەکەم:**

**یەك:** ئەو ئایەتە ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ ﴾ البقرة: ٢٣٠ باسی حەڕام بوونی ژنی تەلاقدراو بۆجاری سێیەم لەسەر مێردە تەلاقدەرەکەی دەکات، کە هەتا مێردێکی دیکە نەکات و لێی جیانابێتەوە، بۆ مێردی یەکەمی حەلاڵ نابێتەوەو، هیچ پەیوەندیی بەباسی یەك تەلاقدان، یان پێکەوە سێ تەلاق دانەوە،نیە.

---

(١) (عون المعبود شرح سنن أبي داود) ج٦، ص٢٧٤-٢٧٥.

**دوو** : ئەوە کە (عويمر العَجْلاني) پاش لیعان کردن لەگەڵ ژنەکەیدا سێ تەلاقەی داوە، نابێتە بەڵگەی ڕەوابوونی تەلاقی سێ بەسێ، چونکە بێگومان ژنی مولاعەنە لەگەڵ کراو، پاش لیعان بۆهەتا هەتایە لە مێردەکەی قەدەغە دەبێ و، ئەو تەلاقدانەی عوەیمیر هەربۆ جەختکردنەوە بووە بەرانبەر بە ژنێکی بێگانە بووە، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەپێویستی نەزانیوە هیچ بفەرموێ.

**سێ**: تەلاقدانەکەی (فاطمة بنت قيْس) یش سێ بەسێ نەبووە، تاکو بەڵگەبێ لەسەر ڕەوایی ئەو جۆرە تەلاقدانە، بەڵکو مێردەکەی پێشتر دوو تەلاقی دیکەی داون، پاشان هی سێیەمیشی داوە[1] .

**چوار**: ئەو دەقەی کە بە (حديث رُكانة) باوە، فەرموودە نیە، چونکە ئیمام ئەحمەد گوتوویەتی: (حديث ركانة ليس بشيء، لأن ابن إسحاق يرويه عن داود بن الحصين عن عكرمة عن ابن عباس، أن ركانة طَلَّقَ امرأته ثلاثاً، وأهل المدينة يُسَمون مَنْ طَلَقَ ثلاثاً: أنهُ طَلَقَ البَّتة)[2] .

واتە: فەرموودەی ڕوکانە هیچ نیە، چونکە ئیبن و ئیسحاق لە داودی کوڕی حوصەین، لە عیکرمە لە ئیبنو عەباسەوە گێڕاویەتەوە، کە ڕوکانە ژنەکەی سێ بەسێ تەلاق داوەو، خەڵکی مەدینەش کەسێك سێ بەسێ تەلاق بدات دەڵێن، یەکجاریی تەلاقی داوە.

**پێنج**: ئەوەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ کردوویەتی، بریتی بووە لە بەکارهێنانی صەلاحیەتی خۆی وەك سەرۆکی دەوڵەت بۆ سزادانی

(١) (المفصل...)، ج٨، ص٧٢.
(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٧٣.

کەسانێك کە بەشێوازێکی شەرعیی و سوننەتیی ژنەکانیان تەلاّق نادەن و، ئەوەشی وەك ئیجتیهادێکی خۆی کردوەو، وەك دوایی باسی دەکەین، پابەندکەر (مُلزِمْ) نیە بۆ مسوڵمانانی دوای خۆی .

**شەش** : هۆکاری پرسیارنەکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئایا ئەو پیاوە یەك تەلاّقی ژنەکەی داوە یان زیاتر ؟ ئەوە بووە کە ئەو کاتە شتێکی زانراو بووە، کە تەلاّقدانی ڕەوا، تەلاّقدانی جیا جیایە، نەك پێکەوە.

**حەوت**: ڕاستە خوای کاربەجێ سێ تەلاّقی خستۆتە ژێر ڕکێفی مێردەوە بەرانبەر بە ژنەکەی، بەلاّم بێگومان مەرج و شێوازی شەرعییانەشی بۆ دیاریکردوەو تەنیا لە سنووری ئەو شێوازو مەرجە شەرعییانەدا بۆی هەیە ژنەکەی تەلاّق بدات.

**هەڵسەنگاندنی بەڵگەکانی ڕای دووەم :**

هەرچەندە من پێم وایە ئەم بەڵگە بەهێزە، بەلاّم ئەوەی ڕێ لەم بەڵگەیە دەگرێ، ئەوەیە کە تێکڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە تەلاّقدانی سێ بە سێ، تەلاّقی پێ دەکەوێ، جا زۆربەیان دەڵێن، هەرسێك تەلاّقەکەی پێ دەکەون و هەندێکیش دەڵێن : تەنیا یەك تەلاّقی پێ دەکەوێ، بەلاّم هیچ کەس لە هاوەڵان و شوێن کەوتوانیان نەیگوتوە : هیچ تەلاّقی پێناکەون، بۆیە ئەم ڕایە بە ڕایەکی ڕیزپەڕ (شاذ) دادەنرێ.

**هەڵسەنگاندنی بەڵگەکانی ڕای سێیەم :**

أ- وەك لەکاتی خستنە ڕووی بەڵگەکانی ڕای چوارەم دا دەیخەینە ڕوو، (إبن عباس) لەبارەی کەوتن و نەکەوتنی سێ تەلاّقەوە فەرموودەی سەنەد ڕاستترو بەهێزتری لە (صحيح مسلم) دا لێ گێڕاوەتەوە لەوەی

کە (أبو داود) هێناویەتی کە گوایە (إبن عباس) بە (أبو الصَّهباء) گوتوە لەو بارەوە.

ب- بەنسبەت نەکەوتنی زیاتر لە تەلاقێکی ژنی نەگوازراوەش، بەهۆی ئەوەوە، کە عیددەی لەسەر نیە، ئێمەش پشتگیریی دەکەین .

**ئێستاش کاتی خستنە رووی بەڵگەکانی رای چوارەمە، کە ئێمە بە راستترو چاکتری دەزانین :**

**رای چوارەم:** ئەم رایەش کە دەڵێ: تەلاقی سێ بەسێ (الطلاق الثلاث) تەنیا یەکیان دەکەوێ و پاشان مێرد بۆی هەیە ژنەکەی لە عیددەدا بگێڕێتەوە، هەروەها ئەگەر بۆجاری دووەمیش تەلاقیدا، دیسان بۆی هەیە لە عیددەدا بیگێڕێتەوە، بۆیە ئەو دوو جار تەلاقدانە بە تەلاقدانی گێرانەوە (الطلاق الرّجعي) ناسراون، چەند بەڵگەیەك پشتگیریی دەکەن، کە بەرای من ئەمانە بەهێزترینیانن:

**بەڵگەی یەکەم:** خوا تبارك و تعالی لەبارەی چۆنیەتی و شێوازی شەرعییانەی تەلاقدانەوە ،فەرموویەتی : ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ البقرة: ٢٢٩، واتە : تەلاقدان دوو کەرەتە، ئنجا یان گرتنە خۆیەکی پەسند، یان واز لێهێنانێکی باش...

لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، کە شێوازی شەرعییانەی تەلاقدان ئەوەیە، کە سێ تەلاقەکە بەسێ کەرەت ولە سێ قۆناغ دا بدرێن، نەك یەك جار و لەیەك قۆناغ دا.

کەواتە:

پیاوێك کە بە ژنەکەی دەڵێ : هەرسێك تەلاقت کەوتبێ، یان سێ

جاران پێی بڵێ : تەلاقت کەوتبێ، تەلاقت کەوتبێ،تەلاقت کەوتبێ، ئەوە سێ تەلاقی ژنەکەی نەخستوون و هەرسێك تەلاقەکەی نەداون، بەڵکو تەنیا تەلاقێکی داوە، وەك چۆن بەڕای سەرجەم شەرعزانان، ئەگەر پیاوێکی مولاعەنەکەر (مُلاعِنْ) بە هاوسەرە تۆمەتبار کراوەکەی بڵێ : (أشهد بالله أربع شهادات أنّي صادق) ئەوە تەنیا بۆی بەیەك شایەدیی دان حیسابە، هەروەها، ئەگەر کەسێك لە جیاتی ئەوەی سی و سێ (٣٣) کەرەت بڵێ: (سبحان الله)، بڵێ : سی و سێ جار (سبحان الله)، تەنیا بۆی بەیەك جار (سبحان الله) کردن حیسابە، نەك بە سی و سێ جار .

**بەڵگەی دووەم:** ئەو تەلاقدانەی، کە خوا دایناوە، ئەوەیە کە بەسێ کەرەت و لەسێ قۆناغ دا ئەنجام بدرێ و، پاش قۆناغی یەکەم و دووەم، ژن و مێرد دەرفەتی پێکهاتنەوەیان هەبێ، چ لە عیددەدا بەهەمان گرێ بەست (عَقْد) ی پێشوو، بەڵام هەرجارەی تەلاقێکی کەم دەبێتەوە، وە چ پاش عیددەو بە گرێبەستێکی تازە، وەپاش تەلاق و قۆناغی سێیەم، جیابوونەوەی یەکجارەکییان دەکەوێتە نێوان و، تازە مەگەر ژنەکە مێردێکی دیکە بکات و بچێتە لای و پاشان لەیەك جیا ببنەوە، ئەگەرنا بۆ مێردە پێشووەکەی حەڵاڵ نابێتەوە، وەك خوا لەبارەی تەلاقی سێیەمەوە فەرموویەتی : ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ ﴾ البقرة: ٢٣٠، واتە: ئنجا ئەگەر بۆجاری سێیەم تەلاقی دا، پاش قۆناغی

یەکەم و دووەم، ئەوە ژنەکە بۆی حەلاڵ نیە دوای ئەوە، هەتا مێردێکی دیکەی جگە لەوە دەکات وە دەچێتە لای، ئنجا ئەگەر ئەویش تەلاقیدا ئەوە گوناهیان ناگات کە بگەڕێنەوە لای یەك.

ئنجا ئەگەر بگوترێ : تەلاقدانی سێ بەسێ بەیەکجار هەرسێ تەلاقەکەی پێ دەکەون، ئەوە ئەو حیکمەت و فەلسەفەیەی، کە خوای کاربەجێ لە شێوازی شەرعییانەی تەلاقدان دا داینـاوە و ڕەچاوی کردووە، کە بریتیە لە دوو جار دەرفەت پێدانی ژن و مێرد کە بگەڕێنەوە لای یەك، دەفەوتێ دیارە بۆ هیچ کەسێش ڕەواو دروست نیە بەجۆرێك حوکمە شەرعییەکان بگۆڕێ، کە ئامانجەکانیان و حیکمەتەکانیان بفەوتێن، بۆیە ناگونجێ سێ تەلاقدان بەجارێك بەڕەواو دروست دابنرێ .

**بەڵگەی سێیەم**: چەند فەرموودەیەك بەڕوونی ئەوە دەگەیەنن کە تەلاقدانی سێ بەسێ لەڕۆژگاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خیلافەتی ئەبو بەکر و سەرەتای ڕۆژگاری خیلافەتی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، تەنیا یەك تەلاقی پێ کەوتوە، بۆ نموونە:

١- (عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ : (كَانَ الطَّلَاقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ طَلَاقُ الثَّلَاثِ وَاحِدَةً،فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ : إِنَّ النَّاسَ قَدْ اسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ، فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عليهم،فَأَمْضَاهُ عليهم) رواه مسلم : ١٥/١٤٧٢.

واتە: تەلاقدان لەڕۆژگاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

و ئەبی بەکرو دوو ساڵیش لە خیلافەتی عومەر، ئەگەر سێ تەلاقیان دابوایە، بەیەك حیساب بوو، ئنجا عومەری کوڕی خەتاب گوتی: خەڵکی لەکارێکدا، کە بواری شێنەیی یان تێیدا هەبوو پەلەیان کرد، کەوابێ بابەسەریاندا جێ بەجێی بکەین، ئیدی بەسەریاندا جێ بەجێی کرد.

دیارە مەبەستی عومەریش خوا لێی ڕازی بێ لەوەدا، کە گوتوویەتی: خەڵك پەلەیان کرد لەشتێك دا کە بواری شێنەییان تێیدا هەبوو، ئەوەیە کە خەڵك لەجیاتی ئەوەی یەك لەدوای یەك سێ تەلاقەی ژنەکانیان بدەن ، پلە پلەیی ڕەچاو بکەن، پەلەیان کردوەو هەرسێ تەلاقەکەیان پێکەوە داون.

هەروەها مەبەستیشی لە : ئەگەر بەسەریاندا جێ بەجێ بکەین (فلو أمضيناهُ عليهم) سزادانیانە بەوە، کە وەك سزایەکی ئەو سەرپێچیەیان، سێ تەلاقەکەیان بە کەوتوو دابنرێت .

٢- (..أَنَّ أَبَا الصَّهْبَاءِ، قَالَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ " : أَتَعْلَمُ إِنَّمَا كَانَتِ الثَّلاَثُ تُجْعَلُ وَاحِدَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَأَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَثَلاَثٍ فِي إِمَارَةِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : نَعَمْ).رواه مسلم.١٤٧٢/١٦.

واتە: ئەبا صەهبا بە کوڕی عەبباسی گوت : ئایا دەزانی کە تەلاق سێ بەسێ بەیەك دادەنرا لەڕۆژگاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبی بەکرو سێ ساڵیش لە حوکمڕانیی عومەر؟ کوڕی عەبباسیش گوتی : بەڵێ .

٣- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ : " طَلَّقَ رُكَانَةُ امْرَأَتَهُ ثَلاثًا فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ فَحَزِنَ عليها حُزْنًا شَدِيدًا، فَسَأَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : كَيْفَ طَلَّقْتَهَا ؟ قَالَ : طَلَّقْتُهَا ثَلاثًا ، فَقَالَ : فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ ؟ قَالَ : نَعَمْ، قَالَ : فَإِنَّمَا تِلْكَ وَاحِدَةٌ فَأَرْجِعْهَا إِنْ شِئْتَ، قال : فَرَاجَعَهَا) رواه أحمد وأبو داود وصححه أبو يَعْلى.

واتە: ڕوكانەی كوڕی عەبدو یەزید ژنەكەی خۆی لە مەجلیسێكدا سێ بەسێ تەڵاق دا، دوایی زۆر بۆی خەمبار بوو، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لێی پرسی : چۆنت تەڵاق داوە ؟ گوتی: سێ بەسێ تەڵاقم داوە، پێغەمبەری خوا فەرمووی: لەیەك مەجلیس دا؟ گوتی : بەڵێ، فەرمووی : بێگومان هەر بەیەك دادەنرێ، جا ئەگەر حەز دەكەی بیگێڕەوە دەڵێ، ئەویش گێڕایەوە .

٤- (ابن تیمیة) گوتوویەتی : (ولا نعرف أن أحداً طلّق على عهد النبي صلى الله عليه وسلم امرأته ثلاثاً بكلمة واحدة، فألْزَمه النبيُّ صلى الله عليه وسلم بالثلاث، ولا روي في ذلك حديث صحيح ولا حسن، وَلا نَقَلَ أهلُ الكتب المعتمد عليهافي ذلك شيئًا، بل رويت في ذلك أحاديث كلها ضعيفة باتفاق علماء الحديث، بل هي موضوعة)[١] .

واتە: وە نەمانزانیوە كە هیچ كەس لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ژنەكەی خۆی بەیەك وشە (واتە:

(١) مجموع الفتاوى، ج٣٣، ص١٣.

یەك كەرەت) سێ تەلاق دابێ و، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پابەندی كردبێ بە خستنی سێ تەلاقەكانییەوە، وەلەو بارەوە هیچ فەرموودەیەكی ڕاست و باش نەگێڕاوەتەوە، وەخاوەنی كتێبە متمانە پێكراوەكان هیچیان لەو بارەوە باس نەكردوە، بەڵكو لەو بارەوە چەند دەقێك گێڕراونەوە كە بەڕای سەرجەم زانایانی فەرموودە ناس، بێهێزو بگرە هەڵبەستراویشن.

دیارە پێشتریش باسمان كرد كە هەڵوێستەكەی عومەری كوڕی خەتابیش خوا لێی ڕازی بێ سزادانێك بووە بۆ كەسانێك كە كارو ڕەفتاری حەرامیان ئەنجام داوە، كە بێگومان ئیجتیهادێكی خۆی بووە وەك حوكمڕانێك، وە ئەگەر پێكابێ دووپاداشت و وەئەگەر بەهەڵەش داچووبێ پاداشتێكی هەر هەیە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : **(إذا حكم الحاكم فاجتهد ثم أصاب فَلَهُ أجران، وإذا حكم فأجتهد ثم أخطأ فَلَهُ أجْرٌ)** رواه البخاري : ٧٣٥، ومسلم: ١٧١٦.

جا بێگومان سزایەكەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ ئیجرائاتێكی كاتی بووە و پەیوەست بووە بەخەڵكی ڕۆژگاری خۆیەوەو[1] ،ئیجتیهادەكەشی ئەگەر پێكابێشی -كە من پێم وایە نەیپێكاوە – پابەندكەر (مُلْزِم) نیە بۆ غەیری خۆی لە حوكمڕان و موجتەهیدان، چونكە پابەندكەر بۆ هەموولایەك

(١) هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص١٥-١٦.

بەس وەحی بەرجەستەیە لە قورئان و سوننەت دا.
بەپێی ئەم بەڵگانەش دەردەکەوێ، کە ڕای سێ تەڵاق بەیەك تەڵاق دانان، لەهەرسێك ڕایەکانی دیکە بەهێزترو بەڵگەدارترە و بێگومان لە ئامانجە شەرعییەکان و بەرژەوەندی خەڵکیش بۆ زوو هەڵنەوەشاندنەوەی خێزانەکانیان نزیکترە.
ئێستاش دەچینە سەر توێژینەوەی جۆری دووەم لە جۆرەکانی تەڵاقدان:

## ٢- تەڵاقدان لە ڕووی صیغەکەیەوە :

تەڵاقدان لە ڕووی ڕێژگە (صیغة) ی بەکارهێنانەوە بۆ تەڵاق، دووجۆرە :
یەکەم: شێوازی ڕاشکاو (صریح).
دووەم: شێوازی کنارە(کنایة).
جا لەسۆنگەی ئەوەوە ،کە ئێمە لە کاتی توێژینەوەی پایەکانی تەڵاق دان (أرکان الطلاق) دا باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوە، لێرە زۆری بەدوا ناکەوین و هەر بە کورتی دەڵێین :

### یەکەم: تەڵاقدانی ڕاشکاو:

بریتیە لەوەی کە مێرد ژنەکەی خۆی بە بێژە (لفظ) یەك تەڵاق بدات، کە جگە لە تەڵاق و دەست لێبەردان، هیچ واتایەکی دیکە هەڵناگرێ، وەك: (أنتِ طالِقٌ)، (أنتِ مُطَلَّقة)واتە: تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقت کەوتوە.
دیارە لەبارەی بێژە ڕاشکاوەکانی تەڵاقیشەوە – وەك پێشتریش باسمان کرد – لەنێوانیاندا مشت و مڕو ڕا جیایی هەیەو هەندێکیان بەس بێژەی تەڵاق (طلاق) و زۆربەشیان هەرسێك وشەی : (طلاق، فراق، سراح) کە لە

قورئانیش دا هاتوون، بەراشکاو دادەنێن .
زۆربەی هەرە زۆری زانایانیش رایان وایە، کە تەلاق بە بێژەی راشکاو دەکەوێ و پەکی لەسەر نیەت و دەلالەتی حاڵ نەکەوتووە، بەلاّم ظاهیرییەکان دەڵێن : بەبێ هەبوونی نیەت ناکەوێ، دیارە هەرکام لە فەرمودەی خوا : ﴿ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ ﴾ البقرة: ٢٢٧ وە فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) : (إنما الأعمال بالنيات...) متفق عليه، بەڵگەی بەهێزی رای ظاهیرییەکانن [1] .

## دووەم : تەلاّقدانی کینایە:

ئەمیش بریتیە لەوە کە مێرد ژنەکەی بە بێژەیەك دەست لێبەردات و وازی لێبێنێ کە تەلاق و جگە لە تەلاقیش بگرێتەوە .
ئەو وشەو تەعبیرانەش – وەك پێشتریش گوتمان – هەموو ئەوانەن، کە ئەگەری مانای تەلاق و مانای دیکەشیان هەیە، وەك ئەوەی کە پیاوێك بە ژنەکەی بڵێ : (أنتِ بائن، إلحقي باهلك) واتە تۆ جیای، بچۆوە لای کەس و کارت ..
زۆربەی هەرە زۆری زانایانیش رایان وایە کە تەلاق دان بە بێژەکانی کنارە (ألفاظ الكناية) ئەگەر نیەتی تەلاقدانی لەگەڵ بێ، تەلاقی پێ دەکەوێ، ئەگەرنا ناکەوێ، بەلاّم ظاهیرییەکان رایان وایە، کە تەلاّقدانی بە کینایە ناکەوێ، (ابن حزم) لەوبارەوە گوتوویەتی: (ومَن قالَ لامرأته أنتِ عليَّ حرامٌ، أو زاد على ذلك فقال: كالميتة والدم ولحم الخنزير، أو قال: من

---

(١) الطلاق وأحكامه، الشيخ حسين حلاوة، ص١٩١-١٩٢.

ذلك، فهو كلهُّ باطل وكذب، ولا تكون بذلك حراماً عليه، وهي امرأته كما كانت، نوى بذلك طلاقاً أو لم يَنْوِه .... وما عدا هذه الألفاظ : الطلاق والسراح والفراق، لاَيَقَعُ بها الطلاق البتة، نوى بها طلاقاً أو لَم يَنْوِه، لا في فتْيا ولافي قضاء) [1] .

واتە: وەهەر كەسێك بە ژنەكەی بڵێ : تۆ لێم قەدەغەی، یان لێی زیاد كردو گوتی : وەك مردارو خوێن و گۆشتی بەراز، یان زیاتریش لەوە بڵێ، ئەوە هەمووی ناهەق و درۆیەو بەوە لێی حەرام نابێ، بەڵكو هەر ژنیەتی وەك پێشوو، جا چ بەوە مەبەستی تەلاَق بووبێ یان نا... وە جگە لە بێژەكانی : تەلاَق و سەڕاح و فیڕاق، هەرگیز تەلاَق ناكەوێ، چ نیەتی تەلاَقی هێنابێ، یان نەیهێنابێ، نەوەك فەتواو نەوەك حوكمی دادوەریی.

بەلاَم لە ڕاستیدا قسەو ڕای جەماوەری زانایان ڕاستترو بەڵگەدارترە، كە لێرەدا تەنیا بەڵگەیەك بەنموونە دێنینەوە:

أ- (بخاري) لە (عائشة) وە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئافرەتێكی هێنا، كاتێك ویستی بچێتەلای گووتی: (أعوذ بالله منك) پەنات لێ بەخوا دەگرم، ئەویش فەرمووی: (قد عُذْتِ بمعُاذٍ، إلحَقي باهلك) : ٤٩٥٥، واتە: پەنات بردۆتە بەر پەنا پێبراوێكی مەزن، بچۆوە لای كەس و كارت، كە دیارە مەبەستی پێ تەلاَقدانی بووە.

كەواتە: كینایە مادام نیازو مەبەستی لەگەڵدابێ، بۆتەلاَقدان بەكاردێ.

ب- هەروەها هەر لە (صحیح البخاری) و (صحیح مسلم) دا هاتووە، كە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە (كعب بن

---

(١) المحلىّ شرح المجلىَّ، ج١٠، ص١٢٤.



مالك) كرد لە ژنەكەی كەنار بگرێ، (كعب) بە ژنەكەی گوت: (إلحقي باهلكِ) : ٤١٥٦، و مسلم : ٢٧٦٩، كە دیارە لێرەدا مەبەست لەهەمان ڕستەو تەعبیر ناردنەوە لای كە سو كار بووە، نەك تەلاقدان ! كەواتە : بێژەو تەعبیرە كینایییەكان، مەگەر نیازو مەبەست و نیشانەیەكیان لەگەڵ دابێ، ئەگەرنا تەلاق ناگەیەنن .

## ٣- تەلاقدان لەڕووی شوێنەواریەوە :

تەلاقدان لە ڕووی شوێنەواریەوە دوو جۆرە :

یەكەم : تەلاقدانی گێڕراوە (رجعي).

دووەم : تەلاقدانی جیابووەوە (بائن).

### یەكەم : تەلاقدانی گێڕراوە (الطلاق الرجعي):

خوا پشتیوان بێ لەهەشت بڕگەدا بە كورتی باسی ئەو جۆرە تەلاقدانە دەكەین :

### یەك: پێناسە :

زانایان ئاوا پێناسەی ئەم جۆرە تەلاقدانەیان كردوە :

**(الطلاق الرجعي هو الذي يملك الزوج فيه مُراجعة زوجته مادامت في العِدَّة بِمَحْض إرادته، رضيت الزوجة أو لَم ترض دون حاجة الى عقد نكاح جديد)**[1] .

(١) (المفصل...) ج٨، ص٦.

واتە: تەلاقی گێڕانەوە ئەوەیە، کە مێرد هەتا ژنەکەی لە عیددە دابێ بۆی هەیە بە ویستی خۆی بیگێڕێتەوە لای خۆی، ژنەکە ڕازی بێ یان نا، بێ ئەوەی پێویست بە گرێبەستێکی تازەی هاوسەرگیریی هەبێ .

## دوو: بناغە لە تەلاقدان دا تەلاقدانی گێڕانەوەیە :

بەڵێ تەلاق لەبەر ناچاریی ڕێی پێدراوە و تەلاقدانی گێڕانەوە (الطلاق الرجعي) یش بەسە بۆ حاڵەتی پێویستیی و ناچاریی، بۆیە ئەم جۆرە تەلاقدانە بناغەیەو لەو بارەشەوە بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە :

١- ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ البقـرة: ٢٢٩، ئەم ئایەتە بەپێزە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو تەلاقدانەی مێرد بۆی هەیە ژنەکەی بەشێوەیەکی پەسند – پاش تەلاقدانەکە – بگرێتەوە خۆی و بیگێڕێتەوە لای خۆی، بریتیە لە دوو کەڕەت تەلاقدان و پاش هەرکام لەو دووجارە، یان دەبێ لە عیددەدا بیگرێتەوە لای خۆی و بەشێوەیەکی پەسند دەستی پێوەبگرێ، یان بە شێوەیەکی جوان دەستی لێ بەربدات .

٢- ﴿ وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖۚ وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ ﴾ البقـرة: ٢٣١ واتە: وەئەگەر ژنەکانتان تەلاقداو گەیشتنە نزیك کۆتایی عیددەیان، یان بە شێوەیەکی پەسند بیانگرنە خۆتان، یان بە شێوەیەکی پەسند دەستبەرداریان بن، وە بەمەستی زیان پێگەیاندن مەیانهێڵنەوە ..

هەڵبەتە مەبەست لە ﴿ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ ﴾ واتە: گەیشتنە نیزیك

بەسەرچوونی عیددە، چونکە بە بەسەر چوونی عیددە، جیابوونەوە(بینونة) ڕوودەدات و، بواری گێڕانەوە (رجعة) نامێنێ.

هەروەها مەبەست لە ﴿ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ﴾لە تێکڕای ئایەتەکانی قورئاندا، گێڕانەوەی مێرد بۆ ژنە تەلاقدراوەکەی لەکاتی عیددەدا، بەمەرجێك تەلاقی یەکەم، یان دووەم بێ .

٣- ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا ۚ ﴾ البقرة: ٢٢٨ کە مەبەستمان لە هێنانی ئەم ئایەتە ڕستەی : ﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ ﴾ یە، واتە: وە مێردەکانیان مافیانە لەو ماوەیەدا بیانگێڕنەوە لای خۆیان[1] .

کە دیارە مەبەست لێرەدا عیددەی دوای تەلاقی یەکەم و دووەمە، چونکە پاش تەلاقی سێیەم، ئەو مافە نامێنێ و جیابوونەوەی گەورە (البينونة الكبرى) ڕوو دەدات .

لەم ئایەتانەو هاو وێنەکانیان دا دەردەکەوێ، کە بناغە لەتەلاقداندا، تەلاقدانی گێڕانەوەیە، (إبن القيم) لەو بارەوە گوتوویەتی: **(ومَنْ تأمَّل القرآن وجد لا يحتمل غير ذلك، مما شرع الله تعالى الطلاق الاّ وشرع فيه الرجعة، الا الطلاق قبل الدخول، وطلاق الخلع، والطلقة الثالثة)** [2] .

---

(١) بۆلێکدانەوەی ئەم ئایەتانە و سەرجەم ئایەتەکانی دیکەی لەم جۆرە، سەرنجی بەرگی یەکەمی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) بدە.

(٢) (بڕوانە: (إغاثة اللهفان من مكائد الشيطان)، ج١، ص٣٠٠.

واتـە: وە هەرکەسـێك لـە قورئـان ڕامێنـێ، دەبینـێ کـە جگـە لـەو جـۆرە هەڵناگرێ، چونکە خوای بەرز تەلاَقی دانەناوەو باس نەکراوە، مەگەر باسـی گێڕانەوەشی کـردوە، جگـە لـە تەلاَقـدانی پـێش گواسـتنەوەو، تەلاَقـدانی خولع و تەلاَقدانی سێیەم.

## سێ: حیکمەتی ئەو جۆرە تەلاَقدانە:

حیکمـەتی ئـەو جـۆرە تەلاَقدانـە – وەك پێشـتریش گوتمـان – دەرفـەت پێدانی ژن و مێردە،کە پاش ئەزموونی تاڵی لێـك ترازانـی کـاتیی پـاش تەلاَقی یەکەم، یان یەکەم و دووەمیش، هـەلی دووبـارە ڕێـك کەوتنـەوەو ئاشتبونەوەیان هەبێ .

## چوار : مەرجەکانی تەلاَقدانی گێڕانەوە :

ئەم جۆرە تەلاَقدانە پەکی لەسـەر سـێ مـەرجی سـەرەکیی کـەوتوە، کـە سەرجەم زانایان لەسەریان پێکهاتوون:

١- دەبێ ئەو ژنەی کە بەو جۆرە تەلاَق دەدرێ، گوازراوە (مـدخول بهـا) بێ، چونکە ژنی نەگوازراوە عیددەی لەسەر نیە، تاکو مێردی بتـوانێ لە عیددەدا بیگێڕێتـەوە لای خـۆی، وەك خـوای زانـا فەرموویـەتی :

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَا﴾ الأحزاب: ٤٩ .

(إبن رشد الفقيه) لەبارەی یەکدەنگی زانایانەوە لەسەر ئەوە کە دەبێ ئەو ئافرەتە گوازراوە بـێ، گوتوویـەتی: (أجمـعَ المسـلمون علـى أن الزوج يملك رجعـة الزوجـة في الطـلاق الرجعي وأن مـنْ شَـرط هـذا

الطلاق تَقدُّم المُسَبِّب لَهُ)[١] ،ئاشکراشـە کـە مەبەسـتی لـە هۆکـار (مُسَبِّب) گوزرانەوەی ژنەکەیە.

٢- نابێ ئەو تەلاقدانە باسی قـەرەبوو (عِـوَض) ی تێـدابێ، چـونکە ئـە کاتە دەبێتە لەخۆ دارنین (خُلْع) و، ئـەویش مێـرد مـافی گێڕانـەوەی ژنەکەی نیە، وەك دوایی باسی دەکەین .

(إبن قدامة) ش یەکدەنگیی زانایانی لەسەر ئەم مەرجە هێناوە[٢] .

٣- نابێ ئەو تەلاقە تەلاقی سێیەم و کۆتایی بێ، چـونکە پـاش تـەلاقی سێیەم، مێردمافی گێڕانەوەی نـامێنێ، (إبـن قدامـة) لـەو بـارەوەش یەکدەنگیی زانایانی باسکردوە[٣] .

## پێنج: حوکمی تەلاقدانی گێڕانەوە :

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە لە ئەنجامی ئەو جۆرە تەلاقدانەدا :

١- هەر تەلاقدانێك، دانەتەلاقێك کەم دەکاتەوە.

٢- مێرد بۆی هەیە ژنە تەلاقدراوەکەی بگێڕێتەوە، مادام عیـددەی بەسـەر نەچووبێ، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ ﴾.

٣- بـەم جـۆرە تەلاقدانـە، ژن هـەتا لـە عیـددە دابـێ، هـەر بـە هاوسـەری مێردەکەی دادەنرێ .

تێکڕای زانایان لەسەر ئەم سێ حوکمە یەکدەنگن ،[٤] و لەکاتی توێژینەوەی تەلاقی جیابۆوە (الطلاق البائن) یشدا ئەم بابەتە زیاتر شیدەکەینەوە .

---

(١) (بدایە المجتهد...) ج٢، ص٧٠.

(٢) (المغنی...) ج٧، ص٢٧٨.

(٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

(٤) (المفصل...)، ج٨ـ ص١٢-١٥.

## شەش: مەرجەکانی گێڕانەوە (شروط الرجعة):

سەرەتا پێناسەی گێڕانەوە (رجعة) دەکەین و دەڵێین :

وشەی (الرَّجعة) لە زمان دا، کە بەمانای جارێکە لە گەڕانەوە (المرة من الرجُوع) لە زاراوەی شەرع دا یانی: گێڕانەوەی تەلاقدراوێکی جیانەبووەوە بۆ حاڵەتی پێشووی هاوسەرێتیی، بەبێ گرێ بەست (إعادة مُطلقةٍ غير بائنٍ الى ما كانت عليه بغير عقْدٍ) [1] .

**مەرجەکانیشی بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان، ئەم سێیەن :**

١- دەبێ گێڕەرەوە (المُرْتجِعْ) کە مێردە تەلاقدەرەکەیە، شایستەیی ئەوەی هەبێ، خۆی هاوسەر گیریی ئەنجام بدات، واتە: باڵغ و عاقڵ و سەربەست و بەهۆش بێ .

٢- دەبێ مەبەستی لە گێڕانەوەی ژنەکەی چاکەکاریی بێ، نەك زیانلێدان و نارەحەتکردن، وەك خوای کاربەجێ فەرمووییەتی:﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا ۚ ﴾ البقرة: ٢٢٨، واتە: وە مێردەکانیان مافیان هەیە بیانگێڕنەوە لەو ماوەیەدا (لەماوەی عیددەدا) ئەگەر چاکەکارییان بوێ...

هەروەها خوای دادگەر بەڕاشکاویی فەرموویەتی: کە پیاوان بۆیان نیە ژنانی تەلاقدراویان بەمەبەستی زیان پێگەیاندن، لەلای خۆیان گل بدەنەوە : ﴿ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ ﴾ البقرة: ٢٣١ واتە: وە ژنەکانتان بە زیان لێدانەوە مەهێڵنەوە

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٥..



بەمەبەستی سنووربەزاندن لەگەڵیان، وە هەر کەسیش ئەوە بکات بێگومان ستەمی لەخۆی کردوە.

٣- دەبێ ژنە گێرراوەکەی ئاگادار بکاتەوە، دیارە لەوەش دا کە ئایافەرزە، یان بەس پەسندە، ژنی گێرراوە (**الزوجة المُرْتَجعة**) ئاگادار بکرێتەوە؟ لەنێو زانایان دا را جیایی هەیە، زۆربەیان بە پەسند (مندوب) و **ظاهیریی**ەکانیش بەپێویستی دەزانن و دەڵێن: ئەگەر ئاگاداری نەکردەوە، گێڕانەوەکەی دروست نیەو[1]، واش پێدەچێ رای **ظاهیرییە**کان بەهێزتر بێ و، شایەد لەسەر گرتن (**الإشهاد**) یش، کە وەك دوایی باسی دەکەین مەرجێکی دیکەی گێڕانەوەیە، ئەو رایەی **ظاهیرییە**کان بەهێزتر دەکات.

## حەوت: شایەد لەسەر گرتنی گێڕانەوە (الإشهاد علی الرجعة):

زانایان لەبارەی شایەد لەسەر گرتنی گێڕانەوەی ژنی یەکەم یان دووەم تەلاقدراو، لە عیددەدا، را جیایی زۆریان هەیە وەك پێشتریش لە باسی تەلاقدان دا خستمانە روو، بەشێکیان بە پێویست و بەشێکیشیان بە پەسند ی دەزانن، بەلام پێم وایە رای بە پێویست زانین راست و بەڵگە دارە، چونکە دەقی قورئانی لەسەرە، وەك خوای بێ وێنە فەرموویەتی :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغۡنَ

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢٠-٢٨.

أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق: ١ — ٢، وەك دەبینین خوای بەرزو مەزن پاش باس کردنی هەرکام لە گێڕانەوە ﴿ فَأَمْسِكُوهُنَّ ﴾ و جیابوونەوە ﴿ فَارِقُوهُنَّ ﴾ فەرمانی کردوە بە گرتنی دوو شایەدی خاوەن دادگەریی ﴿ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴾، پاشان جارێکی دیکەش فەرمانی کردوە بە بەرپاکردنی شایەدیی دان و، دواییش ڕایگەیاندوە، کە ئەوە هەرکەسێکی ئیماندار بەخواو بە دوارۆژی پێ ئامۆژگاریی دەکرێ.

جا ئەگەر ئەم تەعبیرە بەم هەموو جەخت لەسەر کردنەوانەوە، بەڵگەی پێویست بوون (الوجوب) نەبێ، دەبێ چی بەڵگە بێ؟!

## هەشت: گێڕانەوە بە قسەو بە کردەوەش دەبێ :

زانایان تێکڕا لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە گێڕانەوە بە قسە دەبێ، ئەویش بەهەر وشەو تەعبیرێك، کە بە ڕوونیی و ڕاشکاویی، ئەو مەبەستە بگەیەنێ، بۆ وێنە کە مێرد بە ژنەکەی بڵێ: ئەوە گێڕامیەوە (قد راجَعتك) یان هێنامیەوە لای خۆم (رَدَدْتُك إليَّ، إرتجعتك، أمْسَكْتك).

ئنجا زانایان دەڵێن: ئەگەر وشەو تەعبیری گێڕانەوەکە ڕوون و ڕاشکاو بوو، حەو جێی بە نیەت ناکات، بەڵام ئەگەر کینایە بوو و ڕاشکاو (صریح) نەبوو، ئەوە زۆربەیان دەڵێن پێویستی بە نیەت هەیە، کینایەش

وەك: تۆ لەلام هەروەك جارانی(أنتِ عندي كما كنتِ)، تۆ هاوسەرمی (أنتِ زوجتي) [(١)] .

هەروەها وەك چۆن گێڕانەوە (رجعة) بەقسەو بێژە دەبێ، بەکردەوەو ڕەفتاریش دەبێ، واتە: هەر کردەوەو ڕەفتارێك ئەوە بگەیەنێ، کە ئەو پیاوە ژنەکەی هێناوەتەوە لای خۆی و گێڕاویەتەوە، بۆ وێنە: جووت بوون و پێشەکییەکانی (الوَطْء وَمقدّماتُهُ) کە مەبەست پێیان دەستبازیی و و دەستلێدان و ماچکردن و ...هتد، بەلام دەبێ ئەو کردەوانە (جووتبوون و پێشەکییەکانی) بەنیازو مەبەستی گێڕانەوە بن، ئەوجار بەوە حیساب دەکرێن، ئەوە ڕای پەسندترو بەهێزتری زانایانە لەو بارەوە[(٢)] .

## دووەم: تەلاقدانی جیابوونەوە (الطلاق البائن) :

تەلاقی جیابووەوە ئەوەیە کە مێرد مافی گێڕانەوە (رَجْعَة)ی ژنە تەلاقدراوە کەی نیە، جا دیارە ئەم جۆرە تەلاقدانەش دوو جۆرە:

١- تەلاقدانی جیابوونەوەی گچکە (**الطلاق البائن بينونة صغرى**).

٢- تەلاقدانی جیابوونەوەی گەورە (**الطلاق البائن بينونة كبرى**).

### ١- تەلاقدانی جیابوونەوەی گچکە :

ئێمە لەسێ برگەدا باسی ئەو جۆرە تەلاقدانە دەکەین :

#### أ- پێناسەی تەلاقدانی جیابووەوەی گچکە:

زانایان ئاوا پێناسەی ئەو جۆرە تەلاقدانەیان کردوە :

---

(١) (المفصل ...)، ج٨، ص٣٦-٣٨.

(٢) (المفصل...) ج٨، ص٤٢-٤٥.

(هو الذي لا يملك الزوج فيه أن يُرْجِعَ مُطَلَّقَتَهُ الاّ بعقدٍ جديد ومَهْرٍ جديد، سواء في ذلك أن يكون في عِدَّتها أم بعد انتهاء عِدَّتها)(١)،

واتە: ئەوەیە کە مێرد ناتوانێ ژنە تەلاّقدراوەکەی بگێڕێتەوە لای خۆی، مەگەر بە مارەکردنێکی تازەو مارەیی یەکی تازە، وە یەکسانە ئەوە لەکاتی عیددەی دابێ، یان دوای کۆتایی هاتنی عیددەی.

**ب- حاڵەتەکانی تەلاّقدانی جیابوونەوەی گچکە:**

ئەو حاڵەتانەی کە تەلاّقدانی جیابوونەوەی گچکەیان تێدا ڕوو دەدات چوارن:

**یەك: تەلاّقدانی پێش گواستنەوە (قبل الدخول):**

چونکە ئەو جۆرە تەلاّقدانە، عیددەی ژنی تەلاّقدراوی تێدا نیە، وەك پێشتر باسمان کرد، بۆیە پیاو هیچ چارەی نیە دەبێ بە گرێبەست و مارەیی یەکی تازە (عقد جديد و مَهْرٍ جديد) ئەو ئافرەتە بێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی .

**دوو: تەلاّقدان لەبەرانبەر قەرەبوو دا (الطلاق على العِوَض) :**

کە لە زاراوەی شەرع دا داڕنین (خُلْع) ی پێ دەگوترێ، حیکمەتی ئەمەش ئەوەیە کە ژنەکە بۆیە ئەو قەرەبووە دەدات و مێردەکەی لە ملی خۆی دادەڕنێ کە لێی دەرباز بێ، بۆیە مێردەکەی لێی جیا دەبێتەوە، مەگەر جارێکی دیکە دوای ڕازی بوونی ژنەکە بە گرێبەست و مارەییەکی تازە ، بیهێنێتەوە لای خۆی.

دیارە ئێمە لە تەوەری دووەمی ئەم بەشەدا بەدرێژیی باسی خولع دەکەین .

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٥٠.

**سێ : تەلاقدانی گێڕانەوە پاش بەسەرچوونی عیددە (الطلاق الرجعي بعد إنقضاءِ العِدَّة):**

ئاشکراشە ئەو جۆرە تەلاقدانە، دوای ئەوە دەبێ کە مێرد، ژنە گوازراوەکەی خۆی تەلاقی یەکەم، یان تەلاقی دووەم دەدات و لەژنەکەی دەگەڕێ، هەتا عیددەی بەسەر دەچێ، دیارە بەتێپەڕ بوونی عیددەش، ژنەکە لە مێردەکەی جیادەبێتەوەو لێی بێگانە دەبێ و، مەگەر بە مارەکردن و مارەبیەکی تازە، ئەگەرنا بۆی حەلاڵ نابێتەوە .

**چوار: ئەو حاڵەتانەی کە دادوەر هەڵدەستێ بە هەڵوەشاندنەوەی (فَسْخ) ی گرێبەستی هاوسەرگیریی :**

لەهەموو ئەو حاڵەتانەشدا، پاش بڕیاری دادوەر (قاضي)، ژن و مێرد لەیەك بێگانە دەبن، مەگەر بە گرێ بەست و مارەبیەکی تازە — جگە لە حاڵەتی لیعان- ئەگەرنا پەیوەندیی هاوسەرگیرییان بۆ دروست نابێتەوە.

شایانی باسیشە ئێمە تەوەری سێیەمی ئەم باسەمان بۆ توێژینەوەی حاڵەتەکانی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی تەرخان کردوە.

**ج- حوکمی تەلاقدانی جیابوونەوەی گچکە:**

لەئەنجامی تەلاقدانی جیابوونەوەی گچکەدا، چەند حوکمێك دێنە گۆڕێ :

یەك: مێرد مافی بەژنەکەیەوە نامێنێ، بەلام بەیەکجاریی لێی قەدەغە نابێ، بۆیە زانایان گوتوویانە: (الطلاق البائن بينونة صغرى يُزيلُ

الملك ولا يُزيل الحِلَّ)[1]، واتە: هاوسەرگیریی دەپچڕێ، بەڵام حەڵاڵێتیی کۆتایی پێ ناهێنێ، دیارە بە پچڕانی گرێبەستی هاوسەرگیرییش، ژن و مێرد هیچ مافێکیان لەسەر یەکدی نامێنێ، جگە لە مافی مەسرەف کێشانی ژن لەسەر مێرد، هەتا لە عیددەدابێ، ئەگەر دووگیان(حامل) بێ بەیەکدەنگیی زانایان و، ئەگەر دووگیانیش نەبێ بەڕای بەشێکیان[2].

هەروەها ژن لەسەری پێویستە لەماوەی عیددەیدا شوێنی نیشتەجێ بوونی، ماڵی مێردی تەڵاقدەری بەجێ نەهێڵێ، کە ئەمەش بەر لەوەی مافی مێرد بێ، مافی خوایە لەسەر هەرکام لە ژن و مێردو پێویستە پێیەوە پابەند بن[3]، چونکە خوای زانا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ﴾ الطلاق: ١.

دوو: بۆ حەڵاڵ بوونەوەی ژن بۆ مێردە پێشووەکەی، یەك لەسەر ئەوە نەکەوتوە، کە ژنەکە مێردێکی دیکە بکاتەوە، پاشان دوای جیابوونەوەیان بۆ مێردە پێشووەکەی حەڵاڵ بێتەوە، چونکە وەك پێشتر گوتمان، ئەم جۆرە تەڵاقدان و جیابوونەوەیە بەس ژن و مێردایەتیی هەڵوەشاندۆتەوە، بەڵام قەدەغەبوونی یەکجاریی وەدی نەهێناوە، هەربۆیەش پێی دەگوترێ: جیابوونەوەی گچکە (البينونة الصُّغرى).

(١) المفصل...) ج٨، ص٥٩-٦٠.
(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٦٠.
(٣) (المصل...) ج٨) ص٦٠.

سێ: ئەگەر حاڵەتی دارنین (الخلع) و هەڵوەشاندنەوە (فَسْخ) بێ، مێرد بۆی نیە ژنەکەی لە عیددەدا بگێڕێتەوە لای خۆی.

چوار: بابای تەلاقدەر (مُطَلِّق) هیچ کام لە (ظهار) و (إیلاء) ی بۆ نیە بەرانبەر بە تەلاقدراو (مُطَلَّقة)ەکەی، هەروەها ئەگەر تۆمەتباریی کرد بە زینا، لیعانیان لەنێواندا ناکرێ، وە لەکاتی مردنی یەکێکیان دا میراتیش لەیەکدی ناگرن، چونکە هەر لەسەرەتای تەلاقدانەوە جیابوونەوە (بینونة) یان لەنێوان دا بووەو هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نەماوە.

پێنج: پاش ئەم جۆرە تەلاقە لەسەر تەلاقدەر پێویستە دەبێ کە مارەیی دیاری کراوی دواخراو(المَهْرُ المُؤخَر المُسَمَّى) بدات بە ژنە تەلاق دراوەکەی.

شەش: ئەو جۆرە تەلاقدانە ژمارەی تەلاقدان کەم دەکاتەوە، بۆ نموونە:

ئەگەر پیاوێك ژنەکەی بۆجاری یەکەم تەلاق دا، ئەوە هەرکات بەمارەکردنەوەیەکی تازە هێنایەوە، تەنیا بەدوو تەلاقەوە دێتەوە لای.

هەروەها ئەگەر پاش ئەو تەلاقدرانەی، مێردێکی دیکەی کردبێ، بەلام نەچووبێتە لای و، مێردە دووەمەکەی مردبێ، یان تەلاقی دابێ، دیسان بەدوو تەلاقەوە — پاش مارەکردن- دەچێتەوە لای مێردە پێشووەکەی، ئەمە سەرجەم زانایان لەسەری رێککەوتوون[1] .

بەلام ئەوەی زانایان تێیدا کەوتوونەتە را جیایی و مشت و مڕەوە

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٦١.

،ئەوەیە، کە ئایا ئەگەر ژنە تەڵاقدراوەکە شووی کردبۆوە و مێردەکەشی چووبووە لای، پاشان لەیەك جیابوونەوە، یان مێردەکەی مرد، وە مێردە پێشوەکەی مارەی کردەوە، ئایە ئەو ژنە وەك دوو حاڵەتە پێشووەکە، هەر بە دوو تەڵاقەوە، یان بەیەك تەڵاقەوە، ئەگەر دوانی کەوتبێ دەچێتەوە لای مێردە پێشووەکەی، یان بەسێ تەڵاقەوە وەك مارەکرانی یەکەم جاری؟ زانایان لەوبارەوە بوونە دوو بەشەوە، بەشێکیان دەڵێن: شووکردنی دووەمی ژنەکە سەرجەم تەڵاقە ماوەکان (الطلقات الباقية) لادەبات و کاتێك بەمارەکردنێکی تازەوە (بعقد جديد) دەگەڕێتەوە لای مێردە پێشووەکەی، بەسێ تەڵاقی تازەوە لەگەڵی دەبێ، نەك بەدوو، یان یەك تەڵاقی کۆنەوە .

بەشێکیشیان دەڵێن : تەنیا بەتەڵاقە پێشووەکانییەوە دەچێتەوە لای .

واش پێدەچێ ڕای یەکەم ڕاست و بەڵگەدارتر بێ، چونکە مادام مێرد بتوانێ سێ تەڵاقی ژنەکەی بخات، چاکتر دەتوانێ تەڵاقێك و دوان بخات، وەك لە هاوەڵانی (عبدالله بن مسعود) گێڕراوەتەوە، کە گوتوویانە: (أَيَهدِمُ الزوجُ الثلاث ولا يَهْدِمُ الواحدة والإثنتين؟!)[1]، واتە: ئایا مێرد سێیان دەڕووخێنێ، بەڵام یەك و دوان ناڕووخێنێ ؟

ئێستاش نۆرەی توێژینەوەی تەڵاقدانی جیابوونەوەی گەورەیە :

(١) (المفصل...) ج٨، ص٦٢، وە، (الطلاق وأحكامه) للشيخ حسين حلاوة، ص١٩١.

## ٢- تەڵاقدانی جیابوونەوەی گەورە (الطلاق البائن بینونة کبری):

ئەم جۆرە تەڵاقدانەش لەچوار برگەدا دەتوێژینەوە:

**یەك: پێناسەی تەڵاقدانی جیابوونەوەی گەورە :**

زانایان ئاوا پێناسەی ئەو جۆرە تەڵاقدانەیان کردوە:

(الطلاق البائن بینونة کبری هو الذي لا یملك فیه الزوج إرجاعَ مُطلَّقَته لافي عدّتها، ولا بعدَ انتهاء عدّتها الاّ بعَقد نكاحٍ جدید ومَهرٍ جدید، وبعد أن تكون قد نكحت زوجاً آخر ودخل بها هذا الزوج، ثم فارقها بموته أو طلاقه ثم انتهت عدّتُها منه) [1].

واتە: تەڵاقدانی جیابوونەوەی گەورە ئەوەیە کە مێرد بۆی نیە نە لەکاتی عیددەدا وە نەلەدوای عیددەش ژنە تەڵاقدراوەکەی بگێڕێتەوە، مەگەر بەگرێبەستی مارەکردنێکی تازەو مارەییەکی تازە، وەدوای ئەوەی مێردێکی دیکە دەکات و ئەو مێردەش دەچێتە لای، پاشان بە مردنی یان تەڵاقدانی لێی جیادەبێتەوە، وە عیددەی بەسەردەچێ .

پێناسەکەش هێندە ڕوون و ئاشکرایە پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات.

**دوو: کاتی کەوتنی ئەو جۆرە تەڵاقە :**

ئەو جۆرە تەڵاقە تەنیا لەکاتێکدا دەبێ کە تەواوکەری سێ تەڵاقەکان بێ (إذا کان مُكَمِّلاً للطلَّقات الثلاث) وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾ ﴾البقرة:٢٢٩—٢٣٠، کە مەبەست لە ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾ تەلاقی یەکەم و دووەمە وە مەبەستیش لە ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا ﴾ی یەکەم تەلاقی سێیەمە، وەمەبەست لە ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا ﴾ی دووەم تەلاقدانی مێردی دووەمە بۆ ژنە سێ تەلاقدراوەکە.

هەروەها مەبەستیش لە ﴿ فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ ﴾ گرتنەوە خۆی بابای ژن تەلاقدەرە بۆ ژنەکەی لەکاتی عیددەدا و پاش تەلاقدانی یەکەم یان دووەم، یان وازلێهێنانیەتی تاکو عیددەی بەسەر دەچێ و لێی جیادەبێتەوە.

**سێ: حوکمی تەلاقدانی جیابوونەوەی گەورە :**

سەرجەم ئەو شوێنەوارانەی کە دەهاتنە سەر تەلاقدانی جیابوونەوەی گچکە، کە پێشتر باسمان کردن، دێنەسەر ئەم جۆرە تەلاقدانەش، ئنجا وێرای ئەوەش :

ئەو ژنەی کە بەوجۆرە تەلاقدراوە، بۆ مێردە پێشووەکەی حەلاڵ نابێتەوە، مەگەر مێردێکی دیکە بکات و، بچێتە لای ولێی جیابێتەوە، پاشان مێردە پێشووەکەی بەگرێ بەستێکی تازەو مارەییەکی تازە و بەڕەزامەندی ژنەکە بیکاتەوە هاوسەری، وەك خوا فەرموویەتی:﴿ فَإِن

طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٢٣٠ هەربۆیەش شەرع زانان ئەم جۆرە تەڵاقدانەیان بەم شێوەیە پێناسە کردوە (يُزِيلُ الملك والحلَّ) واتە: هاوسەریێتیی و حەڵاڵێتییش لادەبات، بەڵام بۆ جیابوونەوەی گچکە (البينونة الصغرى) گوتوویانە: (يزيلُ الملك لا الحلَّ) واتە: هاوسەریەتی لادەبات بەڵام حەڵاڵێتیی نا.

**چوار: مەرجەکانی هاوسەرگیریی دووەم، کە پاش تێکچوونی و کۆتایی پێهاتنی، ژنی تەڵاقدراو بۆ مێردە پێشوەکەی حەڵاڵ دەبێتەوە :**

ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە دەبێ ئەم مەرجانەی تێدابن :

**مەرجی یەکەم: دەبێ هاوسەرگیرییەکی راست (نكاح صحيح) بووبێ،**

واتە : سەرجەم مەرجەکانی هاوسەرگیریی تێدابن، وەك ڕواڵەت و ئاشکرایی، هاوسەرگیریی، هەروەها پێویستە وەك دیوی پەنهانی هاوسەرگیرییش مەبەست لەو گرێ بەست و نیکاحە هێنانەدی ئامانجە شەرعییەکانی هاوسەرگیریی بێ، کە بریتین لە پێکهێنانی خێزان و پەیدابوونی منداڵ و یەکدی پاراستن لە گوناهو ...هتد، کەواتە : ئەگەر هات و ئامانج لێی تەنیا حەلاڵکردنەوەی ژنە تەلاقدراوەکە بێ بۆ مێردی یەکەمی، ئەویش بەوە کە مێردی دووەم پاش مارەکردنی، یان پاش مارەکردنی و لەگەڵ جووتبوونی، تەلاقی بدات، تاکو بە گرێبەستێکی تازە بچێتەوە لای مێردە پێشووەکەی، ئەوە دروست نیە، چونکە مانای فەرمایشتی خوا ﴿ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ۗ ﴾ بەنیکاح و هاوسەرگیریی شەرعیی و ڕێك و ڕاست نەبێ

نایەتەدی و، حەڵاڵکردنەوەی ژنی تەلاقدراویش بۆ مێردەکەی، یەکێك نیە لە ئامانجە شەرعییەکانی هاوسەرگیریی.

کەواتە :

ئەوەی کە پێی دەگوترێ، هاوسەرگیریی حەلاڵکردن (زواج التحليل) کە بریتیە لەوەی ژنێکی سێ تەلاقە دراو، پاش بەسەرچوونی عیددە بەرێککەوتن (بالتواطؤ) مێرد بە پیاوێکی دیکە بکاتەوە، بەمەرجێك پاش چوونە لای تەلاقی بدات، تاکو بتوانێ مێرد بە مێردە پێشووەکەی بکاتەوە، شتێکی ناشەرعیی و ناشیرینەو، هەرچەند هەندێك لە زانایان بۆ وێنە: (شافعي و أبو يوسف و جەعفەرییەکان و ظاهیرییەکان) گوتوویانە: ئەگەر مەرجەکە لە گرێبەستەکەدا باس نەکرێ دروستە، بەلاّم ئەگەر باس بکرێ دروست نیە، بەلاّم رای زۆربەو جەماوەری زانایان ڕاست و بەڵگەدارە، کە ئەو جۆرە سەودایەیان بەهەرشێوەیەك بێ، بە قەدەغەو حەرام داناوەو، زۆر بەڵگەشیان هێناوەتەوە، بۆ نموونە:

١. فەرموودەی خوا : ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٢٣٠، چونکە خوا سبحانە وتعالى وشەی (إنْ) ی بەکارهێناوە بۆ تەلاقدانی مێردی دووەم، نەك (إذا)، کە دیارە ئەگەر (إن) بۆ گومانە، بەلاّم هەموکات (إذا) بۆ شتێکی مسۆگەرە، جا دیارە ئەگەر (زواج التحليل) ڕەوا بوایە، دەیفەرموو :(فإذا طلّقها)، چونکە تەلاقدانی بابای ژن لێ مارەکراو، بۆ حەلاڵکردنەوەی بۆ مێردەکەی، شتێکی مسۆگەرە .

٢. ئەو جۆرە ژن مارەکردن و تەڵاقدانە، جۆرێکە لە گاڵتەکردن بە ئایەتەکانی خوا، دیارە ئەویش حەرامە و بگرە کوفریشە: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗاۚ﴾ البقرة: ٢٣١ .

٣. چەند فەرموودەیەك لەو بارەوە هەن، کە ئەوجۆرە سەودایەیان قەدەغە کردوە، بۆ نموونە:

* (لعن الله المُحلِّلْ والمُحلَّلَ لَه)رواه أبوداود:١٧٧٨، والترمذي:١٠٣٩.

واتە: خوا لەعنەتی لە حەڵاڵکەرەوەو بۆ حەڵاڵکراوەوە کردوە، کە دیارە مەبەست لە (المُحلِّل) ئەو پیاوەیە کە ژنەکەی مارەدەکاتەوە بەمەبەستی حەڵاڵکردنەوەی بۆ مێردەکەی، وەمەبەست لە (المحلَّل لَهُ) ش بابای ژن بۆ حەڵاڵکراوەوەیە، بە گومانی خۆی !!

* (عن عتبة بن عامر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ألا أخبركم بالتَّيس المُستَعار؟ قالوا : بلى يا رسول الله، قال : هو المحلِّلُ، لعن الله المُحَلِّلَ والمحلَّلَ له) رواه ابن ماجه :١٩٢٦، واتە: پێتان بڵێم نێری خوازراو کێیە؟ گوتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی : حەڵاڵکەرەوەیە، لەعنەتی خوا لە حەڵاڵکەرەوەو بۆ حەڵاڵکراوەوە، ئاشکراشە وشەی (المحلِّل) و (المحلَّل لَهُ) وەك ناوەکەیان و قەناعەتی هەڵەی خەڵکەکە بەکارهاتوون، نەك بەمانای ڕاستەقینەی خۆیان.

**مەرجی دووەم: دەبێ مارەکردن (نکاح) ی دووەم جووتبوونی (وَطْأ)ی تێدا ئەنجام بدرێ،** ئەگەرنا تەنیا گرێبەستی هاوسەرگیریی (مُجَرَّد

عقد النكاح) بۆ ئەو مەبەستە بەس (كافي) نیە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوه:

(عن عمرو بن الزبير أنَّ عائشة أَخْبَرَتهُ : أن امرأة رِفاعَةَ القُرَظيِّ جاءت الى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقالت : يا رسول الله إن رِفاعة طَلَّقني فَبَتَّ طلاقي، وإني نكَحْتُ بعده عبدالرحمن بن الزبير القُرَظيّ وإنَّ ما مَعَهُ مثل الهُدْبَة، قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : لعلَّكِ تُريدين أنْ ترجعي إلى رِفاعة ؟ لا، حتىّ يذوق عُسَيْلَتك وتذوقي عُسَيْلَتَهُ) رواه البخاري : ٥٢٦٠.

واتە: هاوسەری ریفاعەتو لقورەزیی هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ریفاعە بەیەكجاریی تەلاقی داوم، منیش دوای وی مێردم بە عەبدولرەحمانی كوڕی زوبەیری قورەزیی كردۆتەوە، ئەویش ئەوەی پێیەتی (واتە: چووكی) وەك تیتوە پەڕۆیە (واتە: نەرم و شلە، یان گچكەو باریكە) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: رەنگە بتەوێ بگەڕێیەوە لای ریفاعە؟ نا، هەتا (مێردی دووەمت) شیرینایەتیت نەچێژێ و تۆش شیرینایەتی وی نەچێژی (نابێ بگەڕێیەوە).

شایەنی باسیشە تێكڕای زانایان لەسەر ئەو مەسەلەیە رێككەوتوون، بێجگە لە (سعيد بن المُسيِّب) و ئەوانەی رایان وەك ویە، هەڵبەتە مادام فەرمایشتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە هەیە، دەرفەتی قسەی كەس نیەو، واش پێدەچێ (سعيد بن المُسيِّب) ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) پێنەگەیشتبێ، وەك (إبن المنذر) لەو بارەوە گوتوویەتی: (أجمع العلماء على

اشتراط الجماع لتَحلَّ للأول الاّ سعيد بن المسَيّب اكتفى بعقد النكاح الصَّحيح لِيتحلَّ لزوجها الأول وان لم يدخل بها الثاني، إذا لم يقصد الثاني بنكاحه إياها إحلالَها للأول، وهذا القول لا نعلم أحداً وافقه عليه الاّ طائفة من الخوارج، ولعلّه لم يَبْلُغهُ حديث رسول الله صلى الله عليه وسلم فأخذ بظاهر القرآن) [1].

واتە: زانایان لەسەر بەمەرج گرتنی جووت بوون کۆکن، تاکو بۆ مێردی یەکەم حەلاڵ بێتەوە، جگە لە سەعیدی کوڕی موسەییب کە ڕای وایە گرێبەستێکی ڕاست بەسە بۆ حەلاڵ بوونی بۆ مێردی یەکەمی، هەرچەندە مێردی دووەمی نەچێتە لاشی، بەمەرجێك مێردی دووەم بەمارەکردنەکەی مەبەستی حەلاڵکردنەوەی نەبێ بۆهی یەکەم، ئەم قسەیەش نەمانزانیوە، جگە لەبەشێك لە خەواریج هیچ کەس هاوڕای بێ، وە ڕەنگە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێ نەگەیشتبێ، بۆیە ڕواڵەتی قورئانی کردۆتە بەڵگە.

هەڵبەتە مەبەستیشی لە (ظاهر القرآن) ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ﴾ کە دیارە وشەی (نکاح) یش لە ئەسڵدا مانای گرێبەست (عقد) ە و، وەپاشان بۆ جووت بوون (جماع) خوازراوەتەوە، وەك (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (أصل النكاح للعقد ثم أستعير للجماع، ومحالٌ أن يكون من الأصل للجماع ثم استعير للعقد، لأنَّ أسماء الجماع كلّها كنايات لاستقباحهم ذكره كاستقباح تعاطيه) [2]. واتە: وشەی نیکاح لە

(١) (المفصل...) ج٨، ص٩٠.
(٢) مفردات الفاظ القرآن، ص٨٢٣.

بنەڕەتدا بە مانای مارەکردنە، پاشان بۆ جووت بوون خوازراوەتەوە، وە ناگونجێ لە بنەڕەتدا بۆ جیماع بووبێ و، پاشان بۆ مارەکردن خوازرابێتەوە، چونکە ناوەکانی جیماع هەموویان کینایەن، لەسۆنگەی ئەوەوە کە باسکردنیشیان بۆی وەك ئەنجامدانی، پێ ناقۆلاَ بووە کە بە ئاشکراو لەبەرچاوان بێ.

■ **هاوسەرگیریی دووەم سێ تەلاَقەکانی مێردی پێشوو ناهێڵێ:**

واتە: هەرکات ژنێکی سێ تەلاَقە دراو، پاش بەسەرچوونی عیددەی شووی کردەوە، وە پاشان مێردی دووەمی بەهەر هۆیەکەوەبێ وازی لێهێنا، دوای ئەوەی چووبووە لای، پاشان عیددەی بەسەرچوو، وەمێردی یەکەمی مارەی کردەوە، ئەوە بەسێ تەلاَقەوە دەچێتەوە بۆلای، واتە ئەو ڕاجیاییەی کە لەوبارەوە لە جیابوونەوەی گچکە (البینونة الصغری) دا هەبوو، لێرەدا نییە، چونکە ژنی سێ تەلاَقەدراو، هیچ تەلاَقی نەماون.

(إبن المنذر) لەوبارەوە یەکدەنگیی زانایانی هێناوەو گوتوویەتی: (أجمع أهل العلم على أن الحرَّ اذا طلّق زوجته ثلاثاً ثم انقضت عِدَّتها، ونكحت زوجاً آخر ودخل بها ثم فارقها وانْقَضَتْ عِدَّتها، ثم نكحت زوجها الأول، أنّها تكون عنده على ثلاث تطليقات)[1].

ئێستاش دەگوازینەوە بۆ توێژینەوەی چوارەم جۆری تەلاَقدان، کە تەلاَقدانە لە ڕووی کاتی پەیدابوونی شوێنەوارییەوە.

---

(١) (المُغْني...) لابن قدامة، ج٧، ص٢٦١.

## ٤- تەڵاقدان لە ڕووی کاتی پەیدابوونی شوێنەوارییەوە :

تەڵاقدان لە ڕووی کاتی پەیدابوونی شوێنەوارییەوە دوو جۆرە:
یەکەم: تەڵاقدانی دەستبەجێ (الطلاق المُنجَّز).
دووەم: تەڵاقدانی هەڵواسراو (الطلاق المُعلّق).

### یەکەم : تەڵاقدانی دەستبەجێ (الطلاق المُنجَّز):

لەسێ بڕگەدا باسی ئەو جۆرە تەڵاقدانە دەکەین :

### أ- پێناسەی تەڵاقدانی دەستبەجێ :

مەبەست لەو جۆرە تەڵاقدانە ئەوەیە کە ڕێژگ (صیغة) ی تەڵاقدانەکە ڕەهابێ و، بەهیچ مەرجێکەوە نەبەسترابێتەوەو، پاڵ نەدرابێتە لای کاتی ڕابردوو یان داهاتوو، وەك ئەوەی پیاو بە ژنەکەی بڵێ : تۆ تەڵاقدراوی(أنتِ طالِقٌ)، هەروەها بەسترانەوەی تەڵاق بە شتێکەوە، کە بوونی مسۆگەر بێ، دیسان بە صیغەی دەستبەجێ تەڵاقدان دادەنرێ، بۆ وێنە : کە پیاوێك بە ژنەکەی بڵێ : ئەگەر ئاسمان لەسەروومانەوە بێ، تۆ تەڵاقت کەوتبێ (أنتِ طالق ان کانت السماءُ فوقنا) [1].

### ب- دەست بەجێ بوون، بناغەیە لە ڕێژگەی تەڵاقدان دا :

بناغە لە تەڵاقدان دا ئەوەیە کە دەستبەجێ بێ و یەکسەر تەڵاق بکەوێ، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد تەڵاق قەدەغەیە، مەگەر لەبەر ناچاریی و پێویستیی، ئنجا ناچاریی و پێویستییش ئەوە دەخوازێ کە تەڵاق یەکسەر

(١) (المفصل ...) ج٧، ص٤٦٢.

بکەوێ، ئەوەش کاتێك دەبێ کە بەشێوەی دەستبەجێ (مُنَجَّزْ) بێ[1].

## ج- حوکمی تەڵاقدانی دەستبەجێ :

سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە کۆك و تەبان کە ئەو جۆرە تەڵاقدانە، تەڵاقی پێدەکەوێ، مادام هەرکام لە مێردی تەڵاقدەر (الـزوج المُطَلِّقْ) و ژنی تەڵاقدراو (الزوجة المُطَلَّقة) مەرجەکانیان تێدابن، هۆی نەبوونی ڕا جیاییش لە نێوانیان دا لەبارەی کەوتنی تەڵاق بەجۆرە تەڵاقدانە، ئەوەیە کە ئەمە ڕێی ئاسایی تەڵاقدانەوە، ئەگەر تاکە شێوازو ڕێبازیشی نەبێ، وەك بەشێك لە زانایان گوتوویانە[2].

## دووەم : تەڵاقدانی هەڵواسراو (الطلاق المعلَّق):

خوا یاربێ لە دوو بڕگەش دا باسی ئەم جۆرە تەڵاقدانە دەکەین :

## أ- پێناسەی تەڵاقدانی هەڵواسراو :

مەبەست لەوجۆرە تەڵاقدانە ئەوەیە کە بابای تەڵاقدەر (مُطَلِّقْ) کەوتنی تەڵاق دەبەستێتەوە بەشتێکەوە کە بە مەرجی گرتوەو دەشگونجێ بێتە دی، وەك ئەوەی کە بە ژنەکەی بڵێ : ئەگەر بەبێ مۆڵەتی من لە ماڵ چوویە دەرێ، تۆ تەڵاقدراوی (إنْ خرجت من الدار بغير إذني، فأنتِ طالق).

زانایان لەبارەی کەوتن و نەکەوتنی تەڵاق بەجۆرە تەڵاقدانە، ڕا جیاییان هەیە، زۆربەیان ڕایان وایە تەڵاقی پێ دەکەوێ و، **ظاهیرییەکان** و جەعفەرییەکانیش دەڵێن : تەڵاقی پێ ناکەوێ، چ مەرجەکە بێتەدی، چ

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٤٦٣.

(٢) (المفصل ...)، ج٧، ص٤٦٣.

نەیەتە دی .

شایانی باسیشە کە ئەوانەی نکوولیی لە کەوتنی تەلاق بەو جۆرە تەلاقدانە دەکەن، بەڵگەیان ئەوەیە کە شەریعەت بەو جۆرە باسی تەلاقدانی نەکردوە، بۆیە تەلاقی پێ ناکەوێ .

وە زۆربەی زانایانیش ئەوە بەبەڵگە دێننەوە کە مادام تەلاقدان هەڵسوکەوتێکی شەرعییە، چ دەست بەجێ بێ، چ هەڵواسراو بەمەرجەوە، هەر پێویستە پابەندی پێوە بکرێ، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِ ﴾المائدة:١، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پەیمان و گرێبەستەکان جێ بەجێ بکەن .

هەروەها پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (**المسلمون على شروطهم الاّ شرطاً أحلّ حراماً أو حَرّم حلالاً**) **رواه أبو داود والحاكم عن أبي هريرة، ورواه الحاكم عن أنسٍ، ورواه الترمذي وصَحَّحَهُ، ورواه البخاري مُعَلقاً ورواه الطبراني.**

واتە : مسوڵمانان لەسەر مەرجەکانیانن، مەگەر مەرجێك حەرامێك حەلاڵ بکات، یان حەلاڵێك حەرام بکات.

ئنجا دەڵێین: بێگومان هەڵواسینی تەلاقدان بەمەرجێکەوە، هیچ حەلاڵکردنی حەرام و حەرامکردنی حەلاڵی تێدانیە، بۆیە شتێکی ڕەوایە .

منیش پاش سەرنجدانی بەشێك لە مشت و مڕو ڕا جیایی زانایان لەو بارەوە، گەیشتمە ئەو ڕایە کە بڵێم:

هیچ کام لەو دوو ڕایە بەڵگەی یەکلایی کەرەوەیان پێ نیە، چونکە کەمینە لە وەلامی بەڵگە هێنانەوەی زۆرینەدا بە:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ

﴿بِٱلۡعُقُودِۚ﴾ وە (المسلمون على شروطهم) دا، بۆیان هەیە بڵێن:
یەك: ئەو گرێبەستە، چونکە لە شەریعەت دا نەهاتوە، ئایەتەکە نایگرێتەوە، چونکە گرێبەستێکی ناشەرعییە!
دوو: مەرجدارکردنی تەلاق بەهەرشتێکەوە، مایەی حەرامکردنی حەلاڵ و حەلاڵکردنی حەرامە، بۆیە پێیەوە پابەند بوونی نەك هەر پێویست، بگرە دروستیش نیە!
بۆیە پێم وایە ئەگەر دەسەڵاتی شەرعیی بە مەبەستی سنووردارکردنی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەکان، بەهۆی ئەو جۆرە تەلاقدانانەوە، ئەو رایە تەبەنیی بکات، کە تەلاقی هەڵواسراوو مەرجدار (**الطلاق المعلّق والمشروط**) ناکەوێ، شتێکی ئاسایی و ڕەواو بگرە پەسندو باشیشە، وەك هەرکام لە یاسای عێراقی و ئوردونیی و مەغریبیی کردوویانە [(١)].

ئێستاش دەچینە سەر توێژینەوەی کۆتا جۆری تەلاقدان، کە بریتیە لە سوێند خواردن بە تەلاق :

## ٥- سوێند خواردن بە تەلاق (الحَلِفُ بِالطَّلاق):

ئەو جۆرە تەلاقدانانەش لە دوو بڕگەدا دەتوێژینەوە : [(٢)].
یەکەم : شێوەکانی سوێند بەتەلاق خواردن.
دووەم: حوکمی سوێند بەتەلاق خواردن .

---

(١) أحكام الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي المقارن، د. مصطفى الزلمي، ص١٧٥.
(٢) (المفصل ...)، ج٧، ص٤٨٠-٤٨٤.



**یەکەم : شێوەکانی سوێند خواردن بە تەڵاق :**

بەگشتی سوێند بەتەڵاق خواردن، دوو شێوەی هەن :

یەك: کە بەشێوەی سوێند بێ و هیچ هەڵواسین و بەمەرج گرتنی تێدا نەبێ، بۆ وێنە: بڵێ: تەڵاقم بکەوێ، ئەو کارە دەکەم (**الطلاق يَلْزَمُني لأفعَلَنَّ كذا**)، یان بڵێ : بەتەڵاقم ئەو کارە دەکەم (**بالطلاق لأفعلنَّ كذا**).

دوو: کە بەشێوەی هەڵواسینی تەڵاق بێ بەمەرجێکەوە، وەك ئەوە کە مێرد بە ژنەکەی بڵێ ئەگەر بەبێ مۆڵەتی من لەماڵ بچیتە دەرێ، تۆ تەڵاقدراوی (**إن خرجتِ من الدار بغير إذني فأنت طالق**).

ئنجا هەرچی شێوەی یەکەمیانە، ئەوە سەرجەم زمانزانان و شەرعزانان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بەسوێند دادەنرێ، بەلام شەرعیی و ناشەرعیی بوونی سوێندەکە، مەسەلەیەکی دیکەیە کە دوایی باسی دەکەین .

بەلام شێوەی دووەمیان، کە هەڵواسینە بە مەرجێکەوە، ئەوە کاتێك بە سوێند دادەنرێ، کە یەکێك لەم چوار شتە بگرێتە خۆی :

١- ئەگەر هاندان (**تحضيض**) بگرێتەوە، وەك یەکێك بڵێ : ئەگەر ئەمرۆ سەفەرم نەکرد، ژنەکەم تەلاقی نەمابێ (**إنْ لم أُسافر اليوم فامرأتي طالق**).

٢- ئەگەر ڕێگریی کردن لەکارێك بگرێتە خۆی، وەك کەسێك بە ژنەکەی بڵێ : ئەگەر بەبێ مۆڵەتی من لەماڵ چوویە دەر، تەلاقت نەمابێ (**إنْ خرجتِ من الدار بغير إذني فأنت طالق**).

٣- ئەگەر بابای بیسەر وا دار بکات کە بڕوا بە شتێك بێنێ، بەڕاستی بزانێ، وەك ئەوە کەسێك بڵێ: بەتەلاقم دوێنێ سەردانی فلانە کەسم کرد (**عليَّ الطلاق لقد زرتُ فلاناً بالأمسِ**).

٤- ئەگەر بابای بیسەر واداربکات، کە شتێك بەدرۆبزانی، وەك ئەوە کەسێك بڵێ، تەڵاقم بکەوێ ئەو قسەیەی فلانە کەس لەمنەوە بۆی هێناوی، نەمگوتوە (عليَّ الطلاق، ما قلت هذا الذي نَقَلَه فلانٌ اليك عَنّي).

بەڵام ئەگەر ڕێژگە (صيغة) کە، نەمانای شێوەی یەکەمی گەیاند، نەهی دووەم، ئەوە بەسوێند بەتەڵاق خواردن دانانرێ، بەڵکو تەنیا بە هەڵواسین (تعليق) دادەنرێ، بۆ وێنە : ئەگەر بڵێ : ئەگەر فلانە کەس لە سەفەری گەڕایەوە، ژنەکەم تەڵاقی کەوتبێ (إن جاء فلانٌ من سفره فامرأتي طالق)، ئەوە هەرکات ئەو کەسە لە سەفەرەکەی هاتەوە، تەڵاقی دەکەوێ، چونکە مەرجەکە هاتۆتە دی.

## دووەم: حوکمی سوێند بەتەڵاق خواردن :

زانایان لەبارەی حوکمی سوێند بە تەڵاق خواردنەوە، ڕاجیایی زۆریان بووەو هەیە، هەرچی ظاهیرییەکانن، ڕایان وایە کە تەڵاق بەو جۆرە ناکەوێ، بەهەر شێوەیەك بێ، (إبن حزم) لەوبارەوە گوتوویەتی: (واليمين بالطلاق لا يَلْزَم، وسواء بَرّ أو حَنَثَ لا يقع به طلاق) [1]، واتە: وەسوێند بە تەڵاق خواردن تەڵاقی پێ ناکەوێ، چ سوێندەکەی بەرێتە سەر، یان نەیباتە سەر، تەڵاقی پێ ناکەوێ.

هەڵبەتە ژمارەیەکی زۆریش لە زانایان پێیان وایە، سوێند بەتەڵاق خواردن تەڵاقی پێ دەکەوێ، وە بەشێکیشیان ڕایان وایە کە پێی ناکەوێ، مەگەر مەبەستی کابرا تەڵاقدانی ژنەکەی بێ .

---

(١) المحلي، ج١٠، ص٢١١–٢١٢.

منیش پاش تێوەڕامانی مەسەلەکەو قسەی زانایان لەو بارەوە ئەوەی لە بیرو ڕای زانایان لەوبارەوە بەڕاست و دروستی دەزانم، لەم چەند بڕگەیەدا کورت و پوختی دەکەمەوە :

یەك: ئەگەر سوێند بەتەلاق خواردنەکە بەسوێند دابنرێ، ئەوە ئاشکرایە کە لە ڕوانگەی شەریعەتەوە سوێند دوو جۆرە :

١- سوێندی شەرعیی و دامەزراو.

٢- سوێندی ناشەرعیی و دانەمەزراو .

ئنجا هەرچی سوێندی شەرعییە، کە بریتیە لە سوێند خواردن بەخواو بە سیفەتەکانی، ئەوە بابای سوێند خۆر، ئەگەر سوێندەکەی شکاند پێویستە کەفارەت بدات، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ ﴾ المائدة: ٨٩.

بەلام سوێندی ناشەرعیی، کە بریتییە لە سوێند خواردن بە دروست کراوەکانی خوا، ئەوە بە یەکدەنگیی زانایان کەفارەتی ناوێ، بەلام دیارە سوێندخواردن بەغەیری خوا، حەرامە وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (فَمَنْ كان حالفاً فلا يَحْلِفْ إلا بـالله أو لِيَسْكُتْ) رواه مسلم : ١٦٤٦، الاّ قوله: (ليسكُتْ).

کەواتە:

سوێند بەتەلاق خواردن، ئەگەر لە ڕیزی سوێندەکانی مسـولمانان (أيمـان المسلمين) دابێ، ئەوە بەپێی فەرمایشتی خـوا : ﴿ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ ﴾ التحريم: ٢، کەفارەتی لەسەرە .

دوو: بـەلام ئەگـەر بـە سـوێندی مسـولمانان دانـەنرێ، ئـەوە بـەهۆی بـەجێ نەهێنانیەوە کەفارەتی لەسەر نیەو قسەیەکی پووچ و بۆشە .

ئنجا هیچ گومانیشی تێدانیـە کـە تـەعبیری : (بەتـەلاقم) یـان (تـەلاقم کـەوتبێ) یـان (تـەلاقم لەسـەر بـێ) هـیچ کامیـان سـوێند خـواردنی مسولمانانە نین‌و، قسەی پووچ و هەڵەن .

سێ : بابای سوێند بەتەلاق خۆر، دوو حاڵەتی هەن:

أ- کە مەبەستی تەلاق دان بێ، بۆ وێنە: پیاوێك بە ژنەکەی بڵێ: ((ئەگەر دزییت کرد، تەلاقت کەوتبێ)) یان ((ئەگەر خیانـەتت لێکـردم، تـەلاقت کەوتبێ))، ئەوە مادام مەبەستی ئەوە بێ، کە ئەگەر ئەو کارانەی کـردن وەك سزادانێك تەلاقی دەدات، لەسەر ڕای ئەوانەی کە بەو جۆرە تـەلاقی دەکـەوێ، هـەرکات ژنەکـەی ئـەو ڕەفتارانـەی لێ دەرکـەوتن، تـەلاقی دەکەوێ.

ب- کە مەبەستی جەختکردنەوە و داکۆکیی کردن بێ لەسەر نەکردنی یان کردنی شتێك، نەك تەلاقدانی ژنەکەی، بـۆ وێنـە : پیاوێـك بـە ژنەکـەی بڵێ: ((ئەگەر بچیـە سـالۆن، تـەلاقت کـەوتبێ)) یـان ((ئەگـەر ڕێـزم لێ نـەگری، تـەلاقت کـەوتبێ)) ئـەوە تـەلاقی ناکـەوێ، چـونکە مەبەسـتی تەلاقدانی ژنەکەی نەبووە، بەڵکو هاندان و ترساندنی بووە، تاکو ئـەوەی لێی قەدەغـە کردوە نەیکات، یان ئەوەی داوای لێکردوە بیکات.

## پوختەی قسان:

ئەگەر سوێند خواردن بەتەلاق مەبەست پێی لە جۆری مەبەستەکانی سوێند بێ، کە بریتین لە :

١- هاندان بۆ کردنی شتێك .

٢- ڕێگرتن لە کردنی شتێك .

٣- وادارکردن بۆ بە ڕاست زانین .

٤- وادار کردن بۆ بەدرۆزانین .

ئەوە تەنیا مامەڵەی سوێندی لەگەڵ دەکرێ، جا چ کەفارەکەتەی بدرێ، چ نەدرێ، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی مەرج دانان و بەستنەوەی تەلاقدان بێ بەو مەرجەوە، ئەوە بەپێی ڕای ئەوانەی دەڵێن ئەو جۆرە تەلاقدانە، تەلاقی پێ دەکەوێ، هەرکات مەرجەکە هاتەدی، کە تەلاقدانەکە بەهاتنەدییەوە بەستراوە، تەلاقەکە دەکەوێ .

لێرەش دا کۆتایی بە توێژینەوەمان لەبارەی تەلاقدانەوە دێنین و تەوەری یەکەم تەواو دەکەین و دەچینەسەر تەوەری دووەمی ئەم بەشە :



## تەوەری دووەم : لەخۆداڕنینی ژن بۆ مێردەکەی (الخُلْع)

خوێنەری بەڕێز!

وەك پێشتریش باسمان کرد، شەریعەتی دادگەرانەی خوای کار بەجێ و زانا، وەك چۆن مافی تەڵاقدانی بە پیاو داوە، لەکاتێك دا لەگەڵ ژنەکەیدا دەگاتە بن بەست و ناتوانن پێکەوە ژیانێکی شایستە بگوزەرێنن، بەهەمان شێوە مافی بە ژنیش داوە کە لە حاڵەتێکی وادا بتوانێ خۆی دەرباز بکات، بەهۆی لەخۆداڕنینی پیاوەوە، ئەوەندە هەیە پیاو بە حوکمی بەرپرسیاریەتیی بەرانبەر بە خێزان، بۆی هەیە بەشێوەی سەربەخۆ (مُستقل) ئەو بڕیارە بدات، بەلاّم ژن پێویستە بە ڕاوێژ و ئاگاداری مێردییەوە ئەو کارە بکات، مادام مێردەکەی بیانووی پێ نەگرێ و چاوی لە ستەم نەبێ، کە ئەگەر وابێ دادوەر (**قاضي**) دێتە نێوەوەو پیاو پابەند (**مُلْزَمْ**) دەکات.

(إبن رشد) لەوبارەوە کە وەك چۆن مێرد مافی تەڵاقدانی هەیە، ژنیش مافی لەخۆ داڕنین (**خُلْع**) هەیە، گوتوویەتی:

(**والفقه أنَّ الفِداءَ إنَّما جُعِلَ للمرأة في مقابلة ما بيد الرجل من الطلاق، فانَّهُ لما جعل الطلاق بيد الرجل إذا فَرَكَ المرأة، جعل الخلع للمرأة إذا فَرَكَتِ الرجل**)[1]، واتە: تێگەیشتنی ورد لەوبارەوە ئەوەیە، کە قەرەبوو دان لەبەرانبەری ئەوەدا بۆ ژن دانراوە، کە پیاو تەڵاقدانی بەدەستە، چونکە لەبەرانبەر ئەوەدا کە پیاو ئەگەر ژنی بوغزاند، تەڵاقدانی بەدەستە ، ژنیش ئەگەر پیاوی بوغزاند و لەگەڵی مەدار نەکرد، داڕنین (**خُلْع**) ی بەدەستە.

---

(١) بداية المجتهد ونهاية المقتصد، ج٢، ص٦٨.



جا ئێمە خوا پشتیوان بێ هەوڵدەدەین، لە دە (١٠) خاڵ دا باسی بابەتی دارِنین (خلع) بکەین، کە ئەمە ناوونیشانەکانیانە:

١- پێناسەی خولع .
٢- رەوایی خولع .
٣- حوکمی خولع .
٤- حیکمەتی خولع
٥- پێگەی فیقهیی خولع .
٦- پایەکانی خولع .
٧- حاڵەتەکانی خولع .
٨- وەکیل گرتن بۆ خولع دروستە.
٩- مۆڵەتی دادوەر بۆ خولع پێویست نیە.
١٠- شوێنەوارەکانی خولع .

ئێستاش بەرێز بە توێژینەوەی سەرجەم ئەو مەسەلانەدا دەچینە خوار، کە لەو دە خاڵەدا ناوونیشانەکانیانمان نووسی:

## ١- پێناسەی خولع:

وشەی:(خَلَع يَخْلُعُ خَلْعاً) واتە: دارِنین، (خَلَعَ أمرأته خُلْعاً وخِلاعاً) واتە: ژنەکەی لەخۆی دارِنی و وازی لێ هێنا لە بەرانبەر قەرەبوویەك دا.

وە: (خالَعَتْهُ واختلعَتْ منه اختلاعاً، فهي مُخْتَلِعة) واتە: ژنەکە مێردەکەی لەخۆی دارِنی و دەستبەرداری بوو[1].

لە زاراوەی شەرعیش دا(خُلْع) هەر لەسەر ریشەی مانا زمانەوانییەکەی

(١) لسان العرب، لابن منظور، ج٩، ص٤٢٩، وە: النهاية لابن الأثير، ج٢، ص٦٥.

بەکارهێنراوەو، شەرعزانان بەچەند جۆرێك پێناسەیان کردوە، کە هەموویان لەو سورِگەیەدا دەخولێنەوە کە بریتیە لە : لە خۆدارِنینی ژن بۆ مێردی لەبەرانبەر قەرەبوو (فدیة، عوض) یێك دا کە ژنەکەی پێی دەدات لەسەر بناغەی لێك تێگەیشتن (تفاهم) ی نێوانیان، بۆ وێنە: ئەمە یەکێکە لە پێناسەکان: (**الخُلْعُ إزالَةُ ملكِ النكاحِ بمالٍ تَدْفَعُهُ الزوجة لِزَوْجِها بِألْفاظٍ مخصوصة**) [١].

واتە: خولع : لابردنی مافی هاوسەرێتییە لەلایەن ژنەوە، لەبەرانبەر ئەندازەیەك سامان دا، کە دەیداتە مێردەکەی، کە بەچەند وشەیەکی تایبەت جێ بەجێ دەکرێ.

## ٢- رِەوایی خولع:

لەخۆدارِنینی ژن بۆ مێرد لەهەلو مەرجی شەرعییانەدا شتێکی رِەوایەو، وێرِای عەقلی ساغ، قورئان و سوننەت و یەکدەنگیی زانایان (إجماع) یش بەلگەینی:

### ١- ئایەتەکانی قورئان :

* ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ ﴾ البقرة: ٢٢٩ .

واتە: تەلاّقدان دوو کەرِەتە (یانی تەلاّقدانێك کە رِەوابێ مێرد لە عیددەدا ژنەکەی بگێرِێتەوە) پاشان، یان گرتنە خۆیەکی پەسند، یان واز لێهێنانێکی باش، وە بۆتان رِەوانیە کە هیچ شتێك لەوەی پێتان داون، لێیان وەربگرنەوە، مەگەر

(١) (المفصل..) ج٨، ص١١٥.

بترسن کە سنوورەکانی خوا بەرپانەکەن، جا ئەگەر مەترسییتان هەبوو کە سنوورەکانی خوا بەرپانەکەن،، ئەوە گوناهیان ناگات لەوەدا کە ژنەکە خۆی پێ دەرباز بکات و بیبکاتە قەرەبوو .

## ٢- دەقەکانی سوننەت:

* (عن ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، جاءت امرأةُ ثابتِ بنِ قَيْسٍ الى النبيِّ صلى الله عليه وسلم فقالَتْ :يا رسولَ اللَّه، ثابتُ بنُ قَيسٍ ما أعيبُ عليه في خُلُقٍ ولا دِينٍ، ولَكنِّي أكْرَهُ الكُفْرَ في الإسلامِ، فقالَ رسولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم: ((أتَرُدِّينَ عليه حَديقَتَهُ؟))، قالَتْ: نَعَمْ، فأمرها بردِّها، وأمَرَهُ بِفِراقها) رواه البخاري: ٥٢٧٣.

واتە: ژنی ثابیتی کوڕی قەیس هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ثابیتی کوڕی قەیس، هیچ ڕەخنەم لە ڕووی دین و ڕەوشتەوە لەسەری نیە، بەڵام پاش هاتنە نێو ئیسلام، ڕقم لە کوفرو گوناهە ! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی، ئایا باغەکەی دەدەیەوە ؟ گوتی : بەڵێ، ئیدی فەرمانی پێکرد کە باغەکەی بۆ بگێڕێتەوە (کەوا دیارە مارەییەکەی بووە) وە فەرمانیشی بە ثابیت کرد وازی لێ بێنێ.

## ٣- یەکدەنگیی زانایان :

(إبن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی : (والقول بالخُلع هو قول عمر و علي وعثمان وغيرهم من الصَّحابة لَم نعرِفْ لهم في عصرهم مخالفاً فيكون إجماعاً)[1].

---

(١) المغني لابن قدامة، ج٧، ص٥٢–٥٣.

واتە: وە بەڕەوا دانانی خولع ڕای عومەرو عەلی و عوسمانە، وە نەمانزانیوە هاوەڵانی دیکەش لە ڕۆژگاری خۆیان ڕایان لەوان جیاوازبێ، بۆیە یەکدەنگیی لەسەرە .

هەروەها (الجّصاص) یش گوتوویەتی : یەکدەنگیی زانایان لەسەر ڕەوایی خولع هەیە[1].

وە (ابن حجر العسقلاني) یش بەهەمان شێوە، وەك لە (فتح الباري) لە پاش بەرپەرچدانەوەی قسەی (بكر بن عبدالله المُزني) کە گوتوویەتی: ئایەتی خولع نەسخ بوەتەوە، گوتوویەتی: (وانعقد الإجماعُ بَعْدُ على اعتبار الخُلْعِ) [2]. واتە: وەپاش وی یەکدەنگی لەسەر ڕەوایی خولع دامەزراوە.

## ٣- حوکمی خولع :

زانایان لەبارەی حوکمی خولعەوە زۆریان مشت و مڕو ڕا جیایی لەنێواندا هەیە، جا چ داوای خولع لەلایەن ژنەوە بێ، کە ئەوە ئەصڵە، چ لەلایەن پیاوەوە بێ .

منیش پاش لێوردبوونەوەی ئەو مەسەلەیە و قسەو بیرو ڕای زانایان و بەڵگەکانیان، گەیشتومە ئەو قەناعەتەی کە لەم دوو بڕگەیەدا دەیخەمە ڕوو:

یەك: خولعیش وەك تەلاق چ بڵێین لە حاڵەتی ئاساییدا بناغەی تێدا ڕەوایی یە، چ بڵێین بناغە تێیدا قەدەغە بوونە، لە حاڵەتە نا ئاساییەکان دا حوکمەکەی دەگۆڕێ و چوار حوکمە شەرعییەکان : پێویست بوون و پەسند بوون و قەدەغە بوون و ناپەسند بوون (الوجوب والنّدْب والحرمة والكراهة) ڕووی تێدەکەن.

---

(١) أحكام القرآن، ج١، ص٣٩٢.

(٢) فتح الباري، ج٩، ص٣٩٥-٣٩٦.

بەڵگەی ئەوەش :

١- فەرمایشتی خوایە سبحانە وتعالی : ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾ البقرة: ٢٢٩ .

کەواتە: هەرکات ژن و مێرد مەترسیی ئەوەیان هەبوو، کە سنوورەکانی خوا بەرپا نەکەن و، تووشی گوناهو خراپە ببن و، مافەکانی یەکدی بفەوتێنن، ئەوە گوناهیان ناگات، ئەگەر ژنەکە فیدیەو قەرەبوو بدات و خۆی لە داوای مێردەکەی دەرباز بکات.

٢- فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) : (أَيُّمَا امْرَأَةٍ اخْتَلَعَتْ مِنْ زَوْجِهَا مِنْ غَيْرِ بَأْسٍ لَمْ تَرِحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ) رواه الترمذي .

واتە: هەر ژنێك بەبێ هۆ خۆی لە مێردەکەی دارنێ، بۆنی خۆشی بەهەشتی بۆ نایەت .

* (أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلَاقًا فِي غَيْرِ بَأْسٍ فَحَرَامٌ عليه رَائِحَةُ الْجَنَّةِ) رواه أبو داود.

ئەوەی بەروونییش لەم ئایەت و فەرمایشتانە وەردەگیرێ، ئەوەیە کە :

أ- خولع لەبنەڕەتدا مافی ژنە بۆ دەرباز بوون لە مێردێك کە دەزانێ لەگەڵی مەدار ناکات و، ناتوانێ یاساو سنوورەکانی شەریعەتی لەگەڵدا بەرپا بکات، بەبەڵگەی ڕستەی :﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾ .

ب- ژن و پیاو هەتا مەترسیی بەزاندنی سنوورەکانی شەریعەتیان نەبێ، درووست نیە پەنا ببەنە بەر خولع، بەبەڵگەی ڕستەی :﴿ وَلَا يَحِلُّ

لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾، کەواتە: بەبێ هەبوونی ئەو مەترسییە ئەو مەسەلەیە ڕەوانییە، جا یان حەرام یان بەلای کەمەوە ناپەسندەو، هەڵبەتە باری گوناحیش بەلای دەستپێشخەردا لار دەبێ کە ژنە، دواتریش تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیە .

ج- بەلام ئەگەر دڵنیابوون یان گومانی زاڵ (الظن الرّاجح) یان هەبوو کە ناتوانن پێکەوە ژیانێکی شەرعییانە بگوزەرێنن، ئەوە فەرزە یان بەلای کەمەوە پەسندە، کە بە تەلاق یان بە خولع لێك بترازێن، بە بەڵگەی ڕستەی : ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾.

دوو: هەرچەندە خولع لەبنەڕەتدا مافێکە بە ژن دراوە لەبەرانبەر تەلاقداندا کە مافی مێردە، بەلام بەرای زۆربەی زانایان، دەگونجێ خولع لەلایەن پیاویشەوە بێ، واتە پیاو دەستپێشخەری خولع کردن بێ لەگەڵ ژنەکەی، بەلام پێم وایە ئەگەر پیاو دەستپێشخەری خولع بوو، هەڵوێستەکەی وەك هی ژن چوار حوکمەکان نایگرنەوە، بەڵکو یان قەدەغە، یان بەلای کەمەوە ناپەسندە، چونکە:

أ- پیاو تەلاقی بەدەستەو، هەرکات لە ژنەکەی بێزار بوو و زانی پێکەوە ناگونجێن، هیچ پەکی لەسەر خولع نەکەوتوەو پێچەوانەی جوامێرییشە ژنەکەی خۆی نەوێ و ناچاریشی بکات، قەرەبووی بداتێ و مارەییەکەی بداتەوە !





ب- خـوا فەرموویـەتی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ ﴾ النساء: ١٩ .

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! بۆتان حەلاڵ نیە کە بەزۆر ئافرەتان بـە مـیرات بگـرن، وە سـەغڵەتیان مەکـەن و، زیانیـان پـێ مەگەیـەنن بەمەبەستی وەدەسـت خسـتنی بەشـێك لـەو سـامانەی کـە پێتـان داون، مەگەر بە یاخیی بوونێکی ئاشکراوە ڕەفتار بکەن.

(إبـــن کـــثیر) لـــە تەفســـیری ﴿ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ ﴾دا، گوتوویەتی: (أي : لا تُضـارُّوهُنَّ في العشْـرَة لتَتْـرُكَ لك ما أصْدَقْتَها أو بَعْضَهُ، أو حقاً من حقوقها عليك أو شيئاً من ذلـك على وجه القهر لها والإضطِهاد) [1].

واتە: یانی لەهەڵس و کەوتدا زیانیان پێ مەگەیەنن، تاکو ئەو مارەییەی پێـت داوە یـان هەنـدێکی، یـان مافێـك لـە مافـەکانی لەسـەرت، یـان بەشێکی دەست لێهەڵبگرێ، بەهۆی ناچارکردن و چەوساندنەوەوە.

بـەڵێ، بەسـەرنجدانی ئایەتـەکانی قورئـان و دەقـەکانی سـوننەت — کـە لەداهاتووشدا زیاتر لە خزمەتیان دا دەبین- مەگەر چۆن، دەنا پـەنا بردنـی پیاو بۆ خولع تووشی گونـاهی دەکـات، بـەهۆی تەماعێکـەوە کـە لـەماڵی ژنەکەیدا هەیەتی، تەنیا حاڵەتێك لـەو حوکمـە هـەڵاوێراوە، کـە بریتیـە لـە

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص٢٨١.

حاڵەتی یاخیبوونی ئاشکرای ژن، وەك لەخاڵی حەوتەم دا باسی دەکەین .

## ٤- حیکمەتی خولع :

حیکمەتی خولع هەر لە ئایەتەکەی خولع دا خراوەتە ڕوو : ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ﴾ البقرة ٢٢٩، واتە : : ئنجا ئەگەر ترسان کە سنوورەکانی خوا بەرپا نەکەن، ئەوە گوناهیان ناگات لەوەدا کە ژنەکە دەیکاتە فیدیەو قەرەبووی (دەرباز بوونی) خۆی .

(إبن قدامة) ش لەوبارەوە گوتوویەتی : (والخلع لإزالة الضَّرر الذي يَلْحَقُها بِسوْ العِشْرَةِ والمُقام مع مَنْ تَكْرَهُهُ وتُبْغِضهُهُ) [(١)].

واتە: وە خولع بۆ ئەوەیە کە ئەو زیانە لە ژن لابدرێ کە بەهۆی خراپ ڕەفتار لەگەڵ کرانەوە تووشی دەبێ، وە بەهۆی مانەوەیەوە لەگەڵ کەسێکدا کە حەز لە چارەی ناکات و رقی لێیەتی.

کەواتە: -وەك پێشتریش گوتمان — خولع لە بنەڕەتدا مافی ژنەو ئامانجیش لێی خۆدەربازکردنیەتی لە پیاوێك کە بەهەر هۆیەکەوە بێ، چارەی ناوێ و ناتوانێ ژیانێکی ئاسایی ژن و مێردانەی لەگەڵ بگوزەرێنێ و، سەرەنجام تووشی گوناهباریی و عەیبداریی دەبن .

## ٥- پێگەی فیقهیی خولع :

شەرعزانان لە بارەی پێگەی فیقهیی خولعەوە کە ئایا دەکەوێتە بەر چ ناوونیشانێکەوە ؟ ڕاجیایی و مشت و مڕی زۆریان بووە و هەیە، بەڵام زۆربەیان کە

---

(١) المغني، ج٧، ص٥٢.





هەر کام لە : (أبو حنيفة و مالك و شافعي و أحمد) یان لە نێودان، ڕایان وایە کە خولـع، بەتایبـەت ئەگـەر لەلایـەن ژنـەوە بـێ، دەکەوێتـە بازنـەی گۆڕینـەوەکان (المُعاوضات) ەوە، کە دیارە ئەویش پێچەوانەی پێدانەکان (التبرُّعات) نە، چونکە گرێبەسـتەکانی گۆڕینـەوەکان (عقـود المعاوضـات) ئەوانـەن کـە یـەکێك لـە دوو لایەنەکان پابەندییەك بەرانبەر بە لایەنەکەی دیکە دەردەبڕێ، لەبەرانبـەر قـەرەبوو (عـوَض) یـەك دا کـە لێـی وەردەگرێ، بـەلام گرێبەسـتەکانی پێدانـەکان (عقـود التبرُّعـات) ئەوانـەن کـە یـەکێك لـە دوو لایەنـەکان شـتێك بەلایەنەکـەی دیکـە دەبەخشێ، بەبێ بەرانبەر و قەرەبوو .

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە دارنین (خُلْع) یش لە ئەنجامی ئەوەدا دێتەدی، کـە ژن و مێـرد لەسـەر کۆتـایی پێهێنـانی ژیـانی ژن و مێردایـەتییان ڕێکدەکـەون، لەبەرانبەر قەرەبوو (فدية) یەك دا، کە ژنەکە بە مێردەکەی دەدات، چونکە ژنەکـە دەسپێشخەری جیابوونەوەیە، بۆیـە کـت و مـت وەك گرێبەسـتەکانی گۆڕینـەوەکان وایەو، جگـە لـەو شـتانەی کـە تایبەتمەنـدیی هاوسـەرگیریی (خصوصيات الزواج) جیایـان دەکاتـەوە، سـەرجەم یاسـاکانی گرێبەسـتەکانی گۆڕینـەوەکانی بەسـەردا دەچەسپێن[1]، کە لەسەرچاوە فیقهییەکان دا بە درێژیی باسکراون، وەك:

پێویست کردن و پەسند کـردن (الإيجـاب والقبـول) و مـافی پەشـیمان بوونـەوە لەماوەی سێ ڕۆژدا (حق الخيار في ثلاثة أيام)، وەك یەکبوونی پێویسـت کـردن و پەسندکردن (تطابق الإيجاب والقبول) .

بەلام بۆ مەسەلەی شایەد لێگرتن (الإشهاد)، لەهیچ کام لـەو سەرچـاوانەدا کـە لەبەر دەستم دابوون، باسی نەکرابوو، هەڵبەتە لەو ئایەت و فەرمایشـتانەش دا کـە

(١) بڕوانە: (الخلـع وأحكامُـهُ الشـرعية) للشـيخ فيصـل مولـوي، المجلـة العلميـة للمجلـس الأوروبي للإفتاء، العددان : الثامن والتاسع، ص٢١٥.

باسی خولعیان کردوە، دیسان باسی شایەد گرتن نەکراوە، کە دیارە ئەمەش یەکێکە لەجیا کەرەوەکانی خولع لە گۆڕینەوەکان (مُعاوضات)، کە گوتمان خولع لە ڕیزی ئەوان دایە، بەڵام چەند تایبەتمەندییەکی هەن کە لەوان جیای دەکاتەوە، وەك یەکێك لە مەسەلەکانی هاوسەرگیریی .

## ٦- پایەکانی خولع:

خولع چوار پایەی سەرەکی هەن، هەرچەندە لەهی چوارەمیان دا ڕاجیایی هەیە :

١- دارنەر (المُخالِع).

٢- لەخۆ دارنەر (المختلعة).

٣- ڕێژگە (الصیغة).

٤- قەرەبوو (العوض، الفدیة).

## ١- دارنەر (المُخالِع):

کە (خالِع) یشی پێ دەگوترێ و مەبەست پێی مێردە کە لەگەڵ ژنەکەی، هەردووك لایەنی خولع پێك دێنن.

دیارە زانایان زۆریان باسی ئەو شتانەیان کردوە کە لە مێرد (زوج) دا بەمەرج گیراون بۆ ئەوەی خولع کردنەکەی ڕەوابێ، بەڵام ئێمە هەر بە کورتی وازی لێ دێنین، چونکە زانایان لەوبارەوە لەسەر ئەو بنچینەیە ڕێککەوتوون کە دەڵێ: (مَن جاز طَلاقُهُ جازَ خُلْعُهُ) هەر کەسێك بۆی دروست بێ تەلاق بدات، بۆشی دروستە خولع بکات .

ئنجا کە پێشتریش بەدرێژیی باسی مەرجەکانی تەلاقدەر (المُطَلِّقْ) مان کرد پێویست ناکات لێرە دووبارەی بکەینەوە.

## ٢- لەخۆ داڕنەر (المُختلعة) :

ئەمیش ئەو ژنەیە کە مێردەکەی لەخۆی دادەڕنێ و، خۆی لێ دەرباز دەکات و، لە ڕاستییدا ئەم لایەنی یەکەمی خولعە.

ئەوەی لەمیش دا بەمەرج گیراوە، تاکو بۆی درووست بێ لەگەڵ مێردەکەی دا پرۆسەی خولع ئەنجام بدات، ئەوەیە کە شایستەیی(**أهلية**) ئەوەی هەبێ ئەو کارە ئەنجام بدات، ئەویش بەوە دەبێ کە بالغ و عاقڵ و سەر ڕاست و سەربەست بێ (**بالغةٌ و عاقلةٌ ورشيدة و مختارة**)، چونکە ئەو ژنەی خولع دەکات، دەبێ شایستەی بەخشین (**أهلية التَّبرُّع**) ی هەبێ، ئەگەرنا ناتوانێ لەبەرانبەر وازلێهێنرانی دا، قەرەبوو (**عوض**) بدات[1].

کەواتە: هەرکام لە عاقڵیی و بالغیی و سەر ڕاستیی و سەربەستیی، پێویستن، جا هەرچەندە شەرع زانان زیاتر باسی عاقڵی و بالغیی و سەر ڕاستیی (**العقل والبلوغ والرشد**) یان کردوە، بەلام بێگومان ئازادیی و سەربەستیی (**الحرية والإختيار**) یش پێویستن، بۆ ژنێك کە بەکارێکی هێندە گرنگ و هەستیار هەڵدەستێ، بۆیە ژنێك کە ناچار دەکرێ و فشاریشی لێ دەکرێ، مێردەکەی لەخۆی دارنێ، لەهەرلایەکەوە بێ، خولعەکەی دروست نیە.

بە نسبەت کاتی خولع کردنیش، بەڕای زۆربەی هەرە زۆری شەرعزانان، خولع بە پێچەوانەی تەلاقدانەوە، ژن لەهەر حاڵەتێك دابێ هەر دروستە ئەنجام بدرێ، واتە: چ زەیستان بێ، چ لە حەیزدابێ، چ لە پاکییەك دابێ، کە مێردی چوویێتە لای، بەبەڵگەی ئەوە کە لە ئایەت و فەرمایشتەکان دا، باسی هیچ کاتێکی دیاریکراو نەکراوە، وەك تەلاق کە خوا کاتی بۆ داناوە: ﴿ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ الطلاق:١.

---

(١) (المفصل...) ج٨، ص١٤٥.

حیکمەتی ئەوەش ئەوەیە کە لەمەسەلەی خولع دا ژن دەستپێشخەرە و، دیارە بەدانانی کاتی تایبەت و مانەوە زیانبار دەبێ، بۆیە شەریعەت ڕێی داوە لە نیزیکترین کات دا خۆی دەرباز بکات[1].

## ٣- ڕێژگە (الصِّیغە):

سێیەمین پایەی پرۆسەی خولع، بریتیە لە ڕێژگەیەك کە دەربڕی ئەوەیە، ژن مێردەکەی لەخۆی دادەڕنێ و خۆی لێ دەرباز دەکات .

ئنجا زانایان لەبارەی ئەو وشەو تەعبیرانەوە، کە خولعیان پێ ئەنجام دەدرێ، قسەو باسی زۆریان کردوە، بۆ نموونە:

هەندێکیان گوتوویانە : وشەکانی خولع تەنیا ئەم پێنجەن : (**خالعتكِ، باینتكِ، بارأْتُكِ فارقتُكِ، طَلِّقي نَفْسَكِ على كذا**)[2].

واتە: تۆم دارنی، لێت دوورکەوتمەوە، لەتۆ بەرییم، لێت جیابوومەوە، لەسەر ئەوەندە خۆت تەلاق بدە .

بەلام ڕای راست ئەوەیە کە هیچ وشەو تەعبیرێك بەمەرج نەگیراوەو، هەرجیابوونەوەیەك بەپێکهاتنی ژن و مێردو، بەدانی قەرەبوو (**إعطاء عوض**) بەهەر وشەو تەعبیرێك هەر دروست و ڕەوایە، چ بە وشەی دارنین (**خلع**)، یان تەلاق یان هەر وشەیەکی دیکە، وەك (**إبن تیمیة**) لەوبارەو گوتوویەتی: (**الخُلعُ هو الفرقَةُ بِعِوَضٍ، فمتی فارَقَها بِعَوَضٍ فهي مفتدیة لنفسِها بهِ، وهو خـالِعٌ لها بـأي لفظ**

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٧١، لە : (فتاوی ابن تیمیة) ج٣، ص٣٢-٣٣، طبعة : فرج الله کردي.
(٢) (المفصل...) ج٨، ص١٦٨.

کان، لأن الإعتبار في العقود بمعانيها لا بالإلفاظ...) [(١)] واتە: خولع بریتیە لە جیابوونەوە بەقەرەبوو، جا هەرکات پیاو لە ژنەکەی جیابۆوە بەقەرەبوویەك، ئەوە ژنەکە بەقەرەبووەکە خۆی دەرباز کردوە، وە پیاوەکەش ئەوی دارنیوە، بەهەر وشەیەك بێ، چونکە لە گرێبەستەکان دا سەرنجی واتایەکان دەدرێ، نەك وشەکان.

## ٤- قەرەبوو (العوض، الفدية):

لەشەش برگەدا باسی قەرەبوو (عوض) دەکەین :

### یەك: پێناسەی قەرەبوو :

قەرەبوو (عوض، فدیة) ئەوەیە کە ژن پابەند دەبێ بەدانی بە مێرد و گرێبەستی دارنینی لەسەر دادەمەزرێ .

### دوو: ئەندازەی قەرەبوو:

زانایان لەبارەی ئەندازەی قەرەبوو (مقدار العوض) راجیایی زۆریان هەیە، هەیانە دەڵێ : ژن و مێرد لەسەر هەر ئەندازەیەك رێك بکەون دروستە.

وەهەیانە دەڵێ: جگە لەوەی کە مێرد پێیداوەو بەگرێبەستی هاوسەرگیریی بۆ ژنەکە پێویست بووە، نابێ لێی وەربگرێ.

وە هەشیانە دەڵێ : ئەندازەی قەرەبووەکە لەسەر یاخی بوون (نشوز) ی ژن، یان مێرد وەستاوە، ئەگەر ژن یاخی بووبێ، مێرد بۆی هەیە چی پێداوە لێی وەربگرێتەوە، بەلام ئەگەر مێرد یاخی بووبێ، بۆی نیە هیچی لێ وەربگرێ.

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٧١، لە : (فتاوى ابن تيمية) ج٣، ص٣٢-٣٣، طبعة : فرج الله كردي.

پاش لێوردبوونەوەی قسەو بەڵگەکانی هەرکام لەلایەنگرانی ئەم ڕایانەش، گەیشتمە ئەو ئەنجامە کە ئەو ڕایەی دەڵێ : نابێ قەرەبوو لە ئەندازەی ئەو مارەیی یەی کە مێرد پێی داوە، زیاتر بێ، ڕاستترو بەڵگەدارترە، چونکە :

یەکەم: هەرچەندە ئایەتەکە : ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾ ئەندازەی قەرەبووەکەی دیاریی نەکردوە و بەگشتی فەرموویەتی، بەڵام دەق (نص) نیە لەوبارەوەو، دەشگونجێ ئاوا تەفسیر بکرێ : گوناهیان ناگات لەوەدا کە ژن بۆخۆ دارنینی دەیداتە مێردەکەی لەو ماڵ و سامانەدا کە مێردەکەی پێیداوە، ئیدی قەرەبووەکە هەندێکی ئەو ماڵ و سامانە بێ، نەك زیاتر، یان تەنانەت هەموویشی، ئنجا وەك زانایانیش گوتوویانە : (**إِذا دخل الإِحتمال بطل الإِستدلال**) هەرکات ئەگەر وشیمانە پەیدابوو، بەڵگە هێنانەوە نامێنێ .

دووەم : (**إبن ماجه و الدار قطني**) لەبەسەرهاتی هاوسەری (**ثابت بن قيس**) دا کە پێشتر هێنامان و (**بخاري**) بە ژمارە (٥٢٧٣) هێناویەتی، لە ڕیوایەتێك دا هێناویانە : (**فأمره أن يأخذ منها حديقته ولا يزداد**) واتە : فەرمانی پێکرد کە باغەکەی لێ وەربگرێ، بەڵام زێدەنا.

هەڵبەتە ئەوەش لەکاتێك دا کە ژنەکە دەستپێشخەربێ، ئەگەرنا مادام پیاوەکە دەستپێشخەر بێ – وەك پێشتریش گوتمان- بۆی نیە هیچی لێوەربگرێ، و هەر ئەندازەیەکی لێوەربگرێ، لێی حەرامە .

## سێ: ئایا خولع بەبێ قەرەبوو دروستە ؟!

لەوبارەشەوە زانایان ڕاجیایی زۆریان هەیە، هەرچی حەنەفییەکان و مالیکییەکانن دەڵێن: باس کردن و هەبوونی قەرەبوو مەرجی دروست بوونی خولع نیە و، خولع بەقەرەبوو و بەبێ قەرەبووش دروستە.

بەلام شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و زەیدییەکان و جەعفەرییەکان، ڕایان وایە کە بەبێ باسکردن و هەبوونی قەرەبوو، خولع دروست نیە[١].

منیش وای بۆ دەچم کە ڕای حەنەفییەکان و مالیکییەکان ڕاستتر بێ، چونکە ئەوەی ئامانجە لە خولع دا دەربازبوونی ژنە لە مێردە نەویستراوەکەی، جا مادام پیاوەکە خۆی ڕازی بێ بەبێ بەرانبەرو قەرەبوو، دەستبەرداری ژنەکەی بێ و، بە پێچەوانەی جوامێریی (شهامة) بزانێ هیچی لێ وەربگرێ، بۆچی دەبێ مولزەم بکرێ کە دەبێ شتێك هەر وەربگرێ ؟!

## چوار : دروست نیە مێرد بەتەنگ پێ هەڵچنین (عَضْل)، ژنەکەی ناچاری خولع و قەرەبوودان بکات:

لەبەر ڕۆشنایی فەرمایشتی خوا : ﴿ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ﴾النساء:١٩، واتە: وە (ئەی پیاوینە!) ژنەکانتان سەغڵەت مەکەن و تەنگیان پێ هەڵمەچنن، تاکو بەشێك لەوەی پێتان داون، وەربگرن، مەگەر بە ئاشکرا یاخی بن...

(الزَّمخشري) لەمانای وشەی (العَضْل) دا گوتوویەتی: (الحَبْسُ والتضييق والمنع والشدة والإضرار)[٢]، واتە: بریتیە لە حەپس کردن و تەنگەتاوکردن و نەهێشتن و توندو تیژیی و زیان لێدان.

بەڵێ، لەبەر ڕۆشنایی ئایەتی ناوبراو و ئایەتی : ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٢٢٩، دا زۆربەی

---

(١) (المفصل...) ج٨، ص١٧٢-١٧٤.
(٢) (الكشاف...) ج١، ص٤٩٠.

هەرە زۆری زانایان و بگرە تێکڕایان، مەگەر بەدەگمەن، ڕایان گەیاندوە کە مێرد بۆی نیە بەتەنگ پێ هەڵچنین و ناچارکردن، ژنەکەی ناچاری خولع کردن و قەرەبوو دان بکات، وە هەر شتێك بەو جۆرە لە ژنەکەی وەربگرێ حەرامەو گوناهبارە .

بەڵام ئایا ئەگەر مێرد وایکرد، خولعەکە دادەمەزرێ یان نا؟! لەو بارەوە زانایان ڕاجیاییان هەیەو، زۆربەیان ئەو جۆرە خولعە بەبەتاڵ و نادروست دادەنێن، بەڵام هەندێکیان، کە مالیکییەکانیان لەنێودان، خولعەکە بەجێگیر دادەنێن، هەرچەندە بابای مێرد گوناهبارەو قەرەبووەکەشی ناکەوێ و دەبێ بیگێڕێتەوە بۆ ژنەکەی[1].

**منیش پێم وایە ڕای مالیکییەکان ڕاستترەو بۆ ژنەکەش باشترە .**

خوا پشتیوان بێ لەخاڵی حەوتەمیشدا (حاڵەتەکانی خولع) تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیە .

## پێنج: مەرجەکانی قەرەبوو:

(علاء الدين الكاساني) وەك بنچینەیەکی گشتیی لەبارەی مەرجەکانی قەرەبووی خولعەوە گوتوویەتی: (**ما يصلح عوضاً – مَهْراً– في النكاح، يصلح عوضاً في الخُلْعِ**)[2]، واتە: هەرچی بشێ بۆ قەرەبوو – مارەیی – لەهاوسەرگیرییدا، بۆ قەرەبووی خولعیش دەشێ، پاشان مەرجەکانی دەخاتە ڕوو و دەڵێ :

(**مالاً مُتَقَوَّماً موجوداً وقت الخُلْعِ، معلوماً، أو مجهولاً جهالة قليلة أو كثيرة إذا لم تكن مُتفاحِشةً**)[3]، واتە: ماڵ و سامانێکی نرخدار بێ، لەکاتی خولع

---

(١) (المفصل...) ج٨، ص١٧٦-١٧٧.

(٢) بدائع الصنائع، ج٣، ص١٤٧

(٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە .

کردنـدا هـەبێ، زانـراو بـێ، یـان نـەزانراوبێ، بەکـەمیی یـان بـەزۆریی، بـەڵام لەڕاددەبەدەر نەبێ .

کەواتە:

مەرجەکانی قەرەبووی خولع ئەمانەن:

أ- سامانێکی نرخدار بێ .

ب- لەکاتی خولع کردنەکەدا هەبێ .

جـ- زانراوبێ، یان نەزانراوێکی وا نەبێ کە سەرەدەریی لێنەکرێ .

## شەش : جۆرەکانی قەرەبوو:

زانایـان لـەبارەی ئـەوەوە کـە ئایـا چـی و چـی بـۆ قـەرەبووی خولـع دەشـێن ؟ ڕاجیاییان هەیە، بەڵام ئەوەی زۆربەیان لەسەری ڕێك کەوتوون، ئەوەیە کـە هـەرکام لە:

أ- مارەیی دواخراو (**المَهْر المؤَجَّلْ**).

ب- بژێوی ژنی خۆدازنیو (**المختلعه**) و منداڵەکانی .

جـ- کرێی شیرپێدان (**أُجرة الإرضاع**).

د- مەسرەفی بەخێوکردنی منداڵی گچکەو لەلای خۆهێشتنەوەی (**نفقة الصغير وحضانته وإمساكه**).

بەڵام دروست نیە کرێی نیشـتەجێ کـردن (**أُجـرة السُكْنى**) بکرێتـە قـەرەبووی خولع، چونکە مـافی نیشتەجێکردن(حق السُكْنى) ی ژنی جیابووەوە لـەمێردی، لـە کـاتی عیـددەدا مـافێکی خواییـەو هـەردەبێ هـەبێ [1]، وەك خـوا فەرموویـەتی :

﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ﴾ الطلاق: ١ .

---

(١) (المفصل...) ج٨، ص١٩٩-٢٠٨.

## ٧- حاڵەتەکانی خولع :

بە گشتی بۆ پەیوەندیی نێوان ژن و مێردو ئەو حاڵەتانەی کە دەگونجێ پرۆسەی خولعیان تێدا ئەنجام بدرێ، چوار ئەگەرو حاڵەت هەن:

حاڵەتی یەکەم : پێکەوە گونجاویی ژن و مێرد (الوفاق بين الزوجين).

حاڵەتی دووەم: بێزاریی ژن لە مێردەکەی.

حاڵەتی سێیەم: بێزاریی مێرد لە ژنەکەی .

حاڵەتی چوارەم: دڵنیابوونی ژن و مێرد، کە ناتوانن بەگوێرەی شەرع پێکەوە مەدار بکەن.

### حاڵەتی یەکەم : پێکەوە گونجاویی ژن و مێرد:

لەم حاڵەتەدا زۆربەی هەرە زۆری زانایان کە: (**أبو حنيفة و مالك و الثوري و الأذرعي و الشافعي و أحمد**) یان لەنێودان، بەناپەسند (**مكروه**) ی دەزانن کە ژن داوای خولع لە مێردەکەی بکات، مادام هیچ گرفت و کێشەیەکیان نەبێ[1].

هەندێکیشیان بە حەرامی دەزانن، وەك (**إبن قدامة**) گوتوویەتی: (**وَيَحْتَمِلُ كلامُ أحمد تحريمَهُ**)[2]، واتە: وە قسەی ئەحمەد – لەوبارەوە – ئەگەری حەرام کردنی هەیە، هەروەك هەندێکیشیان خولع لەو حاڵەتەدا بەڕاست و ڕەوا دەزانن و دەڵێن : نەك حەرام، بگرە ناپەسند (**مكروه**) یش نیە[3].

---

(١) (المفصل...) ج٨، ص١٨٥.

(٢) (المغني...) ج٧، ص٥٤.

(٣) المجموع شرح المهذب، ج١٦، ص٦٥٣.



منیش وای تێدەگەم کە لەحاڵەتی گونجاویی و بێ گرفت و کێشەیی دا حەرامە، یان لانی کەم ناپەسندە، کە ژن داوای خولع لە مێردەکەی بکات، واتە: هەر چۆن بێ لەو حاڵەتەدا ژن باری بەلادا لار دەبێ و، خۆی تووشی هەڵوێستێکی قەدەغە، یان ناپەسند دەکات، بەڵگەشمان لەوبارەوە ئەو ئایەت و فەرمایشتانەن، کە لە خاڵی سێیەم دا (حوکمی خولع) ئاماژەمان پێکردن و لێرە دووبارەیان ناکەینەوە، بەلام بێگومان گوناهباریی ژن، ئەوە ناگەیەنێ کە خولعەکە دانامەزرێ و، ئەو دوو مەسەلەیە لەیەك جیاوازن .

## حاڵەتی دووەم: بێزاریی ژن لە مێردەکەی:

ئەم حاڵەتە، حاڵەتی ئاسایی و سروشتیی خولعە، وەك ڕواڵەتی فەرمایشتی خوا دەگەیەنێ : ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ۗ ﴾ البقرة: ٢٢٩، (إبن كثير) لەو بارەوە گوتوویەتی : (وأما إذا تشاقق الزوجان، ولم تَقُم المرأة بحقوق الرجل وأبغضته ولم تقدر على معاشرته، فلها أن تفتدي منه بما أعطاها، ولا حرج عليها في بذلها، ولا عليه في قبول ذلك منها " ولهذا قال تعالى : ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ۗ ﴾[1]. البقرة: ٢٢٩ .

واتە: بەلام ئەگەر ژن و مێردناکۆك بوون و، ژن مافەکانی پیاوەکەی جێ بەجێ نەکردن و، نەیتوانی لەگەڵی بژی، ئەوە بۆی هەیە کە بەوەی پێیداوە

---

(١) المصباح المنير، ص١٦٧.

خۆی لێ دەرباز بکات و بیکاتە قەرەبوو، وەنە ئەو گوناهی دەگاتێ، لەسەر ئەوە کە دەیداتێ و، نە پیاوەکەش گوناهی دەگاتێ لەسەر وەرگرتنی ئەوەی دەیداتێ، بۆیەش خوای بەرز فەرموویەتی : ((وەبۆتان ڕەوا نیە کە هیچ شتێك لەوەی بە ژنەکانتان داوە، وەربگرنەوە، مەگەر مەترسییتان هەبێ کە سنوورەکانی خوا بەرپا نەکەن، جا ئەگەر ترسان کە سنوورەکانی خوا بەرپانەکەن، ئەوە گوناهیان ناگات، لەوەدا کە ژنەکە دەیکاتە قەرەبووی خۆی..)).

هەروەها وەك بەسەرهاتەکەی (ثابت بن قیس) و ژنەکەی خوا لێیان ڕازی بێ، دەیگەیەنێ کە پێشتر هێنامان و (بخاري) بە ژمارە : (٥٢٧٣) لە کتێبەکەی خۆیدا هێناویەتی و ئەمەش ڕیوایەتێکی دیکەی ئەو بەسەرهاتەیە کە (مالك و أحمد و أبو داود و النسائي) هێناویانە: (وعَنْ حَبِيبَةَ بِنْتِ سَهْلٍ الأَنْصَارِيَّةِ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم خَرَجَ إِلَى الصُّبْحِ فَوَجَدَ حَبِيبَةَ بِنْتَ سَهْلٍ عِنْدَ بَابِهِ فِي الْغَلَسِ[1]، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم «مَنْ هَذِهِ». فَقَالَتْ أَنَا حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ، قَالَ: « مَا شَأْنُكِ ». قَالَتْ لاَ أَنَا وَلاَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ، (لِزَوْجِهَا) فَلَمَّا جَاءَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : « هَذِهِ حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ ». وَذَكَرَتْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَذْكُرَ وَقَالَتْ حَبِيبَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كُلُّ مَا أَعْطَانِي عِنْدِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لِثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ: « خُذْ مِنْهَا ». فَأَخَذَ مِنْهَا وَجَلَسَتْ هِيَ فِي بَيْتِ أَهْلِهَا)[2].

---

(١) الغَلَس، ظلمة آخر الليل اذا اختلطت بضَوء الصُّبْح، المعجم الوسيط، ص٦٥٨.

(٢) المصباح المنير، ص١٦٧.

واتە: حەبیبەی کچی سەهلی ئەنصاریی، هاوسەری ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بوو، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ نوێژی بەیانی چوو، حەبیبەی کچی سەهلی لەلای دەرگاکەی دی، لەتاریك و ڕووندا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەمە کێ یە ؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من حەبیبەی کچی سەهلم، فەرمووی: چیتە؟ گوتی: من و ثابیتی کوڕی قەیس (مێردەکەی) پێکەوە ناژین، جا کاتێك مێردەکەی ثابیتی کوڕی قەیس هات، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: ئەمە حەبیبەی کچی سەهلە، ئەوەی خوا بیەوێ باسی کردوە(واتە: لەبارەی بێزارییەوە لەتۆ) ئنجا حەبیبە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! هەرچی پێیداوم لەلامە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (واتە بە ثابیت) لێی هەڵگرە، (واتە: لەو پارەو مارەییەی پێت داوە)، ئەویش لێی هەڵگرت، ژنەکەش لەماڵی کەس و کاری دانیشت .

هەڵبەتە وێڕای قورئان و سوننەت، کە هەرکامێکیشیان بەسن بۆ ئیسپاتی حوکمێکی شەرعیی، یەکدەنگیی زاناو شەرعزانانیشی لەسەرە، کە ژن لەو حاڵەتەدا، بۆی هەیە داوای جیابوونەوەو دابڕینی مێردەکەی بکات، (إبن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (إِذَا كَرِهَتْ المرأة زَوْجَهَا لِخُلُقه، أَوْ خَلْقِه، أَوْ دِينِه، أَوْ كِبَرِه، أَوْ ضَعْفِه، أَوْ نَحْوِ ذَلِكَ، وَخَشِيَتْ أَنْ لَا تُؤَدِّيَ حَقَّ اللَّهِ تَعَالَى فِي طَاعَتِه، جَازَ لَهَا أَنْ تُخَالِعَهُ بِعِوَضٍ تَفْتَدِي بِه نَفْسَهَا مِنْهُ، لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِۦ﴾، ولحديث ثابت بن قيس، وبهذا قال جميع الفقهاء، ولا يُعرَفُ لهذا

القول مُخالِفٌ من الصحابة) [1].

واتە: هەرکات ژن حەزی لە چارەی مێردەکەی نەکرد، لەبەر ڕەوشتی، یان لەبەر جەستەی، یان دینداریی، یان بەساڵ داچوونی، یان بێ هێزیی، یان وێنەی ئەوە، وەترسا کە مافی خوای لەفەرمانبەریی مێردەکەیدا پێ جێ بەجێ نەکرێ، بۆی دروستە کە بە قەرەبوویەك خۆی لێ دەرباز بکات، لەسەر فەرمایشتی خوای بەرز : ((وەئەگەر ترسان کە سنوورەکانی خوا بەرپا نەکەن، گوناهیان ناگات لەوەدا کە بیکاتە قەرەبووی خۆی)) وە لەبەر فەرموودەکەی لەمەڕ ثابیتی کوڕی قەیس، وە ئەمە ڕای سەرجەم شەرعزانانە، و نەزانراوە هیچ کەس لەهاوەڵان ڕای پێچەوانەی ئەم ڕایەی بووبێ.

هەڵبەتە وەك پێشتریش گوتمان: ئەگەر ژن بەبێ پاساوو هۆکار، لەمێردەکەی هەڵپێچێ بۆ خولع کردن، گوناهبارە، بەڵام ئایە خولعەکە جێگیر دەبێ لەڕووی دادوەریی (قضاء)ەوە، یان نا؟ زانایان لەو بارەوە ڕا جیاییان هەیە، بەڵام پێم وایە ڕای ڕاست ئەوەیە، کە خولعەکە هەر دادەمەزرێ و، دادوەر بۆی هەیە پیاوەکە ناچار بکات، وەك دواتریش باسی دەکەین و بەسەرهاتەکەی (ثابت بن قیس) و (حبیبە بنت سهل) ی هاوسەریشی، باشترین بەڵگەیە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە (حبیبە) ی نەپرسی بەڵگەو پاساوت چی یە ؟! بەڵکو هەرکە هەڵوێستەکەی بینی و قسەکانی بیست، یەکسەر فەرمانی بە (ثابت) کرد کە پاش وەرگرتنی قەرەبوو، دەستی لێ هەڵبگرێ .

---

(١) المغني، ج٧، ص٥١-٥٢.

## حاڵەتی سێیەم: بێزاریی مێرد لە ژنەکەی:

لەو حاڵەتەدا — وەك پێشتریش گوتمان- حەرام یان بەلای کەمەوە ناپەسندە، کە پیاو پەنا بۆ خولع بەرێ، بۆ دەرباز بوونی لە ژنەکەی، چونکە:

ئەو پیاوەی کە دەیەوێ ژنەکەی ناچار بکات خولعی لەگەڵ بکات، لە دووحاڵ بەدەر نیە:

یەك: یان ژنەکەی خۆی لێ بەلایەو کەیفی پێی نایەت و دەیەوێ لەکۆڵی بێتەوە!

دوو: یان تەماعی لەو ماڵ و سامانە دایە، کە وەك مارەیی پێی داوەو دەیەوێ ئەگەر بە لە دەستدانی ژنەکەیشی بێ، ماڵ و سامانەکەی لێ وەربگرێتەوە، بۆیە دیارە لەهەردوو حاڵەتەکانیشدا، دەقی قورئانی لەسەرە کە پیاو بۆی نیە لەرێی خولعەوە، هیچ شتێك لە ژنەکەی وەربگرێتەوە، ئەگەر نا پێی حەرامەو، گوناهبارو عەیبدار دەبێ .

بەنسبەت حاڵەتی یەکەمەوە، خوا فەرموویەتی : ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾﴾ النساء: ٢٠، واتە: وەئەگەر ویستتان ژنێکی دیکە بێننە جێی ژنێك، وە قینطارێکیشتان[١]، (مارەیی) دابوو بەیەکێکیان (واتە: بەوەی کە دەتانەوێ بیگۆڕن) ئەوە هیچی لێ وەرمەگرنەوە، ئایا بەشێوەی بوختان و گوناهێکی ئاشکرا وەری دەگرن؟!

وەبە نسبەت حاڵەتی دووەمیشەوە، خوای دادگەر فەرموویەتی :

---

(١) القنطار: المال الجزيل، المصباح المنير، ص٢٠٩، (قنطار) ماڵ و سامانێکی زۆرە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ ﴾ النساء: ١٩، کە پێشتر مانامان کردو قسەمان لەبارەوە کرد، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

کەواتە:

پیاوێك کە لەژنەکەی بێزارەو ناتوانێ لەگەڵی بژی و مافەکانی بۆ دابین بکات و، دەیەوێ ژنێکی دیکەی بێنێتە جێ، دروست نیە پەنا بەرێتە بەر خولع، بەڵکو بۆی هەیە لەرێی تەڵاقدانەوە ئەو ئامانجەی بێنێتەدی .

هەروەها پیاو بۆی نیە بۆ دەست خستنی ماڵ و سامانی ژنەکەی، تەنگی پێ هەڵچنێ و سەغڵەتی بکات و، ناچاریی بکات خۆی خولع بکات، چونکە چاو تێبڕینی ماڵ و سامانی هەرکەسێك، با هاوسەریش بێ، وەهەوڵ دان بۆ دەست بەسەداگرتنی، حەڕام و گوناهەو، بەتایبەتییش ڕەفتاری وا لەگەڵ هاوسەردا، پێچەوانەی جوامێریی و نیشانەی نەفس نزمییە!!

بەڵام لێرەدا یەك حاڵەتی تایبەت هەیە، کە لەو حوکمە گشتی یە هەڵاوێراوەو جیاکراوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە پیاوێك گیرۆدە بووبێ بەدەست ژنێکی لاسارو یاخی و بە ئێش و ژانەوەو، نەتوانی لەگەڵی مەدار بکات، لەو حاڵەتەدا کەبار بەلای ژنە لاسارەکەدا لارە، پیاو بۆی هەیە ناچاری خولعی بکات و، خۆی و ئەو ماڵ و سامانەشی کەپێی داوە لەدەستی دەرباز بکات، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴾النساء: ١٩ واتە: وە ژنەکانتان سەغڵەت و تەنگەتاو مەکەن

بەمەبەستی ئەوە کەبەشێك لەوەی پێتان داون، لێیان بستێنن، مەگەر یاخی بوونێکی ئاشکرایان هەبێ ...

واتە: هەرکات یاخی بوونی ئاشکراو ڕوونیان هەبوو، ئێوەش بۆتان هەیە سەغڵەتیان بکەن و، ناچاریان بکەن خولعتان لەگەڵ بکەن .

(إبن کثیر) لە تەفسیری ئەم ڕستە قورئانییەدا گوتوویەتی:

**قال ابن مسعود وآخرون معه، وقال ابن عباس وآخرون : الْفَاحِشَة الْمُبَيِّنَة: النُّشُوز وَالْعِصْيَان، وَاخْتَارَ ابْن جَرِير أَنَّهُ يَعُمّ ذَلِكَ كُلّه: الزِّنَا وَالْعِصْيَان وَالنُّشُوز وَبَذَاء اللِّسَان وَغَيْر ذَلِكَ، يَعْنِي أَنَّ هَذَا كُلّه يُبِيح مُضَاجَرَتهَا حَتَّى تُبْرِئهُ مِنْ حَقّهَا أَوْ بَعْضه وَيُفَارِقهَا)**[1].

واتە: کوڕی مەسعودو کەسانی دیکە هاوڕاشی گوتوویانە : مەبەست لە (**فاحشة مُبَيِّنة**) زینایە، وە کوڕی عەبباس و ژمارەیەکی دیکەش گوتوویانە : مەبەست پێی، یاخی بوون و سەرپێچییە، وە کوڕی جەریر ئەوەی هەڵبژاردوە کە ئەوانە هەموویان بگرێتەوە، زیناو سەرپێچیی و یاخی بوون و زمان شڕیی و ...هتد، واتە: ئەوە هەمووی تەنگ پێ هەڵچنینی ڕەوا دەکات، تاکو لە مافەکەی خۆی یان لەهەندێکی دەیبەخشێ و لێی جیا دەبێتەوە .

شایانی باسیشە کە وشەی (**فاحشةٍ مُبَيِّنَة**) هەرچەندە هەندێك لە زانایان بە زیناو هەندێکیشیان بە زیناو بە یاخیبوون تەفسیریان کردوە، بەڵام ئەگەر سەرنجی ئەو وشەیە بدەین، لەو سیاقانەدا کە تێیاندا هاتوە، بەهیچ جۆرێك ناتوانین بڵێین مەبەست پێی زینایە و ناچارین بڵێین : تەنیا مەبەست پێی ئازاردانی ژنە بۆ مێردی، بەیاخی بوون و سەرپێچی و زمان شڕیی و بۆڵە

---

(١) المصباح المنير تهذيب تفسير ابن كثير، ص٢٨١.

بۆڵ و ...هتد، باتەماشا بکەین :

١- ﴿ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ﴾ النساء: ١٩,

٢- ﴿ يَـٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَـٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ ۞ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَـٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ ﴾ الأحزاب: ٣٠ – ٣١,

٣- ﴿ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ﴾ الطلاق: ١.

بەسەرنجدانی هەرسێك سیاقەکانیش بۆمان دەردەکەوێ، کە ناگونجێ مەبەست لە وشەی ناوبراو زینا بێ، چونکە:

١- بەنسبەت ئایەتی (١٩ ی (النساء)ەوە، پێچەوانەی عەقڵ و شەرع و فیترەتی ساغە، کە خوای کاربەجێ ڕێگا بدات بە پیاو کە لەبەرانبەر زیناکردنی ژنەکەیدا، مارەییەکەی لێ وەربگرێتەوە و بەرهەڵدای بکات!

٢- وە بەنسبەت هەردوو ئایەتی : (٣٠و ٣١) ی (الأحزاب) ەوە، ئەوە ئاشکرایە کە باس باسی گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، خوا لێیان ڕازی بێ، بۆ هاوسەرە بەرزو بەڕێزەکەیان، وە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانیش، هەر ئەوە دەگەیەنێ، ئنجا وشەی: (فاحشةٍ مبيّنة) کە لە ئایەتی (٣٠) دا هاتوە، بەراوردی پێکراوە لەگەڵ: (يقنت منكن لله ورسوله وتعمل صالحاً) دا، کەواتە: مەسەلە یاخیبوون و لاملیی کردن، یان گوێڕایەڵیی و بە

قسەکردنە.

٣- وەبەنسبەت ئایەتی (١) ی (**الطَّلاق**) ەوە، دیسان لە سیاقەکەوە دیارە کە هیچ پەیوەندیی بەزیناوە نیەو، مەسەلەکە ئەوەیە کە ژنی تەڵاقدراوی ڕەجعیی مافی خۆیەتی ماوەی عیددە لە ماڵی خۆی و مێردەکەیدا بگوزەرێنێ، بەمەرجێك مێردەکەی و کەس و کاری، بەیاخیی بوون و سەرپێچیی و پرتەو بۆڵە جاڕزو بێزار نەکات، ئەگەرنا ئەو مافەی دەفەوتێ، پێشم وایە هۆی بەهەڵەداچوونی هەندێك لە زانایان لەمانای ئەو وشەیەدا ئەوەیە، کاتێك زانیویانە وشەی (**فاحشة**) بەمانای داوێنپیسیی[1] دێ، وایانزانیوە کە وشەی (**الفاحشة المبيِّنة**) ش هەمان مانای هەیە، بەڵام لەڕاستیدا وانیە، وەك خستمانە ڕوو، لەهیچ کام لەو سێ شوێنەدا کە وشەی ناوبراو هاتوە، ناگونجێ بەمانای زینا بێ، پاشان دەڵێین: مادام لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا، وشەی(**فاحشة**) بەمانای داوێن پیسیی هاتوە، کەواتە ناگونجێ (**فاحشة مُبَيِّنة**) ش هەمان مانای هەبێ، چونکە زیناو داوێن پیسیی، هەریەك جۆرەو بۆخۆی گوناهێکی ئاشکرایەو، پێویستی بە سیفەتی (**مُبيِّنة**) ئاشکرا ناکات، بخرێتە سەری!

بەڵام بە نسبەت یاخیی بوون و سەرپێچییکردن (**النشوز والعصيان**) ەوە وانیە، چونکە جاری وایە ژن دەمەقاڵێ و پرتەو بۆڵەیەکی ئاسایی دەبێ، کە

---

(١) داوێنپیسیی، زیناو نێر بازیی و خۆلێکخشاندنی ئافرەتان(سحاق) یش، دەگرێتەوە، هەرکام لەم سێیانەش لە قورئاندا بە (فاحشة) ناوبراون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً ﴾ الإسراء: ٣٢. ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ ﴾ العنكبوت: ٢٨، ﴿ وَالَّٰتِى يَأْتِينَ الْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ ﴾ النساء: ١٥.

ئەوە شیاوی چاو پۆشیی و تەحەمولکردنە، بەڵام ئەگەر پرتەو بۆڵە و قرەو گاڵەکە، بێ تام بوو و ئاشکرا بوو، وە زەق بۆوە، ئەوکاتە حوکمێکی دیکەی هەیە .

دیارە وشەی (فاحشة) ش هەرچەندە بە پلەی سەرەکیی، بە مانای لادانی جینسیی (الإنحراف الجنسي) دێ، بەلام بەمانای هەر قسەو کردەوەیەکی زۆر ناشیرین و دزێویش دێ، وەك (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (الفُحْشُ والفحشاء والفاحشة: ما عَظُمَ قُبْحهُ من الأفعال والأقوال) [1]، خوای زاناو تواناش لەبارەی بوختان و تۆمەتی داوێن پیسیی هەڵبەستنەوە، فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾النور: ١٩

## حاڵەتی چوارەم: دڵنیابوونی ژن و مێرد کە ناتوانن بەگوێرەی شەرع پێکەوە مەدار بکەن:

ئەم حاڵەتەش ئەوەیە کە قەناعەتێکی هاوبەش بۆ ژن و مێرد دروست دەبێ، کە ناتوانن بەشێوەیەکی شەرعییانەی ڕێك و پێك پێکەوە مەدار بکەن، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی : ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٢٢٩ .

(القرطبي) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا نووسیویەتی: (أن يظنَّ كل واحد منهما بنفسه ألاّ يُقيم حق النكاح لصاحبه حسب ما يجبُ عليه فيه

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٦٢٦.

لكراهةٍ يَعْتقدُها)) [١]، واتە: ئەوەیە کە هەر کامێکیان گومانی ئەوە بەخۆی بەرێ (یان دڵنیابێ) کە ناتوانێ مافی ژن و مێردایەتیی بۆ هاوەڵەکەی وەك لەسەری پێویستە دابین بکات، لەبەر رِق لێبوونەوەیەك کە لەدڵیدا چەسپاوە.

دیارە لەو حاڵەتەشدا بەرای سەرجەم زانایان – چونکە دەقی قورئانی لەسەرە – دروستە کە ژن قەرەبوو بداتە مێردەکەی و، ئەویش لێی وەربگرێ و لەچنگ یەکدی قوتاریان بێ، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾، ئاشکراشە ئەگەر بە دڵنیابوونی هەرکام لە ژن و مێرد کە پێکەوە ناگونجێن، لەیەکترازانیان رەوا بێ، ئەوە بێگومان بە دڵنیابوونی هەردووکیان پێکەوە، چاکتر لەیەکترازانیان رەوا دەبێ.

## ٨- وەکیل گرتن بۆ خولع دروستە:

بەرای تێکرای زانایان وەکیل گرتن بۆ خولع چ لەلایەن ژنەوە، چ لەلایەن مێردەوە دروستەو، لەو بارەشەوە زانایان وەك بنچینەیەك گوتوویانە : (كلُّ مَنْ صَحَّ أن يَتَصرَّف بالخُلْع لنفسه جاز توكيلهُ ووكالته، ذكراً أو أُنثى، مُسلماً أو كافراً) [٢]، واتە: هەرکەسێك بۆی هەبێ خولع بۆخۆی بکات، دروستە بکرێتە وەکیل و وەکیلیش بگرێ، نێربێ یان مێ، مسوڵمان بێ یان کافر.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج٣، ص١٣٦-١٣٧.
(٢) (المفصل...) ج٨، ص٢٠٩.

(إبن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (**وهذا مذهب الشافيعي وأصحاب الرأي ولا أعلمُ فيه خِلافاً**)[1]، واتە: وە ئەوە ڕای مەزهەبی شافعیی و هاوەڵانی ڕایە (مەبەست مەزهەبی حەنەفییە)، وە نەمزانیوە لەو بارەوە ڕاجیایی هەبێ.

هەروەها زانایان لەو بارەیەوە کە ئایا دەگونجێ، یەك کەس ببێتە وەکیلی هەرکام لە ژن و مێرد بۆ خولع کردن ؟! ڕاجیاییان هەیەو بەشێکیان بەدروست و، بەشێکیشیان بە نادروستی دەزانن، پێشم وایە ئەو ڕایە ڕاستترە، کە بە دروستی دەزانێ، چونکە ئەوە لە کڕین و فرۆشتن و مافەکانی دیکە دا دروستەو، خولعیش لەجۆری ئەوانە، وەك پێشتر گوتمان.

## ٩- مۆڵەتی دادوەر بۆ خولع پێویست نیە :

زانایان لەبارەی پێویست بوون و پێویست نەبوونی مۆڵەتی دادوەر، بۆ ئەنجامدانی خولع، ڕاجیاییان هەیە و، زۆربەیان ڕایان وایە کە خولع کردن پەکی لەسەر مۆڵەتی دادوەر (قاض) نەکەوتوە، هەندێکیشیان مۆڵەتی دادوەر بە پێویست دەزانن.

بەڵگەی بەمەرج دانانی مۆڵەتی دادوەریش ئەوەیە، کە خوا عز وجل فەرموویەتی : ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ البقرە : ٢٢٩، دەڵێن وەك دەبینین خوا ترسەکەی کردوە بەهی غەیری ژن و مێرد، کە دیارە مەبەست پێی کۆمەڵگای مسوڵمان و حوکمڕانەکانیانە، کەواتە: حوکمڕان لەڕێی دادوەرەوە، بڕیاری کۆتایی

(١) المغني، ج٧، ص٩٠-٩١.

لەبارەی خولعەوە دەدات.

زۆربەی زانایانیش کە ڕایەکەیان ڕاست و بەڵگەدارترە، چەند شتێك بەبەڵگە دێننەوە :

أ- ئایەتە قورئانییەکەی کە باسی خولع دەکات، هیچ باسی مۆڵەتی دادوەر (**إذن القاضي**) نەکردوە، بەڵکو بەرەهایی فەرموویەتی، کە مادام ژن و مێرد قەناعەتیان هاتبێ کە پێکەوە ناگونجێن، دروستە بە خولع لەیەك جیاببنەوە: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِۦ ﴾.

ب- (بخاري) لە (صحيح) ی خۆی لە (**١٢- باب الخُلع وكيف الطلاق فيه**) دا هێناویەتی : (**وأجاز عمر الخُلعَ دون السُّلطان**) [1]، واتە: وە عومەر بەبێ مۆڵەتی حوکمڕان، ڕێی خولعی داوە.

جـ- وەك پێشتریش باسمان کرد، خولع گرێبەستێکی گۆڕینەوە(عَقد معاوضة) یە، بۆیە وەك هەرکام لە کڕین و فرۆشتن و هاوسەرگیریی، پەکی لەسەر مۆڵەتی حوکمڕان نەکەوتوە .

د- تەلاق و خولع شێوەی یەکدی دەکەن و، وەك چۆن تەلاقدان پێویستی بە مۆڵەتی دادوەر نیە، خولعیش بەهەمان شێوە .

ئنجا بە نەسبەت ئایەتەکەشەوە، کە بەبەڵگە هێنراوەتەوە لەسەر پێویستبوونی مۆڵەتی دادوەر بۆ خولع، دەڵێین :

مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە کە حوکمڕان و دادوەر، هەرکات مەترسییان هەبوو کە ژن و مێرد، مافەکانی یەکدیی نەپارێزن، ئەرکی سەرشانیانە کە

(١) صحيح البخاري، ص٩٩١، پێش ژمارە :٥٢٧٣.

خولعیان لەنێوان دا جێ بەجێ بکەن، بەتایبەت لەکاتی مل نەدانی مێـرد ا بۆ خولعێك کە ژنەکەی داوای دەکـات، نـەك مەبەسـت ئـەوەبێ، کـە هـەتا مۆڵـەت لـە حـوکمڕان و دادوەر وەرنـەگیرێ، خولـع ئـەنجام نـەدرێ، واتـە: مەبەسـت لـە ئایەتەکـە دەسـتوەردان (تَـدَخُّل) ی حـوکمڕان و دادوەرە لـە مەسـەلەی خولـع دا، دوای بەرزکردنـەوەی بۆلایـان و پەیـدابوونی گرفـت و کێشـە، نەك پێش بەرزکردنەوەی .

## ١٠- شوێنەوارەکانی خولع :

بێگومـان شـوێنەوارو دەرەنجامـەکانی خولـع، بـەپێی دیـاریکردنی جـۆری جیابوونەوەیەك کە بە خولع دێتە دی، دەگۆڕێن.

کەواتە: بۆزانینی شوێنەوارو دەرئەنجامـەکانی خولـع، پـەکمان لەسـەر ئـەوە کەوتوە کە دیاریی بکەین : ئایا ئەو جیابوونەوەیەی کە بە خولع دێتـەدی چ جۆرێکە ؟! شەرع زانان لەوبارەوە بە گشتی سێ ڕایان هەن:

١- بەشێکیان پێیان وایە، ئەو جیابوونەوەیەی بە خولـع لـەنێوان ژن و مێـرد دا ڕوودەدات، لە جۆری تەلاقـدانی جیابوونـەوە (طـلاق بـائن) یـە، کـە دیـارە زۆربەی شەرعزانان ئەمە ڕایانە.

٢- وەهەندێکیان ڕایان وایە، کـە ئـەو جـۆرە لەیـەك جیابوونـەوەی ژن و مێـرد لەجۆری تەلاقدانی گێڕانەوە (طلاق رجعي) یە، ئەمەش ڕای هەندێکیانە.

٣- هەندێکیشیان ڕایان وایە کە ئەو جۆرە لەیەکترازانـەی ژن و مێـرد، دەچێتە بازنەی هەڵوەشانەوە (فَسْخ)ەوە، ئەمەش ڕای ژمارەیـەك لـە زانایانـە، کـە دواتر ئاماژەیان پێ دەکەین .

ئاشکراشە کە دەرەنجام و شوێنەوارەکانی خولع، بەگوێرەی هەر کام لەو سـێ

ڕایە جیایە لەوانەی دیكە :

یەكەم: ئەگەر خولع بە تەلاّقدانی گێڕانەوە (**طلاق رجعي**) دانرا، ئەوە دیارە كە بەهەر خولع كردنێك تەلاّقێك كەم دەكات، وەپاش خولعی یەكەم و دووەمیش، مێرد بۆی هەیە ژنەكەی لە عیددەدا بگێڕێتەوە لای خۆی .

دووەم: وەئەگەر خولع بەتەلاّقدانی جیابوونەوە (**طلاق بائن**) دابنرێ، ئەوە دیارە بە خولع كردن تەلاّقێك دەڕوات، بۆیە، بۆ وێنە : ئەگەر پیاوێك تەلاّقێكی ژنەكەی خۆی دابێ، پاشان خولعیان پێكەوە كردبێ، وە دوایی بە گرێبەستێكی[1] تازە مارەی كردبێتەوە، ئەوە تەنیا بەتەلاّقێكەوە دێتەوەلای، چونكە تەلاّقێكی پێشترو یەكیشیان بە خولع كردنەكە فەوتاوەو، ماوەتەوە یەك.

سێیەم: بەلاّم ئەگەر خولع بەهەلّوەشانەوە (**فَسْخ**) دابنرێ، ئەوە هەرچەندە چەند جارێك خولع دووبارە بێتەوە، هەر جارێك كە پیاوەكە بە گرێبەستێكی تازە ژنەكەی مارە بكاتەوە و بیهێنێتەوە، ژمارەی تەلاّقەكانی هەروەك خۆیەتی، چونكە فەسخ ژمارەی تەلاّقان كەم ناكاتەوە .

بەلاّم ئایا لەو سێ ڕایانە كامیان ڕاستترو بەلّگەدارترەو هەلّی دەبژێرین؟!

لە وەلاّمدا دەلّێین:

یەك: ناگونجێ خولع بە تەلاّقی گێڕانەوە (**طلاق رجعي**) دابنرێ، لەبەر هەبوونی قەرەبوو .

---

(١) چونكە بەبێ گرێبەستێكی تازە، ناتوانێ بچێتەوە لای. بەپێچەوانەی ڕای یەكەمەوە كە خولع بەتەلاّقی گەڕانەوە، دادەنێ، نەك بەتەلاّقی جیابوونەوە.

چونکە وشەی قەرەبوو (فداء – عوض) کە لە ئایەتەکەدا هاتووە : ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾.ئەوە دەگەیەنێ، کە دەبێ دوای ئەوەی ژن مارەییەکەی یان بەشێکی دەگێڕێتەوە بۆ مێردەکەی لەبەرانبەر ئەوەدا کە وازی لێ بێنێ، پاش گەیاندنی بە مێردەکەی ئامانجەکەی بێنێتە دی، کە بریتیە لە ئازاد بوونی و کاری خۆ بەدەستی خۆی بوونی، بۆیە ئەگەر بەهۆی خولعەوە جیابوونەوە (البينونة، الإنفصال) نەیەتەدی، مانای وایە حیکمەت و ئامانجی خولع و نێوەڕۆکەکەی نەهاتۆتەدی .

کەواتە: بەتەلاقدانی گێڕانەوە، دانانی خولع، شتێکی نەگونجاوەو پێچەوانەی سروشت و حیکمەت و ئامانجی خولعیشە.

(إبن تيمية) لەو بارەوە گوتوویەتی (..**وهذا خطأ، فإن مقصود الإفتداء لا يحصل الاّ مع البينونة، ولهذا كان حصول البينونة بالخلع مما لم يُعْرَفْ فيه خلاف بين المسلمين**) [1]، واتە: وە ئەمە (یانی ڕای یەکەم) هەڵەیە، چونکە ئامانجی قەرەبوو دان، بەبێ جیابوونەوە و پچڕان، نایەتەدی، هەر بۆیەش مسوڵمانان لەوەدا ڕاجیاییان نەبووە کە بەهۆی خولعەوە لەیەك جیابوونەوە پەیدادەبێ.

دوو: هەروەها ناگونجێ خولع بەتەلاقدانی جیابوونەوە (**طلاق بائن**) دابنرێ، لەبەر چەند هۆکارێك، کە ئەوانە گرنگترینییانن

١- خوا سبحانه وتعالى فەرموویەتی : ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمْسَاكُۢ

(١) فتاوى شيخ الاسلام ابن تيمية، طبعة فرج الله كردي، ج٣، ص٣٢، لە : (المفصل..) ج٨، ص٢٢١.

بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ ۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ۗ ﴾ البقـــرة: ٢٢٩ — ٢٣٠، وەك دەبیـــنین خوای زاناو شارەزا، سـەرەتا باسـی تەلاقـدانی گێڕانـەوە دەكات،كـە بریتیە لە دوو قۆناغ تەلاقـدان — وەك پێشـتر باسمـان كـرد — پاشـان باسی خولعی كردوە ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ ﴾ ئنجا دوایی لە ئایەتی دواتردا باسی تەلاقدانی كۆتایی و سـێیەمی كـردوە، كـە دوای ئەوە بواری پێكەوە بـوونی ژن و مێـرد نـامێنێ: ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ ﴾ جا ئەگەر بێت و خولع بە تەلاق دابنرێ، مانای وایە ژمارەی تـەلاقان لەسـێ تێدەپـەڕێ و دەبێتـە چـوار !! كەواتـە : خولع تەلاق نیە، نەهی گێڕانەوەو نەهی جیابوونەوە .

٢- پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) عیـددەی ژنـی خۆدارنـەر (مُخْتَلِعة) ی بەیەك حەیز داناوە :

أ- (عن ابن عباس أن امرأة ثابت بن قَيْس اختلعتْ من زوجها فأمرها النبيُّ صلى الله عليه وسلم أن تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ) أخرجه أبو داود والترمذي وحسَّنه.

ب- (عَن الرُّبيعٌ بنت مُعَوذ أنَّها أختلعت على عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم فأمرها النبيُّ أن تَعْتدَّ بِحَيْضَةٍ) أخرجه الترمذي

وإسناده صحيح.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بەهەركام لە ژنی ثابیتی كوڕی قەیس و ڕوبەیعی كچی موعەویذ كردوە- كە خولعیان لە گەڵ مێردەكانیان كردوە- كە عیددەكەیان یەك حەیز (حيضة واحدة) بێ، وە یەك حەیز بوونی عیددەی ژنی خولعكەر (مُختلعة) لە : (عثمان بن عفان و ابن عمر و ابن عباس و أبان بن عثمان و إسحاق و إبن المنذر) ەوە گێڕراوەتەوەو، قسەیەكیشە لە مەزهەبی ئەحمەد دا، خوا لەهەموویان ڕازی بێ[1].

ئاشكراشە كە عیددەی ژنی تەلاقدراوی گوازراوە (المدخول بها)، سێ حەیز، یان سێ پاكییە، وەك خوا عز وجل فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ البقرة: ٢٢٨،

كەواتە: مادام ژنی خولعكەر عیددەكەی یەك حەیزە، نابێ خولع بەتەلاق دابنرێ، ئەگەرنا عیددەكەی لەجیاتی یەك حەیز، سێ حەیز یان سێ پاكیی (ثَلاث حَيْضات أو ثلاثة أطهار) دەبوو.

شایانی باسیشە كە زۆربەی شەرعزانان ڕایان وایە، ژنی خولعكەریش عیددەكەی سێ حەیز بێ، وەك ژنی تەلاقدراو، لەبەر دووربینیی (إحتياط).

٣- (إبن القيم) لەبارەی خولعەوە گوتوویەتی: (لايَصِحُّ عن صحابي أنه طلاق البَتَّة)[2]، واتە: لە هیچ هاوەڵێكەوە، هەرگیز بەسەنەدێكی

---

(١) الخلع وأحكامه الشرعية، للشيخ فيصل مولوي، ص٢٢٣-٢٢٤، المجلة العلمية، العددان الثامن و التاسع .

(٢) زاد المعاد في هَدْي خير العباد، ج٥، ص١٩٧. .

ڕاست نەهاتوە، کە خولع تەلاق بێ .

هەروەها لە (إبن عباس)ەوە هێناویەتی کە گوتوویەتی: (الخُلْعُ تفريق وليس بطلاق) واتە: خولع لەیەك جیاکردنەوەیە و تەلاق نیە، وە (إبن القيم) لەبارەی سەنەدەکەیەوە گوتوویەتی : ڕاستە، هەروەها (إبن حزم) یش هێناویەتی[1].

٤- ئنجا ناشگونجێ ڕستەی : (إقبل الحديقة وطَلِّقها تَطْلِيقَةً) کە لەبەسەرهاتی (ثابت بن قيس) و (حبيبة) ی ژنیدا هاتوە و (بخاري و نسائي) هێناویانە، بەبەڵگەی بەتەلاق دانانی خولع بهێنرێتەوە، چونکە:

أ- ڕیوایەتەکانی دیکە هیچ کامیان وشەی (طلاق) یان تێدانەهاتوە، بۆ وێنە:

١- (خُذْ مِنْهَا ». فَأَخَذَ مِنْهَا وَجَلَسَتْ هِىَ فِى بيت أَهْلِهَا) رواه مالك وأبو داود والنسائي.

٢- (خذ الذي لها عليك، وخَلِّ سَبِيلَها) رواه النسائي.

٣- (خُذْها وفارِقْها) رواه أبو داود.

٤- (فأمره رسول الله صلى الله عليه وسلم أن يأخذ منها حَدِيقَتَهُ ولا يزداد، فأخذها لَهُ وخَلَّى سبيلَها) رواه الدار قطني.

ب- ڕیوایەتەکەی (بخاري و نسائي) لە (إبن عباس) ەوەیە، ئەویش خولع بە هەڵوەشانەوە (فَسْخ) دەزانێ، نەك بەتەلاق، کەواتە : دیارە کە وشەی تەلاق لە فەرموودەکەدا مەبەست لێی مانای فیقهیی و زاراوەیی (المعنى الفقهي

(١) المحلىّ، ج١٠، ص٢٣٧.

والإصطلاحي) نەبووە بۆ وشەی تەڵاق، بەڵکو مەبەست پێیی مانای زمانەوانیی (المعنى اللغوي) بووە، کە بریتیە لە لەیەکترازاندن (التفريق)[١].

سێ: کەواتە: مادام نەگونجێ خولع بەهیچ کام لە تەڵاقدانی گەڕانەوە (الطلاق الرجعي) و تەڵاقدانی جیابوونەوە (الطلاق البائن) دابنرێ، کەواتە : خولع بریتیە لە هەڵوەشاندنەوە (الفَسْخ) کە ئەمەش ڕای (إبن عباس) ە و ئەوەشی بەبەڵگە هێناوەتەوە، کە خوای بەرز پاش ئەوەی فەرموویەتی : (الطلاق مرّتان) وە باسی دوو تەڵاقی کردوە، ئەوجار باسی خولعی کردوە :﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾، وە پاشان فەرموویەتی : ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ﴾، جا دیارە ئەگەر خولعیش تەڵاق بوایە، تەڵاقەکان دەبوونە چوار[٢].

شایانی باسیشە بەهەڵوەشانەوە (فَسْخ) دانانی خولع، ڕای هەرکام لە: (ابن عباس و طاووس و عِكرِمَة و أبو ثور و إسحاق بن راهويه و شافعي (في القديم) و أحمد (في إحدى الروايتين عنه) وإبن خزيمةو الناصر (في أحد قوْلَيهْ) و الصادق و الباقر ويحيى بن حمزة و إبن تيمية و إبن القيم و الشوكاني) يە [٣].

---

(١) الخلع وأحكامه الشرعية، للشيخ فيصل مولوي، ص٢٢٥.
(٢) فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية، طبعة فرج الله كردي، ج٣، ص٣٢.
(٣) الخلع وأحكامه الشرعية، للشيخ فيصل مولوي، ص٢٢٣-٢٢٤، المجلة العلمية، العددان الثامن و التاسع .

بەلاَم پێویستە بزانین کە ئەم جۆرە هەڵوەشانەوەیە، تایبەتمەندیی خۆی هەن و، وەك هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکانی دیکە نیە، بۆ وێنە:

١- ئەم هەڵوەشانەوەیە کاریگەریی بۆ دواوە (أثر رجعي) نیەو، تەنیا کاریگەریی لەسەر داهاتوو هەیە.

٢- ئەو پەیوەندیی خزمایەتیی و حەرام بوونەی کە بەهۆی گرێ بەستی هاوسەرگیرییەوە پەیدابووە، بەهەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە لاناچێ [1].

کۆتایی ئەم تەوەرەی دووەمیش بە قسەیەکی (إبن رشد) دێنین، کە لەسەرەتای ئەو باسەشەوە هێنامان:

**(والفقه أنَّ الفِداءَ إنَّما جعل للمرأة في مقابل ما بيد الرجل من الطلاق، فإنَّه لما جُعِلَ الطلاق بيد الرجل إذا فَرِكَ المرأة، جُعِلَ الخُلْعُ للمرأةِ اذا فَرِكَتِ الرجُلَ)** [2].

هەڵبەتە وردبوونەوە لەم پێناسەیەش سرووشت و نێوەڕۆك و حیکمەت و ئامانجی خولعمان زۆر بۆ ڕوون دەکاتەوە.




(١) هەمان سەرچاوە ص ٢٣٠.

(٢) بداية المجتهد ونهاية المقتصد، ج٢ ص٦٨.

## تەوەری سێیەم: هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی (الفَسخ)

خوێنەری بەڕێز!

ئەگەر ڕێباز و جۆری یەکەمی لەیەکترازانی ژن و مێرد، بە ویست و دەستپێشخەریی مێرد (زوج) بوو، کە تەڵاقدان (الطلاق) بوو، وە ڕێباز و جۆری دووەمی لەیەکترازانی ژن و مێرد، زیاتر بە ویست و دەستپێشخەریی ژن (زوجة) بوو، کە لەخۆدارنین (خلع)بوو، ڕێباز و جۆری سێیەمی لەیەکترازانی ژن و مێرد، بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی (فسْخ عَقد الزواج) بە بڕیار و ئیرادەیەکی دەرەوەی ویست وخواستی هەردووکیان یان یەکێکیان، بەهۆی فەوتان و نەمانی مەرج و بنەمایەکانی هاوسەرگیرییەکەیانەوە، کە ئەو بڕیار و ئیرادەیەش لە حوکمی شەریعەت و، بڕیار و ویستی دادوەر (قرار وإرادة القاضي) دا بەرجەستە دەبن.

جا ئێمە لە تەوەری یەکەم و دووەم دا باسی تەڵاقدانی مێرد و خۆدارنینی ژنمان کردوە، خوا یار بێ لەم تەوەری سێیەمیش دا باسی ڕێباز و جۆری سێیەمی لەیەکترازانی ژن و مێرد دەکەین.

شایانی باسیشە زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوە فیقهییەکان زاراوەی: لێك جیاکردنەوەی ژن و مێرد (التفریق بین الزوجین)، یان لەیەکترازانی دادگایی (التفریق القضائي) یان بەکار هێناوە، بۆ ئەم جۆرەی سێیەمی لەیەکترازانی ژن و مێرد، بەڵام من بۆیە وشەی هەڵوەشاندنەوە (الفَسْخ)م بەکارهێنا، چونکە ئاکام و سەرەنجامی هەموو ئەو هۆکارانەی دەبنە پاساو و مایەی حوکمی شەریعەت و بڕیاری دادوەر، بۆ لەیەکترازاندنی ژن و مێرد، بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەی

گرێبەستی نێوانیان، جگە لە هەندێکیان کە زانایان مشت و مڕیان لە بارەیانەوە هەیە، کە ئایا ئاکام و ئەنجامەکەیان هەڵوەشاندنەوە (الفسخ)یە، یان تەڵاق؟!

سەرجەم ئەو هۆکارانەش کە سەردەکێشن بۆ ئەوە کە بە حوکمی شەریعەت و بڕیاری دادوەر، گرێبەستی هاوسەرگیریی نێوان ژن و مێرد هەڵبوەشێتەوە، حەڤدە (١٧)ەن و، بەگشتی دابەش دەبن بۆ دوو جۆری سەرەکیی:

جۆری یەکەمیان کە شەش (٦) هۆکارن، خاڵی هاوبەشی نێوان ژن و مێردن، وە جۆری دووەمیان کە یازدە (١١) هۆکارن، پەیوەستن بە مێردەوەو، ئەو هۆی پەیدابوون و سەرهەڵدانیانە.

دیارە زانا و شەرعزانانیش وردەکاریی زۆریان لە بارەی هەر کام لەو هۆکارانەوە باس کردوە، کە ئێمە لەم کتێبەدا بە پێویستی نازانین و ناشگونجێ هەمووی بخەینەڕوو، بەڵکو وەك عادەتی خۆمان بەو ئەندازەیە کە بەگرنگ و پێویستی دەزانین و، لەگەڵ سروشتی ئەم کتێبەدا دەگونجێ، وازی لێدێنین و، بە پێی توانایش بیروڕای خۆم لەبارەی بابەتەکانەوە دەخەمە ڕوو و، هیچ بیروڕایەکیش تەبەنی ناکەم ئەگەر لە ڕووی بەڵگەکان و گونجاویی لەگەڵ سروشت و ڕێڕەوی گشتی شەریعەتەوە، بە هێز و پێزتری نەبینم و، پاش لێوردبوونەوە و سەرنجدانی باش هەڵینەدەسەنگێنم[1].

---

(١) بۆ نووسینی ئەم تەوەرە بەگشتی سوودی زۆرم لە کتێبی: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم) ی د.عبدالكريم زيدان، وەرگرتوە، هەروەها سوودم لە کتێبی: (مدى حرية الزوجين في التفريق قضاءً)ي أحمد حسين طه وەرگرتوە.

جۆری یەکەمی هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی:

## هۆکارە هاوبەشەکان

وەك پێشتر گوتمان جۆری یەکەمی هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی و لەیەکترازاندنی ژن ومێرد، بە حوکمی شەریعەت و بە بڕیاری دادوەر، ئەو هۆکارانەن کە خاڵی هاوبەشی نێوان ژن و مێردن و، هەردووکیان دەستیان لە هێنانەدییان هەیە، ئەوانیش ئەم شەشەن-بە بڕوا و تێگەیشتنی من[1]:

١-نەفرین لە یەکدی کردن (اللّعان).
٢-ناکۆکیی پێکەوە هەبوون (الشّقاق).
٣-لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە (الإرتداد).
٤-ئیسلام قەبووڵ نەکردنی یەکێك لە ژن و مێرد (إباء أحد الزوجين الاسلام).
٥-هەبوونی ناتەواویی (العيب).
٦-سەرپشك بوون بۆ هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی لە کاتی باڵغ بوون دا (خيار البلوغ).

ئێستاش بەرێز بە توێژینەوەی ئەم شەش هۆکارەدا دەچینە خوار:

## ١-نەفرین لە یەکدی کردن (اللّعان):

خوا پشتیوان بێ لە حەوت بڕگەدا باسی لیعان دەکەین، کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

یەکەم: پێناسەی لیعان.

(١) بۆیە وام گوتوە چونکە ئەو دابەش کردنە خۆم دامهێناوەو، لە کتێبو سەرچاوە فیقهیەکاندا نەمبینیوە.

دووەم: ڕەوایی لیعان.

سێیەم: حوکمی ل لیعان.

چوارەم: حیکمەتی لیعان.

پێنجەم: مەرجەکانی لعان.

شەشەم: چۆنیەتی لیعان

حەوتەم: شوێنەوارەکانی لیعان

## یەکەم: پێناسەی لیعان:

دیارە وشەی (لیعان) لە (لَعَنَ، يَلْعَنُ، لَعْناً، ولَعْنَةً)ەوە هاتوە، وشەی (لَعْن)یشە:الإبعاد والطَّرد من الخَيْر) [(١)] لێکداراوەتەوە، واتە: دورخستنەوەو دەرکردن لە خێر و چاکە.

دیارە وشەی (لعان) و (ملاعنة) ش بریتییە لە لەعنەت لە یەکدی کردنی دوو لایەن یان زیاتر.

لە زاراوەی شەرعیشدا (لعان) بەم جۆرە پێناسە کراوە:

(اللِّعانُ: حَلَفٌ بألفاظٍ مخصوصة من قِبَل الزوج على زنى زوجته، أو نفي وَلَدِها منهُ، وحلفها على تكذيبه فيما قَذَفها به) [(٢)]. واتە: لیعان بریتیە لە سوێندخواردنی مێرد بە چەند وشەیەکی تایبەت لەسەر ئەوە کە ژنەکەی زینای کردوە، یان لەسەر نکوولّی کردنی لەوە کە منداڵەکەی کە لێی بووە هی وی (مێردەکەی) بێ، وە سوێند خواردنی ژنەکەش لەسەر بەدرۆ دانانی ئەو تۆمەتەی کە پێی دەکات.

---

(١) لسان العرب، لإبن منظور، ج١٧، ص٢٧٣-٢٧٤.

(٢) المفصل١٠٠، ج٨، ص٣٢١، ط٣، ٢٠٠٠م.

## دووەم- ڕەوا بوونی لیعان:

بناغەی ڕەوا بوونی لیعان ئەم چوار ئایەتە موبارەکەن:

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ (النور:٦-٩).

واتە: وە ئەوانەی کە ژنەکانیان تۆ مەتبار دەکەن (بە زینا کردن) وە جگە لە خۆشیان هیچ شایەدیان نیە، ئەوە شایەدیی دانی هەر یەکێکیان بریتیە لە چوار شایەدی دان بە خوا کە لەڕاستگۆیانە (لەو تۆمەتبار کردنەوەیدا. وە جاری پێنجەمیش بڵێ: لەعنەتی خوای لێ بێ ئەگەر لە درۆزنان بێ وە ئەوەی (سزای زینا) لە ژنەکە لادەدات، ئەوەیە کە چوار کەرەت شایەدیی بە خوا بدات، کە مێردەکەی لە درۆزنانە. وە جاری پێنجەمیش بڵێ: تووڕەیی خوای لەسەر بێ ئەگەر ئەو لە ڕاستگۆیان بێ.

## سێیەم- حوکمی لیعان:

زانایان لە بارەی حوکمی لیعانەوە ڕاجیایی زۆریان هەیە:

هەیانە بە پێویستی دەزانێ، مادام مێرد گەیشتبێتە دڵنیایی کە ژنەکەی زینای کردوە، ئەو منداڵەی هەیەتی زۆڵە و لەو نیە، هەشیانە تەنیا بە دروست (جائز) دەزانێ.

منیش وای بۆ دەچم کە حوکمی ئەومەسەلەیە بەپێی حاڵەت و هەل و مەرجە جیاوازەکان جۆرا و جۆرە و، ناگونجێ یەك حوکم بۆ چەند حاڵەت و

هەل و مەرجێکی جیاواز دابنرێ.

ئەوەی هیچ گومانیشی تێدا نیە ئەوەیە کە حەرامە مێرد هەر لە خۆوە بەبێ بەڵگە و نیشانەیەکی بەهێز، ژنەکەی تۆمەتبار بکات و نەسەبی منداڵەکانی لەخۆی ببڕێ، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی:﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ (النور:٢٣). واتە: بێگومان ئەوانەی ئافرەتان پاکیزەی بێئاگای ئیماندار بە (زینا) تۆمەتبار دەکەن، لە دنیا و دوارۆژدا نەفرەتیان لێکراوە و سزایەکی مەزنیان هەیە.

## چوارەم-حیکمەتی لیعان:

سزای بوختانی زیناکردن، بێ ئەوەی بابای تۆمەتکەر (قاذف) بتوانێ تۆمەت و بوختانەکەی بە چوار شایەد-بەخۆیەوە-ئیسپات بکات، بریتیە لە هەشتا قەمچیی (ثمانون جلدة) وەك خوای دادگەر فەرموویەتی :﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ (النور: ٤).

دیارە ئەم سزایە سەرەتا گشتی (عام) بوو، بەڵام دوایی خوای کاربەجێ حوکم و سزایەکی دیکەی جیاواز و تایبەتی بۆ ئەوانە ناردە خوار کە ژنەکانی خۆیان بە زینا تۆمەتبار دەکەن، چونکە هەرگیز ناگونجێ هیچ پیاوێك، ئەگەر تۆسقاڵێك جوامێریی و غیرەتی هەبێ، بچێ سێ پیاوی دیکە بێنێ و پێکەوە لە زیناکردنی ژنەکەیەوە رامێنن!!

ئنجا ئەگەر یەکێکیش بپرسێ: ئایا تەڵاقدان بەس (کافي) نەبوو بۆ

چارەسەری ئەو کێشەیە؟ دەڵێین: نەء چونکە:

١-بە تەڵاقدان نکووڵیی لە نەسەبی ئەو منداڵە، یان ئەو منداڵانە ناکرێ، کە پیاوەکە پێی وایە لەو نین.

٢-تەڵاقدان هەندێك ئەرکی دارایی دەخاتە ئەستۆی بابای تەڵاقدەر (**مطلق**)ەوە، بەڵام ئەگەر بەهۆی لیعانەوە ژنەکەی لە کۆڵ ببێتەوە، هیچی ناکەوێتە سەر.

## پێنجەم-مەرجەکانی لیعان:

شەرع زانان زۆر بە درێژیی باسی مەرجەکانی لیعانیان کردوە، کە پێم وایە ئەمە کورتە و پوختەکەیەتی:

١-بە نسبەت تۆمەتبارکەر (**قاذف**)ەوە، مەرجی ئەوەیە کە بەڵگەی بەدەستەوە نەبێ لەسەر ئەوە کە ژنەکەی زینای کردوە، چونکە ئەگەر بەڵگەی بەدەستەوە هەبێ، لیعان دروست نیە، وەك خوای بەرزومەزن فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ (النور: ٦)

دیارە بەڵگەی ئیسپاتی زیناش، ئەگەر بابای تۆمەتبار کراو (**المقذوف**) دانی پێدانەهێنێ، چوار شایەدن وەك خوای زانا و توانا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ ﴾ (النور:٤).

٢- وە بەنسبەت ژنی تۆمەتبار کراو (**المقذوف**)ەوە، دەبێ دوو مەرجی تێدابن:

أ-پاکیی (**العِفّة**).

ب-نکوولّییکردن له زینا (إنكار الزّنى).

چونکه ئەگەر پاك نەبێ - بە بەڵگە و ئیسپات - ئەوە یەك لەسەر تۆمەتبار کران و بگرەوبەردە نەکەوتوە، ئایەتەکەش فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ....... ﴾ کە دیارە مەبەستیش لێرەدا لە (ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ)، ئافرەتانی پاکیزەن (العفيفات).

وە ئەگەر ژنەکە نکوولّیی لە زینا کردن نەکات، دیسان حەوجێ بە لیعان نیەو، سزای دیکەی بەسەردا دەچەسپێ، واتە سزای زینا کردن.

٣-وە بە نسبەت هەردووکیشیانەوە، دوو مەرجی سەرەکیی پێویستن:

أ- ژن و مێردی ڕاست و دروست بن پێکەوە، واتە: پەیوەندییەکی ڕاست و دروستی هاوسەرێتیی (**علاقة زوجية صحيحة**) یان پێکەوە هەبێ.

ب- عاقڵ و باڵغ بن.

چونکە: خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ .... ﴾ کەواتە: دەبێ ژن و مێردایەتییەکی ڕاست و دروستیان پێکەوە هەبێ، ئنجا یەکسانە ژنەکە گوازرابێتەوە یان نا.

هەروەها عاقڵ بوون وباڵغ بوون، مەرجی پێویستبوونی سەرجەم ئەرکە شەرعییەکانن، وەك لە ڕابردوودا باسمان کردوە.

هەڵبەتە هەندێك لە زانایان چەند مەرجێکی دیکەشیان باس کردوون وەك:

یەك: دادگەر (عادل) بوونی مێرد، واتە: گوناهی گەورەی نەبێ.

دووەم: مسوڵمانبوونیان (واتە ژن و مێرد).

سێ: لە وڵاتی مسوڵمانبوونیان دا (أن يكونا في دار الإسلام).
چوار: ئازادبوونیان (كونهما حُرَّين).
پێنج: گۆیا بوونیان (**كونهما ناطقين**) واتە لاڵ نەبن.
شەش: بینەربوونیان (كونهما بصيرين).
بەڵام بەراستیی ئەم مەرجانە بەڵگەیەكی ئیقناعكەریان لەسەر نیە[1].

## شەشەم- چۆنیەتی لیعان:

بەپێی ئایەتەكانی (٦، ٧، ٨، ٩)ی (النور) كە پێشتر هێنامانن و مانامان كردن، وە بە پێی چەند دەقێكی سوننەت كە دەربارەی لیعان پێكەوە كردنی (**عويمر العجلاني**) و ژنەكەی لەلایەك و، (هلال بن أمية) و ژنەكەی لەلایەكی دیكەوە دەدوێن و، بەسەرهاتەكەی (**عويمر العجلاني**) و ژنەكەی (بخاري ومسلم) لە (سهل بن سعد الساعدي)یەوە هێناویانە، لیعان كردن بەم شێوەیە:

سەرەتا مێردە تۆمەتباركەرەكە (الزوج القاذف) هەڵدەستێ و چوار جار لەسەریەك دەڵێ: شایەدیی بە خوا دەدەم (أشهد بالله) واتە: سوێندی پێ دەخۆم، كە فلانە كەسی ژنم، زینای كردوە، چوار جار ئەمە دووپات دەكاتەوە، پاشان جاری پێنجەم دەڵێ:
نەفرینی خوام لێ بێ، ئەگەر درۆ بكەم.
پاشان ژنەكەش هەڵدەستێ و، چوار كەڕەتان لەسەر یەك دەڵێ:

(١) (المفصل...) ج٨، ص٣٤٣، ط٣، ٢٠٠٠م.

شـــایەدتی بـــەخوا دەدەم (أشـــهد بـــالله) کــە فلانەکەســـی مێـــردم لـــەو تۆمەتبارکردنەی من دا بە زینا، درۆ دەکات، پاشان جـاری پێنجـەم دەڵـێ: تووڕەیی خوام لەسەر بێ، ئەگەر ڕاست بکات.

ئەمەش دەقی بەسەرهاتەکەی (هلال بن أمیة) و ژنەکەیەتی:

(عن ان عبادة: إن هلال بن أمية قذف امرأته عند النبي (ﷺ) بشريك بن سحْماء، فقال النبي (ﷺ) البيِّنة أو حدٌّ في ظهرك، فقال: يا رسول الله: إذا رأى أحدُنا رجلاً على ارأته يلتمسُ البيِّنة؟! فجعل النبّي يقول: البَيِّنة أو حدٌ في ظهرك، فقال هلال: والذي بعثك بالحق نبيّاً إنني لصادق ولَينْزلنّ الله في أمري ما يُبْرِيءُ به ظهري من الحدّ، فنزلت ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ .... ﴾ فانصرف النبي (ﷺ) فأرسل إليهما فجاء، فقام هلال بن امية فشهد —اي لاعن— والنبي يقول، الله يعلم ان احدكما كاذبٌ، فهل منكما من تائبٍ؟ ثم قامت فشهدتْ—أي لاعنت— فلما كانت عند الخامسة:﴿ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ وقالوا لها:إنها مُوجِبةٌ ونكَصَتْ حتى ظننا انّها سَتَرْجِعُ فقالت: لا أفْضَحُ قومي سائر اليوم فمضت...) رواه ابو داود.

واتـە: هیلالـی کـوڕی ئومەییـە لـەلای پێغەمبـەر (ﷺ) ژنەکـەی خـۆی تۆمەتبار کرد بە زینا کردن لەگەڵ شەریکی کوڕی سەحماء، پێغەمبـەریش (ﷺ) فەرمووی: یان بەڵگە دێنی یان سزای پشتت دەدرێ: (واتـە: هەشـتا قەمچییت لـێ دەدرێ) گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! یـەکێکمان پیاوێـك لەسەر ژنەکەی ببینـێ، دەچـێ شـایەدان پەیـدا بکـات؟ پێغەمبـەریش هـەر دەیفەرموو: یـان بەڵگـە یـان سـزای پشـتت، هیلالـیش گـوتی: سـوێند بـەو کەسـەی تۆی بەهـەق کردۆتـە پێغەمبـەر، مـن ڕاسـتگۆم، بێگومـان خـواش

لەبارەی منەوە حوکمێك دادەبەزێنێ کە پشتم لە سزا بپارێزێ، ئیدی ئەم ئایەتانە هاتنە خوار: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ....﴾ (النور: ٦-٩) ئیدی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت و لە دوای ناردن، ئەوانیش هاتن، ئنجا هیلال هەڵسا شایەدتی دا-لیعانی کرد- پێغەمبەریش دەیفەرموو: خوا دەزانێ یەکێکتان درۆکەرن، ئایا هیچ کامتان تۆبە ناکەن؟ ئنجا ژنەکەش هەڵسا شایەدتی دا-لیعانی کرد- جا کە گەیشتە پێنجەم: ﴿أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾. وە پێیان گوت: ئەمە پێویستکەرە (واتە: سزای دۆزەخ پێویست دەکات ئەگەر درۆ بکەی)، ڕاوەستاو پاشەکشەی کرد، هەتا وامانزانی پەشێمان دەبێتەوە، کەچی گوتی: (واتە[1]: هەڵوێستەکەی وای گەیاند نەك بەزار وا بڵێ) ئەمڕۆ ئابڕووی خزمەکانم نابەم، وە شایەدییەکەی تەواو کرد...

## حەوتەم- شوێنەوارەکانی لیعان:

لیعان پێکەوە کردنی ژن و مێرد، چوار شوێنەوار و دەرەنجامی سەرەکیی و گرنگی لێ دەکەونەوە:

**١- لاچوونی سزای بوختانی زینا کردن لەسەر مێردو، سزای زینا لەسەر ژن و (ئەگەر گریان کردبیشی):**

ئەمیش زۆر ڕوون و ئاشکرایە لە چوار ئایەتەکەی (النور) دا، چونکە ڕستەی: (وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ لَعَلَّكُمۡ ) واتە: وە سزای لێ دوور دەخاتەوە...ماناکەی ڕوونە کە ژنی تۆمەتبار کراو بە زینا لەلایەن

(١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکان خۆم زیادم کرد.

مێردیەوە، ئەگەر ئامادەبوو لیعانی لێبکاتەوە و وەڵامی لیعانەکەی بداتەوە، سزای زینای لەسەر لادەچێ، ئنجا (و) ی سەر ﴿وَيَدْرَؤُاْ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ لَعَلَّكُمْ﴾ واوی گێرانەوە (واو العطف)یە، واتە: وەك چۆن مێرد بە لیعان کردن لەگەڵ ژنەکەیدا، سزای زینای لەسەر لادەچێ.

**٢-لەیەك جیابوونەوەی ژن و مێرد:**

ئەمیش شوێنەوارێکی دیکەی لیعانە و زانایانیش لەسەری یەك دەنگن، بەڵام لەوەدا ڕای جیا جیایان هەیە، کە ئایا بە خودی لیعان کردنەکەیان لە یەك جیا دەبنەوە، یان پێویستی بە بڕیاری دادوەریش هەیە؟ پێشم وایە ڕای ئەوانە ڕاست و بەهێزە کە دەڵێن: هەر خودی لیعانەکە مایەی لە یەکترازانی ژن و مێردەوە، یەکی لەسەر بڕیاری دادوەر نەکەوتوە.

هەروەها لەو بارەشەوە مشت و مڕیان هەیە، کە ئایا لە یەکترازانەکەی ژن و مێرد بەهۆی لیعانەوە، هەڵوەشان (فسخ)ە، یان تەڵاقدانە، چونکە وەك دوایی باسی دەکەین، ژن و مێردی لیعان پێکەوەکەر، بۆ هەتا هەتایە (الى الأبد) لەیەك قەدەغە دەبن.

**٣-لەیەك قەدەغەبوونی هەتاهەتایی ئەو ژن و پیاوە:**

ئەمیش دەرەنجامێکی دیکەی لیعانە، کە سەرجەم زانایان لەسەری ڕێککەوتوون، وەك (ابن قدامة) گوتوویەتی: (إنّها تحرمُ عليه باللّعان تحريماً مؤبداً فلا يَحلُّ له، ولا خلاف بين أهل العلم أنهُ إذا لمْ يُكذِّبْ نَفْسَهُ لايَحِلُّ لَهُ) [١].

---

(١) (المفصل...)، ج٨، ص٤٠٠-٤٠٥، ط٣، ٢٠٠٠م.

واتە: ژنەکەی بەهۆی لیعانەوە بۆ هەتا هەتایە لێی قەدەغە دەبێ و بۆی حەڵاڵ نیە، وە لە نێوا زانایاندا ڕا جیایی لەسەر نیە کە ئەگەر (بابای مێرد) خۆی بە درۆ نەخاتەوە بۆ حەڵاڵ نابێتەوە.

دیارە بناغەی ئەوەش چەند شوێنەوارێکن، بۆ نموونە:

أ-(....فمضت السنّة بَعْدُ في المُتَلاعنين أن يُفَرَّقَ بَيْنَهُما ثم لايجْتَمِعان أبداً) رواه ابو داود، واتە: پاشان ڕێباز وابوو لەبارەی ژن و پیاوی لیعان پێکەوەکەرەوە، کە لەیەك جیا بکرێنەوەو، پاشان هەرگیز پێکەوە کۆنەبنەوە.

ب- (عن ابن عباس (رضي الله عنهما) أن النبي (ﷺ)قال: المُتلاعنانِ أن لايَجتمعا أبداً) رواه الدار قطني واتە: پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: دوو لیعان پێکەوە کەرەکان-کە مەبەست ژن و مێردە-هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە.

ج- (عن علي (رضي الله عنهُ) قال: مضت السَنّة في الملاعنين لا يَجتَمِعان أبداً) رواه الدار قطني واتە: بنچینەی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ژن و پیاوی لیعان پێکەوەکەردا، وا ڕابردوە کە هەرگیز پێکەوە کۆنەبنەوە.

## ٤- بڕانی نەسەبی منداڵ لە پیاوی لیعانکەر:

ئەنجام و شوێنەوارێکی دیکەی لیعان ئەوەیە کە ڕەچەڵەکی ئەو منداڵەی پیاو نکوولیی لەوە دەکات کە هی وی بێ، لەو پیاوە دەبڕێ و بە دایکیەوە پەیوەست دەبێ، دیارە ئەمەش زانایان بە گشتی لەسەری یەك دەنگن و، بەڵگەشیان چەند دەقێکی سوننەتە کە ئەمە یەکێکیانە:

(عن ابن عُمر (رضي الله عنهما): (أن النبي (ﷺ)**لاَعَنَ رَجلٍ وامرأته فانتفى من ولَدِها فَفرَّق بيْنَهُما وألْحقَ الولَدَ بالمرأة**) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لیعانی لە نێوان پیاوێك و ژنەكەیدا كرد، كابرا نكوڵیی لە منداڵی ژنەكەی كرد، پێغەمبەریش لەیەكی جیا كردنەوە و منداڵەكەی بە ژنەكەوە پەیوەست كرد.

بەڵام زانایان چوار شتیان كردوونە مەرج، بۆ بڕینی نەسەبی منداڵ لە مێردێك كە لیعان لەگەڵ ژنەكەی دەكات:

أ-دەبێ هەردووكیان لیعان لەگەڵ یەكدیدا بكەن.

ب-دەبێ مێرد دەستپێشخەری لیعان كردن بێ.

ج-دەبێ ژن و مێرد لیعانەكە بە وشە و شێواز دیاریكراو بكەن.

د-دەبێ مێرد نكوڵیی لە منداڵەكەی بكات.

هەڵبەتە بە مەرجگرتنی ئەم چوار مەرجە بۆ دابڕینی ڕەچەڵەكی منداڵ لە مێردی لیعانكەر لەگەڵ ژنەكەیدا، ڕای بە هێزتر و بەڵگەدارتری زانایانە، ئەگەرنا بیرو ڕا و بۆچوونی دیكەش هەن[1].




(١) المفصَّل ج٨ ص ٤٠٠-٤٠٥، ط٣، ٢٠٠٠.

## ٢-ناكۆكی پێكەوە هەبوون (الشقاق):

لە پێنج بڕگەدا باسی ناكۆكی نێوان ژن و مێرد دەكەین، كە یەكێكە لە هۆكارەكانی لە یەكترازانی ژنومێرد لەكاتی تەشەنەكردنیو چارەسەرنەكردنیدا :

١-پێناسەی ناكۆكیی ژن و مێرد (شقاق الزوجين).

٢-ناردنی دوو دادوەر لە كەس و كاری ژن و مێرد بۆ چارەسەری ناكۆكیی نێوانیان.

٣-دوو حەكەمەكە دەستكراوەن بۆ هەر بڕیارێك و بڕیاریشیان پابەندكەرە.

٤-حوكمڕان لەسەری پێویستە بڕیاری دوو حەكەمەكە جێ بەجێ بكات.

٥-دەگونجێ لەیەك جیاكردنەوەی ژن و مێردی ناكۆك، تەلاقی جیاكەرەوە، یان خولع بێ.

### یەكەم: پێناسەی ناكۆكیی ژن و مێرد (شقاق الزوجين):

وشەی (شِقاق) كە لە كوردیدا بە ناكۆكیی و دووبەرەكیی دێ لە نێوان دوو لایەن یان زیاتردا، كە لە بنەڕەتدا لە (الشِقّ)ەوە هاتوە، كە بە مانای لا (جانب) دێ، وەك ئەوەی كە هەر كام لە دوو لایەنەكان لا (جانب) یەكی گرتبێ، جیا لە لا (جانب)ی بەرانبەرەكەی، وە دەشگونجێ لە (شقَّ يشُقُّ)ەوە هاتبێ، چونكە هەر لاك لەوە دەخەفتێ، كە لایەكەی دیكە لەسەری قورسە و پێی ناڕەحەت دەبێ.

شایانی باسیشە كە مانای زاراوەیی (المعنى الإصطلاحي)، (شقاق)یش

کت و مت وەك مانای زمانەوانیی (المعنی اللغوی) وایە، وێڕای زیادکردنی هەردووك وشەی ژن و مێرد (الزوجین)، سەرەنجام ماناکەی ئاوای لێهاتوە:
(شقاق الزوجین) یانی ناکۆکیی و دووبەرەکیی نێوان ژن و مێرد، بە جۆرێك کە پێکەوە ژیانیان بەو جۆرە نەگونجاو بێ.
ئەم ئایەتە موبارەکەش تاکە ئایەتی قورئانە کە باسی ناکۆکیی نێوان ژن و مێرد دەکات:

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَـٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾(النسا ء: ٣٥).

واتە: وە ئەگەر مەترسیی ناکۆکی نێوانیان (نێوان ژن و مێرد)تان هەبوو، ئەوە حەکەمێك لە کەس و کاری مێرد و حەکەمێك لە لەکەس و کاری ژنەکە بنێرن، ئەگەر مەبەستیان چاکسازیی (پێکهێنانەوە) یان لەیەك جیاکردنەوە بێ، خوا کاریان پێك دێنێ، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

## دووەم: ناردنی دوو دادوەر لە کەس و کاری ژن و مێرد بۆ چارەسەری ناکۆکیی نێوانیان:

### ١-ناردنی دوو دادوەر پێویستە:

هەرچەندە بەشێك لە زانایان بەس بە سوننەتی دەزانن، بەڵام ڕاست ئەوەیە کە ناردنی دوو دادوەرەکە، پێویستە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ ﴾ کە دیارە صیغەی فەرمان (صیغة الأمر) لە بنەڕەتدا بۆ فەرزبوونە، مەگەر نیشانەیەك هەبێ لەوە لایبدات و،

لێرەش نەك نیشانەی وا نیە، بەڵكو بە پێچەوانەوە، مادام ماڵ و گوزەرانی ژن و مێرد گەیشتبێتە ناكۆكیی و دووبەرەكیی، لەسەر كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستە، بكەونە بەینیان و چارەسەری كێشەكەیان بكەن و بەلایەكدا بیخەن و، كۆتایی بە ئازار و ناكۆكیی نێوانیان بێنن.

**٢-ناردنی دوو حەكەمەكە لەسەر حوكمڕان و بەرپرسان پێویستە:**

هەرچەندە ڕووی دواندن (خطاب) لەسەرجەم مسوڵمانانە كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا ﴾، بەڵام بێگومان تاك تاكی مسوڵمانان ناتوانن بەو كارە هەڵسن و، ئەوانەی بە پلەی یەكەم پێی دوێنراو و لە بەرانبەریدا بەرپرسیارن، حوكمڕان و بەرپرسانن كە نوێنەری خەڵك و كۆمەڵگان.

هەروەها كەس و كاری ژن و مێردیش بە حوكمی نزیكییان لێیانەوە، دیسان بەرپرسیارن لەبەرانبەریانداو، پێویستە دڵسۆزانە و دەستگەرمانە بە دەم كێشە و گیروگرفتەكانیانەوە بچن.

**٣-پێویستە دوو حەكەمەكە لە خزم و نزیكەكانی ژن و مێرد بن، مەگەر هیچ كەسی شایستەیان نەبێ كە بۆ ئەو كارە بشێ:**

بەڵگەی ئەمیش ئاشكرایە، چونكە خوا فەرموویەتی: ﴿فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا ﴾دیارە حیكمەتی گەورەش لەوە داهەیە، چونكە خزم و نزیكیان بە خێر و شەڕی ژن و مێرد و سروشتیان ئاشنان و، لە خەڵكی دوور و بێگانە باشتر دەتوانن پێكییان بێننەوەو،

گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن.

### ٤-مەرجە دوو حەکەمەکە عاقڵ و باڵغ ولێزان بن، بەڵام مەرج نیە نێرینە بن:

بەڵگەی ئەمەش ئاشکرایە، چونکە:
بابای حەکەم بەبێ عەقڵ و حیکمەت، توانای حەکەمایەتیی و سوڵح و پێکهێنانەوەی نابێ و، وشەی (حَکَمْ)یش پیاو و ژن دەگرێتەوەو، گرنگ هەبوونی توانا و لێهاتوویییە.

### سێیەم-دوو حەکەمەکە دەستکراوەن بۆ هەر بڕیارێك و، بڕیاریشیان پابەندکەرە:

زانایان لە بارەی سەلاحیەتی دوو حەکەمەکە ڕاجیاییان هەیە و بەشێکیان پێیان وایە، دوو حەکەمەکە تەنیا بۆیان هەیە ژن و مێردی ناکۆك پێك بێننەوە و، بۆیان نییە بڕیاری لێك جیاکردنەوە (تفریق) یان بدەن، بەڵام زۆربەیان ڕایان وایە کە دوو حەکەمەکە دەستیان کراوەیەو، هەر چییەك بە بەرژەوەندیی ژن و مێردە پێکەوە ناکۆکەکەی بزانن، بۆیان هەیە بڕیاری لەسەر بدەن.
هەڵبەتە ڕای زۆرینەش ڕاستە، چونکە:
١- ئایەتەکە ناوی لە دوو حەکەمەکە ناوە (حَكَمْ) نەك وەکیل، دیارە حەکەمیش ناوی خۆی بە خۆیەوەیە و بۆی هەیە حوکم و بڕیار دەربکات، کەواتە: کاتێك دوو حەکەمەکە سەلاحیەتی هەر جۆرە بڕیارێکیان نابێ،

با لەیەکترازاندنی ژن و مێردیش بێ، نیوەڕۆکی خۆیان لە دەست دەدەن، دیارە خوای کاربەجێش بەبێ حیکمەت و ئامانج ئەو دوو کەسەی ناونەناون حەکەم!

٢- (ابن القيم) هێناویەتی، کە (**عثمان بن عفان**) خوا لێی ڕازی بێ، هەرکام لە (ابن عباس) و (معاوية)ی وەك دوو حەکەم ناردنە نێوان (**عقيل بن أبي طالب**) (رضي الله عنه) و (**فاطمة بنت عتبة بن ربيعة**)ی هاوسەری، وە بە دوو حەکەمەکەی گوت: (**إنْ رأيتما ان تُفَرِّقا فَفرِّقاهُما**). واتە: ئەگەر بە باشتان زانی، کە لەیەکیان جیا بکەنەوە، جیایان بکەنەوە.

هەروەها لە (**علي بن ابي طالب**)ەوە (خوای لێ ڕازی بێ) هاتوە، کە بە دوو حەکەمی نێوان ژن و مێردی ناکۆکی گرتوە: (**عليكما ان رأيتما ان تُفرِّقا فرَّقتما، وإن رأيتما ان تجمعا جمعتُما**)[1]، واتە: لەسەرتان پێویستە ئەگەر بەباشتان زانی جیایان بکەنەوە، جیایان بکەنەوە، وە ئەگەر بەباشتان زانی کۆیان بکەنەوە، کۆیان بکەنەوە، (ڕێکیان بخەنەوە).

## چوارەم: حوکمڕان لەسەری پێویستە بڕیاری دوو حەکەمەکە جێ بەجێ بکات:

هەر کات دوو حەکەمەکە پاش لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە و هەڵسەنگاندن و کۆبونەوەی تایبەت لەگەڵ هەر کام لە ژن و مێرددا و ئامۆژگاریی

(١) زاد المعاد في هدى خير العباد، ج٤، ص٣٣-٣٤

کردنیان...هتد، هەردووکیان پێکەوە گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە ئەو ژن و مێردە پێکەوە نایانکرێ و، بەرژەوەندییان لە کۆتایی پێهێنانی ئەو ژیانە پڕژانەیان دایە، کە هەردووکیانی بێزار کردوە، بڕیاریان دا کە لەیەکیان بترازێنن، بڕیارەکەیان پابەندکەر (مُلْزِم)ە بۆ هەرکام لە ژن و مێرد، هەرچەندە یەکیان یان هەردووکیشیان نارازی بن، وە لەسەر حوکمڕان و بەرپرسانیش پێویستە بڕیاری دوو حەکەمەکە جێ بەجێ بکات و، بۆی نیە هەڵیبوەشێنێتەوە، ئەوە ڕای ڕاستتر و بەڵگەدارتری زانایانە و، وەك پێشتریش گوتمان هیچ مانایەك بۆ حەکەمایەتیی حەکەمەکان نامێنێتەوە ئەگەر بڕیارەکەیان پابەندکەر نەبێ و جێ بەجێ نەکرێ.

## پێنجەم-دەگونجێ لەیەك جیاکردنەوەی ژن و مێردی ناکۆك، تەڵاقی جیاکەرەوە، یان خولع بێ:

ئەگەر حەکەمەکان بۆیان دەرکەوت کە هۆکاری ناکۆکییەکە هەر کام لە ژن و مێردن و، هەر کامێکیان خراپە لەگەڵ ئەوەی دیکەدا دەکات، ئەوە لەو حاڵەتەدا بەشێوەی تەڵاقدان لەیەکیان جیا دەکەنەوە، دیارە تەڵاقدانی جیابوونەوە (**طلاق بائن**)، هەروەها ئەگەر هۆکاری ناکۆکییەکە مێردەکە بوو دیسان بە شێوازی تەڵاقدان، لەیەکیان دەترازێنن.
بەڵام ئەگەر هۆکاری ناکۆکییەکە ژن بوو، وە ئەو زیاتر دەستپێشخەری جیابوونەوە بوو، ئەوە بەشێوازی خولع لەیەکیان دادەبڕن و، ژنەکە ئەندازەیەك ماڵ و سامان کە لەسەری پێك دێن، دەداتە مێردەکەی.
لە کۆتایی ئەم بابەتەشدا دەڵێم:
تێکڕای سەرچاوەکان بە تەفسیرەکانی قورئانیشەوە، وشەی (إصلاح) لە

رِســـتەی: ﴿إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا﴾ بەوە مانا دەکەن کە مەبەست پێی چاکسازیی و ئاشتەوایی نێوان ژن و مێرد و پێکهێنانەوەیانە و بەس، بەڵام مـن وای بـۆ دەچم کە مەرج نیە مەبەست لە (إصلاح) بەس پێکهێنانەوە بێ، چونکە دەگونجێ چاکسازیی و بەرژەوەندیی دنیا و دوارۆژی ئەو ژن و مێردە ناکۆکە، لەوەدا بێ، کە یەخەی یەکدی بەربدەن و دەستبەرداریی یەکدی بن.

## ٣-لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە (الإرتداد):

لە دوو برگەدا باسی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە دەکەین، وەك هۆکارێکی دیکەی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیریی (فسخ النكاح):

**یەکەم: پێناسەی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە (الارتداد).**

**دووەم: هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیریی بەهۆی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە.**

### یەکەم- پێناسەی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە (الارتداد).

وشەی (رِدّة) لەزمانی عەرەبیدا بە: (الرجوع عن الشيئ إلى غيره) گەڕانەوە لە شتێك بۆ شتێکی دیکە، مانا کراوە.

وە لە زارەوەی شەرعدا بە: (الرجوع عن الإسلام) هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و وازلێهێنانی، مانا کراوە، کەواتە: (مُرتدّ)یش کەسێکە کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە و وازی لێ دێنێ[1].

کە دیارە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، گەورەترین گوناهە، هەربۆیەش خوای بەرز و مەزن لە دوارۆژدا گەورەترین سزای بۆ داناوە، وەك فەرموویەتی:

---

(١) بڕوانە: (المفصل..)، ج٥، ص٣٠٠، (التعريف بالردة والمرتد).

﴿.... وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾(البقرە: ٢١٧)

واتە: .....وە هەر کامێکتان لە ئایینەکەی پاشگەز بێتەوە، پاشان بە کافریی بمرێ، ئەوە ئەوانە لە دونیا و دوارۆژدا کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە، وە ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، تێیدا بەهەمیشەیی دەمێننەوە.

بەنسبەت سزای دنیایی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەشەوە، لە نێوان زانایاندا ڕاجیایی لەسەرە و لە نامیلکەی: (حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و هەڵسەنگاندنێك)دا، قسەم لە بارەی ئەو بابەتەوە کردوە[1].

## دووەم- هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیریی بەهۆی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەوە:

لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەی ژن و مێردێکی مسوڵمان، بە نسبەت کاتی هەڵگەڕانەوەکەیانەوە دوو حاڵەتی هەن:

یەك: پێش گواستنەوە (قبل الدخول).

دوو: پاش گواستنەوە (بعد الدخول).

أ-ئەگەر پێش گواستنەوە بێ، ئەوە سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە چ هەردووکیان پێکەوە هەڵگەڕابنەوە، چ یەکێکیان، ئەوە لەیەك دەترازێن و

---

(١) کە ئاڵقەی سێزدەیەمی زنجیرەی: (بابەتە هەنووکەییەکان)ەو لە ئەسڵدا باسێکە لە باسەکانی کتێبی(ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی) کە لە ژێر چاپدایە.

جیا دەبنەوە[(١)].

ب-بەڵام ئەگەر پاش گواستنەوە بێ، ئەوە دیسان دوو حاڵەتیان هەن:

یەك: هەردووکیان هەڵگەڕابنەوە.

دوو: یەکێکیان هەڵگەڕابێتەوە.

أ- ئەگەر هەردووکیان وێکرا هەڵگەڕابنەوە، ئەگەر پێش گواستنەوە (قبل الدخول) بێ، ئەوە لەلای زۆربەی هەرەزۆری زانایان، کە (زُفر) لە حەنەفییەکان و، مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و جەعفەرییەکان و زەیدییەکان و زاهیرییەکانن، دەستبەجێ هاوسەرگیرییەکان هەڵدەوەشێتەوە.

بەڵام ئەگەر پاش گواستنەوە بێ، ئەوە ڕای زانایان بەم جۆرەیە:

هەرچی حەنەفییەکانن، جگە لە (زفر) دەڵێن: هاوسەرگیرییەکەیان هەڵناوەشێتەوە و، هەر کاتێك گەڕانەوە بۆ ئیسلام، هەر لەسەر نیکاحی پێشوویان دەمێنن[(٢)].

---

(١) (المفصل..)، ج٩، ص١٠٩-١١٤، وە : (مدى حرية الزوجين في التفريق قضاءً)، ص١٧٠.

(٢) بەڵگەشیان ئەوەیە، کە لە ڕۆژگاری خەلیفەی یەکەم (ابوبکر الصدیق)دا خوالێی ڕازی بێ، ئەوهەڵگەڕاوانەی کە پاش سەرکەوتنی سوپای ئیسلام، مسوڵمان بوونەوە، داوایان لێنەکرا کە نیکاحەکانیان تازە بکەنەوە، کەواتە: هەڵنەوەشابوونەوە، ئەوانی دیکەش دەڵێن: ئەگەری هەیە کە ئەوانە تەنیا ڕێگریی زەکات دانیان کردبێ و یەکجاریی لە ئیسلام هەڵنەگەڕابنەوە، هەروەها دەگونجێ پێکەوە — واتە: ژن و مێردەکان- نەگەڕابنەوە بۆ ئیسلام.
بەڵام بەڕای من ئەم قسانە بە هەموویان هێزو پێزی ئەوەیان نییە، کە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە : ئایا ئەگەر لەو حاڵەتەدا، نیکاحەکانیان هەڵوەشاونەوە، بۆچی کەم و زۆر باسی ئەم مەسەلەیە نەکراوەو نەورووژێنراوە لەنێو هاوەڵانی بەڕێزدا، پاش کۆتایی هاتنی جەنگەکانی هەڵگەڕانەوە (حروب الردە)؟!

منیش ئەم ڕایەم پێ بەهێز و پەسەندە.

شافیعییەکانیش دەڵێن: ئەگەر لەماوەی عیددەدا گەڕانەوە و مسوڵمان بوونەوە، ئەوە هەر لەسەر نیکاحی پێشوویان ماون، بەڵام ئەگەر پاش عیددە بێ، ئەوە نیکاحەکەیان هەڵوەشاوەتەوە و لەیەك ترازاون.

حەنبەلییەکانیش لەو بارەوە دوو ڕایان هەن، یەکێکان دەڵێ: دەستبەجێ نیکاحەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، یەکێکیشیان وەك ڕای شافیعییەکانە.

مالیکییەکانیش لەو بارەوە سێ ڕایان هەن: ڕایەکیان دەڵێ: نیکاحەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، ڕایەکیشیان دەڵێ: بە تەڵاقدانی جیابوونەوە (**طلاق بائن**) دادەنرێ، ڕایەکەی دیکەشیان دەڵێ: بە تەڵاقدانی گێڕانەوە (**طلاق رجعي**) دادەنرێ.

جەعفەرییەکانیش ڕایان وەك هی شافیعییەکانە، کە ئەگەر لە عیددەدا بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام، ئەوە نیکاحەکەیان هەر لە جێی خۆیەتی، بەڵام ئەگەر دوای بە سەرچوونی عیددە بێ، نیکاحەکەیان هەڵوەشاوەتەوە و بە نیکاحێکی تازە نەبێ، ناتوانن بچنەوە لای یەکدی، وەك ژن ومێرد.

زەیدییەکانیش دوو ڕایان هەن: یەکیان دەڵێ: دەستبەجێ نیکاحەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، یەکیشیان دەڵێ: پاش بەسەرچوونی هەڵدەوەشێتەوە.

زاهیرییەکانیش دەڵێن: بە هەڵگەڕانەوەی ژن و مێرد پێکەوە یان یەکێکیان، دەستبەجێ نیکاحی نێوانیان هەڵدەوەشێتەوە و لە یەکدی بێگانە دەبن[(١)].

---

(١) (المفصل...)، ج٨، ص١١٠-١١٤.

ب- بەڵام ئەگەر تەنیا یەکێکیان هەڵگەڕابێتەوە، ئەوە ڕای زانایان بەم جۆرەیە:

حەنەفییەکان دەڵێن: ئەگەر هەڵگەڕاوەکە ژنەکە بێ، ئەوە دەستبەجێ بەشێوەی هەڵوەشانەوە (فسخ) لەیەك دەترازێن، هەروەها ئەگەر هەڵگەڕاوەکە مێردیش بێ بەهەمان شێوەیە، لەلای (**أبو حنيفة وأبو يوسف**)، بەڵام (محمد) ڕای وایە تەڵاقە.

بەڵام شافیعییەکان و مالیکییەکان و حەنبەلییەکان لە یەکێك لە دوو ڕایەکانیان داو، جەعفەرییەکان و (**المؤيد بالله**) لە زەیدییەکان، ڕایان وایە کە هەر کام لە ژن و مێرد لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، ئەگەر پێش تێپەڕبوونی عیددە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، ئەوە نیکاحەکەیان هەر لەجێی خۆیەتی، بەڵام پاش تەواوبوونی عیددە، نیکاحەکەیان هەڵوەشاوەتەوە و لەیەك ترازاون.

زاهیرییەکانیش ڕایان وایە کە چ ژن هەڵبگەڕێتەوە، چ مێرد، چ پێکەوە، ئەوە دەستبەجێ نیکاحەکەیان هەڵوەشاوەتەوە، وەك پێشتریش گوتمان[١].

دیارە بەڵگەی هەڵوەشانەوەی نیکاحی ژن و مێردی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، جا چ وێکڕا هەڵگەڕابنەوە، چ بە جیا جیا، وە چ تەنیا مێرد یان تەنیا ژن هەڵگەڕابێتەوە، ئەوەیە کە خوا سبحانه و تعالى ڕایگەیاندوە، کە نە ئافرەتی مسوڵمان بە هیچ ڕەنگێك بۆ پیاوی کافر- هەر جۆرە کافرێك بێ- حەڵاڵە، وە نە پیاوی مسوڵمانیش ئافرەتی کافری بۆ حەڵاڵە، جگە لە هی خاوەن کتێبەکان (أهل الكتاب)، وەك خوای زانا و توانا فەرموویەتی:

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ و لاپەڕە.

﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾ (المائدە: ٥).

واتە: ئەمڕۆ شتە خۆش و بە تامەکانتان بۆ حەڵاڵ کراون، هەروەها خواردنی ئەوانەی کتێبیان دراوەتێ بۆتان حەڵاڵە، وە خواردنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، هەروەها پاکیزەکان لە ئیمانداران و پاکیزەکان لەوانەی پێش ئێوە کتێبیان دراوەتێ...

ئنجا ئەو ئایەتانەش کە بۆیەك حەڵاڵ نەبوونی ئەهلی کوفر و ئەهلی ئیمان لە بواری هاوسەرگیریدا، بە ڕوونیی رادەگەیەنن، ئەمانەن:

١-﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ (البقرة:٢٢١).

واتە: وە ئافرەتانی هاوبەشدانەر مارە مەکەن، هەتا ئیمان دێنن، وە کەنیزەکێکی بڕوادار لە هاوبەشدانەرێك باشترە، هەرچەندە جوانییەکەی سەرسامیشتان بکات، وە ئافرەت لە هاوبەشدانەرەکان مارە مەبڕن، هەتا ئیمان دێنن، وە کۆیلەیەکی بڕوادار لە هاوبەشدانەرێك باشترە، هەرچەندە سەرسامیشتان بکات، ئەوانە

(خەڵك) بەرەو ئاگر بانگ دەكەن و، خواش بەرەو بەهەشت و لێبوردن بە فەرمانی خۆی (خەڵك) بانگ دەكات، وە ئایەتەكانی خۆی بۆ خەڵك ڕوون دەكاتەوە، بەڵكو پەند وەربگرن.

هەڵبەتە ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ، كە دروست نیە پیاوی بڕوادار ئافرەتی كافر بێنێ، هەروەها دوروست نیە ئافرەتی بڕوادار بدرێتە پیاوی كافر.

٢- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ (الممتحنة: ١٠)

ئەم ئایەتەش ئەوە دەگەیەنێ كە نە ئافرەتانی بڕوادار بۆ پیاوانی كافر حەڵاڵن و، نە پیاوانی بڕواداریش ئافرەتانی كافریان بۆ حەڵاڵن: ﴿ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴾ ئەگەر پێشتریش هاوسەری یەكدی بووبن، بەڵام هەر كات یەكیان ئیمانی هێناو، ئەوەی دیكە لەسەر كوفر مایەوە، لە یەكدی حەرام دەبن.

هەروەها ڕستەی: ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ واتە: وە دەست بە گرێبەستی ژنانی كافرەوە مەگرن، بە ڕاشكاویی ئەوە دەگەیەنێ كە پیاوی مسوڵمان بۆی نیە ژنی كافری هەبێ، جگە لە ژنانی خاوەن

کتێبەکان.

شایانی باسیشە ئێمە لە خاڵی چوارەمدا وردتر قسە لەسەر ئایەتی (١٠) (الممتحنة) دەکەین، بۆیە لێرە بە خێرایی بەسەریدا ڕەت بووین.

## ٤-ئیسلام قبووڵ نەکردنی یەکێك لەژن و مێرد (إباءُ أحدِ الزوجين الإسلام):

زانایان لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە[1] ڕاجیایی و مشت و مڕێکی زۆریان هەیە، بەڕای من کەم مەسەلە هەن هێندەی ئەم مەسەلەیە ڕا جیاییان تێدا هەبێ.

جا ئێمە سەرەتا ئاماژە بەو شتانە دەکەین کە زانایان تێیان دا هاوڕا و یەکدەنگن و، پاشان دێینە سەر ئەو شتانەش کە تێیاندا ڕاجیان:

یەك: هەر کات ژن و مێردی کافر مسوڵمان بوون، ئەوە هەر لەسەر نیکاحی خۆیان دەمێننەوە، بە مەرجێك بە شێوەیەك نەبن کە بەپێی شەریعەت بەیەك نەشێن، بۆ وێنە: خوشك و برای شیریی..

بەڵگەش ئەوەیە کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ژن و پیاوە کافرەکان کە مسوڵمان دەبوون، پێغەمبەری خوا لەسەر بناغەی نیکاحی پێشوویان مامەڵەی لەگەڵ دەکردن و، بە هیچ کەسی نەفەرمووە کە نیکاح تازە بکاتەوە، وەك لە سیرە و مێژووی دا دیار و زانراوە و، زانایانیش

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە، وێڕای ئەو دوو سەرچاوەیەکە لە سەرەتای ئەم تەوەرەیەوە ئاماژەم پێدان، سوودم لە (المجلة العلمية للمجلس الأوربي للإفتاء والبحوث) العدد الثاني، وەرگرتوە.

لەسەر ئەوە یەك دەنگن.

**دوو:** هەروەها هەر كات مێردی ژنێكی خاوەن كتێب (الكتابیة) مسوڵمان بوو، بەڵام ژنەكەی مسوڵمان نەبوو، ئەوە دیسان نیكاحەكەیان هەر لە جێی خۆیەتی، بە مەرجێك لەوانە نەبن كە بەیەك نەشێن.

زانایانی ئیسلام تێكڕا لەسەر ئەم مەسەلەیەش ڕێككەوتوون، جگە لە وانەیان كە مارەكردنی ئافرەتی خاوەن كتێب بۆ پیاوی مسوڵمان، بە دروست (جائز) نازانن[1].

كە ڕایەكەشیان ڕاست نیە، چونكە پێچەوانەی دەقی قورئانە وەك پێشتر هێنامان.

بەڵام ئەوەی زانایان بە خەستی تێیدا كەوتوونەتە ڕاجیایی و مشت و مڕەوە ئەوەیە كە: ئایا ئەگەر پیاوێكی كافر مسوڵمان بوو، بەڵام ژنەكەی مسوڵمان، نەبوو، وە خاوەن كتێب (**الكتابیة**)ش بوو، یان ئەگەر ژنێكی كافر مسوڵمان بوو بەڵام مێردەكەی مسوڵمان نەبوو، ئایا حوكمیان چییە؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش دەڵێین:

(**ابن قیم الجوزیة**) لە كتێبی (**أحكام أهل الذمّة**)دا[2] نۆ (٩) ڕای لە هاوەڵان و شوێنكەوتون (**الصحابه والتابعین**) و زانا و پێشەوایانی دوای وانەوە، هێناون لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە.

هەروەها (عبدالله بن یوسف الجُدیع) سێزدە (١٣) ڕای زانایانی لەو بارەوە هێناون[1].

---

(١) (المفصل فی أحكام المرأة...)ج٩ص٩٣.

(٢) بڕوانە: (أحكام أهل الذمة)، ج١، ص٣١٨-٣٢٦)، وە:المجلة العلمیة للمجلس الأوروبی للإفتاء والبحوث)، العدد الثانی، ص٤٢٤-٤٢٧.

جا ئێمە سەرەتا سێزدە ڕایەکەی (الجديع) دێنین، چونکە نۆ ڕایەکەی (ابن القيم)یش دەگرنە خۆیان.

ئەو سێزدە ڕایەش ئەمانەن، وەك (عبدالله بن يوسف الجُديع) لە ژێر ناونیشانی: (خُلاصة مذاهب السَّلَف والخَلَفْ في المسألَة)دا هێناونی:

**١-هەر کات ژن ومێرد یەکیان پێش ئەوی دیکەیان مسوڵمان بوو، گرێبەستی نێوانیان هەڵدەوەشێتەوە.**

ئەمە ڕای: (الحسن البصري)یە لە ڕیوایەتێکدا، هەروەها هی (**عطاء**)ە، لە ڕیوایەتێکدا، وە ڕای: (**عكرمة وقتادة وعمر بن عبدالعزيز وعبدالرحمن بن زيد بن أُسلم وعبدالله بن شبرمة**) لە ڕیوایەتێکدا، وە ڕای: (**أبو ثور**)، وە ڕیوایەتێکە لە (أحمد بن حنبل) و هەندێك لە هاوەڵانی، وە ڕای: (محمد بن حزم الظاهري) یە.

هەروەها ڕای:(المالكية والشافعية والحنابلة) یە ئەگەر ژنەکە نەگوازرابێتەوە.

هەروەها ڕای: (سفيان الثوري) یە بۆ ژن و مێردێك کە لە وڵاتی کافران (دار الحرب) دابن.

**٢-هەر کات مێرد مسوڵمان بوو، وە ژنەکەی لە مسوڵمان بوون دا لێی دوا کەوت، وە لە هەمان کۆڕ (مجلس)دا مسوڵمان نەبوو، مادام خاوەن کتێب (کتابية) نەبێ،و، بۆ ئیسلامیش بانگ کرابێ، ئەوە نیکاحەکەیان هەڵدەوەشێتەوە.**

ئەمە ڕای: (المالكية) و (ابن قيم الجوزية)یە.

٣-هەر کات مێرد مسوڵمان بووو، ژنەکەی بە ماوەیەکی دوای وی مسوڵمان نەبوو، نیکاحەکەیان هەڵدەوەشێتەوە.

---

(١) المجلة العلمية، العدد الثاني، (إسلام المرأة وبقاء زوجها على دينة)، ص١٤٩-١٥١

ئەمەش ڕای هەندێك لە مالیكیەكانە وەك (ابن القاسم).

٤-هەر كات یەكیان مسوڵمان بوو پێش ئەوەی دیكەیان، وە لە عیددەی ژنەكەدا مسوڵمان نەبوو، نیكاحەكەیان هەڵدەوەشێتەوە.

ئەمەش ڕای (**مجاهد المكي**)یە لە ڕیوایەتی ڕاستدا، وە ڕیوایەتێكە لە: (**الحسن البصري وعطاء وعمر بن عبدالعزيز وعبدالله بن شُبرمة**)، هەروەها مەزهەبی (**الأوزاعي والليث بن مسعود**)، وە مالیكییەكانە لە كاتێك دا ژن پێشتر مسوڵمان دەبێ، وە مەزهەبی: (الشافعية والحنابلة واسحاق بن راهويه)ە.

٥-هەر كات ئەوەیان كە مسوڵمان دەبێ- لە ژن و مێرد- لە وڵاتی كافرانەوە (دار الحرب) بچێتە وڵاتی مسوڵمانان، نیكاحەكەیان هەڵدەوەشێتەوە.

ئەمەش مەزهەبی تایبەتی حەنەفییەكانە.

٦-ئەگەر ژن و مێرد خاوەن كتێب نەبن، دەستبەجێ لە كاتی مسوڵمان بوونی یەكێكدا، نیكاحەكەیان بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر خاوەن كتێب بن، لەیەك جیادەكرێنەوە.

ئەمەش لە ڕیوایەتێكدا لە مەزهەبی (**عطاء**)ەو، لە (طاوس **ومجاهد**)یش نەقڵ كراوەو، لە هەندێك ڕیوایەتدا لە (سعيد بن جبير)یش گێڕراوەتەوە.

٧-هەر كات یەكیان لە وڵاتی نا مسوڵمانان (دار الحرب)دا مسوڵمان بوو، وە ژنەكە سێ حەیزی پێ داهات و، دوومیان مسوڵمان نەبوو، نیكاحەكەیان هەڵدەوەشێتەوە.

ئەمەش مەزهەبی تایبەتی حەنەفییەكانە.

٨-هەر كات یەكیان مسوڵمان بوو، وە ئەوی دیكەشیان پاش بانگكران بۆ ئیسلام هەر مسوڵمان نەبوو، نیكاحەكەیان هەڵدەوەشێتەوە.

ئەمەش لە ڕیوایەتێکدا ڕای (عمر عبدالعزیز والزهري)یە، لەڕێیەکی بێهێزەوە.

٩-هەرچەندە یەکیان مسوڵمان ببێ، بەبێ بڕیاری دادوەر، نیکاحەکەیان هەڵناوەشێتەوە، ئەمەش قسەی هەر کام لە: (**طاوس** و سعید بن جبیر والحکم بن عتبة) دەیخوازێ، وەریوایە تێکیشە لە: (عمر بن عبدالعزیز) وە ریوایەتێکی بێهێزیشە لە: (الزهري) یەوە، هەروەها ئەمە ڕواڵەتی قسەی (ابن عباس)ە، چونکە ڕای وایە کە ژنی مسوڵمان بۆی هەیە بە دەستبەرداربوونی مێردە کافرەکەی، نیکاحەکەی بەتاڵ بکاتەوە.

١٠-ژن و مێرد هەرچەندە یەکێکیشیان مسوڵمان ببێ، مادام لە وڵاتی مسوڵمانان (دار الاسلام)دا بن، مەگەر بە بڕیاری دادوەر، دەنا نیکاحیان هەڵناوەشێتەوە.

ئەمەش مەزهەبی حەنەفییەکان و (سفیان الثوري) یە.

١١-ژن و مێرد کە یەکیان مسوڵمان دەبێ، مەگەر بە بڕیاری دادوەر یان کۆتایی هاتنی عیددە، ئەگەر نا نیکاحەکەیان هەڵناوەشێتەوە.

ئەمەش مەزهەبی (الزهري)یە لە ڕیوایەتێکدا.

١٢-هەرکات ژن و مێرد یەکیان مسوڵمان بوو، نیکاحەکەیان دەگۆڕێ بۆ گرێبەستێکی دروست (عقد جائز)، وە بەشێوەی وەستێنراو(موقوف) دەبێ، ئنجا هەرکات دووەمیان مسوڵمان بوو نیکاحەکەیان بەردەوام دەبێ، وە ژنەکە بۆی هەیە چاوەڕێی مێردەکەی نەکات و مێردێکی دیکە بکاتەوە.

ئەمەش ڕیوایەتێکی بە بێهێز دانراوی (احمد بن حنبل) و مەزهەبی (داود **الظاهري**) و (**إبن تیمیة**)یە، هەروەها مەزهەبی (**إبن القیِّم**)یشە لە کاتێکدا کە ژن لە پێش مێرددا مسوڵمان دەبێ.

١٣-گرێبەستی نیکاح لە پێویستە (واجب)ەوە دەگۆڕێ بۆ دروست (جائز)و، ژن بۆی هەیە لە مێردەکەی جیا بێتەوە، وە بۆشی هەیە وەك هاوسەر لەگەڵیدا بمێنێتەوە، مادام لەشوێنێك دابن کە ژنەکە دەستکراوە و سەربەست بێ، وەك وڵاتی مسوڵمانان (دار الإسلام).

ئەمیش ڕیوایەتی ڕاست لە (أمير المؤمنين عمر وأمير المؤمنين علي)یەوە دەلالەتی لەسەر دەکات، وە ئەمەش مەزەبی: (**عامر الشعبي وإبراهيم النخعي وحمّاد بن أبي سليمان**)[1].

وەك دەبینین ئەم مەسەلەیە ڕاجیاییەکی گەورەی زانایانی تێدایە و، هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە دەقێکی ڕوون و یەکلاکەرەوەی قورئان و سوننەت لەو بارەوە نیە، هەروەها یەکدەنگیی زانایانیش نیە، هەرچەندە هەندێك لە زانایان بگرە زۆرێکیان باسیان کردوە[2]، بەڵام مەسەلەیەك ئەو هەموو ڕایانەی ئەو کەڵە زانایانەی لە بارەوە هەبن، ناگونجێ باسی یەکدەنگیی زانایان (اجماع العلماء)ی لە بارەوە بکرێ!

شایانی باسیشە کە ئایەتێك کە سەرجەم ئەو زانایانەی قسەیان لەبارە ئەو مەسەلەیەوە کردوە، بەبەڵگەیان هێناوەتەوە، ئەم ئایەتەیە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ

---

(١) المجلة العلمية، العدد الثاني، (إسلام المرأة وبقاء زوجها على دينه)، ص١٤٩-١٥١.

(٢) هەمان سەرچاوە، (اسلام المرأة وبقاء زوجها على دينه)، الشيخ فيصل مولوي، ص٢٤٥-٣٠٨.

وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ (الممتحنة:١٠)

واته: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوه! هەر کات ئافرەتانی ئیماندار کۆچیان کرده لاتان، تاقییان بکەنەوه، خواش بە ئیمانەکەیان زاناترە، جا هەر کات زانیتان کە ئیماندارن، ئەوه مەیانگێڕنەوه لای کافران، چونکە نەئەوان (ژنەکان) بۆ ئەوان حەلاڵن و نە ئەوانیش (پیاوەکان) بۆ ئەوان حەلاڵن، وه ئەوەی (وەك مارەیی) خەرجیان کردوه بیاندەنەوه، وه هەر کات مارەییەکانیانتان پێیاندا، گوناهتان ناگات کە مارەیان بکەن، وه خۆشتان دەست بە گرێبەستی نیکاحی ژنانی کافرەوه مەگرن، وه ئێوەش داوای ئەوه بکەنەوه کە (وەك مارەیی) خەرجتان کردوه (بۆ ئەو ژنانەتان کە گەڕانەوه لای کافرەکان) وه با ئەوانیش داوای گێڕانەوەی ئەوه بکەن کە خەرجیان کردوه (بۆ ئەو ژنانەیان کە هاتوونە لاتان و مارەتان کردوونەوه) ئا ئەوەتان حوکمی خوایە، حوکمتان لە نێواندا دەکات، وه خوا زانای کار بەجێیە.

ئەم ئایەتە موبارەکە چەند حوکمێکی لێوەردەگیرێن، کە پێم وانیە هیچ کام لە زانایان مشت و مڕیان لەبارەیانەوه هەبێ:

یەك: ئافرەتانێك کە لە نێو کافرانەوه بۆ لای مسولمانان کۆچ دەکەن و، پاش تاقیکردنەوه بە ئیماندار دازانرێن، دروست نیە بگێڕرێنەوه نێو کافرەکان: (فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ).

دوو: نە ئەو ئافرەتە ئیماندارە کۆچکەرانە، بۆ مێردە کافرە دژی ئیسلامەکانیان حەلاڵن و، نە ئەوانیش بۆیان حەلاڵن: (لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ).

سێ: پێویستە مسولمانان مارەیی ئەو ژنانەی بۆ لای مسولمانانیان ڕاکردوه، بۆ مێردە کافرەکانیان بگێڕنەوه : (وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ).

چوار: پیاوانی مسـوڵمان گوناهیـان ناگـات ئەگـەر ئـەو ژنانـە مـارە بکـەن کـە کۆچیان کـردوەو، مێـرد و کـەس و کارەکانیـان بەجێهێشـتوە، دوای ئـەوەی مارەییەکانیان پێ دەدەن: (وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ كَانَ ).

پێنج: وە پیاوانی ئیمانداریش بۆیان نیـە گرێبەسـتی هاوسـەرگیریی لەگـەڵ ئـەو ژنانەیان دا بهێڵنەو، کە لە نێو ئەهلی کوفردا مـاون، یـان ڕایـان کردۆتـەوە لایان و کوفریان هەڵبژاردوە: (وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ).

شەش: هەرکام لە پیاوانی مسـوڵمان و پیـاوانی کـافر کـە ژنـەکانیان لەگـەڵیان نـەماون، مـافی خۆیانـە داوای مارەییـەکانیان بکەنـەوە: (وَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ).

حەوت: ئنجا لە ئایـەتی دواتـر لـە (١١)دا، چارەسـەری ئـەو گرفتـە کـراوە کـە ئەگەر مسوڵمانێك ژنەکەی چۆوە لای کـافران‌و مارەییەکـەی فـەوتا، ئـەوە پێویستە مسوڵمانان لە ماڵ و سامانی دەستکەوت (غنيمة) بـۆی قـەرەبوو بکەنـــــەوە: ﴿ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ ﴾(ممتنحة:١١).

ئنجا لە بارەی بیروڕاشـەوە و ئـەوەی بـە ڕاسـتتر و پەسـەندتری دەزانم، بـۆ ئـەم مەسەلەیە، دەڵێم:

وەك لە سەرەتاشەوە ئامـاژەم پێدا، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە دەقێکـی ڕوون و یەکلاکەرەوەی شەریعەت (قورئان و سـوننەت) لـەو بـارەوە نیـە، پێم وا نیـە هـیچ کەس بە جەزمیی بتوانێ بڵێ: فلانە ڕایە ڕاست و تەواوو، ئەوانی دیکە هەڵەن!

ئەو ڕایەش کە من بە پەسندی دەزانم لە چەند بڕگەیەکدا دەیخەمەڕوو:

١-هیچ بەڵگەیەك نیە کە تەنیا بە مسولمان بوونی ژن یان مێرد، یەکسەر گرێبەستی نیکاحیان هەڵبوەشێتەوەو، فەرمودەی خواش: ﴿لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ تەنیا ئەوەندە دەگەیەنێ کە ژنی مسولمان و مێردی کافر بۆ یەکدی حەڵاڵ نین، واتە: دروست نیە پێکەوە جووت بن، بەڵام نەیفەرمووە یەکجاریی لەیەك پچڕاون.

ئنجا بەڵگەی سوننەتیش لەسەر ئەوە کە بە مسولمان بوونی ژن یان مێرد نیکاحەکەیان هەڵناوەشێتەوە، ئەم دەقەیە:

(عن إبن عباس قال:

ردّ رسول الله (ﷺ)زَيْنَبَ ابْنَتَهُ على زوجها أبي العاص بن الربيع بالنكاح الأول ولم يُحْدِث شيئاً، (زاد في رواية: بعد ست سنين) رواه إبن ابي شيبة واحمد وإبن سعد وإبن هشام في السيرة وأبو داود والترمذي وإبن ماجه والحاكم وغيرهم)[1].

واتە: پێغەمبەری خوا زەینەبی کچی گێڕایەوە بۆ ئەبی ئەلعاصی کوڕی ڕەبیع بە مارەکردنی یەکەم و هیچی زیاد نەکرد (لە ڕیوایەتێکدا: پاش شەش ساڵان).

ئنجا شتێکی ئاشکراشە کە چ لە قۆناغی مەککە داو، چ لە قۆناغی مەدینەداو، تەنانەت پاش ئازادکردنی شاری مەککە (فتح مكة)ش، کە ئەو کاتە دوو ساڵ بوو سورەتی (الممتحنة) هاتبۆ خوارێ- ئەگەر بگوترێ: ئەو حوکمە بە ئایەتی ژمارە (١٠)ی (الممتحنة) نەسخ کراوەتەوە- پیاوان و

(١) بڕوانە: (اسلام المرأة وبقاء زوجها علم دينه)، للجريع، المجلة العلمية، ص٦٧.

ژنانێکی زۆر مسوڵمان بوو، کە بێگومان وابووە، پیاو پێش ژنەکەی و واش بووە، ژن پێش مێردەکەی مسوڵمان ببێ، بۆ وینە: **(أم طلحة)** پـێش **(أبـو طلحة)** مسـوڵمان بـووە، ئنجـا هـەرگیز ئـەو مەسـەلەیە لـەو کاتـەدا بـاس نـەکراوە کـە: چـونکە فلاّنـە ژن و مێـردە، مسـوڵمانبوونیان پـاش و پـێش کـەوتوەو پێکـەوە لەیـەك کاتـدا مسـوڵمان نـەبوون، کەواتـە: نیکاحیـان هەڵوەشاوەتەوە!

٢-هەروەها هیچ بەڵگەیەکیش لەسەر ئەوە نیە، کە ماوەی عیددە بە سنووری ڕەوابوونی گەڕانەوە لای یەکدی، ژنی مسوڵمانبوو و مێردی کافر، دانرابێ، وەك زۆرێك لەزانایان گوتوویانەو، لەلایەن مەزەبەکانی شافیعیی و حەنبەلیی و جەعفەرییەوە، تەبەننیی کراوە.

(ابن القیم) لەو بارەوە گوتوویەتی: (....**وبالجملة فتحدید ردِّ المرأة علی زواجها بانقضاء لعِدّة لو کان هو شرعُهُ الذي جاءَ به، لکان هذا مما یجب بیانهُ للناس من قبل ذلك الوقت، فإنهم أحوج ما کانوا الی بیانه**)[1]. واتە بە کورتیی: دیاریکردنی پێش بەسەرچوونی عیددە، بە کاتی گێڕانەوەی ژن بۆ مێردی، ئەگەر ئـەو شـەرعە بوایـە کـە هێناویـەتی واتـە: پێغەمبەر (ﷺ)ئەوە پێویست بوو کـە پـێش ئـەو کاتـە، کـە زۆر ئاتـاجی ڕوونکردنەوەی بوون، بۆ خەڵکی ڕوون کردبایەوە...

٣-هەروەها ئەوە کە دەبێ هەر کام لە ژن و مێرد مسوڵمان بوون، ئیسلام لەسەر ئەوەی دیکەیان ڕابنوێنرێ‌و، ئەگەر ئەویش وەك هاوسەرەکەی مسوڵمان بوو، باشە، ئەگەرنا دادوەر **(قاضي)** لەیەکیان دەترازێنێ، ڕاست و بەڵگەدار نیەو، نەبیستراوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ ژن

(١) أحکام اهل الذمة، ج١، ص٣٢٦.

ومێردێکی لەیەك جیاکردبنەوە، بەهۆی پێکەوە و لەیەك کاتدا مسوڵمان نەبوونیانەوە.

(مالك) لە (ابن شهاب)ەوە هێناویەتی: (**كان بين إسلام صفوان بن أمية وامرأته بنت الوليد بن مُغيرة نحواً من شهرٍ، أسلمت يوم الفتح وبقي صفوان حتى شَهِدَ حنيناً والطائف وهو كافر ثم أسلم، فلم يفرّق النبي (ﷺ)بينهما، واستقرت عِنْدهُ امرأته بذلك النكاح**)[1].

واتە: لەنێوان مسوڵمانبوونی صەفوانی کوڕی ئومەییە و ژنەکەیدا کچی وەلیدی کوڕی موغیرە، نزیکەی مانگێك بوو، ژنەکەی ڕۆژی فەتحی مەککە مسوڵمان بوو و، صەفوانیش مایەوە هەتا جەنگی حونەین و تائیفیشی بینی و هەر کافریش بوو، پاشان مسوڵمان بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) لە یەکی جیانەکردنەوە و، ژنەکەی هەر بەو نیکاحەیەوە لەلای دامەزراو بوو.

٤-بەڵام بێگومان ئەو ژنەی کە مسوڵمان دەبێ و مێردەکەی مسوڵمان نابێ، بۆی هەیە کە لەلای دادوەر نیکاحەکەی لەگەڵ مێردە کافرەکەی هەڵبوەشێنێتەوەو، شوو بە پیاوێکی مسوڵمان بکاتەوە، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ).

کەواتە: ئەو ژنەی کە مسوڵمان دەبێ و مێردەکەی هەر لەسەر کوفر دەمێنێتەوە، سەرپشك (مختار) دەبێ لە نێوان: مانەوەی لە ژێر نیکاحی مێردەکەیداو، چاوە ڕێ کردنی مسوڵمانبوونی، وەك زەینەبی کچی پێغەمبەر (ﷺ) کە شەش ساڵان چاوەڕێی مێردەکەی کرد، هەتا سەرەنجام مسوڵمان بوو، وە سکاڵا بردنی بۆ لای داوەر بۆ هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی و، شووکردنەوەی بە پیاوێکی مسوڵمان.

---

(١) أحكام أهل الذمة، ج١، ص٣٢٤، وە (نيل الأوطار)، ج٦، ص١٦، للشوكاني.

لەو بارەشەوە چەند شوێنەوار (أثر)ێك لە (عمر بن الخطاب)ەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕراونەوە، بۆ وێنە:

(أسلمت امرأة من أهل الحيرةَ ولم يُسْلِمْ زوجُها: فكتَب فيها عمر بن الخطاب: أن خيِّروها، فأنْ شاءت فارَقَتْهُ وان شاءت قَرَّتْ عندهُ) رواه عبدالرزاق في المُصنّف برقم: ١٠٠٨٣، عن عبدالله بن يزيد الخطمّي).

واتە: ژنێکی خەڵکی حیرە مسوڵمان بوو، بەڵام مێردەکەی مسوڵمان نەبوو بوو، عومەری کوڕی خەتتاب لە بارەیەوە نووسی: کە سەرپشکی بکەن، ئەگەر ویستی با لێی جیاببێتەوە و، ئەگەر ویستیشی با لەلای بمێنێتەوە.

بەڵام پیاوێك کە خۆی مسوڵمان دەبێ و ژنەکەی یان ژنەکانی مسوڵمان نابن، پاش لێ ئومێد بوون، پێویستە تەڵاقی، یان تەڵاقیان بدات و لە ژێر نیکاحی خۆیدا نەیهێڵێتەوە یان نەیانهێڵێتەوە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾. واتە: وەدەست بە گرێبەستی هاوسەرگیریی ژنانی کافرە وە مەگرن.

(بخاري) لە (صحيح)ی خۆیدا بە ژمارە (٢٥٦٤) هێناویەتی کە کاتێك ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ .......﴾ هاتە خوار، کە گەیشتە ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾. عومەر (خوای لێی ڕازی بێ) ئەو ڕۆژە دوو ژنی خۆی تەڵاقدان کە لە سەردەمی شیرکدا هێنابوونی، کە دوایی یەکیان (معاوية بن أبي سفيان) و ئەوی دیکەشیان (صفوان بن أمية) مارەیان کردنەوە.

شایانی باسە فەرمایشتی خوا: ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ[1] ٱلۡكَوَافِرِ﴾. وە ڕستەی:

(١) العِصَم: جمع عِصْمَة، رِباطُ الزوجية يُحِلهُ الزوجُ متى شاء، المعجم الوسيط، ص٦٠٥

(فَطلَّق عُمَرُ يؤمئذ امرأتين كانتا لهُ حي الشرك) کە (بخاري) هێناویەتی، هەرکامێکیان بەڵگە یەلەسەر ئەوە کە بەهۆی مسوڵمانبوونی یەکێك لە ژن و مێردەوە، نیکاحەکەیان هەڵناوەشێتەوە، چونکە:

أ-خوا عزو جل کە فەرموویەتی: (وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ). کەواتە: گرێبەستەکان هەرماون، بەڵام پێویستە نەهێڵرێن.

ب-هەروەها تەڵاقدانی عومەروە، (خوای لێ ڕازی بێ) بۆ دوو ژنە کافرەکەی، ئەوە دەگەیەنێ کە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەی نێوانیان بە مسوڵمانبوونی عومەر لەسەر کوفر و شیرك مانەوەی ئەوان، هەڵناوەشێتەوە، ئەگەرنا حەوجێی تەڵاقدان نەبوو.

٦-کەواتە:

لە ئەنجامی مسوڵمانبوونی یەکێك لە ژن و مێرد دا، نیکاحەکەیان هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو ئەگەر پیاو مسوڵمان بووبێ و ژنەکەی مابێ، پێویستە - مادام ئومێدی مسوڵمان بوونی نەبێ- تەڵاقی بدات و دەستبەرداری ببێ.

وە ئەگەر ژنەکە مسوڵمان بووبێ و مێردەکەی مابێ، ژنەکە سەرپشکە لە نێوان چاوەڕوانکردنی مسوڵمان بوونی مێردەکەی داو، مانەوەی نیکاحەکەیان، یان پەنابردنی بۆ دادوەرو هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیرییەکەیان و شووکردنەوەی.

واتە: بە زاراوی زانایان لەم حاڵەتەدا نیکاحەکەیان لە گرێبەستێکی پێوست (عقد واجب)ەوە دەگۆڕێ بۆ گرێبەستێکی دروست (عقد جائز)، کە ڕێگا بە ژنەکە دەدات هەر کات ویستی هەڵیبوەشێنێتەوە.

بەڵام بێگومان مانەوەی گرێبەستی نیکاحی نێوان ژنی مسوڵمان و مێردی

کافر، مانای ئەوە نیە کە بۆ یەکدی حەلاڵن، چونکە خوا فەرموویەتی: (لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ) بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە هەر کات پیاوەکە مسوڵمان بوو، مادام ژنەکە نیکاحەکەی هەڵنەوەشاندبێتەوە، دەبنەوە بە ژن و مێردی ئاسایی، وەك هەر کام لە (زەینەبی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وە ژنەکانی (صفوان بن أمية) و (عكرمة بن أبي جهل)، کە پاش مسوڵمانبوونی مێردەکانیان، گەڕانەوە لایان، بە ژیانی هاوسەرێتیی ئاسایی جاران.

٧- شایانی باسیشە کە هەندێك شوێنەوار (آثار) هەن، ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە کە ژنی مسوڵمان بوو، بۆی هەبێ لە ماوەی چاوەڕوانیی کردنی مسوڵمانبوونی مێردەکەیدا، ژیانی ژن ومێردایەتی ئاسایی پێکەوە بگوزەرێنن، بە پێکەوە جووتبوونیشەوە، بۆ وێنە:

١-(عن عبدالله بن يزيد الخَطْميِّ قال:

أسلمتْ امرأة من أهل الحيرة ولَمْ يُسْلِمْ زَوْجُها، فَكَتَبَ فيها عمر بن الخطاب (رضي الله عنه): أن خَيِّرْها فإن شاءت فارقَتْهُ وإنْ شاءَتْ قرَّتْ عندهُ) أخرجَهُ عبدالرزاق في المُصَنَّف برقم: ١٠٠٨٣، ورقم: ١٢٦٦٠).

کە پێشتریش هێنامان و مانامان کرد، وەك بەڵگە لەسەر سەرپشك بوونی ژنێکی مسوڵمان بووی مێرد کافر، لە نێوان مانەوە و چاوەڕوانکردنی مسوڵمانبوونی مێردەکەی و، هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیرییەکەیدا.

هەڵبەتە دەشگونجێ ئەم شوێنەوارە بە بەڵگەی ئەوە بهێنرێتەوە کە ئەو جۆرە ژن و مێردە، بۆیان هەیە ژیانی ئاسایی خۆیان بگوزەرێنن، چونکە

ڕستەی: (وإن شاءَتْ قَرّتْ عنده) وە ئەگەر ویستی با لەلای بمێنێتـەوە، زیاتر لەلامانەوەی ئاسایی دەگەیەنێ.

٢-(عَنْ عـامر الشـعْبيٌ عـن علـي (رضـي الله عنـه) قـال: (إذا أسـلمت النّصرانية امرأة اليهودي أو النّصـراني، كـان أحـقّ بِبُضْـعها لأنّ لـه عَهْداً (وفي لفظ): هو أحق بِها ما لَمْ يُخْرِجْها من مِصْرِها) أخرجـه ابـن ابي شيبةَ في المصنف (٥/٩٠) وأخرجه عبدالرزاق برقم : ١٠٠٨٤ ورقـم: ١٢٦٦١.

واتە: هەر كـات ژنـە نەصـرانیی، هاوسـەری جوولەكـە یـان نەصـرانیی، مسولّمان بوو، مێردەكەی مافدارترە بە داوێنی[1] (یـان بـە گرێبەسـتی، یان بە جیماع لەگەڵ كردنی) چونكە خاوەن پەیمانـە، (وە لـە بێژەیەكـدا: مێردەكەی مافی زیاتری پێوەیە مادام لە شـارەكەی خـۆی (هـی ژنەكـە) نەیبردبێتە دەرێ).

دیارە ئەم دەقـەش بـە ڕاشـكاویی ئـەوە دەگەیـەنێ كـە ئـەو جـۆرە ژن و مێردە، بۆیان هەیە ژیانی هاوسەرێتیی ئاسایی خۆیان بگوزەرێنن.

٣- (عن الحسن أن نصرانية أسلمت تَحْتَ نصراني، فأرادوا أن ينزعوها منه، فرجعوا الى عمر (رضي الله عنه) فَخَيّرها) أخرجه ابن ابي شيبة برقم: ١٨٣٠٧).

واتە: ژنێكی نەصرانیی كە مێردەكەی نەصرانیی بوو مسولّمان بوو، ویستیان ژنەكەی لێ بستێنن، پرسیان بە عومەر كرد، ئەویش ژنەكەی سەرپشك كرد.

---

(١) إبن الأثير گوتوویەتی: (البُضْعُ لفظ مشترك يُطْلَقُ على عقدالنكاح والجماع معاً، وعلى الفَرْج) (النهاية في غريب الحديث والأثر)، ج١، ص١٣٣.

٤- (عن الزّهري: إنْ أسلمتْ ولم يُسْلِمْ زَوجُها، فهما على نكاحهما ما لَم يفرِّقْ بيْنَهُما سُلطانٌ) أخرجه إبن أبي شيبة في المُصنّف[(١)]. واتە: ئەگەر ژنەکە مسولمان بوو، وە مێردەکەی مسولمان نەبوو، ئەگەر دادوەر لە یەکیان جیا بکاتەوە، ئەگەرنا هەر لەسەر نیکاحی خۆیانن.

ئنجا پێویستە ئەوەش بزانرێ کە ئەوانەی ئەم ڕایەیان هەیە، لە بارەی ئایەتی ژمارە (١٠)ی (الممتحنة)ەوە، دەڵێن:

ئاشکرایە ئەم ئایەتە پاش صولحی حودەیبیە دابەزیوەو بەبۆنەی ئەو ڕێککەوتن (صلح)ەی کە لە نێوان پێغەمبەری خوا (ﷺ) و نوێنەری قورەیش (سهیل بن عمرو)دا مۆرکراوە، کە یەکێك لە بەندەکانی ئەوە بوو کە ئەگەر یەکێك لە کافرەکانی قورەیش مسولمان بوو، دەبێ مسولمانان بیگێڕنەوە لای کافران، بەڵام ئەگەر لە مسولمانان هەڵگەڕایەوە، ئەوان نایگێڕنەوە لای مسولمانان، وەك (البرا ءُ بن عازب) خوا لێ ڕازی بێ گێڕاویەتەوە:

(صالح النبيُّ (ﷺ) المُشركين يوم الحُدَيبية على ثلاثة أشياء: على أن منْ أتاه من المُشركين ردّهُ اليهم، ومن أتاهمْ من المُسلمين لم يردّوهُ، وعلى أن يَدْخُلَها من قابلٍ ويقيم بها ثلاثةَ أيام، ولايدخلَها إلاّ بجلُبّانِ السِّلاح: السيف والقوس ونحوه، فجاء أبو جندل يحْجِلُ في قيوده، فردّه اليهم)[(٢)].

واتە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی حودەیبیە لەسەر سێ شتان لەگەڵ هاوبەشدانەرەکاندا ڕێککەوت: کە هەر کەسێك لە موشریکەکان هاتە لای

---

(١) أحكام أهل الذمة، لإبن القيم، ج١، ص٣٢٤.

(٢) صحيح البخاري، ٢٧٠٠

بیگێڕێتەوە لایان، وە ئەوان هەر کەس لە مسوڵمانان هاتە لایان بۆیان نەگێڕنەوە، وە کە (ئەمساڵ بگەڕێنەوە و) ساڵی داهاتوو بێن (بۆ مزگەوتی حەرام و شاری مەککە) و سێ ڕۆژان تێیدا بمێننەوە، وە جگە لە چەکی دەستیان لەگەڵ خۆیان نەهێنن، شمشێر و تیر و کەوان و وێنەیان، ئیدی لەو کاتیشدا ئەبو جەندەڵ (کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمرو) هات بە کۆت و پێوەندەکەیەوە بازی دەدا، پێغەمبەریش بۆی گێڕانەوە.

دیارە پێغەمبەر (ﷺ) وەك عادەتی خۆی بەو ڕێککەوتننامەیەوە پابەند بووە، بەڵام کاتێك ژمارەیەك لە ئافرەتانی کافرەکان هاتن و مسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، وە کافرەکان داوایان کرد ئەوانیش تەسلیم بکەنەوە، خوای کاربەجێ هەردووك ئایەتی (١٠) و (١١) ی (الممتحنة) دابەزاندن و ڕایگەیاند، کە حوکمی ئافرەتانێك کە لە نێو کافرەکانەوە دێن و کۆچ دەکەن و مسوڵمان دەبن، جیاوازە لە هی پیاوانیان:

وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتوە:

**(....وجاءت المؤمنات مُهاجرات، فكانتْ أم كُلْثوم بنت عقبةَ بن أبي معيط ممّن خرج الى رسول الله (ﷺ) وهي عاتِقٌ فجاءَ أهلُها يسألون رسولَ الله أن يُرْجِعَها إليهمْ حتى أنزل الله تعالى في المؤمنات ما أنزل)** البخاري: ٤١٨٠-٤١٨١.

واتە: ئافرەتانی ئیماندار هاتن کۆچیان کرد، وە ئوممو کولثوم کچی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط لەگەڵ ئەو ئافرەتانە دابوو کە هاتبوونە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەو کاتە کچ بوو، ئیدی خزمەکانی هاتن داوایان لە پێغەمبەری خوا کرد کە بیگێڕێتەوە بۆ لایان، (هەر داوایان دەکرد) هەتا خوای بەرز ئەوەی دابەزاند لە بارەی ئافرەتانی ئیمانداروە، کە دایبەزاند،

واتـــە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ....... ﴾ (الممتحنة: ١٠)).

جا ئەوانە لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەڵێن:

کەواتـە: فـەرموودەی خـوا: (فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ) حوکمێکی گشتی نیە بۆ هەر ژن و مێردێك کە ژنەکە مسوڵمان بووبێ و مێردەکەی هەر کافر بێ، بەڵکو ئەوە حوکمێکی تایبەتە بەو ژنانـەوە کـە مێردەکانیان کـافری جـەنگیی (کـافر حَرْبـي)ن و سـەنگەریان لـە ئیسـلام و مسوڵمانان گرتوە، بەڵام ئەگەر پیاوێك دژی ئیسلام و مسوڵمانان نەجەنگێ و لەگەڵیاندا تەبا و ئاشتیخواز بێ، ئەوە حوکمەکەی جیایەو، ژنەکەی بـۆی هەیە کە ژیانی ئاسایی ژن و مێردایەتیی لەگەڵ بگوزەرێنێ.

دیارە ئەوان وێڕای چەند شوێنەوارێك کە هەندێکیانمان بە نموونـە هێنایـەوە، سیاقی ئایەتەکانی سورەتی (الممتحنة)ش لە سەرەتای تا کۆتایی، بە بەڵگـە دێنینەوە و دەڵێن: وەك چۆن خـوا ڕێـی لـە چـاکەکاریی و هاوکـاریی کـردن لەگەڵ کافرانی شـەڕ و تـەبادا نـەگرتوە: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ (الممتحنە: ٨) بە هەمـان شـێوەش ڕێـی لـە ژن و مێردایـەتیی ژنی مسوڵمان و مێردی لەسەر کوفر ماوە وە، نەگرتوە!

شایانی باسیشە کە (د. عبدالله بن یوسف الجدیع) خـاوەنی کتـێبی (إسـلام احد الزوجین) کە لە: (المجلة العلمیة للمجلس الأوروبي للإفتـاء والبحـوث،

العدد الثاني)دا بە ناوونیشانی: (إسلام المرأة وبقاء زوجها على دينه)دا چاپی کردوە، یەکێکە لە لایەنگرانی ئەو ڕایە و باس و لێکۆڵینەوەیەکی خەست و خۆڵی لەو بارەوە کردوە و (د. یوسف القرضاوي)یش تا ڕادەیەك پشتگیریی ئەو ڕایەی کردوە[١].

بەڵام من هەر ئەو ڕایەم پێ ڕاستتر و پەسەند ترە، کە باسم کرد و، هەرکام لە (ابن تیمیة) و (ابن القیم)یش هەڵیان بژاردوە[٢].

بەڵام بۆیە وا بەڕوونیی ئەو ڕایەی دیکەشم خستەڕوو، تاکو بزانرێ کە مەسەلەکە بواری قسەی تێدایە.

**خوێنەری بەڕێز!**

هەبوونی ناتەواویی لە هەر کام لە ژن و مێرد یان لە هەردووکیاندا، یەکی دیکەیە لە هۆکار و پاساوەکانی هەڵوەشانەوەی نیکاح و لەیەکترازانی ژن و مێرد.

جا ئێمە لە حەوت بڕگەدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین، ئەمە ناوونیشانەکانیانە:

یەکەم: پێناسەی ناتەواویی (عَيْب).

دووەم: ئایا هەبوونی عەیب پاساوی لەیەك جیابوونەوەی ژنو مێردە؟

سێیەم: کێ مافی داواکردنی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی هەیە بەهۆی عەیبەوە؟!.

چوارەم: ئەو عەیبانەی پاساوی جیابوونەوەی ژنو مێردن.

---

(١) بڕوانە: المجلة العلمية، العدد الثاني، ص٤٢١-٤٤٣، (اسلام المرأة دون زوجها، هل يفرق بينهما؟!) الشيخ الدكتور يوسف القرضاوي.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٤٢٦.

پێنجەم: ئایا دەگونجێ عەیبەکانی پاساوی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی دیاریی بکرێن؟
شەشەم: چۆنیەتی جیاکردنەوەی ژن و مێژد بەهۆی عەیبەکانەوە.
حەوتەم: شوێنەوارەکانی لەیەکترازانی ژن و مێرد بەهۆی ناتەواویی یەکانەوە.

## ٥-هەبوونی ناتەواویی (العَيْب):

### یەکەم-پێناسەی ناتەواویی (العَيْب):

وشەی (عَيْب) کە من لە زمانی کوردیدا (ناتەواویی)یم لە بەرانبەردا هێناوە، لە زمانی عەرەبیدا بە (العار والوصمة) مانا کراوە[1] و کۆیەکەی (أعياب وعيوب)ە، بەو کەم و کوڕیی و ناتەواویی و کەلێنانە دەگوترێ کە لە جەستەی مرۆڤدا پەیدا دەبن، وە لە قورئاندا هاتوە: ﴿أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا...﴾ (الكهف: ٧٩) واتە: بەڵام کەشتیەکە هی چەند نەدارێك بوو کە لە دەریادا کاریان دەکرد، ویستم کەم وکوڕیی تێدا پەیدا بکەم (عەیبداری بکەم).
وە (عیب) لەزاراوی شەرعزانان‌دا هەر ناتەواویی و نەخۆشییە کە، کە نەگونجێ ژیانی هاوسەرێتیی بە ڕێك و پێکیی لەگەڵ ببرێتە سەری.
(ابن قدامة) لە پێناسەی (عەیب)دا گوتوویەتی: (العُيوب التي يثبت فيها خيارُ الفسْخِ، وهي التي تَمْنَعُ الوطءَ كالجَبِّ والعُنَّةِ، أو توجِبُ نَظْرَةً تَمْنعُ قُربان أحدهما من الآخر، أو يُخافُ منها العَدْوى كالجُذام، أو يَخافُ منها

(١) المعجم الوسيط، ص١٠٨٣، لفظ: وَصَمَهُ.

الجناية، كالجنون)[١].

واتـە: ئـەو عەيبانـەی کـە مـافی سەرپشـك بـوون بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی هاوسەرگیریی دەستەبەر دەکەن، ئەوانەن کـە ڕێ لـە جوتبـوون دەگـرن، وەك چووك بڕان و، شلەپەتیی بوونی، یان دەبنە مایەی بێزاریی یـەك کـە ڕێ لـە یەکدی نیزیك کەوتنەوەیان دەگرێ، یان مەترسیی گرتنـەوەیان لـێ دەکـرێ، وەك گوليی (گەڕیی)، یان مەترسی کوشتنیان لێ دەکرێ، وەك شێتیی.

## دووەم: ئایا هەبوونی عەیب، پاساوی لەیەك جیابوونەوەی ژن ومێردە؟!

شەرعزانان لەو بارەوە دوو ڕان:

ڕایەکیان کە هی زاهیرییەکانە دەڵێ: نەخێر، بە هیچ عـەیبێك دروسـت نیـە نیکاح هەڵبوەشێتەوە، وەك لەو بارەوە گوتوویـەتی: (لايُفْسـخُ النكـاحُ بعـد صِحّته بجذامٍ حادث ولا ببَرصٍ كذلك ولا بجنون كذلك.....ولا بِشيء مِن هذه العيوب)[٢].

واتـە: نیکـاح پـاش دامـەزرانی بـە پەیـدابوونی گـولیی، وە پەیـدابوونی بەڵەکیی، وە پەیدابوونی شێتیی، هەڵناوەشێتەوە....هەروەها بـە هـیچ کـام لەو عەیبانە.

دیـارە ڕایەکـەی (إبـن حـزم) کـە (عمـر بـن عبـدالعزيز) و (الشـوكاني)یش هەڵیانبـژاردوە، بەڵگەیـەکی ئـەوتۆی لەسـەر نیـە، چـونکە فەرموودەکـەی (رفاعة القرظي) بە بەڵگـە هێناوەتـەوە، کـە دوایـی دەیهێـنن و پێشـتریش

(١) المغني، لإبن قدامة، ج، ص٦٥٠-٦٥١
(٢) المحلى، ج١٠، ص١٠٩.

هێناومانە و ناگونجێ لەو بارەوە بکرێتە بەڵگە.

ڕای دووەمیش کە هی زۆربەی زانایانە و حەنەفییەکان و مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و زەیدییەکان و جەعفەرییەکانیان لە نێو دان، دەڵێ: هەبوونی عەیب پاساوی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیرییەو، گەلێك بەڵگەش لەسەر ڕاستێتی ئەو ڕایە هێنراونەوە، بۆ نموونە:

١-خوا عزّ وجل فەرموویەتی:﴿ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ... ﴾ (البقرة:٢٢٩).

واتە: یان دەست پێوەگرتنێکی پەسند، یان دەست لێبەردانێکی بە چاکیی.

ئنجا بێگومان ئەوە دەست پێوە گرتنێکی پەسند و باش نیە کە کابرا نەتوانێ بچێتە لای ژنەکەی، یان بەهۆی گولییەوە، ژنەکەی لێی بێزار بێ....یان...یان....هتد.

دیارە خوای کاربەجێش تەنیا دوو حاڵەتی بۆ ژن ومێرد بە ڕەوا داناون و ئەگەر یەکەمیان نەگونجا، کە دەست پێوە گرتنی پەسەندە، پێویستە دووەمیان بێ، کە دەست لێبەردانی چاك و جوامێرانەیە.

٢-هاوەڵان لەسەر ئەوە یەك دەنگ بوونە کە پیاوی جیماع پێنەکەر لەگەڵ ژنەکەی لەیەك دەترازێنرێن، (الشافعي) گوتوویەتی: **(وعن عمر (رضي الله عنه) أنّهُ أجّلَ العنّينَ سنةً، ولا أحفظ عمن لقيته خلافاً في ذلك فإن جامَعَ والاّ فُرّق بينَهُما)**[1].

---

(١) الأم، ج١، ص١٧٨.

واتە: وە لە عومەرەوە خوا لێی رازی بێ گێڕراوەتەوە کە بابای چووك شلەپەتەی ساڵێك مۆڵەت دراوە، وە هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووم، نەمزانیوە لەو بارەوە ڕایان جیاواز بوویێ، جا ئەگەر (دوای ساڵەکە) جیماعی پێکرا، ئەگەرنا لەیەك جیا دەکرێنەوە.

هەروەها لەهەر کام لە (علي)و (إبن مسعود)یش هەمان بڕیاری کە لە عومەرەوە خوا لەهەموویان ڕازی بێ گێڕراوەتەوە، لەوانیش گێڕراوەتەوەو، دیارە بڕیارەکەشیان بە ئامادەیی هاوەڵان بووە، بۆیە دەگونجێ بڵێین: هاوەڵان لەسەری ڕێککەوتوون[1].

٣- بێگومان ئەو نەخۆشیی و ناتەواوییانەی، کە ڕێگر دەبن لە ڕێی ژن و مێردایەتییەکی ڕاست و ڕێکدا، دەبنە مایەی فەوتانی ئامانجەکانی هاوسەرگیریی کە داوێن پاکیی و وەچە خستنەوە (الإعفاف و إيجاد النّسل) دوو ئامانجی سەرەکییانن، دیارە هەر کارێکیش ئامانجەکانی پێ نەهاتنەدی، پاساوی مانەوە و بەردەوامبوونی نەماوە.

## سێیەم: کێ مافی داواکردنی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی هەیە، بەهۆی عەیبەوە؟!

لەو بارەوەشەوە زانایان بە گشتی دوو ڕان:

هەندێکیان کە حەنەفییەکان و (النّخعي) و (الثوري)ین دەڵێن: تەنیا ژن ئەو مافەی هەیە، چونکە پیاو لە ڕێی تەڵاقەوە دەستی کراوەیە و پەکی لەسەر فەسخ نەکەوتوە.

---

(١) بدائع الصنائع، للكاساني، ج٢، ص٣٢٢.

بەڵام زۆربەیان کە وێڕای (عمر بن الخطاب) و (ابن عباس) (خوا لێیان ڕازی بێ)، ڕای مالیکییەکان وشافیعییەکان و حەنبەلییەکان و زەیدییەکان و جەعفەرییەکانیشە[1]، دەڵێن:

مافی هەر کام لە ژن و مێردە کە بەهۆی عەیبەوە داوای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی نێوانیان بکەن.

بە پێویستیشی نازانم بەڵگەکانی زۆربەی زانایان لەو بارەوە بهێنینەوە، چونکە ئەو بەڵگانەی لە بڕگەی دووەمدا هێناماننەوە، ئاماجی ئەم بڕگەیەش دەپێکن، و مادام ژن و مێردیش دوو لایەن (طرفي)ی هاوسەرگیریین، دەبێ لە مافەکانیاندا یەکسان بن و، پێشتریش باسمان کرد کە ژن مافی لەخۆ دارنین (خُلع)ی هەیە، لە بەرانبەر تەڵاقدان (طلاق)ی مێرددا.

## چوارەم-ئەو عەیبانەی پاساوی جیابوونەوەی ژن و مێردن:

ئەو عەیب و نەخۆشییانەی کە پاساوی لە یەکترازن و جیابوونەوەی ژن و مێردن و گرێبەستی هاوسەرگیرییان پێ هەڵدەوەشێتەوە، بەگشتی سێ جۆرن:

١-عەیبە هاوبەشەکانی ژن و مێرد.

٢-عەیبەکانی مێرد.

٣-عەیبەکانی ژن.

### ١-عەیبە هاوبەشەکانی ژن و مێرد:

شەرعزانان ڕاجیایی زۆریان هەیە لە بارەی چۆنیەتی و چەندێتی ئەو ناتەواویی و نەخۆشییانەوە، کە بە عەیبی هاوبەشی نێوان ژن و مێرد

---

(١) (المفصل..)، ج٩، ص١٨-٢٠

دادەنرێن و، بۆ هەر کامێکیان ڕەوایە بەهۆیانەوە داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاح و لەیەکترازان بکات.

ڕاجیاییەکەشیان لەچەند ڕوویەکەوە:

أ- لە ڕووی ژمارە و چەندێتیی ئەو ناتەواویی و نەخۆشییانە (العیوب والعلل)ەوە، کە دروستە نیکاحیان پێ بەتاڵ بکرێتەوە.

بۆ وێنە: حەنبەلییەکان هەتا دە (١٠) دانەیان لەو عەیبانە ژماردوون، وەك:

شێتیی، بەڵەکیی، گولیی، بۆنی ناخۆشی زار، میزوییسایی پێ ڕانەوەستان، مایەسیریی، کەچەڵیی، ئەگەر بۆنی ناخۆشی هەبێ، نێرەمووکیی[(١)].

بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەو چوارە ڕێککەوتوون: شێتیی، گولیی، بەڵەکیی، نێرەمووکیی نادیار (خُنثى مُشْكِل)[(٢)].

ب-لە ڕووی چۆنیەتیی و ئەندازەی ئەو ناتەواویی و نەخۆشییانەوە، بۆ نموونە: لە بارەی بەڵەکیی (بَرَص)ەوە دەڵێن: ئەگەر تەواو پەرەی گرتبێ، جیایە لەوە کە کەمێك بێ، هەروەها لەبارەی شێتییەوە دەڵێن: ئەگەر پچڕ پچڕ (متقطع) بێ، جیایە لەوە کە بەیەکجاریی (مُطْبِق) بێ.

جـ- لە ڕووی کاتی پەیدابوونیانەوە، دەڵێن: ئەگەر پێش مارەکردن پەیدا بووبن، حوکمیان جیایە لەوەی دوایی پەیدا بووبن، بەڵکو هەندێکیان

---

(١) شرح منتهى الإرادات، ج٢، ص٢٩٦-٢٩٧

(٢) (المفصل....)، ج٩، ص٢٩-٣٣، و: (مدى حرية الزوجين في التفريق قضاءً)، ص٢٥٣-٢٦٢.

جیاوازیی دەخەنە نێوان کاتی پێش گواستنەوە (قبل الدخول) و پاش گواستنەوە (بعد الدخول) شەوە.

د- منیش هەرچەندە لەو سەرچاوانەدا کە تەماشام کردن بەرچاوم نەکەوت، بەڵام دەڵێم: پێویستە جیاوازیی بخرێتە نێوان دوو حاڵەتی دیکەشەوە، لە ڕوویێکی دیکەشەوە حوکمی ئەو عەیبانە جیاواز بێ، ئەویش ئەوەیە کە عەیب و نەخۆشییەك کە هەرکام لە ژن و مێرد هەیانە جیایە لە عەیب و نەخۆشییەك کە تایبەتە بە یەکێکیانەوە و، مادام هەردووکیان لە عەیبێکدا بەشداربن، یان هەریەکەی عەیبێکی تایبەتییان هەبێ کە بارتەقای یەك بن، نابێ داوای لەیەك جیابوونەوە بکەن.

## ٢-عەیبە تایبەتەکانی پیاوان:

زانایان زۆربەیان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە سێ عەیب و ناتەواویی هەن، هەرکامێکیان پاساو و بەڵگەی داواکردنی ژنە بۆ جیابوونەوە لە مێردەکەی کە بریتین لە:

یەك: بڕانی چووك (قطع الـذكر) هەمووی، یان بەشێکی بەشێوەیەك کە پەکی جیماع کردن بخات.

دوو: شلەپەتەیی (العِنّة) کە مەبەست پێی ئەوەیە پیاوەکە ئەندامی نێرینەی نەرم و شل بێت و جیماعی پێ نەکرێ.

سێ: خەسێنران (الخِصاء) کە بریتیە لەوەی پیاو هێلکە گونەکانی دەرهێنرابن، یان تەقێنرابن و نەمابن[١].

(١) (المفصل....)، ج٩، ص٢٣-٢٧

دیاره دواتر لە برگەی پێنجەمدا ڕای خۆم بە گشتی لەبارەی عەیبەکانی ژن و پیاوەوە دەخەمە ڕوو، چ هاوبەش بن، چ تایبەت بن بە هەر کامێکیانەوە.

## ٣-عەیبە تایبەتەکانی ژنان:

لەبارەی ئەو عەیبە تایبەتانەی ژنە وە، کە پیاو بۆی هەیە بە هۆیانەوە داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بکات، زانایان ڕاجیایی یان هەیە، بەڵام هەموویان، یان زۆربەیان لەسەر دووانیان ڕێککەوتوون، کە بریتین لە:

یەك: زێ گیران بە گۆشت (**الرَّتْق**) کە بەو جۆرە ژنە دەگوترێ (**رَتْقاء**)، ئەویش ئەوەیە کە پیاو ناتوانێ لەگەڵی جووت ببێ، لەبەر گیرانی ئەندامی زاووزێی بە گۆشت.

دوو: زێ گیران بە ئێسك (**القَرْن**) کە بەو جۆرە ژنەش دەگوترێ (**قَرْناء**)، کە ئەویش ئەوەیە بەهۆی گیرانی ئەندامی مێینەوە، ناگونجێ جیماعی لەگەڵ بکرێ.

هەڵبەتە هەندێك ناتەواویی و نەخۆشیی دیکەش هەن، کە بەشێکیان بە پاساوی هەڵوەشێنراوەی نیکاحیان دادەنێن، وەك:

أ-تێکەڵبوونەوەی: کۆم و زێ، یان ڕێی میزو ڕێی جیماع، کە (**إفضاء**)ی پێ دەگوترێ.

ب-بۆنی ناخۆشی زێ (**نَتَن الفَرْج**) کە (**بَخْر**)ی پێ دەگوترێ.

جـ-خوێنی بەردەوام (**الإستحاضة**)، کە بریتیە لەوەی ژن بەردەوام خوێنی پێدابێ[1].

---

(١) (المفصل.....)، ج٩، ٢٧-٢٩، وە (مدى سلطان الزوجين.....)، ص٣٠٦-٣٢٨.

بەڵام ئەوەی زۆربەیان لەسەری رێککەوتوون، ئەو دووانەن کە باسمان کردن.

## پێنجەم: ئایا دەگونجێ عەیبەکانی پاساوی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی، دیاریی بکرێن؟!

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: نەء، ناگونجێ ئەو عـەیب و نەخۆشـییانەی دەبنـە پاسـاوی داواکردنـی هەڵوەشـاندنەوەی نیکـاح، چ لەلایـەن ژنـەوە، چ لەلایەن پیاوەوە دیاریی بکرێن.

چونکە:

أ-بێگومان عەیب و نەخۆشییەکان لە خودی خۆیاندا وەك ئەندازە و رێژە و چۆنیەتییان جیاوازن.

ب-پاشان بەردەوام نەخۆشیی و ناتەواویی و جەستەیی یەکان لە زیادبوون دان.

جـ-هەروەها عورف و باوی کۆمەڵگاکانیش کاریگەریی لەسەر حوکمی ئەو ناتەواویی و نەخۆشییانە هەیە.

بە پێویستیشی دەزانم کۆتایی ئەم باسە بە چەند قسەیەکی بەهێز و بە پێزی (ابن قيم الجوزية) بێنم کە لەو بارەوە کردوونی:

**(وذهب بعض أصحاب الشافعي إلى ردِّ المرأة بكلِّ عيْبٍ تُـرَدُّ بـه الجاريـة في البيع....وهذا القول هو القياس، أما الإقتصار على عَيْبَين أو سـتة أو سبعةٍ أو ثمانية دون ما هو أولى منها أو مساوٍ لها، فلاَ وَجْهَ لَـهُ، فـالعُمْيُ والخَرْسُ والطـرش وكونهـا مقطوعـة اليَـدين أو الـرجلين أو احـداهما، أو كون الرجل كذلك من أعظم المُنَفِّرات والسكوتُ عنهُ مـن أقـبح التـدْليس والغَـشِّ وهـو منـافٍ للـدين، والإطـلاق إنمـا ينصـرف الى السَّـلامةِ فهـو**

كالمشروط عُرْفاً، وقد قال أمير المؤمنين عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) لمن تزوج امرأةً وهو لايُولَدُ لَهُ، أخْبِرها انك عقيمٌ وخَيِّرْها.

والقياسُ أن كلّ عَيْبٍ يُنفِّرُ الزوج الآخر منه ولايحصلُ به مقصودُ النكاح من الرحمة والمَوَدَّة، يوجبُ الخيارَ...ومَنْ تدبّر مقاصد الشّرع في مصادره وموارده وعدله وحكمته وما اشتمل عليه من المصالح، ولم يَخْفَ عليه رجحان هذا القَول وقُرْبُهُ من قواعد الشريعة)[1].

واتە: وە هەندێك لە هاوەڵانی شافیعیی ڕایان وایە هەر عەیبێك كە كەنیزەكی پێ ڕەت بكرێتەوە لە فرۆشتندا، هاوسەریشی پێ ڕەت دەكرێتەوە....وە بە گوێرەی قیاسیش ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام كورت هەڵێنان لەسەر دوو عەیب، یان شەش، یان حەوت، یان هەشت، وە حیساب نەكردنی عەیبی دیكە، كە لەوان لە پێشترە، یان وەك ئەوانە، هیچ ڕوویەكی نیە.

بۆ وێنە: كوێریی و لاڵیی و كەڕیی، یان ژنەكە یان مێردەكە هەردووك قۆڵی یان هەردووك لاقی یان یەكێكیان بڕابێ، لە گەورەترین سلەمێنەرەوەكانە و، لێ بێدەنگ بوونیشی نا قۆڵاترین شاردنەوە و فێڵە و پێچەوانەی دیندارییشە.

وە لە كاتێك دا بە ڕەهایی باسی ژن و پیاو دەكرێ، مەبەست پێی ژن و پیاوی سەلامەتن، بەڵكو ئەوە بەپێی باو وەك بە مەرج گیرابێ وایە، وە فەرماندەی بڕواداران عومەری كوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ) بە كەسێك كە منداڵی نابێ و ژنێكی مارە كردوە پێی گوتوە، هەواڵی پێ بدە كە نەزۆكیی، وە سەرپشكی بكە (داخۆ ڕازییە یان نا؟).

(١) زاد المعاد في هدي خير العباد، ج٤، ص٣٠-٣١.

وە بەگوێرەی قیاس هەر ناتەواوییەك كە هاوسەرەكەی دیكە بێزار بكات، وە ببێتە مایەی نەهاتنە دی ئامانجی نیكاح، لەبەزەیی و خۆشەویستی، سەرپشك بوونی ژن ومێرد (بۆ هێشتنەوەیان هەڵوەشاندنەوەی نیكاح) پێویست دەكات.

هەر كەسێكیش لە ئامانجە شەرعییەكان وردبێتەوە لە سەرچاوە و جۆگەكانیدا، وە لە دادگەریی و حیكمەتی وردبێتەوە، وە ئەو بەرژەوەندییانەی كە گرتوونیە خۆی، پەسندترین بوونی ئەم رایە و نیزیكتربوونی لە بنچینەكانی شەریعەتیەوەی لێ شێرراوە و پەنهان نابێ.

## شەشەم: چۆنیەتی جیاكردنەوەی ژن و مێرد بە هۆی عەیبەكانەوە:

زانایان لەو بارەوە كە ئایا هەڵوەشاندنەوەی نیكاح بەهۆی عەیبەكانەوە پێویستی بە بەرزكردنەوەی داوا بۆ لای دادوەر (**رفع الدعوى الى القاضي**) هەیە، كە تاكو بڕیاری لەسەر بدات، یان بابای سەرپشككراو (مختار) بۆ هەڵوەشاندنەوە، بۆ خۆی بۆی هەیە؟! بەگشتی سێ ڕایان هەیە:

یەك: زۆربەی هەرەزۆری زانایان كە حەنەفییەكانو مالیكییەكان و شافیعییەكان و حەنبەلییەكانیان لە نێودان، ڕایان وایە كە ئەو كارە بەبێ بەرزكردنەوەی داوا بۆ لای دادوەر پاشان بڕیاری دادوەر دروست نیە[١].

دوو: جەعفەرییەكانیش ڕایان وایە كە هەڵوەشاندنەوەی نیكاح بەهۆی

(١) (المفصل...)، ج٩، ص٥٦.

عەیبەکانەوە، یەکی لەسەر بڕیاری دادوەر و داوا بۆ لا بەرزکردنەوەی نەکەوتوە[١].

سێ: زەیدییەکانیش دەڵێن: ئەگەر ژن و مێرد لەو بارەوە پێکهاتن باشە، ئەگەرنا پێویستی بە بڕیاری دادوەر هەیە[٢].

هەڵبەتە ڕای زۆربەش ڕاستتر و بەڵگەدارترە، بەڵام بەم ڕوونکردنەوەیەوە: ئەگەر داواکاری هەڵوەشاندنەوە ژن بێ، ئەوە بەبێ بەرزکردنەوەی داواکاری بۆ لای دادوەر و پاشان بڕیاری دادوەر نابێ، چونکە ژن لە بنەڕەتدا مافی بڕیاردانی ترازاندن (تفریق)ی نیە، پاشان مەسەلەی ناتەواوییەکان (العیوب) مشت و مڕی زۆری تیدایەو، بڕیاری دادوەریش ڕاجیاییەکان هەڵدەبڕێ.

بەڵام ئەگەر مێرد داواکاری هەڵوەشاندنەوە بێ، ئەگەر بە شێوەی تەڵاقدان بێ، ئەوە پێویستی بەبڕیاری دادوەر نیە، بەڵام ئەگەر داوای هەڵوەشاندنەوە (فسخ) بکات، ئەوە دیسان بەبێ بڕیاری دادوەر نابێ، چونکە مەسەلەی هەبوون و نەبوونی عەیب و نەخۆشیی و شێوە و ئەندازەی و ...هتد، جێگای مشت و مڕە و، یەکلایکردنەوەی یەکی لەسەر بڕیاری دادوەر کەوتوە[٣].

شایانی باسیشە کە زانایان وردەکاریی زۆریان لەبارەی چۆنیەتی هەڵسانی دادوەر بە لەیەکترازاندن (تفریق)ی ژن و مێردەوە، بەهۆی هەبوونی عەیبەکانەوە، باسکردوە، وەك:

أ-مۆڵەتدان و دواخستنی پیاوی چووك شلەپەتە (عِنِّین) و خەسێنراو

---

(١) (الروضة البهیة في فقه الجعفریة)، ج٢، ص١٢٦.

(٢) (شرح الازهار)، ج٢، ص٢٩٤.

(٣) (المفصل...)، ج٩، ص٥٨.

(خَصيٌّ) و بەستراو (المُؤَخَّذ) و شێت (مجنون) ...ئەگەر هیوای چاکبوونەوەیان هەبوو.

ب-رێپێدان یان رێپێنەدان بە مێرد، کە ژنە زێ گیراو (رَتْقاء و قرْناء)ەکەی ناچار، بکات خۆی چارەسەر بکات.

ج-کێشە و مشت و مڕی نێوان ژن و مێرد، لەسەر رووداو و روونەدانی جووتبوون لە نێوانیاندا.

من بە پێویستی نازانم بچمە نێو ئەو وردەکارییانەوە، بەڵام بە پێویستی دەزانم ئاماژەیەك بە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەم، کە بە بۆچوونی هەندێك کەس، وەك پێشتر ئاماژەم بە قسەکەی (إبن حزم) کرد، ئەو فەرمایشتە بەڵگەیە لەسەر رەوا نەبوونی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بەهۆی ناتەواوییەوە:

(عن عائشة (رضي الله عنها) انّ أمرأة رِفاعة القُرَظيّ جاءتْ الى رسول الله (ﷺ) فقالت: **إن رفاعة طَلّقني فَبَتَّ طلاقي وإني نَكَحْتُ بعدهُ عبدالرحمن بن زبير القُرظيّ وانَّ ما معَهُ مثل الهُدْبة، قال رسُول الله (ﷺ): لَعَلّك تُريدين أن ترجعي الى رفاعة؟ لا، حتى يَذوقَ عُسَيْلَتَكِ وتَذوقي عُسَيْلَتَهُ**) رواه البخاري: ٥٢٦٠.

واتە: ژنی ریفاعەتو لقورەزیی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ریفاعە یەکجاریی تەڵاقی دام و دوای وی شووم بە عەبدولڕەحمانی کوڕی زوبەیری قورەزیی کردۆتەوە، ئەویش ئەوەی پێیەتی (واتە ئەندامی نێرینەی) وك پارچە پەڕۆیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: رەنگە بتەوێ بگەڕێیەوە لای ریفاعە؟ نەء، هەتا هەنگوینۆکەت نەچێژێ و هەنگوینۆکەی نەچێژی، (نابێ).

وەك لــە ڕواڵــەتی ئــەم فەرمایشتەشــەوە دیــارە (عبــدالرحن بــن الــزبیر) حاڵەتەکـەی وانـەبووە کـە ژنەکـەی مـافی هەڵوەشـاندنەوەی نیکاحەکـەیانی هەبێ، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا مافی پێ دەدا، بەڵکو وا دیارە ژنەکـەی بـە زێدەڕۆیی (مبالغة)یەوە باسی حاڵەتە جینسـییەکەی کردبـێ، کـە ئەنـدامی نێرینەی بە قولینچکە پەڕۆ چواندوە!

بەڵگەشمان ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە ژنەکـەی فـەرمووە: نـەء،، هـەتا لێـی دەچـێژی و لێـت دەچـێژێ، ئنجـا ژنەکـەش نـەیگوتوە: ئـەو چـێژتنە نایەتەدی، کـە بێگومـان ئەگـەر حاڵەتەکـەی وابوایـە کـە توانـای جیمـاعی نەبوایە، ژنەکە دەیگوت.

کەواتە:

ئەو فەرموودەیە ناگونجێ بکرێتە بەڵگەی ڕەوانەبوونی جیابوونەوەی ژن و مێرد، بەهۆی عەیب و ناتەواوییەوە، بە تایبەت لە ڕووی جینسییەوە.

## حەوتەم: شوێنەوارەکانی لەیەکترازانی ژن و مێرد بەهۆی ناتەواوییەکانەوە:

### یەك: جۆری لەیەکترازانی ژن و مێرد بەهۆی ناتەواویی و نەخۆشییەوە:

زانایان لەو بارەوە بەگشتی دوو ڕایان هەن:

أ-زۆربــــەیان کــــە شـــافیعییەکان و حەنبەلییــــەکان و زەیدییــــەکانیان و جەعفەرییــەکان لــە نێــودان، دەڵــێن: ئــەو جــۆرە جیابوونەوەیــە بــە هەڵوەشاندنەوە (فسخ) دادەنرێ[1].

---

(١) (المفصل..)ج٩، ص٧٨.

ب-هەندێکیشیان کە حەنەفییەکان و مالیکییەکانیان لەنێودان، دەڵێن: ئەو جیابوونەوەیە بە تەڵاقدان دادەنرێ[(١)].

هەڵبەتە ڕای زۆربەش ڕاستتر دێتە بەرچاو، چونکە مادام ئەو جیابوونەوەیە بە بڕیاری دادوەر دەبێ و، ئەگەر گریمان مێرد ڕازیش نەبێ، دادوەر هەر بۆی هەیە ئەنجامی بدات، پەکی لەسەر تەڵاقدانی پیاو نەکەوتوە.

**دوو: مەسەلەی مارەیی و چارەنووسی:**

زانایان لەبارەی مارەیی ئەو ژنەوە، کە بەهۆی عەیبی خۆی یان مێردەکەیەوە، جیا دەبێتەوە ڕاجیایی زۆریان هەیە، کە من هەوڵدەدەم لە چەند وردە بڕگەیەکدا کورت و پوختی بکەمەوە:

**أ-حەنەفییەکان:**

دەڵێن: ئەگەر مێرد ئەندام شلەپەتە (عِنّين) بوو، وە خەڵوەتیشی لەگەڵ ژنەکەیدا کردبوو، دەبێ مارەیی تەواوی بداتێ، بەڵام ئەگەر خەڵوەتی لەگەڵ نەکردبێ، نیوەی مارەیی ناوهێنراو (نصف المهر المُسمّى)ی دەکەوێ، وە ئەگەر خەڵوەتی لەگەڵ نەکردبێ و مارەیی ناوهێنراویشی نەبێ، پێویستە دیاریی (مُتعة) ی بداتێ[(٢)].

**ب-مالیکییەکان:**

ئەمانیش دەڵێن: ئەگەر پێش گواستنەوە (قبل البناء بها) بێ، عەیبەکە لەهەر کامێکیانەوە بێ، ئەوە ژنەکە مارەیی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر پاش گواستنەوە بێ، مادام پیاوەکە جیماعکردنی لێ چاوەڕوان بکرێ، ئەوە مارەیی ناو هێنراوی دەکەوێ، ئەگەرنا نایکەوێ.

---

(١)هەمان سەرچاوە، ص٧٧

(٢)بدائع الصنائع، للكاساني، ج٢، ص٣٢٦.

وە ئەگەر مێردەکەی پاش گواستنەوەی (ژنەکەی) عەیبەکەی بۆ دەرکەوت، بۆی هەیە مارەییەکەی بەسەرپەرشتیارەکەی ببژێرێ، چونکە ئەو بەهۆی تێکەڵییەوە شارەزای بووەو عەیبەکەی زانیوە، بۆیە دەبێ خۆیشی باجی فێڵکردنەکەی بدات(١).

**ج-شافیعییەکان:**

ئەمانیش دەڵێن: هەڵوەشاندنەوە (فسخ) چ لە مێردەوە بێ، چ لە ژنەوە، وە بەهۆی عەیبی هەر کامێکیانەوە بێ، مادام پێش گواستنەوە بێ، ژنەکەی نە مارەیی دەکەوێ و نە دیاریی (متعة)، چونکە ئەگەر عەیب لە پیاوەکەدا بێ، دیارە ژنەکە هەڵوەشێنەرەوە (فاسخة)یە و هیچی ناکەوێ، وە ئەگەر عەیبیش لە ژنەکەدا بێ، مانای وایە بەهۆی خۆیەوە فەسخەکە بووەو، وەك خۆی کردبێتی وایە.

بەڵام ئەگەر پاش گواستنەوە هەڵوەشاندنەوەکە بکرێ، ئەوە هەرچەندە ئەمیش چەند حاڵەتێکی جۆرا و جۆری هەن، بەڵام ئەگەر پاش جووتبوون بوو، مارەیی نابراو دەدرێتە ژنەکە، مادام عەیبەکە پاش جووت بوون پەیدا بووبێ، بەڵام ئەگەر پێش جووتبوون پەیدا بووبێ، مارەیی هاووێنە (مهر المثل)ی دەکەوێ(٢).

**د-حەنبەلییەکان:**

ئەمانیش ڕایان لە هی شافیعییەکانەوە نزیکە و دەڵێن: ئەگەر هەڵوەشاندنەوە کە پێش گواستنەوە (قبل الدخول) بێ، لە هەر کامێکیانەوە بێ، ژنەکە نەمارەیی دەکەوێ نەك دیاریی.

---

(١)الشرح الکبیر، للدردیر، ج٢، ص٢٨٥-٢٨٦

(٢)نهایة المحتاج، ج٦، ص٣٠٦-٣٠٧ وە مغني المحتاج، ج٣، ص٢٤٠-٢٥٠.

بەڵام ئەگەر پاش گواستنەوە یان پاش خەڵوە لەگەڵ کردن بێ، ئەوە مارەیی ناوبراوی دەکەوێ.

وە مێرد بۆی هەیە زیانی مارەیی بەو کەسە ببژێرێ کە فریوی داوە و عەیبی ژنەکەی لێ شاردۆتەوە.

**هـ- جەعفەرییەکان و زەیدییەکان:**

ئەمانیش ڕایان لە هی شافیعییەکان و حەنبەلییەکانەوە نزیکە، لەگەڵ هەندێك جیاوازیی وردەکارییانەدا[1].

## ٦-سەرپشك بوون بۆ هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی لە کاتی باڵغ بووندا (خيار البلوغ):

ئەمیش یەکی دیکەیە لە هۆکارە هاوبەشەکانی نێوان پیاو و ژن بۆ هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی و، بەپێی ڕیزبەندیی ڕەچاوکراوی ئێمە لەم کتێبەدا، هۆکاری شەشەم و کۆتاییە لە هۆکارە هاوبەشەکان.

وەلە سێ بڕگەدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین:

یەکەم: پێناسە.

دووەم: هەڵوێستی مەزهەبەکان

سێیەم: هەڵوێستی بەندە

### یەکەم-پێناسە:

مەبەست لەم مەسەلەیە ئەوەیە کە ئایا کاتێك سەرپەرشتیاری شەرعیی

---

(١)الروضة البهية في فقه الجعفرية، ج٢، ص١٢٧، وه شرائع الإسلام، ج٢، ٣٢١. وه شرح الأزهار، ج٢، ص٢٩٨-٢٩٩.

(الولي الشّرعي) كوڕ و كچی گچكە، یان كـوڕ و كچـی شـێت، گرێبەسـتی هاوسـەرگیریی (عقـد الـزواج)ی بـۆ ئەنجامـدان، ئایـا ئـەو نیكاحـە وەك گرێبەسـتێكی پێویسـت (عقـد لازم) دادەمـەزرێ، بـە جۆرێـك كـە ئەگـەر گچكەكان بالّغ بوون و، شێتەكان چاكبوونەوە، بۆیان نەبێ هەڵیبوەشێننەوە، یان مافی سەرپشك بوون (حق الخیـار) یـان هەیـەو، بۆیـان هەیـە ئەگـەر بـە دڵیان نەبوو، هەڵیبوەشێننەوە لە ڕێی بەرزكردنـەوەی داواكارییـەوە بـۆ لای دادوەر؟!

## دووەم- هەڵوێستی مەزهەبەكان:

هەركام لە مالیكییەكان و شافیعییەكان و حەنبەلییەكان و حەعفەرییەكان، ڕایان وایە كە هەر كات باب (الاب) هاوسەرگیریی بۆ كوڕ و كچـی گچـكە، یان شـێت، ئەنجامـدا، پـاش بـالّغ بـوون و چـاكبوونەوەیان، مـافی سەرپشـك بوونیان نیە و بۆیان نیە ئەو گرێبەسـتە - پێیـان خـۆش بـێ یـان نـاخۆش- هەڵبوەشـێننەوە، هـەروەها هەنـدێكیان -كـە شـافیعییەكان و جەفعەرییەكانن-دەڵێن: باپیر (جدّ)یش هەمان مافی بابی هەیە[1].

بەڵام حەنەفییەكان دەڵێن: ئەو مەسەلەیە سێ حاڵەتی تێدان و هـەر حاڵەتـە حوكمی تایبەتی خۆی هەیە:

**حاڵەتی یەكەم:** ئەگەر باب و باپیر نیكاحیان بۆ كـوڕ و كچـی گچـكە، یـان شـێت، ئـەنجام دا و ئـەو بـاب (الّب) و بـاپیر (الجـدّ)ە، بـەوەش نەناسرابوون كە لارێ و بێ بەندوبار (فاسق و ماجن) بـن، ئـەوە ئـەو نیكاحە هەر چۆنێكی بێ، ئەگەر لەگەڵ هاوكووف(كُفء)ی خۆشیاندا

---

(١) (المفصل....)، ج٨، ص٥٠٨.

نەبێ، پاش باڵغ بوون مافی سەرپشك بوونیان نیە.

**حاڵەتی دووەم:** بەڵام ئەگەر ئەو باب و باپیرە بەچاك ناسراو نەبوون، ئەوە مەگەر لەگەڵ هاوكووفی خۆیان دا و بە مارەیی هاوونێنە (مهرُ المثل) بێ، ئەگەرنا دروست نیەو، بۆیان هەیە پاش باڵغ بوون، یان چاكبوونەوە، هەڵیبوەشێننەوە لە ڕێی دادوەرەوە.

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر جگە لە باب و باپیر ئەو نیكاحەیان كردبوو، وە لەگەڵ ناهاوكووف دا و بە كەمتر لە مارەیی هاووێنە بوو بۆ كچی گچكەو، بۆ كوڕی گچكە زیاتر لە مارەیی هاووێنە بوو، ئەوە نیكاحەكە دانامەزرێ.

بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بوو كە بەرژەوەندیی كوڕ و كچەكەی تێدابێ، واتە: لەگەڵ هاووكوفدا بووو، بە مارەیی هاووێنە بوو، ئەوە نیكاحەكە دادەمەزرێ، بەڵام لەكاتی باڵغ بوون یان چاكبوونەوەیاندا، بۆیان هەیە نیكاحەكە بهێڵنەوە، یان هەڵبوەشێننەوە[1].

## سێیەم-ڕای بەندە:

منیش وای بۆ دەچم كە:

یەك: هاوسەرگیریی ئەنجامدان بۆ كوڕ و كچی گچكە، ئەگەر دروست (جائز)یش بێ، بەڵام شتێكی پەسند نیە و گرفت كێشەی زۆر بەدوای خۆیدا دێنێ، بۆیە واباشە ئەو عادەتە لە نێو مسوڵمانانداا هەر نەمێنێ و بنبڕ بكرێ.

دوو: بەپێی ئایەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ

---

(١) المفصل......، ج٨، ص٥٠٦.

لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ....﴾(البقرة: ١٨٧). کە خوای کاربەجێ ژن و مێرد بەبەرگ و پۆشاکی یەکدی دادەنێ و بەرگ و پۆشاکیش بە ئیرادە و خواست و هەڵبژاردنی مرۆڤ دیاری دەکرێ و دەپۆشرێ! وە بەپێی ئایەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾ (الروم: ٢١)، کە وەك دەبینین خوای زانا ژن و مێرد بە مایەی ئۆخژن و سرەوتن و ئارامیی یەکدی دادەنێ و، رایدەگەیەنێ کە لەسەر بناغەی بەزەیی و خۆشەویستیی پێکەوە دەژین!

هەروەها بەپێی چەندان فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بۆ نموونە:

أ- (لاتُنكحُ الأيِّمُ حتى تُستَأمَرَ ولاتَنكَحُ البِكرُ حتى تُستَأذَنَ، قالوا: يا رَسُول الله وكَيفَ إذنُها؟ قال: أن تَسكُتَ) رواه البخاري: ٥١٣٦.

واتە: بێوەژن هەتا راوێژی لەگەڵ نەکرێ مارە نابڕرێ و، کچیش هەتا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێ مارە نابڕرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ؟ فەرمووی: کە بێ دەنگ بێ. (واتە: نارەزایی دەرنەبڕێ).

ب- (عن خنساء بن خِذام الأنصارية: أن أباها زوَّجها وهي ثَيِّبٌ فكرِهَت ذلك، فأتَت رسول الله (ﷺ) فَرَدَّ نكاحَهُ) رواه البخاري: ٥١٣٨.

واتە: خەنسای کچی خیزامی ئەنصاریی گوتوویەتی: کە بە بێوەژنیی بابی مارەی بڕیوە (لە یەکێك) ئەویش پێی ناخۆش بووە، هاتۆتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش نیکاحەکەی هەڵوەشاندۆتەوە.

بەڵێ، بەپێی ئەو ئایەت و فەرمایشتانە کە زۆر روون و راشکاون، دەڵێم: کوڕ و کچی گچکە، یان شێت، ئەگەر بابێکی باش و دیندار و دڵسۆزیش

گرێبەستی هاوسەرگیریی بۆ ئەنجام دابن، مادام کە بالّغ دەبن، یان عاقلّ دەبن، بە دڵیان نابێ، بۆیان هەیە هەڵیبوەشێننەوەو بە ئارەزووی خۆیان هاوسەرگیریی بکەن.

شایانی باسیشە (بخاري) فەرموودەی یەکەم – ژمارە (٥١٣٦)- ی لەژێر ئەم ناوونیشانەدا هێناوە: (**بـابُ لايُنْكِحُ الأبُ وغيْرهُ البِكر والثّيِّب إلاّ بِرِضاها**)[(١)]، واتە: (باسی ئەوە کە باب و هی دیکەش بەبێ ڕەزامەندیی خۆیان کچ و بێوەژن مارە نابڕن).

فەرموودەی دووەم- ژمارە (٥١٣٨)- یشی لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا هێناوە: (**بابٌ إذا زوَّجَ ابنَتَهُ وهي كارهةٌ فنكاحهُ مَردُودٌ**)[(٢)]، واتە: (باسی ئەوە کە هەر کات (باب) کچی خۆی مارەبڕی و پێیناخۆش بوو، نیکاحەکەی ڕەتکراوەیە).

هەڵبەتە لە ئەنجامی ئەو جۆرە لێکۆڵینەوەیەشدا، زۆرباش دەزانین و دڵنیا دەبین کە دوورکەوتنەوەی مسوڵمانان لە قورئان و سوننەت، لە وەحی خوا، تووشی بیرورا و فەتوای سەیر و سەمەرەو نەگونجاو و لەگەڵ عەقڵ و فیترەت ناتەبا و تێکگیراویان دەکات!

لێرەشدا کۆتایی بە هۆکارە هاوبەشەکانی نێوان ژن ومێرد، کە دەبنە مایەی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی، دێنین و دەچینەسەر باسی جۆری دووەمی ئەو هۆکارانە، کە ئەوانەن کە پەیوەستن بە مێردەوەو، ئەو هۆکاری سەرهەڵدانیانە:

---

(١) صحيح البخاري، ص٩٦٨.
(٢) صحيح البخاري، ص٩٦٨

**جۆری دووەمی هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی:**

## هۆکارە تایبەتەکان

ئەو هۆکارانەی کە زیاتر پەیوەندییان بە پیاوەوە هەیە و دەبنە مایەی لەیەکترازانی ژن و مێرد و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی نێوانیان، بەپێی لێبووردنەوە و ئەنجامگیریی بەندە یازدە (١١) هۆکارن.

جا ئێمە لەسەر بناغەی ڕێزبەندیی (ترتیب) هۆکارە هاوبەشەکان، کە پێشتر باسمان کردن ئەمانیش ڕیز دەکەین، کە ئەمانەن:

## ٧-سوێندخواردنی مێرد لەسەر جووتنەبوونی لەگەڵ ژنەکەیدا (الإیلاء):

ئێمە لە چوار برگەدا باسی ئیلاء دەکەین:

یەکەم: پێناسەی ئیلاء.

دووەم: حوکمی ئیلاء.

سێیەم: پایەکانی ئیلا ء.

چوارەم: شوێنەوارەکانی ئیلاء.

### یەکەم: پێناسەی ئیلاء:

وشەی (ایلاء) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای سوێند (الحَلِفُ والـيَمِين)ە، دەگوترێ: (آلى يُؤْلي إيلاءً وأليَّةً، والجمع: ألايا)[1].

(١) لسان العرب، لابن منظور، ج١٨، ص٤٢-٤٣.

وە لەزاراوەی شەرعزانان دا ئاوا پێناسە کراوە، کە لە نێوەڕۆك دا یەکن، بۆ وێنە: (ابن قدامة) ئاوا پێناسەی کردوە: (**فأما الإيلاء في الشرع فهو الحَلِفُ على تركُ الوطْ ء**)[1]، واتە: ئیلا ء لە شەرعدا بریتیە لە سوێند خواردن لەسەر جووتنەبوون.

هەڵبەتە هەندێك لەزانایانیش ڕایان وایە کە سوێند خواردن لەسەر جیماع نەکردن، تەنیا کاتێك بە (**ایلاء** )دادەنرێ کە بۆ ماوەی چوار مانگ یان زیاتر بێ و ئەگەر کەمتر بێ بە ئیلا ء دانانرێ[2]، دواتریش زیاتر ئەم مەسەلەیە دەتوێژینەوە.

## دووەم: حوکمی ایلاء:

ئیلاء کە وەك باسمان کرد سوێندخواردنی مێردە لەسەر جیماع نەکردنی لەگەڵ ژنەکەیدا، کە دیارە ئەمەش دەگونجێ سەربکێشێ بۆ لەیەکترازانی ژن و مێرد، ئەگەر ماوەی ئیلائەکە تەواو بوو و مێردەکە سوێندەکەی نەشکاند، کە دیارە ئەمەش جۆرێکە لە زیانگەیاندن بە ژن و ئەوەش قەدەغەیە، بۆیە دەتوانین بڵێین: ئیلاء لە ئەسڵدا حەرامە.

ئنجا ئەو تاکە ئایەتەش کە باسی ئیلائی کردوە لە قورئاندا، هەر ئەوەی لێ دەفامرێتەوە:

﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَـٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ (البقرە: ٢٢٦-٢٢٧).

---

(١) المغني، ج٧، ص٢٩٨.
(٢) فتح القدير، للكمال بن الهُمام، ج٣، ص١٨٢.

واتە: ئەوانەی سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن (کە لەگەڵیان جووت نەبن) بۆیان هەیە چوار مانگ چاوەڕوانیی بکەن، جا ئەگەر گەڕانەوە (لە سوێندەکەیان ژیوان بوونەوە) ئەوە بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە، وە ئەگەر بڕیاری تەلاقیان دا، ئەوە بێگومان خوا بیسەری زانایە.

(إبن العَربيّ) گوتوویەتی: ﴿فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ **يقتضي أنه قد تقدَّم ذَنبٌ وهو الإضرار بالمرأة في المنع من الوطء)**[1]، واتە: ئەم ڕستەیە ئەوە دەخوازێ کە گوناهێك کراوە، کە بریتیە لە زیانلێدانی ژن بە لەگەڵ جووتنەبوونی.

بەڵام بێگومان ئیلاء لە کاتێك دا قەدەغە نابێ و ڕەوا دەبێ، ئەگەر مێرد مەبەستی پێی تەمبێ کردن و پەروەردکردن و ڕاستکردنەوەی ژنەکەی بێ، کە بێگومان ئیلائی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ماوەی مانگێك لەهەموو هاوسەرەکانی خوا لێیان ڕازی بێ، لەو جۆرە بووە، وەك (بخاري) هێناویەتی:

**(عَن أمّ سَلَمَةَ (رضي الله عنها) أنّ النَّبِي (ﷺ) حَلَفَ لايدخُلُ على بعض أهلِه شهراً...)**، ٥٢٠٢.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) سوێندی لەهەندێك لە هاوسەرانی خوارد کە ماوەی مانگێك نەچێتە ژووریان.

هەروەها (بخاري) هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامی پرسیاری عومەری کوڕی خەتتاب دا: **(أطلقتَ نساءك؟) ( لا، ولكن اكيتُ منهن شهراً)**:٥٢٠٣ واتە: نەء، بەڵام بۆ ماوەی مانگێك ئیلائم لێ کردوون،

---

(١)أحكام القرآن، ج١، ص١٨٣

واتە: سوێندم خواردوە کە نەچمە لایان.

دیارە ئەم ڕایە ویڕای زاهیرییەکان، (**النّخعي وقتادة وحماد، وإبن ابي لَيلى وإسحاق**)یش تەبەنییان کردوە[1].

واش پێدەچێ ئەم ڕایەی سێیەم ڕاستتر بێ، چونکە ڕستەی: (**للذين يؤلون من نسائهم تربصّ أربعة أشهر**) خوا بەگشتی و بە ڕەهایی باسی سەرجەم ئەوانەی کردوە، کە سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن نەچنە لایان.

ئنجا وشەی (تربص أربعة أشهر) تەنیا ماوەی چاوەڕوانبوونی مێرد دیاریی دەکات، واتە: ئەو ماوەیەی کە ئەگەر لە نێویدا (**في أثنائها**) سوێندەکەی بشکێنێ،ئەوە ژنەکەی هەرحەڵاڵە، بەڵام ئەگەر ئەو چوار مانگە تێپەڕین، لێی حەڕام دەبێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

## سێیەم: وشەکانی ئیلا - (الألفاظ الإيلاء):

وشەکانی ئیلاء هەموو ئەو وشە و تەعبیرانەن کە بە ڕاشکاویی (صراحة) یان کینایە ئەو مەبەستە دەگەیەنن، کە ئەو پیاوە لەگەڵ ژنەکەیدا جووت نابێ.

دیارە زانایانیش لەو بارەوە کە ئایا کام وشەو کام وشە بەڕاشکاو (صريح) دادەنرێن و، کام وشە و کام وشەش بە کینایە؟! ڕاجیاییان هەیە و، بێگومان لە زمانێکەوە بۆ یەکی دیکەو، بگرە لە ڕۆژگار و کۆمەڵگایەکیشەوە بۆ یەکی دیکە، مانای وشە و زاراوەکان گۆڕانیان بەسەردا دێ.

---

(١)المفصل.....، ج٨، ص٢٥١

## چوارەم-شوێنەوارەکانی ئیلاو (آثار الإیلاء):

لە سێ ورده برگەدا باسی شوێنەوارەکانی ئیلاء دەکەین:

### یەك: ماوەی چاوەڕوانیی سوێندخۆر:

بە دەقی قورئان ماوەی چاوەڕوانی بابای سوێندخۆر لەسەر جیماع نەکردن لەگەڵ ژنەکەیدا، چوار مانگە: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾.

حیکمەتی دانانی ئەو ماوەیەش ئاشکرایە، کە بریتییە لە بوار و دەرفەت پێدانی کابرای سوێندخۆر، بەڵکو پەشیمان بێتەوە، نەك پێش بیرکردنەوە کار لە کار بترازێ!

سەرەتای دەستپێکردنی چوار مانگەکەش بریتییە لە سەرەتای کاتی سوێند خواردنەکە وەك لە ئایەتەکەشەوە دیارە، هەندێکیش گوتوویانە: سەرەتایەکەی ئەو کاتەیە کە داواکاریی بۆ لای دادوەر بەرزدەکرێتەوە (من حين الترافع)، بەڵام ڕایەکەیان بێ بەڵگەیە و ئایەتەکە نایگەیەنێ.

### دوو: گەڕانەوەی سوێندخۆر لە ماوەی چاوەڕوانییدا:

دیارە مەبەست لە گەڕانەوەی مێرد (فيئة الزوج) جیماع کردنیەتی لەگەڵ ژنەکەیدا، چونکە ئەوەی سوێندی لەسەر خواردوە، جووتنەبوون (وطء)ە، کەواتە: مەبەست لە گەڕانەوەش گەڕانەوەیەتی بۆ جیماع کردن.

بەڵام ئەگەر لەبەر هۆکارێکی بەدەر لە ویستی خۆی، جیماع کردنەکەی دواکەوت، زیانی نیە.

هەڵبەتە ئەگەر بابای سوێندخۆر بڕیاری گەڕانەوەیدا لەماوەی

چاوەڕوانیی (أثناء مدة التربص)دا، ئەوە ئیلائەکەی تەواو بووە و، ئەو کاتەش بە ڕای زۆربەی زۆری زانایان کە (ابن سیرین و النخعي و الثوري وقتادة و مالك و أهل المدينة و أبو عبيد، الحنفية و الشافعية في الأظهرمن قولَيْهم) یان لەنێودان، کەفارەتی سوێندی دەکەوێتە سەر وەك هەر سوێندێکی دیکە کە دەشکێنرێ.

هەندێکیشیان ڕایان وایە کەفارەتی ناکەوێتەسەر، بەڵام ڕایەکەیان بێ بەڵگەیە[(١)].

## سێ: نەگەڕانەوەی سوێندخۆر هەتا تێپەڕبوونی ماوەی چاوەڕوانیی، دەبێتە هۆی تەڵاق کەوتنی:

زانایان لەبارەی کەوتن و نەکەوتنی تەڵاقی بابای سوێندخۆر لەسەر جیماع نەکردن لەگەڵ ژنەکەیدا، ڕاجیاییان هەیە:

أ-بەشێکیان دەڵێن: بە تێپەڕبوونی ماوەی چاوەڕوانیی و نەگەڕانەوەی کابرا تەڵاقێکی دەکەوێ، جا ئەمانیش لە نێو خۆیاندا دوو ڕان:

ڕایەکیان ئەوەیە کە تەڵاقێکی جیابوونەوە (طلْقة بائنة)ی دەکەوێ، ئەم ڕایەش هی: (إبن عباس و ابن مسعود وعكرمة و جابر بن زيد و عطاء و الحسن و مسروق و قُبَيْصة والنخعي و الأوزاعي و إبن ابي ليْلى و الحنفية)یە.

وە ڕایەکەی دیکەیان دەڵێ: تەڵاقێکی گەڕانەوە (طلقة رجعية)ی دەکەوێ و، ئەم ڕایەش هی: (أبي بكر بن عبدالرحمن و مكحول والزهري)یە[(١)].

(١) المفصل...، ج٨، ص٢٦٧-٢٧١.

ب- بەشێکیشیان کە (**سعيد بن المسيِّب و عروة و مجاهد و طاووس و مالك و الشافعي و اسحاق و أبو عبيد ابو ثور و إبن المنذر**)یان لەنێودان، وە ڕای زۆرێك لە هاوەڵان (الصحابة)ە، کە (**عمر و عثمان و علي ابن عمر و عائشة و ابو الدرداء**)یان لەنێودان (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێن: بە تێپەڕبوونی ماوەکە تەڵاقی ناکەوێ، بەڵکو فەرمانی پێ دەکرێ یان بگەڕێتەوە، یان ژنەکەی تەڵاق بدات[٢].

شایانی باسیشە لایەنگرانی هەردووك ڕایەکە چەند شتێکیان بەبەڵگە هێناوەتەوە، بەڵام بە سەرنجدانی خودی دوو ئایەتەکەی (ایلاء) پێش هەر شتێکی دیکە، بۆمان دەردەکەوێ کە ڕای دووەم بەهێزتر و بەڵگەدار ترە، بابزانین چۆن؟!

١- ڕستەی: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ .... ﴾ ڕواڵەتەکەی ئەوە دەگەیەنێ کە گەڕانەوە (فيئە) کە، دەبێ پاش چوار مانگ بێ، چونکە گەڕانەوە بە (فاء) باسکراوە: (فَإِن فَآءُوا) کە ئەمیش لێرەدا بە دوادا هاتن (تعقيب) دەگەیەنێ، کەواتە: گەڕانەوەی مێرد پاش چوار مانگە، کە، شتێکی ئاساییە و ڕستەی(فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ يُؤَاخِذُكُم )یش هەر ئەوە دەگەیەنێ، چونکە لێبوردن و بەزەیی خوا، لەگەڵ تەڵاق کەوتندا، باسکردنیان گونجاو نیە.

٢- ڕستەی : ( وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ ) ئەگەر عەزمیان لەسەر تەڵاق کرد،

---

(١) هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص٢٧٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٢٧٤.

ئەوە دەگەیەنێ کە تەلاق کەوتن پێویستی بە بڕیار و عەزم لەسەر کردن هەیە و تەنیا بە تێپەڕبوونی ماوەی دیارییکراو ناکەوێ، وە تێپەڕینی ماوەکە بەبێ گەڕانەوە، بەڵگەی عەزم هەبوونی کابرا نیە لەسەر تەلاقدان، چونکە ڕەنگە تەنیا مەبەستی سزادان و ئەزیەتدانی ژنەکەی بێ، نەك تەلاقدانی!

٣- ڕستەی : (فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ يُؤَاخِذُكُم ) بێگومان خوا بیسەری زانایە، ئاماژەیە بۆ هەبوونی قسەیەکی بیستراو (مسموع)، دیارە قسەی بیستراویش لێرەدا تەلاقدانی پیاوەکەیە، ئەگەرنا تێپەڕبوونی کات، نە قسەیە و نەبیستراویشە!

٤- مادام چوار مانگ چاوەڕوانیی وەك هەل و دەرفەتێك بە پیاوەکە دراوە، دیارە لەو ماوەیەدا ژنەکە بۆی نیە داوای گەڕانەوەی بکات، واتە: لەلای دادوەر، کەواتە نابێ تەنیا بە تێپەڕبوونی کاتەکە تەلاقی بکەوێ.

٥- ئیلاء سوێندخواردنە لەسەر جیماع نەکردن و تەلاقدان ناگەیەنێ، بۆیە حیساب کردنی تێپەڕبوونی ئەو کاتە دیاریکراوە، بە تەلاقدان، خستنی تەلاقە بەبێ تەلاقدان!!

ئنجا لە کاتی ڕازی نەبوونی بابای سوێندخۆردا بە تەلاقدانی ژنەکەی، وە پێداگریشی لەسەر نەگەڕانەوەی بۆ جیماع کردن لەگەڵ ژنەکەیدا، دادوەر (قاضي) پێی تەلاق دەدات، یان لەلای خۆیەوە تەلاقی دەخات، هەندێکیش دەڵێن: نابێ تەلاقی بخات، بەڵکو هەر دەبێ سەغڵەتی بکات و تەنگی پێ هەڵچنێ، هەتا دەگەڕێتەوە یان تەلاقی دەدات، بەڵام من ڕای یەکەمم پێ

ڕاسترە، چونکە خوای دادگەر تەنیا باسی دوو ئەگەری کردوە: گەڕانەوە، یان تەڵاقدان، بەڵام تەنگ پێهەڵچنین و سەغڵەت کردن، هیچ کامیان نیە!
هەروەها زانایان لەبارەی جۆری تەڵاقدانەکەشەوە، ڕاجیابیان هەیە و هەندێکیان بە تەڵاقدانی گەڕانەوە (طلاق رجعي) و هەندێکیشان بە تەڵاقدانی جیابوونەوە (طلاق بائن) یان داناوە و، بێگومانیشم کە ڕای دووەم ڕاستە، چونکە حیکمەت و فەلسەفەی گۆڕانکاریی هێنان بەسەر ئیلائدا لەلایەن شەریعەتەوە، ڕێگریی بووە لە ستەمی مێرد لە ژنەکەی، ئاشکراشە کە بەحیسابکردنی ئیلاء بە تەڵاقدانی گێڕانەوە، ئەو ستەمە هەر بەردەوام دەبێ، بەڵام ئەگەر بە تەڵاقدانی جیابوونەوە دابنرێ، زوو بنبڕ دەبێ.

## ٨-پێچواندنی مێرد بۆ ژنەکەی بە پشتی دایکی (الظهار):

هەرچەند ظیهار یەکێك نیە لە لێك ترازاندنەکانی هاوسەرگیریی (فُرَق الزواج)، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئەوەی بە لەیەك جیابوونەوە (الفرقة) لە نێوان ژن و مێردا قەدەغە دەبێ، بە ظیهاریش قەدەغە دەبێ، بۆیە لە ڕیزی هۆکارەکانی لەیەك ترازانی ژن و مێرددا باسمان کرد.
خوا پشتیوان بێ لە چوار بڕگەشدا باسی ظیهار دەکەین:

یەکەم: پێناسەی ظیهار.

دووەم: پایەکانی ظیهار.

سێیەم: حوکمی ظیهار.

چوارەم: کۆتایی هاتنی حوکمی ظیهار.

## یەکەم-پێناسەی ظیهار:

وشەی (ظیهار) لە (ظَهْر)ەوە هاتوە، کە بەمانای پشت دێ، (ابن منظور) گوتوویەتی: (الظَّهْر في كل شيءٍ خلاف البَطْن، والجمع: أظهر وظهور وظهران) [(١)] واتە: (ظهر) لەهەر شتێکدا پێچەوانەی سك (بطن)ەوە بە (أظهر وظهور وظُهْران)یش کۆدەبێتەوە.

لەزاراوی شەرعییشدا (ظهار) ئاوا پێناسە کراوە:

(الظِّهار هو أن يُشَبِّهَ امرأة أو عضواً منها بمن تحرم عليه ولو الى أمدٍ أو بعضوٍ منها) [(٢)].

واتە: **ظیهار** ئەوەیە کە پیاو ژنەکەی یان ئەندامێکی بە مێینەیەکی کە لێی قەدەغەیە ئەگەر بە شێوەی کاتییش بێ، بچوێنێ، یان بە ئەندامێکی بچوێنێ.

ئێستاش بۆ ئەوەی باشتر بەرچاومان لەبارەی (ظهار)ەوە روون بێتەوە، با سەرنجی ئەو چوار ئایەتانە بدەین، کە لەو بارەوە دەدوێن و بەو بۆنەیەوە هاتوونەتە خوار:

﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا

---

(١) لسان العرب، ج٦، ص١٩٢–٢٠٠.

(٢) غاية المنتهى في الجمع بين لإقناع والمنتهى، ج٣، ص١٩٠، لە: (المفصل....)، ج٨، ص٢٨٢.

قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ۝٣ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾(المجادله: ١-٤).

واتە: بێگومان خوا قسەی ئەو ژنەی بیست کە لەبارەی مێردەکەیەوە شەڕە قسەی لەگەڵ دەکردی و سکاڵای بۆ لای خوا دەبرد، خواش گفت و گۆتانی دەبیست، بەڕاستی خوا بیسەری بینەرە، ئەوانەی لە ئێوە (**ظیهار**) لە ژنەکانیان دەکەن (بە پشتی دایکانیان دەچوێنن) ژنەکانیان دایکیان نین.

دایکیان تەنیا ئەو ژنانەن کە ئەوانیان بووە، وە ئەوان قسەیەکی خراپ و درۆ دەڵێن.

وە بێگومان خواش چاوپۆشی لێبوردەیە، وە ئەوانەی (**ظیهار**) لە ژنەکانیان دەکەن، پاشان بۆ ئەوەی گوتوویانە دەگەڕێنەوە (واتە: دەیانەوێ بگەڕێنەوە لای ئەو ژنانەیان کە (**ظیهار**)یان لەگەڵ کردوون) ئەوە ئازادکردنی گەردنی کۆیلەیەکیان لەسەر پێویستە، بەر لەوەی بچنە لای یەکدی، ئا ئەوەتان پێی ئامۆژگاریی دەکرێن، وە خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە. ئنجا هەر کەس (کۆیلەی) چنگ نەکەوت، با دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێ، پێش ئەوەی بچنە لای یەك، وە هەر کەسێك نەیتوانی (بەڕۆژوو بێ) با خواردنی شەست نەدار بدات، ئەوەش تاکو بڕوا بەخوا و پێغەمبەرەکەی بێنن، وە ئەوانە سنوورەکانی خوان و، کافرانیش سزایەکی بە ئێشیان هەیە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەش، لە چەند دەقێکی سوننەتدا باس کراوە و ڕواڵەتی ئایەتی یەکەمیش ئاماژەی پێ دەکات، ئەمەش یەکێکە

لە ڕیوایەتەکانی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتانە:

(عَنْ عروة بن الزبير قال: قالت عائشة (رضي الله عنها): تبارك الذي وَسِعَ سَمْعُهُ كلَّ شيء إنّي لأَسْمعُ كلام خولة بنت ثَعلبة ويخْفى عليّ بعْضُهُ، وهي تشتكي زوجَها الى رسول الله (ﷺ) وهي تَقول: يا رَسُول الله أكل شبابي ونَثَرْتُ له بَطْني حتى إذا كبرتْ سنّي وانقطع ولدي ظاهَرَ منّي، اللّهُمّ إني أشكو اليك، قالت عائشة (رضي الله عنها): فما بَرحْتُ حتى نزل جبريل بهؤلاء الآيات: (قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ...الى قوله تعال: وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ) رواه ابن ماجه والبيهقي في السنن الكبرى).

واتە: عائیشە خوا لێ ڕازی بێ گوتوویەتی: بەرز و بە پێزە ئەو خوایەی کە هەموو قسەیەك دەبیستێ، من گوێم لە قسەی خەولەی کچی سەعلەبە بوو، هەندێکیشم لێ پەنهان بوو کە لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) سکالای لەبارەی مێردەکەیەوە دەکرد و دەیگوت، ئەی پێغەمبەری خوا! تەمەنی گەنجێتیم لەگەڵ بردە سەرو، مندالّم لێی پەیدا بوون، ئێستاش کە کەوتوومەتە تەمەنەوە و مندالّم نابن، (ظیهار)ی لێ کردووم، خوایە من سکالاّ بۆ لای تۆ دێنم!

عائیشە دەڵێ:

هێندەی نەخایاند کە جبریل ئەم ئایەتانەی هێنایە خوار: (قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ...الى قوله تعال: (وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ).

شایانی باسە هاوسەری ئەو ژنەش کە بە (خولة بنت ثعلبة) وە (خويلة

بنت ثعلبة)ەش هاتوە ناوی (أوس بن الصامت)ە، وەك لە فەرموودەیەك دا كە (أحمد) هێناویەتی، هاتوە[1].

## دووەم-پایەكانی (ظیهار)[2]:

(ظیهار) چوار پایەی هەن كە ئەمانەن:

### یەك-ظیهاركەر (المُظاهِر):

كە بریتیە لەمێرد وەك ئایەتەكە ئاماژەی پێ كردوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ﴾، وە ئەگەر گریمان ژن ظیهار لەمێردی بكات و پێی بڵێ: (أنتَ عليَّ كَظَهر أُمي) تۆ لەلام وەك پشتی دایكمی، بە قسەی پووچ (لغو) دادەنرێ وهیچ نیە.

مەرجی ظیهاركەریش بە پێی بنچینەی: هەر مێردێك تەڵاقدانی بۆ هەبێ ظیهاركردنیشی بۆ هەیە (كل زوجٍ صَحَّ طلاقُهُ صَحَّ ظِهارهُ) ئاشكرایە كە دەبێ: عاقڵ و باڵغ و سەربەست (مُختار) بێ.

### دوو-ظیهار لێكراو (المُظاهَر منها):

ئەمیش بریتیە لە ژن و مەرجەكەیشی ئەوەیە كە بە نیكاحێكی ڕاست و دروست بوویێتە هاوسەری مێردەكەی.

### سێ-ظیهارپێكراو (المُظاهَرُ به):

كە مەبەست پێی ئەوەیە كە بابای ظیهاركەر ژنەكەی پێ دەچوێنێ، چونكە

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص١٣٧٢.
(٢) بڕوانە: المفصل...، ج٨، ص٢٨٥-٣٠٣.

کەسێك کە بە ژنەکەی خۆی دەڵێ:
تۆ وەك پشتی دایکمی (أنت عليّ كَظهر أُمي)، مەبەستی ئەوەیە کە تۆش وەك دایکم لێم قەدەغەی و توخنت ناکەوم.
ئنجا ئەو کەسەی کە **ظیهاری** پێدەکرێ و ژنی پێ دەچوێنرێ، دوو مەرجی سەرەکی تێدا بە مەرج گیراون:
أ-دەبێ ئافرەت بێ.
ب-دەبێ بەشێوەیەکی هەتا هەتایی (أبدي) لە بابای **ظیهارکەر** حەرام بێ، وەك: نەنك، دایك، خوشك، کچ، پوور (خالة)، پلك (عمة)...هتد، کە ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە وەك: حەنەفییەکان وشافیعییەکان و زاهیرییەکان و جەعفەرییەکان، هەندێکیش دەڵێن: ئەگەر پێچوێنراو (**مشتبه بها**)ەکە، بەشێوەی کاتییش حەرام بێ، وەك: خوشکی هاوسەر، هەر هەمان حوکمی هەیە، بەڵام بەڕای زۆربەی زیاتر بە عەقڵەوە دەنووسێ.

## چوار-ڕێژگەی ظیهارکردن (صيغة الظهّار):

مەبەست پێی ئەو شێوازە دەربڕینەیە کە **ظیهاری** پێ ئەنجام دەدرێ، کە ئەویش دەگونجێ ڕاشکاو (صريح) بێ و، دەشگونجێ کنارە (كناية) بێ.
ڕاشکاو وەك: تۆ وەك پشتی دایکمی (أنتِ عليّ كَظَهر أُمي) کە دیارە ڕاشکاو حەوجێی بە نیەت نیە.
وە کینایە وەك: تۆ لەلام وەك دایکمی (أنتِ عليّ مثل أُميّ) کە دیارە کینایە حەوجێی بە نیەتە، چونکە دەگونجێ مێرد ئەو تەعبیرە لە ڕووی ڕێز و خۆشەویستییەوە، بۆ هاوسەری بەکاربێنێ.

## سێیەم-حوکمی ظیهار:

حوکمی **ظیهار**کردن بە کورتی ئەوەیە کە بابای **ظیهار**کەر لێی حەرام دەبێ لەگەڵ ژنەکەیدا جووت ببێ، بەر لەوەی کەفارەت بدات، ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە و ڕواڵەتی ئایەتەکانیش هەر ئەوە دەگەیەنێ، چونکە خوای کاربەجێ دووجار ڕستەی: (مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ زَوۡجِهَا ) دووبارە کردۆتەوە، کە دیارە مەبەستیش لە پێکگەیشتن، جیماع و غەیری جیماعیشە، بۆیە پێشەکییەکانیشی دەگرێتەوە.

وە لەڕاستیدا ڕای ئەوانە کە دەڵێن: پێش کەفارەت دانیش جووتبوون دروستە، بێهێزە، هەر بۆیەش ئەگەر پێش کەفارەتدان، بابای **ظیهار**کەر چووە لای ژنەکەی، گوناهبارە.

بەڵام کەفارەتەکەی لەسەر دووبارە نابێتەوە و هەر یەك کەفارەتی لەسەرە، هەرچەند (مجاهد) ڕای وایە کەفارەتێکی دیکەشی دەکەوێتەسەر.

## چوارەم-کۆتایی هاتنی حوکمی ظیهار:

**یەك: ئەگەر حوکمی ظیهارکردنەکە کاتی دیاریکراوی هەبێ**، هەر کات کاتەکە تەواو بوو، بێ ئەوەی بابای **ظیهار**کەر سوێندەکەی خۆی بخات، بە گەڕانەوەی بۆ جیماعکردن لەگەڵ ژنەکەیدا، ئەوە حوکمی **ظیهار**ەکە کۆتایی پێهاتوە.

بۆ وێنە: ئەگەر پیاوێك بە ژنەکەی بڵێ: تۆ بۆ ماوەی مانگێك وەك پشتی دایکمی (**أنتِ عليَّ كَظهر أمي شهراً**) بە تێپەڕبوونی مانگەکە **ظیهار**ەکەش کۆتایی دێ و، پێویستی بە کەفارەتیش ناکات، ئەمە یەکدەنگیی زانایانی لەسەرە.

**دوو-مردنی یەکێك لە ژن و مێرد:**

ئەمیش زۆربەی زانایان بە ڕێبازی دووەمی کۆتایی پێهاتنی **ظیهاری** دەزانن و، هەر کام لە (**عطاء والنخعي والأوزاعي و الحسن والثوري و مالك و أبو عبيد و الحنفية والحنابلة**) ئەم ڕایەیان هەیەو، هەندێکیشیان وەك (**طاووس و مجاهد و الشعبي و الزهري**) دەڵێن: بەس بە کردنی **ظیهار** کەفارەت پێویست دەبێ، با ژن و مێرد یەکیان یان هەردووکیشیان، پێش جیماع کردنیش مردبن.

بەڵام بێگومان ڕای زۆرینە ڕاستە، چونکە:

خوای زانا و توانا فەرموویەتی: (وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ زَوۡجِهَا) کەواتە: بە گەڕانەوە (عود)ەکە کەفارەتەکە پێویست دەبێ، بەڵام ئەگەر بابای **ظیهار**کەر سوێندەکەی نەشکاند، کەفارەتی ناکەوێتە سەر[1].

**سێ-کەفارەت دان:**

ئەمیش ڕواڵەتی ئایەتەکان، کە پێشتر هێنامانن دەگەیەنێ.

کەفارەتیش بۆ ظیهار یەکێك لەم سێ شتانەیە، بەڵام بەڕیز (ترتیب)، واتە: هەتا یەکەمی بۆ بکرێ دووەم دروست نیە و هەروەها.

ئەو سێ شتەش کە لەدەقی ئایەتەکانیشدا هاتوون، ئەمانەن:

١-ئازادکردنی کۆیلەیەك (فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ زَوۡجِهَا).

٢-دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بوون (فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ).

(١) المفصل...، ج٨، ص٣٠٩.

٣-خواردن پێدانی شەست نەدار (فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ).

ئنجا بە نسبەت ئازادکردنی کۆیلەوە- هەرچەندە سوپاس بۆ خوا ئێستا ئەو جۆرە کۆیلەیە نەماون، هەرچەندە جۆری دیکە هەن- هەندێك لە زانایان رایان وایە کە دەبێ کۆیلەیەکی بڕوادار بێ، بەڵام لە راستیدا رای ئەوانی دیکە کە دەڵێن: مەرج نیە ئیماندار بێ، راستترە، چونکە ئایەتەکە بە رەهایی هێناویەتی: (فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ) بۆیە پێویستە ئێمەش بە رەهایی بیهێڵینەوە و لە شوێنی دیکەش کە بەبەندار(مقید)ی هاتووە، وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکەین کە بریتییە لە کەفارەتی کوشتنی هەڵە (القتل الخطأ):

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٍ أَن يَقۡتُلَ مُؤۡمِنًا إِلَّا خَطَـٔٗاۚ وَمَن قَتَلَ مُؤۡمِنًا خَطَـٔٗا فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾ (النساء: ٩٢)

وە بەنسبەت بە دوای یەکدا هاتنی دوو مانگە رۆژووەکان، زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە پێویستە دوو مانگی تەواو بەبێ پسانەوە بەرۆژوو بێ، وە ئەگەر بەبێ عوزر پسانەوەی تێکەوت، دەبێ دووبارە لە نووکەوە تێهەڵچێتەوە، چونکە خوا فەرمویەتی:(فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ).

وە بە نسبەت خواردن پێدانی شەست نەداروە، زۆربەی زانایان ئەو مەرجەیان گرتوە، کە دەبێ خواردنەکە بدرێتە شەست (٦٠) نەدار، بەڵام (أبو حنیفە) رای وایە دەشگونجێ هەمووی بدرێتە یەك نەدار بۆ ماوەی شەست رۆژ، چونکە ئامانج لەو کەفارەتە، تێرکردنی برسییەکە و ، بابای نەداریش برسیبوونەکەی رۆژانە دووبارە دەبێتەوە!

بەڵام واپێدەچێ قسەی زۆربەی ڕاست بێ، چونکە ئەوەی وەك (أبـو حنيفـة) دەڵێ ڕەفتار دەكات، ئایەتەكە جێ بەجێ ناكات و خواردن بە شەست نـەدار نادات (فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا) بەڵكو بـۆ مـاوەی شەسـت ڕۆژ خـواردن بـە یەك نەدار (مسكيناً واحداً) دەدات!

هەروەها بۆچوونیەتی خـواردن پێدانەكـەش، زۆربـەی زانایـان دەڵـێن: دەبـێ خواردنی ڕۆژێك -واتە دوو ژەم- تەسلیمی شەست نەدار بكات، بـەڵام (أبـو حنيفة و أوزاعي) دەڵێن: چ خواردنەكە، چ نرخەكەیان تەسلیم بكـات، هـەر حیسابە[1].

پێشم وایە لێرەدا ئەبو حەنیفە و ئەوزاعیی باشتر نیشانەیان پێكاوە، چونكە جاری وایە خواردنەكە بە دڵی بابای نەدار نابێ، بەڵام ئەگەر نرخەكەی بـێ، بە كەیفی خۆی خواردن ساز دەكات، یان پێی دەكڕێ.

دیارە شەرعزانان لەبارەی ئەندازەی خواردن (**مقدار الطعام**)ەوە، زۆر قسەیان كردوە، كە ئایا ژەمێك بێ یان دوو ژەم، وە دوو مست یان مسـتێك؟ بـەڵام پێم وایە ڕایەكەی (ابن حزم) زۆر جوانە، كە دەڵێ: (**ولايُجـزئُ التكـرارُ علـى أقـلَّ مـن سـتين مسـكيناً، لأنهـم ليسـوا سـتين مسـكيناً، ولاخـلاف في الإشباع، ولم يشترط تعالى طعاماً دون طعام**)[2].

واتە: وە دووبارەكردنەوەی خواردنەكە لەسەر ژمارەیەكی كـەمتر لـە شەسـت نەدار بەرناكەوێ، چونكە كەمتر، شەست نەدار نین، وە ڕاجیایی نیـە لـەوەدا كـە دەبـێ خواردنەكـە تێركـەر بـێ، وە خـوای بـەرز خـواردنێكی جیـا لەخواردنێكی دیكە بە مەرج نەگرتووە.

---

(١) المفصل، ج٨، ص٣١٤-٣١٧

(٢) المحلي، ج١٠، ص٥٠.

## ٩-لەیەکترازاندن بەهۆی زیانپێگەیاندنەوە (التفريق للضرر):

یەکی دیکە لە هۆکار و پاساوەکانی لەیەکترازاندنی ژن و مێرد، ئەوەیە کە مێرد زیان بە ژنەکەی بگەیەنێ و ئەزیەت و ئازاری بدات.

ئنجا ئێمە لە چوار برگەدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین:

یەکەم-پێناسەی زیانگەیاندن (**تعريف ا لضرر**).

دووەم: جۆرەکانی زیانپێگەیاندن (**أنواع الضرر**).

سێیەم: جۆری جیابوونەوەی ژن و مێرد بە هۆی زیانپێگەیاندنەوە.

چوارەم: ژن بۆی هەیە لەگەڵ زیانلێدانی مێردیشیدا داوای جیابوونەوە نەکات.

### یەکەم-پێناسەی زیانپێگەیاندن (تعريف الضرر):

(إبن مَنْظور) گوتوویەتی: (الضُّرُّ والضرُّ بفتح الضاد أو ضَمِّها ضدُّ النفع، وكلّ ما كانَ من سوْ حال وفقرٍ وشدةٍ في بَدَنٍ، فهو ضرٌّ والضَّر يعني -أيضاً- الضيِّق)[1].

کەواتە: (ضَرّ) و (ضُرّ) پێچەوانەی سوودە، واتە: زیان و ئازار، هەروەها هەر خراپ حاڵییەك دەگرێتەوە، وە هەر هەژاریی و نەخۆشیی و ئازارێکی جەستەیی دەگرێتەوە، وە تەنگانە و سەغڵەتییش دەگرێتەوە.

دەشگونجێ لە ڕووی شەرعییەوە ئاوا پێناسەی زیانگەیاندنی مێرد بە ژنەکەی بکەین:

(هوَ كُلُّ ما يُلحِقُ الأذى أو الألم بِبَدنْ الزوجةَ أو نفسها أو يُعرِّضها

---

(١) لسان العرب، ج٦، ص١٥٣-١٥٤.

للهلاكُ) [١].

واتە: بریتییە لە هەر شتێك كە ئازار و ئێش بە جەستە و دەروونی ژن بگەیەنێ و ببێتە مایەی فەوتاندنیی.

## دووەم- جۆرەكانی زیانپێگەیاندن (أنواع الضرر):

دەتوانین ئەو زیانپێگەیاندنانەی لەمێردەوە لە دژی ژنەكەی پەیدا دەبن بیانكەینە دوو جۆری سەرەكی:

### یەك-زیانگەیاندنی ماددیی و جەستەیی:

كە مەبەست پێی هەر جۆرە ئازار گەیاندنێكی مێردە بە جەستەی ژنەكەی، چ بە دەست، چ بە ئامێرێك، چ بە هەر ئامراز و شێوازێك، كە ببێتە مایەی بریندار بوون یان شین ومۆربوونی جەستەی، یان شكانی ئێسقانی ...هتد.

### دوو-زیانگەیاندنی مەعنەویی و دەروونیی:

ئەمیش مەبەست پێی هەر قسە و ڕەفتار و هەڵسوكەوتێكی مێردە، كە ببێتە مایەی ئازاردانی دڵی ئافرەت و ئێش پێگەیاندنی دەروونی، وەك:

أ-قسەی ناشیرین گوتن بەخۆی و باب و دایك وخزم و كەسی.

ب-وێچواندنی بە درندە و ئاژەڵ، وەك: سەگ و كەر و مەیموون و ....هتد.

جـ-جێگا لێ جیاكردنەوەی (الهَجْر) بەبێ پاساو و بەڵگە.

د-لەگەڵ جووتنەبوونی و پشت تێكردنی بەبێ بەڵگە و پاساوی شەرعیی.

هـ-گرژ و مۆن بوون و بەسەردا هاواركردنی و تێخوڕینی.

---

(١) المفصل....، ج٨، ص٤٢٧.

و-قسە لەگەڵ نەکردنی، یان گوێ بۆ نەگرتنی.

## سێیەم-جۆری جیابوونەوەی ژن و مێرد بەهۆی زیانلێدانەوە:

وا پێدەچێ شەرعزانان لەسەر ئەوە یەکدەنگ بن کە جۆری لێك ترازانی ژن و مێرد بەهۆی زیانپێگەیاندنی بەژنەوە، بریتیە لە تەلاقدانێکی جیابوونەوە (طلقة البائنة) وەك (الدردير) گوتوویەتی: (...ولها التطليق بالضَّرر، أي لها التطليق طَلْقَةً واحدة وتكون بائنة)[1].

واتە: وە ژن بۆی هەیە بەهۆی زیانلێدانەوە- لەلایەن مێردەوە- داوای تەلاقدان بکات، واتە بۆی هەیە داوای یەك تەلاقدان بکات و، ئەویش تەلاقێکی جیابوونەوە دەبێ.

بەڵام بێگومان ئەوە لەکاتێك دا دەبێ، کە ژنەکە بتوانێ لەلای دادوەر ئیسپاتی داوایەکەی خۆی بکات، ئەگەرنا نابێ، بەڵام ئەگەر توانی ئیسپاتی بکات، دادوەر پێی تەلاق دەدات، وە ئەگەر گریمان مێردەکەی ئامادە نەبوو، دادوەر تەلاقی دەخات، وەك: (الدردير) گوتوویەتی: (فإن امتنع طلَّق عليه القاضي)[2].

## چوارەم-ژن بۆی هەیە لەگەڵ زیانلێدانی مێردیشیدا داوای جیابوونەوە نەکات:

ئەمیش شەرعزانان لەسەری رێککەوتون، چونکە جیابوونەوەی ژن لە مێردی لەو حاڵەتەدا مافێکی خۆیەتی و دەتوانێ داوای بکات و، دەشتوانێ لەبەر هەندێك هۆکار و ئیعتیبار چاوپۆشیی لەو مافەی خۆی بکات و، لەو

(١) الشرح الكبير، للدردير وحاشية الدسوقي، ج٢، ص٣٤٥.
(٢) المفصل، ج٨، ص٤٣٨،٤٣٧.

حاڵەتەشدا ئەگەر مەسەلەکە برایە لای دادوەر، لەسەر دادوەر پێویستە سەرزەنشتی پیاوەکە بکات لەسەر ڕەفتارە ناشەرعییەکانی، وەك (الحَطّاب) گوتوویەتی: (**ولها أن تقيم مع زوجها ويزْجُره الحاكم عن إضراره بزوجته**)[1].

واتە: وەبۆی هەیە - یانی بۆ ژنەکە - کە هەر لەگەڵ مێردەکەی بمێنێتەوە، وە دادوەر لەسەر زیانگەیاندنی بە ژنەکەی سەرزەنشتی دەکات.

بەڵکو پێم وایە:

ئەگەر ژنەکە لە ترسی ستەم و زۆری مێردەکەی نەوێرێ مومارەسەی ئەو مافەی خۆی بکات - کە داواکردنی جیابوونەوەیە - لەسەر دادوەر و حوکمڕان پێویستە بێتە نێو کێشەکەیانەوە و، گوێی ئەو پیاوە لاسار و زۆردارە بابدات و، دەستی پێ لەو ژنە بێچارەیە بەربدات، مەگەر دڵنیا بێ کە ژنەکە لە دڵەوە حەزناکات بەبێ ترس و فشار، کە لەگەڵ مێردەکەی لەیەك جیاببنەوە.

بەڵگەشم کۆی ئەو ئایەت و فەرموودانەیە کە فەرمان دەکان بە چەسپاندنی داد و لابردنی ستەم و چاکسازیی کردن و نەهێشتنی خراپەکاریی، وەك:

١-﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ (النحل:٩٠).

٢-﴿ فَلَوۡلَا كَانَ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِن قَبۡلِكُمۡ أُوْلُواْ بَقِيَّةٖ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡفَسَادِ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّنۡ أَنجَيۡنَا مِنۡهُمۡۗ ﴾ هود: ١١٦ (هود:١١٦).

(١)

٣-﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ ﴾ (الحج:٤١).

## ١٠-لە یەکترازاندن بەهۆی ونبوونی مێردەوە (التفریق لِفقدان الزوج):

یەکی دیکە لەهۆکار و پاساوەکانی لەیەکترازاندنی ژن و مێرد و، هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی نێوانیان، لەلای بەشێك لە زانایان، بریتییە لە بزربوون و بێ سەروشوێن بوونی مێرد.

ئنجا لە سێ بڕگەدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین:

یەکەم: پێناسەی ونبوون.

دووەم: ئایا ژن مافی هەیە بەهۆی ونبوونی مێردیەوە، داوای جیابوونەوە بکات؟

سێیەم: لەکاتی گەڕانەوەی مێردە ونبووەکەدا هاوسەرگیرییەکە چی لێ دێ؟

### یەکەم-پێناسەی ونبوون:

وشەی (فقدان) کە لەکوردییدا بە ونبوون، بزربوون، بێ سەروشوێن بوون، مانا دەکرێ، ئەوەیە کە مرۆڤ شتێکی لەبەرچاو نەمێنێ و لە دەستی بچێ. دەگوترێ: (فقدَ الشيءَ يفقدُهُ فَقْداً وفِقْداناً: ضاع منهُ، وفقدت المرأة زوْجها فهي فاقد والمفعول مفقودٌ و فقيد، وتفَقَّدْتَهُ، طلَبْتَهُ عند غيبَتِه)[1].

---

(١) المعجم الوسيط، ص٦٩٦-٦٩٧.

لەزاراوەی شەرعزانانیشدا هەر لەسەر بناغەی مانا زمانەوانییەکەی پێناسە کراوە، بۆ نموونە: (الكاساني) گوتوویەتی: (**المفقود اسم لشخص غابَ عن بَلَدهُ ولايُعْرَفُ خَبَرهُ هل هو حيٌّ أم مَيِّتٌ**)[1]، واتە: ونبوو ناوی کەسێکە کە لەوڵاتی خۆی دیار نەماوە و هەواڵی نازانرێ کە ئایا زیندوویە یان مردوو؟

## دووەم: ئایا ژن مافی هەیە بەهۆی ونبوونی مێردیەوە داوای جیابوونەوە بکات؟

شەرعزانان لەو بارەوە ڕاجیایی و مشت ومڕێکی زۆریان هەیە.

هەرچی حەنەفییەکان و شافیعییەکان و زاهیرییەکان و جەعفەرییەکانن، ڕایان وایە کە دروست نیە ژن بەهۆی دیارنەمانی مێردیەوە داوای جیابوونەوە بکات، هەتا نائومێد دەبێ بەهۆی تێپەڕبوونی ساڵانی زۆرەوە، کە هەندێکیان دەڵێن: دەبێ مێردەکەی بە مەزەنە بگاتە حەفتا (٧٠) ساڵیی، یان نەوەد (٩٠) ساڵیی و، هەندێکیشان دەڵێن، سەد و بیست (١٢٠) ساڵیی[2].

حەنبەلییەکانیش دوو حاڵەت بۆ ونبوونی پیاو دادەنێن و بەپێی حاڵەتەکان حوکمەکەی دیاریی دەکەن:

یەک: حاڵەتی زاڵبوونی ئەگەری تیداچوون (غلبة حالة الهلاك) بەسەر حاڵەتی سەلامەتییدا.

---

(١) بدائع الصنائع، ج٦، ص١٩٦.

(٢) المفصل....، ج٨، ص٤٤٣-٤٥١.

دەڵێن: لەم حاڵەتەدا پاش چوار ساڵ چاوەڕوانیی، عیددەی کۆچکردنی مێرد (**عدة وفاة الزوج**) کە چوار مانگ و دە ڕۆژە، تەواو دەکات و ئەو کاتە ئازاد دەبێ.

دوو: حاڵەتی زاڵبوونی ئەگەری سەلامەتیی (**غلبة حالة السلامة**) بەسەر حاڵەتی تێداچووندا.

دەڵێن: لەم حاڵەتەدا ژن بۆی نیە داوای جیابوونەوە بکات[١].

مالیکییەکانیش پێنج حاڵەتی جۆرا و جۆریان داناوە، بە گوێرەی حاڵەتەکان حوکمەکەیان دیاریکردوە[٢].

(**ابن تيمية**) و ژمارەیەکی دیکەش لەزانایان ڕایان وایە کە ژنی مێرد ون بوو (**زوجة المفقود**) بۆی هەیە، پاش چوار ساڵی چاوەڕوانیی، عیددەی مێرد مردن بەرێ بکات و، پاشان شوو بکاتەوە و پێویستیی بە بڕیاری دادوەریش ناکا، وە گوتوویانە: ئەوە ڕا و بڕیاری (**عمر بن الخطاب**) و هاوەڵانی دیکەشە خوا لێیان ڕازی بێ[٣].

پاش سەرنجدان و هەڵسەنگاندنی بیروڕا و بەڵگەکانی شەرعزانانیش، پێم وایە ڕای بەهێزتر و ڕاستتر ئەوەیە کە ژن پاش چاوەڕوانیی چوار ساڵ و بەسەربردنی عیددەی کۆچکردنی مێرد، بۆی هەبێ شوو بکاتەوە، لەبەر ئەم بەڵگانە:

١-خوا لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەی مێردەوە لەگەڵ ژنەکەیدا، فەرموویەتی: ﴿ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾ (البقرە: ٢٢٩)، جا ئەگەر

---

(١) كشاف القناع، ج٣، ص٢٦٧.

(٢) الشرح الصغير، للدردير، وحاشية الصاوي، ج١، ص٥٠٤.

(٣) الإختبارات الفقهية من فتاوي شيخ الإسلام ابن تيمية، ص٢٨١.

دەرفەتی دەستپێوەگرتنی پەسند (فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ) بەهۆی ونبوونی مێردەوە، فەوتاوە تەنیا ماوەتەوە دەستبەرداربوونی چاك (تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ).

دیارە مێردی ونبووش دواندن (خطاب)ی ئاراستە ناکرێ، بەڵام بێگومان حوکمڕان کە دادوەر (قاضي) نوێنەرێتی، لەو بوارانەدا هەم ئەرکیەتی و هەم مافیەتی، کە ئەو گیروگرفتانە چارەسەر بکات، وەك (الكمال بن الهُمام) لەو بارەوە گوتوویەتی: (إذا رأى القاضي المصلحة في الحكم الغائب وعليه، فَحكم فإنه يَنْفُذُ لأنه مُجتهدٌ فيه)[١].

واتە: وە ئەگەر دادوەر بەرژەوەندیی لەوە دابینی کە حوکم بۆ ونبوو بدات یان بەسەریدا بدات وە بڕیاری دا، بڕیارەکە جێ بەجێ دەکرێ، چونکە کۆششی تێدا کردوە.

٢-(ابن قدامة) گوتوویەتی: چەسپاوە کە (عمر بن الخطاب) (خوا لێی ڕازی بێ) بڕیاری داوە ژنی مێرد بزربوو لەگەڵ مێردەکەی لەیەك جیابکرێنەوە، وە ئەوە ڕای (علي وابن عمر و ابن عباس)ەو (عبدالله بن الزبير)یش (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەروای بڕیار داوە و نەشمان بیستوە، هیچ کەس ڕاجیایی هەبووبێ لەو بارەوە بۆیە یەکدەنگیی لەسەرە[٢].

٣-وەك پێشتریش باسمان کرد شەریعەت ڕازی نیە، هیچ کەس زیان لە هیچ کەس بدات بەتایبەت ژن و مێرد، بێگومانیش بە ونبوونی مێرد و بێ

(١) فتح القدير، ج٤، ص٤٤٠.
(٢) المغني لإبن قدامة، ج٧، ص٤٨٩.

سەروشوێن بوونی، ژن زەرەرمەند دەبێ، وەك چۆن بە لێدان و قسە پێگوتن و سەرجێی پێنەکرانی مێرد و ...هتد، زیانبار دەبێ، بگرە زیاتریش، بۆیە شتێکی ڕەوایە و ڕاستە کە ژنی مێرد ونبوو داوای جیابوونەوە بکات.

٤-ئەو دەقانەی کە لایەنگرانی ڕایەکەی دیکە بە بەڵگەیان دێننەوە، وەك:

أ-(إنها امرأتهُ حتى يأتيها البيانُ) رواه الدار قطني مرفوعاً.

ب-(هي أمرأته ابتليتْ فَلْتَصْبِر حتى يَسْتبين موت أو طلاق) رواه الحاكم والحماد عن علي مرسلاً، هیچیان لە ڕووی سنەدەوە هی پشت پێ بەستن نین و، لەڕووی مەتنیشەوە پێچەوانەی یەکدەنگیی هاوەڵانن و لە (علي)یشەوە لە ڕێی ڕاستەوە پێچەوانەی ئەوەگێڕراوەتەوە[1].

بەنسبەت جیابوونەوەی ژنی مێرد ونبووش لە مێردەکەی، هەرچەندە هەندێك لە زانایان ڕایان وایە پێویستی بە بڕیاری دادوەر هەیە، چونکە وەك زانراوە بڕیاری دادوەر، کێشەو گرفتە ڕاجیانی لەسەرەکان (القضايا المختلف فيها) یەکلایی دەکاتەوە، دیارە ئەم مەسەلەیەش ڕاجیایی تێدایە.

هەروەها بەنسبەت کاتی چاوەڕوانیی (زمن التربصّ)یش، وا پێدەچێ چوار ساڵ، ڕایەکی میانجیی و گونجاو بێ‌و، وجۆرێك لە یەکدەنگیی هاوەڵانیشی لەسەرە[2].

---

(١) المفصل.....، ج٨، ص٤٥٣، ٤٥٤.، المغني، لابن قدامة، ج٧، ص ٤٩١.

(٢) المفصل، ج٨، ص٤٥٥.

## سێیەم: لەکاتی گەڕانەوەی مێردە ونبووەکەدا، هاوسەرگیرییەکەیان چی لێ دێ؟!

دیارە لە کاتی گەڕانەوەی مێردی بێ سەروشوێن دا، ژنەکەی سێ حاڵەتی هەن:

أ-شووی نەکردبێتەوە.

ب-شووی کردبێتەوە و نەگوازرابێتەوە.

جـ-شووی کردبێتەوە و گوازرابێتەوەش.

### أ-ئەگەر ژنەکەی شووی نەکردبێتەوە:

ئەگەر شووی نەکردبێتەوە، ئەوە زانایان یەکدەنگن کە هەرچەندە دادوەر لە یەکیشی جیا کردبنەوە، ژنەکە هەر بە نیکاحی یەکەمی هاوسەری خۆیەوەیەتی، چونکە لەسەر بناغەی نەمانی مێردەکە دادوەر نیکاحەکەی هەڵوەشاندۆتەوە، مادام مابێتیش ئەو بناغەیە ڕووخاوە و ئەوەی لەسەریشی دامەزراوە هەرەسی هێناوە.

(إبن قدامة) لەو بارەوە گوتوویەتی: (فإن قَدِمَ زوجها الأول-المقصود- قبل أن تتزوَّج فهي امرأته، لأنَّنا إنما أبحْنا لها التزويج لأن الظاهر موتهُ، فإذا بان حيا انخرمَ ذلك الظاهر وكان النكاح بحالة كما لو شهدت البيِّنة بموته ثمَ بان حياً)[1].

واتە: ئەگەر مێردەکەی یەکەمی - بزبووە کە - بەر لەوەی شوو بکاتەوە گەڕایەوە، ئەوە هەر ژنی خۆیەتی، چونکە لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەڕواڵەت مردوە شووکردنەوەیان بۆ ڕەوا کردوە، بۆیە کە دەرکەوت زیندوە، ئەو

(١) المغني، ج٧، ص٤٩٢.

ڕواڵەتە هەرەس دێنێ و نیکاحەکە هەروەك خۆی دەبێ، وەك ئەوە کە شایەد، شایەدیی بدەن مردوە، پاشان دەربکەوێ کە هەر زیندووە.

## ب-ئەگەر ژنەکەی شووی کردبێتەوە، بەڵام نەگوازرابێتەوە

ئەوە زۆربەی هەرە زۆری نیزیك بە یەکدەنگیی زانایان ڕایان وایە، دیسان ڕایان وایە کە هەر ژنی مێردی یەکەمیەتی و نیکاحی مێردی دووەمی هەڵوەشاوەیە، چونکە بناغەکەی ڕووخاوە، وەك پێشتریش گوتمان[1].

## جـ-ئەگەر ژنەکەی شووی کردبێتەوە و گوازرابێتەوەش:

لەم حاڵەتەشدا مێردە یەکەمە بژاردەکەی سەرپشك دەکرێ، لەنێوان گێڕانەوەی ژنەکەیدا بۆ لای خۆی و، دەستبەردار بوونی ژنەکەی و بۆ گێڕانەوەی ئەو مارەییەی کە پێیداوە، چونکە لەو بارەوە (الزهري) لە (سعيد بن المُسَيب)ەوە کە (عمر و عثمان) گوتوویانە: (إن جاء زوجُها الأول خُيِّر بين المرأة والصَّداق الذي ساق هو)، ئەمەش (الجوزجاني والأثرم) گێڕاویانەتەوە و (ابن الزبير)یش حوکمی پێکردوە، وە نەشزانراوە کەس ڕای جیاواز بووبێ لە ڕۆژگاری خۆیاندا، بۆیە وەك (ابن قدامة) گوتوویەتی: (فكان إجماعاً) یەکدەنگیی لەسەر دروستبووە[2].

بەڵام ئەگەر مێردە یەکەمەکەی ژنەکەی نەویستەوە، ئەوە پێویستە مێردە دووەمەکەی بە نیکاحێکی تازە ژیانی هاوسەریی لەگەڵ دەست پێ بکاتەوە، چونکە بە گەڕانەوەی مێردەکەی نیکاحەکەیان بەتاڵ بۆتەوە و،

---

(١) المجموع شرح المهذب، ج١٦، ص٦١٦، وە المغني، ج٧، ص٤٩٢، وە: الشرح الكبير للدردير، ج٢، ص٤٨٠.

(٢) المغني، ج٧، ص٤٩٢-٤٩٣.

تەنیا بە وازلێهێنانی مێردە پێشووەکەی نابێتە هاوسەری مێردە تازەکەی[١].

## ١١-لەیەکترازاندن بەهۆی لەماڵ دوورکەوتنەوەی مێردە وە (التفریق لغیبة الزوج):

خوا پشتیوان بێ لە سێ بڕگەدا باسی لەماڵ دوورکەوتنەوەی مێرد (غیْبة الزوج) دەکەین، کە ژمارەیەك لە زانایان بە هۆکارێکی دیکەی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی (فسخ الزواج)یان داناوە:

یەکەم: پێناسەی لەماڵ دوورکەوتنەوەی مێرد.

دووەم: ئایا لەماڵ دوورکەوتنەوەی مێرد، پاساوی ژنە بۆ داواکردنی جیابوونەوە؟

سێیەم: ئایا ژنی بابای دیل و گیراو، وەك هی مێرد لەماڵ دوور، بۆیان هەیە داوای جیابوونەوە بکەن؟

### یەکەم: پێناسەی لەماڵ دوورکەوتنەوەی مێرد (غیبة الزوج):

وشەی (غَیْب) پێچەوانەی (شهادة)یە، کە یەکەمیان بە مانای ئامادەنەبوون (عدم الحضور) و، دووەمیان بەمانای ئامادەبوون (الحضور)ە.

ژنێك کە مێردی لە ماڵ نیە بە (مُغیْبَة) ناو دەبرێ، وەك لە فەرموودەدا هاتوە: (أمهلوا حتى تَمشطَ الشَّعثةُ وتستحدَّ المُغيبَة) واتە: مۆڵەت بدەن (کت و پڕ مەچنەوە ماڵ)، تاکو ژنی قژ ئاڵۆز سەری خۆی دادێنێ و ژنی

(١) المغني، ج٧، ص ٤٩٢، ٤٩٣ .

مێرد لەماڵ دوور، خۆی خاوێن دەکاتەوە.

مەبەستیش لە (لەماڵ دوورکەوتنەوەی مێرد) ئەوەیە کە پیاو لە ماڵەکەی و ژن و منداڵەکانی دوور بکەوێتەوە، بەڵام شوێنەکەی دیار و زانراو بێ و بگونجێ پەیوەندیی پێوە بکرێ، چونکەئەگەر شوێنەکە نەزانراو بێ، ئەوە بە ونبوو (مفقود) دادەنرێ.

## دووەم: ئایا لەما ڵدوورکەوتنەوەی مێرد، پاساوی ژنە بۆ داواکردنی جیابوونەوە؟

زانایان لەو بارەوە ڕاجیایی زۆریان هەیە و، بەشێکیان بە هیچ ڕەنگێك ئەو مافە بە ژن نادەن، وەك حەنەفییەکان و شافیعییەکان و زاهیرییەکان، بەشێکیشیان بە چەند مەرجێك ئەو مافەی پێدەدەن، وەك:

١-ئەگەر بەبێ بەڵگە و هۆکار (بدون عذر) نەگەڕێتەوە ماڵ.

٢-ئەگەر مێردەکەی هیچی نەبێ بژێوی ژن ومنداڵەکانی لێ دابین بکرێ.

٣-ئەگەر حوکمڕان و دادوەر ئاگاداری کردبێتەوە کە بێتەوە و کاتی بۆ دیاری کردبێ.

٤-ئەگەر ژنەکەی لەخۆی بترسێ تووشی زینا ببێ.

٥-ئەگەر ماوەی دیارنەبوون و لەماڵ دوورکەوتنەوەکەی، لە شەش مانگ یان ساڵێك زیاتر بوو.

هەڵبەتە بەشێکیشیان بەیەکێك لەم مەرجانە، یان بە دواونیان ئەو مافە بە ژن دەدەن، بۆ وێنە: حەنبەلییەکان دەڵێن: (لە دوای شەش مانگ زیاتر ژن بۆی هەیە ئەو داواکارییە ئاڕاستەی حوکمڕان و دادوەر بکات) [(١)].

---

(١) المفصل....، ج٨، ص٤٦٠-٤٦٤.

**ئەو ڕایەی بە پەسەندی دەزانین:**

ئەو ڕایەی لەو بارەوە بەپەسەند دێتە بەرچاو ئەوەیە کە:

یەك: پیاوێك کە پاساو (مبرر) ێکی ڕەواو و ئیقناعکەری نیە بۆ نەگەڕانەوەی، پاش زیاتر لە شەش مانگ، ژنەکەی بۆی هەیە داوا لە داودوەر بکات و، ئەویش بابای مێردی ئاگادار بکاتەوە ، ئەگەر ئامادەنەبوو، دادوەر نیکاحەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.

دوو: پیاوێك کە پاساوو بەڵگەیەکی ڕەوای هەیە بۆ نەگەڕانەوەی دادوەر، دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ زیاتر و داواکردنی ژنەکەی، ئاگاداری دەکاتەوە و بە گوێرەی یاسا و هەل و مەرجەکەی، کاتی بۆ دیاریی دەکات، کە هەرچۆن بێ، نابێ لە چوار ساڵ زیاتر بێ و دەشگونجێ کەمتر بێ، جا ئەگەر هەر نەگەڕایەوە، نیکاحەکەی هەڵدەوەشێتەوە و ژنەکەی ئازاد دەبێ بۆ شووکردنەوە[1].

## سێیەم: ئایا ژنی بابای دیل و گیراو، وەك هی مێرد لەماڵ دوور، بۆیان هەیە داوای جیابوونەوە بکەن؟!

لەو بارەشەوە زانایان ڕاجیایی زۆریان هەیە و، هەندێکیان بە مەرجیشەوە ڕایان نیە، کە ژنی بابای دیل (أسیر) و ژنی بابای گیراو (مسجون) ئەو مافەیان هەبێ، هەندێکیشیان بە مەرجێك - وەك مەترسیی زینا- یان زیاتر ئەو مافەیان بۆ ئەو جۆرە ژنانە سەلماندوە و، هەندێکیشیان بەبێ هیچ مەرجێك ئەو مافەیان بۆ سەلماندوون، کە یەکێك لەو زانایانە (ابن تيمية)یە

(١) المفصل، ج٨، ٤٦٥-٤٦٦.

وەك لەو بارەوە گوتوویەتی:

(وحصول الضّرر للزوجة بترك الوَطء مُقْتضٍ للفسْخ بكل حال، سواء كان بقصد من الزوج أو بغير قصد...وعلى هذا: فالقول في امرأة الأسير والمحبوس ونحوهما ممّن تَعذُّر انتفاعُ امرأته به، اذا طلبت فُرقَتَهُ، كالقول في إمرأة المفقود بالإجماع كما قال أبو محمد المقدسي)[(١)].

واتە: وە پەیدابوونی زیان بۆ ژن لە سۆنگەی جیماع نەکردنەوە، بەهەر شێوەیەك بێ، خوازیاری هەڵوەشانەوە (فسخ)یە، چ بە ویستی مێرد بێ، چ بەپێی ویستی وی....ئنجا لەسەر بناغەی ئەمە: حوکمی ژنی دیل و گیراو و هاووێنەیان، لەوانەی کە ناگونجێ ژنەکانیا سوودیان لێ ببینن، هەر کات داوای کرد جیابێتەوە، وەك حوکمی ژنی مێرد بزربوو وایە، بەیەکدەنگیی زانایان وەك (ابو محمد المقدسی) گوتوویەتی.

دیارە پێشتریش باسمان کرد، کە ڕای پەسند و بەهێز ئەوەیە، کە ژنی بابای بزربوو، پێویستە چوار ساڵ چاوەڕێ بکات و پاشان عیددەی مێرد مردوو بشوات، وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی: (والصواب في امرأة المفقود مذهب عمر بن الخطاب وغيره من الصحابة (رضي الله عنهم) وهو: انها تتربّص اربع سنوات ثم تعتدُّ للوفاة ويجوز أن تتزوج بعد ذلك)[(٢)].

پێشم وایە ئەم ڕایە ڕاست و پەسندە و وێڕای بەڵگەداربوونیی، لەگەڵ ئامانجە شەرعییەکان (المقاصد الشرعیە)ش دا زۆر باش گونجاوە.

---

(١) الإختيارات الفقهية، ص٢٤٧.
(٢) الإختيارات الفقهية، ص٢٨١.

## ١٢-لەیەکترازندن بەهۆی مەسرەف نەکێشانەوە (التفریق لعدم النفقة):

لە سێ بڕگەدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین:
یەکەم: ئایا مەسرەف نەکێشانی مێرد و بۆ ژنەکەی، پاساوە بۆ داواکردنی جیابوونەوەی؟
دووەم: مەرجەکانی لەیەکترازان بەهۆی مەسرەف نەکێشانەوە.
سێیەم: جۆری لەیەکترازان بەهۆی مەسرەف نەکێشانەوە.

### یەکەم: ئایا مەسرەف نەکێشانی مێرد بۆ ژنەکەی پاساوە بۆ داواکردنی جیابوونەوەی؟

شەرعزانان لەم مەسەلەیەشدا ڕاجیایی و مشت ومڕی زۆریان هەیەو، هەرچی کەمینەن کە حەنەفییەکان و زاهیرییەکان وجەعفەرییەکانن، ڕایان وایە کە ژن ئەو مافەی نیەو، چەند دەقێکی گشتیش لەو بارەوە بەبەڵگە دێننەوە، کە من پێم وایە ناگونجێ بکرێنە بەڵگەی ئەو مەسەلەیە، بۆ وێنە:

١-﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ﴾ (البقرە: ٢٨٠، واتە: وە هەرکەسێك تەنگدەست بوو، با دوابخرێ و چاوەڕێی بکرێ هەتا کاتی ئاسانیی.

بەڵام پێم وایە قەرزدار بوونی مرۆڤ بۆ خەڵکی جیاوازە لە مەسرەف کێشانی ماڵ و خێزان، چونکە بێگومان بابای خاوەن قەرز یەکی ناکەوێ، ئەگەر ماوەیەك چاوەڕێی قەرزەکە بکات، بەڵام ژن و خێزان

پەكیان دەكەوێ.

٢- ﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ﴾ (الطلاق:٧).

واتە: با هەر خاوەن داراییەك لەقەدەر هەبوونەكەی خەرج بكات، وە هەركەس بژێوی لێ وە تەنگ هات، با لەوە خەرج بكات كە خوا پێیداوە (واتە: لە قەدەرخۆی) خوا جگە لەوەی پێیداوە لە هیچ كەس داوا ناكات.

منیش پێم وایە ئەم ئایەتە ناكرێتە بەڵگەی مەسەلەی ناوبراو، چونكە ئایەتەكە باسی ئەوە دەكات كە هەر كەسە لەقەدەر حاڵ و گوزەرانی مەسرەفێكێشانی ماڵ و خێزانی لەسەر فەرزە، جا دیارە ئێمەش هەروا دەڵێین، بەڵام لێرەدا قسەی لەسەر كەسێكە بە ئانقەست یان هەر بە ناچاریی، ناتوانێ گوزەرانی ماڵ وخێزانی دابین بكات، ئایا بابایەكی وا ژنەكەی مولزەمە بە نەمر نەژیی هەر لەگەڵی بێ، یان مافی خۆیەتی داوای لێ جیابوونەوەی بكات؟!

٣-﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ (النور: ٣٢).

واتە: وە هاوسەرگیریی بۆ بێ هاوسەرەكانتان ئەنجام بدەن، هەروەها بۆ كۆیلەو كەنیزەكە چاك و شایستەكانتان، ئەگەر هەژاریش بن، خوا لەبەخششی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەكات..

منیش دەڵێم: ئەم ئایەتەش بەبەڵگەی ئەو مەسەلەیە ناشێ، چونكە: لەلایەك خوای كاربەجێ ئاوا ئامۆژگاریی ئ٦ەوانە دەكات كە خەڵكی

داوای ژنیان لێدەکات، کەلەبەر هەژاریی، لەخزمایەتی کردن و ژن پێدانیان نەسڵەمنەوە، بەڵام هەر لەهەمان سوورەت و لەهەمان سیاقدا ئامۆژگاریی ژنهێنەرانیش دەکات کە خۆیان پاك ڕابگرن، هەتا توانای دارایی و ژن و ماڵ بەڕێوەبردنیان دەبێ: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾ (النور: ٣٣).

واتە: وە ئەوانەی توانای دارایی ژنهێنانیان نیە، با خۆیان پاك ڕابگرن، هەتا خوا لەبەخششی خۆی بێ نیازیان دەكات..

بەڵام زۆرینە کە وێڕای (**عمر و علي و أبوهريرة**) خوا لێیان ڕازی بێ کە مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و هەرکام لە (**سعد بن المُسَيِّب و الحسن و عمر بن عبدالعزيز و ربيعة و حماد و مالك و يحيى القطان و عبدالرحمن بن مهدي و الشافعي و إسحاق و أبوعبيد و أبوثور**)یشیان لەنێودان، ڕایان وایە کە ژن مافی داواکردنی جیابوونەوەی هەیە، لە کاتێکدا کە مێرد توانای دابین کردنی بژێو و مەسرەفی نابێ[1].

دیارە گەلێك شتیش بەبەڵگەی ڕاستیی ڕایەکەیان دێننەوە، کە منیش ڕایەکەیانم پێ ڕاست و پەسەندە، ئەمەش چەند نموونەیەك لە بەڵگەکانیان:

١-خوا فەرموویەتی:﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ (البقرة: ٢٢٩). ئاشکراشە کە مەسرەف نەکێشانی هاوسەر، گرتنە خۆی پەسند ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ﴾ نیە، کەواتە: پێویستە دەستبەرداربوونی چاکەکارانە ﴿تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ ببێ.

---

(١) (المفصل..) ج٨، ص٤٧٦، لە: (حاشية الدسوقي على الشرح الكبير) للدردير، ج٢، ص٥١٨.



٢-خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ۚ﴾(البقرة: ٢٣١). واتە: وە بەزیانلێدانەوە مەیانهێڵنەوە تاکو ستەم بکەن، هەرکەسیش ئەوە بکات ئەوە مسۆگەر ستەمی لەخۆی کردوە..

٣-پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (تقول المرأةُ إمّا أن تُطْعمَني إما أن تُطَلِّقَني) رواه البخاري، واتە: ژن دەڵێ: (یانی بەمێردی) یان خواردنم بدەیە، یان تەڵاقم بدە.

کەواتە: ژن بۆی هەیە لەسەر مەسرەف نەکێشرانی لەلایەن مێردیەوە، داوای جیابوونەوە بکات.

٤-(عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنه) أن عمر بن الخطاب كتب الى أمُراء الأجناد في رجال غابوا عن نسائهم، يأمرهم أن يُخبِروهم أن يُنفقوا أو يُطَلِّقوا،بَعثوا ما حبِسوا) رواه البيهقي في السنن الكبرى.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی رازی بێ) بۆ فەرماندەکانی سەربازان،لەبارەی پیاوەنێکەوە کە ژنەکانیان بەجێ هێشتوە، نامەی نووسی، فەرمانی پێکردن کە پێیان ڕابگەیەنن: یان مەسرەفییان بکێشن یان تەڵاقییان بدەن، ئەگەر تەڵاقییان دان، دەبێ هەقی ئەو ماوەیان بۆ بنێرن، کە بژێویان لێ گرتوونەوە.

## دووەم: مەرجەکانی لەیەکترازان بەهۆی مەسرەف نەکێشانەوە:

کاتێك ژن مافی داواکردنی لەیەکترازانی هەیە، بەهۆی دابین نەکرانی بژێویەوە لەلایەن مێردیەوە، کە چەند مەرجێك هەبن، بەلای زۆریەی

زانایانەوە:

**یەك: دەبێ بەنیكاحێكی ڕاست بووبێتە ژنی مێردەكەی:**

چونكە ئەگەر بەنیكاحێكی ڕاست (نكاح صحيح) نەبووبێتە هاوسەری، ئەوە پێویستە نیكاحەكەی هەڵبوەشێنرێتەوەو بەردەوام نەبێ.

**دوو: دەبێ مافی نەفەقە دابین كردنی،لەسەر مێردەكەی هەبێ:**

چونكە جاری وایە ژن نیكاحەكەی ڕاست و دروستە، بەڵام مافی مەسرەفكێشرانی لەسەر مێردەكەی نیە، لەبەرئەوەی یاخی (ناشز)یە.

**سێ: دەبێ لەكاتی مارەكردنیدا، نەیزانیبێ كە مێردەكەی هەژارە:**

چونكە ئەگەر زانیبی و پێی ڕازی بووبێ، بەڕای بەشێك لەزانایان، بۆی نیە دوایی بەهۆی هەژاریی و تەنگدەستیەوە داوای جیابوونەوە بكات.

بەڵام بەشێكیان دەڵێن: هەرچەندە لەسەرەتاوە زانیبی و ڕازیش بووبێ دوایی هەربۆی هەیە بەوهۆیەوە داوای جیابوونەوە بكات، ئەوە ڕای شافیعییەكان وحەنبەلییەكانیشە[1].

**چوار: دەبێ هیچكەس نەبێ كەهاوكاریی مێردەكەی بكات، بۆ دابینكردنی نەفەقە:**

ئەمیش مەرجێكی دیكەی ماف پێدرانی ژنە بۆ داواكردنی جیابوونەوە بەهۆی تەنگدەستیی (إعسار)ی مێردەكەیەوە، بەڕای زۆرێك لەزانایان كە مالیكییەكان و حەنبەلییەكانیان لەنێودان.

بەڵام هەندێكیان - بۆ وێنە: شافیعییەكان- دەڵێن: هەبوونی بابایەكی

---

(١) (المفصل..) ج٨، ص٤٨٨.

بەخشەر (مُتَبَرِّع) ئەومافە لەژن وەرناگرێتەوە، چونكە ڕەنگە منەتی تێدابێ و ژنیش ناچار نیە منەتی خەڵك هەڵبگرێ.

واش پێدەچێ ڕای یەكەم ڕاستتر بێ، بە تایبەت ئەگەر بەخشەر (مُتَبَرِّع)ەكە، خزمی مێردەكەی بێ [1].

### پێنج: بەرزكردنەوەی داوا بۆلای دادوەر:

ئەمیش مەرجێكی دیكەیە كە زۆربەی زانایان لەسەری ڕێككەوتوون.

(إبن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (**وكلّ موضعٍ ثبت لها الفَسْخُ لأجل النفقة، لم يَجُزْ الاّ بقرار الحاكم، لأنه فَسْخٌ مختلف فيه فأفتَقرَ الى الحاكم كالفسخ بالعُنَّة، ولا يجوز للحاكم التفريق الاّ ان تطلبَ الزوجة ذلك..**) [2].

واتە: وە هەركاتێك ژن مافی هەڵوەشاندنەوەی نیكاحی بۆ چەسپا بەهۆی نەفەقەوە، دروست نیە، مەگەر بەبڕیاری دادوەر، چونكە ئەوە فەسخێكی ڕاجیایی هەڵگرە، بۆیە حەوجێی بەدادوەرە وەك فەسخ بەهۆی جیماع پێ نەكرانەوە، وە دادوەریش دروست نیە لەیەكیان جیابكاتەوە، مەگەر ژنەكە داوای ئەوە بكات.

## سێیەم: جۆری لەیەكترازان بەهۆی مەسرەف نەكێشانەوە:

(شەرعزانان لەوبارەوە ڕاجیایی یان هەیە، بەشێكیان كە شافیعییەكان و حەنبەلییەكانیان لەنێودان، دەڵێن: ئەو جیاكردنەوەیە هەڵوەشاندنەوە (فَسْخ)یە.

---

[1] (المفصل..) ج٨، ص٤٨٨-٤٩٠.

[2] المغني، ج٧، ص٥٧٦، ٥٧٧.

بەشێکیشیان کە مالیکیەکانیان لەنێودان، دەڵێن: ئەو جیاکردنەوەیە بە تەڵاقدانێکی گێڕانەوە (طلاق رجعي) دادەنرێ [1].

واش دێتە بەرچاو ڕای یەکەم ڕاستتر بێ، چونکە لەچنگ بێ بژێویی خۆی دەرباز دەکات، واباشە یەکجار قوتاری بێ، نەك بێنەو بەرەی زۆری پێ بکرێ.

## ١٣-لەیەکترازان بەهۆی زیانلێکەوتن لەمارەییدا (التفريق للغُبنِ في المَهْر):

هۆکارێکی دیکە کەپاساوی هەڵوەشاندنەوە ی نیکاحە - بەڕای هەندێك لەزانایان-بریتییە لە زیانلێکەوتن (الغُبن) لەئەندازەی مارەییدا.

ئنجا ئێمە لەسێ بڕگەدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین:

یەکەم: پێناسەی زیانلێکەوتن لەمارەییدا (الغبن في المهر):

دووەم: بیروڕای مەزەبەکان لەوبارەوە.

سێیەم: ئەوڕایەی بەپەسەندی دەزانم.

### یەکەم: پێناسەی زیانلێکەوتن لەمارەییدا (الغبْن في المَهْر):

وشەی (غُبْن) بەمانای ناتەواویی و کەمیی (نقص) دێ، دەگوترێ: (غَبِنَهُ في البيع: نَقَصَهُ) [2].

واتە: لەکڕین و فرۆشتندا کەمی پێداو زیانی لێدا، هەربۆیەش من بەکوردیی (غُبْن)م بە زیانلێدان ماناکردوە.

---

(1) (المفصل..) ج٨، ص٤٩٢-٤٩٣.

(2) المعجم الوسيط، ص٦٤٣، ٦٤٤.

لەلای شەرعزانان (فقهاء)یش زیانلێدان لەمارەییدا (**الغُبْن في المهر**) ئەوەیە کە مارەیی ئافرەت بەکەمیی دابنرێ، بەشێوەیەك کە بەئەندازەیەك لە مارەیی هاو وێنە (**مَهْر المِثْل**) کەمتر بێ، کەخەڵك چاوپۆشیی (تسامح) لێ نەکەن.

هەروەها هەندێك لە زانایان زاراوەی زیانلێدانی ناقۆڵا، یان زیانلێدانی لەسنوور دەرچوو (**الغُبْن الفاحش**)یان بۆ ئەو زیانلێدانە لەمارەییدا داناوە، کە گرێبەستی هاوسەرگیریی پێ هەڵدەوەشێتەوە.

(إبن عابدین)یش ئاوا پێناسەی (**الغُبْن الفاحش**)ی کردوە:

(**هو مالا يتغابن الناسُ فيه أي لا يَتَحمَّلون الغُبْنَ فيه، احترازاً عن الغُبْن اليسير وهو ما يتغابنون فيه أي يتحملونه**)[1]. واتە: ئەوەیە کە خەڵکی زیانلێکەوتنی تێدا قبووڵ ناکەن، وەك جیاکردنەوە لە زیانلێکەوتنی کەم، کە خەڵکی بۆیان تەحەمول دەکرێ.

ئنجا زانایان لەبارەی ئەندازەی (**الغُبْن الفاحش**)یشەوە ڕاجیایی زۆریان هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: ئەوەیە کە لەنیوەی مارەیی (نصف المهر) زیاتر بێ، وە هەندێکیان گوتوویانە: ئەوەیە کە لە دەیەك (**العُشْر**) زیاتر بێ[2].

هەندێکیشیان گوتوویانە: ناگونجێ ئەندازەی زیانلێکەوتنی لەسنوور دەرچوو مەزەنە بکرێ[3]، شایانی باسیشە کە ئەو زیانلێدانە لەمارەییدا، دەگونجێ پەیوەندیی بە کچی گچکە (**الصغيرة**)ە وە هەبێ، لەکاتێکدا کە

---

(1) در المختار على الدرّ المختار، ج٣، ص٩٦.

(2) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(3) شرح الأحكام الشرعية، للأبياني، ج١، ص٧٢.

مارەییەکەی لەهی هاووێنەکانی کەمتر دەبێ، وە دەشگونجێ پەیوەندیی بەکوڕی گچکە (الصَّغير)ەوە هەبێ ئەویش ئەوەیە کە مارەیی مارەکراوەکەی لەمارەیی هاووێنەکانی زیاتر بێ[1]، چونکە لەحاڵێکی وادا هەرکامێکیان بەهۆی مارەییەوە زیانی پێکەوتوە.

## دووەم: بیروڕای مەزهەبەکان لەوبارەوە:

زانایان و مەزهەبەکانیان لەوبارەوە، ڕاجیایی زۆریان هەیە، کە ئایا زیانلێکەوتن لە مارەییدا پاساوی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحە، یان نا؟ وە ئەگەر: ئا، بەچ مەرجێك؟

### ١-حەنەفییەکان[2]:

هەرچی ئەمانن ئەم مەسەلەیە بۆسێ حاڵەت دابەش دەکەن:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر باب یان باپیر (بابی باب) هاوسەرگیریی بۆ کوڕ یان کچی گچکە بکەن، یان کچی شێتیان بەشوو بدەن، یان ژن لەکوڕی شێتیان مارە بکەن، مادام بەمرۆڤی خراپ نەناسرابن، ئەگەر بەشێوەی زیانلێدانی ناقۆلاش بێ لەمارەییدا، (أبو حنيفە) دەڵێ: نیکاحەکە ڕاستەو مافی هەڵوەشێنرانەوەی تێدا نییە، بەڵام (أبو يوسف و محمد) دەڵێن: ئەوجۆرە مارەکردنە بەتاڵەو دانامەزرێ، کەواتە: هەڵوەشاندنەوەی پێویستە.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر جگە لە باب و باپیر ئەو هاوسەرگیرییە ئەنجام بدەن، بۆ وێنە: برا یان مام، ئەوە ئەگەر هاوسەرگیرییەکە لەگەڵ هاوکووف

---

(1) رد المختار، ج٣، ص٩٦.
(2) الفتاوي الهندية، ج١، ص٢٩٣ و ٢٩٤، وە: (الهداية وفتح القدير) ج٢، ص٤٠٨.

دابوو، وە بەمارەیی هاووێنە (مَهْر المثْل) بوو، ئەوە نیکاحەکە دامەزراوە، ئەگەرنا دانامەزراوەو، دەبێ فەسخ بکرێتەوە.

حاڵەتی سێیەم: ئەگەر ئافرەتی باڵغ بەزیانلێکەوتنێکی ناقۆڵا لەمارەییدا (غبن فاحش في المَهْر) خۆی لەپیاوێکی هاوکووف مارەکرد-کە ئەوە لەمەزهەبی حەنەفییدا ڕەوایە-سەرپەرشتیار (ولي)ەکەی بۆی هەیە نیکاحەکەی هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام پێویستە ئەو هەڵوەشاندنەوەیە لەلای دادوەر بێ.

## ٢-مالیکییەکان:

ئەمانیش ڕایان وایە کە ئەندازەی مارەیی، هەرچەندی بێ، مادام باب هاوسەرگیریی بۆ کچەکەی ئەنجام دابێ، ئەگەر گەورەو باڵغیش بێ مافی هەڵوەشاندنەوەی نییە.

## ٣-شافیعییەکان:

ئەمانیش ڕایان وایە کە کچی گچکە، ئەگەر لەسەر کەمتر لەمارەیی هاووێنە (مَهر المثْل) مارە بکرێ، لەلایەن بابی یان باپیریەوە، ئەوە مافی خۆیەتی پاش باڵغ بوون، داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی بکات.

بەڵام ئەگەر باڵغ بوو، وە بەڕەزامەندیی خۆی مارەکرابوو لەلایەن سەرپەرشتیاریەوە، هەرچەندە لەمارەیی هاووێنەش کەمتر بێ، لەسەر ئەوە نیکاحەکەی هەڵناوەشێنرێتەوە[١].

## ٤-حەنبەلییەکان:

ئەمانیش دەڵێن: ئەگەر مارەبڕ (مُزَوِّج) باب بێ، ئەوە مارەیی

---

(١) مغني المحتاج، ج٣، ص١٤٩.

هەرچەندێکی بێ و کچەکەش گچکە بێ یان باڵغ، نیکاحەکە درووستە.
بەڵام ئەگەر جگە لە باب بێ، ئەگەر خۆی ڕازی بێ، با مارەییەکەی لەمارەیی هاووێنەش کەمتر بێ نیکاحەکە هەر دامەزراوە، بەڵام ئەگەر بەبێ مۆڵەتی خۆی بێ و مارەییەکەشی لەهی هاووێنە کەمتربێ، ئەوە پێویستە مێردەکەی وەك مارەیی هاووێنە بۆی تەواو بکات و سەرپەرشتیار (ولي)ەکەشی ئۆباڵدار (ضامن) دەبێ[1].
منیش دەڵێم:
وەك پێشتر خستمانەڕوو مارەکردنی ئافرەت بەبێ ڕەزامەندیی خۆی، دروست نیە.

### ٥-زەیدییەکان:

ئەمانیش ڕایان وایە کە ئەگەر باب و باپیر ئافرەت مارە بڕن، مارەییەکەی هەرچەندێك بێ، ئەگەر کچی گچکە بێ، نیکاحەکەی هەر دروستە، بەڵام ئەگەر گەورەو باڵغ بێ و مارەییەکەشی بەبێ ڕەزامەندیی خۆی لەمارەیی هاووێنە کەمتر بێ، ئەوە مارەیی هاووێنەی دەکەوێ و نیکاحەکەشی دروستە[2].

### ٦-جەعفەرییەکان:

ئەمانیش دەڵێن: ئەگەر باب و باپیر کە هاوسەرگیرییان بۆ کوڕ یان کچی گچکە کردوە، پێش گرێبەست (عَقد)ەکە بەئینسانی باش ناسرابوون، ئەوە نیکاحەکە دروستە، هەرچەندە بەشێوەی زیانلێکەوتن بێ لەمارەییشدا،

---

(١) المغني، لابن قدامة، ج٦، ص٦٨٧.
(٢) شرح الأزهار، ج٢، ص٢٧٧.

بەڵام کە باڵغ بوون، مافی ئەوەیان هەیە داوای مارەیی هاووێنە (**مَهْر المثل**) بکەن، بەڵام مافی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکەیان نیە.

بەڵام ئەگەر باب و باپیر بەباش نەناسرابوون ئەوە پاش باڵغ بوون، ئەگەر ڕازی بوون باشە، ئەگەرنا مافی بەتاڵکردنەوەی نیکاحەکەیان هەیە[١].

**سێیەم: ئەو ڕایەی بەپەسەندی دەزانم:**

ئەوەی من بەڕاست و پەسەندی دەزانم لەوبارەوە لەم چەند وردە بڕگەیەدا دەیخەمە ڕوو:

١-هەرچەندە هاوسەرگیریی ئەنجامدانی باب و باپیر بۆ کوڕو کچکە دروست (جائز)یش بێ، بەڵام - وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە - شتێکی پەسەند نیە، چونکە گرفت و کێشەی زۆر لەوجۆرە هاوسەرگیرییانە دەکەونەوە.

٢-هاوسەرگیریی ئەنجامدانی باب بۆ کوڕ، یان کچی باڵغ بەبێ مۆڵەت و ڕەزامەندیی خۆیان، دروست نیە وەك پێشتر لەخاڵی شەشەمدا {سەرپشك بوون بۆ هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی لەکاتی باڵغ بووندا (خیار البلوغ)} باسمان کرد.

٣-ئەگەر باب یان باپیر هاوسەرگیریی (زواج)یان بۆ کوڕو کچی گچکە یان باڵغ کردبێ و، مارەییەکە لەوجۆرە بێ کە زیانلێدان (غُبْن)ی تێدابێ، ئەگەر خۆیان ڕازی بن، ئەوە هیچ گرێ و گۆڵی تێدا نیە، ئەگەرنا مافی خۆیانە لەڕێی دادوەرەوە هەڵی بوەشێننەوە، چونکە زەوتکردنی ئیرادەی مرۆڤ و شت لەسەر فەرزکردنی، ئەگەر بەنیازی چاکەشەوە بێ، پێچەوانەی ئازادیی و سەربەستی مرۆڤەو، جۆرێکە لە کۆیلە کردن (إستعباد)ی مرۆڤ.

---

[١] الأحكام الجعفرية في الأحوال الشخصية، للشيخ عبدالكريم الحَلَبي، المادة: ٤٥.

## ١٤-لەیەكترازاندن بەهۆی مارەیی نەدانەوە (التفريق للإعسار بالمَهْر):

ئەمیش لەلای بەشێك لەزانایان، یەكی دیكەیە لەهۆكارەكانی هەڵوەشاندنەوەی نیكاح، بەشێكیشیان بەپاساوی هەڵوەشاندنەوەی نیكاحی نازانن.

ئەمەش ڕوونكردنەوەی هەڵوێستی هەندێك لەزانایان و مەزهەبەكان لەوبارەوە:

هەركام لە حەنەفییەكان و مالیكییەكان و شافیعییەكان و حەنبەلییەكان، ڕایان وایە كە پاش گوازرانەوە (بعد الدخول)، ژن بۆی نیە بەپاساوی مارەیی پێ نەدرانی لەلایەن مێردەكەیەوە، داوای هەڵوەشاندنەوە نیكاحەكەی بكات[1].

بەڵام پێش گوازرانەوە (قبل الدخول):

شافیعییەكان دەڵێن: بۆی هەیە، بەڵام بەبڕیاری دادوەر و پاش ئیسپات بوونی داوا (دعوی)ی ژنەكەو، مۆڵەتدانی ماوەی سێ ڕۆژ بەپیاوەكە، بەڵكو لەوماوەیەدا بتوانێ ئامادەی بكات[2].

مالیكییەكانیش دەڵێن: ئەگەر بابای مێرد هیچ كام لەنەفەقەو مارەیی بۆ ژنەكەی دابین نەكردبن، بۆی هەیە داوای هەڵوەشاندنەوەی نیكاحەكەی بكات، بەڵام ئەگەر یەكێكیانی بۆ دابین كردبێ بۆی نیە[3].

---

(١) (المفصل..) ج٨، ص٥٠١-٥٠٢.

(٢) المجموع شرح المهذب، ج١٥، ص٥٣٣-٥٣٤.

(٣) الشرح الكبير وحاشية الدسوقي، ج٢، ص٢٩٩-٣٠٠.

بەڵام حەنەفییەکان(١) و حەنبەلییەکان(٢) دەڵێن: ژن بۆی نیە بەهۆی پێنەدرانی مارەییەوە، داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی بکات. ئەوەندە هەیە حەنەفییەکان دەڵێن، بەڵام ژنەکەش بۆی هەیە لەبەرانبەر ئەوەدا خۆی تەسلیمی مێردەکەی نەکات-واتە: ئامادە نەبێ بۆی بگوازرێتەوە-.
منیش وای دەبینم کە ژن بۆی نەبێ بەپاساوی مارەیی پێنەدران، داوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی بکات، بەڵام بەمەرجێك هاوسەرەکەی درۆی لەگەڵ نەکردبێ، و قۆڵی نەبڕیبێ و، بەفرووفیشاڵ فریوی دابێ، ئەگەرنا لەوکاتەدا پێم وایە ئافرەت مافی خۆیەتی و جێی خۆشیەتی، کە خۆی لەتەڵەو داوی بابای وا دەرباز بکات.

## ١٥-لەیەکترازاندن بەهۆی لەگەڵ جووتنەبوونەوە (التفريق لعدم الوطء):

ئەمیش بەلای بەشێك لەزانایانەوە، هۆکارێکی دیکەی لەیەکترازاندنی ژن و مێردە ،بەهۆی داواکردنی ژنەوەو لەرێی دادوەرەوە.
شایانی باسیشە هەرکام لە مالکییەکان و حەنبەلییەکان ئەو رایەیان هەیە، کە ژن بەهۆی پشتگوێ خرانی لەلایەن مێردەکەیەوە لە رووی جووتبوونەوە، بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات.
بۆ وێنە: لەکتێبی (مختصر الخليل)دا هاتوە، کەهی مالکییەکانە:
(واجتهد الحاكم وطلّق على الزوج في حَلفه: لأعْزلَنَّ، او ترك الوطء ضرراً

---

(١) الهداية، ج٣، ص٣٣٤.
(٢) الهداية، ج٣، ص٣٣٤.

وإن غائباً)(١). واتە: وە دادوەر کۆشش دەکات و ژنی ئەو مێردە تەڵاق دەدات کە سوێندی خواردوە، ناچمەلای ژنەکەم، یان مێردێك کەبۆ زیانلێدان (لەگەڵ ژنەکەیدا) جووت نابێ، هەرچەندە لەماڵیش نەبێ.

هەروەها لەکتێبی: (کشاف القناع)دا هاتوە، کەهی حەنبەلییەکانە:

(ويجب على الزوج أن يَطأ زَوْجَته في كل أربعة أشهر مرّةً إنْ لم يكن عُذْرٌ، فإن أبى. لك – أي الوطء بعد انقضاء الأربعة أشهر – فَرَّقَ بَيْنهما بطَلَبها كالمولي، وكما لو منع النفقة وتَعَذَّرَتْ عليه من قِبَله)(٢).

واتە: وە لەسەر مێردە هەرچوار مانگ جارێك لەگەڵ ژنەکەی جووت ببێ، مادام عوزری نەبێ، جا ئەگەر ملی بۆئەوە نەدا- واتە: هەتا چوار مانگەکە تێپەڕین نەچووە لای- ئەوە لەسەر داوای ژنەکە لەیەك جیا دەکرێنەوە، وەك بابای ئیلائکەر، وە وەك چۆن ئەگەر مێرد نەفەقەی لەژنەکەی گرتەوەو نەگونجا بژێوی لەلایەن مێردەکەیەوە بۆ دابین بکرێ.

(ابن تَيمية)ش لەوبارەوە گوتوویەتی: (وحصول العُذْر للزوجة بِتَرك الوطء مُقْتَضٍ للفَسْخِ بكل حال، سواء كان بقصدٍ من الزوج أو بغير قَصْدٍ..)(٣).

واتە: وە زیانبار بوونی ژن بەسەرجێی نەکران، مایەی هەڵوەشاندنەوەیە لەهەموو حاڵاندا، جا یەکسانە مێردەکە بەئانقەست لەگەڵی جووت نەبێ یان نا.

هەڵبەتە منیش ئەم ڕایەم زۆر پێ ڕاست و بەجێیە، وەك پێشتریش قسەمان

---

(١) الشرح الكبير على مختصر الخليل، ج٢، ص٤٣١.
(٢) كشاف القناع، ج٣، ص١١٤.
(٣) الإختيارات الفقهية، ص٢٤٧.

لەبارەوە کردوە، بەڵام تێبینیم لەسەر ئەو قسەیە هەیە کە دەڵێ: بەچوار مانگ جارێك لەسەر مێرد پێویستە لەگەڵ ژنەکەدا جووت ببێ.

چونکە من پێم وایە - وەك لەباسی مافەکانی ژن و مێرد لەسەر یەکدیی لەبەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد - کە بەئەندازەی پێویستی ژن و پارێزرانی، لەسەر مێردی پێویستە، مادام لەتوانایدا هەبێ و بۆی بگونجێ، چونکە ئەم مەسەلەیەش لەبازنەی ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ (النساء: ١٩)، دایە، وەك لەشوێنی ئاماژە بۆکراودا بەدرێژیی باسمان کردوە.

## ١٦-لەیەکترازاندن بەهۆی ناشایستەییەوە (التفريق لِعَدم الكفاءة):

زۆربەی هەرە زۆری زانایان، شایستەیی (الكفاءَة) بەشێوەیەك لەشێوەکان بەمەرج دەگرن بۆ بنیاتانی خێزان، بەتایبەت هاوشانیی لە ڕووی دینداریی و طاعەتەوە، بۆ نموونە: (الصّاوي) لەو بارەوە گوتوویەتی: (فَمُخالطة الفاسِق مَمنوعةٌ وهَجرُهُ واجِبٌ شَرْعاً، فكيف النكاحُ) [١]، واتە: تێکەڵی کردنی بابای لارێ (گوناهبار) قەدەغەیەو، پشتگوێ خستنی قسە لەگەڵ نەکردنیشی پێویستە لەشەرعدا، چ جای هاوسەرگیریی (لەگەڵ بکرێ).

جا ئێمە لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەخاڵی (٨)ی بەشی چوارەمی ئەم کتێبەدا: (هاوکووفیێتیی نێوان ژن و مێرد) باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوە، لێرە دووبارەی ناکەینەوە و، هەر بەکورتیی و لەسێ بڕگەدا، لە ڕووی ڕەوا بوونو ڕە وانەبوونی لەیەکترازاندنی ژن و مێرد لەلایەن دادوەرەوە بەهۆی ناشایستەییەوە، باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

---

(١) حاشية الصاوي على الشرح الصغير، ج٢، ص٤٠١.

یەکەم: بیروڕاو هەڵوێستی زانایان لەبارەی لەیەکترازاندنەوە بەهۆی ناشایستەییەوە.

دووەم: بەبێ داوا بەرزکردنەوە (الترافع) بۆلای دادوەر، لەیەکترازاندن دروست نییە.

سێیەم: ئەو لەیەکترازاندنە، هەڵوەشاندنەوە (فَسْخ)یە، نەک تەلاقدان.

## یەکەم: بیروڕاو هەڵوێستی زانایان لەبارەی لەیەکترازاندنەوە، بەهۆی ناشایستەییەوە:

زانایان بەگشتی و لەنێویشیاندا زانایانی هەرچوار مەزەبی حەنەفیی و مالیکیی و شافیعیی و حەنبەلیی، خوا لێیان خۆش بێ، هاوشان و هاوتا (کُفء) بوونی ئەو پیاوەی کەژنی لێ مارەدەکرێ، بەمافی هەرکام لە ژن و باب و براو خزمانیشی دەزانن، کە بەمەرجی بگرن.

بۆ وێنە:

### ١- حەنەفییەکان دەڵێن:

هەرکات ئافرەتێکی عاقڵی باڵغ خۆی لەبابایەکی ناهاوشان (غیرکفء) مارەبڕی، سەرپەرشتیار (ولی)ەکەی بۆی هەیە ڕێ لەو هاوسەرگیرییە بگرێ و داوای هەڵوەشاندنەوەی بکات، چونکە هاوشانێتیی (**الکفاءة**) مافی هەموویانە بەمەرجی بگرن، جا ئەگەر ئافرەتەکە مافی خۆی خستوە، ئەوانی دیکە بۆیان هەیە هەر داوای بکەن، بەڵام ئەگەر سەرپەرشتیارەکانی (**أولیاؤها**) ڕازی بوون و چاوپۆشییان لەومافەیان کرد، ئەوە نیکاحەکە

درووست و دامەزراوە.

وە ئەگەر باب یان باپیر هاوسەرگیرییان بۆ کچی گچکە و کوڕی گچکە ئەنجامدا، هەرچەندە بەرانبەرەکەشیان هاوشان نەبێ، نیکاحەکە هەر دروستە.

بەڵام ئەگەر جگە لە باب و باپیر ئەو هاوسەرگیرییەیان ئەنجامدا، ئەوە ئەگەر لەگەڵ جگە لەهاوشان بێ، نیکاحەکە هەر دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر لەگەڵ هاوشان بوو دادەمەزرێ.

بەڵام پاش باڵغ ،بوون مافی سەرپشك بوون (حق الخیار)یان هەیە[1].

## ٢- شافیعییەکان دەڵێن:

هەرکات سەرپەرشتیار (ولِيّ) ئافرەتێ بەڕەزامەندیی خۆی لەناهاوکووفێك مارەکرد، یان ئەگەر یەکێك لەسەرپەرشتیارانی یەکسان لەپلەی خزمایەتییدا وەك کۆمەڵێك برا (إخوة) یان کۆمەڵێك مام (أعمام)، بەڵام بەڕەزامەندیی ئافرەتەکە و سەرپەرشتیارەکانی دیکەش، ئەوە نیکاحەکە دروستە، چونکە ئەگەر خۆیان مافی خۆیان نەویست، ڕەخنەیان لێناگیرێ.

بەڵام ئەگەر هەندێکیان ڕازی نەبوون، نیکاحەکەی دانامەزرێ، هەندێکیش ڕایان وایە دادەمەزرێ، بەڵام دوایی مافی هەڵوەشاندنەوەیان هەیە[2].

## ٣- مالیکییەکان دەڵێن:

شایستەیی و هاوشانێتیی، مافی هەرکام لەئافرەت و

---

(1) (المفصل..) ج٩، ص٥-٧، لە: (الهدایة والعنایة علی الهدایة) ج٢، ص٣١٩-٣٩٣، وە (الدر المختار ورد المحتار) ج٣، ص٦٥-٦٧.

(2) مغني المحتاج، ج٣.

سەرپەرشتیارەکەشیەتی، بۆیە ئەگەر ئافرەت بەناهاوشان (غیر کفء) ڕازی بوو، بەڵام سەرپەرشتیارەکەی ڕازی نەبوو، ئەویش و سەرپەرشتیارەکانی دیکەش بۆیان هەیە هەڵیبوەشێننەوە، بەمەرجێك نەگوازرابێتەوە، بەڵام ئەگەر گوازرابێتەوە بۆیان نیە[1].

### ٤- حەنبەلییەکان دەڵێن:

ئەگەر ئافرەت لەناهاوشانی خۆی مارەبڕا، ئەوە هەرکەس ڕازی نەبێ، لەئافرەتەکەو لە سەرپەرشتیارەکانیشی، مافی هەڵوەشاندنەوەیان هەیە بۆ دوور خستنەوەی نەنگیی (دفع العار) لەخۆیان.

بەڵکو دەڵێن: ئەگەر باب بەڕەزامەندیی کچەکە خۆی، لەناهاوکووفێك مارەی بڕی، برایەکانی بۆیان هەیە داوای هەڵوەشاندنەوەی بکەن، چونکە عەیبەکە سەری هەموویان دەگرێتەوە، بەهۆی مێردکردنی خوشکەکەیانەوە بەبابایەکی ناهاوتایان[2].

## دووەم: بەبێ داوا بەرزکردنەوە (الترافع) بۆلای دادوەر لەیەکترازاندن دروست نیە:

ئەم مەسەلەیەش سەرجەم زانایان لەسەری کۆکن، هەروەها هەر مەسەلەیەکی دیکەی، جێی مشت و مڕو ڕاجیایی، بەبڕیاری دادوەر نەبێ، هەڵنابڕێ و یەکلایی نابێتەوە، وەك لە: (الفتاوي الهندية)دا هاتوە:

---

[1] حاشية الدسوقي على الشرح الكبير، ج٢، ص٢٤٩.
[2] كشاف القناع، ج٣، ص٣٨.

(ولایکون التفریق لعدم الكفاءة الاّ عند القاضي، أما بدون فَسخ القاضي فلا يُفسَخ النكاح بينهما..)[١].

واتە: وە لەیەکترازاندن بەهۆی ناشایستەییەوە لەلای دادوەر نەبێ نابێ، چونکە بەبێ هەڵوەشاندنەوەی دادوەر، نیکاحی نێوانیان هەڵناوەشێتەوە.

## سێیەم: ئەو لەیەکترازاندنە هەڵوەشاندنەوە (فسخ)ە، نەك تەلاقدان:

ئەمیش واپێدەچێ زانایان لەسەری کۆك بن، چونکە بەڕای زۆربەی زانایان ئەوجۆرە نیکاحە بەتاڵ و خراپ (باطل و فاسد)ەو، نیکاحی واش، بوون و نەبوونی وەك یەکە، بۆیە تەنیا ئەوەندەی بەسە هەڵوەشاندنەوەکەی ڕابگەیەنرێ.

خاوەنی: (فتح القدیر)یش گوتوویەتی: (والفرقة لعدم الكفاءة فَسْخٌ)[٢].

واتە: وە لەیەکترازن بەهۆی ناهاوشانییەوە هەڵوەشاندنەوەیە.

منیش پێم وایە بەگشتی ڕەچاوکردنی هاوشانێتیی (الكفاءة) مافێکی هەم ئافرەت و هەم باب و دایکی و براو مام و خزمەکانیشیەتی و، زیاتریش عورف و باوی کۆمەڵگاکان کاریگەریی لەسەری هەیە و، ژیانی ژن و مێردایەتیی (الحیاة الزوجیة)یش، تا ڕادەیەکی زۆر هاوشانیی و هاوتابوونی ژن و مێرد کاریگەریی ئەرێنی لەسەری هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خاڵی گرنگ و جەوهەریی بکرێنە پێوەری هاوکووفێتیی، نەك لاف و

---

(١) الفتاوى الهندية، ج١، ص٢٩٢.
(٢) فتح القدير، ج٢، ص٤٠٨.

گـەزاف لێـدانی بـۆش و دەمــارگیریی وەجــاخ و بنەماڵـەو تـیرەو هـۆزو نەتەوەو..هتد.

پاشان ئەم مەسەلەیە نەشکرێتە بیانوو پاساوی خۆ لەخەڵك دابڕین و خۆپێ زل و زۆر بوون و، خەڵك پێ گچکە و کەم بوون.

هەروەها ئەم مەسەلە یە کە لەبنەڕەتدا شتێکی ئیجتیهادییەو پەیوەستە بە عورف و باوی کۆمەڵگاوە، نەکرێتە شتێکی کۆنکرێتی لەشکان نەهاتوو!

## ١٧-لەیەك ترازاندن بەهۆی جێبەجێنەکردنی مەرجەوە (التفريق لِعَدم الوَفاءِ بالشرط):

ئەمیش هۆکاری حەڤدەیەمین و کۆتاییە لـە هۆکارەکـانی هەڵوەشـاندنەوەی نیکـاح لەلایـەن ژنـەوە، بـەهۆی پابەندنـەبوونی مێردەکـەی بەوشـتانەوە کەلەسەری بەمەرج گرتوون و ئـەویش قبـوولی کـردوە، لـەکاتی گرێبەسـتی هاوسەرگیریی (عقد الزواج)ی نێوانیاندا.

ئنجا ئێمە لەچەند بڕگەیەکدا ئەم مەسەلەیە دەخەینەڕوو:

یەکەم: ئایا ژن بۆی هەیە بەهۆی جێبـەجێ نـەکردنی مەرجەکانیـەوە داوای جیابوونەوە بکات؟!

دووەم: ژن بۆی هەیە مەرجەکانی لەسەر مێردەکەی لابدات.

سێیەم: بـەبێ بەرزکردنـەوەی داوا بـۆلای دادوەر، نیکـاحی لـەوجۆرە هەڵناوەشێتەوە.

چوارەم: مافی داواکردنی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بۆژن، نابێتە مایەی فەوتانی مافی تەڵاقدان بۆ پیاو.

## یەکەم: ئایا ژن بۆی هەیە بەهۆی جێبەجێ نەکرانی مەرجەکانییەوە داوای جیابوونەوە بکات؟

زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییەکی زۆریان هەیەو، بەگشتی دوو ڕان:

١-ڕایەکیان کە وەك (إبن قدامـة) گوتوویـەتی: ئەوەیـە کـە هـەر مـەرجێك بەقازانجی ژن تەواوبێ و سوودی بۆی هـەبێ، پێویسـتە مێـرد جێبـەجێی بکـات و، بەپێچـەوانەوە مـافی داواکردنـی هەڵوەشـاندنەوەی هاوسەرگیرییەکەمانی هەیە، وە دەڵێ: ئەو ڕایە هی هەرکام لە: (**عمر بن الخطاب و سعد بن أبي وقاص و مُعاوية و عمرو بن العاص-رضي الله عنهم-وشريح القاضي و عمر بن عبدالعزيز و جابر بن زين و طـاووس و الأوزاعي و إسحاق**)ە.

٢- وە ڕایەکەی دیکەشیان دەڵێ: ئەو جۆرە مەرجانـە هـەموویان نـاڕەوان و پابەندکـەر (مُلـزم)نین، لایـەنگرانی ئـەم ڕایـەش، وەك (إبـن قدامـة) گوتوویـەتی، هـەرکام لـە: (**الزهـري وقتـادة ومالـك والليـث والثـوري والشافعي وابن المنذر وأصحاب الرأي**)ین[1].

پێشم وایە لایەنگرانی ڕای دووەم، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە بـابی سـەلماندنی دەعوایەکـەیان بکـات، چونکە بازنـەی هەڵسـوکەوتەکان بناغـە تێیدا ڕەوایی و دەستکراوەییەو، ژن بۆی هەیە شتی ڕەواو شـەرعیی لەسـەر مێردەکەی بەمەرج بگرێ و، ئەویش کە بەمەرجەکانی ڕازی بـوو، پێویسـتە پێیانەوە پابەند بێ.

---

(١) المغني، ج٦، ص٥٤٨-٥٤٩.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (المسلمون على شروطهم الّاشرطاً حرَّم حلالاً أو أحلّ حراماً) رواه أبوداود والحاكم عن أبي هريرة ورواه الترمذي وغيره عن عمر بن عوف وصححه ورواه البخاري مُعلقاً ورواه الطبراني.

واتە: مسوڵمانان لەسەر مەرجەكانیانن، مەگەر مەرجێك حەڵاڵێك حەرام بكات، یان حەرامێك حەڵاڵ بكات.

كەواتە: ئەو مەرجانەی كە حەرام حەڵاڵ ناكەن و حەڵاڵ حەرام ناكەن، پێویستە پابەندییان پێوە بكرێ.

## دووەم: ژن بۆی هەیە مەرجەكانی لەسەر مێردەكەی لابدات:

ئەمیش شتێكی ئاشكرایە، چونكە هەر خاوەن مافێك دەتوانێ چاوپۆشیی لەمافەكەی بكات و بەرانبەرەكەی ببەخشێ.

كەدیارە شێوازی دەربڕینی ئەو بەخشین و مەرج لابردنە، دەگونجێ بە بێژە، یان بەنووسین بێ، دەشگونجێ بەكردەوە و ڕەفتاریش بێ[1].

## سێیەم: بەبێ بەرزكردنەوەی داوا بۆلای دادوەر، نیكاحی لەوجۆرە هەڵناوەشێتەوە:

ئەمیش شتێكی ڕوونە، چونكە:

یەك: لەیەكترازاندن بەهۆی پابەندیی نەكردن بەمەرجەوە، ڕاجیایی تێدایەو بڕیاری دادوەریش مەسەلە ڕاجیای هەڵگرەكان هەڵدەبڕێ و ساغ

---

[1] كشاف القناع، ج٣، ص٥٢.





دەکاتەوە.

دوو: بێگومان بەبێ ئیسپاتی ئەوە کەمێرد مەرجەکانی ژنەکەی جێبەجێ نەکردوون، لەیەکترازاندن نایەتەدی، ئاشکراشە کە ناگونجێ ژن، داواکەر (مُدعي)یش بێ و دادوەریش بێ، بۆیە دەبێ پاش خستنە رووی بەڵگەی ئیسپاتکەر بۆ دادوەر، ئەویش حوکم و بڕیاری خۆی دەربکات، هەڵبەتە پاش گوێگرتنیش لەقسەو وەڵامی لایەنی بەرانبەر، کەمێردی ژنەکەیە.

## چوارەم: مافی داواکردنی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بۆژن، نابێتە مایەی فەوتانی مافی تەڵاقدان بۆپیاو:

هەرکات مێرد مەرجی یان مەرجەکانی ژنەکەی جێبەجێ نەکرد، مافی ژنەکەیەتی کەداوای هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی بکات، بەڵام لەهەمان کاتدا مێردیش مافی تەڵاقدانی هەر هەیە.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتەپێش:

ئایا ئەگەر لەحاڵێکی وادا، ژنەکە داوای فەسخی کردو مێردەکەشی تەڵاقیدا، کامیان جێبەجێ دەبێ، فەسخ یان تەڵاق؟!

وادیارە وەڵامی ڕاست ئەوەبێ، کە ئەگەر پیاوەکە بەر لە بەرزکردنەوەی داوای ژنەکەی بۆلای دادوەر، ژنەکەی تەڵاق دابێ، ئەوە تەڵاقدانەکە جێبەجێ دەبێ، ئەگەرنا مادام داواکاریی ژنەکە بۆلای دادوەر بۆ (فسخ) پێش کەوتبێ، دەبێ هەڵوەشاندنەوە (فسخ)ەکە جێبەجێ بێ[1].

---

(1) (المفصل..) ج٩، ص١١٧.

لێرەشدا وەکۆتایی بە توێژینەوەی حەڤدەیەمین هۆکاری لەیەکترازاندنی هاوسەرگیریی دێنین، کۆتایی بەکۆی باسەکانی تەوەری (هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی) دێنین.

بەڵام لەبەرئەوەی وشەی عیددە (العِدّة) لەباسەکانی ڕابردوودا زۆر دووبارە بۆتەوە، بەچاکی دەزانم ئەگەر بەکورتییش بێ، باسێك لەبارەی عیددەوە بکەین و، بیکەینە کۆتایی سەرجەم باس و بابەتەکانی بەشی حەوتەم.

## باسێك لەبارەی عیددەوە

عیددە یەکێکە لەدەرەنجامە گرنگەکانی لەیەکترازانی ژن و مێرد بەهەر هۆیەکەوەبێ، وە عیددە مافێکی خواییەو، بۆهیچ کام لە ژن و مێرد نیە دەستکاریی بکەنو، پێویستە شەریعەت چۆنی داناوە بەوجۆرە پابەندیی پێوە بکرێ.

جا ئێمە وەك عادەتی خۆمان لەم کتێبەدا، هەوڵدەدەین لەحەوت خاڵاندا بەکورتیی و گوشراویی باسی عیددە و چەند بابەتێکی پێوە پەیوەستی بکەین:

یەکەم: پێناسەی عیددە.

دووەم: ڕەوایی عیددە.

سێیەم: حیکمەتی عیددە.

چوارەم: جۆرەکانی عیددە لە ڕووی جۆری لێك ترازانەوە.

پێنجەم: جۆرەکانی عیددە لە ڕووی ماوەکانیانەوە.

شەشەم: چەند حوکمێکی شەرعیی پەیوەست بە عیددە وە.

حەوتەم: مەسرەفکێشانی کاتی عیددە.

## یەکەم: پێناسەی عیددە:

وشەی (عِدّة) لەزمانی عەرەبیدا بەمانای ژماردنی شتێك (إحصاء شيء) دێ، دەگوترێ: (عَدَدْتُ الشيءَ عِدَّةً، أي: أحْصَيْتُهُ إحصاءً، وعِدّة المرأة: ماتَعُدُّه من أيّام أقرائها، ويقال: اعتدّت المرأة وانقضتْ عِدَّتُها) [١].

کەواتە: عیددەی ژن مەبەست پێی، ئەو ڕۆژانەن کە لەکاتی کەوتنە عادەیدا دەیانژمێرێ.

لەزاراوی شەرعیشدا دەگونجێ ئاوا پێناسە بکرێ:

أ-(العِدّة مُدة مُقَدَّرة بحكم الشرع تَلْزم المرأة مراعاة أحكامها عند وقوع الفرقة بينها وبين زَوْجها) [٢] واتە: عیددە ماوەیەکی دیاریکراوە بەحوکمی شەرع، لەسەر ژن پێویستە لەکاتی لێکترازانی لەگەڵ مێردەکەیدا، ڕەچاوی حوکمەکانی بکات و پێیانەوە پابەندبێ.

ب-هەروەها دەشگونجێ ئاوا پێناسەبکرێ: (العِدّة اسم لمدة تتربصُ بها المرأةلمعرفة بَراءَة رحمها، أو للتعبّد، أو لتفجعُّها على زوجها) [٣]، واتە: عیددە ناوی ئەو ماوەیەیە کە ژن تێیدا چاوەڕوانیی دەکات، بۆ زانینی پاکیی منداڵدانی- لەئاوی مێردەکەی- یان بۆ خواپەرستیی، یان لەبەر پەرۆشیی بۆ مێردەکەی.

---

(١) لسان العرب، ج٤، ص٢٧٢-٢٧٥.
(٢) (المفصل..) ج٩، ص١٢١.
(٣) مغني المحتاج، ج٣، ص٣٨٤.

## دووەم: ڕەوایی عیددە:

عیددە لەسەر ژن پێویستەو، هەرکام لەئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت و، یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء) بەڵگەی ئەوەن:

### ١-ئایەتەکانی قورئان:

أ-﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ ﴾ (البقرة: ٢٢٨).

ب-﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ ﴾ (الطلاق:٤).

ج-﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ ﴾ (البقرة: ٢٣٤).

کە دواتر مانایان دەکەین لەکاتی باسکردنی جۆرەکانی عیددەدا، لەخاڵی چوارەم و پێنجەمدا.

### ٢-دەقەکانی سوننەت:

دەقی سوننەت لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ژنێکەوە بەناوی (**فاطمة بنت قيس**) کە (**أبو حفص**)ی مێردی تەڵاقی سێیەمی داوە، فەرموویەتی: (**لَيْست لها لانفقه لا سُكْنى وعليها العِدّة**) رواه مسلم: ١٤٨-٣٨، واتە: نەمافی مەسرەف کێشانی هەیە نە نیشتەجێ بوون، وە عیددەی لەسەر پێویستە.

**٣-یەکدەنگیی زانایان:**

(إبن قدامة) گوتوویەتی: (**وأُجمعت الأمة على وجوبها في الجملة**)[١]، واتە: وە بەگشتی ئوممەت لەسەر پێویستبوونی یەکدەنگە.

## سێیەم: حیکمەتی عیددە:

بێگومان هیچ یاساو حوکمێکی شەریعەت بێ حیکمەت نیەو، دەشتوانین بەلای کەمەوە سێ حیکمەتی گەورە و گرنگی عیددە بژمێرین:

**یەك: دڵنیابوون لەپاکیی منداڵدانی ژن لەتاوی مێردی پێشووی:**

لەکاتێکدا ژن و مێرد لەیەك دەترازێن، بەهۆی تەڵاق یان خولع یان فەسخەوە، ئەگەر عیددە لەسەر ژن پێویست نەبوایە و ژنەکە شووی کردبایەوە، دەگونجا لەمێردی یەکەمی کۆرپەلەی لەمنداڵدان دابێ و، سەرەنجام نەسەبەکان تێکەڵ دەبوون و، بەلای کەمەوە گومان و دوودڵیی لەبارەی منداڵی یەکەمەوە پەیدادەبوو، کە ئایا دەبێ لەکامیان بێ؟!

**دوو: دەرفەت پێدانی بۆ گێڕانەوەی ژنەکەی:**

پێشتر بە درێژیی باسمان کرد کە بەپێی یاساکانی شەریعەت، تەڵاقدان دەبێ بەسێ قۆناغ بێ، واتە: تەڵاقدانی گێڕانەوە (**طلاق رجعي**) بێ.

ئنجا بێگومان هەبوونی عیددەی ژن، بوارو دەرفەتێکی باش بۆ مێرد دەڕەخسێنێ، کە بتوانێ لەماوەی عیددەدا، بیرێکی چاکتر بکاتەوەو ژنەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر عیددە نەبوایە دەبوو هەرپەنجەی پەشێمانیی بگەزێ و کاڵەك بەئەژنۆی خۆی بشکێنێ!

---

[١] المغني، ج٧، ص٤٤٨.

**سێ: پیشاندانی وەفاداریی ژن بۆ مێردی لە دەستچوویی و، خەمبار بوونی و هاودەردیی لەگەڵ خزم و کەس و کارەکەشیدا:**

بێگومان مێرد بۆ ژن سایەو سێبەر و قەڵغان و پشتیوانەو، بەمردنی، ژن خەمبارو نارەحەت دەبێ، بۆیە شەریعەت داینـاوە کە ژنی مێرد مردوو، چوار مانگ و دەشەو بچێتە عیددەوە، وەك دواییش باسی دەکەین.
کە دیارە ئەمەش وێڕای پیشاندانی وەفاداریی ژن بۆ مێردی، پیشاندانی وەفاو هاوخەمییشە لەگەڵ خزم و کەس و کاری مێردەکەیشیدا و، ئەوانیش بێگومان ئەو چاوەڕوانییەیان لەهاوسەری کوڕو براو پیاوە کۆچکردووەکەیان هەیە.

## چوارەم: جۆرەکانی عیددە لە ڕووی جۆری لێکترازانەوە:

لە ڕووی جۆری لەیەکترازان (فُرقَة)ی ژن و مێردەوە، پێنج جۆرە عیددە هەن:

**یەك: عیددەی ژن و مێردێك کەلەسەر بناغەی نیکاحێکی ڕاست، جارێك یان پتر پێکەوە جووتبوون و لەیەك جیابوونەتەوە:**

وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ ﴾ (البقرة: ٢٢٨).
بەڵام ئەگەر جووتبوونیان لەنێواندا نەبووبێ و بەزاراوی زانایان، پێش گوازرانەوە (قبل الدخول) بێ، ئەوە بەدەقی ئایەت ژن عیددەی لەسەر پێویست نابێ، وەك خوا فەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ

عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ﴾ (الاحزاب: ٤٩). واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەرکات ئافرەتانی ئیماندارتان مارەکرد، پاشان بەرلەوەی دەستیان بگەیەننێ (جیماعیان لەگەڵ بکەن) تەڵاقتان دان، ئەوە عیددە ژماردنیانتان لەسەریان نیە.

شایان باسیشە زاراوەی (قبل الدخول)یش کەمن بەکورتیی بە (پێش گوازرانەوە) مانام کردوە، مەبەست پێی جیماع کردن نیە، بەڵکو مەبەست پێی وەژوورکەوتنی زاوایە لە بووك، بەمەبەستی جیماع کردن، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو وەژوورکەوتنە (دخول)ەی پیاو جیماعی بەدواداد‌ێ، بۆ ئەو مەبەستە بەکارهێنراوە.

مەبەستیشم لەم ڕوونکردنەوەیە ئەوەبوو، کە شەرعزانان (فقهاء)یش وەك ئەدەبی بەرزی قورئان و سوننەت، وشەی زەق و ڕاشکاویان بۆ پەیوەندیی جینسیی بەکارنەهێناوەو کینایەیان بەکارهێناوە، بۆیە ئەوانەی وایانزانیوە، مەبەست لە چوونەژوور (دخول) مانایەکی جینسیی زەقە، خراپ حاڵی بوونە.

بۆ مەسەلەی خەڵوە (الخَلوة)ش کە ئایا عیددەی پێ پێویست دەبێ یان نا؟ زانایان ڕاجیان و بەشێکیان دەڵێن: پێی پێویست دەبێ، بۆ وێنە: حەنبەلییەکان دەڵێن: (روى أحمد والأثرم عن زرارة بن أوفى قال: قضى الخلفاءُ الراشدون أن من أغلق بابًا و أرخى ستراً، فقد وجب المهرُ، ووجبت العدة و هذه قضية اشتهرت ولم تُنكر فكان كالأجماع)[1]. واتە: ئەحمەدو ئەلئەثرەم لە زرارەی کوڕی ئەوفاوە

---

(١) كشاف القناع، ج٣، ص٢٥٨.

هێناویانە کە گوتوویەتی: خەلیفە ڕاشیدەکان بڕیاریان داوە کە هەرکەس دەرگای داخستبێ، یان پەردەی دادابێتەوە، ئەوە مارەیی پێویست بووەو عیددەش پێویست بووە، ئەم مەسەلەیەش بڵاوبۆتەوەو نکوڵیی لێنەکراوە، بۆیە وەك یەکدەنگیی وایە.

هەروەها[1] ئەم رایە هی حەنەفییەکانیش، وەك (الکاسانی) گوتوویەتی: (إلاّ أنَّ الخلوةَ الصّحيحة في النكاح الصحيح، أُقيمت مقام الدخول في وجوب العِدّة)[2].

واتە: بەڵام خەڵوەی ڕاست لەنیکاحێکی ڕاستدا لەجێی گوازرانەوە دانراوە، لەپێویست بوونی عیددەدا.

بەڵام مالیکییەکان و شافیعییەکان و زاهیرییەکان و جەعفەرییەکان، ڕایان وایە کە خەڵوە عیددەی پێ پێویست نابێ[3].

منیش ڕای یەکەمم پێ پەسەندترو بەهێزترە.

## دوو: عیددەی ژنی مێرد مردوو (عدة المتوفّى عنها زوجها):

ئەمیش عیددەکەی دیاریکراوە، کە چوار مانگ و دەشەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ (البقرة: ٢٣٤). واتە: وە ئەوانەتان کە دەمرێنرێن و ژنان بەجێ دەهێڵن، چوار مانگ و دەشەو خۆیان مەرزەم دەکەن و چاوەڕوانیی دەکەن.

---

(١) بدائع الصنائع، ج٣، ص١٩١.

(٢) وشەی: الخلوة، یانی: (انفرد به في خلوة) المعجم الوسيط، ص٢٥٤، بەتەنیا لەگەڵی بوو لەشوێنێکی چۆڵ، کەواتە: خەڵوەی ژن و پیاو، واتە: لەشوێنێکی چۆڵ پێکەوەو بەتەنیا بوونیان.

(٣) (المفصل..) ج٩، ص١٢٨-١٢٩.

شایان باسیشه ئەو عیددیە لەسەر هەموو جۆرە ژنێك پێویستە:

گچکە بێ یان بالغ.

حەیزدار بێ یان لەحەیز چوەوە (الیائسة).

گوازراوە بێ، یان نەگوازراوە.

مسوڵمان بێ، یان خاوەن کتێب.

مێردەکەی گچکە بێ، یان بالغ.

توانای جووتبوونی بووبێ، یان نەیبووبێ[١].

وە (إبن قدامة) لەوبارەوە یەکدەنگیی زانایانی هێناوەو گوتوویەتی: (أجمع أهل العلم على أنّ عدة الحرّة المسلمة غير ذات الحمل من وفاة زوجها: أربعة أشهر وعشراً، مَدْخولاً بها أو غير مدخول بها، سواء كانت كبيرة بالغة، أو صغيرة لم تبلغ..)[٢].

وە زانایان یەکدەنگن وەك (إبن المنذر) گوتوویەتی[٣]: کە ژنی تەڵاقدراوی گێڕانەوە (المطلّقة رَجْعياً) عیددەی مێرد مردووی لەسەرە، چونکە هەر لەژێر نیکاحی مێردەکەیدا بووە کە مردووە.

بەڵام ژنی تەڵاقدراوی جیابوونەوە (المُطلّقة بائناً) ئەگەر لەکاتی عیددەی دا مێردەکەی مرد، عیددەی خۆی تەواو دەکات و عیددەی مێرد مردووی لەسەر نیە، چونکە لەوکاتەدا پیاوەکە مێردی وی نەماوە[٤].

---

(١) (المفصل..) ج٩، ص١٣٠.

(٢) المغني، ج٧، ص٤٧٠.

(٣) المغني، ج٧، ص٤٧١-٤٧٢.

(٤) بدائع الصنائع، ج٣، ص٢٠٠، وە: (المغني) ج٧، ص٤٧٢.

**سێ: عیددەی جیابوونەوە لەنیکاحێکی نادروستدا:**

عیددەی ژنێك كە بەنیکاحێکی نادروست (نكاح فاسد) مارەکراوە، مادام گوازرابێتەوە، کت و مت وەك هی ژنی نیکاح کراو بەنیکاحێکی ڕاست (نكاح صحيح) وایەو، پێویستە دەستبەجێ لەیەك بترازێن و ژنەکە بکەوێتە عیددەوە، زانایان لەسەر ئەمە یەکدەنگن[1].

**چوار: عیددەی ژنێك كە بەهەڵە جیماعی لەگەڵ کراوە (الموطؤة بِشُبْهَة):**

ئەمیش بەلای زۆربەی هەرەزۆری زانایانەوە، عیددەی وەك هی ژنی تەڵاقدراو وایە، هەرکام لە حەنەفییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکان، ئەوە ڕایانە، نموونەیەکی ئەم حاڵەتەش ئەوەیە کە پیاوێك لەجیاتی ئەو ئافرەتەی لێی مارەکراوە، یەکێکی دیکەی بۆ بگوازرێتەوەو، ئەویش وابزانێ هاوسەری خۆیەتی و جیماعی لەگەڵ بکات[2].

**پێنج: عیددەی ئافرەتێکی زینا لەگەڵ کراو (المَزْنِيُّ بها):**

ئەمیش بەلای بەشێك لەزانایانەوە، کە حەنبەلییەکان و زاهیرییەکان و هەرکام لە (الحسن والنخعي) یان لەنێودان، عیددەی ژنی تەڵاقدراوی لەسەرە، بەڵام (مالك) و (أحمد) لەڕیوایەتێکیدا، ڕایان وایە عیددەی یەك حەیزە.

بەڵام حەنەفییەکان و شافیعییەکان و (الثوري) ڕایان وایە کە عیددەی لەسەر نیە، بەلەبەرچاوگرتنی حیکمەتی عیددەش بەگشتی، ڕای یەکەم

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص١٣٣.
[2] (المفصل..) ج٩، ص١٣٦.

راستترو ماقووڵتر دێتە بەرچاو، چونکە:

هەرچۆن بێ زیناش دەبێتە هۆی ئاوتێچوونی منداڵدان (**شَغْل الرَّحم**) بۆیە پێویستە بەهۆی عیددەوە دڵنیایی مان بۆ پەیدا بێ، دیارە ئەویش بەسێ حەیز، نەك یەك وەك هەندێکیان گوتوویانە[1].

## پێنجەم: جۆرەکانی عیددە لەرووی ماوەکانیانەوە:

جۆرەکانی عیددە لەرووی ماوە (**مُدَّة**) کانیانەوە، سێ جۆرن: عیددە بەحەیز یان پاکیی، عیددە بەمانگەکان، عیددە بە دانانی حەمل.

ئێستاش با هەرکام لەو سێ جۆرە لەبڕگەیەکی تایبەتدا بتوێژینەوە:

### یەك: عیددە بەحەیز یان پاکیی (العدة بالقروء):

خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ (البقرة: ٢٢٨)، واتە: وە ژنانی تەڵاقدراو بەسێ حەیز (یان پاکیی)ەوە خۆیان مەرزەم دەکەن، چاوەڕێی دەبن، (دیارە مەبەست لەچاوەڕێ بوون، چاوەڕێ بوونی شووکردنەوەیە).

هەڵبەتە وەك پێشتریش گوتمان، مەبەست لە ژنانی تەڵاقدراو (**المُطلقات**)، ژنانی تەڵاقدراوی گوازراوەن (**المطلقات المدخول بِهِنَّ**) چونکە ژنی تەڵاقدراوی نەگوازراوە (**المطلقة غير المدخول بها**) عیددەی لەسەر نیە، وەك ئایەتی ژمارە (٤٩)ی (**الأحزاب**) فەرموویەتی کە پێشتر هێنامان.

کەواتە: ژنانی تەڵاقدراو چ مسوڵمان بن چ خاوەن کتێب، هەرکات

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص١٣٨-١٣٩.

لەمێردەکانیان جیابوونەوە بەهۆی تەڵاقدرانـەوە، هـەروەها بـەهۆی خولـع و فەسخیشەوە، بەقیاس لەسەر تەڵاق، پێویستە لەسەرەتای جیابوونەوەیانـەوە بچنە عیددەوە، هەتا سێ حەیز یان سێ پاکیی (طُهر) یان بەسەردادێن.

دیارە وەك پێشتریش گوتمان هـەرکام لـە ژنـی بەهەڵـە جیمـاع لەگـەڵ کـراو (الموطوءة بشـبهة) وە ژنـی زینـا لەگـەڵ کـراو (المَزْنـيُّ بهـا)یـش، هـەمان حوکمیان هەیە لە ڕووی جۆری عیددەکەیانەوە.

بەڵام ئایا (قروء) کە کۆی (قُرْء)ە، بەمانای حـەیز (حَـيْض)ە، یـان پـاکیی (طُهـر)؟! ئـەوە لەڕاسـتیدا زانایـان ڕاجیـایی و مشـت و مڕێکـی خسـت و خۆڵیان لەبارەیەوە هەیەو بەگشتی دوو ڕان:

**ڕای یەکەم: دەڵێن: (قروء) یانی پاکییەکان (الأطهار).**

شایانی باسیشە لەهاوەڵان، ئەم ڕایە لەهەرکام لە (**ابن عمر و زید بن ثابـت و عائشـة**) خـوا لێیـان ڕازی بـێ، گێڕراوەتـەوە، وە هـەرکام لـە (**مالـك و الشافعي و أبوثور و جمهور أهل المدينة**)ش ئەم ڕایەیان پەسـەند کـردوە، هـەروەها ئەمـە ڕای مـەزەبی ظـاهیریـی و ئاشـکراترین ڕیوایـەتی جەعفەرییەکانیشە[1].

**ڕای دووەم: دەڵێن: (قروء) یانی: حەیزەکان (الحيض).**

لایەنگرانی ئەم ڕایەش لەهاوەڵان، هەرکام لە: (**عمر و علي و ابن مسعود و أبو موسى الأشعري**) خوا لێیان ڕازی بێت پەسەندیان کردووە، وە (**الأثرَم**) لە (أحمد)ە وە گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: (**الأكابر من أصحاب رسول الله** ﷺ) **يقولون: الأقراء–أي القروء–هي الحِيَض**)[2].

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص١٤٤، وە: بداية المجتهد، ج٢، ص١٧٣.
[2] (المفصل..) ج٩، ص١٤٤، وە: (المغني) ج٧، ص٤٥٢، ٤٥٣.

واتە: گەورەگەورانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەڵێن: قورئەکان حەیزەکانن.

دیارە هەرکام لەو دوو ڕایەش بەڵگەیان لەسەر هێنراونەوە، بەلام بەسەرنجدانی بەڵگەکانی هەردوولا دەردەکەوێ کە ڕای دووەم - کە دەڵێ: (القُرْء: الحَيْضُ)- ڕاستترو بەهێزترە لە ڕووی بەڵگەوە، بابزانین چۆن؟:

**(١)-بەڵگەکانی ڕای یەکەم، کە دەڵێن: (قُرء) پاکییە:**

١-خـوای بـەرز فەرموویـەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ (الطلاق: ١). دیارە تەڵاقدانیش لەکاتی حەیزدا حەرامە، کەواتە: مەبەست لە: ﴿لِعِدَّتِهِنَّ﴾ کاتی پاکێتییە.

٢-لەعائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە گوتوویەتی: (**هل تدرون الأقْراء؟ الأقْراء الأطْهار**)[1]، واتە: ئایا دەزانن قورئەکان چین؟ قورئەکان پاکییەکانن.

٣-لەئایەتەکەدا وشەی (ثلاثة) هاتوە: (**والمطلقات يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء..**) دیارە بەپێی ڕێزمانی عەرەبیش، ئەگەر ژمێرراو (معدود)ەکە (مذكر) بێ، ژمارەکە بە (مؤنث) دێ، دەگوترێ: (**ثلاثة أطهارٍ**) بەلام ئەگەر ژمێرراوەکە (مؤنث) بێ، ژمارەکە بە (مذكر) دێ، دەگوترێ: (**ثلاثُ حِيَضٍ**).

**(٢)-بەڵگەکانی ڕای دووەم کەدەڵێن: (قُرْء) حەیزە:**

١-خـوای بـەرز فەرموویـەتی: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ

---

[1] التفسير الكبير، لفخرالدين الرازي، ج٦، ص٩٤.

أَرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمْ يَحِضْنَ ﴾(الطلاق: ٤). واتە: وە ئەو ئافرەتانەتان کە لەکەوتنە حەیز نائومێد بوونەو، ئەوانەش کە جارێ نەکەوتوونە حەیزەوە، عیددەیان سێ مانگە.

کەواتە: ئەو ژنانەی حەیزیان نیە عیددەکەیان بەمانگانە (الأشهر)ە، چونکە سێ مانگەکان جێگرە وە (بَدلْ)ی (قروء)ن، لەکاتی نائومێدبوون لەحەیزدا، مادام وابێ ئەوەی: کە جێگرە وە (بَدلْ)ەکە هاتۆتە جێی، حەیز (حیض)ە، نەك پاکیی (طُهر).

٢-لەچەندان فەرموودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) وشەی (قُرْء) بەمانای (حیض) بەکارهاتووە، بۆ وێنە: (تَدَعُ الصلاة أيام أقرائها) رواه أبوداود، واتە: (ژن) لەکاتی قوڕئەکانیدا نوێژ ناکات، دیارە لەکاتی حەیزیشدا نوێژ ناکرێ، نەك پاکیی! هەروەها بە (فاطمة بنت أبي حبش)ی فەرموو: (أُنظري فأذا أتى قُرؤكِ فلا تُصلّي، واذا قَرّض قرؤكِ فتطهري ثم صلّي ما بين القرءِ الى القرءِ) رواه النسائي.

واتە: سەرنج بدە! ئەگەر قوڕئەکەت هات نوێژ مەکە، وە ئەگەر قوڕئەکەت ڕۆیی، خۆت بشۆو پاشان لەنێوان قوڕئەوە هەتا قورء نوێژ بکە.

٣-تەنیا کاتێك فەرمانی خوا: (يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء) بەتەواویی جێبەجێ دەبێ، کە (قرء) بەمانای حەیز بێ، چونکە کە پیاو ژنەکەی لەپاکییەکەیدا تەلاق دەدا، دیارە عیددەکەی تەنیا لەدوو پاکیی تەواو (طُهرين کاملين)دا دەبێ، نەك لەسێ پاکیی تەواو (ثلاثةُ أطهارٍ کاملة)دا، چونکە:

ئەو پاکییەی کە تەڵاقەکەی تێدا دراوە، دیارە بەشێکی ڕۆیشتوەو

بەشێکی ماوە! بەڵام ئەگەر (قُرء) بەمانای (حَیْض) بێ، ئەوکاتە واتای (ثلاثة قروء) بەباشیی دێتەدی.

٤-حیکمەتی سەرەکیی عیددە، زانینی پاکێتیی منداڵدان (براءة الرَّحم)ە واتە: دووگیان نەبوونی ژن، جا دیارە ئەوەش جارێك بەدانانی حەمل و، جارێکیش بەوە کە پێچەوانەی حەملە کە حەیزە، دێتەدی، کەواتە: زانینی پاکێتیی منداڵدان و نەبوونی سك (حَمْل)، بەحەیز دێتەدی، نەك بەپاکێتیی (طُهر) بۆیە ناچارین بڵێین: (قُرء) بەمانای حەیزە.

٥- لەوەڵامی سێ بەڵگەکانی لایەنگرانی رای یەکەمیشدا دەڵێین:

أ-مەبەست لە (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) ئەوەیە کە پێش کەوتنە عیددە تەڵاقیان بدەن، (مُستَقْبِلات لعدَّتهنَّ) چونکە بێگومان ناگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە لەعیددەدا تەڵاقیان بدەن، چونکە تەڵاق هۆی پەیدابوونی عیددەیەو، ناگونجێ عیددە لێی پێشکەوێ، چونکە بێگومان هۆ(سَبَب) پێش پەیداکراو (مُسَبَّبْ) دەکەوێ، کەواتە: کاتێك پیاو ژنەکەی لەپاکیی (طُهر)دا تەڵاق دەدات، مانای وایە تەڵاقدانەکەی کەوتۆتە پێش عیددەوە کە کەوتنە حەیزە!

بەڵام ئەگەر (قُرء) بەمانای (طُهر) بێ، مانای وایە، ژنەکە لە (قُرء) یێکدا تەڵاقدراوە، کە پێکهێنەری عیددەیە!

ب-ئەو شوێنەوارەی لە عائیشەوە (خوا لێی رازی بێ) هاتوە، ئەگەر گریمان سەنەدەکەی راست (صحیح)یش بێ، ناگونجێ لەبەرانبەر فەرمایشتی پێغەمبەردا (ﷺ)بوەستێ، و بەڵگەش تەنیا دەقەکانی شەریعەتن، نەك قسەی زانایان.

ج- بەبەڵگە هێنانەوە با وەك خۆی بێ وشەی (ثلاثة)ش، لەسەر ئەوە کە

مەبەست لە (قُروءْ) (أطهار)ە، چونكە (مؤنث) بوونی ژمارە (عدد) بەڵگەی (مذكر) بوونی ژمێرراو،راست نیە. جاری وایە شتێك بە (مذكر)یش،و بە (مؤنث)یش، وەك (البُرّ، الحِنطة) كە هەردووكیان بەمانای (گەنم)ن، دەجا بەهەمان شێوە (قُرء) و (حيضة)ش (مؤنث)ەو دەگوترێ: (ثلاثُ حِيَضٍ) وە (ثلاثة قروء)[1].

وە بەنسبەت عیددەی ژنی خۆدارنەر (مُختَلِعة)ەوە، زانایان ڕاجیاییان هەیەو زۆربەیان كە (سعيد بن المُسَيب و سالم بن عبدالله و عروة و سليمان بن يسار و عمر بن عبدالعزيز والحَسن والشعبي والنّخعي والزهري وقتادة وخلاس بن عمرو ومالك واللّيث والأوزاعي والشافعي) یان لەنێودان، كە دەڵێن: عیددەی ئەویش هەروەك هی تەلاقدراو (مُطلقة) وایە و سێ حەیزە، یان سێ پاكیی.

ڕایەكەی دیكەشیان دەڵێ: عیددەی ژنی خولعكەر (مُختلعة)، تەنیا یەك حەیزە (حَيضة واحدة)، ئەم ڕایەش لە: (أبان بن عثمان و إسحاق ابن المنذر)ە وە گێڕراوەتەوە.

دیارە لەوبارەوە چەند دەقێكی سوننەت هەن، بۆ نموونە:

أ-(عن ابن عباس أن امرأة ثابت بن قَيس اخْتلَعَت منه فَجَعل النبيُّ (ﷺ) عِدَّتها حَيْضَةً) رواه النسائي وابن ماجه[2].

شایانی باسیشە كە هەركام لە (إبن تيمية) و (ابن القيّم)یش هەمان ڕایان هەیەو گوتوویانە: مادام لەوبارەوە فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ)هەن و ڕای هاوەڵانیش هەروایە، قیاسیش دەیخوازێ، چونكە

---

(1) (المفصل..) ج٩، ص١٤٤-١٤٧.
(2) (المفصل..) ج٩، ص١٤٨.

ئامانج لە عیددە- لێرەدا - بەس دڵنیابوونە لەپاکیی منداڵدان (براءة الرحِّم) و، ئەویش بە یەك حەیز دێتەدی، کەواتە: یەك حەیز بەسە[1].

منیش ئەو ڕایەی دووەمم زیاتر بەلاوە پەسەندە، هەرچەندە هی کەمینەی مەزهەبەکان و زانایانی دوای هاوەڵانیشە، بەلام پێم وایە لە ڕۆژگاری هاوەڵاندا، لایەنگری لە ڕایەکەی دیکە زیاتر بوونە.

## دوو: عیددە بەمانگەکان (العِدَّة بالأشهر):

ئەم جۆرە عیددەیەش دوو بەشە، بەشێکیان ئەوەیە، کە هەر لەبنەڕەتەوە بەمانگان (بالأشهُر) دانراوە، کەبریتیە لە عیددەی مردنی مێرد (وفاة الزوج)، وە بەشێکی دیکەیان ئەوەیە، کە عیددەکە بەمانگان دانراوە، بەلام لەجیاتی حەیز (بدلاً عن الحیض) کە ئەمیش پێنج جۆرە:

### بەشی یەکەم: ئەو عیددەیەی کە لەبنەڕەتەوە بەمانگان دانراوە:

ئەمیش تەنیا یەك جۆرە کەبریتیە لە عیددەی مردنی مێرد، وەك خوای بەرزو بێ وێنە فەرموویەتی:﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴾ (البقرة: ٢٣٤). واتە: وە ئەوانەتان کە دەمرێنرێن و هاوسەران لەدوای خۆیان بەجێ دەهێڵن، (ژنەکانیان) چوار مانگ و دە شەو خۆیان مەرزەم دەکەن و چاوەڕێ دەبن.

دیارە پێشتریش باسمان کرد، کە هاوسەری مێرد مردوو (المتوفَّى عنها زَوْجُها) هەرجۆرێکی بێ، ئەو چوار مانگ و دە شەو عیددە بەسەربردنەی هەر لەسەر پێویستە، وەك لەبڕگەی دووەمی خاڵی چوارەمدا باسمان کرد.

---

[1] (زاد المعاد..) ج٤، ص٢١٤.

**بەشی دووەم: ئەو عیددەیەی کە لەجیاتی حەیز بەمانگان دانراوە:**

ئەمیش پێنج جۆرە:

**١-ئافرەتی نائومێدبوو لەحەیز (اليائسة):**

کە بریتیە لە ژنێك کەوتۆتە تەمەنەوەو لەحەیز چۆتەوە، کە دیارە زانایان لەبارەی تەمەنی تێدا کەوتنە لە حەیزچوونەوەی ژنانەوە، ڕاجیاییان هەیەو پێم وایە ڕاجیاییەکەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی نێوان ئافرەتان لەو ڕووەوە، کە بێگومان ژینگەو باری تەندروستیی تاکیی و کۆمەڵیی، کاریگەریی لەو جیاوازییەدا هەیە.

شایانی باسیشە زانایان لە پەنجا (٥٠) هەتا حەفتا (٧٠)ساڵ سنووری ئەو حاڵەتەیان دیاری کردوە[1].

خوای زاناو توانا لەبارەی عیددەی ئەوجۆرە ژنانەوە فەرموویەتی:﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ ﴾ (الطلاق: ٤). واتە: وە ئەو ژنانەتان کە لەحەیز نائومێد بوون، ئەگەر گومانتان هەبوو، ئەوە عیددەیان سێ مانگە.

**٢-ئافرەتی گچکەی حەیز نەدیتوو (الصَغيرة التي لَمْ تَحِض):**

کە بریتیە لە کچێکی کەم تەمەنی نەکەوتووە حەیز، جا دیارە شەرعزانان لەبارەی کەمترین تەمەنی کەوتنە حەیزی ئافرەتانیشەوە، ڕاجیاییان هەیە، بەڵام زۆربەیان لای کەمیی ئەو تەمەنەیان بە نۆ (٩) ساڵ داناوە[2].

وە خوای بێ هاوتا هەر لەهەمان ئایەتی پێشوودا، باسی ئەم جۆرە ئافرەتەو

---

(١) (المفصل..) ج٩، ص١٥٢.

(٢) (المفصل..) ج٩، ص١٥٣-١٥٤.

عیددەکەیشی - لەکاتێکدا لەهاوسەرەکەی جیادەبێتەوە-کردوەو فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ﴾ (الطلاق: ٤)، کە دیارە مەبەست لە: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَ﴾ وە ئەوانەی نەکەوتوونە حەیزەوە، بەپلەی یەکەم ئافرەتی گچکەی حەیز نەدیتوویە، کە دیارە ئەویش عیددەکەی هەر سێ مانگە.

**٣-ئافرەتی باڵغی حەیز نەدیتوو (البالغة التي لم تحض):**

ئەمیش ئەو ئافرەتەیە کە پاش گەیشتنی بەتەمەنێك کە بەزۆریی ئافرەتان تێیدا باڵغ دەبن و حەیزیان پەیدا دەبێ، ناکەوێتە حەیزەوە، بۆ وێنە: گەیشتۆتە تەمەنی پازدە (١٥) ساڵیی، عیددەی ئەمیش هەر سێ مانگەو ڕستەی: (**واللائي لم يَحِضْنَ**) وێڕای کچی گچکەی حەیز نەدیتوو، ئەمیش هەر دەگرێتەوە، چونکە: ئەمیش وەك هی گچکە حەیزی نەدیوە[١].

**٤-ئافرەتی بەردەوام خوێن پێداهاتوو (المُسْتَحاضة):**

ئەمیش ئەو ئافرەتەیە کە بەردەوام خوێنی هەیە، پاش ڕۆژەکانی حەیزیش.

جا دیارە ئەم جۆرە ئافرەتە دوو حاڵەتی هەن:

أ- ئەگەر عادەتی خۆی زانی و کاتی حەیزی بۆ لەکاتەکانی دیکە جیاکرایەوە، ئەوە لەوحاڵەتەدا عیددەکەی بەحەیزەکان، یان پاکییەکان دەبێ.

ب- ئەگەر سەراسیمە (**مُتَحيِّرة**) بوو و کاتی حەیز و کاتەکانی دیکەی لێ تێکەڵ بووبن، لەم حاڵەتەشدا بەمانگان عیددەکەی دیاریی دەکرێ،

---

(١) (المفصل..) ج٩، ص١٥٤.

واتــە: ســێ مــانگ دەچــێتە عیــددەوە، ئەمــە ڕای شــافیعییەکان و ریوایەتێکی (أحمد)و ڕای جەعفەرییەکانیشە، چونکە ئەوان دەڵـێن: وەك عادەتی ئافرەتە خزمەکانی دەبێ، یان سێ مانگ.

بەڵام حەنەفییەکان حەوت مانگ و مالیکییەکان و ریوایـەتێکی (أحمـد)یش دوازدە مانگیان بۆ عیددەی ئەوجۆرە ئافرەتە لێقەوماوە داناوە![1].

منیش ڕای یەکەمم پێ ڕاست و بەجێیە و، پێم وایە بەوسـێ مانگـە خـوێن لەبەر ڕۆیشتنە لەهەموو شتێك خاوێن دەبێتـەوە، ئەگـەر گریمـان شـتێکیش بەمنداڵدانییــەوە نووســا بــێ، یــان ئــەوە تــا شــتێك هــەر ســەرهەڵدەدا، لەوماوەیەدا واتە: حەملی ئەگەر هەبێ ئاشکرا دەبێ.

**٥-ئافرەتی حەیز وەستاو (من ارتفع حَيْضها):**

لەڕاستیدا عیددەی ئەم جۆرە، هەرزۆر ئاڵۆزە و یاخوا هیچ ئافرەتێك تووشی ئەوحاڵەتە نەبێ، کەبریتیە لەوەی:

ئافرەتێك کەجارێ گەنجە و هـی ئەوەیـە بکەوێتـە حـەیزەوەو بـەردەوام بـێ، حەیزەکەی بوەستێ و لەحەیز بچێتەوە.

شایانی باسیشە کە قسەو بۆچوونی زانایانیش بۆدیـاریکردنی عیـددەی ئـەم جـۆرە ژنـە لەحاڵەتەکـەی وی ئـاڵۆزترە، چـونکە هـەرکامێکیان بەتایبـەت مالیکییەکان و حەنبەلییەکان، چەند حاڵەتێکیان گریمان کردوەو، پاشـان بـۆ هەرکام لەوحاڵە گریمانکراوانە، وەڵام و چارەسەریان داناوە!

بەڵام بەهــەرحاڵ ئــەوەی جێــی سەرســوڕمانی منــە ئەوەیــە، کــە هــەموویان (**الأحناف، المالكية، الشافعية، الحنبلية، الظاهرية، الجعفرية، الزيدية**) لەچەند حاڵەتێکی گریمانکراو (**إفتراضي**)دا ڕایان وایە کە ئەوجۆرە ئافرەتە،

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص١٥٥-١٥٦.

هەتا نەگاتە تەمەنی نائومێدیی (سن اليأس) بۆی نییە بچێتە عیددە وە و پاش ئەوە، ئنجا عیددە دەشوات![1]، کە بێگومکان لەوتەمەنەدا دەستیش لەدنیا دەشوات!.

بەڵام بەهەرحاڵ من وای بۆدەچم کە ئەوجۆرە ئافرەتە، یان بەسێ مانگ عیددەکەی تەواوبکات، یان ئەگەر ئەوپەڕی دووربینیی (إحتياط) بکرێ - وەك زۆریان لەچەند حاڵەتێکی گرێمانەییدا گوتوویانە- نۆ (٩) مانگ بوەستێ، کە ئەگەر حەملی هەبێ بەوماوەیە هەر دەزانرێ، پاشان عیددەیەکی سێ مانگی بەرێتە سەرێ.

## سێ: عیددە بەدانانی حەمل (العِدَّة بوضع الحَمل):

جۆری سێیەمی عیددە لە ڕووی ماوەکانیانەوە، بریتیە لە عیددە بەدانانی حەمل، ماوەی عیددەی ئافرەتی دووگیان (المرأة الحامل)یش بریتیە لەماوەی بەردەوامبوونی حەملەکەی و، کۆتایی کاتی عیددەکەیشی، دانانی کۆرپەلەکەیەتی، وەك خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾ (الطلاق: ٤). واتە: وە خاوەن حەملەکان کاتی کۆتایی (عیددەکەیان) ئەوەیە، کە حەملەکەیان دابنێن..

ئنجا لێرەدا پێویستە چەند شتێك ڕوون بکەینەوە:

### ١-چ جۆرە حەملێك بەدانانی عیددەی ژنی دووگیان تەواو دەبێ؟!

زانایان لەوبارەوە لەسەر ئەوە پێکهاتوون کە هەر حەملێك شێوەی مرۆڤی تێدا دەرکەوتبێ لە: سەرو دەست و لاق.. ئەوە بەدانانی عیددەی ژنەکە تەواو دەبێ.

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص١٥٧-١٦١.

(إبن المنذر) لەوبارەوە گوتوویەتی: (أجمع كلّ من نحفظ عنه من أهل العلم على أن المرأة تنقضي عِدّتها ب(السقْط) إذا عُلِم أنه ولَدٌ) [١]، واتە: تێكڕای ئەو زانایانەی زانستمان لێ وەرگرتوون، یەكدەنگن لەسەر ئەوە كە ژن عیددەی بە لەبەرچوو تەواو دەبێ، بەمەرجێك بزانرێ كە منداڵە.

هەروەها بەپارچە گۆشتێك كە مامانە متمانە پێكراوو شارەزایەكان شایەدیی بدەن، كە شێوەی مرۆڤی تێدا دەركەوتوە، ئەمیش بەدانانی ماوەی عیددە تەواو دەبێ [٢].

بەڵام خوێنێك كە نازانرێ هی كۆرپە بوو، یان نا؟ ئەوە ماوەی عیددەی پێ بەسەرناچێ [٣].

**٢-كەمترین ماوەی حەمل كە دانانی عیددەی پێ بەسەردەچێ:**

زانایان لەوبارەوە بەگشتی دوو ڕایان هەن:

أ-هەندێكیان دەڵێن: كەمترین ماوەی هەشتا ڕۆژە (**ثمانون يوماً**).

ب-هەندێكیشیان دەڵێن: كەمترین ماوەی سەدوبیست ڕۆژە (**مائة وعشرون يوماً**) [٤].

**٣ -حوكمی دانانی كۆرپە بەمردوویی:**

هەركات ئافرەتی دووگیان كۆرپەكەی بەمردوویی دانا، ئەوە عیددەكەی تەواوبووە،چونكە خوا فەرموویەتی: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق: ٤). دیارە تێیدا بەمەرج نەگیراوە كە كۆرپەكە

---

(١) المغني، ج٧، ص٤٧٥، مغني المحتاج، ج٣، ص٣٨٩، ردّ المختار، ج٣، ص٥١١.
(٢) المغني، ج٧، ص٤٧٥-٤٧٦.
(٣) (المفصل..) ج٩، ص١٦٩-١٧٠.
(٤) (المفصل..) ج٩، ص١٧١.

زیندوویی.

### ٤-ئایا عیددەی ژنی دووگیانی مێرد مردوو چەندە؟!

زانایان لەوبارەوە دوو ڕایان هەیە:

أ-هەرچی زۆربەیانن دەڵێن: کۆتایی عیددەی ژنی دووگیان مێرد مردوو بریتیە لەدانانی حەملەکەی، دیارە بەڵگەی ئەمانیش ئایەتی: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾ بەو دەڵێن: ئەم ئایەتە پاش ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ﴾ هاتۆتە خوارو مانایەکەی تایبەت (**تخصیص**) کردوە بەوانەی کە حەملیان نیە.

ب-هەندێکیشیان دەڵێن: پێویستە ژنی ئاوس دوورترینیدووکاتەکان (**أبعد الأجلین**) بکاتە کۆتایی عیددەکەی و، بەڵگەشیان ئەوەیە کە ئەوڕایە دووربینیی (**إحتیاط**)ی زیاتری تێدایە.

دیارە ڕای جەماوەریش ڕاست و بەهێزە، چونکە وێڕای دواکەوتنی ئایەتەکەی سوورەتی (**الطلاق**) لەوەی (**البقرة**)، ئەم دەقەی سوننەتیش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیانە:

(عن أم سلمة رضي الله عنها زوج النبي (ﷺ) قالت: إنّ امرأة من أسْلَم يقال لها سُبَيعة كانت تحت زوجها، توفي عنها وهي حُبلى فخطبها أبو السّنابل بن بَعْكك فأبت أن تَنْكحهُ، فقال: والله مايصلح أن تنكحيه حتى تَعْتدِّيْ آخر الأجلَين، فمكثتْ قريباً من عشر ليالٍ ثم جاءت النَّبي (ﷺ) فأستأذنتْهُ أن تنكح، فقال: إنكحي) رواه البخاري.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا(ﷺ) - وەك لە ڕیوایەتێکی دیکەی بوخارییدا هاتوو - پاش دانانی حەملەکەی بەماوەیەکی کەم پاش مردنی

مێردەکەی، مۆڵەتی سوبەیعەخانی داوە شوو بکاتەوە.
ئنجا دیارە حیکمەتی سەرەکیی عیددە، دڵنیابوونە لە پاکبوونەوەی مندالْدان لەئاوی مێردەکەی و، بەمنداڵبوونیش زۆرباش پاك دەبێتەوە.

## شەشەم: چەند حوکمێکی شەرعیی پەیوەست بە عیددە وە:

هەر ئافرەتێك کەوتە حاڵەتی عیددەوە، هەتا ماوەکەی کۆتایی دێ، پێویستە چەند حوکمێکی شەرعیی ڕەچاو بکات و پێیانەوە پابەندبێ، کە ئەمانەن، یان ئەمانە گرنگترینیانن:

### یەك: دروست نیە ئافرەتی عیددەدار هاوسەرگیریی لەگەڵ بکریّ:

ئەمە دەقی ئایەتی قورئان ڕایگەیاندوە، وەك خوا سبحانە وتعالی فەرموویەتی:﴿وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥۚ﴾(البقرة: ٢٣٥). واتە: وە گرێبەستی نیکاح گریّ مەدەن، هەتا نووسراو (واتە: عیددەی پێویستکراو) نەگاتە کۆتایی خۆی.
(إبن كثير) گوتوویەتی: (يعني: ولا تَعقدوا العَقْدَ بالنكاح حتى تَنْقضي العِدّة، وقد أجمع العلماء على أنه لايَصِحُّ العَقْد في مُدَّة العِدّة)[1]. واتە: یانی: هەتا عیددە تەواو نەبێ، گرێبەستی هاوسەرگیریی گریّ مەدەن، وە بێگومان زانایانیش یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوە، کە لەماوەی عیددەدا گرێبەست ئەنجام نادریّ.

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص١٧٣-١٧٤.

**دوو: دروست نیە تاڵرەتی عیددەدار بخوازرێ، مەگەر بەئاماژە شتێکی وبەرگوێ هەڵێنرێ:**

ئەمیش دیسان دەقی ئایەتی قورئان ڕایگەیاندوە، کە هەرئایەتی پێشوویە، وەك خوا فەرموویەتی:﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ ﴾ (البقرة: ٢٣٥)، وە لەوەدا گوناهتان ناگا کە بە نارِاستەوخۆ (ئاماژە) خوازبێنیی ژنان (ی عیددەدار) بکەن، یان نیازی هێنانیان لەدڵی خۆتاندا پەنهان بکەن، خوا زانی کە ئێوە هەرباسیان دەکەن، بەڵام بەپەنهانیی گفتیان پێ مەدەن و قسەیان بۆ ڕامەسپێرن، مەگەر قسەیەکی پەسەند بڵێن..

**سێ: ڕەچەڵەك (نسب)ی ئەو منداڵەی لەکاتی عیددەدا دەبێ، بۆلای بابی چەسپاوە:**

ئەمیش سەرجەم زانایان لەسەری یەکدەنگن، بەڵام بێگومان لەکاتی هەبوونی ئەو مەرجانەدا کە بۆ چەسپاندنی ڕەچەڵەك (إثبات النَّسب) بەمەرج گیراون، کەئەوانیش سێ مەرجی سەرەکیین:

**أ-دەبێ بگونجێ ئەو منداڵە هی ئەو هاوسەرە بێ:**

کەواتە: ئەگەر هاوسەرەکە نابالغ بێ، یان بالغیش بێ، بەڵام توانای جیماعی نەبێ، یان چووکی بڕابێ، یان شلەپەتە (عِنِّین) بێ، ئەوە دروست نیە ئەو منداڵەی لەمل بپێچرێ.

**ب-دەبێ پێش کەمترین ماوەی حەمل پەیدا نەبووبێ:**

کە دیارە بەڕای زۆرێك لەزانایان کەمترین ماوەی حەمل شەش مانگە و لەکۆی ئەم دوو ڕستە قورئانییە دەریان هێناوە: ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ ثَلَـٰثُونَ شَهْرًا ۚ﴾ (الاحقاف: ١٥). واتە: وە هەڵگرتنی و لەشیر بڕینەوەی (منداڵ) سی (٣٠) مانگە، ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ﴾ (البقـــرة: ٢٣٣). واتە: وە دایکان دوو ساڵی تەواو شیر بەمنداڵەکانیان دەدەن، بۆ هەرکەسێك کە بیەوێ ماوەی شیرپێدان تەواو بکات..

کەواتە: سی (٣٠) مانگ ماوەی حەمل و شیرپێدانە، ماوەی شیرپێدانیش بەدەقی قورئان دوو ساڵی تەواوە (حولین کاملین)، دیارە دوو ساڵیش بیست و چوار (٢٤) مانگن، کەواتە: (٣٠-٢٤=٦) مادام وابێ، کەمترین ماوەی حەمل شەش مانگە.

بۆیە ئەگەر ژنێك بەماوەی کەمتر لە شەش مانگ منداڵی لەپیاوێك پەیدا بوو، ناتوانێ بڵێ: هی ئەوەو وادیارە لەیەکێکی دیکەیە، کە پێش گوازرانەوەی بۆ مێردەکەی پێی گەیشتوەو، سکی پڕ بووە.

هەڵبەتە ئەوەش لەکاتێکدا دێتەدی، کە ئیسپات بێ مێردەکەی تەنیا شەش مانگە گواستوویەتەوە، یان جیماعی لەگەڵ کردوە، ئەگەر پێشتریش هاوسەری بووبێ، بەڵام بەهەر هۆیەکەوەبێ ئەوماوەیە لێی دوور بووبێ.

**ج-دەبێ مێردەکەی نکوڵی لەرچەڵەکی منداڵە نەکات:**

کە دیارە لەوحاڵەتەشدا مەسەلەی لیعان دێتەپێش، کە پێشتر قسەمان لەبارەوە کرد، شایانی باسیشە زانایان بۆ ئیسپاتی ئەوە کە هەمیشە- بەو

مەرجانەوە کە باسکران - ڕەچەڵەکی منداڵ بۆلای بابی چەسپاوە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەبەڵگە دێننەوە: (**الولَد للفِراش وللعاهِر الحَجَرُ**) رواه البخاري ومسلم والنسائي والترمذي وابن ماجه.

واتە: منداڵ هی خاوەنی جێگایەو، بەردیش بەزاری بێناموس.

زانایان گوتوویانە: مەبەست بە (**فِراش**) لێرەدا ژنە، چونکە لەکاتی جووتبووندا ڕادەخرێ و پیاو دەچێتە سەری، وە مەبەستیش لە وشەی: (**للفِراش**) یانی: (**لصاحب الفِراش**) (بۆ خاوەنی ڕاخراو) کە پیاوە[1].

## چوار: لەکاتی عیددەدا میرات لەیەکدی گرتنی ژن و مێرد چەسپاوە:

واتە: هەرکام لە ژن و مێرد مردن، لەکاتێکدا کەژن لە عیددەدایە، ئەوی دیکە میراتی لێ دەگرێ، بەڵام بێگومان لێرەدا مەبەست لە عیددە، عیددەی تەڵاقدانی گێرانەوە (**طلاق رَجْعي**)یە، چونکە بەتەڵاقدانی گێرانەوە، پەیوەندیی هاوسەرگیریی (**العلاقة الزوجية**) ناپچڕێ و هەر بەردەوامە.

بەڵام ئەگەر ژنەکە لەعیددەی تەڵاقدانی جیابوونەوە (**طلاق بائن**) دابێ، ئەوە میرات لەیەکدی ناگرن، چونکە لەیەك پچڕاون و ژن و مێرد نەماون.

تەنیا حاڵەتێك لەم حوکمە هەڵاوێرراوە، ئەویش ئەوەیە، کە پیاوەکە لەنەخۆشیی مەرگیدا (**في مَرَض موته**) و بەبێ ڕەزامەندیی ژنەکەی، بەمەبەستی ڕاکردن لەوەی میراتی لێ بگرێ، تەڵاقی دەدات تاکو بێبەشی بکات، لەوحاڵەتەدا ژنەکەی هەر میراتی لێ دەگرێ، ئەوجۆرە تەڵاقدانەش

---

[1] شرح النووي لصحيح مسلم، ج١، ص٣٧-٣٨، وە: (بدائع الصنائع، ج٦، ص٢٤٢.

بە تەڵاقدانی ڕاکردو (طلاق الفارّ) ناسراوە[1].

**پێنج: لەماڵ نەچوونەدەری عیددەدار، لەکاتی عیددەدا (مُلازَمة المُعْتدَّة بیتَ العِدّة):**

ژنی عیددەدار، پێویستە هەتا ماوەی عیددەکەی بەسەردەچێ، ماڵەکەی بەجێ نەهێڵێ و تێیدا نیشتەجێ بێ و، ئەمە بەر لەهەر کەسێك مافی خوا (حق الله)یە.

خوا سبحانە وتعالی لەوبارەوە فەرموویەتی:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ﴾ (الطلاق: ١). واتە: ئەی پێغەمبەر! هەرکات ژنانتان تەڵاقدان، بەجۆرێك تەڵاقیان بدەن کە یەکسەر بچنە عیددەوە (ئەوەش بەوە دەبێ کە لەکاتی پاکییەکی جیماع تێدا نەکراودا تەڵاقی بدات) وە عیددە بژمێرن وە پارێز لەخوای پەروەردگارتان بکەن، لەماڵەکانیان وە دەریان مەنێن، با خۆشیان دەرنەچن، مەگەر ڕەفتارێکی ناقۆڵای ئاشکرا بکەن..

شایانی باسیشە کە پێشتر ڕوونمان کردەوە، مەبەست لە (فاحشة مبّينة) یاخیبوونی ژن و پرتەو بۆڵە و ئاژاوە نانەوەیەتی و، بەهیچ جۆرێك ناگونجێ مەبەست پێی زینا بێ، وەك زۆرێك لەزانایان گوتوویانە، بۆیە لێرە بەپێویستی نازانین دووبارەی بکەینەوە.

ئنجا زانایان لێرەدا- لەبارەی لەماڵ نەچوونە دەری عیددەدارەوە- لەسەر

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص٢٠١.

ئەوە یەکدەنگ بوون کە ژنی عیددەدار لە:

أ-تەڵاقدانی گێڕانەوە (**الطلاق الرجعي**).

ب-تەڵاقدانی جیابوونەوە (**الطلاق البائن**) چ دوای یەکەم تەڵاق بێ، چ دووەم، چ سێیەم.

ج-مردنی مێرد (**وفاة الزوج**) .

پێویستە لەماڵ نەچێتە دەرێ، هەتا عیددەکەی تەواو دەبێ[١] .

دیارە بەڵگەی: (أ و ب) ئایەتی: (١)ی (**الطلاق**)ە، کە پێشتر هێنامان، چونکە خوا بەگشتی باسی ژنانی تەڵاقدراوی کردوە، بۆیە هەموویان دەگرێتەوە.

وە بەڵگەی: (ج)یش ئایەتی (٢٣٤)ی (**البقرة**)یە کە پێشتر هێنامان و باسمان کرد، کە چوار مانگ و دە شەوو ڕۆژ، ماوەی عیددەی ژنی مێرد مردوویە.

بەڵام لەولاشەوە زانایان هەموویان، یان زۆربەی هەرەزۆریان لەسەر چەند مەسەلەیەکی دیکەش ڕێککەوتوون:

١-هەرکام لە ئافرەتی نابالغی عیددەدار (**المُعتدّة الصَّغيرة**) و عیددەداری شێت (**المُعتدّة المجنونة**) و عیددەداری خاوەن کتێب (**المعتدة الكتابية**) وعیددە داری نیکاحێکی ناشەرعیی (**المعتدة في نكاح فاسد**) لەسەریان پێویست نیە لەماڵدا بمێننەوە- واتە: ماڵی هاوسەرێتیی- بۆ تەواوکردنی عیددە[٢].

٢-مەبەست لە(**بيوتهن**) ئەو ماڵەیە، کە ژنەکە پێش کەوتنە عیددەوە

---

(١) (المفصل..) ج٩، ص٢٠٢-٢٠٤.

(٢) (المفصل..) ج٩، ص٢٠٤-٢٠٥.

تێیدا نیشتەجێ بووە، بۆیەش ماڵەکانی پاڵداوەتە لایان، تاکو بزانرێ کە هەتا عیددەش تەواو دەکەن، هەر مافیان بەوماڵانەوە هەیە و دروست نیە لێیان دەربکرێن!

٣-ئافرەتی عیددەدار لەکاتی پێویستیی و ناچارییدا، دروستە ئەوماڵەی عیددەی تێدا دەباتە سەر، بەیەکێکی دیکە بیگۆڕێ، وەك لە بەسەرهاتی (**فاطمة بنت قَيْس**)دا هاتوە: (**جاءت رسول الله** (ﷺ) **تَسْتَفْتيه في خروجها من بيتها، فأمرها أن تَنْتَقل الى ابن أم مكتوم الأعمى**) رواه مسلم، واتە: هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ) پرسی پێدەکرد کە ئایا لەماڵەکەی خۆی بچێتەدەرێ و بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە، یان نا؟ ئەویش فەرمانی پێکرد، کە بگوازێتەوە بۆ ماڵی (**إبن أُم مَكتوم**) ی نابینا.

شایانی باسیشە لە ڕیوایەتێکی دیکەی ئەم بەسەرهاتەدا، هۆکاری ئەو داواکردنەی ئەو ژنە بۆ گواستنەوە ڕوونکراوەتەوە:

(عَن عائشة (**رضي الله عنها**) **قالت: إنّ فاطمة كانت في مكان**[1] **وحشٍ فَخيفَ على ناحيتها، فَذلك أرخصَ لها النبيُّ** (ﷺ) رواه البخاری، واتە: فاطیمە لەشوێنێکی چۆڵ بوو، مەترسیی لێ دەکرا، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتیدا.

٤-هەروەها ئافرەتی عیددەدار بۆی هەیە بۆ ئیش و کاری پێویست لەماڵ بچێتە دەرێ، وە ئەمە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانی لەسەرە، کە: (**مالك والثوري والليث والشافعي وأحمد**)یان لەنێودان[2] و،

---

(1) مكان وَحْش: خالٍ قَفْرٌ، المعجم الوسيط، ص١٠١٨، واتە: شوێنێکی چۆڵ و نائاوەدان.
(2) صحيح مسلم بشرح النووي، ج١٠، ص١٠٨.

لەوبارەشەوە فەرموودە زۆرن، بۆ نموونە:

(عَن جابر بن عبدالله يقول: طُلِّقت خالتي، فأرادَت أن تَجدَّ نَخلَها فزَجَرها رجلٌ أنْ تَخرج، فأتت النَّبيَّ (ﷺ) فقال: بلى فَجُذي نَخلَك فأنك عَسى أن تَصدَّقي أو تَفْعَلي معروفاً) رواه مسلم، واتە: پلكم (خوشكی دایكم) تەڵاقدرا، ئنجا ویستی بچێ دارخورمایەكانی بچنێ، پیاوێك تێیخوڕی، كە دەربچێ، ئەویش هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ)ئەویش فەرمووی: با، دارخورمایەكانت بچنە، چونكە ڕەنگە خێرێك یان چاكەیەك بكەی.

دیارە لەمەشەوە دەزانرێ، كە ژنێك پێویستیی بە لەماڵ چوونەدەر هەبێ، بۆ دابین كردنی بژێوی خۆی و منداڵەكانی، بۆی هەیە بچێتە دەر، با لە عیددەش دابێ، بەڵام تەنیا بە ئەندازەی پێویست، كە دیارە ئەم حوكمە ئافرەتی كارمەند (مُوَظَّفة)ش دەگرێتەوە[1].

## شەش: تازیەبار بوونی عیددەدار (إحدادُ المُعْتَدَّة):

تازیەی (إحداد، حِداد) یەكێكی دیكەیە لەو حوكمە شەرعییانەی، كە ڕوو لە ژنی عیددەدار دەكەن، كەواتە: با سەرەتا بزانین تازیەباریی یانی چی؟!، پاشان بزانین بیروڕای زانایان لەبارەیەوە چۆنە؟ دوایی بزانین لەسەركێ و بۆكێ پێویست دەبێ؟ وە سەرەنجام بزانین بەچی و چی دێتەدی؟!

### ١-پێناسەی تازیەباریی (الحِداد، الإحْداد):

لەزمانی عەرەبیدا، دەگوترێ: (حَدَّت المرأةُ تَحِدُّ حَدّاً وحِداداً فهي حادٌّ،

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص٢١٦.

وأحدَّتِ المرأةُ تُحِدُّ إحداداً فهي مُحِدٌّ، أي: تركت الزينة والطِّيب) [١].

کەواتە: هەرکام لەوشەکانی (حِداد) و (إحداد) یانی تازیەباریی و خەمباریی و وازلێهێنانی جلوبەرگی جوان و خۆڕازاندنەوە و خۆ بۆنخۆشکردن.

شایانی باسیشە بۆ ئافرەتی تازیەبار، هەردووك وشەی (حادٌّ) و (مُحِدٌّ) بەکاردێن، کە یەکەمیان لە: (حَدَّ یَحِدُّ حداداً)ەوە هاتوە و، دووەمیشیان لە: (أحدَّ یُحِدُّ إحداداً)ەوە هاتوە.

دیارە تازیەبارییش تایبەتە بە ئافرەتانەوە، هەرچەندە بێگومان پیاوانیش خەمباریی و تازیەباریی ڕوویان تێدەکات، بەلاّم لێرەدا مەبەست حاڵەتی عیددەدار بوونی ئافرەتانە، کە وەك دوایی باسی دەکەین، پێویستە ئەگەر بەهۆی مردنی مێردیانەوە بێ، عیددەکەیان لەگەڵ تازیەباریی (حِداد) دا ئاوێتەبێ.

**٢-بیروڕای زانایان لەبارەی تازیەبارییەوە:**

زانایانی ئیسلام، جگە لە حەسەنی بەصرایی لەسەر پێویستبوونی تازیەباریی بۆ ژنی عیددەدار یەکدەنگن [٢]، چونکە وێڕای دەلالەتی عەقڵ و فیطرەت، دەقی سوننەتیش لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

(عن أم حبيبة زوج رسول الله (ﷺ) قالت: سَمعت رسولَ الله (ﷺ) يقول: لا تَحِل لأمرأةٍ تؤمن بالله واليوم الآخر أن تَحِدَّ على ميِّتٍ فوق ثلاث ليالٍ، الاّ على زوجٍ أربعة أشهر وعَشْراً) متفق عليه، واتە: بۆ هیچ ئافرەتێك کەئیمانی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێ، حەلاڵ نیە لەسێ شەو پتر

---

[١] المعجم الوسيط، ص١٦٠.

[٢] المغني، ج٧، ص٥١٧، وە: (بداية المجتهد) ج٢، ص١٠١.

بۆهیچ مردوویەك تازیـەباریی بكـات، مـەگـەر بـۆ مێـردی، چـوار مـانگ و دەشـەو.

دیارە حیكمەتی تازیەبارییش ئاشكرایە.

هەم وەفاداریی ژنە بۆ مێردی.

وەهەم دڵڕاگرتنی كەس و كاری مێردیەتی.

وەهەم خۆپاراستنە لە گومان و تۆمەت و واتەوات.

### ٣-تازیە باریی لەسەركێ و بۆكێ پێویست دەبێ؟

هەرچەندە لەوبارەوە تا رادەیەك ڕاجیاییان هەیە، بەڵاّ ڕای بەڵگـەدار و بـێ گرێ و گۆڵ هەر ئەوەیە، كە تازیـەباریی (حـداد) تـەنیا لەسـەر ژنـی مێـرد مـردوو و، وە تـەنیا بـۆمێردی مردوویشـی لـە عیـددەدا پێویسـتە و، فەرموودەكانیش جگە لەوە، باسی هیچ حاڵەتی دیكەیان نەكردوە[1].

ئنجا ژنی مێرد مردوو (المتـوفی عنهـا زوجهـا) بـەڕای زۆرینـەی زانایـان، گچكە و نابالّغ بێ، یان گەورە، گوازراوە بێ یان نەگوازراوە، عاقڵ بـێ یـان شێت، مسوڵمان بێ یان كـافر، تازیـەباریی هـەر لەسـەر پێویسـتە، چـونكە حیكمەتەكانی تازیەباریی لەهەموویاندا دێتەدی[2].

### ٤-تازیەباریی بەچی و چی دێتەدی؟!

لە ڕاستییدا تازیەباریی بەگوێرەی عورف و باوی میللەتان و كۆمەڵگایەكان چۆنیەتییەكەی دەگۆڕێ، بەڵام وەك شـەرعزانان گوتوویانـە، تازیـەباریی دوو مەرجی سەرەكیی هەن:

أ-خۆ دوورگرتنی ئافرەتی عیددەداری تازیـەبار لـە خۆڕازاندنـەوە (إجتنـابُ

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص٢٢٥.
[2] (المفصل..) ج٩، ص٢٢٧.

الزينة) کە دیارە ئەویش بریتیە لەهەر شتێك، کە بەخۆ جوانکردن دادەنرێ، چ جل و بەرگ، چ خشڵ، چ خەنەو کل، چ کرێم..هتد.
ب-خۆ دوور گرتن لە بۆنی خۆش (إجتناب الطِّيب) ئەمیش چ لە جەستەدا، چ لە جل و بەرگدا، چ لە خواردن و خواردنەوەدا..هتد[1].

**بەکورتیی و بەکوردیی:**

ئافرەتی عیددەداری تازیەبار، نابێ هیچ شتێکی نائاسایی لەجوانیی و ڕازاندنەوە و بۆنخۆشیی پێوە دیاربێ، کە پێچەوانەی تازیەباریی و خەمباریی بێ.
بەڵام بێگومان پۆشینی ڕەنگی ڕەش بەمەرج نەگیراوە، هەرچەندە ئێستا کراوە بەعادەت.

## حەوتەم: مەسرەفکێشانی کاتی عیددە (نفقة العِدَّة):

خوا پشتیوان بێ لەشەش برگەدا باسی مەسرەفکێشانی کاتی عیددە (نَفَقَةُ العِدَّة) دەکەین، بەڵام زۆر بەکورتکراوەیی:
یەك: مەسرەفکێشانی کاتی عیددە لەتەڵاقدانی گەڕانەوەدا (الطلاق الرَّجعي)دا.
دوو: مەسرەفکێشانی ژنی دووگیان لە کاتی عیددەی تەڵاقدانی جیابوونەوە (الطلاق البائن)دا.
سێ: مەسرەفکێشانی ژنی بێ حەمل لە کاتی عیددەی تەڵاقدانی جیابوونەوەدا.

---

(١) (المفصل..) ج٩، ص٢٢٨-٢٣٠.

چوار: مەسرەفکێشانی کاتی عیددەی جۆرەکانی جیابوونەوەی جگە لە تەڵاق.

پێنج: مەسرەفکێشانی ژنی مێرد مردووی بێ حەمل لەکاتی عیددەدا!

شەش: لابەرەکانی مەسرەفکێشانی کاتی عیددە (مُسْقِطات نَفَقة العِدَّة):

## یەك: مەسرەفکێشانی کاتی عیددە لەتەڵاقدانی گەڕانەوە (الطلاق الرَّجعي)دا:

ئافرەتی عیددەدار (المُعْتَدَّة) لەتەڵاقدانی گەڕانەوەدا لەسۆنگەی ئەوەوە کە پەیوەندیی هاوسەرگیریی لەگەڵ مێردەکەیدا هەربەردەوامە، سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بژێو و مەسرەفی کاتی عیددەی، هەر لەسەر مێردەکەیەتی و قورئان و سوننەت و یەکدەنگیی زانایانیش بەڵگەن:

أ-قورئان:﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ ﴾(البقرة: ٢٢٨). کەواتە: هەرچەندە تەڵاقێك یان دوو تەڵاقیشیان دراون، بەڵام جارێ هەر لەژێر نیکاحی مێردەکانیاندان.

ب-سوننەت: (انما النَفقة والسُّكْنُ للمرأة إذا كان لِزوجِها عليه الرَّجعة) رواه أحمد والنسائي، واتە: تەنیا کاتێك ژن دابین کردنی بژێوو جێگای لەسەر مێردەکەیەتی، ئەگەر بتوانێ بیگێڕێتەوە.

ج-یەکدەنگیی زانایان: وەك (الشَّوكاني) لەبارەی ئەم فەرمایشتەوە گوتوویەتی: (والحديث يدلّ بمنطوقه على وجوب النفقة والسُّكن على الزوج للمطلَّقة رجعياً، وهو مُجمعٌ عليه)[1]. واتە: بیژەی فەرموودەکە

---

(١) نيل الاوطار، ج٦، ص٣٠.

پێویستبوونی بژێو و جێگا بۆ ژنی تەڵاقدراوی گێڕانەوە لەسەر مێردەکەی دەگەیەنێ، ئەوەش یەکدەنگیی لەسەرە.

**دوو: مەسرەفکێشانی ژنی دووگیان لەکاتی عیددەی تەڵاقدانی جیابوونەوە (الطلاق البائن)دا:**

ئەمیش یەکدەنگیی زانایانی لەسەرەو، پێش ئەوەش خوای بەرزو بێ هاوتا ئەوەی ڕاگەیاندووەو فەرموویەتی:﴿ وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمْلٖ فَأَنفِقُواْ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّۚ ﴾ (الطلاق: ٦).

واتە: وە ئەگەر ژنانی تەڵاقدراو خاوەن حەمل بوون، هەتا حەملەکەیان دادەنێن و مەسرەفیان بکێشن.

**سێ: مەسرەفکێشانی ژنی بێ حەمل لەکاتی عیددەی تەڵاقدانی جیابوونەوەدا:**

لەبارەی مەسرەفکێشانی ئەمجۆرە ژنە لەکاتی عیددەیدا، زانایان ڕاجیان و بەگشتی سێ ڕایان هەن:

أ-مافی مەسرەفکێشان و جێگا بۆدابین کرانی هەیە.

ب-نەمافی مەسرەفکێشان و نەمافی جێگا بۆ دابین کرانی هەیە.

ج-مافی جێگای هەیە، بەڵام مافی مەسرەفکێشانی نیە.

بەڵام هەرکام لە (إبن القيّم و ابن قدامة و الشوكاني و الصنعاني و د. عبدالكريم زيدان) ئەو ڕایەیان پەسەند کردوە[1]، کە ژنی بێ حەمل لەکاتی

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص٢٤٣.

عیددەی تەڵاقدانی جیابوونەوەدا، مافی مەسرەفکێشان و نیشتەجێکرانی لەسەر مێردەکەی نیە و بەڵگەشیان ئەوەیە، کە ئەو ژنە هیچ پەیوەندیی بە پیاوەوە نەماوە و، ناگونجێ لەبەرامبەریدا بەرپرسیار بێ، هەروەها ئەم دەقەی سوننەتیش بەبەڵگە دێننەوە:

(عَن فاطمة بنت قيس قالت:

أتيتُ النبي (ﷺ) فقلت: إنّ زوجي فُلاناً أرسل اليَّ بطلاق وإني سألْتُ أهْلَه النفقة والسُّكْنى فأبوا عليَّ، قالوا: يا رسول الله! إنه أرسل اليها بثلاث تطليقات، قالت: فقال رسول الله (ﷺ): انما النفقة والسُّكَنُ للمرأة اذا كان لزوجها عليه الرَّجعة) رواه أحمد والنسائي.

واتە: فاتیمەی کچی قەیس دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ)گوتم: فلانەکەسی مێردم تەڵاقی بۆ ناردووم، منیش داوای مەسرەف و جێگام لەکەس و کاری کردوە، کەچی ئامادەنەبوون! ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! سێ تەڵاقەی بۆ ناردون دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بێگومان بژێو و جێگا، تەنیا کاتێك بۆ ژن لەسەر مێردی پێویست دەبێ، ئەگەر ڕێی گێڕانەوەی هەبێ.

## چوار: مەسرەفکێشانی کاتی عیددەی جۆرەکانی جیابوونەوەی جگە لەتەڵاق:

ئەمیش بەگشتی دوو جۆرە:

أ-ئەگەر ژنەکە عیددەداری جیابوونەوەیەکی جگە لە تەڵاق بێ و هۆکارەکەی لەلایەن پیاوەوە بێ، بۆ نموونە:

١-ژنەکەی مسوڵمان ببێ و خۆی ئامادە نەبێ.

٢-خۆی لەئیسلام هەڵبگەڕێتەوە.

٣-ژنەکەی پاش باڵغ بوون پێی ڕازی نەبووبێ‌و لەڕێی دادوەرەوە جیا بووبێتەوە

لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا مافی بژێوو جێگای هەیە.

ب-ئەگەر ژنەکە عیددەداری جیابوونەوەیەکی، جگە لە تەلاق بێ و هۆکارەکەیشی لەژنەکەوە بێ، بەلام تێیدا گوناهبار نەبێ، بۆ نموونە: مێردەکەی توانای جیماعی نەبووبێ، ئەوە لەم حاڵەتەشدا ژنەکە بژێو و جێگای دەکەوێ.

بەلام ئەگەر لەهۆکارەکەیدا گوناهبار بێ، بۆ نموونە: لەئیسلام هەڵگەڕابێتەوە، ئەوە مافی بژێوی نیە، بەلام مافی نیشتەجێ کرانی هەرهەیە، چونکە مێردەکەی بەحوکمی مسوڵمانەتییەکەی، ئەرکی سەرشانیەتی هەتا عیددەی بەسەر دەچێ بیحەوێنێتەوە[1].

منیش پێم وایە: دابینکردنی بژێویشی وەك هی جێگای هەر پێویستە، چونکە مسوڵمانیەتیی مێردەکەی جوامێریی دەخوازێ و، ئەویش خوازیاری بژێو دابینکردنە بۆ ژنێك، کە هەتا دوێنێ هاوسەری بووە.

---

(1) (المفصل..) ج٩، ص٢٤٤، تێبینی: ئەو چاپەی (المفصل..) کەلە بەردەستمە کەهی ساڵی(٢٠١٢)یە چاپی چوارەم، لەبەرگی (٩)دا لەلاپەڕە (٢٤٥) دێڕی یەکەم ئاوا هاتوە: (لأنّ السُّكنى فيها حق الله تعالى وهي مسلمة مخاطبة بحقوق الله تعالى، وأما النفقة فتسقط عنها..) کەمن پێم وایە دەبێ ئاوابێ: (لأن السُّكنى فيها حق الله تعالى وهو مسلم مخاطبٌ بحقوق الله تعالى، وأما النفقة فتسقط عنه..) چونکە ژنی (مرتد)، مسوڵمان و دوێنراوی خوا نییە و (نفقە)ش لەسەر مێردە نەك لەسەر ژن!! وادیارە هەڵەی چاپیشە.

## پێنج: مەسرەفکێشانی ژنی مێرد مردووی بێ حەمل، لەکاتی عیددەدا:

ئەمیش زاناو شەرعزانان ڕاجیایی زۆریان لەبارەیەوە هەیە:

**١-حەنەفییەکان:**

دەڵێن: نەمافی بژێوی هەیە، نەهی جێگای نیشتەجێ بوون، چ حەملی هەبێ، چ نەیبێ (حاملاً او حائلاً)، چونکە ماڵ و سامانی مێردەکەی بەمردنی دەبێتە موڵکی میراتگرەکانی.

**٢-مالیکییەکان:**

دەڵێن: ئەگەر گوازراوە (**مدخول بها**) بێ مافی بژێوی نیە، بەڵام هی جێگای هەیە.

**٣-شافیعییەکان:**

دەڵێن: مافی جێگای هەیە لەقسەی ئاشکراتری مەزهەبدا (**على القول الأظهر في المذهب**) بەڵام مافی مەسرەفکێشانی پێویست نابێ.

**٤-ظاهیرییەکان:**

دەڵێن: نەمافی مەسرەفکێشانی هەیە نەهی نیشتەجێکران.

**٥-حەنبەلییەکان:**

دەڵێن: مافی هیچ کام لە مەسرەفکێشان و نیشتەجێکرانی نیە[1].

واش پێدەچێ ڕای ڕاستتر ئەوەبێ کە ئەوجۆرە ژنە مافی نیشتەجێکرانی هەبێ، بەڵام هی مەسرەفکێشرانی نەبێ، چونکە:

أ- هی مەسرەفکێشرانی، چونکە تەنیا مافێکی تایبەتیی ژنە لەسەر مێردی، دیارە بەمردنی مێرد کۆتایی پێ دێ، وەپاش مردنی

---

[1] (المفصل..) ج٩، ص٢٤٥-٢٤٦.

هەرکەسێك،ماڵەکەی دەبێتە هی میراتگرەکانی، بۆیە ناگونجێ ماڵ و سامانی میراتگرەکان، مەسرەفی گوزەرانی ژنەکەی پێ بکێشرێ.

ب- بەڵام هی نیشتەجێکرانی، لەسۆنگەی ئەوەوە، کە وێڕای مافی تایبەتیی ژنەکە، مافی خوا (حق الله)شی تێدایە بەڕای زۆربەی زانایان، بۆیە ئەومافە لەکاتی عیددەشدا هەر بەردەوام دەبێ.

ئنجا وێڕای ئەم بەڵگەیە ئەم دەقەی سوننەتیش لەوبارەوە هەیە:

(إن فُريعة بنت مالك بن سنان، وهي أخت أبي سعيد الخدري، جاءت الى رسول الله (ﷺ) تسألهُ أن ترجع الى أهلها فأن زوجها خَرج في طلب أعبدٍ لهُ أبَقُوا حتى اذا كانوا بطرف القدوم[1]، لحقهم فقتلوه، قالت (أي الفُريعة) فسألت رسول الله (ﷺ) أن أرجع الى اهلي، فأنَّ زوجي لم يَتركْني في مَسكنٍ يَملِكهُ ولا نَفقةٍ، قالت: فقال رسول الله (ﷺ)نَعم، قالت: فانصرفتُ حتى إذا كنت في الحُجرةِ ناداني رسول الله أو أمربي فَنوديتُ لهُ، فقال: كيف قُلتِ؟ فَرددتُ عليه القصّة التي ذكرت من شأن زوجي، فقال (ﷺ): أُمكثي في بَيتكِ حتى يبلغ الكتاب أجَلَهُ، قالت: فأعددت فيه أربعة أشهر وعشراً، قالت: فلما كان عثمان بن عفان أرسل اليَّ فسألني عن ذلك فَأخْبرتُهُ فاتَّبعهُ وقضى بهِ) رواه مالك والترمذي وغيرهما، وهذا لفظ مالك.

وەك دەبینین پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی بە(فُوَرِيْعة) کردووە کە لە ماڵەکەیدا نیشتەجێ بێ، هەتا عیددەکەی بەسەردەچێ، بەڵام باسی مەسرەفکێشانی نەکردوە.

(الترمذي)یش لەبارەی ئەم دەقەوە گوتوویەتی:

---

[1] ناوی شوێنێکە لەنزیك مەدینەیە.

(هذا حديث حسن صحيح والعَملُ على هذا الحديث عند أكثر أهل العلم من أصحاب النبي (ﷺ) وغيرهم..)[1]. واتە: ئەمە فەرموودەیەکی چاکی ڕاستەو لەلای زۆربەی زانایانی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وئەوانی دیکەش کار لەسەر ئەم فەرمایشتەیە..

## شەش: لابەرەکانی مەسرەفکێشانی کاتی عیدده (مُسقطاتُ نَفَقَة العِدَّة):

مەسرەفکێشانی ژنی عیددەدار (المُعتَدَّة) لەکاتی عیددەدا بەچەند هۆکارێك لەسەر مێردەکەی لادەچێ و، مافی داواکردنی بۆی نامێنێ، دیارە مەبەستیشیان لەمەسرەفکێشان (النفقة) هەرکام لە جێگا (السُّكن)و خواردن و خواردنەوە و پۆشاك (الطعام والشراب والكسوة)یشە.

گرنگترین کەوێنەرو لابەرەکانی مەسرەفکێشانی ژنی عیددەدار لەکاتی عیددەدا ئەمانەن:

### ١-یاخیبوون و ئاژاوەگێریی (النُّشوز):

لەئەنجامی یاخیبوون و هەرانانەوە و ئاژاوە دروستکردندا، ژنی عیددەدار مافی نیشتەجێکران لەدەست دەدات، چونکە خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ﴾ (الطلاق: ١) شایانی باسیشە پێشتر باسمان ڕوونکردۆتەوە کە مەبەست لە (فاحشة مبيّنة) لێرەش و لەئایەتی (١٩)ی (النساء) و ئایەتی (٣٠)س (الأحزاب)یشدا-کە تەنیا لەوسێ شوێنەشدا

---

[1] جامع الترمذي، ج٢، ٣٩١-٣٩٢.

هاتوە-یاخیبوون و سەرپێچییکردنە، نەك زینا، وەك زۆرێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

**٢-هەرکات مەسرەفکێشان بەهەردووك جۆری: دابینکردنی بژێو و جێگا، کرا بە قەرەبوو (عوض)ی خولع، لادەچێ:**

چونکە وەك پێشتر لەباسی خولعدا باسمان کرد، ژن بەگێڕانەوەی مارەیی (مَهْر)یەکەی بۆ مێردەکەی، دەتوانێ خۆی دەرباز بکات و مارەییەکەی بکاتە فیدیەو قەرەبووی خۆی، وەك خوا عزوجل فەرموویەتی:﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِۦ ﴾ (البقرة: ٢٢٩).

ئنجا ئەگەر ژنەکە مارەییەکەی بەدەستەوە نەمابوو، دەتوانێ بەپێی ڕێککەوتنی لەگەڵ مێردەکەیدا مەسرەفکێشانی ماوەی عیددە، وەك قەرەبوو (عوض)ێکی خۆداڕنین (خُلع) لەسەر مێردەکەی لاببات[1].

**٣-هەرکات مەسرەفکێشانی کاتی حەمل کرا بە قەرەبووی خولع لەسەر مێرد لادەچێ:**

وەك (إبن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (اذا خالعت المرأةُ زوجَها وأبْرأتْهُ من نفقة حَمْلها وكفالته، لم يكن لها نفقة ولا للولَدِ حتى تَفْطمُهُ)[2].

واتە: هەرکات ژن خولعی لەگەڵ مێردەکەی کرد، لەسەر ئەوە کە لەمەسرەفکێشان و سەرپەرشتییکردنی حەملەکەی ببەخشێ، ئەوە هەتا منداڵەکەی لەشیر دەبڕێتەوە، نەخۆی نەمنداڵەکەی مافی مەسرەفکێشرانیان نیە.

---

(١) (المفصل..) ج٩، ص٢٥٦-٢٥٧.
(٢) (المغني..) ج٧، ص٦١٠.

**٤-لاچوونی مافی مەسرەفکێشران بە تێپەڕبوونی ماوەی عیددە:**

بە ڕای بەشێك لەزانایان مەسرەفکێشرانی ژنی عیددەدار، ئەگەر لەماوەی عیددەکەیدا وەری نەگرێ و، دادوەریش بڕیاری نەدابێ و، خۆیشیان لەسەری پێك نەهاتبن، بەتێپەڕینی ماوەی عیددە دەفەوتێ، ئەمە ڕای حەنەفییەکانە[1].

بەلأم من پێم وایە نەیانپێکاوە، ئەومافە هەر لەئەستۆی مێرد دایە، ئەوکاتە وەك مارەیی هاو وێنە (مَهْر المثل) پێویستە ئەندازەکەی بەقیاس لەسەر نیزیکانی و دەوروبەری مەزەنەنە بکرێ و دیاریی بکرێ.

**٥-بەتێپەڕبوونی ماوەی عیددە، مەسرەفکێشرانی ژنی عیددەدار لادەچێ:**

ئەمیش شتێکی ئاشکرایە، چونکە هۆکاری پێویستبوونی مەسرەفکێشانی ژنی عیددەدار، بوونی عیددەیەو هەرکات بەسەرچوو، هۆکاری بوونەکەی نامێنێ.

خوێنەری بەڕێز:!

لێرەدا کۆتایی بە تەوەری سێیەم: {هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی (الفَسْخ)}لەبەشی حەوتەمی ئەم کتێبە دێنین، کە زۆرترین پانتایی بەشی حەوتەمی گرتوەو، هیوادارم لەو بۆچوون و بیرورا تایبەتییانەشمدا، کە لەکۆی ئەم کتێبەدا بەگشتی و بەتایبەت لەم بەشەدا، جاروبار خستوومنە ڕوو، نیشانەم پێکابێ و، ئەگەر نەشم پێکابێ، بێ پاداشت نەبم.

**ئێستاش نۆرەی بەشی هەشتەمە:**

---

[1] (الدر المختار وردّ المحتار) ج٣، ص٦١٠، وە: (الفتاوى الهندية) ج١، ص٥٥٨.

# بەشی هەشتەم

## پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەرمەشقی هەرە بەرزمان لە ژیانی هاوسەرێتیی دا

خوێنەری بەڕێز !

خوا پشتیوان بێ لەم بەشی هەشتەمی کتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا) هەوڵدەدەین تیشك بخەینەسەر ژیانی هاوسەرێتیی پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، چونکە بێگومان ئەو بەڕێزو سەروەرە، باشترین پێشەواو سەرمەشقمانە لەهەموو لایەکانی ژیان و گوزەرانماندا.

شایانی باسیشە ئێستا (٢١ شعبان/ ١٤٣٣ ك - ١١ تەمووزی/ ٢٠١٢ ز) کە خەریکی دەست پێکردنی نووسینی ئەم بەشەم، لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) لە ئیعتیکاف دام[1]، هیوادارم خوای بەبەزەیی لەبەرەکەتی ئەم شوێنە موبارەکە کارەکەم بۆ ئاسان بکات.

دیارە ئێمە ئەم بەشەمان کردوە بە چوار تەوەری سەرەکییەوە، کە ئەمە ناونیشانەکانیانە :

تەوەری یەکەم : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرمەشقی هەمەلایەنەمانە.

تەوەری دووەم: حیکمەتەکانی هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .

تەوەری سێیەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت جوانترین و چاکترین و وەفادارترین هاوسەر و بەسۆزترین باب.

تەوەری چوارەم: خۆری کەسایەتیی هەرەبەرزی پێغەمبەری خواو فووی زاری ناحەزەکانی .

---

(١) کە لەسەفەری عومرە بووم لەگەڵ هاوسەرمو (دایکی شەریف)و کاك شادی‌و کاك شەریفی کوڕمو، ژمارەیەك لەبرایانی مەکتەبی ئەمیرو پاسەوانەکان.

## تەوەری یەکەم: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەرمەشقی هەمەلایەنەمانە

حیکمەتی خوا سبحانه وتعالى لەوەدا کە پێغەمبەرانی خۆی لەنێو بەشەردا بۆ مرۆڤەکان ناردوون، ئەوەیە کە بۆیان ببنە پێشڕە و و سەرمەشق و ئایین و بەرنامەی خوایان بە بەرجەستە کراویی پیشان بدەن، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ﴾ النساء: ٦٤، واتە: وە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردوە مەگەر بۆ ئەوە کە بە فەرمانی خوا فەرمانبەریی بۆ بکرێ... هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾ الإسراء: ٩٤ – ٩٥، واتە: وە هیچ شتێك ڕێی لە خەڵکی – کافر- نەگرت کە پاش ئەوەی هیدایەتیان بۆ هات ئیمان بێنن، مەگەر ئەوە کە گوتیان: ئایا خوا بەشەرێکی بە پێغەمبەر ناردوە ؟ بڵێ : ئەگەر لەسەر زەمین فریشتەی لێبان بە ئارامیی بڕۆن، ئەوە فریشتەیەکمان لە ئاسمانێ وە بە پێغەمبەر دەناردنە سەرێ.

واتە: مادام ئەوان بەشەرن و ژیانێکی مرۆڤانە لەسەر زەوی دەبەنە سەرێ، ناگونجێ پێغەمبەرەکەشیان لە غەیری خۆیان بێ، چونکە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بۆیە نێردراون، کە خەڵکی بیانوو بڕاو بکەن و بەڵگەی خوایان لەسەر تەواو بکەن، کە ئایین و بەرنامەی خوا ڕاست و تەواوە و بە باشییش

پێشیانیان داون، کە دیارە ئەوەش تەنیا کاتێك دێتەدی، کە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام وێرای تێگەیاندنی تیۆریی (نظري) بە کردەوەو پراکتیك (تطبیق) یش پێشانیان بدەن و لەخۆیان دا بۆیان بەرجەستەو نمایش بکەن، وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی : ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعۡدَ الرُّسُلِۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء: ١٦٥، واتە: پێغەمبەرانێکی موژدە دەرو ترسێنەرن، تاکو دوای (هاتنی پێغەمبەران) خەڵك بەڵگەو بیانووی لەسەر خوا نەبێ، وە خوا زاڵی کاربەجێیە..

ئەوە بەنسبەت پێغەمبەرانی خواوە صلی الله علیهم وسلم بە گشتی، بەنسبەت پێغەمبەری کۆتایی (محمد) یش (صلی الله علیه وسلم) کە سەرمەشق و چاوساغ و پێشرەوی هەمەلایەنەی بەشەرە، بەتایبەت خوا فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ اللَّهَ وَالۡيَوۡمَ الۡأٓخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب: ٢١، واتە: بەدڵنیاییەوە لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە باشترین سەرمەشق هەیە، بۆ هەر کەسێك کە بە ئومێدی (ڕەزامەندیی) خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بێ، وە زۆر یادی خوا بکات .

وەك دەبینین :

خوای بەبەزەیی بە ڕەهایی باسی سەرمەشق و پێشڕەو بوون و چاوساغ بوونی پێغەمبەرەکەی (محمد) دەکات، بۆ سەرجەم بڕواداران، واتە: وەك چۆن خوا عز وجل بە گشتی باسی ئیمانداران دەکات بە وردو درشت و نێرو مێ و تێکڕایانەوە، کە پێغەمبەر سەرمەشق و پێشەوایانە: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ ﴾، ﴿ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ اللَّهَ وَالۡيَوۡمَ الۡأٓخِرَ ﴾ بەهەمان شێوەش سەرمەشق ﴿ أُسۡوَةٌ ﴾ بوونی پێغەمبەریش

(صلى الله عليه وسلم) بەرەهایی باس دەكات و تایبەتی ناكات بەلایەنێك و دوو لایەن و چەند لایەنێكی دیاریكراوەوە.

بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەرجەستەكەری قورئانە لە ژیانی تایبەتیی و گشتیی خۆیدا (في حياته الخاصة والعامة) وەك دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێت لەوەلامی یەكێكدا كە لەبارەی ئاكارو ڕەوشتی پێغەمبەری خواوە پرسیاری لێكرد، گوتی: (ان خُلُقَ نَبِيِّ الله كان القرآن) رواه مسلم، واتە: بێگومان ڕەوشتی پێغەمبەری خوا قورئان بوو، بەڵێ، لە سۆنگەی ئەوەوە، دیارە سەرمەشق بوونەكەشی هەمەلایەنەو گشتگیرە.

هەڵبەتە مەبەستی دایكی بڕواداران‌یش لە ڕەوشت (خُلُق) سەرجەم هەڵسوكەوت و ڕەفتارو ئاكاری پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) بە گشتیی، چ پەیوەندیی بە ژیانی تاكییەوە هەبێ، چ ژیانی خێزانیی، چ كۆمەڵایەتیی، چ سیاسیی، چونكە:

١) وشەی (خُلُق) لە ئەسڵی زمان و بەكارهێنانی قورئانیشدا، واتاو چەمكێكی فراوان و گشتگیریی هەیەو، بابای پرسیاركەریش پرسیاری لەبارەی كۆی هەڵس و كەوت و ئاكاری پێغەمبەری خواوە كردوە، نەك لایەنێكی تایبەت.

٢) دیارە كاتێكیش ڕەوشت و ئاكاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەگوێرەی قورئان دەبێ، كە بەهەموو قورئانەوە پابەند بێ و، قورئانیش گشتگیر (شامل) ە بۆ هەموو لایەنەكانی ئینسان و جۆرەكانی ژیان و گوزەران، كەواتە ڕەوشت و ئاكاری پێغەمبەری خوا (خلق نبي الله) مەبەست پێی سەرجەم هەڵسوكەوت و كردەوەكانیەتی، لە تێكڕای بوارەكانی ژیانی تاكیی و كۆمەڵایەتییدا، بە ڕووحیی و فیكریی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریی و سەربازیی و هتدەوە.

هەروەها خوای کاربەجێ لەبارەی سەرمەشق بوونی گشتگیرو هەمەلایەنەی پێغەمبەری خوا وە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ آل عمران: ٣١ — ٣٢، واتە: بڵێ ئەگەر (ڕاست دەکەن) خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون خواش خۆشی دەوێن، وە لە گوناهەکانتان لێتان دەبووریێ، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە، بڵێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، جا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، خوا کافرانی خۆشناوێن .

کەواتە: شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و بەدواکەوتنی و گێڕانی بە پێشەواو پێشڕەو، سەنگی مەحەك و تەرازوی هەڵسەنگاندنی دەعوای خوا خۆشویستن و بەندایەتیی بۆ خوا کردنە، هەروەها لەولاشەوە هۆکارو مایەی دەستەبەرکردنی خۆشەویستیی خوایە بۆ مرۆڤ .

وە پێچەواکەیشی: ڕوو وەرگێڕان لە پێغەمبەری خوا (محمد) وە پشتتێکردنی، مایەی لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دەرچوون و کافر بوونی ئینسانە، ئەگەر لەوەو پێشیش مسوڵمان بووبێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾.

هەروەها هەر لەوبارەوە کە دەبێ مسوڵمانان سەرجەم ئاراستەو فەرمان و قەدەغەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەدڵ و گیان وەربگرن و لەسەر سەرو چاویانیان دابنێن، و بە پێچەوانەوە سزاو جەزرەبەی توندی خوای دادگەر چاوەڕێیانە، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ الحشر: ٧، واتە: وەهەرچی پێغەمبەر دەتانداتێ لێی وەربگرن، وەهەرچی لێتان قەدەغە دەکات دەستی لێ هەڵبگرن، وە

پارێز لە خوا بکەن، بێگومان خوا سزای توندە ئاشکراشە کە مەبەست لە پارێز لە خوا کردن (تقوى الله) لێرەدا پارێزلێکردنیەتی لە سەرپێچیی نەکردن لە پابەندیی بەڕێبازی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها مەبەستیش لە خستنە ڕووی سزای توندی خوا، ئەوەیە کە هەر کەسێك لاملیی و سەرپێچیی لە پێغەمبەری خوا بکات، ئەوە سزاو جەزرەبەی توندی خوا عز وجل چاوەڕێیەتی .

بەڵام لێرەدا پێویستە لە چەند ڕاستییەکی گرنگ بێ ئاگانەبین :

### یەکەم : هەموو کەسێ ناتوانێ لەهەموو ڕوویەکەوە پێغەمبەری خوا بکاتە سەرمەشق :

بۆ وێنە:

أ- لە ڕووی حوکمڕانیی و سیاسیی و دەوڵەتداریی یەوە، تەنیا سیاسەتمەدارو حوکمڕانان دەتوانن، وەك پێویست پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەوبوارەدا بکەنە سەرمەشق و پێشڕەویان .

ب- هەروەها لە ڕووی جەنگ و جیهادەوە، تەنیا موجاهیدو جەنگاوەران و بگرە لەنێو ئەوانیشدا، تەنیا بەرپرس و فەرماندەکان، دەتوانن وەك پێویست پێغەمبەر بکەنە سەرمەشق و چاوساغیان .

جـ- هەروەها لە ڕووی زانست و فێرکردن و پەروەردە کردندا، ئەوەی زانستی شەرعی پێ نەبێ و، لەبواری پەروەردەو ئاراستەکردندا شارەزاو کارانەبێ، بۆی نالوێ وەك پێویست چاو لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکات و وەك وی بکات!

دیارە ئەم ڕاستییەشم بۆیە خستە ڕوو، تاکو هەرکەس ڕاست بۆوە پێی وانەبێ، کە بۆی هەیە لەهەموو هەڵسوکەوتێکدا وەك پێغەمبەری خوا بکات.



**دووەم: شوێنی هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، تەنیا ئەرکی تاك نیە، بەڵكو ئەرکی تاك و کۆمەڵی مسوڵمانە:**

بەڵێ خوا سبحانه وتعالى کە فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١، نابێ پێمان وابێ کەتەنیا مەبەست پێی تاك تاکی مسوڵمانانەو بەس ! بەڵکو وێڕای تاك تاکیان، مەبەست پێی تێکڕاشیانە بە کۆمەڵ .

کەواتە: هەرکات مسوڵمانان بیانەوێ بەچاکیی فەرمانی خوا جێ بەجێ بکەن و شوێن پێی پێغەمبەرەکەی هەڵبگرن، پێویستە ئەوەی کە بەتاك تاکیان دەکرێ، تاك تاکیان ئەنجامی بدەن و، ئەوەی کە پەکی لەسەر هەموویان کەوتوە، با هەموویان مشووری ئەنجامدانی بخۆن، بۆ وێنە: فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە، بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامیی و قەوارەی سیاسیی، جەنگ و جیهادو ....هتد، چونکە بێگومان پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) کاتی خۆی ئەو کارانەی بە هەرەوەزیی و بەهاوکاریی هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی ئەنجام داون، نەك بۆ خۆی بەتەنیاو تاکە کەسیی .

**سێیەم: ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك شتێکی سروشتی مرۆڤانە کردوونی، بۆ ئێمە پابەندکەر (مُلزِمْ) نین:**

بۆ وێنە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جۆرە خواردنێکی حەز لێ نەبووە، بەڵام نەیفەرمووە مەیخۆن ! وەك بزن مژە (الضبّ) ئەوە بۆ ئێمە قەدەغە نیە، هەروەها جۆرە خواردنێکی حەز لێبووە، بۆ ئێمە سوننەت نیە بیخۆین، بۆ وێنە: شیرینیی و هەنگوین (كان يحب الحلوى والعسل) رواه البخاري.

هـەروەك مەسـەلەی جـل و بـەرگ و پـێڵاو و کـەل و پەلـەکانی دیکـەی ژیـانی ڕۆژانە، کە بێگومان پەیوەستن بـە ژینگـە (بیئـة) و کلتـوور (ثقافـة) و جوگرافیـا، عادەت و نەریت و ...هتدی کۆمەڵگاو میللەتانەوە، ئەمانەو هاوێنەکانیان ناچـنە نێو بازنەی سوننەتەوەو، بۆ مسوڵمانان پابەندکەر (مُلزِمْ) نین، چـونکە پێغەمبـەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو شتانەی بەمەبەستی لە خوا نزیکبوونـەوەو بەندایـەتیی (التقـرب الی الله والعبـادة) ئـەنجام نـەداون و، وەك وەحـی و دینـیش بـە ئێمـەی ڕانەگەیاندوون.

**چوارەم : هەروەها ئەو شتانەی کە لە بازنەی ئەزموونی بەشەرو لایەنی وردەکاریی و هونەریی ژیان و گوزەران دان و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە بۆچوونی خۆی فەرمووونی یان کردوونی، بۆ ئێمە پابەنکەر (مُلزِمْ) نین:**

بۆ وێنە: چۆنیەتی نەخشەو تاکتیکیی جەنگ و، جـۆری چـەك و کـەل و پـەل و، شێوەی دابەشکردنی یەکەکانی سوپا (وحدات الجیش).

هەروەها لایەنە وردەکارییەکانی پزیشکیی (طبي) و کشتوکاڵیی و بازرگانیی و پیشەسازیی و ...هتد، چونکە خۆی فەرموویەتی: (**إذا أمرتكم بشيءٍ مـن دينكم فخذوا به وإذا أمرتكم بشيءٍ من رأيي، فإنمـا أنـا بشـر**) رواه مسـلم :٢٣٦٢، واتە: هەرکات شتێکم لە کاروباری دینتان پێگوتن، وەری بگرن، بـەڵام ئەگـەر وەك بۆچوونی خۆم شتێکم پێ گوتن، ئەوە منیش مرۆڤێکم.

وە لە ڕیواتێکی دیکەی ئەو بەسـەرهاتەدا هـاتوە : (**أنـتم أعلـم بـأمر دنيـاكم**) رواه مسلم :٢٣٦٣، واتە: ئێوە بەکاروباری دنیاتان زاناترن .

دیارە ئەو بەسەرهاتەی کە ئەوەی تێدا فەرموەوە، ئەوەبووە کە بەلای کۆمەڵێکدا ڕەتبووە، دارخورمایان پیتاندوە (تۆوی نێرەکانیان خستۆتە سەر مێیەکان) ئەویش فەرموویەتی: (**ما أظن يُغني ذلك شيئاً**) رواه مسلم: ٢٣٦١، واتە: پێم وانیە ئەوە هیچ سوودێکی هەبێ، ئەوانیش وازیان لێ هێناوە، دوایی دارخورمایەکان بەری چاکیان نەگرتوە و، دواتر هەواڵیان پێداوە، ئەویش ئەوەی فەرمووە کە هێنامان .

**پێنجەم : بەلام هەرچی پەیوەندیی بە ئەدەب و شێوازی هەڵس و کەوت و ڕەفتارەوە هەیە، یا لەبواری خواردنو خواردنەوەو پۆشاك و تەندروستیی و ...هتدیش، دابێ، هەر لە بازنەی سوننەت دایەو پابەندکەرە بۆمان :**

بۆ وێنە : بەدەستی ڕاست خواردن و خواردنەوەو، (بسم الله) کردن لەسەرەتاوەو، (الحمد لله) کردن لەکۆتاییداو، لە پۆشین دا لای ڕاست پێشخستن و، لە داکەندندا لای چەپ پێشخستن و ....هتد، ئەمانە کە پەیوەستن بە ئاکارو ڕەفتارەوە، هەر لە بازنەی سوننەتدان.

**شەش : هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە لە بازنەی تایبەتمەندییەکان (خصوصيات) ی پێغەمبەری خوادان، دیسان نەك هەر بۆ ئێمە سوننەت نین، بگرە دروستیش نین:**

بۆ وێنە : حەلاڵ بوونی زیاتر لە چوار هاوسەر لەیەك کاتدا [1]، وە فەرزبوونی

---

[1] (ياايهاالنبى انا احللنا لك ازواجك اللاتى....) الاحزاب.

شـەونوێژ[(١)]، وە پـارێزران لـە گونـاهو هەڵـەو پەڵـەی بـە ئەنقەسـت[(٢)]، وە وەحـی بۆهـاتن[(٣)]، وە مـیرات لێ نـەگیران (**لا نـورث مـا تركنـاه صـدقة**) رواه البخاري،...هتـد، هـەموو ئـەو شـتانەو هاووێنـەكانیان، لـە ڕووی شـوێن كـەوتنی پێغەمبەری خواوە تێیاندا، لە دەرەوەی بازنەی سوننەتن بۆ ئێمـە، نـەك پابەندكـەر نین، بگرە دروستیش نین .

**حەوت : كەواتە : ئەوەی لەسەرمان پێویستە تێیدا شوێنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بكەوین و بیكەینە سەرمەشقمان، هەموو ئەو شتانەن كە وەك دین و وەحی خوا عز وجل پێی ڕاگەیاندووین، لە بوارەكانی : ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ڕەوشت و ئاكارو ئەو حەلاڵ و حەرام و فەرمان و ڕێگریی (الأمر والنهي) یانەدا، كە بنەما سەرەكییەكانی حوكم و سیاسەت و ئابووریی و جەنگ و ئاشتیی و ..هتد پێك دێنن:**

ئنجا وەك لە شوێنی دیكەشدا گوتوومـانە، شـەریعەتی خـوای كاربەجێ لەهەموو ئەو بـوارو لایەنانـەدا كـە لەمـەودای عـەقڵ و هۆشـی مـرۆڤ دانـین، وەك: ئیمـان و عەقیـدەو خواپەرسـتیی و بـاری كەسـێتیی و ڕەوشـت و بـەها بـەرزەكان، نوختـەی خستۆتە سەر پیت، بەڵام ئەو بوارو لایەنانەی كە مرۆڤ توانای بەسـەریاندا دەشـكێ

---

(١) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ﴾ الأحزاب: ٥٠.

(٢) ﴿ وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ﴾ الإسراء: ٧٤.

(٣) ﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ ﴾ النساء: ١٦٣.

وعەقڵی تێیان بڕ دەکات، وەك: جەنگ و ئاشتیی و مامەڵەو بازرگانیی و حوکم و سیاسەت و ئیدارەو سەرجەم وردەکارییەکانی بوارەکانی پیشەسازیی و کشت و کاڵ و ئاژەڵداریی و...هتد، شەریعەت بەوەندە وازی لێهێناون کە هێڵە گشتییەکانیان دیاریی بکات و بازنەیەکی فراوانیان بۆ دابنێ و، وردەکاریەکانیشیان بۆ عەقڵی مرۆڤ بەجێ بهێڵێ، کە بەگوێرەی پێویستیی کات و شوێن و ژینگە جۆراوجۆرەکان دیارییان بکات.

دیارە هەر لێرەشەوەیە کە زانایان لە ئەنجامی تێوەڕامان و لێوردبوونەوەی سەرجەم دەقەکانی قورئان و سوننەت دا، گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتە کە وەك بنچینەیەك بڵێن : (**تفصيل في الثوابت وإجمالٌ في المتغيرات**) بەدرێژیی دوان لەبارەی چەسپاوەکانەوە و بەکورتیی دوان لەبارەی گۆڕاوەکانەوە، کە بێگومان ئەوە بنچینەیەکی گرنگی ناسینەوەی دەقەکانی شەریعەتی خوای کاربەجێ و زاناو شارەزایە .

لێرەشدا کۆتایی بەم تەوەری یەکەمە دێنین و، دەچینە سەر تەوەری دووەم:



## تەوەری دووەم : حیکمەتەکانی هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) :

هەرچەندە هاوسەرگیریی یاسایەکی خوا ڕسکانە (قانون فطري) ی خوا و سوننەتێکی دێرینی پێغەمبەرانی خوایە (صلی الله علیه وسلم)، لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك هەر کردارو هەڵوێستێکی دیکەی، پڕ پڕە لە حیکمەت.

جا ئێمە بۆ خستنە ڕووی حیکمەتەکانی هاوسەرگیریی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، سەرەتا پێناسەیەکی کورتی هاوسەرە بەڕێزەکانی دەکەین و، بەپێی ڕێزبەندیی و کاتی هاوسەرگیریی کردنیان ڕیزیان دەکەین [1]، پاشان یەك بەیەك باسی حیکمەتی هاوسەرگیرییکردنی لەگەڵ هەر کامێکیان دا دەکەین :

لەبەراییشدا دەڵێین :

هەر چەندە مێژوونووسانی ئیسلام، تا ڕاددەیەك لەبارەی ژمارەی هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بیروڕای جیاوازیان هەیە، بەڵام ئەوەی کە هەموویان لەسەری پێکهاتوون ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەنیا ئەو یازدە(١١) هاوسەرەی گواستوونەوەو ژیانی ژن و مێردایەتیی لەگەڵیان

---

(١) بۆ نووسینی پێناسەی هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوا لێ یان ڕازی بێ، سوودم لەم دوو سەرچاوەیە وەرگرتوە:

١- سبیل الهدی والرشاد في سیرة خیر العباد) للإمام محمد بن یوسف الصالحي الشامي، ج١١، ص١٤٣-٢١٧.

٢-(المفصل..) للدکتور عبدالکریم زیدان، ج١١، ص٤٥٨-٤٧٦.



دابووە، ئەوانیش بەڕای زۆربەی هەرە زۆریـان، ئەگـەر نەشـڵێین هـەموویان، بـەپێی ڕێزبەندیی بوونە هاوسەریان، ئەمانەن :

١- خديجه بنت خويلد.
٢- سودة بنت زمعة .
٣- عائشة بنت أبي بكر الصديق.
٤- حفصة بنت عمر بن الخطاب.
٥- زينب بنت خزيمة الهلالية.
٦- أم سلمة.
٧- زينب بنت جحش
٨- أم حبيبة .
٩- جويرية بنت الحارث.
١٠- ميمونة بنت الحارث.
١١- صفية بنت حُيَي بن الأخطب.

شایانی باسیشە ئێمە لە دوو بڕگەدا ئەم تەوەرە دەخەینە ڕوو :
لەبڕگەی یەکەمدا پێناسەیەکی کورتی هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر دەکەین.
وە لەبڕگەی دووەم دا حیکمەتەکانی ئەو هاوسەرگیرییانە دەخەینە ڕوو .

## بڕگەی یەکەم: پێناسەیەکی کورتی هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ:

### ١- خديجه بنت خويلد رضي الله عنها :

(خديجة)، بابی (خويلد بن أسد بن عبدالعُزَّي) و دايكی (فاطمة بنت زائدة) يە، ئافرەتێكی ناوداری قورەيش بوو، پێش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دوو مێردی دیکەی کردبوون، یەکەمیان (عتيق بن عائذ) و دووەمیان (أبو هالة مالك بن بناش).

وەك لە (سيرة ابن هشام) دا هاتوە، پاش ئەوەی (محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب) لەگەڵ (مَيْسَرة) ی غولامی (خديجة) سەفەرێكی بازرگانی دەکات بۆ شام و (مَيْسَرة) بۆی باسی خوو ڕەوشت و ئاکاری بەرزی موحەممەد دەکات، لەڕاستیی و دەست پاکیی و ...هتد، (خديجة) بۆی پێشنیار دەکات کە ژیانی هاوسەرێتیی پێك بێنن، موحەممەدیش ڕاوێژ بە مامەکانی دەکات و سەرەنجام ئەو هاوسەرێتیی (زواج) یە دێتە دی.

شایانی باسیشە ئەو کاتە (محمد) تەمەنی بیست و پێنج (٢٥) ساڵ و (خديجة)ش چل (٤٠) ساڵ دەبێ و، پازدە (١٥) ساڵ پێش پێغەمبەرایەتیی دەبێ [1].

وە (خديجة) سێ ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وە هاوەڵانی بۆ مەدینە (يثرب)، لە تەمەنی شەست و پێنج (٦٥) ساڵییدا کۆچی

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج١، ص٢٠١-٢٠٦.

دوایی کردوەو، لە شوێنێك بەناوی (حجُـون) لە مەککە نێژراوە[1].

ئنجا خەدیجە پایەو پلەیەکی بەرزی هەیەو لەو بارەوە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆرن، بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا لە ستایشی دا فەرموویەتی : (**خیر نسائها مریم، وخیر نسائها خدیجة**) متفق علیه.

واتە: باشترین ئافرەتانی ئوممەتانی پێشوو مەریەمە، وە باشترین ئافرەتانی ئەم ئوممەتە خەدیجەیە .

هەروەها لە وەلآمی دایکمان (عائشە) دا، کە بەهۆی جوولآنی غەیرەو هەستی هەوێدارییەوە گوتوویەتی : خوا ژنێکی چاکتر لەوی پێداوی، فەرمووییەتی : (...**ما أبدلني الله خيراً منها، قد آمنت بي إذ كفر الناس وصَدَّقتني اذ كَذَّبتني الناسُ، و واَستني بمالها اذ حَرَمَني الناس، ورزقني الله أولادها إذ حَرَمني أولاد النساء**) رواه الشيخان وأحمد عن عائشە .

واتە: خوا عز وجل ژنی چاکتر لەوی پێنەداوم (چونکە) کاتێك خەڵك بڕوایان پێ نەهێنام، ئەو ئیمانی پێ هێنام، وەکاتێك خەڵك بەدرۆیان زانیم، ئەو بەڕاستی دانام، وەکاتێك خەڵك هاوکارییان نەکردم، ئەو بەماڵ و سامانی پشتگیرم بوو، وەلەکاتێکدا خوا لەژنەکانی دیکەمدا منداڵی پێنەداوم، لەوی منداڵی پێبەخشیم.

دیارە منداڵەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، جگە لە (إبراهيم) کە لە (مارية القبطية) یە خوا لێی ڕازی بێ، هەموویان لە (خديجة) ن، کە چوار کچ و دوو کوڕن و، ئەمە ناوەکانیانە بەگوێرەی ڕیزبەندیی تەمەن و لەدایك بوونیان:

١- قاسم .　　٢- زينب.　　٣- رقية

(١) تفسير القرطبي / ج١، ص١٦٤، وە(زاد المعاد) ابن قيم، ج١، ص٢٦.

٤- أم كلثوم. ٥- فاطمة ٦- عبدالله.

وە (عبدالله)، بە (الطيب) و (الطاهر) یش بانگ کراوە .

ئەمە هەرکام لە (ابن إسحاق) و (الطبراني) و (الدار القطني) هێناویانە[١].

## ٢- سَوْدة بنت زمعة رضي الله عنها :

(سودة)، بابی (زمعة بن قيس ابن عبد شمس)، دایکی (الشموس بنت قيس بن عمرو)ە.

پێش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هاوسەری کوڕە مامی خۆی (السَّكران بن عمرو) بوو، کە ئەویش مسوڵمان بووبوو، وە پێکەوە سەفەری حەبەشەیان کردبوو لە کۆچکردنی دووەمدا، وەپاش گەڕانەوەیان بۆ مەککە مێردەکەی مرد، ماوەیەك پاش مردنی خەدیجە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مارەی کردو، هەر لە مەککە بوون کە گواستبووشیەوە [٢].

وە (ابن كثير) هێناویەتی کە سەودە لەسەرەتاوە ناڕەزایی نیشان داوە، کە شوو بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکاتەوە، کاتێك لێی پرسیوە: بۆچی ڕازی نابیّ؟ گوتوویەتی: (يا نبيَّ الله ما يمنعني منك أن لا تكون أحب البرية اليّ ولكن اكرِمُكَ أن يمنعوا هؤلاء الصبية عند رأسك بكرة وعشية) [٣]. واتە: ئەوەی ڕێی لێگرتووم ئەوە نیە کە خۆشەویستترین کەس بی لەلام، بەڵام بەدوورت دەگرم کە منداڵەکانم بەیانیان و ئێواران لە بن سەرت دەنگە دەنگ بکەن و ناچاربن لێت دووربخەنەوە !

(١) (سبيل الهدى والرشاد...) ج١١، ص١٦-١٧.

(٢) زاد المعاد، ج١، ص٢٦.

(٣) البداية والنهاية، ج٣، ص١٣٣.

دیارە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەڵامی داوەتەوە کە ئەمە گرفت نیە، هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن : لە ڕۆژگاری خیلافەتی عومەردا، هەندێکیش دەڵێن لە ڕۆژگاری حوکمڕانیی موعاویەدا، لە ساڵی پەنجاو چوار (٥٤) ی کۆچیدا مردوە[1].

## ٣- عائشة بنت أبي بكر رضي الله عنها:

(عائشة)، بابی (عبدالله بن عثمان بن عامر) کە بە (أبو بكر بن أبي قحافة) ناسراوە، دایکی (أُمُّ رومان بنت عامر بن عُوَيمر) ﻫ .
دەوری هەشت (٨) ساڵ پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە لەدایك بووە، واباوە کە لەتەمەنی شەش (٦) ساڵییدا بابی لە پێغەمبەری خوای مارەکردوەو، لە تەمەنی (٩) ساڵییدا لە مەدینە گوازراوەتەوە، کونیەکەی (أم عبدالله) بووە، کە مەبەست لە (عبدالله)، (عبدالله) ی کوڕی (زبیر) ی خوشکەزایەتی کە دایکی (أسماء بنت أبي بكر)ﻫ، خوا لێیان ڕازی بێ.
لەتەمەنی شەست و شەش (٦٦) ساڵییدا لە ساڵی پەنجاو هەشت (٥٨) ی کۆچیدا، کۆچی دوا یی کردوە و لە گۆڕستانی بقیع بەخاك سپێردراوە[2].
(بخاري) لێی گێڕراوەتەوە کە گوتوویەتی :
(قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم أُرِيتُك في المنام يجيءُ بك المَلَكُ في سَرَقَةٍ من حرير فقال: هذه امرأتك، فكشفتُ عَن وجهكِ الثوبَ فأذا أنتِ هي، فقلت، إن يَكُ هذا من عند الله يُمْضِه) واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم : دوو جاران لە خەون دا تۆیان نیشان داوم، فریشتەیەك لە

---

(١) سبيل الهدى والرشاد.... ج١١، ص٢٠٠.
(٢) زاد المعاد، ج١، ص٢٦، وە : (فتح الباري) ج٧، ص١٠٧.

پارچە ئاوریشمێك دا هێنایتی (واتە: وێنەکەت) گوتی: ئەوە ژنەکەتە! منیش پەڕۆیەکەم لەسەر ڕووت لادا، تۆبووی، گوتم: ئەمە ئەگەر لە خواوە بێ، جێ بەجێ ی دەکات.

فەرموودەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە ستایشی عائیشەدا زۆرن، بۆ نموونە:

١- (عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم يوماً يا عائشة ! هذا جبريلُ يُقرِئك السلاَم، فقلتُ: وعليه السلام ورحمة الله وبركاته) متفق عليه.

واتە: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ئەی عائیشە! ئەمە جبریلە سەلامت لێ دەکات، منیش گوتم : ئەویش سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای لەسەر بێ .

٢- (عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: سمعتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم يقول : فضل (عائشة) على سائر النساء كفضل الثريد على سائر الطعام) متفق عليه.

واتە : پلەو پایەی (عائشە) بەسەر ژنانی دیکەوە، وەك چاکیی و پلەی (ثَريد)ە بەسەر خواردنەکانی دیکەدا.

٣- (عن عمرو بن العاص قال : قلتُ لرسول الله صلى الله عليه وسلم : أي الناس أحبُ اليك؟ قال: عائشة، فقلتُ : ومن الرجال ؟ قال : أبوها، فقلت : ثم مَنْ؟ قال : ثم عمر بن الخطاب، فعدَّ رجالاً...) رواه البخاري.

وە(إبن قيم الجوزية) لەبارەیەوە گوتوویەتی :

(الصديقة بنت الصديق المبرأة من فوق سبع سموات، حبيبة رسول الله صلى الله عليه وسلم عائشة بنت أبي بكر الصديق، وما نزل عليه الوحي في لحاف

امرأة غيرها، وكانت أحبُ الخلق اليه، ونزل عُذْرها من السماء واتفقت الأمة على كفر قاذفها وهي أفقه نسائه وأعلمهن، بل أفقه نساء الأمة وأعلمهن على الإطلاق، وكان الأكابر من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم يرجعون الى قولها ويستفتونها) [1].

واتە: زۆر ڕاستگۆی کچی زۆر ڕاستگۆ، بە پاکدانراو لەسەر ڕووی حەوت ئاسمانەوە، خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) عائیشەی کچی ئەبوبەکری صیددیق، وە تەنیا لەنێو جێی ئەودا وەحی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەزیوە، وە لە هەموو کەس لەلای خۆشەویست تر بوو، وە لە ئاسمانەوە پاکیبیەکەی و بێ گوناهیبیەکەی دابەزی، وە ئوممەت یەکدەنگە، کە بوختان پێکەری کافرە، وە لە هەموو هاوسەرەکانی شارەزاترو زاناتر بووە، بەڵکو بەرەهایی شارەزاترین و زاناترین ئافرەتی ئوممەتە، وە گەورە گەورانی هاوەڵان دەگەڕانەوە لای قسەی وی (لەزۆر مەسەلان دا) وە پرسیاریان لێدەکرد.

## ٤- حفصة بنت عمر بن الخطاب رضي الله عنها:

(حفصة) بابی : (عمر بن الخطاب بن نُفَيل ابن عبدالعُزّي)، و دایکی (زينب بنت مظعون) ە، خوشکی (عثمان بن مظعون)ە .

پێنج ساڵ پێش وەحی بۆ هاتن و ڕەوانەکران (بعثة) ی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەدایك بووە و، لەساڵی سێیەمی کۆچییدا، پاش کۆچی دوایی مێردەکەی (خُنَيسْ بن حذافة السَّهمي) کە لە خاوەنانی دوو کۆچکردنەکەن (أصحاب الهجرتين)و کۆچی بۆ حەبەشەو بۆ مەدینەش کردووە بووە و بەهۆی

(١) زاد المعاد، ج١، ص٢٦.

برینێکەوە کە لەجەنگی ئوحود دا تێیبوەو مـردوە، پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی .

وە لەسـاڵی چـل و یـەك (٤١)، هەنـدێکیش گوتوویانـە چـل و پێـنج (٤٥) ی کۆچیی دا لەتەمەنی شەست (٦٠) یان شەست و چوار (٦٤) ساڵییدا مـردوەو، لە گۆڕستانی (بقیع) دا بەخاك سپێردراوە[1].

وە شایانی باسیشە کە ئەو (مُصْحف) ەی لە ڕۆژگاری خەلیفایەتیی (أبـو بکـر) داو بە پێشنیازی (عمر) خوا لێیان ڕازی بێ، لەنێو دووبـەرگ دا ڕێکخـرا، کـە پێی گوتراوە (المصحف الإمام) پاش مردنی (عمـر) لـەلای (حفصـة) ی کچـی بوو، هەتا دوایی (عثمان) لێی وەرگرت و، چـەند نوسـخەیەکی لەبـەر گرتـەوە بەسەر شارە گەورەکاندا دابەشی کردن.

وەهەرکام لە (الطبراني) و (ابن أبي خَيْثمة) و (أبو داود) و (النَّسائی) و (ابـن ماجه) لـە (قـیس بـن سـعد) و (أنـس) و (ابـن عمـر) ەوە گێڕاویانەتـەوە، کـە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەلاٚقێکی (حفصة)ی داوە، بەلاٚم (جبریل) پێی فەرموە (راجع حفصة فإنها صَوَّامة قَوَّامَة، وإنها زوجتك في الجنـة) واتـە: حفصـە بگێـڕەوە، چـونکە زۆر ڕۆژووگـرو شـەونوێژ کـەرە، وە هاوسەریشـتە لەبەهەشت[2].

## ٥- زينب بنت خزيمة الهلالية رضي الله عنها:

(زینـب بنـت خزیـة)، بـابی : (خزیمـة بـن الحـارث بـن عبـدالله بـن عمـر بـن عبدمناف)ە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاش کوژرانی مێردەکەی (عبـدالله

(١) (المفصل...) ج١١، ص٤٦٦-٤٦٨، وە (سبل الهدی والرشاد) ج١١، ص١٨٤-١٨٦.
(٢) سبیل الهدی والرشاد.... ج١١، ص١٨٥.

بن جحش بن رئاب) لە جەنگی ئوحوددا، پاش سی و یەك (٣١) مانگ لە کۆچکردن بۆ مەدینە، (هێنای و تەنیا هەشت (٨) مانگ لەلای مایەوە و، لەکۆتایی سی و نۆیەمین مانگ پاش کۆچکردن، مردوەو لە گۆڕستانی (البقیع)دا بەخاك سپێردراوە .

## ٦- أم سَلَمة رضي الله عنها:

(أم سلمة) ناوی (هند)ە، بابی (حذافة بن المغیرة (أبو أمیة المخزومي)و، دایکی (عاتكة بنت عامر بن ربیعة) یە، پێشتر هاوسەری ئامۆزایەکەی خۆی : (أبو سلمة بن عبد الأسد) بوو کە کوڕی پوور (عمة) ی پێغەمبەرە، واتە: (بَرّة بنت عبدالمطلب) کە لەکۆچکەرانی حەبەشە بوو، خۆی و خێزانی و بەهۆی برینداری جەنگی ئوحودەوە مردوە، ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ (أمّ سلمة) پێشنیار دەکات کە مارەی بکاتەوە، دوو هۆکار وەك رێگر (مانع) باس دەکات، وەك (مسلم و أحمد) [1] هێناویانە :

یەك: کە زۆر غەیرە داره (إني امرأة شديدة الغَيْرَة).

دوو: کە منداڵبارو هەتیویارە (وإني أمرأة مُصْبِيَةٌ).

پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە وەلامی دا دەفەرموێ :

بەنسبەت غەیرەتەکەتەوە لەخوا دەپارێمەوە کە لایبەرێ، وە بەنسبەت منداڵەکانیشتەوە، خوا مشووریان دەخوات (بژێویان دەدات).

دیارە هەڵوێستی (أم سلمة) ش لە صولحی حودەیبییەدا ئاشکرایە، وەك لە (صحیح البخاري) و (صحیح مسلم) دا هاتوە، کە پێش ئیمزاکردنی ئەو

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٨٨.

ڕێککەوتن نامەیە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەرچەندە سێ جاران بە هاوەڵانی دەفەرمویّ کە قوربانییەکانیان سەربڕن و سەریان بتاشن، هیچیان ئامادە نابن و سەرەنجام کە بۆ (أم سلمة) ی باس دەکات، پێی دەڵێ : بۆخۆت هەڵسە قوربانییەکەت سەربڕە و بانگ بکە سەرتاش سەرت بتاشێ، کەوات کرد ئەوانیش بەناچاریی شوێنت دەکەون، وە بەکردەوەش هەروادەبێ و بەپێشنیاری ئەو ژنە عاقلە، گرفتێکی گەورە چارەسەردەبێ [(١)].

## ٧- زينب بنت جحش رضي الله عنها:

(زینب)، بابی (جحش بن رياب بن يعمر ابن صبرة ابن خزيمة) و، دایکی (أميمة بنت عبدالمطلب) پوور (عمة) ی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم).

دیارە ئەویش ناوی (بَرَّة) واتە: چاکەکار، بوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گۆڕیویەتی بە زەینەب چونکە (بَرَّة) بۆنی تەزکیە خۆکردنی لێ دێ.

شایانی باسیشە کە (زینب) ی کچی جەحش تاکە هاوسەرێکی پێغەمبەری خوایە کە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا عز وجل لێی مارەکراوە، وەك خوا فەرموویەتی:﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ﴾ الأحزاب: ٣٧ .

هەربۆیەش زەینەب شانازیی بەسەر هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دەکردو دەیگوت: (زوَّجَكُنَّ أهاليكُنَّ وزوَّجني الله تعالى من فوق سبع سموات) رواه البخاري، واتە: ئێوە کەس و کارتان مارەی کردوون، بەڵام من خوای بەرز لەسە رووی حەوت ئاسمانانەوە مارەی کردووم.

---

(١) صحيح البخاري: ٣١٨٢، صحيح مسلم:١٧٨٥.

(الطبراني) هێناویەتی کە زەینەبی کچی جەحش، لە ساڵی بیست (٢٠) ی کۆچیی دا مردوەو پێش هەموو هاوسەرەکانی دیکە، پاش مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مردوە.

ئنجا وێڕای هاوسەرەکانی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەمسۆگەریی کەنیزەیەك (جاريە)یكیشی هەبووە بەناوی (مارية القبطية)، هەروەها باسی سێ کەنیزەکی دیکەش دەکرێ، بەناوەکانی : (رَيْحانة) و (جميلة) و (نفيسة)، بەلاَم زانایان مشت و مڕیان لەبارەیانەوە هەیە .

ئنجا هەرچی (مارية) یە، کچی (شَمعون)ەو، (المقوقس) حاکمی ئەسکەندەریە لە (مصر) لەگەڵ خوشکێکی بەناوی (سيرين) بۆی ناردبوو، پاش ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نامەیەکی بە (حاطب بن أبي بلتعة) دا بۆ ناردبوو بانگی کردبوو بۆ ئیسلام، لەساڵی شەشەم دا پاش صوڵحی حودەیبییە[1].

## ٨- أم حبيبة رضي الله عنها:

(أم حبيبة)، بابی (أبو سفيان بن صخر بن حرب الأموي) و، دایکی (صفية بن أبي العاص) پوور (عمة) ی (عثمان بن عفان)ە، خوا لێی رازی بێ.
دیارە (أم حبيبة) ناوی (رَمْلَة) بەو کاتی خۆی لەگەڵ (عبيدالله بن جحش) ی مێردی دا کۆچی کردوە بۆ حەبەشەو، لەوێ مێردەکەی لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە نەصرانیی، بەلاَم ئەو دامەزراوو نەلەخشاو دەبێ، وە کچێکی لەو مێردەی دەبێ بەناوی (حبيبة) و بەوەوە کونیەدار دەبێ .

(١) سبل الهدى والرشاد، ج١١، ص٢١٩.

چۆنیەتی هاوسەرگیرییشی لەگەڵ پێغەمبەر دا، ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (عمرو بن امية الضَّمري) دەنێرێتە لای (النجاشی) و ئەویش پاش بانگکردنی (خالد بن سعيد بن العاص) کە (أم حبيبة) دەیکاتە وەکیلی خۆی، لە پێغەمبەری خوای مارە دەبڕێ و نەجاشی لەجیاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوارسەد دینار مارەیی دەداتێ .

پاشان لەساڵی حەوتەمی کۆچی دا بە (شرحبيل بن حسنة) دا ڕەوانەی شاری مەدینەی دەکات.

وە (أم حبيبة) لە ساڵی چل و چوار (٤٤) ی کۆچی دا مردوەو لە گۆڕستانی (بقيع) دا بەخاك سپێردراوە.

## ٩- جويرية بنت الحارث رضي الله عنها:

(جويرية) ناوی (بَرَّة) بووە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گۆڕیویەتی بۆ (جُوَيرية) ە، بابی : (الحارث بن أبي ضرار بن الحارث بن المُصْطَلَق)ە.

پێشتر هاوسەری (مُسافِعْ) بوو کە بە کافریی کوژراوە، لە جەنگی (المُرَسيع) دا کە بە (غزوة بني المصطلق) ناسراوە، بەدیل گیراوەو کەوتۆتە پشکی (ثابت بن قيس بن شماس)ەوەو، هاتۆتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) داوای هاوکاریی لێکردوە بۆ ئازاد بوونی، ئەویش بۆی پێشنیار کردوە کە لەجیاتی ئەوە، مارەی بکات و مارەیی یەکەشی بەهای ئازادکردنەکەی بێ، ئەویش ڕازی بووە.

دیارە ئەو جەنگەش لەساڵی شەشەمی کۆچیی دابووە، ئنجا کاتێك مسوڵمانان دەبیستن کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (جُوَيْرِية) ی مارەکردوە کە

کچی سەرۆکی هۆزی (بنو المصطلق)ە، سەرجەم دیلەکان ئازاد دەکەن و دەڵێن : ناگونجێ خەزووران (أصهار) ی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دیل و کۆیلە بن، دیارە (الحارث) یش دوایی مسوڵمان بووە، وە جوەیرییە لە ساڵی پەنجا (٥٠) دا کۆچی دوایی کردوو لە گۆڕستانی (البقیع) دا بەخاك سپێردراوە.

## ١٠- میمونة بنت الحارث الهلالیة رضي الله عنها:

(مَیمونة) ناوی (بَرَّة) بووەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گۆڕیویەتی بۆ مەیموونە کە لەزمانی کوردیی دا بە مانای پیرۆزە، یان خێردار دێ .

بابی (الحارث بن حَزَن ابن بُحَیر ابن الهُزم ابن رویبة)و، دایکی (هند بنت عوف بن زهیر بن الحارث..)ە .

پێشتر هاوسەری (أبو رَهْم بن عبدالعزّي) بووەو، پاش مردنی لە کاتی عومرەی گێڕراوە (عُمرة القضاء) دا لە ساڵی حەوتەم دا، دوای ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خواستوویەتی (عباس بن عبدالمطّلب) مامی پێغەمبەری خوای کردۆتە وەکیل و، ئەویش لە پێغەمبەری خوای مارە کردوە، وەك (أحمد و النسائي) هێناویانە : (أن رسول الله صلی الله علیه وسلم خطب میمونة بنت الحارث فجعلت أمرها الی العباس فزوَّجها النبيُّ صلی الله علیه وسلم)، شایانی باسیشە کە (میمونة) پلك (خالة)ی هەرکام لە (عبدالله بن عباس) و (خالد بن الولید) بووە.

لە ساڵی شەست و یەك (٦١) دا کۆچی دوایی کردەو، لە گۆڕستانی (بقیع) دا بەخاك سپێردراوە.

## ١١- صفية بنت حيي بن أخطب رضي الله عنها:

(صَفية)، بابی (حُيَيْ ابن أخطب ابن شعبة ابن ثعلبة بن النضير) ەو سەرۆکی هۆزی (بنو النّضير)ی جوولەکەیەو، لە وەچەی (هارون)ە عليه السلام، وە دایکی : (برة بنت سمؤل)ی خوشکی (رفاعة بنت سمؤل القرظي).
شایانی باسە (حُيي) لە ساڵی حەوتەم دا لەگەڵ هۆزی (بنو قريظة) ی جوولەکەدا کوژرا، پاش پەیمان شکاندنی بەنو قورەیزە لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) .
دیارە (صفية) ش بێوەژن بووەو هاوسەری (كنانة بن أبي الحقيق) بووەو، پاش بەدیل گیرانی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاش سەرپشککردنی لەنێوان هاوسەرگیریی لەگەڵیداو ڕۆیشتنی دوای ئازادکردنی، هاوسەرگیریی لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هەڵبژاردووە، پێغەمبەریش مارەییەکەی کرۆدتە بەهای ئازادکرانی.
وە صەفییە لە ساڵی پەنجا (٥٠)، یان پەنجاو دوو (٥٢) دا کۆچی دوایی کردوە، لە گۆڕستان (بقيع) بەخاك سپێردراوە.

ئێستاش بەر لەوەی دەست بکەین بە خستنە ڕووی حیکمەتەکانی هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هاوسەرە بەڕێزەکانی دا، بەپێویستی دەزانم چەند زانیارییەکی دیکە لەبارەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر، دایکانی بڕواداران (أُمهات المؤمنين) ەوە بخەینە ڕوو:
یەك: دایکانی ئیمانداران خوا لێیان ڕازی بێ لەڕووی ڕەچەڵەك و هۆزەکانیانەوە بەجۆرەن :
١) شەشیان لە هۆزی قورەیشن کە ئەمانەن :

١- خديجة بنت خويلد　　٢- عائشة بنت ابي بكر

٣- حفصة بنت عمر بن الخطاب　　٤- أم سلمة

٥- أم حبيبة　　٦- سودة بنت زمعة.

٢) وە چواریان لە هۆزەکانی دیکەی عەرەبن کە ئەمانەن :

٧- زينب بنت جحش بن رياب　　٨- ميمونة بنت الحارث

٩ - زينب بنت خزيمة　　١٠- جويرية بنت الحارث.

٣) وە یەکێکیان لە وەچەی ئیسرائیلە کە بریتییە لە :

١١- صفية بنت حيي بن أخطب النضيري[1].

دوو: دووان لە هاوسەرانی بەرێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ژیانی خۆی دا مردوون، کە بریتین لە :

١- خديجة بنت خويلد

٢- زينب بنت خزيمة بن الحارث (أم المساكين).

بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان پاش خۆی کۆچی دواییان کردوە .

سێ : تەنیا (خديجة) لەشاری مەککە لە (حجون) بەخاك سپێردراوە، ئەوانی دیکە هەموویان لە گۆڕستانی (بقيع) بەخاك سپێردراون .

چوار: هاوسەرانی بەرێزی پێغەمبەر خوایان لێ ڕازی بێت، چەند تایبەتمەندییەکیان هەن، کە ئەمانەن :

١- هاوسەرانی پێغەمبەری خوا خوا لێیان ڕازی بێت، بە دایکی پیاوانی بڕوادار دادەنرێن، وەك خوا تبارك وتعالى فەرموویەتی : ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴾ الأحزاب: ٦، واتە:

(١) سبل الهدى والرشاد، ج١١، ص١٤٣-١٤٥.

پێغەمبەر لە خودی خۆیان بۆ بڕواداران لە پێشترە وە هاوسەرەکانی دایکانیانن... (القرطبي) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی : (شرَّف الـه تعالى أزواج نبيه بأن جعلهن أمهات المؤمنين، أي في وجوب التعظيم وَالمبَرَّة وَالإجلال، وحرمة النكاح على الرجال) [(١)].

واتە: خوای بەرز، ڕێزی لە هاوسەرانی پێغەمبەرەکەی ناوە، کە گێڕاونی بە دایکانی ئیمانداران، واتە: لە پێویست بوونی بە گەورە گرتن و چاکە لەگەڵ کردن و ڕێز لێنانیان داو، لەوەدا کە پیاوان لێیان قەدەغەیە هاسەرگیریان لەگەڵ بکەن...

ئاشکراشە کەمەبەست لە دایکبوونی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئیمانداران، بەس ڕێزو حورمەت لێگرتنیانە و قەدەغە بوونیانە لەسەر پیاوان، نەك لەهەموو ڕوویێکەوە، وەك میرات لێگرتنیان و حەلاڵ نەبوونی کچەکانیان بۆ هاوسەرگیریی و، هەروەها تەماشاکردنیان و خەڵوە لەگەڵ کردنیان، وەك هەرکام لە : (القرطبي) و (ابن العربي) و (الزمخشري) و (الآلوسي) گوتوویانە[(٢)].

٢- هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوای مردنی لەسەر پیاوانی ئیماندار قەدەغەبوون، کە هاوسەرگیریان لەگەڵ بکەن، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥٣ .

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤، ص١٢٣.

(٢) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤، ص١٢٣، أحكام القرآن، ج٣، ص٤٩٦، الكشاف، ج٣، ص٥٢٣، روح المعاني، ج٢١، ص١٥١.



واتە: وەبۆتان نیە کە ئازاری پێغەمبەری خوا بدەن، هەروەها بۆتان نیە هەرگیز کە دوای خۆی هاوسەرەکانی مارەبکەنەوە، ئا ئەوەتان لەلای خوا شتێکی مەزنە .

٣- دوو چەندان کرانەوەی پاداشت و سزایان، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی : ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ۝٣٠ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحٗا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقٗا كَرِيمٗا ۝٣١ ﴾ الأحزاب: ٣٠ — ٣١، واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ! هەرکامێکتان خراپەیەکی ئاشکرا بکات، سزای بۆ دووبەرانبەر دەکەینەوە و ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە، وەهەرکەسێکتان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ملکەچ و گوێڕایەڵ بێ، دووجار پاداشتی دەدەینەوە و بژێوێکی باش و پڕ ڕێزو حورمەتمان بۆ ئامادەکردوە.

وەك پێشتریش ڕوونمان کردۆتەوە، مەبەست لە: ﴿ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴾ و لێرەو لەهەر جێیەکی دیکەی قورئان دا، سەرپێچیی و یاخیبوون (نشوز)ە، نەك زینا، وەك زۆربەی توێژەروان گوتوویانە و، وەك دیاریشە لێرەدا ﴿ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴾ لەگەڵ ﴿ يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾دا بەراورد کراوە، کە دیارە پێچەوانەو دژی ملکەچیی و گێڕایەڵییش، یاخیبوونو بە قسە نەکردنە.

## بڕگەی دووەم : حیکمەتەکانی هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) :

خوێنەری سەنگین!

بەر لەوەی باسی حیکمەتی یەکە یەکەی هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەین، بەشێوەیەکی گشتی لەبارەی هاوسەرگیرییەکانی یەوە دەڵێین:

### یەکەم: حیکمەتی گشتی هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)

#### ١- هاوسەرگیریی یاسایەکی خوایە لە ژیانی مرۆڤ دا :

وەك پێشتریش باسمان کرد، خوای کاربەجێ ژیانی مرۆڤی لەسەر زەوی وا هەڵخستوە، کە بەبێ هاوسەرگیریی، وەچە (نَسْل) ی بەردەوام نەبێ، بۆیە خودی هاوسەرگیریی لە بنەڕەتدا جێ بەجێ کردنی ئەو یاساو سوننەتەی خوایە و هیچ ئیشکالێکی تێدانیە، بگرە پێچەوانەکەی جێی ئیشکالە، خوای زاناو تواناش فەرموویەتی : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴾ الفرقان: ٥٤، واتە: وە خوا ئەو کەسەیە کە مرۆڤی لە ئاو وەدیهێناوە، پاشان وەچەکەی بەهۆی خزمایەتی پشتێ و بەرێ وە بەردەوام کردوە .

## ٢- هاوسەرگیریی سوننەتی پێغەمبەران بووە بە گشتی:

وەك خـــوای كاربـــەجێ فەرموويـــەتی : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ﴾ الرعد: ٣٨، واتە: بێگومان لـەپێش تـۆش دا پێغەمبەرانمان ناردوون و، هاوسەرو وەچەشمان پێیان داوە.

## ٣- پیاوەتیی پیاوان (فحولة الرجال) نەك هەر جێی ڕەخنە نیە، بگرە سیفەتێكی پەسەندەو، گرنگ ئەوەیە بەشێوازی نا شەرعییانە تێر نەكرێ :

بەڵێ، بەهێز بوونی غەریزەی جینسیی پیـاوان بەمایـەی ڕەخنـە لـێگیران دانانرێ، مادام لە ئاست ناشەرعیی دا خۆیان كۆنترۆڵ بكـەن و لانـەدەن، كە بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وابـووە، وەك خـاتوون عـائیشەی هاوسەری گوتوویەتی :
(وأيكم يملك إربَهُ كما كان رسول الله يملك إرْبَـهُ ! !) متفق عليـه[١]، واتە: ئایە كامەتان وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) غـەریزە و ئارەزووی خۆی كۆنترۆڵ دەكرد!! .




(١) صحيح البخاري:١٩٢٧، وصحيح مسلم: ١١٠٦.

**٤- هاوسەرگیرییکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ زیاتر لە چوار هاوسەردا، کۆمەڵێك هۆکاری یاسادانان (تشريعي) و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و پەروەردەو فێرکردنی هەبوون:**

**أ- هۆکاری یاسادانان :**

بۆ نموونە، هەڵوەشاندنەوەی عادەتی ژنی کوڕی بەکوڕکراو (الإبن المتبنَّى) کە لە بەسەرهاتی (زید بن حارثة) و (زینب بنت جحش) و مارەکردنەکەی زەینەب لەلایەن خوای پەروەردگارەوە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پاش جیابوونەوەی لە زەید دا زۆر جوان دیارە، وەك دوایی لە ڕوونکردنەوەی حیکمەتی هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ زەینەب دا باسی دەکەین .

**ب- هۆکاری سیاسیی :**

کە گرنگترینیان پەیوەندیی دروست کردن، یان بەهێزکردنی بوو لەگەڵ ئەو تیرەو هۆزو قەوارە سیاسییانەدا، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئافرەتی لێ دەخواستن، وەك دوایی لە کاتی خستنە ڕووی حیکمەتی یەك یەکی هاوسەرگیرییەکاندا، دەیخەینە ڕوو.

**جـ- هۆکاری کۆمەڵایەتیی :**

کە گرنگترینیان گرتنە خۆو سەرپەرشتیکردنی ئەو ژنانە بوو کە هاوسەرەکانیان دەکوژران، یان دەمردن و هەیانبوو بە کۆشێك منداڵی سەلکەو پێچکەوە بێوەژن دەبوو.

**د- هۆکاری پەروەردەو فێرکردن:**

کە ئەمیش بەجوانترین شێوە لەو هەموو حوکم و ئەدەبە شەرعییانەدا کە

دایکانی بڕواداران (أمهات المؤمنین) لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بە ئوممەتیان گەیاندووەن، درەوشاوەو نمایانە و، بێگومان بەو ژمارە زۆرەی ئەو بەڕێزانە نەبوایە، نەدەگونجا ئەو هەموو یاساو ئەدەب و ڕەوشتانە بەو هەموو وردەکارییەوە نەقل کرابان، هەروەها لەسەرێکی دیکەشەوە، ئەو دایکە بەڕێزو خۆشەویستانەمان خوا لێیان ڕازی بێ، هاوکارو دەست بارگرێکی باشی پێغەمبەر بوون، بۆ ڕوونکردنەوەو گەیاندنی زۆرێك لە یاساکانی بواری باری کەسێتیی و خێزان و ئەدەبەکانی، کە بەشێکیان هەر ناگونجێ پیاوان باسیان بکەن، بگرە هەر ناشتوانێ وەك هەموو ئەو مەسەلانەی، کە پەیوەستن بە ژنان و تایبەتمەندییەکانیانەوە لە زەیستانیی و حەیزو عیددە و شیرپێدانی منداڵ و بەخێوکردنی و ....هتد.

## دووەم: حیکمەتی تایبەتیی یەك یەکی هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) :

### ١- خدیجة:

بێگومان هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ (خدیجە) دا، هیچ یەکی لەسەر ڕوونکردنەوەی هۆکارو حیکمەتەکەی نەکەوتوە، بۆ پاساودانەوە (تبریر) ی هێنانی، چونکە:

أ- یەکەمین هاوسەری بووە، هەموو پیاوێکیش مافی خۆیەتی بەلای کەمەوە هاوسەرێکی هەبێ .

ب- بێوەژن بووەو پازدە (١٥) ساڵیش لەخۆی بەتەمەنتر بووە.

بگرە سەرەڕای ئەوەش هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ خەدیجەدا، لە حاڵێك دا کە بێوەژنێکی چل ساڵە بووەو موحەممەدیش گەنجێکی بیست و پێنج (٢٥) ساڵە، پاشان مانەوەی لەگەڵیدا، هەتا کۆچی

دوایی کردنی و نەهێنانی ژنی دیکە، واتە:
بەرێکردنی هەموو تەمەنی گەنجێتی لەگەڵیدا، چونکە لەکاتی مردنیدا، خەدیجە شەست و پێنج (٦٥) ساڵ و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) تەمەنی پەنجا (٥٠) ساڵ بووە! بەڵێ هاوسەرگیریی پێغەمبەری خوا لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا، وەلامێکی ددان شکێنی تێدایە، بۆ هەموو ئەوانەی گومانی خراپ بە پێغەمبەری خوا دەبەن و پێیان وایە که ئه و ژمارەیە لە هاوسەرانی، بەهاندەری تێرکردنی غەریزەی جینسیی هێناوەو هیچی دیکە! چونکە بێگومان غەریزەی جینسیی پیاوان، زیاتر لەنێوان تەمەنی (٢٠) بۆ (٥٠) ساڵدا بەهێزە، کەچی ئەو زاتە بەرزە سەرجەم ئەو تەمەنەی لەگەڵ بێوەژنێکدا بەرێ کردوە، کە پازدە ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە و لەکاتی مردنیدا تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بووە!
هەڵبەتە کاتێکیش لە ژیان و هەڵوێستەکانی خاتوون خەدیجە ورد دەبینەوە، کە چۆن پشتگیر و هاوکارو هاندەری هاوسەرە بەرێزەکەی بووە و، بۆی وەك قەلایەکی مەحکەم بووە، زیاتر لە حیکمەتی خوای کاربەجێ تێدەگەین، کە بۆچی ئەو هاوسەرە دەگمەن و ناوازەیەی لەسەرەتای تەمەنی هاوسەرداریی یەوە، بۆ پێغەمبەرەکەی هەڵبژاردوە.

**٢- سَوْدَة :**

وەك پێشتر لە پێناسەی هاوسەرە بەرێزەکانی پێغەمبەردا خوا لێیان رازی بێ، باسمان کرد، خاتوون سەودەی کچی زەمعە، بێوەژنێکی بەتەمەنی خاوەن کۆشێك منداڵ بووە، کە شووی بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کردۆتەوە، پاش مردنی سەکرانی مێردی خوا لێی رازی بێ، تەنانەت خاتوو سەودە لەسەرەتاوە ئامادەی ئەو هاوسەرگیرییەش نەبووەو مەترسیی

ئەوەی هەبووە، کە منداڵەکانی، پێغەمبەری خوا بێزار بکەن ! جا ئایە جگە لە پەنای خۆگرتن و حاواندنەوەو دەست بەسەری هەتیوەکانیدا هێنان، دەبێ چ شتێکی دیکە هاندەری پێغەمبەری خوا بووبێ بۆ هاوسەرگیریی کردنی لەگەڵ بێوەژنێکی ئاوادا؟!

هەرچەندە بێگومان تێرکردنی ئارەزووی جینسیی لە رێیەکی شەرعییانەوە، هیچ نەنگییەکی تێدانیەو شتێکی ڕاست و ڕەوایە.

**٣- عائشة :**

دیارە خاتوو عائیشە تاکە هاوسەری کچ بووە کە پێغەمبەر هێناویەتی و، وەك لە پێناسەکەشیدا هێنامان، هەڵبژاردنی ئەو ئافرەتە ناوازەو هەڵکەوتووە، بەر لەوەی دەستی پێغەمبەری خوای تێدابێ و بیری لێ بکاتەوە، لەلایەن خوای کاربەجێ وەبووە، دیارە دواتریش کە لەتەمەن و ژیانی ئەو هاوسەرە پاك و بەرێزو دڵسۆزەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ورد دەبینەوە، حیکمەتی خوای بەرزو مەزنمان وەك ڕۆژی روون بۆ دەردەکەوێ، بەتایبەت لەو ڕووەوە کە لەگەڵێك بواری دینداریی دا، نەك هەر زۆر فەرمایشتی پێغەمبەری بۆ نەقڵ کردووین، بەڵکو زۆر جاران ئیجتیهادیشی کردوەو، جاروباریش هەڵەی هەندێك لە هاوەڵانیشی ڕاست کردۆتەوە، لەو مەسەلانەدا کە زیاتر پەیوەستن بە بواری ئافرەت و خێزانەوە.

ئنجا بێگومان وێڕای ئەوەش حیکمەتێکی دیکەی ئەو هاوسەرگیرییە ئەوەبوو، کە پێغەمبەری خوا پەیوەندیی نێوان خۆی و نیزیکترین و دڵسۆزترین هاوەڵی، کە (أبو بكر الصديق)ە خوا لێی ڕازی بێ، بەهێزو پێزتر بکات و ئەو شانازییەش بەو پیاوە بەرزو دڵسۆزەو بنەماڵەکەی ببڕێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ببێتە زاوایان !

**٤- حفصة:**

حیکمەت لە هێنانی خاتوون حەفصەش دا ئەوەیە، کە لەلایەکەوە کچی هاوەڵی دڵسۆزو مشوورخۆرو نیزیکی عومەری کوڕی خەتاب بووەو، بەهۆی ئەو هاوسەرگیرییەوە، ئەو برایەتیی و نیزیکییە مەحکەمتر بووەو بۆ عومەرو بنەماڵەکەشی شانازییەکی گەورە بووە، کە ببنە خەزوورانی پێغەمبەری کۆتایی .

وە لەلایەکی دیکەشەوە ڕێزلێنان و دەست بەسەر داهێنانی بێوەژنێك و هاوسەری کۆست کەوتووی جەنگاوەرێکی ئیسلام بووە، واتە (خُنَیْس بن حذافة السَّهْمي) کە بەهۆی برینداریەوە گیانی خۆی لە پێناوی خوادا بەخت کردوە.

هەڵبەتە ئەوەش کە باسکراوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەڵاقێکی حەفصەی داوە بەڵام جبرئیل لە خواوە پێی ڕاگەیاندوە کە بیگێڕێتەوە لای خۆی، چونکە زۆر نوێژکەرو ڕۆژوو گرە، مەدح و ستایشێکی گەورەی خاتوون حەفصەی تێدایەو ئەو نهێنییە ئاشکرا دەکات، کە خوای کار بەجێ بەبێ حیکمەت نەیکردۆتە هاوسەری پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) .

**٥- زینب بنت خزیمة :**

حیکمەتی هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەو ژنە دیندارو خێرخوازەشدا کە نازناوی دایکی نەداران (أم المساكين) ی لەسەردەمی نەفامێتیی (عصر الجاهلیه) دا پێدراوە، ئەوەبووە کە پاش بێوەژن کەوتنی و شەهیدبوونی (عبدالله بن جحش بن رئاب) ی هاوسەرییەوە، بۆی ببێتە سایەو سێبەر و بەتەنیایی نەمێنێتەوە، هەڵبەتە

ناو دەرکردنی ئەو ژنە بەرێزەش پێش ئیسلامیش، بە دایکی نەداران و بێچاران، شایستەیی و لێوەشاوەیی وی بۆ هاوسەرێتیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەگەیەنێ .

**٦- ام سلمة:**

حیکمەتی هێنانی خاتوون ئومو سەلەمەش کە (أبو سلمة) ی هاوسەری، بەهۆی برینداریی جەنگی ئوحودەوە کۆچی دوایی کردبوو، وەبێوەژنێك و کۆشێك منداڵی وردی بەجێهێشتبوون، بریتی بووە لەدەست بەسەرداهێنانی منداڵەکانی و حەواندنەوەیان کە وەك پێشتر لە پێناسەی (أم سلمة) ش دا باسمان کرد، سەرەتا ئەو ژنە عاقڵ و هەڵکەوتووە لەترسی ئەوەی، کە غەیرەی زۆرەو منداڵی وردی هەن و نەبادا پێغەمبەری خوا بێزار بکەن، ئامادەنەبوو هاوسەرگیریی لەگەڵ پێغەمبەر دا بکات، هەتا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بیانووی بڕی.

هەڵبەتە هەڵوێستە ژیرانەکەی خاتوون ئومو سەلەمەشە لە صولحی حودەیبیەداو، پێشنیارەکەی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، کە پێشتر باسمان کرد، دەرخەری ئەوەیە کە ئەو دایکەی ئیمانداران، ژنێکی شایستەی هاوسەرێتیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووە.

**٧- زینب بنت جحش:**

حیکمەت لە هێنانی خاتوو زەینەبی کچی جەحشیش دا زۆر ئاشکرایەو، ئەو هاوسەرگیرییە شتێك بووە، کە خوا ڕاستەوخۆ پێغەمبەرەکەی خۆی پێوە پابەند (مُلزم) کردوە، نەك هەر هیچ دەست پێشخەریی و ڕەغبەتی خۆی تێدانەبووە، بگرە پێغەمبەر لەبەر قسەو قاڵی خەڵك، ئەگەر خوا لەسەری پێویست نەکردایە، هەر بیریشی لێ نەدەکردەوە، بەڵام خوای

کاربەجێ، ویستی بەو هاوسەرگیرییە بەربەستێکی گەورە تێك بشکێنێ و، عادەتێکی سەردەمی نەفامێیتی لابەرێ، کە بریتی بوو لە بە حەرام دانانی ژنی کوڕی بەکوڕ کراو لەسەر بابی (الإبن المُتَبنَّي) لەسەر بابای بە کوڕی خۆ دانەر (المُتبِّني) وەك لە تەوەری چوارەم دا بە درێژیی باسی دەکەین، بۆیە لێرە بەم ئاماژە کورتە وازی لێ دێنین .

**٨- ام حبيبة:**

ئەمیش حیکمەتی هاوسەرگیریی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵیدا زۆر ڕوونە، جارێ لەلایەکەوە ئافرەتێکی کۆچکەر بووە و لەوڵاتی غەریبایەتی، هاوسەرەکەی (عبيدالله بن جحش) لەو ئیسلامە هەڵگەڕاوەتەوە، کە لەپێناویدا خۆی و هاوسەرەکەی کۆچیان کردوە بۆ حەبەشە، وە سەرەنجام بێکەس و سێبەر کەوتۆتە گۆڕێ، بۆیە هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵیدا، دەرباز کردنی بووە لەو قەیران و تەنگانەیەی کە تێیکەوتوە و هاوکارییکردنی و دڵدانەوەی بووە.

وە لەلایەکی دیکەشەوە، ئەو ژنە خۆڕاگرو بەڕێزە کچی (أبو سفيان)ی، سەرۆکی هۆزی قورەیش بووە و، بێگومان بەو هاوسەرگیرییە کاریگەریی ئەرێنی کەوتۆتە سەر هۆزی قورەیش بۆ دڵڕاکێشانیان بەرەو ئیسلام و کەمکردنەوەی دژایەتییان بەرانبەری .

**٩- جويرية بنت الحارث المصطلقية:**

حیکمەتێکی دیاری بەهاوسەرگرتنی جوەیرییە خانیش لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) ئەوە بووە، کە ئەو ئافرەتە کچی (الحارث بن أبي ضرار) سەرۆك هۆزی (بنو المصطلق) بووە، کە لەگەڵ سوپای ئیسلام دا

بەشەرهاتوون و تێکشکاون، بێگومان بەو خزمایەتییەی پێغەمبەریش لەگەڵیاندا، دواتر هەڵوێستیان گۆڕاوە، بەتایبەت کە پاش ئەوەی (**جویریة**) بۆتە هاوسەری پێغەمبەرو، مسوڵمانان تێکڕای دیلەکانی هۆزەکانیان ئازاد کردوەو، گوتوویانە ناگونجێ خەزوورانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەلامان دیل و کۆیلە بن .

**١٠- میمونة بنت الحارث الهلالیة:**

حیکمەتی هێنانی ئەمیش، وێڕای لە پەنای خۆگرتن و دەست بەسەر داهێنانی بێوەژنێك، بەهێزترکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی و خزمایەتییش بووە لەگەڵ خزم و کەس و کاری ئەو دایکەی ئیمانداراتیش دا، کە وەك پێشتر باسمان کرد پلك (خوشکی دایکی) هەرکام لە (عبدالله بن عباس) و (خالد بن الولید) بووە، خوا لێیان ڕازی بێ .

**١١- صفیة:**

خاتوون صەفییە وەك پێشتر لە پێناسەکەی دا باسمان کرد، کچی حویەی کوڕی ئەختەب سەرۆکی هۆزی (بنو نضیر) ی جوولەکەیە، کە کاتی خۆی لەگەڵ (بنو قریظة) دا کوژراوە، وە هاوسەری (کنانە بن أبی حقیق) بووە کە ئەویش کوژراوە، دیارە خۆیشی بەدیل گیراوەو بێ باب و مێرد، بێ کەس و کار ماوەتەوە، هەر بۆیەش هاوەڵانی بەڕێز بۆ پێغەمبەری خوایان پێشنیار کردوە، کە بیکاتە هاوسەری خۆی، چونکە بابی کە سەرۆکی هەر دوو هۆزی جولەکەی (بنو نضیر) و (**بنو قریظة**) بووە و ئەو ئافرەتە، جگە لەو شایستەی کەسی دیکە نیە.

ئنجا کاتێکیش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرپشکی کردوە لەنێوان هاوسەر بوونی پێغەمبەرو ڕۆیشتنی دا، پەکەمیانی هەڵبژاردوە .

کەواتە:

لەو هاوسەرگیریەیشدا حیکمەت ڕەچاوکردنی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) بۆ دڵدانەوەی ژنێکی بێوەژن کەوتووی باب کوژراوی بێ کەس و کاری لێقەوماو، وە ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەری خوا، باشترین شتێك بووە لەو هەلو مەرجەدا کە بۆ ئەو ئافرەتە خانەدانەی کردوە، کە خۆی و هۆزەکەی بوونەتە قوربانیی (ضحیة) خیانەت و پەیمان شکێنیی بابی !

**ئنجا لەکۆتایی ئەم تەوەرەش دا دەڵێین :**

ڕەنگە هەندێك کەس هەندێك وشەو تەعبیر کە لەلایەن هەندێك لە هاوەڵان و هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خواوە خوا لێیان ڕازی بێ بەکارهاتوون، دەربارەی هۆکارو چۆنیەتی بەهاوسەرگرتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ هەندێك لە هاوسەرانی، بکاتە مایەی ئیشکال و تۆمەت، بۆ نموونە:

دایکمان عائیشە لە بارەی (جويرية بنت الحارث) ەوە گوتوویەتی:

(لَما قسم رسولُ الله صلى الله عليه وسلم سبايا بني المصطلق وقعت جويرية في سهم ثابت بن قيس بن شماس أو لابن عم له، فَكاتَبَتْهُ على نفسها وكانت امرأة حلوة ملاحة لا يراها أحدٌ الاّ اخَذَتْ بنفسه، فأتت رسولَ الله تَسْتَعينُهُ في كتابتها... فوالله ماهو الاّ أن رأيتُها فكرهتها وقلت : يرى منها ما قد رأيت ...) رواه أحمد وأبو داود عن عائشة رضي الله عنها.

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئافرەت و منداڵە بەدیل گیراوەکانی هۆزی (بنو مصطلق) دابەشکرد، جوەیرییە کەوتە نێوان پشکی (ثابت بن قیس بن شماس) یان کوڕە مامێکی، ئەویش واتە جوەیرییە - موکاتەبەی[1]

---

(١) المكاتبة : ئەوە بووە کە کۆیلەیەك یان کەنیزەیەك لەگەڵ خاوەنەکەیدا ڕێك بکەوێ، لەسەر ئەوەی کە ئەندازەیەك سامانی پێ بدات و ئەویش دەستبەرداری ببێ و ئازاد بێ .

لەگەڵدا کرد بۆ ئازادبوونی، وە ئەو ژنێکی هێندە شیرین و دڵگیر بوو، هەر کەسێك بینیبای دەچووە دڵیەوە، ئنجا هاتەلای پێغەمبەری خوا، داوای هاوکاریی لێکرد بۆ موکاتەبەکەی ... بەخوا هەر کە دیتم کەیفم پێی نەهات و، لە دڵی خۆم دا گوتم : پێغەمبەریش ئەو دڵگیریەی من لێم بینیوە، لێی دەبینێ و دڵی دەیگرێ.

لە وەڵامی ئەو گومانەش دا دەڵێین :

بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە بەخۆی لە لووتکەی جوانیی و دڵگیریی دا بووە، شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراوە، کە مەسەلەی جوانیی و ڕێك و پێکیی لە هاوسەرەکانی دا ڕەچاوکردبێ، بەڵکو هەر ئەوە شتێکی مەنتیقیی و سرووشتییە، وەك خوای کاربەجێش لەم بارەوە لەکاتی باسکردنی ئەوەدا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆی ڕەوانیە هیچ هاوسەرێکی دیکە بێنێ، فەرموویەتی : ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ ﴾ الأحزاب: ٥٢، واتە: لەمەودوا ئافرەتانت بۆ حەلاڵ نین، هەروەها بۆشت نیە لەجیاتی یەکێکیان هاوسەرێکی دیکە بگری، هەرچەندە جوانییشیان سەرسامت بکات، بەڵێ بێگومان **فیطرەتی** ساغی هەر مرۆڤێك وایە، کە کەیفی بە جوانیی و دڵگیریی دێ، ئەو شتە **فیطرییە** بۆ پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) شتێکی ئاسایی یە، بەڵام ئەوەی گرنگە کە لێرەدا بیزانین ئەوەیە، کە دڵنیاو مسۆگەر بین: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەدوای جوانیی و دڵگیریی ئافرەتان دا وێڵ نەبووە، ئەگەرنا بێگومان لە جیاتی هاوسەرە بێوەژنەکانی و بەتەمەنەکانی، کچی جوان و دڵگیریی کەم تەمەن زۆر بوون، کە بە هاوسەریان بگرێ .

لێرەش دا کۆتایی بەم تەوەری دووەمە دێنین و، دەچینە سەر تەوەری سێیەم، وەبێگومان لە تەوەری چوارەمیشدا، هەندێك مەسەلەی پەیوەست بەم بابەتەوە دەخەینە ڕوو.

# تەوەری سێیەم : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت جوانترین و چاکترین و وەفادارترین هاوسەرو بەسۆزترین باب

خوا پشتیوان بێ بابەتی ئەم تەوەرە لە دوو بڕگەدا دەخەینە ڕوو، لە بڕگەی یەکەمیان دا باسی ڕەوشت و شاکارو هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکەین لە بواری هاوسەرییتیی و ژن و مێردایەتیی دا، وە لە بڕگەی دووەمیشدا باسی ڕەوشت و خوو و هەڵس و کەوتی دەکەین لە بواری باب و ڕۆڵایەتییدا و چۆنیەتی مامەڵە کردنی لەگەڵ کوڕو کچ و نەوەکانی دا .

## یەکەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت جوانترین و چاکترین و وەفادارترین هاوسەر :

فەرمایشتی خوا کە لە وەصفی پێغەمبەری کۆتایی خۆیدا فەرموویەتی :
﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم: ٤، واتە: وەبێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، وەك پێشتریش گوتمان، ڕەوشت (خُلُق) مەبەست پێی، کۆی ڕەوشت و ئاکارو ڕەفتارە، لەهەموو بوارو لایەنەکان دا.

ئنجا لایەن و بوارێکی گرنگ و هەستیاریی خووڕەوشت بریتیە لە چۆنیەتی هەڵس وکەوت لەگەڵ هاسەرو خێزان دا، وە لە ڕاستیدا ڕەوشت و ئاکاری مرۆڤ لەو بوارەدا تەرازوو و پێوەری کەسایەتیی و ڕێژەی چاکیی و خراپیی و بۆ خوا سوڵحان و نەسوڵحانیەتی، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە

فەرموویەتی: (خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهْلي). رواه الترمذي عن عائشة، وابن عن ابن عباس

واتە: چاکترینتان چاکترینتانە بۆ هاوسەری، منیش باشترینتانم بۆ هاوسەرم.

ئێستاش بەباشی دەزانم بۆ ئەوەی ڕەوشت جوانیی و چاکیی و وەفاداریی پێغەمبەری خوامان (صلى الله عليه وسلم) لە میانەی هەڵس و کەوت و کردەوەکانی دا بۆ نمایان و درەوشاوە بێ، لە باغی سیرەو ژیان و گوزەرانی دا، لە بواری مامەڵەی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا، چەند گوڵێك بچنین و، سەرەتاش بەدان پێداهێنان (إقرار) ی لێهاتووترین و خۆشەویستترین هاوسەری دەست پێ دەکەین، کە عائیشەیە خوا لێی ڕازی بێ، چونکە بێگومان هاوسەر لەهەموو کەس باشتر هاوسەری خۆی دەناسێ، چ ژن بۆ مێردی، و چ مێرد بۆ ژنی :

١- کاتێك پرسیار لە (عائشە) کرا لەبارەی ڕەوشتی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) گوتی: (كان خُلُق نبي الله القرآن) رواه مسلم وأحمد وغيرهما، واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا بەپێی قورئان بوو.

ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد مەبەستی خاتوون عائیشە لە وشەی (خُلُق) لێرەدا، کۆی ڕەوشت و ئاکارو هەڵس و کەوتی پێغەمبەرە لە هەموو لایەنەکانی ژیانی دا.

٢- (**عن عبدالله الجدلي قال : قلت لعائشة رضي الله عنها : كيف كان خلق رسول الله صلى الله عليه وسلم في أهله ؟ قالت: كان أحسن الناس خُلُقاً لم يكن فاحشاً ولا مُتَفَحِّشاً ولا صَخَّاباً في الأسواق ولا يجازي بالسيئة مثلها ولكن يعفو ويَغْفِرُ**) رواه أحمد والطيالسي وابن عساكر.

واتە: بە عائیشەم گوت خوا لێی ڕازی بێ : ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ماڵ و خێزانی دا چۆن بوو؟ گوتی: لەهەموو کەس ڕەوشت جوانتر بوو، قسەی ناشیرین و ڕەفتاری دزێو نەبوو، وە لە

بازاڕان دا بەدەنگە دەنگ و هەرا هەرا نەبوو، وە سزای خراپەی بە خراپە نەدەدایەوە، بەڵکو چاوپۆشیی لە (بابای خراپەکار) دەکردو دەیبووری.

٣- **(عن عَمْرَةَ قالت : سئلتُ عائشة عن خلق رسول الله** صلى الله عليه وسلم **اذا خلا مع نسائه، قالت: كان كالرجل من رجالكم، الا أنه كان أكرم الناس، وأحسنَ الناس خُلُقاً، وألْيَنَ الناس في قومه، وأكرمهم، ضحَّاكاً بسَّاماً)** رواه الحارث بن أسامة والخرائطي وابن عساكر.

واتە: عائیشە پرسیاری لە بارەی ڕەوشتی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) لێکرا، لەکاتێکدا کە بەتەنیا لەگەڵ هاوسەرەکانی دەبوو، گوتی: وەك هەر پیاوێك لە پیاوانتان بوو، بەلاّم لەهەموو کەس بەڕێز تر بوو، وە لە هەموو کەس ڕەوشت جوانتر بوو، وە لەنێو کۆمەڵەکەی دا لەهەموو کەس نەرم و نیانترو بەڕێزتر بوو هەمیشە دەم بە پێکەنین و بەزەردەخەنەبوو .

٤- **(عن الأسود بن يزيد قال : سألت عائشة رضي الله تعالى عنها ماكان رسول الله** صلى الله عليه وسلم **يصنع في أهله ؟ قالت: كان بشراً من البشر يَفْلِي راسهُ ويَحْلبُ شاتهُ ويخيط ثوبهُ ويَخدم نفسَهُ ويَخْصِفُ نَعْلَهُ ويعمل ما يعمل الرجالُ في بيوتهم ويكون في مهنة أهله فإذا سمِع المؤذن خرج للصلاة)** رواه أحمد والشيخان.

واتە: پرسیارم لە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ کرد، کە ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ماڵ و خێزانی دا چی دەکرد؟ گوتی: مرۆڤێك بوو وەك مرۆڤەکان، سەری خۆی دەدۆزی و، مەڕەکەی خۆی دەدۆشی و، پۆشاکی خۆی دەدووری و، خزمەتی خۆی دەکردو، نەعلەکەی خۆی پینەدەکرد، وە پیاوان لە ماڵەکانی خۆیاندا چی دەکەن وای دەکرد، وە خزمەتی خێزانی دەکرد (ئیش و کاری ماڵەوەی لەگەڵ دەکرد) وەهەرکات گوێی لە بانگ دەر دەبوو، دەچووە دەرێ بۆ نوێژ.

٥- (عن عائشة رضي الله عنها قالت: ما ضربَ رسولُ الله شيئاً قطٌّ بيده، ولا امرأة ولا خادماً الا أن يجاهد في سبيل الله، وما نِيلَ منه شيء قط فينتقم من صاحبِه الاّ أن يُنْتَهك شيء من محارم الله فينتقم لله عز وجل) رواه مسلم.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز بەدەستی خۆی لەهیچ شتێکی نەداوە، هەروەها لە ژن و خزمەتکاریش، مەگەر لەکاتی جەنگ و جیهاد لەپێناوی خوادا، وەهیچ کاتێك مافێکی نەخوراوەو ئازارێکی نەرداوە کە تۆڵە لە خاوەنەکەی بکاتەوە، مەگەر سنوورێکی خوا ببەزێندرێ و لەبەر خوا سبحانه وتعالى تۆڵە بکاتەوە .

ئێستاش با چەند نموونەیەك لە ڕەوشت و ئاکاریی بەرزو پەسندی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و چاکەکاریی و وەفاداریی لەبواری ژیان و هاوسەرێتیی دا بێنینەوە:

## یەك: خۆشڕەفتاریی و لێبووردنی و نەرم و نیانیی:

١- (عن النعمان بن بشير قال: جاءَ أبو بكر يستأذن على النبي صلى الله عليه وسلم فسَمِعَ عائشَةَ وهي رافعةٌ صوتَها على رسول الله فأذن له فدخل فقال: يا بنت أم رومان وتناولها أترفعين صوتك على رسول الله؟ قال: فحال النبيُّ (صلى الله عليه وسلم) بينه وبينها، قال : فلما خرج أبو بكر جعل النبي يقول لها : يترضاها : ألا ترين أني قد حُلْتُ بين الرجل وبينك؟ قال: ثم جاء أبو بكر فاستأذن عليه فوجده يُضاحِكها قال: فأذن له فدخل : فقال أبو بكر : يا رسول الله

**أشركاني في سِلمِكُما كما أشركتماني في حربِكما فقال رسول الله** صلى الله عليه وسلم : **قَدْ فَعَلْنا**) رواه النسائي وابن عساكر وهذا لفظ ابن عساكر.

واتە: ئەبو بەکر هاتە لای پێغەمبەر داوای مۆڵەتی لێکرد بێتە ژووریّ گوێی لە عائیشە بوو دەنگی بەسەر دەنگی پێغەمبەردا بەرز کردبۆوە، ئەویش مۆڵەتی داو هاتە ژوور، ئیدی دەستی بۆ عائیشە درێژ کردو گوتی : ئەی کچی ئوممو ڕومان، ئایا دەنگت بەسەر پێغەمبەری خوادا بەرز دەکەیەوە ؟ دەڵێ : پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) کەوتە بەینیان و نەیهێشت لێی بدات، جا کاتێك ئەبو بەکر چووە دەریّ، پێغەمبەری خوا وەك ئاشتکردنەوەی عائیشە دەیفەرموو : ئایا نەتدی چۆن کەوتمە نێوانی تۆو ئەو پیاوەوە .

دەڵێ : دوایی ئەبوبەکر هات داوای مۆڵەتی لێکرد، دەڵێ ئەویش مۆڵەتی داو هاتە ژوور، بینی پێغەمبەری خوا لەگەڵ عائیشە دا پێدەکەنیّ، ئەبوبەکریش گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا : وەك چۆن هێناتانمە نێو جەنگەکەتانەوە لە ئاشتەوایەکەشتاندا بەشدارم بکەن، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ئەوە کردمان.

٢- (**عن ميمونة رضي الله عنها قالت : خرج رسول الله** صلى الله عليه وسلم **ذات ليلة من عِندي فأغلقتْ دونه الباب، فجاء يستفتح الباب فأبيْتُ أن أفتح له فقال: أقْسَمتُ عليكِ أن تفتحي، فقلت : تذهب الى بعض نسائك في ليلتي ؟ قال: ما فعلت، ولكن وجدت حقناً من بَوْلي**) رواه ابن سعد[1] .

---

(١) سبل الهدى والرشاد... ج١١، ص١٤٧. .



واتە: مەیموونە گوتوویەتی : شەوێکیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە نۆرەی مندا چووە دەرێ، منیش دەرگام لێداخست، ئیدی هاتەوە داوای کردنەوەی دەرگای کرد، منیش بۆم نەکردەوە، فەرمووی : سوێندت لێدەخۆم هەردەبێ بیکەیەوە، منیش پێم گوت : لەشەوی مندا دەچیە لای یەکێك لە ژنەکانت ؟ فەرمووی: نەچووم، بەڵکو بۆ میزکردن تەنگاو بووم.

٣- **(عن أم سلمة رضي الله عنها أنها أتت بطعام في صفحة لها الى رسول الله وأصحابه، فجاءت عائشة ومعها مهرّ ففلقت به الصفحة، فجمع رسول الله** صلى الله عليه وسلم **بين فلقتي الصَّفحة ويقول : كلوا غارَتْ أمُّكم، ثم أخذ رسولُ الله صفحة عائشة فبعث بها الى أم سلمة وأعطى صفحة أم سلمة لعائشة رضي الله عنها)** رواه النسائي.

واتە: ئوممو سەلەمە گێڕاویەتەوە کە جارێکیان خواردنی لەدەفرێك دا بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی هێناوە، عائیشەش هاتوە بەردێکی تیژی پێ بووەو دەفرەکەی شکاندوە، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) هەردووك پارچە دەفرەکەی کۆکردۆتەوە (لەگەڵ خواردنەکە کە دیارە شل نەبووە) وەبە هاوەڵانی فەرموو : بەرهەمی تووڕە بوونی دایکتان بخۆن، پاشان پێغەمبەری خوا قاپەکەی عائیشەی بۆ ئوممو سەلەمە ناردو، قاپە (شکاوە) کەی ئوممو سەلەمەشی بۆ عائیشە نارد، خوا لێیان ڕازی بێ.

٤- **(عن عائشة رضي الله عنها أنها كانت مع رسول الله** صلى الله عليه وسلم **في سفرة فقال : تعالي حتى أُسابقكِ، فسابَقْتُهُ فَسَبَقْهُ، فلما حَمَلْتُ اللحم سابقته فسبقني، فقال: يا عائشة هذه بتلك)** رواه أبو داود

ونسائي والحميدي وابن أبي شيبة.

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاوتەتیەوە کە لە سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا بووە، پێی فەرمووە : وەرە با پێشبڕکێ بکەین، ئیدی پێشبڕکێمان کردو پێشی کەوتمەوە، ئنجا کاتێك گۆشتم گرت، جارێکی دیکە پێشبڕکێم لەگەڵ کردو پێشمکەوتەوە، ئنجا فەرمووی : ئەی عائیشە ! ئەمجارە بەجارەکەی دیکە.

٥- (عن عائشة رضي الله عنها قالت :

**كان رسول الله** صلى الله عليه وسلم **جالساً فَسَمِعْنا لَغَطاً وصوتَ صبيانٍ فقام رسول الله فإذا صبيان لِحَبشة ترقُصُ (ومن لفظ : يلعبون بحرابهم في المسجد) والصبيان حولها، فقال: يا عائشة: تعالي فانظري، فقلت : نعم فوَضَعْتُ خَدّي على مَنْكِبِ رسول الله** صلى الله عليه وسلم **وهو يسترني بردائه فجعلت أنظر اليهم مابين المنكب الى الرأس، فجعل يقول لي : يا عائشة ! أما شبِعْتِ ؟ أما شَبعتِ ؟ قلت : لا تَعجَل يا رسول الله إني أُحِبُّ النظر اليهم (وفي لفظ : ما أُحبُّ النظر اليهم ولكني أحْبَبْتُ أن يبلغ النساء مقامَهُ لي ومكاني منه)، ولقد رأيته يُراوِحُ بين قدميه اذ طلع عمر فارفضَّ الناس عنها والصبيان..**) رواه الترمذي والنسائي وابن عدي والإسماعيلي وغيرهم.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبوو گوێمان لە غەڵبە غەڵب و دەنگی منداڵان بوو، پێغەمبەری خوا هەڵسا بینی هەندێك منداڵی حەبەشەیی سەمایان دەکرد (لە بێژەیەك دا و بە نێزەکانیان لە مزگەوتی یاریی یان دەکرد) وە منداڵیش دەوریان دابوون، فەرمووی:

ئەی عائیشە ! وەرە تەماشا بکە : گوتم : بەڵێ ئیدی ڕوومەتی خۆم خستە سەرشانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ئەویش بە عەبایەکەی پۆشیبوومی، ئیدی منیش لەنێوان سەری و شانیەوە تەماشام دەکردن.

ئەویش هەر دەیفەرموو، ئەی عائیشە هەر تێر نەبووی، هەر تێر نەبووی؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا پەلە مەکە، حەز دەکەم سەیریان بکەم (لە بیژەیەکدا: وە حەزیشم لێ نەبوو تەماشا بکەم، بەڵام حەزمکرد بە ئافرەتان بگاتەوە کە بۆم ڕاوەستاوە و بزانن من لەلای چۆنم) هەتا بینیم نۆرەی بە پێیەکانی دەکرد، هەتا کاتێك عومەر دەرکەوت خەڵك و منداڵەکان لەدەوریان پرژان و بلاّو بوون.

**٦- عن صفية رضي الله عنها قالت دَخَلَ رسول الله** صلى الله عليه وسلم **وَأنا أبكي، فقال : يابنت حُيَيّ ما يُبكيك ؟ قلت : بلغني أن حفصة و عائشة ينالان منيٌّ ويقولان نحن خيرٌ منها نحن بنات عم رسول الله وأزواجه، قال: ألا قلتِ لهنَّ : كيف تَكُنَّ خيراً منيّ وأبي هارون وعَمّيٌ موسى وزوجي محمد)** أخرجه ابن سعد في الطبقات.

واتە: صەفییە گوتوویەتی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەژوور کەوت من دەگریام، فەرمووی: ئەی کچی حویەی بۆچی دەگری ؟ گوتم : پێم گەیشتوە، کە حەفصەو عائیشە قسەم لە دژ دەکەن و دەڵێن ئێمە لەو چاکترین، ئێمە کچی مامی پێغەمبەرین و هاوسەرینی، فەرمووی : ئەدی بۆچی پێیانت نەگوت : چۆن لەمن باشترن، کە بابم هارِوون و مامم مووساو مێردم موحەمەدە؟

پێشم وایە ئەم نموونانەی هێنامانەوە پێویستییان بەشەرح و قسەلەسەر

کردن ناکات و، هەموویان سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هاوسەرەکانی دا لە لووتکەی ڕەوشتبەرزیی و لێبوردەیی و سینگ فراوانیی و میهرەبانیی دا بووەو لەگەڵیاندا دڵی وەك دەریا بووە و بەهیچ شێوەیەك شلوێ نەبووە.

## دوو: وەفاداریی و چاکە لەبەرچاو بوونی:

هەڵبەتە وەفاداریی و ئەمەکناسیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك هەر خەسڵەتێکی دیکەی پەسندی، تایبەتیی و سنووردار نەبووە، بەڵکو حاڵەتێکی گشتی بووە و لەگەڵ هەموو کەس دا هەروا بووەو، چاکەو خێری هەموو کەسی لەبەر چاو بووە.

بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە سەرجەم هاوسەرەکانی پێغەمبەر جگە لە (خديجه) و (زينب) دوای خۆی کۆچیان کردووەو، دیارە سیفەتی وەفاش زیاتر بەرانبەر بەکەسێك دەبێ، کە لە ژیان دا نەمابێ، بۆیە ئێمە لێرەدا بە خستنە ڕووی وەفای خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) بەرانبەر بە دایکی ئیمانداران خەدیجە وازی لێ دێنین .

١- عن عائشة رضي الله عنها قالت:

**كان رسول الله** صلى الله عليه وسلم **اذا ذكر خديجة رضي الله عنها، لَمْ يَكَدْ يَسْأَمُ مِنْ ثناءِ عليهما استغفارٍ لها، فذكرها ذات يومٍ فاحتَمَلَتني الغَيْرَةُ فقلْتُ لقد عوَّضك الله من كبيرة، قالت فرأيت رسول الله غَضِبَ غَضَباً شديداً وسقطت في جلدي، فقلت : اللهم انْ ذهبَ غيظ رسولك، لم أعُد أذكرها بسوْ ما بقيت، قالت : فلما رأى**

**رسول الله ما لقيت، قال: كيف قلت! والله آمن بي اذ كفر النـاسُ، وَ واستني إذ رفضني الناس، وصدَّقتني اذ كذبني الناس، ورزقت مـن الوَلَد إذ حُرِمْتموه، فغدا وراح عليَّ شهراً)** رواه الطبراني باسناد جيد ورواه غيره .

واتە: پێغەمبەری خوا عادەتی وابوو کە باسی خەدیجەی دەکرد لە پێهەڵداگوتنی وە داوای لێبوردن بۆ کردنی ماندوو نەدەبوو.

ئنجا ڕۆژێك باسی کرد، منیش غەیرەم جووڵاو گوتم : ئەو بێوەژنێك بوو خوا بۆی (بەگەنجێك) گۆڕیی ! ئیدی بینیم پێغەمبەری خوا بە توندی تووڕە بوو، منیش چوومەوە کەوڵی خۆم، بۆیە گوتم : ئەی خوایە ڕق و تووڕەیی پێغەمبەرەکەت لابچێ، هەرگیز تا بێنم بە خراپە باسی ناکەم، دەڵێ جا کاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بینی چیم بەسەرهات، فەرمووی ئەرێ چیت گوت؟!

کاتێك خەڵکانێك بێبڕوابوون، ئەو ئیمانی هێنا، وە دڵی دامەوە لە حاڵەتێك دا کە خەڵك ڕەفزی کردم، وە لە حاڵەتێك دا کە خەڵك بە درۆیان زانیم، ئەو بەڕاستی زانیم، وە خوا منداڵی لەو پێبەخشیم لەکاتێکدا کە لەئێوەمانان پێبەشی کردووم.

عائیشە دەڵێ: ئیدی ئەو قسەیە هەتا ماوەی مانگێك هەر کاریگەریی سەلبیی لەسەرم هەبوو .

٢- **(عن أنس قال: كـان رسـول الله** صلى الله عليه وسلم **اذا أتـي بالشـيء يقول: إذهبوا الى فلانة فإنها كانت صديقة لخديجة)** رواه ابن حبان والدولابي.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر شتێکی بە دیاریی بۆ هاتبایــە، دەیفــەرموو: بــۆ فلانــە ژنــەی ببــەن، چــونکە کــاتی خــۆی دەستەخوشکی خەدیجە بوو.

٣- (عن عائشة رضي الله عنها قالت :

**كانت عجوز تأتي النبي** صلى الله عليه وسلم **فيهشُّ لها ويُكرِمَها فقلت: يا رسول الله من هذه (وفي لفظ، قلت: يا رسول الله تقبِل على هذه العجوز هذه الإقبال ؟ فقال: يا عائشة إنَّها كانت تأتينا زمن خديجة، وإن حُسْنَ العهد من الإيمان.**

واتــە : پیرەژنێــك دەهاتــە لای پێغەمبــەر (صــلى الله عليــه وســلم) زۆر پێشوازیی لێدەکرد و ڕێزی دەگرت، گوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئەمـە کێیە ؟ (لە بێژەیەك دا : گوتم : ئـەی پێغەمبـەری خـوا چۆنە ئـاوا ئـەم پیرەژنە بەخێردێنی و ڕێزی لێ دەگری؟) فەرمووی: ئـەی عائیشـە! ئـەوە لە ڕۆژگاری خەدیجەدا هاموشۆی دەکردین و، چاکە لەبیربوون (وەفا) یش لە ئیمانەوەیە .

هەڵبەتە کاتێکیش بە وردیی سەرنجی ئەم هەڵوێستەی پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) دەدەین، دڵنیا دەبـین کـە خەسـڵەتی وەفـاداریی لـەو زاتە ڕەوشت مەزن و بەرزەدا، وەك هەر خەسڵەتێکی دیکەی پەسـندەی، لە لووتکەدا بووە، چونکە :

١- ئاشکرایە کە خاتوو خەدیجە لـە تەمـەنی شەسـت و پێـنج سـاڵییدا مردوە.

٢- کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) یـادی خەدیجـەی

کردۆتەوە، ژمارەیەك هاوسەری هەبوون، کە یەکیان خاتوو عائیشە بووە.

٣- ئنجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەك هەر خەدیجە خۆی، بگرە دەستە خوشکەکانیشی و ناسیاوەکانیشی هەر لەبیر بوون، بەڵێ ئەمانە هەموویان ئەوە دەگەیەنن کە ئەو پێشەوایە رەندو رەوشت بەرزە پەسندە، لە لووتکەی وەفاداریی و ئەمەکناسییدا بووە، بەرانبەر بە هاوسەرەکانی خوا لێیان رازی بێ .

## دووەم : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەسۆزترین باب بەرانبەر بە رۆڵەکانی:

بۆ خستنە رووی سۆزو بەزەیی و پەرۆشی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرانبەر بە رۆڵەکانی، چ کچەکانی : زەینەب، روقیە، ئوممو کولثوم، فاطیمة، وە چ کورەکانی : قاسم، عبداللە، ئیبراهیم، وە چ نەوەکانی وەك : ئومامە کچی زەینەبی کچی و، حەسەن و حوسێن کورانی فاطیمە ی کچی، با سەرنجی چەند دەقێکی سوننەت بدەین :

### یەك: زەینەبی کچی و ئومامەی نەوەی:

زەینەب خوا لێی رازی بێ، کچی گەورەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووەو لە سییەمین ساڵی تەمەنی پێغەمبەردا لەدایك بووەو، هەر لە مەککە شووی بە کورە پلك (ابن خالة) ی خۆی (**أبو العاص بن الربیع بن عبالعُزّي بن عبدالشمس**) کردوە.

دیارە زەینەب و هەرسێك کچەکەی دیکەشی، هەر زوو لەگەڵ دایکیان

(خديجە) دا مسوڵمان بوون.

ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، وەك (الطبراني) و (البزّار) بەسەنەدێکی ڕاست هێناویانە [1]، زەینەب داوای مۆڵەت لە هاوسەرەکەی (أبو العاص) دەکات، کە هەتا ئەو کاتە مسوڵمان نەبووەو، جاریٚ حوکمی بەیەك نەشیانی ژن و مێردی مسوڵمان و کافریش نەهاتبووە خوارێ، کە بچیٚ بۆلای بابی و مسوڵمانان لە مەدینە، ئەویش مۆڵەتی دەدا، بەلاّم لە ڕێگا (هبار بن الأسود) پێی دەگات و وادەکات لە ولاّخەکەی بەری بداتەوەو، ئەو کۆرپەیەی لەسکیشی دابووە لەبەری بچیٚ .

ئنجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داوا لە (زيد بن حارثة) دەکات کە بچیٚ بەهەر شێوەیەك بووە زەینەبی بۆ بێنێ و، پێی دەفەرموێ : (ألا تنطلق فتجيء بزينب) دەڵێ : با، دەفەرموێ: (فَخُذْ خاتمي فأعْطِها إياه) واتە: ئەنگوستیلەکەم ببەو بیدەیە، تاکو بزانێ کە بابی بەدوای دا ناردوە، ئیدی سەرەنجام، زەید شوانی (أبو العاص) پەیدا دەکات، کە هەندێك مەڕی زەینەبی دە لە وەڕاندن و، ئەنگوستیلەکەی وێ دەدات کە بیداتە زەینەب و، زەینەبیش ئەنگوستیلەکە دەناسێتەوە و، سەرەنجام لەگەڵ زەید دا یەکدی دەگرنەوەو دەچێتە مەدینە.

شایانی باسیشە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مەدحی زەینەبی کچی کردوەو فەرموویەتی : (هي خير بناتي أُصيبتْ فيَّ) واتە: ئەو چاکترینی کچەکانمە لە پێناوی من دا ئازار دراوە .

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مەدحی (أبو العاص) یشی

---

(١) سبل الهدى والرشاد... ج١١، ص١٤٧. .

کردوە بەر لەوەی مسوڵمان ببێ و زەینەبی بنێرێتەوە لا هەر بە نیکاحی پێشووی و فەرموویەتی : (أما بعد فإني أنكحت أبا العاص بن الرَبيع فحدَّثني فَصَدَقَني) رواه الشيخان عن المُسور بن مَخْرَمَة، واتە: پاش ستایشی خوا من کچم دابە (أبو العاص) ی کوڕی (الربيع) وە قسەی لەگەڵ کردم و ڕاستی لەگەڵ گوتم.

ئنجا زەینەب کچێکی لە (أبو العاص) بووە بەناوی (أُمامة) جا (إبن أبي خَثْيمة) لە (مصعب بن الزبير) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆشیویستوەو لە نوێژیدا هەڵیگرتوە، کە سەجدەی بردوە دایناوە و کە هەڵساوەتەوە هەڵیگرتوە : (كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يحبُها ويحملُها في الصلاة، وكان إذا سجد وَضَعها واذا قام رفعها) [1] .

هەروەها (أحمد و أبو يعلي و الطبراني) لە (عائشه)وە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ملوانکەیەکی زۆر جوانی پێشانی هاوسەرەکانی داوەو فەرموویەتی: پێتان چۆنە؟ ئەوانیش گوتوویانە : هەتا ئێستا شتی وا جوان و نایابمان نەدیوە، ئەویش فەرمویەتی : (والله لأضَعُها في رقبة أحَبِّ أهل البيت الي) سوێند بە خوا لە گەردنی خۆشەویست ترین کەسی بنەماڵەکەمی دەکەم، پاشان لە گەردنی (أمامة)ی کردوە کە منداڵێك بووە لە سووچێکی ماڵەکەدا یاری بە خۆڵ کردوە[2] .

هەڵبەتە ئەم هەڵوێستانەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دنیایەك سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی یان تێدایە بەرانبەر، بە زەینەبی کچی و کچەزایەکەی ئومامە.

---

(١) سبل الهدى والرشاد... ج١١، ص٣١-٣٢.
(٢) هەمان سەرچاوە، ج١١، ص٣٣.

**دوو: فاطیمە ی کچی :**

(عن عائشة رضي الله عنها قالت :
ما رأيت أحداً أشبه كلاماً وحديثاً برسول الله صلى الله عليه وسلم من فاطمة رضي الله عنها، وكانت اذا دخلت قام اليها فَقَبَّلَها ورَحَّبَ بها وأخَذَ بيدها وأجلسها في مَجْلِسه، وكانت هي اذا دخل عليه صلى الله عليه وسلم قامت اليه فَقَبَّلَتْهُ وأخذت بيده وأجْلَسَتْهُ مكانها...) رواه ابن حبان.

واتە: هیچ کەسم نەدیوە قسەو گفت و لفتی هێندەی فاطیمە خوا لێی ڕازی بێ بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بچێ، ئنجا پێغەمبەر عادەتی وابوو کە فاطیمە دەچووە لای، بۆلای هەڵدەستاو ماچی دەکرد بەخێری دەهێناو دەستی دەگرت و لەشوێنی خۆی دایدەنیشاند، هەروەها فاطیمەش هەرکات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لێی وەژوور دەکەوت، بۆلای هەڵدەستاو ماچی دەکردو دەستی دەگرت و لەشوێنی خۆی دایدەنیشاند ... هەڵبەتە ئەو جۆرە مامەڵەیەی پێغەمبەر و فاطیمە ی کچیشی لەگەڵ یەکدا، ئەوپەڕی ڕێزو سۆزو خۆشەویستی نێوان باب و ڕۆڵە دەگەیەنێ .

**سێ : ئیبراهیمی کوڕی :**

پێشتر باسمان کرد کە (ابراهیم) لە (مارية القبطية) یەو سێیەمین کوڕی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە بەنابالغی مردوون، وە بەنسبەت ئیبراهیمەوە لە (صحيح البخاري) دا هاتوە، کە حەڤدە یان هەژدە مانگ ژیاوە .

ئنجا لەبارەی ئیبراهیمەوە ئەو هەڵوێستانەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك نموونە دێنینەوە :

١ - (عن أنس رضي الله عنهُ أنَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم دَفَعَ سَيِّدَنا

إبراهيم عليه السلام إلى أُم سيف، إمرأة قَيْنٍ في المدينة يقال لَهُ : أبو سيف، فأنطلق رسول الله صلى الله عليه وسلم وتبعتهُ حتى انتهينا الى أبي سيف وهو ينفخ بكيرهِ وقد امتلأ البيتُ دُخاناً فأسرعْتُ في المشي بين يدي رسول الله صلى الله عليه وسلم حتى انتهيت الى أبو سيف فقلتُ: يا أبا سيف أمْسِكْ، فَجاء رسولُ الله صلى الله عليه وسلم بالصَّبِيِّ فَضَمَّهُ اليه، وقال ماشاء الله أن يقول) متفق عليه .

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەرێزمان ئیبراهیمی سەلامی خوای لێ بێ بۆ بەخێوکردن بەدایکی سەیف سپارد، کە ژنی ئاسنگەرێك بوو لە مەدینە پێی دەگوترا : بابی سەیف، ئیدی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆیشت و منیش شوێنی کەوتم هەتا گەیشتینە لای (أبوسيف) کە بە مووشەدەمەکەی فووی لە —ئاگر- دەکرد وە ماڵەکە لە دووکەڵ داوەستابوو، منیش بەخێرایی لەپێش پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە لای ئەبو سەیف و گوتم، ئەی ئەبا سەیف! ڕاوەستە (واتە چیدیکە فوو لە ئاگرەکە مەکە)، ئنجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) منداڵەکەی هێنا بەخۆیەوە گوشی و، ئەوەی کە خوا ویستی فەرمووی (واتە: قسەی لەگەڵ ئیبراهیم داکردو لاواندیەوەو سۆزو بەزەیی بۆ دەربڕی).

٢- (**عن أنس أن رسول الله** (صلى الله عليه وسلم) **قال: تَدْمعُ العَيْنُ ويَحْزَنُ القَلْبُ، ولا نقول إلا ما يرضي الله تعالى، والله إنا بِفراقِكَ يا إبراهيم لمحزونون**) رواه مسلم وأبوداود وأحمد وعبد بن حمد.

واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەکاتی گیان کێشانی ئیبراهیم دا، فەرمووی : چاو فرمێسکی دێ و، دڵ خەمبار دەبێ، بەلاّم

تەنیا ئەوە دەڵێین، کە خوای بەرز ڕازی بکات، بەخوا ئیبراهیم ئێمە بە جیابوونەوەت خەمبارین .

٣- (عن أنس رضي الله عنهُ :

**لما قُبِضَ إبراهيم ابنُ النبيِّ** صلى الله عليه وسلم **قال لهم رسول الله : لا تُدْرِجوه في أكفانِهِ حتى أنظر اليه، فأتاه فانكبَّ عليه وبكى**) رواه ابن ماجه والترمذي والحكيم .

واتە: دوای ئەوەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گیانی کێشرا، پێغەمبەری خوا پێی فەرموون : هەتا تەماشای نەکەم بەکفنەکانیەوە مەیپێچن، ئنجا هات خۆی بەسەردا شۆڕکردەوەو گریا .

هەڵبەتە هیچ کام لەو هەڵوێستانەش حەوجێی ڕوونکردنەوەو قسە لەسەر کردن نین و، سۆزو پەرۆشی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) یان وەك خۆر تێدا دەدرەوشێتەوە.

**چوار: حەسەن و حوسەینی نەوەی:**

سۆزو خۆشەویستی و پەرۆشی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ هەردووك نەوەی (الحسن و الحسين) دەقی سوننەتی زۆری لەسەرن، کە ئەمانە چەند نموونەیەکیانن:

١- (الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنة، أللهم إني أُحبُّهما فأحِبَّهُما) رواه الطبراني في الكبير عن أسامة بن زيد رضي الله عنهُما، ورواه الترمذي عن بي سعيد الخدري، الا قول (اللهم إني أحبهما فأحبهما) وقال حسن صحيح.

واتە: حەسەن و حوسەین سەروەری گەنجانی خەڵکی بەهەشتن، ئەی خوایە! من خۆشم دەوێن، تۆش خۆشت بوێن .

٢- (مَن أحَبَّ الحسن والحسين فقد أحبَّني ومَنْ أبغضهما فقد أبغَضَني) رواه أحمد وابن ماجة والطبراني في الكبير والحاكم والبيهقي وابن سعد وأبو يعلي عن أبي هريرة رضي الله عنهُ .

واتە: هەر کەس حەسەن و حوسەینی خۆش بوێن، ئەوە منی خۆشویستوە، وەهەر کەس ڕقی لێیان بێ، ئەوە ڕقی لەمنە .

٣- (**عَن أنس رضي الله عنهُ قال : سُئِلَ رسول الله** صلى الله عليه وسلم **: أيُّ أهل بيتك أحَبُّ اليك؟ قال: الحسن والحسين، وكان رسول الله** صلى الله عليه وسلم **يقول لفاطمة : أُدعي لي ابنيَّ فَيَشمُّهما ويَضمُّهما اليه**) رواه العقيلي والترمذي وقال حسن غريب.

واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کرا: کێ لە بنەماڵەکەتان لەلات خۆشەویستترە ؟ فەرمووی: حەسەن و حوسەین، وە پێغەمبەری خوا عادەتی وابوو بە (فاطیمە)ی دەفەرموو : دوو کوڕەکانم بۆ بانگ بکە، ئنجا — کە دەهاتن- بۆنی دەکردن و بەخۆیەوە دەیگوشین .

لێرەدا ڕەنگە پرسیارێك دروست ببێ :

ئایە ئەو فەرمایشتانە چۆن یەکدەخرێن کە جارێك پێغەمبەری خوا عائیشەو جارێك زەینەبی کچی و جارێك فاطیمە و جارێك حەسەن و حوسەین، بە خۆشەویستترین کەسی دادەنێ ؟!

وەڵامەکەشی ئەوەیە کە خۆشەویستی مرۆڤ بۆ هاوسەری جۆرەکەی جیاوازە لە خۆشەویستی بۆ کچ و کوڕی، هەروەها خۆشەویستی منداڵی گچکە یان نەوە، جیایە لەخۆشەویستی هی گەورە .

پاشان خۆشەویستی مرۆڤ بۆ نزیکانی، شتێکی کێشراوو پێوراو نیە و،

دەشگونجێ مرۆۋ هەرکام لە نزیکانی خۆی لـە ژن و کـوڕو کـچ و بـاب و دایك و نەوەو براو خوشك ...هتد لە کاتێکی تایبەت دا لەهەموو کـەس لەلای خۆشەویست تر بێ !

٤- (**عن ابن عمر وعن أنس رضـي الله عـنهُم أن رسـول الله** صلى الله عليه وسلم **قال: إن الحسن والحسين هما ريحانتاي منَ الدنيا**) رواه الترمذي وصححهُ ورواه النسائي .

واتە: بەڕاستی حەسەن و حوسەین ڕەیحانەی دونیای منن .

٥- (**عن بريدة رضي الله عنهُ قال: كان رسول الله يخطب وجـاء الحسـن والحسين وعليهما قميصان أحمران يمشيان ويَعْثُران ويقومان، فنزَلَ رسول الله** (صلى الله عليه وسلم) **من المنبر فَجَعَلَهما واحـداً مـن ذا الشـق وواحـداً مِـن ذا الشـق، ثـم صَـعِدَ المنـبر فقـال: صـدق الله : ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ﴾ التغـابن: ١٥، وإنـي نظـرت الى هـذين الغلامين يمشيان ويَعْثُوان فلم أصبر أن قطعت كلامي ونزلتُ اليهمـا**) رواه أحمد وأصحاب السنن الأربعة وابن أبي شيبة.

واتە: لەکاتێکدا کە پێغەمبـەری خـوا (**صلى الله عليه وسلم**) وتـاری دەدا، حەسەن و حوسەین هاتن سەرو کراسی سـووریان لەبـەردابوو دەڕۆیشـتن و دەکەوتن و هەڵدەستانەوە، پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وسلم**) لەمـینبەر دابـەزی و هـەڵیگرتن، یـەکیان بـە تەنیشـتێك و، ئـەوی دیکـەیان بـە تەنیشتەکەی دیکە، پاشان چووەوە سەر مینبەر و فەرمووی: خوا ڕاستی فەرمووە: (بێگومـان سامـان و ڕۆڵەکانتان تاقی کردنـەوەن) مـن ئـەم دوو منداڵەم بینین دەڕۆیشتن و دەکەوتن، خۆم ڕانەگرت قسەکەم بڕی و بۆیـان دابەزیم .

٦- (عن ابن إياس عن أبيه رضي الله عنهُ قال:

**لقد قُدْتُ بنبي الله** صلى الله عليه وسلم **والحسن والحسين بَغْلَتَهُ الشهباء حتى أدخلتهم حجرة النبي هذا قُدامَهُ وَهذا خَلْفَهُ**) رواه مسلم .

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و حەسەن و حوسەین یەکیان لە پێشەوەو یەکیان لە پشتیەوە، سوار بوویوون بەسواری ئێسترە سپییەکەی، لێم خوڕی هەتا بردمنە ژوورەکەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) .

٧- (عن ابن عباس رضي الله عنهُما قال:

**كان رسول الله** صلى الله عليه وسلم **يُعَوِّذُ الحسن والحسين يقول : أعيذُكما بكلمات الله التامة مِن كل شيطان وهامة ومن كل عَيْنٍ لامَّة، ويقول : إنّ أباكم إبراهيم كان يعوذ بهن إسماعيل وإسحاق**) رواه البخاري .

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوعاو پەنادانی بەسەر حەسەن و حوسەیندا دەخوێندو دەیفەرموو : پەناتان دەدەم بە وشە تەواوەکانی خوا، لەهەموو شەیتان و جرو جانەوەرێك، وەلەهەموو چاوێکی پیس، وە دەیفەرموو: باپتان ئیبراهیم بەم وشانە ئیسماعیل و ئیسحاقی لە ژاردارو چاوو زار دەپاراست.

٨- (عن أبي هريرة رضي الله عنهُ قال:

**كنّا نصلّي مع رسول الله** صلى الله عليه وسلم **العشاء فأذا سَجَدَ وَثَبَ الحَسَنُ والحسين على ظهره، فاذا رفع رأسه أخذهما أخذاً رفيقاً فيضعهما عن ظهره، فإذا عادَ عادا، حتى اذا قضى صلاته أقْعدَهما على فَخِذَيه** ...) رواه أحمد.

واتە: جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا نوێژی خەوتنمان دەکرد، کاتێک دەچووە سەجدە، حەسەن و حوسەین خۆیان هەڵدەدایە سەرپشتی، ئنجا کاتێك سەری بەرز دەکردەوە بەنەرمی لەسەر پشتی دەیهێنانە خوارێ، وەکاتێك دەچۆوە سوجدە، ئەوانیش دەگەڕانەوە سەرپشتی، هەتاکو نوێژەکەی تەواو دەکردو هەردووکیانی لەسەر هەردووك ڕانی دانیشتاند...

هەڵبەتە ئەگونجێ گەلێك دەقی دیکەی سوننەتیش لەبارەی هەڵس و کەوت و مامەڵەی پڕ سۆزو خۆشەویستی و بەزەیی پەرۆشی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ڕۆڵەکانی دا، وەك بەسۆزترین باب بێنینەوە، بەڵام وەك گوتراوە لەهەر باخەی گوڵێك یان چەپکێك .

ئنجا بێگومان ئەو دەقانەی سوننەت، هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ڕەوشت و ئاکاری بەرزی پێغەمبەری خوامان لەبواری باب و ڕۆڵایەتییدا پێشان دەدەن، دەبێ گەلێك هەڵس و کەوت و بیرو بۆچوونی هەڵەو ناشەرعییانەی زۆرێك لە مسوڵمانانیشمان بۆ ڕاست بکەنەوە، ئەگەرنا بێگومان هەر زانیارییەك خاوەنەکەی کاری پێ نەکات و، خۆی پێ پاش نەکات و خۆی پێ لەخواوە نزیك نەخات، ئەوە لەسەری قەرزار بۆتەوە.

لێرەشدا کۆتایی بەم تەوەری سێ یەمەش دێنین و دەچینە سەر تەوەری چوارەم و کۆتایی .

## تەوەری چوارەم : کەسایەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و فووی زاری ناحەزانی:

هەرچەندە پێم وایە هەر کەسێك بە ویژدانێکی زیندوو و عەقڵ و دڵێکی بێ غەرەزەوە، ئەوەی لە تەوەری دووەم دا ڕابرد بخوێنێتەوە، دڵنیادەبێ کە ئەوەی ناحەزانی داخ لەدڵی ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی پێغەمبەری خواوە، لەبواری هاوسەرگیرییەکانیدا، گوتوویانەو دەیڵێن، بێجگە لە گومانی خراپ و تۆمەتی دڵنەخۆشانە، چی دیکە نیە، بەڵام بەپێویستم زانی کە لەم تەوەرەشدا جارێکی دیکە قسە لەسەر ئەو بابەتە بکەین، ئەویش لەسێ بڕگەدا کە ئەمە ناوو نیشانە کانیانە:

یەکەم : گوێز لە هەمبانەی خۆدا ژماردن و قیاس لەسەر خۆکردن، بناغەی گومانی خراپ بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بردنە، لەبواری هاوسەرگیرییەکانی دا .

دووەم: ئایا هاوسەرگیریی پێغەمبەر لەگەڵ خاتوو عائیشە دا هیچ گرێ گۆڵێکی تێدایە؟!

سێیەم: هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ خاتوو زەینەبی کچی جەحش داو ڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتێکی بێ بنەما .

## یەکەم : گوێز لە هەمبانەی خۆدا ژماردن و قیاس لەسەر خۆکردن، بناغەی گومانی خراپ بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بردنە، لەبواری هاوسەرگیرییەکانی دا:

مرۆڤ بەزۆریی لە ئاوێنەی خۆیەوە تەماشای خەڵکی دیکە دەکات و، هەمیشە قیاسی خەڵکی لەسەر خۆی دەکات و وەك پێشینان گوتوویانە: (هەر کەسە لە هەمبانەی خۆی دا گوێزان دەژمێرێ).

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کە سەرجەم ئەوانەی لە بواری هاوسەرگیرییەکانی دا ڕەخنە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەگرن، کەسانی بێ بڕوان، چونکە بێگومان کەسێك ئیمانی بە خواو پێغەمبەری خوا هەبێ، ئیمانەکەی ڕێی نادات تووشی بێ ئەدەبیی وابێ، کە ڕەخنە لە پێغەمبەرێك بگرێ کە لەهەڵەو گوناهو خراپە پارێزراوەو، بەبێ مۆڵەت و ڕێپێدانی خوای کاربەجێ هیچ هەنگاوێك نانێ .

هەڵبەتە ئەو جۆرە کەسانەش – واتە کەسانی بێ بڕوا – لەسۆنگەی ئەوەوە کە هیچ بەربەستێکیان لەبەردەم دا نیە، لە ئیمان و ترس و سەرسامی خواو بیمی لێپرسینەوەی ڕۆژانی دوایی، هەمیشە بەدوای نەفسی خۆیان و ئارەزووەکانیانەوەن وە لەهیچ خراپەو گوناهێك سڵ ناکەنەوەو ناپرینگێنەوە، ئەوە لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە لەسۆنگەی ئەوەوە کە لە ڕوانگەیەکی ماددیی یەوە تەماشای ژیان و، لەدەلاقەی ئاژەڵ بوونی مرۆڤ و بەس حیساب کردنی بۆ غەریزەکانیەوە، بۆ ئینسان دەڕوانن، بۆیە بەپێی یاسای : (مَنْ ساءَت فعالُهُ ساءت ظنونه) هەرکەسێك کردەوەکانی بەد بوون، گومانەکانی خراپ دەبن، خۆیان چۆنن، هەر ئاواش تەماشای خەڵکی دیکەش دەکەن .

بەڵێ ئنجا ئەو جۆرە کەسانە کە سەرلەبەری ژیان و گوزەرانیان و

هەڵسوکەوتەکانیان لەژێر فشاری غەریزەکانیان دایە، پێیان وایە کە پێغەمبەری کۆتاییش (صلى الله عليه وسلم) هەروا بووەو، بەپاڵنەری تێرکردنی غەریزەی جنیسیی سەرجەم هاوسەرگیرییەکانی خۆی ئەنجام داوە!

بەلام بێگومان ئەوانە ئەگەر لەڕاستی بگەڕێن و عەوداڵی دۆزینەوەی هەق بن، ئەگەر تەنیا سەرنجی هەندێك لەلایەنەکانی ژیان و گوزەرانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هەڵوێستەکانی بدەن، دڵنیاو مسۆگەر دەبن، کە خراپ بەهەڵە داچوون و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەدۆڵێك دایەو، ئەوان لە دۆڵێکی دیکەدان . (هو في وادٍ وهم في وادٍ آخر) و هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەری خوا — هەرچەندە تێرکردنی غەریزی جینسیی و سەرجەم غەریزەکانی دیکەش، شتێکی ئاساییی و ڕەوایە مادام بە ڕێبازو شێوازی شەرعییانە بێ — بەلام بەهیچ جۆرێك ناگونجێ کە تەنیا بە تێرکردنی غەریزە تەفسیر بکرێن .

جا ئێستا با سەرنجێکی کورت و خێرای ژیان و گوزەرانی پێغەمبەری خوا بدەین، بەڵکو هەرچی تەمو مژو هەوری گومان و دوودڵیی یە، سەبارەت بە هاوسەرگیرییەکانی برەوێتەوە:.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیتوانی ژیان و گوزەرانێکی پڕ نازو نیعمەت و خۆش گوزەرانیی هەبێ، بەلام ژیانێکی زۆر سادەو دنیا بە کەمگر (زاهد) انەی هەبووە، چ لەڕووی بەرگ و پۆشاك و، چ لە ڕووی خواردن و خواردنەوەو، چ لە ڕووی خانووبەرەو کەل و پەلی نێو ماڵەوە، چونکە ئەو وا تەماشای دنیای دەکرد، کە شوێنی تێدا تاقی کرانەوەیە، نەك جێگای تێدا ڕابواردن و حەسانەوە، با لەو بارەوە سەرنجی چەند دەقێکی سوننەت بدەین :

١- (عن عائشة رضي الله عنها قالت : ما شَبِعَ آلُ محمد صلى الله عليه وسلم من خُبْزِ الشَّعير يومين متتابعين حتى قُبِضَ) رواه مسلم : ٢٢/٢٩٧٠.

واتە: خێزانی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دوو ڕۆژان لەسەر یەك لە نانی جۆ تێر نەبوون، هەتا گیانی کێشرا.

٢- (عن عروة عن عائشة رضي الله عنها أنَّها كانت تقول : والله يا ابن أُخْتي إنْ كُناَّ لَنَنْظُر الى الهلال ثم الهلال ثلاثة أهِلَّة في شهرين وما أوقدَ في أبيات رسول الله صلى الله عليه وسلم نارٌ، قلت: يا خالَةُ فما كان يُعَيِّشكُم ؟ قالت : الأسودان: التمر والماء، الاّ أنه قد كان لرسول الله صلى الله عليه وسلم جيران من الأنصار وكانت لهم منافِحُ وكانوا يُرسْلون الى رسول الله من ألبانها فَيسْقينا) رواه البخاري٦٤٥٩، ومسلم : ٢٨/٢٩٧٢.

واتە: عورِوە(ی کوڕی زوبەیر) لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی : بەخوا کوڕی خوشکم! ئێمە تەماشای مانگی یەك شەوەمان دەکرد، دوایی مانگێکی دیکە، ئنجا یەکی دیکە لە ماوەی دوو مانگ دا سێ مانگ تازە دەبوونەوە، لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ئاگر (بۆ چێشت لێنان) نەدەکرایەوە، (عورِوە دەڵێ) گوتم : ئەی پووری! (چونکە عورِوە کوڕی ئەسمائی کچی ئەبو بەکرە) ئەدی چی دەیژیاندن ؟ گوتی: دوو شتە ڕەشەکان : خورماو ئاو، وێڕای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێك حوشتریان هەبوون، دراوسێی پشتیوانانی هەبوون لە شیرەکەیان بۆ پێغەمبەری خوایان دێنا، ئەویش دەیدایێ .

٣- (عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال:

نام رسول الله صلى الله عليه وسلم على حصيرٍ فقام وقد أثَّر في جَنْبِهِ فقلنا: يا رسول الله لو اتَّخذنا لك وطاءً، فقال: مالي للدنيا ! ما أنا في الدنيا إلا كراكبٍ استَظَلَّ تحت شجرة ثم راح وتركها) رواه الترمذي وقال : حسن

صحيح : ٢٣٧٧.

واتە : پێغەمبەری خوا لەسەر حەسیرێك خەوتبوو، کە هەڵسا شوێنکەی لەسەر کەلەکەی کردبوو، گوتمان : ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر جێگای لەسەر خەوتنێکی نەرمت بۆ بێنین ! فەرمووی : من چیم لە دنیا داوە! من لە دنیادا تەنیا وەك سوارێك وام کە لە سێبەری درەختێکدا پشوویەك دەدات، پاشان دەڕواو بەجێی دەهێڵێ .

٤- (عن أبي بُردة بن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه قال: أخرجت لنا عائشة رضي الله عنها كِساءً وإزاراً غليظَيْن قالت : قُبِضَ رسول الله صلى الله عليه وسلم في هذين) رواه البخاري : ٥٨١٨، ومسلم : ٢٠٨.

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ پۆشاکێك و شەرواڵێکی ئەستووری بۆ دەرهێناین و گوتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەم دووانەدا گیانی کێشرا.

٥- (عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان فراش رسول الله صلى الله عليه وسلم من أدَمٍ حَشْوهُ لِيفٌ) رواه البخاري: ٦٤٥٦، واتە: دۆشەکی خەوتنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەرمێك بوو، نێواخنەکەی پووشە خورما بوو.

بەڵێ ژیان و گوزەرانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاوابووەو، هەڵبەتە خۆیشی حەزی کردوە وابێ نەك بە ناچاریی، وە پاشان ئامادەش نەبووە بیگۆڕێ، تەنانەت ئەگەر لەسەر ئەوە هاوسەرەکانیشی لێی جیاببنەوە، وەك لە مەسەلەی سەرپشك کردنی هاوسەرانی (تخيير أزواجه) دا دەرەوشاوەیە، وەك لە ئایەتەکانی ژمارە (٢٨ و ٢٩) ی (الأحزاب) دا هاتوە:.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٢٨ — ٢٩،

واتە: ئەی پێغەمبەر! بە هاوسەرەکانت بڵێ، ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاو جوانییەکانتیان دەوێ، وەرن سەرو دیارییتان دەدەمێ و بەشێوەیەکی جوان وازتان لێدێنم، وە ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی و مەنزڵگای دوارۆژتان مەبەستە، ئەوە بێگومان خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتێکی مەزنی داناوە .

(ابن كثير) لەبارەی ئەم دوو ئایەتەوە گوتوویەتی:

**(هذا أمرٌ من الله تبارك وتعالى لرسول الله صلى الله عليه وسلم بأنْ يُخَيِّر نساءَهُ بين أن يفارقَهُنَّ فَيَذْهَبْنَ الى غيره فيمَن يَحْصُلُ لَهُنَّ عنده الحياة الدنيا وزينَتُها، وبين الصَّبرْ على ما عنده من ضيق الحال، ولهن عند الله تعالى في ذلك الثوابُ الجزيل، فاخْتَرنَ رضي الله عنهُنَّ وأرضاهُنَّ الله وَرَسولَهُ والدار الآخرة، فجمع الله تعالى لهن بعد ذلك بين خير الدنيا وسعادة الآخرة)** [1].

واتە: ئەمە فەرمانی خوایە تبارك وتعالى بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) کە ژنەکانی سەرپشك بکات لە نێوان : واز لێهێنانی بۆیان و چوونیان بۆلای یەکێکی دیکە، کە نازو نیعمەت و جوانیی دنیایان لەلای چنگ بکەوێ، وە خۆڕاگریی سەر ژیان و گوزەرانی سەختی لای وی، وە پاداشتی فراوان و زۆریان لەلای خوای بەرز لەبەرانبەریدا هەبێ، ئەوانیش خوا لێیان ڕازی بێ و ڕازیشیان بکات، خواو پێغەمبەرەکەی ومەنزڵگای دوارۆژیان هەڵبژارد، خوای بەرزیش دوای ئەوە، چاکەی دونیاو بەختەوەری ڕۆژی دوایی بۆ کۆکردنەوە.

---

(١) المصباح المنير، تهذيب تفسير ابن كثير، ص١٠٨٦.

ئێستاش بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونبوونەوەمان لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە، با دەقێکی سوننەت بێنینەوە کە تیشکی باش دەخاتە سەری :

عن جابر بن عبد الله رضي الله عنه قال:" دخل أبو بكر يستأذن على رسول الله صلى الله عليه وسلم فوجد الناس جلوساً ببابه لم يُؤذن لأحدٍ منهم، قال: فأُذن لأبي بكر فدخل، ثم أقْبلَ عمرُ فاستأذن فأذنَ له، فوَجد النبيَّ صلى الله عليه وسلم جالساً حوله نساؤه واجماً [(1)] .ساكتاً. قال: فقال: لأقولنّ شيئاً أُضْحِكُ النبيَّ صلى الله عليه وسلم فقال: يا رسولَ الله، لو رأيت بنتَ خارجة سألَتْني النفقة، فقمت إليها فوَجأْتُ [(2)] عُنُقَها ! فضَحِكَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم وقال:" هُنَّ حولي كما ترى يسألْنَني النفقة" فقام أبو بكر إلى عائشة يجأ عنقها، فقام عمر إلى حفصة يجأ عنقها، كلاهما يقول: تسألن رسول الله صلى الله عليه وسلم ما ليس عنده ؟! فقلن: والله لا نسأل رسول الله صلى الله عليه وسلم شيئاً أبداً ليس عنده. ثم اعتزلهن شهراً أو تسعاً وعشرين، ثم نزلت عليه هذه الآية:"يا أيها النبي قل لأزواجك" حتى بلغ "للمحسنات منكن أجراً عظيماً"، قال فبدأ بعائشة فقال: يا عائشة إني أريد أن أعْرِضَ عليك أمراً أحب أن لا تعجلي فيه حتى تستشيري أبويك. قالت: وما هو يا رسول الله؟ فتلا عليه الآية، قالت: أفيك يا رسول الله أستشير أبَوَيَّ؟ بل أختار الله ورسوله والدار الآخرة وأسألك أن لا تُخْبِر امرأةً من نسائك بالذي قلت. قال: لا تسألني امرأة منهن إلا أخبرتها، إن الله لم يبعثني مُعَنِّتاً ولا متعنتاً ولكن بعثني مُعَلِّماً مُيَسِّراً")رواه مسلم : ١٤٧٨.

---

(١) وجِمَ، يَجِمُ وَجْماً ووجوماً : سكت على غَيْظ، عبَسَ وأطْرَق وسكت عن الكلام لشدَّة الحزن، المعجم الوسيط، ص١٠١٥، کەواتە: وجوم : گرژیی و تووڕەیی و خەمباری و بێدەنگیی .

(٢) وَجَأَ، يَجَأُ، ووجاءً، دَفَعَهُ بِجَمْعِ كَفِّه في الصدر والعنق وقال : وَجَأَهُ باليد وبالسكين، ضَرَبَهُ: المعجم الوسيط، ص١٠١٢، کەواتە: وَجَأَ : یانی پاڵی پێوەنا، یان لێیدا.

واتە: ئەبو بەکر هاتە ژوور داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا کرد (صلی الله علیه وسلم) خەڵکی بینی لەبەردەم دەرگایەکەی دانیشتوون، مۆڵەتی کەسیان نەدراوە بچنە ژوور، دەڵێ مۆڵەتی ئەبو بەکر درا چووە ژوورێ، پاشان عومەر هات داوای مۆڵەتی کردو مۆڵەتی دراو چووە ژوورێ، پێغەمبەری بینی ژنەکانی لە دەورنی و ئەویش بە گرژی و خەمباریی و بێدەنگیی دانیشتوە، دەڵێ : (واتە: جابر) عومەر گوتی : دەبێ شتێك بڵێم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بهێنمە پێکەنین، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر کچی خاریجەت دیبایە داوای مەسرەفی لێدەکردم (واتە مەسرەفی زیادە) منیش بۆی هەڵسام پالم پێوە نا، پێغەمبەری خواش پێکەنی و فەرمووی: هاوسەرانی منیش وەك دەبینی لەدەورمن و داوای مەسرەفم لێدەکەن (واتا مەسرەفێك کە لە تواناى دانیە) ئیدی ئەبو بەکر بۆ عائیشە هەڵسا پاڵی پێوەنا، وە عومەریش بۆ حەفصە هەڵسا پاڵی پێوەناو هەردووکیان دەیانگوت : ئایە شتێك لە پێغەمبەری خوا داوا دەکەن کە نیەتی، ئەوانیش (واتە: هەموو ژنەکان) گوتیان: بەخوا لەمەودوا هەرگیز شتێك لە پێغەمبەر خوا داواناکەین کە نەیبێ، پاشان ماوەی مانگێك یان بیست و نۆ شەو کەناری لێگرتن، ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ ﴾ هەتا گەیشتە: ﴿ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ دەڵێ ئەویش بە عائیشە دەستی پێکردو فەرمووی : ئەی عائیشە! وەرە شتێکت پێ رادەگەیەنم، پێم خۆشەی هەتا راوێژ بە باب و دایکت نەکەی، پەلەی تێدانەکەی (بریار نەدەی) گوتی: ئەو شتە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ ئەویش ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە، گوتی: جا ئایا لەبارەی تۆوە راوێژ بە باب و دایکم بکەم؟ بەڵکو خواو پێغەمبەرەکەی و مەنزلگای دوارۆژ هەڵدەبژێرم، بەلام داوات لێ دەکەم ئەوەی من گوتم، بەهیچ کام لە ژنەکانتی مەڵێ، فەرمووی:

هیچ ژنێکیان پرسیارم لیَ ناکات، مەگەر پێی دەڵێم، بێگومـان خـوا منـی ڕەوانـە نەکردوە کە ئازاردەر و زەحمەت خەر بم، بەڵکو ناردوومی کە فێرکەرو ئاسانکەر بم.

بەڵیَ ژیان و گـوزەرانی پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوسـەرەکانی ئاوابووە، کە خستمانە ڕوو، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا ئامادە نەبووە ئەو ژیانە سـەخت و دنیا بە کەمگرانەیەی خۆی بگۆڕێ، تەنانەت ئەگەر لەسەر ئەوە هاوسەرەکانیشی لێی جیاببنەوە!

جا لێرەدا دەپرسین :

ئایە کەسێکی وا دەگونجیَ گومـانی کەوتنـە ژێـر کاریگـەریی غـەریزەکانی پـیَ بـبردریَ ؟ بێگومـان نـەخێر، ئنجـا وەنـەبیَ تـەنیا شـێوەی ژیـان و گـوزەرانی پێغەمەبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەرخەری ئەو ڕاستییە بیَ، کـە نـاگونجیَ ئـەو زاتە بەرزە ئەو جۆرە گومانانەی پیَ ببردرێن، بەڵکو لەپێش ئەوەشدا خوا ناسـیی و پارێزکاریی و خوا پەرستیی و هەمیشە دەم بـە زیکـری خـوا بونیشـی، پێچـەوانەی ئەوەیە، با لەوبارەیەشەوە سەرنجی چەند دەقێکی سوننەت بدەین:

### ١- پارێزكاریی و لەخوا ترسانی:

لـەوبارەوە فەرموویـەتی: (أمـا والله إنـي لأخشـاكم لله وأتقـاكم لـه ...) رواه البخاري: ٥٠٦٣، مسلم :١٤٠١، واتە: ئاگاداربن! بەخوا لەهەمووتان لەخوا ترسترو پارێزكار ترم..

### ٢- شەونوێژی :

(عن عائشة رضي الله عنها أنَّ النبيَّ صلى الله عليه وسلم كـان يقـوم مـن الليـل حتّى تتفطّر قدَماهُ، فَقُلْتُ له: لم تصنع هذا يارسول الله وقدغفر الله لك ما تقدم من ذنبك وما تأخَّر؟ قال: أفلا أكون عبداً شكوراً؟!) رواه البخـاري : ٤٨٣٧، ومسلم:٢٨٢٠، واتە : عائیشـە خوا لێی ڕازی بیَ گوتوویەتی: پێغەمبەر (صلی الله

علیه وسلم) هێندەی شەونوێژ دەکردن هەتا پێیەکانی دەقڵیشان، پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی وادەکەی لەکاتێك دا کە خوا لەگوناهی ڕابردوو داهاتووت بوردوە ؟ فەرمووی: ئەدی نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزار بم !!

### ٣- ڕۆژوو گرتنی پێکەوە گرێ دراو (صیام الوصال)ی:

(عن ابن عمر رضـي الله عنهُما قـال: نهـى رسـول الله صلى الله عليه وسلم عـن الوصال، قالوا: إنَّكَ تواصِلُ، قال: إني لَسْتُ مِثلكم، إني أُطْعَمُ وأُسْقى) رواه البخـاري : ١٩٦٢، ومسـلم: ١١٠٢. واتـە: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) ویصاڵی قەدەغە کرد، هاوەڵانیش گوتیان: بەڵام تۆ ویصال دەکەی ؟ فەرمووی: من وەك ئێوە نیم، من خواردن و خواردنەوەم پێ دەدرێ .

دیارە (وصال) ئەوەیە کە بابای ڕۆژوو گر دوو ڕۆژ یان زیاتر بە ڕۆژوو بێ، بێ ئەوەی هیچ شتێکیان لەنێواندا بخوات یان بخواتەوە .

وە مەبەستی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەوە کە دەفەرموێ : خواردن و خواردنەوەم دەدرێتێ، یانی لەززەتی ڕووحیی و ئیمانیی طاعەت و عیبادەت، کەلێنی خواردن و خواردنەوەشی بۆ پڕدەکاتەوە.

### ٤- زۆر یادی خوا کردنی و داوای لێبوردن لێکردنی:

أ- (عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يذكر الله تعالى على كلِّ أحيانه) رواه مسلم : ٣٧٣، واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەهەمو حاڵەتێکیدا یادی خوای بەرزی دەکرد.

ب- (عن أبي هريرة رضي الله عنهُ قال: سمعْتُ رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: والله إنيِّ لأستغفر الله وأتوب اليه في اليوم أكثر من سبعين مَرة) رواه البخـاري : ٦٣٠٧. واتـە: بەخوا مـن ڕۆژی حەفتا جار زیاتر داوای لێبوردن لەخوا دەکەم وە دەگەڕێمەوە لای. دەپرسین :

ئنجا لێرەدا جارێکی دیکە ئایا دەگونجێ پێغەمبەرێکی پابەندی هەمیشە خوا لە یادی دڵ بەخواوە پەیوەست و ئەوپەڕی لەخواترس و پارێزکارو خوا پەرست، تۆمەتی ئارەزوو بازیی ئاراستە بکرێ، بگرە هەر گومانی واشی پێ ببردرێ ؟ ! بێگومان : نەخێر.

## دووەم : ئایا هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ خاتوو عائیشە دا هیچ گرێ و گرێیەکی تێدایە ؟

هەندێك لەو کەسانەی کە لەبڕگەی یەکەمدا باسم کردن، هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ عائیشەی کچی ئەبو بەکری صدیقیان خوا لێیان ڕازی بێ، کردۆتە مایەی تانەدان لەو زاتە بەرزو پاکە، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە تەمەنی نۆ ساڵان بووە کە بۆی گوازراوەتەوە و، ئەویش ئەو کاتە تەمەنی لە پەنجا ساڵ زیاتر بووە، جا دەڵێن : چ ڕەوای هەقە پیاوێکی تەمەن پەنجاو ئەوەندە ساڵە، لەگەڵ کچێکی نۆ ساڵەدا هاوسەرگیریی بکات ؟!

ئنجا ئێمە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە و لابردنی ئەو ئیشکالە، چەند شتێك دەخەینە ڕوو :

### یەك: هاوسەرگیریی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەگەڵ عائیشەدا بەئاڕاستەکردنی خوای کاربەجێ بووە:

وەك لەم فەرموودەیەدا دیارە، کە پێشتریش هێنامان : (عَنْ عَائِشَةَ ، أَنَّهَا قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : " أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ ثَلَاثَ لَيَالٍ،

جَاءَنِي بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَيَقُولُ : هَذِهِ امْرَأَتُكَ فَأَكْشِفُ عَنْ وَجْهِكِ، فَإِذَا أَنْتِ هِيَ فَأَقُولُ : إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ ") رواه البخاري : ٣٨٩٥ و مسلم :٢٤٣٨.

كه پێشتر ماناامان كرد.

كەواتــه پێغەمبـــەری خـــوا (صلى الله عليه وسلم) لەلايـــەن خـــواوە ئاگـــادار كراوەتەوە، بەر لەوەی هیچ كەس بیر لەو مەسـەلەیە بكاتـەوە، بۆیـه ڕەخنـه گرتن لە پێغەمبەر لەو مەسەلەیەدا، ڕەخنە گرتنە لە خـوا سـبحانه وتعـالى و، ئەوەش كوفرێكە هیچ كەس لامەو جیمی تێیدا ناكات.

**دوو: هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ عائیشەدا لەلایەن (خولة بنت حيكم) ەوە پێشنیاركراوە :**

وەك لەم دەقەی سوننەت دا هاتوە: (لَمَّا هَلَكَتْ خَدِيجَةُ جَاءَتْ خَوْلَةُ ابْنَةُ حَكِيمٍ امْرَأَةُ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ، قَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلا تَتَزَوَّجُ، قَالَ : مَنْ ؟، قَالَتْ : إِنْ شِئْتَ بِكْرًا، وَإِنْ شِئْتَ ثَيِّبًا ؟ قَالَ : فَمَنِ الْبِكْرُ ؟، قَالَتْ : ابْنَةُ أَحَبِّ خَلْقِ اللَّهِ إِلَيْكَ: عَائِشَةُ ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ، قَالَ : وَمَنِ الثَّيِّبُ، قَالَتْ : سَوْدَةُ ابْنَةُ زَمْعَةَ، قَدْ آمَنَتْ بِكَ وَاتَّبَعَتْكَ عَلَى مَا تَقُولُ، قَالَ : فَاذْهَبِي، فَاذْكُرِيهِمَا عَلَيَّ....) رواه أحمد في المسند ٢٥٨٣، وحسن اسناده الأرنؤط في تعليقه على المسند .

واته: خەولەی كچی حەكیم ژنـی عوسمانی كـوڕی مـەزعوون پـاش مردنـی خەدیجـە چـووەلای پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) و گـوتی : ئـەی پێغەمبەر خوا! ئایا هاوسەر ناگری؟ فەرمووی كێ ؟ گوتی: ئەگـەر دەتـەوێ كـچ و، ئەگـەر دەتـەوێ بێـوەژن، فـەرمووی كچـەكە كێیـە؟ گـوتی: كچـی

خۆشەویستترین خەڵکی خوا لەلات : عائیشە کچی ئەبو بەکر، فەرمووی : بێوەژنەکە کێیە ؟ گوتی: سەودەی کچی زەمعە کە ئیمانی پێت هێناوە و شوێنی ئەوە کەوتوە کە دەیفەرمووی، فەرمووی : دەبچۆ بۆمیان بخوازە...

هەڵەبتە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ ئەو کاتە عائیشە وابووبێ بخوازرێ، جا تەمەنی هەرچەندێك بووبێ[1] .

بەڵگەیەکی دیکەش بۆ ئیسپاتی ئەوە کە گوتمان ئەوەیە، کە هەر لە دەقی پێشوودا هاتوە کە عائیشە پێش خوازرانی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەلایەن (مُطعِم بن عدي) یەوە بۆ (جُبَیْر) ی کوڕی خوازراوە، بەلاّم دوایی ژنەکەی وەك (أم رومان) ی دایکی عائیشە گوتوویەتی، ژنەکەی (مُطعم) کە ناوی (أم الفتى) بووە، بەبیانووی ئەوەی کە ئەبو بەکر کوڕەکەی هەڵدەگێڕێتەوە و دەیکاتە مسوڵمان، خوازبێنییەکەی هەڵوەشاندۆتەوە:

(قَالَتْ أُمُّ رُومَانَ : إِنَّ مُطْعِمَ بْنَ عدي كَانَ ذَكَرَهَا عَلَى ابْنِهِ، فَوَاللَّهِ مَا وَعَدَ وَعْدًا قَطُّ، فَأَخْلَفَهُ لأَبِي بَكْرٍ . فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى مُطْعِمِ بْنِ عدي عِنْدَهُ امْرَأَتُهُ أُمُّ الْفَتَى، فَقَالَتْ : يَابْنَ أَبِي قُحَافَةَ، لَعَلَّكَ مُصْبِئٌ صَاحِبَنَا، فَمُدْخِلُهُ فِي دِينِكَ الَّذِي أَنْتَ عليه إِنْ تَزَوَّجَ إِلَيْكَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ لِلْمُطْعِمِ بْنِ عدي: بقول هذه تَقُولُ؟ قَالَ : إِنَّهَا تَقُولُ ذَلِكَ، فَخَرَجَ مِنْ عِنْدِهِ، وَقَدْ أَذْهَبَ اللَّهُ تَعَالَى مَا كَانَ فِي نَفْسِهِ مِنْ عدته الَّتِي وَعَدَهُ) مسند أحمد : ٢٥٨١.

(١) بۆیەی من گومانم هەیە کە عائیشە خوا لێ ڕازی بێ لەکاتی خوازرانو مارەکردنی دا شەش ساڵانو، لەکاتی گوازرانەوەی دا نۆ ساڵان بووبێ .

**سێ : ئەگەر ڕاست بوایە عائیشە لەکاتی گوێزرانەوەیدا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) منداڵێکی گچکە بوایە هاوبەشدانەرەکان کە هەمیشە لێی لە بۆسەدابوون بۆ ڕەخنە گرتن، ئەو مەسەلەیان دەورووژاند:**

بەڵێ، لە ڕاستیدا باس نەکردنی ئەم مەسەلەیە لەلایەن هاوبەشدانەرە ناحەزەکانی پێغەمبەرو ئیسلامەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو کاتە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ ئافرەتێکی تەواو و پێگەیشتوو بووە، جا چ تەمەنی لەو تەمەنە زیاتر بووبێ، کە باس کراوە، گوایە نۆ (٩) ساڵ بووە، چ تەمەنەکەی هەر ئەوەندە بووبی، بەڵام زوو گەشەی کردبێ پێگەیشتبێ.

**چوار : لەناوچە گەرمەسێرەکاندا ئافرەت زووتر پێ دەگەن، وەك لەناوچە ساردەکاندا:**

ئەمیش ڕاستییەکە پسپۆڕانی ئەو بوارە لەسەری یەکدەنگن و، دیارە لەنێو کچانیشدا دیسان جیاوازیی هەیە لەڕووی زوو پێگەیشتن و درەنگ پێگەیشتنیانەوە.

**پێنج: باوی کۆمەڵگایەکان جیاوازە شتێکی هەڵەیە کە ڕووداوو مەسەلەیەك لە هەلومەرج و ژینگەو باوە کۆمەڵایەتییەکە دابڕێنرێ.**

ئاشکرایە کە بەپێی باوی زۆربەی کۆمەڵگایەکانی ئەم ڕۆژگارە، هاوسەرگیریی نێوان پیاوو ئافرەت بەجیاوازیەکی تەمەنیی هێندە زۆرەوە (٥٥-٩٥) شتێکی سەیرو نامۆیە، بەڵام بێگومان بەپێی عورف و عادەتی

ئەو کاتەی دونیاو پێش ئەوەش، بەپێی یاساکانی شەریعەت کە گرنگ بەیەکدی ڕازی بوونی پیاوو ئافرەتەو مادام لەسەر بناغەی ڕەزامەندیی هەردووك لا بێت، هاوسەرگیریی بە جیاوازیی نێوان تەمەنی ژن و مێرد، جا چ پیاو بەتەمەنتر بێ، چ ژن، هیچ ئیشکالێکی تێدانیە .

## شەش: بێگومان نابێ تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری خواش چ لەڕووی مەعنەوییەوە، چ لە ڕووی جەستەییەوە، نادیدە بگیرێن:

ئەمەش خاڵێکی گرنگە، چونکە هەندێك کەس لە پیاوان و ئافرەتان بەهۆی نەخۆشیی یان بۆماوە (وراثي) یان هەر هۆکارێکی دیکەوە بێ، هەر زوو دەکەونە تەمەنەوەو نیشانەی پیرییان لێ دەردەکەوێ و، هەیە بە سی چل (٣٠-٤٠)ساڵیی هێندەی شەست حەفتا (٦٠-٧٠) ساڵەیەك دیارەو، کەسانی واش هەن کە بە پێچەوانەوە، کەوتنە نێو تەمەن و پیرییان درەنگ پێوە دەبینرێ، کە بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەجۆری دووەم بووە، بۆ وێنە با لەوبارەوە تەماشای ئەم دەقەی سوننەت بکەین :

(كان رسول الله صلى الله عليه وسلم ليس بالطويل البائن ولا بالقصير، وليس بالأبيض الأمهق ولا بالأدم، ولا بالجعد القطط ولا بالسَّبط، بعثه الله على رأس أربعين سنة، فأقام بمكة عشر سنين وبالمدينة عشر سنين وَتَوفاه الله على رأس ستين سنة، وليس في رأسه ولحيته عشرون شعرة بيضاء) رواه البخاري : ٣٥٤٧، ومسلم :٢٣٤٧، عن أنس، واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باڵای نەزۆر درێژ بوو نە کورت بوو، وە ڕەنگی نە زۆر سپیی بوو نە ئەسمەر بوو، وە قژی نە لوول بوو نە خاو بووە، خوا لەسەری چل ساڵیی تەمەنیدا ناردی، دە ساڵ لە مەککە مایەوەو، دە

ساڵیش لە مەدینە و، خوا لەسەری شەست ساڵەی تەمەنی دا بردیەوە، کە لەو کاتەدا بیست مووی سپی لەسەرو ڕیشی دا نەبوون .

دیارە پێغەمبەری خوا سێزدە ساڵ (١٣) لە مەککە ماوەتەوە، بەلاّم ڕاوی بۆ کورتکردنەوە هەر گوتوویەتی دە ساڵ .

ئنجا بێگومان ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە تەمەنی شەست ساڵیی کاتی مردنی دا، کەمتر لە بیست مووی سپی لەسەرو ڕیشیدا بووبێ، دیارە لەوە پێشتر ئەوەندە تەمەنەشی پێوە دیار نەبووە.

## حەوت: هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ عائیشەدا حیکمەتی زۆر گەورەی تێدابوونە:

کە ئێمە پێشتر لەتەوەری دووەم دا باسی ئەو حیکمەتانە کردو لێرە دووبارەیان ناکەینەوە، بەلاّم ئەوەندە دەڵێین، کە یەکێك لە حیکمەتەکانی ئەو هاوسەرگیرییە بریتیە لە ڕۆڵی گەورەو گرنگی عائیشە خوا لێی ڕازی بێ لە ژیانی پێغەمبەردا، لە ڕووی شارەزایی لەشەریعەتداو بەرچاو ڕوونکردنەوەی مسوڵمانان – لەدوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) – لە گەلێك بواری دینداریی دا، کە هەڵبەتە کەم تەمەنیی عائیشە، کاریگەریی زۆری هەبووە لەسەر ئەو ڕۆڵە گرنگ و گەورەیەی، چونکە مرۆڤ لەسەرەتای تەمەنیەوە توانای وەرگرتنی زانستی زیاترە .

ئنجا لەبارەی زانیاریی و شارەزایی دایکی بڕواداران عائیشەوە، زاناو پێشەوایان زۆر شتیان گوتوە بۆ نموونە:

١- (عن أبي موسى الاشعري رضي الله عنهُ : ما أُشكِلَ علينا أصحابُ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) حديثٌ قطّ فسألنا عنه عائشة الا وَجَدنا

**عندها منه علماً**) رواه الترمذي وحسنه وصححه، واتە: هیچ کات ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەکدا گرفتمان نەبووە، پرسیارمان لەبارەیەوە لە عائیشە کردبێ، مەگەر زانیارییەکی لەبارەوە هەبووە.

٢- (عن الزُّهري أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: **لو جُمِعَ علمُ نساءِ هذه الأمة منهن أزواج رسول الله، كان علم عائشة أكثر من علمهن**) رواه ابن ابي خَيثَمة والطبراني برجال ثقات، واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر زانیاری ئافرەتانی ئەم ئۆممەتە کە هاوسەرانی پێغەمبەری خواشیان لەنێو دابن، کۆبکرێتەوە، زانیاری عائیشە لە زانیاری هەموویان زیاتر دەبێ .

٣- (عن عروة بن الزبير قال: **ما رأيتُ أحداً أعلم بالقرآن ولا بفريضة، ولا بحلال ولا بحرام ولا بفقه، ولا بطبٍ ولا بشعرٍ ولا بحديث العربِ ولا بِنَسَبٍ، من عائشة رضي الله عنها**) رواه ابن أبي خَيثَمة والحاكم والطبراني بسَنَدٍ حسن.

واتە: هیچ کەسم نەدیوە لە عائیشە زاناتر بێ بە قورئان و فەرزەکانو حەلاڵ و حەرام و فیقهو پزیشکی گەریی و شیعرو بەسەرهاتی نەتەوەی عەرەب و رەچەڵەك.

خوا لەو دایکە بەرێزو سەنگینو زاناو خوا پەرستەمان رازی بێ و، بەچاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە، کە وا دیارە وەك چۆن لە رۆژگاری خۆیدا دەغەڵ و دوو روو و دڵنەخۆشەکان بوختانیان پێکردو ئازاری دڵیان دا، ئێستاش فەرخەکانیان لە پیلانە گلاوەکەیاندا بەردەوامن!

## سێیەم : هاوسەرگیریی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خاتوو زەینەبی کچی جەحشداو، ڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتێکی بێ بنەما:

یەکی دیکە لە هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە ناحەزانی پێغەمبەرو ئیسلام و قورئان قسەو باسی زۆریان لەبارەیەوە کردوە، بەرِەخنەیەکی گەورەیان لەسەری حیساب کردووە، هاوسەرگیرییەتی لەگەڵ (زینب بن جحش) کە کچی پووری خۆی (أميمة بنت عبدالمطلب) خوا لێی ڕازی بێ و ڕازیشی بکات.

چۆنیەتی ڕەخنەو تۆمەتەکەش ئەوەیە : کە گوایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك زەینەبی دیوە و دڵی پێداچووەو، کە (زید بن حارثة) ی مێردیشی ئەوەی زانیوە تەلاقی داوە، تاکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مارەی بکاتەوە! بەلاّم بێگومان ئەم تۆمەت و گومانە شتێکی بێ بنەمایەو، بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو تۆمەتەش، ئەم چەند خاڵە دەخەینە ڕوو:

### یەك: هەڵوەشاندنەوەی عادەتی کردنە کوڕی خۆ (التَّبنِّي):

نەریتێکی کۆنی عەرەب بوو کە پیاوێك هەڵدەستا کوڕی کەسێکی دیکەی دەکردە کوڕی خۆی، ئەو کوڕە لەوەدا هەر بەناوی ئەوەوە بانگ دەکرا، نەك بەناوی بابی ڕاستەقینەیەوە.

ئنجا پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) پێش پێغەمبەرایەتیی، (زید بن حارثة) ی کردبوو بە کوڕی خۆی و، هەر بانگیان دەکرد زەیدی کوڕی موحەممەد .

دیارە ئیسلامیش وەك هەر بەرنامەیەكی دیكەی خوا بۆیە هات كە شتەكان بگێڕێتەوە سەر بناغەی خۆیان و حاڵەتی ئاسایی و سروشتییان، ئیدی سەرئەنجام ئەو نەریتەش نۆرەی گەیشتێ و خوای زاناو شارەزا لە ئایەتەكانی ژمارە (٤، ٥) ی (الأحزاب) دا هەڵیوەشاندەوەو فەرمووی :

﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾ ﴾ الأحزاب: ٤ — ٥

واتە: وە خوا بە كوڕ كراوەكانتانی نەكردوونە كوڕانتان، ئەوەتان هەر قسەی خۆتانە بەزارتان دەیڵێن، وە خوا هەق دەڵێ و بۆ ڕاستە شەقام (خەڵكی) ڕێنمایی دەكات، بەناوی باباونیانەوە بانگیان بكەن، ئەوە لەلای خوا دادگەرانەترە، جا ئەگەر بابیانتان نەناسین، ئەوە برای ئایینی و دۆستانتانن، وە لەوەدا كە تێیدا بەهەڵە دادەچن (كە بڵێن : فلانی كوڕی فلان كە بابی خۆی نییە) گوناهتان ناگات، بەڵكو بەوە گوناهبار دەبن كە دڵتان بە ئانقەست ئەنجامی دەدات، وە خوا لێبوردەی بە زەیی یە .

ئیدی بەم جۆرە، قورئان نەریتی بە كوڕی خۆكردن (التَبَنِّي)ی هەڵوەشاندەوە، ئەگەر نا پێشتر ئەو نەریتە شتێكی ڕیشەدارو ڕۆچوو بوو، وە (زید بن حارثة) ش خوا لێی ڕازی بێ، هەر بە (زید بن محمد) ناو دەبرا، وەك لەم دەقەی سوننەت دا هاتووە:

(عن ابن عمر رضي الله عنهُما قال:
ما كنا ندعو زيد بن حارثة الاّ زيد بن محمد، حتى نزل في القرآن ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ رواه البخاري:٤٧٨٢، ومسلم :٢٤٢٥، والترمذي والنسائي وأحمد وغيرهم .

**دوو : هەڵوەشاندنەوەی نەریتی شوونەکردنی ئافرەتی ڕەچەڵەك بەرز بەپیاوی ڕەچەڵەك نزم :**

نەریتێکی دیکەی سەردەمی نەفامیی عەرەبەکان – ئێستاش لەنێو زۆر لە مسوڵمانان دا باوە – ئەوە بوو کە ئافرەتێك کە خۆی بە نەجیب زادە و ڕەچەڵەك بەرز (رفيع النسب) زانیبایە، نەخۆی و نە کەسو کاری ڕازی نەبوون شوو بە پیاوێك بکات، کە پێیان وابایە بنەماڵە و ڕەچەڵەکی لەوان نزمترە .

ئنجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ویستی ئەو نەریتە هەڵبوەشێنێتەوە، هەڵسا زەینەبی کچی جەحشی کچی پووری خۆی بۆ زەیدی کوڕی (حارثة) خواست، کە پێشتر کۆیلە بووەو ئازاد کرابوو، وە لە غەیری هۆزی قورەیش بوو، دیارە هەر کام لە زەینەب و عەبدوڵڵای برای ناڕازی بوون، هەتا خوای کاربەجێ ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الأحزاب: ٣٦، واتە: وەهیچ پیاوێکی بڕوادارو ئافرەتێکی بڕوادار، هەرکات خواو پێغەمبەرەکەی بڕیارێکیان دا، بۆیان نیە سەرپشکی کاری خۆیان بن، وەهەر کەس

سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە مسۆگەر بە گومراییەکی ئاشکرا گومرا بووە .

لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەشەوە ئەم دەقە هاتوە :

(عن قتادة قال: خطب النبي صلى الله عليه وسلم زينب وهو يريدها لِزَيْدٍ، فَظَنَّتْ أنه يُريدها لنفسه، فَلَمَّا عَلِمَتْ أنهُ يُريدها لِزَيدٍ، أبت فأنزل الله ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ ﴾ الآية، فرضيت وسلمت) أخرجه الطبري: ٨٥١٥، والطبراني : ٢٤/٢٥) بسند صحيح عنه مرسلاً ![1].

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زەینەبی خواست بۆ زەیدو، ئەویش وایزانی بۆخۆی دەیەوێ، جا کاتێك زانی بۆ زەیدیەتی ڕازی نەبوو، خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ ﴾ئیدی ئەویش ڕازی و ملکەچ بوو.

## سێ : هەڵوەشاندنەوەی نەشیانی هاوسەری کوڕی بەکوڕ کراو (زوجة للُتبنّي) بۆ بابای بەکوڕ دانەر (المُتَبَنِّي) :

کە دیارە ئەمەش هەر ئەنجام و بەرهەمی عادەتی هەڵەی بە کوڕ دانان (التَبَنّي) بوو، جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم مەسەلەیە شتێکی زۆر ڕیشەدار بوو، خوای زاناو شارەزا پێغەمبەرەکەی خۆی (صلى الله عليه وسلم) بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم نەریتە هەڵەیە هەڵبژارد، ئەویش بەوە کە دوای ئەوەی زەید و زەینەب خوا لێیان ڕازی بێ لەیەك جیابوونەوە، پێغەمبەر زەینەب بکات بە هاوسەری خۆی.

---

(١) لباب النقول في أسباب النزول، للسيوطي : ٨٤٨.

ئێستاش با سەرنجی ئەم چوار ئایەتە بدەین، کە هەر چواریان بەو بۆنەیەوە هاتوونە خوارێ :

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٣٧–٤٠.

واتە: وە کاتێك بەو کەسەت دەگوت کە خوا چاکەی لەگەڵ کردووە، تۆش چاکەت لەگەڵ کردوە دەست بە هاوسەرەکەتەوە بگرەو پارێز لە خوا بکە، و شتێکت لە دڵی خۆت دا پەنهان دەکرد کە خوا دەرخەریەتی، وە لەخەڵك دەترسای و خواش شایستە تر بوو کە لێی بترسی، جا هەر کات زەید پێویستی پێی نەما، ئەوە لەتۆمان مارە بڕی، بۆ ئەوەی بڕواداران لەبەرامبەر هاوسەرانی بەکوڕ کراوەکانیان دا هیچ سەغڵەتییان لەسەر نەبێ، هەرکات پێویستییان پێیان نەماو وازیان لێهێنان، وە فەرمانی خوا جێ بەجێ کراوە، هیچ سەغڵەتییەك لەسەر پێغەمبەر نیە لەوەدا کەبۆی پێویست دەکات، ئەمە یاسای خوایە لەوانەدا کە پێشتر ڕابردوون، وە

فەرمانی خوا ئەندازە گیریی کراوە، ئەوانەی پەیامەکەی خوا رادەگەیەنن و لێی دەترسن و، جگە لە خوا لەهیچ کەس ناترسن، وە خوا بەسە بۆ لێپرسینەوە .

موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوەکانتان نیە، بەڵکو رەوانە کراوی خواو کۆتایی هێنەری پێغەمبەرانە، وە خوا بەهەموو شتێك زانایە .

ئێستاش با سەرنجی هۆی هاتنە خوارەوەی هەندێك لە رستەکانی ئەم چوار ئایەتە بدەین:

١- (عَن أنس أن هذه الآية﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾نزلت في شأن زينب بنت جحش و زيد بن حارثة، رواه البخاري :٧٤٢٠، والترمذي والنسائي و أحمد وغيرهم.

واتە: ئەنەس گوتوویەتی: ئەم ئایەتە: ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾لەبارەی زەینەبی کچی جەحش و زەیدی کوری (حارثة) هاتۆتە خوار.

٢- (عَن أنس قال: جاء زيد بن حارثة يشكو الى رسول الله صلى الله عليه وسلم من زينب بنت جَحْشٍ، فقال النبي: (أمسك عليك أهلك) فنزلت : ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾أخرجه أحمد والحاكم وصححه على شرط الشيخين.

واتە: زەیدی کوری حاریثە هاتەلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سکاڵای زەینەبی کچی جەحشی لەلاکرد، پێغەمبەریش فەرمووی (خێزانەکەت دەست پێوە بگرە) ئیدی ئەمە دابەزی: ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾.

٣- (عن أنس قال: لما قضت عدة زينب قال رسول الله صلى الله عليه وسلم لِزَيْدٍ: إذهب فاذكرها عليَّ : فانطلقْ فأخْبَرْهـا، فقالت : ما أنا بصانعة شيئاً حتى أوأمِرَ رَبِيِّ، فقامت الى مسجدها، ونزل القرآن...) رواه مسلم : ١٤٢٨، والنسائي وأحمد وغيرهم، واتە: کاتێك عیددەی زەینەب بەسەرچوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەزەیدی فەرموو: بچۆ بۆم بخوازە، ئەویش چوو هەواڵی دایە، ئەویش گوتی: هیچ ناکەم هەتا ڕاوێژ بە پەروەردگارم نەکەم مەبەستی (إستخارە بوو) ئیدی هەڵسا چووە نوێژەگەکەیەوە (بۆ نوێژی ئیستیخارە) وە قورئانیش دابەزی.

٤- (عن عائشة قالت : لما تزوَّج النبي زينب : قالوا : تزوج حليلة ابنه، فأنزل الله: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ ﴾ أخرجه الترمذي : ٣٢٠٧.

واتە: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زەینەبی هێنا، گوتیان: ژنی کوڕی خۆی هێناوە، خواش ئەوەی ناردە خوار: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ ﴾.

کەواتە:

پوختەی ئەوە کە لەچوار ئایەتەکەی (الأحزاب) و هۆی هاتنە خوارەوەیان دەستگیر دەبێ، ئەوەیە کە خوای کاربەجێ ویستوویەتی یەکێك لەدەرهاوێشتەکانی نەریتی بە کوڕ کردن (التَبنِّي) هەڵبوەشێنێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دوو کەسی بۆ پاڵەوانێتیی ئەو مەسەلەیە هەڵبژاردوە، کە پێغەمبەرکەی و زەینەبی کچی جەحشن، چونکە زەینەب هەر لەسەرەتاوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك کچە پووری بۆ زەیدی خواست، وای زانی بۆخۆیەتی و ڕازی بوو، بەڵام دوایی کە زانی بۆ زەیدە ناڕازی بوو، هەتا خوا سبحانه وتعالى خۆی (عبدالله) ی برای پابەند

(مُلْـزَمْ) کـرد بــە پێشــنیارەکەی پێغەمبــەرەوە (صـلى الله عليـه وسـلم)، ئـەو جـارە بەناچاریی ملیان دا.

بەڵام دیارە زەینەب هەر خۆی پێ شایستەی زەید نەبوو، وە پێکەوە نـەدەگونجان و چەند جارێك زەید سکاڵای خۆی لـەو بـارەوە بـردە لای پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم)، کە مۆڵەتی بدات تەڵاقی بدات، چونکە لەگەڵی ناگونجێ.

دیــارە پێغەمبــەریش هەرچــەندە خــوا پێیڕاگەیانــدبوو، کــە زەینــەب پــاش جیابوونەوەی لە زەید دەبێتە هاوسەری وی، بەڵام ئامۆژگـاریی زەیـدی کـردوە، کـە دەست بە هاوسەرەکەیەوە بگرێ و پارێز لە خوا بکـات، ئنجـا بێگومـان پاڵنـەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەو هەڵوێستەی، مەترسیی بووە لە قسەو توانج و تەشەری خەڵك، وە سەرەنجام ئەوەی کە خوا دوایی دەری خستوە، کە بریتیە لـەوەی زەینەب دەبێتە هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەری خوا پـەنهانی کردوە و فەرموویـەتی : ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ﴾.

بەڵام سەرەنجام خوا عز وجل بە وەحی ئاشکرای خۆی – کە پێشتر تـەنها وەحـی پەنهان بوو – مەسەلەکە یەکلایی دەکاتەوەو ڕایدەگەیەنێ، کە پـاش جیابوونـەوەی زەید لە زەینەب و پێویستی پێ نەمانی، ئەوە زەینەبی لەتۆ مارەکرد:( فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ) ئنجـا حیکمــەت و ئامــانجی ئــەو هاوســەرگیرییەش ڕادەگەیەنێ کە بریتیە لەوە،هاوسەرانی ئەوانەی کە کردوویانن بەکوڕی خۆیان لێیان قەدەغەنین، کە بە کوڕی خۆیان دایانناون، لەڕاستیدا پێیان بێگانەن و کوڕیـان نـین :﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا ﴾ .

شایانی باسیشە ئەو هاوسەرگیرییە وێڕای هەڵوەشاندنەوەی نەریتی هەڵەی نەشیانی هاوسەری بابای بەکوڕ کراو (زوجة المُتَبَنَّي) بە بابای بە کوڕ کەر (المُتَبَنِّي)، ئامانجێکی دیکەشی هێناوەتەدی، کە بریتییە لە قەرەبوو کردنەوەی زەینەب کە لەبەر سەرپێچیی نەکردن لە فەرمان و بڕیاری خواو پێغەمبەر هاوسەرگیرییەکی نابەدڵی کردوە و، سەرەنجام خوا ئەوەی بۆ قەرەبوو کردۆتەوە کە بۆخۆی لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە لە پێغەمبەرەکەی مارە بڕیوە: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيۡدٞ مِّنۡهَا وَطَرٗا زَوَّجۡنَٰكَهَا ﴾.

دیارە زەینەبیش بەهۆی ئەوەوە شانازیی بەسەر هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەر دا دەکردو دەیگوت : (زَوَجَكُنَّ أهاليكُنَ وزَوَّجني الله تعالى فوق سبع سَموات) أخرجه البخاري : ٦٩٨٤.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

هاوسەرگیریی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحشی کچی پووری خۆیدا خوا لێی ڕازی بێ ئاوابووە، جا ئایا هیچ گرێ و گۆڵ و ئیشکالێك لەو هاوسەرگیرییەدا هەیە، کە مایەی گومان و تۆمەت بێ؟!

بێگومان نەخێر، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو هاوسەرگیرییە بەڵگەیەکی دیکەی بەهێزە لەسەر ئەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەموو هەنگاوەکانی لەبەر ڕۆشنایی وەحی و ئاراستە کردنی خوادا ناون و، بەتایبەت ئەو هاوسەرگیرییەی لەسەر دڵ قورس و ناخۆش بووەو، ئەگەر خوای دادگەر لەسەری پێویست نەکردبایە، نەیدەکرد، وەك ڕواڵەتی ئایەتەکان و بەسەرهات و هەڵ و مەرجی دابەزینیان دەگەیەنن و ڕستەی: ﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنۡ حَرَجٖ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥۖ ﴾ زۆر ڕاشکاوە لەو بارەوە، کە ئەو هاوسەرگیرییە لەلایەن خواوە لەسەر

پێغەمبەر پێویست کراوە.

شایانی باسیشە دڵنەخۆشەکان دوو ڕستەی ئایەتی : (٣٧) دەکەنە بەڵگە و پاساوی گومان و تۆمەتەکەیان بەرانبەر بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئەمانەن:

١- ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾ وە شتێك لەدڵت دا پەنهان دەكەی، کە خوا دەریدەخات و ئاشکرای دەکات .

٢- ﴿ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ ﴾.وە لەخەڵکی دەترسی و خواش شایستە ترە کە لێی بترسی.

دیارە ئەوان گومانیان وایە، کە مەبەست لە ڕستەی: ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ ﴾دڵپێداچوون و عاشق بوونی پێغەمبەرە بۆ زەینەب، واتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆشویستنی خۆی بۆ زەینەبی پەنهان کردوە.

هەروەها گومانیان وایە کە مەبەست لە ڕستەی : ﴿ وَتَخْشَى النَّاسَ ﴾ ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە زمانی خەڵك ترساوە، کە بڵێن : زەینەبی خۆشویستوە و دڵی پێداچووە لە کاتێك دا، کە هاوسەری زەید بووە .

بەڵام بێگومان هیچ لەو دوو گومانە لەجێی خۆیان دانین، بابزانین چۆن؟ .

**١- بەنسبەت هی یەکەمیان:**

أ- خوا فەرموویەتی : ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾ وە شتێك لە دڵی خۆت دا پەنهان دەکەی کە خوا ئاشکرای دەکات، جا ئایا خوا عز وجل چی ئاشکرا کردوە لەو بارەوە؟ بێگومان تەنها ئەوەی ئاشکرا کردوە، کە زەینەب دەکاتە هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)،

پاش ئەوەی زەید پێویستی پێ نامێنێ و وازی لێ دێنێ : ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ﴾.

کەواتە: ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دڵی خۆیدا شاردوویەتەوە هەر ئەوەبووە، کە خوا ئاگاداری کرۆدتەوە، کە زەینەب دەبێتە هاوسەری، چونکە خوا فەرموویەتی : ئەوەی پەنهانت کردوە ئاشکرای دەکەم و، جگە لەوەش هیچی دیکەی ئاشکرا نەکردوە.

ب- زەینەبی کچی پووری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووەو، ئەگەر ئارەزووی هێنانی ببوایە بە کچیی دەیهێنا، لەجیاتی ئەوەی بۆ زەیدی بخوازێ، بۆخۆی دەیخواست، بێگومان پیاوێکیش دڵی بە ئافرەتێك داچووبێ، بە کچیی دەیخوازێ، نەك بە بێوەژنیی، ئنجا شتێکی سەیریشە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە زەینەبی کچی پووری خۆی سەرسام (مُعْجَبْ) نەبووبێ، هەتا شووی نەکردبێ !

جـ- وەك لە خاڵی یەکەمی ئەم تەوەرەدا گوتمان :

گرفتی گەورەو هۆکاری سەرەکی بەهەڵە داچوونی ناحەزانی پێغەمبەر و گومانی خراپ پێبەرانی ئەوەیە، کە لە هەمبانەی خۆیان دا گوێز دەژمێرن و، پێغەمبەری خوا قیاس دەکەنە سەرخۆیان و دیارە (دزیش پێی وایە هەموو کەس دزە)، ئەگەرنا بێگومان هەر مسوڵمانێکی پارێزکاریش لێی ناوەشێتەوە، دڵی بەهاوسەری هاوەڵەکەیدا بچێ، چ جای کەسێکی وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە هەمیشە دڵی موبارەکی بە خواوە پەیوەست بووە و، هەموو دنیا نەیتوانیوە بیهەژێنێ، چ جای بینینی ئافرەتێك کە لەوەپێش چەندان جار بینیویەتی!



د- ئەو گێڕراوانە (روایات) ی، کە لەو بارەوە هاتوون، کە گوایە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاش بینینی زەینەب فەرموویەتی: (**سبحان مُقَلِّب القلوب**) وەك زانایانی فەرمووده ناس (**مُحَدِّثون**) گوتوویانە، هیچیان سەنەدێکی نەك ڕاست و باش (صحیح وحسن)، بگرە هەر مەیلەو باشیشیان نیەو بێ بناغەن.

لێرەشەوە دەڵێم : بێگومان سەرجەم ئەوانەی ئەو جۆرە حیکایەت و قسە بێ سەرو بەرانەیان نەقڵ کردوون، یان ناتەواویی دەروونیان هەیە، یان عەقڵیی، یان هەردووکیان پێکەوە، چونکە بێگومان هەرکەسێك ڕەفتاری وا لە پێغەمبەر بوەشێنێتەوە، دیارە چاکتر لەخۆی دەوەشێنێتەوەو، بابای واش لە عەقڵ و دڵی یەکیان، یان هەردووکیانی تەواوین و نەخۆشن !

**٢- وە بەنسبەت دووەمیشیانەوە :**

وەك پێشتر لەهۆی هاتنەخوارەوەکان دا باسمان کرد، ئەوەی پێغەمبەری خوا لێی ترساوە لەلایەن خەڵکەوە ﴿وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ﴾ ئەوەبوو کە بڵێن، چۆن موحەممەد بووکی خۆی، هاوسەری کوڕی خۆی هێناوە : (**عن عائشة قالت: لما تزوَّج النبيُّ زَيْنَبَ قالوا: تَزوَّج حليلة ابنه، فأنزل الله :** ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ﴾ **أخرجه الترمذي**: ٣٢٠٧، کەواتە : بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکانیش دیارە، کە مەترسی پێغەمبەر لە زمانی خەڵك لە چ ڕوویەکەوە بووەو، هیچ پەیوەندیی بەوەوە نەبوو، کە گومانی بەدگومانان ئاماژەی پێدەکات.

ئنجا لەکۆتایی ئەم بەشەشدا دەڵێم:

بێگومان ڕەوانەکرانی زەید لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بۆ خوازبێنی زەینەب وەك پێشتر هێنامان و لە (صحیح مسلم) دا بە ژمارە (١٤٢٨)

هاتوە، حیکمەتێکی گەورەی تێدایە ئەویش ئەوەیە کە هیچکەس گومانی وا نەڕوات، کە (زید بن حارثة) بە ناچاریی زەینەبی واز لێهێناوە، هەرچەندە ڕستەی: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ ﴾ ش بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ کە زەید لە زەینەب بێزار بووە و داوای مۆڵەتی کردوە، کە وازی لێ بێنێ .

لێرەش دا دێینە کۆتایی تەوەری چوارەمی ئەو بەشی هەشتەمەو، کۆتایی بە بەشی هەشتەم دێنین و دەچینە سەر بەشی نۆیەم و کۆتایی ئەم کتێبە .

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشی نۆیەمەم تەرخانم کردوە بۆ باسکردنی بەشێك لە ڕەوشتو ئاکارە پەسندەکانو، هەڵوێستو هەڵسوکەوتە مسوڵمانانەو شێرە ژنانەکانی، هاوسەری یەکەمو کۆچکردووم لە ساڵی (١٩٩٦)دا، (ڕوخسار ئیبراهیم ماماغا)، کەمن هەر بە نازناوی (خاتوون مەلاژن) بانگم دەکردو، لە تەمەنی سی(٣٠) ساڵییدا کۆچی دوایی کرد، خوالێی خۆشبێ[1].

مەبەستیشم لە نووسینی ئەوەی، کە لەم بەشەدا دەینووسم، دوو ئامانجی سەرەکییە:

**یەکەم**: وەفاداریی بۆ ئەو هاوسەرە دڵسۆزو خۆشەویستەم،، کە لە قۆناغێکی زۆر سەختو دژواری ژیانمدا (١٩٨٤ز- ١٩٩٦ز)، ڕۆڵێکی گەورەو گرنگی گێڕاو، هاوکارو دەستبارگرو دڵسۆزو مشوورخۆرو کارئاسانکەرێکی باشمبوو، خوا پاداشتی هەرە باشی بداتەوەو پلەو پایەی بەرزو بەرزتر بکاتەوە.

هەڵبەتە لەم هەڵوێستەشمدا، پێغەمبەری پێشەوا سەرمەشقو پێشڕەومە، کە وەك لە ژیانو سیرەیدا هاتوە، پاش مردنی خەدیجەی هاوسەری، زۆرجار یادی کردوەو، باسی چاکەکانی کردوەو، مەدحی کردوە، بەڕادەیەك کە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، بەرانبەر بەو، لە

---

(١) خاتوون ڕوخسار، لە: ١٩٦٦/٦/١٥ز لە دایك بووەو، لە: ١٩٩٦/١١/٥ز دا مردوەو لە گۆڕستانی (چوار قوڕنە) بە خاك سپێرراوە.

هەموو هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زیاتر هەستی بە هەوێداریی کردوە، وەك لەم دەقەی سوننەتدا دەبینرێ:

((**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ مَا غِرْتُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ نِسَاءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ وَمَا رَأَيْتُهَا، وَلَكِنْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكْثِرُ ذِكْرَهَا، وَرُبَّمَا ذَبَحَ الشَّاةَ ثُمَّ يُقَطِّعُهَا أَعْضَاءً ثُمَّ يَبْعَثُهَا فِي صَدَائِقِ خَدِيجَةَ، فَرُبَّمَا قُلْتُ لَهُ: كَأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ فِي الدُّنْيَا امْرَأَةٌ إِلَّا خَدِيجَةُ! فَيَقُولُ: إِنَّهَا كَانَتْ، وَكَانَتْ وَكَانَ لِي مِنْهَا وَلَدٌ**)) رواه البخاري: ٣٨١٨، ورواه مسلم: ٢٤٣٥، وهذا لفظ البخاري.

واته: ئەوەندەی بەرانبەر بە خەدیجە غەیرە (هەستی هەوێداریی)یم هەبووە، بەرانبەر بەهیچ کام لە ژنەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو غەیرەیەم نەبووە، هەرچەندە نەشمدیوە، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆری باس دەکرد، وە جاری وابوو مەڕێکی سەر دەبڕی، پاشان بەش بەشی دەکرد، ئنجا بۆ دەستە خوشکەکانی خەدیجەی دەنارد، وە جاری وا بوو پێم دەگوت: دەڵێی هیچ ژن لە دنیادا نەبوونە بێجگە لە خەدیجە! ئەویش دەیفەرموو: ئاواو ئاوا بوو ((مەدحی دەکردو سیفەتەکانی باس دەکردن)) وە منداڵیشم لێی هەبوون.

**دووەم**: بەهرەو سوود وەرگرتنی دایکانو خوشکانو کچانی بەڕێزو خۆشەویستمان، لە ڕەوشتو ئاکارو هەڵوێستو هەڵسوکەوتە بەرزوپەسندەکانی خاتوون مەلاژن، وەك پێغەمبەری خوا " صلى الله عليه وسلم" لەو بارەوە فەرموویەتی: ((**اذْكُرُوا مَحَاسِنَ مَوْتَاكُمْ وَكُفُّوا عَنْ مَسَاوِئِهِمْ**)) رواه أبوداود والترمذي والحاكم **والبيهقي** عن ابن عمر رضى

الله عنهما، واتــه: چــاکەکانی مردووەکانتـــان بـــاس بکــەن‌و باســـی خراپەکانیان مەکەن.

هەڵبەتە حیکمەتی پەسـندیی باسـکردنی چـاکەو خێـری مـردوانیش، هەر ئەوەیە کە زیندوان پەندیان لێـوەربگرن‌و، بیانکەنـە سەرمەشـقی خۆیان.

دیارە مـن لـە دوو تـەوەردا باسـی ڕەوشـت‌و ئاکـارو هەڵوێسـت‌و هەڵسـوکەوتە جـوان‌و پەسـندەکانی خـاتوون مـەلاژنی ڕەحمـەتیی دەکەم:

تەوەری یەکەم: ڕەوشت‌و ئاکارە پەسندەکانی خاتوون مەلاژن.

تـەوەری دووەم: هەڵوێسـت‌و هەڵسـوکەوتە جوانـەکانی خـاتوون مەلاژن.

## تەوەری یەکەم : ڕەوشتو ئاکارە پەسندەکانی خاتوون مەلاژن

((ڕوخسار ئیبراهیم ماماغا))[1] نەك تەنیا بە شایەدیی خۆم،، کە بێگومان ژنو مێرد لە هەموو، کەس لەیەك نیزیکترنو بەیەك ئاشناترن، بەڵکو بە شایەدیی هەموو ئەوانەی کەلە نیزیکەوە ناسیویانەو ئاشنای بوون، بە حوکمی دراوسێیەتیی‌و تێکەڵیی، ڕەوشتوئاکارو خەسڵەتی بەرزو پەسندی زۆری هەبوون، کەمن لێرەدا ئاماژە بە گرنگترینیان دەکەم، بە پێی ئاشنایەتیمو بە ئەندازەی ئەوە کە لە بیرم ماونو، کاتو دەرفەتیش بوارم دەدات، دیارە لە نێوان ڕەوشتو ئاکارو، هەڵوێستو هەڵسوکەوتەکانیشدا پێکگەیشتنو تێکهەڵکێشیی هەیە، بۆیە جۆرێك لە دووبارە بوونەوەش ڕوو دەدات، بەڵام هەرچۆن بێ بە پێویستم زانی، کە لە دوو تەوەرەدا بیاننووسم:

[1] چۆنیەتی هاوسەرگیریم لەگەڵ (ڕوخسارخان)دا ئەوەبوو، کە ڕۆژێك (خاڵ ئەحمەدە ڕەشی ماخۆ بزن) هەزار ڕەحمەتی لێبێت، هاتە سەردانم وگوتی: فلانکەس، ئەگەر بەتەمای ژن بێنی، کچێکی زۆر باش دەناسم، حاڵ وحیسابی ئاواو ئاوایە، باسی ڕەوشت جوانیی ودینداریی ونەجابەتی کرد، ئیدی ئەوەبوو دوایی، لەڕێی هەندێك لەخزمەکانییەوە پێی ئاشنابووم ویەکدیان ناسی، سەرەنجام لەکۆتایی ساڵی (١٩٨٣)دا لەسەر مارەیی (١٢٠٠)دیناری سویسریی مارەم کردو لەمانگی یەکی (١٩٨٤)دا گواستمەوە، سەرەتا هەر لەماڵی بابم دابووین لەگەڕەکی (قولە) لە (ڕانیە)و، پاش ماوەیەك ماڵمان گواستەوە بۆ گوندی (سەرسییان)ی (بەری مەرگە)، چونکە هاوسەرم لەخەستەخانەکەی ئەوێ دەوامی هەبوو وەك پەرستار (ممرضة)، هەروەها بارودۆخی ئەمنیی وسیاسیی خۆیشم وای پێویست دەکرد، کە بەپێویستی نازانم لێرەدا باسی بکەم وبچمە نێو وردەکارییەکانیەوە.



## ١- دينداريى و تاعەت:

خەسلەتێكى ديارى ئەو ژنە هەڵكەوتووە، بريتيى بوو لە دينداريى و **طاعەت**و بۆخوا سوڵحان، كە بێگومان ئەم خەسلەتەش لە هەر مرۆڤێكدا، بناغەو چاوگى سەرجەم ڕەوشت و ئاكارە بەرزو پەسەندەكانو هەڵسوكەوت و هەڵوێستە جوانەكانيەتى، ديارە هەربۆيەش پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ هەر كام لە پياو وژن، كە دەيانەوێ هاوسەرگيريى بكەن، ڕێنمايى ئەوە بووە، كە لەوكەسەدا كە دەيانەوێ هاوسەرگيريى لەگەڵ بكەنو بيكەنە هاوبەشى ژيانيان، چاو بۆ دينداريى بگێڕن، وەك بە پياوى فەرمووە: ((**تُـنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ : لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ**)) رواه البخاري:٤٨٠٢، رواه مسلم:١٤٦٦، واتە: ئافرەت بۆ چوار شتان مارە دەكرێ: بۆماڵو سامانى، وە بۆ بنەماڵەوڕەچەڵەكىو، بۆ جوانييەكەىو، بۆ دينداريى يەكەى، دەجا تۆ بۆ ديندارەكە بخەفتێ، ئەگەرنا هەژار بكەوى.

هەروەها بە كەس‌وكارى ئافرەتيشى فەرمووە:

((**إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ**)) رواه الترمذي:١٠٨٤، وقال: حديث حسن صحيح. واتە: هەركات كەسێك (بۆ داواكردنى هاوسەرگيريى) هاتە لاتان، كە دينداريى و ڕەوشتيتان پێ پەسند بوو، ژنى پێ بدەن، ئەگەرنا ئاژاوەو خراپەيەكى فراوان زەوى دادەگرێ.

ديارە دينداريى و پارێزكاريى و طاعەتيش، بەرلەوەى پەيوەنديى بە ڕواڵەتەوە هەبێ، پەيوەستە بە ناخى مرۆڤەوەو، ئەوەندەى منيش شارەزاى ئەو هاوسەرەم بووم، دينداروخواپەرستێكى ڕاست و ساغ بوو، هەرچەندە زۆرجاران لەبەر

ئیش‌وکاری ماڵ‌و بە خێوکردنی منداڵ‌و خزمەتی میوان، تەنیا فریای فەرزەکان دەکەوت، بەڵام ئەوەندەی دەرفەتی هەبوایە، دریغی نەدەکردو حەزی لە دینداریی‌و طاعەت بوو.

## ٢- هەوڵدان بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعیی:

ئەمیش یەکی دیکە بوو لە ڕەوشت‌و خەسڵەتە پەسندەکانی‌و، بەردەوام ئەوەندەی بواری ببوایە چ لەلای خۆم، چ لەلای مامۆستایانی دیکە، هەوڵی شارەزابوونی زیاتری دەدا، بە تایبەت لە بارەی قورئان‌و سونندەتەوە.
دیارە دینداریی‌و دنیادارییش، بەبێ شارەزایی‌و بەرچاو ڕوونیی، نەك هەر سەرو بەرناگرن، بگرە خاوەنەکەیان لەسەریشیان قەرزدار دەبێتەوە. وەك شاعیر گوتوویەتی:

وكل مَنْ بغير علمٍ يعمل   أعما لُهُ مَردودةٌ لاتُقبلُ

واتە: هەر، کەسێك بە بێ زانیاری کار بکات، کردەوەکانی ڕەتکراوەن‌و وەرناگیرێن.

## ٣- سۆزوبەزەیی:

ئەوخاتوونە، خوای بە بەزەیی ڕەحمی پێ بکات، یەکجار بەسۆزو بەبەزەیی بوو، نەك تەنیا بەرانبەر بە منداڵ‌و خزم‌و نیزیکانی، بگرە بەرانبەر بە خەڵکی نەناسراویش، وەك لە هەڵوێستەکانی، نموونەی لەسەر دەهێنمەوە.
ئاشکراشە، کە ڕەحم‌و بەزەیی مایەی ڕەحم پێکردنی خوایە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ ارْحَمُوا مَنْ**

فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ)) رواه الترمذي.

واتە: خاوەن بەزەیی یەکان، خوای بەبەزەیی، بەزەیی پێیانـدا دێ، ڕەحم بـە خەڵکی سەر زەوی بکەن، ئەوەی لە سەرووەوەیە "خـوا عـز وجـل" ڕەحمتـان پێدەکات.

هەروەها فەرموویەتی: (**من لم يرحم النـاس لايرحمـه الله**) متفـق عليـه عن جرير، واتە: ئەوەی بەزەیی بەخەڵکدا نەیەتەوە، خوا بەزەیی پێدا نایەتەوە.

## ٤- بەخشندەیی و سەخاوەت:

خەسلەتێکی دیکەی زەق و زۆر دیاری مـەلاژنی ڕەحمـەتیی، بریتـی بـوو لـە بەخشـندەیی و سـەخاوەت، کـە تەنانـەت ئامـادە بـوو پـاروو لـە زاری خـۆی بگرێتـەوە، بـۆ بابـای ئاتـاج و برسـی، دوایـیش لـە باسـی هەڵویسـت و هەڵسوکەوتەکانیدا، نموونە لەسەر بەخشندەیی و سەخاوەتی دێنمەوە.

## ٥- دنیا بەکەمگرتن و قەناعەت:

خاتوون مـەلاژن، هەتا بڵێی ژنێکی دنیا بەکەمگر و بە قەناعـەت بـوو، پـێم وایە ئەوەی بـیری لـێ نـەدەکردەوە زێڕ و پـارە و خانووبەرەو...هتـدبوو، بـە دەگمەن دێتەوە بیرم لەسەر ئەو شتانە گلەیی و بێزاریی دەربڕیبێ، هەرچـەندە ئەو کاتە ژیان و گوزەرانی خەڵك و دەوروبەرمان بە گشتی و هـی ئێمـەش، زۆر سـەخت و دژوار بـوو، کـە دوایـی لەتـەوەرەی دووەمـدا نموونـەی لەسـەر دەهێنمەوە.

پێغەمبـەریش (صـلى الله عليـه وسـلم) لـە بـارەی دنیـا بەکەمگرتنـەوە فەرموویەتی:

**((ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبَّكَ النَّاسُ))**

رواه ابن ماجه: ٤١٠٢، والحاكم في المستدرك وصحَّح اسنادهَ وتعقبه الذهبي.

واتە: دنیا بەکەمگریە، خوا خۆشی دەوێی، وە ئەوەی، کە لە دەستی خەڵکدایە، بەکەمی بگرە، خەڵکیش خۆشیان دەوێی.

## ٦- وریایی‌و زیرەکیی‌و واقیع بینیی:

خوای بەخشەر توانایەکی باشی عەقڵیی بەو ژنە هەڵکەوتووە بەخشیبوو، من زۆرجار ڕاوێژم پێدەکردو سوودم لە بیروڕاو سەرنجەکانی وەردەگرت، بە تایبەت لە بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا،، کە بە زۆرییش بەلای نەرم‌و نیانیی‌و چاکەکاریی‌و لێبوردن‌و چاوپۆشییدا دەشکایەوە.

وەگەلێك جار ڕەخنەو تێبینیی گرنگیی لەسەر بوارەکانی سیاسیی‌و حیزبایەتیی‌و پێشمەرگایەتیی دەخستە ڕوو، وەك دوایی نموونەی لە بارەوە دێنمەوە.

## ٧- خۆڕاگریی‌و پشوو درێژیی:

دیارە ماوەی هاوسەرێتیمان، کە دەکەوێتە نێوان ساڵانی: (١٩٨٤-١٩٩٦)و سێزدە ساڵ شتێك کەمترە[1]، قۆناغێکی زۆر سەختو دژواری ژیانمان بوو، لە هەموو ڕوویێکەوە، هەر بۆ نموونە: هەر شەش منداڵەکەمان ئەوانەی، کە لەو ڕەحمەتییەن "کە بە پێی ڕیزبەندیی تەمەنیان: (بەسۆز،

(١) چونکە لە سەرەتایی ساڵی (١٩٨٤)دا گواستمەوەو لە: (١٩٩٦/١١/٥) لە تاران کۆچی دوایی کرد.

پیرۆزە، محمد، عبدالرحمن، فاطمة، شادی)ن، " هەریەکەیان لە شوێنێك لە دایك بوون:

١- بەسۆز، لە گوندی (سەرسیان)، لەساڵی: ١٩٨٤دا.

٢- پیرۆزە، لە گوندی (گەڵوو)ی ماخۆیزنان، لە ساڵی: ١٩٨٦دا.

٣- محمد، لە گوندی (بۆسکێن)، کە خۆم و خێزانم لە حاڵەتی خۆپەنهانکردن (إختفاء)دا بووین لە ساڵی: ١٩٨٧دا.

٤- عبدالرحمن، لە شاری (سەردەشت)، لە ساڵی: ١٩٨٩دا.

٥- فاطمة، لە گوندی (خدراوێ)ی نێوان سەردەشت و خانێ، لە ساڵی: ١٩٩١دا.

٦- شادی، لە شاری (رانیە)، لە ساڵی: ١٩٩٤دا.

بەڵام لە هەموو ئەو قۆناغ و هەل و مەرجە سەخت و دژوارە پڕ هەوراز و نشێوو، کەندولەندەدا، بەدەگمەن بیرەوەرییەکی ناخۆشم لەو خاتوونە خۆڕاگرو بە قەناعەتە دێتەوە یادو، هەمیشەش نەك هەر خۆڕاگر، بگرە هاوکارو دەستبارگرو کارئاسانکەریشم بووە.

## ٨- دەم پاکیی و باس نەکردنی ئەم و ئەو:

خەسڵەتێکی دیکەی پەسندی ئەو شێرە ژنە ئەوە بوو، کە مەگەر بەدەگمەن وشەیەکی ناشیرینی بەزاردا هاتبایە، وە زۆر خۆی لە زەم و غەیبەتی خەڵك دەپاراست، مەگەر مەسەلەیەکی پێویست ناچاری کردبێ باسی کەسێکم بۆ بکات، وەك چارەسەری کێشەیەکی خێزانیی، وە هەمیشە حەزی لە قسەی خێرو چاکە و چارەسەری گرفت و کێشەی خەڵکی بوو.

شـایانی باسیشـە، کـە خـەڵکی بەگشـتیی، زۆر گـیرۆدەی غـەیبـەت و زەم و زەمکاریی دەبـن، بەتایبـەت ژنـان، ئنجـا زۆر کەسـیش، کـە پـێـی گـوترا: بەخراپە باسی ئەم و ئەو مەکە، گوناهە! دەڵێن: ئـاخر ئـەو فلاَنکەسـە، ئـەو شتەی تێدایـە کـە مـن باسـی دەکـەم ! وادەزانـن، کـە ئەگـەر ئـەو سـیفەت وهەڵسوکەوتە خراپەی تێدابوو، کە باس دەکرێت بەغەیبەت دانانرێت !

بەڵام لەڕاستیدا وانیە، وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە: (**عَن أبي هُرَيرة رضي الله عَنه أنَّ رسول الله** صلى الله عليه وسلم **قال: أتدرون مَا الغيبة؟ قالوا: الله ورسوله أعلم، قال: ذكرك أخاكَ بما يكرهه، قيلَ: أفرأيت ان كانَ في أخي ما أقول؟ قال: ان كانَ فيه ماتقول، فقد اغتبته، وان لم يكن فيه ماتقول، فقد بَهَتَّه**). رواه مسلم: ٢٥٨٩.

واتە: پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وسلم**) فەرمووی: دەزانن غـەیبەت (پـاش ملە باسـی خـەڵك کـردن) چییـە؟! گوتیـان: خـواو پێغەمبەرەکـەی زانـاترن، فەرمووی: باس کردنی برایەکەتە بەشێوەیەك کە پێی نـاخۆش بێـت، گـوترا: ئەدی دەبینی ئەوەی باسی دەکەم لەبرایەکەمدا هەیە؟ فەرمووی: ئەگەر ئـەو شتەی تێدابێت، ئەوە غەیبەتت کردوە، ئەگـەر نـا، مـادام ئـەو شـتەی تێـدا نەبێت، ئەوە بوختانت پێکردوە.

## ٩-خۆ بەکەمگریی (التواضع):

خەسـڵەتێکی دیکـەی خـاتوون مـەلا ژن ئـەوە بـوو، کـە زۆر خـاکیی‌و خۆبەکەمگرو بێ فیزو دەمار بوو، وە زۆرحەزی بـە خزمـەتکردن‌و تێکـەڵیی خەڵکی هەژارو نەدارو لێقەوماو و بێ دەرەتان دەکرد، وەك دوایـی نموونـەی لەسەر دێنمەوە، پێغەمبەری خـواش (**صلى الله عليه وسلم**) لـەبارەی گرنگیـی

سیفەتی خۆ بەکەم گرییەوە، فەرموویەتی: (**ما نقصت صَدَقَتٌ من مالٍ، وما زادَ الله عبداً بعفوٍ الا عزاً، وما تواضعَ أحدٌ لله، الا رَفَعَهُ الله عز وجل**) رواه مسلم: ٢٥٨٨

واتە: هەرگیز خێرو بەخشین، لەماڵ وسامان، کەم ناکات، هەمیشە خوا بەهۆی لێبوردنەو، عیززەت بۆ بەندەکەی زیاد دەکات، وە هەرکەسێك لەبەر خوا خۆی بەکەم بگرێ وخاکیی و بێ فیز بێ، خوای زاڵ وشکۆدار هەر بەرزی دەکاتەوە.

## ١٠- عیززەتمەندیی:

هەروەها ئەو شێرە ژنە، وێرای خۆ بەکەمگریی‌و خاکیبوونی، زۆریش نەفس بەرزو بە عیززەت بوو، دنیاو ئەهلی دنیای لە پێناو پاراستنی دین‌و سومعەوکەرامەتدا، پێ پووشکەیەك بوو، وە هەرگیز جارێك لە جاران نەبووە کە شتێکم هەر بۆ پێشنیاریش بکات، چ جای داوام لێ بکات، کە بۆنی ئەوەی لێبێ، لە پێناوی نەك خۆشکردنی ژیان‌و گوزەرانمان، بەڵکو تەنانەت سووککردنی باری قورسیشماندا، لە کارو چالاکی ئیسلامییمان، کەم بکەینەوە، یان نەرمکێشییەك بکەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمیشە هاندەرم بوو بۆ بەردەوامیی‌و ڕاوەستاویی.

## ١١- دڵسۆزیی:

ئاکارێکی دیکەی جوان‌و پەسندی ئەو مەلاژنە ڕەحمەتییە ئەوە بوو، کە زۆر دڵسۆز بوو، چ بۆ خەڵك‌و دۆست‌و خزم بە گشتیی‌و، چ بۆ بەندە، لە ژیانی هاوسەرێتییماندا بە تایبەت، وە بە مانای وشە بەخەم ماڵ‌و منداڵم‌و

سومعەو، کەسایەتییمەوە بوو، وە هەوڵی دەدا بە هەموو توانای، هیچ کەلێنو کەمو کورپییەك نەبێ.

دیارە پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دڵسۆزیی (النَّصِيحَةُ) بە بەشێکی گەورەو گرنگی دینداریی داناوەو فەرموویەتی: (**الدِّينُ النَّصِيحَةُ**) رواه مسلم:٥٥، واتە: دینداریی دڵسۆزییە.

## ١٢- ئازایەتیی:

سیفەتێکی دیکەی هاوسەری ڕەحمەتییم، بریتی بوو لە ئازایەتییو بوێریی، کە دیارە ئەویش لە زۆر هەڵوێستیدا خۆی دەنواند، وەك دوایی لە هەڵوێستو هەڵسو کەوتەکانیدا باس دەکەم.

## ١٣- مشوورخۆریی:

مەبەستم لە مشوورخۆریی بە پلەی یەکەم، مشوورخۆرییەتی لە چوارچێوەیماڵو خێزاندا، کە لەو بارەوە بە شێوەیەك بوو، من هیچ ئەرکو بارگرانییەکی ئەو تۆم بۆ بەڕێوەبردنی ماڵو خێزانو میوانو، کڕینی کەلوپەلو مەسرەفکێشان لەسەر شان نەبوو، تارادەیەکی زۆر دەستی بە تاڵ کردبووم بۆ ئیشو کارەکانم.

## ١٤- صیلەی ڕەحم گەیاندن:

ئەمیش یەکی دیکە بوو لە خەسڵەتەکانیو، لە بواری خزمایەتییدا زۆر بە ڕەحمو سۆزو گورجو گۆڵ بوو، هەمیشە حەزی دەکرد خزمو دۆستو نیزیکان

بەسەر بکاتەوەو ئاگای لێیان بێ.

ئنجا بێگومان گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتییش، خەسڵەتێکی گرنگی مرۆڤی مسوڵمانە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە فەرموویەتی: ((**الرَّحِمُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ تَقُولُ مَنْ وَصَلَنِي وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَنِي قَطَعَهُ اللَّهُ**)) رواه البخاري: ٥٩٨٩، ومسلم: ٢٥٥٥، واتە: خزمایەتیی بە عەرش هەڵواسراوە، دەڵێ: هەرکەس بمگەیەنێ، خوا بیگەیەنێ (بەبەزەیی خۆی)، وە هەرکەس بمپچڕێنێ، خوا بیپچڕێنێ (لە بەزەیی خۆی).

## ١٥- وەفاداریی:

خەسڵەتێکی دیکەی بەرجەستەی ئەو خاتوونە، بریتی بوولە وەفادارییو، هەمیشە چاکەی خەڵکی لەبەر چاو بووو باسی دەکرد، هەروەها بەرانبەر بە ماڵو خێزانی شەهیدانو کەسانێك، کەناسیاوێتییو تێکەڵیی لە گەڵیان هەبوو، بە گوێرەی بۆ لوان ئاگای لێیان بووو، سەری لێدەدانو هاوخەمیی لەگەڵ پێشان دەدان.

ئنجا لەڕاستییدا، ڕەوشتو ئاکارە پەسندو جوانەکانی خاتوون مەلاژن زۆربوون، بەڵام ئەو پازدە (١٥) خەسڵەتەم لە نێویاندا گوڵبژێرکرد، کە بناغەو سەرچاوەی سەرجەم ڕەوشتو ئاکارە بەرزو جوانەکانی دیکەن.



## تەوەری دووەم : هەڵوێستو هەڵسوکەوتە جوانەکانی خاتوون مەلاژن

لـە ڕاستیدا هەڵوێستو هەڵسوکـەوتی مـرۆڤو خووڕەوشـتو ئاکـاری، هـەتا ڕاددەیەکی زۆر لە یەك نیزیكو تێکهەڵکێشن، بـەڵام هەڵوێسـتو هـەڵسو کـەوت، زیاتر حاڵەتی کردەیی‌و پراکتیزەیی ڕەوشتو ئاکارو بەهایەکان بە خۆوە دەگرن.

جـا ئێمـە وەك چـۆن هەنـدێك لەڕەوشـتو ئاکـارە جـوان پەسـندەکانی خـاتوون مەلاژنمان گوڵبژێرکرد، هەندێك لە هەڵوێستو هەڵسو کەوتە دڵگیرو بەرزەکانیشی بە نموونە باس دەکەین، دیارە بەس ئەوانەی کە خۆم لێیان ئاگادار بوومو شـایەدیان بووم، نەك ئەوانەی کە لە خەڵکی دیکەم بیستوون و بۆم گێڕراونەوە، کە زۆر زۆرن:

### ١- دووریبیم لە ماڵو پرتەو بۆڵە نەکردنی و ڕووگرژ نەکردنی:

لە ماوەی ئەو سێزدە ساڵەی تەمەنم لەگـەڵ مـەلاژنی ڕەحمەتییـدا، گەشـتو سەفەرو گەڕانی زۆرو جۆراوجـۆرم هـەبوونو، جاری وا بـووە بـە سـێ چـوار مـانگ لە ماڵ دوور بووم، چ بۆ کاری بانگەوازو ڕێنمایی کردنی خـەڵكو، چ بۆکاری حیزبیی‌و پێشمەرگایەتیی‌و، چ بۆ گەشتو سەفەری سیاسیی، بـەڵام نایەتەوە یادم، تەنیا جارێکیش نێوچاوانی گرژکردبێ، لەسەر دوورکەوتنەوەم لـە ماڵوحـاڵ، بـە تایبـەت خۆپـەنهانکردنی (إختفـاء)ی سـاڵی(١٩٨٧)و، سەفەری حەجی ساڵی (١٩٩١)و، گەشتی دوورو درێژم بۆ (تورکیاو سوریاو ئوردونو لوبنانو سـوودانو یەمـەن)، لـە سـاڵی ١٩٩٦دا، کـە هـەرکامیان

:(خۆپەنهان کردن‌و، حەج‌و، گەشت) یەکی دەوری سێ مانگ، یان زیاتریشیان پێچوو.

دیارە ئەوەش لە حاڵێکدا کە بەزۆریی حاڵەتی نەداریی‌و ناگوزوورییمان هەبووەو، هیچ کام لە پێداویستییەکانی ژیان‌و گوزەرانمان وەك پێویست نەبووە، بەڵام بێگومان ئیمان کانگایەکی وزەی لە بن نەهاتوویەو، قەناعەتیش خەزنەیەکی نەبڕاوەیە.

## ٢- میوانداریی کردنی خەڵکێکی زۆر بەڕووی خۆش‌و زمانی شیرین، وێڕای نەداریی:

هەڵوێستێکی دیکەی پرشنگداری ئەو شێرە ژنەم ئەوەبوو،، کە لەگەڵ وەك پێویست نەبوونی باری دارایی‌و، کەل‌وپەل‌و پێداویستییەکانی خزمەتکردنی ماڵ‌و میوان، هەمیشە بەسەرو ڕووی خۆش‌و گفت‌و لفتی شیرین، پێشوازیی گەرمی لە میوانەکانم دەکرد، تەنانەت ئەگەر بۆ خۆشم لە ماڵ نەبوومایە "چونکە مۆڵەتی منی پێ بوو" دیارە منیش بە حوکمی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی‌و فیکریی‌و سیاسییی یە جۆراو جۆرەکانم‌و، هەندێك جاریش بە حوکمی هەڵکەوتی جوگرافیی ئەو شوێنەی ماڵمانی لێبوو، هەمیشە میوانم زۆر بوون‌و، هەیانبووە بە مانگ‌و زیاتریش ماوەتەوە.

ئنجا سەرباری هەموویشی، خاتوون مەلاژن وێڕای سەخییبوونی‌و بەخشندەیی، عادەتیشی وابوو زۆرخۆی بە میوانانەوە سەغڵەت دەکردو، هەوڵی دەدا هەرچی پێیدەکرێ ئامادەی بکات‌و بۆیان دابنێ، کە من زۆر جار لەو بارەوە گلەییم لێ دەکردو دەمگوت زیاد لە پێویست خۆت ماندوو دەکەی‌و (تکلُّف)دەکەی، بەڵام ئەو بەو شێوەیە نەبوایە مورتاح نەدەبوو.

هەرگیز لە بیرم ناچێ ساڵێکیان[1]ماڵمان لە سەردەشت بوو لە خانوویەکی خراپۆکەدا بووین بەکرێ، هەندێك مامۆستامان میوان بوون لە (سنە)وە هاتبوون، هاوینێکی گەرمیش بوو، خێزانم لەسەر یەك تەباغی نەوتی گچکە، کە هەر ئەوەمان هەبوو وەك عادەتی خۆی، نانو چێشتێکی باشی سازکردبوو، دوو سێ جۆرە شلەوبرنجو..هتد، دوایی پاش نانخواردن، یەکێك لە مامۆستایەکان چوو سوپاسو دەستخۆشیی لە هاوسەرم بکات، کە مەتبەخو تەباخەکەی بینی، بەسەر سوڕمانێکەوە گوتی: ئایا ئەو هەموو خواردنو چێشتەت لەم مەتبەخەداو بەم تەباخە سازکردوە؟!

## ٣- خزمەتی خەڵك کردن بە قالب سووکیی‌و چاوەڕێ کردنی پاداشتی خواوە:

هەڵوێستو هەڵسوکەوتێکی دیکەی ئەو شێرە ژنە ئەوە بوو، کە لە ناخی دڵییەوە هاوکاریی‌و خزمەتکردنی خەڵکی پێخۆشبوو، بە تایبەت خەڵکی لێقەوماوو بێ دەرەتان، ئنجا زۆر بە شەوقو دڵگەرمیی‌و قالب سووکییشەوە، بەو کاروخزمەتە هەڵدەستاو، هەستم دەکرد وەك طاعەتێك بۆ خوا ئەنجامی دەداو، ئومێدی پاداشتی خواو دوا ڕۆژی پێی هەبوو.
دیارە جاری واش هەبوو ئەوەی، کە بۆ خزمەتی خەڵك پێی هەڵدەستا، لەگەڵ ئەرکەکانی بەرانبەر بەمن‌و منداڵەکانی تێك دەگیراو، لەو بارەوە گلەییم لێ دەکرد، ئەویش بە ئارامیی عوزری بۆ دەهێنامەوەو، لێی حاڵی دەبووم کە تەنیا مەبەستی پاداشتو ڕەزامەندیی خوای بەخشندەیە، وەك

(١) ساڵی (١٩٨٩)ی زایینی، بەرلەوەی بگوازینەوە بۆ گوندی (خدراوێ).

خوای بەرزومەزن لەسەر زمانی ئەو جۆرە کەسانە کەبەبێ هیچ ئامانج و مەبەستێکی دنیایی خزمەتی خەڵکی دەکەن، فەرموویەتی:

﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ۝٨ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ۝٩ ﴾ الإنسان. واتە: وە لەگەڵ خۆشەویستییشیان دا بۆ خواردن (لەبەر پێویستیی خۆیان) دەیبەخشن بە نەدارو هەتیوو دیل (لەبەر خۆیانەوەو لە دڵی خۆیاندا) دەڵێن: بێگومان بەس لەبەر ڕووی خوا (ڕەزامەندیی خوا، یان دیداری ڕووی خوا) ئەو خواردنەتان دەدەینێ و هیچ پاداشت و سوپاسکردنێکتان لێ داوا ناکەین (واتە: لێتان چاوەڕوان ناکەین).

ئنجا لەبارەی گرنگیی وکاریگەریی وسەخاوەت و بەخشندەییەوەو، پێگەی بەرزی لەئیسلامدا، با سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەین: **((عَنْ جابِرِ بنِ عبدالله رضي الله عنهما قالَ: سَمِعتُ رسول الله** صلى الله عليه وسلم **يقول: قال جبريل: قالَ الله عز وجل: هذا دينٌ ارتضيتهُ لنفسه ولَنْ يُصلِحَهُ الا السَّخاء وحسنِ الخُلُقِ، فَأكرِموهُ بهما ما صحبتموه)).** رواه البغوي بسنده.

واتە: جیبریل فەرموویەتی: خوای زاڵ وپایەبەرز فەرموویەتی: ئەم ئایینە (واتە: ئیسلام) بۆ خۆمم پەسندکردووە، بەس سەخاوەت ورەوشت جوانیی لێدەوەشێتەوە، دەجا هەتا لەسەر ئەم ئایینەن ولەگەڵیدا هاوەڵن، بەهۆی خۆڕازادنەتانەوە بەو دوو خەسڵە تە، ڕێزی بگرن.

## ٤- حەواندنەوەی خەڵك، کەل و پەل لەگەڵ بەشکردنیان:

ئەو یەك دوو ساڵەی کە ماڵمان لە گوندی (گەڵوو) بوو، کە لە ڕژێم قاچاغ

بووم، کەسانێکی زۆر هاموشۆیان دەکردین، بە تایبەت ڕۆژانی جومعە، جاری وا بوو بیست، سی (٢٠-٣٠)، کەس میوانمان دەبوون، هەروەها هەندێك کەس کە لە ڕژێم قاچاغ دەبوون، دەهاتنە لامانو، هەیانبوو بە مانگ زیاتر لە لامان دەحەوایەوەو... هتد.

ئنجا یەکێك لەوانە کە خۆیو خێزانو منداڵەکانی ماوەیەك لەلامان بوون، ماڵی (مامۆستا مەلا موحەممەدی مەلا صاڵحی شارەزووریی) بوو، خوا لێی خۆشبێ، کە ئەو کاتە لە ڕژێم قاچاغ بوو، دیارە ماوەیەك پێکەوە بووین، لە یادم نەماوە مانگێك زیاتر بوو، یان کەمتر، پاشان وا بە باش زانرا، بگوازنەوە بۆ گوندێکی دیکەی نیزیك خۆمان، جا لە کاتی گواستنەوەیاندا، هەرچەندە کەلو پەلی خۆشمان هەرکەم بوو، بەڵام هاوسەری ڕەحمەتییم، کەلو پەلەکانی لەگەڵ بەشکردنو، لە قەدەر حاڵ لە هەر شتەی شتێك، مامۆستای شارەزووریش کە پیاوێکی قسە خۆش بوو، لەو کاتەدا کە کەلو پەلەکانیان لە ولاخ بۆ بارەکردن، بە پێکەنینەوە رووی لە من کردو گوتی: دەزانی ئێستا کەیم دێتەوە بیر؟ گوتم: کەی؟ گوتی: ئەو کاتەی کە تازە دایکی بەهەشتم هێنابوو، لەگەڵ ماڵی بابم لە یەك جیا دەبوینەوە، کە کەلو پەلەکانیان لەگەڵ بەشکردین !

## ٥- خۆڕاگریی‌و نەشڵەژان لە کاتی بیستنی هەواڵی پەلاماری ڕژێمو چەکدارەکانیدا:

هەڵوێستێکی دیکەی ئەو ئافرەتە هەڵکەوتووە کە ئازایەتییو چاوقاییمی تێدا بەرجەستە بوو، ئەوە بوو، کە ئێمە ئەو کاتەی ماڵمان لە گوندی (گەڵوو) بوو، هەمیشە گوێ قولاغ بووین، کەی ڕژێمو چەکدارەکانی

پەلاماری گوندەکەمان دەدەن، بۆ دەستگیرکردنم، چونکە وێرای قاچاغبوونم لەو ناوچەیەش جم و جۆڵ و گەشت (جَولة)م هەبوو، بۆ گوندەکانی ئەو دەڤەرەو، هەندێك جار بۆ ڕانیەو سەنگەسەرو بەستە ستێن و تووەسووران و... هتدیش.

ئنجا ئەوە بوو شەوێکیان کە وێرای مامۆستا مەلا موحەممەدی شارەزووریی ڕەحمەتیی، کە ئەوکاتە لەڕژێم قاچاغ بوو، کە من بۆ شوێنە ونیی، ناوم لێنا بوو(صۆفی مەحموود)، چونکە ئەو کاتە ڕیشێکی ماش و برنجی جوانی هەبوو، وە ئەو کاتە مەگەر یەکێك صۆفی بوایە، ئەگەرنا ڕیش دەگمەن بوو، تەنانەت لە نێو مامۆستایانیشدا، نەك هەر خەڵکی دیکە، بەڵێ، جگە لەو، کاك (مخلص یونس)[1]یش، کە ئەویش هەر، لەڕژێم قاچاغ

---

(١) کاك حاجی مخلص، خاوەنی نووسینگەی تەفسیر.

کاك حاجی مخلص، کە زانیی بووی نامیلکەیەك لەبارەی هاوسەری کۆچکردوومەوە دەنووسم، ئەم بیرەوەرییەی خۆی نووسیی: (ساڵی ١٩٨٦ لەلایەن دەسەڵاتی بەعسەوە، فەرمانی گرتنم دەرچوو ناچاربووم، شارو وڵات وماڵ و منداڵ جێ بێڵم وبچمە شاخ، ئەوەبوو چوومە ماڵی مامۆستا عەلی باپیر، کە ئەو کاتە لە (گەڵوو) بوون، خەمی گەورەم، دایکی منداڵان وخوشك ودایکم بوو، چونکە بەعس ئەگەر ئەو کەسەی کە مەبەستی بوو، پێی دەستگیر نەکرابایە، پەلاماری ژن و کەسی تری دەدا. ئەو ماوەیەی کە لەوێ بووم، دڵنەوایی و سەبووریم بە سێ شت بوو:

یەکەم: ئەو نوێژانەی کە لەگەڵ مامۆستا عەلی دەمانکرد، کە کاریگەرییەکی تایبەتی لەسەرم هەبوو.

دووەم: خوێندنەوەی تەفسیری (فخرالدین الرازی).

سێیەم: خاتوون مەلا ژن بوو، خوا لێی خۆشبێ وپایەی بەرز بکاتەوە، کە بەئیمانە دامەزراوەکەی، دڵنەوایی دەکردم و ئومێدی زۆریی پێدەبەخشیم و، مودارا تێکی تایبەتی دەکردم، دەیگوت: کاك خدر (کە ئەوکات ناوی نهێنییم بوو)، کوری شارە،

بوو، لە ماڵمان بوو،، کە ئەویشم ناو نا بوو کاک (خدر)، چونکە گوتم: ناوی (مخلص) لەم دەڤەرە نامۆیە، ئیدی کتو پڕ هەواڵێکیان هێنا، کە بەپەلە خۆتان دەرباز بکەن، ڕژێم و چەکدارەکانی بەرێوەن بۆ گوندی گەڵوو، لەو کاتەدا خاتوون مەلاژن دووسێ تفەنگی ئەمانەت، کە لە ماڵمان دانرا بوون، دەستو برد دەری هێنانو، سەرو تفەنگی دایە دەست هەر کام لە مامۆستا مەلا موحەممەدو کاک مخلص، منیش تفەنگی خۆم پێ بوو، گوتی: ئێوە زوو بڕۆن دەربچن، خەمی ئێمەتان نەبێ.

شایانی باسیشە، کە خەڵکی (گەڵوو) بە گشتی بە پیاو و ئافرەتەوە، هێندەمان لەگەڵ باش بوون، هەستمان بە غەریبیی نەدەکرد، وەرێزێکی زۆریان لە هاوسەریشم دەگرتو هەر بە ((داک مەلاژن)) بانگیان دەکرد، بۆیە بۆ مەسەلەی خۆپەنهانکردن (إختفاء)ی هاوسەرم، هیچ گرفتێکمان نەبوو، هەموو ماڵەکان خۆیی بوون.



یەکەم جارە لێی بقەومێ، لەشوێنی خۆی بەخزمەت بووەو حەزی لەخواردنی باشە، دەبێ زۆر ئاگامان لێی بێ.

ئێوارەیەکیان بەڕۆژو بووم، خواردنەکی زۆر بەتامی کردبوو، خاتون مەلا ژن گوتی: ئەوە لەبەر خاتری کاک خدری، لەگەڵ کیژۆڵەی گوندەکە، بیست جۆرە گیامان کردوە، لەگەڵ هێلکە و کەشك و ڕۆنی خۆماڵی بۆم کردوە.

## ٦- تەحەممولکردنی نەداریی‌و ژیانی سەخت‌و سادەو بێزارو هەراسان نەبوون[1]:

هەر لەسەرەتای ماڵپێکەوە نانمانەوە، لەمانگی یەکی ساڵی(١٩٨٤) دا، ماڵ‌و ژیان‌و گوزەرانێکی سادەمان دەستپێکردو هەر ئەوەشمان بۆ دەگونجا، هەم لەبەر کەم توانایی ماددیی‌و، هەم لەبەر گوازە گوازی ماڵ‌و کوردەواریی گوتەنی: "هەمیشە ماڵ لەسەر پشتی وڵاخ بوون".

ئاشکراشە کە کابانی ماڵ، بە تایبەت ئەگەر میوانی زۆربن، حەزدەکات‌و پێویستیشی پێیەتی ئەو، کەل‌و پەلانەی هەبێ کە ئیش‌و کارەکانی ماڵ پێویستییان پێیانە.

بەڵام ئێمە لەبەر ئەو هۆکارانەی ئاماژەم پێدان، ئەوەمان بۆ نەدەگونجا، بۆیە مەلاژن زۆرجاران ناچاردەبوو بۆ پێداویستییەکانی ماڵ، بچێتە ماڵی دراوسێیەکان‌و، کەل‌و پەلیان لێوەربگرێ کە دیارە ئەوەشی زۆر لەسەر دڵ

(١)بەسۆزخانی کچم ئەم هەڵوێستەی دایکی رەحمەتیی بۆ گێڕامەوە کە ئەویش(سازگارخان) هاوسەری شەهید کاك جەمال ئەحمەد مەلافەتاح قوولە ڕەشیی بۆی گێڕاوەتەوە و گوتوویەتی:
ئەوکاتەی ماڵی مامۆستا لە (خدراوێ)بوو، سەردانم کردن، لەگەڵ مەلاژنی رەحمەتیی دانیشتبووین و منداڵەکانیان خەوتبوون، بارانێکی بەلێزمە دەباری، هەرهێندەمان زانی سەربانی خانووەکە-کەخانوویەکی گڵ بوو- بەهۆی ئەوەوە کەئاوی لەسەر راوەستابوو کونبوو، قوڕ و ئاوێکی زۆر هەڵڕژایە نێو ژوورەکەیان، وامزانی ئێستا مەلاژن نارەزایی دەردەبڕێ و ناشوکریی و شەکوا دەکات! بەڵام هیچ خۆی تێك نەداو، بەخێرایی منداڵەکانی بۆ بن دیوارەکان گواستەوەو گوتی: ماشاللا خوایە لەو هەموو بەرەکەت و ڕەحمەتەی ئەمساڵ!

قورس بوو، چونکە خاتوون مەلاژن، هەم لەلای بابییەوەو، هەم لەلای دایکییەوە، خانەدانو هەبوو بوون، بابی (إبراهیم ماماغا) برای (حسین ماماغا) بوو، کە ریش سپی هۆزی (میرزا رۆستەمیی) بوو، خوالێیان خۆشبێ، دایکیشی (معصومە غفورخان) لیوژەیی، کچی غەفوورخانی لیوژەیی بوو کە پیاوێکی ناوداری عەشیرەتی ئاکۆ بووەو کاتی خۆی لەگەڵ کەسانی وەك (شێخ مەحموودی حەفید)و (بابکراغای گردەسپیان) و (هەباسی مەحمووداغای چۆمڕکە) پەیوەندییو سەروکاری هەبووە، خوا لە هەموویان خۆشبێ.

بەڵام هەموو ئەوشتانەی، دڵسۆزانە تەحەممول دەکردنو، هەر بەسەرخۆیشی نەدەهێنا.

یەکێك لەو شتانەش کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە لەو بوارەدا، ئەوەیە کە ئەوکاتەی ماڵمان لە گوندی (سەرسیان)ی بەری مەرگە بوو، کە بە هۆی (حاجیاغای سەرسیان)ەوە خوا لێی خۆشبێ، لەوێ حەوابوومەوەو، بە دڵخۆشیی بە برای بەرێزم (مامۆستا مەلا سەید عەبدوڕڕەحمانی لۆتەریی)یەوە، کە مەلای دێیە کە بوو، دەوری دووساڵ بوو لەوێ گیرسابووینەوە[1].

ڕۆژێکیان نیوەڕۆ بوو، چێشتی ساوارمان هەبوو، بەڵام بەبێ شلەو زەڵاتەو هەرشتێکی دیکە، منیش لەبەرخۆمەوە گوتم: بە خوا خۆش بوو ئەم ساوارە دۆیەك، ماستاوێکی لەگەڵ بوایە، دیارە ماستیشمان نەبوو، وە ئەگەر

---

(١) ماڵی مامۆستا مەلا سید عبدالرحمن لۆتەریی، لەو ماوەیەدا کە لە گوندی سەرسیان بووین، زۆر خزمەتیان کردینو پێمانەوە ماندوو بوون، خوا بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

ئاگاداربـام ڕازیـش نـەدەبووم، خێـزانم داوای ئـەو جـۆرە شـتانە لـە ماڵـە دراوسێیەکان بکات، بۆیە بیێەوەی من پێ بزانم، خێزانم دیـار نـەماو دوایـی تۆزێك خۆی خافڵاندو هاتەوە، پەرداخێك ماستاوی پێ بـوو، منـیش تـووڕە بوومو گوتم نایخۆمەوە، هەتا نەزانم چۆنت پەیدا کرد ؟! گوتی: بە خوا چـوومە فلانە ماڵە دراوسێو گوتم یەك کەوچکە ماسـتم بـدەنێ، شـیری پـێ هـەوێن دەکەمو، ئیدی کردمە ئەم پەرداخە ماستاوە، دیارە پێم نـاخۆش بـوو، بـەڵام لەبەر دڵی وی قبووڵم کرد، کە پێکەوە بەدەم ساوار خواردنەوە بیخۆینەوە !

## ٧- فرۆشتنی بەشێك لە زێڕی مارەیی یەکەی بۆ دەعوەتکردنی پێشمەرگەکانی بارەگای هێزی حەمزە، لە قەڵاتوکانی بناری قەندیل:

ئەو ماوەیەی کە بارەگای هێـزی (حـەمزە)، کـە مـن فەرمانـدەی بـووم، لـە گونـدی (قـەڵاتووکان)ی بنـاری قەنـدیل بـوو، وە ژمارەیەکیشـمان مـاڵو خێزانیشـمان لـەوێ بـوو، کەلـە نێویانـدا بەنـدەو شـەهید مـەلا شـەریف و مامۆستا حەسەن بابەکرو کاك مەلا ئەحمەدی هـەنارۆکێ، هـەبووین، جـاری وا هەبوو چوار مانگ تێدەپەڕین، گۆشتمان نەدەخوارد، ئنجا جارێکیان کە ماوەیەك بوو خۆمـانو پێشـمەرگەکان گۆشـتمان نـەخواردبوو، دیـارە لەبـەر نـەبوونیی‌و کەمدەسـتیی، وە زۆر تامـەزۆری بـووین[1]، خـاتوون مـەلاژن

(١) کاك مەلا هێواش هۆکاری مریشك کڕینەکەی هاوسەرمی بۆ پێشمەرگەکان، بـەم شـێوەیە بۆ گێڕامەوە:

گوتی: ڕۆژێکیان بەلای ماڵی ئێوە دا تێپەڕیم بۆنکرووزێك دەهات، منیش زۆر لە مێژ بـوو

بەشێکی زێڕەکەی فرۆشتو پارەکەی بە مریشکداو، بەو جۆرە دەعوەتێکی باشی برا پێشمەرگەکانی کرد[٢].

## ٨- ئێشکەگرتنی لە ئافرەتان لە ئەشکەوتدا لە گەرمەی شەڕی قەڵاتووکانو تۆپبارانی ڕژێمدا:

لەگەرمەی شەڕی قەڵاتووکاندا، کە لەسەر (گردی ڕەمکان) ڕوویداو خۆم سەرپەرشتی شەڕەکەم دەکرد، ژنو منداڵەکانمان ناردنە دەرەوەی گوندو بارەگا بۆ ئەشکەوتێك، دیارە من یەکێك لە برایانی پێشمەرگەم لەگەڵ دانان، کە (کاك مەلا هێواش)ی شاعیر بوو، چونکە ژمارەمان زۆر کەم بوو، وە پێم گوت: تۆ هیچ مەکە بەس ئاگاداری ژنو منداڵەکان بەو، ئێشکەیان لێ بگرە، وە پێشم گوت: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە جەنگی (أحزاب)دا، (حَسّان بن ثابت)ی شاعیری لەلای ژنو منداڵەکانی نێو قەڵایەکە دانا بوو، با ئێمەش ئەو سوننەتە زیندوو بکەینەوە.

ئنجا کاك مەلا هێواش دەڵێ: لەبەر ئەوەی شەرمم دەکرد لە نێو

---

تامەزۆری گۆشت بووم‌و وامزانی گۆشت دەبرژێنن، بۆیە سەلامم کردو گوتم: داك مەلاژن ئەو بۆنکرووزە چییە، گۆشت دەبرژێنن؟ ئەویش فەرمووی لێکردم‌و گوتی: نەخێر گۆشتمان لە کوێ بوو! منیش گوتم: ئەدی ئەو بۆنە چییە؟ ئەویش تەماشای کرد کراسی بەسۆزخانی کچی بوو کەو تبۆ سەر پشکۆیانو دەسووتا، ئیدی داك مەلاژن گوتی: یاخوا نەمێنم بۆتان، دیارە زۆر تامەزرۆی گۆشتنو، برپاریدا گۆشتمان بۆ بکڕێ!

(٢) یەکی دیکەش لەو ئافرەتانە کە بەشێك لەزێڕەکەی خۆی فرۆشتبوو بۆهاوکاریی پێشمەرگەکانو بارەگا، هاوسەری کاك (حاجی طه حاجی ظاهر) ڕانیەیی بوو، خوشکە (عائیشە) کە ئەو کاتە ئەوان ماڵیان لە نەغەدە بوو، خزمەتێکی زۆری ئەو برایانەیان دەکرد، کە بەئیشو کار دەچوونە نەغەدە، خوا پاداشتیان بداتەوە.

ئەشکەوتەکەدا بخەوم، تاکو ئافرەتەکان ئیسراحەتیان لـێ تێك نەچێ، من لە دەرەوەی ئەشـکەوتەکە دەخـەوتم، هەرچـەندە تۆپبـارانیش هـەبوو، بـەڵام کوژران و بریندار بوونەکەم پێ سەهلتر بوو لەوەی لە نێویاندا بم، ئنجا کاتێك کە خەوم لێکەوتبوو، داك مـەلاژن تفەنگەکـەی لـەبن سـەر دەرهێنـا بـووم، منیش، کە هەستم کرد تفەنگەکەم لەبن سەر دەرهێنراوە، مشـەوەش بـووم، بـەڵام کـە تەماشـام کـرد بـە دەسـت داك مەلاژنەوەیـە، گـوتم: ئـەوە بۆچـی تفەنگەکەم لەلای تۆیە؟ ئەویش گوتی: تۆ خەوت لـێ کەوتبوو، منیش گـوتم نەوەك پەلامارمان بدەن، بـا تفەنگەکـەم بـە دەسـتەوە بـێ، خـۆ نـاکرێ بـێ پاسەوان بین، ئەگەر لێمان نیزیك بکەونەوە دەیان تۆپێنم !

## ٩- شۆردنی جلو بەرگی پێشمەرگە نەخۆشەکان:

ئەو کاتەی کە لە گوندی(خدراوێ) بـووین، لـە سـاڵانی (١٩٩٠-١٩٩١)دا، هەندێك پێشمەرگەی نەخۆشمان هەبوون، نەیانـدەتوانی جـلو بـەرگی خۆیـان بشـۆن، خـاتوون مـەلاژن باسـكو قـۆڵی لـێ هەڵـدەماڵیو بـۆی دەشـۆردن، هەرچەندە ئەو کاتە جگە لە (شادی) هەموو منداڵەکانی دیکەمان هەبوون و هەمووشیان سەلکەو پێچکەو پیرۆچکە بـوون و، گەورەکـەیان (بەسـۆز) بـوو کە تەمـەنی چـوار پێـنج سـاڵە بـوو، دیـارە جاروبـار گلەییشـم لـێ دەکـرد لەوبارەوە، چونکە زۆر ماندوو دەبووو دەشم گـوت: بـا پێشـمەرگەکان فێـری تەنبەڵیی و خزمەتکران نەبن و، خۆیان خزمـەتی خۆیـان بکـەن و، جـاری واش هەبوو لەسەرحیسـابی خزمـەتی مـن و منداڵـەکان بـوو، بـەڵام لـە سـۆنگەی ئەوەوە کە دەمزانی بە دڵێکی پڕبەزەیی یانـەو، بـە نیـەتی طـاعەتـەوە ئـەو کارە دەکات، هەردەرفەتم دەداو لێم لە دڵ نەدەگرت.

## ١٠- زیرەكیی‌و دووربینیی نواندن لە كاتی ڕووداو و پێشهاتەكاندا:

هەرچەندە ئافرەتان بە گشتی هەست‌و سۆزو بەزەییان بە هێزترە لەعەقڵ‌و هۆشیان، ئەویش حیكمەتەكەی دیارە "وەك پێشتر باسمان كردوە"، كە بریتیە لەوەی ئەركی فیطریی‌و سەرەكیی ئافرەت خوازیاری هەست‌و سۆزو بەزەییەكی بە هێزە، بەڵام خاتوون مەلاژن لە زۆر هەڵوێستیدا، نەك هەر عەقڵ‌و هۆشێكی بە هێزی هەبوو، بەڵكو لە دووربینیی‌و زیرەكیی‌و پێش بینیی كردنی ڕووداوەكاندا، پێش زۆر لە پیاوان دەكەوتەوەو، لەوبارەشەوە نموونە زۆرن، بەڵام بە یەكێكیان وازدێنم:

ئەو كاتەی كە ڕژێم دەستی بەجەمو جۆڵ كرد، بەرەو ناوچە سنوورییەكانی نێوان عێراق‌و ئێران، ئێمەش لە بناری قەندیل بووین‌و، چەند قوڵە شەڕێكمان لەگەڵ سوپاو چەكدارە بەكرێگیراوەكانی ڕژێمدا بوو بوو.

ڕۆژێكیان لەگەڵ چەند برایەك دانیشتبووین‌و باسی ئایندەی خۆمان لە ناوچەكەداو، چۆنیەتی جەنگ‌و ڕووبەڕوو بوونەوەمان دەكرد، هاوسەرم پێشنیاری كرد، كە پێویستە دووربینیی زیاتر بكەین‌و، پێش كەوتنە نێو شەڕەوەو، بەرلەوەی ناوچەكە ببێتە بەرە(جبهة)ی شەڕو شەڕگە، خێزانەكان دووربخەینەوە، تاكو دوایی دەستمان نەگیرێ، بەڵام پێشنیارەكەی وەرنەگیراو، دوایی بەو هۆیەوە شپرزیی ڕووی تێكردین.

لە یادمە یەكێك لە برا نیزیكەكان لەو بارەوە گلەیی لە خێزانم دەكرد،، كە باسی دووربینی (إحتیاط)ی دەكردو گوتی: داك مەلاژن ئێمە هەر بەردێك باوێین دەبێتە گوللە تۆپ !

خێزانیشم بە شێنەییەکەوەو لەبەر خۆیەوە گوتی: خـوا بکـات وابـێ، بـەڵام پێموایە ئەمانە قسەی عاتیفیین.

## ١١- هێنانەدەری ماڵێکی ئاوارە لە کەلاوەیەکەو خانوو بۆ گرتنیان:

پاش کۆچی دوایی هاوسەرم، ڕۆژێکیان پیاوێکی ڕیش سپیی کەنەمدەناسی، هاتە ماڵمان، کە ئەو کاتە لـە شـاری (مـەریوان) بـووین، هـات دانیشـتو دەستی کرد بە گریانێکی بە کوڵو، پاش سەرەخۆشیکردنیو چاكو چۆنیی، لێم پرسی: زەحمەت نەبێ خۆتم پـێ بناسـێنە ناتناسـم ! ئـەویش گـوتی: مـن حاجی فلان کەسمو خەڵکی چەمچەماڵم، لێم پرسی: ئـەدی چـۆنە وا بـەکوڵ دەگری؟! ئیدی ئاوا دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ناسینی خێزانمی کـرد و گـوتی: ئێوارەیـەکی سـاردی زسـتان بـوو، خـۆمو خێـزانمو منداڵـەکان لـە کەلاوەیەکی قەراغ شاردا لەسـەرمان هەڵدەلـەرزین، چـونکە لەبـەر نـەداریی خانوومان بۆ بەکرێ نەگیرابوو، تەنیا نایلۆنێکمان بەسەر کەلاوەکە دا دابـوو کـە بـەباران تـەڕ نـەبین، ئێمـە لـەو حاڵەتـەدا بـووین خێزانـت بـەلای کەلاوەکەماندا ڕابردو، کە ئێمەی ئاوا بینی گـوتی: ئەیـەڕۆ ئـەوە لێـرە چـی دەکەن ! لێرە لەسەرمان ڕەق دەبنەوە، بە خوا نابێ ئەمشـەو لێـرەبن‌و دەبـێ بێنە لای ئێمە، ئێمەش هەرچەندە شەرمان دەکرد، بەڵام وازی نەهێنا، هـەتا لەگەڵی چووین، ئنجا کە چـووین، خـۆی پێناسـاندین‌و گـوتی: مـن خێزانـی فلانکەسمو ئەمە ماڵی ئەوە، ئیدی هەر بەوشەوە گـەرماوی بـۆ داخسـتین‌و، هـەمووومان کـە چـڵکن بـووین خۆمـان شـۆردو، جـل‌و بـەرگی هـەموومانی

شۆردو، پاشان بۆ بەیانیش یەك دوو پیاوی بانگ کردن[1] و حاڵی ئێمەی بۆ باسکردنو، داوای لێکردن کە خانوومان بۆ بگرن، وە خانوویان بۆ گرتینو، لەو کەلاوەیە دەرباز بووین، جا ئایا ناهەقمە بە کوڵ بۆی بگریم ؟!

## ١٢- پیرەژنێکی سواڵکەر: کەدەهاتمە ئەم ماڵە نەمدەزانی کە سواڵکەرم، وامدەزانی خانمێکی گەورەم:

چەند رۆژێك پاش کۆچی دوایی خێزانم، پیرەژنێك هاتە ماڵمان، نەمدەناسیو زۆربە پەرۆش بوو بۆ خێزانم، ئنجا کە لێم پرسی: تۆ کێی؟ گوتی: بە خوا رۆڵە پیرەژنێکی بێکەسمو بە سواڵو سەدەقە دەژیم، بەڵام بە خوا هەر جارێك هاتبمە ئەم ماڵە، ئەو ئافرەتە هێندەی رێز لێگرتووم، وامنەزانیوە سواڵکەرو داماوم، بەڵکو وا مزانیوە خانم و خاتوونم !
پاشان گوتی: خوایە ! من، کە بۆ مردن باشم نامرێنیو، ئەو ژنە چاکە دەمرێنی! منیش گوتم: پووری گیان ! ئەو قسانە مەکەو ناشوکریی مەکە، خوا بە هەموو شێوەیەك بەندەکانی تاقی دەکاتەوەو، کاری خوا هەمووی بەجێیە، با ئێمەش سەرمان لە هەمووی دەرنەچێ.

ئنجا با لە کۆتایی هەڵوێستو هەڵسو، کەوتە جوانەکانی خاتوون مەلا ژندا، باسی سێ هەڵوێستی گرنگی تایبەت بە خۆم بکەم:

---

(١)لە دۆستو برایانی خۆمان، کە ئەو کاتە ماڵیان لە مەریوان بوو، .

## ١٣- هەڵوێستی لە کاتی هاوسەرگیریم لەگەڵ هاوسەری دووەمم، شوکریە خاندا:

دیارە مەگەر بە دەگمەن ئەگەرنا هیچ ژنێك ڕازی نیە ژنی بەسەر بێو، خاتوون مەلاژنیش هەروا بوو، بەڵام کەزانی هەر دەمەوێ ژنێکی دیکە بێنم، مۆڵەتی لێوەرگرتم بچێ بیبینێ، کە بینیشیو هاتەوە، هیچ قسەیەکی خراپی نەکردو گوتی: ناتوانم ڕێی شتێکت لێ بگرم کە خواو پێغەمبەری ڕێیان داوە، پاشان لەڕۆژی بووك گواسترانەوەشدا، ئافرەتەکان لەبەر وی کشو مات بوون، کەچی ئەو گوتی: ئەوە چییە هیچکەس تلی لی بۆ بووکێ ناکات؟! ئیدی وەك عادەتی ژنان تلی لی کردو، نوقڵ چوکلاتیشی بەسەر بووکێدا هەڵدان[1]!

## ١٤- لەگەڵمدا هێدیو مەند بوو، نایەتەوە یادم مەسەلەیەکم بە توندی ڕەفز کردبێ، لامو جیمیی تێدا کردبێو، دەنگ توورە دەبوو، زووش ئاشت دەبۆوە:

خاتوون مەلاژن لەگەڵ منو خەڵکیشدا بەگشتی، ئارامو هێمنو مەندبوو، وەهەرگیز لەسەر شتێك نەدەچوو، کەزانیبای لەلای من پەسند ناکرێو، لامو جیمیو سەرەخەریی لەگەڵدا نەدەکردم.

---

(١)هەڵبەتە ناشڵێم دوایی هیچ کەمو کورییەك نەبوو، دیارە باری هەوێدارییش بۆ ژنان زۆر قورسە، بەڵام بەگشتی هەڵوێستو هەڵسو کەوتی هەرجوانو پەسند بوو و، هاوسەری دووەمیشم زۆری ڕێز لێدەگرتو دڵی ڕادەگرتو هاوکارو دڵسۆزی بوو.

هەروەها درەنگ تووڕە دەبوو، ئەگەر تووڕەش بووبایە، هەر ماوەیەکی کەم بوو ئاشت دەبۆوە، جا چ من دەستپێشخەری ئاشتبوونەوە بام، کە هەر عادەتم وایە، چ ئەو، وە لە ماوەی ئەو سێزدە ساڵەی ژیانی هاوسەرێتییماندا، پێم شك نایەت ئەو پەڕی لە سەعاتێك، یان دوو سێ سەعات زیاتر، تووڕە بوونەکەی خایاند بێ.

## ١٥- ڕۆژێك یان دووان پێش کۆچی دوایی وەصیەتی بۆ کردم، کە بەو پارەیەی هەیەتی حەجی بۆ بکەمو، دوو مانگ ڕۆژووش قەرزدارە، بۆی بگرمەوە:

خێزانم دە (١٠) ڕۆژ لە تاران لە خەستەخانە مایەوەو (باجی مەلیحە خان) خێزانی شەهید (عەلی سیوەیلی) هاوەڵی بوو، ڕۆژانەش خۆمو کاك (عبدالواحد)ی برامو کاك (مصلح حمزە)ی کوڕە پووری سەردانمان دەکرد.
ئنجا ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش مردنی گوتی:
مامۆستا ئەمجارە دەمرمو چاك نابمەوە.
منیش دڵم دایەوەو گوتم: نەخێر شیفا لەلای خوایەو خوا یار بێ چاك دەبی.
گوتی: نەخێر دڵنیام چاك نابمەوە.
گوتم: ئاخر چۆنو بەچی دڵنیا بووی؟
گوتی: لە خەونمدا بە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتمو لەگەڵم پێکەنی، ئیدی وا حاڵی بووم کە دڵنیام بکاتەوە، تاکو لە مردن نەترسم.
دیارە هەرواش بوو، بەیانی ڕۆژی دەیەم هەواڵیان دامێ کە لەوکاتەدا لە هۆتێل خەوتبووم، کە خاتوون مەلاژن کۆچی دوایی کردوە، کە هەواڵەکەم





بیست، بە تایبەتیش کە بەشێوەیەکی کتو پڕ بیستم، دنیام لە پێش چاو تاریك بوو، لە ناخەوە هەژام[1].

ئنجا ئەو ڕۆژە، کە باسی مردنی خۆی کرد، گوتی: ئەگەر مردم، حەز دەکەم بەو بڕە پارەیەی هەمە، حەجم بۆ بکەی، دوومانگیش ڕۆژووی ڕەمەزان قەرزدارم، ئەگەر توانیت بۆم بگرەوە. منیش بە ماوەیەکی کورت پاش وەفاتی، حەج و عومرەم بۆ کرد و دوو مانگ ڕۆژووەکەشیم بۆ گرتەوە.

---

١ - هۆی کۆچی دوایی هاوسەرم حاڵەتێکی سووتانی نا ئەنقەست بوو، کە وەك خۆی باسیکرد لە کاتی نەوت تێکردنی تەباخ و داگیرساندنیدا، بێئەوەی ئاگاداربێ دامێنی کراسەکەی، کە بە نەوت بووبوو، ئاگری گرتبوو، دیارە منیش لەماڵەوە بووم و ڕاکشابووم و میوانیشمان هەبوون، ئیدی هەستم پێکرد هاوسەرم خەریکی کوژاندنەوەی ئاگری کراسەکەیەتی، بەپەلە ڕامکردو ئاوم هێناو بەدەستیش کراسەکەم لەبەر داڕنی، وە لەئەنجامی ئەوەدا تۆزێك دەست و پەلیشم سووتان، دوایی کە پێمگوت: بۆچی زوو بانگت نەکردم؟! گوتی: ئاگرەکە شتێکی وانەبوو، گوتم خۆم دەیکوژێنمەوە، بەڵام لە بەرئەوەی کراسەکەم ماددەی نایلۆنی زۆر بوو، هەر زیاتر پەرەی گرت و بۆم نەکوژایەوە، شایانی باسیشە هاوسەرم لەوکاتەدا حەملیشی هەبوو، پێموایە (٣-٤) مانگەبوو، کە دیارە زوو حەملەکەیان بەهۆی عەمەلیاتەوە لێ جیاکردەوە، بەڵام بەمردوویی و پێموایە ئەو عەمەلیاتەش لەوکاتەدا هۆکارێکی دیکەی وەفاتی بوو. کاك هیوا مەرگەیی بۆی گێڕامەوە و بیری هێنامەوە کە: لەکاتێکدا خێزانمیان بردوە بۆ قاوشی عەمەلیات پێی گوتووم: مامۆستا ئێوەش هەرلەم نیزیکانە بن نەوەك پێویستیم بە خوێن بێ! منیش گوتوومە: خەمت نەبێ، ئەوەخۆم لێرەموکاك هیواو چەندبر ایەکی پێشمەرگەش لێرەن بۆخوێندان! ئەویش گوتوویەتی: بەخوا قبووڵ ناکەم پێشمەرگەی ڕەش و ڕووت خوێنی خۆیانم بۆ بگرن، هەموویان هەژارو برسین!

## موژدەی خۆشی پاش مەرگ

ئێستاش دوای ئەوەی پازدە ڕەوشتو خەسڵەتی بەرزوپەسندو، پازدە هەڵوێستو هەڵسو کەوتی جوانو ڕەندم، لە بارەی خاتوون مەلاژنەوە خستنەڕوو، واتە: بە هەردووك تەوەركە سی (٣٠) خەسڵەتو هەڵوێستم لە بارەوە ئەژمار کرد، بە ئەندازەی ساڵەکانی تەمەنی، بە باشی دەزانم لە کۆتاییيدا سێ خەون باس بکەم، کە هەرکامێکیان موژدە (مُبشِّرة)یەکەو بەو ڕەحمەتییەوە بینراون، یەکەمیان: خۆم بینیومەو، دووەمیان: شوکریەخانی خێزانم، سێیەمیشیان: برایەکی دڵسۆزو جێی متمانە.

هەڵبەتە خەونی باش (الرؤيا الصالحة)یش وەك پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، بەشێکە لە چلو شەش (٤٦) بەشی پێغەمبەرایەتییو وەحیو، تاکە دەروازەیەکە کە بەکراوەیی مابێتەوە، ڕووەو جیهانی پەنهانو نادیار (عالم الغيب)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

١- ((لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلَّا الْمُبَشِّرَاتُ قَالُوا وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ قَالَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ)) رواه البخاري: ٦٩٩٠، واتە: هیچ شتێك لەوەحی پێغەمبەرایەتیی نەماوەتەوە، جگە لە موژدەدەرەکان، گوتیان: ئایا موژدەدەرەکان چین؟ فەرمووی: خەونی باشە.

٢- ((وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ)) رواه البخاري: ٧٠٧١، رواه المسلم: ٢٢٦٣، واتە: وە خەونی بڕوادار، بەشێکە لەچلو شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی.

٣- ((**إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ اللَّهِ فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَلَيْهَا وَلْيُحَدِّثْ بِهَا وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا وَلَا يَذْكُرْهَا لِأَحَدٍ فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ**)) رواه البخاري عن أبي سعيد الخدري: ٦٩٨٥، رواه مسلم بنحوه عن قتادة: ٤/٢٢٦١.

واتە: هەرکات یەکێکتان خەونێکی دی کە پێیخۆشبوو، ئەوە لە خوای بەرزەوەیەو باستایشی خوای لەسەر بکاتو باسی بکات، وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوەی بینی لەوەی کە پێی ناخۆشە، ئەوە لەشەیتانەوەیە، با لەخراپەکەی پەنا (بەخوا) بگرێو بۆ کەسیشی باس نەکات، بێگومان زیانی لێنادات.

ئەو فەرمایشتانەشم بۆیە وەك نموونە هێنانەوە، چونکە کەسانێك، کە شارەزایی یان نیە، گەلێك جار بە شێوەیەکی نەگونجاو باسی خەون دەکەن، هەرچەندە بێگومان لە بەرانبەر ئەو بەزایەدان (**تفريط**)ەدا، تێپەڕاندن (**إفراط**) یش هەیەو هەردووکیشیان هەڵەنو هەڵوێستی ڕاست لەبارەی خەونەوە، ئەوەیە، کە وەك دڵخۆشکەر (**مُبَشِّرة**)و بەرچاوڕوونییو وریاکردنەوە، سوودی لێ دەبینرێ، بەڵام هیچ حوکمێکی شەرعیی لەبواری حەڵاڵو حەرامو ئەمرو نەهییدا لێ وەرناگیرێو، جگە لە خەونێکیش کە بە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەبینرێ، کەناگونجێ شەیتان دەستی تێیدا هەبێ، هیچ خەونێکی دیکە بەتەواویی متمانەی پێ ناکرێ.

**موژدەی یەکەم:**

لە ساڵی (١٩٩٦)دا دوای ئەوەی لە خوا پەرستییەکان (مناسك)ی حەجو عومرە بوومەوە، کە بۆ هاوسەری ڕەحمەتییمو لەسەر داواو وەصییەتی وی کردمن، لە خوا سبحانە و تعالی پاڕامەوە کە لەخەوندا شتێکم پیشان

بدات، تاکو دڵنیا بم، کە ئایا ئەو حەجو عومرەیەی کردوومن‌و، ئەو دوومانگە ڕۆژووەی بۆیم گرتوون، قبووڵ بوون‌و پێی گەیشتوون، یان نا ؟!
ئیدی ئەوە بوو ڕێك شەوی دوای تەواوکردنی خوا پەرستییەکانی حەج‌و عومرە، لە خەوندا هاوسەرمم بینی، کە بەڕوویەکی زۆر خۆش‌و جوان‌و دەم بەزەردەخەنەوە، بەرەو ڕووم هات‌و گوتی: (مامۆستا خوا پاداشتت بداتەوە، ئەوەی بۆت کردووم هەموویم پێگەیشت، ئەگەر دەشمزانی ئاوای، زۆر باش دەبووم‌و، هەرگیز دڵم ئازار نەدەدای ! منیش پێم گوت: بەڵام تۆ زۆر باش بووی لەگەڵم ! گوتی: ئاخر باشتر دەبووم).
ئیدی بێدار بوومەوەو لەلای خۆمەوە دڵخۆش بووم، کە "ان شاءالله" خوا پەرستییەکانم بۆ خێزانم قبووڵ کراون.

**موژدەی دووەم:**

چەند ڕۆژێك پاش وەفاتی خێزانم، شوکریەخان بەیانییەك لە خەو هەڵساو بەدەم گریان‌و ترسان‌و لەرزینەوە گوتی: مامۆستا زۆر دەترسم، ئێستا خوشکە ڕوخسارخانم لە خەوندا بینی، منیش ئارامم کردەوەو گوتم: چۆن بوو؟ وەك خۆی بۆم بگێڕەوە، ئیدی ئەویش ئاوا بۆی گێڕامەوە، گوتی: لە خەونما خوشکە ڕوخسار هاتبۆوە، منیش گوتم: ئەدی تۆ نەمردبووی؟ گوتی: با، گوتم: دە تووخوا بۆم باس بکە چییان لێکردی، گۆڕەوشاریان دای؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: چۆن بوو؟ گوتی: تەنیا ئەوەندە بوو، بە خۆیە گوشیمی‌و گوتی: ئاوا بوو، گوتم: ئیدی بردیانی بۆکوێ؟! گوتی: بۆ بەهەشت، گوتم: بەهەشت چۆنە؟ گوتی: زۆر زۆر خۆشە.
ئنجا بەدەم ئەو قسەو گفتو گۆیەوە، ئاخێکیشی هەڵکێشا، کە نەمزانی

مەبەستی چی بوو)⁽¹⁾.

(١) لێرەدا وەك خستنەڕووی ڕاستییو وەفادارییش بۆ شوكریەخانی هاوسەرم، بە پێویستی دەزانم بڵێم: پاش كۆچی دوایی ڕوخسارخانو بەجێهێشتنی شەش منداڵو ماڵو میوانێكی زۆر، شوكریەخان ئەركوقورساییەكی گەورەی كەوتە سەرشانو، دڵسۆزانەو لێبڕاوانە قۆڵی لە بەخێوكردنی منداڵەكانی ڕوخسارخانو خۆیشی هەڵماڵیو، نەیهێشت هەست بەبێ دایكیی بكەن، هەروەها بۆ ماڵو میوانو خزمەتكردنی دڵسۆزانە، ڕۆڵێكی گرنگی گێڕاو هەتا نووسینی ئەم دێرانەش، وێڕای نەخۆشیو ئازاری زۆرو بەردەوام، لێبڕاوانە بەردەوامەو، لەڕاستیدا هەر لە پاش كۆچی دوایی مەلاژنی ڕەحمەتییەوە، مەلاژنە شوكریە بوو بە مشوورخۆرو هەڵسوڕێنەری ئیشو كاری ماڵو خێزانو منی دەستبەتاڵ (متفرّغ) كرد بۆ كارو چالاكییەكانم، خوا پاداشتی خێری بداتەوەو شیفای خێری یەكجاریی بۆبنێرێ.

بە پەسندیشی دەزانم كە وەك خستنەڕووی دڵسۆزییو بەتەنگەوەبوونی هاوسەری ڕەحمەتییم بۆ شوكریە خانو منداڵەكانیش، پاش مردنی لە جیهانی بەرزەخیشەوە، ئەم دڵخۆشكەرە (مبشّرة)یەش بنووسم، كە شوكریە خان بۆی گێڕامەوە، بەماوەیەك پاش مردنی مەلاژنە ڕوخسار، كە جارێ ماڵمان هەر لە مەریوان بوو:

گوتی: مەتبەخەكەمان گیرابوو، ئاوی تێدا ڕاوەستا بوو، منیش زۆر خەفەتم پێوە دەخواردو، بەدەستییەوەگرفتار بوومو، نەمدەزانی لە كوێوە ئاوەكە دەڕواتو كوێی گیراوە، هەرچەندە هەوڵمدا بێ سوود بوو.

شەو خەونم بە مەلاژنە ڕوخسارەوە بینی، هات گوتی: ئەوە مەتبەخەكەتان گیراوە؟ گوتم: بەڵێ نازانم چی لێبكەم! ئەویش دەستی برد بۆ شوێنێك گوتی: ئێرەیە گیراوە، وە كەوچكێك كە هەندێك شتی تێوە ئاڵابوو هێنایەدەر، ئاوەكە ڕۆیشت.

كە خەبەرم بۆوە یەكسەر چوومە مەتبەخەكەو، ئەو شوێنەی پیشانی دابووم، هەر لەبەرچاوم بوو، دەستم برد وەك لە خەونەكەمدا دیبووم، كەوچكێك كە هەندێك شتی لێ ئاڵابوو، بەری كونەكەی گرتبوو، دەرم هێناو ئاوەكە ڕۆیشتو گرفتەكەم چارەسەر بوو.

## مژدەی سێیەم:

لەو ماوەیەدا، کە سەرگەرمی نووسینی پێنج بەشەکانی بەرگی دووەمی ئەم کتێبە بوومو، لە بیرلێکردنەوەی ئەوەدا بووم، کە بتوانم لە سەفەری عومرەداو، پێش هاتنی مانگی موبارەکی ڕەمەزان، هەردووك بەشی هەشتەمو نۆیەم بنووسم، برایەکی دڵسۆزو جێی متمانەم، کە هیچ ئاگاداری بەشو بابەتەکانی ئەم کتێبە نەبوو، هاتە لامو گوتی: مامۆستا شەوی جومعەی ڕابردوو خەونێکم بە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بینیوە، پەیوەندیی بە تۆشەوە هەیە، منیش گوتم بۆم بگێڕەوە، ئەویش خەونەکەی بەوردیی بۆ گێڕامەوە، پاشان داوام لێکرد، کە بەخەتی خۆی بۆم بنووسێتەوە، ئیدی چۆنی گێڕابۆوە، ئاوا بۆی نووسیم، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

بسم الله الرحمن الرحيم

شەوی هەینی: ٢٥/رجب/١٤٣٣کۆچیی، بەرانبەر: ٢٠١٢/٦/١٥، لە خەودا بینیم لە مزگەوتدا بووم، کاتێك بینیمان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتە ناو مزگەوتو چەند ئافرەتێکی لەگەڵدا بوون، ئاوا هاتە خەیاڵم، کە یەکێکیان (خديجة) بێ "رضي الله عنها" پاش سەلام کردن، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا کردو گوتم: یارسول الله ! وا هاتە خەیاڵم، کە ئەم ئافرەتەی ناوەڕاست، (خديجة) بێ (دایکی ئیمانداران)؟ فەرمووی: بەڵێ هەروایە، ئەمە هاوسەری یەکەمە، ئەمەش (ئیشارەتی کرد بۆ ئافرەتێکی تر) هاوسەری یەکەمی مامۆستا عەلی باپیرە.

پاشان ئافرەتەكە، (واتە: هاوسەری ماموّستا عەلی) سەلامی كردو گوتی:

كاك (...........) سەلامم هەیە بۆ ماموّستا عەلیو پێی بڵێ: ئاگادارم زۆر لە مەلائیكەتان دووعای خێری بۆ دەكەنو، سوپاسیشی دەكەم بۆ كتێبی ((ئافرەتوخێزان))، زۆر دڵم بە منداڵەكان خۆشە، بەتایبەت (محمد)، بەڵام بەردەوام پێویستیی بە ئامۆژگاریی ماموّستا عەلی (باوكی) هەیە.

پاشان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((**الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ**)) [1].

پاشان چووە سەر مینبەری ناو مزگەوتو، دەستی كرد بە وتاردان، یەكێك لە قسەكانی فەرمووی: قۆناغی: (**ويمكرون**) [2] لەسەر ماموّستا عەلی لە كۆتایی دایەو قۆناغی: (**ويمكرالله**) [3] دێتە پێش.

بەڵام پێش ئەوەی وتارەكە تەواو بێ، بە ئاگا هاتم لە خەوەكە.

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته**




(١) رواه مسلم والنسائي عن عبدالله بن عمرو العاص رضي الله عنهما، واتە: ژیانی دنیا گوزەرانو ڕابواردنێكی كەمو كاتییەو باشترین شتیشی ژنی چاكە..

(٢) واتە : ئەوان (ناحەزان) پیلان دەگێڕن.

(٣) واتە: خواش تەگبیر دەكات ونەخشە دادەڕێژێ.

دیارە من لەو برایەم پرسی "کە هەرگیز هاوسەری کۆچکردوومی نەدیوە"، کە ئایا شێوەو دیمەنی چۆن بوو؟ ئەویش وەك وێنەی خۆی وەسفی کرد، گوتیشی هەرچەندە شەرمیشم دەکرد باش سەرنجی بدەم.

پێشموایە ئەم سوپاسکردنەی لەسەر کتێبی: (ئافرەتو خێزان) زیاتر پەیوەندیی بەم بەشەوە هەیە، کە ئەمە کۆتایی یەکەیەتی، وا دیارە ئەم یادکردنەوەو باسکردنەی منی پێخۆشە.

خوا لێی خۆشبێو بە چاکترین شێوە پاداشتی بداتەوەو بەردەوام پلەو پایەی بەرزو بەرزتر بکاتەوە، لە ڕیزی پێغەمبەرانو صیددیقانو شەهیدانو صاڵحاندا جێگای بکاتەوە، ئامین.

**سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين، والحمدلله رب العالمين**

٦/ ڕەمەزانی ١٤٣٣ ك

٢٥/تەمموزی ٢٠١٢ ز

سەعات٣:٢٠ ی شەو

هەولێر



# ناوەرۆك







**بەشی چوارەم : گرنگیی و چۆنیەتی بنیاتنانی خێزان** ........................................ ٣٨٥

